إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ




**(خادم الحرمين الشريفين) شاه سەلمان كورێ عەبدول عەزيز ئال سعوود**

**مەلكێ شاهنشينا عەرەبستانا سعوودی شەرەفمەند بوو ب فەرمانا چاپكرنا قورئانا پيرز د گەل وەرگێرانا ڕامانێت وێ**

تشرّف بالأمر بطباعة هذه الترجمة لمعاني القرآن الكريم

خادم الحرمين الشريفين الملك سلمان بن عبدالعزيز آل سعود

ملك المملكة العربية السعودية

# ترجمة معاني القرآن الكريم

## إلى اللغة الكردية

### (اللّهجة الكرمانجيّة)

إعداد:
الدكتور إسماعيل علي طه

مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف
بالمدينة المنورة

ئەڤ قورئانا پیرۆز وەقفە ژ (خادم الحرمين الشريفين)
شاه سەلمان کورێ عەبدول عەزیز ئال سعوود
نابیت بێتە فرۆتن
هەروە دهێتە بەلاڤکرن

# قورئانا پیرۆز د گەل ڕاڤەکرنا وێ ب زمانێ کوردی

تامادە کرن دوکتۆر:
ئیسماعیل عەلی تاها

کۆمەلگەها مەلك فەهەد یا چاپکرنا قورئانا پیروز
ل مەدینەیا مونەووەر

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# مقدمة

بقلم معالي الشيخ الدكتور

**عبد اللطيف بن عبد العزيز بن عبد الرحمن آل الشيخ**

وزير الشؤون الإسلامية والدعوة والإرشاد

المشرف العام على المجمع

الحمد لله رب العالمين، القائل في كتابه الكريم:

﴿ ... **قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ** ﴾.

والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين، نبينا **محمد** صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ، القائل: «**خيركُم مَن تعلَّم القرآن وعلَّمه**».

أما بعد:

فإنفاذاً لتوجيهات خادم الحرمين الشريفين، الملك سلمان بن عبدالعزيز آل سعود -حفظه الله- بالعناية بكتاب الله، والعمل على تيسير نشره، وتوزيعه بين المسلمين في مشارق الأرض ومغاربها، وتفسيره، وترجمة معانيه إلى مختلف لغات العالم.

وإيماناً من وزارة الشؤون الإسلامية والدعوة والإرشاد بالمملكة العربية السعودية، بأهمية ترجمة معاني القرآن الكريم، إلى جميع لغات العالم المهمة؛ تسهيلاً لفهمه على المسلمين الناطقين بغير العربية، وتحقيقاً للبلاغ، المأمور به في قوله صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ: «**بلِّغوا عنِّي ولو آية**».

وخدمةً لإخواننا الناطقين باللغة الكردية (اللهجة الكرمانجية)، يطيب لمجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف بالمدينة المنورة، أن يقدم للقارئ الكريم هذه الترجمة إلى اللغة الكردية (اللهجة الكرمانجية)، التي قام بها الدكتور إسماعيل علي طه؛ وراجعها من قبل المجمع الدكتور مصطفى مسلم محمد، وعمار محمد طاهر محمد.

ونحمد الله سبحانه وتعالى أن وفق لإنجاز هذا العمل العظيم، الذي نرجو أن يكون خالصاً لوجهه الكريم، وأن ينفع به الناس.

إننا لندرك أن ترجمة معاني القرآن الكريم -مهما بلغت دقتها- ستكون قاصرة عن أداء المعاني العظيمة التي يدل عليها النص القرآني المعجز، وأن المعاني التي تؤديها الترجمة إنما هي حصيلة ما بلغه علم المترجم في فهم كتاب الله الكريم، وأنه يعتريها ما يعتري عمل البشر كلّه من خطأ ونقص.

ومن ثم نرجو من كل قارئ لهذه الترجمة أن يوافي مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف بالمدينة النبوية، بما قد يجده فيها من خطأ أو نقص أو زيادة؛ للإفادة من الاستدراكات في الطبعات القادمة إن شاء الله.

والله الموفق، وهو الهادي إلى سواء السبيل، اللّهُمَّ تقبل منّا إنّك أنت السميع العليم.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# پێشگۆتن

ب پێنووسێ ڕێزدار شێخ دوکتۆر

**عەبدولەتیف کورێ عەبدول عەزیز کورێ عەبدولرحمان ئال شێخ**

وەزیرێ کاروبارێت ئیسلامی و بانگهلدێری

و ڕاستەڕێکرنێ سەرپەرشتێ گشتی یێ کۆڕی

سوپاس هەمی بۆ خودایێ گشت جیهانان، ئەوێ د پەرتۆکا خۆ یا پیرۆزدا گۆتی:

﴿ ... قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ﴾.

و سلاڤ و سەلەوات ل سەر پلە بلندترین پێغەمبەر و هنارتی، پێغەمبەرێ مە موحەمەد، ئەوێ گۆتی:

**«خيركُم مَن تعلَّم القرآن وعلَّمه»**.

ئانکو:

باشترینێ هەوە ئەوە یێ فێری قورئانێ بوویی و خەلك فێرکرییێ.

ل دویڤ ڕێنماییێت خزمەتکارێ هەردو حەرەمێت پلە بلند، شاە سەلمان کورێ عەبدول عەزیز ئال سعوود، خودێ بپارێزیت، بۆ چاڤدێرییا پەرتۆکا خودێ و کارکرن ل سەر ب ساناهی خستنا وەشاندنا وێ، و بەلاڤکرنا وێ ل سەر موسلمانان، ل ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤاییێت ئەردی، و ڕاڤەکرنا وێ، و وەرگێرانا ڕامانێت وێ بۆ جودا جودا زمانێت جیهانێ.

ژ باوەرییا وەزارەتا کاروبارێت ئیسلامی و بانگ هولدێری و ڕاستەڕێکرنێ ل شاهنشینا عەرەبی یا سعوودی ب گرنگییا وەرگێرانا رامانێت قورئانا پیرۆز بۆ هەمی زمانێت جیهانێ یێت گرنگ ژ بۆ ب ساناهی خستنا تێگەهشتنا وێ بۆ وان موسلمانێت ب غەیری زمانێ عەرەبی دئاخڤن، و ژ بۆ ب جهئینانا فەرمانا مە پێ هاتییە کرن د گۆتنا پێغەمبەریدا (سلاڤێت خودێ ل سەربن): «**بلِّغوا عنِّي ولو آية**». ئانکو: ژ من بگەهینن خۆ هەکە ئایەتەك بیت.

وەك خزمەت بۆ برایێت مە یێت ب زمانێ کوردی (شێوازێ کرمانجی) دئاخڤن کۆڕێ شاه فەهەد یێ چاپکرنا (مصحف)ا پیرۆز ل مەدینەیا مونەووەر پێ خۆشە ڤێ وەرگێرانا بۆ زمانێ کوردی (شێوازێ کرمانجی) پێشکێش بکەت، ئەوا دوکتۆر ئیسماعیل عەلی تاها؛ سگێری پێ ڕابوویی، و دوکتۆر مستەفا مسلم محەمەد، و عەمار محەمەد تاهر محەمەد، لێ زڤرین ل سەر کری.

سوپاسییا خودێ مەزن دکەین هاریکاری بۆ ب جهئینانا ڤێ کارێ مەزن کری، هیڤیدارین هەمی د ڕێکا خودێدا بیت، و خەلك مفایی ژێ ببینیت.

ئەم دزانین وەرگێرانا ڕامانێت قورئانا مەزن ـ هندی یا هویر و بنەجه بیت ـ ناگەهیتە وان ڕامانێت مەزن ئەوێت د ناڤا دەقێ قورئانێدا، و ئەو ڕامانێت وەرگێران ئەدا دکەت ئەنجامێ وێ چەندێیە یا زانستێ وەرگێرانێ گەهشتییێ د تێگەهشتنا پەرتۆکا خودێ یا پیرۆزدا، و هند دێ ژێ گرت هندی ژ کارێ مرۆڤان هەمیا گرتی ژ خەلەتی و کێماسییان.

و پاشــی داخــوازێ ژ هــەر خواندەڤانەکــێ ڤــێ وەرگێرانــێ دکەیــن.. هــەر خەلەتــی و کێــم و کاســی و زێدەییــەکا تێــدا ببینیــت کــۆرێ شــاهـ فەهــەد یــێ چاپکرنــا (مصحف)ــا پــیرۆز ل مەدینەیــا مونــەووەر پــێ ئاگەهــدار بکــەت دا ب ئانەهییــا خــودێ د چاپکــرن و وەشــانێت بێنــدا بێنــە چارەســەرکرن و مفایــی ژێ ببینیــت.

هــەر خودێیــە هاریــکار، و ئــەوە رێنیشــاندەر بــۆ رێــکا راســت، خودێــوۆ تــو ژ مــە قەبویــل بکــە، ب ڕاســتی هــەر تویــی گوهــدار و زانــا.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# پێشگۆتنا وەرگێرانێت ڕامانێت قورئانا پیرۆز ڕێخۆشکرن

قورئانا پیرۆز ئاخفتنا خودایێ مەزنە یا ب پیت و ڕامانێت وێڤە بۆ پێغەمبەرێ خۆ موحەمەدی (سلاڤێت خودێ ل سەربن) هنارتی وەك دلۆڤانی بۆ هەمی جیهانا، مزگینئین و ئاگەهدارکەر و بانگهلدێر د ڕێکا خودێدا ب دەستویرا وی، و چرایەکێ ڕۆنکەر و گەشە، ئەڤە ژی دانەنیاسینەکا کورتە بۆ قورئانا پیرۆز و پەیاما وێ.

## دانەنیاسینەکا گشتی ب قورئانا پیرۆز

ئێك: دانەنیاسینا قورئانا پیرۆز، و دیارکرنا ناڤ و سالۆخەتێت وێ:

قورئانا پیرۆز ئەو ئاخفتنا خودایێ مەزنە ئەوا ب ڕێکا وەحییێ بۆ پێغەمبەرێ خۆ موحەمەدی (سلاڤێت خودێ ل سەربن) ب پەیڤ و ڕامانێت وێڤە هنارتی. ئەوا د (مصحف)ێدا هاتییە نڤێسین، و دەست بۆ دەستی هاتییە ڤەگوهاستن، و خواندنا وێ پەرستنە.

و خودایێ ـ مەزن و سەردەست ـ ئەوە ناڤێ وێ وەحییا بۆ پێغەمبەرێ خۆ موحەمەدی (سلاڤێت خودێ ل سەربن) هنارتی کرییە قورئان، خودایێ مەزن گۆت: ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ تَنزِيلٗا ﴾ [الإنسان: ٢٣]، چونکی هێژای هندێیە بێتە خواندن و خۆ ژێ دویر نەئێخن.

هەروەسا خودایێ مەزن ناڤێ وێ کرە (الكتاب)، خودایێ مەزن گۆت: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴾ [الزمر:٢]، چونکی هێژای هندێیە بێتە نڤێسین و پشت گوهـ نەئێخن.

و خودایـێ مـەزن قورئانـا پـیرۆز یـا سـالۆخ دایـی کـو: ڕاسـتی و پویچییـێ و حـەلالی و حەرامـی ژێـك ڤاڤـێر دكـەت، و بیرئینانـە، و ڕاسـتەرێییە، و ڕۆناهییـە، و سـاخی و سـلامەتییە، و حەكیمـە، و شـیرەتە، و چەندیـن سـالۆخەتێت دی یێـت مەزناتییـا قورئانـا پـیرۆز و تەمامییـا پەیامـا وێ دیـار دكـەن.

و پەیڤـا (مصحـف) ژ وان بەرپـەڕا هاتییـە وەرگرتـن یێـت قورئانا پیرۆز ل سـەر هاتییـە نڤیسـین، ئـەڤ ناڤكرنە سـەحابییان دانایە سـەر بـۆ دیاركرنا وێ پەرتۆكـێ ئـەوا قورئانـا پیرۆز ل سـەر بەرپەڕێـت وێ هاتییە نڤیسـین.

و قورئانـا پـیرۆز وەحییـە ژ دەڤ خودایـێ مـەزن، جبریـلی ـ سـلاڤ ل سـەر بـن ـ ئینایـە خـوارێ سـەر دلێ موحەمـەد پێغەمبـەری (سـلاڤێت خـودێ ل سـەربن)، خودایـێ مـەزن گـۆت: ﴿ وَإِنَّـهُۥ لَتَنزِيـلُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِـينَ ۞ نَـزَلَ بِـهِ ٱلـرُّوحُ ٱلۡأَمِـينُ ۞ عَلَىٰ قَلۡبِـكَ لِتَكُـونَ مِـنَ ٱلۡمُنذِرِيـنَ ۞ بِلِسَـانٍ عَـرَبِيّٖ مُّبِـينٖ ﴾ [الشـعراء: ١٩٢-١٩٥].

و موحەمـەد پێغەمبـەر (سـلاڤێت خـودێ ل سـەربن) د ڤـێ چەندێـدا نەیـێ جودایـە ژ پێغەمبەرێـت دی، جبریـلی ـ سـلاڤ ل سـەر بـن ـ وەحـی ژ دەڤ خودایـێ مـەزن بـۆ هەمـی برایێـت وی یێـت پێغەمبـەر (سـلاڤ ل سـەر وان بـن) ئینایـە خـوارێ، و خودایـێ مـەزن ـ یـێ پـاك و پاقـژ ـ بـۆ ڤـی ئێهانەتـێ مـەزن وی هەلدبژێریـت یـێ وی بڤێـت، خودایـێ مـەزن گـۆت: ﴿ ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ﴾ [الحـج: ٧٥]، و ئـەو چێـتر دزانیـت كـی ب كـێر وێ چەنـدێ دئێـت و كـی ب كـێر نائێـت، چونكـی چێكـری چێكرییێـت وینـە، خودایـێ پـاك و پاقـژ گـۆت: ﴿ وَرَبُّـكَ يَخۡلُـقُ مَـا يَشَـآءُ وَيَخۡتَـارُ ﴾ [القصـص: ٦٨].

## دوو: هاتنەخوارا قورئانا پیرۆز:

ڕۆژا دوشـەنبی ڕێكەفتـی هەڤـدەی ڕەمەزانـێ سـالا (٦١٠ ز) ل شـكەفتا حەرایـێ ـ ل ئێـك ژ چیایێـت مەكەهـا پـیرۆز ـ هاتنەخـوارا

وەحــی بــۆ پێغەمبــەرێ خــودێ (ســلاڤێت خــودێ ل ســەربن) ب ڤــان ئایەتــا دەســت پــێ کــر: ﴿ ٱقۡـرَأۡ بِٱسۡـمِ رَبِّـكَ ٱلَّذِى خَلَـقَ * خَلَـقَ ٱلۡإِنسَـٰـنَ مِـنۡ عَلَـقٍ * ٱقۡـرَأۡ وَرَبُّـكَ ٱلۡأَڪۡـرَمُ * ٱلَّذِى عَلَّـمَ بِٱلۡقَلَـمِ * عَلَّـمَ ٱلۡإِنسَـٰنَ مَـا لَـمۡ يَعۡلَـمۡ ﴾ [العلـق: ١ - ٥]، و ئەڤـە ئێکەمـین ئایـەت بـوون ژ قورئانـا پـیرۆز بـۆ پێغەمبــەرێ خــودێ (ســلاڤێت خــودێ ل ســەربن) هاتــین خــوارێ.

پێغەمبــەر (ســلاڤێت خــودێ ل ســەر بــن) زڤــڕی مــالا خــۆ و ڕپ ڕپــا دلێ وییــە یــێ دلەرزیــت ژ ترسـیانا ل سـەر خـۆ، و سـەرهاتییا خـۆ بـۆ هەڤژینـا خــۆ دەیــکا خــودان بــاوەران خەدیجــا کچــا خوەیلــدی (خــودێ ژێ ڕازی بیـت) گـۆت، و گۆتـێ: «ئـەز ژ خـۆ ترسـیام»، خەدیجایـێ گۆتـێ: (نەخــێر، مزگینــی بــۆ تــە بیــت، ب خــودێ.. خــودێ چــو جــارا تــە شــەرمزار ناکــەت، تــو ســەرا کــەس و کارێــت خــۆ ددەی، و ڕاســتگۆیی د ئاخڤتنێـدا، و تـو یـێ خەمخـۆری، و ڕێـزێ ل مێڤانـی دگـری، و کار دکـەی بــۆ ب جهئینانــا حەقییــێ)، و خەدیجایــێ ئــەو د گــەل خــۆ بــر و چۆنــە دەڤ (وەرەقــە کــورێ نەوفــەل)، ئــەو مرۆڤەکــێ شــارەزا و تێگەهشــتی بــوو، ئینــا خەدیجایــێ گۆتــێ: (پســمام گوهــێ خــۆ بــدە برازایــێ خــۆ دا بەحســێ خــۆ بــۆ تــە بکــەت)، ئــەو تشــتێ پێغەمبــەری (ســلاڤێت خــودێ ل ســەر بــن) دیتــی، بــۆ گــۆت، وەرەقــەی گۆتــێ: (ئەڤــە ئــەو ملیاکەتــە[1] یــێ خــودێ بــۆ مووســا پێغەمبــەر ئینایییــە خــوار، خــۆزی ئــەز مابامــە ســاخ و شــیابام، دەمــێ ملەتــێ تــە تــە دەردئێخــن بشــتەڤانییا تــە بکــەم)، پێغەمبــەری (ســلاڤێت خــودێ ل ســەر بــن) گۆتــێ: «مــا دێ ئــەو مــن دەرئێخــن»؟ گۆتــێ: (بــەلێ.. هــەر زەلامەکــێ ب وی تشــتی هاتــی یــێ تــو پــێ هاتــی، دژمناتییــا وی یــا هاتییــە کــرن، ئەگــەر ئــەز گەهشــتمە وێ

١- مــەرەم پــێ جبریلــە (ســلاڤ ل ســەر بــن)، ئــەو ملیاکەتــە یــێ هنارتنــا وەحــی بــۆ پێغەمبــەران پــێ هاتییــە ســپارتن.

ڕۆژێ.. دێ پشتەڤانییا تە کەم و تە سەرئێخم)، پاشی گەلەك ب سەر ڤێ چاڤپێکەڤتنێ نەچۆ وەرەقە مر.

و قورئانا پیرۆز هەمی پێکڤە ب ئێك جاری بۆ پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) نەهاتە خوارێ هەروەکی کتێبێت پێغەمبەرێت بەرێ (سلاڤ ل سەر وان بن) هاتین، قورئان پیچ پیچە د بیست و سێ سالاندا هاتە خوار، ڤێجا یان دا سۆرەتەك ب تەمامی ئێتە خوار، یان هندەك ئایەت ژ سۆرەتەکێ.

و حیکمەت ژ پیچ پیچە هاتنەخوارا قورئانێ و نە پێکڤە[1] موکومکرنا دلێ موحەمەد پێغەمبەرییە (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) و بهێزکرنا وییە و بشتەڤانییا وییە ب نویبوونا هاتنا جبریلی (سلاڤ ل سەر بن) ب وەحییێ، دا بهێزتر و موکومتر و خۆراگرتر بیت ل بەرامبەر سەرڕەقییا هەڤپشکچێکەرا و بەرهنگارییا وان بۆ وی ل دەمێ دەستپێکا هنارتنا وی، خودایێ پاك و پاقژ گۆت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةً وَٰحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلًا ﴾ [الفرقان: ٣٢].

هەروەسا هاتنا قورئانا پیرۆز پیچ پیچە و نە پێکڤە حیکمەتەکا دی یا پەروەردەیی یا مەزن تێدایە ئەو ژی ئەوە دا خودان باوەر هێدی هێدی و پلە پلە زانینێ وەربگرن و کار ب ئەحکامێت ئایینی بکەن، دا ب ساناهیتر بیت بۆ فێربوون و تێگەهشتنێ و دەرکەڤتنێ ژ تاریاتییێت نەزانین و گاوری و هەڤپشکچێکرنێ یا هینگێ ئەو تێدا بۆ ڕۆناهییا باوەری و تاکپەرستی و زانینێ.

## سێ: نڤێسینا قورئانا پیرۆز:

ژ گرنگترین ڕێکێت پاراستنا دەقا نڤێسینا وانە، و ئەو ئاخڤتنا نەئێتە نڤێسین یا بەرهنگارە بۆ ژ بیرکرنێ، و مادەم قورئانا پیرۆز

١- بەرێ خۆ بدە: تەفسیرا (الطبري) ١٠/١٩، و (المرشد الوجيز لأبي شامة المقدسي ص: ٢٨).

هاتییه هنارتن وەك ڕاستەرێیی بۆ هەمی جیهانا، حەتا قیامەت ڕادبیت، دڤییا بێتە نڤیسین.

پێغەمبەری ( سلاڤێت خودێ ل سەر بن) گرنگی و پویتەكێ باش دایە نڤیسینا وێ، پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) فەرمان ل هندەك سەحابییێت خۆ كر ئەڤێت نڤیسینێ دزانن ئەو قورئانا پیرۆز بنڤیسن و ئەو كرنە نڤیسەرێت وەحییێ و ناڤدارترینێ وان زەید كورێ (ثابت)ێ ئەنساری بوو (خودێ ژێ رازی بیت)[1].

هەر دەمێ وەحی بۆ پێغەمبەرێ خودێ ( سلاڤێت خودێ ل سەر بن) هاتبا دا ژ بەر كەت پاشی ئەو تشتێ بۆ هاتی دا بۆ ئێكی ژ نڤیسەرێت وەحییێ بێژیت دا بنڤیسیت، و دگۆت: «ڤان ئایەتا داننە د وێ سۆرەتێدا ئەوا ئەڤە و ئەڤە تێدا هاتین»[2]، دا ناڤێ سۆرەتێ بۆ بێژیت، و دا فەرمانێ ل وان كەت ئایەتا تێدا بنڤیسن، پاشی دا فەرمانێ ل سەحابییان كەت خۆ فێری وی تشتی بكەن یێ ژ قورئانا پیرۆز هاتی و ژ بەر بكەن، ڤێجا قورئانا پیرۆز هەمی ل سەر دەمێ وی ( سلاڤێت خودێ ل سەر بن) دهاتە نڤیسین د (الرقاع)[3]دا.

و جبریلی (سلاڤ ل سەر بن) سالێ جارەكێ د گەل پێغەمبەری ( سلاڤێت خودێ ل سەر بن) لێزڤڕین ل قورئانا پیرۆز دكر، و سالا پێغەمبەر ( سلاڤێت خودێ ل سەر بن) تێدا مری دو جارا لێزڤڕین د گەل كر ب ڕێزبەندكرنا ئایەت و سۆرەتێت وێ هەروەكی د وێ (مصحف)ا نوكەدا هەی ئەڤا د ناڤ دەستێت موسلماناندا

---

١- تفسير الطبري ٢٨/١.

٢- سنن أبي داود رقم الحديث: ٧٨٩، وسنن الترمذي رقم الحديث: ٣٠٨٦، وأخرجه الحاكم في المستدرك (رقم الحديث: ٣٣٢٥)، وقال: (هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه).

٣- صحيح البخاري رقم الحديث: ٤٥٩٢ و ٤٥٩٣.

وەك ب جهێنيـــان بـــۆ گۆتنـــا خودايـــێ پـــاك و مـــەزن: ﴿ إِنَّ عَلَيْنَـا جَمْعَـهُۥ وَقُرْءَانَـهُۥ ۞ فَـإِذَا قَرَأْنَـٰهُ فَٱتَّبِـعْ قُرْءَانَـهُۥ ﴾ [القيامـة: ١٧- ١٨]، و ﴿ سَـنُقْرِئُكَ فَـلَا تَنـسَىٰٓ ﴾ [الأعلى: ٦].

## چار: كۆمكرنا قورئانا پيرۆز د بەرپەڕاندا:

پشـتی مرنـا پێغەمبـەری ( سـلاڤێت خـودێ ل سـەر بـن) خەليفەيـێ ڕاشـــد (أبـــو بكـــر الصديـــق) (خـــودێ ژێ رازی بيـــت) فەرمـــان ب كۆمكرنـــا قورئانـــێ دا د هنـــدەك بەرپەڕێـــت ڕێكخســـتيدا، دا چـــو ژ قورئانـێ نەچيـت دەمـێ ژبەركەرێـت قورئانـێ دمـرن يـان ئـەو پارچێـت قورئـان ل سـەر نڤێسـايی (الرقـاع) ژ نـاڤ دچـن، و نڤێسـەرێ وەحيیـێ زەيـد كـوڕێ (ثابـت) (خـودێ ژێ رازی بيـت) ب ڤـی ئەركـی ڕابـوو، و پشـتی لێ زڤڕيـن لێ كـری و پشـت ڕاسـت بوويـی ژ دانەبەرێـكا يـا ل سـەر (الرقـاع) نڤێسـايی و ئـەوا د سـينگادا (دلانـدا) ژبـەر.. ئـەو بەرپـەڕە هەمـی دانانـە مـالا (أبـو بكـر الصديـق) (خـودێ ژێ رازی بيـت) حەتـا چۆيـە بـەر دلۆڤانييـا خـودێ، پاشـتی ل مـالا خەليفەيـێ دووێ عومـەرێ كـوڕێ (خطـاب)ی (خـودێ ژێ رازی بيـت) هاتنـە پاراسـتن، و پشـتی مرنـا وی ل مـالا هەڤژينـا پێغەمبـەری دەيـكا خـودان بـاوەران (حفصـە) كچـا عومـەری خـودێ ژ هـەردووكا ڕازی بيـت هاتنـە پاراسـتن[1].

و دەمـــێ ئيســـلام بـــەلاڤ بوويـــی، موســـلمان پێدڤـــی گەلـــەك (مصحف)ـــا بـــوون لێ بخوينـــن، و هنـــدەك ســـەحابييا گۆتـــە خەليفەيـــێ ڕاشـــد (عثمـــان)ێ كـــوڕێ عەفانـــی (خـــودێ ژێ رازی بيـــت) پێدڤييـــە ئێـك (مصحـف) هەبيـت خەلكـی بـۆ خواندنـێ ل سـەر كـۆم بكەيـن، و ببيتـــە پێشـــەنگ موســـلمان د خواندنـــا خـــۆدا ل دويـــڤ بچـــن. ئينـــا

١- صحيـح البخـاري رقـم الحديـث: ٤٩٨٦، وسـنن الترمـذي رقـم الحديـث: ٣١٠٣، ومسـند الإمـام أحمـد رقـم الحديـث: ٧٦.

(عثمـــان)ی فەرمـــان ل کۆمـــەکا ژبەرکەرێـــت قورئانـــا پـــیرۆز کـــر ئەوێـــت نڤێسـینێ دزانـــن ب ڤـــی ئەرکـــی ڕابـــن، و ل پێشـــییا وان زەیـــد کـــوڕێ (ثابـــت) (خـــودێ ژێ رازی بیـــت) و پشـــتگەرمی وان بەرپـــەڕا بـــوون ئەوێـــت قورئـــان تێـــدا ل ســـەر دەمـــێ (أبـــو بکـــر الصدیـــق) (خـــودێ ژێ رازی بیـــت) هاتییـــە کۆمکـــرن، ڤێجـــا ئـــەو بەرپـــەڕ هەمـــی د (مصحف)ـــەکێدا کۆمکـــرن، و چەندیـــن دانـــە ژێ کۆپیکـــرن، و هـــەر دانەیـــەك هنارتـــە وەلاتەکـــی ژ وەلاتێـــت ئیســـلامێ یێـــت مـــەزن، و فەرمـــان ل موســـلمانا کـــر چەندیـــن (مصحف)ـــا ژێ کۆپـــی بکـــەن.

و هنـــدی (مصحف)ـــەکا ئەڤـــرۆ ل جیهانـــێ ل بـــەر دەســـت، چ دەســـت خـــەت بـــن ئـــان ل چاپخانـــا چاپکـــری.. بنیاتـــێ وان ژ وان (مصحف)ـــایە ئەوێـــت هاتینـــە کۆپیکـــرن و هنارتـــن بـــۆ وەلاتـــا، ژێ جـــودا نینـــن نـــە د دەقـــێ وانـــدا نـــە د ڕێزبەندییـــا وانـــدا.

و حەتـــا نوکـــە ژی موســـلمان پویتـــەی ددەنـــە چاپکرنـــا (مصحف)ـــا پـــیرۆز و ل دویـــڤ تشـــتێ نـــوی دچـــن د ڕێـــك و شـــێواز و تەکنیکێـــت چاپکرنێـــدا پێخەمـــەت ب جهئینانـــا بلندتریـــن پلەیێـــت باشـــی و جوانـــی و ڕێـــك و پێکییـــێ د نڤێسـینا دەقـــێ قورئانیـــدا ب وێنەیـــێ وێ یـــێ پـــێ هاتییـــە نڤێســـین ل ســـەردەمێ (عثمـــان)ێ کـــوڕێ عەفـــان (خـــودێ ژێ رازی بیـــت) یـــا بەرنیـــاس ب وێنەیـــێ (عثمـــان)ی.

و کـــوڕێ شـــاهـ فەهـــەد یـــێ چاپکرنـــا (مصحف)ـــا پـــیرۆز ل مەدینـــا پێغەمبـــەری ئێکـــە ژ ســـیمایێت بەرچـــاڤ و بەلگەیـــە ل ســـەر چاڤدێـــری و پویتەپێکرنـــا بـــاش ب قورئانـــا پـــیرۆز، و ڕژدییـــا کاربدەســـتا ل شاهنشـــینا عەرەبـــی یـــا ســـعوودی ل ســـەر پەرتـــۆکا خودایـــێ مـــەزن و پویتەپێکرنـــا وان ب خزمەتکرنـــا وێ و ب ساناهیئێخســـتنا ب دەســـتڤەئینانا (مصحف)ـــا پـــیرۆز ژ لایـــێ موســـلمانانڤە ب باشـــترین و جوانتریـــن چـــاپ و بـــەرگ و جوانـــی و پاراســـتن و ڕێـــك و پێکـــی و بنەجهـــی.

## پێنج: ڕێزبەندیا (مصحف)ێ و جوزئکرنا وێ:

قورئانـــا پــیرۆز ب ســـۆرەتا فاتیحـــێ دەســـت پــێ دکـــەت، و ب ســـۆرەتا ئەلنـــاس ب دویماهـــی دئێـــت، پێکهاتییـــە ژ (١١٤) ســـۆرەتا، و ئـــەڤ ڕێزبەندییـــە تەوقیفییـــە، ئانکـــو ژ پێغەمبـــەری ( ســـلاڤێت خـــودێ ل ســـەر بـــن) وەرگرتییـــە، نـــە ل دویـــڤ ڕێزبەندییـــا هاتنەخوارێیـــە، چونکـــی ئێکەمـــین ســـۆرەت هاتییـــە خـــوارێ ســـۆرەتا ئەلعەلـــەق بـــوو، بـــەلێ ڕێزبەندییـــا وێ د (مصحف)ێـدا (٩٦)ـــە، و ســـەحابییان ڕێزبەندییـــا ئایـــەت و ســـۆرەتا ژ خواندنـــا پێغەمبـــەری ( ســـلاڤێت خـــودێ ل ســـەربن) بـــۆ قورئانـــا پـــیرۆز دزانـــین[1].

ئەڤـــرۆ قورئـــان یـــا لێکڤەکرییـــە ل ســـەر ســـیهـ جوزئـــا (پشـــکا)، و هـــەر جوزئـــەك لێکڤەکرییـــە بـــۆ دو حزبـــا، و هـــەر حزبـــەك لێکڤەکرییـــە بـــۆ چـــار چارێـــکا، و باراپـــتر ژ ڤـــێ لێکڤەکرنـــێ ئجتیهـــادە ژ دەڤ زانایـــان، پێخەمـــەت ب ســـاناهیکرنا خواندنـــا قورئانـــا پـــیرۆز ل ســـەر موســـلمانان.

## شەش: فێربوونا قورئانا پیرۆز:

موســـلمانا پویتەیەکـــێ مـــەزن یـــێ داییـــە فێربوونـــا قورئانـــا پـــیرۆز و ژبەرکرنـــا دەقـــێ وێ و خواندنـــا وێ هەروەکـــی بـــۆ پێغەمبـــەرێ خـــودێ ( ســـلاڤێت خـــودێ ل ســـەر بـــن) هاتییـــە خـــوارێ، و خواندەڤانێـــت ســـەحابییان و ژبەرکەرێـــت وان نیشـــا تابعییـــان دایـــە و ئـــەو فێرکرینـــە حەتـــا دەقـــێ وێ گرتـــی و پاراســـتی، و ل ســـەر هـــەر ئایەتەکـــێ ڕاوەســـتاندینە حەتـــا د ڕامانێـــت وێ گەهشـــتین، ڤێجـــا فـــێری زانـــین و کریـــارێ هەمییـــێ بووینـــە، پاشـــی تابعییێـــت ژبەرکـــەر قوتابخانـــە بـــۆ فێرکرنـــا خواندنـــا وێ دامەزراندینـــە، و پێگـــری ب وی تشـــتی کرییـــە یـــێ ژ ســـەحابییان فـــێر

---

١- نقله الداني في المقنع (ص: ٨) عن الإمام مالك بن أنس.

بوویـین ژ ئالییێـت خواندنـا وێ و گرتنـا دەقـێ وێ و هژمارتنـا پیـت و پەیڤێـت وێ، و ڕێزبەندییـا سـۆرەت و ئایەتێـت وێ، و بـاش خواندنـا وێ (تەجویـد)، و بنەجهکرنـا ب جهئینانـا وێ و چەوانییـا خواندنـا وێ ب دورسـتی، ڤێجـا قورئانـا پـیرۆز وەلێ هـات بێتـە فێرکـرن و ژبەرکـرن و خوانـدن، و فێرخـواز (قوتابـی) ژ شـێخێ خـۆ ژ پێـت قورئـان ژبـەر وەرگرتییـە ب دەڤـی و ئێکسـەر و ب زمانـێ عەرەبـی یـێ پەتـی زینـدی و تـەڕ هەروەکـی بـۆ پێغەمبـەرێ خـودێ ( سـلاڤێت خـودێ ل سـەر بـن) هاتییـە خـوار حەتـا ڕۆژا مـە یـا ئەڤـرۆ.

و قورئانـا پـیرۆز ب چەنـد ڕێکـەکا (خواندنـەکا) دئێتـە خوانـدن کـو چەوانییـا خواندنـا پەیـڤ و تیپێـت قورئانـێ و ڕێـکا خواندنـا وانـە، ئـەوا تابعییـان ژ خواندەڤانێـت ژبەرکـەر ژ سـەحابییان وەرگرتـی، ئەوێـت (ئانکـو سـەحابییان) ژ پێغەمبـەری (سـلاڤێت خـودێ ل سـەر بـن) وەرگرتییـە، ناڤداتریـن خوانـدن د سـەردەمێ مـەدا خواندنـا (عاصـم) ژ ڤەگێڕانـا قوتابییـێ وی (حفـص) کـوڕێ سـلێمان، و خواندنـا (نافـع) ژ ڤەگێڕانـا قوتابییـێ وی (عثمـان) کـوڕێ سـەعید یـێ بەرنیـاس ب (وەرش)، و ژ وان ڤەگێڕانـا (الدوري)یـە ژ ئەبـی عەمـرێ بـەصری، و ڤەگێڕانـا قالـون ژ نافـع.

## حەفت: ڕاڤەکرنا قورئانا پیرۆز:

ڕاڤەکرنـا قورئانـێ ئانکـو دیارکرنـا ڕامانێـت وێ[1]، و ئارمانجـا ئاخڤتنـێ ب جهـ نائێـت حەتـا مـرۆڤ ل سـەر ناڤـەڕۆك و ڕامانـا وێ نەراوەسـتیت، و خودایـێ مـەزن خواندەڤانـێ قورئانـا پـیرۆز هـان دایـە د ڕامانێـت وێ بگەهیـت، خودایـێ پـاك گـۆت: ﴿ كِتَـٰبٌ أَنزَلۡنَـٰهُ إِلَيۡـكَ مُبَـٰرَكٞ لِّيَدَّبَّـرُوٓاْ ءَايَـٰتِـهِۦ وَلِيَتَذَكَّـرَ أُوْلُـواْ ٱلۡأَلۡبَـٰبِ ﴾ [ص: ٢٩]، و هزرکـرن ئانکـو: تێگەهشـتن.

١- بەرێ خۆ بدە: البرهان للزركشي ١/١٣.

و پێغەمبــەری ( ســلاڤێت خــودێ ل ســەر بــن) ئــەو تشــتێ ســەحابی ژ ڕامانێــت قورئانــا پــیرۆز تــێ نەگەهشــتبان بــۆ ڕون دكــرن[1]، بــەلێ شــارەزاییا وان د زمانــێ عەرەبیــدا ل وی دەمــی و هاتنــا قورئانــا پــیرۆز ب زمانــێ وان وەل وان كــر گەلــەك پێدڤــی پســیاركرنا ڕامانێــت ئایەتێــت قورئانــا پــیرۆز نەبــن، ب بۆرینــا ســالا پێدڤییــا خەلكــی بــۆ ڕاڤەكرنــێ زێدەبــوو.

و ئــەو تشــتێ ژ پێغەمبــەرێ خــودێ ( ســلاڤێت خــودێ ل ســەر بــن) هاتییــە زانــین و ڤەگــێڕان و ژ ســەحابییێت وی و قوتابییێــت وان ژ تابعییــان ســەبارەت ڕاڤەكرنــا قورئانــا پــیرۆز دئێتــە هژمارتــن وەك كاكلــك (ناڤــۆك) بــۆ زانســتێ ڕاڤەكرنــێ، گۆتنــێ ڕاڤەكــرن ب وی تشــتێ هاتییــە ڤەگــێڕان ئەڤــا دئێتــە هژمارتــن گرنگتریــن ڕێــك بــۆ تێگەهشــتنا قورئانــا پــیرۆز، چونكــی تێگەهشــتنا بابكــێ ئێكــێ بــۆ ئایەتێــت قورئانــا پــیرۆز بــۆ مــە دیــار دكــەت، ب ڕێــكا شــارەزاییا وی بابكــی د زمانــێ عەرەبیــدا، و ژیانــا وان د گــەل ڕویــدان و ســەروبەرا ئەوێــت ل دەمــێ هاتنــا قورئانــا پــیرۆز هاتــی ڕویدایــین.

## ١) جۆرێت ڕاڤەكرنێ:

ئاراســتەیێت زانایێــت ڕاڤەكرنــێ بوونــە گەلــەك ل دویــڤ گەلەكییــا پویتەپێكرنێــت وان یێــت زانســتی، ڤێجــا هنــدەك ڕاڤەكــرن دەركەڤتــن گرنگــی ددا دیاركرنــا لایــێ زمانــی یــێ قورئانــا پــیرۆز، و هنــدەك ڕاڤەكرنــا گرنگــی ددا دیاركرنــا حوكمێــت فقهــی، و هندەكێــت دی گرنگــی ددا لایێــت مێژوویــی یــان عەقلــی یــان ڕەفتــاری و یێــت وەكــی وان، و ب ئاڤاكــرن ل ســەر ڤــێ چەنــدێ زانایــان تەفســیر بــۆ دو پشــكا لێكڤەكــر:

---

١- بەرێ خۆ بدە: تفسير الطبرى ٣٧/١، و مقدمة في أصول التفسير لابن تيمية ص: ٣٥.

**یـا ئێكـێ**: تەفسـیركرن ب وی تشـتێ هاتییـە ڤەگـێڕان، كـو ئـەو تشـتە یـێ هاتییـە ڤەگوهاسـتن ژ پێغەمبـەرێ خـودێ ( سـلاڤێت خـودێ ل سـەر بـن) و سـەحابییێت وی و تابعییـان.

**یـا دووێ**: ڕاڤەكـرن ب بۆچۆنـێ یـان ئجتیهـادا ئاڤاكـری ل سـەر شەنگسـتەییێت زانسـتی یێـت دورسـت.

## ٢) باشترین ڕێكێت تەفسیرێ و پێگركێت وێ:

ڕاڤەكـرن ب وی تشـتێ هاتییـە ڤەكـێڕان ئـەوە پێشـەنگ د ڕاڤەكرنـا قورئانـا پـیرۆزدا، چونكـی ژ پێغەمبـەری ( سـلاڤێت خـودێ ل سـەر بـن) یـان ژ سـەحابییێت وی ڤەگوهاسـتییە، و قوتابییێـت وان ژ تابعییـان، و ئـەو ڤـێ چەنـدێ ژ هەمیـان باشـتر دزانـن، بـەلێ ئەگـەر تێگەهشـتنا ئایەتێـت قورئانـا پـیرۆز پێدڤـی پـتر ڕۆنكرنـێ ببـن كـو د ڕاڤەكرنـێ ب وی تشـتێ هاتییـە ڤەگێڕانـدا نەبیـت.. پێدڤییـە ڕاڤەكـەر ڤـان پێگركێـت ل خـوارێ بەرچـاڤ وەربگریـت:

١- بەرچـاڤ وەرگرتنـا وی تشـتێ هاتییـە سـەلماندن د ڕاڤەكرنێـدا ب وی تشـتێ هاتییـە ڤەگـێڕان ژ دیاركرنـا ڕامانێـت ئایەتـان، و خۆدویرئێخسـتن ژ وی تشـتێ هەڤـدژ د گـەل.

٢- هەڤگونجینـا ڕاڤەكرنـێ بـۆ ڕامانێـت گشـتی یێـت قورئانـا پـیرۆز یـێ هاتـی و سـوننەتا پێغەمبـەری ( سـلاڤێت خـودێ ل سـەر بـن) ڕۆنكریـن، ڤـێ نابیـت ڕاڤەكـەر ڕاڤەكرنەكـێ ببینیـت هەڤـدژ بیـت د گـەل وان ڕامانـا، چونكـی قورئانـا پـیرۆز هنـدەك هندەكـێ ڕاڤـە دكـەت و د گـەل ئێـك هەڤـدژ نینـە، و سـوننەتا پێغەمبـەری یـا هاتـی وەك ڕۆنكـەر و ڕاڤەكـەر بـۆ وی تشـتێ ب تەڤگـری د قورئانـا پـیرۆزدا هاتـی.

٣- زانینا شەنگستە و بنەماییێت زمانێ عەرەبی د ڕامانا پەیڤان و د پێکهاتا ڕستەیان و ئالییێت کارئینانێدا، و قورئانا پیرۆز ب زمانێ عەرەبی هاتییە خوار، و دڤێت ل بەر ڕۆناهییا شەنگستە و بنەماییێت وێ تێ بگەهن.

٤- زڤڕاندنا ئایەتێت مەخسەد ڤەشارتی بۆ ئایەتێت ڕۆن و ئاشکەرا، چونکی قورئانا پیرۆز هندەك هندەکێ ڕاڤە دکەت، و ڕامانا پترییا ئایەتێت قورئانا پیرۆز یا ڕۆن و ئاشکەرایە، و ڕامانا هندەك ئایەتان ژی یا ڤەشارتییە و باش ڕۆن نینە و ڤێ دبیت هندەك ب دورستی تێ نەگەهن، و زڤڕاندنا وان بۆ وان ئایەتێت ڕامان ڕۆن و ئاشکەرا دێ بیتە هاریکار بۆ تێگەهشتنا وان و دیاربوونا ڕامانێت وان، خودایێ پاك و پاقژ گۆت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ [آل عمران: ٧].

٥- مفاوەرگرتن ژ ڕاستییێت زانستی یێت خۆجە و نەگوهۆڕ دەمێ ڕاڤەکرنا ئایەتێت گەردوونی، و خۆدویرئێخستن ژ کارئینانا بیردۆزێت زانستی د ڕاڤەکرنا قورئانا پیرۆزدا، دا قورئانا پیرۆزدا ب هندەك ڕامانێت نەهەین ب کۆتەکی ژێ نەئێنە زانین.

٦- خۆدویرئێخستن ژ ڕاڤەکرنێت خراب ئەڤێت ڕامانێت ئاخڤتنا خودایێ مەزن دویر دئێخن ژ ڕاستییێت شەریعەتێ پاك و پاقژ، و ژ شەنگستە و بنەماییێت زمانێ عەرەبی دەردئێخن، چ ب مەرەما لادانێ، یان ژی ژ نەزانینا زمانێ عەرەبی و ڕامانێت وی و ئالییێت کارئینانا وی، یان ژ ئەگەرێ هزرکرنا هندەك ڕامانێت خراب کو ئاخڤتنا خودێ یا پاك و پاقژە ژ وان هزرا.

## هەشت: ئیعجازا قورئانا پیرۆز:

ئیعجــاز د ئیدیەمیــدا: ســالۆخدانەکا مەزنــترە ژ شــیانا ئینانــا تشــتەکی ژ کاری یــان بۆچۆنــێ یــان رێڤەبرنــێ، و موعجیــزە ســالۆخەتدانا رویدانەکێیــە بــۆ دیارکرنــا هنــدەك نیشــان و گرۆڤەیێــت قاســد و پێغەمبــەران (سـلاڤ ل سـەر وان بـن) و ئـەڤ دەربڕینـە د قورئانـا پـیرۆزدا نەهاتییــە، بــەلێ نیشــان (آیــە) و گرۆڤــە (برهــان) و یێــت وەکــی وان هاتینــە.

و قورئانـــا پـــیرۆز ئاخڤتنـــا خودایـــێ مەزنـــە، و هنـــد تەمامـــی د رامانێــت وێــدا، و جوانــی د ئایــەت و پەیــڤ و (مبانی)یێــت وێــدا هەنــە، کــو ژ شــیانێت مرۆڤــا مەزنــترە و مــرۆڤ نەشــێت یێــت وەســا چێکــەن، خودایــێ مــەزن گــۆت: ﴿ الٓرۚ كِتَـٰبٌ أُحۡكِمَـتۡ ءَايَٰتُـهُۥ ثُـمَّ فُصِّلَـتۡ مِـن لَّدُنۡ حَكِيـمٍ خَبِـيرٍ ﴾ [هــود: ١].

و هەڤپشــکچێکەرا پێکــۆل کــر گۆمانــێ بێخنــە ژێــدەرێ قورئانــا پـــیرۆز و خەلکـــی ژێ دویـــر بێخـــن ب رێـــکا چێکرنـــا درەوا و ئازراندنـــا گۆمانـــا[1]، ڤێجـــا خودایـــێ پـــاك و پاقـــژ هنـــدەك ئایـــەت ئینانـــە خـــوار تێـــدا قەبـــێ وان خواســـت ئـــەو بشـــێت قورئانـــەکا وەکـــی قورئانـــا پـــیرۆز ضێ کـــەن، یـــان دەهـــ ســـۆرەتا ژ قورئانـــێ، یـــان ســـۆرەتەکێ ب تنـــێ، ئەگـــەر ئـــەو راســـت دبێـــژن[2]، بـــەلێ نەشـــیان وێ چەنـــدێ بکـــەن، و گەهشـــتنە وێ بـــاوەرێ کـــو هەرچەنـــدە قورئانـــا پـــیرۆز ب زمانـــێ عەرەبییـــە بـــەلێ ئـــەو نەشـــێن خـــۆ ل بەنـــدا وێ باڤێـــژن یـــان ئێـــکا وەکـــی وێ چێکـــەن، خودایـــێ مـــەزن گـــۆت: ﴿ أَمۡ يَقُولُـونَ ٱفۡتَرَىٰـهُۖ قُـلۡ فَأۡتُـواْ بِسُـورَةٖ مِّثۡلِـهِۦ وَٱدۡعُـواْ مَـنِ ٱسۡـتَطَعۡتُم مِّـن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُـمۡ صَٰدِقِـينَ ﴾ [یونــس: ٣٨].

---

١- بـــەرێ خـــۆ بـــدە ڤـــان ئایەتـــان: (الأنعـــام: ٧ و ٢٥)، و (الأنبيـــاء: ٥)، و (ســـبأ: ٤٣)، و (يـــسٓ: ٦٩) و (الصافـــات: ٣٦)، و (صٓ: ٤)، و (الطـــور: ٣٠).

٢- بـەرێ خـۆ بـدە ڤـان ئایەتـان: (البقـرة: ٢٣)، و (يونـس: ٣٨)، و (هـود: ١٣)، و(الطـور: ٣٤).

و قورئانـا پـیرۆز ب ڕەنگەكـێ ئاشـكرا و دەنگەكـێ بلنـد ڕاگەهانـد كـو مـرۆڤ هەمـی و ئەجنـە ژی بچنـە هـاری وان نەشـێن قورئانـەكا وەكـی قورئانـا پـیرۆز بینـن، خـۆ ئەگـەر هاریكارییـا ئێكـدو ژی بكـەن: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴾ [الإسراء: ٨٨].

و قورئانـا پـیرۆز موعجیزەیـە چونكـی ئاخڤتنـا خودێیـە و نەوەكـی ئاخڤتنـا چێكریانـە، و ئـەو نیشـان و گرۆڤەیـە ب پەیـڤ و ئایـەت و زمانـێ خۆڤـە و ئـەو ڕەنگێـت ڕەوانبێژییـێ یێـت تێـدا، و ئـەو دەنـگ و بـاس و چیرۆكێـت تێـدا، و ئـەو حوكـم و یاسـاییێت تێـدا، و هێـزا كارتێكرنـا دەروونـی و وژدانـێ، و ئـەو ڕاسـتییێت زانسـتێ یێـت جهـێ شـانازییێ یێـت تێـدا.

و چەنـد زانایێـت سروشـتی، و ستێرناسـییێ، و ئەوێـت كاری د بیاڤـێ زانسـتێ ژیانـێ و نوژداریـێ و یێـت وەكـی وانـدا دكـەن ماینـە حێبەتـی ژ بەحسـكرنا قورئانـا پـیرۆز بـۆ ڕاسـتییێت زانسـتی و ئاماژەیێـت گەردوونـی ئەوێـت پەیوەنـدی ب وان زانسـتانڤە هـەی یێـت ئـەو كار تێـدا دكـەن، ب دەربڕینـەكا زانسـتی یـا هویـر، كـو نائێتـە هزركـرن دەركەڤـن ژ پێغەمبەرەكـێ نەخواندەڤـان د نـاڤ ئوممەتـەكا نەخواندەڤانـدا، و د جیهانەكێـدا كـو چـو ژ وان دیاردەیـان نەدزانـی، و بـوو ئەگـەر كـو هژمـارەك ژ وان موسـلمان ببـن، چونكـی ئـەوان زانـی كـو ئـەو تشـتێ د قورئانـا پـیرۆزدا هاتـی چـێ نابیـت ئاخڤتنـا مرۆڤـان بیـت، بـەلێ ئـەو ئاخڤتنـا ئافرانـدەرێ گەردوونـی و مرۆڤانـە.

و چەنـد ئایـەت د قورئانـا پـیرۆزدا هەنـە بەلگـە و گرۆڤـن ل سـەر ئێكینییـا خودایـێ مـەزن و جوانـێ و داهێنانـا چێكرییێـت وی، خودایـێ مـەزن گـۆت: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ [فصلت: ٥٣].

## نەهـ: وەرگێڕانا رامانێت قورئانا پیرۆز:

وەرگـێڕان ڤەکوهاستنا زمانەکییە بـۆ زمانەکـێ دی[١]، و وەرگـێڕان یـا بـێ زەحمـەت نینـە، چونکـی دانەبەرێـکا زمانـی ئێکـە ژ پێکهاتێـت دەقـی، و دبیـت یـا ب زەحمـەت بیـت پاراسـتن ل سـەر رامانـا زمانـی بێتـە کـرن بـۆ وێ دانەبەرێکـێ دەمـێ دەق دئێتـە وەرگـێڕان بـۆ زمانەکـێ دی[٢].

ڤێجـا ئەگـەر ئەڤـە حـال و سـەروبەرێ وەرگێرانـێ بیـت د وان دەقانـدا یێـت مـرۆڤ ددەنـە بەرێـك، چـو پـێ نەڤێـت زەحمەتـا وەرگێرانـا قورئانـا پـیرۆز دێ گەلـەك پـتر بیـت، چونکـی ئـەو ئاخڤتنا خودێیـە یـا ب زمانـێ عەرەبـی ژ دەڤ خـودێ هاتییـە خـوار، و ئـەو ـ قورئـان ـ ب گۆتـن و رامانـا خۆڤـە ب رێـکا وەحییـێ یـا ژ دەڤ خودایـێ مەزنڤـە هاتـی، و بـۆ چـو کەسـان نینـە بێژیـت: ئـەز رامانـا قورئانـا پـیرۆز هەمییـێ دزانـم، ئـان ژی بێژیـت: ئـەز دشـێم پەیڤێـت وێ ب ئاوایەکـێ دی بدەمـە بەرێـك وەکـی دەقـێ وێ یـێ عەرەبـی.

و د گـەل زەحەمەتـا وەرگێرانـا قورئانـا پـیرۆز، زانایێـت موسـلمان دوپـات دکـەن کـو پێدڤییـە قورئانـا پـیرۆز و پەیامـا وێ بگەهیتـە هەمـی ئوممەتێـت ئـەردی ب چ زمـان باخڤـن، و ئـەڤ چەنـدە ب جهــ نائێـت ئیلـلا ب رێـکا وەرگێرانـێ[٣].

و وەرگێرانا قورئانا پیرۆز بۆ زمانێت دی دێ بیتە[٤]:

---

١- بەرێ خۆ بدە: لسان العرب لابن منظور (مادەترجم ورجم).

٢- بـەرێ خـۆ بـدە: دلالـة الألفـاظ لإبراهيـم قيـس ص: ١٧١ـ١٧٥، وفـن الترجمـة لمحمـد عـوض محمـد ص: ١٩.

٣- بەرێ خۆ بدە: ابن تيمية: مجموع الفتاوى ١١١/٤.

٤- بـەرێ خـۆ بـدە: مجمـوع الفتـاوى لابـن تيميـة: ١١٥/٤ و ٥٤٢، والتفسـير والمفسـرون، لمحمـد حسـين الذهـبي ٢٢/١.

١- ئـان وەرگێرانا ڕامانێـت قورئانـا پـیرۆزە، و ئـەو وەرگێرانـا بـێ تەفسـیرە،ویـاڤەبڕییـەلسـەردیارکرنـاگۆتنێـتدەقـێقورئانـی.

٢- ئـان ژی وەرگێرانـەکا تەفسـیرییە دئێتـە زەنگینکـرن ب شرۆڤەکـرن و ڕۆنکرنـێ، ئـەو وەکـی تەفسـیرا قورئانـا پـیرۆزە ب زمانەکـی نەیـێ عەرەبـی.

و هنـدی وەرگێرانـا ڕامانێـت قورئانـا پـیرۆز یـا هویـر و بنەجهـبیـت، و هنـدی وەرگـێری شـیانێت هـەردو زمانـان هەبـن، و شـارەزایی ب رامانێـت ئایەتـان هەبیـت، ئـەو وەرگـێران نائێتـە ناڤکـرن ب قورئـان، ژ بـەر دو ئەگـەران[1]:

**ئێـك**: قورئانـا پـیرۆز ئاخڤتنـا خودایـێ مەزنـە، یـا ب زمانـێ عەرەبـی هاتییـە خـوار، و ئـەو یـا ل گوپیتـکا ئەزمـان و ئاخڤتـن و ئەحکامـان، ڤێجـا دوبارەکرنـا ب بەرێکفەئینانـا ئایەتێـت وێ ب زمانەکـێ دی نەیـێ عەرەبـی وەناکـەت ب قورئـان بێتـە ناڤکـرن.

**دو**: وەرگـێران دەربڕینـێ ژ تێگەهشـتنا وەرگـێری دکـەت بـۆ رامانێـت قورئانـا پـیرۆز، و ئـەو ژ ڤـی ئالیڤـە وەکـی تەفسـیرێیە، و کا چـاوا نابێژنـە تەفسـیرێ قورئـان، هەروەسـا نابیـت بێژنـە وەرگێرانـێ ژی قورئـان.

و ژ بـۆ کـو وەرگێرانـا رامانێـت قورئانـا پـیرۆز بێتـە قەبویلکـرن پێدڤییـە ئـەوا زانایـان بـۆ دانایـی ژ پێگرکێـت دیارکرنـا رامانێـت قورئانـا پـیرۆز بێنـە ب جهئینـان، د گـەل هنـدێ ژی هشـیاری و ئاگەهـی هەبیـت نەکـو وەرگـێر پەردەیەکـێ بـۆ خـۆ ب کار بینیـت کـو رامانێـت قـاڕێ بـۆ قورئانـا پـیرۆز بینیـت. ئـان ژی کرێتـی و نەشرینـی بەرامبـەر ڕێ و

١- بەرێ خۆ بدە: المجموع شرح المهذب للنووي ٣٤٢/٣.

رەسمێت موسلمانان و پیرۆزییێت وان تێدا بیت. و ئەڤەیە گەلەك ژ وەرگێرانێت رۆژهەلاتناسان ئەوێت ژ بێبەختی و درەو خۆ ب موسلمان ددانن شێلی کرین، و وانا هندەك عەقیدە و بیروباوەرێت رزی و گەنی یێت ل دەف، پێکولێ دکەن بنەما و پڕبهاییێت دینێ ئیسلاما مەزن ژ بن ببەن، و عەقیدەیا راست و دورست و شریعەتێ وێ یێ ناڤنجی بریندار بکەن.

لەوا کورێ شاهـ فەهەد یێ چاپکرنا (مصحف)ا پیرۆز ل مەدینەیا پێغەمبەری وەشانا وەرگێرانێت بنەجهـ و موکوم یێت قورئانا پیرۆز ب ستۆیێ خۆڤە گرتییە، وەك خەمخوارن کو پەیاما قورئانا پیرۆز یا بلند و پڕ بها بگەهیتە وان یێت ب غەیری زمانێ عەرەبی دئاخڤن و ب زمانێت وان یێت رەسەن.

و سوپاس هەمی بۆ خودایێ گشت جیهانان، و سلاڤێت خودێ ل سەر پێغەمبەرێ مە موحەمەدی بن و ل سەر مال و سەحابیێت وی هەمیا بن، و تابعییان، و یێت ب قەنجی ب دوی کەڤتین هەتا رۆژا قیامەتێ.




## سۆرەتا فاتیحە

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٧) ئایەتە

﴿١﴾ بسم الله الرحمن الرحیم، ب ناڤێ خودایێ دلۆڤان
و پڕ دلۆڤان. ﴿٢﴾ سوپاس هەمی بۆ خودایێ گشت
جیهانان. ﴿٣﴾ [ئەو خودایێ] دلۆڤان و پڕ دلۆڤان.
﴿٤﴾ [ئەو خودایێ] خودانێ ڕۆژا جزادانێ. ﴿٥﴾
[خودێوۆ] تنێ ئەم تە دپەرێسین، و هاریكارییێ ژ تە
ب تنێ دخوازین. ﴿٦﴾ مە ڕاستەڕێ بكە. ﴿٧﴾ ڕێكا
وان كەسێت تە كەرەم [قەنجی] د گەل كرین، نە ڕێكا
وان كەسێت تە كەرب و غەزەب لێ كری، و نە ڕێكا
كەسێت ڕێ بەرزەكری.

---

❊ پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) گۆت: «ئەز ب وی كەمە یێ ڕوحا مە د دەستێ ویدا خودێ نە د تەوراتێدا و نە د ئنجیلێدا و نە د زەبوورێدا و نە د قورئانێدا وەكی سۆرەتا فاتیحێ نەئینایییە خوار».

❊ دیسا پێغەمبەر (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) د فەرموودەكا قودسیدا دبێژیت: «خودایێ مەزن دبێژیت: من نڤێژ د ناڤبەرا خۆ و بەندەیێ خۆدا ب نیڤی یێ ژێكڤەكری، و بەندەیێ من چ بخوازیت دێ دەمێ، ڤێجا ئەگەر بەندەی گۆت ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ خودێ دێ بێژیت: بەندەیێ من شوكور و سوپاسییا من كر، و ئەگەر گۆت ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ خودێ دێ بێژیت: بەندەیێ من پەسن و مەدحێت من كرن، و ئەگەر گۆت: ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ خودێ دێ بێژیت: بەندەیێ من ئەز مەزن و خودان دەستهەلات دانام. و ئەگەر گۆت: ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ خودێ دێ بێژیت: ئەڤە د ناڤبەرا من و بەندەیێ من دایە، و بەندەیێ من چ بخوازیت دێ دەمێ. و ئەگەر گۆت ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ، صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ خودێ دێ بێژیت: ئەڤە بۆ بەندەیێ منە، و كا بەندەیێ من چ بخوازیت ئەز دێ دەمێ.




## سۆرەتا بەقەرە

**ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٢٨٦) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ ب ڤی ڕەنگی دئێتە خواندن (ئەلف، لام، میم) و ئەڤە تەمامییا تیپێت عەرەبینە کو (٢٨) تیپن، نیشانن ل سەر ئیعجازا قورئانێ کو عەرەبان پێ چێ نابیت قورئانەکا وەکی ڤێ چێ بکەن، د گەل هندێ هەر ژ وان حەرفان پێك هاتییە ئەوێت ئەو ئاخڤتنا خۆ پێ چێ دکەن. ﴿٢﴾ ئەڤە ئەو قورئانە کو گۆمان تێدا نینە [ژ دەڤ خودێ هاتییە] و ڕێکا ڕاستەڕێکرنێیە بۆ پارێزکاران. ﴿٣﴾ [پارێزکار] ئەون ئەوێت باوەرییێ ب غەیبێ [تشتێ نەپەنی و نەدیار] دئینن، و بەردەوام نڤێژان دکەن، و ژ تشتێ مە داییێ سەدەقەیان ژێ ددەن. ﴿٤﴾ و ئەو ئەون یێت باوەرییێ ب وێ دئینن ئەوا بۆ تە و بۆ [پێغەمبەرێت] بەری تە هاتی و ژ ئاخرەتێ ژی بێ گۆمانن. ﴿٥﴾ ئەها ئەڤەنە ل سەر ڕاستەڕێکرنا خودایێ خۆ، و هەر ئەڤەنە د سەرفەراز.

---

❊ پێغەمبەر (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) دبێژیت: «مالێت خۆ نەکەنە گۆڕ، ب ڕاستی ئەو مالا سۆرەتا بەقەرە تێدا دهێتە خواندن شەیتان ناچیتە تێڤە».

❊ ئەبو هورەیرە دبێژیت: پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) شاندەکێ پێکهاتی ژ چەندەکان هنارت، ئینا پێغەمبەری پسیارا خواندنا وان کر کا هەر ئێکی چەند قورئان ژبەرە، هەر ئێکی گۆت کا چەند قورئان ژبەرە، هەتا گەهشتییە زەلامەکی ژ وان هەمییان بچویکتر گۆتێ: «فلان کەس تە چ قورئان ژبەرە؟»، ئینا گۆت: فلان سۆرەت و فلان سۆرەت و سۆرەتا بەقەرە ژی. ئینا پێغەمبەری گۆت: «تە سۆرەتا بەقەرە ژبەرە؟» گۆت: بەلێ.. ئینا پێغەمبەری گۆت: «هەرە تو میرێ وانی» ئینا زەلامەکی ژ ڕیسپییێت وان گۆت: ئەز ب خودێ کەمە چو تشتان ئەز ژ ژبەرکرنا سۆرەتا بەقەرە نەدامە پاش ترسا هندێ نەبیت ئەز نەشێم پێ ڕابم، ئینا پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) گۆت: «قورئانێ بزانن و بخوینن ب ڕاستی نموونەیا وی یێ دخوینیت و پێ ڕادبیت وەکی همبانکەکێیە یا تژی مسك و بێهن خۆشی بیت و بێهنا وێ بدەتە هەمی جهان، و نموونەیا وی یێ دزانیت و پێ نەڕابیت وەکی همبانکەکا تژی مسکە و یا گرێدایی بیت».

❊ دیسا پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) گۆت: «سۆرەتا بەقەرە بخوینن، خواندنا وێ بەرەکەتە و هێلانا وێ پەشێمانییە، و سێربەند نەشێنێ».

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ
لَا يُؤۡمِنُونَ ٦ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ
أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٧ وَمِنَ ٱلنَّاسِ
مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨
يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ
وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗاۖ
وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ١٠ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ
لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١ أَلَآ إِنَّهُمۡ
هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ ١٢ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ
ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُۗ
أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ ١٣ وَإِذَا لَقُواْ
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا
مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤ ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ
فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ١٥ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ
بِٱلۡهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ١٦



﴿٦﴾ ڕاستی ئەو کەسێت گاور بووین ل دەڤ وان
ئێکە، تو چ وان بترسینی چ نەترسینی، ئەو هەر
باوەرییێ نائینن. ﴿٧﴾ خودێ مۆرا ل سەر دل و
گوهێت وان دانایی و پەردە یا ئێخستییە بەر چاڤێت
وان، و ئیزایەکا مەزن بۆ وان یا هەی. ﴿٨﴾ و هندەك
هەنە ژ خەلکی دبێژن: مە باوەری ب خودێ و ڕۆژا
ئاخرەتێ [دویماهییێ] هەیە، بەلێ ب ڕاستی ئەو ب
خۆ بێ باوەرن. ﴿٩﴾ دڤێن خودێ و خودان باوەران
بخاپینن، و ژ خۆ پێڤەتر کەسێ ناخاپینن و پێ
نوزانن ژی. ﴿١٠﴾ د دلێ [دەروونێ] واندا نەساخی
هەیە، ڤێجا خودێ نەساخیا وان پتر لێ کر، و ژ بەر
درەوکرنا وان بەرهنگاری ئیزایەکا ب ئێش کرن.
﴿١١﴾ و هەر گاڤەکا ژ وانڕا بێتە گۆتن: خرابییێ د
ئەردیدا نەکەن، دبێژن: ئەم تنێ قەنجیکەر و باشی
خوازین. ﴿١٢﴾ بەلێ هەر ئەڤنە خرابییێ دکەن، بەلێ
ب خۆ ناحەسن. ﴿١٣﴾ و هەر گاڤەکا ژ وانڕا بێتە
گۆتن: دێ هوین ژی، وەکی خەلکێ دی باوەرییێ
بینن، دبێژن: ئەم ژی وەکی نەفامان باوەرییێ بینین؟!
[هشیاربن] هەر ئەون نەفام و پێ نوزانن ژی. ﴿١٤﴾ هەر دەمەکێ گەهشتنە کەسێت باوەری ئینایین دبێژنێ:
مە ژی باوەری ئینایییە، و هەر وەختەکێ د گەل هەڤالێت خۆ یێت شەیتان ڤەدەربوون [مانە ب تنێ] دبێژن:
ئەم هەر د گەل هەوەینە، ئەم بەس ترانەیان بۆ خۆ ب وان دکەین. ﴿١٥﴾ خودێ دێ جزایێ ترانەیێت وان
دەتێ، و مۆلەتا هندێ دەتێ هەر د خرابییا خۆدا بزڤرن. ﴿١٦﴾ ئەڤە ئەون یێت بەرزەبوون [تاریاتی] ب
ڕاستەڕێییێ کڕین، ڤێجا کڕین و فرۆتنا [بازرگانییا] وان فایدە [قازانج] نەکرییە و ئەو ب خۆ ژی ب سەر
ڕێیا ڕاست هلنەبووینە.

مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ
ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ ١٧ صُمُّۢ
بُكۡمٌ عُمۡيٞ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ١٨ أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ
ظُلُمَٰتٞ وَرَعۡدٞ وَبَرۡقٞ يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ
ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩ يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ
يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوۡاْ فِيهِ وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ
قَامُواْۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ
كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٠ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي
خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ٢١ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ
ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ
بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ
تَعۡلَمُونَ ٢٢ وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ
بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن
كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٢٣ فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ وَلَن تَفۡعَلُواْ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ
ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ٢٤



﴿١٧﴾ مەتەلا وان وەکی مەتەلا وی کەسییە ئەوێ ئاگرەك هەلکری [دۆرماندۆرێت خۆ ببینیت] گاڤا ئاگری ڕۆناهی داییێ، چار کنارێت وی خودایێ مەزن ڕۆناهییا وان بر و هێلانە د تارییەکێدا کو ئێدی ئەو نەبینن. ﴿١٨﴾ ئەڤە د کەڕن، لالن، کۆرەنە، ڤێجا ئەو بەر ب ڕێکا ڕاستڤە نازڤرنەڤە. ﴿١٩﴾ [یان مەتەلا وان وەکی مەتەلا ڤان کەسانە] بارانەکا ب ڕێژ و ڕەشەعەورەکێ تاری تێدا شریقە شریقا عەورانە و برسقین و ڤەدانا برویسییان، و ژ بەر برویسییان و ژ ترسا مرنێ تلێت خۆ بکەنە د گوهێت خۆدا [بەلێ دڤیا زانیبانە] خودێ ب سەر بێ باوەراندا [گاوران] سەردەستە و ژ وان ب ئاگەهە. ﴿٢٠﴾ نێزیکە [ڕۆناهیا] برویسییێ وان کۆرە بکەت، هەر گاڤەکا ڕۆناهی دا وان دچن، و گاڤا لێ بوو تاری ڕەق ڕادوەستن، و هەکە خودێ حەزکربایە، دا وان ژ گوە و چاڤان کەت. ب ڕاستی خودێ ل سەر هەمی تشتی خودان شیانە. ﴿٢١﴾ گەلی مرۆڤان، خودایێ خۆ بپەرێسن، ئەو خودایێ هوین و یێت بەری هەوە ئافراندین، دا هوین بێنە پارستن. ﴿٢٢﴾ ئەو خودایێ ئەرد بۆ هەوە دەشت کری [کو ب کێر ژیانێ بهێت] و ئەسمان کرییە ئاڤاهی، باران بۆ هەوە ژ ئەسمانی (ژ ئەوران) ئینایییە خوارێ، و هەمی ڕەنگێت فێقی [بۆ هەوە پێ شین کر] و دەرێخستن. ئێدی هوین ژی چو هەڤبەران بۆ خودێ [چێ نەکەن] و هوین ب خۆ دزانن [خودێ چو هەڤبەر نینن]. ﴿٢٣﴾ و ئەگەر هوین ژ وێ [نامەیا] مە بۆ بەندەیێ خۆ [کو پێغەمبەرە] ئینایییە خوار ب گۆمانن [کێم کێم] سۆرەتەکێ ب تنێ وەکی وێ بینن، و ژ بلی خودێ گازی هەمی هاریکارێت خۆ ژی بکەن [بلا بێنە هاری هەوە] ئەگەر هوین ڕاست دبێژن. ﴿٢٤﴾ ڤێجا ئەگەر هوین [ڤی کاری] نەکەن و هوین ناکەن ژی [چونکی هوین نەشێن] ئێدی خۆ ژ وی ئاگری بپارێزن ئەوێ داردوویێ وی، مرۆڤ و بەر، و بۆ گاوران هاتییە بەرهەڤکرن.

وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ
تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنۡهَا مِن ثَمَرَةٖ
رِّزۡقٗا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗاۖ
وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَهُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥﴾ ۞إِنَّ
ٱللَّهَ لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ أَن يَضۡرِبَ مَثَلٗا مَّا بَعُوضَةٗ فَمَا فَوۡقَهَاۚ فَأَمَّا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۖ وَأَمَّا
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۘ
يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرٗا وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرٗاۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ
إِلَّا ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ
مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ
فِي ٱلۡأَرۡضِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾ كَيۡفَ
تَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا فَأَحۡيَٰكُمۡۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ
ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢٨﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ
لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ
فَسَوَّىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٩﴾

ربع الحزب ١



﴿٢٥﴾ مزگینییێ بدە وان کەسێت باوەری ئینایین و کار و
کریارێت قەنج کرین کو بارا وان ئەو بەحەشتن ئەوێت
رویبار د بنڕا دهەرکن (دچن)، هەر گاڤەکا فێقییەك
ژێ ژێ دایێ، دێ بێژن: ئەڤە بوو بەری نوکە دابییە
مە، و ئەو فێقییێ بۆ وان دئێتە دان (بەردەست کرن)
وەکی ئێکە [بەلێ تام نەئێکە] و بۆ وان [د بەحەشتێدا]
هەڤسەرێت پاك و پاقژ هەنە و ئەو هەروهەر تێدانە.
﴿٢٦﴾ ب ڕاستی خودێ هەر مەتەلەکا بینیت شەرمێ
ژێ ناکەت، ڤێجا [ئەو مەتەل] پێشی بیت یان تشتەکێ
ماستر و پێهەلتر بیت، و ئەو کەسێت باوەری ئینایین
دزانن [ئینانا ڤان مەتەل و نموونەیان] ڕاستییە ژ
خودایێ وان، و هندی ئەون یێت گاوربوویین دبێژن:
خودێ چ ژ ڤان نموونەیان ڤیاییە؟ [خودێ] گەلەکان
پێ سەردا دبەت و گومڕا دکەت، و گەلەکان پێ
ڕاستەرێ دکەت و کەسێ پێ گومڕا ناکەت ئەگەر
ئەو ب خۆ ئەو نەبن یێت ژ ڕێ دەرکەڤتی. ﴿٢٧﴾ ئەو
ژ ڕێدەرکەڤتییێت پەیمانا خودێ پشتی موکومکرنێ
دشکێنن، و هەڤبەندییێت خودێ فەرمان پێ دایین
دبڕن، و خرابییێ د ئەردیدا دکەن، ئەها ئەڤەنە بەرزیان و خوسارەت. ﴿٢٨﴾ ڤێجا چاوا هوین باوەرییێ ب
خودایێ نائینن؟ و هوین د مری بوون، هوین زێندی کرن، پاشی دێ هەوە مرینیت، پاشی دێ هەوە زێندی
کەتەڤە، و پاشی دێ هەر بەر ب ویڤە زڤڕن. ﴿٢٩﴾ [ئەو خودایێ] هەمی تشت بۆ هەوە د ئەردیدا ئافراندی،
پاشی بەرێ خۆ دا ئەسمانی و کرنە حەفت ئەسمان، و هەر ئەوە ب هەمی تشتان زانا.

وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ قَالُوٓاْ
أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ
بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠ وَعَلَّمَ
ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ
أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣١ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ
لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٣٢ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ
أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل
لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ
وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ٣٣ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ
فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤ وَقُلۡنَا
يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا حَيۡثُ
شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٣٥ فَأَزَلَّهُمَا
ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ
لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ٣٦ فَتَلَقَّىٰٓ
ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ٣٧





﴿٣٠﴾ دەمێ خودایێ تە گۆتییە ملیاکەتان ئەز دێ جهگرەكێ [جهێ ئێك و دو بگرن] ب سەر ئەردی ئێخم، ملیاکەتان گۆت: ئەرێ تو دێ وی ئێخییە سەر ئەردی [دنیایێ] یێ خرابییێ تێدا بكەت، و خوینێ برێژیت، و ئەم ب حەمدا تە تەسبیح و تەقدیسا تە دكەین [ئانكو تە ژ هەر كێماسییەكێ پاك و پاقژ دكەین] [خودایی] گۆت: ڕاستییا ئەز دزانم هوین نوزانن. ﴿٣١﴾ [ڤێجا خودێ] هەمی ناڤ نیشا ئادەم دان، و پاشی [خودێ ئەو ناڤ] ئێخستنە بەرۆكا [بەر چاڤێت] ملیاکەتان، و گۆت: ئەگەر هوین ڕاست دبێژن، ناڤێ ڤان بۆ من بێژن. ﴿٣٢﴾ ملیاکەتان گۆت: هەر تویی ژ هەمی كێماسییان پاك و پاقژ، مە ژ وێ زانینێ پێڤەتر نینە یا تە نیشا مە دایی، ب ڕاستی هەر تویی زانا و كار بنەجە. ﴿٣٣﴾ [خودێ گۆت]: هەی ئادەم: كا ناڤێت وان بۆ وان بێژە [دا بزانن كێم زانینن]، دەمێ ئادەم ناڤێت وان گۆتین [ئینا] خودێ گۆت: ما من نەگۆتە هەوە ئەز نەپەنییێت ئەرد و ئەسمانان دزانم، و هەروەسا ئەز ئاشكرا و نەئاشكرا یا هوین دكەن ژی ئەز دزانم. ﴿٣٤﴾ دەمێ من گۆتییە ملیاكەتان سوجدەیێ [سوجدەیا سلاڤ و ڕێزگرتنێ] بۆ ئادەم ببەن هەمییان سوجدە بر، ئبلیس تێ نەبیت، خۆ دا پاش و خۆ مەزن دیت [ب ڤێ چەندێ] بوو ئێك ژ گاوران. ﴿٣٥﴾ و مە گۆت: هەی ئادەم تو و كابانیا خۆ د بەحەشتێدا ئاكنجی ببن و ژ هەر جهێ هەوە بڤێت بێ منەت [بەرفرەه] ژێ بخۆن، بەلێ خۆ نێزیكی ڤێ دارێ نەكەن، هوین دێ ژ ستەمكاران ئێنە هەژمارتن. ﴿٣٦﴾ [بەلێ پاشی شەیتانی ئەو پێ هنگاڤتن [د بەر خەلەتیێ ڕا كرن] و دەرئێخستن [ژ بەحەشتێ] ژ وێ یا ئەو تێدا، مە ژی گۆتە وان: ژێ دەركەڤن هەرنە خوارێ، هندەك ژ هەوە ل هندەكان نەیار و دژمن، و هەتا دەمەكێ دیاركری [ل دەڤ خودێ] د ئەردیدا ئاكنجی ببن و مفایی ژێ وەرگرن. ﴿٣٧﴾ پاشی ئادەم چەند ئاخڤتنەك ژ خودایێ خۆ وەرگرتن [و بۆ خۆ پێ هێڤیا لێنەگرتنێ ژ خودایێ خۆ خواست] خودێ لێ خۆش بوو، و تۆبەیا وی قەبویل كر، ب ڕاستی خودێیە تۆبەوەرگر و دلۆڤان.

قُلْنَا ٱهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعًاۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ
هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ٣٨ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٣٩
يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِيٓ
أُوفِ بِعَهْدِكُمْ وَإِيَّٰيَ فَٱرْهَبُونِ ٤٠ وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلْتُ مُصَدِّقًا
لِّمَا مَعَكُمْ وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۭ بِهِۦۖ وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي
ثَمَنًا قَلِيلًا وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ ٤١ وَلَا تَلْبِسُواْ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُواْ
ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ٤٢ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ
نصف الحزب ١ وَٱرْكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ٤٣ ۞ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ
وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ٤٤
وَٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ٤٥
ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ٤٦
يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ
عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ٤٧ وَٱتَّقُواْ يَوْمًا لَّا تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٖ شَيْـٔٗا
وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٞ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ٤٨



﴿٣٨﴾ مە گۆتە [وان] هوین هەمی ژ بەحەشتێ
داکەڤن [بۆ سەر ئەردی]، هەر گاڤەکا ڕاستەرێکرنەك
ژ بەرێ منڤە بۆ هەوە هات [کو کتێبا خودێیە یان
هنارتنا پێغەمبەرییە]، ڤێجا هەر کەسێ ب دویڤ
ڕاستەرێکرنا من بکەڤیت [ڕۆژا قیامەتێ]، نە ترس
بۆ هەیە و نە خەم دگەهیتێ. ﴿٣٩﴾ بەلێ ئەو کەسێت
گاور بوویین و ئایەتێت مە درەو دەرئێخستین ئەو
دۆژەهینە [جەهنەمینە] و هەروهەر دێ د دۆژەهێدا بن.
﴿٤٠﴾ [گەلی ئسرائیلییان] ئەو قەنجییێت من د گەل
هەوە کرین بینن بیرا خۆ، و پەیمانا هەوە د گەل من
دایی ب جهـ بکەن، ئەز ژی دێ ئەوێ پەیمانا هەوە
ب جهـ ئینم، و ب تنێ ژ من بترسن (ژ من ب تنێ
بترسن). ﴿٤١﴾ و باوەرییێ ب وێ کتێبا مە ئینایییە
خوارێ [کو قورئانە] بینن، کو ڕاستیا وان کتێبانە
یێت بەر دەستێ هەوە [کو ئنجیل و تەوراتن]، و نە
گاورێت پێشییێ بن [ب ڤێ قورئانێ]، و ئایەتێت من
ئەرزان نەفرۆشن، و پارێزکارییا من ب تنێ بکەن.
﴿٤٢﴾ و هەقییێ [کو قورئانا هنارتییە] تێکەلی نەهەقییێ
نەکەن [و ڕابەن] هەقییێ ڤەشێرن، و هوین ژێ ب ئاگەهـ [و هوین دزانن کو هوین تێکەلییێ دکەن].
﴿٤٣﴾ نڤێژان بکەن و زەکاتا مالێ خۆ بدەن [وەکی موسلمانان] و د گەل داچەمیایان [ڕاکعان] داچەمن
[فەرمانا وان ب شەنگستێت ئیسلامێ هاتەکرن، و د گەل موسلمانان نڤێژان ب کۆم (ب جەماعەت) بکەن،
و وەکی وان بچنە ڕکووعێ، چونکی داچەمیان د نڤێژا واندا نینە]. ﴿٤٤﴾ هوین چاوا فەرمانا خەلکی ب
خێرێ [باشییێ] دکەن، و هوین خۆ ب خۆ [خۆ] ژ بیر دکەن، و هوین خۆ ب خۆ کتێبێت بەر دەستێ خۆ
[کو ئنجیل و تەوراتن] دخوینن، ڤێجا ما هوین ئاقلەکی بۆ خۆ ناگرن. ﴿٤٥﴾ و پشتا خۆ ب بێنفرەهییێ و
نڤێژێ گرێ بدەن [قاهیم بکەن]، و ئەڤە یا گرانە ل سەر هەر کەسەکی، ئەو نەبن یێت ژ خودێ ترس.
﴿٤٦﴾ ئەو [خودێ ترس] ئەون یێت بێ گۆمان ژ هندێ کو دێ هەر بەردەستێ خودایێ خۆ ڕاوەستن، و
هەر دێ ب بال ویڤە زڤڕن. ﴿٤٧﴾ گەلی ئسرائیلییان بیرا خۆ و وان خێر و خۆشییێت من د گەل هەوە کرین
بینن، [ب ڕاستی و هنگی] من قەدرێ هەوە ب سەر یێ هەمی خەلکی ئێخست. ﴿٤٨﴾ و ژ ڕۆژەکێ [ڕۆژا
قیامەتێیە] بترسن و خۆ بپارێزن، کو کەس تێدا شوینا کەسێ نەئێتە سزاکرن، و مەهدەر و بەرەڤانی تێدا چو
ناگرن، و بەدەل ژ کەسێ نائێتە وەرگرتن، و هاریکارییا کەسێ ژی نائێتەکرن.

وَإِذۡ نَجَّيۡنَٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ
يُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ
مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ﴿٤٩﴾ وَإِذۡ فَرَقۡنَا بِكُمُ ٱلۡبَحۡرَ فَأَنجَيۡنَٰكُمۡ
وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾ وَإِذۡ وَٰعَدۡنَا مُوسَىٰٓ
أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗ ثُمَّ ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿٥١﴾
ثُمَّ عَفَوۡنَا عَنكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٥٢﴾
وَإِذۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡفُرۡقَانَ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿٥٣﴾
وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِنَّكُمۡ ظَلَمۡتُمۡ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ
ٱلۡعِجۡلَ فَتُوبُوٓاْ إِلَىٰ بَارِئِكُمۡ فَٱقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ ذَٰلِكُمۡ
خَيۡرٞ لَّكُمۡ عِندَ بَارِئِكُمۡ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ
ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾ وَإِذۡ قُلۡتُمۡ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ
جَهۡرَةٗ فَأَخَذَتۡكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثۡنَٰكُم
مِّنۢ بَعۡدِ مَوۡتِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٥٦﴾ وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ
ٱلۡغَمَامَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ
مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿٥٧﴾



﴿٤٩﴾ بیننە بیرا خۆ رۆژا مە هوین ژ دەستێت
فیرعەونییان قورتال کرین، کو [وان] ئیزا و نەخۆشییەکا
پیس ددا بەر هەوە، کورێت هەوە سەرژێ دکرن، و
کچێت هەوە [بۆ خدامینییا خۆ] دهێلان، و ب ڕاستی
[ئیزا و نەخۆشییا هەوە ددیت، و رزگارکرنا خودێ
بۆ هەوە] ئەزموونەکا [ئمتیحانەکا] مەزنە ژ خودێ.
﴿٥٠﴾ [هەروەسا] بیرا خۆ بینن دەمێ مە دەریا بۆ هەوە
کرییە دو فلق [و ڕێك بۆ هەوە ئێخستییێ]، و مە هوین
دەربازکرین [قورتالکرین]، و ل پێش چاڤێت هەوە مە
فیرعەونی خەندقاندین. ﴿٥١﴾ و بیرا خۆ بینن دەمێ
مە ژڤان ب چل شەڤان دایییە مووسایی، [و د پشترا
هەوە لەزکر]، و پشتی هنگی هەوە گۆلك پەراست
[کرە پەرستی]، و ب ڤی ڕەنگی هەوە ستەم ل خۆ
کر. ﴿٥٢﴾ (دگەل هندێ ژی) پاشی مە ل هەوە نەگرت
وەکی ئەڤە دیتر، [بیرا خۆ بینن] دا هوین د سوپاسدار
بن. ﴿٥٣﴾ هەروەسا بیرا خۆ بینن دەمێ مە تەوراتا
ڤاڤێرکەر [جوداکەر] [د ناڤبەرا هەقییێ و نەهەقییێدا]
بۆ مووسایی هنارتی، دا هوین [پێ] ڕاستەرێ ببن.
﴿٥٤﴾ بیننە بیرا خۆ دەمێ مووسایی گۆتییە ملەتێ خۆ: ملەتێ من! هەوە [ب پەرستنا گۆلکی] ستەم ل خۆ
کر، ڤێجا دڤێت هوین تۆبە بکەن و ل خودێ بزڤرنەڤە، و خۆ بکوژن، ئەڤە ل دەڤ خودایێ هەوە بۆ هەوە
چێترە [پشتی دەست ب کوشتنێ کرین] تۆبەیا هەوە وەرگرت، و ب ڕاستی هەر ئەوە تۆبەوەرگر و دلۆڤان.
﴿٥٥﴾ و بیرا خۆ بینن دەمێ هەوە گۆتییە مووسایی: هەتا ئەم ب چاڤێت خۆ خودایێ تە نەبینین، ئەم [د بنیڕا]
باوەرییێ ب تە نائینین، ژ بەر هندێ برویسییێ هوین هنگاڤتن، و هەوە ب چاڤێت خۆ دیت. ﴿٥٦﴾ پاشی
مە هوین پشتی مرنا هەوە زێندی کرن [ساخ کرن]، بەلکی هوین سوپاسییا [خێر و خۆشی و کەرەمێت]
خودێ بکەن. ﴿٥٧﴾ مە عەور ل هنداڤی هەوە کرنە سهوانە [کو سهێ ل هەوە بکەن] و گەزۆ و سەلوا
(سویسك) مە بۆ هەوە هنارتن، ڤێجا ژ حەلالێ پاك و پاقژێ مە ب رزقێ هەوە کری، بخۆن. و ئەوان [ب
کار و کریارێت خۆ یێت نە د ڕێدا و نەدورست] زیان نەگەهاندییە مە، بەلکی هەر زیان ل خۆ کرینە.

وَإِذۡ قُلۡنَا ٱدۡخُلُواْ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةَ فَكُلُواْ مِنۡهَا حَيۡثُ شِئۡتُمۡ
رَغَدٗا وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا وَقُولُواْ حِطَّةٞ نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ
خَطَٰيَٰكُمۡۚ وَسَنَزِيدُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٥٨ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ
ظَلَمُواْ قَوۡلًا غَيۡرَ ٱلَّذِي قِيلَ لَهُمۡ فَأَنزَلۡنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ
رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ٥٩ ۞وَإِذِ ٱسۡتَسۡقَىٰ
مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ فَقُلۡنَا ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡحَجَرَۖ فَٱنفَجَرَتۡ
مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗاۖ قَدۡ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٖ مَّشۡرَبَهُمۡۖ كُلُواْ
وَٱشۡرَبُواْ مِن رِّزۡقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ٦٠
وَإِذۡ قُلۡتُمۡ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصۡبِرَ عَلَىٰ طَعَامٖ وَٰحِدٖ فَٱدۡعُ لَنَا
رَبَّكَ يُخۡرِجۡ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۢ بَقۡلِهَا وَقِثَّآئِهَا
وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَاۖ قَالَ أَتَسۡتَبۡدِلُونَ ٱلَّذِي هُوَ
أَدۡنَىٰ بِٱلَّذِي هُوَ خَيۡرٌۚ ٱهۡبِطُواْ مِصۡرٗا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلۡتُمۡۗ
وَضُرِبَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلۡمَسۡكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٖ مِّنَ
ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ
ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ٦١

ثلاثة أرباع الحزب ١





﴿٥٨﴾ [گەلی ئسرائیلییان] بیننە بیرا خۆ وەختێ
مە گۆتییە هەوە، هەڕنە د ڤی گوندێ [مەقدس]
دا و ب بەرفرەهی و ل جهێ هەوە بڤێت ژێ بخۆن،
و چەماندی [خۆشكاندی بۆ خودایێ هوین ژ
بەرزەبوونێ ڕزگار كرین] بدەنە ژۆر، و بێژن: خودێوۆ
گونەهێت مە داقوتە، دا ئەم ژی ل گونەهێت هەوە
ببۆرین و نەهێلین، خێرا قەنجیكاران ئەم دێ پتر لێ
كەین. ﴿٥٩﴾ بەلێ ئەوێت ستەم و زۆرداری كرین،
ئەو فەرمانا خودێ لێ كری [كو بێژن گونەهێت
مە داقوتە] ب تشتەكێ دی یێ ژێ نەهاتییە خواستن
گوهارت، [ڤێجا ژ بەر هندێ] و ژ بەر نەگوهداری و
ژ ڕێدەركەڤتنا وان، مە ئیزایەك ژ ئەسمانی ب سەر واندا
باراند ئەوێت ستەم كرین. ﴿٦٠﴾ بیننە بیرا خۆ دەمێ
مووسایی داخوازا ئاڤێ [بۆ هەوە] كری [پشتی هوین
تێنی بووین]، ئینا مە گۆتێ: دارێ خۆ ل كەڤری بدە
[هەر كەڤرەكێ هەبیت]، [پشتی مووسایی دارێ خۆ ل
كەڤری دایی، دوازدە كانی ژێ زان [تەمەتی هەژمارا
ئویجاخێت وان]، و هەر ئێكی كانیا خۆ زانی [نیاسی]
[و مە گۆت]، ژ ڕزقێ خودێ بخۆن و ڤەخۆن، و د ئەردیدا بەر ب خرابییڤە نەچن [و نەبنە ژ خرابان].
﴿٦١﴾ و بیننە بیرا خۆ دەمێ هەوە گۆتییە [پێغەمبەرێ خۆ]: هەی مووسا ئەم نەشێین بێنا خۆ ل سەر ئێك
ڕەنگێ خوارنێ فرەهـ بكەین، بۆ مە داخوازێ ژ خودایێ خۆ بكە، كا چ ژ ئەردی دەردكەڤیت: ژ زەرزەوات
و خیار و سیر و نیسك و پیڤازان، بۆ مە شین بكەت، [مووسایی] گۆت: ئەرێ [هەوە دڤێت] یێ باش
[ژ خوارنێ] ب یێ بێخێر بگوهۆڕن. هەڕنە باژێری [هەر باژێرەكێ هەبیت] یێ هەوە خواستی دێ بۆ هەوە
ئێتە جهـ، خودێ ڕسوایی و بێ ڕویمەتی ب سەر واندا داڕێتییە، ب كەربا خودێڤە ڤەگەڕیان، ئەڤە هەمی ژ
بەر هندێ چونكی وان باوەری ب ئایەتێت خودێ نەدئینان، و ب بێ بەختی و نەهەقی پێغەمبەرێت خودێ
دكوشتن، هەر ژ نەگوهداری و زێدەگاڤیا وان.

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنۡ
ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ
رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾ وَإِذۡ أَخَذۡنَا
مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم
بِقُوَّةٖ وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيۡتُم
مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۖ فَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ
ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعۡتَدَوۡاْ مِنكُمۡ فِي ٱلسَّبۡتِ
فَقُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلۡنَٰهَا نَكَٰلٗا لِّمَا
بَيۡنَ يَدَيۡهَا وَمَا خَلۡفَهَا وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾ وَإِذۡ قَالَ
مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تَذۡبَحُواْ بَقَرَةٗۖ قَالُوٓاْ
أَتَتَّخِذُنَا هُزُوٗاۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾
قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا
بَقَرَةٞ لَّا فَارِضٞ وَلَا بِكۡرٌ عَوَانُۢ بَيۡنَ ذَٰلِكَۖ فَٱفۡعَلُواْ مَا
تُؤۡمَرُونَ ﴿٦٨﴾ قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوۡنُهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ
يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ صَفۡرَآءُ فَاقِعٞ لَّوۡنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾





﴿٦٢﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ئینایی [کو موسلمانن پەیکەڤتییێت پێغەمبەری] و ئەوێت بووینە جوهی [پەیکەڤتییێت مووسایی] و فەلەیان [پەیکەڤتییێت عیسایی] و سابئییان [جوینەکە ژ جوهی و فەلەیان ڤەبووینە ستێران دپەرێسن، و هندەك دبێژن: ملیاکەتان دپەرێسن]. هەر کەسێ ژ ڤان ب دورستی باوەرییێ ب خودێ و ڕۆژا قیامەتێ بینیت، و کار و کریارێت چاك بکەت، دێ ژ بەرێ خودێ خۆڤە ئێتە خەلاتکرن [ڕۆژا قیامەتێ] نە ترس بۆ هەیە، نە ژی ب خەم دکەڤیت. ﴿٦٣﴾ و بیننە بیرا خۆ دەمێ مە پەیمانا موکومکرنێ ژ هەوە وەرگرتی [کو هوین ل سەر تەوراتێ بچن و کار پێ بکەن]، و مە چیایێ (طوور) ل هنداڤ هەوە بلندکر، و مە [گۆتە هەوە] ئەڤا مە بۆ هەوە هنارتی ب مجداهی وەربگرن و لێ د ڕژد بن، و بیننە بیرا خۆ کا چ تێدایە و خۆ ژ بیرڤە نەکەن، دا بێنە پارستن ژ ئیزایێ. ﴿٦٤﴾ بەلێ پشتی ڤێ [دان و وەرگرتنا پەیمانا موکومکری] هەوە پشتا خۆ دا پەیمانێ، و ئەگەر نە ژ کەرەم و دلۆڤانییا خودێ بایە، هوین دا ڕاست ژ خوسارەت و بەرزیانان بن. ﴿٦٥﴾ بێ گۆمان هوین دزانن کا مە چ ب سەرێ وان ئینا [ئەوێت دایینە سەر بڕیارا خودێ]، و ڕۆژا شەنبییێ دەست درێژی کرین، مە گۆتە وان ببنە مەیموینکێت ڕسوا و ڕەزیل. ﴿٦٦﴾ و ئەڤ سزایە مە کرە پاشڤەبرنەك بۆ خەلکێ هنگی و بۆ یێت پشتی وان ژی، و مە کرە چامە بۆ پارێزکاران. ﴿٦٧﴾ بۆ ملەتێ خۆ بێژە دەمێ مووسایی گۆتییە ملەتێ خۆ: [ب ڕاستی] خودێ فەرمانا هەوە دکەت هوین چێلەکێ سەرژێکەن، گۆتن: تو بۆ خۆ ترانەیان ب مە دکەی؟! [مووسایی] گۆت: ئەز خۆ ب خودێ دپارێزم کو ئەز ژ نەزانان بم. ﴿٦٨﴾ گۆتن: کا ژ خودایێ خۆ بخوازە بۆ مە دیار بکەت، کا ئەو چ چێلە؟ [مووسایی گۆت: خودێ] دبێژیت: نەیا پیرە و نەیا جوانە ژی [بچویك] د ناڤبەرا هەردویاندایە، ئێدی وێ بکەن یا فەرمانا هەوە پێ هاتییە کرن. ﴿٦٩﴾ گۆتن: کا بێژە خودایێ خۆ بلا بۆ مە دیار بکەت، ڕەنگێ وێ [چێلێ] یێ چاوایە؟ [مووسایی گۆت خودێ] دبێژیت: ئەو چێلە [ڕەنگێ وێ] زەرەکێ تارییە یێت بەر لێ [ب دیتنا وێ] کەیف خۆش دبن.

قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ ٱلۡبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيۡنَا وَإِنَّآ
إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهۡتَدُونَ ٧٠ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا ذَلُولٞ
تُثِيرُ ٱلۡأَرۡضَ وَلَا تَسۡقِي ٱلۡحَرۡثَ مُسَلَّمَةٞ لَّا شِيَةَ فِيهَاۚ قَالُواْ
ٱلۡـَٰٔنَ جِئۡتَ بِٱلۡحَقِّۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفۡعَلُونَ ٧١ وَإِذۡ
قَتَلۡتُمۡ نَفۡسٗا فَٱدَّٰرَٰٔتُمۡ فِيهَاۖ وَٱللَّهُ مُخۡرِجٞ مَّا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ٧٢
فَقُلۡنَا ٱضۡرِبُوهُ بِبَعۡضِهَاۚ كَذَٰلِكَ يُحۡيِ ٱللَّهُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَيُرِيكُمۡ
ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ٧٣ ثُمَّ قَسَتۡ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ
فَهِيَ كَٱلۡحِجَارَةِ أَوۡ أَشَدُّ قَسۡوَةٗۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلۡحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ
مِنۡهُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخۡرُجُ مِنۡهُ ٱلۡمَآءُۚ وَإِنَّ
مِنۡهَا لَمَا يَهۡبِطُ مِنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ٧٤
الحزب ٢ ۞ أَفَتَطۡمَعُونَ أَن يُؤۡمِنُواْ لَكُمۡ وَقَدۡ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ
يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعۡدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمۡ
يَعۡلَمُونَ ٧٥ وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا
خَلَا بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ قَالُوٓاْ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ
عَلَيۡكُمۡ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمۡۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ٧٦





﴿٧٠﴾ گۆتن: كا ژ خودایێ خۆ بخوازە بۆ مە دیار
بكەت ئەو چ چێلە؟ [چێل ب ڤان سالۆخەتان
گەلەكن] ل بەر مە بەرزەبوو، ئەگەر خودێ حەز
بكەت ئەم دێ ب سەر هەلبین. ﴿٧١﴾ [مووسایی
گۆت] خودێ دبێژیت: ئەو چێلە نەیا سەرنەرمە
ئەردی بكێلیت، و نە ژی چاندنییێ ئاڤ ددەت، و یا
بێ كێماسییە و ئێك ڕەنگە ژی، گۆتن: ئەها ژ نوی تە
ڕاستی بۆ مە گۆت. [پشتی ب دەست خۆ ئێخستین]
سەرژێكرن و هند نەمابوو وەنەكەن. ﴿٧٢﴾ بیننە بیرا
خۆ [گەلی ئسرائیلییان] دەمێ هەوە مرۆڤەك كوشتی
و ل سەر كوشتنا وی، هەوە جڕەبڕ كری و هەر ئێك
ژ هەوە كوشتنا وی دكرە د ستوییێ یێ دیدا، و خودێ
دێ ئاشكەراكەت، یێ هوین ڤەدشێرن!!!. ﴿٧٣﴾ مە
گۆت: كا هندەك گۆشتێ چێلێ [چێلا سەرژێكری]
و گۆشتێ وی لێك بدەن [دێ ساخ بیت و بۆ هەوە
بێژیت: كا كێ كوشتیە]، ئەها هۆسا و ب ڤی ڕەنگی
خودێ مرییان زێندی دكەتەڤە، و نیشانێت [شیانا
خۆ] بەرچاڤ دكەت، بەلكی هوین عەقلەكی بۆ
خۆ بگرن. ﴿٧٤﴾ پشتی ڤێ [هەمییێ] دلێت هەوە ڕەق بوون، وەكی كەڤران لێ هاتن، بێژە ڕەقتر ژی،
چونكی ب ڕاستی هندەك كەڤر یێت هەین ڕویبار ژێ دەردكەڤن و هندەك یێت هەین ددەرزن ئاڤ ژێ
دزێت، و هندەك ژی یێت هەین ژ ترسا خودێ دادكەڤن، و خودێ ژ وی تشتێ هوین دكەن نەیێ بێ ئاگەهە.
﴿٧٥﴾ [گەلی موسلمانان] هەوە چاڤە [ملەتەكێ هۆسا] باوەرییێ ب هەوە بینن [موسلمان ببن] و دەستەكەك
ژ وان هەبوون گوهدارییا ئاخڤتنا خودێ دكرن، و پشتی تێ دگەهشتن ڤاڕێ دكرن و پێ ژی دزانین كو یێ
ڤێ دكەن. ﴿٧٦﴾ و ئەگەر گەهشتنە خودان باوەران دێ بێژن: مە ژی باوەری ئینایە، و ئەگەر ب تنێ دگەهنە
ئێك و ڤێك دكەڤن، دبێژنە [ئێكدو] هوین چاوا سوحبەتا [پەسن و ڕەوشا پێغەمبەری ئەوا د تەوراتێدا هاتی]
د گەل وان دكەن، دا ل دەڤ خودایێ هەوە ل سەر هەوە بكەنە مهانە، ما هوین ئاقلەكێ ناگرن.

أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٧﴾
وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ
إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ
ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا
فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ ﴿٧٩﴾
وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً قُلْ
أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ أَمْ
تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً
وَأَحَٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ
فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا
مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ
إِحْسَانًا وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَقُولُوا۟
لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ
تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴿٨٣﴾



﴿٧٧﴾ ڤێجا ما نوزانن؟! چ یێ ڤەشێرن و چ یێ ئاشکەرا بکەن، خودێ پێ ئاگەهە؟!. ﴿٧٨﴾ هندەك ژ وان نەخواندەوارن، چو ژ کتێبێ [تەوراتێ] نوزانن هیڤی تێ نەبن [ئەو درەون یێت وان ژ پێشییێت خۆ وەرگرتین کو دبێژن: ژ چل ڕۆژان پێڤەتر ئەو نائێنە ئیزادان]، و وان ژ بلی هزر و تەخمینێ چو یێ دی [مەخسەد ڕاستی و بەلگەنە] نینە. ﴿٧٩﴾ وەی نەخۆشی و ئیزا بۆ وان بیت یێت کتێبێ ب دەستێت خۆ دنڤێسن، و پاشی دبێژن: ئەڤ [کتێبە] ژ دەڤ خودێیە، دا ئەرزان بفرۆشن، ئیزا و نەخۆشی بۆ وان بیت، ژ بەر تشتێ ب دەستێ وان هاتییە نڤێسین و ژ بەر تشتێ ب دەست خۆڤە ئینایین. ﴿٨٠﴾ و گۆتن هەما چەند ڕۆژەکان [ڕۆژێت تێدا گۆلك پەراستین] دێ ئاگر ب مە کەڤیت! بێژە وان: ئەرێ ما هەوە پەیمانەك ب ڤێ چەندێ ژ خودێ وەرگرتییە و خودێ ل پەیمانا خۆ لێڤە نابیت؟ [هوین هۆ د پشت ڕاست] یان ژی تشتێ هوین ژێ نە پێ ئاگەه د دەرهەقێ خودێدا دبێژن. ﴿٨١﴾ [نەخێر وەنینە] ب ڕاستی هەر کەسەکێ گونەهەکێ بکەت، و گونەها وی سەری ژێ بستینیت [لێ بێتە ئێك کو ژێ دەرنەکەڤیت] ئەڤە دۆژەهینە و هەروهەر دێ تێدا بن. ﴿٨٢﴾ بەلێ ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت قەنج کرین، ئەڤە بەحەشتینە و هەروهەر دێ تێدا بن. ﴿٨٣﴾ بۆ ملەتێ خۆ بێژە دەمێ مە پەیمانا موکوم ژ ئسرائیلییان وەرگرتی، کو ژ بلی خودێ چو نەپەرێسن و چاکییێ د دەرهەقێ دەیباب و کەس و کار و سێوی و بەلنگازاندا بکەن، و ئاخڤتنا خێرێ و شرین د گەل خەلکی بکەن، و بەردەوام نڤێژان بکەن و زەکاتێ بدەن، پاشی هەوە کێمەك تێ نەبن [پەیمانا خۆ شکاند] و پشتا خۆ دایێ و هوین هەر پەیمان شکێنن.

وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ لَا تَسۡفِكُونَ دِمَآءَكُمۡ وَلَا تُخۡرِجُونَ
أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ ثُمَّ أَقۡرَرۡتُمۡ وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ ٨٤
ثُمَّ أَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ تَقۡتُلُونَ أَنفُسَكُمۡ وَتُخۡرِجُونَ فَرِيقٗا
مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمۡ تَظَٰهَرُونَ عَلَيۡهِم بِٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ
وَإِن يَأۡتُوكُمۡ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمۡ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيۡكُمۡ
إِخۡرَاجُهُمۡۚ أَفَتُؤۡمِنُونَ بِبَعۡضِ ٱلۡكِتَٰبِ وَتَكۡفُرُونَ بِبَعۡضٖۚ
فَمَا جَزَآءُ مَن يَفۡعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ إِلَّا خِزۡيٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَاۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلۡعَذَابِۗ وَمَا ٱللَّهُ
بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ٨٥ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡحَيَوٰةَ
ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ٨٦
وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَقَفَّيۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ
بِٱلرُّسُلِۖ وَءَاتَيۡنَا عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدۡنَٰهُ بِرُوحِ
ٱلۡقُدُسِۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمۡ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهۡوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ
ٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ فَفَرِيقٗا كَذَّبۡتُمۡ وَفَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ ٨٧ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا
غُلۡفُۢۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَقَلِيلٗا مَّا يُؤۡمِنُونَ ٨٨



﴿٨٤﴾ بيننە بيرا خۆ [گەلی ئيسرائيلييان] دەمێ مە پەيمانا موكومكری ژ هەوە ستاندی، كو خوينا ئێكدو نەڕێژن و ئێكدو ژ سەر جهـ و وارێت خۆ ب خۆ دەرنەئێخن، هەوە ب خۆ ئەڤە پەسەندكر، و هوين ب خۆ شاهدن.
﴿٨٥﴾ پاشی ئەها هوين ئەڤەنە ئێكدودكوژن و دەستەكەكێ ژ خۆ ب خۆ ژ وارێ وان دەردئێخن و ب گونەهـ و دژمنايی لێ دادجڕن [كۆم دبن]. [پشتەڤانييا ئێكدو دكەن ل سەر دەرئێخستنا وان] و ئەگەر هندەك ژ وان ب ناڤێ دیلاتییێ هاتنە دەڤ هەوە، هوين بەدەلێ پێشڤە ددەن [كا چاوا حەرامە هندەك ژ هەوە بميننە د ئێخسیرییێدا و هوين بەدەلێ پێشڤە بدەن، ئەها وەسا حەرامە ژی هوين ئێكدو بكوژن يان ژ جهێت ئێكدو دەربێخن] و ل سەر هەوە يا حەرام بوو دەرئێخستنا وان. ڤێجا هوين باوەرییێ ب هندەك كتێبێ دئينن و باوەرییێ ب هندەكێ نائينن. هەر كەسەكێ ژ هەوە ڤێ چەندێ بكەت جزايێ وی د دنيايێدا ژ شەرمزاری و ڕسواييێ پێڤەتر نينە، و ڕۆژا ڕابوونێ [ڕۆژا قيامەتێ] ژی دێ بەرێ وی كەڤتە دژوارترين ئيزايێ، خودێ نەيێ بێ ئاگەهە ژ وێ يا هوين دكەن.
﴿٨٦﴾ [ب ڕاستی] ئەڤەنە يێت ژيانا دنيايێ ب ئاخرەتێ كڕين، و نە ئيزا ل سەر وان سڤك دبيت، و نە هاريكارييا وان دئێتەكرن.
﴿٨٧﴾ ب سويند كتێب [كو تەوراتە] مە بۆ مووسايی ئينا و مە پێغەمبەر د پشتڕا هنارتن، و مە موعجيزە و نيشانێت ئاشكەرا دانە عيسايی و مە پشتا وی ب جانێ پيرۆز [جبرائيلی] گرت و قاهيم كر. ئەرێ هەر جارەكا پێغەمبەرەك ب وێ بۆ هەوە هات يا نە ب دلێ هەوە هوين دێ ڕابن خۆ مەزن كەن و دەستەكەكێ درەوين دەرئێخن [وەكی عيسايی و موحەمەدی]، و دەستەكەكێ كوژن [وەكی زەكەريايی و يەحيايی]؟.
﴿٨٨﴾ دبێژن دلێت مە ب كاڤلانكن [د كاڤلانكاندانە [ژ بەر هندێ يا موحەمەد، دبێژن: ئەم تێ ناگەهين] [وەنينە وەكی ئەو دبێژن] بەلكی خودێ ژ بەر گاورييا وان ئەو يێت ژ دلۆڤانييا خۆ بێ بار كرين، و كێمەك ژ وان [نە گەلەك] باوەرییێ دئينن.

وَلَمَّا جَآءَهُمۡ كِتَٰبٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٞ لِّمَا مَعَهُمۡ
وَكَانُواْ مِن قَبۡلُ يَسۡتَفۡتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا
جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦۚ فَلَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٨٩
بِئۡسَمَا ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ أَن يَكۡفُرُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ
بَغۡيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ
فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٖۚ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ ٩٠
وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ نُؤۡمِنُ بِمَآ أُنزِلَ
عَلَيۡنَا وَيَكۡفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا
مَعَهُمۡۗ قُلۡ فَلِمَ تَقۡتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبۡلُ إِن كُنتُم
مُّؤۡمِنِينَ ٩١ ۞وَلَقَدۡ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ثُمَّ
ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ٩٢ وَإِذۡ
أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ
مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱسۡمَعُواْۖ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا
وَأُشۡرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡعِجۡلَ بِكُفۡرِهِمۡۚ قُلۡ بِئۡسَمَا
يَأۡمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٩٣

ربع الحزب





﴿٨٩﴾ و دەمێ کتێب بۆ وان ژ دەڤ خودێ هاتی [کو قورئانە] ڕاستدەرئێخا وان [کتێبانە] یێت د گەل وان و بەری هنگی [بەری هاتنا قورئانێ] داخوازا سەرکەڤتنێ پێ [ژ خودێ] دخواستن ل سەر [نەیارێت خۆ] یێت گاور، بەلێ دەمێ ئەو کتێبا وان ژێ دگۆت و دنیاسی بۆ وان هاتی، باوەری پێ نەئینان و گاوربوون و لەعنەتا خودێ ل گاوران بیت. ﴿٩٠﴾ پیسە فرۆتنە وان خۆ پێ فرۆتی، و ژ زکڕەشی گاوربووین ب وێ کتێبا مە ئینایییە خوارێ، کو خودێ ژ کەرەما خۆ ل سەر هەر بەندەیەکێ بڤێت [وێ کتێبێ بینیتە خوارێ]، ڤێجا هێژایی غەزەبەك ل سەر غەزەبەکێ ڤەگەڕیان [ژ بەر گاورییا وان ب (عیسایی و موحەمەدی)]، و ئیزایەکا هەتکبەر بۆ گاوران هەیە. ﴿٩١﴾ و هەر دەمەکێ بۆ وان بێتە گۆتن: باوەرییێ بینن ب ئەوا خودێ ئینایییە خواری [کو قورئانە] دبێژن: ئەم بەس باوەرییێ ب وێ دئینین ئەوا بۆ مە هاتییە هنارتن [کو تەوراتە] و باوەرییێ ب ئەوێت دیتر نائینین، و ئەو [ئانکو قورئان] ڕاستدەرئێخا وان کتێبانە یێت د گەل وان، بێژە [وان هەکە ڕاستە هوین باوەرییێ ب تەوراتێ دئینن] پا هەوە بۆچی پێغەمبەرێت خودێ بەری نوکە دکوشتن [وەکی یەحیایی و زەکەریایی]. ﴿٩٢﴾ بێ گۆمان مووسا بۆ هەوە [بەری نوکە] ب موعجیزە و نیشانێت ئاشکەرا هات، و پشتی هنگێ هەوە گۆلك پەراست [کرە پەرستی]، و ب ڤی ڕەنگی هەوە ستەم ل خۆ کر. ﴿٩٣﴾ بیننە بیرا خۆ دەمێ مە پەیمانا موکومکری ژ هەوە ستاندی [کو کار ب تەوراتێ بکەن]، و مە چیایێ (طوور) ل هنداڤا هەوە بلندکر [و مە گۆتە هەوە] ئەڤا مە بۆ هەوە هنارتی لێ د مجد بن و گوهداریيا وێ بکەن، گۆتن: مە [ئاخڤتنا تە] بهیست بەلێ ئەم پێ [ب گۆتنا تە] ناکەین، و ڤیانا گۆلکی ژ بەر گاورییا وان تێکەلی دلێ وان بوویە، بێژە [وان]: پیسە تشتە باوەرییا هەوە، هەوە د بەرڕا دکەت [کو پەرستنا گۆلکییە] ئەگەر هوین خودان باوەرن.

قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن
دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَن
يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾
وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۚ
يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ
ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قُلْ مَن
كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ
ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾
مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ
وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ
إِلَيْكَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾
أَوَكُلَّمَا عَـٰهَدُوا۟ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُم ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ
لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ
لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ
كِتَـٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾



﴿٩٤﴾ بێژە [وان]: ئەگەر ئاخرەت [بەحەشت] ژ ڤی خەلکی هەمییێ، بەس بۆ هەوە ب تنێیە ل دەڤ خودێ، پا ئەگەر هوین ڕاست دبێژن داخوازا مرنێ بکەن. ﴿٩٥﴾ ب ڕاستی چوجا مرنێ ناخوازن، چونکی دزانن وان ب دەستێت خۆ چ گونەهـ کرینە، و خودێ ب ستەمکاران زانا و ئاگەهدارە. ﴿٩٦﴾ ڕاستی تو ب خۆ یێ وان دبینی ژ خەلکی هەمییێ پتر د ڕژدن ل سەر ژیانێ، خۆ ژ بوتپەرێسان ژی پتر، هەرەك ژ وان حەز دکەت هزار سالان بژیت و [ژی درێژی ژی] کەسێ ژ ئیزایێ دویر نائێخیت، و خودێ دبینیت کا ئەو چ دکەن. ﴿٩٧﴾ بێژە [وان]: هەر کەسێ دژمن بیت بۆ جبریلی [جبرائیلی]، [دڤێت بزانیت ئەوێ دژمنیا خودێ دکەت]، چونکی ب ڕاستی [جبرائیل] وی [ب دەستویرییا خودێ] ئەو [قورئان] ب سەر دلێ تەدا داڕێتییە، ڕاستدەرئێخا کتێبێت بەری خۆیە و ڕاستەڕێیی و مزگینییە بۆ خودان باوەران. ﴿٩٨﴾ و هەر کەسێ دژمنیا خودێ و ملیاکەتان و پێغەمبەرێت وی و جبرائیلی و میکائیلی بکەت [گاورە]، و ب دورستی خودێ دژمنێ گاورانە. ﴿٩٩﴾ ب ڕاستی مە نیشانێت ئاشکەراکەر بۆ تە هنارتینە، ژ بلی ژ ڕێدەرکەڤتییان کەسێ دیتر ژێ بێ باوەر و گاور نابیت [ئینکار ناکەت]. ﴿١٠٠﴾ ئەرێ هەر جارەکا [نیشانێت ئاشکەراکەر بۆ وان هاتن، باوەرییێ پێ نائینن و گاور دبن] پەیمانەك دان، دەستەکەك ژ وان ب پشت گوهێ خۆڤە دهاڤێژن و دشکێنن، بەلکی باراپتر ژ وان هەر باوەرییێ نائینن. ﴿١٠١﴾ و دەمێ پێغەمبەرەك ژ دەڤ خودێ بۆ وان هاتییە هنارتن، و کتێبێت وان ڕاست دەرئێخستین [کو ژ نك خودێنە]، دەستەکەك ژ وان یێت کتێب بۆ هاتی، کتێبا خودێ ب پشت گوهێ خۆڤە هاڤێتن، دێ بێژی چو ژێ نوزانن [کو ئەڤە ژ دەڤ خودێیە].

وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتۡلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَٰنَۖ وَمَا كَفَرَ
سُلَيۡمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ
ٱلسِّحۡرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلۡمَلَكَيۡنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ
وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنۡ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحۡنُ فِتۡنَةٞ فَلَا
تَكۡفُرۡۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنۡهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ
وَزَوۡجِهِۦۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنۡ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ
وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡۚ وَلَقَدۡ عَلِمُواْ لَمَنِ
ٱشۡتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖۚ وَلَبِئۡسَ مَا شَرَوۡاْ بِهِۦٓ
أَنفُسَهُمۡۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ
لَمَثُوبَةٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ خَيۡرٞۖ لَّوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿١٠٣﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرۡنَا
وَٱسۡمَعُواْۗ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٠٤﴾ مَّا يَوَدُّ
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَلَا ٱلۡمُشۡرِكِينَ
أَن يُنَزَّلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ خَيۡرٖ مِّن رَّبِّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَخۡتَصُّ
بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾





﴿١٠٢﴾ [ئسرائيلى] ب دويڤ خواندنا شەيتانى كەتن ئەوا ل سەر وەختێ سلێمان [پێغەمبەرى] ل سەر خەلكى دهاتە خواندن، سلێمان ب خۆ گاور نەبووبوو [و كەس فێرى سێربەندییێ نەكربوو] بەلێ شەیتان گاور بووبوون، و خەلك فێرى سێربەندییێ دكرن، و خودێ سێربەندى ب سەر دو ملياكەتاندا نەئینابیە خوار [بەلێ شەيتانان خەلك فێرى سێربەندییێ دكرن، ژ وان هارووت و مارووت كو ژ مرۆڤان دئێنە هەژمارتن] و ڤان هەردویان هارووت و مارووت ل بابل سێربەندى نیشا خەلكى ددان، و كەس فێر نەدكرن هەتا نەگۆتبانێ هندى ئەمين ئەم ئەزموون و جەربەینە، هشیاربە گاور نەبە، و وێ ژ وان فێر دبن يا پێ ژن و مێران ژێك دكەن، و نەشێن زیانێ بگەهینە كەسەكێ ئەگەر دەستويرا خودێ پێ نەهاتبیت [خودێ تەقدير نەكربيت] خۆ فێرى وێ دكەن يا زیانێ دگەهینیتە وان، نە مفایی [فایدەی]. و ڕاستى ئەوێ سێربەندى ب كتێبێت خودێ كرى زانى وى ل ئاخرەتێ چو بار و پشك نینن، چ پیسە تشتە یێ وان خۆ پێ فرۆتى، ئەگەر بزانن. ﴿١٠٣﴾ ئەگەر وان باوەرى ئینابايە و پارێزكارى كربايە [ژ ئيزا و ڕۆژا قيامەتێ ترسيابانە]، خەلاتێ خودێ بۆ وان چێتربوو ئەگەر زانیبانە. ﴿١٠٤﴾ گەلی خودان باوەران [دەمێ هەوە دڤێت د گەل پێغەمبەرى باخڤن و هەوە دڤێت بێژنێ خۆ ل مە بگرە، مۆلەتێ بدە مە] نەبێژنێ: [راعنا] [ژ بەر كو جوهى ڤێ پەيڤێ دبێژن و ڕامانەكا كرێت ددەنێ] بەلێ بێژن: [انظرنا] خۆ ل مە بگرە و مۆلەتێ بدە مە [ژ بەر كو ڤێ پەيڤێ ژ ڕامانەكێ پێڤەتر ژێ ناچيت و جوهى نەشێن ڕامانەكا دى بدەنێ] و گوهدارییێ بكەن، و بۆ گاوران ئيزايەكا دژوار هەيە. ﴿١٠٥﴾ ئەوێت گاوربووین ژ خودان كتێبان و بوتپەرێسان، نەڤێت و پێ خۆش نينە، خێر و كەرەمەك ژ نك خودایێ هەوە ب سەر هەوەدا بێت. و خودێ دلۆڤانییا خۆ ب سەر ویدا دادڕێژیت یێ وی دڤێت، و ب ڕاستى خودێ خودان كەرەمەكێ مەزنە.

نصف الحزب ٢

۞ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ
أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ
ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ
ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ
كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ
فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ
لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا
مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ فَٱعْفُوا۟
وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِيَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ
قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَمَا تُقَدِّمُوا۟
لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ
بَصِيرٌ ﴿١١٠﴾ وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا
أَوْ نَصَٰرَىٰ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ﴿١١١﴾ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ
أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾



﴿١٠٦﴾ حوكمێ هەر ئایەتەكا ئەم ل جهێ ئێكا دی بدانین یان ژ سەر دلێ تە ببەین [ژ بیرا تە ببەین] دێ ژ وێ چێتر، یان وەكی وێ ئینین، ما تو نوزانی خودێ ل سەر هەمی تشتان دەستهەلاتدار و شیاندارە. ﴿١٠٧﴾ ما تو نوزانی مالداریبا ئەرد و ئەسمانان هەر یا خودێیە، و ژ بلی خودێ هەوە چو هاریكار و چو پشتەڤان نینن. ﴿١٠٨﴾ یان [گەلی موسلمانان] هەوە ژی دڤێت هوین ژ پێغەمبەرێ خۆ بپرسن، هەروەكی بەری نوكە [ژ بەرێ جوهییانڤە] پسیار ژ مووسایی هاتییە كرن [ب ڕاستی] ئەو كەسێ باوەرییێ ب گاورییێ بگوهۆڕیت، [بێ گۆمان] ئەوی ڕێكا ڕاست بەرزەكر. ﴿١٠٩﴾ گەلەك ژ خودان كتێبان [جوهی و فەلەیان] ژ زكرەشی پێ خۆشە [و دخوازن] پشتی باوەری ئینان و موسلمانبوونا هەوە، و پشتی هەقی و ڕاستی بۆ وان [ب خۆ ژی] دیار و ئاشكەرا بوویی، هەوە ڤەگەریننەڤە سەر گاورییێ، ڤێجا هوین ل وان ببۆرن و چاڤێت خۆ ژ وان بگرن، هەتا خودێ فەرمانا خۆ [ب جیهادێ] دهنێریت. [ب ڕاستی] خودێ ل سەر هەمی تشتان شیاندار و دەستهەلاتدارە. ﴿١١٠﴾ و نڤێژان [بەردەوام] بكەن و زەكاتێ [یا مالێ خۆ] بدەن و [بزانن] هەر خێرەكا هوین ل پێشییا خۆ بهنێرن، هوین دێ ل دەڤ خودێ [خەلاتێ وێ] بینن، و خودێ ب هەر كار و كریارەكا هوین دكەن ئاگەهدارە و دبینیت. ﴿١١١﴾ و گۆتن [مەخسەد جوهی و فەلەیان]: یێ جوهی، یان فەلە نەبیت قەد ناچیتە بەحەشتێ، و ئەڤە خۆزیكێت وانن. بێژێ: ئەگەر هوین ڕاست دبێژن كا دەلیل و نیشانێت خۆ بینن. ﴿١١٢﴾ [نەوەسایە وەكی ئەو دبێژن] یێ خۆ سپارتە خودێ، و ئەو ب خۆ ژی یێ قەنجیكار بیت، وی خەلاتێ خۆ ل دەڤ خودایێ خۆ هەیە، و نە ترس بۆ هەیە، نە ژی ب خەم دكەڤیت.

وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ لَيۡسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ
لَيۡسَتِ ٱلۡيَهُودُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُمۡ يَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۗ كَذَٰلِكَ
قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ مِثۡلَ قَوۡلِهِمۡۚ فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ
يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ١١٣ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن
مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَآۚ
أُوْلَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمۡ أَن يَدۡخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَۚ لَهُمۡ فِي
ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١١٤ وَلِلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ
وَٱلۡمَغۡرِبُۚ فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ١١٥
وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ١١٦ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ
وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ١١٧ وَقَالَ
ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ
كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ تَشَٰبَهَتۡ
قُلُوبُهُمۡۗ قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ١١٨ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ
بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ ١١٩



﴿١١٣﴾ جوهییان گۆت: فەلە، نە ل سەر هەقییێنە، و فەلەیان گۆت: جوهی نە ل سەر هەقییێنە. [هەردو جوین باوەرییێ ب دینێ ئێکدو و ب پێغەمبەرێت ئێکدو نائینن] و هەردو ژی کتێبێ [تەورات و ئنجیلێ] دخوینن، هەروەسا ئەوێت نەزان و نەخواندەوار ژی [کو بوتپەرێسن] وەکی گۆتنا وان [د دەرهەقێ موحەمەد پێغەمبەریدا] گۆت، ڤێجا ڕۆژا قیامەتێ خودێ دێ کەڤیتە د ناڤبەرا واندا [دێ ناڤبەرا وان سافی کەت]، ل سەر وی تشتێ ئەو تێدا ژێك جودا. ﴿١١٤﴾ ما کی ژ وی ستەمکارترە؟ [کەس ژ وی ستەمکارتر نینە] ئەوێ نەهێلیت ناڤێ خودێ ل مزگەفتێت خودێ بێتە ئینان و ل بەر دگەڕیت کاڤل و وێران بکەت، ئەڤ مرۆڤە [ئەوێت ل کاڤلکرن و وێرانکرنا مزگەفتان دگەڕێین] دڤیا ئەڤ مرۆڤە بێ ترس نەچنە د مزگەفتانڤە، ڕسوایی و شەرمزاری د دنیاییێدا بۆ وان هەیە، و ڕۆژا قیامەتێ ژی دێ ب بەر ئێزایەکا دژوار کەڤن. ﴿١١٥﴾ ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤا [هەردو] هەر یێت خودێنە، هەر جهەکێ هوین بەرێ خۆ بدەنێ، خودێ لێیە، ب ڕاستی [د دلۆڤانی و کەرەما خۆدا] خودێ یێ بەرفرەهـ و زانایە. ﴿١١٦﴾ گۆتن [مەخسەد جوهی و فەلە و بوت پەرێسن]: خودێ زارۆیەك بۆ خۆ ڕاکریە، و خودێ ژ ڤێ چەندێ یێ پاك و پاقژە، و هندی د ئەرد و ئەسمانان‌دا هەیە یێ وییە، و ل بەر فەرمانا وییە [خودێ چو هەوجەیی ب ڕاکرنا زارۆیی نینە]. ﴿١١٧﴾ دائینەرێ ئەرد و ئەسمانان گاڤا کار و فەرمانەك ڤیا دێ بێژتێ هەبە دێ بیت. ﴿١١٨﴾ و یێت نەزان و بێ ئاگەه ژ کتێبان [بوت پەرێسێت عەرەبان] گۆتن: بلا خودێ د گەل مە باخڤیت، یان نیشانەك ژ دەڤ بۆ مە بێت، [دا بۆ مە دیاربیت موحەمەد پێغەمبەرە وەکی ئەو دبێژیت]. هۆسا ئەڤێت بەری وان ژی، وەکی گۆتنا وان دگۆتن، دلێت وان دچنە سەرێك [وەکی ئێکن]، و ب ڕاستی مە بەلگە و نیشانێت ڕۆنکرین بۆ یێت هەقییێ پەسەند دکەن و خۆ ددەنە بەر. ﴿١١٩﴾ ب ڕاستی مە تو ب هەقی یێ هنارتی دا ببیە مزگین ئین و ئاگەهدارکەر، و پسیارا دۆژەهییان ژ تە نائێتەکرن.

وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمۡۗ قُلۡ
إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم بَعۡدَ ٱلَّذِي
جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ١٢٠ ٱلَّذِينَ
ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۗ وَمَن
يَكۡفُرۡ بِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ١٢١ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ
ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٢٢ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا
لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا تَنفَعُهَا
شَفَٰعَةٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ١٢٣ ۞ وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ
فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ
لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ١٢٤ وَإِذۡ جَعَلۡنَا ٱلۡبَيۡتَ مَثَابَةٗ لِّلنَّاسِ
وَأَمۡنٗا وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ وَعَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ
وَإِسۡمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ١٢٥
وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنٗا وَٱرۡزُقۡ أَهۡلَهُۥ
مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُم بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ قَالَ وَمَن كَفَرَ
فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلٗا ثُمَّ أَضۡطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ١٢٦

ثلاثة أرباع الحزب ٢



﴿١٢٠﴾ ب ڕاستی جوهی و فەلە ژ تە قایل نابن هەتا
تو نەچییە سەر دینێ وان، بێژە وان: ب ڕاستی
ڕاستەڕێییا خودێ، ئەوە ڕاستەڕێییا دورست،
ئەگەر تو ب دویڤ دلخوازییا وان بکەڤی، پشتی
[هەقی بۆ تە ئاشکەرابوویی] ڕاستی تە زانی، پاشی
تە چو هاریکار و پشتەڤان ل دەڤ خودێ نابن.
﴿١٢١﴾ ئەوێت مە کتێب بۆ ئینایین و دورست [کا چاوا
هاتییە خوارێ وەسا] دخوینن، ئەها ئەڤە باوەرییێ
پێ دئینن و هەر کەسێ [باوەرییێ پێ نەئینیت] و
گاوربیت ئەو بەر زیان و خوسارەتن. ﴿١٢٢﴾ گەلی
ئسرائیلییان بیننە بیرا خۆ ئەو کەرەم و خۆشییێت من
د گەل هەوە کرین و [هنگێ] من قەدرێ هەوە ب
سەر یێ هەمی خەلکی ئێخست. ﴿١٢٣﴾ و ڕۆژەکێ
[کو ڕۆژا قیامەتێیە] بترسن، و خۆ بپارێزن کو کەس
تێدا ژ پێش کەسێڤە نائێتە جزادان، و بەدەل ژ کەسێ
نائێتە وەرگرتن، و مەهدەر و بەرەڤانی تێدا چو ناگرن،
و هاریکارییا کەسێ ژی نائێتەکرن. ﴿١٢٤﴾ و بۆ ملەتێ
خۆ [هەی موحەمەد] بێژە: دەمێ خودێ ئیبراهیم
ب چەند پەیڤەکان جەڕباندی و [ئیبراهیم] ب دورستی ئەو پەیڤ ب جە ئینایین و پێ ڕابوویی، خودێ
گۆتێ: دێ تە کەمە پێشی بۆ خەلکی، ئیبراهیم گۆتێ: دویندەها من ژی [بکە پێشی]، خودێ گۆتێ: سۆز
و پەیمانا من ژ ستەمکاران ناگریت. ﴿١٢٥﴾ و بۆ ملەتێ خۆ [هەی موحەمەد] بێژە دەمێ مە کەعبە بۆ خەلکی
کرییە جهێ لێ زڤڕینێ و جهێ تەناهییێ. و هوین جهێ ئیبراهیم بۆ خۆ بکەنە جهێ نڤێژان، و مە فەرمان ل
ئیبراهیم و ئیسماعیل کرن کو مالا من بۆ تەوافکەر و ئیعتیکافکەران [خلوەنشینی] و داچەمیایی و سوجدەبران
[نڤێژکەران] پاقژ بکەن. ﴿١٢٦﴾ و بۆ ملەتێ خۆ بێژە: دەمێ ئیبراهیم [دوعا ژ خودایێ خۆ کرین] گۆتی:
خودێوۆ تو ڤی جهی بکە باژێرەکێ ئێمن، و خەلکێ وی یێ باوەری ب تە و ڕۆژا قیامەتێ ئینا، ژ فێقییان
بدێ، [خودێ] گۆت: یێ گاور ببیت ژی ئەز دێ پێ خۆشکەم و پاشی ئەز دێ کێشمە د ئاگرێ دۆژەهێدا
[ژ بەر گاورییا وان]، و پیسە بنەجهە.

وَإِذۡ يَرۡفَعُ إِبۡرَٰهِـۧمُ ٱلۡقَوَاعِدَ مِنَ ٱلۡبَيۡتِ وَإِسۡمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلۡ
مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجۡعَلۡنَا مُسۡلِمَيۡنِ
لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةٗ مُّسۡلِمَةٗ لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبۡ عَلَيۡنَآۖ
إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ
يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ
وَيُزَكِّيهِمۡۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ وَمَن يَرۡغَبُ عَن مِّلَّةِ
إِبۡرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥۚ وَلَقَدِ ٱصۡطَفَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ
وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ
قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ
وَيَعۡقُوبُ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ
إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ
ٱلۡمَوۡتُ إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِيۖ قَالُواْ نَعۡبُدُ
إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ إِلَٰهٗا
وَٰحِدٗا وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٣﴾ تِلۡكَ أُمَّةٞ قَدۡ خَلَتۡۖ لَهَا مَا كَسَبَتۡ
وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡۖ وَلَا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٤﴾





﴿١٢٧﴾ و بـۆ ملەتـێ خۆ بێژە: دەمێ ئیبراهیم و ئیسـماعیل بنسـترا [ئاڤاهیـێ] کەعبەیـێ ڕادکرن [دگۆتـن] خودێوۆ ژ مـە قەبویـل بکە، ب ڕاسـتی هەر تویی گوهـدار و زانا. ﴿١٢٨﴾ خودێـوۆ تـو مـە بکـە ژ مرۆڤێـت خـۆ سـپارتییە تـە، و دویندەهـا مـە ژی بکـە ملەتەکـێ خـۆ سـپارتییە تە [ل بەر فەرمانا تە ڕاوەسـتیایی]، و ڕێ و نیشانێت حەجێ نیشـا مـە بـدە، و تۆبەیـا مـە قەبویـل بکـە، و ب ڕاسـتی تویـی یـێ هـەر تۆبەوەرگـر و دلۆڤـان. ﴿١٢٩﴾ خودێـوۆ پێغەمبەرەکـی ژ وان بـۆ وان بهنـێرە، نیشـانێت [ئایەتێت] تـە بـۆ وان بخوینیـت و کتێـب و ئاقلدارییـێ نیشـا وان بـدەت، و دلـێ وان پـاك و پاقـژ بکـەت، ب ڕاسـتی هـەر تویـی یـێ سەردەسـت و کار بنەجـە و فەرمانـڕەوا. ﴿١٣٠﴾ کـی دێ خـۆ ژ ڕێـکا ئیبراهیـم دەتـە پـاش ئـەو نەبیـت یـێ خۆ بکەتـە سـاویلکە، و ب ڕاسـتی د دنیایێدا مـە ئەو [ئانکـو ئیبراهیم] هەلبـژارت، و ئـەو د ئاخرەتێدا ژی ژ کێرهاتـی و سەرڕاسـتانە. ﴿١٣١﴾ بـۆ وان بێـژە: دەمـێ خـودێ گۆتییـێ: خـۆ بسـپێرە مـن [ئانکـو ل بەر فەرمانـا من ڕاوەسـتە] گـۆت: من خـۆ سـپارتە خودانێ هەمـی جیهانـان. ﴿١٣٢﴾ و ئیبراهیـم قەویاتـی [وەسـیەت] ل کوڕێـت خـۆ کـرن ب ڤـی دینی، و یەعقـووب ژی هەروەسـا [گـۆت]: کوڕێـت مـن بـێ گۆمان خـودێ ئـەڤ دینە بۆ هـەوە هلبـژارت، [هشـیار بن] نەمـرن هوین نـە موسـلمان. ﴿١٣٣﴾ گـەلی جوهییـان مـا هویـن د حازر بـوون دەمـێ یەعقووب ل بـەر مرنـێ [ئانکو هویـن نە د حازربـوون] گۆتییـە زارۆیێـت خـۆ: پشـتی مـن هویـن دێ چ پەرێسـن؟ گۆتـن: ئـەم دێ خودایێ تـە و خودایێ بـاب و باپیرێـت تە ئیبراهیم و ئیسـماعیل و ئیسـحاق پەرێسـین (عەبدینـین)، خودایەکێ ب تنێیە، و ئـەم [بەس] ل بـەر فەرمانـا وی ب تنێینـە. ﴿١٣٤﴾ ئـەو ملەتەك بـوو چـۆ، کار و کریارێت وان بۆ وانـن، و یێت هەوە بـۆ هەوەنە، و هویـن ب بـەر کار و کریارێـت وان ناکەڤـن [پرسـا وان ژ هـەوە نائێتـە کرن].

﴿١٣٥﴾ خـودان كتێبـان [جوهـی و فەلەیـان] گۆتنـە
[موسـلمانان]: ببنە جوهی یان فەلە، هوین دێ ڕاسـتەڕێ
بـن، بێژە [وان نەوەسـایە]: ئەم دێ ل سـەر دینێ ئیبراهیم
بـین، دینەكێ ڤـەدەر ژ خواری و خرابییـێ، و ئیبراهیم ب
خـۆ ژی نـە ژ مـوشركان بـوو. ﴿١٣٦﴾ بێـژن: [د بەرسـڤا
وانـدا]: مـە بـاوەری ب خـودێ هەیـە، و ب وێ یـا بـۆ
مـە ئینابییـە خـوارێ [كـو قورئانـە] و ب یـا بـۆ ئیبراهیم
و ئیسـماعیل و ئیسـحاق و یەعقـووب و كوڕێـت وی،
و ب ئـەوا بـۆ مووسـایی و عیسـایی هاتـی، و ب یـا بـۆ
پێغەمبەرێـت دیتر ژی ژ نـك خودێ هاتـی، و ئەم فەرقێ
[جوداییـێ] نائێخینـە ناڤبـەرا كـەس ژ وان و ئـەم ل بـەر
فەرمانـا وینـە. ﴿١٣٧﴾ ئەگـەر وان بـاوەری وەكـی هـەوە
[ب هەمـی پێغەمبـەران] ئینا، ئەڤـە ئەو ڕاسـتەڕێ بوون،
ئەگـەر ژ خۆ پشـت تـێ [د ڤـێ باوەرییێ] كـرن، ئەڤە ئەو
یێـت كەڤتینـە ڕكـێ، و خـودێ بەسـی تەیـە بـۆ وان [كو
وان ژ تـە بدەتـە پاش] و ئـەو گوهدار و زانایە [ب تشـتێ
دبێـژن و ڤەدشـێرن]. ﴿١٣٨﴾ ڕێكا خودێ [كو ئیسـلامە]
بگـرن، و مـا ڕێكـەك ژ ڕێـكا خـودێ [دینـێ خـودێ،
نیشـان و ڕەنگێـت خـودێ] چێـتر و جوانـتر هەیـە؟ و ئـەم یـێ وی دپەرێسـین (عەبدینـین). ﴿١٣٩﴾ بێـژە [وان]:
هویـن جڕەبـڕێ د [دەرهەقـی دینـێ] خودێـدا دكـەن د گـەل مـە و ئـەوە خودانـێ مـە و هـەوە. و كار و كریارێت
مـە بـۆ مەنـە و یێـت هـەوە بۆ هەوەنـە [هـەر ئێـك ژ مـە دێ جزایـێ كار و كریارێت خـۆ ب خۆ خـۆت] و ئەم بۆ
[خـودێ] دلبێـش و دلسـۆزین. ﴿١٤٠﴾ یـان هوین دبێژن ئیبراهیم و ئیسـماعیل و ئیسـحاق و یەعقـووب و كوڕێت
وی، جوهـی بـوون یـان فەلـە بـوون، بێـژە وان: مـا هویـن چێـتر دزانـن یـان خـودێ؟. كـی ژ وی سـتەمكارترە
[گونەهكارتـرە] یـێ ڕاسـتییێ ڤەدشـێریت [ئـەوا د دەرهەقـێ پێغەمبـەری د تەوراتـێ و ئنجیلێـدا هاتـی]، و ب
ڕاسـتی خـودێ نـە یـێ بـێ ئاگەهـە ژ وێ یـا هوین دكـەن. ﴿١٤١﴾ ئـەو ملەتەك بـوو چـۆ، كار و كریارێـت وان بۆ
وانـن و یێـت هـەوە بـۆ هەوەنـە، و هویـن ب بـەر و كار و كریارێـت وان ناكەڤن [پرسـا وان ژ هـەوە نائێتە كرن].



وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰ تَهۡتَدُواْۗ قُلۡ بَلۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِـۧمَ
حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٣٥ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ
أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ
وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن
رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ١٣٦
فَإِنۡ ءَامَنُواْ بِمِثۡلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ
فَإِنَّمَا هُمۡ فِي شِقَاقٖۖ فَسَيَكۡفِيكَهُمُ ٱللَّهُۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ١٣٧
صِبۡغَةَ ٱللَّهِ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبۡغَةٗۖ وَنَحۡنُ لَهُۥ
عَٰبِدُونَ ١٣٨ قُلۡ أَتُحَآجُّونَنَا فِي ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡ
وَلَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُخۡلِصُونَ ١٣٩
أَمۡ تَقُولُونَ إِنَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ
وَٱلۡأَسۡبَاطَ كَانُواْ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ قُلۡ ءَأَنتُمۡ أَعۡلَمُ أَمِ
ٱللَّهُۗ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ
بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ١٤٠ تِلۡكَ أُمَّةٞ قَدۡ خَلَتۡۖ لَهَا مَا كَسَبَتۡ
وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡۖ وَلَا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٤١

*سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمۡ عَن قِبۡلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ
عَلَيۡهَاۚ قُل لِّلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُۚ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ
مُّسۡتَقِيمٖ ١٤٢ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ
شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗاۗ وَمَا
جَعَلۡنَا ٱلۡقِبۡلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيۡهَآ إِلَّا لِنَعۡلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ
مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِۚ وَإِن كَانَتۡ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ
هَدَى ٱللَّهُۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ
بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٤٣ قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ
فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةٗ تَرۡضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ
ٱلۡحَرَامِۚ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥۗ وَإِنَّ
ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ لَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۗ وَمَا ٱللَّهُ
بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ ١٤٤ وَلَئِنۡ أَتَيۡتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ
بِكُلِّ ءَايَةٖ مَّا تَبِعُواْ قِبۡلَتَكَۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٖ قِبۡلَتَهُمۡۚ
وَمَا بَعۡضُهُم بِتَابِعٖ قِبۡلَةَ بَعۡضٖۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم مِّنۢ
بَعۡدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ إِنَّكَ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٤٥





﴿١٤٢﴾ ساویلكە و نەفامێت خەلكی [ژ جوهی و مونافقان] نێزیك دێ بێژن: چ بەرێ وان ژ قیبلەیا وان، ئەوا ئەو ل سەر، وەرگێرا [د بەرسڤا واندا] بێژە: رۆژهەلات و رۆژئاڤا [هەردو] یێت خودێنە، هەچییێ [خودێ] بڤێت دێ بەرێ وی دەتە رێكا راست [هەق]. ﴿١٤٣﴾ و هەروەسا مە هوین كرنە كۆمەكا ناڤنجی، دا هوین ببنە شاهد ل سەر خەلكی، و دا پێغەمبەر ژی ل سەر هەوە ببیتە شاهد. و مە فەرمانا تە نەكر، بەرێ خۆ بدەیە [بەیتولمەقدسێ]. پاشی بەرێ خۆ ژێ وەرگێرییە كەعبەیێ، بۆ هندێ نەبیت دا [ئەم] بزانین كا كی [ل هەر جهەكێ هەبیت] دێ گوهدارییا تە كەت، و كی دێ پاشڤە زڤریت و گاور ببیتەڤە، دبیت ئەڤ گوهۆرینە ل سەر هندەكان یا گران بیت، ژ بلی وی یێ خودێ راستەرێ كربیت، ب ڤێ فەرمانێ خودێ پەرستنا هەوە [نڤێژێت هەوە بۆ بەیتولمەقدسێ] بەرزە ناكەت، ب راستی خودێ د راستا خەلكیدا گەلەك یێ دلۆڤانە. ﴿١٤٤﴾ ب راستی مە ددیت تە بەرێ خۆ ل ئەسمانی دگێرا [ب هیڤییا هندێ بەرێ تە بێتە وەرگێران بۆ كەعبەیێ]. [بێ گومان] دێ بەرێ تە دەینە قیبلەیەكا تو پێ قاییل. بەرێ خۆ بدە راستا كەعبەیێ، و هەر جهەكێ هوین لێ بن بەرێ خۆ بدەنە راستا كەعبەیێ، ب راستی ئەوێت [بەری نوكە] كتێب بۆ هاتین، دزانن كو ئەڤە [ئەڤ بەروەرگێرانە] هەقییە ژ خودایێ وان، و خودێ نە یێ بێ ئاگەهە ژ وێ یا ئەو دكەن. ﴿١٤٥﴾ خۆ تو بۆ وان كەسێت كتێب بۆ هاتین، چ نیشانا گۆمانبڕ بینی، ئەو ب دویڤ قیبلەیا تە ناكەڤن، [بلا بێ هیڤی ببن] تو ژی نابیت [سەر ژ نوی] ب دویڤ قیبلەیا وان بكەڤی، و ئەو ب خۆ ژی [مەخسەد جوهی و فەلە] ب دویڤ قیبلەیا ئێكدو ناكەڤن، و ئەگەر تو ب دویڤ دلخوازییا وان بكەڤی پشتی زانین بۆ تە هاتی، ب راستی وێ گاڤێ تو ژی دێ ژ ستەمكاران ئێیە هەژمارتن.

ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡۖ
وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنۡهُمۡ لَيَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ١٤٦ ٱلۡحَقُّ
مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ١٤٧ وَلِكُلّٖ وِجۡهَةٌ
هُوَ مُوَلِّيهَاۖ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ أَيۡنَ مَا تَكُونُواْ يَأۡتِ بِكُمُ ٱللَّهُ
جَمِيعًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٤٨ وَمِنۡ حَيۡثُ خَرَجۡتَ
فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۖ وَإِنَّهُۥ لَلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَۗ
وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ١٤٩ وَمِنۡ حَيۡثُ خَرَجۡتَ فَوَلِّ
وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ
وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيۡكُمۡ حُجَّةٌ إِلَّا ٱلَّذِينَ
ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِي وَلِأُتِمَّ نِعۡمَتِي عَلَيۡكُمۡ
وَلَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ١٥٠ كَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِيكُمۡ رَسُولٗا مِّنكُمۡ يَتۡلُواْ
عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمۡ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ
وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ١٥١ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ
وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ١٥٢ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
ٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٥٣



﴿١٤٦﴾ ب ڕاستی ئەوێت مە کتێب [ئنجیل و تەورات]
بۆ هنارتین، یان داییتنێ ئەو وی [پێغەمبەری] وەکی
زارۆییێت خۆ دنیاسن، ب ڕاستی دەستەکەك ژ وان،
هەقییێ ڤەدشێرن [ئانکو سالۆخەتێت پێغەمبەری]
و دزانن کو هەقییێ ڤەدشێرن. ﴿١٤٧﴾ [ئەڤ قبیلە
گوهارتنە] هەقییە، ژ نك خودایێ تە، ڤێجا ژ دودلان
نەبە. ﴿١٤٨﴾ و هەر ئێکی قیبلەیەك هەیە بەرێ خۆ
ددەتێ [ئانکو هەر دینەکی قیبلەیا خۆ هەیە]، خودێ
بۆ وان ئاشکەرا کرییە، و بەرێ وان داییێ. ڤێجا
دەست ب خێران بکەن و بکەنە بەڕەبەزینك، و هەر
جهەکێ هوین لێ بن، خودێ دێ هەوە هەمییان ئینیت
[کۆم کەت، دا هەر ئێك جزایێ خۆ وەربگریت]، بێ
گۆمان خودێ ل سەر هەمی تشتی دەستهەلاتدارە.
﴿١٤٩﴾ و هەر جهەکێ تو پێڤە بچی بەرێ خۆ بدە
ڕاستا کەعبەیێ، ب ڕاستی هەقی هەر ئەڤەیە، و ب
ڕاستی خودێ نەیێ بێ ئاگەهە ژ وێ یا هوین دکەن.
﴿١٥٠﴾ و هەر جهەکێ تو ژێ دەرکەڤتی بەرێ خۆ بدە
ڕاستا کەعبەیێ، و هەر جهەکێ هوین لێ بن بەرێ خۆ
بدەنە ڕاستا وێ، دا خەلکی چو هەجەت ل سەر هەوە نەمینن، ژ بلی وان ئەوێت ستەمکار، ئێدی هوین ژ
[ئاخفتنێت] وان نەترسن و ژ من بترسن، دا ئەز کەرەما خۆ ل سەر هەوە تمام بکەم، [بەرێ هەوە بدەمە قیبلەیا
بابێ هەوە ئیبراهیم] و دا هوین ڕاستەڕێ ببن. ﴿١٥١﴾ لەوما مە پێغەمبەرەك هەر ژ هەوە بۆ هەوە هنارت،
دا نیشانێت مە بۆ هەوە بخوینیت، و دل و دەروونێ هەوە بشۆت و پاقژ بکەت، و کتێب [کو قورئانە] و
سونەتێ [ڕێکا پێغەمبەری] نیشا هەوە بدەت، و تشتێ هەوە نەدزانی نیشا هەوە بدەت. ﴿١٥٢﴾ ڤێجا
[ب گوهداری و پەرستنێ] من بیننە بیرا خۆ، ئەز ژی [ب خەلاتکرن و گونەهـ ژێبرنێ] دێ هەوە ئینمە بیرا
خۆ. و هوین سوپاسی و شوکورا من بکەن و کەرەمێت من ژ بیرا خۆ نەبەن [ژ بەر چاڤێت خۆ نەبەن].
﴿١٥٣﴾ گەلی خودان باوەران، هوین پشتا خۆ ب بێنفرەهییێ و نڤێژان گرێ بدەن، [هاریکارییان بۆ خۆ
بخوازن]، و ب ڕاستی خودێ د گەل بێنفرەهـ و سەبرکێشانە.

وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقۡتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتُۢۚ بَلۡ أَحۡيَآءٞ وَلَٰكِن
لَّا تَشۡعُرُونَ ١٥٤ وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ
وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٥٥
ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦
أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ١٥٧ ۞ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ
فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ
وَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ١٥٨ إِنَّ ٱلَّذِينَ
يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ
لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ١٥٩
إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ
وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ١٦٠ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ
كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةُ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ١٦١
خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ١٦٢
وَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ١٦٣

الحزب ٣





﴿١٥٤﴾ و هوین د ڕاستا ئەوێت د ڕێکا خودێدا دئێنە کوشتن، نەبێژن: د مرینە [نە] بەلکی ئەو د ساخن، بەلێ هەوە های ژێ نینە. ﴿١٥٥﴾ [گەلی خودان باوەران] ب ڕاستی ئەم دێ هەوە ب هندەك ترسێ و برسێ، و کێمکرنا مال و مالدارییێ و جان و بەر و بەرهەمان، جەڕبینین و [تو هەی موحەمەد] مزگینییێ بدە بێنفرەهـ و سەبرکێشان. ﴿١٥٦﴾ ئەوێت هەر گاڤەکا بەلایەك [ئاتافەك] ب سەرێ وان هات، دبێژن: ب ڕاستی ئەم هەر یێت خودێینە [ئانکو ئەم بەندەیێت وینە]، و هەر دێ ب بال ویڤە زڤڕین. ﴿١٥٧﴾ سلاڤ [لێنەگرتن و گونەهـ ژێبرن] و دلۆڤانییا خودێ بۆ ئەڤانە، و هەر ئەڤەنە ڕاستەڕێ و دورستەڕێ. ﴿١٥٨﴾ ب ڕاستی سەفا و مەروە، [ناڤێن بۆ دو چیاکێت مەکەهێ] ژ ڕێ و نیشانێت [دینێ] خودێنە. ڤێجا هەر کەسێ حەجێ بکەت یان عومرەیێ، چو ل سەر نینە [ئەگەر] د ناڤبەرا هەردووکاندا بێت و بچیت، و هەچییێ ژ دەڤ خۆ باشییێ بکەت [خودێ باشییا وی بێ بەرانبەر ناهێلیت]. ب ڕاستی خودێ سوپاسدار [بەرانبەری تشتێ کێم گەلەکێ ددەت] و زانایە. ﴿١٥٩﴾ ب ڕاستی کەسێت نیشانێت ئاشکەراکەر و ڕاستەڕێییا مە ئینایییە خوارێ، پشتی مە بۆ خەلکی د کتێباندا [ئانکو د تەورات و ئنجیلێدا] ڕۆنکری، ڤەدشێرن، خودێ لەعنەتێ ل ڤان دکەت، و لەعنەتکەر ژی لەعنەتان لێ دکەن. ﴿١٦٠﴾ ژ بلی وان ئەوێت پشتی هنگێ تۆبە کرین و قەنجی کرین و تشتێ ڤەشارتی ئاشکەرا کرین، ئەڤێت هەنێ ئەز دێ تۆبەیێ دەمە سەر وان، و ئەزم تۆبەوەرگر و دلۆڤان. ﴿١٦١﴾ ب ڕاستی ئەوێت گاور بوویین، و مرین و ئەو گاور، ئەوان لەعنەتا خودێ و ملیاکەتان و هەمی مرۆڤان ل سەر بیت. ﴿١٦٢﴾ هەروهەر ئەو دێ تێدا [د ئاگر و لەعنەتێدا] مینن، ئیزا ل سەر وان سڤك نابیت، و مۆلەت بۆ وان نائێتە دان. ﴿١٦٣﴾ [گەلی خودان باوەران] خودایێ هەوە هەر ئێك خودایە، ژ بلی وی چو پەرستی [خودا] نینن، ئەوە دلۆڤانێ پڕ دلۆڤانی.

إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ
وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ
مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا
مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ
ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ
مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ
ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾
إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ
وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ لَوْ أَنَّ
لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا ۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ
أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ۖ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُوا۟ مِمَّا فِي ٱلْأَرْضِ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا۟
خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم
بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٦٩﴾

٢٥

﴿١٦٤﴾ ب ڕاستی چێكرنا ئەرد و ئەسمانان و هاتن و چۆنا شەڤ و ڕۆژان، و گەمییێت د دەرياییێدا دگەڕن، و مفای دگەهیننە خەلكی، و ئەو ئاڤا [بارانان] خودێ ژ ئەسمانان دادڕێژیت، و پێ ئەردی پشتی مرنا وی [هشكاتییێ] زێندی دكەتەڤە [شین دكەت]، و هەمی ڕەنگێت جانەوەران تێدا [د ئەردیدا] بەلاڤ كرین، و ئینان و برنا بایی و عەورێت دانایی د ناڤبەرا ئەرد و ئەسماناندا، ئەڤە هەمی نیشانن [ل سەر هەیی و دەستهەلاتدارییا خودێ]، بۆ وان كەسێت ژیر و ئاقلدار. ﴿١٦٥﴾ [شوینا هزرا خۆ د نیشانێت تاك و تەنیاییا خودێدا بكەن] هندەك مرۆڤ هەنە بەڤل و هەڤبەران بۆ خودێ چێ دكەن، وەكی حەژێكرنا خودێ حەژێ دكەن، بەلێ یێت باوەری ئینایین پتر حەژ خودێ دكەن، و ئەگەر ئەوێت ستەمكار زانیبایە دەمێ ئیزایێ دبینن، كو هەمی هێز و شیان یا خودێیە [و كەسێ چو شیان نینە]، و ب ڕاستی ئیزایا خودێ گەلەك یا دژوارە. ﴿١٦٦﴾ هنگێ كەنكەنە و گرگرە دەمێ ئیزایێ دبینن، و ژ هەمی هەڤبەندیان ڤەدقەتێن و ژ خۆ بێزار دبن، و دەستێ خۆ ژ دویكەڤتییێت خۆ بەر ددەن و خۆ ژێ بەری دكەن. ﴿١٦٧﴾ و دویكەڤتییان گۆت: خۆزی جارەكا دی ئەم ڤەگەڕیابایینە سەر دنیایێ، دا مە ژی خۆ ژ وان شویشتبایە هەروەكی وان خۆ ژ مە شویشتی، هۆسا خودێ كار و كریارێت وان ددەتە ڕوییێ وان، دا ببنە كول و كۆڤان و پەشێمانی و كەسەر، و ئەو ژ ئاگری ژی [چو جا] دەرناكەڤن. ﴿١٦٨﴾ گەلی مرۆڤان هەر تشتێ د ئەردیدا پاقژ و حەلال بخۆن، و ب دویڤ پێنگاڤێت شەیتانی نەكەڤن. ب ڕاستی ئەو دژمنەكێ ئاشكەرایە بۆ هەوە. ﴿١٦٩﴾ [چونكی] ئەو فەرمانا هەوە بەس ب هندێ دكەت، هوین خرابی و تەریڤییێ [كرێتییێ] بكەن، و د ڕاستا خودێدا وێ بێژن یا هوین نەزانن.

وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا
عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۗ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا
يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ
بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً ۚ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٧١﴾
يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ
وَٱشْكُرُوا۟ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ
عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ
ٱللَّهِ ۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ
غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ
ٱلْكِتَـٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ
فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ
وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٤﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
ٱشْتَرَوُا۟ ٱلضَّلَـٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ وَٱلْعَذَابَ بِٱلْمَغْفِرَةِ ۚ فَمَآ
أَصْبَرَهُمْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴿١٧٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ ۗ
وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِى ٱلْكِتَـٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿١٧٦﴾





﴿١٧٠﴾ و هەر گاڤەكا گۆتبايێ: [مەخسەد بوت پەرێسن] ب دويڤ وێ بكەڤن يا خودێ هنارتی، دگۆتن: نەخێر ئەم دێ ب دويڤ وێ كەڤين ئەوا مە باب و باپيرێت خۆ ل سەر ديتين، بلا باب و باپيرێت وان چو نەزانن ژی، و كەسەكێ ژی [بۆ هەقييێ] ڕاستەڕێ نەكەن؟. ﴿١٧١﴾ مەتەلا ئەوێت گاوربووين وەكی مەتەلا وی [شڤانی]يە يێ ل تەرشێ خۆ دكەتە قێڕی و تەرش ب خۆ، ژ بلی دەنگ دۆر و قێڕييێ چو يێ دی نابهيسيت، [ئەڤ گاورە ژی وەكی وی تەرشينە، ئاخڤتنێ دبهيسن بەس تێ ناگەهن]. كەڕن، لالن، كۆرەنە، چو ب ناڤ عەقلێ واندا ناچيت. ﴿١٧٢﴾ گەلی خودان باوەران ژ وی حەلالێ مە ب ڕزقێ هەوە كری بخۆن، و سوپاسييا خودێ بكەن، ئەگەر [ڕاست] هوين وی ب تنێ دپەرێسن. ﴿١٧٣﴾ ب ڕاستی خودێ، بەس مرار و خوين [يا ڕۆن] و گۆشتێ بەرازان و تشتێ نەبۆ خودێ هاتييە سەرژێكرن، ل سەر هەوە حەرام كرييە. بەلێ هەر كەسەكێ نەچار ببيتە خوارنا ئەڤان ژی، بێی دل تێ هەبيت و بەس هەوجەييا خۆ پێ بقەتينيت، چو گونەه ل سەر نينە، ب ڕاستی خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿١٧٤﴾ ب ڕاستی ئەو كەسێت ئەوا خودێ د كتێبێدا ئينايييە خوار ڤەدشێرن و ئەرزان دفرۆشن، ئەڤە ژ ئاگری پێڤەتر چو يێ دی ناخۆن، و ڕۆژا قيامەتێ خودێ [ب دلۆڤانی] وان نائاخێڤيت، و گونەهێت وان ژێ نابەت، و ئيزايەكا دژوار دێ دەتە بەر وان. ﴿١٧٥﴾ ئەڤەنە، ئەوێت ڕاستەڕێيی داينە ب گۆمڕاييێ، و گونەهـ ژێبرن داينە ب ئيزايێ، چەند بێنا وان يا فرەهە ل سەر ئاگری، [ئانكو چەند بێنفرەهـ و ڕكۆيينە ل سەر وان كار و كريارێت بەرێ وان ددەتە ئاگرێ دۆژەهێ]. ﴿١٧٦﴾ ئەڤ ئيزايە ژ بەر هندێيە، كو خودێ كتێب [قورئان] ب هەقی و ڕاستييێ هنارت [وان باوەری پێ نەئينا]، و ب ڕاستی ئەوێت دودل بووين [كو جوهی و فەلەنە] ل سەر كتێبێ [قورئانێ]، د ڕكۆييەكا دويری هەقييێ دانە.

نصف الحزب ٣

* لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ
وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ
وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلۡمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ
وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ
ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُوفُونَ بِعَهۡدِهِمۡ إِذَا عَٰهَدُواْۖ
وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ١٧٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ
عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ وَٱلۡأُنثَىٰ
بِٱلۡأُنثَىٰۚ فَمَنۡ عُفِيَ لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ شَيۡءٞ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَأَدَآءٌ
إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖۗ ذَٰلِكَ تَخۡفِيفٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَرَحۡمَةٞۗ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ
بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ١٧٨ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ يَٰٓأُوْلِي
ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٧٩ كُتِبَ عَلَيۡكُمۡ إِذَا حَضَرَ
أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ إِن تَرَكَ خَيۡرًا ٱلۡوَصِيَّةُ لِلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ
بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُتَّقِينَ ١٨٠ فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعۡدَمَا سَمِعَهُۥ
فَإِنَّمَآ إِثۡمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ١٨١



﴿١٧٧﴾ [چاكی] قەنجییا ڕاست و دورست، نە
بەس ئەوە هوین [دەمێ نڤێژكرنێ] بەرێ خۆ بدەنە
ڕۆژهەلاتێ یان ڕۆژئاڤایێ، چاكییا ڕاست و دورست
ئەوە مرۆڤ باوەرییێ ب خودێ و ڕۆژا قیامەتێ و
ملیاكەتان و كتێبان [یێت ئەسمانی] و پێغەمبەران
بینیت، و مالی د سەر حەژێكرنا ویرا بدەتە كەس و كار
و سێوی و بەلنگاز و ڕێڤینگ و خوازخوازۆك و دیلان
[و كۆلەیان ژ بۆ ڕزگاركرنا وان]، و نڤێژان بەردەوام
بكەت، و زەكاتێ بدەت، و ئەو پەیمانا دایی ب جە
بینیت، و بێهنا خۆ ل سەر ترس و تەنگاڤی و هەژاری
و نەساخییان و دەمێ شەڕی، بكێشیت. [خودانێت
ڤان سالۆخەتان] د ڕاستن و هەر ئەڤنە تەقوادار.
﴿١٧٨﴾ گەلی خودان باوەران، [د دەرهەقێ كوشتنێدا]
مە تۆل [قساس] ل سەر هەوە دانا [ئانكو گونەهكار
ب گونەها خۆ بێتە جزاكرن، و كوژەك ب تنێ بێتە
كوشتن]. مرۆڤێ ئازاد ب مرۆڤێ ئازاد، یێ بەندە
ب یێ بەندە، و ژن بەرانبەری ژنێ، و دڤێت كەسێ ژ
بەرێ برایێ خۆڤە ب دانا خوینێ هاتییە عەفووكرن،
ڕێكا باش بگریت، و تازە ژێ بخوازیت، دڤێت كوژەك ژی بێ كێماسی و بێ گیرۆكرن خوینا وی بدەتێ. و
ئەڤ بڕیارە [گوهارتنا كوشتنێ ب دانا خوینێ] بارسڤكاتی و دلۆڤانییە ژ خودایێ هەوە. و هەر كەسێ پشتی
پێكهاتنێ زێدەگاڤییێ بكەت، ئێزا و نەخۆشییەكا دژوار [ڕۆژا قیامەتێ] بۆ وی هەیە. ﴿١٧٩﴾ گەلی ئاقلداران
د تۆلێدا [كوشتنا كوژەكی ب تنێ] بۆ هەوە ژیانە [خۆ دانەپاشا كوژەكی ژیانا وی د گەل یا خەلكی دێ ئێتە
پاراستن]، بەلكی هوین پارێزكارییێ بكەن. ﴿١٨٠﴾ ل سەر هەوە هاتە دانان، ئەگەر ئێك ژ هەوە كەڤتە بەر
مرنێ، و مالەكێ مەزن ب پاش خۆڤە هێلا، وەسیەتێ ب قەنجی بكەت بۆ دەیبابان و كەس و كاران، و ئەڤ
وەسیەتە ئەركە ل سەر پارێزكاران. ﴿١٨١﴾ ڤێجا هەر كەسەكێ پشتی بهیستی بگوهۆڕیت، ب ڕاستی گونەه
د ستۆیێ وانە یێت [وەسیەتێ] دگوهۆڕن، و ب ڕاستی خودێ گوهدێر و زانایە.

فَمَنۡ خَافَ مِن مُّوصٖ جَنَفًا أَوۡ إِثۡمٗا فَأَصۡلَحَ بَيۡنَهُمۡ فَلَآ إِثۡمَ
عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٨٢ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ
عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ
لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٨٣ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن كَانَ
مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۚ وَعَلَى
ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا
فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥۚ وَأَن تَصُومُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ١٨٤
شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ
وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ
ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ
مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ
ٱلۡعُسۡرَ وَلِتُكۡمِلُواْ ٱلۡعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا
هَدَىٰكُمۡ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ١٨٥ وَإِذَا سَأَلَكَ
عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ
فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لِي وَلۡيُؤۡمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمۡ يَرۡشُدُونَ ١٨٦



﴿١٨٢﴾ [پشتی هنگی] هەچییێ پێ حەسیا وەسیەتکەر
بەر ب گونەهێ چۆیە، چ ژ خەلەتی بیت [بێ دەستی]
چ ژی ژ قەستان، و ڕابیت ناڤبەرا وەسیەتلێکرییان
[ئانکو میراتخۆران] خۆش بکەت چو گونەهـ ل سەر
نینە، ب ڕاستی هەر خودێیە یێ گونەهان ژێ دبەت،
و هەر ئەوە یێ دلۆڤان. ﴿١٨٣﴾ گەلی خودان باوەران،
ڕۆژی ل سەر هەوە هاتە نڤێسین، هەروەکی ل سەر
یێت بەری هەوە ژی هاتییە نڤێسین، بەلکی هوین
پارێزکارییێ بکەن. ﴿١٨٤﴾ چەند ڕۆژەکێن [دیارکرینە]
ڤێجا هەچییێ ژ هەوە یێ نەساخ بیت [تێدا] یان ل
سەر وەغەرەکێ بیت، بلا تەمەتی هەژمارا ڕۆژییێت
خوارین بگریتەڤە، و ئەو کەسێت گەلەك زەحمەت و
نەخۆشییێ ب گرتنا وانڤە دبەن، بلا د پێش خوارنا
هەر ڕۆژییەکێڤە، خوارنا بەلنگازەکی ل سەر خۆ
بێخن و بدەن، و هەچییێ پتر ژی ل سەر خۆ بێخیت
و بدەت بۆ وی گەلەك خێرترە، و ڕۆژیگرتن بۆ
هەوە چێترە ئەگەر هوین بزانن. ﴿١٨٥﴾ [ئەڤ چەند
ڕۆژە] هەیڤا ڕەمەزانێیە، ئەو هەیڤا قورئان تێدا هاتییە
خواری، ڕاستەڕێییە بۆ خەلکی، و نیشانێت ڕاستەڕێیی و ڤاڤارتنێنە [ژێك جوداکرنا هەقییێ و نەهەقییێ] ڤێجا
هەر کەسێ ژ هەوە ئەڤ هەیڤە ب سەردا هات [ل مال بیت و نە ل سەر وەغەرێ بیت] بلا ڕۆژییان بگریت،
و هەچییێ [تێدا] یێ نەساخ بیت، یان ل سەر وەغەرەکێ بیت، [بۆ وی هەیە بخۆت] و بلا تەمەتی هەژمارا
ڕۆژییێت خوارین وەختەکێ دی بگریتەڤە، خودێ دڤێت ل سەر هەوە ساناهی بکەت، نەڤێت ل سەر هەوە
گران بکەت [ب زەحمەت بێخیت]، دا هوین هەیڤا ڕەمەزانێ تەمام بکەن پاشی خودایی، مەزن بکەن [بێژن:
(الله أكبر)] ل سەر ڕاستەڕێکرنا وی بۆ هەوە، و دا هوین سوپاسی و شوکورا خودێ بکەن. ﴿١٨٦﴾ و ئەگەر
بەندەیێت من، پرسا من ژ تە کرن، ئەز یێ نێزیکم، یێ گازی من بکەت دێ د هەواری ئێم، و بەرسڤا گازییا
وی دەم، ڤێجا بلا گوهدارییا من بکەن و باوەرییێ ب من بینن، دا ڕاستەڕێ ببن.

أُحِلَّ لَكُمۡ لَيۡلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمۡۚ هُنَّ
لِبَاسٞ لَّكُمۡ وَأَنتُمۡ لِبَاسٞ لَّهُنَّۗ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمۡ كُنتُمۡ
تَخۡتَانُونَ أَنفُسَكُمۡ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡ وَعَفَا عَنكُمۡۖ فَٱلۡـَٰٔنَ
بَٰشِرُوهُنَّ وَٱبۡتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ
حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلۡخَيۡطُ ٱلۡأَبۡيَضُ مِنَ ٱلۡخَيۡطِ ٱلۡأَسۡوَدِ مِنَ
ٱلۡفَجۡرِۖ ثُمَّ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيۡلِۚ وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمۡ
عَٰكِفُونَ فِي ٱلۡمَسَٰجِدِۗ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقۡرَبُوهَاۗ كَذَٰلِكَ
يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ١٨٧ وَلَا تَأۡكُلُوٓاْ
أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ وَتُدۡلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلۡحُكَّامِ
لِتَأۡكُلُواْ فَرِيقٗا مِّنۡ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلۡإِثۡمِ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ١٨٨
۞ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِۖ قُلۡ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلۡحَجِّۗ
وَلَيۡسَ ٱلۡبِرُّ بِأَن تَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ
مَنِ ٱتَّقَىٰۗ وَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِنۡ أَبۡوَٰبِهَاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٨٩ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ
يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠

ثلاثة أرباع الحزب ٣





﴿١٨٧﴾ چۆنا هەوە بۆ نڤینا ژنێ شەڤێت هەیڤا
ڕەمەزانێ هاتە دورستکرن. ئەو کراسن بۆ هەوە و
هوین کراسن بۆ وان، خودێ زانی هوین خۆ ناگرن،
و دێ خیانەتێ ل خۆ کەن، تۆبە دا سەر هەوە و ل هەوە
بۆری، ڤێ گاڤێ [ژ ئێرە و پێدا] [شەڤێت ڕەمەزانێ]
هەرنە نڤینا هەڤسەرێت خۆ، و وێ بخوازن یا خودێ
بۆ هەوە نڤیسی، و [ب شەڤ] بخۆن و ڤەخۆن هەتا
سپیاتییا ڕۆژێ بۆ هەوە ژ تارياتییا شەڤێ جودا دبیت
[دیار دبیت]، و ڕۆژییێ ژی هەتا شەڤێ [کو پشتی
ڕۆژئاڤابوونێیە] تەمام بکەن، و نەچنە نڤینا خۆ دەمێ
خلوەییا مزگەفتێ [دەمێ هوین دکەڤنە د ئعتیکافێدا ل
مزگەفتێ] ئەڤە، تان و پەرژانێت خودێنە، خۆ نێزیك
نەکەن [و نەدەنە سەر] هۆسا خودێ نیشانێت خۆ
بۆ خەلکی دیار دکەت، بەلکی پارێزکارییێ بکەن.
﴿١٨٨﴾ و مالێ ئێکدو ب نەهەقی نەخۆن، و نەکەنە
بەرتیل بۆ فەرمانبەران، دا پشکەکێ ژ مالێ خەلکی
ب نەهەقی بخۆن ژ بەرێ دەستەکەکێ ژ هەوەڤە،
و هوین دزانن نەهەقییە. ﴿١٨٩﴾ و پسیارا هەیڤێ ژ
تە دکەن [بۆچی دئێتە گوهۆڕین زراڤ دبیت و پاشی بەربەر ستویر دبیت هەتا تەکووز دبیت] بێژە: ئەو
نیشانێت وەختانە بۆ خەلکی، و بۆ حەجێ [دەمێت پەرستنا خۆ و دەمێ کار و بارێت خۆ پێ دنیاسن].
و نە ژ قەنجییێیە هوین د پشت خانیڕا بێنە د ژۆرڤە، بەلێ قەنجی ئەوە پارێزکارییێ بکەن، و د دەرگەهانڕا
بێنە د مالانڤە، و پارێزکارییا خودێ بکەن، دا هوین سەرفەراز ببن. ﴿١٩٠﴾ و [گەلی خودان باوەران] د ڕێکا
خودێدا شەڕێ وان بکەن یێت شەڕێ هەوە دکەن، و زێدەگاڤییێ [ستەمکارییێ] نەکەن، ب ڕاستی خودێ
حەژ زێدەگاڤان [ستەمکاران] ناکەت.

وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ
أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۚ وَلَا تُقَٰتِلُوهُمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمْ
فِيهِ ۖ فَإِن قَٰتَلُوكُمْ فَٱقْتُلُوهُمْ ۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩١﴾ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟
فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٢﴾ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ
ٱلدِّينُ لِلَّهِ ۖ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩٣﴾ ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ
بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْحُرُمَٰتُ قِصَاصٌ ۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟
عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ
ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾ وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ۛ
وَأَحْسِنُوٓا۟ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ۚ
فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ ۖ وَلَا تَحْلِقُوا۟ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ
ٱلْهَدْىُ مَحِلَّهُۥ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ
مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ۚ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلْعُمْرَةِ إِلَى ٱلْحَجِّ
فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ ۚ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِى ٱلْحَجِّ
وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ ۗ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ۗ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِى
ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾





﴿١٩١﴾ و [گەلی خودان باوەران]، ئەوان [بوت پەرێسان] بكوژن، ل هەر جهەكێ ب دەست هەوە بكەڤن، و كا چاوا وان هوین [ژ مەكەهێ] دەرئێخستن، هوین ژی وان دەربێخن، ب ڕاستی ئەو نەخۆشییا ئەوان بۆ موسلمانان چێكری، دا ژ دینێ وان وەرگێڕن، مەزنترە ژ كوشتنێ. و شەڕێ وان ل دەڤ حەرەمێ [مەكەهێ] نەكەن، هەتا ئەو شەڕێ هەوە نەكەن، ئەگەر وان شەڕێ هەوە كر هوین ژی شەڕێ وان بكەن، جزایێ گاوران هۆسانە. ﴿١٩٢﴾ ڤێجا ئەگەر وان دەست ژ [ئێزادانا موسلمانان و شەڕێ وان] بەردا [و موسلمان بوون]، ب ڕاستی خودێ یێ لێنەگر و دلۆڤانە. ﴿١٩٣﴾ و هوین [گەلی موسلمانان]، شەڕێ وان بكەن، دا ڕێكا ئیسلامێ نەئێتە گرتن، و دینێ خودێ ببیتە سەرپشكێ هەمی دینان، و ئەگەر [گاوران] دەست ژ دژمناییێ و شەڕی كێشان، شەڕێ وان نەكەن، شەڕ و دژمنایی بەس د گەل ستەمكارانە. ﴿١٩٤﴾ و هەیڤا حەرام [و ب حورمەت] ب هەیڤا حەرامە [ئەگەر وان حورمەتا هەیڤێ شكاند و شەڕ تێدا د گەل هەوە كرن، هوین ژی بشكێنن و شەڕی د گەل بكەن]، و هەر تشتەكێ نەدورست هوین پێ لێ بنن، و دەستدرێژییێ ل سەر بكەن، تۆل (قساس) تێدایە [ئانكو ئێك د پێش ئێكیڤەیە و ئەگەر وان حورمەتا هەیڤێت حەرامكری شكاند، دێ ب سەرێ واندا شكێت]. و هەچییێ دەستدرێژی ل سەر هەوە كر، هوین ژی تەمەت دەستدرێژییا وان، دەستدرێژییێ ل سەر بكەن، و ژ خودێ بترسن و بزانن خودێ د گەل پارێزكارانە. ﴿١٩٥﴾ و د ڕێكا خودێدا [د جیهادێدا] مالێ خۆ بمەزێخن، و خۆ ب دەستێت خۆ نەهاڤێژنە د مالوێرانییێدا [خۆ د هیلاك نەبەن]، و قەنجییێ بكەن، ب ڕاستی خودێ حەژ قەنجیكاران دكەت.

﴿١٩٦﴾ [گەلی موسلمانان] حەج و عومرەیا خۆ، ئەگەر هەوە دەست پێ كر و ئیحرام گرێدان ببەنە سەری، و ئەگەر هوین ئاسێ بوون [چ ژ نەشیان و ڕێگرتنێ، چ ژ نەساخییێ] چ یێ بەردەست و ساناهی، ژ قوربانان بدەن [و ژ ئیحرامان وەرنە دەرێ] و سەرێ خۆ نەتراشن هەتا قوربان نەگەهنە جهێ خۆ [ل وێرێ سەرژێ بكەن، پاشی سەرێ خۆ بتراشن] و هەچییێ ژ هەوە یێ نەساخ بیت، یان ئەزیەتەك د سەریدا بیت [و نەچار ببیت سەرێ خۆ بتراشیت] بلا ئێك ژ ڤان بەدەلان بدەت [سێ] ڕۆژییان بگریت، یان خوارنا [شەش مرۆڤان] بدەت، یان ژی پەزەكی بكەتە خێر، و ئەگەر هوین ئێمن بوون، و ئێكی ڤیا پشتی دویماهیهاتنا عومرەیێ ب خۆ خۆش ببیت [ژ ئیحرامان بێتەدەر هەتا دەمێ حەجێ] چ قوربان ساناهیترە بلا وی بدەت، و ئەگەر ب دەست نەكەڤت، بلا سێ ڕۆژییان هەر د حەجێدا بگریت، و حەفتان پشتی دزڤریتەڤە، ئەڤە بوونە دەهـ ڕۆژێت دورست، ئەڤ بڕیارە (حكم) [خۆ خۆشبوون (ژ ئیحرام دەركەڤتن)، د ناڤبەرا عومرەیێ و حەجێدا] بەس بۆ وانە یێت مالێت وان نە ل حەرەمێ [مەكەهێ] و ژ خودێ بترسن [پارێزكارییا خودێ بكەن] و بزانن جزایێ خودێ [ب ڕاستی] جزایەكێ دژوارە.

ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ ۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ فَلَا
رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِى ٱلْحَجِّ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ
خَيْرٍ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ ۚ
وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٧﴾ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ
أَن تَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ۚ فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ
عَرَفَٰتٍ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ ۖ
وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ
لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿١٩٨﴾ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ
ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٩﴾
فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ
ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ۗ فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ
رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ﴿٢٠٠﴾
وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً
وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ
لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾



﴿١٩٧﴾ هندی حەجە هەیڤێت خۆ یێت دیار و ئاشكەرا
هەنە، و هەر كەسێ [ئیحرام گرێدان] حەج ل سەر
خۆ ئێخست، [دڤێت بزانیت د حەجێدا] چۆنا نڤینا
ژنێ و ئاخڤتنێت كەشەفرێت و جڕەبڕ و مەدەڕكی
د حەجێدا نینە، و نەدورستە. هەر خێر و قەنجییەكا
هوین بكەن خودێ پێ ئاگەهە. و كارێ خۆ بكەن
[بۆ وەغەرا دنیایێ] و ب ڕاستی چێترین خۆكاركرن
[بۆ وەغەرا قیامەتێ] پارێزكارییە، و گەلی ئاقلداران
پارێزكارییا من بكەن. ﴿١٩٨﴾ چو گونەهـ بۆ هەوە تێدا
نینە هوین [دەمێ حەجێ] كەرەم و خێران ژ خودایێ
خۆ بخوازن [ئانكو بازرگانییێ بكەن]، ڤێجا ئەگەر
هوین ژ عەرەفاتێ دارژیانە خوارێ زكرێ خودێ
ل مەشعەروڵحەرامێ (جهەكە كو دبێژنێ موزدەلیفە)
بكەن و هوین وەسا زكرێ وی بكەن، هەروەكی وی
[خودێ] هوین ڕاستەڕێ كرین، و هوین ب خۆ
بەری نوكە ژ ڕێ بەرزەیان بوون. ﴿١٩٩﴾ پاشێ دارژنە
خوارێ ژ [موزدەلیفەیێ]، وی جهێ خەلك ژێ
دادرژتە خوارێ، و داخوازا گونەهـ ژێبرنێ ژ خودێ
بخوازن، ب ڕاستی خودێیە گونەهـ ژێبەر و دلۆڤان. ﴿٢٠٠﴾ ڤێجا ئەگەر هەوە ڕێ و نیشانێت خۆ یێت حەجێ
ب دویماهی ئینان، خودێ بیننە بیرا خۆ كا چاوا هوین باب و باپیرێت خۆ دئیننە بیرا خۆ، [بەحسێ باشییێت
وان دكەن] بەلكوو [ژ باب و باپیرێت خۆ] پتر خودێ بیننە بیرا خۆ، هندەك مرۆڤ هەنە [ب ڤی ڕەنگی
داخوازێ دكەن]، دبێژن: خودایێ مە، د دنیایێدا چاكییێ د گەل مە بكە و د ئاخرەتێدا وان چو بار و پشك
نینن و د زڕبارن. ﴿٢٠١﴾ و هندەك ژی [ژ مرۆڤان] هەنە [ب ڤی ڕەنگی داخوازێ دكەن] دبێژن: خودایێ مە،
تو د دنیایێدا قەنجییێ د گەل مە بكە، و د ئاخرەتێدا قەنجییێ د گەل مە بكە، و مە ژ ئێزا و نەخۆشییا ئاگرێ
دۆژەهێ بپارێزە. ﴿٢٠٢﴾ ڤێجا ئەڤان ژ بەر كار و كریارێت كرین بار و پشكەك هەیە و خودێ د حسابێدا یێ
دەست سڤكە.

الحِزْبُ ٤

۞ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن تَعَجَّلَ فِي
يَوۡمَيۡنِ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۖ لِمَنِ
ٱتَّقَىٰۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ٢٠٣
وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا
وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ٢٠٤
وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ
وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ٢٠٥ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ
أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِۚ فَحَسۡبُهُۥ جَهَنَّمُۖ وَلَبِئۡسَ
ٱلۡمِهَادُ ٢٠٦ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ
مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ٢٠٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ
ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٢٠٨ فَإِن زَلَلۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ
مَا جَآءَتۡكُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ٢٠٩
هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِي ظُلَلٖ مِّنَ ٱلۡغَمَامِ
وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ٢١٠





﴿٢٠٣﴾ و هوین خودێ د چەند ڕۆژەکێت هەژمارتیدا [کو ڕۆژا یازدێ و دوازدێ و سێزدێیە ژ زیلحجەیێ] بیننە بیرا خۆ [و زکرێ (الله أکبر) ل دویڤ نڤێژان و د گەل ڕەجمێ بکەن]، و هەر کەسێ لەزێ ل ڕەجمێ بکەت و د دو ڕۆژاندا ب جە بینیت چو گونەه بۆ نینە، و یێ گیرۆببیت [بۆ هەر سێ ڕۆژان بهێلیت] چو گونەه ل سەر نینە، ئەڤە بۆ وییە یێ ژ خودێ بترسیت، و پارێزکارییا خودێ بکەت، و بزانن هوین دێ بەر ب ویڤە ئێنە کۆمکرن. ﴿٢٠٤﴾ ژ مرۆڤان هندەك هەنە ئاخڤتنا وان د دنیایێدا گەلەك یا ب دلێ تەیە، و خودێ دکەتە شاهد ل سەر یا د دلێ خۆدا، و ئەو ب خۆ دژوارترین دژمنن. ﴿٢٠٥﴾ و هەر گاڤەکا پشت دا هەوە، و ژ دەڤ هەوە چۆ د ئەردیدا دگەڕیت، دا خرابییێ تێدا بکەت، و دەرامەت و ڕەڤێژێ پویچ و وێران بکەت، و خودێ حەژ پویچاتی و وێرانکرنێ ناکەت. ﴿٢٠٦﴾ و هەر دەمەکێ بۆ [ڤی دوڕوی] بێتە گۆتن: ژ خودێ بترسە، سەرێ وی مەزن دبیت ب گونەهێ [ژ خۆ ناگریت بهێلیت]، هەما دۆژەهـ بەسی وییە، و ئەو چ پیسە جهە. ﴿٢٠٧﴾ و هندەك ژ مرۆڤان ژی هەنە، جانێ خۆ د بەر ڕازیبوونا خودێدا ددەن، و خودێ د گەل بەندەیان دلۆڤانە. ﴿٢٠٨﴾ گەلی خودان باوەران، ب سەر و زار و دلێ خۆڤە ببنە موسلمان، و ئیسلامەتییێ هەمییێ وەرگرن، و نەدەنە دویڤ دەوسێت شەیتانی، ب ڕاستی ئەو بۆ هەوە دژمنەکێ ئاشکەرا ئاشکەرایە. ﴿٢٠٩﴾ و ئەگەر پشتی نیشانێت ئاشکەرا بۆ هەوە هاتین، هوین تەحسین، و ژ هەقییێ [کو ئیسلامە] ڤاڕێبوون، بزانن خودێ یێ سەردەست و کاربنەجهە. ﴿٢١٠﴾ ل هیڤیا چنە؟! خودێ د ناڤ سیبەرا عەورانڕا و د گەل ملیاکەتان ب سەر واندا بێت [هاتنەکا بێ چاوایی کو شایی (لائیقی) مەزناتییا خودێ بیت]، [دا حسابێ د گەل هەوە بکەت]، و فەرمانا خودێ [ب ئیزادانا هەوە] دویماهی پێ هات، و هەمی کاروبار هەر ب بال خودێڤە دزڤڕن و [ئەو هەر کارەکی جزایێ وی ددەتێ].

سَلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍۗ وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ
ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢١١﴾ زُيِّنَ
لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ
ٱتَّقَوْا۟ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢١٢﴾
كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ
وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ
فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعْدِ
مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ
إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا
يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ
وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ
ٱللَّهِۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلْ
مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ
وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾



﴿٢١١﴾ [هەی موحەمەد و گەلی موسلمانان] ژ
ئسرائیلییان بپرسە! کا مە چەند نیشان و موعجیزەیێت
ئاشکەرا داینە وان [ل سەر دەستێ پێغەمبەرێت
وان]، ڤێجا کەسێ خێر و کەرەمێت خودێ، پشتی
بۆ هاتین بگوهۆڕیت، [ڕاستەڕێکرنا خودێ بدەتە ب
گاورییێ]، ئیزا و نەخۆشییا خودێ [د ڕاستا ویدا]
گەلەکا دژوارە. ﴿٢١٢﴾ ژین و ژیارا دنیایێ بۆ گاوران
یا هاتییە خەملاندن، [ژ بەرێ شەیتانیڤە چاڤ ل وان
هاتینە تاریکرن، ئاخرەتێ نابینن] و ترانەیان بۆ خۆ ب
خودان باوەران دکەن، و ئەوێت پارێزکارییا خودێ
کرین ڕۆژا قیامەتێ د سەر وانڕانە، و یێ خودێ بڤێت
دێ بێ هەژمار دەتێ. ﴿٢١٣﴾ ژ ڕێڤە خەلک هەمی
ئێک بوون [هەتا دەمێ نووح پێغەمبەر ژی ئێک
دین بوون، ژ نووحی و پێدا جودایی کەڤتیەناڤبەرا
وان]، ڤێجا خودێ پێغەمبەر هنارتن مزگینئین و
ئاگەهدارکەر، و کتێب ب هەقییێ پێرا [دگەل وان]
هنارتن، دا حوکمی د ناڤبەرا خەلکیدا بکەن ل سەر
تشتێ خەلک تێدا نەئێک و ژێک جودا، د ڕاستا
ڤێ هەقییێدا ئەو ژێک جودابوون، ئەوێت کتێب بۆ هاتین [دا ژێکجودابوون نەمینیت] ئەڤە ژی پشتی
نیشانێت ئاشکەراکەر گەهشتینە وان، و ژ زکڕەشی. ئەوێت باوەری ئینایین خودێ ب دەستویرا خۆ ب سەر
هەقییا خودان کتێب تێدا نەئێک، هلکرن. و یێ خودێ بڤێت دێ بەرێ وی دەتە ڕێکەکا ڕاست [هەق].
﴿٢١٤﴾ [گەلی موسلمانان]، هەوە ل بەرە هوین بچنە بەحەشتێ، و هێژ ئەو نەهاتییە سەرێ هەوە یا هاتییە
سەرێ یێت بەری هەوە. ترس و تەنگاڤی و نەخۆشییان هنگاڤتن، هندە هەژیان [هند نەخۆشی و ئیزا بۆ وان
چێبوو]، هەتا وێ ڕادەیێ کو پێغەمبەر و یێت باوەری پێ ئینایی پێکڤە دگۆتن: کا کەنگی هاریکارییا خودێ
دێ بۆ مە ئێت؟ [د وی دەمیدا مزگینییا خودێ بۆ وان هات]. و ب ڕاستی هندی هاریکاری و پشتەڤانییا
خودێیە یا نێزیکە [نەیا دویرە]. ﴿٢١٥﴾ ژ تە دپرسن: کا دێ چ مەزیێخن [د ڕێکا خودێدا]؟ بێژە: هەر خێرەکا
هوین بدەن، بلا بۆ دەیباب و نێزیک (کەس و کار) و سێوی و بەلنگاز و ڕێڤینگان بیت، و هەر خێرەکا هوین
بکەن ب ڕاستی خودێ پێ ئاگەهە.

كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ وَهُوَ كُرۡهٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ
شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ
لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٢١٦ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ
ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ كَبِيرٞۚ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ
ٱللَّهِ وَكُفۡرُۢ بِهِۦ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَإِخۡرَاجُ أَهۡلِهِۦ مِنۡهُ
أَكۡبَرُ عِندَ ٱللَّهِۚ وَٱلۡفِتۡنَةُ أَكۡبَرُ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۗ وَلَا يَزَالُونَ
يُقَٰتِلُونَكُمۡ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمۡ عَن دِينِكُمۡ إِنِ ٱسۡتَطَٰعُواْۚ وَمَن
يَرۡتَدِدۡ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتۡ وَهُوَ كَافِرٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ
حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ
ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢١٧ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ
هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ
ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٢١٨ ۞يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ الحزب ٤
قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثۡمُهُمَآ أَكۡبَرُ
مِن نَّفۡعِهِمَاۗ وَيَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلِ ٱلۡعَفۡوَۗ كَذَٰلِكَ
يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَتَفَكَّرُونَ ٢١٩



﴿٢١٦﴾ شەڕكرن [د ڕێكا خودێدا]، ل سەر هەوە هاتە نڤێسین، و ئەو ب خۆ بۆ هەوە نەخۆشە، و ل سەر هەوە یا گرانە، دبیت هەوە تشتەك نەڤێت، و ئەو ب خۆ باشی بیت بۆ هەوە، و دبیت هوین حەژ تشتەكی بكەن، و ئەو ب خۆ خرابی بیت بۆ هەوە، و خودێ دزانیت [كا باشییا هەوە د چ ڕایە] و هوین نوزانن.
﴿٢١٧﴾ پسیارا بڕیارا (حكم) شەڕكرنێ د هەیڤێت حەرامكریدا [زیلقیعدە، زیلحیجە، و موحەڕەم و ڕەجەبێ] ژ تە دكەن، كا شەڕ تێدا هەیە؟! بێژە: شەڕكرن د واندا [گونەهەكا] مەزنە، و ڕێگرتن ژ ڕێكا خودێ و نەباوەری ئینان پێ، و دەرگەهـ گرتنا كەعبەیێ ل سنگێ خەلكێ، و دەرێخستنا خەلكێ مەكەهێ [كو ئەڤە هەمی گاورێت مەكەهێ دكر]، مەزنترە ل دەڤ خودێ [ژ شەڕێ د هەیڤێت حەرامكریدا]، و ئیزا و نەخۆشییا هوین ددەنە بەر موسلمانان، دا بەرێ وان ژ دینێ وان بێتە وەرگێڕان، ژ كوشتنێ مەزنترە. و [بوت پەرێس و گاور] دێ هەر شەڕی د گەل هەوە كەن، هەتا ڕێكا هەوە ل سەر دینێ هەوە دگوهێزن ـ ئەگەر شیان ـ چ یێ ژ هەوە ژ دینێ خۆ وەرگەڕیت و بمریت و ئەو یێ گاور ئەها ئەڤنە كار و كریارێت وان د دنیایێ و ئاخرەتێدا پویچ دبن، و ئەڤنە دۆژەهی و هەروهەر دێ تێدا بن. ﴿٢١٨﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ئینایین، و ئەوێت مشەختبووین، و جیهاد د ڕێكا خودێدا كرین ئەڤە ل هیڤییا دلۆڤانییا خودێنە، و خودێ لێنەگر و دلۆڤانە. ﴿٢١٩﴾ پسیارا مەی و قومارێ ژ تە دكەن، بێژە: زیان و گونەهەكا مەزن یا د هەردوكاندا، و قازانج ژی د هەردوكاندا هەیە، بەلێ زیانا وان پترە ژ قازانجێ وان، [هەروەسا] پسیارێ ژ تە دكەن، كا چ [ژ مالێ] خۆ بدەن، بێژە: یێ ژ هەوجەییا هەوە زێدە. هۆسا خودێ نیشانێت [هەیین و زەبەردەستیا خۆ] بۆ هەوە دیار دكەت، دا هوین هزرا خۆ بكەن.

فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۗ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡيَتَٰمَىٰۖ قُلۡ إِصۡلَاحٞ لَّهُمۡ
خَيۡرٞۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ ٱلۡمُفۡسِدَ مِنَ
ٱلۡمُصۡلِحِۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعۡنَتَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٢٢٠﴾
وَلَا تَنكِحُواْ ٱلۡمُشۡرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤۡمِنَّۚ وَلَأَمَةٞ مُّؤۡمِنَةٌ
خَيۡرٞ مِّن مُّشۡرِكَةٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡۗ وَلَا تُنكِحُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ
حَتَّىٰ يُؤۡمِنُواْۚ وَلَعَبۡدٞ مُّؤۡمِنٌ خَيۡرٞ مِّن مُّشۡرِكٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكُمۡۗ
أُوْلَٰٓئِكَ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ وَٱلۡمَغۡفِرَةِ
بِإِذۡنِهِۦۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٢١﴾
وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِۖ قُلۡ هُوَ أَذٗى فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي
ٱلۡمَحِيضِ وَلَا تَقۡرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَۖ فَإِذَا تَطَهَّرۡنَ فَأۡتُوهُنَّ
مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾
نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ وَقَدِّمُواْ
لِأَنفُسِكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُۗ وَبَشِّرِ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢٢٣﴾ وَلَا تَجۡعَلُواْ ٱللَّهَ عُرۡضَةٗ لِّأَيۡمَٰنِكُمۡ أَن تَبَرُّواْ
وَتَتَّقُواْ وَتُصۡلِحُواْ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢٢٤﴾





﴿٢٢٠﴾ د دنیایێ و ئاخرەتێدا [بزانن یێ ژ هەوجەییا هەوە زێدە د دنیایێدا بێخنە د خزمەتا ئاخرەتێدا]. و پسیارا ئێتیم و سێوییان ژ تە دکەن، بێژە: قەنجی د گەل وان چێترە، و ئەگەر هوین مالێ وان د گەل یێ خۆ تێکەل بکەن، [و پێکڤە بژین] برایێت هەوە [یێت دینی]نە، و خودێ خراب و قەنجان ژێك دنیاسیت، و ئەگەر خودێ ڤیابایە دا هەوە تەنگاڤ کەت، ب ڕاستی خودێ زال و کاربنەجهە. ﴿٢٢١﴾ ئەڤێت هەڤال و هۆگران بۆ خودێ چێ دکەن، مارە نەکەن هەتا موسلمان نەبن، و جارییەکا موسلمان ژ ژنەکا [موشرك] چێترە هەکە خۆ دلێ هەوە ژی ل سەر بیت، و کچێت خۆ ل موشرکان مارە نەکەن هەتا موسلمان نەبن. بەندەیەکێ موسلمان ژ زەلامەکێ موشرك چێترە، هەکە خۆ ب دلێ هەوە ژی بیت، [ئەو هەڤال و هۆگر چێکەر] بەرێ مرۆڤی ددەنە ئاگری، و خودێ ب دەستویرا خۆ بەرێ مرۆڤی ددەتە بەحەشتێ و لێ خۆشبوونێ و نیشانێت [هەیین و دەستهەلاتدارییا] خۆ بۆ خەلکی دیار دکەت، بەلکی [پێڤەچۆن و تۆبە] بێتە بیرا وان. ﴿٢٢٢﴾ و پسیارا بێ نڤێژییێ [چۆنا نڤینا ژنێ د بێ نڤێژییێدا] ژ تە دکەن [هەی موحەمەد]، بێژە: بێ نڤێژی [نڤینا ژنێ د بێ نڤێژییێدا] زیان و ئێزایە، نەچنە نڤینا ژنان د بێ نڤێژییێدا، و نێزیکی وان نەبن [نەچنە نڤینا وان] هەتا پاقژ نەبن [ژ بێ نڤێژییێ خلاس نەبن و خوینا وان ڕانەوەستیت]، ڤێجا ئەگەر خۆ شویشتن، و خۆ ب نڤێژ ئێخستن، هەرنە نڤینا وان، هەروەکی خودێ گۆتییە هەوە، ب ڕاستی خودێ حەژ تۆبەداران دکەت، و هەروەسا حەژ پاقژان ژی دکەت. ﴿٢٢٣﴾ ژنکێت هەوە زەڤینە بۆ هەوە [جهێ شینکرنا دویندەهێنە]، ڤێجا کا هەوە چاوا بڤێت هەرنە زەڤیا خۆ [هەرنە نڤینا ژنا خۆ]، و کار و کریارێت باش بدەنە پێشییا خۆ [بەری خۆ بهنێرن]، و ژ خودێ بترسن و بزانن هوین هەر دێ گەهنە خودێ، و مزگینییێ بدە باوەرداران. ﴿٢٢٤﴾ و سویندخوارنا خۆ ب خودێ نەکەنە هەجەت و مهانە، بۆ نەکرنا باشییێ و پارێزکارییێ و خۆشکرنا ناڤبەرا خەلکی، و خودێ یێ گوهدار و زانایە.

لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتۡ
قُلُوبُكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ٢٢٥ لِّلَّذِينَ يُؤۡلُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ تَرَبُّصُ
أَرۡبَعَةِ أَشۡهُرٖۖ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٢٢٦ وَإِنۡ عَزَمُواْ
ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ٢٢٧ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ
ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكۡتُمۡنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِيٓ أَرۡحَامِهِنَّ
إِن كُنَّ يُؤۡمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي
ذَٰلِكَ إِنۡ أَرَادُوٓاْ إِصۡلَٰحٗاۚ وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ
وَلِلرِّجَالِ عَلَيۡهِنَّ دَرَجَةٞۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ٢٢٨ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ
فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ
مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ
فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ
بِهِۦۗ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعۡتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٢٢٩ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا
غَيۡرَهُۥۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن
يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۗ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ٢٣٠





﴿٢٢٥﴾ خودێ ب سویندا بێ ئنیەت و یا بوویییە ئاخفتن ل هەوە ناگریت، بەلێ دێ وێ سویندێ ل هەوە گریت، یا ژ دلێ هەوە دەردکەڤیت، و خودێ گونەهـ ژێبەر و بێنفرەهە [لەزێ ل جزاکرنێ ناکەت]. ﴿٢٢٦﴾ ئەو زەلامێت سویند دخۆن کو نەچنە نڤینا ژنێت خۆ، بۆ وان هەیە چار هەیڤان خۆ بگرن، و ئەگەر لێڤەبوون و [سویندا خۆ شکاندن] دڤێت بزانن خودێ لێنەگر و دلۆڤانە. ﴿٢٢٧﴾ [و ئەگەر لێڤە نەبوون] و بەردان کرنە دلێ خۆ، [دڤێت بزانن] ب ڕاستی خودێ یێ گوهدار و زانایە. ﴿٢٢٨﴾ و ژنێت بەردایی [شکرا یێت ڤەگوهاستییە] دڤێت بەری شوی بکەن، سێ ژڤانان (بێ نڤێژییان، یان پاقژییان) خۆ بگرن، و بۆ وان نەدورستە تشتێ خودێ د مالبچویکێ واندا چێکری ڤەشێرن، ئەگەر [ڕاست] باوەرییێ ب خودێ و ڕۆژا قیامەتێ دئینن. و بۆ زەلامێت وان [بەری ژڤانێت (بێ نڤێژییێت) وان ب دویماهی بێن] پتر هەق هەیە وان بزڤڕیننەڤە، ئەگەر [ئنیەتا وان یا خێرێ بیت] و پێکهاتن بڤێن ب قەنجی. و ژنان ژی هەقێ عەدەتی ل سەر زەلامان هەیە هەروەکی زەلامان هەق ل سەر وان هەی، و زەلامان پەیسکەك هەیە د سەر واندا [ئەو ژی ژ بەر مالخۆیاتی و بەرپسیارییا وییە ژ کاروبارێت مالێ] و خودێ یێ سەردەست و کاربنەجهە. ﴿٢٢٩﴾ بەردان [بەردانا لێ زڤرین تێدا ـ الطلاق الرجعی] دو جارانە، [پشتی هەر جارەکێ ژ ڤان] ڤێجا یان دەست دەینانە سەر ب قەنجی، یان دەست ژ سەرڕاکرنە ب قەنجی، و نەدورستە بۆ هەوە هوین تشتەکی ژ مەهرا هەوە داییە وان ببەن، ئەو نەبیت ئەگەر هەردو خۆ ل تخویبێت خودێ نەگرن، ڤێجا ئەگەر هوین ترسیان هەردو خۆ ل تخویبێت خودێ ناگرن. گونەهـ ل سەر هەردوکان نینە [ژن بەرانبەر بەردانا خۆ، هندەك ژ مەهرا خۆ بۆ زەلامێ خۆ بهێلیت، و زەلام وەربگریت بەرانبەر بەردانا وێ] ژن تشتەکی د پێش بەردانا خۆڤە بدەت، و ئەڤە بڕیار و تخویبێت خودێنە نەدەنە سەر، و یێت ددەنە سەر بڕیار و تخویبێت خودێ، ئەو ستەمکار ب خۆنە. ﴿٢٣٠﴾ ڤێجا ئەگەر [جارا سیێ] بەردا، ئێدی ب کێر وی [مێرێ ئێکێ] نائێت، هەتا شوی ب مێرەکێ دی نەکەت، ڤێجا ئەگەر مێرێ دوییێ ژی بەردا، چو ل سەر وان [مێرێ ئێکێ و ژنکێ] نینە جارەکا دی لێك بزڤڕنەڤە، ئەگەر د وێ هزرێدا بن کو دێ فەرمان و بڕیارێت (ئەحکامێت) خودێ ب جە ئینن، و ئەڤەنە تخویب و بڕیارێت خودێ، بۆ وان کەسێت دزانن و تێ دگەهن، [خودێ] دیار دکەت.

وَإِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ
أَوۡ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖۚ وَلَا تُمۡسِكُوهُنَّ ضِرَارٗا لِّتَعۡتَدُواْۚ وَمَن
يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوٗاۚ
وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡحِكۡمَةِ
يَعِظُكُم بِهِۦۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٣١﴾ وَإِذَا
طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحۡنَ
أَزۡوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوۡاْ بَيۡنَهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ
مِنكُمۡ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۗ ذَٰلِكُمۡ أَزۡكَىٰ لَكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ وَٱللَّهُ
يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾ ۞ وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ
كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ وَعَلَى ٱلۡمَوۡلُودِ لَهُۥ رِزۡقُهُنَّ
وَكِسۡوَتُهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ لَا تُكَلَّفُ نَفۡسٌ إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَا تُضَآرَّ
وَٰلِدَةُۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوۡلُودٞ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦۚ وَعَلَى ٱلۡوَارِثِ مِثۡلُ ذَٰلِكَۗ فَإِنۡ
أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٖ مِّنۡهُمَا وَتَشَاوُرٖ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَاۗ وَإِنۡ
أَرَدتُّمۡ أَن تَسۡتَرۡضِعُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ إِذَا سَلَّمۡتُم مَّآ
ءَاتَيۡتُم بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿٢٣٣﴾

نصف الحزب ٤



﴿٢٣١﴾ هـەر گاڤەكا هـەوە ژی [ب دو تەلاقان (بەركان)] بـەردان، و ئـەو گەهشـتنە دویماهیـكا دەمـێ خۆگرتنـێ، ڤێجـا یـان ب قەنجـی دەسـتێ خـۆ داننـە سـەر وان، یان ژی ب قەنجـی دەسـتێ خـۆ ژ سـەر وان ڕاكـەن (ئانكـو بـەردەن)، و ب مەرەمـا ئیزادان و دەسـتدرێژییێ دەسـتێ خـۆ نەداننـە سـەر وان، و هەر كەسـێ ڤێ بكـەت، ئەوی [ب ڕاسـتی] سـتەم ل خـۆ كـر، و نیشـان و بڕیارێـت خـودێ نەكەنـە ترانـە و یـاری، و نیعمـەت و كەرەمـا خـودێ د گـەل هـەوە كری بیننە بـیرا خۆ (ژ بـیر نەكەن)، و [هەروەسـا] ئەو كتێب و ئاقلدارییا [ڕێـكا پێغەمبەری] ب سـەر هـەوەدا داڕێتی، ئـەوا هەوە پێ شـیرەت دكەت، بیننـە بـیرا خـۆ و ژ بـیر نەكـەن و ژ خـودێ بترسـن، و بزانـن [بـێ گۆمـان] خـودێ ژ هەمـی تشـتی ب ئاگەهە. ﴿٢٣٢﴾ و هـەر گاڤـەكا هـەوە ژن بـەردان، و ژڤانـێ خـۆ تەمامكـرن [و ڤیـان ل زەلامێـت خـۆ بزڤـڕن] نەكەڤنـە د ڕێـكا وانـدا، و نەبنـە ئاسـتەنگ، كـو ل زەلامێـت خـۆ بزڤڕنەڤـە، ئەگـەر هـەردو د ناڤبەرا خـۆدا ب قەنجی پێك خـۆش بـوون. ئەڤـێ ئـەو بـۆ خـۆ دكەنـە دەرس یێـت بـاوەری ب خـودێ و ڕۆژا قیامەتـێ هەیـن، و ئەڤـە [ئـەڤ بڕیـار و ڕاسـتەڕێكرنە] بـۆ هـەوە چێـتر و پاقژتـرە و خـودێ دزانیـت و هویـن نوزانـن. ﴿٢٣٣﴾ و دەیكێـت بچویـك شـیر [ئەوێت بەردایی] دێ دو سـالێت دورسـت شـیری دەنـە بچویكێـت خـۆ، ئەڤـە بـۆ یـا بڤێـت شـیردانا خـۆ تەمـام بكـەت، و بابـێ بچویكـی ل دویڤ شـیانا خـۆ، خـوارن و ڤەخـوارن و جلكێـت ژنـێ [دەیـكا بچویكـی] ل سـەرن، و هـەر ئێكـی هنـد ژێ دئێتە خواسـتن هنـدی بشـێت، نـە دەیـك بابـێ بچویكی ئیـزا بـدەت و بئێشـینیت (هنـد ژێ بخوازیت كو پـێ چێ نەبیـت)، و نە بـاب دەیكـێ ب بچویكـی ئیـزا بدەت و بئێشـینیت (هنـدێ نەدەتێ كو بشـێت د بەر خـۆدا بـدەت)، و میراتخۆرێ بچویكـی ژی دڤێـت یـێ هۆسـا بیـت. و ئەگـەر وان ڤیـا ب دلخۆشـی و مشـێورەت [بـەری وەختـی] بچویكی ژ شـیرڤە بكـەن، چـو گونەهــ ل سـەر وان نینـە، و ئەگەر هـەوە ڤیـا داییـنان بـۆ بچویكێـت خـۆ بگرن، چـو گونەهـ ل سـەر هـەوە نینـە ئەگـەر هوین هەقێ شـیرێ وان ب دورسـتی بدەنـێ، و ژ خودێ بترسـن و بزانن تشـتێ هوین دكـەن خـودێ دبینیت.

وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ
أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَعَشۡرٗاۖ فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ
فِيمَا فَعَلۡنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ٢٣٤
وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا عَرَّضۡتُم بِهِۦ مِنۡ خِطۡبَةِ ٱلنِّسَآءِ
أَوۡ أَكۡنَنتُمۡ فِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمۡ سَتَذۡكُرُونَهُنَّ
وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُواْ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗاۚ
وَلَا تَعۡزِمُواْ عُقۡدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡكِتَٰبُ أَجَلَهُۥۚ
وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ
أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ ٢٣٥ لَّا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ إِن طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ
مَا لَمۡ تَمَسُّوهُنَّ أَوۡ تَفۡرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى
ٱلۡمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلۡمُقۡتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعَۢا بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى
ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٢٣٦ وَإِن طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدۡ
فَرَضۡتُمۡ لَهُنَّ فَرِيضَةٗ فَنِصۡفُ مَا فَرَضۡتُمۡ إِلَّآ أَن يَعۡفُونَ
أَوۡ يَعۡفُوَاْ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ عُقۡدَةُ ٱلنِّكَاحِۚ وَأَن تَعۡفُوٓاْ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۚ
وَلَا تَنسَوُاْ ٱلۡفَضۡلَ بَيۡنَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ٢٣٧



﴿٢٣٤﴾ ژ هەوە ئەوێت دمرن و ژنان ب پاش خۆڤە دهێلن، دڤێت [ئەڤ ژنە بەری شوی بکەن] چار هەیڤ و دەه ڕۆژان خۆ بگرن، ڤێجا ئەگەر گەهشتنە دویماهییا دەمێ خۆگرتنێ، چو گونەه ل سەر هەوە نینە، ئەو دویڤ عادەتی کارێ خۆ بکەن [دا بێنە خواستن و جارەکا دی شویکەن] و خودێ ب کار و کریارێت هوین دکەن ئاگەهدار و شارەزایە. ﴿٢٣٥﴾ و گونەه ل سەر هەوە نینە [نە د گونەهکارن]، هوین [بێژنێ بەری ڕۆژێت خۆگرتنێ ب دویماهی بێن] ب ڕەنگەکی تێ بگەهینن کو هەوە دل پێ ل سەر. یان بێخنە د دلێ خۆدا [چ گاڤا ڕۆژێت خۆگرتنێ تەمامبوون مار بکەن]، [بەلێ نابیت هوین ئێکسەر بخوازن] خودێ زانی هوین دێ سوحبەتا وان کەن [کو هەوە دلێ ل سەر وان] بەلێ چو ژڤانان ب دزیکیڤە نەدەنە وان ژ بلی هندێ هوین ئاخڤتنەکا عەدەتی بێژن [بدەنێ] [وەکی هێژ تو یا ل سەر خۆ، من دل تێ هەیە ئێکا وەکی تە بۆ خۆ بینم، کو تێ بگەهیت پێ، تە چ ل بەرە]، و مار نەکەن هەتا دەمێ وێ یێ خۆگرتنێ ب دویماهیك نەئێت، و بزانن خودێ یا د دلێ هەوەدا دزانیت، [ڤێجا ژ بەر هندێ] خۆ ژێ بپارێزن [ب کرنا تاعەتان و دانەپاشا گونەهان] و گوهدارییا وی بکەن، و بزانن بێ گۆمان خودێ گونەهـژێبەر و بێنفرەهە ل سەر جزادانێ. ﴿٢٣٦﴾ چو گونەه ل سەر هەوە نینە، ئەگەر هوین ژنان بەردەن بەری هوین بچنە نڤینا وان، یان مەهرەکێ [مارەکێ] بۆ وان ڤەبڕن، دەستفرەه ل دویڤ دەستفرەهییا خۆ، دەستتەنگ ل دویڤ دەستتەنگییا خۆ، دڤێت هەر ئێك متا و پەرگالەکی [ئانکو تشتەکی بۆ دلێ وان] بدەتە وان، تشتەك بیت ب وی ڕەنگێ خودێ پێ ڕازی و ل دویڤ ئێجادا (عورفێ) خەلکی، ئەڤە ئەرکەکە ل سەر قەنجیکاران. ﴿٢٣٧﴾ و هەکە هەوە [ژن] بەردان بەری هوین بچنە نڤینا وان، و هەوە بەری هنگی مارا وێ دیار کربیت. نیڤا هەوە ڤەبڕی [دڤێت هوین بدەنێ] ژ بلی هندێ ئەو ب خۆ وێ نیڤێ بهێلیت، یان ئەوێ مارکرن د دەستدا، هەمییێ (هەمی مەهرێ) بۆ ژنێ بهێلیت. و ئەگەر هوین [مەخسەد پێ هەردوکن و باراپتر زەلامە] بهێلن [و هەمی مارێ بدەنێ و ب نیڤی نەکەن]، و هەچییێ یێ دی ئازا بکەت پتر نێزکی پارێزکارییێیە، و قەنجی و چاکییێ د ناڤبەرا خۆدا ژ بیر نەکەن، ب ڕاستی خودێ ب کار و کریارێت هوین دکەن ب ئاگەهە و دبینیت.

حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ
قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًاۖ فَإِذَآ أَمِنتُمْ
فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٩﴾
وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا
وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍۚ فَإِنْ
خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ
مِن مَّعْرُوفٍۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٤٠﴾ وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعُۢ
بِٱلْمَعْرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ
ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ
إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ
فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُواْ ثُمَّ أَحْيَٰهُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ
عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾
وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٤﴾ مَّن
ذَا ٱلَّذِي يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا
كَثِيرَةًۚ وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٤



﴿٢٣٨﴾ [گەلی موسلمانان] بەردەوام بن ل سەر نڤێژێت
خۆ، و نڤێژا ئێڤاری [ژ بیر نەکەن] و ب گوهداری ب
بەر خودێڤە رابن، و هوین وی ژ دل بپەرێسن [نڤێژان
بکەن]. ﴿٢٣٩﴾ ڤێجا ئەگەر هوین [ژ بەر شەڕی یان
ژ بەر هەر تشتەکێ دیتر] ترسیان، [نڤێژێت خۆ]
پەیادە یان سویار بکەن، [و پاشی] ئەگەر هوین ئێمن
بوون، وەسا خودێ بپەرێسن [نڤێژان بکەن] وەکی
وی هوین فێرکرین و بەری هنگی هەوە نەدزانی.
﴿٢٤٠﴾ و ژ هەوە ئەوێت دمرن و ژنان ب پاش خۆڤە
دهێلن، دڤێت وەسیەتێ بۆ هەڤسەرێت خۆ بکەن
کو سالەکێ د مالدا بمینن، و بێنە خودانکرن و نەئێنە
دەرئێخستن، [ب وی شەرتی کو مالا هەڤسەرێت
خۆ نەهێلن و د ڤی دەمیدا شوی نەکەن]، و ئەگەر
ئەو ژ دەڤ خۆ دەرکەڤتن، چو گونەه ل سەر هەوە
نینە، چ یا ئەو ل دویڤ عەدەتی ل خۆ بکەن [کو
خۆ بخەملینن و هندەك بێنە پێش بۆ دیتنێ] خودێ
سەردەست و کاربنەجهە. ﴿٢٤١﴾ و ژنێت بەردایی،
دڤێت متا و خەلاتەکێ قەنج بۆ بێتە ڤەبڕین [ژ بەرێ
زەلامانڤە بێتە دان]، و ئەڤە هەقە ل سەر کەسێت تەقوادار و ژ خودێ ترس. ﴿٢٤٢﴾ هۆسا خودێ بڕیار و
نیشانێت خۆ بۆ هەوە دیار دکەت، بەلکی هوین ئەقلەکی بۆ خۆ [ژێ] بگرن. ﴿٢٤٣﴾ ما تە چیرۆکا وان
نەبهیستییە ئەوێت ژ وار و وەلاتێ خۆ دەرکەڤتین و ئەو ب هزارانن ژ مرنێ ڕەڤین (ژ ترسا مرنێ)، خودێ
گۆتە وان بمرن [مرن] پاشی ساخکرنەڤە، ب ڕاستی خودێ گەلە قەنجی و کەرەم ل سەر خەلکی هەنە،
بەلێ باراپتر ژ خەلکی [ژ مرۆڤان] ناشوکورینن و سوپاسی ناکەن [قەنجی و کەرەما خودێ نائێتە بەرچاڤان].
﴿٢٤٤﴾ ڤێجا [گەلی خودان باوەران] د ڕێکا خودێدا شەڕی بکەن و بزانن [بێ گۆمان] خودێ گوهدێر و
زانایە. ﴿٢٤٥﴾ ڤێجا کییە قەرەکێ باش د گەل خودێ بکەت [قەنجییێ بکەت دا خودێ خەلات بکەت]، دا
خودێ هندی وی [قەری] و تەمەتی وی بۆ زێدە بکەت، و خودێیە، یێ کێم و زێدە دکەت، و ئەوە یێ هوین
دێ چنە بەر دەستان و ب بالڤە زڤڕن.

أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰٓ إِذۡ
قَالُواْ لِنَبِيّٖ لَّهُمُ ٱبۡعَثۡ لَنَا مَلِكٗا نُّقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ
قَالَ هَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُواْۖ
قَالُواْ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدۡ أُخۡرِجۡنَا
مِن دِيَٰرِنَا وَأَبۡنَآئِنَاۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ تَوَلَّوۡاْ
إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٤٦﴾ وَقَالَ لَهُمۡ
نَبِيُّهُمۡ إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ بَعَثَ لَكُمۡ طَالُوتَ مَلِكٗاۚ
قَالُوٓاْ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلۡمُلۡكُ عَلَيۡنَا وَنَحۡنُ أَحَقُّ
بِٱلۡمُلۡكِ مِنۡهُ وَلَمۡ يُؤۡتَ سَعَةٗ مِّنَ ٱلۡمَالِۚ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ
ٱصۡطَفَىٰهُ عَلَيۡكُمۡ وَزَادَهُۥ بَسۡطَةٗ فِي ٱلۡعِلۡمِ وَٱلۡجِسۡمِۖ
وَٱللَّهُ يُؤۡتِي مُلۡكَهُۥ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴿٢٤٧﴾
وَقَالَ لَهُمۡ نَبِيُّهُمۡ إِنَّ ءَايَةَ مُلۡكِهِۦٓ أَن يَأۡتِيَكُمُ
ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَبَقِيَّةٞ مِّمَّا
تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ تَحۡمِلُهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُۚ
إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٤٨﴾





﴿٢٤٦﴾ مـا تـە چـیرۆكا كەنكەنەیێـت ئسرائیلییـان پشـتی موسـا پێغەمبـەر بهیستیـیە، گاڤـا گۆتینـە پێغەمبەرەكێ خـۆ: میرەكی بۆ مە ڕاكـە [فرێكە دا ئەم د بن سـەرۆكاتییا ویڤـە] شـەڕی د ڕێـكا خودێـدا بكەین، پێغەمبـەرێ وان گـۆت: ئـەز دترسـم شـەڕ ل سـەر هـەوە بێتـە نڤێسـین و هویـن شـەڕی نەكـەن، [خـۆ پاشـڤە بكێشـن]. گۆتـن: ڤێجـا مـا بـۆچ ئـەم شـەڕی د ڕێـكا خودێـدا ناكەیـن و [پشـتی] ئـەم ژ نـاڤ وار و كـچ و كوڕێـت خـۆ هاتینـە دەرئێخسـتن؟! بەلـێ دەمـێ شـەڕ (جیهـاد) ل سـەر وان هاتییـە نڤێسـین، هەمیـیان پشـت دا شـەڕی، كێمـەك تـێ نەبـن، و خـودێ ب ئاگەهـە ژ ستەمكاران.

﴿٢٤٧﴾ و پێغەمبـەرێ وان گۆتـە وان: خودێ طالووت بۆ هـەوە ب میرینی هنارتیـیە، گۆتـن: [گۆتنـە پێغەمبەرێ خـۆ] دێ چـاوا بیتـە مـیرێ مـە و ئـەم ژ وی هێژاتـری میرینییـێینە، و ئـەو نەگەلەكـێ ب مالـە؟! [پێغەمبـەرێ وان] گـۆت: خـودێ ئـەو ل سـەر هـەوە هلبژارتییـە [و خـودێ ژ كەرەمـا خـۆ] زێـدە زانـین و قەلافـەت و گەودەكـێ بـاش ژی یـێ دایـێ، و خـودێ ملـك و مالدارییـا خـۆ ددەتـە وی یـێ وی بڤێـت، ب ڕاسـتی [د دلۆڤانی و كەرەمـا خۆدا] خودێ یـێ بەرفرەهــو زانایە.

﴿٢٤٨﴾ پێغەمبەرێ وان گۆتە وان: نیشـانا میرینیــیا وی ئەوە: سـندرویك بۆ هەوە بێت كو دلڕەحەتی و دلخۆشـی ژ نـك خودایـێ هـەوە و شـوینهاییێت بنەمـالا موسـا پێغەمبـەر و هاروونـی تێـدا بـن، و ملیاكـەت هەلگـرن. ب ڕاسـتی ئـەڤ چەنـدە نیشـانەكا ئاشـكەرایە بـۆ هـەوە، ئەگـەر هویـن خـودان بـاوەر بـن.

فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِٱلۡجُنُودِ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبۡتَلِيكُم
بِنَهَرٖ فَمَن شَرِبَ مِنۡهُ فَلَيۡسَ مِنِّي وَمَن لَّمۡ يَطۡعَمۡهُ
فَإِنَّهُۥ مِنِّيٓ إِلَّا مَنِ ٱغۡتَرَفَ غُرۡفَةَۢ بِيَدِهِۦۚ فَشَرِبُواْ مِنۡهُ
إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
مَعَهُۥ قَالُواْ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلۡيَوۡمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦۚ
قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٖ
قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ
ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُواْ
رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا
عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ فَهَزَمُوهُم بِإِذۡنِ ٱللَّهِ
وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ
وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ
بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّفَسَدَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو
فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا
عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٥٢﴾



﴿٢٤٩﴾ ڤێجا دەمێ طالووتی لەشکەر [ژ باژێری] دەرئێخستی، گۆتە وان: ب ڕاستی خودێ دێ هەوە ب ڕویبارەکی جەڕبینیت، ڤێجا هەچییێ ژێ ڤەخوار نە ژ [لەشکەرێ] منە، و یێ ژێ نەڤەخۆت ژ [لەشکەرێ] منە، ژ بلی هندێ کو ئێك مستەکێ ژێ ڤەخۆت [دا تێنا خۆ پێ بشکێنیت] هەمییان ژێ ڤەخوار، کەتەکا کێم تێ نەبیت، و دەمێ طالووت و ئەوێت باوەری د گەل ئینایین ژ [ڕویباری] دەرباز بوویین گۆتن: ئەڤرۆ مە شیانا شەڕێ جالووت و لەشکەرێ وی نینە. بەلێ ئەوێت پشت ڕاست کو دێ بەرانبەری خودێ بن، گۆتن: چەند جاران کۆمەکا بچویك ب ئانەهیيا خودێ ب سەر کۆمەکا مەزن کەڤتییە؟! و خودێ د گەل سەبرکێش و بێنفرەهانە. ﴿٢٥٠﴾ دەمێ [طالووت و لەشکەرێ وی] بەرانبەری جالووت و لەشکەرێ وی بوویین، گۆتن: خودێوۆ بێنفرەهییێ ب سەر مەدا داڕێژە و مە قاهیم بکە [پێییێت مە موکوم بکە و ڕاگرە]، و مە ب سەر گاوران (جالووت و لەشکەرێ وی) بێخە. ﴿٢٥١﴾ ڤێجا ب ئانەهیيا خودێ [طالووت و لەشکەرێ وی]، ئەو [جالووت و لەشکەرێ وی] شکاندن، و داوودی جالووت کوشت، ڤێجا خودێ میرینی و پێغەمبەراتی دانێ، و تشتێ خودێ ڤیایی نیشا دا. و ئەگەر خودێ هندەك ب هندەکان نەدابانە پاش، دا ئەرد پویچ بیت، [خودانێت پویچاتییان دا دەستێ خۆ دانن سەر و وێران کەن]. بەلێ خودێ خودان کەرەمە ل سەر هەمی جیهانان. ﴿٢٥٢﴾ ئەڤە [ئەڤ چیرۆکە] ژ نیشانێت خودێنە ئەم بۆ تە دخوینین، و تو ب خۆ ژی [ب ڕاستی] ژ پێغەمبەرانی.

۞ تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۘ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ ۖ
وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ ۚ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ
وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ
بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟
فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿٢٥٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟
مِمَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا
شَفَٰعَةٌ ۗ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ
ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ يَعْلَمُ
مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا
بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ
وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ
ٱلْغَىِّ ۚ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ
بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾



﴿٢٥٣﴾ ئەو پێغەمبەرێت [مە بەحسێ وان د ڤێ سۆرەتێدا كری]، مە هندەك ژ وان ب سەر هندەكان ئێخستین، هندەك ژ وان [وەكی مووسایی] خودێ ئاخافتییە و [خودێ] هندەك ژ وان پێكا وان بلند كرییە [كرییە سەروەرێ هەمی پێغەمبەران كو پێغەمبەرێ مەیە (سلاڤێت خودێ ل سەر بن)]. و مە موعجیزە و نیشانێت ئاشكەرا دانە عیسایێ كوڕێ مەریەمێ و مە پشتا وی ب جانێ پیرۆز [جبرائیل] قاهیم كر، [پشتی هنارتنا پێغەمبەران و نیشانێت ئاشكەرا ژێك چۆنە پاش و ژێك جودایی پەیدابوو، و كێشا هندێ خەلك ئێكدو بكوژن]. و ئەگەر خودێ ڤیابایە پێت پشتی وان [پێغەمبەران] شەڕێ ئێكدو نەدكرن، پشتی نیشانێت ئاشكەرا بۆ هاتین، بەلێ ژێك جودابوون. ڤێجا هندەك ژ وان باوەری ئینان و هندەك ژی گاور بوون، و ئەگەر خودێ ڤیابایە ب شەڕ نەدكەڤتن، بەلێ خودێ وێ دكەت یا وی دڤێت. ﴿٢٥٤﴾ گەلی خودان باوەران، ژ وی رزقی بدەن، یێ مە داییە هەوە، بەری رۆژەك ب سەر هەوەدا بێت، نە كڕین و فرۆتن تێدایە [هوین خۆ بكڕن] و نە هەڤالینی و نە مەهدەر تێدایە [بەرەڤانی ژ هەوە بێتەكرن]، و گاورن [وێ رۆژێ] ستەمكار. ﴿٢٥٥﴾ [گەلی خودان باوەران] خودا هەر ئێك خودایە، ژ بلی وی چو پەرستی [خودا] نینن، ئەوە یێ چو پەرستییێت دورست ژ بلی وی نەیی، ئەوە یێ هەروهەر مایی و [و د هەمی كاروبارێت هەبوونێدا] رێبەر، نە د نقرۆسك دچیت و نە د خەو.. هندی د ئەسماناندا و هندی ل سەر روییێ ئەردی، هەمی یێ وییە، كییە [ژ بەندەیێت خودێ بشێت] مەهدەرێ ل دەڤ بكەت بێی دەستویرا وی؟! خودێ ژ كار و كریارێت وان كرین و یێت دێ كەن، ب ئاگەهە، و [ئەو] ب سەر چو زانینا وی هلنابن، ئەو نەبیت یا وی [خودایی] ڤیایی، [ب رێكا پێغەمبەرێت خۆ] و كورسییا وی [خودێ دزانیت كا چییە] ئەرد و ئەسمان ڤەگرتینە، و راگرتنا هەردوكان ژی [ئەرد و ئەسمانان] لێ [ل خودێ] یا گران نینە. و ئەوە یێ خودان رێز و مەزنایی و پێكا بلند. ﴿٢٥٦﴾ كۆتەكی و خورتی د دینیدا نینە [ب خورتی خەلك بێتە موسلمانكرن] ب سویند (باوەری ئینان) و نەراستی (گاوری) ژێك هاتنە ڤاقارتن (ژێك هاتنە نیاسین)، ڤێجا كەسێ پشتا خۆ بدەتە سەرێ گاورییێ [ئەوێ شوینا خودێ دئێتە پەرستن] و باوەرییێ پێ نەئینیت، و باوەرییێ ب خودێ بینیت، ئەوی خۆ ب چنبلێ (قولپا) موكومڤە گرت [ئانكو رێكا سەرفەرازییێ] كو ڤەرەسیان بۆ نینە و خودێ گوهدێر و زانایە.

ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ
وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ
ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا
خَٰلِدُونَ ٢٥٧ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ
أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ إِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ
وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي
بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِي
كَفَرَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٢٥٨ أَوۡ كَٱلَّذِي
مَرَّ عَلَىٰ قَرۡيَةٖ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحۡيِۦ
هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٖ ثُمَّ بَعَثَهُۥۖ
قَالَ كَمۡ لَبِثۡتَۖ قَالَ لَبِثۡتُ يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۖ قَالَ بَل
لَّبِثۡتَ مِاْئَةَ عَامٖ فَٱنظُرۡ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمۡ يَتَسَنَّهۡۖ
وَٱنظُرۡ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجۡعَلَكَ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِۖ وَٱنظُرۡ إِلَى
ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ فَلَمَّا
تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٥٩



﴿٢٥٧﴾ خودێ هاریكار و پشتەڤانێ وانە یێت باوەری
ئینایین، وان ژ تاریستانان دەردئێخیتە ڕۆناهییێ، و
ئەوێت گاوربووییـن، شەیتان و سەرێت گاورییێ،
هاریكار و پشتەڤانێت وانن، وان ژ ڕۆناهییێ
دەردئێخنە تاریستانان، ئەڤە دۆژەهینە و هەروهەر دێ
تێدا مینن. ﴿٢٥٨﴾ ئەرێ ما تە چیرۆكا وی نەبهیستییە،
ئەوێ جڕەبڕ د گەل ئیبراهیم [پێغەمبەر] د ڕاستا
خودێدا كری، پشتی خودێ ب ملك و مال ئێخستی
و مەزنكری، [ڤێجا ب ملك و مالێ خۆ خڕیایی و
د سەرداچۆیی] دەمێ ئیبراهیم گۆتی: خودایێ منە
یێ ساخ دكەت و دمرینیت، گۆت: ئەز ژی ساخ
دكەم و دمرینم! [دو مرۆڤ ئینان، ئێك بەردا و ئێك
كوشت] ئیبراهیم گۆت [گۆتێ]: خودێ ڕۆژێ ژ
ملێ ڕۆژهەلاتێڤە دئینیت (دەردئێخیت)، [ئەگەر تو
ڕاست دبێژی] تو ژ ملێ ڕۆژئاڤاییێڤە بینە (دەربێخە)،
زمان ل ڤی گاوری شكەست و گوهشی، و خودێ
ملەتێ ستەمكار ڕاستەڕێ ناكەت. ﴿٢٥٩﴾ دیسا ما
تە چیڕۆكا یێ د بەر گوندەكیڕا بۆری نەبهیستییە، ئەو
گوندێ كاڤل و خانییێت وی ب سەر دیوارانـدا هەڕافتی [دەمێ] گۆتی: كەنگی خودێ دێ ڤی گوندی پشتی
كاڤلبوونا وی ئاڤاكەتەڤە؟! ڤێجا خودێ ئەو ب خۆ سەد سالان مراند، پاشی ساخكرەڤە، [خودێ ب ڕێكا
ملیاكەتی] پسیار ژێ كر، گۆتێ: تو چەند [مری]مایی؟ گوت: ڕۆژكێ یان دانەكێ ڕۆژێ، [خودێ ب ڕێكا
ملیاكەتی] گۆتێ: نە، تو سەد سالان [مری] مایی، بەرێ خۆ بدە خوارن و ڤەخوارنا خۆ، نەهاتییە گوهۆڕین
[هێژ ل سەر تام و ڕەنگێ خۆ یێ بەرێ ماییە]، و بەرێ خۆ بدە كەرێ خۆ [دا بزانی كا چاوا مری ساخ
دبنەڤە] و دا تە بكەینە نیشان و دەلیل بۆ خەلكی، [ل سەر ساخبوونا پشتی مرنێ]، و بەرێ خۆ بدە هەستییان
ئەم چاوا ددەینە ئێك و پاشی ب گۆشتی كراس دكەین، ڤێجا دەمێ بۆ دیاربوویی [و ب سەرێ وی ب خۆ
هاتی]، گۆت: ئەز دزانم كو خودێ خودان شیانە ل سەر كرنا هەمی تشتی.

وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيۡفَ تُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ قَالَ أَوَلَمۡ
تُؤۡمِنۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِيۖ قَالَ فَخُذۡ أَرۡبَعَةٗ مِّنَ
ٱلطَّيۡرِ فَصُرۡهُنَّ إِلَيۡكَ ثُمَّ ٱجۡعَلۡ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٖ مِّنۡهُنَّ جُزۡءٗا
ثُمَّ ٱدۡعُهُنَّ يَأۡتِينَكَ سَعۡيٗاۚ وَٱعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٢٦٠
مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ
أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ
يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ٢٦١ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ
أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتۡبِعُونَ مَآ أَنفَقُواْ مَنّٗا وَلَآ
أَذٗى لَّهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ
يَحۡزَنُونَ ٢٦٢ ۞ قَوۡلٞ مَّعۡرُوفٞ وَمَغۡفِرَةٌ خَيۡرٞ مِّن صَدَقَةٖ الحِزْب
يَتۡبَعُهَآ أَذٗىۗ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٞ ٢٦٣ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ
رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ
صَفۡوَانٍ عَلَيۡهِ تُرَابٞ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٞ فَتَرَكَهُۥ صَلۡدٗاۖ لَّا يَقۡدِرُونَ
عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّمَّا كَسَبُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٢٦٤



﴿٢٦٠﴾ و [و بۆ ملەتێ خۆ بێژە] دەمێ ئیبراهیم گۆتی: خودێوۆ، نیشا من بدە کا تو چاوا مرییان ساخ دکەی؟ [خودێ] گۆت: ما تە باوەری [ب شیانا من] نەئینابییە؟ گۆت: بەلێ [من باوەری هەیە]، بەس دا دلێ من تەنا ببیت، [خودێ] گۆتێ: چار بالەفڕان بینە، [سەرژێکە] و گۆشتێ وان ل دەڤ خۆ لێك بدە [د ناڤ ئێك هەلکە]، پاشی هەر چیایەکی پارچەیەکا گۆشتێ هەر ئێك ژ وان دانە سەر، پاشی گازی بکە وان، ب لەز دێ ئێنە دەڤ تە، و بزانە کو [ب ڕاستی] خودێ پێڤەهاتی و کاربنەجهە. ﴿٢٦١﴾ مەتەلا ئەوێت مالێ خۆ د ڕێکا خودێدا دمەزێخن وەکی مەتەلا دندکەکێیە حەفت گولی دابن، هەر گولییەکێ سەد دندك تێدا بن، و خودێ بۆ یێ بڤێت هندی دی لێ دکەت، و ب ڕاستی [د دلۆڤانی و کەرەما خۆدا] خودێ یێ بەرفرەهـ و زانایە. ﴿٢٦٢﴾ ئەوێت مالێ خۆ د ڕێکا خودێدا دمەزێخن، نە دکەنە منەت و نە دکەنە چکی [کو ئەزیەتێ پێ بگەهیننە یێ مال داینێ و هەڕۆ بدەنە ڕوییێ وان]، ئەڤان خەلاتێ خۆ ل دەڤ خودایێ خۆ هەیە، و نە ترس [ڕۆژا قیامەتێ] بۆ وان هەیە و نە ژی ب خەم دکەڤن. ﴿٢٦٣﴾ ئاخڤتنەکا خۆش و لێنەگرتن [ژ یێ ددەت بۆ یێ دخوازیت] چێترە ژ خێرەکێ ئەزیەت د دویڤرا بێت، و خودێ یێ دەولەمەندە [منەت ب مالێ هەوە نینە] و لەزێ ل جزادانێ ناکەت. ﴿٢٦٤﴾ گەلی خودان باوەران خێر و قەنجییێت (سەدەقەیێت) خۆ ب منەت و چکییێ (ئەزیەتێ) پویچ نەکەن، وەکی ئەوێ مالێ خۆ بۆ ڕویمەتی دمەزێخیت، و ئەو ژ خودێ و ڕۆژا ئاخرەتێ بێ باوەر، مەتەلا وی وەکی مەتەلا تەحتەکێیە ئاخ ل سەر بیت و تاڤییەکا بارانێ ژێ بگریت [ئاخێ ژێ بشۆت] و ڕویت و حولی بهێلیت، [ئەڤێت هۆسا، ئەوێت مالێ خۆ دکەنە منەت و چکی بۆ یێ ددەنێ و پێ دئێشینن] مالێ وان هەمی ژ دەست وان دەردکەڤیت [ژ خێرا وی بێ بارن، نەشێن مالێ خۆ ژی بزڤڕیننەڤە، پشتی بۆ ڕویمەتی داین] و خودێ مرۆڤێت گاور ڕاستەڕێ ناکەن.

وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ
وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ
فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ ۗ
وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٦٥﴾ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ
جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ
فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ
ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ ۗ كَذَٰلِكَ
يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾ يَـٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا
لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ
وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُوا۟ فِيهِ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ
حَمِيدٌ ﴿٢٦٧﴾ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ
وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾
يُؤْتِى ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ
أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾



﴿٢٦٥﴾ و مەتەلا ئەوێت مالێ خۆ ژ بۆ ڕازیبوونا
خودێ و موکومکرن و ڕاگرتنا دلێت خۆ دمەزێخن
وەکی مەتەلا باغەکی [جنیکەکێ]یە ل سەر گرەکی،
تاڤییەکا بارانێ لێ بدەت دوقات بەرێ خۆ بگریت،
ئەگەر تاڤییا بارانێ لێ نەدەت، هویربارانەك لێ
بێت. و خودێ ب هەر کار و کریارەکا هوین دکەن
ئاگەهدارە و دبینیت. ﴿٢٦٦﴾ ئەرێ ئێك ژ هەوە هەیە
بڤێت چەمەك ژ دارقەسپ و مێوان هەبیت، و ڕویبار
د بەردا بچن، و هەمی فێقی تێدا هەبیت، و پیراتی ب
سەردا بێت، و وی لاوازی هەبیت و دویندەهەکا لاواز
هەبیت، و بابەلیسکەکا ب ئاگر ل چەمێ وی بدەت،
ڤێجا بسۆژیت. وەکی ڤێ مەتەلێ خودێ نیشانێت
خۆ بۆ هەوە دیار دکەت، بەلکی هوین [ڕاست]
هزرا خۆ بکەن. ﴿٢٦٧﴾ گەلی خودان باوەران ژ حەلال
باشێ هەوە ب دەست خۆڤە ئینایی و پەیداکری، و ژ
وی یێ مە بۆ هەوە ژ ئەردی دەرئێخستی بمەزێخن
[د ڕێکا خودێدا بدەن] و یێ بێخێر ژێ نەکەنە خێر،
ئەوێ هوین ب خۆ، ئەگەر نە ژ ئێکا شەرمێ بیت
وەرناگرن و چاڤێت خۆ ژ بێخێرییا وی ناگرن [و پێ قایل نابن] و بزانن خودێیە دەولەمەند و شایی سوپاسێ.
﴿٢٦٨﴾ شەیتان هەوە ژ هەژارییێ دترسینیت و هەوە د بەر قەلسی و چرویکاتییێرا دکەت، و خودێ سۆزا
لێبۆرین و زێدەدانێ ددەتە هەوە، و خودێ [د دلۆڤانی و کەرەما خۆدا] دەستفرەهـ و زانایە. ﴿٢٦٩﴾ زێدە زانین
و کاربنەجهییێ ددەتە وی یێ وی بڤێت، و یێ خودێ زێدە زانین و کاربنەجهی دایێ، کەرەمەکا مەزن د گەل
هاتەکرن، و ژ ئاقلداران پێڤەتر کەس هزرا خۆ د ڤێدا ناکەت و وەرناگریت.

وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ
يَعْلَمُهُۥ ۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٢٧٠﴾ إِن تُبْدُوا۟
ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا
ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن
سَيِّـَٔاتِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٧١﴾ ۞ لَّيْسَ
عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۗ وَمَا
تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا
ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ
وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٢﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟
فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ
يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم
بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ
خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم
بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ
رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾

نصف الحزب ٥





﴿٢٧٠﴾ هەر تشتەكێ مەزاختنێ، یێ هەوە مەزاختی و هەر نەزرەكێ هەوە ل سەر خۆ ئێخستی، خودێ پێ دزانیت، و ستەمكاران چو پشتەڤان و هاریكار نینن.
﴿٢٧١﴾ ئەگەر هوین خێر و سەدەقەیێت خۆ ئاشكەرا كەن، ئەڤە خۆش شۆلە، و ئەگەر هوین ب ڤەشارتن بدەنە ژار و خێزانان، هێژ خێرتر و چێترە بۆ هەوە، [ب ڤی كارێ باش خودێ] دێ هەوە ژ گونەهان شۆت، و خودێ ب كار و كریارێت هوین دكەن شارەزایە.
﴿٢٧٢﴾ [هەی پێغەمبەر] ڕاستەڕێكرنا وان [ب كۆتەكی] نە ل سەر تەیە، بەلێ خودێیە، یێ وی بڤێت ڕاستەڕێ دكەت، و چ خێرا هوین بدەن و بمەزێخن بۆ هەوە ب خۆیە، و تشتێ هوین ب خێر بدەن و بمەزێخن، بلا بەس ژ بۆ ڕوییێ خودێ بیت، و هەر خێرەكا هوین بكەن و بمەزێخن دێ [خەلات و جزایێ وێ ب زێدەیی] گەهیتە هەوە و غەدر (ستەم) ل هەوە نائێتە كرن. ﴿٢٧٣﴾ [هوین خێرا خۆ] بدەنە [وان] دەست تەنگ و ژاران، ئەوێت د ڕێكا خودێدا هاتینە گرێدان. [ئەوێت ماینە ب جیهادێڤە و خۆ فرۆتینە خودێ] و نەشێن ژ بەر جیهادێ دەركەڤنە بازرگانییەكێ یان شۆلەكی، یێ نەشارەزا هزرا دەولەمەندان ژ وان دكەت، (چونكی) ژ پاڤژیا خۆ، ل خۆ دەرنائێخن دەست تەنگ و ژارن. تو دێ وان ب ڕەنگ و سیمایێ وان نیاسی [كو دەست تەنگ و ژارن] تشتی ژ كەسێ ناخوازن و خوازۆكییێ ناكەن، هەر تشتەكێ باشێ هوین بدەن و بمەزێخن، خودێ ژێ ب ئاگەهە. ﴿٢٧٤﴾ ئەوێت مالێ خۆ ب شەڤ و ڕۆژ، نەپەنی و ئاشكەرا ددەن و دمەزێخن، ئەوان خەلاتێ خۆ ل دەڤ خودایێ خۆ هەیە و [ڕۆژا قیامەتێ] نە ترس ل سەر وان هەیە و نە ژی ب خەم دكەڤن.

ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي
يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ
مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ فَمَن جَآءَهُۥ
مَوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمۡرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَنۡ
عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ يَمۡحَقُ
ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ
وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ
وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٢٧٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ
فَأۡذَنُواْ بِحَرۡبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَإِن تُبۡتُمۡ فَلَكُمۡ رُءُوسُ
أَمۡوَٰلِكُمۡ لَا تَظۡلِمُونَ وَلَا تُظۡلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ وَإِن كَانَ
ذُو عُسۡرَةٖ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيۡسَرَةٖۚ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡ
إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى
ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٢٨١﴾



﴿٢٧٥﴾ ئەوێت سەلەفێ و زێدەییێ دخۆن، [ڕۆژا قیامەتێ] وەکی وی [ژ گۆڕان] ڕادبن، ئەوێ تەبۆیی (طەبۆیی)، ئەوێ شەیتانی دین کری و هنگاڤتی، چونکی ئەوان دگۆت: هەما کڕین و فرۆتن ژی وەکی سەلەفێیە، و خودێ کڕین و فرۆتن دورست کرییە، و سەلەف دورست نەکرییە، ڤێجا یێ شیرەتا خودێ گەهشتێ و سەلەف هێلا و دەست ژێ کێشا، ئەڤا کری و بۆری خودێ لێ ناگریت [ئانکو ئەڤ حوکمە ژ یا بۆری ناگریت]. و ئەو د دەست خودێدایە [بڤێت لێ ناگریت و بڤێت دێ ئیزا دەت]، و هەچییێ لێ زڤڕیڤە [سەلەفێ بخۆت پشتی بڕیار و شیرەتا خودێ گەهشتییێ] دۆژەهییە، هەروهەر دێ تێدا مینیت. ﴿٢٧٦﴾ خودێ سەلەفێ بێ بەرەکەت دکەت، و مالێ خێر و سەدەقە ژێ بێتە دان زێدە دکەت و بەرەکەتێ دێخیتێ [سەدەقەیان ڕادکەت]، و خودێ حەژ زێدەگاور و تێرگونەهان ناکەت. ﴿٢٧٧﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت قەنج کرین، و بەردەوام نڤێژ کرین و زەکاتا مالێ خۆ دایین، ئەڤان خەلاتێ خۆ ل دەڤ خودێ هەیە، و [ڕۆژا قیامەتێ] نە ترس ل سەر وانە و نە ژی ب خەم دکەڤن. ﴿٢٧٨﴾ گەلی خودان باوەران ژ خودێ بترسن، و ئەو سەلەفا هەوە مابییە ل خەلکی بهێلن، ئەگەر [ڕاست] هوین خودان باوەرن. ﴿٢٧٩﴾ ڤێجا ئەگەر هەوە [ئەڤە] نەکر، خۆ بۆ شەڕێ خودێ و پێغەمبەرێ وی کار بکەن [چونکی ب ڕاستی ئەڤە د ڕاستا خودێ و پێغەمبەرێ ویدا شەڕە هوین دکەن]. و ئەگەر هوین لێڤەبوون و هەوە تۆبە کر، سەرێ مالێ هەوە یێ هەوەیە [ب ڤی ڕەنگی] نە هوین ستەمێ [ل دەینداران] دکەن [ب وەرگرتنا زێدەییێ] و نە ستەم ل هەوە دئێتەکرن [ب گیرۆکرنا دانا مالێ هەوە ژ بەرێ وانڤە]. ﴿٢٨٠﴾ و ئەگەر [دەینداری هەوە] دەست تەنگ بیت، خۆ لێ بگرن هەتا دەستێ خۆ دگریت، و ئەگەر هوین [دەینێ خۆ] بۆ بهێلن و گەردەنا وی ئازا بکەن، بۆ هەوە چێترە ئەگەر هوین بزانن. ﴿٢٨١﴾ و ژ وێ ڕۆژێ بترسن یا هوین تێدا ب بال خودێڤە دزڤڕن، پاشی هەر ئێکی ل دویڤ کار و کریارێت وی حسێب دێ د گەل ئێتە کرن، و ستەم ل کەس ژ وان نائێتە کرن [نە خێرێت وان کێم دبن، نە ژی گونەهێت وان پتر لێ دئێن].

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى
فَٱكۡتُبُوهُۚ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَلَا يَأۡبَ
كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ
ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ
فَإِن كَانَ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ
أَن يُمِلَّ هُوَ فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ
مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ
مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ
إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ وَلَا يَأۡبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْۚ وَلَا تَسۡـَٔمُوٓاْ
أَن تَكۡتُبُوهُ صَغِيرًا أَوۡ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ أَقۡسَطُ
عِندَ ٱللَّهِ وَأَقۡوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَرۡتَابُوٓاْ إِلَّآ أَن تَكُونَ
تِجَٰرَةً حَاضِرَةٗ تُدِيرُونَهَا بَيۡنَكُمۡ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ
أَلَّا تَكۡتُبُوهَاۗ وَأَشۡهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعۡتُمۡۚ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٞ
وَلَا شَهِيدٞۚ وَإِن تَفۡعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقُۢ بِكُمۡۗ وَٱتَّقُواْ
ٱللَّهَۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ٢٨٢



﴿٢٨٢﴾ گەلی کەسێت هەوە باوەری ئینایی، ئەگەر هەوە دەینەك هەتا دەمەكێ دەستنیشانكری و ڤەبڕی د گەل ئێكدو كر، بنڤێسن. و بلا قەلەمدارەك د ناڤبەرا هەوەدا ب وژدان بنڤێسیت، و بلا كەس ژ قەلەمداران خۆ ئاسێ نەكەت كو بنڤێسیت، وەكی خودێ نیشادایی بنڤێسیت. بلا بنڤێسیت، و یێ دەیندار ب خۆ بلا بۆ [یێ دنڤێسیت] بێژیت (بۆ بخوینیت)، و بلا ژ خودایێ خۆ بترسیت، و چو [ژ دەینی] كێم نەكەت، و ئەگەر ئەوێ دەیندار یێ كێم ئاقل و نەزان بیت یان یێ بێ چارە و لاواز بیت [چ ژ پیراتی یان ژ بچویكاتی]. یان ئەو ب خۆ نەشێت بێژیت و بخوینیت، بلا ئەوێ ژێ بەرپرس، ب وژدان و دورست بۆ [یێ دنڤێسیت] بێژیت، و دو زەلامان، ژ یێت خۆ، ل سەر بكەنە شاهد، و ئەگەر دو زەلام نەبن، بلا زەلامەك و دو ژن بن، ژ وان یێت هوین ژێ ڕازی، ئەگەر ئێكێ ژ بیر كر، دا یا دی بینیتە بیرا وێ، و بلا شاهد خۆ ئاسێ نەكەن ئەگەر هاتنە داخوازكرن، [بۆ شادەییێ]. و زڤێر نەبن [بێ خێرەت نەبن] كو [دەینی] هەتا دەمێ وی یێ دەستنیشانكری بنڤێسن، چ بچویك بیت چ مەزن. ئەڤە بۆ هەوە دورستترە ل دەڤ خودێ و بۆ شادەییێ ژی بنەجهترە و ڕاستترە و نێزیكترە كو هوین [د دان و هەژمارێدا] ب گۆمان نەكەڤن، ژ بلی هندێ كو كڕین و فرۆتنەكا دەست ب دەست بیت هوین د ناڤبەرا خۆدا بكەن، [هنگێ] چو گونەه ل سەر هەوە نینە، هوین نەنڤێسن. و شاهدان بگرن، ئەگەر هەوە كڕین و فرۆتن كر، و بلا زیان نەگەهیتە یێ دنڤێسیت و شاهدان، و ئەگەر هوین زیانێ بگەهیننە وان، [كریارا هەوە] ئەڤە ژ ڕێ دەركەڤتن و گونەهكارییە بۆ هەوە. و ژ خودێ بترسن، خودێ دێ هەوە تێگەهینیت و نیشا هەوە دەت، و خودێ ژ هەر تشتەكی ب ئاگەهە.

ثلاثة أرباع الحزب ٥

۞وَإِن كُنتُمۡ عَلَىٰ سَفَرٖ وَلَمۡ تَجِدُواْ كَاتِبٗا فَرِهَٰنٞ مَّقۡبُوضَةٞۖ
فَإِنۡ أَمِنَ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا فَلۡيُؤَدِّ ٱلَّذِي ٱؤۡتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ وَلۡيَتَّقِ
ٱللَّهَ رَبَّهُۥۗ وَلَا تَكۡتُمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَۚ وَمَن يَكۡتُمۡهَا فَإِنَّهُۥٓ
ءَاثِمٞ قَلۡبُهُۥۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ٢٨٣ لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَوۡ تُخۡفُوهُ
يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ
وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ٢٨٤ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ
مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ
وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ
سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨٥ لَا يُكَلِّفُ
ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ
رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ
عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا
وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا
وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٢٨٦



﴿٢٨٣﴾ و ئەگەر هوین ل سەر وەغەرێ بن، و کەس نەبیت بنڤێسیت، تشتەکی بکەنە گەرەو [ڕەهینە]، [شوینا نڤێسینا دەینی] کو پێشڤە بێتە دان، و ئەگەر هوین ژێك ئێمن بوون [خودانێ دەینی باوەری ب دەینداری هات، و دەین ل سەر نەنڤێسی و ب گەرەوێ ڕازی بوو]، ڤێجا بلا ئەوێ خودانێ دەینی باوەرییا خۆ دایێ [کو دەیندارە] دەینێ خۆ بدەت، بلا ژ خودایێ خۆ بترسیت، و هوین شادەیییێ (شادەییا خۆ) نەڤەشێرن، و هەچیێ ڤەشێریت یێ گونەهکارە، و خودێ ب هەر کار و کریارەکا هوین دکەن ئاگەهدارە.
﴿٢٨٤﴾ هندی د ئەرد و ئەسمانان‌دا یێ خودێیە، ڤێجا تشتێ د دلێ خۆدا هوین چ دیار بکەن چ هوین ڤەشێرن، خودێ دێ هەر حسابا وی د گەل هەوە کەت. ڤێجا یێ وی بڤێت لێ ناگریت و یێ بڤێت دێ ئیزا دەت، و خودێ ل سەر [کرنا] هەمی تشتان خودان شیانە. ﴿٢٨٥﴾ پێغەمبەری باوەری ئینایییە ب تشتێ بۆ [وی] ژ دەڤ خودێ هاتی، و خودان باوەران ژی، هەمییان باوەری ب خودێ و ملیاکەتێت وی و کتێبێت وی و پێغەمبەرێت وی ئینایییە [و دبێژن] ئەم فەرقێ (جوداییێ) نائێخینە ناڤبەرا چو پێغەمبەرێت وی، و هەمییان تێکدا (پێغەمبەری و خودان باوەران) گۆت: [خودێوۆ] مە بهیست و مە گوهداری کر، ل مە ببۆرە خودێوۆ، جهێ مە هەر تویی [دویماهیکا مە ئەوە یا ل دەڤ تە]. ﴿٢٨٦﴾ خودێ هەر کەسەکی ژ بارێ وی زێدەتر لێ ناکەت، ڤێجا چ یا بکەت [چ قەنج چ خراب] بۆ خۆ دکەت و ل خۆ دکەت، خودێوۆ ل مە نەگرە ئەگەر مە تشتەك ژ بیر کر یان ئەم خەلەت بوویین، خودێوۆ بارەکێ هند گران ل مە نەکە وەکی وی یێ تە ل یێت بەری مە کری [کو جوهی بوون] خودێوۆ وی باری ل مە نەکە یێ ئەم نەشێین ڕاکەین (هلگرین)، و ل مە ببۆرە، و گونەهێت مە ژێ ببە، و دلۆڤانییێ ب مە ببە، تو پشتەڤانێ مەیی، و مە ب سەر کۆما گاوران بێخە.

سُورَةُ آلِ عِمۡرَانَ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ١ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ٢ نَزَّلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ
بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ٣ مِن
قَبۡلُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلۡفُرۡقَانَۗ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ
لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ٤ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخۡفَىٰ
عَلَيۡهِ شَيۡءٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ٥ هُوَ ٱلَّذِي يُصَوِّرُكُمۡ
فِي ٱلۡأَرۡحَامِ كَيۡفَ يَشَآءُۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٦ هُوَ
ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ
ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ
مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ
إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ
رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٧ رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ
إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ٨ رَبَّنَآ
إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوۡمٖ لَّا رَيۡبَ فِيهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ٩





## سۆرەتا ئالیعومران

**ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٢٠٠) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ [ب ڤی ڕەنگی دئێتە خواندن] ئەلف، لام، میم [و ئەڤە تەمامیا تیپێت عەرەبینە کو (٢٨) تیپن، و نیشانن ل سەر ئیعجازا قورئانێ کو عەرەبان پێ چێ نابیت قورئانەکا وەکی ڤێ قورئانێ بدانن، هەر چەندە ژ وان تیپان پێك هاتییە و ئاخفتنا خۆ پێ چێ دکەن]. ﴿٢﴾ خودا هەر ئێك خودایە، ژ وی پێڤەتر چو پەرستی [خودا] نینن، ئەوە یێ چو پەرستییێت دورست ژ وی پێڤەتر نەیی، ئەوە یێ هەروهەر مایی و [هەمی کاروبارێت هەبوونێدا] ڕێبەر. ﴿٣﴾ ب هەقییێ کتێب ب سەر تەدا دارێت (ئانکو بۆ تە ئینا خوار) [کو قورئانە] ڕاستەدەرئێخا کتێبێت بەری خۆیە، کو تەورات و ئنجیل ژی [بەری تە ب سەر مووسایی و عیسایی] دا دارێتینە. ﴿٤﴾ بەری نوکە [ئانکو بەری قورئانێ] ڕاستەدەرئێخ بوون بۆ خەلکی و [ئەو کتێب هنارتن] یێت ڤاڤێرکەر (جوداکەر) [د ناڤبەرا هەقی و نەهەقییێدا] ب ڕاستی ئەوێت باوەری ب نیشانێت خودێ [کتێبێت وی] نەئینایین، ئیزا و نەخۆشییەکا دژوار ل پێشییا وانە (بۆ وان هەیە) و خودێ یێ سەردەست و تۆلڤەکەرە. ﴿٥﴾ ب ڕاستی چو تشت ل بەر خودێ بەرزە نابن، نە ل ئەردی و نە ل ئەسمانی. ﴿٦﴾ و ئەوە یێ هەوە د مالبچویکاندا ب وی ئاوایی چێدکەت یێ وی دڤێت، چو پەرستی نینن ژ بلی وی، و ئەوە یێ هەر زال و کاربنەجهـ. ﴿٧﴾ ئەوە یێ کتێب [کو قورئانە] ب سەر تەدا ئینایییە خوار، هندەك ئایەتێت وێ د ڕۆن و ئاشکەرانە [مەخسەد و مەرەما وان یا دیار دیارە] و ئەون هێڤێن و ماکا کتێبێ و [بناخە و بنیاتا ئایەتێت دی]. و هندەکێت دی [هەنە] د مەخسەد ڤەشارتی ( ئانکو مەخسەدا وان نەیا ئاشکەرا ئاشکەرایە) ڤێجا ئەڤێت، ڤارێبوون ژ ڕاستییێ د دلێ واندا هەی، ب دویڤ وان دکەڤن (ب وانڤە دمینن) ئەوێت مەخسەد نەئاشکەرا، ژ بۆ هلێێخستنا فتنەیێ یان ژ بۆ ڤارێکرنا مەخسەدێ [کو وێ مەخسەدێ بدەنێ یا وان دڤێت]. و ژ خودێ پێڤەتر کەس مەخسەدا وان نوزانیت. و ئەڤێت زێدەزانا دبێژن: مە باوەری ب هەمییێ هەیە، هەمی ژ دەڤ خودایێ مە هاتییە، و ژ بلی ئاقلداران کەسێ دی هزرا خۆ د ڤێ چەندێدا ناکەت [و ل خۆ نازڤریت]. ﴿٨﴾ خودێوۆ تو دلێت مە پشتی تە ئەم [د ڕاستا ئایەتێت خۆدا] ڕاستەڕێ کرین، خوار نەکە، و ژ کنارێ خۆڤە دلۆڤانییەکێ ب سەر مە دارێژە، ب ڕاستی هەر تویی یێ تێرکەرم. ﴿٩﴾ خودێوۆ [ب ڕاستی] تویی خڕڤەکەرێ مرۆڤان بۆ ڕۆژەکا بێ گۆمان، و خودێ ل سۆزا خۆ لێڤە نابیت.

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم
مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمْ وَقُودُ ٱلنَّارِ ﴿١٠﴾ كَدَأْبِ ءَالِ
فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ
بِذُنُوبِهِمْۗ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١١﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ
سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَۖ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٢﴾
قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِي فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَاۖ فِئَةٌ تُقَٰتِلُ فِي
سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ
ٱلْعَيْنِۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿١٣﴾ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ
مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ
وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِۗ ذَٰلِكَ
مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ ۞ قُلْ
أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْۖ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ عِندَ رَبِّهِمْ
جَنَّٰتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَٰجٌ
مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿١٥﴾

الحزب ٦





﴿١٠﴾ ب ڕاستی ئەوێت گاور بووین نە مالێ وان،
نە ژی عەیالێ وان فایدەیی وان ناكەت، و وان ژ
ئیزا و نەخۆشییا خودێ ناپارێزن [بزانن] هەر ئەون
داردوویێ ئاگرێ دۆژەهێ. ﴿١١﴾ ئەو ژی هەروەكی
بنەمالا فیرعەونی و یێت بەری وی [كو مال و
عەیالێ وان چو مفا نەگەهاندنە وان] ئایەتێت مە درەو
دەرئێخستن، ڤێجا خودێ ژ بەر گونەهێت وان ئەو
هنگاڤتن و ئیزادان، و خودێ گەلەك یێ ئیزا دژوارە.
﴿١٢﴾ بێژە ئەوێت گاور بووین [و باوەری نەئینایین]:
نێزیك هوین دێ شكێن، و هوین [ڕۆژا قیامەتێ]
بەر ب دۆژەهێ دێ ئێنە كۆمكرن، و ئەو چ پیسە
جهە [ڤێجا ب سەركەڤتنا ئوحدێ خۆش نەبن]!.
﴿١٣﴾ و ب سویند بۆ هەوە دەرس و نیشان د هەردو
جویناندا هەبوون، دەمێ كەڤتینە بەرێك [د شەڕێ
بەدرێدا]، كۆمەك (تیپەك) ژ وان د ڕێكا خودێدا
شەڕی دكەن، و كۆما دی گاورن [سێ جاران تەمەتی
موسلمانان بوون د گەل هندێ ژی]، كۆما باوەری
ئینایی ب دیتنا چاڤان دوجا هندی خۆ دبینن، و
خودێ ب پشتەڤانییا خۆ وی ب سەر دئێخیت یێ وی بڤێت، د ڤێ چەندێدا چام و دەرسەك هەیە بۆ ئاقلدار
و ئاقلگران. ﴿١٤﴾ حەژێكرنا دلخوازییان ژ ژنان و كوڕان، و مالدارییا گەلەك و ل سەرێك ژ زێر و زیڤان و
هەسپێت دوریكری و تەرش و كەوالان و ڕەز و زەڤییان، ئەڤە هەمی پەرگالێت ژیانا دنیایێنە و د چاڤێت
خەلكیدا هاتینە شرینكرن، و دویماهیكا باش ئەوە یا ل دەڤ خودێ. ﴿١٥﴾ [هەی موحەمەد] بێژە [وان]:
ئەرێ ئەز بۆ هەوە، یا ژ ڤێ خرێ چێتر بێژم؟ بۆ وان ئەوێت پارێزكاری كرین، ژ بەرێ خودایێ وانڤە
بەحەشتێت ڕویبار د ناڤرا دچن هەنە و هەروهەر دێ تێدا بن، و ژنكێت هەڤسەرێت پاقژ، و قایلبوونا خودێ،
هەنە، و خودێ بەندەیێت خۆ دبینیت [كو هەر ئێك شایی چیە].

ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا
وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ١٦ ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلۡقَٰنِتِينَ
وَٱلۡمُنفِقِينَ وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ ١٧ شَهِدَ ٱللَّهُ
أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا
بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١٨ إِنَّ ٱلدِّينَ
عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ
إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ وَمَن يَكۡفُرۡ
بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ١٩ فَإِنۡ حَآجُّوكَ
فَقُلۡ أَسۡلَمۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ
ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسۡلَمۡتُمۡۚ فَإِنۡ أَسۡلَمُواْ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ
وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ٢٠
إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ
بِغَيۡرِ حَقّٖ وَيَقۡتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡقِسۡطِ مِنَ
ٱلنَّاسِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ٢١ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتۡ
أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ٢٢





﴿١٦﴾ ئەو پارێزکارێت دبێژن: خودێوۆ ب ڕاستی مە باوەری ئینایە، گونەهێت مە ژێ ببە، و مە ژ ئیزا و نەخۆشییا دۆژەهێ بپارێزە. ﴿١٧﴾ ئەوێت بێنفرەهـ و ڕاستگۆ و گوهدار، و مالـمەزێخ د ڕێكا خودێدا، و ئەوێت بەرسپێدەیان [خودێ دپەرێسن و] داخوازا ژێبرنا گونەهان ژ خودێ دكەن. ﴿١٨﴾ ب ڕاستی خودێ شادەیی دا و دیار كر كو چو پەرستی نینن ژ بلی وی، و ملیاكەت و خودان زانین ژی [عەینی شادەییێ ددەن] كو ئەوە خودانێ ترازییا دورست، و ژ وی پێڤەتر چو پەرستی نینن، و ئەوە یێ سەردەست و كاربنەجهـ. ﴿١٩﴾ ب ڕاستی دینێ ڕاست و دورست ل دەڤ خودێ ئیسلامە، و ئەوێت كتێب بۆ هاتین، [د ڕاستا ئیسلامێدا] هنگێ ژێك جودابوون دەمێ نیشانێت ئاشكەرا و زانین بۆ وان هاتی، و زكرەشی كەڤتیە د ناڤ واندا. و هەر كەسێ باوەرییێ ب ئایەتێت خودێ نەئینیت، [دڤێت بزانیت] ب ڕاستی خودێ یێ حساب سڤكە [د حسابا خۆدا، گەلەكێ دەست سڤكە]. ﴿٢٠﴾ و ئەگەر وان جرەبڕ [د ڕاستا دینێ خودێدا] د گەل تە كر، تو بێژە [وان]: من بەرێ خۆ دا خودێ، و من و هندی د گەل من، مە خۆ سپارتێ، و بێژە ئەوێت كتێب بۆ هاتین [جوهی و فەلە] و نەخواندەواران [بوت پەرێسێت مەكەهێ]: هوین ژی موسلمان بوون [هەوە ژی خۆ سپارتە خودێ؟ ئانكو هوین ژی موسلمان ببن]؟ ڤێجا ئەگەر ئەو موسلمان بوون، ژ خۆ ئەو ڕاستەڕێ بوون، و ئەگەر ڕوییێ خۆ ژ ئیسلامێ وەرگێڕان [دڤێت بزانن] یا ل سەر تە گەهاندنا گۆتنا خودێیە، و خودێ بەندەیێت خۆ هەمییان دبینیت. ﴿٢١﴾ ب ڕاستی ئەوێت بێ باوەر ژ ئایەتێت خودێ، و ژ بێ بەختی و ب نەهەقی پێغەمبەرێت خودێ دكوژن، و وان دكوژن ئەوێت داخوازا باشی و ڕاستییێ دكەن، مزگینییا ئیزایەكا دژوار بدە وان. ﴿٢٢﴾ ئەها ئەڤنە ئەوێت كار و كریارێت وان د دنیا و ئاخرەتێدا پویچ دبن، ئەون د بێ پشتەڤان و بێ هاریكار.

أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُدۡعَوۡنَ إِلَىٰ كِتَٰبِ
ٱللَّهِ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ وَهُم مُّعۡرِضُونَ ٢٣
ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَٰتٖۖ
وَغَرَّهُمۡ فِي دِينِهِم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ٢٤ فَكَيۡفَ إِذَا جَمَعۡنَٰهُمۡ
لِيَوۡمٖ لَّا رَيۡبَ فِيهِ وَوُفِّيَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ
لَا يُظۡلَمُونَ ٢٥ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن
تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن
تَشَآءُۖ بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٦ تُولِجُ ٱلَّيۡلَ
فِي ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِۖ وَتُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ
وَتُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّۖ وَتَرۡزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ٢٧
لَّا يَتَّخِذِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ
وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَلَيۡسَ مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيۡءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنۡهُمۡ
تُقَىٰةٗۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨ قُلۡ
إِن تُخۡفُواْ مَا فِي صُدُورِكُمۡ أَوۡ تُبۡدُوهُ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُۗ وَيَعۡلَمُ
مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٩



﴿٢٣﴾ ما تو ئەوێت خودێ بارەك ژ كتێبێ دایییە
وان [كو جوهی و فەلەنە] نابینی؟! بۆ كتێبا خودێ
[كو تەوراتە] دئێنە داخوازكرن، دا حوكمی د ناڤبەرا
واندا بكەت، پاشی دەستەكەك ژ وان ڕوییێ خۆ
ژێ وەردگێڕن و ئەو پشتەڕێنە. ﴿٢٤﴾ [وان ئەڤە كر]
چونكی گۆتن: هەما چەند ڕۆژەكان [ڕۆژێت تێدا
گۆلك پەراستین] دێ ئاگر ب مە كەڤیت. و ئەو تشتێ
ئەوا ب سەر دینێ خۆڤە زێدە دكر ئەو خڕاندن و د
سەردابرن. ﴿٢٥﴾ ڤێجا ئەو دێ چ كەن دەمێ ئەم وان
بۆ ڕۆژەكا بێ گۆمان كۆم دكەین، و هەر كەسەك تێدا
دگەهیتە وێ یا وی كری (جزایێ خۆ دستینیت)،
و ستەم ل كەس ژ وان نائێتە كرن. [نە خێرێت وان
كێم دبن، نە ژی گونەهێت وان پتر لێ دئێن].
﴿٢٦﴾ بێژە: خودێوۆ تویی خودانێ ملك و مالدارییێ:
یێ تە بڤێت مال و مالدارییێ ددەیێ، و یێ تە بڤێت
ملك و مالدارییێ ژێ دستینی، و یێ تە بڤێت خۆشڤی
و ب ڕویمەت دكەی، و یێ تە بڤێت ڕسوا دكەی.
خێر هەمی ئەوە یا د دەست تەدا، چ یا تە بڤێت تو
دشێی بكەی و شیانداری. ﴿٢٧﴾ شەڤێ دكەیە د ناڤ ڕۆژێدا و ڕۆژێ دكەیە د ناڤ شەڤێدا [هەردووكان
ب ڤێ چەندێ كورت و درێژ دكەی]، و تو یێ زێندی ژ یێ مری و یێ مری ژ یێ زێندی دەردئێخی، و
یێ تە بڤێت [خێر و كەرەما خۆ] بێ كار و بێ هەژمار ددەیێ. ﴿٢٨﴾ بلا [خودان باوەر] گاوران [ئەوێت
گاوربووییین] شوینا خودان باوەران نەكەنە دۆست و پشتەڤان، و هەچیێ ڤێ بكەت نە ژ خودێیە ب چو
ڕەنگان، ژ بلی هندێ هوین خۆ ژ وان ب دورستی بپارێزن، خودێ هەوە هشیاری [ئێزا] خۆ دكەت [و هەوە
ئاگەهدار دكەت] و [بزانن] دویماهیك هەر خودێیە هوین لێ بزڤڕنەڤە. ﴿٢٩﴾ بێژە: تشتێ د دلێ خۆدا، هوین
چ ڤەشێرن چ دیاركەن، خودێ پێ ئاگەهە [و دزانیت]، دزانیت كا چ د ئەرد و ئەسماناندا هەیە، و ب ڕاستی
خودێ هەمی پێ چێ دبیت، و ل سەر هەمی تشتی دەستهەلاتدار و خودان شیانە.

يَوۡمَ تَجِدُ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ مِنۡ خَيۡرٖ مُّحۡضَرٗا وَمَا عَمِلَتۡ
مِن سُوٓءٖ تَوَدُّ لَوۡ أَنَّ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَهُۥٓ أَمَدَۢا بَعِيدٗاۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ
نَفۡسَهُۥۗ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٣٠﴾ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ
فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ
رَّحِيمٞ ﴿٣١﴾ قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ
ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ۞إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ
وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾ ذُرِّيَّةَۢ بَعۡضُهَا مِنۢ بَعۡضٖۗ وَٱللَّهُ
سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ إِذۡ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ عِمۡرَٰنَ رَبِّ إِنِّي نَذَرۡتُ لَكَ
مَا فِي بَطۡنِي مُحَرَّرٗا فَتَقَبَّلۡ مِنِّيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٥﴾
فَلَمَّا وَضَعَتۡهَا قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي وَضَعۡتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا وَضَعَتۡ
وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰۖ وَإِنِّي سَمَّيۡتُهَا مَرۡيَمَ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ
وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ
حَسَنٖ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنٗا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّاۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيۡهَا
زَكَرِيَّا ٱلۡمِحۡرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقٗاۖ قَالَ يَٰمَرۡيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَاۖ
قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾

ربع الحزب ٦





﴿٣٠﴾ رۆژا هەر ئێك چ خێرا كری بەرچاڤ دبینیت، و چ خرابییا كری ژی [وەسا دبینیت]، [هنگی] وی پێ خۆشە، دەمەكێ دویر و درێژ، د ناڤبەرا وی و وان كریارانـدا هەبایە [و دەفتەرا كار و كریارێت خۆ نەدیتبایە]. و خودێ هەوە هشیاری خۆ دكەت (ژ خۆ دترسینیت)، و خودێ د ڕاستا بەندەیێت خۆدا پڕ دلۆڤانە. ﴿٣١﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: [وان] ئەگەر هوین [ب دورستی] حەژ خودێ دكەن، ل دویڤ من وەرن [رێكا من بگرن] خودێ دێ حەژ هەوە كەت، و گونەهێت هەوە دێ ژێ بەت، [و ب ڕاستی] خودێ گونەهـژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٣٢﴾ و بێژە [وان]: گوهداریا خودێ و پێغەمبەرێ وی بكەن، ڤێجا ئەگەر وان ڕوییێ خۆ وەرگێڕا، [بلا بزانن] ب ڕاستی خودێ حەژ گاوران ناكەت. ﴿٣٣﴾ ب ڕاستی خودێ ئادەم و نووح و بنەمالا ئیبراهیم و بنەمالا عمران ژ ناڤ هەمی جیهانان ئەو هلبژارتن. ﴿٣٤﴾ [ئەڤە هەمی] دویندەهەكن، هندەك ژ هندەكانە [د ئنیەت و پارێزكاری و موسلمانەتییا خۆدا ژێكن]، و [ب ڕاستی] خودێ گوهدار و زانایە. ﴿٣٥﴾ بینە بیرا خۆ دەمێ ژنا عمرانی گۆتی: خودێوۆ [ب ڕاستی] ئەڤێ د زكێ خۆدا، خۆسەر من گۆری تە كرییە [بۆ تە كرییە نەدر]، [ژ بۆ خزمەتا مالا تە بكەت]، [خودێوۆ] ژ من وەرگرە، ب ڕاستی هەر تویی گوهدێر و زانا. ﴿٣٦﴾ ڤێجا دەمێ بوویی، گۆت: خودێوۆ، ب ڕاستی من كچا بوویی (ئانكو یێ من ب خۆ دڤیا كوڕ بوو) و خودێ چێتر دزانیت كا چ بوویە، و كوڕ نەوەكی كچێیە [و وەكی وی ب كێر خزمەتا من ڤیایی نائێت]، و ب ڕاستی من ناڤێ وێ كرییە مەریەم، و ئەز وێ و دویندەها وێ ب تە دپارێزم ژ شەیتانێ دویری دلۆڤانییێ. ﴿٣٧﴾ ڤێجا خودایێ وێ ب ئاوایەكێ جوان [مەریەم] ب نەدر قەبویل كر (وەرگرت)، و لاو پەروەردەكر و جوان ڕاكر، و زەكەریایی سەرەگوهی لێ كر و خودانی ژێ كر، چەند زەكەریا چۆبایە دەڤ د جهێ پەرستنا وێدا، فێقی و خوارن ل دەڤ ددیت، و دگۆت: مەریەمێ، ئەڤە بۆ تە ژ كیڤە دئێت؟! گۆت: ئەڤە ژ نك خودێ [بۆ من دئێت]، و خودێ یێ بڤێت بێ هەژمار كەرەم و خێران د گەل دكەت و ددەتێ.

هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ ۖ قَالَ رَبِّ هَبْ لِى مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً
طَيِّبَةً ۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ٣٨ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ
يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ
مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ٣٩ قَالَ رَبِّ
أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِىَ ٱلْكِبَرُ وَٱمْرَأَتِى عَاقِرٌ ۖ قَالَ
كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ٤٠ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّىٓ ءَايَةً ۖ
قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا ۗ وَٱذْكُر
رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ ٤١ وَإِذْ قَالَتِ
ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ
عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ ٤٢ يَٰمَرْيَمُ ٱقْنُتِى لِرَبِّكِ وَٱسْجُدِى
وَٱرْكَعِى مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ٤٣ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۚ
وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ
وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ٤٤ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ
يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى
ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ٤٥



﴿٣٨﴾ هنگى زەكەريايى داخواز ژ خودێ كر، گۆت:
خودێوۆ تو ژ نك خۆ دويندەهەكا پاقژ بدە من، ب
ڕاستى تويى دوعاوەرگر. ﴿٣٩﴾ ڤێجا ملياكەتان
گازيكرێ، و ئەو ل سەر نڤێژێ يێ ڕاوەستيايى بوو د
ميحرابێدا، گۆتنێ: خودێ مزگينييا يەحيايى ددەتە تە،
باوەرييێ ب [هاتنا] پەيڤا خودێ [كو عيسايە] دئينيت،
و سەروەر و خۆڕاگرە و پێغەمبەرەكە ژ قەنجان.
﴿٤٠﴾ زەكەريايى گۆت: خودێوۆ چاوا دێ من كوڕەك
هەبيت، و ئەز هۆ يێ پير و دانعەمر، و ژنا من ژى
يا خرش [زاڕۆك نابن] گۆت: وەسايە هەر كارەكێ
خودێ بڤێت دێ كەت. ﴿٤١﴾ [زەكەريا] گۆت:
خودێوۆ تشتەكى بۆ من بكە نيشان، [خودێ] گۆت:
نيشانا تە ئەوە سێ ڕۆژان [تو نەشێى] د گەل خەلكى
باخڤى، ب ئيشارەتان نەبيت، و گەلەك ناڤێ خودايێ
خۆ بينە [گەلەك بپەرێسە]، و سپێدە و ئێڤاران خودايێ
خۆ ژ كێماسييان پاقژ بكە. ﴿٤٢﴾ بينىنە بيرا خۆ دەمێ
ملياكەتان گۆتى مەريەمێ: ب ڕاستى خودێ تو يا
هلبژارتى [و ژ كار و كريارێت نەدورست] يا پاقژكرى
و قەدرێ تە ب سەر يێ هەمى ژنێت جيهانێ ئێخستييە. ﴿٤٣﴾ مەريەمێ [بەرانبەر ڤان كەرەمان] بەردەوام
خودايێ خۆ بپەرێسە، و ل بەر فەرمانا وى بە، و د گەل نڤێژكەران نڤێژان بكە. ﴿٤٤﴾ ئەڤە (ئەڤ بەحسە)
ژ سالۆخێت غەيبێنە، ب وەحى ئەم بۆ تە دهنێرين، تو نە ل دەڤ وان بووى دەمێ قەلەمێت خۆ [بۆ پشك
كێشانێ] ددانان، كا كى دێ سەرەگوهييا مەريەمێ كەت، هەروەسا تو نە ل دەڤ وان بووى دەمێ وان [ل سەر
ڤێ سەرەگوهييێ] جڕەبڕ دكر. ﴿٤٥﴾ د وێ گاڤێدا ملياكەتان گۆت: مەريەمێ ب ڕاستى خودێ مزگينييێ ب
پەيڤەكا خۆ [كو عيسا بوو] ددەتە تە، ناڤێ وى مەسيحە (ئانكو يێ پيرۆزە، يان دەستێ وى يێ پيرۆزە هەر
كەسێ ب دەستێ خۆ ڤەمالى نەخۆشييا وى نەما، يان جبريلى ئەو ڤەمالييە ژ بەر هندێ دبێژنێ مەسيح، يان ژ
بەر هندێ يێ گەرۆك بوو و ل چو جهان ئاكنجى نەبوويە، يان پييێت وى د حولى بوون و گۆزەك نەبوون)
عيسايە كوڕێ مەريەمێ، د دنيا و ئاخرەتێدا خودان ڕويمەتە و ژ نێزيكانە ژى [بۆ خودێ].

وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ٤٦
قَالَتۡ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞۖ قَالَ كَذَٰلِكِ
ٱللَّهُ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٤٧
وَيُعَلِّمُهُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ٤٨
وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَنِّي قَدۡ جِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن
رَّبِّكُمۡ أَنِّيٓ أَخۡلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ فَأَنفُخُ
فِيهِ فَيَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ وَأُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ
وَأُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأۡكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ
فِي بُيُوتِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٤٩
وَمُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم
بَعۡضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيۡكُمۡۚ وَجِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ
فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ٥٠ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ
هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ٥١ ۞ فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنۡهُمُ
ٱلۡكُفۡرَ قَالَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ
أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ٥٢

نصف الحزب ٦



﴿٤٦﴾ [هێـژ] د لاندکێدا و ب پیراتـی ژی د گەل خەلکی دئاخڤیـت و ژ چاکانـە [ژی]. ﴿٤٧﴾ [مەریەمـێ] گۆت: خودێـوۆ دێ چـاوا مـن کـوڕ هەبیـت، و کەسـێ خـۆ نەگەهاندییـە مـن و نێزیکـی مـن نەبوویـی؟! [خـودێ] گـۆت: هۆسـایە، ئـەوێ خـودێ بڤێـت چـێ دکـەت، و گاڤـا کار و فەرمانـەك ڤیـا [بـەس] دێ بێژتـێ ببـە، دێ بیـت. ﴿٤٨﴾ و خـودێ دێ وی [ئانکـو عیسـایی] فـێری نڤێسـین و زانـین و تەورات و ئنجیلێ کـەت. ﴿٤٩﴾ و دێ کەتـە پێغەمبـەرەك بـۆ ئسرائیلییـان، [هـەی عیسـا بێـژە وان] مـن نیشـانەك ژ نـك خودایـێ هەوەڤـە بـۆ هـەوە ئینایییـە، ئـەز بـۆ هـەوە ژ تەقنـێ تشـتی ل سـەر ڕەنگێ بالەفـران چێ دکەم و پـف دکەمێ، ب دەسـتویرا خودێ دبیتـە بالەفـر، و کۆرەیـێ د زکماکـدا کـۆرە و یـێ لـەش بەلـەك ئـەز سـاخ دکـەم، و مرییـان ئـەز زێنـدی دکەم ب دەسـتویرا خـودێ، و دزانـم کا هویـن چ د مالدا دخۆن و چ هلدگرن. ب ڕاسـتی ئەڤە هەمی نیشـانەکا ئاشـکەرایە بـۆ هـەوە، ئەگەر هوین خـودان باوەر بـن. ﴿٥٠﴾ و ئەزێ هاتیـم کتێبـا بـەری خـۆ کـو تەوراتـە ڕاسـت دەربێخـم (کـو ئـەوێ مزگینییـا هاتنـا مـن دابـوو هـەوە و سـالۆخەتێت مـن دابوونـە هـەوە)، و دا هنـدەك ژ وان تشـتێت بۆ هـەوە هاتینـە حەرامکـرن، بـۆ هـەوە حـەلال بکـەم، و مـن نیشـانەك ژ نـك خودایـێ هەوەڤـە بۆ هـەوە ئینایییـە، ڤێجـا پارێزکارییـا خـودێ بکـەن و گوهـێ خۆ بدەنە مـن. ﴿٥١﴾ ب ڕاسـتی خودێ خودایـێ من و هەوەیـە، ڤێجا وی بپەرێسـن، ڕێـکا ڕاسـت ئەڤەیـە. ﴿٥٢﴾ دەمـێ عیسـایی زانـی کـو ئـەو باوەرییـێ پـێ نائینـن، گـۆت: کـی د ڕێـکا خودێـدا هاریـکار و پشـتەڤانێ منە؟ سەرپشـك و سـەربژارەیان گۆت: ئەم هاریـکار و پشـتەڤانێت [دینێ] خودێینـە، مـە بـاوەری ب خـودێ ئینایییـە، و تـو شـاهد بـە [ڕۆژا قیامەتـێ] کو ئەم [ب ڕاسـتی] موسـلمانین.

رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلۡتَ وَٱتَّبَعۡنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ
ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾
إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ
مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوۡقَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأَحۡكُمُ
بَيۡنَكُمۡ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٥٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
فَأُعَذِّبُهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمَا لَهُم
مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٥٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾ ذَٰلِكَ نَتۡلُوهُ
عَلَيۡكَ مِنَ ٱلۡأٓيَٰتِ وَٱلذِّكۡرِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٥٨﴾ إِنَّ مَثَلَ
عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٖ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ
كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴿٦٠﴾
فَمَنۡ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ فَقُلۡ تَعَالَوۡاْ
نَدۡعُ أَبۡنَآءَنَا وَأَبۡنَآءَكُمۡ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمۡ وَأَنفُسَنَا
وَأَنفُسَكُمۡ ثُمَّ نَبۡتَهِلۡ فَنَجۡعَل لَّعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾



﴿٥٣﴾ خودێوۆ مە باوەری ب یا تە دارێتی و ئینایییە خوارێ ئینا، و ئەم ب دویڤ پێغەمبەری کەڤتین [و مە رێکا وی گرت]، ڤێجا تو مە د گەل شاهدان بنڤێسە [شاهدێت باوەرییێ ب تە و کتێب و پێغەمبەرێت تە دئینن، و شادەیییێ بۆ یەکتاییا تە ددەن].
﴿٥٤﴾ و [جوهییان بۆ کوشتنا عیسایی] پیلان و ئۆیین گێران، و خودێ بەرسنگێ وان گرت، و ئۆیینێت خۆ دانان، و خودێ چێترین ئۆیینگێڕ و نەخشکێشە.
﴿٥٥﴾ و بۆ ملەتێ خۆ بێژە دەمێ خودێ گۆتی: هەی عیسا ئەز دێ تە پارێزم ژ وان هەتا دویماهیکا تە دئێت، و دێ تە کێشمە دەڤ خۆ، و دێ تە قورتال کەم [ژ خرابییان و ژ خرابییا] ئەوێت گاوربووییین. و ئەوێت ب دویڤ تە کەڤتین دێ وان ب سەر وان ئەوێت گاوربووییین ئێخم هەتا ڕۆژا قیامەتێ، پاشی زڤڕینا هەوە هەمییان ب بال منڤەیە، و ئەز دێ حوکمی د ناڤبەرا هەوەدا کەم، ل سەر تشتێ هوین تێدا نەئێك. ﴿٥٦﴾ ڤێجا ئەوێت گاوربووییین، ب ڕاستی ئەز دێ وان د دنیایێ و ئاخرەتێدا ب بەر ئیزایەکا دژوار ئێخم، و ئەوان چو هاریکار و پشتەڤان ژی نینن. ﴿٥٧﴾ و ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت چاك کرین، خودێ دێ خەلاتێ وان ب دورستی دەتە وان، و خودێ حەژ ستەمکاران ناکەت. ﴿٥٨﴾ [هەی موحەممەد] ئەڤا ئەم بۆ تە دبێژین ژ نیشان و بیرئینانێت بنەجهە [قورئانە]. ﴿٥٩﴾ ب ڕاستی مەتەلا عیسایی ل دەڤ خودێ وەکی مەتەلا ئادەمە، [خودێ] ئادەم ژ ئاخێ چێکر، پاشی گۆتێ: ببە [مرۆڤ]، بوو [مرۆڤ]. ﴿٦٠﴾ ئەڤە هەقییە [د دەرهەقا بوونا عیساییدا] ژ دەڤ خودایێ تە، ڤێجا تو [تێدا] نەبە ژ دودلان. ﴿٦١﴾ هەچیێ جرەبڕێ د دەرهەقێ ویدا (د دەرهەقێ عیساییدا) د گەل تە بکەت پشتی ڕاستی [د دەرهەقا ویدا] بۆ تە هاتی، بێژە [وان]: وەرن [کۆم ببن] دا کوڕێت خۆ و یێت هەوە، ژنکێت خۆ و یێت هەوە، و خۆ و هەوە ڤەخوینین، و پاشی ڤێکڕا نفرینان بکەین، و لەعنەتان ل درەوینان بارینین [بێژین لەعنەت ل درەوینان بن].

إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡقَصَصُ ٱلۡحَقُّۚ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ
ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٦٢﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٦٣﴾
قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا
وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ
بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ
بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ﴿٦٤﴾ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ
وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوۡرَىٰةُ وَٱلۡإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٦٥﴾
هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجۡتُمۡ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ فَلِمَ
تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ
لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ إِبۡرَٰهِيمُ يَهُودِيّٗا وَلَا نَصۡرَانِيّٗا
وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفٗا مُّسۡلِمٗا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٦٧﴾
إِنَّ أَوۡلَى ٱلنَّاسِ بِإِبۡرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِيُّ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْۗ وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٦٨﴾ وَدَّت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ
لَوۡ يُضِلُّونَكُمۡ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴿٦٩﴾ يَٰٓأَهۡلَ
ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ ﴿٧٠﴾





﴿٦٢﴾ ب ڕاستی ئەڤەیە ئەو سەرهاتییا دورست و ڕاست، [د دەرهەقێ عیساییدا هاتییە گۆتن] و چو پەرستی ژ بلی خودێ نینن، و ب ڕاستی خودێیە یێ سەردەست و کاربنەجهـ. ﴿٦٣﴾ ڤێجا ئەگەر ڕوییێ خۆ [ژ ڤێ ڕاستییێ] وەرگێڕان، ب ڕاستی خودێ ژ خرابکاران ب ئاگەهە. ﴿٦٤﴾ [هەی موحەمەد] بێژە [وان]: گەلی خودان کتێبان (جوهی و فەلەنە)، وەرنە سەر وێ ئاخڤتنێ یا ئەم و هوین تێدا ئێك، کو ئەم و هوین ژ خودێ پێڤەتر چو نەپەرێسین، و چو هەڤال و هەڤپشکان بۆ چێ نەکەین، و هندەك ژ مە هندەکان نەدانن جهێ خودێ [و بۆ داچەمن]، ڤێجا ئەگەر ڕوییێ خۆ وەرگێڕان و پشت تێ کرن، بێژنە وان: ئەڤە هوین شاهد کو ئەم موسلمانین [و مە سەرێ گوهدارییێ بۆ خودێ چەماند]. ﴿٦٥﴾ گەلی خودان کتێبان بۆچ هوین جڕەبڕێ ل سەر ئیبراهیم دکەن [هەر ئێك ژ هەوە دبێژیت: ئیبراهیم ژ مەیە]، و تەورات و ئنجیل پشتی وی یێت هاتینە خوارێ، ما هوین ئاقلێ خۆ نائیننە سەرێ خۆ؟! ﴿٦٦﴾ [گەلی جوهی و فەلەیان] ئەها ئەڤە هوین یێ جڕەبڕێ دکەن ل سەر وی تشتێ هوین ژێ دزانن [هەر چەندە هوین ب جە ژێ نائینن]، ڤێجا ما بۆچ هوین دێ جڕەبڕێ ل سەر وی کەن یێ هوین چو ژێ نەزانن؟! خودێ دزانیت [کا ئیبراهیم چ بوو] و هوین نوزانن. ﴿٦٧﴾ ئیبراهیم نە جوهی بوو و نە فەلە. بەلکی ئیبراهیم ژ هەمی نەڕاستی و خوارییان یێ ڤەدەربوو، و سەرێ گوهدارییێ بۆ خودێ چەماندبوو، و نە ژ وان بوو یێت هەڤال و هەڤپشکان بۆ خودێ چێ دکەن. ﴿٦٨﴾ ب ڕاستی یێت ژ هەمی مرۆڤان پتر نێزیکی ئیبراهیم ئەو بوون یێت ڕێکا وی گرتین، و ئەڤ پێغەمبەرەیە و یێت باوەری پێ ئینایین، و خودێ هاریکار و پشتەڤانێ خودان باوەرانە. ﴿٦٩﴾ دەستەکەکێ ژ خودان کتێبان، ڤیا هەوە د سەردا ببەن، و بخڕینن، بەلێ ئەو ژ بلی خۆ کەسێ دیتر د سەردانابەن، و پێ نوزانن ژی [ب خۆ ژی ناحەسن کو خۆ د سەردادبەن]. ﴿٧٠﴾ گەلی خودان کتێبان (جوهی و فەلەیان): هوین بۆچ باوەرییێ ب قورئانێ نائینن، و هوین [ب خۆ] دزانن کو هەقە.

يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَلْبِسُونَ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ
وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٧١﴾ وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ءَامِنُوا۟
بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ
لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَا تُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ قُلْ إِنَّ
ٱلْهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤْتَىٰٓ أَحَدٌ مِّثْلَ مَآ أُوتِيتُمْ أَوْ يُحَآجُّوكُمْ
عِندَ رَبِّكُمْ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ
وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ
ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ۞ وَمِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ
يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ
إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِمًا ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَيْسَ عَلَيْنَا فِى
ٱلْأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾
بَلَىٰ مَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٧٦﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا
أُو۟لَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ
إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٧﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٦



﴿٧١﴾ گەلی خودان کتێبان بۆچ هوین هەقییێ [کو
قورئانا هنارتییە] تێکەلی نەهەقییێ دکەن، و [رادبن]
هەقییێ ڤەدشێرن، و هوین دزانن [کو هوین
تێکەلکرنێ دکەن]. ﴿٧٢﴾ دەستەکەکێ ژ خودان کتێبان
[کو جوهی بوون] گۆت: سحارێ باوەرییێ ب وێ
بینن، ئەوا بۆ ئەوێت باوەری ئینایین هاتی، و ئێڤاری
جارەکا دی پشتا خۆ بدەنێ، دا ئەو ژی لێڤەببن، [و
گۆمان بکەڤتە د دلێ واندا بەرانبەری ئیسلامێ].
﴿٧٣﴾ و بەس ژ وی باوەر بکەن یێ ل سەر دینێ
هەوە [باوەرییا خۆ ب کەسێ دیتر نەئینن]، [ئاخڤتن
یا جوهییانە، پشتی پیلانا موسلمانبوونا سەرێ ڕۆژێ
و گاوربوونا دویماهییا وێ دانایین]. بێژە [وان]: ب
ڕاستی ڕاستەڕێیی، ڕاستەڕێییا خودێیە. ڤێجا ئەو یا
مایی تشتەك بۆ بێت، وەکی یا بۆ هەوە هاتی، و ل
دەڤ خودێ هەوە شەرمزار دەربێخیت، و ئاخڤتنا
وی ب سەر یا هەوە بکەڤیت. [هەی موحەمەد] تو
بێژە [وان]: دان و کەرەم ب دەستێ خودێنە ددەتە وی
یێ وی بڤێت، و خودێ [د کەرەم و دانا خۆدا] یێ
دەستفرەهـ و پڕ زانایە. ﴿٧٤﴾ و دلۆڤانییا خۆ ب سەر ویدا دادڕێژیت یێ وی بڤێت، و ب ڕاستی خودێ
خودان کەرەمەکا مەزنە. ﴿٧٥﴾ هندەك ژ خودان کتێبان [ئانکو جوهی] هەنە، ئەگەر تو مالەکێ مەزن ب
ئەمانەت بدەیەڤێ، دێ ل تە زڤڕینیت، و هندەك ژی هەنە ئەگەر تو دینارەکێ ب ئەمانەت بدەیەڤێ ئەگەر تو
ب دویڤڤە نەبی و داخوازا هەقێ خۆ ژێ نەکەی ل تە نازڤڕینیت، چونکی دبێژن: خوارنا مالێ نەخواندەواران
[ئانکو عەرەبان]، نەگونەهە بۆ مە، و درەوێ ژ کیسێ خودێ دکەن، و ئەو دزانن ئەڤا ئەو دکەن درەوە.
﴿٧٦﴾ [ئەڤا ئەو دبێژن کو مالێ نەخواندەواران بۆ وان دورستە] وەسا نینە، هەر کەسێ سۆز و پەیمانا خۆ ب
جە بینیت و پارێزکارییا خودێ بکەت [بلا بزانیت] خودێ ژی حەژ تەقواداران دکەت. ﴿٧٧﴾ ب ڕاستی ئەو
کەسێت سۆز و پەیمانێت دایینە خودێ و سویندێت خۆ ئەرزان دفرۆشن، ئەڤان چو بار و پشك د ئاخرەتێدا
نینە، و خودێ [ب دلۆڤانی] وان نائاخێڤیت، و ڕۆژا قیامەتێ بەرێ خۆ نادەتە وان، و گونەهێت وان ژێ نابەت،
و ئیزایەکا دژوار دێ دەتە بەر وان.

وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَٰبِ لِتَحْسَبُوهُ
مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ
عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ
وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٨﴾ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ
وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن
دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن كُونُوا۟ رَبَّٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ
ٱلْكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن
تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرْبَابًا ۗ أَيَأْمُرُكُم بِٱلْكُفْرِ بَعْدَ
إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨٠﴾ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم
مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا
مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ
عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم
مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾ فَمَن تَوَلَّىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ
ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٨٢﴾ أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾





﴿٧٨﴾ و دەستەكەك ژ وان هەیە [گاڤا كتێبا خودێ دخوینن] ئەزمانێ خۆ خوارومار دكەن، دا هوین هزر بكەن ئەو [ڤارێكرنا (تحريف) وان كری و ئەو خواندنا ئەو دخوینن] ژ كتێبێیە [و ژ كەلامێ خودێیە] و ئەو ب خۆ نە ژ كتێبێیە [و نە ژ كەلامێ خودێیە] دبێژن: (مەخسەد خواندنا ئەو دخوینن): ئەڤە ژ نك خودێ هاتییە، و ئەو ب خۆ، نە ژ دەڤ خودێ هاتییە، و درەوان ژ كیسێ خودێ دكەن، و ئەو دزانن كو درەون ژی.
﴿٧٩﴾ بۆ چو مرۆڤان دورست نینە، خودێ كتێب و ئاقلداری و پێغەمبەراتییێ بدەتێ، پاشی بێژتە خەلكی: ببنە بەندەیێت من، نە یێت خودێ (من بپەرێسن شوینا خودێ)، بەلكی دێ بێژتە وان: مرۆڤێت خودێ بن د نیشادانا خۆ یا كتێبێدا، [د خواندنا خۆدا دەمێ هوین كتێبا خودێ دخوینن]. ﴿٨٠﴾ و نابێژتە هەوە ملیاكەت و پێغەمبەران بكەنە خودێ، ما دێ بەرێ هەوە دەتە گاورییێ پشتی هوین موسلمان بووین؟!.
﴿٨١﴾ بیننە بیرا خۆ [هەی خودانێت كتێبان (مەخسەد جوهی و فەلە)]، دەمێ خودێ پەیمانا موكومكری ژ پێغەمبەران ستاندی، ئەگەر من كتێب و پێغەمبەراتییەك دا هەوە، پاشی پێغەمبەرەك بۆ هەوە هات، ئەو تشتێ من داییــیە هەوە ڕاست دەرئێخست، هوین دێ باوەرییێ پێ ئینن، و پشتەڤانییا وی كەن. خودێ گۆتە وان: هەوە پەسەند كر [ئەڤا من گۆتی] و هەوە ل سەر هندێ پەیمانا من قەبویلە؟ گۆتن: [بەلێ] مە پەسەند كر، [خودێ] گۆت: پا شاهد بن ئەز ژی د گەل هەوە [ل سەر پەسەندكرن و قایلبوونا هەوە و شادەییــیا هەوە] ژ شاهدانم. ﴿٨٢﴾ ڤێجا هەچیێ پاشی ڕوییێ خۆ [ژ ڤێ پەیمانێ] وەرگێڕیت [و پەیمانێ بشكێنیت و باوەرییێ ب تە نەئینیت]، ب ڕاستی ئەو ژ ڕێدەركەڤتی و پشتەڕێیانە. ﴿٨٣﴾ ئەرێ ما ئەو دینەكێ دی ژ بلی دینێ خودێ دخوازن؟! و خودێ ئەوە یێ هندی د ئەرد و ئەسماناندا [ژ ملیاكەت و مرۆڤ و ئەجنەیان] چ ب ڤیان چ ب نەڤیان سەرێ گوهدارییێ بۆ چەماندین و خۆ سپارتینێ، و هەمی ژی هەر دێ ب بال ویڤە زڤڕن.

قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ
وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ
وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ
وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن
يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ كَيْفَ
يَهْدِى ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ
ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ
وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ
عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ
بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ
وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ
كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ ٱلْأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ
ٱفْتَدَىٰ بِهِۦٓ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٩١﴾





﴿٨٤﴾ [هەی موحەمەد] تو بێژە وان: مە باوەری
ب خودێ و تشتێ ب سەر مەدا هاتییە خوارێ
[کو قورئانە] و یێ ب سەر ئیبراهیم و ئیسماعیل
و یەعقووب و دویندەها وی و یێ بۆ مووسایی و
عیسایی و پێغەمبەران ژ نك خودێ هاتی، هەیە، و ئەم
جوداییێ نائێخینە د ناڤبەرا کەس ژ واندا، و ئەم ل بەر
فەرمانا وینە، و سەرێ گوهدارییێ بۆ دچەمینین و خۆ
دسپێرینێ. ﴿٨٥﴾ چ کەسێ ژ بلی ئیسلامێ دینەکێ دی
بگریت، ژێ نائێتە قەبویلکرن، و [دڤێت بزانن] کو
ئەو د ئاخرەتێدا ژ خوسارەتانە. ﴿٨٦﴾ چاوا خودێ دێ
ملەتەکی ڕاستەڕێ کەت، کو پشتی باوەری ئینایین،
و شادەیی داین کو پێغەمبەر ڕاست پێغەمبەرە و
نیشانێت ئاشکەرا [و موعجیزە] بۆ وان هاتین [ژ نوی]
گاور بووین؟! و خودێ ملەتێ ستەمکار ڕاستەڕێ
ناکەت. ﴿٨٧﴾ ئەڤان جزایێ وان ئەڤەیە: لەعنەتا
خودێ و یا ملیاکەتان و یا هەمی مرۆڤان دێ ل سەر
وان بیت. ﴿٨٨﴾ هەروهەر دێ [د ئاگر و لەعنەتێدا]
مینن، و ئیزا و نەخۆشی ل سەر وان سڤك نابیت،
و نائێنە مۆلەتدان ژی. ﴿٨٩﴾ ژ بلی وان ئەوێت پشتی هنگی تۆبەکرین و قەنجی کرین، [کار و کریارێت
باش کرین] ب ڕاستی خودێیە گونەهـ ژێبەر و دلۆڤان. ﴿٩٠﴾ ئەڤێت پشتی باوەرئینانا خۆ گاور بووین،
و پاشی زێدەتر گاور بووین، تۆبەیا وان [ل بەر مرنێ] نائێتە وەرگرتن، و ئەها ئەڤەنە ڕێبەرزە و گومڕا.
﴿٩١﴾ ب ڕاستی ئەڤێت گاوربووین، و مرین و ئەو گاور، ئەگەر ئێك ژ وان ڕوییێ ئەردی تژی زێڕ بەدەلێ
بدەت، ژێ نائێتە وەرگرتن، و ئەڤان ئیزایەکا زێدە دژوار بۆ هەیە، و وان چو پشتەڤان و هاریکار نینن.

لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ
فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ ﴿٩٢﴾ ۞كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلّٗا لِّبَنِيٓ
إِسۡرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسۡرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ مِن قَبۡلِ أَن تُنَزَّلَ
ٱلتَّوۡرَىٰةُۚ قُلۡ فَأۡتُواْ بِٱلتَّوۡرَىٰةِ فَٱتۡلُوهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾
فَمَنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩٤﴾ قُلۡ صَدَقَ ٱللَّهُۗ فَٱتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ
وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ أَوَّلَ بَيۡتٖ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي
بِبَكَّةَ مُبَارَكٗا وَهُدٗى لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ مَّقَامُ
إِبۡرَٰهِيمَۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنٗاۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ
مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾
قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ
عَلَىٰ مَا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن
سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ تَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَأَنتُمۡ شُهَدَآءُۗ وَمَا ٱللَّهُ
بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقٗا
مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ كَٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾



﴿٩٢﴾ ب ڕاستی، هوین ناگەهنە ڕاستیيا قەنجییێ، هەتا هوین وی نەمەزیێخن [د ڕێکا خودێدا] یێ هوین گەلە حەژێ دکەن، و چ تشتێ هوین بمەزیێخن خودێ پێ دزانیت. ﴿٩٣﴾ هەمی خوارن بۆ ئسرائیلییان یا دورست بوو [حەلال بوو] ئەو تێ نەبیت یا ئسرائیل [یەعقووب پێغەمبەر] ل سەر خۆ دورست نەكری [حەرام كری] بەری تەورات بێتە خوارێ، [موحەمەد] بێژە [وان]: ئەگەر هوین ڕاست دبێژن [د ڕاستن] تەوراتێ بینن و بخوینن [كا تەوراتێ چ د دەرهەقێ هەوەدا گۆتییە]. ﴿٩٤﴾ ڤێجا پشتی ڤێ هەچییێ درەوان ژ كیسێ خودێ بكەت، ب ڕاستی هەر ئەون یێت ستەمكار. ﴿٩٥﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: خودێ ڕاست گۆتییە [كا چ د دەرهەقێ ئیبراهیمدا گۆتییە، و كا چ بۆ تە د قورئانێدا ئینایییە]، ڤێجا ب دویڤ دینێ ئیبراهیم بكەڤن، كو دینەكێ ڤەدەرە ژ خواری و خرابییێ، و ئەو ب خۆ ژی (ئیبراهیم پێغەمبەر) نە ژ وانە یێت هەڤال و هۆگران بۆ خودێ چێ دكەن. ﴿٩٦﴾ ب ڕاستی ئاڤاهییێ ئێكێ یێ بۆ خەلكی [و پەرستنا خودێ] هاتییە دانان، ئەوە یێ ل مەكەهێ [هاتییە دانان] كو [جهەكێ] پیرۆزە (و تێر خێر و بێرە)، و جهێ ڕاستەڕێكرنێیە بۆ هەمی خەلكی. ﴿٩٧﴾ و نیشانێت ئاشكەرا لێ هەنە، [وەكی چیاكێ سەفا و مەروا و هەمی ڕێ و نیشانێت حەجێ، و ژ وان هەر كەسێ خرابی كرییە د دلێ خۆدا د ڕاستا وێدا، بۆ نەمایە]، و بنەجها ئیبراهیم و هەچییێ ب ژۆر كەڤت، ئێمن بوو، و خودێ ل سەر خەلكی هەیە، هەچییێ بشێت (ئانكو پێ چێ ببیت) قەست بكەتێ [بۆ جهێینانا كار و كریارێت حەجێ]، و هەچییێ گاور [ژی] ببیت [باوەرییێ ب خودێ نەئینیت]، ڤێجا ب ڕاستی خودێ پاكی (منەت) ب خەلكی هەمییێ نینە.
﴿٩٨﴾ بێژە: گەلی خودان كتێبان بۆچ هوین خۆ بێ باوەر دكەن ژ ئایەتێت خودێ [كو قورئانە]، ب ڕاستی كار و كریارێت هوین دكەن خودێ دبینیت و پێ ب ئاگەهە. ﴿٩٩﴾ بێژە گەلی خودان كتێبان: بۆچ هەچییێ باوەری ئینایی، هوین ڕێكا خودێ لێ دگرن، هەوە دڤێت یا خوار و ڤیچ بیت [و ل بەر دلێ خەلكی ڕەش دكەن]، و هوین ب خۆ ژی دبینن [و دزانن ڕێكا ڕاست و دورست هەر ئەوە]، نێ خودێ نەیێ بێ ئاگەهە ژ وێ یا هوین دكەن. ﴿١٠٠﴾ گەلی مرۆڤێت هەوە باوەری ئینایی، ئەگەر هوین گوهێ خۆ بدەنە دەستەكەكێ ژ وان یێت كتێب بۆ هاتین، جارەكا دی پشتی باوەری ئینانا هەوە دێ هەوە كەنە گاور.

وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ
رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم
مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ۚ وَٱذْكُرُوا۟
نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ
فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ
ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ
تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ
بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾
وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ
وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ
وُجُوهٌ ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ
فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ
وُجُوهُهُمْ فَفِى رَحْمَةِ ٱللَّهِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٠٧﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ
ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٨﴾





﴿١٠١﴾ ڤێجا هوین دێ چاوا گاور بن و ئایەتێت
خودێ ل سەر هەوە دئێنە خواندن، و پێغەمبەرێ
خودێ [ب خۆ ژی] د ناڤ هەوەدا؟! و هەچییێ
ڕێکا خودێ بگریت و پشتا خۆ پێ گرێدەت، ئەو
ڕاستەڕێ بوو، و بەرێ وی کەڤتە ڕێکا ڕاست.
﴿١٠٢﴾ گەلی مرۆڤێت هەوە باوەری ئینایین، ب
دورستایی پارێزکارییا خودێ بکەن، [و هشیار بن]
نەمرن هوین نەموسلمان. ﴿١٠٣﴾ و هوین هەمی خۆ
ب دینێ خودێ و کتێبا ویڤە بگرن، و ژێك بەلاڤ
نەبن، و نیعمەت و کەرەما خودێ د گەل هەوە کری
بیننە بیرا خۆ [ژ بیر نەکەن] دەمێ هوین [هێژ موسلمان
نەبووین] لێك دژمن، [خودێ] دلێت هەوە گەهاندنە
ئێك و هوین ژ دەولەت و کەرەما خودێ بوونە
برایێت ئێك، و هوین ل سەر لێڤا کۆرەکا ئاگری
بوون [نێزیك بوو بداهڕێینێ]، خودێ هوین ژێ
قورتال کرن، هۆسا خودێ نیشانێت خۆ بۆ هەوە دیار
دکەت، دا هوین ڕاستەڕێ ببن. ﴿١٠٤﴾ بلا هوین هەمی
ببنە ملەتەك، داخوازا قەنجییێ بکەن و فەرمانا چاکییێ
بکەن، و خەلکی ژ خرابییێ بدەنە پاش، و هەر ئەڤەنە د سەرفەراز. ﴿١٠٥﴾ و وەکی وان نەبن ئەوێت ژێکڤە
بووین و بەلاڤ بووین، پشتی نیشانێت خودێ یێت ئاشکەرا بۆ هاتین، ئەها ئیزایەکا مەزن بۆ ئەڤانە.
﴿١٠٦﴾ ڕۆژا هندەك ڕوی [ب گوهدارییێ و پەرستنا خودێ] سپی دبن، و هندەك ژی [ب گاورییێ و گونەهان]
ڕەش دبن، ئەڤێت ڕوییێت وان ڕەش بووین دێ بێژنێ: هوین گاور بوون پشتی هەوە باوەری ئینایی؟ دێ
ڤێجا تامکەنە ئیزایا گاوربوونا خۆ. ﴿١٠٧﴾ و هندی ئەون ئەوێت ڕوی سپی بووین ئەو د دلۆڤانییا خودێ
دانە، [د بەحەشتا وی دانە]، و هەروهەر دێ تێدا بن. ﴿١٠٨﴾ ئەڤە ئایەت و نیشانێت خودێنە، ئەم ب ڕاست
و دورستی ل سەر تە دخوینین و خودێ نەئەوە یێ ستەمێ ل بەندەیان بکەت [خێرا وان کێم بکەت یان
گونەهێت وان زێدە بکەت، یان ئێکی شوینا ئێکێ دی جزا بکەت].

وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ١٠٩
كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ
وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِۗ وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ
ٱلْكِتَٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمۚ مِّنْهُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ
ٱلْفَٰسِقُونَ ١١٠ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّآ أَذًىۖ وَإِن يُقَٰتِلُوكُمْ
يُوَلُّوكُمُ ٱلْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ١١١ ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ
ٱلذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوٓا۟ إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ
وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْمَسْكَنَةُۚ ذَٰلِكَ
بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلْأَنۢبِيَآءَ
الحِزْبُ ٧ بِغَيْرِ حَقٍّۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ١١٢ ۞ لَيْسُوا۟
سَوَآءًۗ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ
ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ١١٣ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ
ٱلْءَاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ
وَيُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْخَيْرَٰتِۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ١١٤ وَمَا
يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ١١٥





﴿١٠٩﴾ هندی د ئەرد و ئەسمانانــدا، هەمی یێ خودێیە، و هەمی کاروبار دێ هەر ب بال ویڤە زڤڕن. ﴿١١٠﴾ هوین [گەلی موسلمانان] باشترین ملەتن بۆ خەلکی هاتین، چونکی هوین فەرمانێ ب کرنا قەنجییێ دکەن و ڕێکێ ل خرابییێ دگرن، و هوین باوەرییێ ژی ب خودێ دئینن، و ئەگەر خودان کتێبان باوەری ئینابایە، بۆ وان باشتربوو، هندەك ژ وان (ژ خودان کتێبان) خودان باوەرن [ئانکو باوەری یا ب پێغەمبەری ئینایی] و باراپتر ژێ ژ ڕێ دەرکەڤتینە. ﴿١١١﴾ چو زیانێ ناگەهیننە هەوە، ئەزیەت [ب دەڤی، و ب بێ بەختییێ] تێ نەبیت. و ئەگەر شەڕی د گەل هەوە بکەن، [دێ شکێن و خۆ ناگرن] و دێ بازدەن، و پاشی هاریکارییا وان ژی نائێتەکرن. ﴿١١٢﴾ هەر جهەکێ ئەو لێ بن، خودێ ڕسوایی و بێ ڕویمەتی ب سەر واندا گرتییە [دارێتیە]، نابێژم خۆ ب وەریسێ خودێڤە بگرن [موسلمان بن ] و خۆ ب وەریسێ [عەهدێ] موسلمانانڤە بگرن. و ب کەرب و کینا خودێڤە زڤڕین، و ڕسوایی ل وان هاتە ئێك، ئەڤە هەمی ژ بەر هندێ، چونکی وان باوەری ب ئایەتێت خودێ نەدئینا و ژ بێ بەختی و ب نەهەقی پێغەمبەرێت خودێ دکوشتن، ئەڤە ژی هەر ب نەگوهدارییا خۆ و زێدەگاڤی ژی [د سەرڕا] دکرن. ﴿١١٣﴾ هەمی [خودان کتێب مەخسەد جوهی ] وەکی ئێك نینن، هندەك ژ وان هەنە دورستن، و ل بەر فەرمانا خودێ د ڕاوەستاینە، و ب شەڤ ئایەتێت خودێ [کو قورئانە] دخوینن، و بۆ خودێ ئەنیا خۆ ددانینە ئاخێ [ب شەڤ قورئانێ ل سەر نڤێژان دخوینن]. ﴿١١٤﴾ باوەرییێ ب خودێ و ڕۆژا ئاخرەتێ دئینن، و فەرمانێ ب باشییێ دکەن و ڕێ ل خرابییێ دگرن، و لەزێ ل قەنجییان دکەن، و ئەڤە (ئانکو خودانێت ڤان سالۆخەتان) ژ کێرهاتی و سەرڕاستانە. ﴿١١٥﴾ و چ قەنجییا ئەو بکەن، ژێ بێ بار نابن و خودێ ژ پارێزکاران ب ئاگەهە.

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ
ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۚ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١١٦
مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَثَلِ رِيحٖ فِيهَا
صِرٌّ أَصَابَتۡ حَرۡثَ قَوۡمٖ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَأَهۡلَكَتۡهُۚ وَمَا
ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنۡ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ١١٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةٗ مِّن دُونِكُمۡ لَا يَأۡلُونَكُمۡ خَبَالٗا
وَدُّواْ مَا عَنِتُّمۡ قَدۡ بَدَتِ ٱلۡبَغۡضَآءُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَمَا تُخۡفِي
صُدُورُهُمۡ أَكۡبَرُۚ قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ ١١٨
هَٰٓأَنتُمۡ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمۡ وَلَا يُحِبُّونَكُمۡ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ
كُلِّهِۦ وَإِذَا لَقُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ عَضُّواْ عَلَيۡكُمُ
ٱلۡأَنَامِلَ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۚ قُلۡ مُوتُواْ بِغَيۡظِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ
ٱلصُّدُورِ ١١٩ إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡ وَإِن تُصِبۡكُمۡ
سَيِّئَةٞ يَفۡرَحُواْ بِهَاۖ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ
شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ١٢٠ وَإِذۡ غَدَوۡتَ مِنۡ أَهۡلِكَ
تُبَوِّئُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلۡقِتَالِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ١٢١



﴿١١٦﴾ ب ڕاستی ئەوێت گاور بوویین، مال و زارۆكێت وان مفایێ وان ناكەت، و ئیزایا خودێ ژ وان نادەتە پاش، و ئەڤە دۆژەهینە و هەروهەر دێ تێدا بن. ﴿١١٧﴾ مەتەلا كەسێ مالێ خۆ ب ڕویمەتی د ڤێ دنیایێدا دمەزێخیت وەكی مەتەلا بایەكێ ب سڕ و سەقەمە ب سەر چاندنیا ملەتەكی ستەمكاردا بێت و پویچ بكەت، [و چو مفایی بۆ خۆ ژێ وەرنەگرن، هۆسا گاور ژی، مفایی ژ كارێت خۆ یێت قەنج ناكەن]. خودێ ستەم ل وان نەكرییە بەلێ وان [ب كار و كریارێت خۆ یێت نە د ڕێدا و نەدورست] ستەم و زیان ل خۆ كرینە. ﴿١١٨﴾ گەلی خودان باوەران ژ بلی خۆ [موسلمانان] كەسێ دیتر [شوینا خودان باوەران] نەكەنە دۆست و بژارتییێت خۆ، ئەو تەخسیرییێ د ئەزیەتگەهاندنا هەوەدا ناكەن، هیڤیان دكەن [و دخوازن] بەرتەنگی و وەستیان بۆ هەوە چێ ببیت، كین و نەڤیان ژ دەڤێ وان دیاربوو [و دباریت]، و یا د دلێ واندا هێژ مەزنترە ژی. ب ڕاستی مە بۆ هەوە، ئایەت و نیشان [ل سەر پێدڤیا دلسۆژییێ د دینیدا و دۆستینیا موسلمانان و نەدۆستینیا گاوران] ئاشكەرا كرن، ئەگەر ئاقلەك د سەرێ هەوەدا هەبیت.
﴿١١٩﴾ ئەها ئەڤە هوینێ حەژ وان دكەن، و ئەو حەژ هەوە ناكەن، و هوین باوەرییێ ب كتێبێت هاتینە خوارێ هەمییان دئینن [دگەل هندێ ژی ئەو هەر حەژ هەوە ناكەن]. و ئەگەر گەهشتنە هەوە و هوین دیتن دێ بێژن: مە ژی باوەری ئینا، و ئەگەر قەدەربوون و مانە ب تنێ، و پشتا هەوە كەڤتە وان، ژ كەربانددا بۆ هەوە تلان دگەزن و دكرینن، بێژە: ب كەرب و كینێت خۆڤە بمرن، ب ڕاستی خودێ ژ وێ ب ئاگەهە یا د سینگاندا [ڤەشارتی]. ﴿١٢٠﴾ ئەگەر خۆشییەك بگەهیتە هەوە، پێ نەخۆش دبن، و ئەگەر نەخۆشییەك بگەهیتە هەوە، كەیفا وان پێ دئێت، و ئەگەر هوین بێنا خۆ [ل سەر ئەزیەتا وان بكێشن] و پارێزكارییێ بكەن، فند و فێلێت [نەخشكێشانا] وان چو زیانێ ناگەهیننە هەوە، ب ڕاستی ئەو كارێ ئەو دكەن خودێ پێ ئاگەهە.
﴿١٢١﴾ [بیننە بیرا خۆ] وی دەمێ سپێدێ زوی تو ژ مال دەركەڤتی، دا چەپەران بۆ خودان باوەران كار بكەی، و خودێ یێ گوهدار و زانایە.

إِذۡ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمۡ أَن تَفۡشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَاۗ وَعَلَى ٱللَّهِ
فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدۡرٖ وَأَنتُمۡ أَذِلَّةٞۖ
فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذۡ تَقُولُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ
أَلَن يَكۡفِيَكُمۡ أَن يُمِدَّكُمۡ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ
مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ
هَٰذَا يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾
وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ لَكُمۡ وَلِتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦۗ
وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ لِيَقۡطَعَ طَرَفٗا
مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡ يَكۡبِتَهُمۡ فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾
لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ أَوۡ يُعَذِّبَهُمۡ فَإِنَّهُمۡ
ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ يَغۡفِرُ لِمَن
يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ
وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿١٣٠﴾ وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ
لِلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٣١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿١٣٢﴾



﴿١٢٢﴾ دەمێ دو دەستەك ژ هەوە، نێزیك بوو دا
شكێن و ژ هەوە ڤەبن [و زڤڕنەڤە] و سست بن، و
خودێ پشتەڤانێ وانە [ژ بەر هندێ پارستن و نەهێلا
سست ببن و د گەل دوڕوییان بزڤڕن]. و بلا
خودان باوەر پشتا خۆ ب خودێ موكوم بكەن.
﴿١٢٣﴾ ب سویند خودێ شەڕێ بەدرێ، هوین ب
سەرئێخستن و هاریكارییا هەوە كر، و هوین پیچەك.
ڤێجا پارێزكارییا خودێ بكەن ، دا هوین سوپاسییا
[خێر و خۆشی و كەرەمێت ] وی بكەن. ﴿١٢٤﴾ بیننە بیرا
خۆ [ڕۆژا بەدرێ] دەمێ تە گۆتییە خودان باوەران،
ما نەبەسی هەوەیە خودێ بۆ هاریكارییا هەوە سێ
هزار ملیاكەتان بینیتە خوارێ. ﴿١٢٥﴾ بەلێ، ئەگەر
هوین بێنا خۆ [ل سەر شەڕی] فرەهـ بكەن و خۆ
بپارێزن، د ڤێ گاڤێدا [دژمن] بێنە هەوە و ب سەر
هەوەدا بگرن، خودێ دێ پشتەڤانییا هەوە ب هنارتنا
پێنج هزار ملیاكەتێت نیشانكری كەت. ﴿١٢٦﴾ خودێ
[ئەڤ هاریكارییە] نەدكر ئەگەر ژ بەر هندێ نەبایە دا
ببیتە مزگینییەك بۆ هەوە [كو هوین دێ ب سەركەڤن]
و دا دلێت هەوە پێ تەنا ببن [و ترسا دژمنی ژ بەر پیچەكییا هەژمارا هەوە، ژ دلێ هەوە دەركەڤیت] و هندی
سەركەڤتنە ژ نك خودایێ سەردەست و كار بنەجهە. ﴿١٢٧﴾ [و خودێ ئەڤ پشتەڤانی و هاریكارییە كرییە]
دا گوهەكی [ئالییەكی] ژ بەر گاوران ڤەكەت و ژ ناڤ ببەت، یان دا دلێ وان ب كول و خەم بێخیت، و وان
[وەسا] شەرمزار بكەت كو سەرشۆڕ و بێ هیڤی بزڤڕنەڤە. ﴿١٢٨﴾ [هەی موحەمەد، بزانە] تە چو دەست د
ڤی كاروباریدا نینە [هەمی د دەست خودێ دایە چ یا وی بڤێت دێ ل وان كەت]، چ تۆبەیێ بدەتە سەر وان
[پشتی پەشێمان دبن] و چ ژی وان ئیزا بدەت [ئەگەر هەر ل سەر گونەهێ مان]. و ب ڕاستی ئەو ستەمكارن.
﴿١٢٩﴾ چ د ئەرد و ئەسمانان‌دا هەیە، هەمی یێ خودێیە، ڤێجا یێ وی بڤێت لێ ناگریت و دێ گونەهێت وی
ژێ بەت، و یێ بڤێت دێ ئیزا دەت، و خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿١٣٠﴾ گەلی خودان باوەران، سەلەفێ
ب زێدەییا گەلەجاركی نەخۆن [مەخسەد سەلەفێ بهێلن و سەرێ مالێ خۆ ب تنێ وەرگرن بێ زێدەیی]، و
پارێزكارییا خودێ بكەن، هیڤییا هندێ دا هوین سەرفەراز ببن. ﴿١٣١﴾ و خۆ بپارێزن ژ ئاگرێ (دۆژەها) بۆ
گاوران هاتییە بەرهەڤكرن. ﴿١٣٢﴾ و گوهدارییا خودێ و پێغەمبەری بكەن، دا خودێ دلۆڤانییێ ب هەوە
ببەت .

نصف الحزب ٧

* وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا
ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ
فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ
عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ
فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ
لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا
فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ١٣٥ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن
رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ
أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ١٣٦ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ
فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ١٣٧
هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ١٣٨
وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٣٩
إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥۚ وَتِلۡكَ
ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٤٠





﴿١٣٣﴾ [گەلی خودان باوەران] لەز ل ژێبرنا
گونەهان ژ بەرێ خودایێ خۆڤە و ل بەحەشتا
فرەهیا وێ فرەهیا ئەرد و ئەسمانان بکەن،
ئەو بەحەشتا بۆ پارێزکاران هاتییە بەرهەڤکرن.
﴿١٣٤﴾ [ئەو پارێزکارێت] د بەرفرەهی و تەنگاڤییێدا
[د دەولەمەندی و دەستکورتییێدا] مالێ خۆ دمەزێخن،
و کەربا خۆ دادعویرن و ڤەدشێرن [ستەمێ ژ کەرباندا
ل کەسێ ناکەن] و د ڕاستا خۆدا خەلکی ئازا دکەن، و
خودێ ژی حەژ ڤەنجیکاران دکەت. ﴿١٣٥﴾ و ئەوێت
(پارێزکارێت) ئەگەر گونەهەکێ دکەن یان ژی ستەمێ
ل خۆ دکەن، ناڤێ خودایێ خۆ دئینن و خودێ دئیننە
بیرا خۆ، و داخوازا گونەهـ ژێبرنێ ژ خودێ دخوازن،
ما کی ژ بلی خودێ گونەهان ژێ دبەت، و ڕکمانێ
ل سەر گونەها کرین ناکەن (هەر نامیننە ل سەر و
دهێلن و ئنیەتا لێ نەزڤڕینێ دکەنە دلێ خۆ). و ئەو
دزانن [وان خەلەتی کر و نابیت هەر ل سەر بمینن،
و دڤێت تۆبە بکەن، و دزانن کەس ژ خودێ پێڤە
گونەهێت وان ژێ نابەت]. ﴿١٣٦﴾ ئەڤان خەلاتێ وان
ژێبرنا گونەهانە ژ بەرێ خودایێ وانڤە و بەحەشتێت ڕوبیار د بنڕا دهەڕکن و دچن، و هەروهەر دێ تێدا بن،
و بەحەشت چ خۆش خەلاتە بۆ کریارکەرێت ڤەنج. ﴿١٣٧﴾ [گەلی خودان باوەران] بێ گۆمان بەری هەوە
ڕویدانێت بۆرین [ڕێکا (سونەتا) خودێ د ڕاستا ئەوێت ئایەتێت وی دەرئێخستین و باوەری ب پێغەمبەرێت
وی نەئینایین]. ڤێجا هوین د ئەردیدا بگەڕن بەرێ خۆ بدەنێ و بزانن کا دویماهیکا ئەوێت [ئایەتێت خودێ]
درەو دەرئێخستین یا چاوا بوو و چ بوو؟ ﴿١٣٨﴾ ئەڤ قورئانە بەیانە بۆ هەمی خەلکی و ڕاستەڕێکرن و
چامەیە بۆ پارێزکاران. ﴿١٣٩﴾ و هوین [گەلی خودان باوەران] سست نەبن و ب خەم نەکەڤن، و هوین د سەر
وانڕانە، ئەگەر هوین خودان باوەر بن [نە سست بن و نە ب خەم بکەڤن]. ﴿١٤٠﴾ ئەگەر هوین [د ئوحدێدا ]
بریندار بووبن [و بوت پەرێسان شیابنە هەوە]، ب ڕاستی وەکی ڤێ ب سەرێ وان ژی هاتبوو [ڕۆژا بەدرێ،
بەلێ سست نەبوون و دەستێت خۆ د بەر خۆدا نەبەردان، و جارەکا دی زڤڕینە شەڕێ هەوە، ڤێجا یا باش
ئەوە هوین ژ وان چێتر بن، د بێ هیڤی نەبوون و سست نەبوونێدا]. و ڤان ڕۆژان [جار شکەستن و جار
سەرکەڤتن] د ناڤبەرا خەلکیدا دگێڕینین [ئەزموونە بۆ خەلکی]، دا خودێ ئەوێت باوەری ئینایین [و سەبری
دکێشن] بنیاسیت، و هندەکان ژ هەوە ب شەهیدبوونێ خەلات بکەت، و ب ڕاستی خودێ حەژ ستەمکاران
ناکەت.

وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمۡ
حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ
مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَقَدۡ كُنتُمۡ تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ مِن
قَبۡلِ أَن تَلۡقَوۡهُ فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾ وَمَا مُحَمَّدٌ
إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوۡ قُتِلَ
ٱنقَلَبۡتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡۚ وَمَن يَنقَلِبۡ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ فَلَن يَضُرَّ
ٱللَّهَ شَيۡـٔٗاۗ وَسَيَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَمَا كَانَ
لِنَفۡسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ كِتَٰبٗا مُّؤَجَّلٗاۗ وَمَن يُرِدۡ
ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلۡأٓخِرَةِ نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَاۚ
وَسَنَجۡزِي ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيّٖ قَٰتَلَ مَعَهُۥ
رِبِّيُّونَ كَثِيرٞ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ
وَمَا ٱسۡتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوۡلَهُمۡ إِلَّآ أَن
قَالُواْ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا
وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ
ٱلدُّنۡيَا وَحُسۡنَ ثَوَابِ ٱلۡأٓخِرَةِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٤٨﴾



﴿١٤١﴾ و دا خودێ ئەوێت باوەری ئینایین ژ گونەهان بشۆت و گاوران ژی قڕ بكەت. ﴿١٤٢﴾ [گەلی موسلمانان] هوین هزر دكەن بچنە بەحەشتێ بێی خودێ بزانیت كا ئەوێت جیهاد كرین و سەبر كێشایین ژ هەوە، كی بوون؟!. ﴿١٤٣﴾ ب سویند بەری هوین مرنێ ببینن هەوە مرن دخواست [هەوە حەز دكر شەڕەك چێ ببیت، دا هوین تێدا شەهید ببن]، و ب راستی هەوە مرن دیت [و هوین ب خۆ ژی نێزیكی مرنێ بوون و هەڤالێت هەوە ل پێش چاڤێت هەوە هاتنە شەهیدكرن]. و هەوە ددیت [وەختێ هەڤالێت هەوە دهاتنە كوشتن]. ﴿١٤٤﴾ و موحەمەد پێغەمبەرەكە ژ پێغەمبەران، و گەلەك پێغەمبەر بەری وی هاتینە و چۆیینە، ڤێجا ئەگەر مر، یان هاتە كوشتن، هوین دێ ب پاشڤە زڤرن، [و هلگەڕنە سەر گاورییێ] و هەچییێ ژ هەوە ب پاشڤە بزڤریتەڤە [و گاور ببیت] چو زیانێ ناگەهینیتە خودێ، و خودێ دێ خەلاتێ سوپاسداران [ئەوێت خۆ ڕاگرتین و ب پاشڤە نەزڤرین] دەتێ. ﴿١٤٥﴾ نینە كەسەك بمریت بێ دەستویرا خودێ [ئانكو بێ دەستویرا خودێ كەس نامریت] [مرن] ب ڕۆژا خۆ تشتەكێ نڤیسی یێ دیاركرییە [ئانكو نڤێسییە، نە پێش دكەڤیت و نە پاش دكەڤیت]، و هەچییێ [ب كار و كریارێت خۆ] دنیا بڤێت ئەم دێ ژێ دەینێ و یێ [ب كار و كریارێت خۆ] خێرا ئاخرەتێ بڤێت دێ ژێ دەینێ، و سوپاسداران دێ خەلات كەین. ﴿١٤٦﴾ چەند پێغەمبەر هەبوون، گەلەك مرۆڤێت خودێ [ژ زانا و چاكان] د گەل وان شەڕ [د ڕێكا خودێدا] كرینە، و سست نەبوون ژ بەر ئەوا د ڕێكا خودێدا دیتین، و بێ هێز و لاواز نەبوون و ستۆیێ خۆ خوار نەكرن [سەرێت خۆ نەچەماندن]. و خودێ ژی حەژ بێنفرەهان دكەت. ﴿١٤٧﴾ و ئاخڤتنا وان ژی هەر ئەڤە بوو: خودێوۆ ل گونەهێت مە و زێدەگاڤیا مە ببۆرە، و مە قاهیم بكە [پییێت مە موكم بكە و ڕابگرە] و مە ب سەر ملەتێ گاور بێخە. ﴿١٤٨﴾ ڤێجا خودێ خێرا دنیا و ئاخرەتێ دا وان [سەركەڤتن و دەستكەڤتن دانێ] و خودێ حەژ قەنجیكەران دكەت.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
يَرُدُّوكُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ١٤٩
بَلِ ٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلنَّٰصِرِينَ ١٥٠ سَنُلۡقِي
فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ بِمَآ أَشۡرَكُواْ بِٱللَّهِ
مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗاۖ وَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ وَبِئۡسَ
مَثۡوَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٥١ وَلَقَدۡ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ
وَعۡدَهُۥٓ إِذۡ تَحُسُّونَهُم بِإِذۡنِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلۡتُمۡ
وَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ وَعَصَيۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم
مَّا تُحِبُّونَۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن
يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ ثُمَّ صَرَفَكُمۡ عَنۡهُمۡ لِيَبۡتَلِيَكُمۡۖ
وَلَقَدۡ عَفَا عَنكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٥٢
۞إِذۡ تُصۡعِدُونَ وَلَا تَلۡوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٖ
وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ فِيٓ أُخۡرَىٰكُمۡ فَأَثَٰبَكُمۡ
غَمَّۢا بِغَمّٖ لِّكَيۡلَا تَحۡزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا
مَآ أَصَٰبَكُمۡۗ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٥٣

ثلاثة أرباع الحزب ٧





﴿١٤٩﴾ [گەلی موسلمانان] ئەگەر هوین ب گۆتنا
ئەوێت گاور بووین بكەن دێ هەوە خڕینن و
زڤڕیننە سەر گاورییێ، ڤێجا هوین دێ ڤەگەڕنەڤە،
زیاندار و خوسارەت. ﴿١٥٠﴾ [ئەو نەدۆستێت هەوەنە،
گوهدارییا وان نەكەن] بەلكی خودێ هاریكار و
پشتەڤانێ هەوەیە و ئەو باشترین هاریكار و پشتەڤانە.
﴿١٥١﴾ ئەم نێزیك دێ ترس و لەرزێ ئێخینە د ناڤ دلێ
گاوراندا، ژ بەر شركا وان دكر ژ نەهەقی و بێ تشتەك
بۆ هەبیت، و جهێ وان دۆژەهە و چ پیسە جهە جهێ
ستەمكاران. ﴿١٥٢﴾ ب سویند گاڤا هەوە نەیارێ خۆ
ب دەستویر و ئزنەها خودێ [ئێخستییە پێشییا خۆ]
و شكاندی و قوتبڕ كری [ب كوشتنێ] خودێ ئەو
پەیمانا داییــیە هەوە [كو هەوە ب سەربێخیت] ب جهـ
ئینا. بەلێ پشتی خودێ ئەوا هەوە دڤیا نیشا هەوە
دایی، د وێ گاڤێدا هوین سست بوون و ژێكڤەبوون
و هەوە نەگوهداری كر [ئەو جهێت پێغەمبەری بۆ
هەوە دانایین، هەوە هێلان]. هندەكان ژ هەوە دنیا
[دەستكەڤتی] دڤیا [جهێت خۆ بەردان و هێلان]، و
هندەكان ژ هەوە ئاخرەت دڤیا [ل جهێت خۆ مان و بەرنەدان]، پاشی [خودێ] هوین ژ وان ڕزگار كرن
[ب شكەستنێ] دا هەوە بجەڕبینیت، و خودێ هوین ئازاكرن [پشتی هوین پەشێمان بووین]، و خودێ
خودان كەرەم و منەتە ل سەر خودان باوەران. ﴿١٥٣﴾ بیننە بیرا خۆ [گەلی موسلمانان] دەمێ هوین ل دویڤ
سەرێ خۆ درەڤین و ل كەسێ نەدزڤڕین، و پێغەمبەری ل پشت هەوە د گەل ئەڤێت مایی گازی هەوە دكر
[بەلێ هوین ل پاش خۆ نەدزڤڕین و هوین هەر درەڤین]، و خودێ كۆڤان ل سەر كۆڤانێ ب سەر هەوەدا
دارێت، دا هوین خەمێ ژ وی تشتی نەخۆن یێ ژ دەست هەوە چۆیی [كو سەركەڤتن بوو]، و خەمێ ژ وی
نەخۆن یێ هوین هنگاڤتین [كو شكەستن بوو]، و خودێ ب ئاگەهە ژ وی یێ هوین دكەن.

ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنۢ بَعۡدِ ٱلۡغَمِّ أَمَنَةٗ نُّعَاسٗا يَغۡشَىٰ طَآئِفَةٗ
مِّنكُمۡۖ وَطَآئِفَةٞ قَدۡ أَهَمَّتۡهُمۡ أَنفُسُهُمۡ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ
ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ مِن شَيۡءٖۗ
قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَمۡرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِۗ يُخۡفُونَ فِيٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبۡدُونَ لَكَۖ
يَقُولُونَ لَوۡ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٞ مَّا قُتِلۡنَا هَٰهُنَاۗ قُل لَّوۡ كُنتُمۡ
فِي بُيُوتِكُمۡ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَتۡلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمۡۖ
وَلِيَبۡتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمۡ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ
وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٥٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ
يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ
مَا كَسَبُواْۖ وَلَقَدۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿١٥٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ إِذَا
ضَرَبُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَوۡ كَانُواْ غُزّٗى لَّوۡ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ
وَمَا قُتِلُواْ لِيَجۡعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسۡرَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡۗ وَٱللَّهُ يُحۡيِۦ
وَيُمِيتُۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿١٥٦﴾ وَلَئِن قُتِلۡتُمۡ فِي سَبِيلِ
ٱللَّهِ أَوۡ مُتُّمۡ لَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحۡمَةٌ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴿١٥٧﴾





﴿١٥٤﴾ پاشـی خودێ پشـتی کۆڤانـێ ئێمناهـی و تەناهی و هێنژیـن [خـەو چاڤگرتـن] ب سـەر هـەوەدا دارێـت، دەسـتەکەك ژ هەوە د نقرۆسـك دچن [پشـتی وەسـتیانێ تەنـا دبـن] و دەسـتەکەك ژی کەتبوونـە د دەردێ خۆدا و بـەس د خەمـا خـۆدا بـوون [ژ ترسـاندا خـەو ژ چاڤـان ڤەرەڤـی] و هـزرا نـە د رێدا [کـو خـودێ پێغەمبەرێ خۆ سـەرنائێخیت] ژ خـودێ دکـرن، وەکی نەزانـان، دبێژن: مـا کار و بارەك ب دەسـتێ مە هەیە؟ [ژ سـەرکەڤتنێ یان شکەسـتنێ] بێـژە: [هەی موحەمـەد] هەمـی کاروبار ب خودێنـە [چـاوا بڤێـت دێ وەسـا بیـت]. وێ د سـینگێ خـۆدا ڤەدشـێرن یـا بـۆ تـە ئاشـکەرا نەکـەن، دبێـژن: ئەگـەر کاروبـارەك د دەسـت مـەدا هەبایـە، ئـەم ل ڤێرێ نەدهاتینـە کوشـتن، بێژە: ئەگـەر هوین خۆ د خانییـــێت خۆڤە ژی بانە، دیسـا ئەوێت کوشـتن ل سـەر وان هاتییە نڤێسـین، دا بـۆ کوشـتنا خـۆ دەرکەڤـن، دا خـودێ ئـەوا د سـینگێ هـەوەدا هـەی بجەرببینیـت، و دا یـا د دلـێ هـەوەدا [ژ بانـگ و ئاوازێـت شـەیتانی] پاقـژ بکـەت. و خـودێ ئاگەهـەداره ژ وێ یـا د سـینگ و دلانـدا.

﴿١٥٥﴾ ب راسـتی ئەوێـت رۆژا هـەردو کـۆم ڤێـك کەڤتـین [رۆژا ئوحـدێ] و پشـت داپینـە شـەری و رەڤین، ب راسـتی شـەیتانی ئـەو د سـەردابرن و تەحسـاندن ژ بـەر گونەهێـت وان کریـن، ب راسـتی خـودێ ل وان بـۆری و ئازاکـرن. و ب راسـتی خـودێ گونەهــ ژێبـەر و بێنفرەهـە ل سـەر جزادانـێ. ﴿١٥٦﴾ گـەلی خـودان بـاوەران، هویـن ژی وەکـی وان نەبـن، ئەوێـت گـاور بوویـن و بـۆ برایێـت خـۆ [چ یێـت بابـێ یـان یێـت دورویاتییـێ] دگۆتـن چ گاڤـا دەرکەڤتبانـە بازرگانییەکـێ یـان وەغەرەکـێ، یـان ژی خەزاکەربانـە [مربـان یـان ژی هاتبانـە کوشـتن]: ئەگـەر ل دەڤ مـە بانـە نەدمـرن و نەدهاتنـە کوشـتن، دا خودێ ڤـێ بـاوەرا وان بکەتە کـول و کۆڤان د دلـێ وانـدا. و خودێیە سـاخ دکـەت و دمرینیت، و خـودێ ئاگەهـداره ب کار و کریارێت هوین دکـەن و دبینیت.
﴿١٥٧﴾ و ئەگـەر هویـن د رێـکا خودێدا هاتنە کوشـتن یان ژی مرن، ب راسـتی لێبۆرینا خـودێ و دلۆڤانییا وی بۆ هـەوە ژ وان تشـتان ئەوێـت هویـن [بـۆ ژین و ژیـارا دنیایـێ] کۆم دکـەن چێترە.

وَلَئِن مُّتُّمۡ أَوۡ قُتِلۡتُمۡ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحۡشَرُونَ ﴿١٥٨﴾ فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ
لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ
فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ
فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ إِن يَنصُرۡكُمُ ٱللَّهُ
فَلَا غَالِبَ لَكُمۡۖ وَإِن يَخۡذُلۡكُمۡ فَمَن ذَا ٱلَّذِي يَنصُرُكُم مِّنۢ
بَعۡدِهِۦۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٦٠﴾ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن
يَغُلَّۚ وَمَن يَغۡلُلۡ يَأۡتِ بِمَا غَلَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ
نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١٦١﴾ أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِ
كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأۡوَىٰهُ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٦٢﴾
هُمۡ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿١٦٣﴾ لَقَدۡ
مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ
يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ
وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾ أَوَلَمَّآ
أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ
قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٦٥﴾





﴿١٥٨﴾ و ئەگەر هوین مرن یان هاتنە کوشتن
[بزانن] هوین دێ هەر بەر ب خودێڤە ئێنە کۆمکرن.
﴿١٥٩﴾ [هەی موحەمەد] ژ بەر وێ دلۆڤانییا خودێ ب
تە بری تو بۆ وان نەرم بووی، و هەکە تو مرۆڤەکێ
هشکێ دلڕەق بایی دا ژ دۆرێت تە ڤەڕەڤن، [ژ بەر
هندێ] ل وان ببۆرە و داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ وان
ژ خودێ بخوازە، و مشێورەتا وان د کاروباراندا بکە
[د وان کاروبارێت وەحی پێ نەهاتی] و ئەگەر تە
[پشتی مشێورەتێ] خۆ ئێك دل کر و بڕیارا خۆ دا
[و ڕەئیا خۆ ڤەبڕی]، پشتا خۆ ب خودێ ڕاست بکە،
و ب ڕاستی خودێ حەژ وان دکەت یێت پشتا خۆ ب
خودێ ڕاست دکەن. ﴿١٦٠﴾ ئەگەر خودێ هاریکاری
و پشتەڤانییا هەوە بکەت [و هەوە سەربێخیت]
شکەستن بۆ هەوە نینە، و کەس ل سەر هەوە زال
نابیت، و ئەگەر هاریکاری و پشتەڤانییا هەوە نەکەت
و هەوە بشکێنیت، کی هەیە ژ خودێ پێڤە هاریکارییا
هەوە بکەت؟ و بلا خودان باوەر پشتا خۆ ب خودێ
گەرم بکەن. ﴿١٦١﴾ چو پێغەمبەران [ئەو ماف نینە]
خیانەتێ بکەن و بەختێ خۆ خراب بکەن، و هەر کەسێ خیانەتێ بکەت، ڕۆژا قیامەتێ، ئەو ب خیانەتا
خۆڤە دێ ئێتە حازرکرن، پاشی هەر ئێکی ل دویڤ کار و کریارێت وی حسێب دێ د گەل ئێتە کرن. و ستەم
ل کەس ژ وان نائێتە کرن [نە خێرێت وان کێم دبن، نە ژی گونەهێت وان پتر لێ دئێن]. ﴿١٦٢﴾ ئەرێ ما
ئەوێ قایلبوون و ڕازیبوونا خودێ ل بەر، و دخوازیت وەکی وییە، یێ ب نەڕازیبوونا خودێڤە ڤەگەڕیایی،
و جهێ وی دۆژەهە [کو] چ پیسە جهە. ﴿١٦٣﴾ [نەء، هەردو جوین نەوەکی ئێکن ل دەڤ خودێ] هەر ئێك
ژ وان ل دەڤ خودێ پەییسکەکە، و خودێ دبینیت کا ئەو چ دکەن [خودێ ژ کریارێت وان ب ئاگەهە].
﴿١٦٤﴾ خودێ خێر و کەرەم د گەل باوەری ئینابییان کر، دەمێ پێغەمبەرەك هەر ژ وان بۆ وان هنارتی،
نیشانێت مە بۆ وان بخوینیت [ئانکو قورئانێ نیشا وان بدەت] و دل و هناڤێت وان بشۆت و ڤەشۆت و
پاقژ بکەت. و کتێب [کو قورئانە] و سونەتێ [کو ڕێکا پێغەمبەرییە] نیشا وان بدەت، هەر چەندە بەری
نوکە د بەرزەبوون و گومڕاییەکا ئاشکەرادا بوون. ﴿١٦٥﴾ ئەرێ [گەلی موسلمانان] دەمێ هوین بەرهنگاری
ئاتافەکێ بووین [کو ڕۆژا ئوحدێ حەفتێ ژ هەوە هاتنە کوشتن] و دوجا هندی وێ هەوە ب سەرێ وان ئینا
[ڕۆژا بەدرێ هەوە حەفتێ ژێ کوشتن و حەفتێ ژێ ئێخسیر و دیل کرن]، و هوین دبێژن ئەڤ [بەلایە] چاوا
و ژ کیڤە هات؟! بێژە [وان: مەخسەد پێ موسلمانن] ئەڤە [ئەڤ بەلایە] ژ هەوە ب خۆیە [دەمێ هەوە جهێت
خۆ بەردایین و نەگوهدارییا فەرمانا پێغەمبەری کری]. ب ڕاستی خودێ خودان شیانە ل سەر هەمی تشتی.

وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٦٦
وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ
أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ
أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ
وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ ١٦٧ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ
لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن
كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٦٨ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ
أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ١٦٩ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ
ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم
الحزب ٨ مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ١٧٠ ۞ يَسۡتَبۡشِرُونَ
بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٧١ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ
ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ ١٧٢
ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ
فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ١٧٣





﴿١٦٦﴾ و یا هاتییە سەریّ هەوە، دەمیّ هەردو کۆم کەڤتینە بەرانبەری ئێك [مەخسەد ژیّ موسلمان و گاورێت قورەیشییان ڕۆژا ئوحدیّ] ب دەستویرا خودیّ بوو، و دا خودان باوەر ئاشکەرا ببن [ئەوێت بێن ل سەر نەخۆشییێ کێشایین و خۆ ڕاگرتین].
﴿١٦٧﴾ [و دیسا] دا ئەوێت دوڕوویاتی کرین بێنە نیاسین و [ئاشکەرا ببن]. گۆتنە وان [مەخسەد پێ دوڕوینە]: وەرن د ڕێکا خودێدا شەڕی [جهادیّ] بکەن، یان ژی [ئەگەر هوین د ڕێکا خودێدا نەکەن] بەرگرییێ ژ خۆ بکەن، گۆتن: ئەگەر مە زانیبایە دیّ بیتە شەڕ، ئەم دا خۆ دەینە د گەل هەوە [و شەڕی کەین]، ئەو [ب ڤیێ گۆتنا خۆ] وێ ڕۆژێ هند نێزیکی باوەرییێ نینن هندی نێزیکی گاورییێ، وێ ب ئەزمانێ خۆ دبێژن یا نە ل سەر دلێ وان، و خودێ چێتر دزانیت کا ئەو چ [د دلێ خۆدا] ڤەدشێرن.
﴿١٦٨﴾ ئەوێت ڕوینشتین [شەڕ نەکرین] و گۆتینە برایێت خۆ، ئەگەر ب یا مە کربانە [و دەرنەکەتبانە شەڕی و هەر ژ مالێت خۆ دەرنەکەتبانە] نە دهاتنە کوشتن، بێژە [وان] ئەگەر هوین ڕاست دبێژن مرنێ ژ خۆ بدەنە پاش. ﴿١٦٩﴾ هزر نەکەن ئەوێت د ڕێکا خودێدا هاتینە کوشتن د مرینە [وەکی هەر ئێك دمریت]، [نەء] بەلکی ئەو ل دەڤ خودایێ خۆ د ساخن ڕزقێ خۆ دخۆن. ﴿١٧٠﴾ دلخۆشن ب ئەوا خودێ ب کەرەما خۆ دایییە وان و د گەل وان کری، و ئەو مزگینییێ ددەنە یێت ب پشت خۆڤە هێلایین، و هێژ نەگەهشتینە وان [و شەهید نەبوویین] کو ترس ل سەر وان نینە [ژ ئیزایێ ڕۆژا قیامەتێ] و ب خەم ژی ناکەڤن [ب هێلانا دنیایێ]. ﴿١٧١﴾ و ئەو ب وێ خێر و کەرەما خودێ د گەل وان کری دلخۆش دبن و مزگینییێ ددەن کو ب ڕاستی خودێ خێرا باوەرئینایییان بەرزە ناکەت. ﴿١٧٢﴾ [باوەرئینایی ئەون] ئەوێت پشتی برینداری و نەخۆشییا ئوحدێ ژی ب سەردا هاتی هەر ژ گوهدارییا خودێ و پێغەمبەری دەرنەکەڤتین، [و د گەل پێغەمبەری ل دویڤ ئەبو سوفیان و لەشکەرێ وی هاتن پشتی ژ ئوحدێ زڤڕین]، بۆ وان ئەوێت قەنجی کرین و پارێزکاری کرین خەلاتەکێ مەزن هەیە.
﴿١٧٣﴾ ئەوێت خەلکی [مەخسەد پێ مرۆڤەك بوو، ئەبو سوفیان هنارت کو بێژتە وان] گۆتینێ: خەلکی [نەیارێت هەوە] لەشکەرێ بۆ هەوە [بۆ بنبڕکرنا هەوە] کۆمکری، ژ خۆ بترسن و هشیار بن، [شوینا بترسن] باوەرییا وان پتر لێ هات و [ژ بەر هندێ] گۆتن: خودێ بەسی مەیە و پشتەڤان هەما هەر خودێیە.

فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ وَٱتَّبَعُواْ
رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ ١٧٤ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ
يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمۡ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٧٥
وَلَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِۚ إِنَّهُمۡ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ
شَيۡـٔٗاۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجۡعَلَ لَهُمۡ حَظّٗا فِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ
عَظِيمٌ ١٧٦ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ
شَيۡـٔٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ١٧٧ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا
نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۖ وَلَهُمۡ
عَذَابٞ مُّهِينٞ ١٧٨ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ
عَلَيۡهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطۡلِعَكُمۡ
عَلَى ٱلۡغَيۡبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجۡتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ
وَرُسُلِهِۦۚ وَإِن تُؤۡمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمۡ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ١٧٩ وَلَا يَحۡسَبَنَّ
ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ هُوَ خَيۡرٗا لَّهُمۖ
بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلِلَّهِ
مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ١٨٠



﴿١٧٤﴾ ڤێجا [ژ بەر پشتگەرمییا وان ب خودێ، بێ
شەڕ] و ب خێر و کەرەمێت خودێ ڤەگەڕیان و چو
نەخۆشی نەگەهشتنە وان، و ب دویڤ قایلبوون و
ڕازیبوونا خودێ کەڤتن [دەمێ ب برینێت خۆڤە ب
دویڤ لەشکەرێ قورەیشییان کەڤتین]، و خودێ
خودانێ کەرەمەکا مەزنە. ﴿١٧٥﴾ ب ڕاستی ئەوێ
[گۆتییە هەوە خەلك و نەیارێت هەوە بۆ هەوە یێت
کۆم بووین دا هەوە بترسینن و سار بکەن ژ جیهادێ]
ئەو شەیتانە، دۆستێت خۆ دترسینیت، ڤێجا ژ وان
نەترسن، و ژ من بترسن، ئەگەر ب ڕاستی هوین
خودان باوەرن. ﴿١٧٦﴾ و خەمێ ژ وان نەخۆ، ئەوێت
لەزێ ل گاورییێ دکەن، ب ڕاستی ئەو چو زیانێ
ناگەهیننە خودێ، و خودێ دڤێت چو پشك و باران
[ژ خەلاتێ] ڕۆژا ئاخرەتێ بۆ وان تەرخان نەکەت و
نەخۆشی و ئیزایەکا مەزن [وێ ڕۆژێ] بۆ وان هەیە.
﴿١٧٧﴾ ب ڕاستی ئەوێت گاوری ب باوەرییێ کڕی
چو زیانێ ناگەهیننە خودێ، و بۆ وان ئیزایەکا دژوار
هەیە. ﴿١٧٨﴾ ئەوێت گاور بووین بلا هزر نەکەن
مۆلەتا [بێندانا] ئەم ددەینە وان [چ ژی درێژی بیت چ خۆشحالی] بۆ باشییا وانە، ئەو بێنا ئەم ل وان فرەه
دکەین ژ بۆ هندێیە کو گونەهێت وان زێدە ببن، و ئیزایەکا هەتکبەر ژی بۆ وان هەیە. ﴿١٧٩﴾ [هەی موحەمەد]
خودێ خودان باوەران [موسلمانان] ل سەر ڤی دەستوداریێ هوین تێدا [تێکەل] ناهێلیت، هەتا قەنج و
خرابان ژێك نەڤاڤێریت. و خودێ هەوە ب سەر وی تشتێ نە ل بەر چاڤان و نهینی هلناکەت [کو غەیبە]،
بەلێ خودێ ژ ناڤ پێغەمبەرێت خۆ یێ بڤێت دێ هەلبژێریت و [ئاگەهدار کەت، هەروەکی پێغەمبەرێ خۆ
موحەمەد (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) ب سەر دوڕوییان هلکری]، ڤێجا باوەرییێ ب خودێ و پێغەمبەرێت
وی بینن، و ئەگەر هوین باوەرییێ بینن و پارێزکارییێ بکەن خەلاتەکێ مەزن بۆ هەوە هەیە. ﴿١٨٠﴾ و بلا
ئەوێت قەلسییێ د وی تشتیدا دکەن یێ خودێ ژ کەرەما خۆ دایییە وان، هزر نەکەن ئەڤە باشییە بۆ وان،
بەلکی ئەڤە بۆ وان خرابییە، ڕۆژا قیامەتێ ئەڤ چڕویکی و قەلساتییە دێ ل وان ئێتە ئێك [ئانکو دێ پێ ئێنە
ئیزادان] و میراتێ ئەرد و ئەسمانان هەر بۆ خودێیە، و خودێ ب هەر کار و کریارەکا هوین دکەن ئاگەهدارە.

لَّقَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٞ وَنَحۡنُ أَغۡنِيَآءُۘ
سَنَكۡتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتۡلَهُمُ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَنَقُولُ
ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ
وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّامٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ
عَهِدَ إِلَيۡنَآ أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ
تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُۗ قُلۡ قَدۡ جَآءَكُمۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِي بِٱلۡبَيِّنَٰتِ
وَبِٱلَّذِي قُلۡتُمۡ فَلِمَ قَتَلۡتُمُوهُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾
فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدۡ كُذِّبَ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ جَآءُو
بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾ كُلُّ نَفۡسٖ
ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوۡنَ أُجُورَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ
فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا
الحزب ٨ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ ۞ لَتُبۡلَوُنَّ فِيٓ
أَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ وَلَتَسۡمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ
ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَذٗى كَثِيرٗاۚ
وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴿١٨٦﴾





﴿١٨١﴾ ب سویند خودێ گۆتنا وان ئەوێت گۆتین خودێ یێ هەژارە (فەقیرە) و ئەم دەولەمەندین، بهیستیە. ب ڕاستی ئەڤا وان گۆتی [د ڕاستا خودێدا] و کوشتنا وان ژ بێ بەختی بۆ پێغەمبەران [بەری نوکە ئەم دێ نڤێسین، [و وان دێ ل سەر جزاکەین]، و دێ بێژینە وان تامکەنە ئیزایا دۆژەهێ. ﴿١٨٢﴾ [ئەڤ ئیزایە] ژ بەر وێیە یا هەوە ب دەستێت خۆ بەری نوکە کری. و خودێ ب ڕاستی د ڕاستا بەندەیێت خۆدا نەیێ ستەمکارە. ﴿١٨٣﴾ ئەو ئەون یێت گۆتین خودێ پەیمان ژ مە وەرگرتییە کو ئەم باوەرییێ ب چو پێغەمبەران نەئینین، هەتا ئەو پێغەمبەر قوربانەکی بۆ مە نەئینیت و ئاگرەك [ژۆردا نەئێت] بسۆژیت، [هەی موحەمەد] بێژە [وان] نێ پێغەمبەر بەری من ب نیشانێت ئاشکەرا و ب وی تشتێ هوین دبێژن هاتبوون، پا هەوە بۆچی کوشتن، هەکە هوین ڕاست دبێژن؟! ﴿١٨٤﴾ ڤێجا ئەگەر وان تو درەوین دانایی [باوەر ژ تە نەکرن] [خەمێ نەخۆ]، ب ڕاستی گەلەك پێغەمبەر بەری تە ژی ب نیشانێت ئاشکەرا و ب کتێبێت ئەسمانی و ب کتێبا ڕۆنکەر هاتبوون، [دگەل هندێ ژی] درەوین هاتنە دانان. ﴿١٨٥﴾ هەر جاندارەکێ هەبیت دێ تامکەتە مرنێ [و دێ شەربەتا مرنێ ڤەخۆت]، و ب ڕاستی ڕۆژا قیامەتێ هوین [هەمی] دێ جزایێ خۆ وەرگرن. ڤێجا هەر کەسێ ژ ئاگری دویرکەڤت و چۆ د بەحەشتێدا، ئەها ئەو ب سەرکەڤت و سەرفەراز بوو، و هندی ژیانا دنیایێیە ژ خەمل و خێر و پەرتالێ خاپاندنێ پێڤەتر نینە. ﴿١٨٦﴾ ب سویند هوین دێ ب مال و حال و جانێ خۆ ئێنە جەرباندن، و هوین دێ گەلەك ئیزا و نەخۆشییێ ژ وان بینن یێت بەری هەوە کتێب بۆ هاتین و ژ وان یێت هەڤاڵ و هۆگر بۆ خودێ چێکرین، ڤێجا ئەگەر هوین بێنا خۆ فرەهـ بکەن و پارێزکارییێ بکەن، [بزانن] کو ئەڤە [بێنفرەهی و پارێزکاری] ژ وان کارانە یێت دڤێت مرۆڤ ل سەر ڕێ هشیار و ڕژد بیت.

وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ
وَلَا تَكۡتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمۡ وَٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦ ثَمَنٗا
قَلِيلٗاۖ فَبِئۡسَ مَا يَشۡتَرُونَ ﴿١٨٧﴾ لَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡرَحُونَ بِمَآ
أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحۡمَدُواْ بِمَا لَمۡ يَفۡعَلُواْ فَلَا تَحۡسَبَنَّهُم
بِمَفَازَةٖ مِّنَ ٱلۡعَذَابِۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٨٨﴾ وَلِلَّهِ مُلۡكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِي
خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٖ
لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا
وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ
رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾
رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدۡخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدۡ أَخۡزَيۡتَهُۥۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ
أَنصَارٖ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ أَنۡ
ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمۡ فَـَٔامَنَّاۚ رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا
سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ
رُسُلِكَ وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾



﴿١٨٧﴾ و بـۆ ملەتیٚ خۆ بێژە: دەمێ خـودێ ژ وان ئەوێت کتێـب بـۆ هاتین سـۆز و پەیـمان سـتاندی [و گۆتییە وان] کـو هویـن بێ گۆمـان دێ ڤـێ کتێبـێ بۆ خەلکـی ڕۆن و ئاشـکەراکەن و چـو یـێ ژێ ناڤەشـێرن، [بەلێ ئەو سـۆز و پەیمانـا وان دایـی] ب پشـت خۆڤە هێلان [ئانکو پشـتا خـۆ دانـێ]. و [سـۆز و پەیمانـا خـۆ] ب بهایەکـی کێـم فرۆتـن، و نـە چـو بـازار بـوو وان کـری. ﴿١٨٨﴾ [هـەی موحەمـەد] هـزر نەکە ئەوێـت ب کریارێـت خۆ دلخۆش دبـن [کو ئـەو جوهینە یێت نیشـانێت موحەمـەد پێغەمبەر ئەوێـت د تەوراتێـدا هاتـین ڤەشـارتین ب ڤـی کارێ خـۆ دلخـۆش بوویـین دێ ژ ئیزایـا خـودێ ڕزگاربـن] و دڤێن دەستخۆشـییا وان بێتەکـرن ل سـەر وێ یـا نەکرین. هزر نەکـە ئەڤـە دێ ژ ئیزایـێ قورتال بـن، ئیزا و نەخۆشـییەکا دژوار بـۆ ڤـان هەیـە. ﴿١٨٩﴾ و سـەر و سـامانێ ئـەرد و ئەسـمانان هـەر یێ خودێیـە، و خودێ ب خۆ ژی ل سـەر هەمـی تشـتان دەسـتهەلاتدار و خودان شـیانە. ﴿١٩٠﴾ ب ڕاسـتی چێکرنـا ئەرد و ئەسـمانان، و هاتن و چۆنا شـەڤ و ڕۆژان نیشـانن [ل سـەر هەبـوون و دەسـتهەلاتدارییا خـودێ] بـۆ کەسـێت ژیـر و ئاقلـدار. ﴿١٩١﴾ [کەسـێت ژیـر و ئاقلـدار] ئەوێت ڕاوەسـتیایی [ل سـەر پیـیان] و ڕوینشـتی و ل سـەر تەنشـتێ (کێلەکـێ) درێژکـری، خـودێ دئینن‌ـە بـیرا خـۆ و زکـرێ خـودێ دکەن و هـزرا خۆ د چێکرنـا ئـەرد و ئەسـمانان‌دا دکـەن، [و دبێـژن]: خودێـوۆ [ئـەڤ جیهانـە] تـە ژ قەسـتا چـێ نەکریـە. پاکـی [ژ هەمـی کێماسـییان] هـەر بـۆ تەیـە، [و ئـەم تـە ژ کێماسـییان و تـە ژ چێکرنـا ژ قەسـتا و پویـچ پاقـژ دکەیـن]. ئێدی تـو مـە ژ ئاگـرێ دۆژەهـێ بپارێـزە. ﴿١٩٢﴾ خودێوۆ، ب ڕاسـتی کەسـێ تـو بکەیە د ئاگریدا تە ڕسـوا و شـەرمزار کـر، و سـتەمکاران چـو پشـتەڤان و هاریـکار نینـن. ﴿١٩٣﴾ خودێوۆ، ب ڕاسـتی مە گولـێ بـوو، بانگهلدێرەك بۆ باوەرئینانـێ یـێ گـازی دکـەت [باوەرییـێ ب خـودێ و پێغەمبـەری بینـن]، ڤێجا مە بـاوەری ئینـا، خودێوۆ ل مە ببـۆرە و دانگـێ ل سـەر گونەهێـت مـە بگـرە (ئانکـو ژێ ببـە)، و خەلەتی و خرابیـیـێت مـە ژێ ببە و مـە د گەل قەنجیـکاران بمرینـە [ئانکـو مە ژی ژ وان حسـێب بکە، و مـە ب هەڤالینیا وان شـایی بکـە]. ﴿١٩٤﴾ خودێوۆ، چ پەیمانـا تـە ل سـەر زمانێ پێغەمبـەران دایی بدە مە [کو بەحەشـتە و بـۆ یێ ژ گوهدارییـا فەرمانا تـە دەرنەکەڤیت]، و [خودێـوۆ] مـە ڕسـوا و شـەرمزار نەکـە ڕۆژا قیامەتـێ، ب ڕاسـتی تو ژ سـۆزا خـۆ لێڤەنابی.

فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن
ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ
وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ
لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي
مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ
حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ١٩٥ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي
ٱلۡبِلَٰدِ ١٩٦ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ١٩٧
لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي
مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلٗا مِّنۡ عِندِ
ٱللَّهِۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ١٩٨ وَإِنَّ مِنۡ أَهۡلِ
ٱلۡكِتَٰبِ لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَمَآ أُنزِلَ
إِلَيۡهِمۡ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشۡتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا
قَلِيلًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ
سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ١٩٩ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ
وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٢٠٠





﴿١٩٥﴾ ڤێجا خودێ دوعایا وان وەرگرت [ب گۆتنا
خۆ]: ئەز كار و كریارێت چو كریاركەران ژ هەوە بەرزە
ناكەم چ مێر چ ژن، هەر هندەك ژ هەوە ژ هندەكانن
[ئانكو ژێدەرێ هەوە ژن و مێران هەر ئێكە و فەرق و
جودایی د ناڤبەرا هەوەدا نینە]. ڤێجا ئەوێت مشەخت
بووین و ژ وەلاتێ خۆ هاتینە دەرئێخستن، و د رێیا
مندا هاتینە ئێشاندن و شەر [شەرێ دژمنێت خودێ]
كرین و شەرێ وان [ژ ئالییێ نەیارێت خودێڤە] هاتییە
كرن، ب راستی ئەز دێ گونەهێت وان راكەم و ژێبەم،
و ئەوان دێ كەمە د وان بەحەشتاندا ئەوێت رویبار د
بندا دهەركن (دچن). [ئەڤ خەلاتێ هەنێ] كەرەمەك
و خەلاتەكە ژ خودێ [ددەتە وان]، و نێ خودێ
باشترین خەلات و جزا ل دەڤ هەیە. ﴿١٩٦﴾ گەریان
و هاتن و چۆنا ئەوێت گاور بووین د باژێراندا، بلا
تە نەخاپینیت. ﴿١٩٧﴾ خۆشی و پەرگالەكا كێمە [یا
دنیایێ بەرانبەری یا ئاخرەتێ]، پاشی دویماهی و جهێ
وان هەر دۆژەهە و ئەو چ پیسە جهە. ﴿١٩٨﴾ بەلێ
ئەوێت پارێزكارییا خودایێ خۆ كرین، بەحەشتێت
رویبار د بندا دهەركن بۆ وان هەنە، و هەروهەر دێ تێدا بن، ئێورگەهەكە ژ نك خودێ، و یێ ل نك خودێ
هەی بۆ قەنجیكاران چێترە [ژ وێ خۆشی و پەرگالا ب رێكا گەریانا دنیایێ دئێت]. ﴿١٩٩﴾ ب راستی هندەك
ژ خودانێت كتێبان هەنە كو باوەرییێ ب خودێ دئینن و ب ئەوا بۆ هەوە هاتی [ژ نك خودێ كو قورئانە]،
و ب وێ یا بۆ وان هاتی، و ژ خودێ دترسن [ل بەر فەرمانا وی د راوەستاینە] و نیشانێت خودێ ب بهایەكێ
كێم نافرۆشن [ئانكو سالۆخێت پێغەمبەران د كتێبێت خۆدا ڤارێ ناكەن بەرانبەری بهایەكێ كێم]. ئەڤان
خەلاتێ خۆ ل نك خودێ هەیە و خودێ د حسابێدا یێ سڤكە. ﴿٢٠٠﴾ گەلی ئەوێت هەوە باوەری ئینایی بێنا
خۆ [ل سەرگوهداریێ] فرەهـ بكەن و [ل سەر جیهادا گاوران] بێنفرەبن و خۆ رابگرن، و دل و دەروونێ خۆ
ب خودێ گرێ بدەن، و پارێزكارییا خودێ بكەن، هیڤییە ب ڤێ چەندێ هوین سەرفەرازبن.

## سۆرەتا نیساء

**ل مەدینەیێ هاتیە خوارێ (١٧٦) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ خەلكینۆ پارێزكاریا خودایێ خۆ بكەن
[باوەرییێ پێ بینن و بپەرێسن] ئەوێ هوین ژ ئێك
گیانی ب تنێ ئافراندین [و ئەوی خودایی ژ وی گیانی]
هەڤسەرا وی ژێ چێكر [ئافراند] و ژ ڤان هەردوكان
گەلەك ژن و مێر دان و بەلاڤكرن، و هوین پارێزكاریا
خودێ بكەن، ئەوێ هوین ب ناڤێ وی تشتان ژ
ئێكدو دخوازن، و هشیاری مرۆڤانییێ بن [نەقەتینن]
ب ڕاستی خودێ ل سەر هەوە زێرەڤانە. ﴿٢﴾ و مالێ
سێوییان بدەنێ، مالێ خۆ یێ بێخێر [و حەلال] ب یێ
وان یێ باش [و حەرام بۆ هەوە] نەگوهۆڕن، و مالێ
وان د ناڤ مالێ خۆدا نەخۆن [ئانكو مالێ وان تێكەلی
یێ خۆ نەكەن، ب ئنیەتا خوارنا مالێ وان]. ب ڕاستی
[ئەڤ كارە] گونەهەكا مەزنە. ﴿٣﴾ و ئەگەر هوین
ترسیان د ڕاستا كچێت سێوییدا [ئەوێت هوین خودانییێ ژێ دكەن] [ئەگەر مار بكەن] دادوەرییێ نەكەن
[و مافێت وان ب دورستی نەدەنێ، وان بهێلن]، ڤێجا ژنێت دیتر یێت هەوە پێ خۆش، دویان، سێیان، چاران
مار بكەن، بەلێ ئەگەر هوین بترسن د ناڤبەرا واندا وەكهەڤییێ [عەدالەتێ] نەكەن، ژنەكێ ب تنێ بینن
[و نابیت پتر بینن] یان ژێ جاریێ یێت خۆ مار بكەن، ئەڤە [هێلانا هەوە بۆ سێوییان، دا خورتییێ لێ نەكەن
و مافێ وان نەخۆن و ئێك ژن ب تنێ، ئەگەر هوین بترسن دادگەرییێ د ناڤبەرا واندا نەكەن] ڕێكا ژ هەمییان
نێزیكترە كو هوین خۆ ژ ستەمكرنێ بپارێزن و بدەنە پاش. ﴿٤﴾ و مارا ژنان ب خۆشی بدەنێ، و هەكە وان
[ژنان] تشتەك ژ مارا خۆ ب خۆشی [و ب دلێ خۆ] بۆ هەوە هێلا [و گەردنا هەوە ئازا كر]، ئێدی بخۆن ل
هەوە حەلال بیت و نۆشی جان بیت. ﴿٥﴾ و هوین مالێ ساویلكەیان [ژ بچویك و دین و دەست دریاییان]
نەدەنە ڤێ، ئەو [مالێ] خودێ بۆ هەوە كرییە ئەگەرێ بەردەوامییا ژیانێ [و ژیان ل سەر ڕادوەستیت] بێ
خودان بكەن و ب جلك بێخن، و ئاخڤتنا خێرێ بۆ وان بێژن [ئانكو ئەگەر هوین ب ئاقل كەتن دێ مالێ
هەوە دەینە هەوە]. ﴿٦﴾ و سێوییان بجەرببینن هەتا بالق دبن [و دێینە ژنان یان شوییان]، و ئەگەر هەوە دیتن
بالق بوون و ب ئاقل كەتن، مالێ وان بدەنە ڤێ، و لەزێ لێ نەكەن بخۆن ژ ترسا مەزنبوونا وان [ترسا هندێ
كو وی مالی ژ هەوە بستینن]. و هەچییێ دەولەمەند بیت بلا [چو مالی بەرانبەری خودانییا خۆ ژ سێوییان
ڕانەكەت] و یێ دل پاقژ بیت. و هەچییێ خیزان (فەقیر) بیت بلا تەمەتی زەحمەتا خۆ و ل دویڤ هەوجەییا
خۆ بخۆت، و ئەگەر هەوە مالێ وان دا وان، شاهدان ل سەر بگرن [كا هەوە مالێ سێوییان هەمی داییێ
یان ژێ نە]، و خودێ بۆ هەوە بەسە زێرەڤان و حسابدار.



سُورَةُ النِّسَاءِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نصف الحزب ٨

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا
زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ
وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ وَءَاتُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰٓ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ وَلَا تَتَبَدَّلُواْ
ٱلۡخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِۖ وَلَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَهُمۡ إِلَىٰٓ أَمۡوَٰلِكُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبٗا كَبِيرٗا ٢
وَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تُقۡسِطُواْ فِي ٱلۡيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ
مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۚ
ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ ٣ وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ فَإِن طِبۡنَ
لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ نَفۡسٗا فَكُلُوهُ هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا ٤ وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ
أَمۡوَٰلَكُمُ ٱلَّتِي جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ قِيَٰمٗا وَٱرۡزُقُوهُمۡ فِيهَا وَٱكۡسُوهُمۡ وَقُولُواْ لَهُمۡ
قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ٥ وَٱبۡتَلُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنۡ ءَانَسۡتُم مِّنۡهُمۡ
رُشۡدٗا فَٱدۡفَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ وَلَا تَأۡكُلُوهَآ إِسۡرَافٗا وَبِدَارًا أَن يَكۡبَرُواْۚ
وَمَن كَانَ غَنِيّٗا فَلۡيَسۡتَعۡفِفۡۖ وَمَن كَانَ فَقِيرٗا فَلۡيَأۡكُلۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ
فَإِذَا دَفَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ فَأَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبٗا ٦

لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ
مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ ۚ نَصِيبًا
مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُو۟لُوا۟ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ
وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٨﴾
وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا۟ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَٰفًا
خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾ إِنَّ
ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى
بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ
أَوْلَٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءً
فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا
ٱلنِّصْفُ ۚ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن
كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ ۚ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ ۚ فَإِن
كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى بِهَآ
أَوْ دَيْنٍ ۗ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ
نَفْعًا ۚ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾



﴿٧﴾ زەلامان د وی (مالێ) دەیباب و کەس و کاران ب پاش خۆڤە هێلایی، بار و پشکەك هەیە، و ژنان ژی ژ وی (مالێ) دەیبابان و کەس و کاران ب پاش خۆڤە هێلایی، بار و پشك هەیە، چ کێم چ زێدە، پشکەکە [ژ بەرێ خودێڤە] هاتییە دانان. ﴿٨﴾ و ئەگەر دەمێ لێکڤەکرنێ، کەس و کار و سێوی و بەلنگاز ئامادەبوون، تشتەکی ژ وی میراتی بدەنە وان، و ئاخڤتنەکا بێ ئەزیەت بێژنە وان. ﴿٩﴾ و ئەوێت ژ هندێ بترسن، ئەگەر ب پاش خۆڤە دویندەهەکا بێ چارە بهێلن، ستەم لێ بێتەکرن [دڤێت هەر ب وی چاڤی بەرێ خۆ بدەنە سێوییێت ئەو خودانییێ ژێ دکەن، و پا ئەگەر ئەڤرۆ ئەو یێ مریبایە، کا وی دڤیا چاوا سەرەگوهییا زارۆکێت وی هاتبایەکرن، ئەها دڤێت ئەو ژی یێ وەسا بیت د گەل سێوییێت ئەو سەرەگوهییا وان دکەت]، ڤێجا بلا ژ خودێ بترسن و ئاخڤتنا راست د گەل وان بکەن [ئانکو چاوا د گەل زارۆکێت خۆ دئاخڤن، و دبێژنێ: کورێ من، کچا من، هەر ڤێ ئاخڤتنێ د گەل سێوییان ژی بکەن].

﴿١٠﴾ ئەوێت مالێ سێوییان ژ بێ بەختی و ب نەهەقی دخۆن، ب راستی تنێ ئەو یێ ئاگری تژی زکێ خۆ دکەن و دخۆن، و زوی دێ چنە د ئاگرێ دۆژەهێدا. ﴿١١﴾ د دەرهەقێ زارۆکێت هەوەدا خودێ [ب ڤی رەنگی] فەرمانا هەوە دکەت، کو بارا کوری تەمەتی بارا دو کچانە، و ئەگەر زارۆکێت هەوە کچ بن و ژ دویان پتر بن، دوسێکا میراتی بۆ وانە، و ئەگەر [میراتخۆر] کچەك ب تنێ بیت، نیڤ [یا میراتی] بۆ وێیە، و دەیبابێت وێ [یێ مری] هەر ئێکی شەشێك دگەهیتێ، ئەگەر [ئەوێ مری] زارۆك هەبیت [چ کور بن، چ کچ] و ئەگەر چو زارۆك [چ کور، چ کچ] نەبن و دەیبابێت وی بوونە میراتخۆرێت وی، سێك بۆ دەیکا وییە، و ئەگەر [ئەوێ مری] برا هەبن [خویشك و برا، دو یان پتر]، شەشێك بۆ دەیکا وییە، [ئەڤ پشك و بارە دێ ئێنە لێکڤەکرن] پشتی جهئینانا وەسیەتا مری کری یان ژی [دەرئێخستنا] قەران [دەینان]. بابێت هەوە و زارۆکێت هەوە، هوین نوزانن کی ژ وان پتر د خێرا هەوەدایە [ژ بەر هندێ خودێ هەر ئێکی پشك و بارێت وی دیارکرن]، ئەڤ ئەرکە ژ بەرێ خودێڤە ل سەر هەوە هاتە دانان، ب راستی خودێ یێ زانا و کار بنەجهە.

ثلاثة أرباع الحزب ٨

۞ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن
لَّهُنَّ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا
تَرَكْنَ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۚ
وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ ۚ
فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم ۚ
مِّنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۗ وَإِن كَانَ
رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ
وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ
فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ
بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ ۚ وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ
عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ
وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا
ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾
وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ
يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾



﴿١٢﴾ و نیڤا میراتێ ژنێت [هەڤسەرێت] هەوە هێلایی
بۆ هەوەیە [پشتی مرنێ] ئەگەر وان چو زارۆك
[کوڕ یان کچ] نەبن [نە ژ هەوە، و نە ژ چو زەلامێت دی]
و ئەگەر وان زارۆکەك هەبیت، چارێکەك ژ میراتێ وان
هێلایی بۆ هەوەیە [هەلبەت] پشتی جهێینانا وەسیەتا
کری و [دەرئێخستنا] قەران [دەینان] و ئەگەر هەوە
چو زارۆك نەبن [کوڕ یان کچ، ژ وێ یان ژ ئێکا
دی]، چارێکا میراتێ هەوە بۆ هەڤسەرێت هەوەیە،
و ئەگەر هەوە زارۆکەك هەبیت هەشتێکا میراتێ
هەوە بۆ وانە، پشتی جهێینانا وەسیەتا هەوە کری و
دەرئێخستنا قەران، و ئەگەر زەلامەك یان ژنەك بێ
عەیال و بێ باب [مەخسەد یا بێ دویندەهـ و باب و
باپیر بیت] مر، و برایەك یان خویشکەکا [ژ دەیکێ]
هەبیت شەشێك بۆ هەر ئێکییە و ئەگەر ژ ئێکی پتر بن
هەمی د سێکێدا د هەڤپشکن، پشتی جهێینانا وەسیەتا
بێ زیان و دەرئێخستنا قەران، ئەڤە فەرمانە ژ خودێ،
و خودێ زانا و حەلیمە [ئانکو لەزێ ل جزادانێ
ناکەت]. ﴿١٣﴾ ئەڤە فەرمان و تخویبێت خودێنە، و هەر
ئێکێ گوهداریا خودێ و پێغەمبەرێ وی بکەت، دێ ئێخیتە د بەحەشتاندا ئەوێت ڕوبار د بەرڕا و د ناڤڕا
دهەڕکن، و هەروهەر دێ تێدا بن، و ئەڤەیە سەرکەڤتنا مەزن. ﴿١٤﴾ و یێ گوهداریا خودێ و پێغەمبەرێ وی
نەکەت و بدەتە سەر تخویبێت وی [فەرمانێت وی ب جهـ نەئینیت] دێ ئێخیتە د ناڤ ئاگریدا کو هەروهەر
تێدا بیت، و ئیزایەکا ب ڕسوا و ڕەزالەت بۆ وییە.

وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ
أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ
حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ١٥
وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا
فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ١٦
إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ
ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ
وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ١٧ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ
يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ
قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ
أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ١٨ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ
لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ
مُّبَيِّنَةٖۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ
أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ١٩



﴿١٥﴾ و ئەوێت زنایێ دکەن ژ ژنکێت هەوە، چار شاهدان ژ خۆ ل سەر بگرن، ڤێجا ئەگەر شادەیی ل سەر دان، د مالێت وانڤە ئاسێ بکەن هەتا دمرن، یان ژی هەتا خودێ رێکەکا قورتالبوونێ بۆ ڤەدکەت و ددانیت [هەلبەت ئەڤ فەرمانە یا دەستپێکا ئیسلامێ بوو، پاشی هاتە راکرن]. ﴿١٦﴾ و ئەوێت دکەڤنە د زنایێدا ژ هەوە [چ ژن چ مێر] بئێشینن، و ئەگەر تۆبەکرن و خۆ باشکرن، ژێ بگەرن، ب راستی خودێ یێ تۆبەوەرگر و دلۆڤانە. ﴿١٧﴾ ب راستی تۆبەیا وان ب تنێ دئێتە وەرگرتن و قەبویل کرن ئەوێت ژ نەزانین گونەهێ دکەن، پاشی ژ نێزیك و زوی [ژ وێ کرنێ پەشێمان دبن] ل خۆ دزڤرن و تۆبە دکەن، ڤێجا خودێ تۆبەیا ڤان قەبویل دکەت [و تۆبەیێ ددەتە سەر] و خودێ زانا و کاربنەجهە. ﴿١٨﴾ و تۆبە بۆ وان نینە، ئەوێت کار و کریارێت خراب و گونەهان دکەن [دمیننە د گونەهێدا، و ل خۆ نازڤرن] هەتا ئێك ژ وان دکەڤیتە بەر مرنێ [ژ نوی] بێژیت: ئەها ژ نوی من تۆبەیە [و ئەز پەشێمانم]، و [تۆبە] بۆ وان ژی نینە یێت دمرن، و ئەو گاور، ئیزایەکا ب دەرد و دژوار مە بۆ ڤان بەرهەڤکریە. ﴿١٩﴾ گەلی ئەوێت هەوە باوەری ئینایین نەدورستە هوین ب کۆتەکی ببنە میراتخۆرێت ژنان [ئانکو وەکی هەر میراتەکی بگەهیننە خۆ و دەستێ خۆ داننە سەر]، و بۆ هەوە نەدورستە هوین رێکا وان بگرن و نەهێلن شوی بکەن، دا هندەکێ ژ وی مالێ هەوە دایە وان [ژ مەهرا وان] ژێ وەرگرن، ژ بلی وێ، ئەگەر خەلەتیەکا ئاشکەرا بکەت، و ب باشی و قەنجی د گەلدا بن و سەرەدەریێ د گەل بکەن. و ئەگەر هەوە نەڤیان [بێنا خۆ لێ فرەهکەن و بەرنەدەن] چونکی دبیت هوین ژ تشتەکی بێزار بن و هەوە نەڤێت، و خودێ خێرەکا مەزن ئێخستبیتە تێدا.

وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ
إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ
بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ
بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾
وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ
إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ
سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ
وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ
ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ
وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ
وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ
ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا
جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ
أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا
مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾



﴿٢٠﴾ و ئەگەر هەوە ڤیا ژنەكێ شوینا ژنەكا دی [پشتی
بەردانێ] بینن، و ئێك ژ وان هەوە مالەكێ مەزن
[ب ناڤێ مەهرێ] دابیتێ، چو ژ وی [مالی] ژێ نەستینن
[هوین وی مالی] چاوا دێ ژ بێ بەختی و ب گونەهەكا
مەزن ژێ ستینن. ﴿٢١﴾ ئەرێ چاوا هوین دێ وی مالی
ژێ ستینن و هوین چۆینە دەڤ ئێكدو [و هوین ب تنێ
ماینە د گەلێك] و [وەختێ مەهركرنێ] وان پەیمانا
موكوم ژ هەوە ستاندییە. ﴿٢٢﴾ و هوین وان ژنان
مار نەكەن ئەوێت بابێت هەوە ماركرین، ژ بلی وێ
ئەوا هەوە بەری ڤێ فەرمانێ ئینابیت، ب ڕاستی ئەو
كارەكێ زێدە كرێت بوو، و پیسەكار و پیسەڕێك بوو.
﴿٢٣﴾ ل سەر هەوە هاتە حەرامكرن و نەدورستكرن
[ماركرنا] دەیكێت هەوە، و كچێت هەوە، و
خویشكێت هەوە، و مەتێت هەوە، و خالەتێت هەوە، و
برازایێت هەوە، و خوارزایێت هەوە، و دەیكێت هەوە
یێت شیری [دایینێت هەوە]، و خویشكێت هەوە
یێت شیری، و خەسوییێت هەوە، و نەڤسییێت هەوە
یێت د مالا هەوەدا مەزن بووین، ژ وان ژنێت نڤین د
ناڤبەرا هەوە و واندا چێبوویی، وئەگەر نڤین نەبیت دناڤبەرا هەوە و واندا چو گونەهـ بۆ هەوە تێدا نینە هوین
وان نەڤسیان ماربكەن. و بویكێت هەوە یێت كوڕێت هەوە یێت دورست، و [دیسا حەرامە] هوین د ناڤبەرا
دو خویشكان د ماركرنێدا كۆم بكەن، ئەو نەبیت ئەوا هەوە بەری ڤێ فەرمانێ كربیت، ب ڕاستی خودێ
گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە.

* وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۖ
كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ أَن تَبۡتَغُواْ
بِأَمۡوَٰلِكُم مُّحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَۚ فَمَا ٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهِۦ
مِنۡهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا
تَرَٰضَيۡتُم بِهِۦ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡفَرِيضَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا
حَكِيمٗا ٢٤ وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ
ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن
فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ بَعۡضُكُم
مِّنۢ بَعۡضٖۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ
بِٱلۡمَعۡرُوفِ مُحۡصَنَٰتٍ غَيۡرَ مُسَٰفِحَٰتٖ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ
أَخۡدَانٖۚ فَإِذَآ أُحۡصِنَّ فَإِنۡ أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٖ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ
مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ ٱلۡعَنَتَ
مِنكُمۡۚ وَأَن تَصۡبِرُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٢٥
يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمۡ وَيَهۡدِيَكُمۡ سُنَنَ ٱلَّذِينَ
مِن قَبۡلِكُمۡ وَيَتُوبَ عَلَيۡكُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٢٦



﴿٢٤﴾ و [مارکرنا] ژنێت شویکری و ب مێر [بۆ هەوە حەرامە] ژ بلی وان یێت [ب خەزایێ بوویینە] جێرییێت هەوە [و ئەگەر جێری یا شویکری بیت بۆ خودانی (سەرکارێ وێ) دورست نینە هەتا زەلامێ وێ دمریت یان دئێتە بەردان] ئەڤە فەرمانا خودێیە ل سەر هەوە هاتە دانان و نڤێسین [بۆ کەسێ نابیت بدەتە سەر] و ژ بلی ڤان یێت بۆرین، هەکە هوین مارا وان بدەنێ و دەهمەن پاقژ بن و زناکەر نەبن، بۆ هەوە دورست و حەلالن، ڤێجا هەچییا هەوە خۆشی ب نڤینا وان دیت [ئانکو مارکر] مارا وان [ئەوا هەوە د ناڤ خۆدا دیارکری] ب ئەرك بدەنێ، و گونەهـ ل سەر هەوە نینە پشتی هەوە مەهر دیارکری د گەلێك پێك بێن [ئانکو ژ وێ مارا دیارکری ب قایلبوونا هەوە هەردوکان، کێمترێ بدەنە وان، یان ژی ژ وێ مارێ پتر بدەنە وان]، ب ڕاستی خودێ یێ زانا و کاربنەجهە. ﴿٢٥﴾ و هەچیێ ژ هەوە نەشیا [ب مالێ خۆ] ژنەکا ئازاد و خودان باوەر و دەهمەن پاقژ مار بکەت [و بۆ خۆ بینیت] ڤێجا بلا جێرییێت خۆ ژ کچێت موسلمان مار بکەت [ئەگەر شیان هەبن یا ئازاد مار بکەن، نەدورستە یا جێری مار بکەن، و دیسا نەدورستە جێرییا نەموسلمان مار بکەن]، و خودێ ب باوەرییا هەوە چێتر دزانیت [ئانکو دبیت باوەرییا هندە جێرییان ب هێز و موکومتر بیت ژ یا ئازادکری] هوین ژ ئێکن [ئانکو هوین هەردو مرۆڤن چ هوین بەندە بن چ هوین ئازادکری بن هوین د مرۆڤاتییێدا ئێکن]. ئێدی ب دەستویرا سەرکارێت وان مار بکەن، و مەهرا وان ب قەنجی [ب ئاوایەکێ دورست و شەرعی و گونجایی د گەل سەروبەری] بدەنە وان [ئەڤ جێرییە بۆ هەوە دورستە مار بکەن ب وی شەرتی] د دەهمەن پاقژ بن و زناکەرێت ئاشکەرا نەبن، و خودانێت یارێت نهینی نەبن، ڤێجا وەختێ شویکرن و کەڤتنە د کرێتییێدا [ئانکو د زنایێدا] نیڤا جزایێ ژنێت ئازاد ل سەر وانە، ئەڤ فەرمانە [مارکرنا جێرییان] بۆ وی دورستە، یێ ژ خۆ بترسیت [ئەگەر ژنێ نەئینیت دێ کەڤیتە د گونەهێدا [ئانکو د زنایێدا] و ئەگەر خۆ ڕابگرن [و جێرییێ مار نەکەن] بۆ هەوە باشترە، و خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٢٦﴾ خودێ [ب ڤان فەرمانان] دڤێت بۆ هەوە دیارکەت [کا چ ل سەر هەوە حەلالە و چ حەرامە]، و بەرێ هەوە بدەتە ڕێ و ڕەوشتێت یێت بەری هەوە [ژ پێغەمبەر و چاکان]، و تۆبەیێ بدەتە سەر هەوە، و خودێ زانا و کاربنەجهە.

وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ
ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا ٢٧ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ
عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا ٢٨ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ
تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ
ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ٢٩ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ عُدۡوَٰنٗا
وَظُلۡمٗا فَسَوۡفَ نُصۡلِيهِ نَارٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ
يَسِيرًا ٣٠ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ
عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا ٣١
وَلَا تَتَمَنَّوۡاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ لِّلرِّجَالِ
نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَۚ
وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ
عَلِيمٗا ٣٢ وَلِكُلّٖ جَعَلۡنَا مَوَٰلِيَ مِمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ
وَٱلۡأَقۡرَبُونَۚ وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَـَٔاتُوهُمۡ
نَصِيبَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدًا ٣٣



﴿٢٧﴾ خـودێ دڤێـت [ب ڤـان بڕیـاران] تۆبــەیێ بدانتە سـەر هەوە، و ئەوێت ب دویڤ دلخوازیــیان [مەخسـەد ژێ یــێت حـەرام] دکەڤـن، دڤێـت هویـن گەلـەك ب ڕەخـێ وانڤە بچـن [ئانكـو كار و كریارێـت وان بكەن]. ﴿٢٨﴾ و خـودێ دڤێـت ل سـەر هـەوە سـڤك بكـەت [ئانكـو كارێ هـەوە ب سـاناهی بێخیـت، ب دانـا وی بـۆ هـەوە شـەریعەتەكێ سـاناهی و گونجایـی د گـەل سروشـتێ مرۆڤـی]، ب ڕاسـتی مـرۆڤ بـێ هێـز و لاواز هاتیــیە چێكـرن [ئانكـو نەشـێت بێنـا خۆ ل سـەر دلخوازیــیان فرەهـ بكەت]. ﴿٢٩﴾ گەلی خـودان باوەران مالـێ خـۆ [ئێكـدو] د ناڤبـەرا خـۆدا ب نەهەقـی نەخۆن [وەكـی سـەلەفێ و قومـارێ و زەبتكرنـێ (احتـكار) و دزیــیێ... هتـد]، بازرگانیــیەكا هویـن ل سـەر قایـل نەبـن تـێ نەبیـت [ئانكـو ب كڕیـن و فرۆتنـان هـەردو ئالیــێت قایـل بخـۆن و ب ڕێكێـت دورسـت] و خـۆ [ژ بـێ هیڤیبوونـێ] نەكـوژن یـان ئێكـدو نەكـوژن ب ڕاسـتی خودێ د گەل هەوە یێ دلۆڤانـە. ﴿٣٠﴾ و هەچیێ [ژ هەوە ڤان نەدورستیـیێت بۆری] ژ ستەمی و زێدەگاڤی ڤـێ بكـەت، دێ وی كەینـە د ئاگـرێ دۆژەهێدا، و ئەڤـە ب خۆ ل دەڤ خـودێ ب ساناهیــیە. ﴿٣١﴾ ئەگەر هوین خـۆ ژ گونەهێـت مەزن [شركێ و كوشـتنێ و دزیــیێ و سێربەندیــیێ... هتد] بدەنە پاش، گونەهێت هەوە یــێت بچویـك دێ پەردەپـۆش كەیـن و ژێبەیـن و ڤەشـێرین، و هەوە دێ بەینـە جهەكێ دلخۆش و بـاش. ﴿٣٢﴾ و هوین دلخوازیــیا وی تشـتێ كـو خـودێ هندەك ژ هـەوە پێ ب سـەر هندەكێـت دی ئێخسـتین، نەكەن [ئانكو خۆزیــیا هنـدێ بكـەی خـودێ ژ وی بسـتینیت و بدەتـە تە ]، و زەلامان پشـك و بـار ژ كار و كریارێت كریـن هەنە، و ژنان پشـك و بـار ژ كار و كریارێـت كریـن هەنـە، و داخوازا كەرەمـا خودێ بكەن، ب ڕاسـتی خودێ ب هەمی تشـتی ئاگەهـدارە. ﴿٣٣﴾ و مـە میراتگـر بـۆ هـەر ئێكـی داناینـە ژ میراتـێ دەیبـاب و كـەس و كاران هێلایـی، و ئەوێت هـەوە پەیـمان داینـێ [كو ببنـە میراتگرێت هەوە] پشـك و بارێـت وان بدەنێ [هەلبـەت ئەڤ فەرمانە ل دەسـتپێكا ئیسـلامێ بـوو، پاشـی هاتـە ڕاكرن ب گۆتنـا خـودێ ﴿ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ ﴾ ب ڕاسـتی خودێ ل سـەر هەمی تشـتان بەرهەڤ و شـاهدە.

ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ
بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ
حَٰفِظَٰتٞ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ
نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ
وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ
إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيّٗا كَبِيرٗا ٣٤ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ شِقَاقَ بَيۡنِهِمَا
فَٱبۡعَثُواْ حَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهِۦ وَحَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن
يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا
خَبِيرٗا ٣٥ ۞ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ ربع الحزب ٩
وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ
وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ
وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ
لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ٣٦ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ
وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ
ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ٣٧



﴿٣٤﴾ زەلام سەرکار و سەرپەرشتیێت کاروبارێت ژنانە [ئانکو دڤێت ئەو ل بەر خزمەتا وان بن و ب کاروبارێت وان رابن] ژ بەر کو خودێ هندەك ب سەر هندەکان ئێخستینە، و ژ بەر کو [زەلام] مالێ خۆ [د بەر واندا] دمەزێخن، ڤێجا ژنێت چاك [کارراست] گوهدارێت خودێ و زەلامێت خۆنە [و ب ئەرکێ خۆ رادبن د راستا خودێدا، و پاشی د راستا زەلامێت خودا] و بۆ مال و نامویسا [زەلامێت خۆ] د پشت ویرا، ب هاریکاریا خودێ پارێزەرن، و ئەو ژنێت هوین ژێ دترسن کو گوهداریا هەوە نەکەن [خۆ ل سەر زەلامێ خۆ مەزن بکەن و مافێت وان نەدەنێ] شیرەتان ل وان بکەن [و ژ خودێ و ئیزایا رۆژا قیامەتێ بترسینن] [و ئەگەر پاشڤەچۆن باشە، و نابیت چو رێکێت دی بگری، و ئەگەر نە] خۆ ژ نڤینا وان بدەنە پاش [ئانکو ل سەر نڤینا وێ بی، بەلێ پشتا خۆ بدەیێ و پویتە پێ نەکەی، و هەکە ب ڤێ چەندێ ژی نەهاتە رێ] ڤێجا لێ بدەن [بەلێ لێدانەکا بێ ئێش] ڤێجا ئەگەر گوهێ خۆ دانە هەوە، هوین چو هێجەتان هلنەئێخن [کو هوین خورتی و ستەمێ لێ بکەن]، ب راستی خودێ یێ بلند و مەزنە [ئانکو پشتی گوهداریا هەوە کرین، ئەگەر ستەمێ لێ بکەن، بزانن خودێ ژ هەمیان مەزنترە و ل سەر هەوە دەستهەلاتدارە هەروەکی هوین ل سەر وان دەستهەلاتدار، و بۆ هەوە ناهێلیت]. ﴿٣٥﴾ و ئەگەر هوین ترسیان ناڤبەرا وان نەخۆش بیت و ژێك نەگرن، دادوەرەکی ژ مرۆڤێت زەلامی و دادوەرەکێ دی ژ مرۆڤێت ژنێ هەلبژێرن [و فرێکەنە دەف ئێك، دا پێکڤە بەرێ خۆ بدەنە ئارێشەیێ و چارەسەر بکەن] ڤێجا هەکە ب راستی وان [هەردو دادوەران] بڤێن وان پێك بینن و ناڤبەرا وان خۆش بکەن، خودێ دێ وان ئێخیتە بەرێك، ب راستی خودێ زانا و شارەزایە. ﴿٣٦﴾ و هوین خودێ بپەرێسن و چو هۆگر و هەڤبەران بۆ چێ نەکەن، و د گەل دەیبابان د چاك بن [دیسا] و د گەل کەس و کار و سێوی و بەلنگاز و جیرانێت دبنە مرۆڤێت هەوە، و جیرانێت چو مرۆڤانی د گەل هەوە نەیی و هەڤالێ رێکێ یان هەڤسەرا خۆ و رێڤینگ و بەندەیێت هەوە، ب راستی خودێ حەژ قەبەیێ پەسەندەر ناکەت [ئەوێ کەسێ ژ خۆ مەزنتر و بلندتر نەبینیت و ببینیت ئەو ل سەر غەیری خۆدایە]. ﴿٣٧﴾ ئەوێت [ئانکو قەبە و دفن بلند] چرویکییێ دکەن [د راستا فەرمانا خودێدا و د راستا دەیباب و کەس و کاراندا... هتد]، و فەرمانا خەلکی ژی ب چرویکییێ دکەن، و وێ کەرەما خودێ د گەل کری ڤەدشێرن، و خودێ ئیزایەکا هەتکبەر بۆ گاوران بەرهەڤکریە.

وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ
وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۗ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ
قَرِينًا ﴿٣٨﴾ وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَنفَقُوا۟
مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ
مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ
أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ
وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ
ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ
سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى
سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا۟ ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ
أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً
فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ
إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٤٣﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ
ٱلْكِتَٰبِ يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿٤٤﴾





﴿٣٨﴾ و ئەوێت مالێ خۆ ب ڕویمەتیا مرۆڤان دمەزێخن، و باوەرییێ نە ب خودێ دئینن و نە ب ڕۆژا قیامەتێ، و هەر کەسێ شەیتان هەڤالێ وی بیت [ب یا وی بکەت و ل دویڤ وی بچیت] پیسە هەڤاله [چونکی دێ بەرێ وی دەتە خرابییێ وەکی قەبەیی و خۆمەزنکرنێ و چڕویکی و ڕویمەتییێ... هتد].
﴿٣٩﴾ ما چ زیان دا گەهیتە وان ئەگەر باوەری ب خودێ و ڕۆژا قیامەتێ ئینابانە، و ژ تشتێ خودێ داییە وان سەدەقە ژێ دابانە، و خودێ ب وان ئاگەهدارە [کا هەر ئێکی ئنیەتا وی چیە]. ﴿٤٠﴾ بێ گۆمان خودێ تەمەت دندکەکێ [ئەوا د ناڤ تیرۆژکا ڕۆژێدا] ستەمێ ل کەسێ ناکەت، ئەگەر [ئەو دندك] باشی بیت [خودێ] چەندجارکی لێ دکەت، و دێ خەلاتەکێ مەزن دەتێ. ﴿٤١﴾ ڤێجا ئەو دێ د چ کراسدا بن دەمێ ئەم بۆ هەر ملەتەکی شاهدەکی دئینین [پێغەمبەرێت وان شادەیییێ ل سەر وان ددەن] و ئەم تە ژی ل سەر ڤان دکەینە شاهد. ﴿٤٢﴾ وێ ڕۆژێ [ڕۆژا قیامەتێ] ئەوێت گاوربووین و گوهداریا پێغەمبەری نەکرین، حەز دکەن ئەرد بێتە کەلاشتن، و تێدا بچن و د گەل ئاخێ ببنە ئێك، [وێ ڕۆژێ] نەشێن چو ئاخڤتنان ژ خودێ ڤەشێرن. ﴿٤٣﴾ گەلی خودان باوەران، نێزیکی نڤێژێ نەبن دەمێ هوین سەرخۆش هەتا هوین بزانن کا هوین چ دبێژن، دیسا دەمێ لەش د بێ نڤێژییێدا [جەنابەتێدا] ژ بلی کو هوین ڕێبار بن هەتا خۆ دشۆن، و ئەگەر هوین نەخۆش بن [نەشێن ئاڤێ ب کاربینن] یان ژی ڕێڤینگ و ڕێبار بن [د سەفەرێدا بن] یان ئێك ژ هەوە ژ دەستاڤێ هات یان چۆبیتە نڤینا ژنێ، و ئاڤ [بۆ دەستنڤێژ و لەش پاقژکرنێ] ب دەست هەوە نەکەڤیت، تەیەمومێ ب ئاخەکا پاقژ بکەن، سەروچاڤ و دەستان ڤەمالن، ب ڕاستی خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٤٤﴾ ما تە نەددیت ئەوێت [خودێ] بارەك ژ زانینا کتێبێ [کو تەوراتە] داییێ، گومڕاییێ و بەرزەییێ پێ دکڕن، و وان دڤێت هوین ژی د سەردا بچن.

وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِأَعۡدَآئِكُمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيّٗا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرٗا ٤٥
مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ
سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا وَٱسۡمَعۡ غَيۡرَ مُسۡمَعٖ وَرَٰعِنَا لَيَّۢا بِأَلۡسِنَتِهِمۡ
وَطَعۡنٗا فِي ٱلدِّينِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا وَٱسۡمَعۡ وَٱنظُرۡنَا
لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَقۡوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُونَ
إِلَّا قَلِيلٗا ٤٦ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلۡنَا
مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبۡلِ أَن نَّطۡمِسَ وُجُوهٗا فَنَرُدَّهَا
عَلَىٰٓ أَدۡبَارِهَآ أَوۡ نَلۡعَنَهُمۡ كَمَا لَعَنَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلسَّبۡتِۚ وَكَانَ أَمۡرُ
ٱللَّهِ مَفۡعُولًا ٤٧ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ
ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا ٤٨
أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ
وَلَا يُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ٤٩ ٱنظُرۡ كَيۡفَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ
وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثۡمٗا مُّبِينًا ٥٠ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا
مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ
لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ٥١



﴿٤٥﴾ و خودێ چێتر دژمنێت هەوە دنیاسیت [ژێ ب ئاکەهـ بن]، و بەسی هەوەیە خودێ [بۆ هەوە] سەمیان و بەسی هەوەیە خودێ [بۆ هەوە] پشتەڤان. ﴿٤٦﴾ جوهی ئاخڤتنێ ڤارێ دکەن [ئانکو دگوهۆڕن] و دبێژن: ب ئەزمان خواری یان ب تان هاڤێتن ل دینی مە ئاخڤتنا تە بهیست، بەلێ ئەم پێ ناکەین، و گولێ ببە و تە گولێ نەبیت [مەخسەدا وان نفرینە ئانکو بمری یان کەر ببی] و [دبێژن ] (راعنا) [مەخسەدا وان ژێ رامانەکا نەیا جوانە] و ئەگەر وان گۆتبایە، مە [گۆتنا تە] بهیست و ئەم ب گۆتنا تە دکەین، و (انظرنا) [شوینا (راعنا) ئانکو خۆ ل مە بگرە و مۆلەتێ بدە مە] بۆ وان باشتر و دورستتر بوو، بەلێ ژ بەر گاوریا وان خودێ ئەو دویری دلۆڤانیا خۆ ئێخستن، ڤێجا ژ بلی باوەرەکا کێم باوەریێ نائینن [ئەو ژی باوەریەکا لاوازە ب هندەك پێغەمبەر و کتێبان]. ﴿٤٧﴾ هەی گەلی ئەوێت کتێب بۆ هاتین [ئانکو جوهی و فەلە] باوەریێ ب وێ کتێبا مە ئینایییە خوارێ [کو قورئانە] بینن کو ب ڕاستی ژ وان کتێبانە یێت بەر دەستی هەوە [کو ئنجیل و تەوراتن] بەری ئەم هندە سەروچاڤان بەرەڤاژی بکەین و لێك بزڤرینین یان ژی دویری دلۆڤانیا خودێ بێخین، هەروەکی ئەوێت داینە سەر بڕیارا خودێ ڕۆژا شەنبیێ مە دویری دلۆڤانیا خۆ ئێخستین و لەعنەت لێ کرین، و ب ڕاستی فەرمانا خودێ هەر دێ ئێتە جە [ئانکو لێڤەبوون بۆ نینە]. ﴿٤٨﴾ ب ڕاستی خودێ گونەها چێکرنا هەڤال و هۆگران بۆ خودێ ژێ نابەت و گونەهێت دیتر ئەڤێت مایین [ژ بلی شرکێ] ژێ دبەت بۆ یێ بڤێت، و ب ڕاستی هەر کەسێ هەڤالەکی بۆ خودێ چێکەت، ب سویند وی گونەهەکا مەزن کر. ﴿٤٩﴾ ما تو وان نابینی و نانیاسی ئەوێت خۆ پاك و پاقژ [ژ گونەهان] دبینن و ددانن [کو جوهی و فەلەنە دەمێ دبێژن: ئەم مرۆڤێت خودێینە و ئەم یێت بێ گونەهین]، خودێیە یێ بڤێت ژ گونەهان پاك و پاقژ دکەت، و تەمەت دەزییێ بەرکێ قەسپێ ژی ستەم لێ نائێتە کرن. ﴿٥٠﴾ بەرێ خۆ بدێ کا چاوا ئەو درەوان ب ناڤێ خودێ دکەن؟ و بەسی وانە ئەڤ گونەها مەزن و ئاشکەرا. ﴿٥١﴾ ئەرێ تو دبینی ئەوێت بارەك ژ زانینان بۆ هاتی، باوەریێ ب بوت و شەیتانی دئینن، و دبێژنە ئەوێت گاوربوویین [مەخسەد ژێ قورەیشینە] ئەڤە ژ وان یێت باوەری ئینایین [کو موسلمانن] باشتر و ڕاسترن.

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَمَن يَلۡعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾
أَمۡ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُلۡكِ فَإِذٗا لَّا يُؤۡتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا ﴿٥٣﴾ أَمۡ
يَحۡسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۖ فَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ
ءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَءَاتَيۡنَٰهُم مُّلۡكًا عَظِيمٗا ﴿٥٤﴾
فَمِنۡهُم مَّنۡ ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن صَدَّ عَنۡهُۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا ﴿٥٥﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوۡفَ نُصۡلِيهِمۡ نَارٗا كُلَّمَا نَضِجَتۡ
جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ
عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ
جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّهُمۡ فِيهَآ
أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَنُدۡخِلُهُمۡ ظِلّٗا ظَلِيلًا ﴿٥٧﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ
أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن
تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا
بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي
ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ
تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾

نصف الحزب ٩



﴿٥٢﴾ ئەڤە ئەون ئەوێت خودێ لەعنەت لێ کرین
[دویری دلۆڤانیا خۆ ئێخستین]، و هەر ئێکێ خودێ
دویری دلۆڤانیا خۆ بێخیت، ب ڕاستی تو چو
هاریکاران بۆ نابینی [دەستێ وی بگریت و ڕاستەڕێ
بکەت]. ﴿٥٣﴾ یان ژی وان بارەك د خودایینیێدا
هەیە [ئانکو وان چو پشك و بار د خودایینیێدا
نینن، و ئەگەر هەبانە ژی ژ چڕویکی و قەلسی]
تەمەت تیڤلێ بەرکێ قەسپێ ژی نەددانە خەلکی.
﴿٥٤﴾ یان حەسویدییێ ب خەلکی [ب پێغەمبەری و
موسلمانان] دبەن، ژ وێ کەرەما خودێ د گەل کری
[بۆچی حەسویدییێ ب موحەمەدی دبەن و ئەو نە
کەسێ ئێکێیە خودێ کەرەم د گەل کری و کریە
پێغەمبەر]، و ب سویند [بەری وی] مە پێغەمبەراتی و
کتێب دابوونە بنەمالا ئیبراهیمی [ئانکو مە پێغەمبەر ژ
دویندەها ئیبراهیمی ژی هنارتن ژ بەنی ئسرائیلیان]،
و مە مالداری و سەرداریەکا مەزن دابوو وان.
﴿٥٥﴾ [دگەل هندێ ژی کو پێغەمبەر هەر ژ وان بوون]
بەلێ هندەکان باوەری پێ ئینان، و هندەکان ژی پشتا
خۆ دانێ و باوەری پێ نەئینان [ڤێجا چاوا دێ باوەرییێ ب تە ئینن؟!]، ئاگر و سۆتنا دۆژەهێ بەسی وانە.
﴿٥٦﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ب نیشان و ئایەتێت مە نەئینایین، ئەم دێ وان هاڤێژینە د ناڤ ئاگریدا، هەر
گاڤەکا چەرمێ وان سۆت و هاتە براشتن، ئەم دێ چەرمێ وان ب هندەك چەرمێ دی گوهۆڕین دا تامکەنە
ئیزایێ، ب ڕاستی خودێ یێ زال و کاربنەجهە. ﴿٥٧﴾ و ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت قەنج کرین،
ئەم دێ وان کەینە د بەحەشتاندا، ئەوێت ڕویبار د بنڕا دچن، و هەروهەر تێدانە، و بۆ وان [د بەحەشتێدا]
هەڤسەرێت پاك و پاقژ هەنە و دێ وان ئێخینە بن سیبەرەکا درێژ و تێر سیبەر. ﴿٥٨﴾ ب ڕاستی خودێ فەرمانا
هەوە دکەت هوین ئەمانەتی بدەنە خودانێت وان، و هەر گاڤەکا هوین دادوەرییێ د ناڤبەرا خەلکیدا بکەن، ب
دادڤانی دادوەرییێ بکەن، ب ڕاستی ئەڤە باشترین شیرەتە خودێ ل هەوە دکەت، ب ڕاستی خودێ گوهدێر
و بینەرە. ﴿٥٩﴾ گەلی ئەوێت هەوە باوەری ئینایین، گوهدارییا خودێ بکەن، و گوهدارییا پێغەمبەری بکەن،
و کار ب دەستێت خۆ. ڤێجا ئەگەر هوین ل سەر تشتەکی ژێکڤەبوون و ب هەڤڕك چۆن، هوین ل خودێ و
پێغەمبەری بزڤڕن ئەگەر هەوە باوەری ب خودێ و ڕۆژا قیامەتێ هەبیت، ئەڤ کارێ هەوە [تشتێ هوین ل
سەر ب هەڤڕك چۆیین بزڤڕیننە خودێ و پێغەمبەری]، بۆ هەوە چێترە و دویماهیك خێرترە.

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ
وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ
وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ
ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ
ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ
صُدُودًا ﴿٦١﴾ فَكَيْفَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا
قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ
إِحْسَٰنًا وَتَوْفِيقًا ﴿٦٢﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعْلَمُ ٱللَّهُ مَا
فِى قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُل لَّهُمْ فِىٓ
أَنفُسِهِمْ قَوْلًۢا بَلِيغًا ﴿٦٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا
لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ
جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ
لَوَجَدُوا۟ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿٦٤﴾ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ
حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ
أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾





﴿٦٠﴾ ئەرێ تو [حێبەتی نامینی] نابینی ئەوێت ل نك
خۆ هزر دكەن، وان باوەری ب وێ [قورئانێ] ئەوا
بۆ تە هاتییە خوارێ و ب وان یێت بۆ یێت بەری
تە ژی هاتینە خوارێ ئینایییە، و دڤێن بۆ دادوەرییێ
بچنە دەڤ وی یێ دادییێ ب فەرمانا خودێ نەكەت،
و ئەو ب خۆ ژی فەرمانا وان یا هاتییە كرن باوەرییێ
پێ نەئینن، و ب ڕاستی شەیتانی دڤێت وان پیس
پیس سەردا ببەت [كو باش دویری ڕاستییێ ببن].
﴿٦١﴾ و گاڤا بۆ وان بێتە گۆتن: هوین ل بەر وان
بڕیاران وەرن یێت خودێ هنارتین و وەرنە دەڤ
پێغەمبەری، تو دێ دوڕوییان بینی، ڕوییێ خۆ ژ
تە وەردگێرن. ﴿٦٢﴾ ڤێجا دێ د چ كراسدا بن و دێ
چ كەن، دەمێ ئاتافەك ب سەر واندا دئێت، هەر ژ
وێ یا وان ب دەستێت خۆ ب سەرێ خۆ ئینایی
[كو بڕیارا (حوكمێ) تە هێلایینە و ب یا تاغۆتی
ڕازیبووینە]، پاشی دئێنە دەڤ تە، ب خودێ سویند
دخۆن و [دبێژن]: ژ قەنجی و چاكی و پێكئینانێ
پێڤەتر مە نەڤیایە. ﴿٦٣﴾ ئەو [دوڕوی درەوان دكەن]
خودێ دزانیت كا چ د دلێ واندایە، سزاكرنا وان بهێلە، و شیرەتان ل وان بكە [ژ دویماهیكا دوڕوییاتییێ
بترسینە] و شیرەتەكا كارلێكەر و ئاشكەرا د ناڤبەرا خۆ و واندا بۆ [وان] بێژە. ﴿٦٤﴾ و مە چو پێغەمبەر
نەهنارتینە ئەگەر ژ بەر هندێ نەبیت دا ب دەستویرا خودێ گوهدارییا وی بێتە كرن، و هەكە گاڤا وان ستەم
ل خۆ كری [تو هێلایی و ب بڕیارا تە ڕازی نەبوویین]، هاتبانە دەڤ تە و داخوازا گونەهـ ژێبرنێ ژ خودێ
كربانە، و پێغەمبەری ژی داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ وان كربایە، دا زانن خودێ گەلەكێ تۆبەوەرگر و دلۆڤانە.
﴿٦٥﴾ وەسا نینە، ب خودایێ تە سویند دخۆم ئەو نابنە خودان باوەر [باوەرییێ نائینن] هەتا هەر تشتەكێ
ئەو هەڤڕكییێ ل سەر دكەن، تە نەكەنە حەكەم ل سەر، پاشی بەرانبەر بڕیارا تە چو دلتەنگییێ د دلێ خۆدا
نەبینن، پاشی ب دورستی خۆ هلپەسێرنە تە [ئانكو ب دورستی گوهدارییا تە بكەن و فەرمان و بڕیارێت تە
ب جهـ بینن].

وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن
دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ ۖ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ
بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم
مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٦٨﴾
وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ
عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ۚ
وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ
بِاللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا خُذُوا حِذْرَكُمْ
فَانفِرُوا ثُبَاتٍ أَوِ انفِرُوا جَمِيعًا ﴿٧١﴾ وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ
فَإِنْ أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ إِذْ لَمْ أَكُن
مَّعَهُمْ شَهِيدًا ﴿٧٢﴾ وَلَئِنْ أَصَابَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ اللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن
لَّمْ تَكُن بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَّةٌ يَا لَيْتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ
فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧٣﴾ ۞ فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ
يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالْآخِرَةِ ۚ وَمَن يُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ
اللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٧٤﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٩



﴿٦٦﴾ و ب ڕاستی هەکە مە ل سەر وان نڤێسیبایە
خۆ بکوژن، یان ژ وەلاتێ خۆ دەرکەڤن ب فەرمانا
مە نەدکرن ژ بلی کێمەکێ ژ وان، و ئەگەر وان ب
شیرەتێت ل وان دهاتنەکرن کربایە، بۆ وان چێتر و
بنەجهتر بوو [مەخسەد بۆ دنیا و ئاخرەتا وان چێتر
بوو، و باوەریا وان دا چێتر و پتر بنەجە و موکوم
بیت]. ﴿٦٧﴾ و ب ڕاستی هنگی ئەم دا خەلاتەکێ
مەزن دەینە وان. ﴿٦٨﴾ و ئەم دا وان ڕاستەڕێ کەین.
﴿٦٩﴾ [ژ خۆ وەسایە] هەر کەسێ گوهداریا خودێ
و پێغەمبەری بکەت، ڤێجا ئەو هەڤالێت وانن یێت
خودێ قەنجی د گەل کرین ژ پێغەمبەر و ڕاستگۆ
و شەهید و قەنجیکاران، و ئەڤە چ خۆش هەڤالن.
﴿٧٠﴾ ئەڤ خنێکە [نیعمەتە] ژ خودێ ژ بەر وانن، و
بەس خودێ دزانیت کا کی هێژای کەرەم و خنێکا ویە.
﴿٧١﴾ گەلی خودان باوەران [هوین بەرانبەری نەیارێت
خۆ ئامادە بن] و هشیار و کارکری بن، دەست دەست
یان ژی ب هەڤڕا و پێکڤە هێرشێ ببەنە سەر نەیاران.
﴿٧٢﴾ و ب ڕاستی هندەك ژ هەوە یێت هەین خۆ
ڤەدهێلن و گیرۆ دکەن، ڤێجا [بەرێ خۆ ددەنێ] ئەگەر ئاتافەك [ژ کوشتنێ و شکەستنێ] ب سەر هەوەدا هات،
دبێژن: ب سویند خودێ قەنجی د گەل مە کر [خێرا مە ڤیا]، ئەم د گەل وان نەبووین. ﴿٧٣﴾ و ئەگەر کەرەمەك
ژ خودێ گەهشتە هەوە [ژ سەرکەڤتن و دەستکەڤتیان] دێ بێژن: هەروەکی بەری نوکە چو ڤیان و نیاسین د
ناڤبەرا هەوە و ویدا نەیی: خۆزی ئەز د گەل وان بامە، دا ئەز ژی ب سەرفەرازییەکا مەزن سەرفەراز بامە.
﴿٧٤﴾ ڤێجا بلا ئەوێت ژیانا ئاخرەتێ ب ژیانا دنیایێ کڕین، د ڕێکا خودێدا جیهادێ [شەڕی] بکەن، و هەر
کەسێ د ڕێکا خودێدا جیهادێ بکەت، ڤێجا بێتە کوشتن یان سەرفەراز سەربکەڤیت، ب ڕاستی ئەم دێ
خەلاتەکێ مەزن دەینێ.

وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ
وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ
أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِي
سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ
كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا۟
ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ
يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ
عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ
وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾ أَيْنَمَا تَكُونُوا۟
يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ۗ وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ
يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ
عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ
حَدِيثًا ﴿٧٨﴾ مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ
فَمِن نَّفْسِكَ ۚ وَأَرْسَلْنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٧٩﴾





﴿٧٥﴾ هەوە خێرە؟ بۆچی هوین د ڕێکا خودێدا شەڕی
ناکەن ژ بەر تەپەسەر و بێ دەستهەلاتان ژ زەلام و ژن و
بچویکان، ئەوێت [گازی دکەن] دبێژن: خودێوۆ تو
مە ژ ڤی گوندێ خەلك ستەمکار دەربێخە، و بۆ مە
هاریکارەکی ژ دەڤ خۆ بهنێرە، و بۆ مە پشتەڤانەکی ژ
دەڤ خۆ بهنێرە. ﴿٧٦﴾ ئەوێت باوەری ئینایین، د ڕێکا
خودێدا شەڕی دکەن، و ئەوێت گاوربوویین د ڕێکا
سەرێ گاوریێدا [ئەوێ شوینا خودێ دئێتە پەرستن]
شەڕی دکەن، ڤێجا [گەلی خودان باوەران] هوین
شەڕێ دۆست و یارێت شەیتانی بکەن، ب ڕاستی
کارێ شەیتانی [بەرانبەر یێ خودێ] یێ بێ هێز بوو.
﴿٧٧﴾ ئەرێ ما تە ئەو نەدیتن ئەوێت [ل مەکەهێ]
بۆ دهاتە گۆتن، هوین دەستێ خۆ بکێشن [و شەڕی
نەکەن] و نڤێژان بکەن و زەکاتا مالێ خۆ بدەن، ڤێجا
گاڤا [ل مەدینەیێ] شەڕ [د ڕێکا خودێدا] ل سەر
وان هاتییە نڤێسین، د وێ گاڤێدا دەستەکەك ژ وان ژ
مرۆڤان دترسیان وەکی ترسا وان ژ خودێ، بەلکی پتر
ژ مرۆڤان دترسیان، و گۆتن: خودێوۆ بۆچی تە شەڕ
ل سەر مە نڤێسی، بلا تە ئەڤ شەڕە ب پاش ئێخستبایە و دەرفەت دابایە مە [مە خۆشی ب خۆ بربایە و
ئەم ب مرن چۆباینە]، بێژە: خۆشیا دنیایێ یا کێمە و ئاخرەت بۆ یێ پارێزکارییێ بکەت چێترە، و تەمەت
دەزییێ نیڤا بەرکێ قەسپێ ستەم ل هەوە نائێتەکرن [نە خێرێت هەوە کێم دبن و نە گونەهێت هەوە دئێنە
زێدەکرن]. ﴿٧٨﴾ هوین ل کیڤە بن [ل وێرێ بن]، خۆ هوین د کەلهێت ئاسێڤە ژی بن، هەر مرن دێ گەهیتە
هەوە، و ئەگەر قەنجی و خێرەك گەهشتە وان، دبێژن: ئەڤە ژ خودێیە، و ئەگەر نەخۆشییەك ب سەرێ وان
هات، دبێژن: ئەڤ نەخۆشییە [ژ بێ وەغەرییا] تەیە، بێژە [نەوەسایە وەکی هوین دبێژن] هەمی تشت
[خۆشی و نەخۆشی و دان و چێکرن] ژ خودێیە، ڤێجا ڤان مرۆڤان خێرە چو ئاخڤتنان تێناگەهن [کو چو بێی
خودێ نابیت]. ﴿٧٩﴾ هەر خێرەکا بگەهیتە تە ژ خودێیە، و هەر نەخۆشییەکا ب سەرێ تە بێت ژ تەیە [ئانکو
ئەڤە ئەوە یا دەستێت تە کری و تە ب کار و کریارێت خۆ ب سەرێ خۆ ئینایی] و مە تو ب پێغەمبەرینی
بۆ خەلکی هنارتی [و قەدەرا خودێ ژ بەرتەنگی و بەرفرەهی و خۆشی و نەخۆشییێ نە ب دەستێ تەیە] و
شادەییا خودێ [ل سەر ڤێ چەندێ] بەسە.

مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ
عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗا ٨٠ وَيَقُولُونَ طَاعَةٞ فَإِذَا بَرَزُواْ مِنۡ عِندِكَ
بَيَّتَ طَآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ غَيۡرَ ٱلَّذِي تَقُولُۖ وَٱللَّهُ يَكۡتُبُ مَا يُبَيِّتُونَۖ
فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ٨١
أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ
لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا ٨٢ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ
أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ
مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡۗ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ
عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٣
فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ
عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأۡسٗا
وَأَشَدُّ تَنكِيلٗا ٨٤ مَّن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةً حَسَنَةٗ يَكُن لَّهُۥ
نَصِيبٞ مِّنۡهَاۖ وَمَن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةٗ سَيِّئَةٗ يَكُن لَّهُۥ كِفۡلٞ مِّنۡهَاۗ
وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقِيتٗا ٨٥ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ فَحَيُّواْ
بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ رُدُّوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَسِيبًا ٨٦





﴿٨٠﴾ هەر كەسێ گوهداریيا پێغەمبەری بكەت، ب
ڕاستی ئەوی گوهداریيا خودێ كرییە، و یێ ڕوییێ
خۆ [ژ پێغەمبەری] وەرگێڕیت [و گوهداریيا وی
نەكەت]، مە تو نەهنارتی كو ل سەر وان پارێزڤان
بی [ب كۆتەكی بەرێ وان بدەیە باشی و باوەرییێ].
﴿٨١﴾ [بەرانبەری تە] دبێژن: [فەرمانا تە ل سەر
چاڤێت مە] ئەم دێ گوهداریيا تە كەین، هەر گاڤەكا
ئەو ژ دەڤ تە چۆن، دەستەكەك ژ وان د شەڤێدا وێ
دكەن و وێ دبێژن نە ئەوا تە گۆتی، و كا چ ب شەڤ
دبێژن و دكەن خودێ دنڤێسیت، ئێدی تو دەست ژ
وان بەردە و پویتە پێ نەكە و خۆ ب خودێ پشت
گەرم بكە، و بەسی تەیە خودێ پشتەڤانێ تە بیت.
﴿٨٢﴾ ڤێجا بۆچی هزرا خۆ [باش] د قورئانێدا ناكەن،
و ئەگەر قورئان ژ دەڤ ئێكی دی هاتبایە ژ بلی خودێ،
دا گەلەك تشتێت ڤێكنەكەڤتی و نەوەكهەڤ تێدا بینن
[و وەكی ڤێ تێدا نەبینن، بلا بزانن بێ گۆمان ژ
دەڤ خودێیە و موحەمەد پێغەمبەرە]. ﴿٨٣﴾ و ئەگەر
خەبەرەك ژ سەركەڤتنێ یان شكەستنێ گەهشتە وان
[ئانكو دوڕوییان] دێ بەلاڤكەن، و ئەگەر وان ئەو خەبەر گەهاندبایە پێغەمبەری [پسیار ژێ كربانە] یان ژی
[گەهاندبایە] سەركارێت خۆ، ئەوێت ڤان خەبەران ژێك دنیاسن، و ڕاستییێ ژ نەراستییێ جودا دكەن، و
ئەگەر كەرەم و دلۆڤانیيا خودێ ل سەر هەوە نەبایە كێمەك تێ نەبن یێت دی هەمی دا ب دویڤ شەیتانی
كەڤن. ﴿٨٤﴾ ڤێجا تو د ڕێكا خودێدا شەڕی بكە، خۆ هەكە تو یێ ب تنێ ژی بی، تو دێ ژ كار و كریارێت
خۆ ب تنێ بەرپرس بی، و خودان باوەران سەرگەرم بكە [پالدە بۆ شەڕكرنێ]، بێ گۆمان خودێ خرابی
و زیانا ئەوێت بوویینە گاور دێ ژ هەوە دەتە پاش و ڤەگریت، و خودێ ب هێزترە و جزادانا وی دژوارترە.
﴿٨٥﴾ هەر كەسێ بەرەڤانییەكا خێرێ بكەت [مەهدەرا قەنجییێ بكەت] وی بارەك ژ وێ مەهدەرێ هەیە،
و هەر كەسێ بەرەڤانیيا خرابییێ بكەت، بارەك ژ گونەها وێ بەرەڤانییێ بۆ وییە، و خودێ ل سەر هەمی
تشتان دەستهەلاتدار و شاهدە [جزایی بەرانبەر هەمی تشتان ددەت]. ﴿٨٦﴾ هەر گاڤەكا سلاڤ ل هەوە
هاتەكرن، هوین چێتر بەرسڤا وێ بدەن یان ژی وەكی وێ ڤەگێڕن، ب ڕاستی خودێ ل سەر هەمی تشتان
حسێبدارە.

الحزب ١٠

ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ
وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ٨٧ ۞فَمَا لَكُمۡ فِي ٱلۡمُنَٰفِقِينَ
فِئَتَيۡنِ وَٱللَّهُ أَرۡكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهۡدُواْ مَنۡ
أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ٨٨ وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ
كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗۖ فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ أَوۡلِيَآءَ حَتَّىٰ
يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ
وَجَدتُّمُوهُمۡۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرًا ٨٩ إِلَّا ٱلَّذِينَ
يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ
صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ
لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ
وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ٩٠
سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأۡمَنُوكُمۡ وَيَأۡمَنُواْ قَوۡمَهُمۡ كُلَّ مَا
رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلۡفِتۡنَةِ أُرۡكِسُواْ فِيهَاۚ فَإِن لَّمۡ يَعۡتَزِلُوكُمۡ وَيُلۡقُوٓاْ
إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ وَيَكُفُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ
ثَقِفۡتُمُوهُمۡۚ وَأُوْلَٰٓئِكُمۡ جَعَلۡنَا لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا ٩١



﴿٨٧﴾ [گەلی مرۆڤان] خودێ ئەوە یێ ژ وی پێڤەتر چو پەرستی [خودێ] نەیی، بێ گۆمان دێ هەوە هەمییان ڕۆژا قیامەتێ کو چو گۆمان د وێ ڕۆژێدا نینە دێ کۆم کەت، و کی ژ خودێ ئاخفتن ڕاستتر هەیە [ئانکو کەس نینە]؟!. ﴿٨٨﴾ هەوە خێرە هوین هۆ د ڕاستا دوروییاندا بوویینە دو جوین؟ و خودێ ئەو ژ بەر کار و کریارێت کرین ڤەگەڕاندنەڤە [گاورییێ]. ئەرێ هەوە دڤێت یێ خودێ گومڕا و بەرزەکری ڕاستەڕێ بکەن؟ و هەچییێ خودێ گومڕا و بەرزەکر ئێدی تو چو ڕێکان بۆ نابینی [کو ئێك بۆ ببیتە ڕاستەڕێکەر]. ﴿٨٩﴾ [وان دوروییان] پێ خۆشە و حەز دکەن هوین ژی گاور ببن، هەروەکی ئەو گاوربوویین، دا هوین و ئەو وەکی ئێك لێ بهێن، ڤێجا هوین چو دۆست و پشتەڤانان ژ وان نەگرن، هەتا ئەو ب دورستی باوەرییێ ب ئارمانجا مشەختبوونا د ڕێکا خودێدا نەئینن، ڤێجا ئەگەر وان پشتا خۆ دایێ، بگرن و بکوژن، هەر جهێ لێ بن و ب دەست هەوە بکەڤن، و هوین قەت چو دۆست و هاریکاران ژێ نەگرن.

﴿٩٠﴾ ئەو نەبن ئەوێت خۆ بگەهیننە هندەکان [ئانکو خۆ دئاڤێنە بەختێ وان] کو پەیمان د ناڤبەرا هەوە و واندا هەیە [دەستێ خۆ نەکەنە ڤان و نەکوژن] یان ئەوێت دئێنە دەڤ هەوە و دلێ وان نەگریت [و بەرتەنگ ببیت] نە شەڕێ هەوە بکەن و نە شەڕێ ملەتێ خۆ.. و ئەگەر خودێ ڤیابایە [دلتەنگ نەدبوون] دا ل سەر هەوە زال و دەستهەلاتدار کەت و شەڕێ هەوە کەن. ڤێجا ئەگەر بەرهنگاری هەوە نەبوون، و شەڕێ هەوە نەکرن، و ئاشتی ڤیان و دەستێ دۆستینی و ئاشتییێ بۆ هەوە درێژ کر، [بزانن] خودێ بۆ شەڕێ وان چو ڕێ نەدایتە هەوە. ﴿٩١﴾ ب ڕاستی هوین دێ جوینەکێ دی [ژ دوروییان] بینن، دڤێن ژ هەوە [ب دورووییاتییێ] پشت ڕاست و ئێمن ببن و ژ ملەتێ خۆ ژی [ب گاورییێ] پشت ڕاست و ئێمن ببن. و هەر گاڤەکا هاتنە داخوازکرن بۆ گاورییێ و بۆ شەڕێ هەوە، لێ دزڤرن. ڤێجا ئەگەر ئەو دەستێ خۆ ژ شەڕ و بەرهنگارییا هەوە نەکێشن و ئاشتییێ ژ هەوە نەخوازن، بگرن و بکوژن ل کیڤە ببینن، ئەڤا مە بۆ هەوە ل سەر ڤان هێجەتەکا ئاشکەرا ژی دا [کو هوین ژ بەر دژمنییا وان یا ئاشکەرا بکوژن].

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ
مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ
إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ
لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ
مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ
أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ
شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ
عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا
فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ
وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓا۟ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُوا۟ وَلَا تَقُولُوا۟
لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ
عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ ۚ
كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ
فَتَبَيَّنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٩٤﴾



﴿٩٢﴾ بۆ چو باوەریدار و موسلمانان نابیت و نەدورستە باوەریدارەکی بکوژیت، ب بێ دەستی نەبیت، و هەر کەسێ باوەریدارەکی ب بێ دەستی بکوژیت، دڤێت [جزایێ خۆ] بەندەیەکێ موسلمان ئازا بکەت، و خوینێ بدەتە مرۆڤێت وی، ژ بلی هندێ هەکە ئەو خوینێ پێ بهێلن، و هەکە ئەو [کوشتی] ژ ملەتەکێ دژمن بیت بۆ هەوە، و ئەو [کوشتی] یێ موسلمان بیت، دڤێت بەس بەندەیەکێ موسلمان ئازا بکەت، و ئەگەر ئەو [کوشتی] ژ ملەتەکی بیت پەیمان د ناڤبەرا هەوە و واندا هەبیت، ئێدی [جزایێ وی ئەڤەیە] خوینا وی بدەتە مرۆڤێت وی، و بەندەیەکێ موسلمان ئازا بکەت. ڤێجا یێ بەندە ب دەست نەکەڤیت [یان شیان نەبن ب دەست خۆ بێخیت] تۆبەیا وی [ئەوە]: دو هەیڤان ل سەرئێك [بێ ڤەبڕین ئەو نەبیت یێ دەستویری هەبیت، وەکی نەساخییێ، ژڤان و چلکان و...] ب ڕۆژی بیت، ب ڕاستی خودێ یێ زانا و کاربنەجهە. ﴿٩٣﴾ و هەر کەسێ موسلمانەکی، بێ غالی و غەرەز و ژ قەستا بکوژیت، جزایێ وی دۆژەهە، هەروهەر دێ تێدا مینیت، و خودێ کەرب ژێ ڕاکرییە و دویری دلۆڤانییا خۆ ئێخستییە، و خودێ بۆ وی ئیزایەکا مەزن بەرهەڤکرییە. ﴿٩٤﴾ گەلی خودان باوەران هەر گاڤەکا هوین د ڕێکا خودێدا بۆ جیهادێ دەرکەڤتن، [لەزێ ل شەڕی نەکەن] و موسلمان و گاوران ژێك بنیاسن، و ئەوێ سلاڤ [یا موسلمانەتییێ] ل هەوە کر، نەبێژنێ تو نەموسلمانی، بۆ متا و پەرتالەکی ژیانا دنیایێ، و ل دەڤ خودێ دەستکەڤتییێت مەزن هەنە، [ژ بیر نەکەن] هوین ژی بەری نوکە وەسا بوون، ڤێجا خودێ کەرەم د گەل هەوە کر [و هوین ڕاستەڕێ کرن] [لەزێ ل کوشتنێ نەکەن] و ب دورستی بزانن و ژێك بنیاسن، ب ڕاستی خودێ ب تشتێ هوین دکەن یێ ئاگەهدارە.

لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ
فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ
وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ وَفَضَّلَ اللَّهُ
الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً
وَرَحْمَةً وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ
ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ
قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ
جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ
وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾
فَأُولَٰئِكَ عَسَى اللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾ ۞ وَمَن
يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَجِدْ فِي الْأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً وَمَن
يَخْرُجْ مِن بَيْتِهِ مُهَاجِرًا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ فَقَدْ
وَقَعَ أَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي
الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ
أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُوا لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾

الحزب ١٠





﴿٩٥﴾ موسلمانێت روینشتی [ژ جیهادێ] ئەو نەبن یێت زیان پێ کەڤتی، نەوەکی وانن، یێت ب خۆ و مالێ خۆ جیهادێ د رێکا خودێدا دکەن، ب راستی خودێ ئەوێت ب خۆ و مالێ خۆ جیهادێ د رێکا خودێدا دکەن، پەییسکەکێ ب سەر ئەوێت روینشتی [و عوزرا خۆ هەی] ئێخستینە، و خودێ ژڤانێ چاکییێ ب هەمییان دایییە، و خودێ موجاهد (جیهادکەر) ب خەلاتەکێ مەزن ب سەر روینشتییان ئێخستینە. ﴿٩٦﴾ پلە و پایە و گونەهـ ژێبرن و دلۆڤانی ل دەڤ خودێنە، و خودێ یێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٩٧﴾ ب راستی ئەوێت ستەم ل خۆ کرین [مشەخت نەبووین و مایینە د ناڤ گاوراندا] ملیاکەت جانێ وان دکێشن و دبێژنێ: هوین ل سەر چ بوون؟ دێ بێژن: ب راستی ئەم د ئەردیدا بەلنگاز و بێچارە بووین [ئەم نەدشیاین مشەخت ببین و ئەم نەدشیاین موسلمانەتییا خۆ ژی ئاشکەرا بکەین] ملیاکەت دێ بێژنێ: ئەرێ ما ئەردێ خودێ یێ بەرفرەهـ نەبوو هوین مشەخت ببنێ؟ ڤێجا ئەڤان جهێ وان دۆژەهە و چ پیسە دویماهیکە. ﴿٩٨﴾ ژ بلی وان یێت [ب دورستی] بەلنگاز و نەچار، ژ زەلام و ژن و بچویکان، ئەوێت بێ رێك و نەشێن رێکەکا دەرکەڤتنێ بگرن. ﴿٩٩﴾ ڤێجا ئەڤان خودێ دێ لێ بۆریت، و ژ خۆ خودێ لێبۆر و گونەهـ ژێبەرە. ﴿١٠٠﴾ و هەر کەسێ بۆ رێکا خودێ مشەخت ببیت، دێ ل سەر دفنا ملەتێ خۆ، جهی بۆ خۆ د ئەردیدا کەت، و بەرفرەهییێ د رزقیدا بینیت. و هەر کەسێ بۆ خودێ و پێغەمبەرێ وی ب مشەخت ژ مالا خۆ دەرکەڤیت، پاشی [د رێکێدا بەری بگەهیتە جهێ ڤیایی] بمریت، بێ شك خێرا وی [تەمام] ل سەر خودێ کەڤت [بۆ بنڤێسیت]، و خودێ ب خۆ یێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿١٠١﴾ و ئەگەر هەوە وەغەرەك [ئانکو سەفەرەك] د ئەردیدا کر، چو گونەهـ ل سەر هەوە نینە، هوین نڤێژا [چار رکاعەت] کورت بکەن، ئەگەر هوین ترسیان ئەوێت گاور هەوە ئەزیەت بدەن، ب راستی گاور بۆ هەوە دژمنێت ئاشکەرانە.

وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ
مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ ۖ فَإِذَا سَجَدُوا۟ فَلْيَكُونُوا۟
مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟ فَلْيُصَلُّوا۟
مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ
عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ
أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ
وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾
فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ
جُنُوبِكُمْ ۚ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ
كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ وَلَا تَهِنُوا۟ فِى
ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا
تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ
عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ
بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ۚ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾



﴿١٠٢﴾ و گاڤا تو [مەخسەد پێغەمبەرە و یێت د دویڤدا
دئێن ـ ژ سەروەران ـ هەتا ڕۆژا قیامەتێ] د ناڤ واندا
بی، و تە ڤیا نڤێژا جەماعەت [وەختێ د ترسێدا] بۆ
بکەی، بلا دەستەکەك ژ وان [پشتی دبنە دو جوین]
د گەل تە نڤێژێ بکەن، و بلا چەکێ خۆ هلگرن
[و جوینا دی دڤێت بەرانبەر دژمنی ڕاوەستیت]، ڤێجا
هەر گاڤەکا سوجدە برن [و نڤێژا خۆ ڕکعەتەك یان
ب تەمامی ل پشت تە کرن] ئێدی بلا ئەو ل پشت
هەوە ڕاوەستن [و زێرەڤانییێ بکەن] و بلا دەستەکا
دی [ئەوا بەرانبەر نەیاران ڕاوەستیایی] یا نڤێژ نەکری
بهێت و د گەل تە نڤێژێ بکەت، و بلا د هشیار
و سەرخۆ بن و چەکێ وان د گەلدا بیت. ئەوێت
گاوربووین، هیڤیان دکەن، کو هوین ژ چەك و کەل
و پەلێت خۆ بێ ئاکەهـ بن، دا ئەو ژی ئێدی پێکڤە ب
سەر هەوەدا بگرن و هێرشێ بکەنە هەوە. چو گونەهـ
ل سەر هەوە نینە ئەگەر ئەزیەتەك ژ بارانێ ب هەوە
کەڤتبیت یان ژی هوین د نەساخ بن، چەکێ خۆ دانن،
بەلێ هەوە باش ئاکەهـ ژ خۆ هەبیت و هشیار بن، ب
ڕاستی خودێ ئیزایەکا هەتکبەر بۆ گاوران بەرهەڤکرییە. ﴿١٠٣﴾ ڤێجا هەر گاڤەکا [ب ئاوایێ بۆری] هەوە
نڤێژا خۆ کر، ئێدی هوین ل سەر پییان و ڕوینشتی و ل سەر کێلەکان درێژکری زکرێ خودێ بکەن و خودێ
بیننە بیرا خۆ، ڤێجا ئەگەر هوین ژ دژمنی ئێمن بوون [کو چو هێرشان نائینتە سەر هەوە] هوین نڤێژا خۆ
[ب وی ڕەنگی، ئەوێ خودێ فەرمانا هەوە پێ کری و د دەمێ دەستنیشانکریدا] بکەن، ب ڕاستی نڤێژ ل
سەر باوەریداران ئەرکە و دەمدارە [ئانکو دەمێ خۆ یێ دەستنیشانکری یێ هەی]. ﴿١٠٤﴾ [گەلی خودان
باوەران] هوین ب دویڤ گەریان و داخوازکرنا نەیاران سست و بێزار نەبن، [چونکی] ئەگەر هوین
[ب دویڤ وانڤە و د شەڕێ واندا] دئێشن، ب ڕاستی کا چاوا هوین دئێشن ئەو ژی دئێشن [و ئەگەر ئەو بێنا
خۆ ل سەر نەهەقییا خۆ فرەهـ دکەن و خۆ ل بەر ڤان ئێش و نەخۆشییان دگرن، دڤێت هوین ژ وان چێتر خۆ
ڕاگرن چونکی] ئەو هیڤییا هوین ژ خودێ دخوازن [ژ خەلاتێ مەزن و خێرێ] ئەو ناخوازن، ب ڕاستی
خودێ یێ زانا و کاربنەجهە. ﴿١٠٥﴾ ب ڕاستی مە ئەڤ کتێبە [کو قورئانە] ب هەقی و ڕاستییێ بۆ تە ئینا
خوار، دا تو حوکمی د ناڤبەرا واندا ب وێ بکەی یا خودێ نیشا تە دایی، و بۆ خائینان پشتەڤان نەبە.

وَٱسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ١٠٦ وَلَا تُجَٰدِلۡ
عَنِ ٱلَّذِينَ يَخۡتَانُونَ أَنفُسَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ
خَوَّانًا أَثِيمٗا ١٠٧ يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسۡتَخۡفُونَ
مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمۡ إِذۡ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرۡضَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡلِۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطًا ١٠٨ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ
جَٰدَلۡتُمۡ عَنۡهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنۡهُمۡ
يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ وَكِيلٗا ١٠٩ وَمَن يَعۡمَلۡ
سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا
رَّحِيمٗا ١١٠ وَمَن يَكۡسِبۡ إِثۡمٗا فَإِنَّمَا يَكۡسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ١١١ وَمَن يَكۡسِبۡ خَطِيٓـَٔةً أَوۡ إِثۡمٗا
ثُمَّ يَرۡمِ بِهِۦ بَرِيٓـٔٗا فَقَدِ ٱحۡتَمَلَ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ١١٢
وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ وَرَحۡمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ
أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ
مِن شَيۡءٖۚ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَكَ
مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ عَظِيمٗا ١١٣



﴿١٠٦﴾ و داخوازا گونەهــ ژێبرنــێ بکـە [ژ بـەر ئـەوا تـە کریــیە دلـێ خـۆ، کـو تـو بەرەڤانییــێ ژ طوعمـێ کـورێ ئیبریقـی و دەسـتەکا وی بکـەی یـان یـێ جـوی سـزابدەی]، ب ڕاسـتی خـودێ گونەهــ ژێبــەر و دلۆڤانـە. ﴿١٠٧﴾ هەڤرکـی و جرەبرێ ژ پێـش وانڤـە نەکـە، ئەوێـت [ب گونەهـان] خیانەتێ ل خـۆ دکەن. ب ڕاسـتی خـودێ حـەژ زێدەخائینـێ گونەهـکار ناکـەت. ﴿١٠٨﴾ [ئەوێـت دوروی.. خیانەتـا خـۆ] ژ مرۆڤـان [ژ تـرس و شـەرمان] ڤەدشـێرن و ژ خـودێ ناڤەشـێرن، و خـودێ د گـەل وانـدا بـوو وەختـێ ب شـەڤ وان ڕەئیــییێت، خـودێ پـێ نەخـۆش و پـێ نـەڕازی، د گەل ئێـك دگـێڕان. و ب ڕاسـتی خـودێ ب وی تشـتێ ئـەو دکـەن بـاش ئاگەهـدارە. ﴿١٠٩﴾ ئەهـا ئەڤـە هـەوە پشـتەڤانی و بەرەڤانـی د ژیانـا دنیایــێدا ژ وان کـر، ڤێجا کـی دێ ڕۆژا قیامەتـێ بەرانبـەری خودێ بەرەڤانییــێ ژ وان کـەت؟! یـان کـی دێ خـۆ دەتـە بـەر وان و کریـارا وان ب سـتۆیێ خۆڤـە گریـت [کو وان ژ ئیزایـا دۆژەهێ ڕەهـا بکـەت]. ﴿١١٠﴾ و هـەر کەسـێ کارەکـێ خـراب بکـەت [کـو ئەزیەتـا وی بگەهیتـە هندەکێـت دی و پـێ بئێشـن] یـان ستەمێ ل خـۆ بکـەت [ئانکـو گونەهـان بکـەت] پاشـی داخـوازا گونەهــ ژێبرنـێ ژ خـودێ بخوازیـت، دێ بینیت خـودێ یێ گونەهــ ژێبـەر و دلۆڤانە. ﴿١١١﴾ و هـەر کەسـێ گونەهەکـێ بکـەت، زیانـێ ل خـۆ دکـەت، ب ڕاسـتی خـودێ یـێ زانـا و کاربنەجهـە. ﴿١١٢﴾ و هـەر کەسـێ گونەهـەکا بچویـك یان یا مـەزن [یان خەلەتیــیەکێ] بکەت پاشـی ب ئێکێ بـێ غالیغەرەز ڤەنیـت، ب ڕاسـتی وی بـێ بەختـی و گونەهـەکا ئاشـکەرا ئێخسـتە سـەر خـۆ. ﴿١١٣﴾ [هـەی موحەمـەد] ئەگەر کـەرەم و دلۆڤانیـیا خـودێ ل سـەر تە نەبایە، دەسـتەکەك ژ وان ل بەربوو تە د سـەردا ببەن، بەلێ ئـەو ژ خۆ پێڤەتر کەسـێ د سـەردا نابـەن [چونکـی سـەرئەنجامێ کارێ وان هـەر ل وان دزڤڕیـت] و ئـەو قەت نەشـێن چـو زیانێ بگەهیننـە تـە، ژ لایـێ خۆڤـە خودێ قورئان و سـونەت بۆ تـە هنارتن [ڤێجـا دێ چاوا شـێن زیانەکـێ گەهیننە تە، خـودێ دێ تـە پارێزیـت ئـەو چەنـد بزاڤێ بکەن] و تشـتێ تە چـو ژێ نەدزانی ب تـە دا زانین، ب ڕاسـتی خودێ کەرەمـەکا مەزن د گەل تە کریــیە.

نصف الحزب ١٠

۞ لَّا خَيۡرَ فِي كَثِيرٖ مِّن نَّجۡوَىٰهُمۡ إِلَّا مَنۡ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ
أَوۡ مَعۡرُوفٍ أَوۡ إِصۡلَٰحِۭ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ
ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿١١٤﴾ وَمَن
يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ
سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ
مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ
ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا
بَعِيدًا ﴿١١٦﴾ إِن يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثٗا وَإِن يَدۡعُونَ
إِلَّا شَيۡطَٰنٗا مَّرِيدٗا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ ٱللَّهُۘ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنۡ
عِبَادِكَ نَصِيبٗا مَّفۡرُوضٗا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمۡ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمۡ
وَلَأٓمُرَنَّهُمۡ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ وَلَأٓمُرَنَّهُمۡ
فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلۡقَ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيۡطَٰنَ وَلِيّٗا مِّن
دُونِ ٱللَّهِ فَقَدۡ خَسِرَ خُسۡرَانٗا مُّبِينٗا ﴿١١٩﴾ يَعِدُهُمۡ
وَيُمَنِّيهِمۡۖ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ
مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنۡهَا مَحِيصٗا ﴿١٢١﴾



﴿١١٤﴾ چـو خـێر د گەلـەك ئاخفتـن و پستەپسـتا وانـدا
نینـە، ئـەو تـێ نەبیت یـێ فەرمانـا خـێرێ یان قەنجیـیێ
یـان ئاشـتکرن و پێکئینانـا د ناڤبـەرا هەڤڕکانـدا بکـەت،
و هـەر کەسـێ [ئەڤـا بـۆری] بـۆ ڕویـیێ خـودێ
بکـەت، ب ڕاسـتی ئـەم دێ خەلاتەکـێ مـەزن دەینـێ.
﴿١١٥﴾ و هەر کەسـێ پشـتی ڕێکا ڕاسـت بۆ دیاربوویی و
دژاتیـیا پێغەمبەری بکەت، و ڕێکا بـێ باوەران بگریت،
ئـەم ژی دێ بـەرێ وی دەینـە وێ ڕێـکا ئـەو لـێ زڤڕی،
و ئـەم دێ وی کەینـە د دۆژەهێـدا، کـو پیسـە دویماهیـك
و پیسـە قویناخـە. ﴿١١٦﴾ ب ڕاسـتی خـودێ [گونەهـا]
یێـت هەڤـال و هۆگـران بـۆ چـێ دکـەن ژێ نابـەت، و ژ
بـلی ڤـێ [گونەهـێ] خـودێ بـۆ وی یـێ بڤێـت گونەهـا
وی ژێ دبـەت، و هـەر کەسـێ شریـکان بـۆ خـودێ
چێکـەت ب سـویند ئـەو بەرزەبوونـەکا پیـس [دویـر]
بەرزەبوویـیە. ﴿١١٧﴾ [ئەو موشرك] ژ بـلی خودێ گازی
و پەرسـتنا هنـدەك پەرستیـیێت مـێ دکـەن [وەکی لات
و عـوززا و مەنـات و نائیلـە... هتـد، و ب ڤـێ پەرسـتنێ
و گازیکرنـێ]، ب تنـێ شـەیتانێ خڕیایـی دپەرێسـن و
هـەوار دکەنـێ. ﴿١١٨﴾ خودێ دویرئێخسـت ژ دلۆڤانیـیا خۆ [لەعنەت لێ باراندن ]، سـویند خـوار و گۆت: ئەز
دێ بـارەکا ئاشـکەرا ژ بەندەییـێت تـە بۆ خۆ ئێخـم. ﴿١١٩﴾ و ئەز دێ وان ژ ڕێکا ڕاسـت بەرزەکـەم، و دێ وان ب
هیڤـی ئێخـم [کـو دێ ژی درێژ بـن و دێ هزرکەن هێژ زوییـیە تۆبە بکـەن، و ل خۆ بزڤڕن هەتا ژیانا خۆ هەمیـیێ
ب ڤـان هیڤیـیان دبەنـە سـەری] و ئـەز دێ فەرمانـا وان کـەم، ڤێجا ئـەو دێ گوهێت تەرشـان ژێڤەکەن [کـو بێنە
نیشـانکرن ئـەو پێشکێشـن بۆ پەرسـتی و بوتان]، و ئـەز دێ فەرمانا وان کەم کو ئەو چێکریـیان یـان دینێ خودێ
بگوهـۆڕن. و هـەر کەسـێ شـەیتانی ل جهێ خودێ بـۆ خۆ بکەتـە هاریکار و پشـتەڤان، ئێدی ب سـویند ئەو ب
بـەر زیانـەکا ئاشـکەرا کەڤـت. ﴿١٢٠﴾ [شـەیتان] ژڤان و پەیمانێـت [درەو] ددەتـە وان و وان ب هیڤـی دئێخیت، و
شـەیتان ژ خاپاندنـێ پێڤەتـر نادەتـە بـەر وان. ﴿١٢١﴾ ئەڤان [دویکەڤتیـیێت شـەیتانی] جهـێ وان [ڕۆژا قیامەتێ]
دۆژەهـە، و چـو ڕێکێـت ژێ دەرکەڤتـن و ڕەهابوونـێ نابینن.

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ
تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ
حَقّٗاۚ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا ١٢٢ لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ
وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِۗ مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ
وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ١٢٣ وَمَن
يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ
فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا ١٢٤ وَمَنۡ
أَحۡسَنُ دِينٗا مِّمَّنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ وَٱتَّبَعَ
مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبۡرَٰهِيمَ خَلِيلٗا ١٢٥ وَلِلَّهِ
مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٖ
مُّحِيطٗا ١٢٦ وَيَسۡتَفۡتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ
فِيهِنَّ وَمَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ
ٱلَّٰتِي لَا تُؤۡتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ
وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلۡوِلۡدَٰنِ وَأَن تَقُومُواْ لِلۡيَتَٰمَىٰ بِٱلۡقِسۡطِۚ
وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمٗا ١٢٧





﴿١٢٢﴾ و ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت قەنج کرین، ب ڕاستی ئەم دێ وان بەینە د وان بەحەشتاندا ئەوێت ڕویبار د بندا دهەڕکن (دچن) و ئەو هەروهەر دێ تێدا مینن، ئەڤە سۆز و پەیمانەکا ڕاستە ژ خودێ، و ما کی ژ خودێ ڕاستگۆتر هەیە؟ ﴿١٢٣﴾ گەلی ئەوێت هەوە باوەری ئینایین، و گەلی خودانێت کتێبان [جزا و خەلاتێ خودێ] نە ب هیڤیێت هەوەیە و نە ب هیڤیێت خودانێت کتێبانە [کو جوهی و فەلەنە]، هەر کەسێ [ژ هەوە یان ژ وان] خرابی و گونەهەکێ بکەت، دێ پێ ئێتە جزادان، و ژ خودێ پێڤەتر چو هاریکار و پشتەڤانان بۆ خۆ نابینیت. ﴿١٢٤﴾ و هەر کەسێ کار و کریارێت قەنج بکەت چ ژن چ مێر، و ئەو خودان باوەر بیت، ئەها ئەڤە دێ چنە بەحەشتێ، و تەمەت خیچا بەرکێ قەسپێ ستەم لێ نائێتەکرن [ئانکو کێمترین ستەم لێ نائێتە کرن]. ﴿١٢٥﴾ ما دینێ کێ ژ یێ وی چێترە ئەوێ ب دورستی خۆ سپارتییە خودێ و ئەو کارڕاست و قەنج ژی، و بوویییە دویکەڤتییێ دینێ ئیبراهیمی، کو دینەکێ ڤەدەرە ژ خواری و خرابییێ، و خودێ ژی ئیبراهیم کرە زێدەخۆشڤییێ خۆ. ﴿١٢٦﴾ هندی د ئەرد و ئەسماناندا هەمی یێ خودێیە، و خودێ ژی ب هەر تشتەکی [چ بچویك چ مەزن] باش یێ ئاگەهدارە. ﴿١٢٧﴾ [هەی موحەمەد] ئەوا د دەرهەقێ ژنێدا [کا چ بڕیار و ئەحکام د دەرهەقێ وێدا هەنە] ژ تە دپرسن، بێژە: خودێ دێ بۆ هەوە ڤێ چەندێ ڕۆن کەت، و ئەوا بۆ هەوە ژ قورئانێ دئێتە خواندن ڕۆنکرن و بەرسڤە، [ئیشارەتە بۆ ئایەتا سێیێ ژ سۆرەتا (ئەلنیساء)، و ڕامانا وێ ژی ئەڤەیە [ئەگەر هوین ترسیان د ڕاستا کچێت سێویدا ئەوێت هوین خودانییێ ژێ دکەن، ئەگەر مار بکەن، دادگەرییێ نەکەن، و مافێت وان ب دورستی نەدەنێ، وان بهێلن، و ژنێت دی یێت هەوە پێ خۆش مار بکەن]، [خودێ دێ بۆ هەوە دیارکەت و ئەوا ژ قورئانێ بۆ هەوە دئێتە خواندن]، کا چ د ڕاستا سێوییێدا هەیە ئەوا هوین میراتێ خودێ بۆ ڤەبڕی نەدەنێ، و هەوە دڤێت مار بکەن [ژ بەر جوانییا وێ، دا مەهرا ئەو هەژی نەدەنێ، یان ژی هەما هەر نەهێلن شوی بکەت، دا مالێ وان بۆ هەوە بمینیت] [ئانکو خودێ بۆ هەوە دیار دکەت، هوین چو ژ ڤان د ڕاستا سێوییێدا نەکەن، و ستەمێ لێ نەکەن نە ژ ڕێکا میراتیڤە نە ژ ڕێکا مەهر و شویکرنا وێڤە] و خودێ بڕیارا کوڕێت بچویك دێ بۆ هەوە دیارکەت [ماف و میراتێ وان بدەنێ و بێ بار نەکەن] و خودێ بۆ هەوە بڕیارا سێوییان [چ کوڕ چ کچ] دیار دکەت کو هوین دادوەرییێ د هەمی کاروبارێت واندا بکەن، هەر خێر و قەنجیا هوین بکەن ب ڕاستی خودێ یێ پێ ئاگەهە.

وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا فَلَا جُنَاحَ
عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحًاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٌۗ
وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ
كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٢٨﴾ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ
بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ فَتَذَرُوهَا
كَٱلۡمُعَلَّقَةِۚ وَإِن تُصۡلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ
غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٢٩﴾ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغۡنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴿١٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَلَقَدۡ وَصَّيۡنَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن
قَبۡلِكُمۡ وَإِيَّاكُمۡ أَنِ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ
مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ﴿١٣١﴾
وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾
إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأۡتِ بِـَٔاخَرِينَۚ وَكَانَ
ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا ﴿١٣٣﴾ مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ
ثَوَابُ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿١٣٤﴾





﴿١٢٨﴾ و ئەگەر ژن ترسیا زەلامێ وێ ژێ دویركەڤیت و ڕوییێ خۆ ژێ وەرگێڕیت یان دەست ژێ بەردەت، گونەهـ ل سەر وان نینە هەردو د گەل ئێك پێكبێن [تفاقەكێ د گەل ئێك بكەن]، [ڕۆژێت خۆ یان هندەكان ژێ یان هندەك نەفەقەی یان مەهرێ یان هندەكێ ژێ، پێ بهێلیت و ڕازی بیت، و ب ڤێ پێهێلانێ زەلام د گەل بمینیت]. و پێكهاتن و ئاشتبوون چێترە، و چڕویكاتی د گەل نەفسێ هاتییە بەرهەڤكرن، [ئانكو نەفس ل سەر چڕویكاتییێ ڕابوویییە و یا پێڤە گرێدایییە، نە ژن چو ب زەلامێ خۆ دهێلیت و نە زەلام مافێ وێ ددەتێ، ئەگەر دلێ خۆ دا سەر ئێكا دی پاشی دئێنە پالدان كو ڤی سروشتی بهێلن] ڤێجا ئەگەر هوین قەنجییێ بكەن [و ل ئێكدو ب هەجەت نەبن و د گەلێك بقەتینن] و خۆ ژ ستەم و مافخوارنێ بپارێزن [بزانن] ب ڕاستی خودێ ب تشتێ هوین دكەن ئاگەهدارە. ﴿١٢٩﴾ چوجا هوین نەشێن د ناڤبەرا ژناندا دادوەرییێ بكەن [مەخسەد عەدالەتا ڕاست و دورست و تەكووز]، خۆ هوین د مجد ژێ بن. ڤێجا [ئەوا دلێ هەوە ل سەر نەمایی] ب ئێكجاری بەرێ خۆ ژێ وەرنەگێڕن، ڤێجا هوین وێ وەكی یا هەلاویستی بهێلن [نەیا ب زەلامە، و نەیا بێ زەلامە]، و ئەگەر هوین خەلەتییێت خۆ چێكەن [و فەرق و جوداییێ نەكەن] و پارێزكارییا خودێ بكەن [ژ هەمی كار و كریارێت خودێ ژێ نەرازی، وەكی: ستەم و فەرق و جوداییا د ناڤبەرا ژناندا] ب ڕاستی خودێ گونەهـژێبەر و دلۆڤانە. ﴿١٣٠﴾ و ئەگەر ئەو هەردو [ژن و مێر] ژێكڤەبوون [ژن هاتە بەردان] خودێ وان هەردووكان دێ ژ كەرەما خۆ زەنگین و بێ منەت كەت [ئانكو وان هەوجەیی ئێكدو ناكەت] ب ڕاستی خودێ [د دلۆڤانی و كەرەما خۆدا] یێ بەرفرەهـ و كاربنەجهە. ﴿١٣١﴾ هندی د ئەرد و ئەسماناندا یێ خودێیە، ب ڕاستی مە فەرمانا، ئەوێت بەری هەوە مە كتێب داییێ، كر و یا هەوە ژی دكەین كو پارێزكارییا خودێ بكەن، و ئەگەر هوین گاوربوون ب ڕاستی هندی د ئەرد و ئەسماناندا یێ خودێیە، [و هوین چو زیانێ ناگەهیننە خودێ] خودێ یێ بێ منەتە و هێژایی سوپاسییێیە. ﴿١٣٢﴾ هندی د ئەرد و ئەسماناندا یێ خودێیە، و خودێ بەسە پشتەڤان بیت. ﴿١٣٣﴾ و ئەگەر خودێ بڤێت دێ هەوە بەرئاتافكەت [هەوە مرینیت و قڕكەت] گەلی مرۆڤان، و هندەكێت دی [شوینا هەوە] دێ ئینیت، و ب ڕاستی خودێ ل سەر ڤی كاری یێ دەستهەلاتدارە. ﴿١٣٤﴾ و هەر كەسێ خێرا دنیایێ [ب تنێ بەرانبەر كار و كریارێت خۆ] بڤێت، [بلا بزانن] خودێ خێرا دنیا و ئاخرەتێ ل دەڤە [ڤێجا بۆچی هوین خۆشییا كێم ددەنە ب یا گەلەك و بۆچی هوین ب دنیایێ ب تنێ د ڕازینە]، و خودێ ب وی كارێ هوین دكەن بهیسەر و بینەرە.

* يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوۡ
عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَوِ ٱلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَۚ إِن يَكُنۡ غَنِيًّا أَوۡ فَقِيرٗا
فَٱللَّهُ أَوۡلَىٰ بِهِمَاۖ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلۡهَوَىٰٓ أَن تَعۡدِلُواْۚ وَإِن تَلۡوُۥٓاْ
أَوۡ تُعۡرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ١٣٥ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ
عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُۚ وَمَن يَكۡفُرۡ
بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ فَقَدۡ ضَلَّ
ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ١٣٦ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ
كَفَرُواْ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرٗا لَّمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ
سَبِيلَۢا ١٣٧ بَشِّرِ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا ١٣٨ ٱلَّذِينَ
يَتَّخِذُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ أَيَبۡتَغُونَ
عِندَهُمُ ٱلۡعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعٗا ١٣٩ وَقَدۡ نَزَّلَ عَلَيۡكُمۡ فِي
ٱلۡكِتَٰبِ أَنۡ إِذَا سَمِعۡتُمۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكۡفَرُ بِهَا وَيُسۡتَهۡزَأُ بِهَا فَلَا
تَقۡعُدُواْ مَعَهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦٓ إِنَّكُمۡ إِذٗا مِّثۡلُهُمۡۗ
إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ١٤٠



﴿١٣٥﴾ گەلی خودان باوەران ب دادوەرییێ ڕابن [خۆ ژێ نەدەنە پاش و د بنیڕا ستەمێ نەکەن] و شادەیییێ بۆ خودێ بدەن، ئەگەر خۆ ل سەر هەوە و دەیباب و کەس و کاران ژی بیت. ئەگەر ئەو د زەنگین بن یان د هەژار بن، خودێ ژ وان هەردووکان هەژیترە [هوین خاترێ بۆ بگرن] ڤێجا ب دویڤ دلخوازییا خۆ نەکەڤن، کو هوین دادوەرییێ نەکەن. و ئەگەر هوین ئەزمانێ خۆ تێك بدەن [و شادەیییێ بگوهۆڕن] یان ژی نەدەن [و ڤەشێرن] بزانن خودێ ب تشتێ هوین دکەن ئاگەهدارە. ﴿١٣٦﴾ گەلی خودان باوەران، خۆ ل سەر باوەرییا ب خودێ و پێغەمبەری و کتێبا وی ب سەر پێغەمبەرێ خۆدا ئینایییە خوارێ و کتێبێت بەری نوکە هنارتین، ڕاگرن و بمینن، و هەر کەسێ باوەرییێ ب خودێ و ملیاکەتێت وی و کتێبێت وی و پێغەمبەرێت وی و ڕۆژا قیامەتێ نەئینیت، ب سویند ئەو کویر و دویر بەرزەبوو. ﴿١٣٧﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ئینایین، پاشی گاوربووین، پاشی دیسا باوەری ئینایین، پاشی د دویڤڕا دیسا گاوربووین، پاشی گاورییا وان زێدەبوویی و ل سەر گاورییێ مرین، ئێدی خودێ وان ئازا ناکەت، و گونەهێت وان ژێ نابەت و ڕاستەڕێ ناکەت. ﴿١٣٨﴾ [هەی موحەمەد] مزگینییێ بدە دوڕوییان کو ب ڕاستی ئیزایەکا ب ژان بۆ وان هەیە. ﴿١٣٩﴾ ئەوێت گاوران شوینا خودان باوەران بۆ خۆ دکەنە دۆست و پشتەڤان، ئەرێ وان ڕێز و سەرفەرازی ژ وان دڤێت؟! ب ڕاستی ڕێز و سەرفەرازی هەر یا خودێیە [ئانکو ڕێز و سەرفەرازییێ بەس ژ خودێ بخوازن]. ﴿١٤٠﴾ ب ڕاستی خودێ د قورئانێدا بۆ هەوە ئینایییە خوار، و هەر گاڤەکا هەوە بهیست ترانە یان گاوری ب ئایەتێت خودێ دئێتەکرن، د گەل وان [ئانکو ترانەکەران] نەڕویننە خوارێ هەتا سوحبەتەکا دی دکەن [ئانکو هەتا سوحبەتا خۆ دگوهۆڕن]. و ئەگەر هوین وێ گاڤێ د گەل ڕوینشتن، هوین ژی دێ وەکی وان لێ ئێن، بێ گۆمان خودێ دوڕوییان و گاوران پێکڤە د دۆژەهێدا دێ کۆمکەت.

ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمۡ فَإِن كَانَ لَكُمۡ فَتۡحٞ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓاْ
أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡ وَإِن كَانَ لِلۡكَٰفِرِينَ نَصِيبٞ قَالُوٓاْ
أَلَمۡ نَسۡتَحۡوِذۡ عَلَيۡكُمۡ وَنَمۡنَعۡكُم مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ
بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ
سَبِيلًا ١٤١ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا
قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ
ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا ١٤٢ مُّذَبۡذَبِينَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ
هَٰٓؤُلَآءِۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ١٤٣ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ
أَتُرِيدُونَ أَن تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينًا ١٤٤ إِنَّ
ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ١٤٥
إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخۡلَصُواْ
دِينَهُمۡ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَسَوۡفَ يُؤۡتِ ٱللَّهُ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَجۡرًا عَظِيمٗا ١٤٦ مَّا يَفۡعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمۡ
إِن شَكَرۡتُمۡ وَءَامَنتُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمٗا ١٤٧





﴿١٤١﴾ ئەوێت خۆ دگرن و زێرەڤانییا هەوە دكەن
[كا دێ چ ب سەرێ هەوە ئێت] ڤێجا ئەگەر سەركەڤتنەك
و خێرەك ژ دەڤ خودێ بۆ هەوە هات، دێ بێژن ما
ئەم ژی د گەل هەوە نەبووین؟ [مە ژی د دەستكەڤتیدا
پشكدار بكەن] و ئەگەر سەركەڤتن بارا گاوران بیت،
دێ بێژن: ما ئەم یێت ب سەر هەوەدا د زال نەبووین؟
[بەلێ مە هوین نەكوشتن و نەئێخسیركرن و د ناڤ
واندا مە هاریكارییا هەوە نەكر؟] و ما مە هوین ژ
موسلمانان نەپارستن [ڤێجا كا بارا مە بدەنە مە] ڕۆژا
قیامەتێ خودێ دێ فەرمانێ و حوكمی د ناڤبەرا
واندا كەت، و ژ خۆ خودێ چوجا ڕێ و فەرسەتێ
نادەتە گاوران، موسلمانان قڕ بكەن. ﴿١٤٢﴾ ب ڕاستی
دوڕوییان [دڤێن] خودێ بخاپینن، و خودێ ب
خۆ وان ڕادكێشیتە سەرداچۆنا وان، و گاڤا ڕابوونە
نڤێژێ، ب سستی ڕادبن و پێش چاڤێت خەلكی
نڤێژێ دكەن، كێم جار نەبن خودێ نائیننە بیرا خۆ
[مەخسەد د نڤێژێدا، چونكی ژ بەر خەلكی دكەن و
ترسا خودێ تێدا ناكەن]. ﴿١٤٣﴾ ئەو [دوڕوی د ناڤبەرا
موسلمان و گاوراندا یێت ماین] نە ژ وان و نە ژ وانن، و ب ڕاستی ئەوێ خودێ بەرزەكر، تو چو ڕێكان
بۆ نابینی ڤەگەڕیتەڤە. ﴿١٤٤﴾ گەلی خودان باوەران، گاوران شوینا موسلمانان دۆست و پشتەڤان نەگرن،
ئەرێ هەوە دڤێت [ب ڤی كارێ خۆ] نیشانەكا ب هێز و ئاشكەرا بدەنە خودێ [هەوە ژ بەر ئیزا بدەت].
﴿١٤٥﴾ ب ڕاستی دوڕوی د بنێ دۆژەهێدانە، و چو هاریكار بۆ وان نینن [وان ژ ئیزایا دۆژەهێ قورتال بكەن].
﴿١٤٦﴾ ژ بلی وان یێت پەشێمان بووین و تۆبەكرین، و كاروبارێت خۆ دورست و چاك كرین، و خۆ ب كتێبا
خودێ و سونەتا پێغەمبەریڤە گرتین و ب كار و كریارێت خۆ ڕازیبووین و ڕوییێ خودێ ب تنێ ڤیاین.
ئێدی ئەڤە [ڕۆژا قیامەتێ] دێ د گەل خودان باوەران بن، و ب ڕاستی خودێ دێ خەلاتەكێ مەزن دەتە
خودان باوەران. ﴿١٤٧﴾ ما خودێ چ هەوجەیی و منەت ب ئیزادانا هەوە هەیە، ئەگەر هوین سوپاسی و
شوكورا خودێ بكەن و باوەرییێ پێ بینن؟ [ئەڤە چو ژ گەنجخانەیا خودێ زێدە ناكەت، دیسا ئیزادانا وی
بۆ هەوە چو ژ گەنجخانەیا وی كێم ناكەت]. و خودێ ب خۆ ژی سوپاسگۆزارێ زانایە [ئانكو بەندەیێت
خۆ ل سەر گوهدارییا خۆ خەلات دكەت].

۞ لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ ۚ وَكَانَ
ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾ إِن تُبْدُوا۟ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا۟ عَن
سُوٓءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴿١٤٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ
بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ
نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا۟
بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ حَقًّا ۚ وَأَعْتَدْنَا
لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٥١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ
وَلَمْ يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ أُو۟لَٰٓئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ
أُجُورَهُمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٥٢﴾ يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ
أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ
مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ۚ
ثُمَّ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ فَعَفَوْنَا
عَن ذَٰلِكَ ۚ وَءَاتَيْنَا مُوسَىٰ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٥٣﴾ وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ
ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمْ وَقُلْنَا لَهُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُلْنَا
لَهُمْ لَا تَعْدُوا۟ فِى ٱلسَّبْتِ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿١٥٤﴾





﴿١٤٨﴾ خـودێ حـەژ دیـارکرنا ئاخفتـنێت کرێـت
ناکـەت، ژ وی نەبیـت یـێ ستەملێـکری [ئـەو ژی دا
بەرەڤانیـیێ ژ خۆ بکـەت]. و خودێ گوهدێـر و زانایە.
﴿١٤٩﴾ ئەگـەر هویـن قەنجـی و خـێرێ ئاشـکەرا بکـەن
یان ژی ڤەشـێرن یان ژی ژ خرابیـیەکێ ببـۆرن، ڤێجا ب
راسـتی خودێ لێنەگر و خودان شـیانە. ﴿١٥٠﴾ ب راستی
ئەوێـت باوەریـیێ ب خودێ و پێغەمبەرێـت وی نەئینن
و دڤـێن فـەرق و جوداهیـیێ بێخنـە د ناڤبـەرا خـودێ و
پێغەمبەرێـت ویـدا، و دبێـژن ئـەم باوەریـیێ ب هنـدەك
پێغەمبـەران دئینـین و ب هنـدەکان نائینـین، و دڤـێن بـۆ
خـۆ رێکـەکا ناڤنجـی د ناڤبەرا [بـاوەری و گاوریـیێدا]
بگـرن. ﴿١٥١﴾ بـێ گۆمـان ئەڤـە ب دورسـتی گـاورن،
و مـە ئیزایـەکا هەتکبـەر بـۆ گـاوران بەرهەڤکریـیە.
﴿١٥٢﴾ و ئەوێـت بـاوەری ب خـودێ و پێغەمبەرێت وی
ئینایـین و فـەرق و جوداهـی د ناڤبـەرا وانـدا نەکریـن،
[و بـاوەری ب هەمـی پێغەمبـەران ئینایـی] ئەهـا ئەڤـان
خـودێ دێ خەلاتـێ وان دەتـێ، و خـودێ ب خـۆ ژی
گونەهــژێبـەر و دلۆڤانـە. ﴿١٥٣﴾ خودانێـت کتێبان ژ تە
دخـوازن، تـو کتێبەکـێ بـۆ وان ژ ئەسـمانی بینیـیە خـوارێ ب سـویند وان ژ ڤـێ مەزنـتر ژ مووسـایی خواسـت،
گۆتنە [مووسـایی] کا خودێ ب ئاشـکەرایی نیشـا مە بدە، و ژ بەر ستەمکاریـیا وان برویسیـیا ئاگری ل ئەسـمانا
ئـەو گرتـن، و پشـتی نیشـانێت ئاشـکەراکەر ژی بـۆ هاتـین، دیسـا گۆلـك بـۆ خۆ گرتـن و پەرسـتن، پاشـی ئەم
لـێ بۆریـن، و مـە نیشـانێت ئاشـکەراکەر دانـە مووسـایی. ﴿١٥٤﴾ ژ بـەر کـو دا پەیمانـا وان یـا موکـوم بیـت، مـە
[چیایـێ] (طـوور) راکـرە هنداڤ سـەرێ وان و مـە فەرمانا وان کـر: داچەمیایی [و خۆشـکاندی بـۆ خودایێ ئەو
ژ بەرزەبوونـێ رزگارکریـن] د دەرگەهـێ قودسـێرا بدەنـە ژۆر، و مـە فەرمانـا وان کر زێدەگاڤیـیێ د شەنبیـیێدا
نەکـەن [و نەدەنـە سـەر بڕیـارا خـودێ] و مـە پەیمانـا موکومکـری ژ وان سـتاندن.

فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ
بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ
فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا
عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ
ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ
ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ
وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾
وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ
ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾ فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟
حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ
كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ
ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾ لَّٰكِنِ
ٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ وَٱلْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ
وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ ۚ وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ
وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ أُو۟لَٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾



﴿١٥٥﴾ ڤێجا ژ بەر پەیمان شكاندن و باوەری نەئینانا
وان ب نیشان و ئایەتێت خودێ، و كوشتنا وان ژ بێ
بەختی و نەهەقی بۆ پێغەمبەران، و گۆتنا وان دلێت
مە ب كاڤلانكن [ژ بەر هندێ تێ ناگەهین] [وەنینە
وەكی ئەو دبێژن] بەلكی خودێ ژ بەر گاوریا وان
یێت پەردەسەر كرین، ڤێجا كێمەك ژ وان [نە گەلەك]
باوەرییێ پێ دئینن. ﴿١٥٦﴾ دیسا ژ بەر نەباوەرئینانا
وان ب عیسایی و گۆتنا وان یا زێدە بێ بەخت ل سەر
مەریەمێ. ﴿١٥٧﴾ دیسا ژ بەر گۆتنا وان ب ڕاستی
مە عیسایێ كوڕێ مەریەمێ كو پێغەمبەرێ خودێیە،
مە یێ كوشتی، و وان ب خۆ ژی نە عیسا كوشتییە
و نە ل دار داییە [ئانكو ل سەر داران نەكوشتییە
و هەلاویستییە] بەلێ ل بەر وان [ئەوێ كوشتی و
عیسا] وەكی ئێك لێ هاتن، و ئەو ب خۆ ژی ل سەر
كوشتنا عیسایی ب گۆمانن، و چو زانین پێ نینن ژ بلی
دویكەڤتنا گۆمانێ، و ب ڕاستی وان عیسا نەكوشتییە.
﴿١٥٨﴾ بەلێ خودێ ئەو ب بال خۆڤە بلندكرییە،
و خودێ ب خۆ یێ سەردەست و كاربنەجهـ و
فەرمانڕەوایە. ﴿١٥٩﴾ چو كەس ژ خودانێت كتێبان [مەخسەد جوهی و فەلەنە] نامینن باوەرییێ ب عیسایی
نەئینن بەری مرنا وی [دەمێ دئێتە خوارێ بۆ كوشتنا دەجالی]، و ڕۆژا قیامەتێ ل سەر هەمییان دێ بیتە
شاهد [كو وی یێ گەهاندی ئەو بەندەیێ خودێیە و پێغەمبەرە]. ﴿١٦٠﴾ ڤێجا ژ بەر ستەما جوهییان دكر
و ژ بەر ڕێگرتنا وان یا گەلەك بۆ ڕێكا خودێ، مە ژی هندەك تشتێت پاقژ و بۆ وان دورست و حەلال، ل
سەر نەدورستكرن. ﴿١٦١﴾ و دیسا ژ بەر وەرگرتن و خوارنا وان بۆ سەلەفێ و ئەو ب خۆ فەرمانا وان هاتبوو
كرن وەنەكەن، و ژ بەر خوارنا وان بۆ مالێ خەلكی ژ بێ بەختی و ژ نەهەقی [من ژی تشتێ بۆ وان پاقژ و
دورست، نەدورست كر]. و ب ڕاستی مە ئیزایەكا ب ژان بۆ گاوران ژ وان بەرهەڤكرییە. ﴿١٦٢﴾ بەلێ ژ وان
یێت ڕەهوان و شارەزا د زانینێدا [وەكی عەبدوللایێ كوڕێ سەلامی و ئەسەدێ كوڕێ عوبەیدی و ئەسەدێ
كوڕێ سەعیە] و یێت باوەری ئینایین، باوەرییێ ب ئەوا بۆ تە و بۆ [پێغەمبەرێت] بەری تە هاتی دئینن، و
بەردەوام نڤێژان دكەن و زەكاتێ ددەن، و باوەرییێ ب خودێ و ڕۆژا قیامەتێ دئینن، ب ڕاستی ئەم ڤان دێ
خەلاتەكێ مەزن دەینێ.

الحزب ١١

۞ إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ
وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ
وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ
وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ١٦٣ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ
مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ
تَكۡلِيمٗا ١٦٤ رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ
عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ١٦٥
لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ
يَشۡهَدُونَۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ١٦٦ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدۡ ضَلُّواْ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ١٦٧ إِنَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ لَمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ
طَرِيقًا ١٦٨ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ وَكَانَ
ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ١٦٩ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلۡحَقِّ
مِن رَّبِّكُمۡ فَـَٔامِنُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ
مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ١٧٠





﴿١٦٣﴾ ب ڕاستی مە وەحی بۆ تە هنارت هەروەکی مە وەحی بۆ نووح و پێغەمبەرێت پشتی وی هاتین هنارتی. و مە وەحی بۆ ئیبراهیمی و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و کوڕێت وی و عیسا و ئەیـیووب و یوونس و هاروون و سولەیمان، و [مە کتێبا ب ناڤێ] زەبوور دا داوودی. ﴿١٦٤﴾ و پێغەمبەر مە هنارتن ژ وان یێت مە بەری نوکە سەرهاتیا وان بۆ تە ڤەگێڕایی و هندەك پێغەبەرێت دی ژی مە هنارتن، و بەحسێ وان مە بۆ تە نەکرییە، و ب ڕاستی خودێ د گەل مووسا ئاخڤتییە. ﴿١٦٥﴾ ئەو پێغەمبەر مزگینئین و ئاگەهدارکەر بوون، دا مرۆڤان بەرانبەری خودێ پشتی هنارتنا پێغەمبەران، چو هێجەت نەمینن، و خودێ ب خۆ ژی یێ زالکەر و کاربنەجهە. ﴿١٦٦﴾ بەلێ خودێ شادەیییێ ب وێ کتێبا ب زانینا خۆ بۆ تە ئینایە خوارێ ددەت [کو ئەڤ قورئانە ژ دەڤ خودێیە و تو پێغەمبەری] و ملیاکەت ژی شادەیییێ ددەن، و شادەیییا خودێ بەسە. ﴿١٦٧﴾ ئەوێت گاوربووین و مرۆڤان ژی ژ ڕێکا خودێ ددەنە پاش، ب ڕاستی ئەو بەرزەبوونەکا دویر بەرزە بووینە. ﴿١٦٨﴾ ب ڕاستی ئەوێت گاوربووین و ستەم کرین، ب ڕاستی خودێ لێ نابۆریت و بەرێ وان نادەتە چو ڕێکێت [سەرفەرازییێ]. ﴿١٦٩﴾ ژ بلی ڕێکا دۆژەهێ کو هەروهەر دێ تێدا مینن، و ئەڤە ب خۆ ل دەڤ خودێ ب ساناهییە. ﴿١٧٠﴾ گەلی مرۆڤان ب ڕاستی پێغەمبەرەك ژ لایێ خودایێ هەوەڤە ب دینەکێ هەق و ڕاست هات، ڤێجا باوەرییێ پێ بینن بۆ هەوە چێترە، و ئەگەر باوەرییێ پێ نەئینن و ببنە گاور [بزانن] هەر تشتێ د ئەرد و ئەسماناندا هەی بۆ خودێیە، و خودێ ب خۆ یێ زانا و کاربنەجهە.

يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى
ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ
وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ
وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ
إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿١٧١﴾ لَّن يَسۡتَنكِفَ
ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ
وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ فَسَيَحۡشُرُهُمۡ
إِلَيۡهِ جَمِيعٗا ﴿١٧٢﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ
ٱسۡتَنكَفُواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ فَيُعَذِّبُهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَلَا
يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٧٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ
قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ﴿١٧٤﴾
فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ فَسَيُدۡخِلُهُمۡ فِي
رَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَفَضۡلٖ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ﴿١٧٥﴾



﴿١٧١﴾ هەی خودانێت کتێبان [مەخسەد فەلەنە] هوین
توندییێ د دینێ خۆدا نەکەن [کا دینێ هەوە یێ چاوایە
وەسا وەربگرن، عیسا پێغەمبەرە و بەندەیێ خودێیە، و
حاشا نەکورێ خودێیە]. و ژ ڕاستی و هەقییێ پێڤەتر
د ڕاستا خودێدا نەبێژن، ب ڕاستی هندی عیسایە
مەسیحێ کورێ مەریەمێ، پێغەمبەرێ خودێیە و ب
پەیڤا خۆ [ببە] چێکرییە، کو ئاراستەی مەریەمێ
کربوو، و ئەو جانەکە ژ خودێ. ڤێجا باوەرییێ ب
خودێ و پێغەمبەرێت وی بینن، و هوین [د دەرهەقێ
خودێدا نەبێژن] [خودێ] سێنە، ڤێ ئاخڤتنێ بهێلن،
بۆ هەوە چێترە. ب ڕاستی خودێ پەرستییەکێ تەك و
تنێیە، یێ پاك و پاقژ و بلندە ژ هندێ کو زارۆکەك بۆ
هەبیت. و کا چ د ئەرد و ئەسماناندا هەیە یێ خودێیە و
بەسە کو ڕاگر و ڕێڤەبەرێ [ئەرد و ئەسمانانە و هەچییێ
تێدا هەی]. ﴿١٧٢﴾ عیسا خۆ مەزن ناکەت کو بەندەیێ
خودێ بیت و ملیاکەتێت نێزیکێت خودێ ژی، و هەر
کەسێ خۆ ژ پەرستنا وی بلندتر لێ بکەت و خۆ مەزن
بکەت، ب ڕاستی خودێ دێ وان هەمییان ل دەڤ خۆ
کۆمکەت. ﴿١٧٣﴾ ڤێجا ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت قەنج کرین، ئەڤانە خودێ دێ کرییا وان
دەتێ، و ژ کەرەما خۆ هێژ پتر دێ دەتێ، بەلێ ئەوێت خۆ بلند دیتین و خۆ مەزنکرین، ئێدی خودێ دێ
وان ب بەر ئیزایەکا ب ژان ئێخیت. و ژ بلی خودێ چو هاریکار و پشتەڤانان بۆ خۆ نابینن. ﴿١٧٤﴾ گەلی
مرۆڤان ب ڕاستی نیشان و بەلگەیەکا گۆمانبڕ ژ لایێ خودایێ هەوەڤە بۆ هەوە هات [کو پێغەمبەرە و چو
هێجەتان بۆ هەوە نەهێلیت، هەمی تشتان بۆ هەوە ڕاست و دورست دیار بکەت]، و مە ڕۆناهییەکا ڕۆنکەر
[کو قورئانە] بۆ هەوە هنارت. ﴿١٧٥﴾ ڤێجا ئەوێت باوەری ب خودێ ئینایین و خۆ ب وێ باوەرییێ و
قورئانێڤە گرتین. خودێ وان دێ گەهینیتە دلۆڤانی [بەحەشتا] و کەرەما خۆ و دێ وان ڕاستەڕێ کەت.

يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِۚ إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ
لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن
لَّمۡ يَكُن لَّهَا وَلَدٞۚ فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَۚ
وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ
يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ أَن تَضِلُّواْۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ١٧٦

سُورَةُ المَائدَة

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ أُحِلَّتۡ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلۡأَنۡعَٰمِ
إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ غَيۡرَ مُحِلِّي ٱلصَّيۡدِ وَأَنتُمۡ حُرُمٌۗ إِنَّ ٱللَّهَ
يَحۡكُمُ مَا يُرِيدُ ١ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ
وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَلَا ٱلۡهَدۡيَ وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ
ٱلۡحَرَامَ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗاۚ وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْۚ
وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ أَن
تَعۡتَدُواْۘ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ
وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢

نصف الحزب ١١





﴿١٧٦﴾ [هەی موحەمەد] پسیارا میراتێ وی مری ئەوێ نە باب و باپیر و نە کور و نە نەڤی هەین، ژ تە دکەن [کا چاوانە] بێژە: ژ خۆ خودێ دێ بۆ هەوە میراتێ وی دیارکەت، ئەگەر مرۆڤەك مر و چو زارۆك و نەڤی [دویندەهـ] نەبن و چو باب و باپیر ژی نەبن و خویشکەکا [دەیبابی یان یا بابێ نەیا دەیکێ ب تنێ] هەبیت، نیڤا میراتێ وی بۆ خویشکا ویـیە، و ئەگەر خویشك مر و چو دویندەهـ و باب و باپیر نەبن، برا دبیتە میراتخۆرێ وێ، و ئەگەر ژ دو خویشکان و پتر بن، دوسێکا میراتی بۆ وانە، و ئەگەر خویشك و برا دگەلێك بن، بارا برایی تەمەتی بارا دو خویشکانە. دا هوین ماڤێ کەسێ نەخۆن و د سەردا نەچن، خودێ بۆ هەوە رۆن دکەت، و ب ڕاستی خودێ ب هەمی تشتان یێ زانا و ئاگەهدارە.

## سۆرەتا مائیده

### ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (١٢٠) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ گەلی ئەوێت هەوە باوەری ئینایین، سۆز و پەیمانێت خودێ ژ هەوە وەرگرتین، ب جهـ بینن، گیاندارێت راگرتنێ یێت گیاخۆر [وەکی کەوالی و حێشتران و چێلان] بۆ هەوە دورست بوون، ژ بلی ئەڤێت دێ بۆ هەوە ئێنە خواندن، و دیسا ژ بلی نێچیرکرنا وان و هوین د ئیحرامان‌دا [بۆ حەجێ یان عومرەیێ] و نێچیرێ بۆ خۆ دورست نەکەن و هوین د ئیحرامان‌دا. ب ڕاستی خودێ چ بڤێت دێ بریارێ پێ دەت و حوکمی پێ کەت. ﴿٢﴾ گەلی ئەوێت هەوە باوەری ئینایین، نەدەنە سەر ڕێ و نیشانێت دینێ خودێ، و حورمەتا هەیڤێت حەرامکری و ب ڕویمەت [کو (زی القعدە)، و (زی الحجە)، و موحەرەم، و ڕەجەبن] نەشکێنن [و شەڕی تێدا نەکەن] و ڕێکا قوربانان و تەرشێت ڕستك د ستۆیدا [کو دیارینە بۆ کەعبەیێ] نەگرن، و بۆ خۆ دورست نەکەن، و بۆ خۆ دورست نەکەن هوین ڕێکا وان بگرن، ئەوێت ژ بەر دەستڤەئینانا کەرەم و ڕازیبوونا خودایێ خۆ قەستا مالا خودێ دکەن. هەر وەختێ هوین ژ ئیحرامان دەرکەڤتن ڤێجا نێچیرا خۆ بکەن. و بلا نەڤیانا هەوە بۆ دەستەکێ کو [سالا حودەیبییە] ڕێکا کەعبەیێ ل هەوە گرتبوو وە ل هەوە نەکەت هوین دەستدرێژییێ بکەن، و ل سەر باشی و پارێزکاریا خودێ هاریکارێت ئێك بن. و ل سەر گونەهـ و دەستدرێژییێ هاریکارێت ئێك نەبن. و پارێزکاریا خودێ بکەن، و ب ڕاستی جزایێ خودێ جزایەکێ دژوارە.

حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ
وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ
ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيۡتُمۡ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ
بِٱلۡأَزۡلَٰمِۚ ذَٰلِكُمۡ فِسۡقٌۗ ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا
تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ
نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ
غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣﴾ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ
أُحِلَّ لَهُمۡۖ قُلۡ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَمَا عَلَّمۡتُم مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ
مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُۖ فَكُلُواْ مِمَّآ أَمۡسَكۡنَ عَلَيۡكُمۡ
وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٤﴾
ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ
وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ
مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ
مُحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖۗ وَمَن يَكۡفُرۡ
بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٥﴾



﴿٣﴾ [گۆشتێ] مراران و خوین [یا ڕۆن] و گۆشتێ
بەرازان و یێ نە ژ بۆ خودێ هاتییە سەرژێکرن و
[گۆشتێ] تەرشا هاتییە فەتساندن، و [گۆشتێ تەرشا]
ب داروبەران هاتییە کوشتن و [گۆشتێ تەرشا] کەڤتی
[و مری] و [گۆشتێ تەرشا] ب قۆچان مربیت و
[گۆشتێ] دەهبەیان خواری، ئەو نەبیت یا هوین ڤێڕا
دگەهن و ڤەدکوژن، و [گۆشتێ تەرشا] کو ل سەر
کەڤرێت چکلاندی دئێتە ڤەکوشتن، ل سەر هەوە
هاتە حەرامکرن، دیسا هوین بەخت و ئێغبالا خۆ
ژ فالڤەگرتنێ بخوازن ل سەر هەوە هاتە حەرامکرن
[ژ ڕێز و سەروبەرێت عەرەبان ئەو بوو ئەگەر وان کارەك
ل بەربایە چ وەغەربایە چ ژنئینان یان هەر تشتەکێ دی،
بەختێ خۆ ب ڕێکا فالڤەگرتنێ دجەڕباندن، سێ تیر
هەبوون ل سەر ئێکێ نڤیسی بوو، «خودێ فەرمانا من
دکەت»، یا دووێ «خودێ من ناهێلیت» و یا سێیێ یا
بێ نڤێسین بوو، و دا ئێکی ژ کاڤلانکی کێشن، ئەگەر
دەرکەڤتبایە «بکە»، دا کەت و ئەگەر دەرکەڤتبا «نەکە»،
نەدکر، و ئەگەر یا بێ نڤێسین بایە دا کەتە د ناڤدا و
جارەکا دی کێشیت]، و کارئینانا ڤێ گونەهێ دەرکەڤتنە ژ ڕێکا ڕاست، ئەڤرۆ ئەوێت گاوربووین یێت بێ
هیڤی بووین دینێ هەوە پویچ بکەن، و هەوە ژێ دەربێخن، ڤێجا هوین ژ وان نەترسن و ژ من بترسن، ئەڤرۆ
من دینێ هەوە تەمام کر [کێماسی تێدا نەمایە ژ بەر هندێ نابیت چو ژێ بێتە کێمکرن و چو لێ زێدە ببیت] و
من خنێك و کەرەمێت خۆ بۆ هەوە تەکووزکرن. [بگرە ژ ڕاستەڕێکرنێ و تەکووزکرنا دینی و ڤەکرنا مەکەهێ
و بێ هیڤیکرنا گاوران ژ دینێ هەوە کو بشێن پویچکەن و نەهێلن] و من دینێ ئیسلامێ بۆ هەوە هەلبژارت و
ئەو دینە ل دەڤ خودێ و چێێت دی نە، بەلێ هەر کەسێ ژ برساندا نەچار ببیتە [خوارنا مراری و نەدورستکری
یێت د دویڤدا] بێی کو دل ل سەر گونەهێ هەبیت [و بخۆت گونەه ل سەر نینە] ب ڕاستی خودێ گونەهـ
ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٤﴾ [هەی موحەمەد] ئەو ژ تە دپرسن کا چ بۆ وان هاتییە دورستکرن [حەلالکرن] بێژە:
تشتێ پاقژ بۆ هەوە هاتە دورستکرن، و ئەو نێچیرا جانەوەرێت جەڕباندی [فێرکری وەکی سە و شاهینی] ب
وی شەرتی کو هوین فێری وێ بکەن یا خودێ نیشا هەوە دایی، [ئانکو ئەگەر گۆتێ هەڕە، بچیت، ئەگەر
گۆتێ وەرە بهێت، و ئەگەر گرت بۆ خودانێ خۆ بگریت، نە بۆ خۆ، و ئەگەر گۆتێ بهێلە، بهێلیت]. ڤێجا
ئەو نێچیرا بۆ هەوە دگرن، ناڤێ خودێ ل سەر بینن [وەختێ هوین دهنێرنێ، یان ڤێڕا دگەهن و ڤەدکوژن]
و بخۆن، و پارێزکارییا خودێ بکەن، ب ڕاستی خودێ د حسابێدا یێ دەست سڤکە. ﴿٥﴾ ئەڤرۆ تشتێ پاك
و پاقژ بۆ هەوە هاتە دورستکرن، و دەستکوژێ خودان کتێبان [ئانکو جوهی و فەلەیان] بۆ هەوە دورستە، و
یێ هەوە ژی بۆ وان یێ دورستە، و کچێت شەریف و پاك و پاقژ و ئازاد ژ موسلمانان، و کچێت دەهمەن پاقژ ژ
ئەوێت بەری هەوە کتێب بۆ هاتین [کو جوهی و فەلەنە] بۆ هەوە دورستە مار بکەن، ئەگەر هوین مەهرا وان
بدەنێ، و د دەهمەن پاقژ بن، و زناکەر نەبن، و وان ب دزیڤە بۆ خۆ نەکەنە یار، و هەر کەسێ شوینا باوەرییێ
بینیت گاور ببیت، بێ گۆمان وی کار و کریارێت خۆ پویچ کرن، و ڕۆژا قیامەتێ ژی ئەو یێ بەرزیانە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ
وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ
وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ
وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ
ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا
طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ
لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ
وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٦
وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِي وَاثَقَكُم
بِهِۦٓ إِذۡ قُلۡتُمۡ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ
بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ
لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ
أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ
ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ٨ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٞ ٩



﴿٦﴾ گەلی خودان باوەران، ئەگەر هەوە ڤیا ڕابن نڤێژێ بکەن [و هوین یێت بێ دەستنڤێژ بن] ئێدی هوین سەروچاڤێت خۆ و دەستێت خۆ هەتا ئەنیشکا بشۆن، و سەرێ خۆ ڤەمالن، و پێیێت خۆ هەتا گوزەکان بشۆن، و ئەگەر هوین د بێ نڤێژ بن [ب جەنابەت بن] خۆ بشۆن، و ئەگەر هوین د نەساخ بن، یان ل سەر وەغەرێ بن، یان ئێك ژ هەوە ژ تارەتێ [دەستاڤێ] هات، یان هوین چۆبنە نڤینا ژنێ، و ئاڤ ب دەست هەوە نەکەڤت [کو تێرا هەوە بکەت دەستنڤێژێ پێ بگرن یان سەرێ خۆ پێ بشۆن]، ب ئاخەکا پاقژ تەیەمومێ بکەن، و سەروچاڤ و دەستێت خۆ پێ ڤەمالن، خودێ [ب ڤێ فەرمانێ کو هوین ب ئاڤێ یان ب ئاخێ خۆ پاقژ بکەن، وەختێ هەوە دڤێت نڤێژان بکەن یان ب هەمی فەرمانێت خۆ] نەڤێت بەرتەنگی و زەحمەتێ بۆ هەوە چێکەت، بەلێ دڤێت هەوە ژ گونەهان پاقژ بکەت و خنێکێت خۆ ل سەر هەوە تەمام بکەت، دا هوین سوپاسیا وی بکەن. ﴿٧﴾ [گەلی خودان باوەران] خنێك و کەرەمێت خودێ و وێ پەیمانا خودێ د گەل هەوە گرێدایی بیننە بیرا خۆ [کو پەیمانا عەقەبەیە] وەختێ هەوە گۆتی مە بهیست و مە گوهداری کر، و پارێزکاریا خودێ بکەن، بێ گۆمان خودێ ب ئاگەهە ژ وێ یا د سنگ و دلاندا ڤەشارتی. ﴿٨﴾ گەلی خودان باوەران ل بەر فەرمانا خودێ د ڕاوەستیایی بن [و هەمی تشتان ژ بۆ خودێ پێ ڕابن]، و ب ڕاستی شادەییێ بدەن، و بلا نەڤیانا هەوە بۆ دەستەکەکێ، هەوە پال نەدەت هوین دادوەرییێ [عەدالەتێ] نەکەن، [بلا هەوە نەڤێن ژی] و دادوەرییێ بکەن ئەو نێزیکترە بۆ پارێزکارییێ، و پارێزکاریا خودێ بکەن، ب ڕاستی کارێ هوین دکەن خودێ پێ ئاگەهە. ﴿٩﴾ خودێ پەیمانا داییە ئەوێت باوەری پێ ئینایین و کار و کریارێت قەنج کرین، کو گونەهـ ژێبرن و خەلاتەکێ مەزن بارا وانە.

وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ
ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ هَمَّ قَوۡمٌ أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ
فَكَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ
ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١١﴾ ۞وَلَقَدۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ
وَبَعَثۡنَا مِنۡهُمُ ٱثۡنَيۡ عَشَرَ نَقِيبٗاۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي
مَعَكُمۡۖ لَئِنۡ أَقَمۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيۡتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ
وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرۡتُمُوهُمۡ وَأَقۡرَضۡتُمُ ٱللَّهَ قَرۡضًا
حَسَنٗا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّكُمۡ
جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ فَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ
مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٢﴾ فَبِمَا نَقۡضِهِم
مِّيثَٰقَهُمۡ لَعَنَّٰهُمۡ وَجَعَلۡنَا قُلُوبَهُمۡ قَٰسِيَةٗۖ يُحَرِّفُونَ
ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ
بِهِۦۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٖ مِّنۡهُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۖ
فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣﴾

ثلاثة أرباع الحزب ١١



﴿١٠﴾ بەلـێ ئەو كەسـێت گاوربوویـین و ئایەتێت مە درەو
دەرئێخستین، ئـەو دۆژەهینـە [جەهنەمینـە]. ﴿١١﴾ گـەلی
خـودان بـاوەران قەنجیــیا خـودێ د گـەل هـەوە كـری
بیننـە بـیرا خۆ، وەختـێ دەسـتەكەكێ ڤیایی دەسـتێت خۆ
ب خرابیــیێ درێـژ بكەنـە هـەوە، دەسـتێت وان ژ هـەوە
دانـە پـاش، و پارێزكاریــیا خـودێ بكەن، و بـلا خودان
بـاوەر پشـتا خـۆ ب خـودێ موكـوم بكـەن. ﴿١٢﴾ بـێ
گۆمـان خـودێ پەیمانا موكـوم ژ ئسرائیلیــیان وەرگرت،
و دوازدە شـاهد و بەرپـرس ناڤداركـرن و بـۆ هنارتـن، و
خـودێ گۆتە وان ب ڕاسـتی ئـەز پشـتەڤان و هاریكارێ
هەوەمـە، ئەگـەر هویـن نڤێـژان ب دورسـتایی بكـەن، و
زەكاتـا مالـێ خـۆ بـدەن، و باوەریــیێ ب پێغەمبەرێـت
مـن بینـن و پشتەڤانیــیا وان بكـەن و قـەدرێ وان بگرن،
و قەرەكـی بـاش د گـەل خـودێ بكـەن [ئانكـو خـێر و
خێراتـان د ڕێـكا خودێـدا بكـەن]. ب ڕاسـتی ئـەز دێ
گونەهێـت هـەوە ژێ بـەم و دێ هـەوە ئێخمـە د وان
بەحەشـتاندا ئەوێـت ڕوبیـار د بنـڕا دهەڕكـن، ڤێجـا
هەچیـێ پشـتی ڤـێ گـاور ببیـت بـێ گۆمـان وی ڕێـكا
ڕاسـت بـەرزە كـر. ﴿١٣﴾ و ژ بـەر شـكاندنا وان بۆ سـۆز و پەیمانێت خـۆ، مە لەعنـەت ل وان كر [مە ژ دلۆڤانیــیا
خـۆ دویرئێخسـتن] و مـە دلـێ وان ڕەق كـر، تەوراتـێ ڤـاڕێ دكـەن و دگوهـۆرن، و پشـكەكا بـاش [ژێ] كـو
فەرمانـا وان پـێ دهاتەكـرن، هێـلان و ژ بیرا خۆ برن، [هـەی موحەممەد] كێمـەك ژ وان نەبن [ئەو ژی ئەون یـێت
موسـلمان بوویــین] یێـت دی بـەردەوام دێ خیانەتێ [و شـكاندنا سـۆز و پەیمانان هەتـا ڕۆژا قیامەتـێ] ژێ بینی،
ڤێجـا لـێ ببۆرە و چاڤێـت خـۆ ژێ بگـرە. ب ڕاسـتی خـودێ حـەژ قەنجیـكاران دكـەت.

وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ فَنَسُواْ
حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ
وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ
بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ١٤ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ
جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا
كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖۚ
قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ١٥
يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ
وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ
وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ١٦ لَّقَدۡ كَفَرَ
ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ
قُلۡ فَمَن يَمۡلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا إِنۡ أَرَادَ أَن يُهۡلِكَ
ٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ
جَمِيعٗاۗ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۚ
يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٧



﴿١٤﴾ ژ وان ژی ئەوێت گۆتین، ئەم هاریکار و پشتەڤانێت عیساینە، مە پەیمان وەرگرت، پشکەکا باش ژێ ئەڤا پەیمان ل سەر هاتییە ستاندن ب پشت گوهێ خۆڤە هاڤێتن و ژ بیرکرن، [و ژ بەر هندێ] مە دژمناتی و نەڤیان ئێخستە د ناڤ واندا هەتا ڕۆژا قیامەتێ، و خودێ دێ وان ب کار و کریارێت وان کرین ئاگەهدار کەت [و دێ جزایێ شکاندنا پەیمانا خۆ خۆن]. ﴿١٥﴾ گەلی خودان کتێبان ب ڕاستی پێغەمبەرێ مە [موحەمەد] بۆ هەوە هات، دا گەلەکا هەوە ژ کتێبێت خۆ ڤەشارتی [وەکی سالۆخێت پێغەمبەری، بڕیارا ڕەجمێ، سەرهاتییا خودانێت شەنبییێ... هتد.] ئاشکەرا بکەت، و ژ گەلەکێ ژی دبۆریت [ئەوا هوین ژ تەورات و ئنجیلێ ڤەدشێرن، ئاشکەرا ناکەت]. ب سویند ژ دەڤ خودایێ هەوە ڕۆناهییەك [کو پێغەمبەرە] و کتێبەکا ئاشکەراکەر [کو قورئانە] بۆ هەوە هات. ﴿١٦﴾ خودێ ب وێ [کتێبێ] ئەوێت ب دویڤ ڕازیبوونا خودێ دکەڤن ڕاستەڕێ دکەتە ڕێکا سلامەتییێ و ڕزگاربوونێ، و وان ب دەستویرا خۆ ژ تاریستانان دەردئێخیتە بەر ڕۆناهییێ، و وان ڕاستەڕێ دکەت. ﴿١٧﴾ ب ڕاستی ئەوێت گۆتین: مەسیحێ کوڕێ مەریەمێ خودێیە ئەو گاوربوون [ژ بەر ڤێ گوتنێ]. [هەی موحەمەد] بێژە وان: ئەرێ ئەگەر خودێ بڤێت، عیسایێ کوڕێ مەریەمێ و دەیکا وی، و هندی د ئەردیدا هەیین بەرزیان و وێران بکەت، کی دشێت نەهێلیت و خۆ بدەتە بەر بڕیارا خودێ؟ و سەر و سامانێ ئەرد و ئەسمانان و تشتێ د ناڤبەرا هەردووکاندا هەر یێ خودێیە، چ یا بڤێت دێ چێکەت. نێ خودێ ل سەر هەمی تشتان دەستهەلاتدار و خودان شیانە.

وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥۚ قُلۡ
فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُمۖ بَلۡ أَنتُم بَشَرٞ مِّمَّنۡ خَلَقَۚ يَغۡفِرُ لِمَن
يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ
وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٨﴾ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ
رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُواْ مَا جَآءَنَا
مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ
شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٩﴾ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ ٱذۡكُرُواْ
نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَعَلَ فِيكُمۡ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكٗا
وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمۡ يُؤۡتِ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَٰقَوۡمِ ٱدۡخُلُواْ
ٱلۡأَرۡضَ ٱلۡمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِي كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَرۡتَدُّواْ
عَلَىٰٓ أَدۡبَارِكُمۡ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ
فِيهَا قَوۡمٗا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَا حَتَّىٰ يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِن
يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ
أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ فَإِذَا دَخَلۡتُمُوهُ فَإِنَّكُمۡ
غَٰلِبُونَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٣﴾



﴿١٨﴾ جوهی و فەلە دبێژن: ئەم زارۆکێت خودێ و خۆشڤیێت وینە، بێژە: [ئەگەر وەیە وەکی هوین دبێژن] پا بۆچی هەوە ب گونەهێت هەوە ئیزا ددەت، بەلێ هوین مرۆڤن وەکی هەمی مرۆڤێت خودێ چێکرین. ڤێجا یێ وی بڤێت لێ ناگریت، و یێ بڤێت دێ ئیزا دەت. و سەر و سامانێ ئەرد و ئەسمانان و تشتێ د ناڤبەرا واندا هەر یێ خودێیە، و [بزانن] دویماهیك هەر خودێیە هوین لێ بزڤرنەڤە. ﴿١٩﴾ گەلی خودان کتێبان: دا هوین نەبێژن [پشتی ڤەبرینا پێغەمبەران] چو مزگینئین و ئاگەهدارکەر بۆ مە نەهاتینە، پێغەمبەرێ مە، پشتی ڤەبرین و سستبوونا هنارتنا پێغەمبەران بۆ هەوە هات دا کاروبارێت دینی بۆ هەوە ئاشکەرا بکەت، بێ گۆمان مزگینئین و ئاگەهدارکەر بۆ هەوە هات، و خودێ ل سەر هەمی تشتان دەستهەلاتدارە. ﴿٢٠﴾ [گەلی ئسرائیلیان] بینە بیرا خۆ دەمێ مووسایی گۆتییە ملەتێ خۆ: ملەتێ من بیرا خۆ ل وان خێر و خۆشیێت خودێ د گەل هەوە کرین بینن، وەختێ پێغەمبەر ژ هەوە ڕاکرین، و هندەك ژ هەوە کرینە میر و مەلك [یان هوین خانەدان و حالخۆش کرن، ب ژن و مال و خدام و خولام ئێخستن]. و ئەو قەدر دا هەوە یێ نەدایییە کەسێ ژ دنیایێ هەمییێ. ﴿٢١﴾ ملەتێ من هەرنە سەر ئەردێ پیرۆز [کو قودسە] ئەوێ خودێ بۆ هەوە نڤیسی [ئەڤە هندی ئەو د چاك و باش بوون، بەلێ وەختێ خراب بووین ژێ هاتنە دەرئێخستن]. و ب پاشدا نەزڤرن ژ ترساندا، هوین دێ خوسارەت بن. ﴿٢٢﴾ گۆتن: یا مووسا ب ڕاستی هندەك کەسێت ب هێز و زەبردەست تێدانە، و ئەم ناچینە تێدا هەتا ئەو ژێ دەرنەکەڤن، و ئەگەر ئەو ژێ دەرکەڤتن ئەم دێ چینە تێدا. ﴿٢٣﴾ دو زەلامان ژ وان ئەوێت ژ خودێ دترسن، و خودێ کەرەم د گەل کری گۆتن: [ژ هێز و کەلەخ و مەزنییا وان نەترسن] ب سەر واندا بگرن د دەرگەهیدا، ڤێجا ئەگەر هوین چۆنە تێدا دێ ئەو شکێن و هوین دێ ب سەرکەڤن. و پشتا خۆ ب خودێ موکوم بکەن ئەگەر هوین خودان باوەر بن.

قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا مَّا دَامُواْ فِيهَا فَٱذۡهَبۡ
أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ٢٤ قَالَ رَبِّ إِنِّي
لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ
ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٥ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ
يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٦
الحزب ١٢ ۞وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا فَتُقُبِّلَ
مِنۡ أَحَدِهِمَا وَلَمۡ يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ قَالَ لَأَقۡتُلَنَّكَۖ
قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ٢٧ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ
لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ
رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢٨ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ
مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ٢٩ فَطَوَّعَتۡ
لَهُۥ نَفۡسُهُۥ قَتۡلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٣٠
فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابٗا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي
سَوۡءَةَ أَخِيهِۚ قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا
ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ٣١





﴿٢٤﴾ گۆتن: هەی مووسا ب ڕاستی هندی ئەو تێدا بن، ئەم قەت ناچینە تێدا [مەخسەد باژێرێ قودسێیە] تو و خودایێ خۆ هەڕن شەڕی بکەن ئەم دێ ل ڤێرێ د ڕوینشتی بین [ئانکو تو و خودایێ خۆ وان دەربێخن، مە تاقەتا وان نینە]. ﴿٢٥﴾ [مووسایی گۆت:] خودێوۆ بەس من شۆلە ب خۆ و برایێ خۆ هەیە، ڤێجا ناڤبەرا مە و ڤی ملەتێ ژ ڕێ دەرکەڤتی ناڤبڕ بکە. ﴿٢٦﴾ [خودێ] گۆت: ئەو ئەرد هەتا چل سالان ل وان حەرامە و نەدورستە، د ئەردیدا بزڤڕن و نەکەڤنە ل سەر چو ڕێکان [ئانکو هەتا چل سالێت دی ئەو دێ ل وێ دەشتێ مینن بەرزە و ناچنە د باژێرێ قودسێدا]. ڤێجا خەمێ بۆ ملەتێ گاور نەخۆ. ﴿٢٧﴾ سالۆخێ کوڕێت ئادەم ب دورستی ل سەر وان بخوینە، هەر ئێکی ژ وان قوربانەك دابوو، ژ ئێکی هاتە وەرگرتن و ژ یێ دی نەهاتە وەرگرتن، [ئەوێ قوربانێ وی نەهاتییە وەرگرتن] گۆت: بێ گۆمان ئەز دێ تە کوژم. [برایێ وی ئەوێ قوربانێ وی هاتییە وەرگرتن] گۆت: هندی خودێیە ب ڕاستی بەس ژ پارێزکاران وەردگریت. ﴿٢٨﴾ ئەگەر تو دەستێ خۆ درێژکەیە من، دا من بکوژی، ئەز دەستێ خۆ درێژ ناکەمە تە دا تە بکوژم، ب ڕاستی ئەز ژ خودایێ هەمی جیهانێ دترسم. ﴿٢٩﴾ و من دڤێت تو گونەها من و خۆ هەلگری، و ببییە دۆژەهی. نێ هەر ئەڤەیە جزایێ ستەمکاران. ﴿٣٠﴾ دلێ وی گرت برایێ خۆ بکوژیت و گوهداریا دلێ خۆ کر و برایێ خۆ کوشت. ڤێجا بوو ژ وان یێت خوسارەت. ﴿٣١﴾ ئێدی خودێ قڕەك هنارت و ب دمێ خۆ ئەرد کۆلا، دا نیشا بدەت کا دێ چاوا تەرمێ برایێ خۆ ڤەشێریت، گۆت: خۆلی ب سەرێ من، من نەشیا ئەز وەکی ڤێ قڕێ ژی بم تەرمێ برایێ خۆ ڤەشێرم، ڤێجا بوو ژ پەشێمانان.

مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ
نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ
ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ
جَمِيعًا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا
مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾ إِنَّمَا
جَزَٰٓؤُا۟ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِى
ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓا۟ أَوْ يُصَلَّبُوٓا۟ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ
وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ ۚ ذَٰلِكَ
لَهُمْ خِزْىٌ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾
إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهِمْ ۖ فَٱعْلَمُوٓا۟
أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟
ٱللَّهَ وَٱبْتَغُوٓا۟ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُوا۟ فِى سَبِيلِهِۦ
لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ أَنَّ لَهُم
مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفْتَدُوا۟ بِهِۦ مِنْ
عَذَابِ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٣٦﴾



﴿٣٢﴾ ژ بەر ڤێ [كوشتنا كورێت ئادەمی بۆ ئێكدو]
مە ل سەر ئسرائیلیان نڤێسییە، ب ڕاستی هەر كەسێ
مرۆڤەكی بێ بەرانبەر یان ژی ژ بۆ خرابییێ د ئەردیدا
بكوژیت، هەروەكی وی هەمی مرۆڤ كوشتین،
و هەر كەسێ ببیتە ئەگەرێ ژیانا ئێكی هەروەكی
بوویە ئەگەرێ ژیانا هەمی مرۆڤان، ب ڕاستی
پێغەمبەرێت مە بۆ وان ب نیشانێت ئاشكەراكەر هاتن،
پاشی ب ڕاستی پشتی هاتنا وان ژی [یا پێغەمبەران
ژی] گەلەك ژ وان زێدە خرابییێ د ئەردیدا دكەن.
﴿٣٣﴾ ب ڕاستی ئەوێت دژاتی و شەڕی د گەل
خودێ و پێغەمبەرێ وی دكەن، و د ئەردیدا دگەڕن
دا خرابییێ تێدا بكەن، جزایێ وان ئەوە بێنە كوشتن
یان ب دارانڤە بێنە هلاویستن، یان ژی دەست و
پییێت وان چەپ و ڕاست بێنە ژێڤەكرن، یان ژی ژ
وەلاتی خۆ بێنە دویرئێخستن، ئەڤ جزایە د دنیایێدا
بۆ وان هەتكبەرییە، و د ڕۆژا قیامەتێدا ئیزایەكا مەزن
بۆ وان هەیە. ﴿٣٤﴾ ژ بلی وان ئەوێت ل خۆ زڤڕین و
تۆبەكرین، بەری هوین بشێن بگرن [و جزا بكەن]،
بزانن ب ڕاستی خودێ لێنەگر و دلۆڤانە. ﴿٣٥﴾ گەلی خودان باوەران، پارێزكارییا خودێ بكەن، دا هوین
بگەهنە ڕازیبوونا وی ل ڕێكان بگەڕن، [ئانكو ڕێكێت ڕازیبوونا وی بگرن و لێ بگەڕن] و جیهادێ د ڕێكا
خودێدا بكەن، دا هوین سەرفەراز ببن. ﴿٣٦﴾ ب ڕاستی ئەوێت گاوربووین، ئەگەر هندی د ئەردیدا یێ وان
بیت و هندی دی ژی دگەل، دا پێش خۆڤە بدەن، و ژ ئیزایا ڕۆژا قیامەتێ ڕزگار ببن، ژ وان نائێتە وەرگرتن
[و ئەو ژ وێ ئیزایێ ڕەها نابن] و ئیزایەكا ب ژان بارا وانە.

يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنْهَا ۖ
وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ٣٧ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟
أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ
حَكِيمٌ ٣٨ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعْدِ ظُلْمِهِۦ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ
يَتُوبُ عَلَيْهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ٣٩ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ
لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغْفِرُ
لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ٤٠ ۞ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ مِنَ
ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ ۛ وَمِنَ
ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ ۛ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوْمٍ
ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ ۖ
يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ
فَٱحْذَرُوا۟ ۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ
شَيْـًٔا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمْ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ ۚ لَهُمْ
فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ٤١

ربع الحزب ١٢





﴿٣٧﴾ وان دڤێت [رۆژا قیامەتێ] ژ ئاگری دەرکەڤن، بەلێ ئەو ژێ دەرناکەڤن و بۆ وان ئیزایەکا ب دۆم و بەردەوام هەیە. ﴿٣٨﴾ و زەلامێ دز و ژنا دز دەستێت وان [د گرێچکێڕا] ببڕن، جزایێ کارێ وان کری، و ئەڤە پاشڤەبرنەکە ژ خودێ [دا ئەو ب پاشڤە بچن و دزییێ نەکەن و خەلك وان بۆ خۆ بکەنە چامە]، و خودێ ب خۆ ژی سەردەست و کاربنەجهە. ﴿٣٩﴾ ڤێجا هەر کەسێ [دزەکی] پشتی [ب دزییا خۆ] ستەم ل خۆ کری، پەشێمان ببیت و ل خۆ بزڤریت و تۆبە بکەت و خۆ چێکەت و باش بکەت، ب ڕاستی خودێ دێ تۆبەیێ دەتە سەر، ب ڕاستی خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٤٠﴾ ما تو نزانی کو ب ڕاستی سەر و سامانێ ئەرد و ئەسمانان یێ خودێیە، یێ بڤێت دێ ب بەر ئیزایێ ئێخیت، یێ بڤێت دێ ئازاکەت، و خودێ ب خۆ ژی ل سەر هەمی تشتان یێ دەستهەلاتدارە. ﴿٤١﴾ هەی پێغەمبەر، بلا تە ب خەم نەئێخن ئەوێت خۆش ب بەر گاورییێڤە دچن [ژ دوڕوییان] ئەوێت سەردەڤ دبێژن: باوەری مە ئینایییە، و ئەو ب خۆ هێژ دلێت وان د بێ باوەرن، و دیسا [بلا تە ب خەم نەئێخن] ئەوێت بوویینە جوهی، زێدە گوهدارییا درەوان دکەن، و گوهدارییێ بۆ دەستەکەکا دی دکەن کو [ژ مەزناتیێ] نەهاتینە دەڤ تە، ئاخڤتنان ڤاڕێ دکەن و ژ جهێ وان دبەن، دبێژنە [هەڤالێت خۆ]: ئەگەر موحەمەد ب وێ هاتە هەوە یا مە ڤاڕێ کری ژێ وەرگرن، و ئەگەر ب وێ نەهاتە هەوە، هشیار بن [باوەر ژێ نەکەن] و یێ خودێ بەرزەبوون و گاوری بۆ ڤیایی، ڤێجا تو نابینی ئێك هەبیت تشتێ خودێ ڤیایی نەهێلیت چێ ببیت. ئەڤە ئەون یێت خودێ نەڤیایی دلێت وان پاقژ بکەت، ڕوی ڕەشی و شەرمزاری بۆ وان بیت د دنیایێدا و ئیزایەکا مەزن د ئاخرەتێ ژێدا بۆ وان هەیە.

سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ فَإِن جَآءُوكَ
فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن
يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗاۖ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ
إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴿٤٢﴾ وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ
وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوۡنَ مِنۢ بَعۡدِ
ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٣﴾ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ
فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ
لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن
كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَۚ فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ
وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم
بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ وَكَتَبۡنَا
عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ وَٱلۡعَيۡنَ بِٱلۡعَيۡنِ وَٱلۡأَنفَ
بِٱلۡأَنفِ وَٱلۡأُذُنَ بِٱلۡأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلۡجُرُوحَ
قِصَاصٞۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٞ لَّهُۥۚ وَمَن
لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾





﴿٤٢﴾ گوهداریـــیا درەوان دکەن، و بەرتیل و مالێ حەرام
و نەدورسـت دخـۆن، ڤێجـا ئەگـەر ئـەو هاتنـە دەڤ تـە
[دا حوکمی د ناڤبەرا واندا بکەی] ڤێجا تە دڤێت حوکمی
د ناڤبـەرا وانـدا بکـە و یان ڕویـیێ خـۆ ژێ وەرگـێڕە. د
بنـیڕا نەشـێن زیانەکـێ بگەهیننـە تـە، و ئەگـەر تـە حوکم
د ناڤبـەرا واندا کر، ڤێجـا حوکمـی ب دادوەری د ناڤبەرا
وانـدا بکە، ب ڕاسـتی خـودێ حـەژ دادوەران (عادلان)
دکـەت. ﴿٤٣﴾ و چـاوا ئـەو قەسـتا تـە دکـەن و حوکمێ
تـە دخـوازن؟! و تـەورات ل دەڤ وانـە، بڕیـارا خـودێ
تێدایـە [کا حوکمـێ زناکەری چیـیە] و پاشـی پشـتا خۆ
ددەنـە حوکمـێ تـە [ئـەوێ وەکـی یـێ تەوراتـێ]، و ب
ڕاسـتی ڤان بـاوەری نەئینایـیـیە و نە ژ خـودان باوەرانن.
﴿٤٤﴾ ب ڕاسـتی مە تەورات ئینایـیـیە خوار، ڕاسـتەڕێیی
و ڕۆناهـی تێدایـە، و پێغەمبەرێـت خـۆ سـپارتینە خودێ
ل دویـڤ تەوراتـێ حوکـم بـۆ جوهیـیان دکـرن، دیسـا
خودێنـاس و زانایـان ژی حوکـم ب وێ دکـر ئـەوا ژێ
هاتیـیە خواسـتن کو بپارێـزن ژ گوهۆڕیـن و ڤاڕێکرنێ،
و ئەو زێرەڤان بوون ل سـەر وان [ل سـەر جوهیـیان، دا
نەئێـتە گوهۆڕیـن]، [گەلی زانا و ڕێبەرێت جوهیـیان] ژ مرۆڤان نەترسـن [کـو ئەگەر هوین ڕاستیـیێ بێژن، دێ
زیانـێ گەهیننـە هـەوە]، و هویـن ژ من بترسـن، و ئایەتێت من ئـەرزان نەفرۆشـن، و هەر کەسـێ حوکمی ب وێ
نەکـەت یـا من ئینایـیـیە خوارێ ئـەو ژ گاورانە. ﴿٤٥﴾ و هەر د وێ [کتێـبێدا کو تەوراتە] مە ل سـەر ئسرائیلیـیان
نڤێسـی، جانێ کوشـتی [نەفسـا هاتیـیە کوشـتن] ب نەفسا کوژەکیـیە، و چاڤ ب چاڤیـیە، و دفن ب دفنێـیە و
گوهــب گوهیـیە، و ددان ب ددانیـیە، و برینـان تۆل یا تێدا [ئانکو برین ب برینێـیە و بەرانبـەری ئێکن]. و هەر
کەسـێ [مـافێ خـۆ بهێلیـت، و ل گونەهـکاری] ببۆریت [و تۆلێ لـێ ڤەنەکەت]، ئـەو لێبۆرین دێ بـۆ بیتە گونەهـ
ڕاکـەر. و هـەر کەسـێ حوکمـی ب ئەوا مە ئینایـیـیە خـوارێ نەکـەت، ئـەو ژ زۆردارانە.

وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ
مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا
لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾
وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم
بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ
ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ
وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ
عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ
وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ
فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم
بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ
بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم
بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكْمَ
ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾



﴿٤٦﴾ و د دویڤ وانڕا [پێغەمبەرێت ئسرائیلیان]، مە عیسایێ کوڕێ مەریەمێ هنارت، کو ڕاستدەرئێخێ کتێبا بەری خۆیە کو تەوراتە، و مە ئنجیل دایێ، ڕاستەڕێیی و ڕۆناهی تێدایە، و ڕاستدەرئێخا کتێبا بەری خۆیە، کو تەوراتە، و ڕاستەڕێیی و شیرەتە بۆ پارێزکاران. ﴿٤٧﴾ و خودانێت ئنجیلێ، بلا حوکمی ب وێ بکەن ئەوا خودێ د ئنجیلێدا ئینایییە خوار، و هەر کەسێ حوکمی ب وێ نەکەت ئەوا خودێ ئینایییە خوار، ئەو ژ ڕێکا ڕاست و باوەرییێ ڤەدەرن. ﴿٤٨﴾ [هەی موحەمەد] مە کتێب [کو قورئانە] ب هەقییێ بۆ تە هنارت، ڕاستدەرئێخا کتێبێت بەری خۆیە و شاهدە ل سەر وان [کا چ ڕاستە و چ نە، و کا چ ژێ هاتییە گوهۆڕین]، ڤێجا حوکمی ب ئەوا خودێ ئینایییە خوار د ناڤبەرا واندا بکە، و هەقییا بۆ تە هاتی کو قورئانە نەهێلە، و ب دویڤ دلخوازییا وان نەکەڤە. مە هەر ئێک ژ هەوە [مەخسەد پێ جوهی و فەلە و موسلمانن] ڕێکەك و بەرنامەیەك پێ دایێ، و ئەگەر خودێ ڤیابایە، دا هەمییان کەتە ئێك ملەت [ئێك دین و ئێك بەرنامە] دا هەوە ب ئەوا دایییە هەوە [کو هوین کرینە گەلەك دین] بجەڕبینیت، ڤێجا دەست ب خێران بکەن، و بکەنە بەڕەبەزینك. زڤڕینا هەوە هەمییان ب بال خودێڤەیە، ڤێجا [وێ ڕۆژێ، ڕۆژا قیامەتێ] ئەز دێ هەوە ب وی تشتێ هوین تێدا نەئێك و جودا ئاگەهدار کەم. ﴿٤٩﴾ [و مە ئەڤ قورئانە ب هەقییێ بۆ تە هنارتییە] دا تو حوکمی ب ئەوا خودێ بۆ تە ئینایییە خوار د ناڤبەرا واندا بکەی، و ب دویڤ دلخوازییا وان نەکەڤە، هشیار بە، نەکو ئەو بەرێ تە ژ هندەکا خودێ بۆ تە ئینایییە خوارێ وەرگێڕن، ڤێجا ئەگەر وان ڕوییێ خۆ ژ [حوکمێ] تە وەرگێڕان، بزانە خودێ دڤێت وان ب هندەك گونەهێت وان، ئێزا بدەت. ب ڕاستی گەلەك خەلك ژ ڕێکا ڕاست د ڤەدەرن. ﴿٥٠﴾ ئەرێ وان حوکمێ غەیری خودێ دڤێت؟! ما حوکمێ کێ ژ یێ خودێ چێترە، و ئەوێت موکوم باوەری ئینایین باش ڤێ دزانن.

نصف الحزب ١٢

* يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ
أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ
ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ يَقُولُونَ
نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ
فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ ٥٢ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ
أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ إِنَّهُمۡ لَمَعَكُمۡۚ حَبِطَتۡ
أَعۡمَٰلُهُمۡ فَأَصۡبَحُواْ خَٰسِرِينَ ٥٣ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ
مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ
عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا
يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ
عَلِيمٌ ٥٤ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ
ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمۡ رَٰكِعُونَ ٥٥ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ
وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ٥٦ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمۡ هُزُوٗا وَلَعِبٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ
ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَٱلۡكُفَّارَ أَوۡلِيَآءَۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٥٧



﴿٥١﴾ گەلی خودان باوەران، جوهی و فەلەیان بۆ خۆ نەكەنە دۆست و پشتەڤان، و ئەو خۆ ب خۆ پشتەڤانێت ئێكدونە، و هەچییێ ژ هەوە وان بۆ خۆ بكەتە دۆست و پشتەڤان. ڤێجا ب ڕاستی ئەو ژ وانە، و خودێ ملەتێ زۆردار ڕاستەڕێ ناكەت. ﴿٥٢﴾ ڤێجا تو دبینی ئەوێت نەساخی د دل و دەروونێ واندا هەی، بۆ دۆستینی و هاریكاریا وان ب لەزن، [د دلێ خۆدا] دبێژن: ئەم دترسین نەخۆشییەك بۆ مە چێ ببیت [كو هەوجەی وان ببین]. ڤێجا هیڤی هەیە، خودێ سەركەفتنەكێ یان ژی فەرمانەكێ ژ دەڤ خۆ [ب پاشڤەبرن و شكەستنا جوهییان و دیاركرنا نهێنییێت دورویان] بدەتە هەوە، ڤێجا ئەو [دوروی] ل سەر ئەوا د دلێ خۆدا ڤەشارتین [كو دۆستینی و هاریكاریا جوهییانە، ژ ترسا كو ڕۆژ ل موسلمانان بقولپیت] پەشێمان ببن. ﴿٥٣﴾ و ئەوێت باوەری ئینایین دێ بێژنە وان [جوهییان]: ئەوێت هەنێ بوون ژ هەمی دلێ خۆ سویند خوارین كو د گەل هەوەنە، كار و كریارێت وان پویچ بوون و ئەو ب خۆ ژی خوسارەت بوون. ﴿٥٤﴾ گەلی خودان باوەران هەچییێ ژ هەوە، ژ دینێ خۆ دەركەڤیت، [زیانێ ناگەهینیتە خودێ] خودێ دێ هندەكێت دی شوینا وان ئینیت، كو خودێ حەژ وان دكەت، و ئەو ژی حەژێ دكەن، د ڕاستا موسلماناندا خۆ دشكێنن و بەرانبەر گاوران خورت و سەربلندن، جیهادێ د ڕێكا خودێدا دكەن، و بۆ خودێ ژ لۆمەییا كەسێ ناترسن و پاكی پێ نینە، و ئەڤە كەرەما خودێیە، ددەتە وی یێ بڤێت، و خودێ [د دلۆڤانی و كەرەما خۆدا] یێ بەرفرەهـ و زانایە. ﴿٥٥﴾ ب ڕاستی پشتەڤانێ هەوە بەس خودێیە، و پێغەمبەرێ وی، و ئەوێت باوەری ئینایین، ئەون یێت بەردەوام نڤێژان دكەن، و زەكاتێ ددەن و خۆ بۆ خودێ دچەمینن و دشكێنن و ل بەر فەرمانا وی د ڕاوەستیایی. ﴿٥٦﴾ و هەر كەسێ خودێ و پێغەمبەرێ وی و موسلمانان بۆ خۆ بكەتە پشتەڤان و هاریكار، [بلا بزانیت] ب ڕاستی هاریكارێت دینێ خودێ و كۆما وی د سەركەفتینە. ﴿٥٧﴾ گەلی خودان باوەران هوین وان ئەوێت دینێ هەوە دكەنە ترانە و یاری، ژ ئەوێت بەری نوكە كتێب بۆ هاتین [مەخسەد جوهی و فەلەنە] و گاوران بۆ خۆ نەكەنە دۆست و هاریكار، و پارێزكاریا خودێ بكەن [ئانكو هشیار بن وان نەكەنە پشتەڤان و هاریكار و خۆشڤی] ئەگەر هوین خودان باوەر بن.

وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ
لَّا يَعْقِلُونَ ﴿٥٨﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا
بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٥٩﴾
قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ
عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ
مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾ وَإِذَا جَآءُوكُمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَقَد
دَّخَلُوا۟ بِٱلْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُوا۟ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا۟ يَكْتُمُونَ ﴿٦١﴾
وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَأَكْلِهِمُ
ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٦٢﴾ لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ
وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟
يَصْنَعُونَ ﴿٦٣﴾ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟
بِمَا قَالُوا۟ ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ ۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا
مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ۚ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ
وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا
ٱللَّهُ ۚ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٤﴾



﴿٥٨﴾ و وەختێ هوین بانگێ نڤێژێ ددەن، ئەو ترانە و یارییان بۆ خۆ پێ دكەن، چونكی ئەو ملەتەكێ نەفام و بێ ئەقلن. ﴿٥٩﴾ بێژە: خودان كتێبینۆ [مەخسەد جوهی و فەلەنە] هوین چو كێم و كاسییان ل سەر مە ناگرن، ئەو نەبیت كو مە باوەری ب خودێ ئینایییە، و ب وێ یا بۆ مە هاتییە خوارێ كو قورئانە، و ب وێ یا بەری نوكە [بۆ پێغەمبەران] هاتییە خوارێ، ئەڤە و باراپتر ژ هەوە ژ رێ دەركەڤتینە. ﴿٦٠﴾ [هەی موحەمەد] بێژە وان: ئەرێ ئەز بۆ هەوە بێژم كا كی ل دەڤ خودێ عەیبدارتر و ئیزا خرابترە؟! ئەوە یێ خودێ لەعنەت لێ كری، و ژ دلۆڤانییا خۆ دویر ئێخستی، و خودێ [ژ بەر گونەهێت وی] لێ كەربگرتی بوویی، و هندەك ژ وان كرینە مەیمونك و بەراز و كۆرە كۆلەیێت سەرگاوران، ئەڤان [رۆژا قیامەتێ] خرابترین جە بۆ وانە، و رێ بەرزەترن ژی. ﴿٦١﴾ ئەگەر بێنە دەڤ هەوە دێ بێژن: مە باوەری یا هەی [و ئەو ب خۆ نەوەسایە] ب راستی ئەو ب گاورییێڤە هاتن و هەر ب گاورییێ ژێڤە دەركەڤتن. و خودێ چێتر دزانیت كا چ ڤەدشارتن. ﴿٦٢﴾ و تو دێ بینی گەلەك ژ وان لەزێ ل گونەهـ و دەستدرێژی و نەیارییێ و خوارنا حەرامی دكەن. چ پیسە كارە ئەو دكەن. ﴿٦٣﴾ بلا خودێناس و زانایان، ئەو ژ گۆتنێت وان یێت ب گونەهـ، و ژ خوارنا حەرامی، دابانە پاش، و چ پیسە كارە ئەو دكەن. ﴿٦٤﴾ و جوهییان گۆت: دەستێ خودێ یێ گرتییە، دەستێ وان بێتە گرێدان [نفرینە ل وان دئێتە كرن، ب چرویكییێ، یان ژی ب هندێ دەستێت وان ب زنجیرێت دۆژەهێ بێنە گرێدان]، و ژ دلۆڤانییا خودێ دویركەڤتن ژ بەر گۆتنا كرین، بەلێ هەردو دەستێت وی [ئانكو یێت خودێ] دڤەكرینە، چاوا بڤێت وەسا دمەزێخیت. و ب راستی ئەڤ قورئانا بۆ تە هاتییە خوارێ، گاوری و زێدەگاڤی و خرابییا وان پتر لێ دكەت، و مە كەرب و كین و دژمناتی ئێخستییە د ناڤبەرا واندا هەتا رۆژا قیامەتێ، هەر گاڤەكا ڤیان ئاگرەكێ شەری [ل سەر پێغەمبەری] هەلكەن، خودێ دڤەمرینیت، و د ئەردیدا دگەڕن خرابییان بكەن، و خودێ حەژ خرابكاران ناكەت.

﴿٦٥﴾ ئەگەر خودان کتێبان باوەری ئینابایە، و پارێزکاریا خودێ کربایە، ئەم دا گونەهێت وان ل سەر ڕاکەین و دا بەینە بەحەشتێت تێرخنێك و خۆشی. ﴿٦٦﴾ و ئەگەر وان تەورات و ئنجیل و یا بۆ وان ژ خودایێ وان هاتییە خوارێ ڕاگرتبایە و کار پێ کربایە، ب ڕاستی دا د سەر خوڕا و د بن خوڕا و دا ل هنداڤی، خۆن [ئانکو خودێ دا بۆ وان ڕێکان ساناهی کەت کو ڕزقی ژ ئەرد و ئەسمانان بخۆن]. ژ وان هندەك د ناڤنجینە [ئەو ژی ئەون یێت باوەری ئینایین، وەکی عەبدوللایێ کوڕێ سەلامی و یێت وەکی وی] و گەلەك ژ وان د خرابن و پیسەکارە دکەن. ﴿٦٧﴾ هەی پێغەمبەر چ بۆ تە هاتییە خوارێ ژ خودایێ تە بگەهینە [چو ژێ نەڤەشێرن] و ئەگەر تو وەنەکەی، [نەگەهینی و ڤەشێری] تە پەیاما وی نەگەهاند. و خودێ دێ تە ژ مرۆڤان پارێزیت. ب ڕاستی خودێ مرۆڤێت گاور ڕاستەرێ ناکەت. ﴿٦٨﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: گەلی خودان کتێبان، هوین ل سەر چو هەقییێ نینن، هەتا هوین تەورات و ئنجیلێ و ئەوا ژ خودایێ هەوە [کو ئەڤ قورئانەیە] بۆ هەوە هاتییە خوارێ، ڕانەگرن و کار پێ نەکەن، و ب ڕاستی ئەڤ قورئانا بۆ تە هاتییە خوارێ گاوری و زێدەگاڤی و خرابییا وان پتر لێ دکەت. ڤێجا بۆ مرۆڤێت گاور ب خەمنەکەڤە. ﴿٦٩﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ئینایین [کو موسلمانن دویکەفتییێت پێغەمبەری] و یێت بووینە جوهی [دویکەفتییێت مووسایی] و فەلە [دویکەفتییێت عیسایی] و سابئی [جوینەکە، ژ جوهی و فەلەیان ڤەبوویینە، ستێران دپەرێسن، و هندەك دبێژن ملیاکەتان دپەرێسن] هەر کەسێ ژ ڤان ب دورستی باوەرییێ ب خودێ و ڕۆژا قیامەتێ بینیت، و کار و کریارێت چاك بکەت [دێ ژ بەرێ خودێڤە ئێتە خەلاتکرن، و ڕۆژا قیامەتێ] نە ترس بۆ هەیە، و نە ژی ب خەم دکەڤن. ﴿٧٠﴾ ب ڕاستی مە پەیمانا موکومکری ژ ئسرائیلیان وەرگرت، و مە پێغەمبەر بۆ هنارتن، و هەر گاڤەکا پێغەمبەرەك بۆ وان ب وێ یا نە ب دلێ وان دهات، دەستەکەك درەوین دەردئێخستن [وەکی عیسا و موحەمەد]، و دەستەکەك دکوشتن [وەکی زەکەریا و یەحیایی].



وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَكَفَّرۡنَا عَنۡهُمۡ
سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ٦٥ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ أَقَامُواْ
ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِم مِّن رَّبِّهِمۡ لَأَكَلُواْ
مِن فَوۡقِهِمۡ وَمِن تَحۡتِ أَرۡجُلِهِمۚ مِّنۡهُمۡ أُمَّةٞ مُّقۡتَصِدَةٞۖ
وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ سَآءَ مَا يَعۡمَلُونَ ٦٦ ۞يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ ثلاثة أرباع الحزب ١٢
بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ
رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ
ٱلۡكَٰفِرِينَ ٦٧ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَسۡتُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍ حَتَّىٰ
تُقِيمُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡۗ
وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗاۖ
فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٦٨ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ
هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ
وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٦٩ لَقَدۡ أَخَذۡنَا
مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمۡ رُسُلٗاۖ كُلَّمَا جَآءَهُمۡ رَسُولُۢ
بِمَا لَا تَهۡوَىٰٓ أَنفُسُهُمۡ فَرِيقٗا كَذَّبُواْ وَفَرِيقٗا يَقۡتُلُونَ ٧٠

وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتۡنَةٞ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ثُمَّ
عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٞ مِّنۡهُمۡۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿٧١﴾
لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ وَقَالَ ٱلۡمَسِيحُ
يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۖ إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ
بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا
لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ﴿٧٢﴾ لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ
ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ وَإِن لَّمۡ يَنتَهُواْ
عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾
أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسۡتَغۡفِرُونَهُۥۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٧٤﴾
مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ
صِدِّيقَةٞۖ كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ
ثُمَّ ٱنظُرۡ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴿٧٥﴾ قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا
يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗاۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٧٦﴾ قُلۡ
يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓاْ أَهۡوَآءَ
قَوۡمٖ قَدۡ ضَلُّواْ مِن قَبۡلُ وَأَضَلُّواْ كَثِيرٗا وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾





﴿٧١﴾ وان هزر دكر كو چو ئیزا و بەلا ب سەرێ وان نائێن [ژ بەر وێ یا وان ب سەرێ پێغەمبەران دئینا، و ئەو پەیمانێت وان ددان و شكاندن]، ڤێجا [ژ هەقی و ڕاستەڕێییێ] كۆرە و كەڕ بوون، [پاشی پەشێمان بوون و ل خۆ زڤڕین] پاشی خودێ تۆبە دا سەر وان، پاشی گەلەك ژ وان كۆرە و كەڕ بوون. و خودێ دبینیت كا ئەو چ دكەن. ﴿٧٢﴾ ب ڕاستی ئەوێت گۆتین: خودێ مەسیحێ كوڕێ مەریەمێیە گاوربوون [بوونە گاور]، و مەسیحی ب خۆ ژی گۆتییە: گەلی ئسرائیلییان خودێ بپەرێسن كو خودایێ من و خودایێ هەوەیە، و ب ڕاستی هەر كەسێ هەڤپشكان بۆ خودێ چێكەت، ب سویند خودێ بەحەشت ل سەر وی حەرام كرییە و جهێ وی ئاگر و دۆژەهە، نێ ستەمكاران قەت چو هاریكار بۆ نینن. ﴿٧٣﴾ ب ڕاستی ئەوێت گۆتین: خودێ ئێكە ژ سێیان گاوربوون [بوونە گاور]، و چو پەرستی نینن ژ خودێ پێڤەتر و ئەگەر ئەوا دبێژن بەس نەكەن و نەهێلن، بێ گۆمان دێ ئیزایەكا ب ژان ژ وان ئەوێت گاوربوویین گریت. ﴿٧٤﴾ ڤێجا ما ئەو [ژ ڤان ئاخڤتنێت پویچ و نەهەق د دەرهەقێ خودێ و پێغەمبەرێ وی عیسایێ كوڕێ مەریەمێدا] تۆبە ناكەن و داخوازا گونەهـ ژێبرنێ ناكەن؟ ب ڕاستی خودێ لێنەگر و دلۆڤانە.
﴿٧٥﴾ مەسیحێ كوڕێ مەریەمێ ژ پێغەمبەری پێڤەتر نینە، و بەری وی پێغەمبەرێت هاتین و چۆیین، و دەیكا وی ژی زێدە یا ڕاستگۆ بوو، هەردووكان ژی خوارن دخوار، بەرێ خۆ بدێ چاوا ئەم نیشانان بۆ وان ئاشكەرا دكەین [ل سەر نەوەییا گۆتنا وان د دەرهەقێ عیسایی و دەیكا ویدا] و بەرێ خۆ بدێ كا چاوا [ژ هەقییێ و نیشانێت ئاشكەرا ل سەر ڕاستییا عیسایی] دئێنە ڤاڕێكرن. ﴿٧٦﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: هوین چاوا وی شوینا خودێ دپەرێسن ئەوێ نە مفایی دگەهینتە هەوە نە زیانێ. و خودێیە گوهدێر و زانا.
﴿٧٧﴾ بێژە گەلی خودان كتێبان زێدەگاڤییێ د دینێ خۆدا و د دویڤچۆنا هەقییێدا نەكەن [ڤێجا هوین تشتی، ژ جهێ وی بلندتر لێ بكەن، هەروەكی هەوە عیسا ـ ژ زێدەگاڤی ـ ژ پێغەمبەراتییێ بلندتر لێ كری] و ب دویڤ دلخوازییا هندەك مرۆڤان [ئەوێت بەری هەوە] نەكەڤن، ب ڕاستی بەری نوكە یێت بەرزەبووین، و ژ ڕێكا ڕاست دەركەڤتین، و گەلەك ژی د گەل خۆ یێت بەرزەكرین و سەردابرین، و ڕێكا ڕاست بەرزەكرن.

﴿٧٨﴾ لەعنـەت ل وان ئسرائیلیـــیان هاتەکـرن، ئەوێـت
گاوربوویـــین، ل سـەر ئەزمانـێ داوودی و عیسـایێ
کـوڕێ مەریەمێ، ژ بـەر نەگوهداریـــیا وان، و زێدەگاڤی
ژی دکـرن. ﴿٧٩﴾ وان [جوهیـــیان] ئێکـدو ژ چـو
خرابیـــیێت دکـرن، نەددانـە پـاش. چ پیسـە کار بوو وان
دکـر. ﴿٨٠﴾ [هەی موحەمـەد] تو گەلـەك ژ وان دێ بینی
[ژ کەربێت موسلمانان‌دا] دۆسـتینی و پشتەڤانیـــیا ئەوێت
گاوربوویـــین [ژ موشرکان] دکەن. ب ڕاسـتی ئەڤە پیسە
شـۆلە وان دایـــیە بـەری خـۆ، کـەرب و غەزەبـا خودێ
ل سـەر وان بیـت، و ئـەو دێ هـەر د دۆژەهێـدا مینـن.
﴿٨١﴾ ئەگـەر وان باوەری ب خـودێ و پێغەمبەری و وان
ئایەتێـت بـۆ پێغەمبـەری هاتـین ئینابایـە، وان دۆسـتینی
و پشتەڤانیـــیا وان [مـوشرکان] نەدکـر، بەلـێ باراپـتر ژ
وان ژ ڕێ دەرکەڤتینـە. ﴿٨٢﴾ ب ڕاسـتی دێ بینـی یـێ ژ
هەمیـــیان دژمنـتر بـۆ ئەوێت بـاوەری ئینایـین، جوهینە و
ئەوێـت هەڤپشـك بۆ خـودێ چێکرین. و ب ڕاسـتی دێ
بینـی یـێ حەژێکرنـا وی پتر بـۆ ئەوێت بـاوەری ئینایین،
ئـەون ئەوێـت دبێـژن ئـەم هاریکاریـن [دویکەڤتیـــیێت
عیسایـــینە]، [ئـەڤ ئایەتـە د دەرهەقـێ نەجاشیدا هاتبـوو خـوارێ] چونکـی زانـا و خودێنـاس د نـاڤ وانـدا
هەبـوون، و وان ب خـۆ ژی خـۆ مەزن نەدکر. ﴿٨٣﴾ هـەر وەختەکێ ئـەو ئایەتێت بۆ پێغەمبەری هاتین دبهیسـتن،
چاڤێـت وان تـژی ڕۆنـدك دبوون ژ بـەر وێ هەقیـیا وان دزانی، دبێـژن: خودێوۆ مە بـاوەری ب تە ئینـا، ڤێجا تو
مە ژ شـاهدان بنڤێسـە، [شـاهدێت باوەریـیێ ب تـە و کتێـب و پێغەمبەرێت تە دئینن، و شادەیـیێ بۆ یەکتایـــییا
تـە ددەن].



لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ
دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ
يَعۡتَدُونَ ٧٨ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ
لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ٧٩ تَرَىٰ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ
يَتَوَلَّوۡنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ لَبِئۡسَ مَا قَدَّمَتۡ لَهُمۡ
أَنفُسُهُمۡ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَفِي ٱلۡعَذَابِ هُمۡ
خَٰلِدُونَ ٨٠ وَلَوۡ كَانُواْ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِيِّ وَمَآ
أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمۡ أَوۡلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرٗا
الجزء ٧ الحزب ١٣ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ٨١ ۞ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةٗ
لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ
أَقۡرَبَهُم مَّوَدَّةٗ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ
ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ وَرُهۡبَانٗا وَأَنَّهُمۡ
لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ٨٢ وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى
ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ مِمَّا عَرَفُواْ
مِنَ ٱلۡحَقِّۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ٨٣

وَمَا لَنَا لَا نُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلۡحَقِّ وَنَطۡمَعُ أَن يُدۡخِلَنَا
رَبُّنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلصَّٰلِحِينَ ٨٤ فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُواْ جَنَّٰتٖ
تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ
ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٨٥ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ
أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ٨٦ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ
طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ
ٱلۡمُعۡتَدِينَ ٨٧ وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ
وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ٨٨ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ
بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلۡأَيۡمَٰنَۖ
فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ
أَهۡلِيكُمۡ أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٖۖ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ
ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡۚ وَٱحۡفَظُوٓاْ
أَيۡمَٰنَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٨٩
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ
رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠



﴿٨٤﴾ و مـا بۆچـی ئـەم باوەریـیێ ب خـودێ و ب
هەڤیـیا بـۆ مە هاتـی نائینـین، و ئـەم دخوازیـن خودایێ
مـە، مـە بێخیتە د گـەل مرۆڤێت چـاك و بـاش [ئانكو مە
بكەتـە هەڤالێـت پێغەمبـەری و خودێناسـان، و مـە ببەتە
بەحەشـتێ]. ﴿٨٥﴾ ڤێجا خودێ بەرانبـەری ئەوا گۆتین،
ب بەحەشـتێت ڕوبـار دبنـڕا دچـن خەلاتكـرن، كـو
هەروهـەر دێ تێـدا بن، و ئەڤەیـە خەلاتـێ قەنجیكاران.
﴿٨٦﴾ و ئەوێـت گاوربوویـن، و ئایەتێـت مـە درەو
دانایـین، ئـەو دۆژەهینـە. ﴿٨٧﴾ گـەلی خـودان بـاوەران،
ئـەو تشـتێت خـۆش ئەوێـت خـودێ بـۆ هـەوە حـەلال
كریـن ل خۆ حـەرام نەكـەن، و زێدەگاڤیـیان نەكەن، ب
ڕاسـتی خـودێ حـەژ زێدەگاڤـان ناكـەت [ئـەڤ ئایەتـە
د دەرهەقـێ هنـدەك سەحابیـیاندا هاتـە خـوارێ، ل بەر
بـوون ژ ترسـێت خودێـدا گۆشـتی و ژنـان و تشـتێت
خـۆش بهێلـن و ل خـۆ حـەرام بكـەن]. ﴿٨٨﴾ [گـەلی
خـودان بـاوەران] ئـەو تشـتێ مە دایـیە هـەوە حەلال و
پاقـژ بخـۆن. و پارێزكاریـیا خودێ بكەن، ئـەو خودایێ
هـەوە بـاوەری پێ هـەی. ﴿٨٩﴾ خـودێ ب سـویندا بێ
ئنیـەت و ئـەوا بوویـیە ئاخڤتـن، ل هـەوە ناگریـت، بەلـێ دێ وێ سـویندێ ل هـەوە گریـت ئـەوا ژ دلـێ هەوە
دەردكەڤیـت. ڤێجـا [ئەگـەر ب ڤـی ڕەنگـی هەوە سـویند خوار و هـەوە شـكاند، یان هـەوە ڤیا بشـكێنن] جزایێ
وێ [و ژێبرنـا گونەهـا سـویندێ] زاددانـا دەهــ مرۆڤێت بەلنگـازە ژ زادێ ناڤنجی، ئـەوێ [ڕۆژانـە] هوین ددەنە
مـالا خـۆ، یـان ژی ب جلـك ئێخستنا وانـە [وان دەهـان هەرئێكـێ جلكـەك] یـان ژی ئازادكرنـا بەندەیەكیـیە،
ڤێجـا هەچیـێ چـو ژ ڤـان نەدیـت [و پێ چـێ نەبـوو] دڤێت سـێ ڕۆژیـیان بگریـت، ئەڤەیـە ڕاكرنـا [كەفارەتا]
سـویندا هـەوە، ئەگـەر هـەوە شـكاند. و سـویندێت خـۆ بپارێزن [نـە لـەزێ ل سـویندخوارنێ بكەن، و نـە لەزێ
ل شـكاندنا وێ بكـەن، و بـێ كەفـارەت نەهێلـن ئەگـەر هـەوە شـكاند]. ب ڤـی ڕەنگی خـودێ ئایەتێـت خۆ بۆ
هـەوە ئاشـكەرا دكـەت، دا هوین سوپاسیـیا وی بكەن. ﴿٩٠﴾ گـەلی خودان باوەران، ب ڕاسـتی مـەی و قومار و
بوتێـت چكلانـدی و دانایـی [ل دۆر كەعبەیـێ و تێـدا] هەڕمـی و پیسـن، ژ كار و عەمەلێ شـەیتانینە، ڤێجا هوین
خـۆ ژێ بدەنـە پـاش و خـۆ ژێ دویـر بێخـن، دا هویـن سـەرفەراز ببن.

إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ
فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ
ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ
ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا
ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٩٢﴾ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ
ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيۡءٖ
مِّنَ ٱلصَّيۡدِ تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ لِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ
بِٱلۡغَيۡبِۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٩٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ
مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا
عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ
أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا
سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٩٥﴾



﴿٩١﴾ ب ڕاستی شەیتانی دڤێت دژمنایی و نەڤیانێ
ب مەی و قومارێ بێخیتە د ناڤبەرا هەوەدا، و هەوە
ژ بیرئینانا خودێ و نڤێژێ بدەتە پاش، ڤێجا ما هەوە
نەبەسە؟! [ئانکو بەسە بهێلن]. ﴿٩٢﴾ و گوهداریا
خودێ بکەن، و گوهداریا پێغەمبەری بکەن، و هشیار
بن [ژ وێ بێ ئەمریێ یا هوین پێ ژ فەرمانا خودێ و
پێغەمبەری دەرکەڤن]، و هەکە هەوە بەرێ خۆ وەرگێڕا
و نەگوهداری کر بزانن ب ڕاستی بەس گەهاندنا
ڤێ پەیاما ئاشکەراکەر ل سەر پێغەمبەرێ مەیە.
﴿٩٣﴾ [هندەك ژ سەحابییێت پێغەمبەری (سلاڤێت
خودێ ل سەر پێغەمبەری بن) مربوون بەری
حەرامکرنا مەی و قومارێ، ڤێجا هندەك سەحابییان
گۆت: ئەرێ پا ئەڤێت بەری نوکە مرین، بەری مەی
و قومار حەرام ببن، حوکمێ وان چییە؟! ئینا ئەڤ
ئایەتە هاتە خوارێ] چو گونەه ل سەر وان نینە،
ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت چاك کرین ل
سەر ئەوا وان کری [ژ ڤەخوارنا مەیێ و کرنا قومارێ
بەری حەرام ببن]. ئەگەر بەری هنگی خۆ ژ حەرامی
یان شرکێ پاراستبیت، و باوەری ب خودێ ئینابیت و کار و کریارێت قەنج کربن، پاشی خۆ ژ وی حەرامی
دابنە پاش یێ وان باوەری پێ ئینایی، و پاشی بەردەوام بوویین ل سەر خۆپارستنێ و کار و کریارێت قەنج
کربن، و خودێ ب خۆ ژی حەژ قەنجیکاران دکەت. ﴿٩٤﴾ گەلی خودان باوەران، ب ڕاستی خودایێ هەوە
[وەختێ هوین د ئیحراماندا] ب وێ نێچیرا هوین ب دەست و ڕومێت خۆ دکەن هەوە دجەربینیت، دا خودێ
دیار بکەت کا کی نەپەنی ژ خودێ دترسیت، ڤێجا هەر کەسێ پشتی ڤێ [ئانکو پشتی هاتییە دیارکرن، کا چ
حەرامە ل سەر وان کەسێت د ئیحراماندا] زێدەگاڤییێ بکەت [بلا بزانیت] ب ڕاستی ئیزایەکا ب ژان و دژوار
بۆ هەیە. ﴿٩٥﴾ گەلی خودان باوەران، نێچیرێ نەکوژن، و هوین د ئیحراماندا [هەتا هوین ژێ دەرنەکەڤن]،
و هەچییێ ژ هەوە ژ قەستا [نێچیرێ] بکوژیت، جزایێ وی تەرشەکێ وەکی نێچیرا کوشتییە، [بکەتە قوربان
شوینا نێچیرا کوشتی] دو مرۆڤێت دادوەر بڕیارێ پێ بدەن، دیارییەکە [ئەو قوربان] بگەهیتە کەعبەیێ
[ئانکو دڤێت ئەو قوربان ل مەکەهێ بێتە سەرژێکرن] یان شوینا قوربانی [تەمەتی بهایێ نێچیرێ] بکەتە
خوارنا بەلنگازان یان بەرانبەر [وێ خوارنێ] ب ڕۆژی بیت، دا تامکەتە جزایێ کارێ خۆ، و خودێ ل یا
بەری نوکە بۆری [بەری ئەڤ ئایەتە د دەرهەقێ ئیحرامکەریدا بێنە خوارێ]. بەلێ هەر کەسێ لێ بزڤڕیتەڤە
خودێ دێ تۆلێ لێ ڤەکەت، و نێ خودێ دەستهەلاتدار و تۆلڤەکەرە.

أُحِلَّ لَكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَحۡرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِلسَّيَّارَةِۖ
وَحُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَرِّ مَا دُمۡتُمۡ حُرُمٗاۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ
إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٩٦﴾ ۞جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلۡكَعۡبَةَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ
الحزب ١٣
قِيَٰمٗا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَٱلۡهَدۡيَ وَٱلۡقَلَٰٓئِدَۚ ذَٰلِكَ لِتَعۡلَمُوٓاْ
أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ
شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴿٩٧﴾ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ
غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٩٨﴾ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا
تُبۡدُونَ وَمَا تَكۡتُمُونَ ﴿٩٩﴾ قُل لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ
وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ كَثۡرَةُ ٱلۡخَبِيثِۚ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ
لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿١٠٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ
أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ وَإِن تَسۡـَٔلُواْ عَنۡهَا حِينَ يُنَزَّلُ
ٱلۡقُرۡءَانُ تُبۡدَ لَكُمۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَاۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿١٠١﴾
قَدۡ سَأَلَهَا قَوۡمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡ ثُمَّ أَصۡبَحُواْ بِهَا كَٰفِرِينَ ﴿١٠٢﴾ مَا جَعَلَ
ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٖ وَلَا سَآئِبَةٖ وَلَا وَصِيلَةٖ وَلَا حَامٖ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَأَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿١٠٣﴾





﴿٩٦﴾ نێچیرا دەریایان و خوارنا وان بۆ هەوە دورست بوو، دا بۆ هەوە ئاکنجی و ڕێباران ببیتە متا، و مفایی ژێ وەرگرن، بەلێ هندی هوین د ئیحرامان‌دا بن نێچیرا کویڤی و چۆلی ل سەر هەوە هاتییە حەرامکرن، و پارێزکارییا خودێ بکەن، ئەوێ هوین ل دەڤ دئێنە کۆمکرن. ﴿٩٧﴾ خودێ کەعبە، ئەوا ب بەیتولحەرام دئێتە ناڤکرن، بۆ مرۆڤان کرە جهێ سەروبەرکرنا کاروباران، و هەیڤێت حەرامکری کرنە ئەگەرا بەردەوامییا ئێمناهی و ژیانێ، و قوربانێت [دیاری بۆ کەعبەیێ] نیشانکری و یێت نەنیشانکری کرنە ئەگەرا قەتاندنا هەوجەییا هەژاران، دا بزانن خودێ ئەوا د ئەرد و ئەسمانان‌دا دزانیت، و هندی خودێیە ب ڕاستی ب هەمی تشتان زانا و ئاگەهدارە. ﴿٩٨﴾ و بزانن جزایێ خودێ ب ڕاستی جزایەکێ دژوارە، و ب ڕاستی خودێ لێنەگر و دلۆڤانە. ﴿٩٩﴾ یا پێغەمبەری ژ گەهاندنا پەیاما خودێ پێڤەتر نینە، و خودێ ب خۆ ئاشکەرا و نەئاشکەرایا هوین دکەن، دزانیت و پێ ئاگەهە. ﴿١٠٠﴾ [هەی موحەممەد] بێژە وان: پیس و پاقژ [ئانکو حەرام و حەلال، یان گاور و موسلمان، یان گونەهکار و گوهدار] وەکی ئێك نینن، خۆ هەکە تو ب گەلەکی و بۆشاتییا پیساتییێ عەجێبگرتی ژی ببی، ڤێجا گەلی ئاقلداران پارێزکارییا خودێ بکەن دا هوین سەرفەراز ببن. ﴿١٠١﴾ گەلی خودان باوەران پرسا وان تشتان [ژ پێغەمبەری] نەکەن ئەوێت ئەگەر بۆ هەوە ئاشکەرا ببن هوین پێ نەخۆش ببن، و ئەگەر هوین د وەختێ هاتنا قورئانێدا پرسا وان بکەن، دێ بۆ هەوە ئاشکەرا بن، خودێ هوین ژ پرس و پسیارێت بۆری ئازاکرن. و خودێ ب خۆ ژی گونەهـژێبەر و دلۆڤانە و سزا لەزلێنەکەرە. ﴿١٠٢﴾ ب ڕاستی بەری هەوە هندەك ملەتان ئەڤ پرسە [ژ پێغەمبەرێت خۆ] کرن، پاشی کار پێ نەکرن و پێ گاوربوون. ﴿١٠٣﴾ خودێ دورست نەکرییە و فەرمان پێ نەدایییە ئەڤ کارە بێتەکرن، حێشترا پێنج جاران زابیت و جارا پێنجێ نێر ئینابیت، گوهێ وێ بێتە درویکرن و بێتە بەردان بۆ بوتان، و حێشتر بێتە ئازادکرن بۆ بوتان چونکی خودان یێ ژ گرفتارییەکێ دەرکەڤتی، و حێشترا جەمکەکێ نێر و مێ بینیت دگۆتن: مێ و نێر گەهشتنە ئێك و هەردو] بۆ بوتان بێنە ئازادکرن، و حێشترا نێرا دەهـ سالان دهاتە بەردان د ناڤ حێشتران‌دا ئازادکرن بۆ بوتان. بەلێ ئەوێت گاوربوویین درەوان ب ناڤێ خودێ دکەن، و باراپتر ژ وان نوزانن ژی [کو درەوان دکەن].

وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُواْ حَسۡبُنَا
مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ
شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ ١٠٤ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ
لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ١٠٥ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ
بَيۡنِكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ ٱثۡنَانِ ذَوَا
عَدۡلٖ مِّنكُمۡ أَوۡ ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ إِنۡ أَنتُمۡ ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ
فَأَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةُ ٱلۡمَوۡتِۚ تَحۡبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ
فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ لَا نَشۡتَرِي بِهِۦ ثَمَنٗا وَلَوۡ كَانَ ذَا
قُرۡبَىٰ وَلَا نَكۡتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلۡأٓثِمِينَ ١٠٦ فَإِنۡ عُثِرَ
عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسۡتَحَقَّآ إِثۡمٗا فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ ٱلَّذِينَ
ٱسۡتَحَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَوۡلَيَٰنِ فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن
شَهَٰدَتِهِمَا وَمَا ٱعۡتَدَيۡنَآ إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٠٧ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ
أَن يَأۡتُواْ بِٱلشَّهَٰدَةِ عَلَىٰ وَجۡهِهَآ أَوۡ يَخَافُوٓاْ أَن تُرَدَّ أَيۡمَٰنُۢ بَعۡدَ
أَيۡمَٰنِهِمۡۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡمَعُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ١٠٨



﴿١٠٤﴾ و گاڤا بۆ وان هاتە گۆتن: وەرن بۆ وێ یا خودێ ئینایییە خوار، و وەرنە دەڤ پێغەمبەری [ئانكو ل دویڤ وێ هەرن یا خودێ ئینایییە خوار كو قورئانە، و ل دویڤ پێغەمبەری هەرن]. دبێژن: ئەڤا مە باب و باپیرێت خۆ ل سەر دیتی بەسی مەیە، ئەرێ ئەگەر باب و باپیرێت هەوە چو نەزانن و ڕاستەڕێكرنێ ژی نەكەن [دیسا ڕێكا وان هەر بەسی هەوەیە؟!].
﴿١٠٥﴾ گەلی خودان باوەران، هەوە ئاگەهـ ژ خۆ هەبیت، ئەگەر هوین د ڕاستەڕێكری بن، یێت سەرداچۆیی و بەرزە، زیانێ ناگەهیننە هەوە، زڤڕینا هەوە هەمییان ب بال خودێڤەیە، ڤێجا دێ هەوە ئاگەهداری وێ كەت یا هەوە كری [ئانكو دێ هەوە ل دویڤ كار و كریارێت هەوە جزاكەت].
﴿١٠٦﴾ گەلی خودان باوەران، گاڤا ئێك ژ هەوە وەختێ وەسیەتێ، كەڤتە بەر مرنێ، دو مرۆڤێت دادوەر ژ خۆ [ئانكو موسلمان] وەك شاهد بگرن، ڤێجا ئەگەر هوین د ڕێ و ڕێبارانـدا بن [ئانكو د وەغەرێدا] و كەڤتنە بەر مرنێ [و موسلمان ب دەست هەوە نەكەڤتن] دو كەسێت دی نە ژ هەوە بگرن [بكەنە شاهد]، و ئەگەر هوین ل وان شاهدان ب گۆمان كەڤتن [كو ڕاستییێ بێژن]، هوین وان هەردو شاهدان پشتی نڤێژێ [ئانكو نڤێژا ئێڤاری، یان هەر نڤێژەكا هەبیت] بینن، و بلا هەردو [هۆسا] سویند بخۆن [ب خودێ] ئەم ژ درەو بەرانبەر تشتەكی سویند ب خودێ ناخۆین خۆ هەكە مرۆڤێ مە ژی بیت، و ئەم شادەییا خودێ ناڤەشێرین، ئەگەر مە شادەییا خۆ ڤەشارت وێ گاڤێ ئەم ژ گونەهكارانین.
﴿١٠٧﴾ ڤێجا ئەگەر بۆ هەوە دیاربوو كو هەردو شاهد هەژی گونەهێ بوویینە [و شادەییا خۆ دورست نەدایینە]، بلا دو میراتخۆر، یان دوییێت ژ هەمییان نێزیكتر بۆ مری ل جهێ وان هەردو شاهدان ڕابن، و ب خودێ سویند بخۆن، كو شادەییا وان ژ شادەییا یێت دی ڕاسترە، و ئەم [ب سویندا خۆ] ژ ڕاستییێ دەرنەكەڤتینە، ئەگەر مە [ژ بێ بەختی] شادەیی ل سەر وان دا هنگی ئەم دێ ژ ستەمكاران بین.
﴿١٠٨﴾ ئەڤ شادەییا ب ڤی ڕەنگی بۆ هەوە چێترە دا شادەیی وەكی خۆ بێتە دان [ئانكو ب دورستی بێتە دان]، یان بترسن [ئانكو شاهد] سویندێت وان ب هندە سویندێت دی ژێ بێنە ڤەگێڕان [و درەوا وان ئاشكەرا ببیت و شەرمزار ببن]. و پارێزكارییا خودێ بكەن و گوهدار بن. و نێ خودێ مرۆڤێت ژ ڕێ دەركەڤتی ڕاستەڕێ ناكەت.

نصف الحزب ١٣

* يَوۡمَ يَجۡمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡۖ قَالُواْ لَا عِلۡمَ لَنَآۖ
إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ١٠٩ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ
ٱذۡكُرۡ نِعۡمَتِي عَلَيۡكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذۡ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ
ٱلۡقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗاۖ وَإِذۡ عَلَّمۡتُكَ
ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَۖ وَإِذۡ تَخۡلُقُ
مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ بِإِذۡنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ
طَيۡرَۢا بِإِذۡنِيۖ وَتُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ بِإِذۡنِيۖ وَإِذۡ تُخۡرِجُ
ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِيۖ وَإِذۡ كَفَفۡتُ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذۡ
جِئۡتَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ إِنۡ هَٰذَآ
إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ١١٠ وَإِذۡ أَوۡحَيۡتُ إِلَى ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ أَنۡ ءَامِنُواْ
بِي وَبِرَسُولِي قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّنَا مُسۡلِمُونَ ١١١
إِذۡ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ
أَن يُنَزِّلَ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِۖ قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم
مُّؤۡمِنِينَ ١١٢ قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا
وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ١١٣



﴿١٠٩﴾ [هشیار بن] رۆژا خودێ پێغەمبەران کۆم دکەت، دێ بێژیتە وان: چاوا بەرسڤا هەوە [ژ بەرێ ملەتێت هەوەڤە] هاتەدان؟ دێ بێژن: ئەم نوزانین، ب ڕاستی هەر تویی زانایێ نهینیان [ئانکو تو چێتر دزانی]. ﴿١١٠﴾ و بۆ ملەتێ خۆ بێژە دەمێ خودێ گۆتی: عیسایێ کوڕێ مەریەمێ، ئەو نیعمەت و کەرەمێت من د گەل تە و دەیکا تە کرین بینە بیرا خۆ، بینە بیرا خۆ وەختێ مە ب جانێ پیرۆز [ب جبریلی] پشتەڤانیا تە کری، وەختێ د لاندکێدا و پشتی تو مەزن بوویی [وەکی ئێك] تو د گەل خەلکی دئاخڤتی، و بینە بیرا خۆ وەختێ من تو فێری نڤێسین و تێگەهشتن و کاربنەجهییێ و تەوراتێ و ئنجیلێ کری، و بینە بیرا خۆ وەختێ تە ب دەستویرا من ژ تەقنێ پەیکەرێ بالندەیان چێدکر، و تە پف دکرێ و ب دەستویرا من دبوو بالندەیەك، و ب دەستویرا من تە یێت د زکماکدا کۆرە و بەلەکەیی ساخ دکرن، بینە بیرا خۆ وەختێ تە مری ب دەستویرا من زێندی دکرن، و بینە بیرا خۆ وەختێ من ئەزیەتا ئسرائیلیان ژ تە دایییە پاش، وەختێ تو ب نیشانێت ئاشکەراکەر بۆ وان هاتی، و ئەوێت گاوربوویین ژ وان، گۆت: ئەڤە ژ سێرەبەندییەکا ئاشکەرا پێڤەتر نینە. ﴿١١١﴾ و بۆ ملەتێ خۆ بێژە دەمێ مە ئیلهام دایییە هاریکارێت عیسایی [و ئێخستییە سەر دلێ وان] کو باوەرییێ ب من بینن و ب پێغەمبەرێ من، گۆتن: مە باوەری ئینا، و تو شاهدبە کو ب ڕاستی ئەم موسلمانین. ﴿١١٢﴾ بۆ ملەتێ خۆ بێژە دەمێ هاریکاران (حەوارییان) گۆتییە عیسایێ کوڕێ مەریەمێ: ئەرێ خودایێ تە دشێت سفرەیەکا خوارنێ بۆ مە ژ ئەسمانان بینتە خوارێ؟! [عیسایی] گۆت: ژ خودێ بترسن [ئانکو ڤێ نەبێژن و نەکەن] ئەگەر هوین خودان باوەرن. ﴿١١٣﴾ گۆتن: مە دڤێت ئەم ژێ بخۆین و دلێ مە ئێمن ببیت، و بزانین تو ڕاست بۆ مە ڕاستییێ دبێژی، و دا ئەم ژی ل سەر ببینە شاهد.

﴿١١٤﴾ عیسایــێ كـوڕێ مەریەمــێ گـۆت: خودێـوۆ
خودایــێ مە، سـفرەیەكێ ژ ئەسـمانان بۆ مە بینـە خوارێ،
دا بـۆ مـە ببیتـە جەژن، بـۆ یــێت سـەردەمێ مە و پشـتی
مـە، و ببیتـە نیشـانەك ژ تە [ل سـەر شـیانا تـە و ڕاستیــیا
پێغەمبەراتیــیا مـن]، و بكـە ڕزقێ مـە [ڤێ سفرەیــێ] و
تـو چێتریـن ڕازقـی. ﴿١١٥﴾ خـودێ گـۆت: ب ڕاسـتی
ئـەز دێ بـۆ هـەوە ئینمـە خـوارێ، ڤێجـا كـی ژ هـەوە
پشـتی هنگـی گـاور ببیـت، ئـەز دێ ب ئیزایەكـێ وی
ئیـزادەم كـو كەسـێ د جیهانێـدا وەسـا ئیـزا نـادەم.
﴿١١٦﴾ و بـۆ ملەتـێ خـۆ بێـژە دەمـێ خـودێ گۆتیــیە
[عیسـایێ كـوڕێ مەریەمێ]: عیسـایێ كـوڕێ مەریەمێ،
ئـەرێ مـا تـە گۆتیــیە خەلكـی مـن و دەیـكا مـن شـوینا
خـودێ بپەرێسـن، [عیسـایی] گۆت: ئـەز تـە ژ گۆتنێت
وان پاقـژ دكـەم و پاقـژی بـۆ تـە بیـت، و مـن هـەق نینـە
یـا بـۆ مـن نەدورسـت بێـژم، ئەگـەر مـن وەگۆتبیـت بێ
گۆمـان تـو دزانـی، تـو دزانـی كا چ د دلـێ مـن دایـە، و
ئـەز چـو ژ نهێنیــیا تـە نوزانـم. ب ڕاسـتی هـەر تویـی
زانایـێ تشـتێ نەدیـار و نهێنیــیان. ﴿١١٧﴾ ژ بـلی تشـتێ تە
فەرمانـا مـن پـێ كـری، چـو یـێ دی مـن نەگۆتییـە وان، خـودێ، خودایـێ مـن و خـۆ بپەرێسـن، و ئـەز شـاهد
بـووم ل سـەر وان هنـدی ئـەز د نـاڤ واندا، بەلـێ وەختێ تە ئـەز ژ نـاڤ وان ڕاكریم، تـو زێرەڤان بوویی ل سـەر
وان، و تـو ب خـۆ ژی هەمـی تشـتان دبینـی و ل سـەر شـاهدی. ﴿١١٨﴾ ئەگەر تـو وان ئیـزا بدەی ئەو بەندەیـێت
تەنـە، و ئەگـەر تـو ل وان نەگـری ب ڕاسـتی تـو یـێ دەسـتهەلاتدار و كاربنەجهـی. ﴿١١٩﴾ خـودێ گـۆت: ئەڤـە
ئـەو ڕۆژە یـا ڕاسـتبێژ مفایـی ژ ڕاسـتبێژیــیا خـۆ دبینـن، بەحەشـتێت ڕوبیـار د بنڕا دچن بـۆ وانـن، هەروهەر دێ
تێـدا بـن، خـودێ ژ وان ڕازیــیە، و ئـەو ژی ب خەلاتـێ خـودێ د قایلـن، و سەرفەرازیــیا مـەزن ئەهـا ئەڤەیـە.
﴿١٢٠﴾ ملـك و مالداریــیا ئـەرد و ئەسـمانان و هنـدی تێدا یـێ خودێیە، و خودێ ب خۆ ژی ل سـەر هەمی تشـتان
یێ دەسـتهەلاتدارە.



قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ
تَكُونُ لَنَا عِيدٗا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةٗ مِّنكَۖ وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ
خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١٤﴾ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ
مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١١٥﴾
وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي
وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ
مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي
وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلۡتُ لَهُمۡ
إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۚ وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ
شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡۚ
وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن
تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ
ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ
فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١٩﴾ لِلَّهِ
مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا فِيهِنَّۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرُۢ ﴿١٢٠﴾

سُورَةُ الأَنعَامِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ
وَٱلنُّورَ ۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ١ هُوَ ٱلَّذِى
خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا ۖ وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ۖ ثُمَّ أَنتُمْ
تَمْتَرُونَ ٢ وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ ۖ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ
وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ ٣ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ
ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ٤ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ
لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ٥
أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ
مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا ٱلْأَنْهَٰرَ
تَجْرِى مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا
ءَاخَرِينَ ٦ وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ
لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ٧ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ
عَلَيْهِ مَلَكٌ ۖ وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَّقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ٨



## سۆرەتا ئەنعام

### ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (١٦٥) ئایەتە

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ پەسن و سوپاسی بۆ وی خودایی ئەوێ ئەرد و ئەسمان داین و تاریاتی و ڕۆناهی [یان شەڤ و ڕۆژ یان باوەری و گاوری] چێکرین، پشتی ڤێ هەمییێ ئەوێت باوەری ب خودایێ خۆ نەئینایین هەڤبەران بۆ [خودایێ خۆ] ددانن، و بەرێ خۆ ژێ وەردگێڕن. ﴿٢﴾ خودێیە [ئەوە] یێ هوین ژ تەقنێ چێکرین، پاشی وەختەکێ نەدیار بۆ مرنێ دانا، وەختێ دیار ل دەڤ وییە، و پشتی ڤێ هوین ژ ڤەژینێ دودل دبن؟!. ﴿٣﴾ و هەر ئەو خودێیە هەژی پەرستنێ د ئەرد و ئەسماناندا، و ئەوە نهێنی و ئاشکەراییا هەوە دزانیت، و هەر تشتێ هوین دکەن پێ ئاگەهە. ﴿٤﴾ و چو نیشان ژ نیشانێت خودایێ وان ژ قورئانێ بۆ وان نائێن ئەگەر ئەو بەرێ خۆ ژێ وەرنەگێڕن و پاتکا خۆ نەدەنێ. ﴿٥﴾ ڤێجا ب ڕاستی دەمێ ئەڤ ڕاستییە [کو قورئانە] بۆ وان هاتی، وان درەو دەرئێخست، نێزیک بەحس و خەبەرێت وان ترانە پێ دکرن دێ بینن [دەمێ ئیزایا خودێ ڕۆژا قیامەتێ ب سەر واندا دئێت]. ﴿٦﴾ ما نابینن چەند ملەت بەری وان مە بەرئاتاف کرینە، و مە ئەو هێز و شیان دابوو وان د ئەردیدا، یا مە نەدایییە هەوە، و مە بارانێت ب ڕێژ و بۆش ب سەر واندا باراندن و مە ڕوبیار د ناڤ داروبارێ وانڕا و د بن وانڕا برن، بەلێ ژ بەر گونەهێت وان، مە ئەو بەرئاتافکرن، و شوینا وان مە هندە ملەتێت دی ئینان. ﴿٧﴾ [هەی موحەمەد] ئەگەر ئەم کتێبەکا وەسا ب سەر تەدا بینینە خوارێ [وەکی ئەو دبێژن] یا نڤێسی د کاغەزاندا، ئەو ب خۆ دەستێ خۆ بکەنێ، دیسا ئەوێت گاوربوویین هەر دا بێژن، ئەڤە ژ سێربەندییەکا ئاشکەرا پێڤەتر نینە. ﴿٨﴾ گۆتن: دێ بلا ملیاکەتەک د گەل [موحەمەدی] هاتبایە هنارتن [دا مە ژێ باوەر ژێ کربایە] و ئەگەر مە ملیاکەتەک هنارتبایە [وەکی ئەو دخوازن] نێ دا بیتە دویماهیکا وان، پاشی نەدهاتنە گیرۆکرن ژی.

وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا
يَلْبِسُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ
سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ قُلْ سِيرُوا۟
فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾
قُل لِّمَن مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُل لِّلَّهِ ۚ كَتَبَ عَلَىٰ
نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۚ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ
فِيهِ ۚ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ ۞ وَلَهُۥ
مَا سَكَنَ فِى ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٣﴾ قُلْ
أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ
يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ ۗ قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ ۖ
وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٤﴾ قُلْ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ
رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ مَّن يُصْرَفْ عَنْهُ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمَهُۥ ۚ
وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ
لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾
وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٨﴾

ثلاثة أرباع الحزب ١٣





﴿٩﴾ و ئەگەر ئەو پێغەمبەر مە كربایە ملیاكەت، دا
كەینە زەلام، و دا هەر جلكێ ئەو [پێغەمبەر] دكەنە
بەر خۆ كەینە بەر وان. ﴿١٠﴾ [هەی موحەمەد] ب
سویند ئەو پێغەمبەرێت بەری تە ژی هاتین، ترانە ب
وان ژی هاتبوونە كرن، ڤێجا ئەوا وان ترانە پێ دكر
ئەو هنگاڤتن و بەرئاتاف كرن. ﴿١١﴾ [هەی موحەمەد]
بێژە [وان]: د ئەردیدا بگەرن، پاشی بەرێ خۆ بدەنێ
كا دویماهیكا درەودەرئێخان [ئەوێت نیشانێت خودێ
درەو دانایین] بوو چ. ﴿١٢﴾ بێژە: ئەرێ هندی د ئەرد و
ئەسمانان‌دا هەی، یێ كێیە؟ [نەشێن بەرسڤێ بدەن و دێ
بێ دەنگ مینن] بێژە: یێ خودێیە، ئەوێ دلۆڤانی ل
سەر خۆ نڤێسی. ب راستی ئەو دێ هەوە رۆژا قیامەتێ
كۆمكەت، چو گۆمان تێدا [د هاتنا وێدا] نینە. ئەوێت
خۆ خوسارەت كرین ئەون یێت باوەری نەئینایین.
﴿١٣﴾ و كا چ د شەڤ و رۆژاندا هەیە، هەر یێ وییە، و
ئەو ب خۆ ژی یێ گوهدێر و زانایە. ﴿١٤﴾ بێژە: ئەرێ
ئەز هاریكار و پشتەڤانەكی ژ بلی خودێ بگرم؟ و ئەو
[ئانكو خودێ] چێكەرێ ئەرد و ئەسمانانە، و ئەو رزقی
ددەت و ئەو ناخۆت [هەوجەیی ب هندێ نینە كەس خوارنێ بدەتێ]، بێژە: ب راستی فەرمانا من هاتییە
كرن ئەز موسلمانێ ئێكێ بم، و نەبمە ژ وان یێت هەڤپشكان بۆ خودێ چێ دكەن. ﴿١٥﴾ بێژە ب راستی ئەز
ژ ئیزایا رۆژا مەزن دترسم، ئەگەر ئەز نەگوهداریا خودایێ خۆ بكەم. ﴿١٦﴾ و هەر كەسێ وێ رۆژێ ئیزا
ژێ نەگریت و ژێ هاتە وەرگێران، ب راستی [خودێ] دلۆڤانی پێ بر، و ئەها ئەڤەیە سەركەڤتنا ئاشكەرا.
﴿١٧﴾ و ئەگەر خودێ زیانەكێ بگەهینیتە تە، كەس نینە راكەت، ئەو نەبیت، و ئەگەر باشییەكێ بگەهینیتە تە
[ژ خێر و بەرفرەهی و سلامەتییێ و... هتد كەس نینە ل تە ڤەگریت]، نێ هەر ئەوە دەستهەلاتدار ل سەر
هەمی تشتان. ﴿١٨﴾ و هەر ئەوە یێ سەردەست ل سەر بەندەییێت خۆ، و هەر ئەوە یێ كاربنەجه و شارەزا.

قُلۡ أَيُّ شَيۡءٍ أَكۡبَرُ شَهَٰدَةٗۖ قُلِ ٱللَّهُۖ شَهِيدُۢ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا
ٱلۡقُرۡءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ أَئِنَّكُمۡ لَتَشۡهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً
أُخۡرَىٰۚ قُل لَّآ أَشۡهَدُۚ قُلۡ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ وَإِنَّنِي بَرِيٓءٞ مِّمَّا
تُشۡرِكُونَ ١٩ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمُۘ
ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٢٠ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى
ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٢١ وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ
جَمِيعٗا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَيۡنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ٢٢
ثُمَّ لَمۡ تَكُن فِتۡنَتُهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشۡرِكِينَ ٢٣
ٱنظُرۡ كَيۡفَ كَذَبُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡۚ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ٢٤
وَمِنۡهُم مَّن يَسۡتَمِعُ إِلَيۡكَۖ وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ
وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗاۚ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا
جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ
ٱلۡأَوَّلِينَ ٢٥ وَهُمۡ يَنۡهَوۡنَ عَنۡهُ وَيَنۡـَٔوۡنَ عَنۡهُۖ وَإِن يُهۡلِكُونَ إِلَّآ
أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٢٦ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ
يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٢٧



﴿١٩﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: ئەرێ چ شادەیی
ژ هەمییان مەزنترە؟! [پشتی وان خواستی ئێك
شادەییێ بۆ پێغەمبەری بدەت]، [و ئەگەر وان خۆ
بێ دەنگ کر] بێژە: خودێ شاهدە د ناڤبەرا من و
هەوەدا، کو ئەڤ قورئانە بۆ من هاتییە هنارتن، دا ئەز
هەوە و هەچییێ دگەهیتێ پێ بدەمە ئاگەهدارکرن و پێ
بترسینم، ئەرێ هوین شادەییێ ددەن کو پەرستییەکێ
دی د گەل خودێ هەیە؟! بێژە: ئەز ب خۆ وێ
شادەییێ نادەم، تو بێژە: ب ڕاستی ئەو پەرستییە،
خودایەکێ تاك و تەنیایە و ئەز یێ بەریمە ژ وێ شرکا
هوین دکەن، [یان ئەز یێ بەریمە ژ وان ئەوێت هوین
بۆ خودێ دکەنە هەڤپشك]. ﴿٢٠﴾ ئەوێت مە کتێب
دایینێ [مەخسەد ژێ جوهی و فەلەنە] پێغەمبەری
دنیاسن [ژ سالۆخێت وی یێت د کتێبێت واندا
هاتین] هەروەکی زاڕۆکێت خۆ دنیاسن، و ئەوێت
خۆ خوسارەت کرین، ئەون یێت باوەری نەئینایین.
﴿٢١﴾ ئەرێ ما کی ژ وی ستەمکارترە ئەوێ درەوەکێ
ژ کیسێ خودێ بکەت یان ژێ نیشان و ئایەتێت
وی درەو بدانیت؟ ب ڕاستی ستەمکار سەرفەراز نابن. ﴿٢٢﴾ [هەی موحەمەد بینە بیرا وان] ڕۆژا ئەم وان
هەمییان کۆم دکەین [کو ڕۆژا قیامەتییە]، پاشی ئەم دێ بێژینە هەڤپشك چێکەران، کا ئەو هەڤپشکێت هەوە،
یێت هەوە ژ درەو دگرتن [کا ل کیڤەنە]؟. ﴿٢٣﴾ پاشی بەرسڤ و دویماهیکا گاورییا وان [د وێ ڕۆژێدا دێ
ئێتە سەر هندێ] دێ بێژن: ب خودێ کو خودایێ مەیە، ئەم نە ژ هەڤپشك چێکەران [موشرکان] بووین.
﴿٢٤﴾ بەرێ خۆ بدێ کا چاوا ئەو درەوێ ل خۆ دکەن، و ئەو هزرا وان دکر [ژ مەهدەر و بەرەڤانییا بوتان]
ل وان بەرزە بوو. ﴿٢٥﴾ و ژ وان هندەك هەنە [وەختێ تو قورئانێ دخوینی] گوهدارییا تە دکەن، و دا چو
[ژ قورئانێ] تێ نەگەهن، مە پەردە ئێخستینە سەر دلێت وان، و گرانی ئێخستییە د گوهێت واندا، و ئەگەر
ئەو هەمی نیشانان ژی ببینن، هەر باوەرییێ پێ نائینن. و ئەگەر هاتنە دەڤ تە مەدەرکییێ د گەل تە دکەن، و
ئەوێت گاوربووین دبێژن: ئەڤە ژ چیڤانۆکێت بەرێ پێڤەتر نینە. ﴿٢٦﴾ و ئەو خەلکی ژ قورئانێ ددەنە پاش
و ئەو ب خۆ ژی ژێ دویر دکەڤن، و ئەو ژ خۆ پێڤەتر کەسێ بەرئاتاف ناکەن و ئەو ب خۆ ناحەسن ژێ.
﴿٢٧﴾ و ئەگەر تو وان ببینی وەختێ [ڕۆژا قیامەتێ] ل سەر ئاگری دئێنە ڕاوەستاندن [دا دیمەنەکێ ب ترس
بینی]، ڤێجا دبێژن: خۆزی ئەم ڤەگەڕاندباینە [دنیایێ]، و مە نیشان و ئایەتێت خودایێ خۆ درەو نەدانابانە، و
ئەم بووباینە ژ وان یێت باوەری ئینایین.

بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا يُخْفُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ
وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالُوا إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ
بِمَبْعُوثِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ وُقِفُوا عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ قَالَ أَلَيْسَ هَٰذَا
بِالْحَقِّ ۚ قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٠﴾
قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ ۖ حَتَّىٰ إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ
بَغْتَةً قَالُوا يَا حَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ
عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا
إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۖ وَلَلدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٣٢﴾
قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ
وَلَٰكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ
رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا وَأُوذُوا حَتَّىٰ أَتَاهُمْ نَصْرُنَا ۚ
وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَاءَكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ ﴿٣٤﴾
وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِيَ
نَفَقًا فِي الْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِي السَّمَاءِ فَتَأْتِيَهُم بِآيَةٍ ۚ وَلَوْ شَاءَ
اللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى الْهُدَىٰ ۚ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْجَاهِلِينَ ﴿٣٥﴾



﴿٢٨﴾ [نەء.. وەسا نینە وەكی ئەو دخوازن] بەلكی
[ڤێ خۆزییێ دخوازن] ژ بەر ئەوا وان بەری نوكە
د دنیایێدا دڤەشارت [ژ گاوری و دوڕوییاتی و
كریارێت خراب] بۆ وان دیار بوو [و زانین بێ
گۆمان ئەڤرۆ ئەو بەرئاتافن]، و ئەگەر بێنە زڤڕاندن
[بۆ دنیایێ] جارەكا دی دێ زڤڕنە وێ یا فەرمانا
وان هاتییە كرن ژێ دویركەڤن، و ب ڕاستی ئەو
درەوكەرن. ﴿٢٩﴾ گۆتن: ژ ژیانا دنیایێ پێڤەتر چو
ژیانێت دی نینن، و ئەم پشتی مرنێ زێندی نابینەڤە.
﴿٣٠﴾ و ئەگەر تو وان ببینی وەختێ ئەو بەرانبەر خودایێ
خۆ ڕادوەستن [دێ تشتەكێ مەزن بینی] [كو خودێ]
دبێژیت: ما ئەڤە نە ئەو ڕاستییە [ئەوا هەوە باوەری
پێ نەدئینا]؟ دبێژن: بەلێ سویند ب خودایێ مە [ئەڤە
ڕاستییە و هەقە] خودێ گۆت: دێ ڤێجا تامكەنە
ئیزایێ ژ بەر وێ گاورییا هەوە دكر. ﴿٣١﴾ ب ڕاستی
ئەوێت دیدارا خودێ درەو داناین خوسارەت بوون،
هەتا ژ نشكەكێڤە ڕۆژا قیامەتێ ب سەر واندا هاتی،
و بارێ وان یێ گونەهان یێ ل سەر پشتا وان و
گۆتن: وەی بۆ ڤێ پەشێمانییێ ل سەر تەخسیری و سستییا مە كری، وەی چ بارەكێ پیسە ل سەر پشتا وان.
﴿٣٢﴾ ب ڕاستی ژینا دنیایێ ژ ترانە و دلخوازیێ پێڤەتر نینە، و ب ڕاستی ئاخرەت بۆ ئەوێت پارێزكارییێ
دكەن چێترە، ما هوین ئاقلێ خۆ نائیننە سەرێ خۆ؟!. ﴿٣٣﴾ ب ڕاستی ئەم دزانین ئەوا ئەو دبێژن: [كو تو
سێرەبەندی یان خێڤزانكی یان هەلبەستڤانی یان دینی] تە ب خەم دئێخیت، نێ ئەو نە، تە درەوین ددانن،
بەلكی ستەمكار باوەرییێ ب نیشان و ئایەتێت خودێ نائینن. ﴿٣٤﴾ ب ڕاستی بەری تە ژی [خەلكی] هندەك
پێغەمبەر یێت ب درەوین ناڤكرین و دانایین ، بەلێ بێنا خۆ ل سەر درەودانانا خۆ فرەهكرن و هاتنە ئێشاندن،
هەتا هاریكارییا مە بۆ وان هاتی، و چو گوهۆڕین بۆ پەیمانێت خودێ نینە [كو دێ هەر هاریكارییا خودان
باوەران كەت]، و ب ڕاستی ژ بەحس و خەبەرێت پێغەمبەران بۆ تە هاتن [ئەو پێغەمبەرێت باوەری پێ
نەهاتییە ئینان، و هاتینە ئێشاندن، و كا چاوا مە ئەو رزگار كرن و هاریكارییا وان كر]. ﴿٣٥﴾ و ئەگەر ڕوی
وەرگێڕانا وان [ژ ڤی دینی] ل سەر تە یا گران بیت، ڤێجا ئەگەر تە پێ چێ ببیت كو بنبیڤەكێ (نەفەقەكێ)
د ئەردیدا چێكەی یان پێستركەكێ ب ئەسمانیڤە ببەی، دا نیشانەكێ [د ئەردیدا یان د ئەسمانیدا] بۆ وان بینی،
بكە، [بەلێ تو نەشێی، ڤێجا خۆ هند ب خەم نەئێخە، و بلا هند ل سەر تە یا گران نەبیت] و ئەگەر خودێ
ڤیابایە دا وان هەمییان ل سەر ڕاستەڕێییێ كۆم كەت، ڤێجا نەبە ژ نەزانان.

۞ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ
يُرْجَعُونَ ﴿٣٦﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ
قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾ وَمَا
مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا طَـٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ
مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَـٰبِ مِن شَىْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾
وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا صُمٌّ وَبُكْمٌ فِى ٱلظُّلُمَـٰتِ ۗ مَن يَشَإِ
ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٩﴾ قُلْ
أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيْرَ ٱللَّهِ
تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ
مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴿٤١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ
إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَـٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ
يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟ وَلَـٰكِن قَسَتْ
قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ فَلَمَّا
نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ
إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَـٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾





﴿٣٦﴾ ب ڕاستی ئەو دێ باوەرییێ ئینن ئەوێت [ب گوهـ و دلان] دبهیسن، و ئەوێت دلمری [ئانکو گاور] خودێ دێ وان پشتی مرنێ [ڕۆژا قیامەتێ] ساخکەتەڤە، پاشی هەر دێ ب بال ویڤە [ب بال خودێڤە] ئێنە زڤڕاندن. ﴿٣٧﴾ و گۆتن: کا بلا نیشانەك ژ خودایێ وی بۆ مە هاتبایە [وەکی ملیاکەتان، یان چیا بۆ بلند ببانە، دا مە باوەر ژێ کربایە]. بێژە وان: ب ڕاستی خودێ دشێت نیشانەکێ بینیت، [کو وان بڤێت نەڤێت باوەرییێ بینن، بەلێ خودێ ئەو د گەل هنارتنا پێغەمبەران سەربەست و ئازاد هێلایینە بۆ جەڕباندن]، بەلێ باراپتر ژ وان نوزانن [پشتی نیشانێ دێ چ ب سەرێ وان ئێت]. ﴿٣٨﴾ نینە جانەوەرەك ل سەر ڕوییێ ئەردی بچیت یان بالەفڕەك ب چەنگێت خۆ، بفڕیت، هەکە ئەو ژی [د ژین، و مرن، و چێکرن، و ڤەژین و هەوجەیییا خۆدا] وەکی هەوە کۆم نەبن، و مە چو [ژ هەوجەیییێت هەوە] د کتێبێدا [مەخسەد پێ دەپێ پاراستییە] نەهێلایە و ژ بیر نەکریە، ڤێجا پاشی ئەو دێ ب بال خودایێ خۆڤە ئێنە کۆمکرن. ﴿٣٩﴾ و ئەوێت نیشان و ئایەتێت مە درەو دانایین ئەو کەڕ و لالن د تاریستانێدا، و هەر کەسێ خودێ بڤێت دێ گۆمڕا کەت و هەر کەسێ بڤێت دێ ڕاستەڕێ کەت. ﴿٤٠﴾ [هەی موحەمەد بێژە وان]: کا بۆ من بێژن: ئەگەر ئیزایا خودێ ب سەر هەوەدا هات، یان ڕۆژا قیامەتێ، ئەرێ هوین [د ڤی کراسیدا] ژ خودێ پێڤەتر دێ هەوارا خۆ گەهیننە ئێکێ دی؟! ئەگەر هوین ڕاست دبێژن. ﴿٤١﴾ نەء، هوین ژ وی پێڤەتر گازی کەسێ دی ناکەن [ئەگەر وی بڤێت] ئەوا هوین بۆ لاڤلاڤێ دکەن، دێ ژ سەر هەوە ڕاکەت، و ئەوێت هەوە کرینە هەڤپشك، هوین دێ ژ بیرکەن [نە هەوارا خۆ دگەهیننێ و نە هوین ل هیڤییێنە ئیزایێ ژ هەوە بدەتە پاش، چونکی دێ بۆ هەوە دیار بیت چو مفا ئەڤرۆ د واندا نینە]. ﴿٤٢﴾ ب ڕاستی مە پێغەمبەر بۆ ملەتێت بەری تە هنارتینە [چونکی دژی وان ڕاوەستیایینە، و نەگوهدارییا وان کرینە]، ڤێجا مە ژی ئەو ب هەژاری و نەساخییان هنگاڤتن، بەلکی [ل خۆ بزڤڕن] خۆ بۆ خودێ بشکێنن و لاڤلاڤێ ژێ بکەن. ﴿٤٣﴾ بلا وەختێ ئیزایا مە گەهشتییە وان خۆ شکاندبان و لاڤلاڤ کربان، بەلێ دلێت وان ڕەق بوون، و ئەو کارێ وان دکر شەیتانی بۆ دخەملاند و ل بەر چاڤێت وان جوان دکر. ﴿٤٤﴾ ڤێجا وەختێ وان چام بۆ خۆ ژ تشتێ هاتییە سەرێ وان وەرنەگرتی و ژ بیرا خۆ بری، مە ژی دەرگەهێت هەمی تشتان بۆ وان ڤەکرن [ژ خێر و کەرەمان]، هەتا کەیفا وان هاتی ب ئەڤا بۆ وان هاتییە دان، ژ نشکەکێڤە مە هنگاڤتن و بەرئاتاف کرن، ڤێجا ژ نوی بێ هیڤی بوون.

فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾
قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم
مَّنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ
ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ ﴿٤٦﴾ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ
بَغْتَةً أَوْ جَهْرَةً هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا
نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۖ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ
فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا
يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٤٩﴾ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ
عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّى مَلَكٌ ۖ
إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ۚ
أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴿٥٠﴾ وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوٓا۟ إِلَىٰ
رَبِّهِمْ ۙ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٥١﴾
وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ
وَجْهَهُۥ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ
عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾





﴿٤٥﴾ ڤێجا ڕهـو ڕویشالێت وی ملەتێ ستەم کری،
هاتنە بڕین، و هەمی پەسن و سوپاسی بۆ خودایێ
هەمی جیهانان. ﴿٤٦﴾ [هەی موحەمەد] بێژە وان:
بێژنە من ئەگەر خودێ هوین ژ چاڤ و گوهان
کرن، و دلێت هەوە مۆرکرن [تاری و کۆرە کرن] چ
پەرستی ژ خودێ پێڤەتر دشێت [بهیستن و دیتنا هەوە]
بۆ هەوە بینیتەڤە؟ بەرێ خۆ بدێ کا ئەم ب چەند
ڕەنگان نیشانان [بۆ وان] دئینین، و ئەو هەر پاتکا
خۆ ددەنێ. ﴿٤٧﴾ بێژە وان کا بۆ من بێژن ئەگەر ئیزایا
خودێ ژ نشکەکێڤە یان ئاشکەرا بگەهیتە هەوە، ئەرێ
ما ژ ملەتێ ستەمکار پێڤەتر هەیە بەرئاتاف ببیت؟!.
﴿٤٨﴾ و ئەم پێغەمبەران ناهنێرین ئەگەر مزگینئین
و ئاگەهدارکەر نەبن، ڤێجا یێ باوەری ئینا و کار و
کریارێت قەنج کرن، [ڕۆژا قیامەتێ] نە ترس ل سەر
وان هەیە و نە ژی ب خەم دکەڤن. ﴿٤٩﴾ و ئەوێت
نیشان و ئایەتێت مە درەو دانایین، ئیزا دێ وان گریت
ژ بەر ژ ڕێ دەرکەڤتنا وان. ﴿٥٠﴾ بێژە: ئەز نابێژمە هەوە
من خزینەیێت [گەنجینەیێت] خودێ یێت هەین، و
ئەز غەیبێ (ڤەشارتیان) نوزانم، و ئەز نابێژمە هەوە ژی ئەز ملیاکەتم، ژ وەحیا بۆ من هاتی پێڤەتر، ل دویڤ
چو یێ دی ناچم، بێژە [وان]: ئەرێ یێ کۆرە و یێ ب چاڤ وەکی ئێکن؟! ما هوین هزرا خۆ ناکەن.
﴿٥١﴾ و تو، ئەوێت دترسن ل دەڤ خودایێ خۆ بێنە کۆمکرن ب ڤێ قورئانێ ئاگەهدار و هشیار بکە، وان
ژ وی پێڤەتر چو هاریکار و بەرەڤان و مەهدەرچی نینن، دا ئەو پارێزکاریا خودێ بکەن. ﴿٥٢﴾ [هەی
موحەمەد] تو ئەوێت سپێدە و ئێڤاران گازی خودایێ خۆ دکەن [و خودێ دپەرێسن] و [ب پەرستن و گازیا
خۆ] قایلبوون و ڕازیبوونا خودێ دخوازن، دەرنەئێخە، نە چو حسێبا وان ل سەر تەیە و نە چو حسێبا تە ل
سەر وانە، ڤێجا ئەگەر تو وان دەربێخی، دێ بییە ژ زۆرداران.

وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ
عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ وَإِذَا
جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ
رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۖ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا
بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٤﴾
وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٥٥﴾
قُلْ إِنِّى نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۚ قُل
لَّآ أَتَّبِعُ أَهْوَآءَكُمْ ۙ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾
قُلْ إِنِّى عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَكَذَّبْتُم بِهِۦ ۚ مَا عِندِى مَا
تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦٓ ۚ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ يَقُصُّ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ
خَيْرُ ٱلْفَٰصِلِينَ ﴿٥٧﴾ قُل لَّوْ أَنَّ عِندِى مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦ لَقُضِىَ
ٱلْأَمْرُ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٨﴾ ۞ وَعِندَهُۥ
مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ
وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ
ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾

الحزب ١٤



﴿٥٣﴾ [ب ڤـى رەنگـى] مـە هنـدەك ژ وان ب هندەكێت دى جەربانـدن، دا [گرەگـر و كەنكەنـە] بێـژن: ئـەرێ ئەڤەنـە یێـت خـودێ د نـاڤ مـەدا كـەرەم د گـەل كری؟ ئـەرێ مـا خـودێ شـوكورداران چێـتر نانیاسـیت؟! ﴿٥٤﴾ و گاڤـا ئەوێـت بـاوەری ب نیشـان و ئایەتێـت مـە ئینایـین هاتنـە دەڤ تـە، بێژە: [وان] سـلاڤ ل سـەر هـەوە بـن، خودایێ هەوە دلۆڤانی ل سـەر خۆ نڤێسیـیە، كـو ب ڕاسـتی هەچیێ ژ هـەوە ژ نەزانـین خرابیـیەكێ بكـەت، پاشـی تۆبە بكەت و قەنجیـیێ بكـەت [خودێ دێ وی ئازاكەت]، ب ڕاسـتی خـودێ لێنەگر و دلۆڤانە. ﴿٥٥﴾ و ب ڤـی ئاوایـی ئـەم نیشـانان بـاش و ب درێـژی ئاشـكەرا دكەیـن، دا رێـكا گونەهـكاران [گـاوران] ئاشـكەرا ببیـت. ﴿٥٦﴾ [هـەی موحەمـەد] بێـژە وان: ب ڕاسـتی ئـەز ژ پەرسـتنا وان، ئەوێـت هوین ژ بـلی خودێ دپەرێسـن، یـێ هاتیمـە پاشـڤەلێدان [ئانكـو پشـت ڕاسـت بن ئـەز وان ناپەرێسـم] بێـژە: ب ڕاسـتی ئەز ب دویـڤ دلخوازیـیا هـەوە ناكەڤـم [ئەگەر ئـەز ب دویڤ دلخوازییا هـەوە كەڤـتم]، وێ گاڤـێ ئـەز دێ د سـەردا چـم، و ئـەز ژ وان نابـم ئەوێـت هاتینە ڕاسـتەرێكرن. ﴿٥٧﴾ [هەی موحەمەد] بێژە [وان] ب ڕاسـتی من نیشـانەكا گۆمانـبڕ ژ خودایـێ خـۆ هەیە [كو ب ڕاسـتی ئەز یێ ل سـەر رێكا ڕاسـت] و هوین درەو ددانـن. [و باوەرییێ پێ نائینـن] و ئـەوا (ئیزایـا) هویـن لـەزێ لێ دكەن، نـە ل دەڤ منە. برپـار بەس یا خودێیـە، و ئەوە ڕاستیـیێ دبێژیت و ڕۆن دكـەت، و ئـەوە چێتریـن حاكـم. ﴿٥٨﴾ بێـژە: ئەگـەر ئـەو ئیزایا هویـن لەزێ لـێ دكەن، ب مـن بایە، نوكە ئـەوا د ناڤبـەرا مـن و هـەوەدا سـافی ببا. نێ خـودێ ستەمكاران چێـتر دنیاسـیت. ﴿٥٩﴾ و كلیلێت (خزینەیـێت) غەیبـێ (نەپەنـی و ڤەشارتیـیان) ل دەڤ وینـە و ژ وی پێڤەتـر (ژ خـودێ پێڤەتـر) كەس پێ نوزانیت و [خودێ] تشـتێ ل سـەر ئـەردی و د ئاڤێـدا هـەی دزانیـت، و بەلگـەك [ژ جهـێ خـۆ] ناكەڤیت ئەگەر پـێ نەزانیـت، و چو دنـدك د نـاڤ ئەردیـدا نینـن، و چو تەڕ و هشـك نینـن ئەگەر ئەو نەزانیـت، و د دەپێ پارسـتیدا یێ نڤێسـی نەبیت.

وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ
يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَىٰٓ أَجَلٌ مُّسَمًّى ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ
يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٦٠﴾ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۖ
وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ
رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ثُمَّ رُدُّوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ ۚ
أَلَا لَهُ ٱلْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾ قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن
ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ تَدْعُونَهُۥ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً لَّئِنْ أَنجَىٰنَا مِنْ
هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ
ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٦٤﴾ قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن
فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم
بَأْسَ بَعْضٍ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾ وَكَذَّبَ
بِهِۦ قَوْمُكَ وَهُوَ ٱلْحَقُّ ۚ قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ نَبَإٍ
مُّسْتَقَرٌّ ۚ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٦٧﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا
فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ ۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ
ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٨﴾





﴿٦٠﴾ ئـەوە د شـەڤێدا هـەوە دنڤینیـت، و دزانیـت د
ڕۆژێـدا کا هـەوە چ ب دەسـت و پێیان کریـیە، و پاشـی
هـەوە تێـدا هشـیار دکـەت، دا [ڕۆژا هـەوە] بگەهیتـە
وەختـێ خـۆ یـێ دیارکـری و تەمـام بیـت، پاشـی زڤڕینا
هـەوە بـۆ دەڤ ویـیە، پاشـی ئـەوا هـەوە کـری، دێ
هـەوە پـێ ئاگەهدارکـەت. ﴿٦١﴾ و هـەر ئـەوە زال ل
سـەر بەندەیـێت خـۆ سەردەسـت، و ئـەوە ملیاکەتێـت
پارێزڤـان ب سـەر هـەوەدا دهنێریـت، هەتـا دەمـێ مرنـا
ئێـك ژ هـەوە دئێـت هنارتیـیێت مـە دمرینـن [جانـێ
وی دکێشـن]، و ئـەو تەخسـیری و کێماسیـێ ناکـەن.
﴿٦٢﴾ پاشـی ئـەو [پشـتی مرنـێ] دێ ب بـال خودایـێ
خـۆ یـێ دورسـتڤە ئێنـە زڤڕانـدن هشـیار بـن، و [بزانن]
بڕیـار هەر یا ویـیە و ئەو دەسـت سـڤکترین حسـێبدارە.
﴿٦٣﴾ [هـەی موحەمەد] بێـژە: کی هەوە ژ تەنگاڤیـیێت
هشـکاتی و ئاڤـێ ڕزگـار دکـەت وەختـێ ئاشـکەرا و
نەپەنـی دبیتـە لاڤـلاڤ و هەوارهـەوارا هـەوە، [هـەوە
دگـۆت] ب ڕاستی ئەگـەر ڤـێ جارێ ژی مـە ڕزگـار
بکـەت ئەم دێ ژ شـوکورداران بین. ﴿٦٤﴾ بێـژە: خودێیە
هـەوە ژ وان هەمـی تەنگاڤـی و نەخۆشـی و کۆڤانـان ڕزگـار دکەت، و هویـن [هێژ] هەڤپشـکان بۆ چـێ دکەن!!
﴿٦٥﴾ بێـژە: ئـەو [خـودێ] دشـێت هنداڤی هەوە یان د بن پیـیێت هـەوەدا ئیزایەکێ ب سـەر هـەوەدا بینیت، یان
ژی هـەوە ژێکڤەکـەت و بکەتە دەسـتەك دەسـتەك، و هنـدەکان ژ هەوە ب هندەکان بئێشـینیت، بـەرێ خۆ بدێ کا
ئـەم چـاوا نیشـانان ب هەمی ڕەنگان ئاشـکەرا دکەیـن، دا تێ بگەهن [خرابیـیا خـۆ بهێلن و بۆ خـۆ تۆبە بکەن].
﴿٦٦﴾ و ملەتـێ تـە قورئـان درەو دانـا [و بـاوەری پێ نەئینـا]، و ڕاسـتی و هەقی هەر ئـەوە. بێژە: ئەز نەبەرپرسـم
ژ هـەوە. ﴿٦٧﴾ هـەر سـالۆخەکی (خەبەرەکـی) دویماهیکـەکا هەی [کا ڕاسـتە ئان نە]، و پاشـی هوین ب خۆ ژی
دێ زانـن [کا ئـەو قورئـان ڕاسـتە ئـان نـە]. ﴿٦٨﴾ و هـەر گاڤەکا تـە ئەو دیتـن ئەوێـت ترانەیان بۆ خۆ ب نیشـان
و ئایەتێـت مـە دکـەن، ڕوییـێ خـۆ ژ وان وەرگێڕە [و د گـەل نەڕوینـە] هەتا ئـەو نەچنـە سـوحبەتەکا دی، ڤێجا
ئەگـەر شـەیتانی ژ بـیرا تـە بر [کو دڤێـت تو د گـەل وان نەڕوینی و پاتـکا خۆ بدەیێ]، پشـتی بیرهاتنـێ تو ل دەڤ
سـتەمکاران نەڕوینە.

وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنۡ حِسَابِهِم مِّن شَيۡءٖ وَلَٰكِن
ذِكۡرَىٰ لَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ﴿٦٩﴾ وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ
لَعِبٗا وَلَهۡوٗا وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ وَذَكِّرۡ بِهِۦٓ أَن
تُبۡسَلَ نَفۡسُۢ بِمَا كَسَبَتۡ لَيۡسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٞ
وَلَا شَفِيعٞ وَإِن تَعۡدِلۡ كُلَّ عَدۡلٖ لَّا يُؤۡخَذۡ مِنۡهَآۗ أُوْلَٰٓئِكَ
ٱلَّذِينَ أُبۡسِلُواْ بِمَا كَسَبُواْۖ لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ
وَعَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ﴿٧٠﴾ قُلۡ أَنَدۡعُواْ مِن دُونِ
ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعۡقَابِنَا بَعۡدَ إِذۡ
هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِي ٱسۡتَهۡوَتۡهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِي ٱلۡأَرۡضِ
حَيۡرَانَ لَهُۥٓ أَصۡحَٰبٞ يَدۡعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلۡهُدَى ٱئۡتِنَاۗ قُلۡ إِنَّ
هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۖ وَأُمِرۡنَا لِنُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَأَنۡ
أَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُۚ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٧٢﴾ وَهُوَ
ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۖ وَيَوۡمَ يَقُولُ كُن
فَيَكُونُۚ قَوۡلُهُ ٱلۡحَقُّۚ وَلَهُ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِۚ
عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿٧٣﴾



﴿٦٩﴾ و چـو حسێب و گونەهـا وان [ئەوێـت تڕانەیـان بـۆ خـۆ ب ئایەتێـت خـودێ دکـەن] ناکەڤتـە سـەر ئەوێـت پارێزکاریـیا خـودێ دکـەن [ئەگـەر خـۆ ژ وان پاراسـتن و ل جڤاتـێت وان نەڕوینشـتن] بەلـێ شـیرەتکرن و ئاگەهدارکـرن و بیرئینـان ل سـەر وانـە [ئانکـو پارێـزکاران]، دا ل خـۆ بزڤـڕن و تڕانەیـان بـۆ خـۆ ب ئایەتـێت خـودێ نەکـەن. ﴿٧٠﴾ تـو [هـەی موحەمـەد] دەسـت ژ وان بـەردە ئەوێـت دینـێ خـۆ کرینـە تڕانـە و مژویلاهـی و ژیانـا دنیایـێ ئـەو د سـەردا بریـن، و تـو ب قورئانـێ وان شـیرەت بکـە و بینـە بـیرا وان، دا کار و کریارێـت کەسـەکی خودانـێ خـۆ ب بـەر ئیزایـێ نەئێخیـت، و وی ژ خـودێ پێڤەتر چـو بەڕەڤان و هاریـکار و مەهدەرچـی نینـن، [و دا ژ ڤێ ئیزایـێ ڕزگار ببیـت] هنـدی ب پێش خۆڤـە [مالی] بـدەت ژێ نائێـتە وەرگرتـن، ئەڤـە ئـەون یـێت کەڤتینـە بـەر ئیزایـێ ژ بەر کار و کریارێـت وان دکـرن، ڤەخوارنـا ئاڤـەکا کـەل و شـارپایی و ئیزایـەکا ب ژان و دژوار بـۆ وان هەیـە ژ بەر گاوریـیا وان دکـر. ﴿٧١﴾ [هەی موحەمـەد] بێژە: ئەرێ ئـەم دێ چاوا ئـێکی ژ بلی خودێ پەرێسـین، نـە مفایی دگەهینیتە مە و نـە ژی زیانێ..؟ و جارەکا دی پاشـداکێش ببین [مەخسـەد ڤەگەڕینـە تاریاتـی و گاوریـیێ]، پشـتی خـودێ ئـەم ڕاسـتەڕێ کرین، وەکـی وی یێ شـەیتانی ڕاکێشـایی و ژ ڕێکا ڕاسـت دەرئێخسـتی، و پەریشـان کری، و هندەك هەڤال هەبن ڤەخوینن بۆ ڕاستەڕێییـیێ؟! بێژە ب ڕاسـتی، ڕاسـتەڕێیی، ڕاستەڕێـییا خودێیە [ئانکو ئیسـلامە] و فەرمانا مە یا هاتیـیە کرن ئەم خۆ بسـپێرینە خودایـێ هەمـی جیهانـان. ﴿٧٢﴾ و [دیسـا فەرمانا مە هاتیـیە کـرن] ئەم بـەردەوام نڤێـژان بکەین و پارێزکاریـیا خـودێ بکەیـن، و هـەر ئـەوە یـێ هویـن هەمـی [ڕۆژا قیامەتـێ] ل دەڤ کـۆم دبـن. ﴿٧٣﴾ و هـەر ئـەوە ئـەرد و ئەسـمان ب ڕاسـتی چێکریـن، و ڕۆژا بێژیـت هەبـە دێ بیـت، گۆتنا وی ڕاسـتە. و خودانی و سـەروەری یا ویـیە ڕۆژا بـۆق دئێـتە پفکـرن، ئـەوە زانایـێ بەرچـاڤ و نەبەرچاڤـان، و هـەر ئـەوە شـارەزا و کاربنەجهـ.

نصف الحزب ١٤

۞ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصۡنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ
أَرَىٰكَ وَقَوۡمَكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ
مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾
فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ رَءَا كَوۡكَبٗاۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ
قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا
رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمۡ يَهۡدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ
ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ
أَكۡبَرُۖ فَلَمَّآ أَفَلَتۡ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿٧٨﴾
إِنِّي وَجَّهۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ
حَنِيفٗاۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٧٩﴾ وَحَآجَّهُۥ قَوۡمُهُۥۚ قَالَ
أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنِۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ
إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيۡـٔٗاۚ وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ أَفَلَا
تَتَذَكَّرُونَ ﴿٨٠﴾ وَكَيۡفَ أَخَافُ مَآ أَشۡرَكۡتُمۡ وَلَا تَخَافُونَ
أَنَّكُمۡ أَشۡرَكۡتُم بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗاۚ
فَأَيُّ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ أَحَقُّ بِٱلۡأَمۡنِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٨١﴾





﴿٧٤﴾ و گاڤا ئیبراهیمی گۆتییە بابێ خۆ ئازەر: چاوا تو بوتان دکەیە پەرستی، ب ڕاستی ئەز تە و ملەتێ تە د بەرزەبوونەکا ئاشکەرادا دبینم. ﴿٧٥﴾ و هۆسا مەزناتییا ئەرد و ئەسمانان ب ئیبراهیم دا دیتن، دا ببیتە ژ وان یێت ژ دل باوەرییێ دئینن. ﴿٧٦﴾ ڤێجا وەختێ شەڤ ب سەرداهاتی و تاری بوویی، ستێرەك دیت، گۆت: ئەڤە خودایێ منە [ئەڤە دا بەرسڤا وان بدەت و پیچ پیچە وان ب نك خۆڤە بینیت، و بۆ وان نەزانین و خەلەتییا وان دیار بکەت دەمێ ئەو ئێکێ دی ژ بلی خودێ دپەرێسن]. بەلێ دەمێ ئەو [ستێر] ئاڤا بوویی، [ئیبراهیمی] گۆت: ب ڕاستی من ئەو نەڤێن یێت ئاڤا دبن. ﴿٧٧﴾ ڤێجا گاڤا وی دیتی هەیڤ دەرکەڤت، گۆت: ئەڤە خودایێ منە، بەلێ وەختێ ئاڤابوویی گۆت: ب ڕاستی ئەگەر خودایێ من، من ڕاستەڕێ نەکەت، ئەز دێ ژ ملەتێ بەرزەبوویی بم. ﴿٧٨﴾ و گاڤا وی دیتی ڕۆژ دەرکەڤت، گۆت: ئەڤە خودایێ منە، ئەڤە مەزنترە، بەلێ وەختێ ئاڤابوویی، گۆت: گەلی ملەتێ من ب ڕاستی ئەز ژ وان یێ بەریمە ئەوێت هوین دکەنە هەڤپشك [بۆ خودێ]. ﴿٧٩﴾ ب ڕاستی من بەرێ خۆ دا وی [ئانکو من خۆ ب گیان و پەرستنڤە سپارتە خودێ] ئەوێ ئەرد و ئەسمان چێکرین، بەرێ خۆ ژ هەمی تشتان وەردگێڕم بۆ ئیسلامێ، و ب ڕاستی ئەز نە ژ وانم یێت هەڤپشکان چێ دکەن. ﴿٨٠﴾ و ملەتێ وی [د ڕاستا خودێدا] جڕەبڕ و گەنگەشە د گەلدا کر، ئینا گۆت: ئەرێ هوین چاوا جڕەبڕێ د دەرهەقێ خودێدا د گەل من دکەن، و بێ شك وی ئەز یێ ڕاستەڕێ کریم؟. و ئەز ژ وان ناترسم ئەوێت هوین [بۆ خودێ] دکەنە هەڤپشك [کو زەرەرەکێ بگەهیننە من]، ئەو نەبیت یا خودێ حەزکری. زانینا خودێ هند یا بەرفرەهە هەمی تشتان دگریت [و بێی زانینا وی چو زیان و مفا ناگەهنە کەسێ]. ڤێجا ما هوین بۆ خۆ چو دەرس و چامەیان ناگرن. ﴿٨١﴾ و ئەز چاوا ژ وان تشتان ئەوێت هوین دکەنە هەڤپشك بترسم؟! و هوین بێ ترس و بێی هەوە بەلگە و نیشانەك هەبیت هەڤپشکان بۆ خودێ چێ دکەن، ئەرێ کی ژ مە هێژاتری ئێمنییێیە ئەگەر هوین ئەو بن یێت دزانن؟!.

ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ
وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾ وَتِلْكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيْنَٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ عَلَىٰ
قَوْمِهِۦ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٨٣﴾
وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا
مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ
وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾
وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾
وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ ۖ وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ
وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى
بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟
يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ
وَٱلنُّبُوَّةَ ۚ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا۟
بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ۗ
قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾





﴿٨٢﴾ ئەوێت باوەری ئینایین و ستەم و شرك
تێکەلی باوەریـیا خۆ نەکرین، ئەها ئێمنی [ژ ئیزایا
خودێ] بۆ وانە و ئەون یێت هاتینە ڕاستەڕێکرن.
﴿٨٣﴾ ئەڤە بەلگە و نیشانێت مەنە، مە داینە ئیبراهیمی
دا هەمبەری ملەتێ خۆ سەربکەڤیت، مە کی بڤێت ئەم
دێ وی پایەبلند کەین، ب ڕاستی خودایێ تە یێ
کاربنەجهـ و زانایە. ﴿٨٤﴾ و مە ئیسحاق و [کوڕێ
ئیسحاق] یەعقووب دانێ، و مە هەمی ڕاستەڕێ
کرن و مە بەری وان، نووح ژی ڕاستەڕێ کربوو، و
ژ دویندەها وی ژی داوود و سولەیمان و ئەیووب و
یووسف و مووسا و هاروون [مە ڕاستەڕێ کربوون] و
هۆسا ئەم قەنجیکاران خەلات دکەین. ﴿٨٥﴾ و زەکەریا
و یەحیا و عیسا و ئلیاس [ژی مە ڕاستەڕێ کرن]، ئەڤە
هەمی ژ قەنجان بوون. ﴿٨٦﴾ و ئیسماعیل و ئەلیەسەع
و یوونس و (لووط) [ژی مە ڕاستەڕێ کرن]، و ئەڤە
هەمی مە [ب پێغەمبەراتییێ] قەدرێ وان ب سەر یێ
هەمی خەلکی ئێخست. ﴿٨٧﴾ و مە هندەك ژ باب
و باپیر و دویندەهـ و برایێت وان هەلبژارتن، و مە
ڕاستەڕێ کرن. ﴿٨٨﴾ ئەڤە ڕاستەڕێییا خودێیە، ژ بەندەیێت خۆ یێ بڤێت پێ ڕاستەڕێ دکەت، و ئەگەر
وان هەڤال و هەڤپشك بۆ خودێ چێکربانە، دا کار و کریارێت وان کرین پویچ بن. ﴿٨٩﴾ ئەڤێت بۆری
(پێغەمبەرێت بۆری) ئەون یێت مە کتێب و زانین و پێغەمبەراتی داییێ، ڤێجا ئەگەر [قورەیشی] باوەرییێ
[ب ڤان پێغەمبەران] نەئینن، ئێدی ب ڕاستی ئەم دێ ئێخینە بەرێ ملەتەکێ دی، کو قەت گاورییێ پێ
نەکەن. ﴿٩٠﴾ ئەڤە ئەون یێت خودێ ڕاستەڕێ کرین، ڤێجا ل دویڤ ڕاستەڕێکرنا وان هەرە، بێژە: ئەز
[بەرانبەری پێغەمبەراتییا خۆ] چو کرێ ژ هەوە ناخوازم، ب ڕاستی ئەڤە [مەخسەد پێ قورئانە] شیرەت و
بیرئینانە بۆ هەمی خەلکی.

وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ ۗ
قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى
لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم
مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓاْ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ
يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ
يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ
يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩٢﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ
ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِىَ إِلَىَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَىْءٌ
وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى
غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُ ۖ
ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ
ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا
فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَٰكُمْ وَرَآءَ
ظُهُورِكُمْ ۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ
شُرَكَٰٓؤُاْ ۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٩٤﴾



﴿٩١﴾ و ب راستی وەختێ وان گۆتی: خودێ چو تشت
بۆ چو مرۆڤان نەهنارتییە، وان [ئانكو ئسرائیلیان] ب
دورستی وەك پێدڤی رێز ل خودێ نەگرتییە، [و ب
دورستی وەك پێدڤی وان خودێ نەنیاسییە]، [هەی
موحەمەد] بێژە: ئەرێ كێ ئەو كتێبا مووسا پێ هاتی،
كو رۆناهی و راستەرێییە بۆ خەلكی هنارتییە، ئەوا
كو هوین پارچە پارچە ل سەر پەران دنڤیسن، [یا
هەوە پێ خۆش] ئاشكەرا دكەن [بۆ خەلكی دبێژن]
و گەلەكێ [ژ یا هەوە پێ نەخۆش] هوین ڤەدشێرن،
و هەوە [ب وێ كتێبێ كو تەوراتە] ئەو زانی یا نە
هەوە و نە دەیبابێت هەوە زانی؟. بێژە: خودێیە [یێ
ئینایییە خواری]، پاشی وان بهێلە بلا د نەهەقییا
خۆدا بلەیزن. ﴿٩٢﴾ و ئەڤە [ئەڤ قورئانە] كتێبەكە
مە ئینایییە خواری، یا پیرۆز و پڕ خێر و بەرەكەتە
[بۆ خەلكی] و راستدەرئێخا كتێبێت بەری خۆیە، دا
تو خەلكێ مەكەهێ و دەوروبەرێت وێ پێ ئاگەهدار
بكەی و بترسینی، و ئەوێت باوەرییێ ب رۆژا قیامەتێ
دئینن، باوەرییێ پێ (ب قورئانێ) دئینن و ئەو نڤێژا
خۆ دپارێزن. ﴿٩٣﴾ ما كی ژ وی ستەمكارترە یێ درەوێ ژ كیسێ خودێ بكەت، یان بێژیت: وەحییا بۆ من
هاتی و چو وەحی بۆ نەهاتییە، یان ژی ئەوێ بێژیت: ئەز ژی وەكی وێ یا خودێ ئینایییە خواری دێ ئینمە
خواری. ڤێجا هەكە تو ستەمكاران ببینی وەختێ ئەو د سەكەراتا مرنێدا، و ملیاكەت دەستێت خۆ درێژ دكەنێ
[دا جانێ وان بكێشن دا دیمەنەكێ عەجێب و ب ترس بینی] [ڤێجا دبێژنێ]: خۆ خلاس بكەن [خۆ ژ ڤێ
سەكەراتێ دەربێخن، یان ژی خۆ ژ دەستێت مە رزگار بكەن یان ژی جانێ خۆ ب دەست مەڤە بەرنەدەن]،
ئەڤرۆ هوین ب ئیزایەكا ب ژان و هەتكبەر دێ ئێنە جزاكرن، ژ بەر ئەوا هەوە ب نەهەقی د راستا خودێدا
دگۆت، و هەوە خۆ ل سەر نیشانێت خودێ مەزن دكر [و هەوە باوەری پێ نەدئینا]. ﴿٩٤﴾ ب سویند هوین
هەمی دێ ئێك ئێكە بەر ب مە ئێن، هەروەكی مە جارا ئێكێ هوین داین. و هەوە دەست ژ وێ بەردا و
پشت دا وێ یا مە دایییە هەوە [ژ مال و سامان و خۆزی و كەل و پەلێت دنیایێ]، و كا مەهدەرچییێت هەوە،
ئەوێت هەوە دگۆتن ئەڤە هەڤال و هەڤپشكێت خودێنە، كا ئەم د گەل هەوە نابینین؟ ب سویند ئەوا د ناڤبەرا
هەوەدا نەما، و ئەوێت هەوە مەهدەرچی و پشتەڤان بۆ خۆ ددانان ل هەوە بەرزە بوون.

ثلاثة أرباع الحزب ١٤

* إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلۡحَبِّ وَٱلنَّوَىٰۖ يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَمُخۡرِجُ
ٱلۡمَيِّتِ مِنَ ٱلۡحَيِّۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴿٩٥﴾ فَالِقُ ٱلۡإِصۡبَاحِ
وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ حُسۡبَانٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ
ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٩٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهۡتَدُواْ
بِهَا فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٩٧﴾
وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ فَمُسۡتَقَرّٞ وَمُسۡتَوۡدَعٞۗ
قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَفۡقَهُونَ ﴿٩٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيۡءٖ فَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهُ
خَضِرٗا نُّخۡرِجُ مِنۡهُ حَبّٗا مُّتَرَاكِبٗا وَمِنَ ٱلنَّخۡلِ مِن طَلۡعِهَا قِنۡوَانٞ
دَانِيَةٞ وَجَنَّٰتٖ مِّنۡ أَعۡنَابٖ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشۡتَبِهٗا وَغَيۡرَ
مُتَشَٰبِهٍۗ ٱنظُرُوٓاْ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَيَنۡعِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكُمۡ
لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٩﴾ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلۡجِنَّ وَخَلَقَهُمۡۖ
وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾
بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ
صَٰحِبَةٞۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١٠١﴾

١٤٠



﴿٩٥﴾ ب ڕاستی خودێیە دندك و بەركان دپەقینیت [ئانكو ئەوە دندك و بەركان كەر دكەت و بستیك و كیزیكی ژێ دەردئێخیت دا شین ببیت]، زێندیان ژ مریان دەردئێخیت و ژ مریان زێندیان دەردئێخیت، ئەڤەیە خودێ، ڤێجا چاوا هوین خۆ ژ هەقییێ ددەنە پاش. ﴿٩٦﴾ ئەوە سپێدە دەرئێخ و ئەوە شەڤ كرییە جهێ بێنڤەدانێ (ئێورینێ)، و ڕۆژ و هەیڤ كرینە جهێ حسێبان [كو خەلك وەختێت خۆ پێ بزانن]، ئەڤێت هەنێ ژ دانانا خودایێ سەردەست و پرزانایە. ﴿٩٧﴾ و هەر ئەوە ستێر بۆ هەوە داین [ئێخستینە ئەسمانی] دا هوین ڕێكا خۆ د تاریستانێت هشكاتی و دەریایاندا پێ بزانن، ب ڕاستی مە نیشان باش و ب درێژی ئاشكەرا كرن بۆ وان یێت دزانن. ﴿٩٨﴾ و ئەوە هوین ژ ئێك جان داین، پاشی هوین د پشتا باباندا بنەجە بوون و كەڤتنە د مالبچویكاندا، ب ڕاستی مە ئایەت و نیشان باش و ب درێژی ئاشكەراكرن بۆ یێت تێ دگەهن. ﴿٩٩﴾ و ئەوە باران ژ ئەسمانی (ژ عەوران) ئینایییە خوار، و مە ب وێ ئاڤێ زیلك و بستیكا هەمی تشتان دەرئێخستییە، و مە شینكاتی ژێ دا، و ژ وی شینكاتی دندكێت پێكڤە و ل سەرێك دەردئێخین، و مە [ب وێ ئاڤێ] دارقەسپ ژی دەرئێخستینە، و ژ گولیا وێ، ئویشی یێت پێدا شۆڕ و بەردەست دەردئێخین، و مە [ب وێ ئاڤێ] ڕەز و باغ ژی دەرئێخستینە، ژ تری و زەیتوین و هناران، یێت وەكی ئێك و نەوەكی ئێك [تەمەتی ئێك و ئێك ڕەنگ و نەئێك تام]، بەرێ خۆ بدەنە بەرێ وێ وەكی دەردكەڤیت و دگەهیت [كا چاوا دەردكەڤیت، بشكۆژ كەكا بچویك و هەتا مەزن دبیت و دگەهیت]. ب ڕاستی د ڤاندا نیشانێت هەین بۆ یێت باوەری هەین. ﴿١٠٠﴾ و وان ئەجنە، كو خودێ چێكرینە، كرینە هەڤپشك بۆ خودێ و ژ نەزانین كوڕ و كچ [ژ بێ بەختی] بۆ دانایینە، خودێ پاك و پاقژ و بلندە ژ سالۆخەت و نیشانێت ئەو دبێژن. ﴿١٠١﴾ یێ ئەرد و ئەسمان چێكرین چاوا دێ كوڕ و كچ هەبن و وی چو ژن نەیی؟! و وی ب خۆ هەمی تشت یێت چێكرین، و ئەو ب هەمی تشتان ئاگەهدارە.

ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٖ فَٱعْبُدُوهُۚ
وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ وَكِيلٞ ١٠٢ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ
يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ١٠٣ قَدْ جَآءَكُم
بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْۖ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦۖ وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَاۚ
وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٖ ١٠٤ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْأٓيَٰتِ
وَلِيَقُولُواْ دَرَسْتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٖ يَعْلَمُونَ ١٠٥ ٱتَّبِعْ
مَآ أُوحِيَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ١٠٦
وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُواْۗ وَمَا جَعَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظٗاۖ
وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٖ ١٠٧ وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ
مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدْوَۢا بِغَيْرِ عِلْمٖۗ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ
عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ١٠٨
وَأَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٞ لَّيُؤْمِنُنَّ
بِهَاۚ قُلْ إِنَّمَا ٱلْأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِۖ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ
لَا يُؤْمِنُونَ ١٠٩ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ
يُؤْمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ١١٠



﴿١٠٢﴾ [ئەوێ پەسنکری ب سالۆخەت و نیشانێت بۆری]
ئەو خودایێ هەوەیە، ژ وی پێڤەتر چو پەرستی [خودێ]
نینن، ئەوە چێکەرێ هەمی تشتان، وی بپەرێسن،
و ئەوە چاڤدێر ل سەر هەمی تشتان. ﴿١٠٣﴾ چاڤ
ناگەهنێ [ب دورستی نابینن، بەلێ ئاخرەتێ باوەریدار
دێ بینن هەروەکی وی ب خۆ ژڤان پێ دایی ﴿وُجُوهٞ
يَوْمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ * إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ﴾]، و ئەو ب خۆ باش
دبینیت، و ڕاستییا چاڤان ل بەر بەرزە نابیت، و
ئەو هویربین و شارەزایە. ﴿١٠٤﴾ ب ڕاستی بەلگە
و نیشانێت بەرچاڤ [کو وەحی و قورئانە] ژ بەرێ
خودایێ هەوەڤە بۆ هەوە هاتن، ڤێجا هەر کەسێ
ڕاستی دیت [باوەری پێ ئینا] بۆ خۆیە، و هەر کەسێ
ژ دیتنا ڕاستییێ کۆرە ببیت زیانێ ل خۆ دکەت، و
ئەز نە زێرەڤانم ل سەر هەوە [ئەز بەس پێغەمبەر
و بانگهلدێرم]. ﴿١٠٥﴾ و هۆسا ئەم بەلگە و نیشانان
ب درێژی ئاشکەرا دکەین، و ئەو دبێژن [مەخسەد
موشرکن دەمێ گولێ دبن]، تە ئەڤە یا خواندی
[ئانکو تە ئەڤە یا د کتێبێت فەلە و جوهییاندا خواندی]
و دا بۆ ئەوێت دزانن ئاشکەرا بکەین. ﴿١٠٦﴾ ل دویڤ وێ هەرە یا ب وەحی بۆ تە هاتی ژ بەرێ خودایێ
تەڤە، ژ وی پێڤەتر چو پەرستی [خودێ] نینن، و ژ موشرکان بگەڕە [هەلبەت ئەڤە بەری ئایەتا شەڕی بێتە
خوارێ]. ﴿١٠٧﴾ و ئەگەر خودێ ڤیابایە وان هەڤپشك بۆ چێ نەدکرن. و مە تو ل سەر وان نەکرییە زێرەڤان،
و تو ل سەر وان نەچاڤدێری. ﴿١٠٨﴾ و خەبەرا نەبێژنە وان ئەوێت شوینا خودێ دئێنە پەرستن [ژ بوت و
پەرستییان]، ئەگەر ئەو ژی ژ زێدەگافی و ژ نەزانی و نەیارەتی دێ خەبەران بێژنە خودێ. ب ڤی ڕەنگی
مە کار و کریارێت هەر ملەتەکێ د چاڤێت واندا خەملاندینە [هەر ئێك ب کار و کریارێت خۆ یێ شایی و
ڕازییە]، پاشی زڤڕینا وان ب بال خودایێ وانڤەیە. ڤێجا دێ وان ب کار و کریارێت وان کرین ئاگەهدارکەت.
﴿١٠٩﴾ و ب خودێ سویند خوارن سویندێت خۆ یێت مەزن. ئەگەر ئایەتەك و موعجیزەیەك بۆ وان بێت دێ
باوەرییێ پێ ئینن، بێژە: [مەخسەد پێغەمبەرە] ب ڕاستی نیشان و موعجیزە ل دەڤ خودێنە. ما هوین چ
دزانن ئەگەر نیشان و موعجیزە بۆ بێن دێ باوەرییێ ئینن [ئانکو ئەگەر موعجیزە و نیشانان ب چاڤێ سەرێ
خۆ ببینن هەر باوەرییێ نائینن]. ﴿١١٠﴾ و ئەم دل و چاڤێت وان دێ وەرگێڕین [کو هەڤییێ تێ نەگەهن
و نەبینن، هەکە موعجیزە بۆ بێن ژی] هەروەکی جارا ئێکێ باوەری پێ نەئینایین، و ئەم دێ وان هێلین د
خرابییا خۆدا بزڤڕن.

الجزء ٨ الحزب ١٥

۞ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا
عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ
وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴿١١١﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ
عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ
زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا
يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ وَلِتَصْغَىٰٓ إِلَيْهِ أَفْـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ
وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا۟ مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ ﴿١١٣﴾ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِى
حَكَمًا وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَٰبَ مُفَصَّلًا ۚ
وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ
بِٱلْحَقِّ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١١٤﴾ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ
صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾
وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِن
يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿١١٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ
أَعْلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١١٧﴾ فَكُلُوا۟
مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾



﴿١١١﴾ و ئەگەر مە ملیاکەت بۆ وان هنارتبانە، و مری ژی د گەل وان ئاخفتبانە، و مە هەمی تشت ل بەر چاڤان کۆمکربانە، هەر باوەری نەدئینان، ئەو نەبن ئەوێت خودێ ڤیایی باوەرییێ بینن، بەلێ باراپتر ژ وان نوزانن [کو ڕاستەڕێکرن ژ خودێیە]. ﴿١١٢﴾ و ب ڤی ڕەنگی مە بۆ هەر پێغەمبەرەکی شەیتانێت مرۆڤ و ئەجنەیان کرینە دژمن، ژ بۆ سەردابرنێ ئاخڤتنێت خەملاندی و جوانکری د گوهێ ئێکدودا دبێژن. و ئەگەر خودایێ تە ڤیابایە وان وەنەدکر [ئانکو دژمنیا پێغەمبەران نەدکر]. ڤێجا [ژ بەر هندێ] وان و درەوێت وان بهێلە. ﴿١١٣﴾ و دا ل دلێ وان بێت، ئەوێت بێ باوەر ژ ڕۆژا قیامەتێ، و دا ب دویڤ بکەڤن و پێ [ب نەهەقییێ] قاییل ببن، و دا وێ بکەن ئەوا دکەن. ﴿١١٤﴾ [هەی موحەمەد بێژە:] ئەرێ ئەز ژ خودێ پێڤەتر حاکمەکی [دادوەرەکی] دی بخوازم؟! و وی ئەڤ کتێبە [کو قورئانە] یا کو ب دویر و درێژی تشتان دیار دکەت بۆ هەوە ئینایییە خوارێ. و ئەوێت مە کتێب بۆ ئینایین دزانن کو ئەڤ [قورئانە] یا هەقە، ژ بەرێ خودایێ تەڤە هاتییە، ڤێجا ژ گۆمانداران نەبە [کو ئەو ڤێ ڕاستییێ دزانن]. ﴿١١٥﴾ و ب ڕاستی پەیڤێت خودایێ تە [پەیمانا خودێ داییە پێغەمبەرێ خۆ ب سەرکەڤتنێ] ڕاست و دورست هاتن، و چو گوهۆڕین بۆ فەرمانێت خودێ نینە، و ئەو [خودێ] یێ گوهدێر و زانایە. ﴿١١٦﴾ و ئەگەر تو گوهێ خۆ بدەیە باراپتر ژ ئەوێت د ئەردیدا، دێ تە ژ ڕێکا خودێ دەرئێخن و بەرزەکەن، ئەو بەس ل دویڤ گۆمانێ دچن، و ژ درەوان پێڤەتر ناکەن. ﴿١١٧﴾ ب ڕاستی خودایێ تە ئەوێت ژ ڕێکا وی دەرکەڤتین ژ وان چێتر دنیاسیت، و ئەو ڕاستەڕێکرییان ژی چێتر دنیاسیت. ﴿١١٨﴾ ڤێجا ژ وی یێ ناڤێ خودێ ل سەر هاتی بخۆن، ئەگەر هەوە باوەری ب نیشان و ئایەتێت وی هەنە.

وَمَا لَكُمۡ أَلَّا تَأۡكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ وَقَدۡ فَصَّلَ
لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيۡكُمۡ إِلَّا مَا ٱضۡطُرِرۡتُمۡ إِلَيۡهِۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا
لَّيُضِلُّونَ بِأَهۡوَآئِهِم بِغَيۡرِ عِلۡمٍۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُعۡتَدِينَ ١١٩
وَذَرُواْ ظَٰهِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَبَاطِنَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡسِبُونَ ٱلۡإِثۡمَ
سَيُجۡزَوۡنَ بِمَا كَانُواْ يَقۡتَرِفُونَ ١٢٠ وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ
يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٞۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ
إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ ١٢١
أَوَمَن كَانَ مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ
فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَاۚ كَذَٰلِكَ
زُيِّنَ لِلۡكَٰفِرِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٢٢ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا
فِي كُلِّ قَرۡيَةٍ أَكَٰبِرَ مُجۡرِمِيهَا لِيَمۡكُرُواْ فِيهَاۖ وَمَا
يَمۡكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ١٢٣ وَإِذَا جَآءَتۡهُمۡ
ءَايَةٞ قَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ حَتَّىٰ نُؤۡتَىٰ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِۘ ٱللَّهُ
أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥۗ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ صَغَارٌ
عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا كَانُواْ يَمۡكُرُونَ ١٢٤



﴿١١٩﴾ ڤێجا هوین بۆچی ژ وی [گۆشتی] یێ ناڤێ
خودێ ل سەر هاتییە ئینان ناخۆن؟ و ب سویند تشتێ
بۆ هەوە نەدورست ب درێژی دیارکرییە، [نابیت
بدەنە سەر] ژ بلی کو هوین نەچار ببنێ. و ب ڕاستی
گەلەك خەلك ژ نەزانین ب دویڤ دلخوازییا خۆ دکەڤن
و خەلکی ژێ سەردا دبەن. و ب ڕاستی خودایێ
تە، ئەوێت زێدەگاڤییێ دکەن، چێتر دنیاسیت.
﴿١٢٠﴾ و هوین دەست ژ گونەها پێشچاڤ و
نەپێشچاڤ بەردەن و بهێلن. ب ڕاستی ئەوێت گونەهان
دکەن، دێ ب وان گونەهێت کرین ئێنە جزاکرن.
﴿١٢١﴾ و هوین ژ وی [گۆشتی] یێ ناڤێ خودێ
[ژ قەستا و بێ ژ بیرکرن] ل سەر نەهاتییە ئینان، نەخۆن،
و ب ڕاستی [خوارنا گۆشتێ ڤان تەرشان] دەرکەڤتنە
ژ ڕێکا خودێ. و ب ڕاستی شەیتان نیشا هەڤالێت
خۆ ددەن [د گوهێ واندا بانگ ددەن ، و گۆمانان
نیشا وان ددەن] دا جڕەبڕێ د گەل هەوە بکەن، و
ئەگەر هوین گوهێ خۆ بدەنە وان، ب ڕاستی هوین
ژی دێ بنە ژ موشرکان. ﴿١٢٢﴾ ما ئەوێ [دلێ وی ب
گاورییێ] مری بیت، و پاشی مە ئەو [ب باوەرییێ] زێندی کربیت، و مە ڕۆناهییەك بۆ چێ کربیت، پێ
د ناڤ خەلکیدا بچیت، ما وەکی وییە یێ د تاریستانێدا [تاریستانا گاورییێ] کو قەت ژێ دەرنەکەڤیت؟!
[ئەرێ وەکی ئێکن؟ قەت وەکی ئێك نابن]، ئەها هۆسا ئەوێ گاوران دکر بۆ هاتییە خەملاندن.
﴿١٢٣﴾ و هەر ب ڤی ڕەنگی مە د هەمی گوندانـدا کەنکەنە و گرەگرێت وان گونەهکار داناینە، دا ئەو [مەزن]
خاپاندن و خرابییێ تێدا بگێڕن، و ژ خۆ پێڤەتر کەسێ ناخاپینن، و ب خۆ ناحەسن ژێ. ﴿١٢٤﴾ گاڤا ئایەت
و نیشانەك بۆ وان هات، [ئەو کەنکەنە] دبێژن: ئەم باوەرییێ نائینین هەتا بۆ مە ژی [ئایەت و نیشان ژ خودێ]
نەئێن، هەروەکی بۆ پێغەمبەرێت خودێ هاتین. و خودێ ب خۆ چێتر دزانیت کا دێ پێغەمبەراتییا خۆ دەتە
کێ. ئەوێت گونەه کرین دێ ژ خودێ بەرهنگاری سڤکی و ڕەزالەت و ئیزایەکا دژوار بن، ژ بەر خرابییا
وان دکر.

فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ وَمَن
يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجٗا كَأَنَّمَا
يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِۚ كَذَٰلِكَ يَجۡعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ
لَا يُؤۡمِنُونَ ١٢٥ وَهَٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسۡتَقِيمٗاۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا
ربع الحزب ١٥ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ١٢٦ ۞ لَهُمۡ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ
رَبِّهِمۡۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٢٧ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ
جَمِيعٗا يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ قَدِ ٱسۡتَكۡثَرۡتُم مِّنَ ٱلۡإِنسِۖ وَقَالَ
أَوۡلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلۡإِنسِ رَبَّنَا ٱسۡتَمۡتَعَ بَعۡضُنَا بِبَعۡضٖ وَبَلَغۡنَآ
أَجَلَنَا ٱلَّذِيٓ أَجَّلۡتَ لَنَاۚ قَالَ ٱلنَّارُ مَثۡوَىٰكُمۡ خَٰلِدِينَ فِيهَآ
إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ١٢٨ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي
بَعۡضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعۡضَۢا بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٢٩
يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ
يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ
هَٰذَاۚ قَالُواْ شَهِدۡنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَاۖ وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا
وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ١٣٠



﴿١٢٥﴾ ڤێجا هەر كەسێ خودێ بڤێت ڕاستەڕێ بكەت، دێ سنگێ وی بۆ وەرگرتنا ئیسلامێ ڤەكەت، و هەر كەسێ بڤێت گومڕا بكەت، دێ سینگێ وی وەسا تەنگ كەت [وەختێ دبێژنێ موسلمان ببە] هەروەكی سەرئەڤراز دبیتە ئەسمانی، ب ڤی ڕەنگی، خودێ پیساتی و ئیزایێ ددانیتە سەر وان، ئەوێت باوەرییێ نەئینن. ﴿١٢٦﴾ و ئەڤە [دینێ تو ل سەر، هەی موحەمەد] ڕێكا خودایێ تەیە و یا ڕاستە، و ب سویند مە ب درێژی ئایەت و نیشان ئاشكەرا كرن بۆ كەسێت چام وەرگر. ﴿١٢٧﴾ بەحەشتا تەنا و ئێمن بۆ وانە ژ بەرێ خودایێ وانڤە، و ئەوە پشتەڤانێ وان، ژ بەر كار و كریارێت وان دكرن. ﴿١٢٨﴾ و ئەو ڕۆژا كو هەمییان كۆم دكەت [دێ بێژتە وان ] گەلی ئەجنەیان [مەخسەد پێ شەیتانن] هەوە گەلەك ژ مرۆڤان كێشانە تایێ خۆ و د سەردا برن، و هەڤال و دۆستێت وان ژ مرۆڤان گۆتن [دێ بێژن]: خودێو مە هەردووكان مفا بۆ خۆ ژ ئێكدو وەرگرت [مرۆڤان ڕێكێت دلخوازییێ ژ وان وەرگرتن، و شەیتان ژی گەهشتنە مرادا خۆ، دەمێ مرۆڤان گوهدارییا وان كری، و بووینە هەڤال و دۆستێت وان] و ئەم گەهشتینە وی وەختێ تە بۆ مە دانایی و ئاشكەرا كری، [خودێ] دێ بێژیت: ئاگر جهێ هەوەیە، دێ هەروهەر تێدا بن، هندی خودێ بڤێت. ب ڕاستی خودایێ تە كاربنەجهــو پڕزانایە. ﴿١٢٩﴾ و ئەها ب ڤی ڕەنگی هندەك ستەمكاران دێ ب سەر هندەكێت دی ئێخین، ژ بەر كار و كریارێت خراب ئەوێت وان دكرن. ﴿١٣٠﴾ گەلی ئەجنە و مرۆڤان ئەرێ ما پێغەمبەر ژ هەوە ب خۆ بۆ هەوە نەهاتن، نیشان و ئایەتێت من بۆ هەوە بێژن، و هەوە ژ ڤێ ڕۆژێ بترسینن؟ گۆتن [دێ بێژن]: بەلێ ئەم شادەیییێ ل سەر خۆ ددەین [كو پێغەمبەر هاتبوون]، بەلێ ژیانا دنیایێ ئەو خاپاندن و د سەردا برن، و شادەیی ل سەر خۆ دان كو ب ڕاستی ئەو د گاور بوون.

ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا
غَٰفِلُونَ ﴿١٣١﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ۚ وَمَا رَبُّكَ
بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٢﴾ وَرَبُّكَ ٱلْغَنِىُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِۚ
إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم مَّا
يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ ﴿١٣٣﴾
إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَءَاتٍۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿١٣٤﴾ قُلْ يَٰقَوْمِ
ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَامِلٌۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ
مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١٣٥﴾
وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلْحَرْثِ وَٱلْأَنْعَٰمِ نَصِيبًا
فَقَالُوا۟ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَاۖ فَمَا كَانَ
لِشُرَكَآئِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ
يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمْۗ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿١٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ
زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ
شُرَكَآؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا۟ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْۖ
وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١٣٧﴾





﴿١٣١﴾ ئەڤە (هاتنا پێغەمبەران بۆ وان) ژ بەر هندێ
بوو كو ب ڕاستی خودایێ تە چو باژێر و گوندان ب
ستەم و نەهەقی بەرئاتاف ناكەت، و خەلكێ وان د بێ
ئاگەه بن، و های ژ چو نەبیت. ﴿١٣٢﴾ و هەر ئێكی
[ژ قەنج و خرابان ] پێك و پەیسكێت خۆ یێت هەین
ژ بەر كارێ وان كری، و نێ خودایێ تە یێ بێ ئاگەه
نینە ژ كار و كریارێت ئەو دكەن. ﴿١٣٣﴾ و خودایێ تە
یێ دەولەمەند و خودان دلۆڤانییە، ئەگەر بڤێت هەوە
هەمییان دێ تێ بەت [دێ بەرئاتاف كەت و ژ بن
بەت]، و هەر كەسێ [خودێ] بڤێت دێ پشتی هەوە
ئاكنجی كەت، و شوینا هەوە ئینیت، هەروەكی هوین
ژ دویندەها ملەتەكێ دی داپین. ﴿١٣٤﴾ ب ڕاستی تشتێ
پەیمان پێ هاتییە دان بۆ هەوە، دێ هەر ئێت، و هوین
نەشێن ڕاگرن، یان خودێ نەچار بكەن [كو ئەو وێ
پەیمانێ ب سەرێ هەوە نەئینیت ]. ﴿١٣٥﴾ بێژە: ملەتێ
من، هوین ل سەر یا خۆ بن، و كا هوین ل سەر چنە
وێ بكەن، ئەز ژی دێ یا خۆ كەم، ڤێجا ڕۆژا قیامەتێ
هوین ب ڕاستی دێ زانن كا دویماهییا كێ دێ یا
خێرێ بیت [یا مە یان یا هەوە]؟ نێ ب ڕاستی ستەمكار سەرفەراز نابن. ﴿١٣٦﴾ و موشركان ژ وان تشتێت
كو خودێ چێكرین ژ چاندنێ و تەرشی پشكەك بۆ خودێ ئێخستینە و ل دویڤ گۆتنا خۆ [یا بێ دەلیل و بێ
نیشان] گۆتن: ئەڤە بارا خودێیە، و ئەڤە ژی بارا پەرستییێت [بوتێت] مەیە، ئەوا بارا بوتان ناگەهیتە خودێ،
بەلێ ئەوا بارا خودێ دگەهیتە بوتان، چ پیسە حوكمە ئەو دكەن. ﴿١٣٧﴾ و ب هۆسا هەڤپشكێت وان، ژ
موشركان، كوشتنا بچویكێت وان [ب دەستێت وان و ب ساخی] بۆ گەلەك ژ وان خەملاند، دا وان تێ ببەن، و
دینێ وان ژی ل سەر وان تێكەل بكەت [كو هەقی و نەهەقییێ ژێك جودا نەكەن]، ئەگەر خودێ ڤیابایە وان
وەنەدكر، ڤێجا تو وان و درەوێت ئەو دكەن بهێلە.

وَقَالُواْ هَٰذِهِۦٓ أَنۡعَٰمٞ وَحَرۡثٌ حِجۡرٞ لَّا يَطۡعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ
بِزَعۡمِهِمۡ وَأَنۡعَٰمٌ حُرِّمَتۡ ظُهُورُهَا وَأَنۡعَٰمٞ لَّا يَذۡكُرُونَ
ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا ٱفۡتِرَآءً عَلَيۡهِۚ سَيَجۡزِيهِم بِمَا كَانُواْ
يَفۡتَرُونَ ﴿١٣٨﴾ وَقَالُواْ مَا فِي بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ خَالِصَةٞ
لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِنَاۖ وَإِن يَكُن مَّيۡتَةٗ
فَهُمۡ فِيهِ شُرَكَآءُۚ سَيَجۡزِيهِمۡ وَصۡفَهُمۡۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ
عَلِيمٞ ﴿١٣٩﴾ قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوۡلَٰدَهُمۡ سَفَهَۢا بِغَيۡرِ
عِلۡمٖ وَحَرَّمُواْ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفۡتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِۚ قَدۡ ضَلُّواْ
وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴿١٤٠﴾ ۞ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٖ
مَّعۡرُوشَٰتٖ وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٖ وَٱلنَّخۡلَ وَٱلزَّرۡعَ مُخۡتَلِفًا
أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٖۚ
كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦۖ
وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿١٤١﴾ وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ
حَمُولَةٗ وَفَرۡشٗاۚ كُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ
خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿١٤٢﴾

نصف الحزب ١٥





﴿١٣٨﴾ [ژ دەڤ خـۆ] گۆتـن ئـەڤ تـەرش و چاندنـە د قەدەغەكرینـە [ئانكـو نابیـت كەس دەسـتێ خـۆ بكەتێ، چونكـی پشـكا بوتانـە] نابیت كـەس ژێ بخـۆت، ژ بلی وی یـێ مـە بڤێـت [ژ خـولام و خزمەتكارێـت بوتـان]، [و گۆتـن]: ئەڤـە هنـدەك تەرشـن سـویاربوونا وان نەدورسـتە و حەرامـە، و هنـدەك تەرشـان ژی [دگـەل سـەرژێكرنێ] ناڤـێ خـودێ ل سـەر نائینـن، و ڤـێ كریـارێ ژ درەو ب بـال خودێڤـە لـێ ددەن، خـودێ دێ وان ب درەوا وان دكر، جزاكـەت. ﴿١٣٩﴾ و وان [مـوشركان] گـۆت: تشـتێ د زكـێ ڤان تەرشـاندا هەمی بـەس بـۆ زەلامێـت مەیـە، و حەرامە ل سـەر ژنێـت مە، بەلـێ ئەگـەر بـوو، یـێ مـری، هەمـی [ژن و مێر] تێـدا پشـكدارن، نێزیـك خودێ دێ وان ب سـالۆخەكرنا وان جزاكـەت [ژ بـەر حەلالكـرن و حەرامكرنـا بـێ دەلیل و بێ نیشـان]. ب ڕاسـتی خودێ یـێ كاربنەجهـ و زانایە. ﴿١٤٠﴾ ب سـویند، ئەوێـت بچویكێـت خـۆ ژ نەفامـی و خشـیمی كوشـتین بەرزیـان و خوسـارەت بـوون، و ئەوێـت ئـەو رزقـێ خـودێ داییـێ، ژ درەو ژ كیسـێ خـودێ ل سـەر خـۆ حەرامكریـن، بەرزیـان و خوسـارەت بـوون، ئەڤـە گومـڕا بـوون، و قـەت نـە د ڕاسـتەڕێ بـوون. ﴿١٤١﴾ و هـەر ئـەوە جنیـك و باغ [ژ گەلـەك جوینان] دایین، سـەرئەرد [وەكـی مێوێ و گوندۆری و شـتی و كولنـدی... و هتـد] و بلنـد ل سـەر بنـێ خـۆ، [وەكـی دارێـت فێقی] و دار قەسـپ و شـینكاتی كـو فێقییێ وان ڕەنـگ و ڕەنگـە، و زەیتویـن و هنـار یێـت داییـن، وەكـی ئێـك و نەوەكی ئێـك [دبیت تەمەتـی ئێك بـن، و نەئێك تـام بـن، و نەتەمەتـی ئێـك بـن]، ڤێجـا وەختێ ئـەو دار هاتنـە بـەری و فێقـی دان، ژێ بخـۆن و زەكاتـا وان ڕۆژا چنینـێ بـدەن، و دەرێژییـێ (ئیسرافێ) نەكـەن، ب ڕاسـتی خـودێ حـەژ دەسـتدرێیایان ناكـەت. ﴿١٤٢﴾ و تـەرش [گەلـەك جویـن] داییـنە هـەوە، هندەك بۆ بـاری [و هندەكان ژێ ڤەكوژن، و شـیری ژێ بدۆشـن، و مفایی ژ موی و هرییـا وان وەرگـرن] و نڤینـان ژێ چێكـەن، و ژ وێ یا خـودێ كرییە ڕزقـێ هەوە بخـۆن، و ب دویڤ پێنگاڤێت شـەیتانی نەكەڤـن، ب ڕاسـتی شـەیتان بـۆ هـەوە دژمنەكـێ ئاشـكەرا و دیارە.

ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ
قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ
أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾
وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ
حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ
أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا فَمَنْ
أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ
عِلْمٍ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾ قُل لَّآ أَجِدُ
فِى مَآ أُوحِىَ إِلَىَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ
مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ أَوْ
فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ
فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا
كُلَّ ذِى ظُفُرٍ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ
شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلْحَوَايَآ أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ
بِعَظْمٍ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾



﴿١٤٣﴾ و ژ تەرشان هەشت جۆت [گۆشت حەلال] [دایینە]، ژ پەزێ سپی نێر و مێ، و ژ بزنی نێر و مێ. بێژە: ئەرێ خودێ ژ ڤان یێ نێر حەرام کرییە؟ یان ژ وان یێ مێ؟ یان ژی یا (تێژکا) د مالبچویکێ مێیاندا؟ کا ژ زانین بۆ من بێژن، ئەگەر هوین ڕاستگۆنە.
﴿١٤٤﴾ و ژ حێشتران جۆتەك [نێر و مێ] و ژ چێلان جۆتەك [نێر و مێ]، [مە دایینە هەوە]. بێژە: ئەرێ خودێ ژ ڤان یێ نێر حەرام کرییە؟ یان ژ وان یێ مێ؟ یان ژی یا (تێژکا) د مالبچویکێ مێیاندا؟ یان ژی هوین یێت ئامادە و حازربوون وەختێ خودێ فەرمان ب ڤێ چەندێ داییە هەوە؟!! ڤێجا ما کی ژ وی ستەمکارترە ئەوێ درەوێ ژ کیسێ خودێ بکەت، دا ژ نەزانین خەلکی د سەردا ببەت؟ و ب ڕاستی خودێ مرۆڤێت ستەمکار ڕاستەڕێ ناکەت.
﴿١٤٥﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: [گاورێت مەکەهێ] ئەز د وێ وەحییێدا یا بۆ من هاتی [کو قورئانە] تشتەکێ حەرام و نەدورست ل سەر هەر ئێکێ هەبیت نابینم، ژ بلی مراری یان ژی خوینەکا ڕۆن یان ژی گۆشتێ بەرازی، نێ ئەو یێ پیسە، یان ژی ژ گونەهـ ناڤێ غەیری خودێ ل سەر ئینا بیت، ڤێجا هەر کەسێ نەچار ببیت [ژ برساندا ژ حەرامێ بۆری بخۆت] بەلێ بێی کو دل ل سەر هەبیت و زێدە بدەتە بەر [چو گونەهـ ل سەر نینە]، ب ڕاستی خودایێ تە گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿١٤٦﴾ و مە هەمی جانەوەرێت ب پەنج ل سەر جوهییان حەرام و نەدورستکرن، و ژ چێل و پەزان، مە بەزێ وان ژ بلی یێ ب پشتا وانڤە ژ لایێ زکیڤە و ب عویر و ڕویڤیکانڤە، یان یێ تێکەلی هەستی، مە ل سەر وان حەرامکر، و ئەڤ جزایە ژ بەر ستەم و خرابیا وان، مە دا بەر وان، و بێ گۆمان ئەم ڕاستبێژین.

فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمۡ ذُو رَحۡمَةٖ وَٰسِعَةٖ وَلَا يُرَدُّ
بَأۡسُهُۥ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ١٤٧ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ
لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن شَيۡءٖۚ
كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأۡسَنَاۗ
قُلۡ هَلۡ عِندَكُم مِّنۡ عِلۡمٖ فَتُخۡرِجُوهُ لَنَآۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا
ٱلظَّنَّ وَإِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَخۡرُصُونَ ١٤٨ قُلۡ فَلِلَّهِ ٱلۡحُجَّةُ ٱلۡبَٰلِغَةُۖ
فَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ ١٤٩ قُلۡ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ
ٱلَّذِينَ يَشۡهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَاۖ فَإِن شَهِدُواْ فَلَا تَشۡهَدۡ
مَعَهُمۡۚ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱلَّذِينَ
لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ ١٥٠ ۞ قُلۡ
تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ أَلَّا تُشۡرِكُواْ
بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗاۖ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم
مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡۖ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلۡفَوَٰحِشَ
مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَۖ وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ
إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ١٥١

ثلاثة أرباع الحزب ١٥



﴿١٤٧﴾ ڤێجا ئەگەر باوەر ژ تە نەکرن، و وان تو درەوین دانایی، بێژە: خودایێ هەوە خودان دلۆڤانییەکا بەرفرەهە [لەزێ ل جزادانا هەوە ناکەت، بەلێ د گەل دلۆڤانییا وی یا بەرفرەهـ]، ئیزایا وی ژ مرۆڤێت گونەهکار نائێتە وەرگێڕان. ﴿١٤٨﴾ ئەوێت هەڤال و هەڤپشك بۆ خودێ چێکرین دێ بێژن: ئەگەر خودێ ڤیابایە، نە مە و نە باب و باپیرێت مە، هەڤپشك چێ نەدکرن، و مە چو تشت [ل دەڤ خۆ] حەرام نەدکر، هەر هۆسا ئەوێت بەری وان ژی پێغەمبەرێت خۆ درەوین دانان و باوەری پێ نەئینان، هەتا تامکرینە ئیزایا مە، بێژە: ئەرێ هەوە دەلیل و زانینەك [ل سەر وێ گۆتنا هوین دکەن] هەیە؟ [نیشا مە بدەن] ب ڕاستی هوین ژ گۆمانێ پێڤەتر ل دویڤ چو یێ دی ناچن، و هوین ژ بلی درەوێ چو یێ دی نابێژن. ﴿١٤٩﴾ بێژە: نێ دەلیلێ ب هێز و گۆمانبڕ یێ خودێیە، ئەگەر ڤیابایە [هەوە ڕاستەڕێ بکەت] دا هەوە هەمییان ڕاستەڕێ کەت. ﴿١٥٠﴾ بێژە: کا شاهدێت خۆ بینن، ئەوێت [وێ] شادەییێ ددەن کو خودێ ئەڤە یێت حەرامکرین [مەخسەد ئەو جوینێت حێشترانن ئەوێت وان حەرامکرین، و تشتێت دی (بزڤڕە ئایەتا (١٠٣) ژ سۆرەتا مائیدە)]، ڤێجا ئەگەر [ژ نەهەقی] شادەیی دان، تو شادەییێ د گەل وان نەدە. و ب دویڤ دلخوازییا وان نەکەڤە، ئەوێت ئایەت و نیشانێت مە درەو دانایین، و ئەوێت باوەرییێ ب قیامەتێ نەئینن، و هەڤبەران بۆ خودایێ خۆ ددانن، و بەرێ خۆ ژێ وەردگێڕن. ﴿١٥١﴾ بێژە وەرن دا ئەوێ خودێ ل سەر هەوە حەرامکری بۆ هەوە بخوینم، و بێژم: چو تشتان بۆ خودێ نەکەنە هەڤپشك، و د گەل دەیبابان د قەنج بن، و زاڕۆکێت خۆ ژ ترسا برسێ نەکوژن، ئەم ڕزقێ هەوە و یێ وان ددەین، و نێزیکی گونەهان نەبن چ یێت ئاشکەرا و چ یێت نەپەنی، و ئەو نەفسا خودێ کوشتنا وێ حەرامکری، نەکوژن ژ بۆ تۆلڤەکرنێ [بەرانبەر کوشتنەکێ] نەبیت. ئەها ئەڤەیە خودێ فەرمانا هەوە پێ کری، دا هوین ئەقلەکی بۆ خۆ بگرن [و بەرهنگاری گونەهان نەبن].

وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۖ
وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا
وُسْعَهَا ۖ وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُوا۟ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۖ وَبِعَهْدِ
ٱللَّهِ أَوْفُوا۟ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾
وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ
فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ
تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِىٓ
أَحْسَنَ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ
رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٤﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ
وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ أَن تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ
طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ ﴿١٥٦﴾
أَوْ تَقُولُوا۟ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ
مِنْهُمْ ۚ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ ۚ
فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا ۗ سَنَجْزِى ٱلَّذِينَ
يَصْدِفُونَ عَنْ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْدِفُونَ ﴿١٥٧﴾



﴿١٥٢﴾ و نێزیکی مالێ سێوی نەبن، ئەگەر بۆ خێرا
وی نەبیت [کو بۆ بپارێزن و بۆ شۆل پێ بکەن]، هەتا
ب دورستی تێ نەگەهیت و بالق نەبیت، و هوین ب
دورستی پیڤان و کێشانێ [د کڕین و فرۆتنێت خۆدا]
بکەن، و ئەم کەسێ ژ شیانا وی زێدەتر ژێ ناخوازین، و
ئەگەر هوین ئاخڤتن، ڕاستییێ بێژن، خۆ هەکە ئەوێ
هوین د دەرهەقێ ویدا دئاخڤن مرۆڤێ هەوە ژی بیت،
و پەیمانا هەوە د گەل خودێ دایی ب جە بینن، ئەڤەیە
خودێ ئەمرێ هەوە پێ کری، دا هوین پێڤەبچن و
تۆبە بێتە بیرا هەوە. ﴿١٥٣﴾ و ب ڕاستی ئەڤەیە ڕێکا
من، کو ڕێکەکا ڕاست و دورستە، ڤێجا بگرن و ل
دویڤ هەڕن، و چو ڕێکێت دی نەگرن، دێ هەوە ژ
ڕێکا خودێ دەرئێخن و هەوە ژێکڤەکەن. ئەها ئەڤەیە
خودێ فەرمانا هەوە پێ دکەت، دا هوین پارێزکاریا
خودێ بکەن. ﴿١٥٤﴾ و مە تەورات دا مووسایی، کو
تەمامکرنا قەنجییێیە ل سەر وی یێ قەنجی کری، و
ئاشکەراکەرە ب درێژی بۆ هەمی تشتان [ئەو بڕیارێت
ئەو د دینێ خۆدا هەوجە دبنێ]، و ڕاستەڕێکەرە [ڕێکا
ڕاستەڕێکرنێیە] و دلۆڤانییە، دا ئەو باوەرییێ ب دیدارا (لیقائا) خودایێ خۆ بینن. ﴿١٥٥﴾ و ئەڤ قورئانە
کتێبەکا پیرۆزە مە بۆ تە ئینایییە خوارێ، ڤێجا ل دویڤ هەڕن، و هشیار بن ژێ دەرنەکەڤن، دا هوین ب
بەر دلۆڤانییا خودێ بکەڤن. ﴿١٥٦﴾ [و ئەڤ قورئانا پیرۆز مە ئینایییە خوارێ] دا هوین نەبێژن: [گەلی
قورەیشییان] کتێب بەس بۆ هەردو دەستەکێت بەری مە [جوهی و فەلەیان] یێت هاتینە خوارێ، و ئەم ب
خۆ ژی چو ژ خواندنا کتێبێت وان نوزانین، و ژێ بێ ئاگەهین. ﴿١٥٧﴾ و دا هوین نەبێژن: ب ڕاستی ئەگەر
کتێب بۆ مە هاتبایە، ئەم دا ژ وان [ژ جوهی و فەلەیان] ڕاستەڕێتر بین، ڤێجا ب ڕاستی نیشان و دەلیلەك ژ
خودایێ هەوە [کو قورئانە] بۆ هەوە هات، کو ڕێکا ڕاستەڕێیی و دلۆڤانییێیە، ڤێجا ما کی ژ وی ستەمکارترە
یێ ئایەتێت خودێ درەو دانایین [و ددانیت]، و ڕوییێ خۆ ژێ وەردگێڕیت و خەلکی ژی ژێ ددەتە پاش؟
ئەوێت ڕوییێ خۆ ژ قورئانا مە وەردگێڕن، و خەلکی ژی ژێ ددەنە پاش، ئەم دێ وان ب ئیزایەکا دژوار ئیزا
دەین ژ بەر ڕوی وەرگێڕانا وان.

هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ يَأۡتِيَ رَبُّكَ أَوۡ يَأۡتِيَ بَعۡضُ
ءَايَٰتِ رَبِّكَۗ يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفۡسًا إِيمَٰنُهَا
لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ أَوۡ كَسَبَتۡ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيۡرٗاۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓاْ
إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ
فِي شَيۡءٍۚ إِنَّمَآ أَمۡرُهُمۡ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿١٥٩﴾
مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ
فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ قُلۡ إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ
إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ دِينٗا قِيَمٗا مِّلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۚ وَمَا كَانَ
مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ
رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرۡتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٦٣﴾
قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِي رَبّٗا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيۡءٖۚ وَلَا تَكۡسِبُ كُلُّ
نَفۡسٍ إِلَّا عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم
مَّرۡجِعُكُمۡ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿١٦٤﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ
خَلَٰٓئِفَ ٱلۡأَرۡضِ وَرَفَعَ بَعۡضَكُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي
مَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ رَّحِيمُۢ ﴿١٦٥﴾



﴿١٥٨﴾ ل هیڤیــیا چنــە؟ ئـەو ل هیڤیـــیێنە ملیاکـەت [روح کێشـان] بـۆ وان بێـت [و ڕوحـا وان بکێشـیت]، یـان ژی ل هیڤیـــیا هاتنـا خودایـێ تەنـە [ڕۆژا قیامەتـێ، دا حوکمـی د ناڤبـەرا وانـدا بکـەت]، یـان ژی ئـەو ل هیڤیـــیا هنـدەك نیشـان و ئایەتێـت خودایـــێ تەنـە [یـــێت ڕۆژا قیامەتـێ، و ژ نوی باوەریـــێ بینـن]. ڕۆژا نیشـانێت قیامەتێ دئێن ئێدی باوەرئیـــنانا کەسـێ مفایی ناگەهینـــتێ، ئەگـەر بـەری هنگـی بـاوەری نەئینابیـت، یـان ژی باشـی و قەنجـی د باوەریـــیا خـۆدا نەکربیـت. بێـژە: ل هیڤیـــیا وێ ڕۆژێ بـن، ب ڕاسـتی ئـەم ب خـۆ ژی یێ ل هیڤیـــیێ. ﴿١٥٩﴾ ب ڕاسـتی ئەوێـت دینێ خۆ پارچـە پارچە کریـن و ل سـەر ژێك جودا بوویـــین [کو هندەکـێ وەردگـرن و هندەکـێ دهێلن، و باوەریـــێ ب هنـدەك پێغەمبـەران دئینـن و ب هندەکان نائینـن، وەکی جوهـی و فەلەیان]، و ئەو ب خۆ ژی بوویـــینە دەسـتەك دەسـتەك، تـە شـۆلە ژ وان نینـە [کا خـودێ دێ چ سـزا دەتـە بـەر وان، و تـو ژ وان نەبەرپرسـی]، و حسـابا وان بـەس ل دەڤ خودێیـە، پاشـی ئـەو دێ وان ب کار و کریارێـت وان ئاگەهدارکـەت. ﴿١٦٠﴾ هـەر کەسـێ [ڕۆژا قیامەتـێ] ب خێرەکـێ بێـت، خـودێ دێ دەهــ جـار وەکـی وێ خـێرێ دەتـێ [و یـێ بڤێـت دێ بـۆ پـتر لـێ کـەت هەتـا حەفـت سـەد قاتـان و پـتر]، و هـەر کەسـێ ب گونەهەکـێ بێـت، ب گونەهـەکا وەکـی وێ پێڤەتـر نائێتـە جزاکـرن، و ستەم لـێ نائێـتە کـرن [نـە خێرێـت وی کێـم دبـن و نـە گونەهــ ل سـەر زێـدە دبـن]. ﴿١٦١﴾ [هـەی موحەمـەد] بێـژە [وان]: ب ڕاسـتی خودایێ من ئـەز یـێ ڕاسـتەڕێ کریمـە ڕێکـەکا (دینەکێ) ڕاسـت و بـێ خواریـــیە، دینێ ئیبراهیمیـــیە، کـو دینەکێ ڤـەدەرە ژ خـواری و خرابیـــێ، و ئـەو ب خـۆ ژی [ئانکـو ئیبراهیـم] نـە ژ مـوشرکان بـوو. ﴿١٦٢﴾ [هـەی موحەمـەد] بێژە [وان]: ب ڕاسـتی نڤێـژا مـن، و هـەر تشـتێ ئـەز ڤەکـوژم، یان پەرسـتن و عیبادەتـێ مـن، و ژیانا مـن و مرنا من، خـرەك بـۆ خودایـێ هەمـی جیهانانـە. ﴿١٦٣﴾ هەڤـال و هەڤپشـك بـۆ نینـن، و فەرمانا من ب ڤـێ هاتیـــیە کرن، و ئـەز ب خـۆ موسـلمانێ ئێکێمـە. ﴿١٦٤﴾ [هـەی موحەمـەد] بێـژە [وان]: ئـەز چـاوا ژ بـلی خـودێ خودایەکێ دی بـۆ خـۆ بگـرم، و ئـەو ب خـۆ خودایـــێ هەمـی تشـتانە؟! و کـەس نائێتـە ئێـزادان ب وێ گونەهێ نەبیـت یا وی کـری، و کـەس گونەهـا کەسـێ هەلناگریـت، پاشـی زڤڕینـا هـەوە هـەر ب بـال خودایـێ هەوەڤەیە، ڤێجـا [وێ ڕۆژێ کـو ڕۆژا قیامەتێیـە] دێ [خـودێ] هـەوە ب وی تشـتێ هویـن تێـدا ژێك جـودا و نەئێـك، ئاگەهدارکەت. ﴿١٦٥﴾ و ئـەوە هویـن د ئەردیـدا کرینـە جهگرتـی [پشـتی ملەتێت بـۆری ڤەبریایـن]، و هندەك ژ هـەوە ب پێك و پەیـــیسکان ب سـەر هندەکێت دی ئێخسـتن، دا هەوە ب وی تشـتێ دایـــیە هەوە بجەڕبینیت، ب ڕاسـتی خودایێ تـە زوی ئێزایـێ ددەتـە بەر وان یـــێت جەڕباندی، و ب ڕاسـتی ئەو گونەهـ ژێبـەر و دلۆڤانە.

سُورَةُ الأَعۡرَافِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحزب ١٦

الٓمٓصٓ ١ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ
لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ٢ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم
مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ٣
وَكَم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ
قَآئِلُونَ ٤ فَمَا كَانَ دَعۡوَىٰهُمۡ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَآ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ
إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ٥ فَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرۡسِلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَنَسۡـَٔلَنَّ
ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٦ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖۖ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ٧
وَٱلۡوَزۡنُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّۚ فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ
ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٨ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ
أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَظۡلِمُونَ ٩ وَلَقَدۡ مَكَّنَّٰكُمۡ
فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَۗ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ١٠
وَلَقَدۡ خَلَقۡنَٰكُمۡ ثُمَّ صَوَّرۡنَٰكُمۡ ثُمَّ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ
ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ لَمۡ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ١١



## سۆرەتا ئەعراف

### ل مەکەهێ هاتیـە خوارێ (٢٠٦) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ ب ڤـی رەنگـی دئێتـە خوانـدن: ئەلـف، لام، میـم، صـاد، و ئەڤـە ژ تیپێـت عەرەبینـە کـو هەمـی تێکـدا (٢٨) تیپن، نیشـانن ل سـەر ئیعجـازا قورئانـێ ڕامان ژێ ئەڤەیـە کـو عەرەبـان پـێ چـێ نابیـت قورئانـەکا وەکـی ڤـێ قورئانـێ بدانـن، هەرچەنـدە زمانـێ وان هـەر ژ ڤان حەرفـان پێـك هاتیـە. ﴿٢﴾ ئـەڤ قورئانـە کتێبەکـە بـۆ تـە هاتیـە خـوارێ، ڤێجـا بـلا سـینگێ تە تەنـگ نەبیت [ژ بـەر هەلویسـتێ مـوشرکان ژ تـە و ڤـێ کتێبـێ]، دا تو وان ب ڤـێ قورئانێ بترسـینی و هشـیار بکـەی، و دا ببیتە بیرئینـان بۆ خـودان بـاوەران. ﴿٣﴾ [گەلی موسـلمانان] ل دویـڤ وێ هـەڕن ئـەوا ژ دەڤ خودایـێ هـەوە بـۆ هەوە هاتیـیە خـوارێ [کـو قورئانە] و ژ بلی خـودێ ب دویڤ چـو هاریکار و دۆستـان نەکەڤن [چ بـوت و چ خێڤزانك و چ سـەرەگاور]، و هویـن کێـم پێڤـە دچـن و دئیننـە بیرا خـۆ. ﴿٤﴾ و گەلـەك گوند و باژێـر مە وێرانکـرن، ئیزایا مـە ب شـەڤ و ئـەو نڤستی [وەکی ملەتـێ (لـوط) پێغەمبەر] یـان ژی د نیڤـا ڕۆژێـدا و د خەوا نیڤـرۆدا [وەکی ملەتـێ شـوعەیب پێغەمبـەر] ب سـەر وانـدا هـات. ﴿٥﴾ ڤێجـا وەختـێ ئیزایـا مە ب سـەر وانـدا هاتـی، وان چو ئاخڤتـن نەبـوو، ژ بلـی کـو گۆتـن: ب ڕاسـتی ئـەم ستەمکار بوویـین [لـەوا ئەڤە هاتە سـەرێ مـە، و چو سـتەم ل مـە نەهاتیـە کـرن]. ﴿٦﴾ بـێ گۆمان ئـەم دێ پسیارا وان [ملەتان] کەیـن، ئەوێـت پێغەمبەر بۆ چۆیـین [کا وان چـاوا پێشوازیـیا وان کـر، و چـاوا بەرسـڤا وان دا؟] و دێ پسـیارا پێغەمبـەران ژی کەیـن [ئەوێت بـۆ وان هاتینە هنارتـن کا وان ملەتـان گوهـێ خـۆ دایـینە وان یـان نـە؟]. ﴿٧﴾ بـێ گۆمـان ئـەم دێ ژ زانـین بـۆ وان بێژیـن کا چ د ناڤبـەرا وانـدا چێبوویـییە، و نەکـو ئـەم نەیـێت حـازر و دیاربوویـین [هەتا تشـتەك ل بەر مە بـەرزە ببیت].

﴿٨﴾ وێ ڕۆژێ کێشـان و سـەنگ یا ڕاسـت و دورسـتە [بێ کێم و کاسیـیە] ڤێجا هەر کەسـێ ترازیـیا وی گران بـوو، [و سـەرێ ترازیـیا کار و کریارێـت وی یـێـت قەنـج ژ یـێـت خـراب گرانـتر لـێ هـات] ئەڤە ئەون یـێـت سـەرفەراز. ﴿٩﴾ و هـەر کەسـێ ترازیـیا وی سـڤك بـوو [و سـەرێ ترازیـیا کار و کریارێـت وی یـێـت خراب ژ یـێـت قەنـج گرانـتر لـێ هـات]، ئەڤـە ئـەون یـێـت وان خـۆ خوسـارەت کریـن، ژ بـەر وێ گـاوری و باوەری نەئینانـا وان ب نیشـان و ئایەتێـت مـە دکـر. ﴿١٠﴾ و مـە هویـن د ئەردیـدا بنەجهکـرن، و هەمـی ئەگەرێـت ژینـێ ژ خـوارن و ڤەخوارنـێ مـە بـۆ هـەوە کرنـە تێـدا، [دگـەل هنـدێ ژی] کێمـەك ژ هـەوە شـوکورا خـودێ دکـەن.

﴿١١﴾ و ب سـویند مـە هویـن چێکرینە [ئادەم بابێ هەمی مرۆڤان مە ژ هەرییـێ چێکرییـە] پاشـی مـە [ئادەم] ب وێنە و شـکل ئێخسـت، پاشـی مە گۆتە ملیاکەتان سوجدەیـێ [سـوجدەیا سـلاڤ و ڕێزگرتنێ] بۆ ئادەمی ببەن، هەمیـیان سـوجدە بر، ئبلیس تـێ نەبیت، نە ژ سـوجدەبران بوو.

قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ
وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ
فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾
قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ
صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ
وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ قَالَ
ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ
أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾ وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ
شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسْوَسَ
لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ
مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ
أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾
فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا
يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن
تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾



﴿١٢﴾ [خودێ] گۆتێ: چ وەل تە كر تو سوجدەیێ نەبەی، دەمێ من فەرمانا تە پێ كری؟ گۆت: ب راستی ئەز ژ وی چێترم، تە ئەز یێ ژ ئاگری چێكریم، و تە ئەو یێ ژ هەرییێ چێكری. ﴿١٣﴾ [خودێ] گۆت: ژ جهێ خۆ و ژ بەحەشتێ داكەڤە [سەر ئەردی] چونكی بۆ تە دورست نینە تو خۆ تێدا [ل سەر ئەمرێ من] مەزن بكەی. ژێ دەركەڤە، [ب راستی] تو ژ رەزیل و رسوایانی. ﴿١٤﴾ [ئبلیسی] گۆت: مۆلەتێ بدە من هەتا رۆژا مری ژ گۆران رادبن [من بهێلە ساخ]. ﴿١٥﴾ [خودێ] گۆت: ب راستی تو یێ مۆلەت دایی. ﴿١٦﴾ [ئبلیسی] گۆت: ژ بەر كو تە ئەز گومڕا كرم و د سەردا برم، ب سویند ئەز دێ بۆ وان د رێكا تە یا راستدا روینم [و دێ وان ژێ دەمە پاش، و كەڤمە د رێكا واندا]. ﴿١٧﴾ پاشی ئەز دێ ژ پێشیا وانڤە و ژ پشتا وانڤە و ژ ملێ وان یێ راستێڤە و ژ ملێ وان یێ چەپێڤە ئێمە وان [مەخسەد ژ هەمی رەخانڤە دێ رێكێت خراب ب بەر وان ئێخم و وان د سەردا بەم] كو تو باراپتر ژ وان شوكوردار و خودان باوەر نەبینی. ﴿١٨﴾ [خودێ] گۆت: ب رسوایی و عەیبداری و دەرئێخستی ژێ دەركەڤە، ب سویند هەر كەسێ ب دویڤ تە بكەڤیت [بلا بزانن] ئەز دێ دۆژەهێ ب هەوە هەمییان تژی كەم. ﴿١٩﴾ و هەی ئادەم، تو و كابانیا خۆ د بەحەشتێدا ئاكنجی ببن، و ژ هەر جهێ هەوە بڤێت بێ منەت ژێ بخۆن، بەلێ خۆ نێزیكی ڤێ دارێ نەكەن، ئەگەر هوین دێ ژ ستەمكاران ئێنە هەژمارتن. ﴿٢٠﴾ بەلێ شەیتانی وەسواس و گۆمان ئێخستە دلێ وان [و د بەر خەلەتییرا كرن] دا شەرمگەهێ (عەورەتێ) وان یێ ڤەشارتی بۆ وان دیار بكەت، و گۆت (گۆتە وان): خودایێ هەوە هوین ژ ڤێ دارێ نەدایینە پاش ژ بەر هندێ نەبیت دا هوین هەردو نەبنە ملیاكەت یان ژی هەروهەر د بەحەشتێدا نەمینن. ﴿٢١﴾ و [شەیتانی] بۆ وان سویند خوار كو ب راستی من خێرا هەوە دڤێت. ﴿٢٢﴾ ڤێجا ب فند و فێلان ئەو خاپاندن و نزمكرن و ئینانە خوارێ [و د بەر خەلەتییرا كرن] ڤێجا وەختێ ژ دارێ خوارین شەرمگەهێ وان بۆ وان دیاربوو، و دەست هاڤێتنێ بەلگێت بەحەشتێ ژێڤەكرن و خۆ پێ نخافتن، و خودێ وان گازی كرە وان: ما من هوین ژ وێ دارێ نەدابوونە پاش [و نەهیا هەوە ژێ نەكربوو]، و ما من نەگۆتبوو هەوە، ب راستی شەیتان بۆ هەوە دژمنەكێ دیار و ئاشكەرایە.

قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ
مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٢٣ قَالَ ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ
فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ٢٤ قَالَ فِيهَا تَحۡيَوۡنَ وَفِيهَا
تَمُوتُونَ وَمِنۡهَا تُخۡرَجُونَ ٢٥ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ
لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ
ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ٢٦ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ
ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا
لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ
حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ٢٧
وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةٗ قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ
قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٢٨
قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ
وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ ٢٩
فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُۚ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُواْ
ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُم مُّهۡتَدُونَ ٣٠



﴿٢٣﴾ و هەردووكان [ئادەم و حەوایێ] گۆت: خودایێ
مە، مە ستەم ل خۆ كر، و ئەگەر تو ل مە نەبۆری و
گونەهێت مە ژێ نەبەی و دلۆڤانییێ ب مە نەبەی،
ب سویند ئەم دێ ژ خوسارەتان بین. ﴿٢٤﴾ مە گۆت
[وان]: هوین هەمی ژ بەحەشتێ داكەڤن، هەڕنە
خواریێ، هندەك ژ هەوە ل هندەكان نەیار و دژمن، و
هەتا دەمەكێ دیاركری [ل دەڤ خودێ]، د ئەردیدا
ئاكنجی ببن، و مفایی ژێ وەرگرن. ﴿٢٥﴾ [خودێ]
گۆت: هوین دێ تێدا (د ئەردیدا) ژین و تێدا مرن،
و هوین دێ ژێ دەركەڤن [بۆ قیامەتێ]. ﴿٢٦﴾ گەلی
دویندەها ئادەمی ب ڕاستی مە جلكەك بۆ هەوە هنارت
[ئانكو مە نیشا هەوە دا كو هوین هەمی ڕەنگێت
پەڕۆك و جلكان چێ بكەن] كو شەرمگەهێ هەوە
ڤەشێریت، و جلكەك هەوە جوان بكەت و بخەملینیت،
و جلكێ تەقواداری و باوەرییێ باشترە، ئەڤە ژ نیشان
و كەرەمێت خودێنە بەلكی بیننە بیرا خۆ. ﴿٢٧﴾ گەلی
دویندەها ئادەمی: [هشیاری خۆ بن] شەیتان هەوە د
سەردا نەبەت، هەروەكی دەیبابێت هەوە ژ بەحەشتێ
دەرئێخستین، جلكێ وان ژ بەر وان دكەت، دا شەرمگەهێ وان نیشا وان بدەت، ب ڕاستی ئەو (شەیتان)
و دەستەكا خۆ هەوە دبینن و هوین وان نابینن. ب ڕاستی مە شەیتان كرینە دۆست و هەڤال بۆ وان یێت
باوەرییێ نەئینن. ﴿٢٨﴾ و [ئەوێت باوەرییێ نەئینن] هەر گاڤەكا كریارەكا كرێت و پیس كرن [وەكی شركێ
یان زڤرین ب ڕویسی ل دۆر كەعبەیێ... هتد] دبێژن: مە باب و باپیرێت خۆ یێت ل سەر [ڤی كاری]
دیتین و خودێ ب خۆ فەرمانا مە یا پێكری. بێژە: ب ڕاستی خودێ فەرمانێ ب كریارێت كرێت ناكەت،
هوین وێ ژ كیس خودێ دبێژن یا هوین نەزانن؟!!. ﴿٢٩﴾ بێژە: خودایێ من فەرمان ب ڕاستی و هەقییێ
كرییە، و هوین هەمی د وەختێ هەر نڤێژەكێدا و ل هەر جهەكێ هەبیت بەرێ خۆ بدەنە خودێ، و ژ دل وی
ب تنێ بپەرێسن، و كا چاوا وی جارا ئێكێ هوین چێكرینە، دێ جارەكا دی وەسا هەوە ساخكەتەڤە (دێ
زڤرنەڤە). ﴿٣٠﴾ دەستەكەك [خودێ] ڕاستەڕێكرن [كو موسلمانن]، و دەستەكەك ژی هێژایی گومڕابوونێ
بوون [كو گاورن]، وان شەیتان شوینا خودێ پشتەڤان و هاریكار بۆ خۆ گرتن و هزر دكەن ژی كو ئەو د
ڕاستەڕێكرینە.

ربع الحزب ١٦
* يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ
وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٣١ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ
ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ
فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا خَالِصَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ
لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ٣٢ قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا
بَطَنَ وَٱلۡإِثۡمَ وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ
بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٣ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ
أَجَلٞۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ٣٤
يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي فَمَنِ
ٱتَّقَىٰ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٣٥ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ
بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا
خَٰلِدُونَ ٣٦ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ
بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ يَنَالُهُمۡ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ
رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ قَالُوٓاْ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ
قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ٣٧



﴿٣١﴾ گەلی دویندەهـا ئادەمـی، د گـەل هـەر نڤێژەکـێ یـان تەوافەکـێ جلکێـت خـۆ یـێت جـوان بکەنـە بـەر خـۆ و بخـۆن و ڤەخـۆن و دەرێژیـیـێ و دەسـتدرێیانێ نەکـەن، ب ڕاسـتی خـودێ حـەژ دەسـتدرێیایان ناکەت. ﴿٣٢﴾ [هـەی موحەمـەد] بێـژە: [وان ئەوێـت ڕویـس ل دۆر کەعبەیـێ دزڤـڕن و تشـتێ خودێ بۆ وان دورسـت کـری ژ خوارنـان ل سـەر خـۆ حـەرام دکـەن] کـێ ل سـەر هـەوە حـەرام کرییـە، ب وان جلکێـت خـودێ دایـینە هـەوە هویـن خـۆ جـوان بکەن، یـان خۆشیـیێ ب وان خوارنێـت خـۆش ببـەن، ئەوێـت خودێ دایـینە بەندەیـێـت خـۆ؟ بێـژە: ئەڤـە د ژیانـا دنیایـێدا بـۆ وانن یـێت باوەری ئینایـین [و گاور ژی د گەل هەڤپشـکن]، بەلـێ ڕۆژا قیامەتـێ خۆسـەر بـۆ وان ب تنێنـە، [ئانکـو بـۆ خـودان بـاوەران]، هۆسـا ئـەم نیشـان و ئایەتێـت خـۆ ڕۆن و ئاشـکەرا دکەیـن بـۆ وان یـێت دزانـن و تێ دگەهـن. ﴿٣٣﴾ بێژە: ب ڕاسـتی خودایێ مـن گونەهێت مەزن، یـێت ئاشـکەرا و یێـت نەپەنی و هەمـی ڕەنگێت گونەهـان د گـەل زۆرداریـیا ژ بـێ بەختـی حەرامکرینە و [دیسـا حـەرام کرییـە] هویـن هەڤـال و هەڤپشـکان بـێ دەلیـل و نیشـانەك پـێ هاتبیـت بـۆ خـودێ چێکـەن و [دیسـا حـەرام کرییـە]، هویـن وێ ژ کیسـێ خـودێ بێـژن یـا هویـن نەزانـن. ﴿٣٤﴾ و هـەر ملەتەکـی وەختەکێ دیارکـری یـێ هـەی، ڤێجا هـەر گاڤەکا وەختـێ وان هات نە بیستەکێ پـاش دکەڤن و نە بیسـتەکێ پێـش دکەڤن.

﴿٣٥﴾ گـەلی دویندەهـا ئادەمـی ئەگـەر پێغەمبەر ژ هـەوە بۆ هەوە هاتن ئایەت و نیشـانێت مە ل سـەر هەوە خواندن [کتێبـا مـن بـۆ هـەوە خوانـدن و ئەحکامێت من بـۆ هەوە دیارکـرن، گوهداریـیا وان بکـەن و ڕێـکا وان بگرن]، ڤێجـا هەر کەسـێ پارێزکاریـیا خـودێ بکـەت و کار و کریارێت قەنج بکـەت، نە ترس ل سـەر وان هەیە و نە ب خـەم ژی دکەڤـن [ژ بـەر ئەوا د دنیایـێدا بەرهنگـاری وان بوویـی]. ﴿٣٦﴾ و ئەوێـت ئایەت و نیشـانێت مە درەو دانایـین و خـۆ ژێ مەزنـتر دیتـین، ئەڤـە دۆژەهینە و هەروهـەر دێ د ئاگـرێ دۆژەهێـدا بن. ﴿٣٧﴾ ڤێجـا ما کی ژ وی ستەمکارترە ئـەوێ درەوێ ژ کیسـێ خـودێ دکـەت، یان ژی نیشـان و ئایەتێـت وی درەو بدانیـت؟ ئەڤە دێ گەهنـە بـارا خـۆ ئـەوا بۆ وان هاتیـیە نڤێسـین [ژ دنیایێ]، هەتـا ملیاکەتێت مـە دئێنـە وان و جانێ وان دسـتینن، و دبێـژن: کا ئەوێـت هـەوە شـوینا خـودێ دپەراسـتن؟ دێ بێژن: ئـەو ل مە بەرزەبوون، و شـادەیی ل سـەر خۆ دان کو ب ڕاسـتی ئـەو د گاوربوون.

قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِۖ كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعٗا قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٨﴾ وَقَالَتۡ أُولَىٰهُمۡ لِأُخۡرَىٰهُمۡ فَمَا كَانَ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلٖ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٤٠﴾ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٞ وَمِن فَوۡقِهِمۡ غَوَاشٖۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّۖ وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾



﴿٣٨﴾ [و خودێ ئەڤە] گۆت [وان]، هوین د گەل ملەتێت بەری هەوە بۆرین ژ ئەجنە و مرۆڤان هەرنە د ناڤ ئاگریدا، هەر وەختێ كۆم و دەستەكەك چۆنە تێدا، لەعنەتان ل یێ بەری خۆ دكەن [چونكی وان ددانن ئەگەر بۆ سەرداچۆنا خۆ] هەتا هەمی تێدا دگەهنە ئێك، یێت پاشییێ [ئەوێت دویماهیا هەمیان چۆیینە تێدا دویكەفتییێت گرەگر و كەنكەنانە] د راستا یێت پێشییێدا دێ بێژن: خودایێ مە، ئەها ئەڤەنە ئەم گومڕا كرین و د سەردا برین، ڤێجا تو دوقات ئیزایێ بدە بەر وان، [خودێ] دێ بێژیت: بۆ هەر ئێكێ ژ هەوە ئیزا دوقاتە، بەلێ هوین پێ ناحەسن [ئانكو چو كۆم و دەستەك نوزانن كا ئیزایا كۆم و دەستەكا دی چەندە]. ﴿٣٩﴾ پێشییێت وان دێ بێژنە دویكەفتییێت خۆ [یێت د دویف خۆڕا] هوین ژ مە چێتر نینن، ڤێجا ئیزایێ بخۆن و تامكەنێ [هەروەكی مە خواری] ژ بەر كار و كریارێت هەوە دكرن [ژ گونەهـ و خرابییان]. ﴿٤٠﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ب نیشان و ئایەتێت مە نەئینایین و درەو دانایین و خۆ ل سەر مەزن دیتین، دەرگەهێت ئەسمانی بۆ وان نائێنە ڤەكرن [كو جانێ وان یان دوعایێت وان یان كارێ وان سەربكەڤیت] و ئەو ناچنە بەحەشتێ هەتا حێشتر د كونا دەرزیكێڕا نەچیت، و ئەم هۆسا گونەهكاران ئیزا ددەین. ﴿٤١﴾ دۆشەكا بن وان و لحێفا ل سەر وان دێ ژ جەهنەمێ بن، و ب ڤی ڕەنگی ئەم ستەمكاران ئیزا ددەین. ﴿٤٢﴾ و ئەوێت باوەری ئینایین و كار و كریارێت قەنج كرین، ئەم كەسەكی ژ بارێ وی زێدەتر ژێ ناخوازین، ئەو بەحەشتینە، و هەروهەر دێ د بەحەشتێدا بن. ﴿٤٣﴾ و مە كەرب و نەڤیان ژ دلێت وان ئینادەر، ڕویبار د بن وانڕا دچن، و گۆتن سوپاسی هەمی بۆ خودێ، ئەوێ ئەم بۆ ڤێ ڕاستەڕێ كرین [و ئەڤە كرییە ڕزقێ مە] و ئەگەر خودێ ئەم ڕاستەڕێ نەكربانە، ئەم ڕاستەڕێ نەدبوویین [و ئەڤە نەدبوو ڕزقێ مە]، ب سویند پێغەمبەرێت خودایێ مە ب هەقییێ هاتبوون، و گازی وان هاتەكرن: ئەو [ئەڤ بەحەشتا نوكە هوین تێدا] ئەو بەحەشتە ئەوا هەوە ب كار و كریارێت خۆ گەهاندییە خۆ.

وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا
رَبُّنَا حَقّٗا فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ
مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن
سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴿٤٥﴾ وَبَيۡنَهُمَا
حِجَابٞۚ وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٞ يَعۡرِفُونَ كُلَّۢا بِسِيمَىٰهُمۡۚ وَنَادَوۡاْ
أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ ﴿٤٦﴾
۞ وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ تِلۡقَآءَ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا
مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم
بِسِيمَىٰهُمۡ قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٨﴾
أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ
لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴿٤٩﴾ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ
ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ
إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ لَهۡوٗا
وَلَعِبٗا وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ فَٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰهُمۡ كَمَا نَسُواْ
لِقَآءَ يَوۡمِهِمۡ هَٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ﴿٥١﴾



نصف الحزب ١٦



﴿٤٤﴾ بەحەشتیان گازی دۆژەهیان کر: [گەلی
جەهنەمیان] ب ڕاستی ئەم گەهشتینە وێ پەیمانا
خودایێ مە دایییە مە و مە دیت، ئەرێ هەوە ژی ئەو
پەیمانا خودایێ هەوە دایییە هەوە ب دورستی دیت؟
گۆتن: بەلێ [مە دیت] پاشی بانگهلدێرەکی د ناڤ
واندا گازی کر: ب ڕاستی لەعنەتا خودێ ل سەر
ستەمکاران بیت. ﴿٤٥﴾ ئەوێت دکەڤنە د ڕێکا خودێدا
[و خەلکی ژێ ددەنە پاش] و دڤێن یا خواروڤیچ
بیت [و ل بەر دلێ خەلکی ڕەش دکەن و دزانن ژی
ڕێکا ڕاست و دورست هەر ئەوە]، و ئەو ب خۆ ژی
باوەرییێ ب ڕۆژا ئاخرەتێ نائینن. ﴿٤٦﴾ و د ناڤبەرا
هەردوکاندا [جەهنەمی و بەحەشتیان] ناڤبڕەك هەیە،
و ل سەر ناڤبڕێ هندەك زەلام هەنە [ئەون یێت خێر و
گونەهێت وان هندی ئێك لێ هاتین، نە خێرێت وان
پترن کو بچنە بەحەشتێ، و نە گونەهێت وان پترن
کو بچنە دۆژەهێ، ل وێرێ یێت هاتینە ڕاوەستاندن
هەتا خودێ فەرمانێ د دەرهەقێ واندا ددەت] ئەو
هەردوکان [جەهنەمی و بەحەشتیان] ب سیما و
سەروچاڤێت وان دنیاسن، گازی خەلکێ بەحەشتێ دکەن: سلاڤ ل هەوە بن، ئەو ب خۆ هێژ نەچۆیینە
بەحەشتێ بەلێ حەز دکەن و ل وێ هیڤییێنە. ﴿٤٧﴾ هەر وەختەکێ بەرێ وان بۆ ڕەخێ جەهنەمیان هاتە
وەرگێڕان، دبێژن: خودایێ مە تو مە نەبە د گەل مرۆڤێت ستەمکار. ﴿٤٨﴾ و خودانێت ناڤبڕێ (ئەعرافیان)
گازی هندەك زەلامان [یێت دۆژەهی] کر، ب سەر و چاڤان دنیاسین، گۆتن: کۆمکرن [یا مالی و
خزمەتکاران] و خۆمەزنکرنا هەوە چ مفا گەهاندە هەوە. ﴿٤٩﴾ ئەرێ ئەڤە [بەحەشتی] ئەون ئەوێت هەوە
سویند دخوار خودێ دلۆڤانییێ ب وان نابەت [و ناچنە بەحەشتێ]؟ هەڕنە بەحەشتێ، نە ترس بۆ هەوە
هەیە و نە هوین ب خەم دکەڤن. ﴿٥٠﴾ و دۆژەهی گازی دکەنە بەحەشتیان، هندەك ژ ئاڤێ یان ژ ئەوا خودێ
دایییە هەوە ب سەر مەدا داڕێژن، دێ بێژن: ب ڕاستی خودێ ئەڤە هەردو یێ ل سەر گاوران حەرامکرین.
﴿٥١﴾ ئەوێت دینێ خۆ کرینە مژویلاهی و تڕانە، و ژیانا دنیایێ ئەو د سەردا برین. ڤێجا ئەڤرۆ [ڕۆژا قیامەتێ]
ئەم ژی دێ وان برسی و تێنی هێلینە د ئاگریدا، هەروەکی وان ژی دیتنا ڤێ ڕۆژێ ژ بیرا خۆ بری، و باوەری
ب ئایەت و نیشانێت مە نەئینایی.

وَلَقَدۡ جِئۡنَٰهُم بِكِتَٰبٖ فَصَّلۡنَٰهُ عَلَىٰ عِلۡمٍ هُدٗى وَرَحۡمَةٗ
لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٢﴾ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأۡوِيلَهُۥۚ يَوۡمَ يَأۡتِي تَأۡوِيلُهُۥ
يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّ
فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشۡفَعُواْ لَنَآ أَوۡ نُرَدُّ فَنَعۡمَلَ غَيۡرَ ٱلَّذِي
كُنَّا نَعۡمَلُۚ قَدۡ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ
يَفۡتَرُونَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ
فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ
يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ
بِأَمۡرِهِۦٓۗ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾
ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٥٥﴾
وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا وَٱدۡعُوهُ خَوۡفٗا وَطَمَعًاۚ
إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يُرۡسِلُ
ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَيۡ رَحۡمَتِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ سَحَابٗا ثِقَالٗا
سُقۡنَٰهُ لِبَلَدٖ مَّيِّتٖ فَأَنزَلۡنَا بِهِ ٱلۡمَآءَ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ مِن كُلِّ
ٱلثَّمَرَٰتِۚ كَذَٰلِكَ نُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾





﴿٥٢﴾ و ب ڕاستی مە کتێبەك [کو قورئانە] بۆ وان
[قورەیشییان] ئینا، و مە ئەحکامێت وێ ژ زانین ب
درێژی دیارکرن، و بۆ وان یێت باوەرییێ دئینن
ڕاستەڕێکەرە [و ڕێکا هیدایەتێیە] و دلۆڤانییە.
﴿٥٣﴾ ئەرێ خۆ دگرن کا دویماهیا وێ دێ چیتە سەر
چ؟ ئەو ل هیڤیا چو نینن ئاشکەرابوونا دویماهیا ڤێ
نەبیت [ئانکو ل هیڤیا هندێنە ژڤان و گەفێت د ڤێ
کتێبێدا هاتین ژ خەلات و جزایان دێ ڕاست دەرکەڤن
یان نە؟]. ڤێجا وەختێ دویماهیا وێ دئێت [کو ڕۆژا
قیامەتێیە] ئەوێت بەری نوکە پشتا خۆ دایینێ و ژ بیرا
خۆ برین، دێ بێژن: ب سویند پێغەمبەرێت خودایێ
مە ب هەقییێ بۆ مە هاتبوون، ئەرێ ڤێجا ئەڤرۆ
مەهدەرچی هەنە ل مەهدەرا مە بێن [ئانکو خۆزی
ئەڤرۆ ئێك بۆ مە ببایە بەرەڤان و مەهدەرچی] یان ژی
[بۆ دنیایێ] هاتباینە زڤڕاندن، دا مە ئەو کارە کربایە
نە ئەوێ مە دکر؟ ب سویند وان خۆ خوسارەت کر،
و ئەو درەوا وان دکر [بەرەڤانی و مەهدەرا بوتان] ل
وان بەرزەبوو. ﴿٥٤﴾ ب ڕاستی خودانێ هەوە خودێیە
ئەوێ ئەرد و ئەسمان د شەش ڕۆژاندا دایین، پاشی بلند بوو سەر عەرشی [بلندبوونەکا هێژاییی خودێ، و بێ
چاوایی] شەڤێ ب سەر ڕۆژێ داددەت [و ڕۆناهیا وێ هلدچنیت] ب لەز ب دویڤ دکەڤیت، و ڕۆژ و هەیڤ
و ستێر ژی یێت دایین، و ئەو ل بەر فەرمانا وی د ڕاوەستایینە. بزانن: دان و دانەکار [یا گەردوونی] ب وییە،
پاکی و بلندی و پڕ خێر و بەرەکەت بوو خودانێ هەمی جیهانان. ﴿٥٥﴾ هوین خۆ شکاندی و ب ترس و ب
ئاشکەرایی و بەرزەیی دوعا ژ خودایێ خۆ بکەن، ب ڕاستی خودێ حەژ زێدەگاڤان ناکەت [ئەوێت زێدە
ددەنە بەر د دوعایاندا، و دەنگێ خۆ گەلەك بلند دکەن]. ﴿٥٦﴾ و خرابییێ د ئەردیدا نەکەن پشتی چاککرنا
وی (ب هاتنا پێغەمبەران و دیارکرنا بەرنامەیێ خودێ) و ب ترس و هیڤی دوعا ژ خودێ بکەن، ب ڕاستی
دلۆڤانیا خودێ نێزیکی قەنجیخوازانە. ﴿٥٧﴾ و هەر ئەوە بای بەری ڕەحما خۆ [ئانکو بارانێ] ب مزگینی
دهنێریت، گاڤا عەورێت گران [بای] ب ئاڤێ هەلگرتن، ئەم بەرێ وان ددەینە وەلاتەکێ هشك، و پێ ئاڤ
ددەین، و ئەم ئاڤێ بۆ وان ژ عەوران دئینین، و ب وێ ئاڤێ هەمی ڕەنگێت فێقی مە دەرئێخستن، و هۆسا [کا
چاوا ئەردێ مری و هشك مە ساخ و شین کر] مریان ژی [ڕۆژا قیامەتێ] دێ زێندی کەینەڤە [و ژ گۆڕان
دێ ڕاکەینەڤە] دا هوین دەرسان ژێ وەرگرن [و بزانن چو فەرقی د ناڤبەرا ساخکرنا ئەردی و مریاندا نینە].

وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ
إِلَّا نَكِدًا ۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ ﴿٥٨﴾
لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم
مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥٩﴾
قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٦٠﴾ قَالَ يَـٰقَوْمِ
لَيْسَ بِى ضَلَـٰلَةٌ وَلَـٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٦١﴾
أُبَلِّغُكُمْ رِسَـٰلَـٰتِ رَبِّى وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ
مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٢﴾ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ
عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُوا۟ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٦٣﴾
فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيْنَـٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ
كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا عَمِينَ ﴿٦٤﴾ * وَإِلَىٰ
عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ
غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦٓ
إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾
قَالَ يَـٰقَوْمِ لَيْسَ بِى سَفَاهَةٌ وَلَـٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٦٧﴾

ثلاثة أرباع الحزب ١٦





﴿٥٨﴾ ئەردێ ب خێروبێر و باش، دەرامەتێ وی ب دەستویرا خودێ [باش] دئێت (نموونەیە بۆ مرۆڤێ ئیماندار هاتییە گۆتن، کو ئەو یێ باشە و کار و کریارێت وی ژی دێ د باش بن) و ئەردێ پیس و کێرنەهاتی، ژ دەرامەتێ بێخێر پێڤەتر ژێ نائێت [نموونەیە بۆ مرۆڤێ گاور هاتییە گۆتن، کو ئەو یێ کێرنەهاتییە و کار و کریارێت وی ژی کێرنەهاتی دئێن]، و ئەم هۆسا و ب هەمی ڕەنگان نیشانان بۆ یێت سوپاسییا خودێ دکەن ئاشکەرا دکەین. ﴿٥٩﴾ و ب سویند مە نووح [ب پێغەمبەراتی] بۆ ملەتێ وی هنارت، گۆت: گەلی ملەتێ من، خودێ ب تنێ بپەرێسن، ب ڕاستی هەوە ژ وی پێڤەتر چو خودێ نینن، ب ڕاستی [ئەگەر هوین ئێکێ دی ژ وی پێڤەتر بپەرێسن] ئەز ژ ئیزایا ڕۆژەکا مەزن [ڕۆژا قیامەتێ، یان تۆفانێ] ل سەر هەوە دترسم. ﴿٦٠﴾ کەنکەنەیێت ملەتێ وی گۆتن: ب ڕاستی ئەم [ب ڤێ داخوازا تە کو ئەم خودێیەکێ ب تنێ بپەرێسین] تە د گومڕایی و بەرزەبوونەکا ئاشکەرادا دبینین. ﴿٦١﴾ نووحی گۆت: گەلی ملەتێ من، چو گومڕایی و بەرزەبوون ل دەڤ من نینە، بەلێ ئەز پێغەمبەرم [بۆ هەوە] ژ نك خودانێ هەمی جیهانان. ﴿٦٢﴾ پەیامێت خودایێ خۆ دگەهینمە هەوە، و هەوە شیرەت دکەم، و یا ئەز ژ خودێ دزانم هوین نوزانن. ﴿٦٣﴾ ئەرێ هوین حێبەتی دبن و دویر ددانن کتێبەك ژ خودایێ هەوە ل سەر ئەزمانێ زەلامەکی ژ هەوە بۆ هەوە بهێت؟ دا هەوە [ژ دویماهییا هەوە] بترسینیت، و دا هوین پارێزکارییا خودێ بکەن، دا ب بەر دلۆڤانییا خودێ بکەڤن. ﴿٦٤﴾ باوەری پێ نەئینان و درەوین دانان، ڤێجا مە ئەو [ئانکو نووح] و یێت د گەل دگەمییێدا، رزگار کرن، و ئەوێت باوەری نەئینایین، و نیشان و ئایەتێت مە درەو دانایین، مە [د ئاڤێدا] خەندقاندن. و ب ڕاستی ئەو، ملەتەکێ کۆرەبوون [هەقی نەددیتن و دل یێت ژێ تاری بوون]. ﴿٦٥﴾ بۆ ملەتێ عادی هەر ژ وان ب خۆ مە هوود [ب پێغەمبەراتی] هنارت، گۆت: گەلی ملەتێ من، خودێ بپەرێسن، ب ڕاستی هەوە ژ وی پێڤەتر چو خودێ نینن، ئەرێ ما هوین ژ ئیزایا وی ناترسن. ﴿٦٦﴾ کەنکەنەیێت ملەتێ وی ئەوێت گاوربوویین گۆتن: ئەم تە دبینین تو یێ عەقل سڤکی، و ب ڕاستی ئەم تە ژ درەویناان ددانین. ﴿٦٧﴾ گۆت: گەلی ملەتێ من، چو عەقل سڤکی ل دەڤ من نینە، بەلێ ئەز پێغەمبەرم ژ نك خودانێ هەمی جیهانان.

أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ أَوَعَجِبۡتُمۡ أَن
جَآءَكُمۡ ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنكُمۡ لِيُنذِرَكُمۡۚ
وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ قَوۡمِ نُوحٖ وَزَادَكُمۡ
فِي ٱلۡخَلۡقِ بَصۜۡطَةٗۖ فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٦٩﴾
قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِنَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَحۡدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعۡبُدُ
ءَابَآؤُنَا فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٧٠﴾
قَالَ قَدۡ وَقَعَ عَلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ رِجۡسٞ وَغَضَبٌۖ
أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسۡمَآءٖ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم
مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٖۚ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ
ٱلۡمُنتَظِرِينَ ﴿٧١﴾ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا
وَقَطَعۡنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ وَمَا كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٧٢﴾
وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمۡ صَٰلِحٗاۗ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ
مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ قَدۡ جَآءَتۡكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡۖ
هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةٗۖ فَذَرُوهَا تَأۡكُلۡ فِيٓ أَرۡضِ
ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٧٣﴾



﴿٦٨﴾ ئەز پەیام و بڕیارێت خودایێ خۆ دگەهینمە هەوە، و ئەز بۆ هەوە شیرەتکارەکێ دلسۆز و دلبێشم. ﴿٦٩﴾ ئەرێ هوین حێبەتی دبن و دویر ددانن کتێبەك ژ خودایێ هەوە ل سەر ئەزمانێ زەلامەکی ژ هەوە بۆ هەوە بهێت؟ دا هەوە [ژ ئیزا و دیدارا خودێ] بترسینیت. و بیننە بیرا خۆ وەختێ خودێ هوین کرینە ئاکنجییێت ئەردی پشتی د هیلاکبرنا ملەتێ نووحی، و هێز و قەلافەت ژ وان پتر دا هەوە، ڤێجا نیعمەت و کەرەمێت خودێ بیننە بیرا خۆ دا هوین سەرفەراز ببن. ﴿٧٠﴾ گۆتن: ئەرێ تو بۆ مە هاتی دا ئەم خودێ ب تنێ بپەرێسین؟! و ئەوێت باب و باپیرێت مە دپەرستن بهێلین؟! ڤێجا وێ ئیزایا تو پێ گەفان ل مە دکەی و دترسینی، بۆ مە بینە ئەگەر تو ژ ڕاستبێژانی. ﴿٧١﴾ [هوود پێغەمبەر] گۆت: هوین هەژی جزا و کەربا خودێ بوون، هوین چاوا جڕەبڕێ د هندەك ناڤاندا د گەل من دکەن کو هەوە و باب و باپیرێت هەوە [ژ نك خۆ] یێت دانایین؟ خودێ چو دەلیل و نیشان پێ نەئینایینە خوارێ، خۆ [ل هیڤیا ژڤان و ئیزایا خودێ ئەوا هوین دخوازن] بگرن، ئەز ژی د گەل هەوە دێ ژ چاڤەڕێیان بم. ﴿٧٢﴾ ڤێجا [وەختێ ئیزا ب سەر واندا هاتی] مە هوود و یێت د گەل ب دلۆڤانییا خۆ رزگار کرن، و ئەوێت باوەری ب ئایەتێت مە نەدئینان و درەو ددانان، مە بنبڕ کرن و هەکە هێلابان ژی هەر باوەری نەدئینان. ﴿٧٣﴾ و بۆ (ثەموود) برایێ وان صالح مە [ب پێغەمبەراتی] هنارت، گۆت: گەلی ملەتێ من، خودێ بپەرێسن، ب ڕاستی هەوە ژ وی پێڤەتر چو خودێ نینن. ب ڕاستی نیشانەکا ئاشکەرا [مەخسەد موعجیزەیەکا مەزن، ئەو ژی دەرکەڤتنا حێشترێیە ژ بەری] ژ خودایێ هەوە، بۆ هەوە هات. ئەڤە حێشترا خودێیە موعجیزەیەکە بۆ هەوە [ل سەر ڕاستیا من]، ڤێجا بهێلن د ئەردێ خودێدا بچەریت، و دەستێ خۆ ب خرابی نەگەهینێ، ئەگەر دێ بەرهنگاری ئیزایەکا ب ژان و دژوار بن.

وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ عَادٖ وَبَوَّأَكُمۡ
فِي ٱلۡأَرۡضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورٗا وَتَنۡحِتُونَ
ٱلۡجِبَالَ بُيُوتٗاۖ فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي
ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن
قَوۡمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِمَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُمۡ أَتَعۡلَمُونَ
أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلَ بِهِۦ
مُؤۡمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِيٓ
ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٧٦﴾ فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوۡاْ عَنۡ
أَمۡرِ رَبِّهِمۡ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ
مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٧٧﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ
جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ
رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٧٩﴾
وَلُوطًا إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَتَأۡتُونَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم
بِهَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ ٱلرِّجَالَ
شَهۡوَةٗ مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ﴿٨١﴾



﴿٧٤﴾ و بیننە بیرا خۆ وەختێ خودێ هوین ئینایین و د ئەردیدا ئاکنجی کرین پشتی خودێ عێلا عاد بەرئاتاف کری. ل دەشتێت وێ [هوین] قەسران ئاڤا دکەن و چیایان دکۆلن دکەنە خانی، ڤێجا قەنجی و کەرەمێت خودێ بیننە بیرا خۆ، و د ئەردیدا بەر ب خرابیێڤە نەچن. ﴿٧٥﴾ کەنکەنەییێت ملەتێ وی ئەوێت خۆ مەزن کرین، گۆتنە وان ئەوێت هاتینە تەپەسەرکرن، ژ وان ئەوێت باوەری ئینایین. ئەرێ هوین ل وێ باوەرینە کو (صالح) ژ بەرێ خودایێ خۆڤە [ب پێغەمبەراتی] هاتییە هنارتن. [تەپەسەران] گۆت: بەلێ [وەسانە] ب راستی ئەو تشتێ ئەو پێ هاتی ئەم ژێ ب باوەرین. ﴿٧٦﴾ بەلێ ئەوێت خۆ مەزن کرین گۆتن: ب راستی ئەم ب وی یێ هەوە باوەری پێ ئینایی، بێ باوەر و گاورین. ﴿٧٧﴾ ڤێجا وان حێشتر کوشت، و ژ فەرمانا خودایێ خۆ دەرکەڤتن [خۆ ل سەر مەزن دیتن و رکهانا فەرمانا خودێ کرن] و گۆتن: یا (صالح)، هەکە راست تو ژ پێغەمبەرانی، وێ ژڤانا تو گەفێ پێ ل مە دکەی بۆ مە بینە. ﴿٧٨﴾ ڤێجا بیقەلەرزا ب هێز ئەو هنگاڤتن [هەروەکی وان داخواز دکر] ڤێجا ئەو ل سەر چۆکان د خانییێت خۆدا مری و بێ بزاف مان. ﴿٧٩﴾ ڤێجا [صالحی] پشتا خۆ دا وان و گۆت: گەلی ملەتێ من، ب سویند من پەیاما خودایێ خۆ گەهاندە هەوە [و من هوین ژ ئێزایا وی ترساندن] و من شیرەت ل هەوە کرن، بەلێ یا هوین حەژ شیرەتکاران ناکەن. ﴿٨٠﴾ و [مە (لووط) ژی ب پێغەمبەرینی بۆ ملەتێ وی هنارت] وەختێ (لووطی)ی گۆتییە ملەتێ خۆ: ئەرێ هوین چاوا وێ پویچاتییێ دکەن، یا کەسێ ل چو جیهانان بەری هەوە نەکری؟!!. ﴿٨١﴾ ب راستی هوین هەر ژ حیزاتی دچنە دەڤ زەلامان شوینا ژنان، بەلێ هوین نفشەکن زێدەگاڤیان دکەن.

وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوۡمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخۡرِجُوهُم مِّن
قَرۡيَتِكُمۡۖ إِنَّهُمۡ أُنَاسٞ يَتَطَهَّرُونَ ٨٢ فَأَنجَيۡنَٰهُ
وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ٨٣ وَأَمۡطَرۡنَا
عَلَيۡهِم مَّطَرٗاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ٨٤
وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ
مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ قَدۡ جَآءَتۡكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡۖ
فَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ
أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَاۚ
ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٨٥ وَلَا
تَقۡعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٖ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن
سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبۡغُونَهَا عِوَجٗاۚ وَٱذۡكُرُوٓاْ
إِذۡ كُنتُمۡ قَلِيلٗا فَكَثَّرَكُمۡۖ وَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ
عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٨٦ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٞ مِّنكُمۡ
ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٞ لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ فَٱصۡبِرُواْ
حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ بَيۡنَنَاۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ٨٧





﴿٨٢﴾ و ملەتێ وی چو بەرسڤ نەبوون ژ بلی کو
گۆتن [(لووط)ی و یێت باوەری پێ ئینایین]: ڤان ژ
گوندێ خۆ دەربێخن، ب ڕاستی ئەو خۆ پاقژ ددانن.
﴿٨٣﴾ ڤێجا مە ئەو و مرۆڤێت وی [ئەوێت باوەری
پێ ئینایین] رزگار کرن، ژنا وی تێ نەبیت، ژ یێت
مایی بوو [د ناڤ عەزابێدا]. ﴿٨٤﴾ و مە بارانەك ب
سەر واندا داریێت [بارانەکا ئەنتیکە، بەرێت سۆتی ب
سەر واندا باراندن]، ڤێجا بەرێ خۆ بدێ کا دویماهییا
گونەهکاران بوو چ. ﴿٨٥﴾ و مە بۆ خەلکێ مەدیەنێ
برایێ وان شوعەیب پێغەمبەر هنارت، گۆت: گەلی
ملەتێ من، خودێ [ب تنێ] بپەرێسن، ب ڕاستی
هەوە ژ وی پێڤەتر چو خودایێت دی نینن، ب ڕاستی
نیشانەك و موعجیزەیەك ژ خودایێ هەوە بۆ هەوە
هات، ڤێجا ب دورستی کێشان و پیڤانێ بکەن، و
تشتێت خەلکی [د کێشان و پیڤانێدا] کێم نەکەن،
و خرابییێ د ئەردیدا نەکەن پشتی دورستکرنا وی
[ب هنارتنا پێغەمبەران و ئینانەخوارا کتێبان]. ئەڤە
[کێشان و پیڤانا دورست] بۆ هەوە چێترە ئەگەر هوین
باوەر [ژ من] بکەن. ﴿٨٦﴾ و ل سەر هەمی ڕێکان نەرونن، و خودان باوەران ب کوشتنێ بترسینن، و یێ
باوەری ب خودێ ئینایی هوین ژ ڕێکان ددەنە پاش و هەوە [ڕێکا خودێ] خوارو ڤیچ دڤێت [و ل بەر دلێ
خەلکی ڕەش دکەن]، و بیننە بیرا خۆ [ئانکو سوپاسییا خودێ بکەن]، وەختێ هوین د کێم [خودێ] هوین
زێدەکرن، و بەرێ خۆ بدەنێ کا دویماهییا خرابکاران بوو چ. ﴿٨٧﴾ و ئەگەر دەستەکەکێ ژ هەوە باوەری ب
وێ ئینا یا ئەز پێ هاتیمە هنارتن، و دەستەکەکێ باوەری نەئینا، بێنا خۆ فرەه بکەن هەتا خودێ حوکمی د
ناڤبەرا مەدا دکەت و ئەو چێترین حاکمە.

الجزء ٩ الحزب ١٧

۞ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ
وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۚ قَالَ أَوَلَوۡ
كُنَّا كَٰرِهِينَ ٨٨ قَدِ ٱفۡتَرَيۡنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنۡ عُدۡنَا فِي مِلَّتِكُم بَعۡدَ
إِذۡ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنۡهَاۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ
ٱللَّهُ رَبُّنَاۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَاۚ رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ
بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ ٨٩ وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعۡتُمۡ شُعَيۡبًا إِنَّكُمۡ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ٩٠
فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ٩١ ٱلَّذِينَ
كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَاۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَانُواْ
هُمُ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٩٢ فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ
رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡۖ فَكَيۡفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوۡمٖ
كَٰفِرِينَ ٩٣ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ أَخَذۡنَآ أَهۡلَهَا
بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَضَّرَّعُونَ ٩٤ ثُمَّ بَدَّلۡنَا
مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلۡحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَواْ وَّقَالُواْ قَدۡ مَسَّ ءَابَآءَنَا
ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ٩٥



﴿٨٨﴾ کەنکەنەییێت ملەتێ وی ئەوێت خۆ مەزن
دکرن، گۆتن: هەی شوعەیب، ب ڕاستی ئەم دێ
تە و یێت د گەل تە باوەری ئینایین ژ گوندێ خۆ
دەرئێخین، یان ژی هوین دێ زڤرنەڤە سەر دینێ مە.
[شوعەیبی] گۆت: خۆ هەکە مە دینێ هەوە نەڤێت
ژی؟ ﴿٨٩﴾ ب ڕاستی ئەڤە مە درەو د گەل خودێ
کر، گەر ئەم بزڤرینە سەر دینێ هەوە پشتی خودێ
ئەم ژێ ڕزگارکرین، و زڤراندن بۆ مە قەت چێنابیت.
ئاگەهداری و زانینا خودایێ مە هەمی تشت یێت
گرتین، مە پشتا خۆ ب خودێ گرێدا، خودێوۆ ب
هەقییێ حوکمی د ناڤبەرا مە و ملەتێ مەدا بکە و
تو چێترین حاکمی. ﴿٩٠﴾ و کەنکەنەییێت ملەتێ
وی، ئەوێت گاوربوویین گۆتن: [گەلی ملەتێ مە]
ب ڕاستی ئەگەر هوین ب دویڤ شوعەیبی کەڤتن
هوین دێ د خوسارەت بن. ﴿٩١﴾ ڤێجا بیڤەلەرزا ب
هێز ئەو هنگاڤتن، و ئەو ل سەر چۆکان و مری د
خانییێت خۆدا مان. ﴿٩٢﴾ ئەوێت شوعەیب درەوین
داناین هەروەکی ئەو نە د ڤی گوندیدا و نە ئاکنجییێت
ڤی گوندی، [ئانکو بێ سەروشوین چۆن] و ئەوێت شوعەیب درەوین داناین ئەو یێت خوسارەت بوون.
﴿٩٣﴾ ڤێجا پشتا خۆ دا وان و گۆت: گەلی ملەتێ من، ب ڕاستی من پەیام و فەرمانێت خودێ گەهاندنە هەوە
و من شیرەت ل هەوە کرن، ڤێجا ما ئەز دێ چاوا بۆ ملەتەکێ گاور ب خەم کەڤم. ﴿٩٤﴾ و مە چو پێغەمبەر
بۆ چو گوندان نەهنارتینە، ئەگەر مە ب بەرتەنگی و نەساخییان خەلکێ وان نەجەڕباند بن، دا هشیار ببن و
خۆ بۆ خودێ بشکێنن. ﴿٩٥﴾ پاشی مە بەرفرەهی ل جهێ بەرتەنگییێ دانا [دا سوپاسییا خودێ بکەن] هەتا
هەیی بوویین [بوویینە تێر مال و تێر زارۆك] و گۆتن: باب و باپیرێت مە بەرتەنگییێ هنگاڤتبوون، پاشی
بەرفرەهییێ [نەدانە هزرا خۆ کو ئەڤە جەڕباندنە]، ڤێجا ژ نشکەکێڤە مە ئەو بەرئاتافکرن و وان های ژ خۆ نە.

وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَفَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَرَكَٰتٖ
مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذۡنَٰهُم بِمَا كَانُواْ
يَكۡسِبُونَ ﴿٩٦﴾ أَفَأَمِنَ أَهۡلُ ٱلۡقُرَىٰٓ أَن يَأۡتِيَهُم بَأۡسُنَا
بَيَٰتٗا وَهُمۡ نَآئِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهۡلُ ٱلۡقُرَىٰٓ أَن يَأۡتِيَهُم
بَأۡسُنَا ضُحٗى وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ ﴿٩٨﴾ أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ
فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَلَمۡ يَهۡدِ
لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِ أَهۡلِهَآ أَن لَّوۡ نَشَآءُ
أَصَبۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡۚ وَنَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ﴿١٠٠﴾
تِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآئِهَاۚ وَلَقَدۡ جَآءَتۡهُمۡ
رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ مِن
قَبۡلُۚ كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٠١﴾ وَمَا وَجَدۡنَا
لِأَكۡثَرِهِم مِّنۡ عَهۡدٖۖ وَإِن وَجَدۡنَآ أَكۡثَرَهُمۡ لَفَٰسِقِينَ ﴿١٠٢﴾
ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ
فَظَلَمُواْ بِهَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٠٣﴾
وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰفِرۡعَوۡنُ إِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾



﴿٩٦﴾ و ئەگەر خەلكێ وان گوندان [ئەوێت مە پێغەمبەر
بۆ هنارتین و بەرئاتاف کرین] باوەری ب خودێ ئینابانە
و پارێزکاری کربانە، دا دەرگەهێ بەرەکەتێت ئەرد و
ئەسمانان بۆ ڤەکەین، بەلێ نیشان و پێغەمبەرێت مە
درەو دانان [نە باوەری ئینان و نە تەقوایا خودێ کرن]
ڤێجا مە ئەو ب وان کار و کریارێت وان دکرن گرتن،
و ب بەر ئیزایێ ئێخستن. ﴿٩٧﴾ ئەرێ خەلکێ وان
گوندان ژ خۆ پشت ڕاست و ئێمن بوون، کو ئیزایا
مە ب شەڤ ب سەر واندا نەئێت، و ئەو د نڤستی.
﴿٩٨﴾ یان ژی ئەرێ خەلکێ وان گوندان پشت
ڕاست بوون کو ئیزایا مە [دەملدەست و ژ نشکەکێڤە]
تێشتەگەهێ وان نەگریت، و ئەو ییێت مژویل ب تشتێ
بێ مفاڤە. ﴿٩٩﴾ یان ژی ئەو ئێمن بوون ژ تەکبیرا
خودێ [کو وان ب بەر ئیزایێ بێخیت چ ب شەڤ چ
ب ڕۆژ]. و کەس ژ تەکبیرا خودێ ئێمن نابیت، ئەو
نەبن ییێت خوسارەت. ﴿١٠٠﴾ ئەرێ بۆ وان دیارنەبوو
ئەوێت ئەرد ب میراتی گەهشتییێ پشتی خودان
نەماین، کو ب ڕاستی ئەگەر مە [خودێ] بڤێت
دێ وان ب گونەهێت وان هنگێڤین و ئیزادەین [هەروەکی مە ییێت بەری وان هنگاڤتین]، و دلێت وان دێ
مۆرکەین [نە هەقی بچیتە تێدا و نە نەهەقی ژێ دەرکەڤیت]، کو وان گول هەقییێ نەبیت. ﴿١٠١﴾ گوندێت
بۆرین [ژ ملەتێ نووح پێغەمبەر بگرە هەتا یێ شوعەیب پێغەمبەر] [ئەڤە] چەند بەحس و خەبەرەکێت وانە
ئەم بۆ تە دبێژین [کا چ ب سەرێ وان هات و کا ڕکهانا وان بووچ؟] ب ڕاستی پێغەمبەرێت وان ب نیشانێت
ئاشکەرا و موعجیزەیان بۆ وان هاتن، بەلێ ئەو، ئەو نەبوون باوەرییێ بینن [چ بەری هاتنا موعجیزەیان، چ
پشتی هاتنا وان] چونکی وان ئەو [پێغەمبەر] بەری هنگی درەوین دانابوون، و هۆسا خودێ دلێت گاوران
مۆر دکەت. ﴿١٠٢﴾ و باراپتر ژ وان مە خودان سۆز و پەیمان نەدیتن [ئانکو کارێ وان شکاندنا پەیمانان بوو]،
و مە باراپتر ژ وان ژ ڕێ دەرکەڤتی دیتن. ﴿١٠٣﴾ پشتی ڤان [پێغەمبەرێت بۆرین] مە مووسا ب نیشان و
موعجیزەییێت خۆ بۆ فیرعەونی و دەستەکا وی هنارت، ڤێجا وان باوەری پێ نەئینا، کا برێنێ دویماهییا
خرابکاران بووچ؟. ﴿١٠٤﴾ مووسایی گۆت: فیرعەونۆ ب ڕاستی ئەز پێغەمبەرێ خودانێ هەمی جیهانانم
[ب پێغەمبەری بۆ هەوە هاتیمە].

حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ۚ قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ
مِّن رَّبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِىَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾ قَالَ إِن كُنتَ
جِئْتَ بِـَٔايَةٍ فَأْتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾ فَأَلْقَىٰ
عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ
لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ
عَلِيمٌ ﴿١٠٩﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ ۖ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿١١٠﴾
قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿١١١﴾ يَأْتُوكَ
بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿١١٢﴾ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوٓا۟ إِنَّ
لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ
لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن
نَّكُونَ نَحْنُ ٱلْمُلْقِينَ ﴿١١٥﴾ قَالَ أَلْقُوا۟ ۖ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ سَحَرُوٓا۟
أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾
۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ الحزب ١٧
فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُوا۟
هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُوا۟ صَٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾



﴿١٠٥﴾ پێدڤییە ل سەر من، ژ ڕاستی و هەقییێ پێڤەتر د ڕاستا خودێدا نەبێژم. ب ڕاستی من موعجیزە و نیشانەکا ئاشکەرا ژ دەڤ خودایێ هەوە بۆ هەوە ئینایییە [کو ڕاستییا پێغەمبەراتییا من دیار بکەت] ڤێجا ئسرائیلییان د گەل من بهنێرە. ﴿١٠٦﴾ [ڤێجا فیرعەونی بەرسڤا مووسایی دا و گۆت]: ئەگەر ڕاست تو ب موعجیزەیەکێ هاتبی کا بینە ئەگەر تو ژ ڕاستگۆیان بی. ﴿١٠٧﴾ ڤێجا دارێ خۆ هاڤێت، بوو مارەکێ مەزن و دورست. ﴿١٠٨﴾ و دەستێ خۆ ژ پاخلا خۆ دەرئێخست، سپی دەرکەڤت بۆ تەماشەڤانان. ﴿١٠٩﴾ کەنکەنەیان ژ ملەتێ فیرعەونی گۆتێ: ب ڕاستی ئەڤە سێرەبەندەکێ زێدە زانایە. ﴿١١٠﴾ دڤێت هەوە ژ ئەردێ هەوە [کو (مصر)ـە ب سێرەبەندییا خۆ] دەربێخیت، ڤێجا کا هوین چ دبێژن، و کا چ فەرمانێ ددەن. ﴿١١١﴾ گۆتن: وی و برایێ وی ڤێ گاڤێ گیرۆکە، و تو کۆمڤەکەران بهنێرە باژێران. ﴿١١٢﴾ بلا هەمی سێرەبەندێت زێدە زانا بۆ تە بینن. ﴿١١٣﴾ [هنارتە د دویڤ هەمی سێرەبەندانرا] ڤێجا وەختێ هاتینە دەڤ فیرعەونی، گۆتن: ئەرێ مە خەلاتێ خۆ هەیە ئەگەر ئەم سەرکەڤتین؟ ﴿١١٤﴾ [فیرعەونی] گۆت: بەلێ.. [هەوە خەلاتێ خۆ یێ هەی] و هوین دێ ژ نێزیکێت من ژی بن [ئانکو بنە ئەندامێت جڤاتا من]. ﴿١١٥﴾ سێرەبەندان گۆت: هەی مووسا، یان تو دێ ئاڤێژی [نوکە] یان ئەم دێ ئاڤێژین [ئانکو بۆ خۆ هەلبژێرە تە دڤێت دەستپێکێ تو دارێ خۆ باڤێژە، تە دڤێت ئەم دێ ئاڤێژین]. ﴿١١٦﴾ مووسایی گۆت: هوین باڤێژن، ڤێجا وەختێ وان وەریس و دارێت خۆ ئاڤێتین، سێرە ل چاڤێت خەلکی کرن و ترساندن [و هزرکرن ئەڤە ب دورستی مارن نەکو سێرەیە]، و سێرەبەندییەکا مەزن ئینان و کرن. ﴿١١٧﴾ و مە وەحی بۆ مووسایی هنارت، دارێ خۆ باڤێژە [ڤێجا وەختێ دارێ خۆ ئاڤێتی]، وی داری وەریس و دارێت وان ب ئێکجاری داعویران. ﴿١١٨﴾ و ب ڕاستی هەقی ئاشکەرا بوو و کارێ وان [سێرەبەندان] کری، پویچ بوو. ﴿١١٩﴾ و سێرەبەند ل وێرێ شکەستن و ڕەزیل و ڕسوا ڤەگەڕیان. ﴿١٢٠﴾ و سێرەبەند کەڤتن و سوجدە برن.

قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٢١ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ١٢٢ قَالَ
فِرۡعَوۡنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَمَكۡرٞ
مَّكَرۡتُمُوهُ فِي ٱلۡمَدِينَةِ لِتُخۡرِجُواْ مِنۡهَآ أَهۡلَهَاۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ١٢٣
لَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمۡ
أَجۡمَعِينَ ١٢٤ قَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ١٢٥ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ
إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتۡنَاۚ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا
وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ ١٢٦ وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ
وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ
أَبۡنَآءَهُمۡ وَنَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ ١٢٧
قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْۖ إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ
لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ١٢٨
قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ
عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ
فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ١٢٩ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ
بِٱلسِّنِينَ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ١٣٠



﴿١٢١﴾ گۆتن: مە باوەری ب خودانێ هەمی جیهانان
ئینا. ﴿١٢٢﴾ خودێ و خودانێ مووسا و هاروونی.
﴿١٢٣﴾ فیرعەونی گۆت: ئەرێ هەوە باوەری پێ ئینا
بەری ئەز دەستویریێ بدەمە هەوە؟ ب ڕاستی ئەڤە
فند و فێلەکە هەوە د ڤی باژێریدا گێڕاییە، دا هوین
خەلکێ وی ژێ دەربێخن، نێ هوین دێ زانن [کا
ئەز دێ چ ئینمە سەرێ هەوە]. ﴿١٢٤﴾ ب ڕاستی ئەز
دێ دەست و پییێت هەوە چەپ و ڕاست ژێڤەکەم،
پاشی ئەز دێ هەوە هەمییان [ب دارانڤە] هەلاویسم
[هەتا هوین دمرن]. ﴿١٢٥﴾ [سێرەبەندان گۆت:
خەم نینە]، ب ڕاستی ئەم دێ ب بال خودایێ خۆڤە
ڤەگەڕین. ﴿١٢٦﴾ و تو مە عەیبدار و لەکەدار ناکەی ژ
بەر هندێ نەبیت، کو مە باوەری ب نیشان و ئایەتێت
[موعجیزەیێت] خودایێ خۆ ئینایییە، وەختێ بۆ مە
هاتین، خودێوۆ سەبری ب سەر مەدا دارێژە، و مە
ڕاگرە، و مە موسلمان بمرینە. ﴿١٢٧﴾ کەنکەنەیێت
ملەتێ فیرعەونی گۆتن: ئەرێ ما دێ [تو] مووسایی
و ملەتێ وی هێلی خرابییێ د ئەردیدا بکەن، و تە
و پەرستییێت تە بهێلن؟ [فیرعەونی] گۆت: کوڕێت وان [ئانکو زەلامێت وان] دێ کوژین، و ژنێت وان
دێ هێلینە ساخ [دا خدامینیا مە بکەن]، و ئەم سەردەستی وانین و ئەو بن دەستی مەنە. ﴿١٢٨﴾ مووسایی
گۆتە ملەتێ خۆ: پشتا خۆ ب خودێ گرێدەن، و هاریکارییێ ژ وی بخوازن، و بێنا خۆ فرەهـ بکەن و خۆ
ڕاگرن، ب ڕاستی ئەرد یێ خودێیە ددەتە وی بەندەیی ژ بەندەیێت خۆ یێ وی بڤێت، و دویماهیك هەر بۆ
پارێزکارانە. ﴿١٢٩﴾ گۆتن: بەری تو بێی ئەم یێت هاتینە ئێشاندن، و پشتی تو هاتی ژی ئەم یێت دئێینە
ئێشاندن [ڤێجا نوزا کەنگی دێ ڕزگار بین؟] [مووسایی] گۆت: هیڤییا من ئەوە خودایێ هەوە دژمنێ هەوە
د هیلاك ببەت، و هەوە شوینا وان د ئەردیدا ئاکنجی بکەت، ڤێجا دێ بەرێ خۆ دەتێ کا هوین دێ چ کەن.
﴿١٣٠﴾ و ب سویند مە فیرعەون و ملەتێ وی ب هشکەسالان و کێم دەرامەتییێ هنگاڤتن، دا ل خۆ بزڤڕن.

فَإِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡحَسَنَةُ قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ
يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ
وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ١٣١ وَقَالُواْ مَهۡمَا تَأۡتِنَا بِهِۦ
مِنۡ ءَايَةٖ لِّتَسۡحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ١٣٢ فَأَرۡسَلۡنَا
عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلۡجَرَادَ وَٱلۡقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ
ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ١٣٣
وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ ٱلرِّجۡزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا
عَهِدَ عِندَكَۖ لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ
وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ١٣٤ فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ
ٱلرِّجۡزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ ١٣٥ فَٱنتَقَمۡنَا
مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا
غَٰفِلِينَ ١٣٦ وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ
مَشَٰرِقَ ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۖ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ
رَبِّكَ ٱلۡحُسۡنَىٰ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُواْۖ وَدَمَّرۡنَا
مَا كَانَ يَصۡنَعُ فِرۡعَوۡنُ وَقَوۡمُهُۥ وَمَا كَانُواْ يَعۡرِشُونَ ١٣٧



﴿١٣١﴾ ڤێجا هەر گاڤەكا باشی و كەرەمەك گەهشتبایە وان، دگۆتن: ئەڤە ژ بەر مەیە، و ئەگەر نەخۆشییەكێ [ژ بەر هشكەسالان] هنگاڤتبانە، مووسا و یێت د گەل دكرنە ئەگەرا بێ وەغەرییا خۆ، بزانن ب راستی، هەر تشتێ ژ خۆشی و نەخۆشییێ بگەهیتە وان ژ خودێیە، بەلێ پا باراپتر ژ وان نوزانن [كو هەر نەخۆشییەكا ب سەرێ وان هاتی ژ بەر گونەهێت وانە، و نە ژ بەر مووساییە]. ﴿١٣٢﴾ گۆتن [هەی مووسا]: هەر موعجیزەیەكا تو بۆ مە بینی، دا مە ژ سەر وی دینی ببەی ئەوێ ئەم ل سەر، ئەم باوەرییێ ب تە نائینین. ﴿١٣٣﴾ ڤێجا مە ژی بارانەكا دژوار و كولی و سپیە و بەق و خوین ب سەر واندا ئینان كو ئەڤە نیشانێت گەلەرەنگن، ڤێجا [پشتی هاتنا ڤان نیشانان ژی] خۆ مەزن كرن [و باوەری نەئینان]، ب راستی ئەو ملەتەكێ گونەهكار بوون. ﴿١٣٤﴾ ڤێجا دەمێ ئیزا و عەزاب ب سەر واندا هاتی، گۆتن: هەی مووسا، تو بۆ مە ب وی قەدرێ خودێ دایییە تە [كو پێغەمبەراتییە] داخواز بكە، هەكە تو ڤێ ئیزا و بەلایێ ژ سەر مە راكەی، ب راستی ئەم دێ باوەرییێ ب تە ئینین، و ب راستی ئەم دێ ئسرائیلییان د گەل تە هنێرین. ﴿١٣٥﴾ ڤێجا وەختێ مە ئەو بەلا و ئیزا ژ سەر وان راكری، هەتا وەختەكێ دیاركری، كو دێ گەهنێ، پەیمانا خۆ شكاندن [و ل ئاخفتنا خۆ لێڤەبوون]. ﴿١٣٦﴾ ڤێجا مە تۆل ژ وان ڤەكر و مە ئەو د دەریاییێدا خەندقاندن، چونكی وان ئایەت و نیشانێت مە درەو ددانان و ژێ د بێ ئاگەهـ بوون. ﴿١٣٧﴾ و مە ئەو ملەتێ هاتییە تەپەسەركرن، كرە میراتگرێ ئەردێ شامێ ب ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤاڤە، ئەو ئەردێ مە پیرۆزكری [تێر خێروبێر كری]. و ژڤانێ خودایێ تە [كو دێ وی ئەردی] بۆ ئسرائیلییان [هێلیت] ب جه هات، ژ بەر سەبرا وان كێشایی، و ئەوا فیرعەونی و ملەتێ وی دكر، و ئەوا وان ئاڤا دكر مە هەڕافت.

وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ
عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا
لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ
مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ قَالَ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ
أَبۡغِيكُمۡ إِلَٰهٗا وَهُوَ فَضَّلَكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَإِذۡ أَنجَيۡنَٰكُم
مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُقَتِّلُونَ
أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ
مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ﴿١٤١﴾ ۞ وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ
وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗۚ وَقَالَ
مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ
سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ
رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ
ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا
تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ
أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٤٣﴾

نصف الحزب ١٧





﴿١٣٨﴾ و مە ئسرائیلی ژ دەریایێ دەربازکرن، گەهشتنە
دەڤ ملەتەکی ب بوتێت خۆڤە بوون، دپەرستن. ئینا
گۆتن: هەی مووسا تو ژی بۆ مە پەرستییەکی بدانە
هەروەکی ڤان پەرستی هەین. [مووسایی] گۆت: ب
ڕاستی هوین ملەتەکێ نەزانن. ﴿١٣٩﴾ ب ڕاستی ئەڤە د
هیلاك چۆیینە و کارێ ئەو دکەن [کو پەرستنا بوتانە]
یێ پویچە. ﴿١٤٠﴾ [مووسایی] گۆت: ئەرێ ئەز ژ
خودێ پێڤەتر پەرستییەکێ دیتر بۆ هەوە بخوازم؟!
و وی قەدرێ هەوە ب سەر یێ هەمی خەلکی
ئێخستییە. ﴿١٤١﴾ بیننە بیرا خۆ دەمێ مە هوین ژ
دەستێت فیرعەونییان قورتال کرین، کو وان ئیزا و
نەخۆشییەکا پیس و دژوار ددا بەر هەوە، کوڕێت هەوە
دکوشتن، و کچێت هەوە [بۆ خدامینییێ] دهێلان، و
ب ڕاستی ئەها د ڤێدا [ئیزا و نەخۆشییا هەوە ددیت،
و ڕزگارکرنا هەوە ژ بەرێ خودێڤە] ئەزموونەکا
[ئمتیحانەکا] مەزن بوو ژ خودایێ هەوە. ﴿١٤٢﴾ و مە
سیهـ شەڤان ژڤان دا مووسایی، و مە دەهێت دی ژی
لێ زێدەکرن، ڤێجا وەختێ [دیدارێ دگەل] خودایێ
وی بوونە چل شەڤێت دورست، و مووسایی گۆتە برایێ خۆ هاروونی جهێ من بگرە د ناڤ ملەتێ مندا،
و قەنجییێ بکە و ڕێکا خرابکاران نەگرە. ﴿١٤٣﴾ ڤێجا وەختێ مووسا ل دویڤ وەختێ مە دانایی هاتی، و
خودایێ وی د گەل ئاخفتی [بێی کو ئێك د ناڤبەرا واندا هەبیت]، [مووسایی] گۆت: خودێوۆ خۆ نیشا من
بدە، تە ببینم، [خودێ] گۆت: ب ڕاستی تو قەت من نابینی، بەلێ بەرێ خۆ بدە چیایی، ئەگەر ل جهێ
خۆ ما، دبیت تو من ببینی، ڤێجا وەختێ خودایێ وی بۆ چیایی دیاربووی [دیاربوونەکا هێژاییی وی و یا بێ
چاوایی]، ڤێجا چیا پرت پرت بوو، و د گەل ئەردی ڕاست بوو. و مووسا کەڤت و های ژ خۆ نەما، ڤێجا
دەمێ ب سەر خۆڤە هاتی و هشیاربووی، گۆت: ئەز تە ژ هەمی کێماسییان پاقژ دکەم، من تۆبەیە جارەکا
دی ڤێ داخوازێ بکەم و ئەز خودان باوەرێ ئێکێمە.

قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي
فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَكَتَبۡنَا
لَهُۥ فِي ٱلۡأَلۡوَاحِ مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ
شَيۡءٖ فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ وَأۡمُرۡ قَوۡمَكَ يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَاۚ سَأُوْرِيكُمۡ
دَارَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿١٤٥﴾ سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ
فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا
وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ
ٱلۡغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا
وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٤٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا
وَلِقَآءِ ٱلۡأٓخِرَةِ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡۚ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ
يَعۡمَلُونَ ﴿١٤٧﴾ وَٱتَّخَذَ قَوۡمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِنۡ حُلِيِّهِمۡ
عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٌۚ أَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمۡ
وَلَا يَهۡدِيهِمۡ سَبِيلًاۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿١٤٨﴾
وَلَمَّا سُقِطَ فِيٓ أَيۡدِيهِمۡ وَرَأَوۡاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ ضَلُّواْ قَالُواْ لَئِن
لَّمۡ يَرۡحَمۡنَا رَبُّنَا وَيَغۡفِرۡ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾





﴿١٤٤﴾ [خودێ] گۆت: هەی مووسا، ب ڕاستی من ب پێغەمبەراتیيا خۆ و ب ئاخفتنا خۆ، تو ل سەر خەلكی هەلبژارتی و كريیە سەرپشك، ڤێجا ئەڤا من دايیيە تە [ژ تێگەهشتن و پێغەمبەراتیيێ] بگرە، و ژ شوكورداران بە. ﴿١٤٥﴾ و مە بۆ مووسايی ل سەر دەپێت تەوراتێ هەمی تشت ژ شيرەت و ئەحكامان ب درێژی نڤێسينە. ڤێجا ب هێز و ژ دل وەربگرە، و فەرمانا ملەتێ خۆ ژی بكە يا چێتر وەربگرن [وەكی لێ بۆرين و تۆلڤەكرنێ، ئانكو وێ بكەن يا پتر خێر بۆ وان پێ دئێتە نڤێسين]، و ب ڕاستی نێزيك ئەز دێ خانیيێت ژ ڕێ دەركەڤتيیان [وەكی فيرعەونی و ملەتێ وی] نيشا هەوە دەم [كا چ ل وارێ وان هاتيیە]. ﴿١٤٦﴾ ئەز ناهێلم ئەوێت ژ بێ بەختی و ژ نەهەقی خۆ د ئەرديدا مەزن دكەن، د نيشان و ئايەتێت من بگەهن، و ئەگەر هەمی نيشان و ئايەتان ژی ببينن، ديسا باوەریيێ پێ نائينن، و ئەگەر ڕێكا هيدايەتێ و ڕاستیيێ ببينن ژی ناگرن، و ناكەنە ڕێكا خۆ، و ئەگەر ڕێكا خرابیيێ و بەرزەبوونێ ببينن دێ بۆ خۆ كەنە ڕێك، چونكی ئايەت و نيشانێت مە درەو ددانان، و ژێ د بێ ئاگەه بوون. ﴿١٤٧﴾ و ئەوێت نيشان و ئايەتێت مە و ديتنا ئاخرەتێ درەو ددانان، كار و كريارێت وان [يێت چاك] پويچ بوون، ما ئەو دێ ژ جزايێ كارێ خۆ پێڤەتر بينن! ﴿١٤٨﴾ و ملەتێ مووسايی، پشتی [چۆنا] وی، [پشتی مووسا چۆيیيە ژڤانێ خودايێ خۆ] ژ چەكێت خۆ [ژ زێر و زينەتێ د گەل وان] گۆلكەك چێكرن، لەشەكێ بێ گيان بوو دەنگێ چێلێ هەبوو، ما نەدديتن وی [گۆلكی] ئەو نەدئاخڤتن و بەرێ وان نەددا چو ڕێكان، [و گۆلك] ب پەرستی بۆ خۆ كرنە پەرستی، و ئەو ب خۆ د ستەمكاران بوون. ﴿١٤٩﴾ ڤێجا وەختێ پەشێمان بووين و زانين يێت گومڕا بووين، گۆتن: ئەگەر خودايێ مە دلۆڤانیيێ ب مە نەبەت، و گونەهێت مە ژێ نەبەت، ب ڕاستی ئەم دێ ژ خوسارەتان بين.

وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًا قَالَ بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِى
مِنۢ بَعْدِىٓ ۖ أَعَجِلْتُمْ أَمْرَ رَبِّكُمْ ۖ وَأَلْقَى ٱلْأَلْوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأْسِ
أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيْهِ ۚ قَالَ ٱبْنَ أُمَّ إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِى وَكَادُوا۟
يَقْتُلُونَنِى فَلَا تُشْمِتْ بِىَ ٱلْأَعْدَآءَ وَلَا تَجْعَلْنِى مَعَ ٱلْقَوْمِ
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِأَخِى وَأَدْخِلْنَا فِى رَحْمَتِكَ ۖ
وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ
غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى
ٱلْمُفْتَرِينَ ﴿١٥٢﴾ وَٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ
بَعْدِهَا وَءَامَنُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٥٣﴾
وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلْغَضَبُ أَخَذَ ٱلْأَلْوَاحَ ۖ وَفِى نُسْخَتِهَا
هُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ ﴿١٥٤﴾ وَٱخْتَارَ مُوسَىٰ
قَوْمَهُۥ سَبْعِينَ رَجُلًا لِّمِيقَٰتِنَا ۖ فَلَمَّآ أَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ قَالَ
رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّٰىَ ۖ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ
ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآ ۖ إِنْ هِىَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهْدِى
مَن تَشَآءُ ۖ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا ۖ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْغَٰفِرِينَ ﴿١٥٥﴾



﴿١٥٠﴾ و وەختێ مووسا [ژ ژڤانا خودایێ خۆ] ب سەر
ملەتێ خۆدا ڤەگەڕیایی، زێدە کەربگرتی و خەمگین
ڤەگەریا، گۆت: پیسە شۆل بوو هەوە پشتی من
کری [دەمێ هەوە گۆلك پەرستی] ئەرێ هەوە لەز
ل فەرمانا خودێ کر [هەوە چ بوو؟ هەوە گۆلك
پەرست، و هەوە خۆ نەگرت هەتا ئەز ژ ژڤانێ خودێ
دزڤڕم، و فەرمانا خودێ بۆ هەوە دبێژم] و مووسایی
دەپێت تەوراتێ ئاڤێتن، و دەست ئاڤێتە سەرێ برایێ
خۆ، گرت و ب بەر خۆڤە کێشا، [هاروونی] گۆت:
هەی کوڕێ دەیکا من، ب ڕاستی ملەتی ئەز بێزارکرم
و نێزیك بوو من بکوژن، ڤێجا تو کەیفا نەیاران
ب من نەئینە، و من نەدە د گەل ملەتێ ستەمکار
[و من ژ وان حسێب نەکە]. ﴿١٥١﴾ [مووسایی] گۆت:
خودێوۆ، گونەهێت من و برایێ من ژێ ببە و مە
هەردوکان ب بەر دلۆڤانییا خۆ بێخە، و تویی ژ هەمی
دلۆڤانان دلۆڤانتر. ﴿١٥٢﴾ ب ڕاستی ئەوێت گۆلك
پەرستین نێزیك دێ کەربا خودایێ وان و ڕسوایی د
ژیانا دنیایێدا وان گریت، و هۆسا ئەم درەوینان ئیزا
ددەین. ﴿١٥٣﴾ و ئەوێت کار و کریارێت خراب کرین، پاشی تۆبە کرین، و دلبێشی و دلسۆزی د باوەریا
خۆدا کرین، ب ڕاستی خودایێ تە پشتی ڤێ تۆبەیێ، گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿١٥٤﴾ ڤێجا دەمێ کەربا
مووسایی داهاتی، دەپێت تەوراتێ ڕاکرن، ئەوا [تەوراتا] ڕێکا ڕاستەڕێیی و دلۆڤانییێ تێدا نڤێسی، بۆ وان
یێت ژ خودایێ خۆ دترسن. ﴿١٥٥﴾ و مووسایی ژ ملەتێ خۆ حەفتێ زەلام ژێ گرتن بۆ وەختێ مە دانایی
[دا داخوازا لێبۆرینێ و لێنەگرتنێ ژ خەلەتییا خۆ یا مەزن بکەن، وەختێ گۆلك پەرستین]، ڤێجا دەمێ
بیڤەلەرزا ب هێز ئەو گرتین [کەڤتن و نەهشبوون]، ئینا [مووسایی] گۆت: خودێوۆ ئەگەر تە ڤیابایە بەری
نوکە دا من و وان د هیلاك بەی، ما دێ مە ب کریارا ساویلکەیان د هیلاك بەی؟ ئەڤە ژ جەڕباندن و ئەزموونا
تە پێڤەتر نینە، یێ تە بڤێت ب وێ جەڕباندنێ گومڕا دکەی، و یێ تە بڤێت پێ ڕاستەڕێ دکەی، تویی
سەمیان و هاریکارێ مە، ڤێجا ل گونەهێت مە ببۆرە و دلۆڤانییێ ب مە ببە، و ب ڕاستی تو چێترین لێنەگری.

ثلاثة أرباع الحِزْب ١٧

۞ وَٱكْتُبْ لَنَا فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ
إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ ۚ قَالَ عَذَابِىٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنْ أَشَآءُ ۖ وَرَحْمَتِى
وَسِعَتْ كُلَّ شَىْءٍ ۚ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ
ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ
ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ
فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ
عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ
ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ
عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟
ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾
قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى
لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ
فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ
وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾ وَمِن
قَوْمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٩﴾



﴿١٥٦﴾ و تـو د ڤـێ جیهانێـدا قەنجیـیێ بۆ مە بنڤێسـە [ژ ژیانـەکا خـۆش، و دویماهیکەکا باش، و سـەرفەرازی بۆ کارێ بـاش] و ل ئاخرەتـێ ژی قەنجیـیێ بـدە مـە [کـو بەحەشـتە]، ب ڕاسـتی مـە ب بـال تەڤـە تۆبـە کریـیە. [خـودێ] گـۆت: هـەر کەسـێ مـن بڤێـت دێ ب ئیزایا خـۆ هنگێڤم، و دلۆڤانیـیا مـن هەمی تشـتان ڤەدگریت، ڤێجـا ئـەز دێ [ڤـێ دلۆڤانیـیێ] سپەهی و خۆسـەر [ڕۆژا قیامەتـێ] بـۆ وان نڤێسـم ئەوێـت پارێزکاریـیا مـن دکـەن، و زەکاتـا خـۆ ددەن، و باوەریـیێ ب هەمی کتێـب و پێغەمبەرێـت مـە دئینـن. ﴿١٥٧﴾ و ئەوێـت ل دویـڤ هنارتی و پێغەمبـەرێ نەخوانـدەوار دچن، ئەوێ سـالۆخەت و نیشـانێت وی ل دەڤ خـۆ د تـەورات و ئنجیلێـدا دبینن، فەرمانا وان ب قەنجیـیێ دکەت، و وان ژ خرابیـیێ ددەتـە پـاش، و تشـتێ پاقژ بۆ وان دورسـت دکـەت، و تشـتێ پیس ل سـەر وان حـەرام دکـەت، و بـارێ وان یـێ گـران ل سـەر وان ڕادکـەت، و قەیدێـت وان خـۆ پـێ گرێدایی ل سـەر وان ڕادکـەت [ئانکو وی بـارێ وان، ژ وان ئەحکامێـت وان خـۆ پـێ گرێدایـی ژ نەدورسـتکرنا هنـدەك خوارنـان و ژێڤەکرنـا جهێ پیس ژ جلکێ وان و سـۆتنا دەستکەڤتیـیان (الغنائـم)... هتد، سـڤك کـر]، ڤێجـا ئەوێـت باوەری پـێ ئینایـین، و ڕێز لێ گرتـین، و هاریکارییا وی ل سـەر نەیـاران کری، و ب دویـڤ وێ ڕۆناهیـیێ کەڤتـین ئـەوا د گـەل وی هاتی [کـو قورئانە]، ئەڤە ئـەون یـێت سـەرفەراز. ﴿١٥٨﴾ بێژە: گـەلی مرۆڤـان، ب ڕاسـتی ئـەز پێغەمبـەرێ خودێمە بۆ هەوە هەمیـیان، ئـەو خودایـێ ملکێ ئەرد و ئەسمانان یێ وی، چـو پەرسـتی نینـن ژ وی پێڤەتر، ئەوە ژیانـێ ددەت، و دبەت، ڤێجا باوەریـیێ ب خـودێ و پێغەمبەرێ وی بینـن، ئـەو پێغەمبـەرێ نەخوانـدەوار، ئەوێ (ئەو پێغەمبەرێ) باوەریـیێ ب خـودێ و کتێبـێت وی دئینیت، و ل دویـڤ وی هـەڕن، دا هویـن ڕاسـتەڕێ ببـن. ﴿١٥٩﴾ و دەسـتەکەك ژ ملەتـێ مووسـایی هەیـە، بـەرێ خەلکی ب ڕاسـتی و هەقییـێ ددەنـە ڕێـکا ڕاسـت، و ب هەقیـیێ و ڕاستیـیێ ژی فەرمانداریـیێ و حوکمی دکەن.

وَقَطَّعۡنَٰهُمُ ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَمٗاۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ
مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسۡتَسۡقَىٰهُ قَوۡمُهُۥٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡحَجَرَۖ
فَٱنۢبَجَسَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗاۖ قَدۡ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٖ
مَّشۡرَبَهُمۡۚ وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡغَمَٰمَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمُ
ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ وَمَا
ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ١٦٠
وَإِذۡ قِيلَ لَهُمُ ٱسۡكُنُواْ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةَ وَكُلُواْ مِنۡهَا
حَيۡثُ شِئۡتُمۡ وَقُولُواْ حِطَّةٞ وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا
نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ خَطِيٓـَٰٔتِكُمۡۚ سَنَزِيدُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٦١
فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ قَوۡلًا غَيۡرَ ٱلَّذِي قِيلَ
لَهُمۡ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ
يَظۡلِمُونَ ١٦٢ وَسۡـَٔلۡهُمۡ عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَتۡ
حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ
حِيتَانُهُمۡ يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ شُرَّعٗا وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ لَا تَأۡتِيهِمۡۚ
كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ١٦٣



﴿١٦٠﴾ و مە ملەتێ مووسایی کرە دوازدە دەستەك و ئویجاخ، و دەمێ ملەتێ وی ئاڤ ژێ خواستی، مە وەحی بۆ هنارت: دارێ خۆ ل کەڤری بدە [هەر کەڤرەکێ هەبیت]، پشتی مووسایی دارێ خۆ ل کەڤری دایی، دوازدە کانی ژێ زان و دەرکەڤتن [تەمەت هەژمارا ئویجاخێت وان]، و هەر ئێکی کانیا خۆ زانی و نیاسی، و مە عەور ل هنداڤی وان کرنە سهوانە [کو سهێ ل وان بکەن] و گەزۆ و سویسك مە ب سەر واندا بارانـدن، ڤێجا ژ حەلالێ پاك و پاقژێ مە ب رزقێ هەوە کری بخۆن، و ئەوان [ب کار و کریارێت خۆ یێت نە د رێدا و نەدورست] زیان ل مە نەکرییە، بەلکی هەر یا ل خۆ کرین.
﴿١٦١﴾ و وەختێ خودێ گۆتییە وان [مەخسەد پێ ئسرائیلیان] هەرنە د ڤی گوندیدا [قودسێ] و ب بەرفرەهی و ل جهێ هەوە بڤێت ژێ بخۆن، و بێژن: خودێوۆ گونەهێت مە ژ مە داقوتە، و داچەمیایی [و خۆشکاندی بۆ خوادیێ هوین ژ بەرزەبوونێ رزگار کرین] بدەنە ژۆر، دێ ل گونەهێت هەوە بۆرم و ناهێلم، و ئەم دێ خێرا قەنجیکاران پتر لێ کەین.
﴿١٦٢﴾ بەلێ ئەوێت ستەم و زۆرداری کرین، ئەو فەرمانا خودێ ل وان کری [کو بێژن گونەهێت مە ژ مە داقوتە]، ب تشتەکێ دی یێ ژێ نەهاتییە خواستن، گوهارتن [ڤێجا ژ بەر هندێ]، و ژ بەر نەگوهداری و ستەما وان دکر مە ئێزایەك ژ ئەسمانی ب سەر واندا هنارت.
﴿١٦٣﴾ و تو [هەی موحەمەد] پسیارا وی گوندێ نێزیکی دەریایێ [ژ ئسرائیلیان] بکە، وەختێ وان د رۆژا شەنبییێدا دەستدرێژی کرین، وەختێ رۆژا شەنبییێ ماسییێت وان سەر ئاڤ دبوون، و رۆژا نە شەنبی [کو یا بۆ وان دورست تێدا بگرن] نەدهاتن، مە هۆسا و ژ بەر ژ رێ دەرکەڤتنا وان ب ڤێ بەلایێ جەرباندن [کو رۆژا بۆ وان نەدورست ماسیان بگرن، ماسییێت ئاشکەرا سەرئاڤ ببن، و رۆژا بۆ وان دورست بگرن، ماسی نەئێن و دیار نەبن].

وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ
عَذَابًا شَدِيدًا ۖ قَالُوا۟ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾
فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ
وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾
فَلَمَّا عَتَوْا۟ عَن مَّا نُهُوا۟ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿١٦٦﴾
وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَن يَسُومُهُمْ
سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ۗ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلْعِقَابِ ۖ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٦٧﴾
وَقَطَّعْنَٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أُمَمًا ۖ مِّنْهُمُ ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنْهُمْ
دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَبَلَوْنَٰهُم بِٱلْحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمْ
يَرْجِعُونَ ﴿١٦٨﴾ فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ
يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلْأَدْنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِن
يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُۥ يَأْخُذُوهُ ۚ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَٰقُ ٱلْكِتَٰبِ
أَن لَّا يَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ وَدَرَسُوا۟ مَا فِيهِ ۗ وَٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ
خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ
بِٱلْكِتَٰبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٧٠﴾



﴿١٦٤﴾ و وەختێ دەستەكەكێ ژ وان گۆتی [گەلی دەستەكا شیرەتكاران] هوین بۆ چ خەلكەكی شیرەت دكەن، كو خودێ دێ وان د هیلاك بەت، یان ژی دێ وان ب بەر ئیزایەكا دژوار ئێخیت، [كۆما شیرەتكار] گۆت: بۆ هندێیە دا بۆ مە ل دەڤ خودایێ هەوە ببیتە هەجەت (مهانە)، و بەلكی ئەو ل خۆ بزڤڕن و خۆ بپارێزن. ﴿١٦٥﴾ ڤێجا وەختێ وان، ئەو شیرەتێت ل وان دهاتنە كرن، ژ بیرا خۆ برین و پویتە پێ نەكرین، مە ئەوێت بەرگەڕیان دكرن كو خرابی نەئێتە كرن رزگار كرن، و مە ئەوێت ستەم دكرن [یێت د ئەزموونا خۆدا كەڤتین و یێت خۆ ل سەر خرابیێ بێ دەنگ كرین] ب ئیزایەكا ب ژان و دژوار هنگاڤتن، ژ بەر ژ ڕێ دەركەڤتنا وان. ﴿١٦٦﴾ ڤێجا وەختێ وان خۆ مەزن كرین ل سەر تشتێ نەهیا وان ژێ هاتییە كرن، و زێدەگاڤیا خۆ نەهێلایین، مە گۆتە وان: ببنە مەیموینكێت ڕسوا و ڕەزیل. ﴿١٦٧﴾ و بۆ ملەتێ خۆ بێژە: وەختێ خودایێ تە [پێشیێت ئسرائیلیان] ئاگەهدار كرین، كو خودایێ تە هندەك مرۆڤێت وەسا ب سەر واندا دێ هنێریت، كو هەتا ڕۆژا قیامەتێ ئیزا و نەخۆشیەكا ب ژان و دژوار بدەنە بەر وان، و ب ڕاستی خودایێ تە جزا ب لەزە [ئانكو جزاكرنا وی یا ب لەزە]، و خودایێ تە ب ڕاستی گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿١٦٨﴾ و مە ئەو (ئسرائیلی) د ئەردیدا كرنە كۆم كۆم [و مە ژێكڤەكرن]، هندەك ژ وان د قەنج و كێرهاتی بوون [ئەڤێت باوەری ب موحەمەد پێغەمبەر ئینایین، و یێت بەری هاتنا وی مرین]، و هندەك ژ وان د وەسا نەبوون، ڤێجا مە ئەو ب خۆشی و نەخۆشیان جەڕباندن، دا ل خۆ بزڤڕن. ﴿١٦٩﴾ و د دویڤ ڤانڕا [ئەڤێت تێكەل، قەنج و خراب] دەستەكەك هات چو خێر تێدا نە، بوونە وێرسێت تەوراتێ [دخوینن، بەلێ كار پێ ناكەن] و لەزێ ل ئەڤا نێزیك و كێم دكەن [كو دنیایە، و پشتا خۆ ددەنە هەڤییێ] و دبێژن: دێ خودێ مە ئازاكەت و ل مە ناگریت، و ئەگەر متایەكێ دی ژی وەكی وێ ب دەست وان بكەڤیت دێ ڕاكەن [ل نك نەخەمە، حەلالە یان حەرامە؟] ئەرێ ما پەیمان د تەوراتێدا ژ وان نەهاتبوو ستاندن، كو ئەو ژ ڕاستییێ پێڤەتر چو یێ دی ل سەر ناڤێ خودێ نەبێژن؟ [ڤێجا چاوا حەرامی دخۆن و دبێژن: خودێ ل مە ناگریت] و وان تەورات یا خواندی كا چ تێدایە. و ئاخرەت بۆ وان، یێت پارێزكاریا خودێ دكەن چێترە، ڤێجا ما هوین ئاقلێ خۆ نائیننە سەرێ خۆ. ﴿١٧٠﴾ و ئەوێت تەوراتێ دگرن و كار پێ دكەن، و نڤێژان [كا چاوا فەرمانا وان پێ هاتییە كرن] بەردەوام دكەن، ب ڕاستی ئەم خێرا قەنجیكاران بەرزە ناكەین.

الحزب ١٨

۞وَإِذۡ نَتَقۡنَا ٱلۡجَبَلَ فَوۡقَهُمۡ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٞ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعُۢ بِهِمۡ
خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٧١
وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ
عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ
ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ١٧٢ أَوۡ تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أَشۡرَكَ
ءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةٗ مِّنۢ بَعۡدِهِمۡۖ أَفَتُهۡلِكُنَا
بِمَا فَعَلَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ١٧٣ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلَعَلَّهُمۡ
يَرۡجِعُونَ ١٧٤ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ
مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ١٧٥ وَلَوۡ شِئۡنَا
لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ
كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ
يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ
ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ١٧٦ سَآءَ مَثَلًا ٱلۡقَوۡمُ ٱلَّذِينَ
كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمۡ كَانُواْ يَظۡلِمُونَ ١٧٧ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ
فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِيۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ١٧٨





﴿١٧١﴾ و بیننە بیرا خۆ دەمێ مە چیایێ (طور) ل هنداڤی
وان وەکی بانەکی یان سەهوانەکێ بلندکری، هزر دکرن
دێ ب سەر واندا ئێت، [مە گۆتە وان] ئەڤا مە بۆ
هەوە هنارتی ژ دل و ب هێز وەربگرن و لێ د ڕژد بن.
و بیننە بیرا خۆ کا چ تێدایە و خۆ ژ بیرڤە نەکەن، دا
ژ ئیزایێ بێنە پارستن. ﴿١٧٢﴾ و وەختێ خودایێ تە ژ
پشتا ئادەمی، دویندەها وی دەرئێخستی، و هەر ئەو
[دویندەهـ] ل سەر دویندەهێ ب خۆ کرنە شاهد،
[وی وەختی خودێ گۆتە وان]: ما ئەز نە خودایێ
هەوەمە؟ گۆتن: بەلێ، ئەم شادەییێ ددەین، ئەڤە
دا هوین ڕۆژا قیامەتێ نەبێژن، ئەم ژ ڤێ د بێ ئاگەهـ
بووین. ﴿١٧٣﴾ یان ژی دا هوین نەبێژن [ئەم چ
بکەین] باب و باپیرێت مە بەری مە هەڤال و هەڤپشك
[بۆ خودێ] چێکربوون، و ئەم ژی دویندەهەك بووین
پشتی وان هاتین [مە ژ نك خۆ هەڤال و هەڤپشك
چێ نەکرینە، مە چاڤ ل وان کر]، ڤێجا ما دێ مە ب
کریارا گومڕایان د هیلاك بەی؟. ﴿١٧٤﴾ و هۆسا ئەم
نیشانان ب درێژی و ب هەمی ئاوایان ڕۆن دکەین، دا
[پویچیا ئەو ل سەر بهێلن] بزڤرن [بۆ هەقییێ]. ﴿١٧٥﴾ [هەی موحەمەد] تو بۆ وان [ئانکو ئسرائیلییان]،
سەرهاتیا وی مرۆڤی بێژە و بخوینە، ئەوێ مە زانینا نیشان و ئایەتێت خۆ دایییێ، پاشی ئەو ژ زانینا وان
ئایەتان دەرکەڤت و خۆ ژێ کێشا [هەروەکی مار ژ کەڤلێ خۆ دەردکەڤیت]، ڤێجا شەیتان ب دویڤ کەڤت و
خۆ گەهاندێ، و بوو ژ وان یێت زێدە گومڕا و بەرزە. ﴿١٧٦﴾ و ئەگەر مە ڤیابایە ئەم دا وی ب وێ زانینا مە
دایییێ بلندکەین و قەدری دەینێ، بەلێ ئەو ما ب دنیایێڤە، و ب دویڤ دلخوازیا خۆ کەڤت، ڤێجا مەتەلا
وی [د خرابییێدا] وەکی مەتەلا سەییە ئەگەر لێ بخوڕی و دەربێخی، دێ حلکەحلکێ کەت [ئانکو دێ
ئەزمانێ خۆ دەرئێخیت] و ئەگەر بهێلی و دەرنەئێخی ژی، هەر دێ حلکەحلکێ کەت، و ئەڤ مەتەلە مەتەلا
وانە یێت نیشانێت مە درەو دانایین و باوەری پێ نەئینایین [ئانکو ئەو ژی وەکی سەیینە چ شیرەتان ل وان
بکەی یان لێ نەکەی، وەکی ئێکە، نائێنە سەر ڕێکا ڕاست]. ڤێجا ڤان چیرۆکان بۆ ڤەگێرە، دا هزرا خۆ تێدا
بکەن. ﴿١٧٧﴾ چ مەتەلەکا پیسە وان کەسان هەی، ئەوێت نیشان و ئایەتێت مە درەو دانایین، و ئەوان ستەم ل
خۆ ب خۆ کرییە [نە ل کەسێ دی]. ﴿١٧٨﴾ ئەوێ خودێ ڕاستەڕێ بکەت هەر ئەوە ڕاستەڕێکری، و هەر
کەسێ [ژ بەر کار و کریارێت وی] گومڕا و بەرزە بکەت، نێ هەر ئەوەن یێت خوسارەت.

وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ
بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ
أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ وَلِلَّهِ
ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ
سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٨٠﴾ وَمِمَّنۡ خَلَقۡنَآ أُمَّةٞ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ
وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ ﴿١٨١﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَنَسۡتَدۡرِجُهُم
مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٨٢﴾ وَأُمۡلِي لَهُمۡۚ إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ ﴿١٨٣﴾ أَوَلَمۡ
يَتَفَكَّرُواْۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿١٨٤﴾
أَوَلَمۡ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ
مِن شَيۡءٖ وَأَنۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقۡتَرَبَ أَجَلُهُمۡۖ فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ
بَعۡدَهُۥ يُؤۡمِنُونَ ﴿١٨٥﴾ مَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُۥۚ وَيَذَرُهُمۡ
فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿١٨٦﴾ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرۡسَىٰهَاۖ
قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّيۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقۡتِهَآ إِلَّا هُوَۚ ثَقُلَتۡ فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَا تَأۡتِيكُمۡ إِلَّا بَغۡتَةٗۗ يَسۡـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنۡهَاۖ
قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٨٧﴾





﴿١٧٩﴾ ب سويند مە گەلەك ئەجنە و مرۆڤ بۆ دۆژەهێ يێت چێكرين، وان دل يێت هەين، هەقييێ پێ تێ ناگەهن، و چاڤ يێت هەين، پێ نابينن، و گوهـ يێت هەين پێ گولێ نابن (نابهيسن)، ئەڤە وەكی تەرش و كەوالانە [مفايی بۆ خۆ ژ ئەندامێت هەستكرنێ نابينن] بەلكی هێژ بەرزە و گومڕاترن، ئەڤەنە يێت ئاگەهـ ژ خۆ نەيی. ﴿١٨٠﴾ و [هەمی] باشناڤ بۆ خودێنە، ڤێجا ب وان دوعايان ژێ بكەن، و هوين وان بهێلن ئەوێت دەستكارييێ د ناڤێت ويدا (يێت خودێ) دكەن، دێ ئەو گەهنە جزايێ كارێ خۆ. ﴿١٨١﴾ و ژ وان ئەوێت مە چێكرين (دەستەكەك) هەيە، ب هەقييێ ڕاستەڕێييێ دكەن و پێ [ب هەقييێ] دادوەرييێ دكەن. ﴿١٨٢﴾ و ئەوێت نيشان و ئايەتێت مە درەو دانايين، دێ مۆلەتێ دەينێ، پيچ پيچە دێ وان نێزيكی وی تشتی كەين يێ وان بەرئاتاف بكەت بێی ب خۆ بحەسن. ﴿١٨٣﴾ ئەز دێ مۆلەتێ دەمێ [و جزاكرنا وان ب پاش ئێخم]، ب ڕاستی گرتن و ئيزايا من يا ب هێز و دژوارە. ﴿١٨٤﴾ ئەرێ ما نادەنە هزرا خۆ كو چو ديناتی ل دەڤ هەڤالێ وان (كو پێغەمبەرە) نينە؟ بەلێ ئەو ژ ئاگەهداركەرەكێ ئاشكەرا پێڤەتر نينە. ﴿١٨٥﴾ ئەرێ ما ئەو هزرا خۆ د مەزناتييا ئەرد و ئەسمانان و د تشتێ خودێ چێكريدا ناكەن، و دبيت وەختێ مرنا وان [يان ئيزادانا وان ژ بەر گاورييا وان] نێزيك بووبيت، ڤێجا ما ئەو پشتی قورئانێ باوەرييێ ب كيژ ئاخڤتنێ دئينن؟. ﴿١٨٦﴾ و هەر كەسێ خودێ [ب كار و كريارێت وی يێت خراب] گومڕا و بەرزە بكەت، نێ كەس نينە وی ڕاستەڕێ بكەت، و دێ وان هێلين هەر د خرابييا خۆدا بزڤڕن. ﴿١٨٧﴾ [هەی موحەمەد] پسيارا ڕۆژا قيامەتێ ژ تە دكەن، كا كەنگييە و كەنگی دێ ئێت؟ بێژە: ب ڕاستی زانينا وەختێ هاتنا وێ بەس ل دەڤ خودايێ منە، كەس نەشێت وەختێ وێ بدەتە ئاشكەراكرن خودێ نەبيت، ژ ئەرد و ئەسمانان مەزنترە بزانن [يان ڕۆژا دئێت يا گرانە ل سەر ئەرد و ئەسمانان] ب سەر هەوەدا نائێت ژ نشكەكێڤە نەبيت، پسيارا وێ ژ تە دكەن، هەروەكی تو دزانی و لێ دگەڕی، بێژە: ب ڕاستی زانينا [هاتنا] وێ [ڕۆژێ] بەس ل دەڤ خودێيە، بەلێ باراپتر ژ خەلكی [ڤێ ڕاستييێ] نوزانن.

قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ
أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ
إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ١٨٨ ۞ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم
مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَجَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا لِيَسۡكُنَ إِلَيۡهَاۖ فَلَمَّا
تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتۡ حَمۡلًا خَفِيفٗا فَمَرَّتۡ بِهِۦۖ فَلَمَّآ أَثۡقَلَت دَّعَوَا
ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنۡ ءَاتَيۡتَنَا صَٰلِحٗا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ١٨٩
فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحٗا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ فَتَعَٰلَى
ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ١٩٠ أَيُشۡرِكُونَ مَا لَا يَخۡلُقُ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ١٩١
وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ لَهُمۡ نَصۡرٗا وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ١٩٢
وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمۡۚ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡ أَدَعَوۡتُمُوهُمۡ
أَمۡ أَنتُمۡ صَٰمِتُونَ ١٩٣ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ
أَمۡثَالُكُمۡۖ فَٱدۡعُوهُمۡ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ إِن كُنتُمۡ
صَٰدِقِينَ ١٩٤ أَلَهُمۡ أَرۡجُلٞ يَمۡشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَيۡدٖ يَبۡطِشُونَ
بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَعۡيُنٞ يُبۡصِرُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ
بِهَاۗ قُلِ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ١٩٥

الحزب ١٨





﴿١٨٨﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: نە ب دەستێ منە
مفایەکی بگەهینمە خۆ، یان زیانەکێ ژ خۆ بدەمە
پاش، ئەو نەبیت یا خودێ حەزکری، و ئەگەر من
غەیب [تشتێ نەئاشکرا و نەبوویی] زانیبایە، دا پتر
فایدەکەم و خوسارەت نەدبووم [و زیان نەدگەهشتە
من] و ئەز ژ ئاگەهدارکەر و مزگینئینی پێڤەتر نینم،
بۆ وی ملەتێ باوەرییێ بینیت. ﴿١٨٩﴾ و ئەوە [ئانکو
خودێیە] هوین ژ ئێك کەس ب تنێ چێکرین، و
هەڤسەرا وی ژێ ژێ چێکر، دا بێنا (سەبرا) وی پێ
بێت و ل دەڤ ڤەهەسیێت، ڤێجا وەختێ چۆیییە
نڤینا وێ، ب حال کەڤت، حالەکێ سڤك، و ما د
ڤی حالیدا، ڤێجا وەختێ گران بوویی، [و بچویك د
زکیدا مەزن بوویی] وێ و زەلامێ خۆ دوعا ژ خودێ
کرن: ئەگەر تو زارۆکەکێ ب کێرهاتی بدەیە مە، ئەم
دێ ژ شوکورداران بین. ﴿١٩٠﴾ ڤێجا وەختێ خودێ
[دوعایا وان قەبویل کری] و زارۆکەکێ ب کێرهاتی
داییێ، هندە دویندەها وان هەڤپشکان [ب ڤێ دانێ]
بۆ [خودێ] چێ دکەن، و خودێ بلندتر و پاقژترە ژ
وێ شرکا ئەو دکەن. [ئەڤ ئایەتە بەحسێ هندە دویندەها ئادەم پێغەمبەر و حەوایێ دکەت دەمێ خودێ
دویندەهـ داییێ شوینا سوپاسیا خودێ بکەن هەڤپشکان بۆ خودێ چێ دکەن چ ب ناڤکرنا وان ب
ناڤێت خەلەت بکەنە بەندە نە بۆ خودێ یان غەیری خودێ - ئەوێ ئەو کەرم د گەل کری - دپەرێسن].
﴿١٩١﴾ ئەرێ ئەو وی بۆ خودێ دکەنە هەڤپشك یێ چو چێ نەکەت، و ئەو ب خۆ یێت هاتینە چێکرن.
﴿١٩٢﴾ و ئەو نەشێن هاریکاریا وان بکەن [خۆ ئەگەر ژێ بخوازن ژی]، و نەشێن هاریکاریا خۆ ژی
بکەن. ﴿١٩٣﴾ و ئەگەر هوین گازی وان [بوتان] بکەن بۆ ڕاستەرێیییێ، ل دویڤ هەوە نائێن [چونکی
بەرن و د بێ ڕوحن]، وەکی ئێکە چ هوین گازی وان بکەن یان بێ دەنگ بمینن و گازی وان نەکەن.
﴿١٩٤﴾ ب ڕاستی ئەوێت هوین دپەرێسن چێکرییێت خودێنە، وەکی هەوە، ڤێجا گازی وان بکەن بلا
بەرسڤا هەوە بدەن!! ئەگەر هوین ڕاست دبێژن. ﴿١٩٥﴾ ئەرێ ما وان [بوتان] پێ هەنە پێ ب ڕێڤە بچن؟
یان دەست هەنە پێ دربان بدانن؟ یان چاڤ هەنە پێ ببینن؟ یان گوهـ هەنە پێ گولێ ببن؟!! بێژە:
هوین گازی هەمی هەڤپشکێت خۆ بکەن، پاشی هوین و ئەو پێکڤە پیلانێ بۆ من بگێڕن و چو دەرفەتێ
ژی نەدەنە من.

إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ١٩٦
وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَكُمۡ
وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ١٩٧ وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَسۡمَعُواْۖ
وَتَرَىٰهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ وَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ١٩٨ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ
وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ١٩٩ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ
مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٢٠٠ إِنَّ
ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ
فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ٢٠١ وَإِخۡوَٰنُهُمۡ يَمُدُّونَهُمۡ فِي ٱلۡغَيِّ ثُمَّ
لَا يُقۡصِرُونَ ٢٠٢ وَإِذَا لَمۡ تَأۡتِهِم بِـَٔايَةٖ قَالُواْ لَوۡلَا ٱجۡتَبَيۡتَهَاۚ
قُلۡ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ مِن رَّبِّيۚ هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡ
وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٢٠٣ وَإِذَا قُرِئَ ٱلۡقُرۡءَانُ
فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ٢٠٤ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ
فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ
وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ٢٠٥ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ
لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ ۩ ٢٠٦ سجدة





﴿١٩٦﴾ ب ڕاستی پشتەڤان و هاریکارێ من خودێیە، ئەوێ قورئان ئینایییە خوارێ، و ئەوە هاریکاریا قەنجیکاران دکەت. ﴿١٩٧﴾ و ئەوێت هوین ژ بلی خودێ دپەرێسن، نەشێن هاریکاریا هەوە بکەن، و نەشێن هاریکاریا خۆ ژی بکەن. ﴿١٩٨﴾ و ئەگەر هوین گازی وان [بوتان] بکەن بۆ ڕێکا ڕاست، گول هەوە نابن، و تو دبینی بەرێ وان یێ ل تە، بەلێ ئەو ب خۆ نابینن. ﴿١٩٩﴾ لێنەگرتنێ و کار و ئالییێ ساناهی بگرە، و فەرمانێ ب کار و کریارێت قەنج بکە، و ڕوییێ خۆ ژ نەفامان وەرگێڕە. ﴿٢٠٠﴾ و هەر وەختەکێ وەسواسەك ژ شەیتانی بگەهیتە تە، خۆ ب خودێ بپارێزە، ب ڕاستی ئەو یێ گوهدێر و زانایە. ﴿٢٠١﴾ ب ڕاستی ئەوێت پارێزکاری کرین، هەر وەختەکێ وەسواسەك ژ شەیتانی گەهشتە وان، [فەرمانا خودێ] هاتە بیرا وان، ڤێجا ب خۆ دحەسن، و چاڤێت وان باش ڕۆن دبن، [و دزانن ئەڤە وەسواسا شەیتانییە، خۆ ژ گونەهێ ڤەدکێشن و گوهێ خۆ نادەنە شەیتانی]. ﴿٢٠٢﴾ و برایێت وان [ژ شەیتانان] هاریکاریا وان [گاوران] دکەن د خرابییێدا، و پاشی دەست ژ خرابیا وان بەرنادەن. ﴿٢٠٣﴾ و ئەگەر تو بۆ وان چو موعجیزەیان نەئینی، دێ بێژن: بلا تە ئێك ژ دەڤ خۆ ئینابایە [بۆ ترانە]، بێژە: ئەز ل دویڤ وی تشتی دچم یێ کو وەحی بۆ من پێ هاتبیت ژ بەرێ خودایێ منڤە، ئەڤ قورئانە نیشان و دەلیلێت ئاشکەرانە ژ خودایێ هەوە، و ڕێکا هیدایەتێ و دلۆڤانییێیە بۆ ملەتێ باوەرییێ بینیت. ﴿٢٠٤﴾ و ئەگەر قورئان هاتە خواندن [د نڤێژێدا و ژ دەرڤەی نڤێژێ ژی] گوهێ خۆ بدەنێ و بێ دەنگ ببن، دا دلۆڤانی ب هەوە بێتە برن. ﴿٢٠٥﴾ و خودایێ خۆ ب ترس و ئاشکەرایێڤە و ب نهێنی و ناڤنجیڤە (ناڤبەرا دەنگێ نزم و یێ بلند) سپێدە و ئێڤاران بینە بیرا خۆ، و ژ بێ ئاگەهان نەبە. ﴿٢٠٦﴾ ب ڕاستی ئەوێت ل دەڤ خودایێ تە [کو ملیاکەتن] خۆ ل سەر پەرستنا خودێ مەزن ناکەن و خودێ [ژ هەمی کێماسییان] پاقژ دکەن، و هەر بۆ خودێ سوجدەیان دبەن.

## سۆرەتا ئەنفال

**ل مەدینەیێ هاتیـیە خوارێ (٧٥) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ پسیارا دەستکەفتیـییێت (خەزایـێ) ژ تـە دکـەن
[کا دێ چـاوا ئێنـە بەلاڤکـرن، نەخاسـمە پشـتی ژێـك
جودابوون ل سەر دەستکەفتیـییێت بەدرێ پەیدابوویی]،
بێـژە: دەسـتکەفتی بـۆ خـودێ و پێغەمبەرینـە [ئانکـو
بەلاڤکرنـا وان ب هیـڤیـیا پێغـەمبـەریڤـەیـە]، ڤێجـا
پارێزکاریـیا خـودێ بکـەن [ل سـەر دەستکەفتیـیان
ژێکڤـە نەبـن، و ل بـەر فەرمانـا خـودێ ڕاوەسـتن]، و
ناڤبـەرا خـۆ دورسـت بکـەن، و گوهداریـیا خـودێ و
پێغەمبـەرێ وی بکـەن ئەگـەر هویـن خـودان بـاوەر بن.
﴿٢﴾ ب ڕاسـتی خـودان بـاوەر بـەس ئـەون، ئەوێـت
ئەگـەر ناڤـێ خـودێ هاتـە ئینـان، دلێـت وان ژ ترسـاندا
خـۆ دقوتـن، و ئەگەر قورئان ل سـەر وان هاتـە خواندن،
باوەریـیا وان پـتر لـێ دئێـت، و پشـتا خـۆ ب خـودێ
موکـوم و گـەرم دکـەن. ﴿٣﴾ و ئەوێـت بـەردەوام [و ب ڕەنگـێ پێدڤـی] نڤێـژان دکـەن، و ژ تشـتێ مـە دایـییێ
خێـران ددەن. ﴿٤﴾ ئەهـا ئەڤەنـە خـودان باوەرێـت ڕاسـت و دورسـت، وان ل دەڤ خودایـێ خۆ پێـك و پایە و
گونەهــ ژێبرن و ڕزقەکـێ بەرفرەهـ هەیە. ﴿٥﴾ [حوکمـێ ژێکڤەکرنا دەستکەفتیـیان ب دویڤهیك هات، دێ ب
وی ڕەنگـی بیـت یـێ خـودێ بڤێـت، د گەل هنـدێ کو ب دلـێ هنـدەکان نینـە ژی] هەروەکی خودایـێ تە تو ژ
مەدینەیـێ دەرئێخسـتی بـۆ بـەدرێ [بـۆ کارەکی تەقدیرا وی ل سـەر بـوو]، و هندەك ژ خـودان بـاوەران ئەڤە پێ
نەخـۆش بـوو. ﴿٦﴾ پشـتی بۆ وان ڕاسـتی دیاربوویی کو دێ سـەرکەڤن، جڕەبڕێ [د دەرهەقێ شـەڕیدا] د گەل
تـە دکـەن، [و وان شـەڕ پـێ نەخۆشـە] دێ بێـژی بۆ کوشـتنێ دئێنـە هاژۆتـن، و کوشـتنێ ب چاڤێت خـۆ دبینن.
﴿٧﴾ و بینـە بـیرا خـۆ وەختێ خودێ ژڤان ب ئێك ژ دویان دایــییە هەوە [کاروانێ قورەیشـیـیان، یان سـەرکەڤتن
ل سـەر لەشـکەرێ وان]، بەلـێ هویـن حـەز دکـەن یـا بـێ شـەڕ بگەهیتە هـەوە [کـو کاروانـە]، و خـودێ دڤێت
ب ئایەتێـت خـۆ ئەوێـت هاتینـە خـوارێ ل سـەر شـەڕی، هەقیـێ بنەجە بکـەت، و گـاوران بنبڕ بکـەت. ﴿٨﴾
و دا هەقیـێ [کـو ئیسـلامە] بنەجـە بکـەت، و پویچاتیــیێ پویچ بکـەت، چەند نـە ب دلـێ گونەهـکاران [بوت
پەرێسـان] ژی بیت.



سُورَةُ الأَنفَالِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نصف الحزب ١٨
يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَنفَالِۖ قُلِ ٱلۡأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡۖ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم
مُّؤۡمِنِينَ ١ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ
قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ
يَتَوَكَّلُونَ ٢ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ
يُنفِقُونَ ٣ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُمۡ دَرَجَٰتٌ عِندَ
رَبِّهِمۡ وَمَغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ٤ كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ
مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ٥
يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ
وَهُمۡ يَنظُرُونَ ٦ وَإِذۡ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحۡدَى ٱلطَّآئِفَتَيۡنِ أَنَّهَا
لَكُمۡ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيۡرَ ذَاتِ ٱلشَّوۡكَةِ تَكُونُ لَكُمۡ وَيُرِيدُ
ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقۡطَعَ دَابِرَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٧
لِيُحِقَّ ٱلۡحَقَّ وَيُبۡطِلَ ٱلۡبَٰطِلَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٨

إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ فَٱسۡتَجَابَ لَكُمۡ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلۡفٖ
مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ ٩ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ
وَلِتَطۡمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمۡۚ وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ
عَزِيزٌ حَكِيمٌ ١٠ إِذۡ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةٗ مِّنۡهُ وَيُنَزِّلُ
عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذۡهِبَ عَنكُمۡ
رِجۡزَ ٱلشَّيۡطَٰنِ وَلِيَرۡبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمۡ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلۡأَقۡدَامَ ١١
إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمۡ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْۚ سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ فَٱضۡرِبُواْ
فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ ١٢ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ
شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ ٱللَّهَ
شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ١٣ ذَٰلِكُمۡ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلۡكَٰفِرِينَ
عَذَابَ ٱلنَّارِ ١٤ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ زَحۡفٗا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ ١٥ وَمَن يُوَلِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ
دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفٗا لِّقِتَالٍ أَوۡ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٖ فَقَدۡ بَآءَ
بِغَضَبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأۡوَىٰهُ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ١٦



﴿٩﴾ بیننە بیرا خۆ وەختێ [د شەڕێ بەدرێدا] لاڤلاڤ
و هەوار هەوارا هەوە: هەوە سەرکەڤتن و هاریکاری
ژ خودایێ خۆ دخواست، ئینا بەرسڤا هەوە دا، ب
ڕاستی ئەز دێ ب هزار ملیاکەتێت ل دویڤ ئێك
پشتەڤانییا هەوە کەم. ﴿١٠﴾ و ئەڤ هاریکارییە بۆ
هەوە کر، دا بۆ هەوە ببیتە مزگینی ژ بەرێ خودێڤە، و
دا دلێت هەوە پێ تەنا ببن [کو هوین دێ سەرکەڤن]،
و ب ڕاستی سەرکەڤتن بەس ب دەستێ خودێیە،
ب ڕاستی خودێ یێ سەردەست و کاربنەجهە.
﴿١١﴾ و بیننە بیرا خۆ دەمێ خەوەکا سڤك دلێ هەوە
گرتی، و خودێ ژ نك خۆ هوین پێ دلتەنا کرین و
باران بۆ هەوە ژ ئەسمانی باراندی، دا هەوە پێ پاقژ
بکەت [شویشتنێ ل سەر خۆ ڕاکەن، و دەستنڤێژێت
خۆ بگرن و نڤێژێت خۆ بکەن]، و دا ئاوازێت
شەیتانی ژ دەڤ هەوە ببەت [هوین نەبێژن ئەم دکێمین
و ئەو گەلەکن]، و دا دلێت هەوە ب بێنفرەهییێ
موکوم بکەت، و پێیان پێ ڕابگریت [و ل بن پێیێت
هەوە گزر بکەت و نەبنە تەقن]. ﴿١٢﴾ بیننە بیرا
خۆ دەمێ خودایێ تە وەحی بۆ ملیاکەتان هنارتی، ب ڕاستی ئەز یێ د گەل هەوە، ڤێجا مزگینییێ ب
سەرکەڤتنێ بدەنە ئەوێت باوەری ئینایین و وان ڕاگرن، ئەز دێ ترس و لەرزێ ئێخمە د دلێت واندا ئەوێت
گاور بوویین، ڤێجا هوین دربان دانە ستۆ و سەرتلێت وان. ﴿١٣﴾ چونکی وان دژاتییا خودێ و پێغەمبەرێ
وی دکر، و هەر کەسێ دژاتییا خودێ و پێغەمبەرێ وی بکەت [بلا بزانیت] هندی جزایێ خودێیە، ب
ڕاستی جزایەکێ دژوارە. ﴿١٤﴾ ئەڤە ئیزایا هەوەیە ڤێجا تامکەنێ، [و بزانن] ب ڕاستی [ڕۆژا قیامەتێ] ئاگرێ
دۆژەهێ بۆ گاورانە. ﴿١٥﴾ گەلی ئەوێت هەوە باوەری ئینایین، ئەگەر هوین [د شەڕیدا] کەڤتنە بەر سینگێ
گاوران، پشتا خۆ نەدەنە وان و ژ وان نەرەڤن. ﴿١٦﴾ و هەر کەسێ وێ ڕۆژێ پشتا خۆ بدەتە وان و ژ وان
برەڤیت، ژ بلی وی یێ ل بەر بیت بچیتە چەنگەکێ دی یێ شەڕی یان خۆ ڤەکێشیت، دا جارەکا دی ب هێزتر
بزڤریتەڤە، یان خۆ بدەتە د گەل دەستەکەکا دی، ڤێجا ب ڕاستی ئەوێ پشتا خۆ بدەتە وان و ژ وان برەڤیت
[ژ بلی ئەوێت مەبەستا وان هاتینە دیاریکرن] هێژایی غەزەبا خودێ بوو، و جهێ وی دۆژەهە و پیسە جهە.

فَلَمۡ تَقۡتُلُوهُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمۡۚ وَمَا رَمَيۡتَ إِذۡ رَمَيۡتَ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ وَلِيُبۡلِيَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡهُ بَلَآءً حَسَنًاۚ
إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿١٧﴾ ذَٰلِكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيۡدِ
ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٨﴾ إِن تَسۡتَفۡتِحُواْ فَقَدۡ جَآءَكُمُ ٱلۡفَتۡحُۖ وَإِن
تَنتَهُواْ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَإِن تَعُودُواْ نَعُدۡ وَلَن تُغۡنِيَ عَنكُمۡ
فِئَتُكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَوۡ كَثُرَتۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٩﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ
وَأَنتُمۡ تَسۡمَعُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَهُمۡ
لَا يَسۡمَعُونَ ﴿٢١﴾ ۞إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ
ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَوۡ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمۡ خَيۡرٗا لَّأَسۡمَعَهُمۡۖ
وَلَوۡ أَسۡمَعَهُمۡ لَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٢٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ
وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ
تُحۡشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ
مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢٥﴾

ثلاثة أرباع الحزب ١٨



﴿١٧﴾ ڤێجا نە هەوە ئەو دكوشتن، بەلێ خودێ ئەو
كوشتن و نە تو بوویی [هەی پێغەمبەر وەختێ خیز
گەهشتیە سەروچاڤێت هەمیان] تە هاڤێتی وەختێ
تە هاڤێتی، بەلێ خودێ هاڤێت، و دا خودێ ب ڤێ
[هاریكرن و سەرئێخستنێ] قەنجی و كەرەمەكا باش
د گەل خودان باوەران بكەت، ب ڕاستی خودێ
گوهدێر و زێدە زانایە. ﴿١٨﴾ مەخسەد [ژ ڤان
هاریكاریان] ئەوە [خودێ قەنجییێ د گەل خودان
باوەران بكەت، و پیلانێت گاوران سست بكەت]،
ب ڕاستی خودێ لاوازكەرێ پیلانێت گاورانە.
﴿١٩﴾ [گەلی موشركان] ئەگەر هوین سەركەڤتنێ
دخوازن [بۆ وی یێ ڕاست و دورست]، ڤێجا
سەركەڤتن ل دویڤ داخوازا هەوە هات [كا كی چێتر
و دورسترە، خودێ ئەو ب سەرئێخست]، و ئەگەر
هوین نەیارەتیا [پێغەمبەری و موسلمانان] بهێلن و
بەس بكەن، نێ ئەڤە بۆ هەوە چێترە، و ئەگەر هوین
بزڤرنەڤە [گاورییێ و دژمناتییێ]، ئەم ژی دێ [بۆ
هاریكاریا پێغەمبەری و شكاندنا گاوران] زڤرینەڤە،
و كۆم و هەژمارا هەوە چو مفایی ناگەهینتە هەوە، هوین چەند گەلەك ژی بن، و ب ڕاستی خودێ یێ د
گەل خودان باوەران. ﴿٢٠﴾ گەلی خودان باوەران، گوهداریا خودێ و پێغەمبەرێ وی بكەن، و پێغەمبەری
نەهێلن و پشتا خۆ نەدەنێ، و گوهێ هەوە ب دورستایی لێ كا چ دبێژیت. ﴿٢١﴾ و وەكی وان نەبن ئەوێت
گۆتین مە بهیست [كو ئەو دوروی و جوهینە] و ئەو ب خۆ [بهیستنەكا ب مفا] نابهیسن. ﴿٢٢﴾ ب ڕاستی
خرابترین جاندار ل دەڤ خودێ، ئەون ئەوێت كەڕ و لال، ئەوێت تێ نەگەهن [كا چ د خێرا واندایە چ د خێرا
واندا نینە، هەلبەت ئەڤ ئایەتە د دەرهەقێ هندەك مرۆڤان ژ ئویجاخا (عبد الدار)دا هاتە خوار، دگۆتن: ئەم
د ڕاستا وی تشتیدا یێ موحەمەد پێ هاتی د كەڕ و كۆرە و لالین]. ﴿٢٣﴾ و ئەگەر خێرەك د واندا [د كەڕ
و لالاندا] هەبایە، دا خودێ هەقییێ ب گوهێ وان ئێخیت، و ئەگەر ب گوهێ وان ئێخستبایە ژی، هەر دا
پشتا خۆ دەنێ و ڕوییێ خۆ ژ باوەرییێ وەرگێرن. ﴿٢٤﴾ گەلی خودان باوەران، بەرسڤا خودێ و پێغەمبەری
بدەن [ئانكو ب لەز گوهداریا خودێ و پێغەمبەری بكەن] دەمێ بۆ وی تشتی گازی هەوە دكەت یێ هەوە
زێندی دكەت، و بزانن خودێ مرۆڤی و دلێ مرۆڤی ژێك دكەت [ئانكو دلی دمرینیت و دگوهۆڕیت]، و ب
ڕاستی هوین دێ ب بال ویڤە ئێنە كۆمكرن. ﴿٢٥﴾ و خۆ ژ ئاتافەكێ بپارێزن، نەبەس دێ وان ب تنێ گریت،
ژ هەوە، ئەوێت ستەم كرین، و بزانن جزایێ خودێ ب ڕاستی جزایەكێ دژوارە.

وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَخَافُونَ
أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمۡ وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ وَرَزَقَكُم
مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٧﴾
وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ
عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿٢٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ
ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا وَيُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ
وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ وَإِذۡ يَمۡكُرُ بِكَ
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثۡبِتُوكَ أَوۡ يَقۡتُلُوكَ أَوۡ يُخۡرِجُوكَۚ وَيَمۡكُرُونَ
وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ
ءَايَٰتُنَا قَالُواْ قَدۡ سَمِعۡنَا لَوۡ نَشَآءُ لَقُلۡنَا مِثۡلَ هَٰذَآ إِنۡ هَٰذَآ
إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذۡ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا
هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ
أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٣٢﴾ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمۡ وَأَنتَ
فِيهِمۡۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمۡ وَهُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ﴿٣٣﴾



﴿٢٦﴾ و بیننە بیرا خۆ وەختێ هوین ل مەکەهێ د کێم و بندەست، هوین دترسیان خەلك [ئانکو موشرکێت مەکەهێ] ب لەز هەوە بگرن، ڤێجا [خودێ] هوین حەواندن [و مەدینە بۆ هەوە کرە ئێورگەهـ و پەناگەهـ]، و ب هاریکاریا خۆ [رۆژا بەدرێ] پشتەڤانیا هەوە کر، و رزقێ پاك و پاقژ دا هەوە، دا هوین سوپاسیا خودێ بکەن. ﴿٢٧﴾ گەلی خودان باوەران: خیانەتێ ل خودێ و پێغەمبەری نەکەن [کو هوین فەرمانێت وان بهێلن و رێکا وان نەگرن، و گونەهان بکەن]، و خیانەتێ د ئەمانەتێت خۆدا نەکەن، و هوین دزانن ئەڤا هەوە د راستا ئەمانەتیدا کری خیانەتە. ﴿٢٨﴾ و بزانن ب راستی زارۆك و مالێ هەوە، جەرباندنە بۆ هەوە، و [بزانن] ب راستی خودێ خەلاتەکێ مەزن ل دەڤە [ڤێجا خەمێ ژ وی خەلاتی بخۆن، و بلا زارۆك و مالێ هەوە وی خەلاتی ژ دەست هەوە نەکەن]. ﴿٢٩﴾ گەلی خودان باوەران ئەگەر هوین پارێزکاریا خودێ بکەن، دێ ڤاڤێرێ دەتە هەوە [کو هوین راستی و پویچییێ ژێك ڤاڤێرن و ژێك جودا بکەن]، و گونەهێت هەوە دێ پویچکەت و دێ ل هەوە بۆریت، و نێ خودێیە خودانێ کەرەما مەزن. ﴿٣٠﴾ و بیننە بیرا خۆ وەختێ ئەوێت گاور بووین، ئۆیین و نەخشە بۆ تە ددانان، دا تە زیندان بکەن و گرێ بدەن یان تە بکوژن، یان تە [ژ مەکەهێ] دەربێخن، و فند و فێلان دکەن و نەخشەیان ددانن، و خودێ ژی نەخشەیان ددانیت [تەکبیرێ دکەت]، و خودێ چێترین تەکبیرکەرە. ﴿٣١﴾ وەختێ ئایەتێت مە ب سەر واندا دهاتنە خواندن، دگۆتن: مە بهیستن، ئەگەر مە ڤیابایە، ئەم ژی دا وەکی ڤان ئایەتان بێژین، و ئەڤە ژ ئەفسانەیێت پێشییان پێڤەتر نینە. ﴿٣٢﴾ و بیننە بیرا خۆ دەمێ وان گۆتی: خودێوۆ ئەگەر ئەڤە [ئەڤا موحەمەد پێ هاتی] هەقی بیت ژ نك تە هاتبیت، تو بەرانەك ژکەڤران ژ ئەسمانی ب سەر مەدا ببارینە، یان ئیزایەکا ب ژان و دژوار بۆ مە بینە. ﴿٣٣﴾ و خودێ وان ئیزا نادەت [هەمییان ب گشتی ب بەر ئیزا نائێخیت] و تو [هەی موحەمەد] د ناڤ واندا.. و خودێ وان ب بەر ئیزایێ نائێخیت، و ئەو داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بکەن.

وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ
ٱلْحَرَامِ وَمَا كَانُوٓا۟ أَوْلِيَآءَهُۥٓ ۚ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ
وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ
عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ۚ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ
بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنفِقُونَ
أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ
عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ
يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ
ٱلْخَبِيثَ بَعْضَهُۥ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُۥ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُۥ
فِى جَهَنَّمَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٣٧﴾ قُل لِّلَّذِينَ
كَفَرُوٓا۟ إِن يَنتَهُوا۟ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِن يَعُودُوا۟
فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ
لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ
ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ وَإِن تَوَلَّوْا۟
فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَىٰكُمْ ۚ نِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٤٠﴾



﴿٣٤﴾ و وان چ هەیە نەهێلیت خودێ وان ب بەر ئیزا بێخیت [پشتی تو و موسلمانێت لاواز ژ ناڤ وان دەرکەڤتین] و ما بۆچی خودێ وان ئیزا نادەت، و ئەو ڕێکا خەلکی ژ مزگەفتا حەرام [کەعبەیێ] دگرن، و ئەو ب خۆ نەخودانێت مزگەفتێ.. خودانێت وێ ژ پارێزکاران پێڤەتر کەسێ دی نینە، بەلێ باراپتر ژ وان ڤێ نوزانن. ﴿٣٥﴾ و نڤێژا وان د مزگەفتێدا ژ فیتیان و دەستقوتانێ پێڤەتر چو یێ دی نەبوو، ڤێجا ژ بەر وێ گاورییا هەوە دکر ئیزایێ بخۆن. ﴿٣٦﴾ ب ڕاستی ئەوێت گاور بووین، مال و سامانێ خۆ دمەزێخن، دا ڕێکا خودێ ژ خەلکی بگرن، ڤێجا ئەو دێ مال و سامانێ خۆ مەزێخن، و پاشی دێ بۆ وان بیتە کول و کۆڤان و پاشی دێ شکێن ژی، و ئەوێت گاور بووین دێ د جەهنەمێدا ئێنە کۆمکرن. ﴿٣٧﴾ دا خودێ باش و خرابان [ئانکو موسلمان و گاوران] ژێك ڤاڤێریت، و خرابان ب دانیتە سەر خرابان و خڕان کۆمکەتە سەرێك، ڤێجا هەمییان دێ کەتە د دۆژەهێدا، و ئەڤەنە یێت خوسارەت. ﴿٣٨﴾ [هەی موحەمەد] بێژە وان: ئەوێت گاور بووین، ئەگەر دەست ژ دژمناتییا خودێ و پێغەمبەری بەردەن و موسلمان ببن، تشتێ بۆری ل وان نائێتە گرتن، و ئەگەر بزڤرنەڤە [ژ شەڕێ پێغەمبەری و دژمناتییا وی]، ب سویند ڕێکا خودێ د ڕاستا واندا و ئەوێت وەکی وان یا دیارە کا چ بووی؟! ﴿٣٩﴾ و هوین [گەلی موسلمانان] شەڕێ وان بکەن دا ڕێکا ئیسلامێ نەئێتە گرتن، و دا دینێ خودێ ببیتە سەرپشکێ هەمی دینان، ڤێجا ئەگەر [گاوران] دەست ژ دژمناتییێ و شەڕی و گاورییێ بەردان [و موسلمان بوون]، ب ڕاستی تشتێ ئەو دکەن خودێ دبینیت. ﴿٤٠﴾ و ئەگەر وان [دەست ژ کریارێت خۆ بەرنەدا] پشتا خۆ دا هەوە، ڤێجا هوین بزانن خودێ پشتەڤانێ هەوەیە، و ئەو باشترین پشتەڤان و باشترین هاریکارە.

* وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ
وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ إِن
كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ
يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٤١﴾ إِذۡ
أَنتُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلۡقُصۡوَىٰ وَٱلرَّكۡبُ
أَسۡفَلَ مِنكُمۡۚ وَلَوۡ تَوَاعَدتُّمۡ لَٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡمِيعَٰدِ
وَلَٰكِن لِّيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗا لِّيَهۡلِكَ مَنۡ
هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ
لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ إِذۡ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلٗاۖ
وَلَوۡ أَرَىٰكَهُمۡ كَثِيرٗا لَّفَشِلۡتُمۡ وَلَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤٣﴾ وَإِذۡ
يُرِيكُمُوهُمۡ إِذِ ٱلۡتَقَيۡتُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِكُمۡ قَلِيلٗا وَيُقَلِّلُكُمۡ
فِيٓ أَعۡيُنِهِمۡ لِيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗاۗ وَإِلَى ٱللَّهِ
تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ
فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٤٥﴾





﴿٤١﴾ و بزانن ب ڕاستی هەر دەستکەڤتیەکێ ب دەست هەوە بکەڤیت، پێنجێك ژێ بۆ خودێ و پێغەمبەری و مرۆڤێت وی [ژ بابکێ هاشم و (موطە لب)ی] و سێویان و قەلەندەر و ڕێڤنگانە، ئەگەر هەوە باوەری ب خودێ و ب ئەوا مە ڕۆژا بەدرێ بۆ بەندەیێ خۆ ئینایییە خوارێ، ئینابیت [ڕۆژا هەقی و نەهەقی ژێك هاتینە ڤاڤارتن] ڕۆژا هەردو دەستەك [گاور و موسلمان] کەڤتینە بەرئێك، و خودێ ب خۆ ل سەر هەمی تشتان یێ دەستهەلاتدارە. ﴿٤٢﴾ وەختێ هوین ل ڕەخێ نهالا نێزیکی مەدینەیێ و ئەو [قورەیشی] ل ڕەخێ نهالا دویری مەدینەیێ، و کاروان [یێ قورەیشیان] د بن هەوەدا بوو، و ئەگەر هەوە ژڤان دابایە ئێکدو، هەوە ژێك نەدگرت و هوین نەدبوونە ئاخڤتنەك [کێمیا هەوە، دا هەوە سست کەت، و ترسا پێغەمبەری د دلێت واندا، دا وان سست کەت، و هوین نەدکەڤتنە بەرئێك]، بەلێ خودێ بێ ژڤان هوین ل ڤی جهی گەهاندنە ئێك، دا خودێ وێ بکەت یا دڤیا ببیت [کو سەرئێخستنا موسلمانان بوو، و شکاندنا گاوران بوو]، و دا یێ گاور بوویی ب بەلگە و نیشان گاور ببیت، و دا یێ باوەری ئینایی ب بەلگە و نیشان باوەرییێ بینیت، و ب ڕاستی خودێ گوهدێر و زێدە زانایە. ﴿٤٣﴾ و بینە بیرا خۆ وەختێ خودێ ئەو کێم د خەونێدا نیشا تە داین، و ئەگەر ئەو گەلەك نیشا تە دابانە، هوین دا سست و نەچار بن و دا ترسن، و دا ل سەر کارێ شەڕی ب جڕە چن، بەلێ خودێ سلامەتی دا [ئەڤە هەمی چێ نەدبوو]، ب ڕاستی خودێ ئاگەهداری وێیە یا د سینگاندا [ڤەشارتی]. ﴿٤٤﴾ و بیننە بیرا خۆ وەختێ هوین [د شەڕیدا] کەڤتینە بەرئێك، مە ئەو ل بەر چاڤێت هەوە کێمکرن [دا جەسارەتا هەوە پتر لێ بهێت]، و مە هوین ژی ل بەر چاڤێت وان کێمکرن [دا ژ خۆ پشت ڕاست بن و کارێ خۆ ب دورستی نەکەن]، دا خودێ وێ بکەت یا دڤیا ببیت، و هەمی کاروبار هەر ب بال خودێڤە دزڤڕن [هەر کارەکی جزایێ وی ددەتێ]. ﴿٤٥﴾ گەلی خودان باوەران ئەگەر هوین کەڤتنە بەرانبەری کۆم و دەستەکا گاوران خۆ ڕاگرن، و خودێ گەلەك بیننە بیرا خۆ، دا هوین سەرفەراز بن.

وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرٗا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿٤٧﴾ وَإِذۡ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّي جَارٞ لَّكُمۡۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلۡفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكُمۡ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوۡنَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٤٨﴾ إِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمۡۗ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٤٩﴾ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴿٥٠﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿٥١﴾ كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٥٢﴾



﴿٤٦﴾ و هوین [گەلی خودان باوەران] گوهدارییا خودێ و پێغەمبەرێ وی بکەن و بەرهنگاری ئێکدو نەبن، هوین دێ سست بن و هەوە هێز و شیان نامینیت. و بێهنا خۆ فرەهـ بکەن، ب ڕاستی خودێ د گەل بێنفرەهـ و سەبرکێشانە. ﴿٤٧﴾ و وەکی وان نەبن ئەوێت ژ مەزناتی و بۆ ناڤ و دەنگێ خۆ، ژ مالا خۆ دەرکەتین، و ڕێکا خودێ ل خەلکی دگرن، و ب ڕاستی ئەو کارێ ئەو دکەن خودێ پێ ئاگەهدارە. ﴿٤٨﴾ و وەختێ شەیتانی کارێ وان د چاڤێ واندا جوانکری و گۆتییە وان: ئەڤرۆ کەس نەشێتە هەوە و کەس ب سەر هەوە ناکەڤیت، و ئەز پشتەڤان و هاریکارێ هەوەمە. ڤێجا وەختێ هەردو دەستەك بەرهەمبەری ئێك بوویین، ل سەر پاشپانییێت خۆ زڤری [و ڕەڤی] و گۆت: من شۆلە ب هەوە نینە، ب ڕاستی یا ئەز دبینم هوین نابینن، و ب ڕاستی ئەز ژ خودێ دترسم و خودێ یێ جزا دژوار و جزا گرانە. ﴿٤٩﴾ و بێژە وان وەختێ دوروییان و ئەوێت نەساخی د دلێت واندا هەی، دگۆت: ڤان موسلمانان، دینێ وان ئەو د سەردا برن [دینێ وان ئەو د بەر کارەکێرا کرن ژ وان یێ مەزنتر]، و هەر کەسێ پشتا خۆ ب خودێ موکوم بکەت، ب ڕاستی خودێ سەردەست و کاربنەجهە. ﴿٥٠﴾ و ئەگەر تو وان ببینی وەختێ ملیاکەت ڕوحا وان ئەوێت گاور بوویین دستینن، و بەر و پشتێت وان دقوتن [دا دیمەنەکێ ب ترس بینی] [و ملیاکەت دێ بێژنە وان] تامکەنە ئیزایا دۆژەهێ. ﴿٥١﴾ و ئەڤە ئەوە یا دەستێت هەوە کری، و ب ڕاستی خودێ چو ستەمێ ل بەندەیان ناکەت. ﴿٥٢﴾ وان ژی وەکی فیرعەونی و یێت بەری وی باوەری ب نیشان و ئایەتێت مە نەئینان، ڤێجا خودێ ئەو ب گونەهێت وان هنگاڤتن و ئیزادان، و ب ڕاستی خودێ یێ ب هێز و ئیزا دژوارە.

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمۡ يَكُ مُغَيِّرٗا نِّعۡمَةً أَنۡعَمَهَا عَلَىٰ قَوۡمٍ حَتَّىٰ
يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ٥٣ كَدَأۡبِ ءَالِ
فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ فَأَهۡلَكۡنَٰهُم
بِذُنُوبِهِمۡ وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَۚ وَكُلّٞ كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ٥٤
إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٥٥
ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنۡهُمۡ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهۡدَهُمۡ فِي كُلِّ
مَرَّةٖ وَهُمۡ لَا يَتَّقُونَ ٥٦ فَإِمَّا تَثۡقَفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡحَرۡبِ فَشَرِّدۡ بِهِم
مَّنۡ خَلۡفَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ٥٧ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوۡمٍ
خِيَانَةٗ فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ عَلَىٰ سَوَآءٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡخَآئِنِينَ ٥٨
وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْۚ إِنَّهُمۡ لَا يُعۡجِزُونَ ٥٩
وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ
تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ
لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ
ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ ٦٠ ۞ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ
فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٦١

ربع الحزب ١٩





﴿٥٣﴾ ئەڤـە خـودێ ب سـەرێ وان ئینـا، چونكـی ب
ڕاسـتی ئـەو قەنجـی و كەرەمـا خـودێ د گـەل ملەتەكی
كری، خودێ وێ قەنجیـیێ ناگوهۆڕیت [ژێ ناستینیت
و وان ئیـزا نـادەت] هەتـا ئـەو ملـەت خـۆ ب خـۆ،
خـۆ نەگوهـۆڕن [سوپاسیـیا وی بهێلـن و فەرمانێـت
وی ب پشـت گوهـێ خۆڤـە باڤێـژن]، و ب ڕاسـتی
خـودێ یـێ گوهدێـر و زانایـە. ﴿٥٤﴾ و وان ژی وەكـی
بنەمـالا فیرعەونی و یـێت بـەری وان [ب دەسـتێت خۆ
ئـەو قەنجـی و كـەرەم ژ خۆ كـرن، ژ بیركـرن كا كێ ئەڤ
خێر و كەرەمە د گەل وان كرن] نیشـان و موعجیزەیـێت
خودایـێ خۆ درەو دانـان، ڤێجا مە ژی ژ بـەر گونەهێت
وان ئـەو د هیـلاك برن، و مە بنەمـالا فیرعەونی [د ئاڤێدا]
خەندقانـدن، و ب ڕاسـتی ئەو هەمی [بنەمـالا فیرعەونی
و یـێت د گەل خەندقین و كوشتیـێت قورەیشیـیان] د
ستەمكار بـوون. ﴿٥٥﴾ ب ڕاسـتی خرابتریـن جانـدار
ل دەڤ خـودێ ئـەون، ئەوێـت ل سـەر گاوریـیێ
گـاور بوویـین و ڕژد بوویـین، و د بنـیڕا ئەو باوەریـیێ
نائینـن. ﴿٥٦﴾ ئەوێـت تـە سـۆز و پەیـمان ژێ سـتاندین،
پاشـی هـەر جـار سـۆز و پەیمانا خـۆ دشـكێنن، و ئەو خـۆ ژ ترس و شـەرما دویماهیـكا ڤـێ شـكاندنێ ناپارێزن.
﴿٥٧﴾ [هـەی موحەمـەد] هـەر دەمەكـێ تو ل سـەر وان سەردەسـت و دەسـتهەلاتدار ببـی، تـو وێ بریندارکرن و
كوشـتنێ ب سـەرێ وان بینە كو بۆ یـێت پشـت خۆ ببنە چام و عیبرەت [و ئێدی جورئەت نەكەن شـەڕی د گەل
تـە بكـەن، ژ ترسـا ئەڤـا ب سـەرێ هەڤالێـت وان هاتـی]، دا پێڤە بچـن. ﴿٥٨﴾ و هـەر وەختەكێ تو ترسـیایی كو
هنـدەك پەیمانـا خـۆ د گـەل تە بشـكێنن و خیانەتـێ د گەل تە بكـەن، ڤێجـا وان ئاگەهدار بكـە كو پەیـمان د ناڤبەرا
هـەوەدا نەمـا، وەكـی وان ل بـەر، ب ڕاسـتی خـودێ حـەژ خائینـان ناكـەت. ﴿٥٩﴾ و بـلا ئەوێـت گاوربوویـین
[و ڕۆژا بەدرێ ژ كوشـتن و ئێخسیریـیێ ڕزگاربوویـین] وێ هـزرێ نەكەن ئەو ژ ئیزایا خـودێ قورتالبوون، ئەو
مـە نەچـار ناكـەن [ئـەم وان ب بـەر ئیـزا نەئێخـین]. ﴿٦٠﴾ و هویـن ژی [گەلی خـودان بـاوەران] هندی هـەوە پێ
چـێ ببیـت ژ هێـزێ و هەسـپێت گرێدایی بـۆ وان بەرهەڤ بكەن كـو هوین پـێ [ب وێ هێـزێ] دژمنێت خودێ
و دژمنێـت خـۆ و هندەكێت ژ بلی ڤان هوین نانیاسـن، خودێ وان دنیاسـیت، چاڤترسـاندی بكەن و هەر تشـتەكێ
هویـن د ڕێـكا خودێـدا بمەزیـێخن، دێ خـێرا وی ل هەوە ب خـۆ زڤڕیت، بێی سـتەم ل هەوە بێتەكـرن [خێرێت
هـەوە بێنـە كێمكـرن یـان بێنـە ژ بیركـرن]. ﴿٦١﴾ و ئەگەر ئـەو [دژمن] بـەر ب ئاشتیـیێڤە هاتن، ڤێجا تـو ژی بەر
ب ئاشتیـیێڤە هـەڕە، و پشـتا خـۆ ب خودێ گـەرم و موكوم بكە، ب ڕاسـتی ئەوە یـێ گوهدێـر و زێدەزانا.

وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخۡدَعُوكَ فَإِنَّ حَسۡبَكَ ٱللَّهُۚ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ
بِنَصۡرِهِۦ وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٦٢ وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ لَوۡ أَنفَقۡتَ
مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ
أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٦٣ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسۡبُكَ
ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٦٤ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَى ٱلۡقِتَالِۚ إِن يَكُن مِّنكُمۡ عِشۡرُونَ صَٰبِرُونَ
يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفٗا مِّنَ
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ٦٥ ٱلۡـَٰٔنَ خَفَّفَ
ٱللَّهُ عَنكُمۡ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗاۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ
صَابِرَةٞ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمۡ أَلۡفٞ يَغۡلِبُوٓاْ
أَلۡفَيۡنِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ٦٦ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ
أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ
ٱلدُّنۡيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٦٧ لَّوۡلَا كِتَٰبٞ
مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمۡ فِيمَآ أَخَذۡتُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٦٨ فَكُلُواْ
مِمَّا غَنِمۡتُمۡ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٦٩



﴿٦٢﴾ و ئەگەر وان [ب وێ ئاشتیبوونێ] ڤیا تە بخاپینن
[مۆلەتێ بۆ خۆ چێکەن، دا کارێ خۆ باش بکەن]،
[خەمێ نەخۆ] ڤێجا ب ڕاستی خودێ بەسی تەیە،
ئەوە یێ تو ب پشتەڤانیا خۆ و یا موسلمانان ب هێز
ئێخستی. ﴿٦٣﴾ و ئەوە یێ دلێت وان [یێت ئەوس
و خەزرەجییان] گەهاندینە ئێك، و ئەگەر هندی د
ئەردیدا هەی، هەمی تە دابایە، تە نەدشیا تو دلێت
وان بگەهینییە ئێك، بەلێ خودێ گەهاندنە ئێك،
ب ڕاستی خودێ یێ سەردەست و کاربنەجهە.
﴿٦٤﴾ هەی پێغەمبەر، خودێ بەسی تەیە و بەسی
وانە ژی ئەوێت ڕێکا تە گرتین ژ خودان باوەران.
﴿٦٥﴾ هەی پێغەمبەر تو ناڤی ل خودان باوەران بدە و
وان گەرم بکە ل سەر شەڕی، ئەگەر بیستێت سەبرکێش
ژ هەوە هەبن، دێ شێنە دوسەدان، و ئەگەر سەد کەس
ژ هەوە هەبن دێ شێنە هزاران ژ گاوران، چونکی ئەو
ملەتەکن [هەقیێ] تێ ناگەهن [ڤێجا بەرهەمبەری
خودان باوەران خۆ ڕاناگرن]. ﴿٦٦﴾ ئەها ڤێ گاڤێ
خودێ ل سەر هەوە سڤك کر، و زانی لاوازییەکا ل
دەڤ هەوە هەی، ڤێجا ئەگەر سەدێت سەبرکێش و چەسپان ژ هەوە هەبن، دێ شێنە دوسەدان، و ئەگەر هزار
ژ هەوە هەبن، ب دەستویرا خودێ دێ شێنە دو هزاران، و ب ڕاستی خودێ د گەل بێنفرەهـ و سەبرکێشانە.
﴿٦٧﴾ بۆ چو پێغەمبەران دورست نینە ئێخسیر هەبن [و بەدەلێ بەرانبەر وەرگرن]، هەتا کوشتنەکا زێدە د
ئەردیدا نەکەن [دا گاور ڕسوا ببن و پشتەڤانێت وان کێم ببن] و هەوە [ب وەرگرتنا بەدەلێ بەرانبەر ئازاکرنا
وان]، پەرتال و متایێ دنیایێ دڤێت، و خودێ خێرا ئاخرەتێ بۆ هەوە دڤێت، و خودێ ب خۆ سەردەست و
کاربنەجهە. ﴿٦٨﴾ و ئەگەر ژ بەر حوکمێ خودێ یێ بەری نوکە نەبایە [کو خودێ ژ بەر ئجتیهادا خەلەت
کەسێ ئیزا نادەت]، دا ئیزایەکا مەزن ژ بەر بەدەلا هەوە وەرگرتی، هەوە هنگێڤیت. ﴿٦٩﴾ ڤێجا ژ وی مالێ ب
دەست هەوە کەڤتی [کو غەنیمەیە] بخۆن، حەلال و پاقژە، و [ژ نوکە وێڤە] ژ خودێ بترسن [و نەدەنە سەر
وی تشتی یێ خودێ دەستویر پێ نەدایی] و خودێ گونەهـ ژێبەر و زێدە دلۆڤانە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ
فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ
وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٧٠ وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدۡ خَانُواْ ٱللَّهَ
مِن قَبۡلُ فَأَمۡكَنَ مِنۡهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ٧١ إِنَّ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ
ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ
وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوۡمِۭ
بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ٧٢ وَٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٍۚ إِلَّا تَفۡعَلُوهُ تَكُن فِتۡنَةٞ فِي
ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٞ كَبِيرٞ ٧٣ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ
فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ
حَقّٗاۚ لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ٧٤ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ
وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ
بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ٧٥



﴿٧٠﴾ هەی پێغەمبەر، بێژە وان ئێخسیرێت د ناڤ دەستێت هەوەدا، ئەگەر خودێ بزانیت خێرا د هەوەدا هەی و ئنیەتا هەوە یا دورستە، دێ ژ وێ چێتر دەتە هەوە یا ژ هەوە هاتییە وەرگرتن، و دێ ل گونەهێت هەوە بۆریت، و خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە.
﴿٧١﴾ و ئەگەر وان بڤێت خیانەتێ ل تە بکەن، ب ڕاستی وان بەری نوکە خیانەتا ل خودێ کری، ڤێجا تو ب سەر وان ئێخستی [و ئەگەر ئەو جارەکا دی بزڤرنە سەر خیانەتا خۆ، جارەکا دی خودێ دێ تە ب سەر وان ئێخیت]، و خودێ زێدەزانا و کاربنەجهە.
﴿٧٢﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ئینایین و مشەخت بووین، و ب سەر و مالێ خۆ جیهاد د ڕێکا خودێدا کرین، و ئەوێت موسلمان ڤەحەواندین و هاریکاریا وان کرین، ئەڤە هەمی هاریکار و میراتخۆرێت ئێکن، و ئەوێت باوەری ئینایین و مشەخت نەبووین، ل سەر هەوە نەواجبە هوین هاریکاریا وان بکەن، و میراتخۆری د ناڤبەرا هەوەدا نینە، هەتا مشەخت نەبن، و ئەگەر هاریکاری ژ هەوە خواستن، هاریکاریا وان بکەن، ژ بلی هندێ هاریکاریا هەوە ل سەر ملەتەکی بخوازن د ناڤبەرا هەوە و واندا پەیمانەك هەبیت، و کارێ هوین دکەن خودێ دبینیت. ﴿٧٣﴾ و ئەوێت گاوربووین هندەك هاریکارێت هندەکانە [ئانکو هاریکار و پشتەڤانێت ئێکن]، و ئەگەر هوین ژی هاریکاری و پشتەڤانیا ئێکدو نەکەن، دێ بەلا و خرابییەکا مەزن د ئەردیدا چێبیت. ﴿٧٤﴾ و ئەوێت باوەری ئینایین و مشەخت بووین، و جیهاد د ڕێکا خودێدا کرین، و ئەوێت مشەخت ڤەحەواندین و هاریکاریا وان کرین، ئەها ئەڤەنە خودان باوەرێت ڕاست و دورست. گونەهـ ژێبرن و دانەکا ب ڕێز و ب قەدر بۆ وان هەیە. ﴿٧٥﴾ و ئەوێت پشتی هنگی باوەری ئینایین و مشەخت بووین، و جیهاد د گەل هەوە کرین، ئەها ئەڤە ژ هەوەنە. و د بەرنامە و حوکمێ خودێدا مرۆڤێت ئێك ژ بیانیان هەژیترن ببنە میراتخۆرێت ئێکدو. ب ڕاستی خودێ ئاگەهـ ژ هەمی تشتی هەیە.

## سُورَةُ التَّوۡبَةِ

نصف الحزب ١٩

بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١
فَسِيحُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي
ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخۡزِي ٱلۡكَٰفِرِينَ ٢ وَأَذَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ
إِلَى ٱلنَّاسِ يَوۡمَ ٱلۡحَجِّ ٱلۡأَكۡبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ
وَرَسُولُهُۥۚ فَإِن تُبۡتُمۡ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ
أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ٣
إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ثُمَّ لَمۡ يَنقُصُوكُمۡ شَيۡـٔٗا
وَلَمۡ يُظَٰهِرُواْ عَلَيۡكُمۡ أَحَدٗا فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡۚ
إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ٤ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ
فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ وَخُذُوهُمۡ وَٱحۡصُرُوهُمۡ
وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖۚ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ
ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥ وَإِنۡ أَحَدٞ
مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ
ٱللَّهِ ثُمَّ أَبۡلِغۡهُ مَأۡمَنَهُۥۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡلَمُونَ ٦



## سۆرەتا تەوبە

**ل مەدینەیێ هاتیـە خوارێ (١٢٩) ئایەتە**

﴿١﴾ ئەڤـە بەرائەتـە [ژ پەیمانـێ دەرکەڤتنـە] ژ خـودێ و پێغەمبـەرێ وی، بـۆ وان ئەوێـت هـەوە پەیـمان د گـەل دایـین ژ مـوشرکان. ﴿٢﴾ ڤێجـا [گـەلی گـاوران] چـار هەیڤـان [مەخسـەد هەیڤێـت حەرامکرینـە کو شـەڕ تێدا بێتەکـرن: (رجـب، ژی القعـده، ژی الحجـه، محـرم)] بـێ تـرس و ئێمـن د ئەردیـدا بگـەڕن، و بزانـن هویـن نەشـێن خـودێ نەچـار بکـەن [کو هـەوە ب بەر ئیزاییـێ نەئێخیـت]، و ب ڕاسـتی خـودێ ڕسـواکەرێ گاورانـە. ﴿٣﴾ و ئەڤـە ئاگەهدارکرنـە ژ بەرێ خـودێ و پێغەمبەرێ ویڤـە، د ڕۆژا حەژنـا حەجیانـدا، بـۆ هەمـی خەلکی، کو خـودێ و پێغەمبـەرێ وی د بەرینـە ژ مـوشرکان [ئەوێت پەیمانـا خـۆ دشـکێنن]، ڤێجـا ئەگـەر تۆبـە بکـەن، ئەڤە د خێرا هەوەدایـە و ئەگـەر هویـن ڕوییـێ خـۆ وەرگـێڕن [و ل سـەر شرکا خـۆ بمینـن] ڤێجـا بزانـن هویـن نـە نەچارکەرێـت خودێنـە، [کـو وەلێ بکەن نەشـێت هەوە ئیزا بدەت] و [تـو هەی موحەمەد] مزگینییـێ ب ئیزایەکا ب ژان و دژوار بـدە ئەوێـت گـاور بوویـین. ﴿٤﴾ و ژ بـلی وان [مـوشرکان] ئەوێـت هەوە پەیمان دایـینێ پاشـی وان چـو ژ پەیمانـا خـۆ کێم نەکریبـت و نەبوویـینە پشـتەڤان و هاریکارێت کەسـەکێ ل سـەر هـەوە، پەیمانا وان بگەهیننـە وەختـێ وێ یـێ دیارکری، ب ڕاسـتی خـودێ حەژ پارێـزکاران دکـەت [ئەوێت پارێزکاریـیا خودێ د وی تشـتیدا دکـەن ئـەوێ ل سـەر وان حەرامکـری و پەیمانـا خۆ ب جـه دئینـن]. ﴿٥﴾ ڤێجا ئەگـەر هەیڤێت ب ڕویمـەت و حەرامکـری بۆریـن و دەرکەڤتـن، هەمـی مـوشرکان بکـوژن، ل هـەر جهەکـێ هوین لـێ ببینن و ب دەسـت هـەوە بکەڤـن، و بگـرن و ئێخسـیر بکـەن و ل دۆر بزڤڕن و هەمـی زێرەڤانگەهـان لێ بگـرن، ڤێجا ئەگەر تۆبەکـرن و نڤێژکـرن و زەکاتـا مالێ خـۆ دان، ڤێجا ڕێکا وان بەردەن، ب ڕاسـتی خودێ گونەهــژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٦﴾ و ئەگـەر ئێـك ژ مـوشرکان خـۆ هاڤێتـە بەختێ تـە، بحەوینە دا کەلامـێ خودێ گولـێ ببیت [و قورئانێ بۆ بخوینـە]، پاشـی بگەهینـە وی جهـی یـێ لـێ ئێمـن ببیت، چونکـی ب ڕاسـتی ئـەو ملەتەکێ نەزانن.

كَيۡفَ يَكُونُ لِلۡمُشۡرِكِينَ عَهۡدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ
إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۖ فَمَا ٱسۡتَقَٰمُواْ
لَكُمۡ فَٱسۡتَقِيمُواْ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ٧
كَيۡفَ وَإِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ لَا يَرۡقُبُواْ فِيكُمۡ إِلّٗا وَلَا
ذِمَّةٗۚ يُرۡضُونَكُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَتَأۡبَىٰ قُلُوبُهُمۡ وَأَكۡثَرُهُمۡ
فَٰسِقُونَ ٨ ٱشۡتَرَوۡاْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلٗا فَصَدُّواْ عَن
سَبِيلِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٩ لَا يَرۡقُبُونَ
فِي مُؤۡمِنٍ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُعۡتَدُونَ ١٠ فَإِن
تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي
ٱلدِّينِۗ وَنُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ١١ وَإِن
نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُم مِّنۢ بَعۡدِ عَهۡدِهِمۡ وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمۡ
فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ إِنَّهُمۡ لَآ أَيۡمَٰنَ لَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ
يَنتَهُونَ ١٢ أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمٗا نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ
وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍۚ
أَتَخۡشَوۡنَهُمۡۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٣



﴿٧﴾ چاوا موشرکان دێ پەیمان ل دەڤ خودێ و پێغەمبەرێ وی هەبن، ژ بلی وان ئەوێت هەوە پەیمان ل کەعبەیێ دایییێ، هندی ئەو د گەل هەوە د ڕاست بن، هوین ژی د گەل وان د ڕاست بن، ب ڕاستی خودێ حەژ پارێزکاران دکەت [جهێنانا پەیمانێ ژ پارێزکارییێیە]. ﴿٨﴾ چاوا [دێ وان پەیمانا خودێ و پێغەمبەری هەبیت] ئەگەر ئەو ب سەر هەوە بکەڤن، مرۆڤانی و پەیمانێ بەرچاڤ ناگرن، ب دەڤێ خۆ هەوە ڕازی دکەن [ئانکو دەڤنەرمییێ د گەل هەوە دکەن، و دلێ وان ل سەر هەوە تژی کەرب و کینە]، و دلێ وان ناگریت [ئەو ئەوا د گەل هەوە دبێژن ب جە بێت]، و باراپتر ژ وان ڕێ دەرکەڤتینە. ﴿٩﴾ ئایەت و نیشانێت خودێ ب بهایەکێ کێم فرۆتن، و ڕێکا خودێ ل خەلکی گرتن، ب ڕاستی ئەڤا ئەو دکەن گەلەك کرێتە. ﴿١٠﴾ [نە بەس د ڕاستا تە ب تنێدا وەسانە] ئەو د ڕاستا چو خودان باوەراندا پەیمان و مرۆڤانییێ بەرچاڤ ناگرن، و ئەها ئەڤەنە، زێدەگاڤیکەر [یێت ددەنە سەر تان و پەژانێ خودێ]. ﴿١١﴾ ئەگەر تۆبەکرن و نڤێژکرن و زەکات دان، ڤێجا برایێت هەوەنە د دینیدا، و ئەم ب درێژی و ب هەمی ڕەنگان نیشان و ئایەتێت خۆ بۆ وان دیار دکەین، ئەوێت دزانن. ﴿١٢﴾ و ئەگەر پەیمانێت خۆ ئەوێت ب سویند موکوم کرین، پشتی د گەل هەوە داین بشکێنن، و ئەزماندرێژی د ڕاستا دینێ هەوەدا کرن [تان تێ قوتان]، ڤێجا سەرێت گاورییێ بکوژن، ب ڕاستی وان چو سویند و پەیمان نینن، بەلکی بەس بکەن و ب پاشڤە بچن.
﴿١٣﴾ ئەرێ ما هوین [گەلی موسلمانان] شەڕێ وان ناکەن، ئەوێت سویند و پەیمانێت خۆ شکاندین، و ل بەر بوون پێغەمبەری دەربێخن، و دەستپێکێ وان شەڕ د گەل هەوە کربوو، ما هوین ژ وان دترسن [لەوا هوین شەڕێ وان ناکەن]؟ خودێ هەژیترە هوین ژێ بترسن ئەگەر هوین خودان باوەر بن.

قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ وَيُخۡزِهِمۡ وَيَنصُرۡكُمۡ
عَلَيۡهِمۡ وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ ١٤ وَيُذۡهِبۡ غَيۡظَ
قُلُوبِهِمۡۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ١٥
أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تُتۡرَكُواْ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ
وَلَمۡ يَتَّخِذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَلِيجَةٗۚ
وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٦ مَا كَانَ لِلۡمُشۡرِكِينَ أَن يَعۡمُرُواْ مَسَٰجِدَ
ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلۡكُفۡرِۚ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ
أَعۡمَٰلُهُمۡ وَفِي ٱلنَّارِ هُمۡ خَٰلِدُونَ ١٧ إِنَّمَا يَعۡمُرُ مَسَٰجِدَ
ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى
ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمۡ يَخۡشَ إِلَّا ٱللَّهَۖ فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ
ٱلۡمُهۡتَدِينَ ١٨ ۞ أَجَعَلۡتُمۡ سِقَايَةَ ٱلۡحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلۡمَسۡجِدِ (ثلاثة أرباع الحزب ١٩)
ٱلۡحَرَامِ كَمَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَجَٰهَدَ فِي سَبِيلِ
ٱللَّهِۚ لَا يَسۡتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٩
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ
وَأَنفُسِهِمۡ أَعۡظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ٢٠



﴿١٤﴾ شەڕێ وان بکەن، خودێ دێ وان ب دەستێت
هەوە [ب کوشتنێ] ئیزادەت و [ب ئێخسیرکرنێ] ڕسوا
کەت، و هەوە ب سەر وان ئێخیت و دلێت دەستەکەکا
موسلمانان هین کەت. ﴿١٥﴾ و دێ کەربا دلێت وان
[موسلمانان] داڕێژیت، و خودێ تۆبەیێ ددەتە سەر
وی یێ بڤێت، و خودێ ب خۆ یێ زانا و کاربنەجهە.
﴿١٦﴾ ئەرێ هوین ل وێ هزرێنە [هۆسا بێ جەرباندن]
بێنە هێلان، و خودێ نەزانیت کێ ژ هەوە جیهاد
کرییە و کێ ژ هەوە ژ بلی خودێ و پێغەمبەرێ وی و
موسلمانان، کەسەك بۆ خۆ نەکربیتە نێزیك و خۆشتڤی،
و خودێ ژ هەر کارەکێ هوین دکەن ئاگەهدارە [ئانکو
هوین ل وێ هزرێنە بێنە هێلان، بێی کو جیهادێ بکەن
و خۆ ژ موشرکان بشۆن]. ﴿١٧﴾ بۆ موشرکان نابیت
و نەدورستە، و ئەو ب خۆ شادەیییێ ب گاورییێ
ل سەر خۆ ددەن، کو ئەو مزگەفتێت خودێ ئاڤا
بکەن، کار و کریارێت ڤان [ئەوێت شانازییێ پێ
دبەن] پویچ بوون، و هەروهەر دێ د ئاگریدا مینن.
﴿١٨﴾ ب ڕاستی بەس ئەو دێ مزگەفتێت خودێ
ئاڤاکەت، ئەوێ باوەری ب خودێ و ب ڕۆژا ئاخرەتێ ئینایی، و نڤێژێ بکەت و زەکاتێ بدەت، و ژ خودێ
پێڤە ژ کەسێ نەترسیت، ڤێجا هیڤییە ئەڤە ژ ڕاستەڕێکریان بن. ﴿١٩﴾ ئەرێ هوین [کارێ] ئاڤدانا حەجیان
و ئاڤاکرنا [سەخبێکرنا ئاڤاهییێ] کەعبەیێ، وەکی [کارێ] وی ددانن ئەوێ باوەری ب خودێ و ڕۆژا
قیامەتێ ئینایی و جیهاد د ڕێکا خودێدا کری، ئەڤە ل دەڤ خودێ نەوەکی ئێکن، و خودێ ب خۆ ملەتێ
ستەمکار ڕاستەڕێ ناکەت. ﴿٢٠﴾ ئەوێت باوەری ئینایین و مشەخت بوویین و جیهاد ب خۆ و مالێ خۆ
د ڕێکا خودێدا کرین، ل دەڤ خودێ پایە و پەیسکێت وان بلندترن، [ئانکو قەدرێ وان مەزنترە]. و ئەها
ئەڤەنە یێت سەرفەراز.

يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَانٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا
نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ
عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَابَآءَكُمْ
وَإِخْوَٰنَكُمْ أَوْلِيَآءَ إِنِ ٱسْتَحَبُّواْ ٱلْكُفْرَ عَلَى ٱلْإِيمَٰنِۚ
وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ إِن
كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ
وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ
كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ
وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأْتِيَ ٱللَّهُ
بِأَمْرِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾ لَقَدْ نَصَرَكُمُ
ٱللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ
كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ
ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ
سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا
لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾



﴿٢١﴾ خودایێ وان مزگینییێ ب دلۆڤانییێ ژ دەڤ خۆ، و ب ڕازیبوونێ و بەحەشتێت بۆ وان خۆشی تێدا بەردەوام، ددەتێ. ﴿٢٢﴾ هەروهەر دێ تێدا بن، ب ڕاستی خەلاتێ مەزن ئەوە ئەوێ ل دەڤ خودێ. ﴿٢٣﴾ گەلی خودان باوەران، باب و باپیر و برایێت خۆ نەهەلگرن هەڤال و خۆشتڤی، ئەگەر وان گاوری شوینا باوەرییێ هەلبژارت، و هەر کەسێ ژ هەوە وان بۆ خۆ بکەتە خۆشتڤی [پشتی گاوری هەلبژارتی]، ئەڤە ئەو ژ ستەمکارانە. ﴿٢٤﴾ بێژە: ئەگەر بابێت هەوە و زارۆکێت هەوە و برایێت هەوە و ژنێت هەوە، و عەشیرەتا هەوە و مالێ هەوە ب دەست خۆڤە ئینایی، و بازرگانییا هوین ژێ بترسن بشکێت و نەچیت، و خانییێت هەوە پێ خۆش، ل دەڤ هەوە شرینتر و خۆشتڤیتر بن ژ خودێ و پێغەمبەرێ وی و ژ جیهادا د ڕێکا خودێدا، ڤێجا خۆ بگرن هەتا فەرمانا خودێ دئێت، و خودێ ب خۆ ملەتێ ژ ڕێ دەرکەڤتی ڕاستەڕێ ناکەت. ﴿٢٥﴾ ب سویند خودێ هوین ل گەلەك جهان ب سەرئێخستن، و هاریکارییا هەوە کر [وەکی بەدرێ و حودەیبییێ و خەیبەرێ و ڤەکرنا مەکەهێ]، و ڕۆژا حونەینێ ژی [هاریکارییا هەوە کر]، گەلەکییا هەوە هوین گەرمکرن [و هەوە گۆت: ئەڤرۆ گەلەك بەرامبەر کێمەکا ناشکێن] و ڤێ گەلەکییێ چو فایدە ژی نەگەهاندە هەوە، و چو ژ هەوە نەدا پاش، و ئەرد ب بەرفرەهییا خۆڤە ل هەوە بەرتەنگ بوو، پاشی هەوە بەرێ خۆ وەرگێڕا و هوین ڕەڤین. ﴿٢٦﴾ پاشی خودێ [پشتی هوین ڕەڤین] دلخۆشییا خۆ ب سەر پێغەمبەرێ خۆ و خودان باوەراندا ئینا خوارێ، و لەشکەرەك [بۆ پشتەڤانییا هەوە] ئینا خوارێ، هەوە نەددیتن، و ئەوێت گاوربوویین ئەشکەنجەدان و ئەڤەیە جزایێ گاوران.

ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ
غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٢٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ
نَجَسٞ فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَاۚ
وَإِنۡ خِفۡتُمۡ عَيۡلَةٗ فَسَوۡفَ يُغۡنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦٓ
إِن شَآءَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٢٨ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ
لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ
مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ
ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ
وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٢٩ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ
وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم
بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُۚ
قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ٣٠ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ
وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ
مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ
لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٣١



﴿٢٧﴾ پاشی خودێ پشتی ڤێ تۆبەیێ ددەتە سەر
وی یێ وی بڤێت و خودێ ب خۆ گونەهـ ژێبەر و
دلۆڤانە. ﴿٢٨﴾ گەلی خودان باوەران، ب ڕاستی هندی
موشرکن د پیسن [پیساتیا وان یا شرکێ و سالۆخەت
و هزروبیرانە]، ڤێجا بلا پشتی ڤێ سالێ [کو سالا
نەهی مشەختی بوو] نێزیکی مزگەفتا کەعبەیێ نەبن،
[و نابیت ژ نوکە و پێڤە بێنە کەعبەیێ بۆ حەجێ و
عومرەیێ] و ئەگەر هوین [ژ نەهاتنا وان بۆ مزگەفتێ]
ژ خیزانییێ (هەژارییێ) بترسن [چونکی ب هاتنا وان
ڕەواجەك دکەڤیتە کڕین و فرۆتنا هەوە]، ڤێجا ئەگەر
خودێ بڤێت دێ هەوە ژ کەرەما خۆ دەولەمەند کەت.
ب ڕاستی خودێ یێ زانا و کاربنەجهە. ﴿٢٩﴾ [گەلی
خودان باوەران] شەڕی د گەل وان بکەن ئەوێت
باوەرییێ ب خودێ و ڕۆژا قیامەتێ نەئینن، و ئەوا
خودێ و پێغەمبەرێ وی حەرامکری، حەرام نەکەن، و
دینێ ڕاست بۆ خۆ نەکەنە دین، ژ وان ئەوێت کتێب بۆ
هاتین [جوهی و فەلە] هەتا ب دەستێت خۆ زێرەسەرێ
ددەن و ئەو یێت شکەستی. ﴿٣٠﴾ و جوهیان گۆت:
عوزەیر کوڕێ خودێیە، و فەلەیان گۆت: عیسا کوڕێ خودێیە، ئەڤە گۆتنا وانە ئەو ب دەڤێ خۆ [ڤێ] دبێژن [بێ نیشان و بێ بەلگە و گۆترە]، چاڤ ل وان دکەن یێت بەری وان گاور بوویین [د چەرخ و سەردەمێت بۆریدا وەکی یۆنان و ڕۆمانان]، خودێ وان بکوژیت [لەعنەتان ل وان بکەت]، چاوا ئەو بەرێ خۆ ژ هەقییێ وەردگێڕن بۆ پویچییێ؟! ﴿٣١﴾ ئەوان [مەخسەد جوهی و فەلە] زانا و عیبادەتکەرێت خۆ و عیسایێ کوڕێ مەریەمێ بۆ خۆ خودا دانایینە، و فەرمانا وان نەهاتییە کرن ژ خودایەکی زێدەتر بپەرێسن، کو ژ وی پێڤەتر چو خودایێت دی نینن، و ب ڕاستی ئەو یێ پاك و پاقژە ژ وی سالۆخی ئەوێ موشرك ددەنێ.

يُرِيدُونَ أَن يُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَيَأۡبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن
يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ
رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ
كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ﴿٣٣﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡأَحۡبَارِ وَٱلرُّهۡبَانِ لَيَأۡكُلُونَ
أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۗ وَٱلَّذِينَ
يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي
سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٣٤﴾ يَوۡمَ يُحۡمَىٰ عَلَيۡهَا
فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكۡوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمۡ وَجُنُوبُهُمۡ
وَظُهُورُهُمۡۖ هَٰذَا مَا كَنَزۡتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ
تَكۡنِزُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ
شَهۡرٗا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوۡمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ مِنۡهَآ
أَرۡبَعَةٌ حُرُمٞۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُۚ فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ
أَنفُسَكُمۡۚ وَقَٰتِلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ كَآفَّةٗ كَمَا
يُقَٰتِلُونَكُمۡ كَآفَّةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾

الحزب ٢٠





﴿٣٢﴾ دڤێن [و ل بەر دگەڕن] ڕۆناهییا خودێ [كو قورئانە] ب دەڤێت خۆ بڤەمرینن، و خودێ ناهێلیت، هەتا ڕۆناهییا خۆ تەمام نەكەت و ب سەرنەئێخیت، خۆ گاوران پێ نەخۆش ژی بیت. ﴿٣٣﴾ ئەو [خودێ] ئەوە یێ پێغەمبەرێ خۆ ب ڕێكا راستەڕێكرنێ [كو قورئانە] و ب دینێ ڕاست هنارتی، دا بكەتە سەرپشكا هەمی دینان، و ب سەر هەمی دینان بێخیت، بلا موشركان پێ نەخۆش ژی بیت. ﴿٣٤﴾ گەلی ئەوێت هەوە باوەری ئینایین، ب ڕاستی گەلەك ژ زانا و عیبادەتكەران [ژ فەلە و جوهییان] مالێ خەلكی ب نەهەقی دخۆن [ب ڕێكا بەرتیلێ و سەلەفێ و حەرامییێ]، و ڕێكا خودێ ژ خەلكی دگرن، و ئەوێت زێر و زیڤان ددانە سەرێك [و هەقێ خودێ ژێ دەرنەئێخن] و د ڕێكا خودێدا نەمەزێخن، ڤێجا [هەی موحەمەد] تو مزگینییێ ب ئیزایەكا ب ژان و دژوار بدە وان. ﴿٣٥﴾ ڕۆژا [زێڕ و زیڤ] د ئاگرێ جەهنەمێدا دئێنە سۆركرن و گەرمكرن، و ئەنییێت وان و تەنشتێت وان و پشتێت وان پێ دئێنە داخكرن، [دێ بێژنە وان] ئەها ئەڤە ئەوە یا هەوە بۆ خۆ دانایە سەرێك، ڤێجا تامكەنە وێ [بخۆن] یا هەوە بۆ خۆ دانایە سەرێك. ﴿٣٦﴾ ب ڕاستی ژ ڕۆژا خودێ ئەرد و ئەسمان چێكرین، هەژمارا مەهان ل دەڤ خودێ دوازدە مەهن، هەروەكی خودێ د كتێبا خۆدا [دەپێ پارستی] بنەجهكری، ژ وان مەهان چار ژێ ب ڕویمەتن [د وان مەهاندا (ژو القعدە، ژو الحجە، موحەررەم و ڕەجەب) شەڕ و كوشتن تێدا نەدورستە]، ئەڤەیە [ئیسلامە] دینێ ڕاست و دورست [ئەوێ قەدرێ ڤان مەهان دگریت]، ڤێجا د ڤان مەهاندا ستەمێ ل خۆ نەكەن [ئانكو كوشتنێ تێدا نەكەن]. و هوین هەمی پێكڤە شەڕێ موشركان بكەن، هەروەكی ئەو هەمی پێكڤە شەڕێ هەوە دكەن، و بزانن خودێ د گەل پارێزكارانە.

إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُۥ عَامٗا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامٗا لِّيُوَاطِـُٔواْ
عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ زُيِّنَ لَهُمۡ
سُوٓءُ أَعۡمَٰلِهِمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٧
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ
ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم
بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ٣٨ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبۡكُمۡ
عَذَابًا أَلِيمٗا وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّوهُ
شَيۡـٔٗاۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ٣٩ إِلَّا تَنصُرُوهُ
فَقَدۡ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذۡ أَخۡرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ
إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ
مَعَنَاۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيۡهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٖ
لَّمۡ تَرَوۡهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفۡلَىٰۗ
وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلۡعُلۡيَاۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ٤٠





﴿٣٧﴾ ب ڕاستی گیرۆکرنا [پاشئێخستنا] ڕویمەتا مەهێ بۆ مەهەکا دی [ئانکو گوهۆڕینا وان هەیڤێت خودان ڕویمەت و شەڕ تێدا حەرام ب هندەك مەهێت دی، دا ڕویمەتێ وێ بشکێنن] زێدەبوونە د گاوریێدا، ئەوێت گاوربوویین پێ بەرزە و گومڕا دبن، سالەکێ حەلال دکەن و سالا دی حەرام دکەن، دا هندی وێ هەژمارێ لێ بکەن یا خودێ حەرامکری، ڤێجا ئەو ب ڤێ کریارا خۆ حەرامێ خودێ حەلال دکەن. کارێ وان یێ خراب یێ بۆ وان هاتییە خەملاندن، و خودێ ب خۆ ژی ئەوێت گاور ڕاستەڕێ ناکەت. ﴿٣٨﴾ گەلی خودان باوەران هەوە خێرە، ئەگەر بۆ هەوە هاتە گۆتنێ، هوین هەمی د ڕێکا خودێدا دەرکەڤن بۆ جیهادێ، [هوین] د ئەردیدا لەش گران دبن، ئەرێ هەوە ژیانا ئاخرەتێ دا ب ژیانا دنیایێ؟ ڤێجا [بزانن] خۆشیا ژیانا دنیایێ ل بەر یا ئاخرەتێ چو نینە، یا کێم و بێ قیمەتە. ﴿٣٩﴾ و ئەگەر هوین [گەلی خودان باوەران] هەمی پێکڤە نەچنە جیهادێ، دێ خودێ ب ئێزایەکا دژوار هەوە ئێزادەت، و دێ هەوە ب غەیری هەوە گوهۆڕیت. و هوین نەشێن چو زیانێ ژی بگەهینێ، ب ڕاستی خودێ ل سەر هەمی تشتان یێ دەستهەلاتدارە. ﴿٤٠﴾ ئەگەر هوین [گەلی خودان باوەران] پشتەڤانی و هاریکاریا وی [پێغەمبەرێ من، موحەمەد] نەکەن، نێ ب ڕاستی خودێ هاریکاریا وی کر، وەختێ گاوران ئەو [پێغەمبەر ل مەکەهێ] ئێك ژ دویان [کو ئەبو بەکرە] دەرئێخستی، وەختێ ئەو هەردو د شکەفتێڤە بوون، دەمێ دگۆتە هەڤالێ خۆ [ئەبو بەکری] ب خەم نەکەڤە، نێ خودێ یێ د گەل مە، [هنگی] خودێ دلرەحەتیا خۆ ب سەردا داڕێت و پشتەڤانیا وی ب لەشکەرەکی کر هەوە نەددیت، و داخوازا گاوران بۆ [شرکێ و گاوریێ] ب بن ئێخست، و داخوازا خودێ [بۆ ئیسلامێ] ب سەرئێخست و بلندکر، و خودێ ب خۆ سەردەست و کاربنەجهە.

ٱنفِرُواْ خِفَافٗا وَثِقَالٗا وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ
فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٤١
لَوۡ كَانَ عَرَضٗا قَرِيبٗا وَسَفَرٗا قَاصِدٗا لَّٱتَّبَعُوكَ
وَلَٰكِنۢ بَعُدَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلشُّقَّةُۚ وَسَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ
لَوِ ٱسۡتَطَعۡنَا لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ يُهۡلِكُونَ أَنفُسَهُمۡ وَٱللَّهُ
يَعۡلَمُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ٤٢ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ
حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٤٣
لَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ أَن
يُجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ٤٤
إِنَّمَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ
وَٱرۡتَابَتۡ قُلُوبُهُمۡ فَهُمۡ فِي رَيۡبِهِمۡ يَتَرَدَّدُونَ ٤٥ ۞ وَلَوۡ
أَرَادُواْ ٱلۡخُرُوجَ لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةٗ وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ
فَثَبَّطَهُمۡ وَقِيلَ ٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ ٤٦ لَوۡ خَرَجُواْ فِيكُم
مَّا زَادُوكُمۡ إِلَّا خَبَالٗا وَلَأَوۡضَعُواْ خِلَٰلَكُمۡ يَبۡغُونَكُمُ
ٱلۡفِتۡنَةَ وَفِيكُمۡ سَمَّٰعُونَ لَهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ٤٧

ربع الحزب ٢٠



﴿٤١﴾ و هوین [گەلی خودان باوەران] ب دلخوازی و دلنەخوازی و ب گەنج و پیرەمێرڤە و ب سوار و پەیادەڤە و د خۆشی و نەخۆشییاندا و ب زارۆك و بێ زارۆكڤە و ب بارسڤکی و ب بارگرانیڤە و ب مال و جانێ خۆڤە، جیهادێ د رێکا خودێدا بکەن، ئەڤە بۆ هەوە چێترە ئەگەر هوین بزانن. ﴿٤٢﴾ ئەگەر [گازیکرنا تە هەی موحەمەد بۆ شەڕی نەبایە] و بۆ دەستکەڤتییەکێ نێزیك بایە یان ژی بۆ وەغەرەکا ناڤنجی بایە [نەیا دویر و نەیا نێزیك بایە]، ب راستی دا ل دویڤ تە ئێن، بەلێ ب راستی زەحمەت و وەستاندنێ ئەو دویرئێخستن و لەشگران کرن، و دێ ب خودێ سویند خۆن [و دێ بێژن:] ئەگەر ئەم شیابایینە، ب راستی دا د گەل هەوە دەرکەڤین [ب ڤەمانا خۆ ژ جیهادێ] خۆ بەرئاتاف دکەن، و خودێ ب خۆ دزانیت ئەو درەوینن. ﴿٤٣﴾ خودێ ل تە نەگریت و تە ئازاکەت [هەی موحەمەد]، بۆچی تە دەستویرا وان دا، بەری ئەوێت راستی گۆتین، بۆ تە دیار بن و تو درەوینان بنیاسی. ﴿٤٤﴾ ئەوێت باوەرییێ ب خودێ و رۆژا قیامەتێ دئینن، دەستویرییێ ژ تە ناخوازن کو ئەو ب خۆ و مالێ خۆ جیهادێ د رێکا خودێدا بکەن، و خودێ ئاگەهـ ژ پارێزکاران هەیە. ﴿٤٥﴾ بەلێ بەس ئەو دەستویرییێ ژ تە دخوازن [ژ جیهادێ ڤەمینن] ئەوێت باوەری ب خودێ و رۆژا قیامەتێ نەی، و دلێت وان ب گومان، ڤێجا ئەو د گومان و دودلییا خۆدا دزڤرن. ﴿٤٦﴾ و ئەگەر [راست دبێژن] وان ڤیابایە دەرکەڤن [بۆ جیهادێ] دا کاری بۆ کەن، بەلێ خودێ رابوونا وان نەڤیا، ڤێجا ل بەر وان گران کر، و گۆتنە ئێکدو د گەل روینشتییان [بچویك و پیرەمێر و ژنان] بروینن. ﴿٤٧﴾ و ئەگەر ئەو د گەل هەوە دەرکەڤتبانە ژی، ژ خرابییێ پێڤەتر ل هەوە زێدە نەدکرن، و دا د ناڤ هەوەدا ئێن و چن و خرابییێ هەلئێخن، سەرگێرییێ بۆ هەوە دخوازن، و د ناڤ هەوەدا یێت هەین [سست و لاواز] گوهدارییا وان دکەن، و خودێ ئاگەهـ ژ ستەمکاران هەیە.

لَقَدِ ٱبۡتَغَوُاْ ٱلۡفِتۡنَةَ مِن قَبۡلُ وَقَلَّبُواْ لَكَ ٱلۡأُمُورَ حَتَّىٰ
جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَظَهَرَ أَمۡرُ ٱللَّهِ وَهُمۡ كَٰرِهُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِنۡهُم
مَّن يَقُولُ ٱئۡذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓۚ أَلَا فِي ٱلۡفِتۡنَةِ سَقَطُواْۗ وَإِنَّ
جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾ إِن تُصِبۡكَ
حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡۖ وَإِن تُصِبۡكَ مُصِيبَةٞ يَقُولُواْ قَدۡ
أَخَذۡنَآ أَمۡرَنَا مِن قَبۡلُ وَيَتَوَلَّواْ وَّهُمۡ فَرِحُونَ ﴿٥٠﴾ قُل
لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوۡلَىٰنَاۚ وَعَلَى
ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلۡ هَلۡ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ
إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ وَنَحۡنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ
بِعَذَابٖ مِّنۡ عِندِهِۦٓ أَوۡ بِأَيۡدِينَاۖ فَتَرَبَّصُوٓاْ إِنَّا مَعَكُم
مُّتَرَبِّصُونَ ﴿٥٢﴾ قُلۡ أَنفِقُواْ طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا لَّن يُتَقَبَّلَ
مِنكُمۡ إِنَّكُمۡ كُنتُمۡ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَا
مَنَعَهُمۡ أَن تُقۡبَلَ مِنۡهُمۡ نَفَقَٰتُهُمۡ إِلَّآ أَنَّهُمۡ كَفَرُواْ
بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأۡتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمۡ
كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمۡ كَٰرِهُونَ ﴿٥٤﴾



﴿٤٨﴾ ب ڕاستی وان بەری نوکە ژی [بەری تەبووکێ]
کارێ خرابییێ بۆ هەوە دکر، و هەمی کار بۆ تە دئینان
و دبرن [پیلان و ئۆیین بۆ تە دگێران، دا تە ژ جیهادێ
سست بکەن]، هەتا ڕۆژا هەقییێ هاتی [هاریکاری
و پشتەڤانیا تە هاتیە کرن] و دینێ خودێ ب
سەرکەفتی، و وان [ئەڤێت ڤەمایین ژ جیهادێ] ئەڤە
نەدڤیا و د سەر وانڕا ئەڤە هاتەکرن. ﴿٤٩﴾ هەیە ژ
وان دبێژتە تە دەستویرا من بدە [ئەز نەئێمە شەڕێ
ڕۆمێ]، و من نەئێخە د گونەهێدا، بزانن گونەهـ ئەوە
یا ئەو کەڤتینێ و یا ئەو تێدا [کو حەز دکەن ڤەمینن]،
ب ڕاستی جەهنەم یا وەرهاتییە ل دۆر گاوران.
﴿٥٠﴾ ئەگەر قەنجییەك [سەرکەفتن و دەستکەفتییەك]
بگەهیتە تە پێ نەخۆش دبن، و ئەگەر خرابییەك
[د ڕێکا خودێدا بێتە سەرێ تە چ بریندارکرن چ کوشتن]
دێ بێژن: ب ڕاستی مە بەری نوکە کارێ خۆ کربوو،
[لەوا ئەم دەرنەکەفتین] و بەرێ خۆ ددەنە مالێت خۆ
و ئەو یێت کەیفخۆش. ﴿٥١﴾ بێژە ب ڕاستی چو بەلا
و ئاتاف مە ناهنگێڤن، ئەو نەبن یێت خودێ بۆ مە
نڤێسین، هەر ئەوە [خودێیە] پشتەڤان و هاریکارێ مە، ڤێجا بلا خودان باوەر پشتا خۆ ب خودێ گرێ
بدەن. ﴿٥٢﴾ بێژە [هەی موحەمەد] ما هوین ل هیڤییێنە چ ب سەرێ مە بێت، ژ بلی ئێك ژ دو قەنجییان
[سەرکەفتن و سەربلندی، یان ژی شەهیدبوون و لێبۆرین]، و ب ڕاستی ئەم ژی بۆ هەوە ل هیڤییێنە
[ئێك ژ دویان ب سەرێ هەوە بێت]، خودێ ب ئیزایەکێ ژ دەڤ خۆ هەوە بهنگێڤیت یان ب دەستێت مە
[هەوە بدەتە کوشتن ل سەر گاورییێ]، ڤێجا چاڤەڕێ بن، ئەم ژی د گەل هەوە چاڤەڕێینە. ﴿٥٣﴾ [هەی موحەمەد]
تو بێژە: [وان دوڕوییان] چ ب دلێ خۆ و چ بێ دلێ خۆ، مالێ خۆ بدەن، هەر ژ هەوە نائێتە قەبویلکرن. ب
ڕاستی هوین ملەتەکێ ژ ڕێ دەرکەفتینە. ﴿٥٤﴾ و چو نەهێلا مەزاختن و خێرێت وان ژ وان بێنە وەرگرتن، ئەو
نەبیت کو وان باوەری ب خودێ و پێغەمبەرێ وی نەئینا، و نڤێژێ ناکەن ئەگەر ب خرچ و خاڤی نەبیت، و
چو نادەن و نامەزێخن ئەگەر ژ نەچاری نەبیت.

فَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُمۡۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم
بِهَا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ٥٥
وَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمۡ لَمِنكُمۡ وَمَا هُم مِّنكُمۡ وَلَٰكِنَّهُمۡ
قَوۡمٞ يَفۡرَقُونَ ٥٦ لَوۡ يَجِدُونَ مَلۡجَـًٔا أَوۡ مَغَٰرَٰتٍ أَوۡ مُدَّخَلٗا
لَّوَلَّوۡاْ إِلَيۡهِ وَهُمۡ يَجۡمَحُونَ ٥٧ وَمِنۡهُم مَّن يَلۡمِزُكَ فِي
ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنۡ أُعۡطُواْ مِنۡهَا رَضُواْ وَإِن لَّمۡ يُعۡطَوۡاْ مِنۡهَآ إِذَا
هُمۡ يَسۡخَطُونَ ٥٨ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ رَضُواْ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ
وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤۡتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ
نصف الحزب ٢٠ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ٥٩ ۞إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ
وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ
وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ
مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦٠ وَمِنۡهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ
ٱلنَّبِيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٞۚ قُلۡ أُذُنُ خَيۡرٖ لَّكُمۡ يُؤۡمِنُ
بِٱللَّهِ وَيُؤۡمِنُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ
مِنكُمۡۚ وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٦١





﴿٥٥﴾ ڤێجا بلا مال و زارۆكێت وان [یێت گەلەك] تە عەجێبگرتی نەكەن، خودێ دڤێت د ژیانا دنیایێدا وان پێ ئەزیەت بدەت، و پاشی وان بمرینیت و ئەو گاور. ﴿٥٦﴾ [دورویی] ب خودێ سویند دخۆن كو ئەو ژ هەوەنە و یێت د گەل هەوە، و ئەو ب خۆ نە ژ هەوەنە، بەلێ ئەو دەستەكەكن دترسن [ئەوا هاتییە سەرێ گاوران ب سەرێ وان ژی بێت، ژ بەر هندێ ژ درەو بۆ هەوە سویند دخۆن، كو موسلمانن و خودان باوەرن وەكی هەوە، و ئەو ب خۆ وەسا نینە]. ﴿٥٧﴾ و ئەگەر وان ئاسێگەهەك [كو تێدا هاتبانە پارستن]، یان شكەفتەك [كو تێدا نەهاتبانە دیتن]، یان ژێرزەمینەك [كو چۆبانە تێدا] دیتبایە، دا ب لەز بەرێ خۆ دەنێ [ژ ترساندا]. ﴿٥٨﴾ و هندەك ژ وان د لێكڤەكرنا دەستكەڤتیاندا، تە لەكەدار دكەن، و تانان دهاڤێژنە تە، ڤێجا ئەگەر ژ وی مالی گەهشتە وان ڕازی بوون، و ئەگەر نەگەهشتە وان عێجز و نەڕازی دبن. ﴿٥٩﴾ و ئەگەر ب وی تشتێ كو خودێ و پێغەمبەرێ وی دایییە وان [ژ دەستكەڤتی و غەنیمەیان] ڕازی بانە، و گۆتبانە: خودێ بەسی مەیە، خودێ دێ ژ كەرەما خۆ دەتە مە و پێغەمبەرێ وی ژی [ژ كەرەما خودێ دێ دەتە مە]، و ب ڕاستی ئەم ل هیڤییا خودایێ خۆینە [ئەڤە دا بۆ وان چێتر بیت]. ﴿٦٠﴾ ب ڕاستی زەكات بەس بۆ وانە ئەوێت هەژار و بەلنگاز، و ئەوێت ل سەر شۆل دكەن [بۆ كۆمكرنا زەكاتێ]، و ئەوێت دلێ وان بەر ب ئیسلامێڤە دئێتە كێشان [ژ كەسێت موسلمان بوویین و هێژ موكوم نەبوویین، یان گرەگرێت گاوران دا ژ زیانا وان بێتە پاشڤەبرن و دلێ وان بۆ ئیسلامێ بێتە نەرمكرن]، و بۆ ئازادكرنا بەندەیان و بۆ دەینداران، و بۆ ڕێیا خودێ (جیهادێ ب هەمی ڕەنگانڤە) و ڕێڤنگانە، ئەڤە فەرزە ژ دەڤ خودێ، و خودێ ب خۆ یێ زانا و كاربنەجهە. ﴿٦١﴾ و ژ وان [دورویان] هەنە ئەزیەتێ دگەهیننە پێغەمبەری و دبێژن: ئەو گوهێ خۆ ددەتە هەمی تشتان و هەمییێ باوەر دكەت، بێژە: بەلێ ئەو گوهدارییا هەمی تشتی دكەت، بەلێ گوهدارییا وی بۆ خێرا هەوەیە، باوەرییێ ب خودێ دئینیت و باوەر ژ خودان باوەران دكەت، و دلۆڤانییە بۆ ئەوێت باوەری ئینایین ژ هەوە، و ئەوێت ئەزیەتێ دگەهیننە پێغەمبەرێ خودێ، ئیزایەكا ب ژان و دژوار بۆ وان هەیە.

يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ لِيُرۡضُوكُمۡ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ
أَن يُرۡضُوهُ إِن كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٦٢﴾ أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّهُۥ مَن
يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدٗا فِيهَاۚ
ذَٰلِكَ ٱلۡخِزۡيُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٦٣﴾ يَحۡذَرُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ أَن
تُنَزَّلَ عَلَيۡهِمۡ سُورَةٞ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلِ ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ
إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ
لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ
وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم
بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ إِن نَّعۡفُ عَن طَآئِفَةٖ مِّنكُمۡ نُعَذِّبۡ طَآئِفَةَۢ
بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ
بَعۡضُهُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمُنكَرِ وَيَنۡهَوۡنَ
عَنِ ٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَقۡبِضُونَ أَيۡدِيَهُمۡۚ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡۚ
إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ
وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ هِيَ
حَسۡبُهُمۡۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ ﴿٦٨﴾



﴿٦٢﴾ بۆ هەوە ب خودێ سویند دخۆن، دا هەوە
ڕازی بکەن، و خودێ و پێغەمبەرێ وی هێژاترن ئەو
ڕازی بکەن، ئەگەر ڕاست ئەو ژ خودان باوەران
بن. ﴿٦٣﴾ ئەرێ ما وان نەزانییە، هەر کەسێ دژاتی
و دژمناتییا خودێ و پێغەمبەرێ وی بکەت، نێ ب
ڕاستی ئاگرێ دۆژەهێ بۆ وییە و دێ هەروهەر
تێدا بیت، ئەڤەیە ڕسواتی و شەرمزارییا مەزن.
﴿٦٤﴾ دوڕوی دترسن سۆرەتەك د دەرهەقێ واندا [ئان
ل سەر وان] بێتە خوارێ، یا د دلێ واندا [ڤەشارتی]
بۆ وان بێژیت، [هەی موحەمەد] بێژە [وان]: ترانەیان
بکەن، نێ ئەوا هوین ژێ دترسن، خودێ دێ ئاشکەرا
کەت. ﴿٦٥﴾ و ئەگەر تو پسیارا وان بکەی [ژ وی
تشتێ وان گۆتی] دێ سویند خۆن و بێژن مە بەس
ترانە د ناڤبەرا خۆدا دکرن و بەس ئاخڤتن بوو، و
مە چو مەخسەد پێ نەبوون. بێژە: ئەرێ هەوە ترانە
ب خودێ و ئایەتێت وی و پێغەمبەرێ وی دکرن؟!
﴿٦٦﴾ [هەی موحەمەد بێژە دوڕوییان:] مهانە و
هەجەتان نەگرن (عوزران نەخوازن) [ژ هەوە نائێنە
وەرگرتن]، ب ڕاستی هوین گاوربوون پشتی هەوە باوەری ئینایی، ئەگەر ئەم ل دەستەکەکێ ژ هەوە
ببۆرین و ئازا بکەین [ئەوێت دوڕوییاتییا خۆ هێلایین] دەستەکەکێ دێ ئیزا دەین، چونکی ئەو ب ڕاستی
گونەهکار بوون. ﴿٦٧﴾ دوڕوی ژ ژن و مێران ژ ئێکن [ئانکو هەمی وەکی ئێکن د دوڕوییاتییێدا]، فەرمانێ
ب خرابییێ دکەن و ڕێ ل باشییێ دگرن، و دەستێت خۆ دگرن (دمچینن) و قەلساتییێ دکەن، خودێ ژ
بیرکرن [فەرمانا وی ب پشت گوهێ خۆڤە هاڤێتن] خودێ ژی ئەو هێلان [و دلۆڤانی و کەرەما خۆ ژ وان
بڕی]، ب ڕاستی دوڕوی ئەون یێت ژ ڕێ دەرکەڤتین. ﴿٦٨﴾ خودێ بۆ دوڕوییان ژ ژن و مێران و گاوران
ئاگرێ دۆژەهێ بەرهەڤ کرییە، و هەروهەر دێ تێدا بن و ئەو بەسی وانە، و خودێ ئەو یێت ژ دلۆڤانییا
خۆ دویرئێخستین، و ئیزایەکا هەروهەر بۆ وان هەیە.

كَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنكُمْ قُوَّةً وَأَكْثَرَ أَمْوَٰلًا
وَأَوْلَٰدًا فَٱسْتَمْتَعُوا۟ بِخَلَٰقِهِمْ فَٱسْتَمْتَعْتُم بِخَلَٰقِكُمْ
كَمَا ٱسْتَمْتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُم بِخَلَٰقِهِمْ وَخُضْتُمْ
كَٱلَّذِى خَاضُوٓا۟ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا
وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمْ يَأْتِهِمْ
نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَقَوْمِ
إِبْرَٰهِيمَ وَأَصْحَٰبِ مَدْيَنَ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتِ ۚ أَتَتْهُمْ رُسُلُهُم
بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟
أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٧٠﴾ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ
أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ
وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ
وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾
وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا
ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ
وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٧٢﴾



﴿٦٩﴾ [گەلی دوڕوییان] هوین ژی وەکی ئەوێت
بەری خۆ، ئەو ژ هەوە ب هێزتر بوون، و پتر ژ هەوە
مال و زارۆ هەبوون، ڤێجا وان خۆشی ب بارا خۆ
ژ دنیایێ بر، و هەوە ژی کەیف و خۆشی ب بارا
خۆ بر، و هوین کەڤتنە د پویچاتییێدا هەروەکی ئەو
کەڤتینە د پویچاتییێدا، [خودانێت ڤان سالۆخان]
ئەڤان کار و کریارێت وان د دنیا و ئاخرەتێدا پویچ
بوون، و هەر ئەڤەنە زیانکار. ﴿٧٠﴾ ما بۆ [دوڕوییان]
بەحسێ یێت بەری وان نەهاتییە کرن [کا چ ب
سەرێ وان هات]، ملەتێ نووح، و عاد [ملەتێ هوود
پێغەمبەر]، و (سەموود) [ملەتێ صالح پێغەمبەر]، و
ملەتێ ئیبراهیم پێغەمبەر و خەلکێ مەدیەنێ [ملەتێ
شوعەیب پێغەمبەر]، و گوندێت هاتینە سەروبنکرن
[گوندێت (لووط) پێغەمبەر]، پێغەمبەرێت وان ب
نیشان و بەلگەیێت ئاشکەراکەر بۆ وان هاتن [وان
باوەری ب پێغەمبەرێت خۆ نەئینا، ڤێجا خودێ ئیزا
ب سەردا دارێت]، ڤێجا خودێ نە ئەوە یێ ستەمێ
ل وان بکەت، بەلێ وان ب خۆ ستەم ل خۆ کر.
﴿٧١﴾ زەلام و ژنێت خودان باوەران هاریکار و پشتەڤانێت ئێکن، فەرمانێ ب قەنجی و باشییێ دکەن و ڕێکێ
ل خرابییێ دگرن، و نڤێژێت خۆ [ب ڕەنگێ پێدڤی] دکەن و زەکاتێ ددەن، و گوهدارییا خودێ و پێغەمبەرێ
وی دکەن، ئەڤان خودێ دێ دلۆڤانییێ پێ بەت، ب ڕاستی خودێ سەردەست و کاربنەجهە. ﴿٧٢﴾ خودێ
سۆزا دایییە خودان باوەران، ژ ژن و مێران، کو بەحەشتێت ڕوبیار د بنڕا دچن و دئێن و هەروهەر تێدا بن،
و خانییێت خۆش د بەحەشتا عەدەندا بکەتە بارا وان، و ڕازیبوونا خودێ ژ ڤێ هەمییێ مەزنترە، و ئەڤەیە
سەرفەرازییا مەزن.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ
وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ٧٣ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ
وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ
بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ
مِن فَضۡلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ
ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ
ثلاثة أرباع الحزب ٢٠ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ٧٤ ۞ وَمِنۡهُم مَّنۡ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنۡ ءَاتَىٰنَا
مِن فَضۡلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ٧٥
فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضۡلِهِۦ بَخِلُواْ بِهِۦ وَتَوَلَّواْ وَّهُم
مُّعۡرِضُونَ ٧٦ فَأَعۡقَبَهُمۡ نِفَاقٗا فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ يَلۡقَوۡنَهُۥ
بِمَآ أَخۡلَفُواْ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ٧٧
أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ سِرَّهُمۡ وَنَجۡوَىٰهُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ
عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ٧٨ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ
فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٧٩



﴿٧٣﴾ هەی پێغەمبەر جیهادێ د گەل گاور و
دوڕوییان بکە، و ل سەر وان بشدینە، و جهێ وان
جەهنەمە و پیسە دویماهیکە. ﴿٧٤﴾ [دوڕوی] ب
خودێ سویند دخۆن، وان نەگۆتییە [ئەگەر ڕاست
موحەمەد پێغەمبەر بیت، ئەم ژ کەران ژی خرابترین]
و ب ڕاستی وان پەیڤا گاورییێ گۆت، و پشتی
موسلمان بوویین گاور بوونەڤە، و ئەو کرنە دلێ خۆ
یا ب دەست وانڤە نەهاتی [کو کوشتنا پێغەمبەرییە]،
و چو کێماسی و ڕەخنە ل سەر [پێغەمبەری] نەبوون،
ئەو نەبیت خودێ و پێغەمبەرێ وی ئەو ژ کەرەما
خودێ بێ منەت کرن. ڤێجا ئەگەر ئەو تۆبە بکەن،
تۆبە بۆ وان چێترە و ئەگەر ئەو ڕوییێ خۆ [ژ تۆبە و
باوەرییێ] وەرگێڕن، ب ڕاستی خودێ دێ وان د دنیا و
ئاخرەتێدا ب بەر ئیزایەکا ب ژان و دژوار ئێخیت، و وان
د ئەردیدا چو هەڤال و پشتەڤان و هاریکار نابن [وان ژ
ئیزایێ ڕزگار بکەن]. ﴿٧٥﴾ و ژ وان [دوڕوییان] هەنە
پەیمانێ د گەل خودێ ددەن، ئەگەر [خودێ] ژ کەرەما
خۆ مالی بدەتە مە، ب ڕاستی و ب سویند ئەم دێ خێر
و سەدەقەیان دەین، و ئەم دێ بینە ژ مرۆڤێت قەنجیکار. ﴿٧٦﴾ ڤێجا وەختێ [خودێ] ژ کەرەما خۆ مال
داییێ، [وان دوڕوییان] قەلسی و چڕویکی کرن [و چو خێر نەدان، وەکی سویند خوارین]، و پشتا خۆ
دانێ [دانە پەیمانا خۆ] و ئەو د ڕوی وەرگێرانا خۆدا ڕکهشك. ﴿٧٧﴾ ڤێجا [چڕویکییێ] دوڕوییاتییەکا
بەردەوام هێلا د دلێ واندا، هەتا ڕۆژا دگەهنە خودێ، ژ بەر جهنەئینانا پەیمانا وان دایی، و ژ بەر درەوێت وان
دکرن. ﴿٧٨﴾ ئەرێ ما وان نەزانییە، خودێ نهێنی و پستەپستا وان دزانیت، و ب ڕاستی خودێ زێدە زانایێ
نهێنیانە. ﴿٧٩﴾ ئەو [دوڕوییێت] چکییان ددەنە خودان باوەرێن، ژ دل و گیان [گەلەك] سەدەقەیان ددەن
[دبێژن: ئەڤە بۆ ڕویمەتییێیە نە ژ بۆ ڕازیبوونا خودێیە]، و [ژ خودان باوەران] ئەوێت چو نەبینن بدەن ژ بلی
پێچێبوونا خۆ، [دوڕوی] ترانەیان بۆ خۆ پێ دکەن [و دبێژن: خودێ چو پاکی ب ڤێ کێمێ نینە]، خودێ
ئەو جزادان ل سەر ترانەیێت وان، و ئیزایەکا ب ژان و دژوار بۆ وان هەیە.

ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً
فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۗ
وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٨٠﴾ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ
خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا۟ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ
فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ
لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا جَزَآءًۢ
بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ
مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا۟ مَعِىَ أَبَدًا وَلَن
تُقَٰتِلُوا۟ مَعِىَ عَدُوًّا ۖ إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُوا۟
مَعَ ٱلْخَٰلِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ
عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾
وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم
بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَآ
أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُوا۟ مَعَ رَسُولِهِ ٱسْتَـْٔذَنَكَ
أُو۟لُوا۟ ٱلطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُوا۟ ذَرْنَا نَكُن مَّعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾





﴿٨٠﴾ چ تو داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ وان [دوڕوییان] بکەی، یان ژی داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ وان نەکەی، خۆ ئەگەر حەفتێ جاران داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ وان بکەی، هەر خودێ گونەهێت وان ژێ نابەت، چونکی ب ڕاستی وان باوەری ب خودێ و پێغەمبەرێ وی نەئینا، و خودێ ب خۆ ملەتێ ژ ڕێ دەرکەفتی، ڕاستەڕێ ناکەت. ﴿٨١﴾ ئەڤێت قەماین [ژ دوڕوییێت دەستویر خواستین، و نەچۆینە تەبووکێ] ب ڕوینشتنا خۆ [د مالێت خۆدا]، پشتی پێغەمبەرێ خودێ چۆیی، خۆشبوون، و نەڤیان ب خۆ و مالێ خۆ جیهادێ د ڕێکا خودێدا بکەن، و گۆتنە [خەلکی] د گەرمێدا دەرنەکەڤن، بێژە: ئاگرێ جەهنەمێ گەرمترە، ئەگەر ئەو تێ بگەهن. ﴿٨٢﴾ ڤێجا بلا پیچەک بکەنن، و گەلەک بکەنە گری، جزایێ کار و کریارێت وان کرین. ﴿٨٣﴾ ڤێجا ئەگەر خودێ تو [ژ تەبووکێ] ڤەگەڕاندییە مەدینەیێ ل نك دەستەکەکێ ژ وان [ژ یێت قەماییی]، و دەستویر ژ تە خواستن بۆ دەرکەڤتنێ [بۆ خەزایەکا دی ژ بلی تەبووکێ]، بێژە: هوین چو جاران د گەل من دەرناکەڤن، و هوین چو جاران د گەل من شەڕێ چو دژمنان ناکەن، ب ڕاستی هوین جارا ئێکێ ب ڕوینشتنا خۆ د خۆش بوون، ڤێجا هوین ژی د گەل قەماییان بمیننە ڕوینشتی. ﴿٨٤﴾ [هەی موحەمەد] هەر کەسێ ژ وان بمریت نڤێژێ ل سەر نەکەی، و ل سەر گۆڕێ وی [د وەختێ ڤەشارتنێدا] ڕانەوەستە، ب ڕاستی وان باوەری ب خودێ و پێغەمبەرێ وی نەئینایییە، و مرن و ئەو ژ ڕێ دەرکەڤتی. ﴿٨٥﴾ و ب مال و زاڕۆکێت وان عەجێبگرتی نەبە، ب ڕاستی خودێ دڤێت د دنیایێدا وان پێ ئێزا بدەت، و وان بمرینیت و ئەو گاور. ﴿٨٦﴾ و ئەگەر سۆرەتەک هاتە خوارێ، و تێدا هاتبیت باوەرییێ ب خودێ بینن، و د گەل پێغەمبەرێ وی جیهادێ بکەن، ئەوێت دەولەمەند دەستویرییێ ژ تە دخوازن و دبێژن: بهێلن ئەم ژی د گەل ڕوینشتییان بمینین.

رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلۡخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ
لَا يَفۡقَهُونَ ٨٧ لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ
جَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡخَيۡرَٰتُۖ
وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٨٨ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي
مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ٨٩
وَجَآءَ ٱلۡمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ لِيُؤۡذَنَ لَهُمۡ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ
كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ
أَلِيمٞ ٩٠ لَّيۡسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرۡضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ
لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ
مَا عَلَى ٱلۡمُحۡسِنِينَ مِن سَبِيلٖۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٩١
وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوۡكَ لِتَحۡمِلَهُمۡ قُلۡتَ لَآ أَجِدُ
مَآ أَحۡمِلُكُمۡ عَلَيۡهِ تَوَلَّواْ وَّأَعۡيُنُهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ
حَزَنًا أَلَّا يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ ٩٢ ۞ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى (الجزء ١١ الحزب ٢١)
ٱلَّذِينَ يَسۡتَـٔۡذِنُونَكَ وَهُمۡ أَغۡنِيَآءُۚ رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ
مَعَ ٱلۡخَوَالِفِ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٩٣



﴿٨٧﴾ ئەو ڕازی بوون د گەل ژنان بمینن، و خودێ دلێ وان مۆرکر، ڤێجا ئەو ژ بەر هندێ تێ ناگەهن [کا چ سەرکەڤتن و خۆشی د جیهادێدایە، چ ئەزیەت و نەخۆشی د ڕوینشتنێدایە]. ﴿٨٨﴾ بەلێ پێغەمبەری و ئەوێت باوەری د گەل ئینایین، ب خۆ و مالێ خۆ جیهاد کرن، خێروبێرێت دنیایێ و ئاخرەتێ بۆ وانن، و ئەون یێت سەرفەراز. ﴿٨٩﴾ خودێ
بەحەشتێت ڕویبار دبنڕا دچن بۆ وان بەرهەڤکرینە، هەروهەر دێ تێدا مینن، و ئەڤەیە سەرکەڤتنا مەزن.
﴿٩٠﴾ و کۆچەرێت عەرەبان [ئەوێت ل دەشتێ ئاکنجی] ئەوێت هەجەت گرتین، دا دەستویری بۆ وان بێتە دان [کو بمینن و پشکدارییێ د تەبووکێدا نەکەن]، و ئەوێت خودێ و پێغەمبەرێ وی درەوین داناییین، ئەو ڕوینشتن [هەر نەهاتن عوزرێ ژی بخوازن]، ئەوێت گاوربوویین ژ وان، نێزیک دێ ئیزایەکا ب ژان و دژوار وان گریت. ﴿٩١﴾ گونەهـ ل سەر لاواز و نەساخ و ئەوێت چو نەبینن [بۆ جیهادێ] خەرج بکەن نینە [ئەگەر پشکدارییێ د جیهادێدا نەکەن]، ئەگەر ئەو باوەرییێ ب خودێ و پێغەمبەری بینن، و گوهدارییا وان بکەن، چو گونەهـ ل سەر خودان عوزران نینە و گازندە ژێ نائێتەکرن، خودێ ب خۆ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٩٢﴾ و چو گونەهـ ل سەر وان نینە ئەوێت وەختێ بێنە دەڤ تە دا تو وان سویار بکەی، تە گۆت: من چو نینە هەوە لێ سویار بکەم، بەرێ خۆ وەرگێران و چاڤێت وان تژی ڕۆندک دبوون ژ خەماندا، چونکی وان چو نەددیت د ڕێکا خودێدا بمەزێخن.
﴿٩٣﴾ ب ڕاستی ڕێکا جزادانێ و ژێ وەرنەگرتنێ و گونەهکارکرنێ، بەس ل سەر وانە ئەوێت دەستویرییێ ژ تە دخوازن [کو نەئێنە جیهادێ]، و ئەو ب خۆ یێت دەولەمەند، ڕازی بوون د گەل ژنان [ڕوینشتی] بمینن، و خودێ دلێ وان مۆرکرییە، ڤێجا ژ بەر هندێ ئەو نوزانن.

يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ ۚ قُل لَّا تَعْتَذِرُوا۟
لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ ۚ وَسَيَرَى
ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٤﴾ سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ
لَكُمْ إِذَا ٱنقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا۟ عَنْهُمْ ۖ فَأَعْرِضُوا۟
عَنْهُمْ ۖ إِنَّهُمْ رِجْسٌ ۖ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟
يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا۟ عَنْهُمْ ۖ فَإِن
تَرْضَوْا۟ عَنْهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٩٦﴾
ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا۟ حُدُودَ
مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٩٧﴾ وَمِنَ
ٱلْأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ
ٱلدَّوَآئِرَ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٩٨﴾ وَمِنَ
ٱلْأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ
قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِ ۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرْبَةٌ لَّهُمْ ۚ
سَيُدْخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٩﴾



﴿٩٤﴾ [هەی پێغەمبەر] دەمێ هوین ژ جیهادێ ڤەدگەڕن، [دوڕوی] دێ ئێن داخوازا لێبۆرینێ ژ هەوە کەن، بێژە: داخوازا لێبۆرینێ نەکەن [چو عوزران نەخوازن]، ئەم باوەر ژ هەوە ناکەین، ب ڕاستی خودێ ئەم ب سەر سالۆخێت هەوە هلکرین، و خودێ و پێغەمبەرێ وی دێ کریارێت هەوە بینن [کا دێ خرابی و دوڕوییاتییا خۆ هێلن، یان دێ هەر ل سەر مینن]، پاشی دێ زڤڕنە دەڤ زانایێ نەپەنی و ئاشکەرایان، و دێ هەوە ئاگەهداری کار و کریارێت هەوە کەت [دێ هەوە ل دویڤ کریارێت هەوە ئیزادەت]. ﴿٩٥﴾ گاڤا هوین زڤڕینە دەڤ وان، دێ بۆ هەوە ب خودێ سویند خۆن، دا هوین ل وان ببۆرن و لێ نەگرن، ڤێجا هوین ڕوییێ خۆ ژ وان وەرگێڕن، ب ڕاستی ئەو د پیسن و جهێ وان دۆژەهە، جزایێ کریارێت وان کرین. ﴿٩٦﴾ بۆ هەوە سویند دخۆن، دا هوین ژ وان ڕازی ببن، و ئەگەر هوین ژ وان ڕازی ژی ببن. ب ڕاستی خودێ ژ ملەتێ ژ ڕێ دەرکەڤتی ڕازی نابیت. ﴿٩٧﴾ گاوری و دوڕوییاتییا کۆچەرێت عەرەبان [ئەعرابان] پترە [ژ یا خەلکێ باژێران]، و شایێترن، ئەو بڕیار و ئەحکامێت خودێ ل سەر پێغەمبەرێ خۆ ئینایینە خوارێ نەزانن [پێدڤییە بزانین زێدەگاوری و دوڕوییاتییا وان یا هندێیە ئەو ل دویڤ سەرێ خۆ ییێت ڕابووین، و کەس نەبوو وان شیرەت بکەت و ژ زانایان د دویر بوون، و چو ژ کتێبا خودێ و سونەتا پێغەمبەرێ وی نوزانن]. و خودێ ب خۆ ییێ زانا و کاربنەجهە. ﴿٩٨﴾ و ژ وان ئەعرابان، هەنە تشتێ دکەنە خێر ب خوسارەتی ددانن، و ل هیڤییێنە بەلا و ئاتاف بێنە سەرێ هەوە، بەلا و ئاتاف ب سەرێ وان بهێن و خودێ ب خۆ ییێ گوهدێر و زانایە. ﴿٩٩﴾ و ژ ئەعرابان ژی هەنە باوەرییێ ب خودێ و ڕۆژا قیامەتێ دئینن، و تشتێ دمەزێخن، نێزیکبوون ژ خودێ دبینن، و [ژ مەزاختنا خۆ] دوعایێت پێغەمبەری و داخوازا گونەهـ ژێبرنێ دڤێن. بلا ب ئاگەهـ بن کو ئەڤ مەزاختنە نێزیکبوونە بۆ وان [وان نێزیکی ڕازیبوون و دلۆڤانییا خودێ دکەت]، خودێ دێ وان ئێخیتە بەر دلۆڤانییا خۆ [ئانکو د بەحەشتێدا]، ب ڕاستی خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە.

وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ
ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ
لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ
ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ وَمِمَّنۡ حَوۡلَكُم مِّنَ ٱلۡأَعۡرَابِ
مُنَٰفِقُونَۖ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ مَرَدُواْ عَلَى ٱلنِّفَاقِ لَا تَعۡلَمُهُمۡۖ
نَحۡنُ نَعۡلَمُهُمۡۚ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيۡنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ
عَظِيمٖ ﴿١٠١﴾ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا
وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾
خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ
إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ
ٱللَّهَ هُوَ يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ وَيَأۡخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ وَأَنَّ
ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ
وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ وَءَاخَرُونَ مُرۡجَوۡنَ لِأَمۡرِ ٱللَّهِ
إِمَّا يُعَذِّبُهُمۡ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيۡهِمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿١٠٦﴾



﴿١٠٠﴾ و پێشییێت ئێکێ ژ مشەخت و هاریکاران و
ئەوێت ب قەنجی ب دویڤ وان کەڤتین، خودێ ژ
وان ڕازی بوویییە و ئەو ژی [ب تشتێ خودێ داییە
وان] ڕازی بووینە، بەحەشتێت ڕوبیار د بنڕا دچن
بۆ وان بەرهەڤکرینە، و هەروهەر دێ تێدا مینن،
ئەڤەیە سەرکەڤتنا مەزن. ﴿١٠١﴾ و ژ وان ئەعرابێت
دۆرماندۆری هەوە دوڕوی هەنە، و ژ خەلکێ
مەدینەیێ ژی هەنە پەلەوان ل سەر دوڕوویاتییێ،
تو وان نانیاسی، ئەم وان دنیاسین، دوقات ئەم دێ
وان ئیزادەین [د دنیایێدا ب شەرمزارییێ و ئیزایا
گۆڕێ، و ل ئاخرەتێ ب ئیزایا دۆژەهێ]، پاشی
دێ ئێنە ڤەگێڕان بۆ ئیزایەکا مەزن [ڕۆژا قیامەتێ].
﴿١٠٢﴾ و هندەکێت دی ژ خەلکێ مەدینەیێ [ژ وان بوون
ئەوێت ژ تەبووکێ ڤەماین] گونەهێت خۆ ل سەر
خۆ ئاشکەرا کرن، کارێ خۆ یێ چاك [جیهادا خۆ
یا بەری تەبووکێ] و هندەکێ دی یێ خراب [ڤەمانا
خۆ ژ تەبووکێ] تێکەل کرن، بەلکی خودێ تۆبەیا
وان قەبویل بکەت، ب ڕاستی خودێ گونەهـژێبەر و
دلۆڤانە. ﴿١٠٣﴾ زەکاتێ ژ مالێ وان وەرگرە، وان پێ پاك و پاقژ بکە ژ گونەهان، و بۆ وان [پشتی تو زەکاتێ
ژ وان وەردگری] دوعایان بکە، ب ڕاستی دوعایێت تە بۆ وان ڤەهەسیان و دلرەحەتییە، و خودێ ب خۆ
گوهدێر و دلۆڤانە. ﴿١٠٤﴾ ئەرێ ما نوزانن هەر خودێیە یێ تۆبەیا بەندەیێت خۆ و زەکاتا وان وەردگریت، و
ب ڕاستی هەر خودێیە تۆبەوەرگر و دلۆڤان. ﴿١٠٥﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: [وان ئەوێت تۆبە کرین] [چ کارێ
هەوە پێ خۆش] بکەن، خودێ و پێغەمبەرێ وی و خودان باوەر دێ کارێ هەوە بینن، و ب ڕاستی هوین
هەمی دێ ب بال زانایێ نهێنی و بەرچاڤانڤە ئێنە ڤەگەڕاندن، ڤێجا ئەو دێ هەوە ب کریارێت هەوە دکرن،
ئاگەهدار کەت. ﴿١٠٦﴾ و هندەکێت دی [ژ وان یێت ژ تەبووکێ ڤەماین: (موراڕەیێ کوڕێ ڕەبیع و کەعبێ
کوڕێ مالك و هیلالێ کوڕێ ئومەیە)] هەنە، کاروبارێ وان یێ ڕاوەستیاییە هەتا فەرمانا خودێ د ڕاستا
واندا دیار دبیت، ئان دێ وان ئیزا دەت ئان [خودێ] دێ تۆبەیا وان قەبویل کەت، و خودێ ب خۆ یێ زانا
و کاربنەجهە.

وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ
وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ
لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ
مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ أَن
يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ أَفَمَنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ
عَلَىٰ تَقۡوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٍ خَيۡرٌ أَم مَّنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ
عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٖ فَٱنۡهَارَ بِهِۦ فِي نَارِ جَهَنَّمَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي
ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٩﴾ لَا يَزَالُ بُنۡيَٰنُهُمُ ٱلَّذِي بَنَوۡاْ رِيبَةٗ
فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١١٠﴾
ربع الحزب ٢١ * إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم
بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ
وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ
وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ
بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١١﴾





﴿١٠٧﴾ و ئەوێت [ژ وان دوڕوییان ئەوێت ڤەمایین ژ تەبووكێ] مزگەفتەك بۆ زیان گەهاندنێ [ب موسلمانان]، و ب هێزكرنا گاورییێ و ژێكڤەكرنا خودان باوەران، و بۆ خۆبەرهەڤكرن و خۆگرتنێ ل هیڤیا وی یێ بەری نوكە شەڕێ خودێ و پێغەمبەرێ وی كری، ئاڤاكرین، و سویند ژی دخۆن كو مە ژ قەنجییێ پێڤەتر [ژ ئاڤاكرنا مزگەفتێ] چو یێ دی نەڤیاییە، و خودێ شادەیییێ ددەت كو ئەو ب ڕاستی [د ڤێ سویندخوارنا خۆدا] درەوینن. ﴿١٠٨﴾ چوجا لێ ڕانەوەستە و نڤێژێ تێدا نەكە، ئەو مزگەفتا جارا ئێكێ ل سەر تەقوا و ترسا خودێ هاتییە ئاڤاكرن، هەژیترە تو نڤێژێ تێدا بكەی، هندە زەلام یێت تێدا هەین دڤێن خۆ پاقژ بكەن [ب دەستنڤێژگرتنێ و خۆشویشتنێ و دویركەڤتنا گونەهان]، و خودێ ب خۆ ژی حەژ خۆپاقژكەران دكەت. ﴿١٠٩﴾ ئەرێ ئەوێ خیم و بنیاتێ (بنسترێ) [ئاڤاهییێ دینێ] خۆ ل سەر پارێزكاری و ڕازیبوونا خودێ ئاڤاكری چێترە، یان ژی ئەوێ خیمێ [ئاڤاهییێ دینێ] خۆ ل سەر لێڤا كەندالەكێ هەڕفتە ئاڤاكری، ڤێجا [ئاڤاهییێ وان یێ ل سەر لێڤا كەندالی] ئەو هەڕفاندنە د ئاگرێ دۆژەهێدا، و خودێ ب خۆ ملەتێ ستەمكار ڕاستەڕێ ناكەت. ﴿١١٠﴾ ئەو ئاڤاهییێ وان ئاڤاكری دێ هەر مینیت، گۆمان و دودلی د دلێ واندا، هەتا دلێ وان ژێكڤە دبیت و دمرن [ئانكو هندی د ساخن دێ ئەو ئاڤاهی گۆمانێ د دلێت واندا هێلیت]، و خودێ ب خۆ زانا و كاربنەجهە. ﴿١١١﴾ ب ڕاستی خودێ جان و مالێ خودان باوەران، ژ وان كڕییە بەرانبەری هندێ بەحەشتێ بدەتە وان، ئەڤە چونكی ئەو د ڕێكا خودێدا جیهادێ دكەن، ڤێجا ئەو [گاوران] دكوژن و دئێنە كوشتن ژی، ئەڤە پەیمانەكا بنەجهە ل سەر وی [خودێ] د تەورات و ئنجیل و قورئانێدا، و كی هەیە وەكی خودێ پەیمانا خۆ ب جە بینیت؟ ڤێجا هوین ب وێ كڕینا خۆ یا هوین پێ هاتینە فرۆتنێ [كو بەحەشتە] شاد و كەیفخۆش بن، نێ سەرفەرازییا مەزن ئەها ئەڤەیە.

ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ
ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ
وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ
وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (١١٢) مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ
أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ
مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ (١١٣) وَمَا
كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ
إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ
لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ (١١٤) وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوۡمَۢا بَعۡدَ إِذۡ
هَدَىٰهُمۡ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ
عَلِيمٌ (١١٥) إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ
وَيُمِيتُۚ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ (١١٦)
لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ
ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ
فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ (١١٧)



﴿١١٢﴾ [خودان باوەر] تۆبەدارن ژ هەمی گونەهان، و ل
بەر فەرمانا خودێ د ڕاوەستیاینە، و دلسۆزن د پەرستنا
خۆدا، و سوپاسیا خودێ د هەمی کراساندا دکەن، و
ڕۆژیگر و گەریدەنە د ڕێکا خودێدا، و نڤێژکەرن و
فەرماندەنە ب چاکیان، و ڕێنەدەنە و وریگرن بۆ
خرابیان، و پارێزەرن بۆ بڕیار و ئەحکام و تخوبێت
خودێ، و مزگینییێ [ب بەحەشتێ] بدە خودان
باوەرێت هۆسا. ﴿١١٣﴾ نەدورستە بۆ پێغەمبەری و
خودان باوەران، داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ موشركان
بکەن، خۆ ئەگەر مرۆڤێت وان ژی بن [و حەژ وان
ژی بکەن]، پشتی بۆ وان دیاربوویی، کو ئەو موشرك
ب ڕاستی دۆژهینە. ﴿١١٤﴾ و داخوازا گونەهـ ژێبرنا
ئیبراهیم بۆ بابێ خۆ نەدهاتەکرن، ئەگەر ژ پەیمانەکێ
نەبایە کو وی دابوو بابێ خۆ [وەختێ گۆتییێ ب
ڕاستی ئەز دێ داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ تە ژ خودێ
کەم]، ڤێجا وەختێ بۆ دیاربوویی [کو بابێ وی]
نەیارێ خودێیە، دەست ژێ بەردان و بەرائەتا خۆ ژێ
کر، ب ڕاستی ئیبراهیم ژ خودێ ترس و ب نالنال و
لێبۆر و نەرم و حەلیمە. ﴿١١٥﴾ و خودێ چو ملەتان گومڕا و بەرزە ناکەت پشتی ڕاستەڕێ کرین، هەتا بۆ
وان دیار نەکەت کا دێ خۆ ژ چ پارێزن، و ب ڕاستی خودێ ب هەمی تشتان یێ زانایە. ﴿١١٦﴾ ب ڕاستی
ملکێ ئەرد و ئەسمانان یێ خودێیە، ئەو ساخ دکەت و ئەو دمرینیت، و ژ بلی خودێ هەوە چو هاریکار و چو
پشتەڤان نینن. ﴿١١٧﴾ ب ڕاستی خودێ تۆبە دا سەر پێغەمبەری [گونەهێت وی ژێبرن ژ بەر دەستویردانا وی
بۆ دوڕوییان، کو ڕۆژا تەبووکێ ڤەمینن] و مشەختییان و هاریکاران [خەلکێ مەدینەیێ]، ئەوێت وەختێ
تەنگاڤییێ خۆ داینە د گەل پێغەمبەری، پشتی نێزیك بوویی دلێت دەستەکەکێ بۆ هندێ بچن، ڤەمینن [و ژ
بەر گرانی و زەحمەتێ خۆ نەدەنە د گەل پێغەمبەری]، پاشی خودێ تۆبە دانا سەر وان و گونەهێت وان ژێبرن.
ب ڕاستی ئەو بۆ وان زێدە ب ڕەحم و دلۆڤانە.

وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ
بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلْجَأَ
مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ
ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ
ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم
مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُواْ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُواْ
بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ
وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا
يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ
لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَٰلِحٌ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾
وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ
وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُواْ
يَعْمَلُونَ ﴿١٢١﴾ ۞ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً
فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ
وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾

نصف الحزب ٢١





﴿١١٨﴾ [هەروەسا] تۆبە دا سەر وان هەرسێكێت [ل مەدینەیێ مایین و ژ تەبووكێ] ڤەمایین، [هاتنە جزاكرن ب ڤەبڕینا پەیوەندییان، و ب تێكەلی نەكرنا وان و ژ ڤەمانا خۆ وەسا پەشێمان ببوون]، هەتا ئەرد ب بەرفرەهییا خۆڤە ل وان تەنگ بوویی و بێنا وان چك بوویی و وان زانی، چو پەنا و پارێزەر ژ ئیزایا خودێ نینن ژ بلی ئەو بزڤرنە خودێ [ب تۆبەكرنێ و ب داخوازا گونەهـ ژێبرنێ]، پاشی خودێ تۆبە دا سەر وان، دا خۆ ل سەر تۆبەیا خۆ ڕاگرن و دا ژ تۆبەداران بن، ب ڕاستی خودێ زێدە تۆبەوەرگر و دلۆڤانە. ﴿١١٩﴾ گەلی خودان باوەران پارێزكارییا خودێ بكەن و د گەل ڕاستگۆیان بن. ﴿١٢٠﴾ نابیت بۆ خەلكێ مەدینەیێ و ئەعرابێت [كۆچەرە عەرەب] ل دۆرێت مەدینەیێ خۆ ژ پێغەمبەرێ خودێ ڤەهێلن [و خۆ نەدەنە د گەل د جیهادێدا]، و جانێ خۆ ژ گیانێ پێغەمبەری خۆشتر بڤێن [كو ل خۆ هشیار بن، و خۆ بپارێزن، و پێغەمبەری نە..] چونكی چو تێناتی و وەستیان، و چو برساتی د ڕێكا خودێدا ناگەهیتە وان، و ناچنە چو جهان [ب پیێت خۆ یان ب سومێت دەوارێت خۆ] كو پێ كەربێت گاوران ڤەكەن و دلێت وان بئێشینن و زیانەكێ ناگەهیننە دژمنی [ب كوشتنێ یان ئێخسیركرنێ یان بریندار كرنێ]، ئەگەر خودێ پێ كارەكێ چاك بۆ وان نەنڤێسیت، ب ڕاستی خودێ خێرا قەنجیخوازان بەرزە ناكەت. ﴿١٢١﴾ و چو مالی نادەن، چ كێم چ گەلەك، و چو نهالان نابڕن ئەگەر خودێ بۆ وان ب خێر نەنڤێسیت، دا خودێ ژ كریارێت وان چێتر، وان خەلات بكەت [ڤان كاران ب خێر بۆ وان دنڤێسیت]. ﴿١٢٢﴾ و نابیت خودان باوەر هەمی پێكڤە دەركەڤنە جیهادێ، ڤێجا بلا ژ هەر تیپەكێ ژ وان كێمەك بچن و دەركەڤن، دا خۆ د دینیدا شارەزا بكەن، و دا ملەتێ خۆ [ئەوێت چۆیینە جیهادێ] ئاگەهدار بكەن وەختێ دزڤرنە دەڤ وان، دا ئەو [ملەتێ] خۆ بپارێزن ژ وی تشتێ دڤێت خۆ ژێ بپارێزن.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ
ٱلۡكُفَّارِ وَلۡيَجِدُواْ فِيكُمۡ غِلۡظَةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ
مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ١٢٣ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن
يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ١٢٤
وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ
رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ١٢٥ أَوَلَا يَرَوۡنَ
أَنَّهُمۡ يُفۡتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٖ مَّرَّةً أَوۡ مَرَّتَيۡنِ ثُمَّ
لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمۡ يَذَّكَّرُونَ ١٢٦ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ
سُورَةٞ نَّظَرَ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ هَلۡ يَرَىٰكُم مِّنۡ
أَحَدٖ ثُمَّ ٱنصَرَفُواْۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ
لَّا يَفۡقَهُونَ ١٢٧ لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ
عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ
رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٢٨ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ
إِلَّا هُوَۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَهُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ١٢٩



﴿١٢٣﴾ گەلی خودان باوەران شەڕێ وان گاوران بكەن
ئەوێت نێزیكی هەوە، و بلا هەوە ب هێز و مێرخاس
و چەسپان ببینن، و بزانن ب ڕاستی خودێ د گەل
پارێزكارانە. ﴿١٢٤﴾ و هەر وەختێ سۆرەتەك بێتە
خوارێ، هندەك ژ وان [دوروییان بۆ ئێكدو] دبێژن:
ئەرێ ئەڤێ [سۆرەتێ] باوەرییا كێ ژ هەوە پتر لێ
كر؟ [بێژە: بەلێ] ئەوێت باوەری ئینایین [هەر گاڤەكا
سۆرەتەك بێتە خوارێ] باوەرییا وان پتر لێ كر، و
ئەو پێ دلشاد و كەیفخۆش دبن [چونكی باوەرییا
وان پتر لێ دئێت]. ﴿١٢٥﴾ و بەلێ ئەوێت گۆمان و
دوروییاتی و شرك و گاوری د دلێت واندا، [هاتنا
سۆرەتان] پیسی ل سەر پیسییێ ل وان زێدەكر، و
ل سەر گاورییێ مرن. ﴿١٢٦﴾ ئەرێ ما ئەو نابینن
سالێ جارەكێ یان دو جاران، ئەم وان [ب نەساخی
و هشكاتی، و ب بەرتەنگی و برسێ، و ب بەلا و
ئاتافان] دجەڕبینین و ئمتیحانە دكەین، پاشی نە
تۆبە دكەن و نە ژی دئیننە بیرا خۆ، و نە پێڤەدچن.
﴿١٢٧﴾ و هەر وەختێ سۆرەتەك بێتە خوارێ هندەك
ژ وان [دوروییان] بەرێ خۆ ددەنە هندەكان [و دبێژن:] ئەرێ كەس [ژ خودان باوەران] هەوە دبینیت؟
[دا ل ڤێرێ بچین] پاشی ڤەڕەڤین، خودێ دلێت وان [ژ هەقییێ و ڕاستەڕێییێ] وەرگێڕان، چونكی ب
ڕاستی ئەو ملەتەكن بێ فامن و هەقییێ تێ ناگەهن. ﴿١٢٨﴾ ب ڕاستی پێغەمبەرەكێ وەسا یێ ژ هەوە بۆ
هەوە هاتی، وەستیانا هەوە ل سەر وی یا گرانە [ئانكو وی پێ نەخۆشە هوین زەحمەتێ بكێشن و ئیزا بگەهیتە
هەوە]، ل سەر ڕاستەڕێكرنا هەوە یێ ڕژدە [و یێ هشیارە ل سەر باوەرییا هەوە]، و بۆ خودان باوەران زێدە
دلسۆژ و ب ڕەحمە. ﴿١٢٩﴾ ڤێجا ئەگەر وان ڕوییێ خۆ ژ باوەرییێ [و هەقییێ] وەرگێڕا، بێژە: ئەو خودایێ
كو ژ بلی وی چو خودا و چو پەرستی نەیی، بەسی منە، ب ڕاستی من پشتا خۆ ب وی گەرم و موكوم كر،
و ئەوە خودانێ عەرشێ مەزن.

سُورَةُ يُونُس

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ١ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنۡ
أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ رَجُلٖ مِّنۡهُمۡ أَنۡ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ
أَنَّ لَهُمۡ قَدَمَ صِدۡقٍ عِندَ رَبِّهِمۡۗ قَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ إِنَّ هَٰذَا
لَسَٰحِرٞ مُّبِينٌ ٢ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ
فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَۖ مَا مِن شَفِيعٍ
إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ إِذۡنِهِۦۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ٣
إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقًّاۚ إِنَّهُۥ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ
لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلۡقِسۡطِۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ وَعَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ٤
هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلشَّمۡسَ ضِيَآءٗ وَٱلۡقَمَرَ نُورٗا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ
لِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ
يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ٥ إِنَّ فِي ٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ
وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَّقُونَ ٦



## سۆرەتا یوونس

### ل مەکەهێ هاتیـیە خوارێ (١٠٩) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ ب ڤـی ڕەنگـی دئێتـە خوانـدن (ئەلـف، لام، ڕا) سـێ تیپـن ژ (٢٨) تیپێت زمانێ عەرەبی، نیشـانن ل سـەر ئیعجـازا قورئانـێ کـو عەرەبـان پـێ چێنابیـت قورئانەکا وەکـی ڤـێ بدانـن، هەرچەنـدە ئـەڤ قورئانـە ژ عەینـێ وان تیپـان پێکهاتیــیە ئەوێـت ئـەو ئاخڤتنا خۆ پـێ چێ دکـەن. ئەڤەنـە ئایەتێـت کتێبـا پـیرۆز و بنەجهــو دویر ژ گومانـێ. ﴿٢﴾ ئەرێ ئەڤە بـۆ خەلکی جهێ عەجێبیــیێیە مـە بـۆ زەلامەکـی ژ وان وەحـی هنـارت، [مـە وەحـی بـۆ وی هنـارت و مـە گۆتـێ:] خەلکـی ئاگەهـدار بکـە [و ژ ڕۆژا قیامەتـێ بترسـینە]، و مزگینیــێ بـدە ئەوێـت باوەری ئینایــین، کو ب ڕاستی بۆ وان ل دەڤ خودایــێ وان بەراهیــیەکا کەرەمێ و خـەلات و پێکەکا بلند هەیە، گـاوران گـۆت: ب ڕاسـتی ئەڤـە [ئـەڤ پێغەمبـەرە] سـێربەندەکێ ئاشـکەرایە. ﴿٣﴾ ب ڕاسـتی خودایــێ هەوە ئەو خودایە یــێ ئەرد و ئەسمــان د شـەش ڕۆژاندا چێکریـن، پاشـی بلنـد بـوو سـەر عەرشـێ خـۆ [بلندبوونـەکا هێژایـی وی، و بـێ چاوایـی]، تەکبیرا کاروباران دکـەت، چـو مەهدەرچـی نینـن، پشـتی دەسـتویردانا وی نەبیـت، ئـەو [خودایـێ ب ڤـان سـالۆخەتان دئێتـە سـالۆخدان] خودایــێ هەوەیـە، ڤێجـا وی بپەرێسـن، مـا هوین بۆ خـۆ چامەکـێ ناگـرن. ﴿٤﴾ ڤەگەڕیانا هەوە هەمیــیان ب بـال ویڤەیـە، [و ئەڤـە] ب ڕاسـتی پەیمــانا خودێیـە و ڕاستە، ب ڕاسـتی ئـەو جـارا ئێکێ دەسـت ب ئافراندنـێ دکـەت، پاشـی [پشـتی مرنـێ] دێ زڤرینیتەڤە، دا ئەوێـت بـاوەری ئینایــین و کار و کریارێت قەنج کریـن ب دادی و ب عەدالـەت خـەلات بکـەت، و ئەوێـت گاوربوویــین بـۆ وان ڤەخوارنـەکا زێـدە کەلیایـی و ئیزایـەکا ب ژان و دژوار هەیـە، ژ بـەر وێ گاوریــیا دکـرن. ﴿٥﴾ و ئـەوی [خـودێ] ڕۆژ بـۆ هەوە کریـیە چرا و هەیـڤ کریــیە ڕۆناهـی، و کـرە قویناخ قویناخ دا هوین هەژمارا سـالان و حسـێبا خـۆ بزانن، و خودێ ژ قەسـتا ئەڤـە چـێ نەکریــیە ئەگەر بـۆ هەقیــێ نەبیت [هەقی و ڕاسـتی پێ بێتـە زانین و ئـەم بگەهینە مەزناتیــیا خودێ و وی بپەرێسـین]. نیشـان و ئایەتـان ب درێـژی [خودێ] بۆ وان ئاشـکەرا دکـەت ئەوێت دزانن. ﴿٦﴾ ب ڕاسـتی د هاتـن و چۆنـا شـەڤ و ڕۆژاندا، و د هەر تشـتێ خـودێ د ئەرد و ئەسمــاناندا چێکـری، نیشـان و بەلگەنە بۆ وان یــێت پارێزکاریــێ دکەن، و ژ خودێ دترسـن.

إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱطْمَأَنُّوا۟
بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ
ٱلنَّارُ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟
ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمْ ۖ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ
ٱلْأَنْهَٰرُ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٩﴾ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ
ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ۚ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ
لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ ۞ وَلَوْ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ
ثلاثة أرباع الحزب ٢١
ٱسْتِعْجَالَهُم بِٱلْخَيْرِ لَقُضِىَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ ۖ فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ
لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١﴾ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ
ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوْ قَاعِدًا أَوْ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفْنَا
عَنْهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ
لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ
مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ ۙ وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُوا۟
لِيُؤْمِنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٣﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰكُمْ
خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ مِنۢ بَعْدِهِمْ لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾





﴿٧﴾ ب ڕاستی ئەوێت حەژ دیتنا مە نەکەن، و ب ژیانا دنیایێ ڕازی بوویین و پێڤە ڕسیان [پێڤەمان]، و ئەوێت ژ نیشان و ئایەتێت مە بێ ئاگەهـ.
﴿٨﴾ ئەڤان جهێ وان ئاگرە، ژ بەر کار و کریارێت وان کرین. ﴿٩﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت قەنج کرین، خودێ ژ بەر باوەریا وان دێ وان ڕاستەرێ کەتە بەحەشتا پڕ خێر، کو ڕوویبار د بنڕا دچن. ﴿١٠﴾ دوعا و گازیا وان د بەحەشتێدا ئەڤەیە: خودێوۆ ئەم تە ژ هەمی کێماسیان پاقژ دکەین، و دروودا وان سلاڤە، و دویماهیک دوعایا وان ئەڤەیە: هەمی پەسن و شوکور بۆ خودێ، خودانێ هەمی جیهانان. ﴿١١﴾ ئەگەر خودێ بۆ خەلکی لەز ل خرابییێ کربایە، وەکی لەزا ئەو دکەن بۆ باشییێ [ئانکو خەلکی چاوا دڤێت لەز ل دوعایا وان یا خێرێ بێتەکرن، وەسا خودێ لەز ل دوعایا وان یا خرابییێ ژی کربایە، دا وان تێ بەت وەختێ وان نفرین ل خۆ دکرن]، دا مرن، و دا ڕوحا وان ئێتە ستاندن، ڤێجا ئەوێت هزرا دیتنا مە نەکەن، ئەم دێ وان هێلین د خرابییا خۆدا بزڤڕن. ﴿١٢﴾ و هەر وەختێ نەخۆشییەك بگەهیتە مرۆڤی، ل سەر تەنشتا خۆ [ئانکو درێژکری] یان ڕوینشتی یان ڕاوەستیایی گازی و هەوارا خۆ دگەهینیتە مە، ڤێجا وەختێ مە نەخۆشییا وی ڕاکر، وەسا دچیت [ژ بیر دکەت] هەروەکی چو نەخۆشی ب سەری نەهاتین و هەوارا خۆ نەگەهاندییە مە، هۆسا بۆ زێدە خرابان کار و کریارێت وان هاتینە خەملاندن و جوانکرن. ﴿١٣﴾ ب سویند مە خەلکێ چەرخێت بەری هەوە د هیلاك برن و ئیزا دان وەختێ وان [ب شرك و گاورییێ] ستەم کری، و پێغەمبەرێت وان ب بەلگە و نیشان و موعجیزاتێت ئاشکەراکەر بۆ وان هاتین [دا باوەرییێ پێ بینن، و باوەری پێ نەئینان]، و ئەو نە ئەو بوون باوەرییێ بینن [ئەگەر هێلابانە، و د هیلاك نەبربانە]، و هۆسا ئەم ئەوێت گونەهکار جزا دکەین.
﴿١٤﴾ پاشی، پشتی وان، مە هوین کرنە جهنشینێت وان د ئەردیدا، دا ببینین کا هوین دێ چ کار و کریاران کەن.

وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٖ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ
لِقَآءَنَا ٱئۡتِ بِقُرۡءَانٍ غَيۡرِ هَٰذَآ أَوۡ بَدِّلۡهُۚ قُلۡ مَا يَكُونُ
لِيٓ أَنۡ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلۡقَآيِٕ نَفۡسِيٓۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۖ
إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿١٥﴾ قُل
لَّوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوۡتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَدۡرَىٰكُم بِهِۦۖ
فَقَدۡ لَبِثۡتُ فِيكُمۡ عُمُرٗا مِّن قَبۡلِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٦﴾
فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ
إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿١٧﴾ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ
مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا
عِندَ ٱللَّهِۚ قُلۡ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا
فِي ٱلۡأَرۡضِۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿١٨﴾ وَمَا
كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ فَٱخۡتَلَفُواْۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ
سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡ فِيمَا فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿١٩﴾
وَيَقُولُونَ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۖ فَقُلۡ إِنَّمَا
ٱلۡغَيۡبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ ﴿٢٠﴾



﴿١٥﴾ و وەختێ نیشان و ئایەتێت مە یێت ئاشكەراكەر
ب سەر واندا دئێنە خواندن، ئەوێت نە ل هیڤیا دیتنا
مە [و باوەری ب ڕۆژا قیامەتێ نەیی، دبێژن:] كا
قورئانەكا دی ژ بلی ڤێ بینە، یان ژی ڤێ [قورئانێ]
بگوهۆڕە. بێژە: ئەز نەشێم و من هەق نینە ئەز ژ دەڤ
خۆ بگوهۆڕم، ئەز ل دویڤ چو ناچم ژ وێ پێڤەتر یا
ب وەحی بۆ من دئێت، ب ڕاستی ئەز ژ ئیزایا ڕۆژەكا
مەزن دترسم، ئەگەر نەگوهدارییا خودایێ خۆ بكەم.
﴿١٦﴾ بێژە: ئەگەر خودێ ڤیابایە [ئەڤ قورئانە] من بۆ
هەوە نەدخواند و هەوە هەر پێ نەدزانی ژی [ئانكو
خودێ ئەڤ قورئانە ل سەر زمانێ من نیشا هەوە
نەددا]. نێ [هوین ب خۆ ژی دزانن] من بەری نوكە
ژئێكێ د ناڤ هەوەدا بری، [ئەگەر ئەز ئەو بامە یێ
ژ نك خۆ قورئانێ چێكەم، دا بەری نوكە ژی چێكەم]
ئەرێ ما هوین ئەقلێ خۆ نائیننە سەرێ خۆ [بزانن
ئەڤ قورئانە ژ دەڤ خودێیە و پێغەمبەری ژ دەڤ خۆ
نەئینایییە هەتا بشێت بگوهۆڕیت]. ﴿١٧﴾ ڤێجا ما
كی ژ وی ستەمكارترە ئەوێ درەوان ب ناڤێ خودێ
دكەت، یان ژی ئایەتێت خودێ درەو ددانیت، ب ڕاستی گونەهكار سەرفەراز نابن. ﴿١٨﴾ و ژ بلی خودێ وی
دپەرێسن یێ نە زیانێ دگەهینیتە وان نە مفایی.. و دبێژن: ئەڤە مەهدەرچییێت مەنە ل دەڤ خودێ، [هەی
موحەمەد] بێژە: ئەرێ ما هوین دێ وی تشتی نیشا خودێ دەن یێ كو نەزانیت یێ د ئەرد و ئەسماناندا
هەی؟! و ب ڕاستی خودێ یێ پاك و پاقژە ژ وێ شركا ئەو دكەن. ﴿١٩﴾ و دەستپێكێ خەلك هەمی ملەتەك
بوون، پاشی ژێك جودا بوون و ئەگەر ژ بەر فەرمانا خودێ نەبایە [كو وان پێكڤە ئیزا نادەت]، دا حوكمی
و دادگەرییێ د وی تشتیدا كەت ئەوێ ئەو ل سەر ژێك جودا. ﴿٢٠﴾ و دبێژن: بلا موعجیزەیەك و نیشانەك
ژ خودایێ وی بۆ هاتبایە [دا مە ژی باوەری پێ ئینابایە] بێژە: غەیب كارێ خودێیە و موعجیزە ب فەرمانا
وینە، ڤێجا چاڤەڕێ بن ب ڕاستی ئەز ژی د گەل هەوە ژ چاڤەڕێیانم.

وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ
فِيٓ ءَايَاتِنَاۚ قُلِ ٱللَّهُ أَسۡرَعُ مَكۡرًاۚ إِنَّ رُسُلَنَا يَكۡتُبُونَ مَا تَمۡكُرُونَ ﴿٢١﴾
هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ
وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ
وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ
دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ
مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ
ٱلۡحَقِّۗ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٣﴾
إِنَّمَا مَثَلُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ
بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ مِمَّا يَأۡكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلۡأَنۡعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ
أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ
عَلَيۡهَآ أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدٗا كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ
بِٱلۡأَمۡسِۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ
إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٢٥﴾



﴿٢١﴾ و وەختێ ئەم بەرفرەهییەكێ ددەینە خەلكی
[ئانكو خەلكێ مەكەهێ] پشتی تەنگاڤی و هشكاتییێ
هنگاڤتین، دێ بینی ئایەت و نیشانێت مە درەو ددانن، و
تانان تێ دقوتن و نەخشەیان بۆ دكێشن، بێژە: خودێ
د جزایێ خۆدا ب لەزترە، ب ڕاستی ئەو فەند و فێلا
هوین دكەن، ملیاكەتێت مە دنڤێسن. ﴿٢٢﴾ ئەوە هەوە
د هشكاتی و ئاڤێدا دگێڕینیت [ئانكو ئەوە شیانێ
ددەتە هەوە، هوین ب پییان و دەواران و گەمییان و
ئالاڤێت دی قویناخێت درێژ ببڕن]. هەتا هوین دچنە
د گەمیییێدا، و بایەكێ نەرم گەمییێ دبەت و [ئەڤێت
تێدا] پێ كەیف خۆش بوون، وی وەختی بایەكێ ب
بارۆڤە بەر ب گەمیییڤە بێت و پێلێت ئاڤێ ژ هەمی
ڕەخان ل وان بێنە ئێك، و ئەو هزر بۆ وان چێبوو كو
دۆرماندۆری وان هاتە گرتن و مانە د ناڤ پێلانڕا،
دوعا ژ دل و مێلاك ژ خودێ كرن، ئەگەر تە ئەم
ژ ڤێ تەنگاڤییێ ڕزگاركرین، ب ڕاستی ئەم دێ ژ
شوكورداران بین. ﴿٢٣﴾ ڤێجا وەختێ ئەو ڕزگاركرین،
[جارەكا دی] بێی كو وان ماف هەبیت ستەمێ د
ئەردیدا دكەن، گەلی مرۆڤان ب ڕاستی ستەما هەوە هەر ل سەر هەوە ب خۆیە [ئانكو زیانا ستەمێ هەر دێ
ل هەوە زڤریت]، ئەڤە خۆشییێت ژیانا دنیایێنە، پاشی زڤرینا هەوە هەمییان بۆ دەڤ مەیە [ب بال مەڤەیە]،
ڤێجا ئەم دێ هەوە ئاگەهداری وێ كەین یا هەوە د دنیایێدا دكر. ﴿٢٤﴾ ب ڕاستی هندی ژیانا دنیایێیە وەكی
ئاڤەكێیە مە ژ ئەسمانی باراندی، ڤێجا ب ڤێ ئاڤێ ئەو شینكاتییێ گەلەڕەنگ و تێكەل دەركەڤت یێ كو
مرۆڤ و جانەوەر [هەردو] دخۆن، گاڤا كو ئەرد ب شینكاتییا خۆ دخەملیت و جوان دبیت، و خودانێت
وێ [خەلكێ ئەردی] هزر دكەن ئەو دشێن بچینن و مفایی ژێ وەرگرن، [هنگی] فەرمانا مە ب شەڤ یان
ب ڕۆژ ب سەردا هات، ڤێجا مە وەكی زەڤییا دوری لێ كر، هەروەكی بەری نوكە ئەو شینكاتی نەیی.
ئەها ب ڤی ڕەنگی ئەم ئایەت و نیشانێت خۆ ب درێژی ئاشكەرا دكەین بۆ وان یێت هزرا خۆ دكەن.
﴿٢٥﴾ و خودێ بۆ ئاڤاهییێ ئاشتی و تەناهییێ [كو بەحەشتە] بانگ و گازییێ هلددێریت، و یێ وی بڤێت
دێ بەرێ وی دەتە ڕێكا ڕاست.

الحزب ٢٢

۞لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ وَلَا يَرۡهَقُ وُجُوهَهُمۡ قَتَرٞ
وَلَا ذِلَّةٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٦ وَٱلَّذِينَ
كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةِۭ بِمِثۡلِهَا وَتَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ مَّا لَهُم
مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۖ كَأَنَّمَآ أُغۡشِيَتۡ وُجُوهُهُمۡ قِطَعٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ
مُظۡلِمًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٧ وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ
جَمِيعٗا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ مَكَانَكُمۡ أَنتُمۡ وَشُرَكَآؤُكُمۡۚ فَزَيَّلۡنَا
بَيۡنَهُمۡۖ وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم مَّا كُنتُمۡ إِيَّانَا تَعۡبُدُونَ ٢٨ فَكَفَىٰ بِٱللَّهِ
شَهِيدَۢا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ إِن كُنَّا عَنۡ عِبَادَتِكُمۡ لَغَٰفِلِينَ ٢٩
هُنَالِكَ تَبۡلُواْ كُلُّ نَفۡسٖ مَّآ أَسۡلَفَتۡۚ وَرُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ
ٱلۡحَقِّۖ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ٣٠ قُلۡ مَن يَرۡزُقُكُم مِّنَ
ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أَمَّن يَمۡلِكُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَمَن يُخۡرِجُ
ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَۚ
فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُۚ فَقُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ ٣١ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ
ٱلۡحَقُّۖ فَمَاذَا بَعۡدَ ٱلۡحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُۖ فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ ٣٢ كَذَٰلِكَ
حَقَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ فَسَقُوٓاْ أَنَّهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٣٣



﴿٢٦﴾ بۆ ئەوێت چاکی و قەنجی کرین [ئانکو ب چێترین ئاوا فەرمانا خودێ ب جه ئینایین]. قەنجی و جهێ باش و هێژ [پتر کو دیتنا خودێیە] د بەحەشتێدا هەیە، و سەروچاڤێت وان نە تۆزەوی دبن و نە ژی رسوا دبن، ئەڤە بەحەشتینە و هەروهەر دێ تێدا مینن.
﴿٢٧﴾ و ئەوێت کار و کریارێت خراب کرین جزایێ وان تەمەتی گونەهێت وانە، و ڕویڕەشی و ڕسوایی سەروچاڤێت وان دگریت، و وان چو پارێزڤان نینن، وان ژ ئیزایا خودێ بپارێزن، سەروچاڤێت وان هەروەکی کەرەکێ شەڤا ڕەش و تاری گرتین، ئەڤە دۆژەهینە و هەروهەر ئەو دێ تێدا مینن.
﴿٢٨﴾ و ڕۆژا ئەم هەمییان کۆم دکەین، پاشی دێ بێژینە وان ئەوێت هەڤال و هۆگر بۆ خودێ چێکرین، هوین و پەرستییێت خۆ ل جهێ خۆ بن، ڤێجا مە ئەو ژێکڤەکرن و مە ناڤبەرا وان بری، و پەرستییێت وان گۆتە وان: هەوە نە بەس ئەم ب تنێ پەرستین [ئانکو نە مە فەرمانا هەوە کرییە هوین مە بپەرێسن بەلێ هەوە ب دلخوازییا خۆ شەیتان پەرست، وەختێ هوین د سەردا برین و فەرمانا هەوە کری هوین مە بپەرێسن]. ﴿٢٩﴾ و هەر ئەڤە بەسە کو خودێ د ناڤبەرا مە و هەوەدا شاهد بیت، کو ئەم ژ پەرستنا هەوە د بێ ئاگەهـ بووین. ﴿٣٠﴾ وێ ڕۆژێ [ڕۆژا قیامەتێ] هەر نەفسەك دێ کار و کریارێت خۆ بینیت و تامکەتێ، و هەمی ب بال خودایێ خۆڤە، پەرستییێ ڕاست و دورست، دێ ئێنە ڤەگەڕاندن، و ئەو درەوا وان دکر ل وان بەرزە بوو. ﴿٣١﴾ بێژە: کیە ڕزقێ هەوە ل ئەردی [ب شینکاتی] و ئەسمانان [ب بارانێ] ددەت؟ یان ژی کێ پێ چێ دبیت، گوهـ و چاڤان بدەت [و ژ ئاتافان بپارێزیت د گەل نازکییا وان]، و کییە ساخی ژ مری دەردئێخیت و مری ژ ساخی دەردئێخیت، و کییە کاروبارێت دنیایێ ب ڕێڤە دبەت؟ دێ بێژن خودێیە، بێژە: پا بۆچ هوین پارێزکارییا خودێ ناکەن؟!
﴿٣٢﴾ ڤێجا [ئەوێ ئەڤێ هەمییێ دکەت] ئەوە خودێ، خودایێ هەوە یێ ڕاست و هەق، ڤێجا ما تشتەك پشتی هەقییێ هەیە ژ گومڕایی و بەرزەبوونێ پێڤەتر [ئانکو پشتی هەقییێ، بەرزەبوون]، ڤێجا چاوا هوین ڕوییێ خۆ ژ هەقییێ وەردگێڕن بۆ گومڕاییێ. ﴿٣٣﴾ ئەها هۆسا فەرمانا ئیزایا خودایێ تە بۆ ژ ڕێ دەرکەڤتیان واجب بوو، چونکی ب ڕاستی ئەو باوەرییێ نائینن.

قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟
ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣٤﴾ قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِىٓ
إِلَى ٱلْحَقِّ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِى لِلْحَقِّ ۗ أَفَمَن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن
يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّىٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ ۖ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٥﴾
وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ۚ
إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ
مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ
لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ
مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾
بَلْ كَذَّبُوا۟ بِمَا لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ
كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٩﴾
وَمِنْهُم مَّن يُؤْمِنُ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن لَّا يُؤْمِنُ بِهِۦ ۚ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ
بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤٠﴾ وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّى عَمَلِى وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ ۖ أَنتُم
بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٤١﴾ وَمِنْهُم مَّن
يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٢﴾



﴿٣٤﴾ بێـژە: ئـەرێ ئێـك ژ وان ئەوێـت هـەوە کرینـە
هەڤپشـك بۆ خودێ هەیـە دەسـت ب ئافراندنێ بکەت؟
پاشـی جـارەکا دی [پشـتی مرنـێ] بزڤڕینیتەڤـە؟! بێـژە:
بـەس خودێیـە جـارا ئێکـێ تشـتی چـێ دکـەت پاشـی
[پشـتی مرنـێ] دزڤڕینیتەڤـە، ڤێجـا چـاوا هویـن بـەرێ
خـۆ ژ ڕێـکا ڕاسـت وەردگـێڕن. ﴿٣٥﴾ بێژە: ئـەرێ ئێك
ژ بـوت و پەرستیـیێت هـەوە هەیـە ڕاسـتەڕێکرنێ بـۆ
ڕاسـتی و هەقیـیێ بکەت؟! بێژە: خودێ ڕاسـتەڕێکرنێ
بۆ ڕاسـتی و هەقیـیێ دکـەت، ڤێجا یـێ ڕاسـتەڕێکرنێ
بـۆ ڕاستیـیێ و هەقیـیێ دکـەت هێژاتـرە دویڤچـۆن بۆ
بێتەکـرن، یان یـێ خـۆ ڕاسـتەڕێ نەکـەت ئەگـەر نەئێتە
ڕاسـتەڕێکرن؟ ڤێجـا هـەوە خـێرە، هویـن چـاوا وان و
خـودێ دئیننە ڕێزەکـێ؟! ﴿٣٦﴾ باراپـتر ژ وان ژ گۆمانێ
پێڤەتر ل دویڤ چو یـێ دی ناچن [ل وێ هزرێ کو دێ
بوتێت وان بەرەڤانیـیێ ژێ کەن یان ڕاسـت پەرسـتینە]،
ب ڕاسـتی گۆمـان مرۆڤـی ژ هەقیـیێ بێ منـەت ناکەت
[ئانکـو گۆمـان جهـێ هەقیـیێ ناگریت]، و ب ڕاسـتی
خـودێ ب ئـەوا ئەو دکـەن ئاگەهدارە. ﴿٣٧﴾ نەدورسـتە
و نابیـت ئـەڤ قورئانـە ئاخڤتنـا غەیـری خودێ بیـت، بەلێ ڕاسـتدەرئێخا کتێـبێت بـەری خۆیە [ئانکـو تەورات
و ئنجیلـێ]، و ئاشـکەراکەرە ب درێـژی بـۆ بڕیـار و ئەحکامێت خـودێ، گۆمان تێـدا نینـە ژ دەڤ خودانێ هەمی
جیهانانـە. ﴿٣٨﴾ یـان ژی دبێـژن: [موحەمـەدی ئەڤ قورئانـە] ژ دەڤ خۆ ئینایـییە [ئانکو وی دانایـییە و ب بال
خودێڤـە لـێ ددەت] بێـژە: پـا کا [ئەگـەر هوین ڕاسـت دبێژن، و وەکـی هەوە بیت] سـۆرەتەکێ وەکـی وێ بینن،
و هـەر کەسـەکێ هویـن بشـێن ژی ژ بلی خـودێ، هاریکاریـیێ ژێ بخـوازن، ئەگەر هوین ڕاسـت دبێـژن [ئەڤ
قورئانـە ژ چێکرنـا موحەمـەدە]. ﴿٣٩﴾ بەلکـی وان قورئـان درەو دانـا و بـاوەری پـێ نەئینـا، بەری تـێ بگەهن و
ڕاستیـیا وێ بزانن، و هێژ بۆ وان ڕاسـتی و هەقیـیا تێدا، ئاشـکەرا نەبوویی. وەسـا یـێت بەری وان ژی [کتێب
و پێغەمبەرێـت مـە] درەو ددانـان، ڤێجـا بـەرێ خۆ بـدێ کا دویمـاهیکا ستەمکاران بـوو چ!! ﴿٤٠﴾ و هندەك ژ
وان [ئەوێـت تـو بـۆ هاتیـیە هنارتن، هەی موحەمـەد] باوەریـیێ ب ڤێ قورئانـێ دئینن، و هندەك باوەریـیێ پێ
نائینـن، و خودایـێ تـە چێتر خرابـکاران دنیاسـیت. ﴿٤١﴾ و ئەگەر وان تو درەویـن دانایی و بـاوەری ب تە نەئینا،
بێـژە: کریارێـت مـن بۆ منن و کریارێـت هەوە بۆ هەوەنـە [ئانکو جزایـێ کارێ من بۆ منە و جزایـێ کارێ هەوە
بـۆ هەوەیـە]، هویـن بەرینە ژ وێ یـا ئەز دکەم و ئەز ژی یـێ بەریمە ژ وێ یـا هوین دکەن [هەر ئێك دێ جزایـێ
کار و کریارێـت خـۆ خـۆت]. ﴿٤٢﴾ و هنـدەك ژ وان گوهێ خـۆ ددەنە تە [وەختـێ تو قورئانێ دخوینـی]، [بەلێ
ئەگـەر ئـەو د کـەڕ بـن]، ئـەرێ تـو دشـێی کـەڕی وەلـێ بکەی کـو گولـێ ببیت خـۆ ئەگەر د بـێ ئاقـل ژی بن.

وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ أَفَأَنتَ تَهْدِي الْعُمْيَ وَلَوْ كَانُوا لَا يُبْصِرُونَ ﴿٤٣﴾
إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ النَّاسَ شَيْئًا وَلَٰكِنَّ النَّاسَ أَنفُسَهُمْ
يَظْلِمُونَ ﴿٤٤﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّنَ النَّهَارِ
يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ وَمَا كَانُوا
مُهْتَدِينَ ﴿٤٥﴾ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ
فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ اللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ﴿٤٦﴾ وَلِكُلِّ
أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَاءَ رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ وَهُمْ
لَا يُظْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٤٨﴾
قُل لَّا أَمْلِكُ لِنَفْسِي ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ لِكُلِّ أُمَّةٍ
أَجَلٌ إِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾
قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَتَاكُمْ عَذَابُهُ بَيَاتًا أَوْ نَهَارًا مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ
الْمُجْرِمُونَ ﴿٥٠﴾ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ آمَنتُم بِهِ آلْآنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِ
تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ
الحزب ٢٢ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَيَسْتَنبِئُونَكَ
أَحَقٌّ هُوَ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥٣﴾



﴿٤٣﴾ و هندەك ژ وان بەرێ خۆ ددەنە تە [نیشانێت پێغەمبەراتیا تە دبینن، د گەل هندێ ژی باوەرییێ ب تە نائینن، هەچکو کۆرە مفایی بۆ خۆ ژ وێ دیتنێ نابینن]، ڤێجا ئەگەر ئەو کۆرە بن نەبینن، ئەرێ تو دشێی هەقییێ پێ بدەیە دیتن، خۆ ئەگەر دلتاری ژی بن. ﴿٤٤﴾ ب ڕاستی خودێ چو ستەمێ ل مرۆڤان ناکەت، بەلێ مرۆڤ ب خۆ ستەمێ ل خۆ دکەن. ﴿٤٥﴾ و ڕۆژا خودێ وان کۆم دکەت [کو ڕۆژا قیامەتێیە]، ئەو د وەسانە هەروەکی ئەو ژ بیستەکێ ژ ڕۆژێ پێڤەتر د ئەردیدا نەماینە ئێکدو دنیاسن [هەروەکی ئەڤە ژ مێژ نینە ژێك ڤەبوویین ]، ب ڕاستی ئەوێت دیتنا خودێ [ڕۆژا قیامەتێ] درەو دانایین، خوسارەت بوون و نە ل سەر ڕێکا ڕاست بوون. ﴿٤٦﴾ و ئەگەر ئەم د ژیانا تەدا، هندەك ژ وێ ئیزایا مە بۆ وان پەیمان پێ دایی، ب بەر چاڤێت تە بێخین [دا چاڤێت تە پێ ڕۆن ببن (ئەڤە ب جە هات)] یان ئەگەر تە بمرینین ژی [بەری ب بەر چاڤێت تە بێخین]، نێ زڤڕینا وان هەر ب بال مەڤەیە [ڕۆژا قیامەتێ دێ هەر ئێنە جزاکرن، نە د دنیایێدا د ئاخرەتێدا]. پاشی خودێ ب خۆ ژی شاهدە ل سەر ئەوا ئەو دکەن. ﴿٤٧﴾ و هەر ملەتەکی پێغەمبەرەك هەیە، ڤێجا وەختێ پێغەمبەرێ وان [ڕۆژا قیامەتێ] بۆ وان هات [و شادەیی ل سەر ملەتێ خۆ دا، کو وی پەیاما خودێ ڕۆن و ئاشکەرا یا گەهاندی، و کا وان چ هەلویست ژ وی و پەیاما خودێ هەبوو] ب دادگەری حوکم د ناڤبەرا واندا هاتەکرن، و ستەم ل وان نائێتەکرن. ﴿٤٨﴾ و دبێژن: کەنگی ئەو پەیمان و ژڤان [ئەوا هوین مە ب ئیزایا وێ دترسینن] دێ ئێت، ئەگەر هوین ڕاست دبێژن. ﴿٤٩﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: نە د دەستێ مندایە مفایەکی بگەهینمە خۆ، یان زیانەکێ ژ خۆ بدەمە پاش، ئەو نەبیت یا خودێ حەزکری، هەر ملەتەکی دویماهیکەکا ئاشکەرا یا هەی [تێدا بێنە جزاکرن یان ژی تێدا بمرن]، ڤێجا ئەگەر وەختێ وان هات، نە بیستەکێ دئێنە پێش، و نە بیستەکێ دچنە پاش. ﴿٥٠﴾ کا بۆ من بێژن ئەگەر ئیزایا خودێ د شەڤێدا [و هوین ییێت ڕازایی] یان ژی د ڕۆژێدا [و هوین ل سەر شۆلی] بۆ هەوە بهێت [هوین دێ چ کەن؟]، ڤێجا گونەهکار لەزێ ل هاتنا چ دکەن؟! ﴿٥١﴾ ڤێجا ئەرێ پشتی ئەو ئیزا دئێت ژ نوی دێ باوەرییێ ئینن؟! ئەرێ ڤێ گاڤێ؟ [هوین باوەرییێ دئینن] و هەوە بەری نوکە لەز ل هاتنا ئیزاییێ دکر. ﴿٥٢﴾ پاشی بۆ ئەوێت ستەم کرین هاتە گۆتن: تامکەنە ئیزایا هەروهەر [بخۆن]، ئەرێ ما هوین ژ یا هەوە کری پێڤەتر دئێنە جزاکرن. ﴿٥٣﴾ و ژ تە دپرسن: ئەرێ [ئەو ئیزایا ئەم پێ دئێینە ترساندن، و ژڤان بۆ مە پێ دئێتە دان] ئەو ڕاستە؟ بێژە: ئەرێ ب خودێ، ئەو هەقە و ڕاستە [تشتێ پەیمان بۆ هەوە ب هاتنا وێ هاتییە دان، دێ هەر ئێت]، و هوین نەشێن ڤەگرن، یان خودێ نەچار بکەن کو ئەو نەئینیتە سەرێ هەوە.

وَلَوۡ أَنَّ لِكُلِّ نَفۡسٖ ظَلَمَتۡ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ لَٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ وَأَسَرُّواْ
ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَۖ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِ وَهُمۡ
لَا يُظۡلَمُونَ ٥٤ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِنَّ
وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٥٥ هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ
وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٥٦ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ
مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧
قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا
يَجۡمَعُونَ ٥٨ قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزۡقٖ
فَجَعَلۡتُم مِّنۡهُ حَرَامٗا وَحَلَٰلٗا قُلۡ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمۡۖ أَمۡ عَلَى
ٱللَّهِ تَفۡتَرُونَ ٥٩ وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ
يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ
لَا يَشۡكُرُونَ ٦٠ وَمَا تَكُونُ فِي شَأۡنٖ وَمَا تَتۡلُواْ مِنۡهُ مِن قُرۡءَانٖ
وَلَا تَعۡمَلُونَ مِنۡ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيۡكُمۡ شُهُودًا إِذۡ تُفِيضُونَ
فِيهِۚ وَمَا يَعۡزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثۡقَالِ ذَرَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي
ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصۡغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٍ ٦١



﴿٥٤﴾ و ئەگەر هەر کەسێ ستەم [گاوری] کری، هندی د ئەردیدا یێ وی بیت، دێ [ڕۆژا قیامەتێ] پێش خۆڤە دەت [بەس دا ژ ئیزایا وێ ڕۆژێ قورتال ببیت]، پەشێمانیا خۆ ڤەدشێرن دەمێ ئیزایێ دبینن [دا کەیفا موسلمانان پێ نەئێت، بەلێ وەختێ دکەڤنە تێدا نەشێنە خۆ، و ب دەنگێ بلند پەشێمانیا خۆ ئاشکەرا دکەن]، و ب دادگەری فەرمان و حوکم د ناڤبەرا واندا هاتەکرن، و ستەم ل وان نائێتە کرن. ﴿٥٥﴾ ئاگەهدار بن [هشیار بن]، ب ڕاستی هندی د ئەرد و ئەسماناندا یێ خودێیە، هشیار بن ب ڕاستی پەیمانا خودێ یا ڕاستە [و هەر دێ ئێت]، بەلێ باراپتر ژ وان ڤێ نوزانن. ﴿٥٦﴾ و هەر ئەوە یێ زێندی دکەت و دمرینیت، و ب ڕاستی هوین هەر دێ ب بال ویڤە زڤڕن. ﴿٥٧﴾ گەلی مرۆڤان ب ڕاستی شیرەتەك بۆ هەوە ژ بەرێ خودایێ هەوەڤە هات [کو قورئانە]، و ئەو دەرمان و سلامەتییە بۆ یا د دل و سینگاندا، و ڕاستەرێیی و دلۆڤانییە بۆ خودان باوەران. ﴿٥٨﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: بلا ب کەرەم و دلۆڤانیا خودێ شاد بن [بلا شاد ببن ب وێ قورئانا خودێ ب ڕزقێ وان کری و بەرێ وان دایییە ڕاستەرێییێ، ئانکو هیدایەتێ]، ڤێجا بلا ئەو ب ڤێ شاد بن، چونکی [کەرەم و دلۆڤانیا خودێ، ئانکو هیدایەت] بۆ وان چێترە ژ یا ئەو کۆم دکەن و بزاڤێ بۆ دکەن. ﴿٥٩﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: کا بۆ من بێژن ئەو ڕزقێ خودێ دایییە هەوە [و هوین پارچە پارچە دکەن]، هندەکێ ژ دەڤ خۆ حەلال دکەن و هندەکێ حەرام دکەن، بێژە: ئەرێ خودێ دەستویرا هەوە ب ڤێ چەندێ دایییە؟! یان هوین درەوان ب ناڤێ خودێ دکەن. ﴿٦٠﴾ ئەو چ هزر دکەن ئەوێت درەوان ژ کیس خودێ دکەن کا ڕۆژا قیامەتێ خودێ دێ چ ئیزا دەتە بەر وان، ب ڕاستی خودێ خودان کەرەمە ل سەر مرۆڤان [وەختێ پێغەمبەرێت خۆ بۆ وان هنارتین و ڕاستی و نەڕاستی بۆ وان دیارکری]، بەلێ د گەل هندێ ژی باراپتر ژ وان سوپاسییا خودێ ناکەن. ﴿٦١﴾ [هەی موحەمەد] هەر کار و کراسەکێ تێدا بی و هەر پشکەکا قورئانێ یا تو بخوینی، و هەر کار و کریارەکا هوین بکەن، ئەگەر ئەم ل سەر زێرەڤان و شاهد نەبین دەمێ هوین دچنە د ناڤدا [هەمییان ئەم دهەژمێرین و دنڤێسین]، و چو تشت د ئەرد و ئەسماناندا ل بەر خودایێ تە بەرزە نابیت، ژ دندکا تۆزێ بگرە، و چ بچویکتر و چ مەزنتر، ئەڤە هەمی یێت د کتێبەکا ئاشکەراکەردا [کو دەپێ پارستییە].

أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ
فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ
ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٦٤﴾ وَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ إِنَّ
ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًاۚ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦٥﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ
مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ
يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ
وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ﴿٦٦﴾ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ
ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ
سُبۡحَٰنَهُۥۖ هُوَ ٱلۡغَنِيُّۖ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ
إِنۡ عِندَكُم مِّن سُلۡطَٰنِۭ بِهَٰذَآۚ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ
مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦٨﴾ قُلۡ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ
لَا يُفۡلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٞ فِي ٱلدُّنۡيَا ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ ثُمَّ
نُذِيقُهُمُ ٱلۡعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ﴿٧٠﴾



﴿٦٢﴾ ئاگەهدار بن، مرۆڤێت خودێ نە ترس بۆ
وان هەیە [کو خودێ وان ب بەر ئیزایێ بێخیت]،
و نە ب خەم دکەڤن [ل سەر هێلانا دنیایێ و تشتێ
ژ وان چۆیی]. ﴿٦٣﴾ [مرۆڤێت خودێ] ئەوێت
[ژ دل] باوەری ئینایین، و [پاشی ڕاست و دورست]
پارێزکاریا خودێ کرین. ﴿٦٤﴾ د ژیانا دنیایێ و
ئاخرەتێدا مزگینی بۆ وان هەیە [مزگینیا دنیایێ ئەوە
یا ملیاکەت ددەنێ د گەل ڕوحکێشانێ، یان ژی خەونا
چاکە یا ئەو دبینن، یان ژی یا ب وانڤە دئێتە دیتن،
و مزگینیا ئاخرەتێ بەحەشتە]، و قەت چو گوهۆڕین
بۆ پەیمانا خودێ نینە، و ئەڤەیە سەرفەرازیا
مەزن. ﴿٦٥﴾ و ئاخفتنا وان بلا تە ب خەم نەئێخیت
[کو دبێژنە تە تو نە پێغەمبەری، و تانان ل تە و پەیاما
تە دقوتن]، ب ڕاستی سەردەستی و دەستهەلاتداری
هەمی یا خودێیە [ڤێجا ما دێ چاوا شێن ڕێکێ ل
پەیاما تە گرن، هەتا تو خەمێ ژ گۆتنا وان بخۆی]، و
هەر ئەوە گوهدێری زێدەزانا. ﴿٦٦﴾ بزانن و ئاگەهدار
بن، ب ڕاستی هەچیێ د ئەرد و ئەسماناندا یێ
خودێیە، [ڤێجا چاوا دێ شێن ئەزیەتا تە کەن، ب تشتەکێ خودێ حەز نەکری] و ئەوێت غەیری خودێ
دپەرێسن ئەو هەڤال و هەڤپشکێت ئەو بۆ خودێ چێ دکەن، نە هەڤال و هەڤپشکن بۆ خودێ [چونکی
خودێ چو هەڤال و هەڤپشك نینن]، و ب ڕاستی ئەو ژ گۆمانێ پێڤەتر ل دویڤ چو یێ دی ناچن، و ئەو
ب ڕاستی ژ درەوان پێڤەتر ناکەن. ﴿٦٧﴾ ئەوە [خودێیە] یێ شەڤ بۆ هەوە دایی، دا هوین تێدا ڤەهەسن، و
ڕۆژ بۆ هەوە ڕۆنکری [دا هوین پەرگاریا خۆ تێدا بکەن، و کاروبارێت خۆ تێدا ب سەروبەر بکەن]، ب
ڕاستی د ڤان تشتاندا نیشان گەلەك هەنە، بۆ وان یێت گوهداریا دورست دکەن. ﴿٦٨﴾ گۆتن خودێ بۆ
خۆ کورەکێ گرتی [وەسا نینە] خودێ ژ ڤان گۆتنێت ئەو دکەن یێ پاقژە، ئەو یێ دەولەمەند و بێ منەتە،
هندی د ئەرد و ئەسماناندا هەیی، یێ ویە، و هەوە چو بەلگە و نیشان ب ڤێ چەندێ نینن، چاوا تشتێ
هەوە چو ئاگەهـ پێ نەیی د دەرهەقێ خودێدا دبێژن؟! ﴿٦٩﴾ بێژە: ب ڕاستی ئەوێت درەوێ د ڕاستا خودێدا
دکەن سەرفەراز نابن. ﴿٧٠﴾ [ب ڤێ درەوێ ئەگەر مفایەکێ کێم د دنیایێدا گەهاندنە خۆ] مفایەکێ کێمێ
دنیایێیە، پاشی زڤڕینا وان ب بال مەڤەیە، پاشی دێ ئیزایەکا دژوار دەینە بەر وان، ژ بەر گاوریا وان دکر.

نصف الحزب ٢٢

* وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ
عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ
فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ ثُمَّ
ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ ٧١ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَمَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٍۖ
إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ٧٢
فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ خَلَٰٓئِفَ
وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ ٧٣
ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ رُسُلًا إِلَىٰ قَوۡمِهِمۡ فَجَآءُوهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ
فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۚ كَذَٰلِكَ نَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ
ٱلۡمُعۡتَدِينَ ٧٤ ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ
وَمَلَإِيْهِۦ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ٧٥
فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰذَا لَسِحۡرٞ مُّبِينٞ ٧٦
قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمۡۖ أَسِحۡرٌ هَٰذَا وَلَا يُفۡلِحُ
ٱلسَّٰحِرُونَ ٧٧ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَلۡفِتَنَا عَمَّا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَا
وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا نَحۡنُ لَكُمَا بِمُؤۡمِنِينَ ٧٨





﴿٧١﴾ [هەی موحەمەد] تو سەرهاتییا نووحی
[بۆ گاورێت مەکەهێ] بخوینە وەختێ گۆتییە
ملەتێ خۆ، ملەتێ من ئەگەر مانا من د ناڤ هەوەدا،
و شیرەتێت من ب ئایەت و نیشانێت خودێ ل سەر
هەوە یا گران و مەزن بیت [هەر تشتێ هەوە پێ چێ
بیت د ڕاستا مندا بکەن]، من خۆ هەلپەسارتە خودێ
و پشتا خۆ پێ گرێدا. ڤێجا خۆ بکەنە ئێك و خۆ
و پەرستییێت خۆ کۆمکەنە سەرێك، و یا هەوە ل
بەر ئاشکەرا بکەن [کا هەوە چ پێ چێ دبیت د ڕاستا
مندا بکەن، بکەن] و پاشی ئەو کریارا هەوە دڤێت
د دەرهەقێ مندا بکەن [و ب سەرێ من بینن] بکەن،
و مۆلەتێ ژی نەدەنە من. ﴿٧٢﴾ ڤێجا ئەگەر هەوە پشتا
خۆ دا شیرەت و بیرئینانا من، من چو هەق و بەرانبەر
ژ هەوە نەخواستییە [هەتا هوین ژ بەر هندێ شیرەتا
من وەرنەگرن و ڕوییێ خۆ ژ من وەرگێڕن] کرییا من
[هەق و بەرانبەرێ من] ل سەر خودێیە. فەرمانا من یا
هاتییە کرن کو ئەز ژ موسلمانان بم. ﴿٧٣﴾ بەلێ وان
ئەو درەوین دانا، ڤێجا مە ئەو و ئەوێت د گەل وی
د گەمییێدا رزگار کرن، و مە کرنە جهنشینێت گاوران، و مە ئەوێت باوەری ب ئایەتێت مە نەئینایین و دەرو
دانایین، خەندقاندن. ڤێجا بەرێ خۆ بدێ کا دویماهیکا وان ییێت گەف لێ هاتینەکرن و هاتینە ترساندن کا
یا چاوا بوو. ﴿٧٤﴾ پاشی مە پشتی نووحی، پێغەمبەر بۆ ملەتێت وان هنارتن، ڤێجا ب نیشان و بەلگەیێت
ئاشکەراکەر بۆ وان هاتن، بەلێ ئەو نە ئەو بوون ییێت باوەرییێ ب وی تشتی بینن یێ کو وان بەری هنگی
درەو دانایی، هۆسا ئەم دلێت زێدەگاڤیکەران مۆر دکەین. ﴿٧٥﴾ پاشی مە پشتی وان، مووسا و هاروون ب
نیشان و بەلگەییێت خۆ بۆ فیرعەونی و گرەگرێت وی هنارتن، خۆ مەزنکرن و خۆ قەبە دیتن، [و باوەری
پێ نەئینان] ب ڕاستی ئەو ملەتەکێ گونەهکار بوون. ﴿٧٦﴾ ڤێجا وەختێ هەقی و ڕاستی ژ دەڤ مە بۆ وان
هاتی، گۆتن ب ڕاستی ئەڤە سحر و سێرەبەندییەکا ئاشکەرایە. ﴿٧٧﴾ مووسایی گۆت: ئەرێ هوین دبێژنە
هەقییێ پشتی بۆ هەوە هاتی، ئەڤە سێرەبەندییە، ئەرێ ئەڤە سحر و سێرەبەندییە؟! ب ڕاستی سێرەبەند
ب سەرناکەڤن و سەرفەراز نابن. ﴿٧٨﴾ گۆتن: ئەرێ تو بۆ مە هاتی، دا مە ژ وێ بدەیە پاش یا مە باب
و باپیرێت خۆ ل سەر دیتین؟! و دا مەزناتی د ئەردیدا بەس بۆ هەوە هەردویان بیت، ئەم باوەر ژ هەوە
هەردویان ناکەین.

وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ٱئۡتُونِي بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ ٧٩ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ
قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلۡقُواْ مَآ أَنتُم مُّلۡقُونَ ٨٠ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ قَالَ
مُوسَىٰ مَا جِئۡتُم بِهِ ٱلسِّحۡرُۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبۡطِلُهُۥٓۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ
عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٨١ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ
ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٨٢ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٞ مِّن قَوۡمِهِۦ عَلَىٰ
خَوۡفٖ مِّن فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِمۡ أَن يَفۡتِنَهُمۡۚ وَإِنَّ فِرۡعَوۡنَ لَعَالٖ
فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٨٣ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوۡمِ إِن
كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ ٨٤
فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٥
وَنَجِّنَا بِرَحۡمَتِكَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٨٦ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ
وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوۡمِكُمَا بِمِصۡرَ بُيُوتٗا وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ
قِبۡلَةٗ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٨٧ وَقَالَ مُوسَىٰ
رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيۡتَ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةٗ وَأَمۡوَٰلٗا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَۖ رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ
وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ٨٨



﴿٧٩﴾ و فیرعەونی گۆت: کا هەر سێرەبەندەکێ زێدەزانا بۆ من بینن. ﴿٨٠﴾ ڤێجا وەختێ سێرەبەند هاتین، مووسایی گۆتە وان: کا باڤێژن یا هەوە دڤێت باڤێژن [ژ رستك و وەریسێت خۆ]، سحرا هەوە دڤێت بکەن، بکەن. ﴿٨١﴾ ڤێجا وەختێ وان [وەریسێت خۆ] هاڤێتین [و سحرا خۆ کرین]، مووسایی گۆت: ئەو تشتێ هەوە کری و ئینایی سحرە، ب راستی خودێ زوی دێ پویچکەت، ب راستی خودێ کارێ خرابان راست نائینیت. ﴿٨٢﴾ و خودێ دێ ب کەلامێ خۆ [ئەوێ ب وەحی بۆ وان ئینایی] هەقییێ ئاشکەراکەت و سەرئێخیت، خۆ ئەگەر گونەهکار و خرابان نەڤێت ژی. ﴿٨٣﴾ ڤێجا [دگەل دیتنا ڤان موعجیزە و ئایەتان ژی] کەسێ باوەری ب مووسایی نەئینا، کێمەکا دویندەها ئسرائیلییان نەبیت، و دلێ وان ژی یێ ب ترس بوو ژ فیرعەونی و کەنکەنەیێت وی، نەکو ب خورتی وان ژ دینێ وان ڤەکەن و ئەزیەت بدەن، ب راستی فیرعەون یێ زال و دەستهەلاتدار بوو د ئەردیدا، و ب راستی ئەو ژ گونەهکاریێت زێدە خراب بوو. ﴿٨٤﴾ و مووسایی گۆت: ملەتێ من، ئەگەر هەوە راست باوەری ب خودێ ئینایییە، پا خۆ هلپەسێرنێ و پشتا خۆ پێ گرێدەن، ئەگەر هوین ئەو بن یێت هەوە خۆ سپارتبیتە خودێ. ﴿٨٥﴾ ئینا گۆتن: ب راستی مە خۆ هلپەسارتە خودێ، و مە پشتا خۆ پێ موکوم کر، خودایێ مە تو مە ب دەستێت گاور و ستەمکاران جەربە نەکەی [و مە نەئێخییە د بن ئیزا و ئەزیەتا وان، کو مە ژ دینێ مە ڤەکەن]. ﴿٨٦﴾ و ب رەحما خۆ مە ژ ملەتێ گاور رزگار بکە. ﴿٨٧﴾ و مە وەحی بۆ مووسایی و برایێ وی هنارت، هوین هەردو د مسرێدا هندە خانییان بۆ ملەتێ خۆ ئامادە بکەن، و خانییێت خۆ بکەنە مزگەفت و بەرقیبلە بکەن [و هۆسا ب نهێنی] نڤێژان د وان خانییانڤە بکەن، و مزگینییێ [ب سەرکەڤتنێ] بدە خودان باوەران. ﴿٨٨﴾ و مووسایی گۆت: هەی خودایێ مە، ب راستی تە د ژیانا دنیایێدا زینەت و گەلەك جوینێت مالی یێت داینە فیرعەونی و کەنکەنەیێت وی، و خودایێ مە ئەڤە ژی یا بوویە ئەگەرا هندێ بەندەیێت تە ژ رێکا تە دەربێخن و بەرزە بکەن، خودایێ مە، تو مالێ وان بێ سەروشوین بکە و دلێت وان رەق بکە، نێ هەتا ئەو ئیزایا ب ژان و دژوار نەبینن، باوەرییێ نائینن.

قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَاسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَانِّ سَبِيلَ
الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾ * وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ
فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُ بَغْيًا وَعَدْوًا حَتَّىٰ إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ
قَالَ آمَنتُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ
وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ آلْآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ
مِنَ الْمُفْسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ
خَلْفَكَ آيَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ ﴿٩٢﴾
وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٍ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ
الطَّيِّبَاتِ فَمَا اخْتَلَفُوا حَتَّىٰ جَاءَهُمُ الْعِلْمُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي
بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٩٣﴾ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ
مِّمَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ فَاسْأَلِ الَّذِينَ يَقْرَءُونَ الْكِتَابَ مِن
قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَاءَكَ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ ﴿٩٤﴾
وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٩٥﴾
إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾
وَلَوْ جَاءَتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴿٩٧﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٢٢



﴿٨٩﴾ [خودێ] گۆتە وان [ئانكو مووسایی
و هاروونی]: ب ڕاستی دوعایا هەوە هاتە
قەبویلكرن، ڤێجا هوین هەردو خۆ ڕاگرن [بمیننە
ل سەر باوەرییا خۆ]، و ڕێكا ئەوێت نەزان نەگرن.
﴿٩٠﴾ و مە ئسرائیلی ژ دەریایێ دەربازكرن، و فیرعەون
و لەشكەرێ خۆ ژ نەهەقی و ژ بێ بەختی دانە دویڤ
وان، هەتا فیرعەون كەڤتیە بەر خەندقاندنێ گۆت:
من باوەری ئینا كو ب ڕاستی ژ بلی وی خودایێ
ئسرائیلییان باوەری پێ ئینایی، چو خودایێت دی
نینن، و ئەز ژ خودان باوەرانم. ﴿٩١﴾ ژ نوی تە باوەری
ئینا [ژ نوی تو باوەرییێ دئینی، پشتی تو ژ زیانێ بێ
هیڤی بوویی؟]، و تە بەری نوكە نەگوهداری دكر، و
تو ژ خرابكاران بوویی؟! ﴿٩٢﴾ ئەڤرۆ ئەم دێ كەلەخێ
تە ژ ئاڤێ دەرئێخین، دا تو بۆ یێت د دویڤ خۆدا ببیە
چام و عیبرەت. ب ڕاستی گەلەك ژ خەلكی ژ نیشان
و ئایەتێت مە، د بێ ئاگەهن. ﴿٩٣﴾ و مە ئسرائیلی ل
جهەكێ باش ئاكنجی كرن، و مە ڕزقەكێ پاقژ دا
وان، و ئەو ل سەر دینێ خۆ ژێك جودا نەبوون هەتا
تەورات بۆ وان نەهاتی، ب ڕاستی خودایێ تە ڕۆژا قیامەتێ دێ حوكمی د ناڤبەرا واندا كەت، ل سەر وی
تشتێ ئەو تێدا ژێك جودا. ﴿٩٤﴾ ڤێجا ئەگەر تو ب وی تشتێ مە بۆ تە ئینایییە خوارێ یێ دودلی، پسیارا
وان بكە ئەوێت بەری تە كتێبێت ئەسمانی [تەوراتێ و ئنجیلێ] دخوینن، ب سویند هەقییە ژ خودایێ تە
بۆ تە هاتی، ڤێجا هشیاربە ژ دودلان نەبە. ﴿٩٥﴾ و نەبە ژ وان ئەوێت نیشان و ئایەتێت خودێ درەو دانایین،
ئەگەر تو ژی دێ ژ زیانكاران بی. ﴿٩٦﴾ ب ڕاستی ئەوێت عەزابا خودێ ل سەر واجب بوویی، باوەرییێ
نائینن [ئانكو دێ مرن و ئەو گاور]. ﴿٩٧﴾ و ئەگەر هەمی نیشان و ئایەتێت خودێ بگەهنە وان، باوەرییێ
نائینن هەتا ئیزایا ب ژان و دژوار نەبینن [هنگی ژ نوی دێ باوەرییێ ئینن وەكی فیرعەونی، بەلێ هنگی
باوەرییا وان فایدەی وان ناكەت].

فَلَوۡلَا كَانَتۡ قَرۡيَةٌ ءَامَنَتۡ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوۡمَ يُونُسَ
لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفۡنَا عَنۡهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا
وَمَتَّعۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ حِينٖ ٩٨ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ
كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ٩٩
وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تُؤۡمِنَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَيَجۡعَلُ ٱلرِّجۡسَ
عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ ١٠٠ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَا تُغۡنِي ٱلۡأٓيَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ ١٠١
فَهَلۡ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثۡلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِهِمۡۚ
قُلۡ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ ١٠٢ ثُمَّ نُنَجِّي
رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيۡنَا نُنجِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٠٣
قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي شَكّٖ مِّن دِينِي فَلَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِينَ
تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنۡ أَعۡبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُمۡۖ وَأُمِرۡتُ
أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٠٤ وَأَنۡ أَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفٗا
وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٠٥ وَلَا تَدۡعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا
يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَۖ فَإِن فَعَلۡتَ فَإِنَّكَ إِذٗا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٠٦



﴿٩٨﴾ ڤێجا بلا گوندەکێ ژ وان گوندێت مە برینە هیلاکێ باوەری ئینابایە بەری مە ئیزا ب سەرێ وان دئینا، دا باوەریا وان مفا گەهاندبایە وان، وەکی ملەتێ یوونس پێغەمبەر [ئانکو ژ بلی ملەتێ یوونس پێغەمبەر چو گوند و باژێران بەری هاتنا عەزابێ باوەری نەئینایییە کو باوەریا وان فایدەی وان کربیت]، ڤێجا وەختێ ملەتێ یوونس پێغەمبەر [بەری هاتنا عەزابێ] باوەری ئینایی، مە ژێ عەزاب و ئیزایا هەتکبەر د ژیانا دنیایێدا ل سەر وان راکر، و مە هەتا دەمەکێ دیارکری [ئانکو دەمێ مرنێ] خۆشی و چاکی پێ دانە وان. ﴿٩٩﴾ و ئەگەر خودایێ تە ڤیابایە، دا هندی ل سەر روییێ ئەردی هەمی باوەرییێ ئینن، ڤێجا ما تو دێ خورتییێ ل خەلکی کەی دا باوەرییێ بینن؟! ﴿١٠٠﴾ و کەس نەشێت باوەرییێ بینیت ئەو نەبیت یێ خودێ دەستویرا وی دایی [ئانکو ژ بلی وان یێت خودێ دەستویرا باوەریئینانا وان دایی، کەسێ دیتر نەشێت ژ دەڤ خۆ باوەرییێ بینیت]، و خودێ دێ ئیزا و رسواییێ ب سەر واندا ئینیت، ئەوێت عەقلێ خۆ د نیشان و ئایەتێت خودێدا ب کارنەئینن. ﴿١٠١﴾ بێژە: [گەلی گاوران] کا بەرێ خۆ بدەنە ئەرد و ئەسمانان کا چ تێدا هەیە؟ بەلێ نیشان و ئایەت و ترساندن دێ چ گەهیننە وان ئەوێت باوەرییێ نەئینن. ﴿١٠٢﴾ ڤێجا ئەرێ ئەو ل هیڤیا وان رۆژانە ئەوێت بۆ یێت بەری وان هاتین [باوەری ب پێغەمبەران نەدئینان و ژ بەر هندێ خودێ ئیزادان]، [هەی موحەمەد] بێژە: خۆ بگرن ئەز ژی د گەل هەوە دێ خۆ گرم [دێ ژ چاڤەرێیان بم]. ﴿١٠٣﴾ پاشی ئەم [وەختێ هاتنا ئیزاییێ و ئاتافێ] پێغەمبەرێت خۆ و یێت باوەری ب وان ئینایین رزگار دکەین، و هۆسا حەقی و راستی ل سەر مە دکەڤیت، ئەم خودان باوەران رزگار بکەین. ﴿١٠٤﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: گەلی مرۆڤان ئەگەر هوین د دینێ مندا یێت دودل و ب گۆمان بن، ئەز ئەوێت هوین ژ بلی خودێ دپەرێسن، ناپەرێسم، بەلێ ئەز وی خودایی ب تنێ دپەرێسم ئەوێ هەوە دمرینیت، و فەرمانا من یا هاتییە کرن ئەز ژ خودان باوەران بم. ﴿١٠٥﴾ و [فەرمانا من یا هاتییە کرن] ئەز خۆ راست و دورست بکەم بۆ دینێ راست و دویر ژ خواری و نەهەقییێ، و ئەز ژ موشرکان نەبم. ﴿١٠٦﴾ و ژ بلی خودێ ئەز گازی و هەوارا خۆ نەگەهینمە وی، یێ نە مفایی دگەهینیتە من و نە زیانێ [و هۆسا فەرمانا من یا هاتییە کرن]، ڤێجا ئەگەر تە ئەڤە [نەگوهدارییا خودێ] کر، ب راستی وی وەختی دێ ژ ستەمکاران بی.

وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٨﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَٱصْبِرْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿١٠٩﴾

سُورَةُ هُودٍ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓر ۚ كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۚ إِنَّنِى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ ﴿٢﴾ وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ ۖ وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ ﴿٣﴾ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا۟ مِنْهُ ۚ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٥﴾



﴿١٠٧﴾ و ئەگەر خودێ [بۆ جەرباندنا تە] زیانێ بگەهینیتە تە، کەس نینە ڕاکەت، ئەو نەبیت، و ئەگەر خودێ خێرەك بۆ تە ڤیا، کەس نینە بشێت ڕێکێ ل کەرەما وی بگریت، خودێ کەرەما خۆ ددەتە وی، ژ بەندەیێت خۆ، یێ وی بڤێت، و هەر ئەوە گونەهـ ژێبەر و دلۆڤان. ﴿١٠٨﴾ بێژە: گەلی مرۆڤان ب سویند هەقی ژ بەرێ خودێڤە بۆ هەوە هات [کو ئەڤ قورئانەیە]، ڤێجا هەر کەسێ ڕاستەڕێ بوو، ئەو بۆ خۆ ڕاستەڕێ بوو، و هەر کەسێ ژ ڕێ دەرکەڤت و سەرداچۆ، ب ڕاستی زیان ل خۆ کر، و ئەز ل سەر هەوە پارێزڤان نینم [ئانکو ئەز نە پارێزڤانێ هەوەمە].
﴿١٠٩﴾ و ل دوی وێ وەحییێ هەرە یا بۆ تە دئێت، و بێنا خۆ فرەهـ بکە هەتا خودێ حوکمی [د ناڤبەرا تە و ملەتێ تەدا] دکەت، و هەر ئەوە چێترین حاکم.

## سۆرەتا هوود

**ل مەکەهێ هاتیە خوارێ (١٢٣) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ [ئەلف لام ڕا، ئەڤە سێ تیپن ژ (٢٨) تیپێت زمانێ عەرەبی، نیشانن ل سەر ئیعجازا ڤێ قورئانێ کو عەرەبان پێ چێنابیت قورئانەکا وەکی ڤێ بدانن، هەرچەندە زمانێ وان ژ عەینی تیپان پێك هاتییە]، ئەڤە کتێبەکە ئایەتێت وێ ب ڕێك و پێکی و موکومی هاتینە دارێتن، پاشی هاتە جوداکرن [ئایەتێت ئەحکامان جودا، و شیرەت و چیرۆك جودا... هتد] ژ بەرێ خودایێ کاربنەجهـ و شارەزاڤە. ﴿٢﴾ [ئانکو ناڤەرۆکا وان ئایەتێت هاتینە موکومکرن و جوداکرن ئەڤەیە] ژ بلی خودێ کەسێ دی نەپەرێسن، ب ڕاستی ئەز ژ نك خودێڤە بۆ هەوە مزگینئین و ئاگەهدارکەرم. ﴿٣﴾ و داخوازا گونەهـ ژێبرنێ ژ خودایێ خۆ بکەن، پاشی ژ کریارێت خۆ پەشێمان ببن، و تۆبە بکەن و ل خودێ بزڤڕن، دا ئەو ژیانا هەوە ب چاکی هەتا دەمەکێ ئاشکەراکری خۆش بکەت، و دا کەرەما خۆ د گەل هەر خودان تاعەت و کارەکێ قەنج بکەت، و ئەگەر بەرێ خۆ [ژ ڤێ فەرمانێ] وەرگێڕن، ڤێجا ب ڕاستی ترسا من ژ ئیزایا ڕۆژەکا مەزنە ب سەر هەوەدا بهێت کو ڕۆژا قیامەتێیە. ﴿٤﴾ [بزانن] زڤڕینا هەوە ب بال خودێڤەیە، و ئەو ب خۆ ژی ل سەر هەمی تشتان یێ دەستهەلاتدارە. ﴿٥﴾ ئاگەهدار بن و هشیار بن، ئەو سینگێ خۆ ب دژمنییێ دپێچن [ئانکو دوروینە] دا خۆ ژ پێغەمبەری ڤەشێرن، هشیار بن دەمێ ئەو جلکێت خۆ ل خۆ دپێچن، خودێ ب ئاگەهە ژ وێ یا ئەو نەپەنی و ئاشکەرا، دکەن. ب ڕاستی ئەو یێ ب ئاگەهە ژ وی یێ د دلان و سینگاندا ڤەشارتی.

۞ وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ
مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٦ وَهُوَ
ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَكَانَ
عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۗ وَلَئِن
قُلۡتَ إِنَّكُم مَّبۡعُوثُونَ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡمَوۡتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ
إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ٧ وَلَئِنۡ أَخَّرۡنَا عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابَ إِلَىٰٓ
أُمَّةٖ مَّعۡدُودَةٖ لَّيَقُولُنَّ مَا يَحۡبِسُهُۥٓۗ أَلَا يَوۡمَ يَأۡتِيهِمۡ لَيۡسَ
مَصۡرُوفًا عَنۡهُمۡ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٨
وَلَئِنۡ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ ثُمَّ نَزَعۡنَٰهَا مِنۡهُ إِنَّهُۥ
لَيَـُٔوسٞ كَفُورٞ ٩ وَلَئِنۡ أَذَقۡنَٰهُ نَعۡمَآءَ بَعۡدَ ضَرَّآءَ
مَسَّتۡهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّيٓۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٞ فَخُورٌ ١٠
إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم
مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ١١ فَلَعَلَّكَ تَارِكُۢ بَعۡضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ
وَضَآئِقُۢ بِهِۦ صَدۡرُكَ أَن يَقُولُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ جَآءَ
مَعَهُۥ مَلَكٌۚ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٞۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٌ ١٢





﴿٦﴾ چو جاندار د ئەردیدا نینن ئەگەر ڕزقێ وان ل سەر خودێ نەبیت، و دزانیت جهێ ئەو لێ [د ئەردیدا یان د پشتاندا بەری هەبیت]، و جهێ لێ خۆجە دبیت [د مالبچویکاندا یان د گۆڕاندا، و جهێ لێ دمریت]، ئەڤە هەمی د کتێبەکا ئاشکەرادانە کو دەپێ پارستییە.
﴿٧﴾ و ئەو ئەوە یێ ئەرد و ئەسمان د شەش ڕۆژاندا چێکری، و عەرشێ وی ل سەر ئاڤێ بوو [بەری ئەرد و ئەسمان بێنە چێکرن] دا هەوە بجەڕبینیت کا کارێ کێ ژ هەوە باشترە [ژ یێ کێ]، و ئەگەر بێژی، ب ڕاستی هوین پشتی مرنێ دێ ساخ بنەڤە، ئەوێت گاوربووین دێ بێژن: ئەڤە ژ سێرەبەندییەکا ئاشکەرا پێڤەتر نینە. ﴿٨﴾ و ئەگەر ئەم ئیزا و جزاکرنا وان هەتا دەمەکێ ئاشکەرا گیرۆ بکەین، [ئەوێت گاور] دێ بێژن: کا ئەو ئیزایا دا بۆ مە ئێت، چ ڕێ لێ گرتییە؟ هشیار بن! ڕۆژا ئەو ئیزا بۆ وان دئێت، ژ وان نائێتە ڤەگرتن، و ئەو ئیزایا وان ترانە پێ دکر و لەز لێ دکر، دۆرماندۆرێت وان گرتن. ﴿٩﴾ و ئەگەر ئەم ژ ڕەحمێ خۆڤە نیعمەت و دلۆڤانییەکێ بگەهینینە مرۆڤی پاشی مە ژێ ڤەگرت، ئەو [ژ دلۆڤانییا مە] زوی بێ هیڤی دبیت، و ئەو قەنجییێت بەرێ، مە د گەل کرین ژ بیرا خۆ دبەت. ﴿١٠﴾ و ب ڕاستی ئەگەر ئەم پشتی تەنگاڤی و نەخۆشییێ نیعمەتان د گەل بکەین و بگەهینینێ دێ بێژیت: نێ تەنگاڤی و نەخۆشی ل سەر من نەمان [چۆن]، ڤێجا یێ بەتران و قەبەیە. ﴿١١﴾ ژ بلی وان مرۆڤان یێت بێنا خۆ فرەهـ کرین و کار و کریارێت قەنج کرین [ئەڤە د هەردو کراساندا ل بەر خۆ ڕادوەستن، و ئەگەر خودێ خێر و کەرەمەك د گەل وان کر، سوپاسییا خودێ دکەن و ئەگەر ئاتافەك یان نەخۆشییەك ب سەرێ وان هات، ژ ڕەحما خودێ بێ هیڤی نابن] بۆ ڤان گونەهـ ژێبرن، و خەلاتەکێ مەزن هەیە.
﴿١٢﴾ تێ هەیە تو هندەك ژ وەحییا بۆ تە هاتی، بهێلی و دلێ تە تەنگ ببیت، چونکی دبێژن: بلا گەنجخانەیەك بۆ هاتبایە خوارێ، یان ملیاکەتەك د گەل هاتبایە شادەیی بۆ دابایە، [دا مە ژی باوەری پێ ئینابایە] تو بەس ئاگەهدارکەری، و خودێیە ل سەر هەمی تشتان پاریزڤان و چاڤدێر.

أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَـٰتٍ
وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١٣﴾
فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ وَأَن
لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٤﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ
ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَـٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا
لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا
ٱلنَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا۟ فِيهَا وَبَـٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾
أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ
كِتَـٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۚ وَمَن يَكْفُرْ
بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ ۚ إِنَّهُ
ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٧﴾ وَمَنْ
أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ
رَبِّهِمْ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَـٰدُ هَـٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ
أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ
ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿١٩﴾





﴿١٣﴾ یان ژی دبێژن: [موحەمەدی ئەڤ قورئانە] ژ نك
خۆ یا چێكری [و ژ درەو ب بال خودێڤە لێ ددەت]
بێژە: ئەگەر هوین ڕاست دبێژن: كا دەه سۆرەتێت
وەكی وێ ژ دەڤ خۆ بینن، ئەگەر ڕاستە ئەز ژ نك
خۆ چێ دكەم. و بۆ ڤێ چەندێ و بۆ هاریكاریا
خۆ، هەر كەسێ هوین بشێن ژ بلی خودێ داخوازێ
ژێ بكەن، داخوازێ ژێ بكەن. ﴿١٤﴾ ڤێجا ئەگەر
وان بەرسڤا هەوە نەدا [و نەچار بوون و نەشیان وێ
بكەن یا هوین ژێ دخوازن]، بزانن ب ڕاستی ئەڤ
قورئانە ب زانینا خودێ ب تنێ هاتییە خوارێ، چو
پەرستی ژ خودێ پێڤەتر نینن، ڤێجا ما هوین موسلمان
نابن. ﴿١٥﴾ هەر كەسێ ژیان و خەملا دنیایێ بڤێت،
ئەم دێ بێ كێماسی بەرانبەر كارێ وان دەینە وان و
د دنیایێدا چو ژ وان نائێتە كێمكرن. ﴿١٦﴾ ئەڤان د
ئاخرەتێدا ژ ئاگری پێڤەتر چو یێ دی بۆ نینە، و كار
و كریارێت وان د دنیایێدا كرین، د ئاخرەتێدا پویچ
بوون، و كارێ وان دكر هەمی یێ پویچە [چونكی
بۆ خودێ نەهاتییە كرن]. ﴿١٧﴾ ئەرێ یێ بەلگە و
نیشانەكا ئاشكەرا ژ ڕەخێ خودێڤە هەبیت، و شاهدەك ژی ژ بەرێ خودێڤە د گەل هەبیت و ب هێز بێخیت
[كو قورئانە]، و بەری قورئانێ ژی كتێبا مووسایی كو پێشی و دلۆڤانی بوو، شادەیییێ بۆ بدەت، ئەڤێت
هەنێ [ئەڤێت ب ڤان سالۆخەتان هاتینە پەسنكرن كو بەلگە و نیشان د گەلن، و شاهد ل دویڤ شاهدی،
شادەیییێ بۆ ددەن] باوەرییێ ب پێغەمبەری و قورئانێ دئینن، و هەر كەسێ ژ خەلكێ مەكەهێ و هەمی
خودانێت دینان، باوەرییێ ب پێغەمبەری و قورئانێ نەئینیت و گاور ببیت، ب ڕاستی ئاگر جهێ ویـیە، ڤێجا
بلا بۆ تە چو گۆمان د دەرهەقا قورئانێدا چێ نەبیت، ب ڕاستی ئەڤ قورئانە ژ خودایێ تەیە، بەلێ باراپتر ژ
مرۆڤان باوەرییێ نائینن. ﴿١٨﴾ ئەرێ ما كی ژ وی ستەمكارترە ئەوێ درەوان ژ كیسێ خودایێ خۆ دكەت،
ئەڤێت هۆسا دێ بەرانبەری خودێ ئێنە ڕاوەستاندن، و شاهد [ژ ملیاكەت و پێغەمبەران] دێ بێژن: ئەڤەنە
درەو ژ كیسێ خودێ دكرن، بزانن! ب ڕاستی لەعنەتا خودێ ل ستەمكاران بیت. ﴿١٩﴾ ئەو [ستەمكار] یێت
ڕێكا خودێ ژ خەلكی دگرن و دڤێن یا خوار و ڤیچ بیت [دا خەلكی ژێ بدەنە پاش]، و وان ب خۆ باوەری
ب ڕۆژا قیامەتێ نەی.

أُوْلَٰٓئِكَ لَمْ يَكُونُواْ مُعْجِزِينَ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ
ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَۘ يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلْعَذَابُۚ مَا كَانُواْ يَسْتَطِيعُونَ
ٱلسَّمْعَ وَمَا كَانُواْ يُبْصِرُونَ ﴿٢٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ
أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿٢١﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ
فِي ٱلْأٓخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَخْبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِۖ
هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٣﴾ ۞ مَثَلُ ٱلْفَرِيقَيْنِ كَٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْأَصَمِّ
الحِزْب ٢٣
وَٱلْبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِۚ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًاۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾
وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٥﴾
أَن لَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٢٦﴾
فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا
وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأْيِ
وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلِۭ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾
قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحْمَةً مِّنْ
عِندِهِۦ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمْ لَهَا كَٰرِهُونَ ﴿٢٨﴾





﴿٢٠﴾ ئەڤە نەشێن خودێ نەچار بکەن کو وان د
ئەردیدا ئیزا نەدەت، و وان ژ بلی خودێ چو پشتەڤان
نینن وان ژ ئیزایا خودێ بدەتە پاش، ئیزا ل سەر
دوقات لێ دئێت، و ئەوان نەدشیا ڕاستییێ گولێ
ببن، و نەدشیان ژی ڕاستییێ ببینن. ﴿٢١﴾ ئەڤان زیان
ل خۆ کرییە و ئەو درەوا وان دکر [کو مەهدەریا
بوتانە] ل وان بەرزەبوو. ﴿٢٢﴾ ب ڕاستی و بێ گۆمان
ڕۆژا قیامەتێ هەر ئەو د خوسارەتن. ﴿٢٣﴾ ب ڕاستی
ئەوێت باوەری ئینایین، و کار و کریارێت قەنج کرین،
و د ڕاستا خودێدا خۆ شکاندین و ترسیایین و ب بال
خودایێ خۆڤە زڤڕین، ئەڤە بەحەشتینە و هەروهەر
دێ د بەحەشتێدا مینن. ﴿٢٤﴾ مەتەلا هەردو جوین
و دەستەکان، وەکی یێ کۆرە و یێ کەڕ، و یێ ب
چاڤ و یێ ب گوهە، ئەرێ ما ئەڤە وەکی ئێکن؟
ئەرێ ما هوین هزرا خۆ ناکەن؟! ﴿٢٥﴾ ب سویند
مە نووح پێغەمبەر بۆ ملەتێ وی هنارت [گۆتە وان]،
ب ڕاستی ئەز بۆ هەوە ئاگەهدارکەرەکێ ئاشکەرامە.
﴿٢٦﴾ ژ خودێ پێڤەتر چو یێ دی نەپەرێسن، ب
ڕاستی ئەز دترسم [ئەگەر هوین باوەر ژ من نەکەن] ئیزایا ڕۆژەکا گران و دژوار ب سەر هەوەدا بێت.
﴿٢٧﴾ گرەگرێت ملەتێ وی ئەوێت گاوربوویین گۆتنێ: ئەم تە ژ مرۆڤەکێ وەکی خۆ پێڤەتر نابینین [ئانکو
تو ژی وەکی مەیی، و ئەم تە پێغەمبەر نابینین]، و ئەم نابینین کەسەکێ وەسا ب دویڤ تە کەڤتبیت ژ فەقیر و
ژارێت مە پێڤەتر.. ئەوێت سادە و ساویلکە. و ئەم نابینین هوین تشتەکێ ژ مە زێدەتر و چێترن، بەلکی ئەم
هەوە درەوین دبینین [ڤێجا چاوا دێ باوەرییێ ب هەوە ئینین]. ﴿٢٨﴾ [نووح پێغەمبەر بەرسڤا وان دا] گۆت:
ملەتێ من کا بۆ من بێژن: ئەگەر من نیشان و بەلگەیێت ئاشکەرا ژ نك خودایێ خۆ هەبن [کو ئاشکەرا
ببیت ئەز پێغەمبەرم]، و دلۆڤانی ژ نك خۆ ب من بربیت، و پێغەمبەراتی دابیتە من [و ئەو بەلگە و نیشان و
ئەو دلۆڤانییە کو پێغەمبەراتییە] ژ هەوە هاتبیتە ڤەشارتن و ل بەر هەوە بەرزە بوویت، ئەرێ ما ئەز دشێم
هەوە نەچار بکەم، و ب خورتی باوەرییێ بێخمە د دلێت هەوەدا، و هەوە ب خۆ نەڤێت.

وَيَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مَالًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ وَمَآ أَنَا۠
بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمًا
تَجۡهَلُونَ ﴿٢٩﴾ وَيَٰقَوۡمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمۡۚ أَفَلَا
تَذَكَّرُونَ ﴿٣٠﴾ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ
أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٞ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزۡدَرِيٓ
أَعۡيُنُكُمۡ لَن يُؤۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيۡرًاۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمۡ إِنِّيٓ
إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدۡ جَٰدَلۡتَنَا فَأَكۡثَرۡتَ جِدَٰلَنَا
فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ إِنَّمَا
يَأۡتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَنفَعُكُمۡ
نُصۡحِيٓ إِنۡ أَرَدتُّ أَنۡ أَنصَحَ لَكُمۡ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن
يُغۡوِيَكُمۡۚ هُوَ رَبُّكُمۡ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٣٤﴾ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ
قُلۡ إِنِ ٱفۡتَرَيۡتُهُۥ فَعَلَيَّ إِجۡرَامِي وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُجۡرِمُونَ ﴿٣٥﴾
وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤۡمِنَ مِن قَوۡمِكَ إِلَّا مَن قَدۡ ءَامَنَ
فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا
وَوَحۡيِنَا وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴿٣٧﴾



﴿٢٩﴾ هەی ملەتێ من، ئەز بەرانبەری گەهاندنا
نامەیا خودێ، چو مالی ژ هەوە ناخوازم، چونكی
خەلاتێ من بەس ل سەر خودێیە، و ئەز وان كەسێت
باوەری ئینایین [ئەوێت هوین فەقیر و ژار دبینن] ژ
دەڤ خۆ ناكەمە دەرێ، چونكی ب ڕاستی ئەو دێ
گەهنە خودایێ خۆ [دێ وان خەلات كەت]، بەلێ
ب ڕاستی ئەز دبینم هوین ملەتەكن، خۆ نەزان دكەن
[دەمێ هوین وان كێم دبینن و خۆ چێتر دبینن].
﴿٣٠﴾ هەی ملەتێ من، ئەرێ كی دێ هاریكاریا من
كەت بەرانبەر خودێ [ئەگەر ئەز ئیزادام و تۆلا وان ژ
من ڤەكر] گاڤا من دەرئێخستن، ما هوین هزرا خۆ
ناكەن؟ ﴿٣١﴾ [هەی ملەتێ من] و ئەز نابێژمە هەوە
خزینە و گەنجخانەیێت خودێ یێت ل دەڤ من
[كا وەرن دا بدەمە هەوە]، و ب ڕاستی تشتێ نەدیار و
نەبەرچاڤ ژی ئەز نوزانم، و ئەز نابێژم ئەز ملیاكەتم
ژی، و ئەز نابێژمە وان ئەوێت د چاڤێت هەوەدا كێم و
شكەستی، خودێ كەرەمێ د گەل وان ناكەت، خودێ
چێتر یا د دلێ واندا دزانیت، ئەگەر من وەگۆت
هنگی ئەز ژ ستەمكارانم. ﴿٣٢﴾ گۆتن: هەی نووح ب ڕاستی تە جڕەبڕ د گەل مە كر، و تە زێدە د گەل مە
درێژكر، ئەگەر تو ڕاست دبێژی ئەو ئیزایا تو مە پێ دترسینی بۆ مە بینە. ﴿٣٣﴾ گۆت: ئەگەر خودێ ڤیا
دێ ب سەر هەوەدا ئینیت، و هوین نەشێن ڕێكێ لێ بگرن، و خودێ نەچار بكەن كو هەوە ئیزا نەدەت.
﴿٣٤﴾ و شیرەتێت من فایدەیی هەوە ناكەن، ئەگەر من ڤیا هەوە شیرەت بكەم و خودێ ڤیا هەوە گومڕا و
بەرزە بكەت، ئەوە خودایێ هەوە و هوین دێ ب بال ویڤە زڤڕن. ﴿٣٥﴾ یان ژی [موشركێت مەكەهێ]
دبێژن: چیرۆكا نووحی ئەڤاهە [یان ئەڤ قورئانە موحەمەد] ژ دەڤ خۆ چێكرییە، [هەی موحەمەد] بێژە:
ئەگەر من ژ دەڤ خۆ چێكربیت و ئینابیت، گونەها من بۆ منە و ئەز یێ بەریمە ژ وێ گونەها هوین دكەن
[ب بالڤەلێدانا درەوێ ب بال منڤە]. ﴿٣٦﴾ و وەحی بۆ نووحی هاتە هنارتن، ژ وان پێڤەتر ئەوێت باوەری
ئینایین كەسێ دیتر ژ ملەتێ تە باوەرییێ نائینیت، ڤێجا [مادەم كەسێ دی ژ ملەتێ تە باوەرییێ نائینیت] ب
خەم نەكەڤە ژ كارێ وان دكر [كو وان تو درەوین ددانایی و ئەزیەتا تە دكرن، وەختێ تۆلڤەكرنێ ژ وان هات].
﴿٣٧﴾ كا تو گەمییێ ل بەرچاڤێت مە و ب چاڤدێری و پارێزییا مە و ب وەحییا مە چێكە، و تو مەهدەرێ ژ
من نەخوازە بۆ وان ئەوێت ستەم كرین، بێ گۆمان ئەو د خەندقینە [دێ هەر خەندقن].

وَيَصۡنَعُ ٱلۡفُلۡكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيۡهِ مَلَأٞ مِّن قَوۡمِهِۦ سَخِرُواْ مِنۡهُۚ
قَالَ إِن تَسۡخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسۡخَرُ مِنكُمۡ كَمَا تَسۡخَرُونَ ٣٨
فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيۡهِ عَذَابٞ
مُّقِيمٌ ٣٩ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلۡنَا ٱحۡمِلۡ فِيهَا
مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ
وَمَنۡ ءَامَنَۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٞ ٤٠ ۞ وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا
بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ٤١
وَهِيَ تَجۡرِي بِهِمۡ فِي مَوۡجٖ كَٱلۡجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبۡنَهُۥ
وَكَانَ فِي مَعۡزِلٖ يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٤٢
قَالَ سَـَٔاوِيٓ إِلَىٰ جَبَلٖ يَعۡصِمُنِي مِنَ ٱلۡمَآءِۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلۡيَوۡمَ
مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَۚ وَحَالَ بَيۡنَهُمَا ٱلۡمَوۡجُ فَكَانَ مِنَ
ٱلۡمُغۡرَقِينَ ٤٣ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي
وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ
بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٤ وَنَادَىٰ نُوحٞ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبۡنِي
مِنۡ أَهۡلِي وَإِنَّ وَعۡدَكَ ٱلۡحَقُّ وَأَنتَ أَحۡكَمُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ٤٥

نصف الحزب ٢٣



﴿٣٨﴾ نـووح پێغەمبـەری گەمی چێ دکـر، و هەر گاڤەكا گرەگرێت ملەتێ وی د بەررا بۆریبانە، ترانـە بۆ خۆ پێ دکـرن، نووحـی گۆتـە وان ئەگـەر هوین [ژ بـەر چێکرنا گەمیـێ ل سـەر ئاخـێ] ترانەیـان ب مە دکـەن، نێ ئەم ژی [وەختـێ ئیزا و تۆفانـێ] كا چـاوا هویـن [ئەڤـرۆ] ترانەیـان ب مـە دکـەن، ئـەم ژی وەسـا دێ ترانەیـان ب هـەوە کەیـن. ﴿٣٩﴾ ڤێجـا نێزیـك هویـن دێ زانـن، كا ئیـزا دێ بـۆ کـێ ئێت كو وی ڕسـوا و شـەرمزار بکەت؟ و ئیزایـەكا هەروهـەر [کـو یـا ڕۆژا قیامەتێیە] ب سـەردا بێـت؟ ﴿٤٠﴾ و [نووحی گەمیـیا خۆ چێ دکـر، و ملەتێ وی د بـەردەوام بـوون د ترانەپێکرنا خـۆدا] هەتا وەختێ فەرمانـا مـە هاتـی، و ئیزایـا مـە ب سـەر وانـدا هاتی، و ئـاڤ د تەنویـرێ زایـی و هلاڤێتـی، مـە گۆتـە نووحی ژ هـەر نـێر و مێیەکـی [ژ جانەوەرێـت د ئەردیـدا] و کەس و کارێـت خـۆ، ئەو نەبـن ئەوێـت فەرمانا مـە ب ئیزادانا وان بـۆری، و ئــەوێت بـاوەری ئینایــین د گەمیــێدا بهەلگـرە و سـوارکە، و ژ هەژمـارەكا کێـم پێڤەتـر بـاوەری پـێ نەئینـا بـوو. ﴿٤١﴾ گـۆت [نووحـی گۆتـە هەڤالێـت خـۆ] ب ناڤـێ خـودێ سـواری گەمیـێ ببـن، و ناڤـێ خـودێ بینـن وەختێ گەمـی دچیـت و وەختێ ڕادوەسـتیت، ب ڕاسـتی خودایـێ مـن گونەهـ ژێبـەر و دلۆڤانە [ڤێجا نەترسـن، خودێ دێ هـەوە ڕزگارکەت].
﴿٤٢﴾ و گەمیـێ ئـەو د نـاڤ هنـدەك پێلانـدا دبـرن وەکـی چیایـان بـوون، و وی وەختـی نووحی گـازی کوڕێ خـۆ کـر، و کـوڕێ وی یـێ ژێ دویـر و ڤـەدەر بوو: کـوڕێ مـن، د گەل مە سـوار ببـە و نەمینە د گەل گـاوران و [ژ گـاوران نەبە ئەڤرۆ ئەو یــێت خەندقینـە]. ﴿٤٣﴾ کوڕێ وی گۆت: ئەز دێ خۆ دەمـە چیایەکی من ژ خەندقینێ بپارێزیـت، [نووحـی] گـۆت: ئەڤـرۆ [بـۆ کەسـێ] چـو پارێـزی بەرانبـەر فەرمانـا خـودێ نینـە، ئەو نەبیت یــێ خـودێ دلۆڤانـی پـێ بـری، [ئەڤـرۆ کـەس ژ ئیزایا خـودێ نائێتـە پارسـتن]، و پێلا ئاڤـێ کەڤتـە د ناڤبـەرا واندا، ڤێجـا ئـەو ژی بـوو ژ وان یــێت خەندقیـن. ﴿٤٤﴾ [پشـتی ملەتـێ نـووح پێغەمبـەر ب تۆفانێ چۆیـین، ژ بلی وان ئەوێـت د گەمیــێدا] فەرمـان هاتـەدان، ئـەردۆ ئاڤـا خۆ ڤەخـۆ، و ئەسمــانۆ تو ژی ئاڤا خـۆ ڕابگرە و بەسـکە، و ئـاڤ غـەوری، و فەرمانا خودێ ب جە هات [نووح و یــێت باوەری د گەل ئینایــین ڕزگار بوون و یــێت دی ب تۆفانـێ خەندقین]، و گەمی ل سـەر چیایــێ جوودی ڕاوەسـتیا [چیایەکە دکەڤیتە کوردستانا بن دەسـتێ تورکیا] و هاتـە گۆتـن [ملیاکەتـان گـۆت]: هیلاك و بنـبڕی بۆ ملەتـێ ستەمکار بیـت. ﴿٤٥﴾ و نووحی گازی خودایــێ خـۆ کـر و گـۆت: خودێـوۆ ب ڕاسـتی کـوڕێ مـن ژ مالا منـە، و ب ڕاسـتی پەیمانـا تە یا هەقـە [کـو دێ مالا من ڕزگـار کـەی]، و تـو ژ هەمی حاکـمان زانـا و دادپەروەرتری.

قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ
مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ٤٦
قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٌۖ وَإِلَّا
تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٤٧ قِيلَ يَٰنُوحُ
ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٖ مِّمَّن مَّعَكَۚ
وَأُمَمٞ سَنُمَتِّعُهُمۡ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ٤٨ تِلۡكَ
مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهَآ إِلَيۡكَۖ مَا كُنتَ تَعۡلَمُهَآ أَنتَ
وَلَا قَوۡمُكَ مِن قَبۡلِ هَٰذَاۖ فَٱصۡبِرۡۖ إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ ٤٩
وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ
إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۖ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا مُفۡتَرُونَ ٥٠ يَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ
أَجۡرًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِي فَطَرَنِيٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ٥١
وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ
عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ
مُجۡرِمِينَ ٥٢ قَالُواْ يَٰهُودُ مَا جِئۡتَنَا بِبَيِّنَةٖ وَمَا نَحۡنُ
بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوۡلِكَ وَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ٥٣



﴿٤٦﴾ [خودێ] گۆت: هەی نووح ب ڕاستی ئەو نە ژ مالا تەیە، ئەو کارەکی نەهاتییە [مەهدەرا تە بۆ کوڕێ تە کارەکی نە هێژا و لایقی تەیە]، ڤێجا پسیارا وی تشتی ژ من نەکە یێ تە ئاگەهـ ژێ نەیی، ب ڕاستی ئەز شیرەتان ل تە دکەم، دا تو ژ نەزانان نەبی. ﴿٤٧﴾ نووحی گۆت: خودێوۆ ب ڕاستی ئەز خۆ ب تە دپارێزم کو ئەز پسیار و داخوازا تشتەکی ژ تە بکەم من ئاگەهـ ژێ نەبیت، نەخۆ ئەگەر تو ل من نەبۆری و دلۆڤانییێ ب من نەبەی [ژ بەر ئەڤا من کری]، ب ڕاستی ئەز دێ ژ خوسارەتان بم. ﴿٤٨﴾ گۆتێ: هەی نووح، ب سلامەتی و ئێمناهییا مە پەیابە (داکەڤە)، و خێر و نیعمەتێت بەردەوام بۆ تە و ملەتێت د گەل تە [ملەتێت ژ دویندەها وان یێت د گەمییێدا]، و هندە ملەتان [ئەوێت بووینە گاور و هەر ژ دویندەها وان] دێ ژینەکا خۆش د دنیایێدا دەینە وان، پاشی ڕۆژا قیامەتێ ئیزایەکا ب ژان و دژوار، دێ ژ نك مە، وان هنگێڤیت. ﴿٤٩﴾ [هەی موحەمەد] ئەڤە [چیرۆکا نووح پێغەمبەرە] ژ سالۆخ و بەحسێت غەیبێنە، ب وەحی بۆ تە دهنێرین، بەری نوکە نە تە چو ژێ دزانی نە ملەتێ تە.. ڤێجا بێنا خۆ فرەهـ بکە، ب ڕاستی دویماهیکا باش بۆ پارێزکارانە. ﴿٥٠﴾ و مە بۆ ملەتێ عاد، برایێ وان هوود ب پێغەمبەری هنارت، گۆت: هەی ملەتێ من، خودێ بپەرێسن هەوە ژ وی پێڤەتر چو خودا و پەرستی نینن [ئەوێت هوین بۆ خودێ دکەنە هەڤپشك، ب ڤی کارێ خۆ] ژ درەوان پێڤەتر هوین ناکەن. ﴿٥١﴾ هەی ملەتێ من، ئەز بەرانبەری ڤێ ڕاگەهاندنێ و ڤان شیرەتان چو کرێ و هەقی ژ هەوە ناخوازم، هەقێ من بەس ل سەر ویە یێ ئەز دایم و چێکریم، ڤێجا ما هوین تێ ناگەهن. ﴿٥٢﴾ و هەی ملەتێ من، داخوازا گونەهـ ژێبرن و لێبۆرینێ ژ خودایێ خۆ بخوازن، پاشی ل خودێ بزڤڕن و تۆبە بکەن، دێ بارانێت بۆش ب سەر هەوەدا بارینیت، و دێ هێزێ ل سەر هێزا هەوە زێدەکەت، و پشتا خۆ نەدەنە گازییا ئەز ڕابەری هەوە دکەم، و ڕوییێ خۆ ژ هەقییێ وەرنەگێڕن و هوین گونەهکار. ﴿٥٣﴾ گۆتن: هەی هوود تە چو بەلگە و نیشانێت ئاشکەرا بۆ مە نەئینایینە [ل سەر ڕاستییا پێغەمبەراتییا خۆ]، دا ئەم باوەر ژ تە بکەین، و ئەم [ژ بەر ئاخڤتنا تە] دەست ژ پەرستییێت خۆ بەرنادەین و ناهێلین، و ئەم باوەرییێ ژی ب تە نائینین.

إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعۡتَرَىٰكَ بَعۡضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٖۗ قَالَ إِنِّيٓ أُشۡهِدُ ٱللَّهَ
وَٱشۡهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ٥٤ مِن دُونِهِۦۖ فَكِيدُونِي
جَمِيعٗا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ٥٥ إِنِّي تَوَكَّلۡتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمۚ مَّا مِن
دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٥٦
فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُم مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦٓ إِلَيۡكُمۡۚ وَيَسۡتَخۡلِفُ رَبِّي
قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَفِيظٞ ٥٧
وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا هُودٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا
وَنَجَّيۡنَٰهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٖ ٥٨ وَتِلۡكَ عَادٞۖ جَحَدُواْ بِـَٔايَٰتِ
رَبِّهِمۡ وَعَصَوۡاْ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٖ ٥٩ وَأُتۡبِعُواْ فِي
هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ عَادٗا كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا
بُعۡدٗا لِّعَادٖ قَوۡمِ هُودٖ ٦٠ ۞ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمۡ صَٰلِحٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ
ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ
وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا فَٱسۡتَغۡفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٞ مُّجِيبٞ ٦١
قَالُواْ يَٰصَٰلِحُ قَدۡ كُنتَ فِينَا مَرۡجُوّٗا قَبۡلَ هَٰذَآۖ أَتَنۡهَىٰنَآ أَن نَّعۡبُدَ
مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِي شَكّٖ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ ٦٢

ثلاثة أرباع الحزب ٢٣



﴿٥٤﴾ و ئەم ژ ڤێ ئاخفتنێ پێڤەتر نابێژینە تە [چونكی تو دژمناتییا پەرستییێت مە دكەی]، هندەك پەرستییێت مە تو یێ هنگاڤتی و زیانا گەهاندییە تە، و تو ڤان ئاخفتنان ژ دەڤ خۆ دبێژی، [هوودی] گۆت: ب ڕاستی ئەز خودێ دكەمە شاهد، و هوین ژی شاهد بن كو ب ڕاستی ئەز ژ وان یێت هوین ژ بلی خودێ بۆ خودێ دكەنە هەڤپشك، یێ بەریمە. ﴿٥٥﴾ ڤێجا هوین هەمی پێكڤە پیلان و ئۆیینان بۆ من بگێڕن، پاشی قەت مۆلەتێ نەدەنە من [بەلێ د گەل هندێ ژی چو ژ هەوە نائێت]. ﴿٥٦﴾ ب ڕاستی من پشتا خۆ ب خودێ گرێدا، ئەو خودایێ منە و خودایێ هەوەیە ژی، جاندارەك ل سەر ڕوییێ ئەردی نینە، ئەمرێ وی د دەست خودێدا نەبیت و د بن دەستهەلاتا ویڤە نەبیت، و ب ڕاستی خودایێ من د گەل هەقیێیە [و هەوە ل سەر من زال ناكەت]. ﴿٥٧﴾ ڤێجا ئەگەر هوین ڕوییێ خۆ ژ باوەرییێ وەرگێڕن، ب ڕاستی ئەوا ئەز پێ هاتیم، من گەهاندە هەوە [و ژ بەر ڤێ ڕاوەستیانا هەوە، خودێ دێ هەوە د هیلاك بەت]، و دێ ملەتەكێ دیتر ل شوینا هەوە ئینیت، و هوین چو زیانێ ژی ناگەهیننێ. ب ڕاستی خودایێ من پارێزڤانە ل سەر هەمی تشتان. ﴿٥٨﴾ ڤێجا وەختێ ئیزایا مە هاتی، مە هوود و یێت د گەل باوەری ئینایین ب ڕەحما خۆ رزگار كرن، و مە ئەو ژ ئیزایەكا گران و دژوار قورتالكرن.

﴿٥٩﴾ و ئەڤە عادن [ئانكو ئەڤە گۆڕ و شوینواریێت وانن، بەرێ خۆ بدەنێ كا چ ب سەرێ وان هات و ژ بەر چ؟] باوەری ب نیشان و ئایەت و موعجیزەییێت خودێ نەئینان، و نەگوهدارییا پێغەمبەرێت وی كر [یێ پێغەمبەرەكی درەوین بدانیت، وەیە هەچكو وی هەمی پێغەمبەر درەوین دانایین]، و ب دویڤ فەرمانا هەر خۆمەزنكەرەكێ زێدە خراب و هەق دژمن، كەڤتن. ﴿٦٠﴾ د ڤێ دنیاییدا و ڕۆژا قیامەتێ ژی لەعنەت ب دویڤ هاتینە ئێخستن، ملەتێ عاد باوەری ب خودایێ خۆ نەئینا، ڤێجا هیلاك بۆ عاد بن، ملەتێ هوودی.

﴿٦١﴾ و بۆ ملەتێ (سەموود)ی، مە برایێ وان صالح پێغەمبەر بۆ وان هنارت، گۆت: هەی ملەتێ من خودێ بپەرێسن، هەوە ژ وی پێڤەتر چو خودا و پەرستی نینن، ئەوی هوین یێت ژ ئاخێ چێكرین [بابێ هەوە ئادەم یێ ژ ئاخێ چێكری و هوین دویندەها وینە]، و هوین كرنە ئاڤاكەر و ئاكنجییێت ئەردی، ڤێجا داخوازا گونەهـ ژێبرنێ و لێبۆرینێ ژێ بكەن، پاشی لێ بزڤرن و تۆبە بكەن، ب ڕاستی خودایێ من یێ نێزیك و بەرسڤدەهە. ﴿٦٢﴾ گۆتن [ملەتێ وی گۆت]: هەی صالح ب ڕاستی تو بەری نوكە جهێ هیڤییا مە بوویی [كو تو ببییە سەروەرێ مە]، ئەرێ تو چاوا مە ژ پەرستنا وان پەرستییان ددەیە پاش، ئەوێت باب و باپیرێت مە پەرستنا وان دكر، و ب ڕاستی ئەم ب خۆ ژ وی تشتێ تو گازییا مە بۆ دكەی [كو پەرستنا خودێ ب تنێیە و هێلانا پەرستییێت مەیە] ب شك و دودلین.

قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي
مِنْهُ رَحْمَةً فَمَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُۥ فَمَا تَزِيدُونَنِي
غَيْرَ تَخْسِيرٍ ﴿٦٣﴾ وَيَٰقَوْمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً
فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِيٓ أَرْضِ ٱللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ
عَذَابٌ قَرِيبٌ ﴿٦٤﴾ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمْ
ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ ﴿٦٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا
نَجَّيْنَا صَٰلِحًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَمِنْ
خِزْيِ يَوْمِئِذٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْقَوِيُّ ٱلْعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ
ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾
كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَآ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمْ أَلَا
بُعْدًا لِّثَمُودَ ﴿٦٨﴾ وَلَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُواْ
سَلَٰمًا قَالَ سَلَٰمٌ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا رَءَآ
أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً
قَالُواْ لَا تَخَفْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٠﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ
فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾



﴿٦٣﴾ گۆت [صالح پێغەمبەر گۆت]: هەی ملەتێ
من بێژنە من، ئەگەر من نیشان و بەلگەیێت ئاشکەرا
ژ خودایێ خۆ هەبن [کو بۆ هەوە ئاشکەرا ببیت،
ئەز پێغەمبەرم]، و ڕەحم و دلۆڤانی ب من ربیت
[کو پێغەمبەراتی دابیتە من]، ڤێجا ئەگەر [پشتی ڤێ
خرێ] ئەز نەگوهدارییا وی بکەم، [و ب ڕاگەهاندنێ
ڕانەبم و د ڕێکا پەرستنا بوتاندا ڕانەوەستم] کی
دشێت بەرانبەری خودێ هاریکارییا من بکەت، و
ئیزایا وی ژ من بدەتە پاش، ڤێجا [ملەتێ من هوین ب
ڤێ ئاخڤتنا خۆ: (چاوا تو مە ژ پەرستنا وان پەرستییان
ددەیە پاش ئەوێت باب و باپیرێت مە پەرستنا وان
دکر)] هوین ژ زیانێ پێڤەتر چو ل من زێدە ناکەن.
﴿٦٤﴾ هەی ملەتێ من، ئەڤە حێشترا خودێیە بۆ هەوە
نیشان و موعجیزەیەکا ئاشکەرا، ڤێجا بهێلن د ئەردێ
خودێدا بچەریت و نەئێشینن و ئەزیەت نەدەن [بکوژن
یان ڤەکوژن]، دا ئیزا و ئاتافەکا نێزیك هەوە نەگریت.
﴿٦٥﴾ ڤێجا [وان گوهێ خۆ نەدا صالحی] حێشتر
کوشتن، ئینا صالحی گۆتە وان، سێ ڕۆژان ب شاهی
و کەیف، د مالێت خۆدا بژین، پاشی هوین دێ ئیزایا خودێ بینن، ب ڕاستی ئەڤە ژڤان و پەیمانەکا ڕاستە،
بێ درەوە. ﴿٦٦﴾ ڤێجا وەختێ ئیزایا مە هاتی، مە صالح و یێت باوەری د گەل ئینایین، ب ڕەحما خۆ ژ
ئیزا و شەرمزاری و ڕسواییا وێ ڕۆژێ ڕزگار کرن، ب ڕاستی خودایێ تە یێ ب هێز و دەستهەلاتدارە.
﴿٦٧﴾ ڤێجا دەنگەکێ ب هێز [ژ ئەسمانیڤە هات] ئەو هنگاڤتن، ڤێجا ئەو ل سەر چۆکان د خانییێت خۆدا
مرن، و بێ بزاڤ مان. ﴿٦٨﴾ [ئەڤە ب سەرێ وان هات و بێ سەروشوین بوون] هەروەکی ئەو ل وێرێ
ئاکنجی نەبوویین و چو ئاڤاهی ل جهێ وان نیەی، و ملەتێ (سەموود) باوەری ب خودایێ خۆ نەئینا، ڤێجا
هیلاك و دویری ژ دلۆڤانییا خودێ بۆ ملەتێ (سەموود). ﴿٦٩﴾ و ب ڕاستی هنارتییێت مە [کو ملیاکەتن]
ب مزگینیڤە هاتنە دەڤ ئیبراهیمی و گۆتن: ئەم سلاڤان ل تە دکەین، ئیبراهیمی گۆت: سلاڤ ل سەر
هەوە بن، ڤێجا گەلەك پێڤە نەچۆ هەتا ئیبراهیمی، گۆلکەکێ ل سەر بەران براشتی، بۆ ئینایی. ﴿٧٠﴾ ڤێجا
گاڤا ئیبراهیمی دیتی دەستێت وان ناگەهنێ [ئانکو دەستێت خۆ درێژ ناکەنە گۆشتێ گۆلکی بۆ خوارنێ]
نەنیاسین، و د دلێ خۆدا ژ وان ترسیا، ئینا ملیاکەتان گۆت: نەترسە ئەم بۆ ملەتێ (لووطی) یێت هاتینە
هنارتن. ﴿٧١﴾ و کابانییا ئیبراهیمی ژ پێڤە یا ڕاوەستیایی بوو، ئینا کەنی [ژ کەیفا نەمانا ترسا ئیبراهیم، یان
ژی ژ کەیفا هندێ کو ملەتێ (لووطی) دێ گەهیتە جزایێ خۆ]، ڤێجا مە مزگینی ب بوونا ئیسحاقی دایێ،
و مە مزگینی دایێ دێ ئیسحاقی کوڕەك هەبیت کو یەعقووبە.

قَالَتۡ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٞ وَهَٰذَا بَعۡلِي شَيۡخًاۖ إِنَّ هَٰذَا
لَشَيۡءٌ عَجِيبٞ ٧٢ قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ
وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ ٧٣ فَلَمَّا ذَهَبَ
عَنۡ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلرَّوۡعُ وَجَآءَتۡهُ ٱلۡبُشۡرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِي قَوۡمِ لُوطٍ ٧٤
إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٞ مُّنِيبٞ ٧٥ يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَآۖ إِنَّهُۥ
قَدۡ جَآءَ أَمۡرُ رَبِّكَۖ وَإِنَّهُمۡ ءَاتِيهِمۡ عَذَابٌ غَيۡرُ مَرۡدُودٖ ٧٦ وَلَمَّا
جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗا وَقَالَ هَٰذَا
يَوۡمٌ عَصِيبٞ ٧٧ وَجَآءَهُۥ قَوۡمُهُۥ يُهۡرَعُونَ إِلَيۡهِ وَمِن قَبۡلُ كَانُواْ
يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطۡهَرُ لَكُمۡۖ
فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخۡزُونِ فِي ضَيۡفِيٓۖ أَلَيۡسَ مِنكُمۡ رَجُلٞ رَّشِيدٞ ٧٨
قَالُواْ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنۡ حَقّٖ وَإِنَّكَ لَتَعۡلَمُ مَا نُرِيدُ ٧٩
قَالَ لَوۡ أَنَّ لِي بِكُمۡ قُوَّةً أَوۡ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكۡنٖ شَدِيدٖ ٨٠ قَالُواْ
يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَۖ فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ
مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٌ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا
مَآ أَصَابَهُمۡۚ إِنَّ مَوۡعِدَهُمُ ٱلصُّبۡحُۚ أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ ٨١





﴿٧٢﴾ [کابانیـــیا ئیبراهیمـی] گـۆت: وەیـلا ل من خۆلی سـەرێ ئـەزێ، مـن دێ بچویك بـن؟! و ئەز یـا پیرەژن، و ئەڤـە زەلامـێ منـە پیرەمـێرە، ب ڕاسـتی ئەڤە تشـتەكێ عەجێبـە. ﴿٧٣﴾ [ملیاكەتـان] گۆتـن: ئەرێ تـو ژ فەرمانا خـودێ عەجێبگرتـی دبی [چو تشـت ل دەڤ خودێ ب زەحمـەت نینـە، و هویـن مالـەكا مـال پێغەمبـەرن، دڤێت ئەڤـە ل هـەوە عەجێـب نەبیـت، ئەگەر تـو بزانـی ئەمرێ خودێیـە]، ئەڤـە دلۆڤانـی و بەرەكـەت و پیرۆزبایـــیا خودێیـە دایـــییە هـەوە خەلكـێ مـالا ئیبراهیمـی، ب ڕاسـتی ئـەو هێژایـی سوپاسیـــێیە و یـێ پایەبلنـدە. ﴿٧٤﴾ ڤێجـا وەختـێ ترسـا ئیبراهیمـی چۆیـی و مزگینی بـۆ هاتـی، دەسـت ب جڕەبـڕێ د گـەل هنارتیـــێت مـە كـر، د دەرهەقـێ ملەتـێ (لـووط) پێغەمبـەردا [بەلكـی ئیزایـــێ ل سـەر وان گیرۆ بكـەت]. ﴿٧٥﴾ [چونكی] ب ڕاسـتی ئیبراهیـم ژ وان بـوو ئەوێـت ل سـەرخۆ و نـەرم و حەلیـم و تۆبـەكار، و دل ب ئێـش ژ ترسـێت خودێدا. ﴿٧٦﴾ [ملیاكەتـان گۆتـە ئیبراهیمـی] هـەی ئیبراهیم ڤێ جڕەبـڕێ بهێلـە، فەرمانا خودایـــێ تـە ب ئیزادانـا وان یا هاتـی، ب ڕاسـتی ئیزایـەك دێ وان گریـت ڤەگرتـن بـۆ نینـە [نـە ب دوعایـان و نـە ب جڕەبـڕێ]. ﴿٧٧﴾ ڤێجـا وەختـێ هنارتیـــێت مـە [ل سـەر ڕەنگـێ مێڤانـان] هاتینـە دەڤ (لـووطی)، ب هاتنـا وان نەخـۆش بـوو و پـێ تەنگـاڤ بـوو [ترسـیا دەسـتدرێژی ل سـەر وان بێتەكـرن و ئەو مێڤانێـت وی]، و گۆت: ب ڕاسـتی ئەڤـە ڕۆژەكا گـران و ب بەلایـە. ﴿٧٨﴾ [وەختـێ ملەتـێ وی ب مێڤانێـت وی زانی] ملەتـێ وی ب لەز هاتنـە دەڤ (لووطی)، و بـەری هنگـی وان كرێتـی دكـرن [تالۆقەتـی زەلامـان دبـوون، ژ بـەر هنـدێ ب لـەز هاتـن، و ئەڤـە ب كرێتـی نەهاتـە بەرچاڤێـت وان، پـێ شـەرم بكـەن]، ئینـا (لـووطی) گۆتـە وان، هـەی ملەتـێ مـن ئەڤـە ژنكێـت هـەوە بۆ هـەوە ژ ڤـان مێڤانـان پاقژتـرن، ڤێجـا ژ خـودێ بترسـن و مـن د مێڤانێت مندا شـەرمزار نەكـەن، ئەرێ ما كەسـی تێگەهشـتی و ب ئاقـل د نـاڤ هـەوەدا نینـە؟! ﴿٧٩﴾ [ملەتێ وی] گۆتـن: تو دزانی دلـێ مە ناچیتـە ژنكێت مە، و ب ڕاسـتی تـو دزانـی كا مە چ دڤێـت! ﴿٨٠﴾ [(لووطی)] گـۆت: خۆزی من هێـزەك هەبایە، یان ژی پشـتەڤانەكێ ب هێـز مـن هەبایـە [هویـن دا بینـن كا ئەز دا چاوا هـەوە پاشـڤە بـەم]. ﴿٨١﴾ [ملیاكەتان] گۆتن: هـەی (لووط)، ب ڕاسـتی ئەم هنارتیـــێت خودایـــێ تەینە، ئەو نەشـێن دەسـتێ خـۆ بكەنە تە، ڤێجـا تو مرۆڤێت خـۆ د وەختەكێ شـەڤێدا ژ گونـدی دەربێخـە، و بـلا كـەس ژ هەوە ب پشـت خۆڤـە نەزڤڕیت، ژنـا تە تـێ نەبیت، ب ڕاسـتی ئەوا ب سـەرێ وان دئێـت دێ ب سـەرێ وێ ژی ئێـت، ب ڕاسـتی وەختـێ ئیزادانـا وان سـپێدەیە، ئەرێ ما سـپێدە یا نێزیـك نینە؟!

فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا جَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهَا
حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٖ مَّنضُودٖ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَۖ
وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٖ ﴿٨٣﴾ ۞ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ
شُعَيۡبٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ
وَلَا تَنقُصُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَۖ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيۡرٖ
وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ مُّحِيطٖ ﴿٨٤﴾ وَيَٰقَوۡمِ
أَوۡفُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ
أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ
ٱللَّهِ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم
بِحَفِيظٖ ﴿٨٦﴾ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ
مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ
لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ
عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ
أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ
مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾

الحزب ٢٤





﴿٨٢﴾ ڤێجا وەختێ ئیزایا مە هاتی، مە گوندێ وان سەروبن کر، و مە کەڤرێت ئاخێ ل دویڤ ئێك ب سەر واندا باراندن. ﴿٨٣﴾ ئەڤ کەڤرێت هەرییێ یێت ب نیشان بوون ژ بەرێ خودایێ تەڤە، و ئەڤ کەڤرە ژ ستەمکاران نەیێت دویرن [هەر ستەمکارەکێ هەبیت، ئەو بن یان قورەیشی، یان هەر ستەمکارەکێ دی]. ﴿٨٤﴾ و مە بۆ مەدیەنێ، برایێ وان شوعەیب هنارت، گۆت: هەی ملەتێ من خودێ بپەرێسن، ژ خودێ پێڤەتر هەوە چو خودا و پەرستی نینن، و پیڤان و کێشانێ کێم نەکەن، ئەز هەوە، هەیی و دەولەمەند دبینم. [و ئەگەر هوین دەست ژ کێمکرنا پیڤان و کێشانێ بەرنەدەن] ب ڕاستی ئەز ژ ئیزایا ڕۆژەکا ل هەوە وەرهاتی دترسم. ﴿٨٥﴾ و هەی ملەتێ من هوین ب دورستی پیڤان و کێشانێ [د کڕین و فرۆتنێت خۆدا] بکەن، و دادییێ تێدا بکەن، و تشتێت خەلکی [ب چو ڕێکان] ژێ کێم نەکەن، و د ئەردیدا نەگەڕن خرابییێ تێدا بکەن. ﴿٨٦﴾ ئەڤا بۆ هەوە ژ حەلالێ هەوە دمینیت بۆ هەوە چێترە [ژ وێ یا ب کێمکرنا کێشان و پیڤانێ دگەهیتە هەوە]، ئەگەر هوین ب ڕاستی خودان باوەر بن، و ئەز ب خۆ نەزێرەڤانم ل سەر هەوە [دا حسێبا هەوە بکەم، بەلێ ئەز بەس ئاگەهدارکەرم]. ﴿٨٧﴾ [ملەتێ وی] گۆتن: هەی شوعەیب، ئەرێ نڤێژێت تە ئەمرێ تە دکەن ئەم دەست ژ وان پەرستییان بەردەین ئەوێت باب و باپیرێت مە دپەرستن، یان ئەم ب کەیفا خۆ و وەکی مە دڤێت دەستکارییێ د مالێ خۆدا نەکەین [ژ دان و وەرگرتن و کێمکرن و زێدەکرنێ] ب ڕاستی تو مرۆڤەکێ نەرم و حەلیم و شارەزایی!! ﴿٨٨﴾ گۆت: هەی ملەتێ من کا بێژنە من، ئەرێ ئەگەر من نیشان و بەلگەیێت ئاشکەرا ژ خودایێ خۆ هەبن [ل سەر وی تشتێ ئەز داخوازا هەوە بۆ دکەم]، و ڕزقەکێ باش [کو پێغەمبەراتییە یان دەولەمەندییە] ژ دەڤ خۆ دابیتە من [ئەرێ ما ئەز دێ شیرەتکرنا هەوە هێلم، ئەگەر هوین شیرەتێ ژ من وەرنەگرن]، و من ب خۆ د بنیڕا نەڤێت ئەز هەوە ژ تشتەکی بدەمە پاش، و ئەز ب خۆ بکەم، ژ چاکخوازییێ پێڤەتر هندی بشێم من چو یێ دی بۆ هەوە نەڤێت [ژ ڤی تشتێ ئەز بۆ هەوە دبێژم]، و ب سەرهەلبوونا من بەس ب خودێیە، من پشتا خۆ پێ گرێدا، و د هەمی کاروبارێت خۆدا ئەز بەس ل وی دزڤڕم.

وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ
قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم
بِبَعِيدٖ ﴿٨٩﴾ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي
رَحِيمٞ وَدُودٞ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ مَا نَفۡقَهُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَقُولُ
وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفٗاۖ وَلَوۡلَا رَهۡطُكَ لَرَجَمۡنَٰكَۖ وَمَآ أَنتَ
عَلَيۡنَا بِعَزِيزٖ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَهۡطِيٓ أَعَزُّ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ
وَٱتَّخَذۡتُمُوهُ وَرَآءَكُمۡ ظِهۡرِيًّاۖ إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ
مُحِيطٞ ﴿٩٢﴾ وَيَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَٰمِلٞۖ
سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَمَنۡ هُوَ كَٰذِبٞۖ
وَٱرۡتَقِبُوٓاْ إِنِّي مَعَكُمۡ رَقِيبٞ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا
شُعَيۡبٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَأَخَذَتِ
ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾
كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّمَدۡيَنَ كَمَا بَعِدَتۡ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾
وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ
وَمَلَإِيْهِۦ فَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ فِرۡعَوۡنَۖ وَمَآ أَمۡرُ فِرۡعَوۡنَ بِرَشِيدٖ ﴿٩٧﴾



﴿٨٩﴾ هەی ملەتێ من بلا دژمنی و نەڤیانا هەوە بۆ من، هەوە بەر ب هندێڤە نەبەت، ئەو بێتە سەرێ هەوە یا ب سەرێ ملەتێ نووحی و ملەتێ هوودی و ملەتێ صالحی هاتی، و ملەتێ (لووطی) ژ هەوە نەییێ دویرە. ﴿٩٠﴾ و داخوازا گونەهـ ژێبرن و لێبۆرینێ ژ خودایێ خۆ بکەن، پاشی لێ بزڤرن و تۆبە بکەن، ب ڕاستی خودایێ من دلۆڤان و حەژێکەرە بۆ قەنجیکاران. ﴿٩١﴾ [ملەتێ وی] گۆتن: هەی شوعەیب، ئەم گەلەك ئاخفتنێت تو دبێژی تێ ناگەهین، و ب ڕاستی ئەم تە لاواز و بێ چارە د ناڤ خۆدا دبینین، و ئەگەر ل سەر خاترا عەشیرەتا تە نەبایە، دا تە ب بەران کوژین، و تو ب خۆ نە هندێ ب ڕێز و ڕویمەتی ل دەڤ مە، یان نە هندێ ب زەحمەتی. ﴿٩٢﴾ [شوعەیبی] گۆت: هەی ملەتێ من، ئەرێ عەشیرەتا من ل دەڤ هەوە ژ خودێ خۆشڤیتر و ب قەدرترە، و هەوە فەرمانا وی یا ب پشت گوهێ خۆڤە هاڤێتی، ب ڕاستی خودایێ من ب کارێ هوین دکەن زانایە، و چو ل بەر بەرزە نابیت. ﴿٩٣﴾ و هەی ملەتێ من، کا هوین ل سەر چ کارینە، بکەن، ئەز ژی دێ ل سەر کارێ خۆ بم، ڤێجا هوین دێ زانن کا ئیزا دێ بۆ کێ ئێت کو وی ڕسوا و شەرمزار بکەت، و کا کی درەوینە، ڤێجا چاڤەڕێ بن ئەز ژی د گەل هەوە چاڤەڕێمە. ﴿٩٤﴾ ڤێجا وەختێ ئیزایا مە هاتی، مە شوعەیب و ئەوێت باوەری د گەل ئینایین ب دلۆڤانیا خۆ رزگار کرن، و دەنگەکێ ب هێز ئەوێت ستەمکاری کرین گرتن و هنگاڤتن، ڤێجا ئەو ل سەر چۆکان د خانییێت خۆدا مرن و بێ بزاڤ مان. ﴿٩٥﴾ هەروەکی ئەو ل وێرێ نە د ئاکنجی، و وێرێ چوجا ئاڤا نەبوویی، ڤێجا هیلاك و دویری ژ دلۆڤانیا خودێ بۆ خەلکێ مەدیەنێ، هەروەکی (سەموود) ژ دلۆڤانیا خودێ دویرکەڤتی. ﴿٩٦﴾ و ب ڕاستی مە مووسا ب نیشان و موعجیزەیێت خۆ، و ب بەلگە و نیشانێت ئاشکەرا هنارت. ﴿٩٧﴾ بۆ فیرعەونی و گرەگرێت وی، بەلێ ئەو ل دویڤ فەرمانا فیرعەونی چۆن و گوهێ خۆ دانە وی، و فەرمانا فیرعەونی ب خۆ نەیا دورست بوو.

يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَۖ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ
ٱلْمَوْرُودُ ﴿٩٨﴾ وَأُتْبِعُواْ فِي هَٰذِهِۦ لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۚ بِئْسَ
ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ ﴿٩٩﴾ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَۖ
مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓاْ
أَنفُسَهُمْۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِي يَدْعُونَ مِن دُونِ
ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾
وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِيَ ظَٰلِمَةٌۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ
أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ ٱلْأٓخِرَةِۚ
ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴿١٠٣﴾
وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴿١٠٤﴾ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ
إِلَّا بِإِذْنِهِۦۚ فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ ﴿١٠٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُواْ فَفِي
ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ
وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾
۞ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِي ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ
ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۖ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ ﴿١٠٨﴾

ربع الحزب ٢٤



﴿٩٨﴾ [فیرعەون] دێ رۆژا قیامەتێ کەڤیتە پێشییا
ملەتێ خۆ، و دێ وان بەتە ناڤ ئاگری، و چ پیسە
جهە، ئاگر جهێ مرۆڤی بیت. ﴿٩٩﴾ و ئەو د ڤێ
دنیایێدا و رۆژا قیامەتێ ژی هاتنە دویرئێخستن ژ
دلۆڤانییا خودێ، و چ دانەکا خرابە هاتییە دان بۆ
وان [کو د دنیایێ و ئاخرەتێدا هاتینە دویرئێخستن ژ
دلۆڤانییا خودێ]. ﴿١٠٠﴾ و ئەڤە بەحس و خەبەرێت
گوندانە ئەم بۆ تە ڤەدگێرین، هندەك ژ وان گوندان
یێت ماین، و هندەك ژێ بێ سەروشوینن.
﴿١٠١﴾ و مە ستەم ل وان نەکرییە [وەختێ مە ئەو ژ
بەر کریارێت وان ئیزا داین] بەلێ وان ب خۆ ستەم
ل خۆ کر [ب گاوری و گونەهێت بووینە ئەگەرێ
تێچۆنا وان]، ڤێجا وەختێ فەرمانا خودایێ تە هاتی
[ب ئیزادانا وان]، بوت و پەرستییێت وان ئەوێت
وان ژ بلی خودێ هەوار دکرنێ و دپەرستن فایدەیێ
وان نەدا، و ئیزا ژ وان نەدا پاش، و ژ زیانێ و هیلاکێ
پێڤەتر سەنەمێت وان چو یێ دی ل وان زێدە نەکر.
﴿١٠٢﴾ و هۆسا ئیزادانا خودایێ تە، خەلکێ وان
گوندان دگریت وەختێ ئەو ستەمکار، ب راستی ئیزادانا خودایێ تە زێدە ب ژان و گرانە. ﴿١٠٣﴾ ب راستی
ئەڤە [سەرهاتییێت بۆرین] نیشان و دەرسن بۆ وان ئەوێت ژ ئیزایا رۆژا قیامەتێ دترسن، و ئەو رۆژەکە هەمی
مرۆڤ دێ بۆ ئێنە کۆمکرن و دێ بینن. ﴿١٠٤﴾ و ئەم [وێ رۆژێ] گیرۆ ناکەین، و ب پاش نائێخین، ئەگەر
بۆ رۆژەکا دیارکری نەبیت. ﴿١٠٥﴾ رۆژا دئێت کەس نائاخڤیت ب دەسویرا خودێ نەبیت، ڤێجا هندەك ژ وان
بەخت رەش و بەرئیزانە، و هندەك ژێ بەختەوەر و کەیفخۆشن. ﴿١٠٦﴾ ڤێجا هندی ئەون ئەوێت بەخت رەش
بووین، ئەو د ئاگریدانە، و وان تێدا بێن بەردان و بێن هلکێشانەکا ب کول و کۆڤان هەیە. ﴿١٠٧﴾ و هەروهەر
دێ تێدا بن، هندی ئەرد و ئەسمان هەبن [ئەرد و ئەسمانێت قیامەتێ]، ژ بلی گونەهکارێت موسلمانان، تەمەت
گونەهێت خۆ دێ ئیزایێ خۆن، و ب حەزکرنا خودێ دێ ژێ دەرکەڤن، ب راستی خودایێ تە چ یا بڤێت
دێ کەت. ﴿١٠٨﴾ و هندی ئەون ئەوێت بەختەوەر بووین د بەحەشتێدانە، هەروهەر دێ تێدا بن، هندی ئەرد
و ئەسمان هەبن، ژ بلی هندێ ئەگەر خودێ بڤێت وان دەربێخیت، و ئەڤە خەلاتەکێ بێ ڤەبڕ و بێ دویماهیکە.

فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰٓؤُلَآءِۚ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ
ءَابَآؤُهُم مِّن قَبْلُۚ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ١٠٩
وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ
سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْۚ وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ١١٠
وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَٰلَهُمْۚ إِنَّهُۥ بِمَا يَعْمَلُونَ
خَبِيرٌ ١١١ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْاْۚ
إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ١١٢ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ
فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ
لَا تُنصَرُونَ ١١٣ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ
ٱلَّيْلِۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ
لِلذَّٰكِرِينَ ١١٤ وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ١١٥
فَلَوْلَا كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُوْلُواْ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ
عَنِ ٱلْفَسَادِ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْۗ وَٱتَّبَعَ
ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَآ أُتْرِفُواْ فِيهِ وَكَانُواْ مُجْرِمِينَ ١١٦ وَمَا
كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ١١٧



﴿١٠٩﴾ [هەی موحەمەد] ڤێجا تو ژ پویچیا پەرستنا وان ب گۆمان نەبە، ئەڤە هەر وان دپەرێسن ئەوێت باب و باپیرێت وان بەری نوکە دپەرستن، و ب ڕاستی ئەم دێ هەقێ وان و بارا وان ژ ئیزایێ بێ کێماسی دەینە وان. ﴿١١٠﴾ و ب ڕاستی مە تەورات بۆ مووسایی ئینا و دایێ، پاشی ملەتێ وی ل سەر ڤێ کتێبێ ژێك جودابوون [هندەکان باوەری پێ ئینا، و هندەکان باوەری پێ نەئینا]، و ئەگەر پەیمانا پاشئێخستنا ئیزایا وان [بۆ ڕۆژا قیامەتێ] ژ خودایێ تە نەبایە، دا حوکمی د ناڤبەرا واندا کەت، و ب ڕاستی ئەوێت تە درەوین ددانن، د ڕاستا ڤێ قورئانێدا یان د ڕاستا ئیزایێدا ب گۆمانن. ﴿١١١﴾ و ب ڕاستی خودایێ تە بێ کێم و کاسی جزایێ کار و کریارێت هەر کەسەکی ددەت، ب ڕاستی خودایێ تە ب کارێ ئەو دکەن ئاگەهدار و شارەزایە. ﴿١١٢﴾ ڤێجا ڕێکا خودێ بگرە و خۆ سەرڕاست بکە، هەروەکی ئەمرێ تە و ئەوێت تۆبەکرین د گەل تە هاتییە کرن، و نەدەنە سەر تخوبێت خودێ، و ب ڕاستی ئەو ب کار و کریارێت هوین دکەن بینەرە. ﴿١١٣﴾ و ب چو ڕەنگان مەیلا ستەمکاران نەکەن، ئەگەر ئاگر دێ هەوە هنگێڤیت [و دێ د ئاگرێ واندا سوژن]. و هەوە ژ خودێ پێڤە چو پشتەڤان نینن، و هاریکاریا هەوە ژی نائێتە کرن. ﴿١١٤﴾ [هەی موحەمەد] تو د هەردو ڕەخێت ڕۆژێدا [سپێدێ و ئێڤاری] و پشکەکێ ژ شەڤێ، نڤێژێ بکە، ب ڕاستی خێر و چاکی گونەهان پویچ دکەن، و ئەڤە دەرس و چامەیە بۆ وی یێ پێڤە بچیت. ﴿١١٥﴾ و بێنا خۆ فرەه بکە [ل سەر وێ خۆڕاگرتنا ئەمرێ تە پێ هاتییە کرن، و مەیل نەگرتنا ستەمکاران و کرنا نڤێژان]، ب ڕاستی خودێ خەلاتێ قەنجیکاران بەرزە ناکەت. ﴿١١٦﴾ بلا چەرخێت بەری هەوە زانایێت خودان هزر و ئەقل و ب دین بانە، و نەهیبا خرابییێ د ئەردیدا کربانە، دا مە هەمی ب بەر ئیزایێ نەئێخستبانە، بەلێ کێمەك ژ وان ئەو بوون ئەوێت زانا و خودان هزر و ئەقل و دین، و نەهیبا خرابییێ دکرن، و ئەو ئەو بوون ئەوێت مە ڕزگار کرین، و هندی ئەوێت ستەمکار بوون، ب دویڤ وێ خۆشییێ کەڤتن یا تێدا، و ئەو یێت گونەهکار بوون. ﴿١١٧﴾ و خودایێ تە نەئەو بوو یێ گوند ب ستەم و نەهەقی د هیلاك بربانە، و خەلکێ وان ب خۆ یێ قەنجیکار.

وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾
إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ
لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾ وَكُلًّا نَّقُصُّ
عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءَكَ فِي هَٰذِهِ
الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ
اعْمَلُوا عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَامِلُونَ ﴿١٢١﴾ وَانتَظِرُوا إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٢٢﴾
وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الْأَمْرُ كُلُّهُ
فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾

سُورَةُ يُوسُفَ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ ﴿١﴾ إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا
عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢﴾ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ
الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَٰذَا الْقُرْآنَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ
لَمِنَ الْغَافِلِينَ ﴿٣﴾ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ
أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ ﴿٤﴾



﴿١١٨﴾ و ئەگـەر خودایـێ تە ڤیابایە [جودایـی نەبایە]، دا
هەمـی مرۆڤـان کەتە ئێـك ملەت، و ل سـەر ئێـك ڕێکێ
کـۆم کـەت [وەکـی ملیاکەتـان]، و [مـرۆڤ] بـەردەوام
دێ د ژێـك جـودا بـن [هـەر ئێـك ل دویـڤ دلـێ خـۆ
دێ ڕێـکا خـۆ بـۆ خـۆ هەلبژێریـت]. ﴿١١٩﴾ ئـەو نەبیت
یـێ خـودێ دلۆڤانـی پـێ بـری [کـو ئـەو ژی ئەهلـێ
سـوننەتێ و جەماعەتێنـە]، و ژ بەر هندێ [دا دلۆڤانیـێ
پـێ ببـەت] یـێت دایـین، و فەرمانا خودایـێ تـە بۆری
[ئـەوا دبێژیـت] ب ڕاسـتی ئـەز دێ جەهنەمـێ ژ مرۆڤ
و ئەجنەیـان تـژی کـەم. ﴿١٢٠﴾ و هەمـی دەنگ و باسـێت
پێغەمبـەران بـۆ تـە ڤەدگێڕیـن [ب چیرۆك دبێژیـن]، دا
دلـێ تـە پـێ موکـوم بکەیـن، و د ڤـێ سـۆرەتێدا، هەقی،
بـۆ تـە هـات [کـو چیرۆکێـت پێغەمبەرانـن، و کا چ ب
سـەرێ وان هـات] و چامـە و شـیرەت و بیرئینانـە، بـۆ
خودان بـاوەران. ﴿١٢١﴾ و [هەی موحەمـەد] بێژە ئەوێت
باوەریـێ نەئینـن: ل سـەر کارێ خـۆ بـن، و ل سـەر
ڕێـکا خـۆ بمینـن، ئـەم ژی ل سـەر کار و ڕێـکا خۆینـە.
﴿١٢٢﴾ و چاڤـەڕێ بـن ب ڕاسـتی ئـەم ژی چاڤەڕێینـە
[و دێ هویـن زانـن کا دویماهیـك بـۆ کێیـە؟]. ﴿١٢٣﴾ و زانینـا غەیبـا ئـەرد و ئەسمانان ل دەڤ خودێیـە، و هەمـی
کاروبـار دێ ب بـال ویڤـە زڤـڕن، ڤێجـا وی بپەرێسـە و خـۆ هلپەسێرە وی، و پشـتا خـۆ ب وی گـرێ بـدە، و
خودایـێ تـە ژ کار و کریارێـت هویـن دکـەن نەیـێ بـێ ئاگەهە.

## سۆرەتا یووسف

### ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (١١١) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ هۆسـا دئێتـە خوانـدن ئەلف، لام، ڕا، ئەڤە سـێ تیپـن ژ (٢٨) تیپێت زمانێ عەرەبی، نیشـانن ل سـەر ئیعجازا
ڤـێ قورئانـێ کـو عەرەبـان پـێ چـێ نابیـت قورئانەکا وەکـی ڤـێ بدانـن، هەرچەنـدە زمانـێ وان ژ عەینـی تیپان
پێکهاتییـە و ئەڤـە ئایەتێـت قورئانـا ڕۆنکەرن. ﴿٢﴾ ب ڕاسـتی مە ئـەڤ قورئانـە ب زمانێ عەرەبی ئینـا خوارێ،
دا هویـن تـێ بگەهـن. ﴿٣﴾ ئـەم باشـترین چیرۆك و سەرهاتییـان [یـێت ملەتێت بەرێ] بـۆ تـە ڤەدگێڕین، ب
ڕێـکا وەحییـا مـە بۆ تـە ئینایی ژ ڤـێ قورئانێ، هەرچەنـدە بەری ئـەڤ قورئانە بۆ تە بهێـت، تو ژێ ژ بـێ ئاگەهان
بوویـی [ژ چیرۆکا یووسـفی و چیرۆکێت دی ژی]. ﴿٤﴾ وەختێ یووسـفی گۆتییـە بابێ خۆ: بابـۆ.. من د خەونا
خـۆدا ددیـت یـازدە سـتێر و ڕۆژ و هەیڤ بۆ مـن د سوجدەیـێدا بوون.

قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًاۖ
إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٥ وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ
رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ
وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعۡقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيۡكَ مِن قَبۡلُ إِبۡرَٰهِيمَ
وَإِسۡحَٰقَۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦ ۞ لَّقَدۡ كَانَ فِي يُوسُفَ
نصف الحزب ٢٤
وَإِخۡوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٞ لِّلسَّآئِلِينَ ٧ إِذۡ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ
إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ٨
ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا يَخۡلُ لَكُمۡ وَجۡهُ أَبِيكُمۡ
وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ قَوۡمٗا صَٰلِحِينَ ٩ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ
لَا تَقۡتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلۡقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ يَلۡتَقِطۡهُ بَعۡضُ
ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ١٠ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۬نَّا عَلَىٰ
يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ١١ أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ
وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ١٢ قَالَ إِنِّي لَيَحۡزُنُنِيٓ أَن تَذۡهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ
أَن يَأۡكُلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَأَنتُمۡ عَنۡهُ غَٰفِلُونَ ١٣ قَالُواْ لَئِنۡ
أَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّآ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ١٤



﴿٥﴾ [بابێ وی] گۆت: کورێ من، خەونا خۆ بۆ برایێت خۆ نەبێژە، ئەگەر [تو خەونا خۆ بۆ وان بێژی] دێ پیلانان بۆ تە دانن، ب ڕاستی شەیتان بۆ مرۆڤی دژمنەکێ ئاشکەرایە [دێ حەسویدییێ ئێخیتە د دلێ واندا، و وان د بەر دژمنایییا تەرا کەت]. ﴿٦﴾ هۆسا خودایێ تە، تە هەلدبژێریت و ڕاڤەکرنا خەونان نیشا تە ددەت، و نیعمەتا خۆ ل سەر تە و مالا یەعقووب تەمام دکەت هەروەکی بەری نوکە ل سەر هەردو بابێت تە، ئیبراهیم و ئیسحاقی تەمامکری، ب ڕاستی خودایێ تە یێ زانا و کاربنەجهە. ﴿٧﴾ ب ڕاستی بۆ پسیارکەران ژ جوهییان بەلگە و نیشان [ل سەر ڕاستییا پێغەمبەراتییا تە] و بۆ مرۆڤان چامە و عیبرەت یێت د چیرۆکا یووسف و برایێت ویدا هەین. ﴿٨﴾ وەختێ برایێت یووسفی گۆتین: یووسف و برایێ خۆ ژ مە خۆشڤیترن ل دەڤ بابێ مە، و ئەم ب خۆ کۆمەکین، ب ڕاستی بابێ مە یێ د خەلەتییەکا ئاشکەرادا [وەختێ ئەو پتر حەژ یووسف و برایێ وی دکەت، و وان ب سەر مە دئێخیت]. ﴿٩﴾ [برایێت وی گۆتن:] یووسفی بکوژن، یان ژی باڤێژنە ئەردەکێ دویر [کو نەشێت بزڤریت] بابێ هەوە دێ بۆ هەوە ب تنێ مینیت، و پشتی ڤێ گونەهێ [تۆبە بکەن]، و ببنە مرۆڤێت قەنجیکار. ﴿١٠﴾ ئێك ژ وان گۆت: یووسفی نەکوژن، و ئەگەر هەوە بڤێت تشتەکی ب سەری بینن باڤێژنە د تارییا بنێ بیرێدا، هندەك کاروانی دێ هەلگرن [و د گەل خۆ دێ بەنە جهەکێ دویر کو ژ بابێ خۆ بەرزە ببیت]. ﴿١١﴾ [پشتی نەخشە کێشایین و ئێك دەنگ بوویین ل سەر پیلان و ئۆیینا خۆ، دەست ب پێنگاڤێت ب کار کرن، و هاتنە دەڤ بابێ خۆ] گۆتن: بابۆ.. بۆچی باوەرییا تە ل سەر یووسفی ب مە نائێت، و ب ڕاستی مە خێرا وی دڤێت، و ئەم بۆ وی دلسۆزین. ﴿١٢﴾ سوبەهی د گەل مە بهنێرە، دا تێر فێقی بخۆت و تێر یارییان بکەت، و ب ڕاستی ئەم بۆ وی پارێزڤانین. ﴿١٣﴾ [یەعقووبێ بابێ یووسفی] گۆت: ب ڕاستی بێنا من نائێت، و دێ ب خەم کەڤم هوین وی ببەن، و ئەز دترسم هەوە های ژێ نە، گورگ وی بخۆت. ﴿١٤﴾ گۆتن: ئەگەر گورگ وی بخۆت، و ئەم ب خۆ کۆمەکا ب هێز، هنگی ئەمین یێت خوسارەت.

فَلَمَّا ذَهَبُوا۟ بِهِۦ وَأَجْمَعُوٓا۟ أَن يَجْعَلُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ ۚ وَأَوْحَيْنَآ
إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٥﴾ وَجَآءُوٓ
أَبَاهُمْ عِشَآءً يَبْكُونَ ﴿١٦﴾ قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ
وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ ۖ وَمَآ أَنتَ
بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ
بِدَمٍ كَذِبٍ ۚ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ
وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتْ سَيَّارَةٌ
فَأَرْسَلُوا۟ وَارِدَهُمْ فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُۥ ۖ قَالَ يَٰبُشْرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٌ ۚ وَأَسَرُّوهُ
بِضَٰعَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ
دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَالَ
ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ
أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى
ٱلْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ
أَمْرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢١﴾ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ
ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٢﴾





﴿١٥﴾ ڤێجا وەختێ وان ئەو د گەل خۆ بری، هەمیان
خۆ کرنە ئێك وی بێخنە د بنێ بیرێدا [و وەختێ وان
ئەڤ نەخشەیە بۆ دگێڕا، و کار دکر باڤێژنە د بیرێدا]،
مە وەحی بۆ یووسفی هنارت، دێ ڤی کارێ وان بۆ
وان بێژی، و وان های ژ خۆ نە. ﴿١٦﴾ و ب شەڤ
هاتنە دەڤ بابێ خۆ و دکرنە گری. ﴿١٧﴾ گۆتن: ب
ڕاستی ئەم چۆبوویین مە بەریکانە دکر، و مە یووسف
هێلابوو ل دەڤ تشتێت خۆ، و گورگی ئەو خوار، و
تو قەت ژ مە باوەر ناکەی، خۆ ئەگەر ئەم د ڕاستگۆ
ژی بین. ﴿١٨﴾ و خوینەکا ژ درەو ل قەمیسێ وی
دابوون [و قەمیسێ ب خوینڤە بۆ بابێ خۆ ئینان، دا
باوەر ژ وان بکەت کو گورگی یووسف یێ خواری].
یەعقووبی گۆت: [نەخێر وەنینە چو گورگان یووسف
نەخوارییە، و ئەڤە خوینەکا ژ درەوە هەوە ل قەمیسێ
وی دایی] بەلێ دلخوازیا هەوە کارەکێ مەزن د
دەرهەقێ یووسفیدا بۆ هەوە خەملاندییە، و ل بەر
هەوە ب ساناهی ئێخستییە، ڤێجا بێنفرەهیا من
بێنفرەهییەکا جوانە، گازندە تێدا بەس بۆ خودێیە، و
ئەز هاریکارییێ ژ خودێ دخوازم ل سەر ڤێ یا هوین دبێژن. ﴿١٩﴾ و کاروانەك هات [ل سەر وێ بیرێ
دانا] و ئاڤگێڕێ خۆ هنارتن [دا بۆ وان ئاڤێ ژ بیرێ هەلکێشیت]، ڤێجا وی ژی سەتلا خۆ داهێلا بیرێ
[یووسفی خۆ ب سەتلکێ و وەریسیڤە گرت و پێ دەرکەفت] ئینا گۆت: وەی ڤێ مزگینییێ، ئەڤە لاوەکە،
و ئاڤگێڕان یووسف ژ هەڤالێت خۆ ڤەشارت و نەگۆتە وان مە یێ ژ بیرێ ئینایییە دەر، و بۆ فرۆتنێ د
گەل خۆ برن، و خودێ ب خۆ ب ئەوا ئەو دکەن [برایێت یووسفی و یێ ئەو کڕی] ب ئاگەهـ و زانایە.
﴿٢٠﴾ و برایێت وی ئەو ب بهایەکێ کێم، ب چەند دەرهەمەکان فرۆتە وان، ل دەڤ وان هند یێ ب بها نەبوو
[و هند دل ل سەر نەبوون، لەوا ب بهایەکێ کێم فرۆتن]. ﴿٢١﴾ و ئەوێ یووسف ل مسرێ کڕی گۆتە ژنا
خۆ: قەدرێ وی بگرە، و جهێ وی خۆش بکە، بەلکی ب کێر مە بهێت یان ژی بکەینە کوڕێ خۆ، و هۆسا
[مە ئەو ژ برایێت وی ڕزگارکر و ژ بیرێ ئینا دەرێ و برە د مالەکا زەنگیندا کو حەژێ بکەن، و حسێب بکەن
کوڕێ خۆ] مە ئەو خۆجە کر د ئەردێ مسرێدا [و بوو خودانێ ئەمر و نەهییان]، و دا ڕاڤەکرنا خەونان نیشا
بدەین و خودێ ل سەر کارێ خۆ یێ زالە [ئانکو چاوا بڤێت دێ وەسا کەت]، بەلێ باراپتر ژ خەلکی ڤێ
نوزانن. ﴿٢٢﴾ ڤێجا وەختێ یووسف گەهشتییە کاملانا خۆ [ژ ئەقلی و هێزێڤە]، مە پێغەمبەراتی و زانین
دایێ، و هۆسا ئەم قەنجیکاران خەلات دکەین.

وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ
وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ
إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا
لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ
وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٢٤﴾ وَٱسۡتَبَقَا
ٱلۡبَابَ وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ
قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ
أَلِيمٞ ﴿٢٥﴾ قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ
أَهۡلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ
ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ فَكَذَبَتۡ وَهُوَ
مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ قَالَ إِنَّهُۥ
مِن كَيۡدِكُنَّۖ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ ﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ
هَٰذَاۚ وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ ﴿٢٩﴾
۞ وَقَالَ نِسۡوَةٞ فِي ٱلۡمَدِينَةِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا
عَن نَّفۡسِهِۦۖ قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّاۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٢٤



﴿٢٣﴾ و ئەوا يووسف د مالا ويدا [كابانيا سەروەرێ مسرێ] بۆ دەستێڤەدانا خۆ [بۆ نڤينا خۆ] ب فندوفێل داخوازا يووسف كر، و دەرگەهـ هەمی گرتن، و گۆتە يووسف: دێ ب لەز پێشڤە وەرە [يووسفی] گۆت: ئەز خۆ ب خودێ دپارێزم ژ وی تشتێ تو ژ من دخوازی، ب ڕاستی مالخۆيێ مالێ [سەروەرێ مسرێ] سەروەرێ منە، وی قەنجی يێت د گەل من كرين و جهێ من يێ خۆشكری، ب ڕاستی خودێ خائين و ستەمكاران سەرفەراز ناكەت. ﴿٢٤﴾ ب ڕاستی وێ ئەو كرە د دلێ خۆدا و قەستا وی كر، و ئەگەر يووسف ژی نيشان و بەلگەيێت خودايێ خۆ نەديتبان، دا كەتە دلێ خۆ دربەكی دانيتێ، يان دا بەر ب وێڤە چيت، وەسا مە نيشانا خودايێ وی نيشادا، دا خيانەت و دەهمەنپيسييێ ژێ بدەينە پاش، ب ڕاستی ئەو ژ بەندەيێت مە يێت هەلبژاتيیە. ﴿٢٥﴾ و هەردو بەزينە دەرگەهی [يووسفی دڤيا دەرگەهی ڤەكەت و برەڤيت، و ژنا سەروەری دڤيا د بەرڕا بكەت، دا نەهێليت دەركەڤيت]، و قەميسێ وی ژ پشتێڤە گرت و كێشا و دراند، و هەردووكان زەلامێ ژنێ د دەرگەهيدا ديت، ئينا ژنێ گۆت: جزايێ وی كەسی چيە يێ خرابی بۆ مالا تە بڤێت و خيانەتێ ل تە بكەت، ژ هندێ پێڤەتر بێتە زيندانكرن يان ب ئيزايەكا دژوار بێتە ئيزادان. ﴿٢٦﴾ [يووسف] گۆت: وێ ب خورتی ئەز داخوازكرمە دەڤ خۆ [ئەز ژ بەر وێ ڕەڤيم دا دەركەڤم، تو هاتيیە د دەرگەهيدا] و د وی وەختيدا شاهدەكی ژ مالا وێ شادەيی دا [و گۆت]: ئەگەر قەميسێ وی [يێ يووسفی] ژ بەرڤە دڕيابيت، ژنا تە ڕاست دبێژيت، و ئەو [يووسف] ژ درەوينانە. ﴿٢٧﴾ و ئەگەر قەميسێ يووسف ژ پشتڤە دڕيابيت [ئەوێ] درەو كر و [يووسف] ژ ڕاستگۆيانە. ﴿٢٨﴾ ڤێجا وەختێ ديتی قەميسێ وی ژ پشتێڤە يێ هاتيیە دڕاندن، ئينا گۆت: ب ڕاستی ئەڤە ژ فندوفێلێت هەوەنە، ب ڕاستی فندوفێلێت هەوە ژنان د مەزنن. ﴿٢٩﴾ [زەلامێ ژنێ (سەروەرێ مسرێ)] گۆت: هەی يووسف چاڤێ خۆ ژ ڤی تشتی بگرە، و بۆ كەسێ نەبێژە و [گۆتە ژنێ] تو ژی داخوازا لێبۆرينێ ژ گونەها خۆ بكە، ب ڕاستی تو ژ مرۆڤێت خەلەت بوويی. ﴿٣٠﴾ و كۆمەكا ژنان د باژێريدا گۆتن: ژنا سەروەرێ مسرێ بەردەستكێ خۆ داخواز دكەتە دەڤ خۆ، ب ڕاستی ڤيانا وی پەردەيا دلێ وێ هنگاڤتيیە، ب ڕاستی ئەم وێ د خەلەتيیەكا ئاشكەرادا دبينين.

فَلَمَّا سَمِعَتۡ بِمَكۡرِهِنَّ أَرۡسَلَتۡ إِلَيۡهِنَّ وَأَعۡتَدَتۡ لَهُنَّ مُتَّكَـٔٗا
وَءَاتَتۡ كُلَّ وَٰحِدَةٖ مِّنۡهُنَّ سِكِّينٗا وَقَالَتِ ٱخۡرُجۡ عَلَيۡهِنَّۖ فَلَمَّا رَأَيۡنَهُۥٓ
أَكۡبَرۡنَهُۥ وَقَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّ وَقُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنۡ هَٰذَآ
إِلَّا مَلَكٞ كَرِيمٞ ٣١ قَالَتۡ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِي لُمۡتُنَّنِي فِيهِۖ وَلَقَدۡ رَٰوَدتُّهُۥ
عَن نَّفۡسِهِۦ فَٱسۡتَعۡصَمَۖ وَلَئِن لَّمۡ يَفۡعَلۡ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسۡجَنَنَّ
وَلَيَكُونٗا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ٣٢ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ
إِلَيۡهِۖ وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ٣٣
فَٱسۡتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنۡهُ كَيۡدَهُنَّۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ
ٱلۡعَلِيمُ ٣٤ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا رَأَوُاْ ٱلۡأٓيَٰتِ لَيَسۡجُنُنَّهُۥ
حَتَّىٰ حِينٖ ٣٥ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجۡنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ
أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي
خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ
ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٣٦ قَالَ لَا يَأۡتِيكُمَا طَعَامٞ تُرۡزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأۡتُكُمَا
بِتَأۡوِيلِهِۦ قَبۡلَ أَن يَأۡتِيَكُمَاۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ إِنِّي تَرَكۡتُ
مِلَّةَ قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ٣٧





﴿٣١﴾ ڤێجا وەختێ [ژنا سەروەری] نەکامیا وان
بهیستی، هنارتە دویڤ وانرا، و بالگەهـ بۆ ئامادەکرن،
و هەر ئێکێ کێرەك بۆ ئینا و داڤێ، ئینا گۆتە یووسف:
دەرکەڤە ناڤ وان [خۆ نیشا وان بدە]، ڤێجا وەختێ
چاڤێ وان ب یووسفی کەڤتی، مەزن و بێ نموونە
دانان [های ژ خۆ نەمان]، و دەستێت خۆ برین
و گۆتن: حاشای خودێ ئەڤە مرۆڤ بیت، ئەڤە
ژ ملیاکەتەکێ ب رێز و خودان قەدر پێڤەتر نینە.
﴿٣٢﴾ [ئینا ژنا سەروەرێ مسرێ] گۆت: ئەها ئەڤە
بوو یا هەوە بۆ من دکرە کێماسی و ئەز پێ لۆمەدار
دکرم، و ب راستی من ئەو یێ داخوازکریە دەڤ خۆ،
و خۆ دا پاش و خۆ ئاسێ کر، و ئەگەر ئەو تشتێ ئەز
ژێ دخوازم نەکەت، بێ گۆمان دێ ئێتە زیندانکرن، و
دێ بیتە ژ وان ئەوێت رسوا و رەزیل. ﴿٣٣﴾ یووسفی
گۆت: خودێوۆ، من زیندان پێ خۆشترە ژ وێ یا ئەو
داخوازا من بۆ دکەن، و ئەگەر تو فندوفێلێت وان ژ
من نەدەیە پاش، دێ ب نك وانڤە چم، و دێ بمە ژ
نەزانان. ﴿٣٤﴾ ڤێجا خودێ دوعایا وی قەبویل کر، و
فندوفێلێت وان ژێ دانە پاش، ب راستی خودێ گوهدێر و زانایە. ﴿٣٥﴾ پاشی بۆ وان [کاربدەستان] وەسا
دیاربوو، پشتی بەلگە و نیشان ل سەر بێ گونەهی و رووی سپیاتیا یووسفی دیتین، [یا باش ئەوە] هەتا
دەمەکێ نەیێ ئاشکەرا زیندان بکەن [دا هزرا گونەهکارییێ ژێ بێتەکرن، و شەرما خۆ ژی پێ بڤەشێرن].
﴿٣٦﴾ و دو گەنج د گەل وی چۆنە د زیندانێڤە [ئێك نانپێژێ خوندکاری بوو، یێ دی ئاڤگێرێ وی بوو]،
ئێك ژ وان گۆت: من د خەونا خۆدا ددیت من تری دگڤاشت و مەی (عەرەق) چێ دکر، و یێ دی گۆت:
من ددیت نان ل سەر سەرێ من بوو و بالندەیان ژێ دخوار، ڤێجا تو بۆ مە راڤەکرنا ڤێ بێژە، ب راستی ئەم
تە خۆش مرۆڤ و جوامێر دبینین. ﴿٣٧﴾ [یووسفی گۆت] هێژ خوارن نەهاتییە بەر هەوە ئەگەر من بۆ هەوە
نەگۆتبیت کا چ خوارنە، بەری بۆ هەوە بهێت، و ئەڤە ئەو زانینەیە یا خودایێ من نیشا من دایی، ب راستی
من دینێ ملەتەکی یێ هێلایی باوەرییێ ب خودێ نائینن، و ژ ئاخرەتێ ژی بێ باوەرن.

وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ
لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى
ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٨﴾ يَٰصَٰحِبَيِ
ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٣٩﴾
مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ
وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ
أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ
ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا
فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ
مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾ وَقَالَ
لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ
ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾
وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ
سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ ﴿٤٣﴾



﴿٣٨﴾ و من دینێ باب و باپیرێت خۆ ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووبی گرت، و بۆ مە [مال پێغەمبەران] دورست نینە ئەم تشتەکی بۆ خودێ بکەینە هەڤپشك، و ئەڤە [کو ئەم پێغەمبەر ژ گونەهان پارستینە] کەرەما خودێیە، ل سەر مە و ل سەر مرۆڤان [دەمێ پێغەمبەر بۆ ڕاستەڕێکرنا وان هاتینە هنارتن]، بەلێ پا باراپتر ژ مرۆڤان [ڤێ نوزانن] سوپاسیيا خودێ ناکەن. ﴿٣٩﴾ هەی هەڤالێت من یێت زیندانێ، ئەرێ پەرستییێت بەلاڤ و جودا جودا چێترن، یان خودایێ تاك و تەنیا، ئەوێ هەمی تشت بۆ مەزناتیيا خۆ داچەماندین. ﴿٤٠﴾ ئەو پەرستییێت هوین ژ بلی خودێ دپەرێسن ژ ناڤان پێڤەتر نینن، هەوە و باب و باپیرێت خۆ یێت ب ناڤکرین [و پەرستی دانایین]، خودێ چو بەلگە و نیشان پێ نەهنارتینە، ژ خودێ پێڤەتر کەس حوکمی د چێکریياندا ناکەت، ئەمرێ کری کو هوین ژ وی پێڤەتر چو نەپەرێسن، ئەڤەیە دینێ ڕاست و دورست بەلێ باراپتر ژ خەلکی ڤێ نوزانن. ﴿٤١﴾ هەی هەڤالێت من یێت زیندانێ، هندی ئێك ژ هەوەیە دێ زڤڕیتەڤە سەر کارێ خۆ، و دێ مەیێ (عەرەقێ) دەتە سەروەرێ خۆ، و هندی یێ دیيە دێ ب دارێڤە ئێتە هەلاویستن و دێ ئێتە کوشتن، و بالندە دێ سەرێ وی خۆن، و ئەو کارێ هوین هەردو ژ من دپرسن ب دویماهیك هات و [ئەوا من گۆتییە هەوە] دێ هەر چێ بیت ژی. ﴿٤٢﴾ و یووسفی گۆتە وی، یێ وی هزردکر، ژ هەردووکان ئەو دێ ئێتە بەردان، بەحسێ من ل دەڤ خوندکارێ خۆ بکە [چیرۆکا من بۆ بێژە بەلکی من ژ ڤێرێ دەربێخیت و بزانیت ئەز یێ بێ گونەهم] بەلێ شەیتانی ژ بیرێ بر بەحسێ یووسفی بۆ خوندکارێ خۆ بکەت. ڤێجا چەند سالەکان یووسف ما د زیندانێڤە. ﴿٤٣﴾ [پشتی دەمەکی خوندکارێ مسرێ ب خۆ، خەونەك دیت و هەمی خەونزان کۆمکرن، بەلێ کەس ب سەر ڕاڤەکرنا خەونا وی هەلنەبوو] خوندکاری گۆت: ب ڕاستی من د خەونێدا ددیت، حەفت چێلێت قەلەو، حەفتێت لاواز ئەو [یێت قەلەو] دخوارن، و من ددیت حەفت گولییێت کەسك یێت دانگرتی، حەفتێت دی یێت هشك خۆ تێ ئالاندبوون و کەڤتبوونە سەر، ڤێجا گەلی ڕویسپی و ماقویلان، ڕاڤەکرنا ڤێ خەونا من، بۆ من بێژن، ئەگەر هوین ڕاڤەکرنا خەونان بزانن.

قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖۖ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ٤٤
وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأۡوِيلِهِۦ
فَأَرۡسِلُونِ ٤٥ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٖ
سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ
وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ لَّعَلِّيٓ أَرۡجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَعۡلَمُونَ ٤٦ قَالَ
تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا
قَلِيلٗا مِّمَّا تَأۡكُلُونَ ٤٧ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ سَبۡعٞ شِدَادٞ يَأۡكُلۡنَ
مَا قَدَّمۡتُمۡ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تُحۡصِنُونَ ٤٨ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ
عَامٞ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ ٤٩ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي
بِهِۦۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ
ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ٥٠
قَالَ مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ قُلۡنَ حَٰشَ
لِلَّهِ مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖۚ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ
ٱلۡحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٥١ ذَٰلِكَ
لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ ٥٢





﴿٤٤﴾ گـۆتن: ئـەڤـە تێکـەلـەخـەونن، ئـەم چـو ژ
ڕاڤەکرنـا تێکەلەخەونـان نوزانـین. ﴿٤٥﴾ و ئـەوێ ژ وان
هـەردووکان [ئەوێـت د گـەل یووسـفی د زیندانێڤـە]
هاتیـیە بـەردان، و پشـتی دەمەکێ درێژ ژ نوی یووسـف
هاتیـیە بـیرێ، گـۆت: ئـەز دێ بـۆ هـەوە ڕاڤەکرنـا ڤـێ
خەونـێ بێـژم، کا مـن بهنێرنـە زیندانـێ دەڤ یووسـفی.
﴿٤٦﴾ [ڤێجـا وەختـێ چۆیـە دەڤ یووسـفی د زینداانێڤە]
گـۆت: یووسـف هەی مرۆڤـێ زێـدە ڕاسـتگۆ، کا بۆ مە
ڤـێ خەونـێ ڕاڤـە بکـە، حەفـت چێلێـت لاواز حەفـت
چێلێـت قەلەو دخوارن، و حەفت گولیـیێت هشـك خۆ
ب سـەر حەفتێـت کەسـك دادابـوو، دا ئـەز بزڤرِمـە ناڤ
خەلکـی، و ڕاڤەکرنـا ڤـێ خەونـێ بزانـن و قـەدرێ تـە
ژی بزانـن، و تـە ژ زینداانێ دەربێخن. ﴿٤٧﴾ [یووسـفی]
گـۆت: حەفت سـالان ل سـەرئێك و بێ ڤەبڕیـن، وەکی
هەرجـار چاندنا خۆ بکەن، ڤێجا یـێ هـەوە درووی بهێلنە
د گولیـیا ویـدا، ئـەو کێـم نەبیـت ئـەوا هویـن دخـۆن.
﴿٤٨﴾ پاشـی پشـتی هنگـی [ڤـان سـالان] دێ حەفـت
هشـکە سـالێت گـران هـێن ئەڤـا هـەوە بـۆ هلگرتـی و
دانایە سـەرئێك، هەمیـیێ دێ خۆن، ئەو کێم نەبیت یـێ هەوە بۆ تۆڤی ڕاکری. ﴿٤٩﴾ پاشـی پشـتی ڤان سـالان،
سـالەك دێ ئێـت، بـاران دێ ب خەلکـێرا گەهـن [دێ بیتـە بەرفرەهـی]، و دێ بـۆ خۆ تێدا دۆشـاڤێ و شـەربەتێ
و ڕوینـی ڤەگـرن. ﴿٥٠﴾ و خونـدکاری گـۆت: کا یووسـفی بـۆ مـن بینـن، ڤێجـا وەختـێ ئێلچیـیێ خوندکاری
هاتیـیە دەڤ، [یووسـفی] گۆتـێ: بزڤـرە دەڤ خونـدکارێ خـۆ، و بێـژێ [پسـیارێ ژێ بکـە] وان ژنـان چ بـوو
ئەوێـت دەسـتێت خۆ بڕین؟ ب ڕاسـتی خودایـێ مـن ئاگەهـ ژ فندوفێلێـت وان هەیـە. ﴿٥١﴾ [خوندکاری گازی
وان ژنـان کـر] و گۆتـێ: هـەوە چ بوو وەختـێ هەوە یووسـف داخوازکریـیە دەڤ خۆ [ئـەرێ هەوە خرابیـیەك
ژێ دیتبـوو] گۆتـن: حاشـایی خـودێ [ئـەو خرابیـیەکێ بکەت] مـە چو خرابـی ژێ نەدیتیـیە [وێ گاڤـێ] ژنا
سـەروەری گۆت: ئەها ڤێ گاڤێ ڕاسـتی دیاربوو، من ئەو یـێ داخوازکری و ئەو یـێ بەریـیە، و ئەو ب ڕاسـتی
ژ ڕاسـتگۆیانە. ﴿٥٢﴾ یووسـف گـۆت: مـن ئەڤ داخـوازە کر [کـو خوندکار پسـیارا وان ژنان بکـەت، کا وان چ
بـوو، بـەری ئـەز ژ زینداانـێ دەرکەڤم] دا سـەروەر [عەزیـزێ مـسرێ] بزانیت من د پشـترا خیانەت لێ نەکریـیە،
ب ڕاسـتی خـودێ فندوفێلێـت خائینـان ب سـەر نائێخیت.

۞ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ
إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥٣﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ
لِنَفۡسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ﴿٥٤﴾
قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴿٥٥﴾ وَكَذَٰلِكَ
مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ
بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَلَأَجۡرُ
ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٥٧﴾ وَجَآءَ
إِخۡوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٨﴾
وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ قَالَ ٱئۡتُونِي بِأَخٖ لَّكُم مِّنۡ أَبِيكُمۡۚ أَلَا
تَرَوۡنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلۡكَيۡلَ وَأَنَا۠ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ﴿٥٩﴾ فَإِن لَّمۡ تَأۡتُونِي
بِهِۦ فَلَا كَيۡلَ لَكُمۡ عِندِي وَلَا تَقۡرَبُونِ ﴿٦٠﴾ قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنۡهُ أَبَاهُ
وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ﴿٦١﴾ وَقَالَ لِفِتۡيَٰنِهِ ٱجۡعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ فِي رِحَالِهِمۡ
لَعَلَّهُمۡ يَعۡرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٦٢﴾
فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ
فَأَرۡسِلۡ مَعَنَآ أَخَانَا نَكۡتَلۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٦٣﴾





﴿٥٣﴾ و ئەز ب ڕاستی خۆ بەری ناکەم کو چو خەلەتیان ناکەم [یووسفی ئەڤ ئاخڤتنە ژ جوامێریا خۆ گۆت]، ب ڕاستی نەفس زێدە خرابیخوازە، ئەو [نەفس] تێ نەبیت یا خودێ دلۆڤانی پێ بری و پارستی، ب ڕاستی خودایێ من گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٥٤﴾ و خوندکاری گۆت: وی [یووسفی] بۆ من بینن، ئەز دێ وی بۆ خۆ ب تنێ گرم [ڤێجا وەختێ یووسف هاتییە دەڤ خوندکاری] د گەل ئاخڤت و گۆتێ: تو ئەڤرۆ ل دەڤ مە خودان جە و خودان دەستهەلات و ئەمینداری ل سەر هەمی تشتان. ﴿٥٥﴾ یووسفی گۆت: تو من دانە سەر گەنجخانەیێت مسرێ [گەنجخانەیێت پارە و خوارن تێدا، دا ب عەدالەت بەلاڤ بکەت و بکەتە ڕێکەك پێ بگەهیتە خەلکێ مسرێ، دا پەرستنا بوتان بهێلن و باوەرییێ ب خودێ بینن]، ب ڕاستی ئەز یێ ئەمین و پارێزەرم، و زانامە ب ڕێکێت بەلاڤکرنا وان. ﴿٥٦﴾ و هۆسا [مە ئەو ژ زیندانێ دەرئێخست و ئێخستە دلێ خوندکاری، دا بدانیتە سەر گەنجخانەیێت مسرێ] مە یووسف د مسرێدا ب جە کر کو خودان شیان و ئەمر بیت، هەر جهێ بڤێت ل مسرێ بۆ خۆ بکەتە جە و خانی، و ئەم ب دلۆڤانیا خۆ قەنجی و کەرەمان دگەهینینە وی یێ مە بڤێت، و ئەم خەلاتێ قەنجیکاران بەرزە ناکەین. ﴿٥٧﴾ و خەلاتێ ئاخرەتێ بۆ وان، ئەوێت باوەری ئینایین و ژ خودێ دترسیان، چێترە. ﴿٥٨﴾ و برایێت یووسف هاتن و چۆنە دەڤ، وی ئەو نیاسین، و وان ئەو نەدنیاسی. ﴿٥٩﴾ ڤێجا وەختێ یووسف بارێ وان داگرتی، گۆت: ئەگەر هوین جارەکا دی هاتن برایێ خۆ یێ بابێ بۆ من بینن، ما هوین نابینن ئەز ب دورستی دپیڤم، و ئەز چێترین قەدرگرم بۆ مێڤانان. ﴿٦٠﴾ ڤێجا ئەگەر هوین وی برایێ خۆ بۆ مە نەئینن، هەوە چو بار ل دەڤ من نینن، و نێزیکی من ژی نەبن. ﴿٦١﴾ گۆتن: ب ڕاستی ئەم دێ داخوازێ ژ بابێ وی کەین و د بەرڕا کەین، و ئەم دێ کەین و بێ تەقسیری. ﴿٦٢﴾ و یووسفی گۆتە خزمەتکارێت خۆ: متایێ وان بێخنە د ناڤ بارێت واندا، بەلکی وەختێ دزڤڕنە ناڤ مرۆڤێت خۆ پێ بحەسن [وان خوارن بێ بەرانبەر یا ژ مسرێ ئینایی]، و بەلکی جارەکا دی بزڤڕنەڤە. ﴿٦٣﴾ ڤێجا وەختێ زڤڕینە دەڤ بابێ خۆ، گۆتن: بابۆ ژ پیڤانێ [ژ ئێرە و پێڤە] ئەم هاتینە بێ بارکرن [ئەگەر تو برایێ مە د گەل مە نەهنێری]، ڤێجا برایێ مە د گەل مە بهنێرە دا تشتێ مە بڤێت بۆ مە بێتە پیڤان، هەبیت، و ب ڕاستی ئەم دێ چاڤێ خۆ باش دەینێ.

قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن
قَبْلُ فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَٰفِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَمَّا فَتَحُوا۟
مَتَٰعَهُمْ وَجَدُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا
مَا نَبْغِى هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا وَنَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ
أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴿٦٥﴾ قَالَ
لَنْ أُرْسِلَهُۥ مَعَكُمْ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأْتُنَّنِى
بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا
نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ يَٰبَنِىَّ لَا تَدْخُلُوا۟ مِنۢ بَابٍ وَٰحِدٍ
وَٱدْخُلُوا۟ مِنْ أَبْوَٰبٍ مُّتَفَرِّقَةٍ وَمَآ أُغْنِى عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن
شَىْءٍ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ
ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم مَّا كَانَ
يُغْنِى عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ إِلَّا حَاجَةً فِى نَفْسِ يَعْقُوبَ
قَضَىٰهَا وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٍ لِّمَا عَلَّمْنَٰهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ
لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَخَاهُ
قَالَ إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٦٩﴾



﴿٦٤﴾ گۆت: ئەرێ ئەز ژ هەوە ئێمن ببم ل سەر، هەروەکی بەری نوکە ئەز ژ هەوە ئێمن بوویيم ل سەر برايێ وی یووسف [و هوين دزانن کا چ ب سەرێ وی هات]، و خودێ چێترين پارێزڤانە، و دلۆڤانترين دلۆڤانە [ئانکو من ئەو هێلا ب هيڤيا خودێڤە ئەو پارێزیيێ بۆ من لێ بکەت، و ل من بزڤرينيتەڤە، ئەگەر بهێلمە ب هيڤيا هەوەڤە، ئەو ژی دێ د رێکا یووسفيدا چيت]. ﴿٦٥﴾ ڤێجا وەختێ بارێت خۆ ڤەکرين، متايێ خۆ ديتن يێ ل وان هاتيیە زڤراندن، گۆتن: بابۆ ما مە چ يێ دی دڤێت، ئەڤە متايێ مە يێ ل مە هاتيیە زڤراندن [ڤێجا برايێ مە د گەل مە بهنێرە]، ئەم دێ خوارنێ بۆ مرۆڤێت خۆ ئينين، و برايێ خۆ پارێزين و بارێ حێشترەکێ دێ ل خۆ زێدەکەين، و ئەڤ بارە ل سەر خوندکاری نە گەلەکە. ﴿٦٦﴾ [يەعقووبی] گۆت: هەتا هوين بۆ من ئەهد نەکەن ب خودێ، کو هوين دێ بۆ من ئيننەڤە، ژ بلی هندێ دۆرماندۆرێت هەوە بێنە گرتن و هوين نەچار ببن [ئەگەر نە، ئەز د گەل هەوە ناهنێرم]، ڤێجا وەختێ وان ئەهد (پەيمان) دايیێ، گۆت: خودێ ل سەر ئەوا هوين دبێژن ئاگەهدار و زێرەڤانە. ﴿٦٧﴾ و [يەعقووبی] گۆت: کورێت من د دەرگەهەکی ب تنێرا نەچنە ژۆر، و د گەلەك دەرگەهانرا هەرنە ژۆر، و ئەز نەشێم ئەو تشتێ خودێ بۆ هەوە نڤێسی ژ هەوە بدەمە پاش، و حوکم و فەرمان بەس يێت خودێنە، من پشتا خۆ پێ گرێدا، و يێت بڤێن پشتا خۆ قاهيم بکەن، بلا پشتا خۆ ب خودێ قاهيم بکەن. [ئەوێت خۆ دهێلنە ب هيڤيیەکێڤە بلا خۆ بهێلنە ب هيڤيا خودێڤە]. ﴿٦٨﴾ ڤێجا وەختێ ئەو ب ژۆر کەڤتين وەکی بابێ وان گۆتيیە وان، و وی [يەعقووبی] نەدشيا تشتێ خودێ بۆ وان ڤيايی (نڤێسی) ڤەگريت يان ژێ بدەتە پاش، بەلێ تشتەك د دلێ ويدا بوو وی ژ دلێ خۆ دەرئێخست [دڤيا کورێت وی پێکڤە نەئێنە ديتن و کەس چاڤان ل وان نەدەت، لەوا گۆتە وان: پێکڤە د ئێك دەرگەهيرا نەچنە ژۆر]، و ب راستی ئەو [يەعقووب] يێ خودان زانينە [دزانيت قەدەرا خودێ دێ هەر ئێت و کەس نەشێت خۆ بدەتە بەر و ڤەگريت] ژ وێ زانينا مە نيشا دايی، بەلێ پا باراپتر ژ مرۆڤان ڤێ نوزانن. ﴿٦٩﴾ ڤێجا وەختێ چۆيينە دەڤ یووسف، [یووسف] برايێ خۆ ئينا دەڤ خۆ، گۆتێ: ئەز برايێ تەمە [يێ دەيبابی]، ڤێجا تو ژ بەر ئەوا وان دکر ب خەم نەکەڤە.

فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِي رَحْلِ أَخِيهِ
ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَٰرِقُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا۟
وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم مَّاذَا تَفْقِدُونَ ﴿٧١﴾ قَالُوا۟ نَفْقِدُ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ
وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ
لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ ﴿٧٣﴾
قَالُوا۟ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٧٤﴾ قَالُوا۟ جَزَٰٓؤُهُۥ
مَن وُجِدَ فِي رَحْلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٥﴾
فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا مِن
وِعَآءِ أَخِيهِ ۚ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ
فِي دِينِ ٱلْمَلِكِ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ
الحزب ٢٥ وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴿٧٦﴾ ۞ قَالُوٓا۟ إِن يَسْرِقْ
فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ ۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفْسِهِۦ
وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ ۚ قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا ۖ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا
تَصِفُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا
فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓ ۖ إِنَّآ نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٧٨﴾



﴿٧٠﴾ ڤێجا وەختێ بارێت وان داگرتین، ترارێ ئاڤڤەخوارنێ کرە د بارێ برایێ خۆ یێ دەیبابیدا [پشتی کاروان ب رێ کەڤتی]، پاشی بانگهلدێرەکی گازیکر گەلی کاروانییان [راوەستن] هوین دزیکەرن [هەوە دزی یا کری]. ﴿٧١﴾ [برایێت یووسفی] ل وان زڤرین و گۆتن: چ یێ هەوە بەرزەبوویییە. ﴿٧٢﴾ گۆتن: ترارێ ئاڤڤەخوارنا خوندکاری یێ بەرزەبوویی، و هەر کەسێ بینیت [بەری ئەم سەحکەینە هەوە]، دێ بارەکێ حێشترێ دەینێ و ئەز کەفیل. ﴿٧٣﴾ [برایێت یووسفی] گۆتن: ب خودێ هوین ب خۆ دزانن، ئەم نەهاتینە دا خرابیێ د ئەردیدا بکەین، و مە چوجا دزی نەکرییە [و ئەم نە دزیکەرین]. ﴿٧٤﴾ گۆتن: پا جزایێ وی یێ ترار دزی چیە، ئەگەر هوین درەوین دەرکەڤتن؟ ﴿٧٥﴾ [برایێت یووسف] گۆتن: هەر کەسێ ترار د بارێ ویدا هاتە دیتن، ئەو ب خۆ شوینا ترارییە، ئەم هۆسا دزیکەران جزا دکەین. ﴿٧٦﴾ ئینا ژ بارێ وان دەست پێ کر، بەری یێ برایێ خۆ [دا شکێ نەبن کو ئەڤە پیلانەکە هاتییە دانان]، پاشی [ترار] ژ بارێ برایێ خۆ یێ دەیبابی ئینادەر، و هۆسا مە ئەو کار نیشادا [دا بگەهیتە وی تشتێ وی دڤیا]، و ئەو نەدشیا برایێ خۆ ل دویڤ برِیارا [حوکمێ] خوندکاری بگەهینیتە خۆ [ئەگەر ئەڤە نەکربایە] ژ بلی حەزکرنا خودێ، هەر کەسێ مە بڤێت دێ پایەبلند کەین، و د سەر هەر زانایەکیڕا یێ ژێ زاناتر و شارەزاتر هەیە. ﴿٧٧﴾ [برایێت یووسف] گۆتن: ئەگەر وی دزی کربیت، ب راستی برایەکێ وی ژی بەری وی دزی کربوو، و یووسف ئاخفتنا وان داعویرا و خۆ ب سەرڤە نەبر، یا د دلێ خۆدا بۆ وان دیار نەکر، گۆت: کەس ژ هەوە خرابتر نینە [هوین ئەون یێت هەوە برایێ خۆ ژ بابێ خۆ دزی]، و ئەوا هوین دبێژن، خودێ چێتر دزانیت. ﴿٧٨﴾ گۆتن: ئەزبەنی، ب راستی وی [مەخسەد برایێ دەیبابی یێ یووسف] بابەکێ پیر و دانعەمر یێ هەی [بێنا وی بێی وی نائێت]، ڤێجا تو ئێکی ژ مە شوینا وی بگرە، ب راستی ئەم تە ژ قەنجیکاران دبینین [ڤێجا ڤێ قەنجییێ د گەل مە بکە].

قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأۡخُذَ إِلَّا مَن وَجَدۡنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ
إِذٗا لَّظَٰلِمُونَ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا ٱسۡتَيۡـَٔسُواْ مِنۡهُ خَلَصُواْ نَجِيّٗاۖ
قَالَ كَبِيرُهُمۡ أَلَمۡ تَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ أَبَاكُمۡ قَدۡ أَخَذَ عَلَيۡكُم
مَّوۡثِقٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبۡلُ مَا فَرَّطتُمۡ فِي يُوسُفَۖ فَلَنۡ أَبۡرَحَ
ٱلۡأَرۡضَ حَتَّىٰ يَأۡذَنَ لِيٓ أَبِيٓ أَوۡ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ لِيۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴿٨٠﴾
ٱرۡجِعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيكُمۡ فَقُولُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبۡنَكَ سَرَقَ
وَمَا شَهِدۡنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمۡنَا وَمَا كُنَّا لِلۡغَيۡبِ حَٰفِظِينَ ﴿٨١﴾
وَسۡـَٔلِ ٱلۡقَرۡيَةَ ٱلَّتِي كُنَّا فِيهَا وَٱلۡعِيرَ ٱلَّتِيٓ أَقۡبَلۡنَا فِيهَاۖ
وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٨٢﴾ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ
فَصَبۡرٞ جَمِيلٌۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَنِي بِهِمۡ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ
ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٨٣﴾ وَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ
يُوسُفَ وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ ﴿٨٤﴾
قَالُواْ تَٱللَّهِ تَفۡتَؤُاْ تَذۡكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا
أَوۡ تَكُونَ مِنَ ٱلۡهَٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي
وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٨٦﴾



﴿٧٩﴾ [یووسف] گۆت: خودێ نەکەت، ئەم ئێکی ژ
وی پێڤەتر بگرین، یێ مە متایێ خۆ ل دەڤ گرتی
[خودێ مە ژ ڤێ بپارێزیت]، ب ڕاستی [ئەگەر ئەم
وەبکەین]، وی وەختی ئەم دێ ژ ستەمکاران بین.
﴿٨٠﴾ ڤێجا وەختێ ئەو ژێ بێ هیڤی بوویین، خۆ
ڤەدەرکرن و بوو پستا وان د گەل ئێك، برایێ
وان یێ ژ هەمییان مەزنتر گۆت: ئەرێ ما هوین
نوزانن بابێ هەوە پەیمانا ژ هەوە وەرگرتی [کو هوین
کوڕێ وی بپارێزن، و بۆ بزڤڕیننەڤە]، و ما هوین
نوزانن هەوە بەری نوکە چ سستی یا د دەرهەقێ
یووسفدا کری. ڤێجا ئەز ئەردێ مسرێ ناهێلم هەتا
بابێ من دەستویرییا من نەدەت، یان خودێ بڕیارا
خۆ د دەرهەقێ مندا بدەت [کو ژێ دەرکەڤم یان بمرم،
یان شیانێ بدەتە من ئەز برایێ خۆ ژ وان بستینم]، و
ئەو چێترین حاکمە. ﴿٨١﴾ بزڤڕنەڤە دەڤ بابێ خۆ و
بێژنێ: بابۆ.. کوڕێ تە دزی کر، و مە شادەیی ل سەر
نەدایییە ب وی نەبیت یێ مە [ژ شەریعەتێ تە] زانی
[کو یێ دزییێ بکەت، دێ پێشڤە ئێتە گرتن]، و مە
چو ژ غەیبێ نەدزانی [وەختێ مە پەیمان دایییە تە، مە نەدزانی دێ دزییێ کەت و ئێتە گرتن]. ﴿٨٢﴾ [و ئەگەر
تو باوەر نەکەی] پسیارا خەلکێ وی گوندی بکە ئەوێ ئەم چۆیینێ [مەخسەد ئێکی بهنێرە مسرێ و پسیارا
خەلکێ وێ بکە]، دیسا پسیارا وی کاروانی بکە ئەوێ ئەم د گەل هاتین، و ب ڕاستی ئەم ڕاست دبێژین.
﴿٨٣﴾ [پشتی ئەو زڤڕینە دەڤ بابێ خۆ و ئاخڤتنا برایێ مەزن بۆ گۆتی]، ئینا [یەعقووبی] گۆت: بەلێ دلێ
هەوە کارەك ل بەر هەوە جوان کر و هەوە کر، ڤێجا بێنفرەهییا من بێنفرەهییەکا جوانە و یا بێ گازندەیە،
هیڤی دکەم خودێ هەمییان ل من بزڤڕینیت [یووسف و برایێ وی و ئەڤێ دی ئەوێ مایییە ل مسرێ]، ب
ڕاستی خودێ یێ زانایە [ب ڕەوشا من]، و کاربنەجهە [د ڤێ جەرباندنێدا بۆ من]. ﴿٨٤﴾ و یەعقووبی بەرێ
خۆ ژ وان وەرگێڕا، و گۆت: ئاخ بۆ کول و کۆڤانێت یووسف، و هەردو چاڤێت وی ژ خەمێت یووسفیدا
سپی بوون [هندی ڕۆندك باراندن]، و یێ تێر و تژی بوو ژ کەربێ، و کەربا خۆ دادعویرا. ﴿٨٥﴾ گۆتن: ب
خودێ تو هەر دێ مینی هزرا یووسفی کەی، هەتا تو بەر ب هیلاکێڤە دچی یان ژی دمری. ﴿٨٦﴾ گۆت: ب
ڕاستی ئەز کول و کۆڤانێت خۆ بەس حەوالەی خودێ دکەم، و یا ئەز ژ خودێ دزانم، هوین نوزانن [خەونا
یووسف خەونەکا ڕاستە و دێ هەر چێ بیت].

يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ
مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ
ٱلۡكَٰفِرُونَ ٨٧ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ
مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ فَأَوۡفِ لَنَا
ٱلۡكَيۡلَ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَجۡزِي ٱلۡمُتَصَدِّقِينَ ٨٨
قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم مَّا فَعَلۡتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذۡ أَنتُمۡ
جَٰهِلُونَ ٨٩ قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُۖ قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ
وَهَٰذَآ أَخِيۖ قَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَآۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ
ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٩٠ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ
ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ٩١ قَالَ لَا تَثۡرِيبَ
عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَۖ يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ٩٢
ٱذۡهَبُواْ بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلۡقُوهُ عَلَىٰ وَجۡهِ أَبِي يَأۡتِ
بَصِيرٗا وَأۡتُونِي بِأَهۡلِكُمۡ أَجۡمَعِينَ ٩٣ وَلَمَّا فَصَلَتِ
ٱلۡعِيرُ قَالَ أَبُوهُمۡ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن
تُفَنِّدُونِ ٩٤ قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ ٩٥





﴿٨٧﴾ کورێت من، هەرن ل یووسف و برایێ وی بگەڕن و ژ ڕەحما خودێ بێ هیڤی نەبن، و ب ڕاستی ژ بلی گاوران کەسێ دی ژ ڕەحما خودێ بێ هیڤی نابیت. ﴿٨٨﴾ ڤێجا وەختێ ئەو چۆیینە دەڤ یووسفی، گۆتن: هەی وەزیر، ب ڕاستی ئەم و مرۆڤێت خۆ یێت بێ چارە بوویین [ژ برساندا]، و مە متایەکێ بێ سەروبەر و بێ بها یێ ئینایی، ڤێجا [ب ڤی متایێ مە یێ بێ سەروبەر] یان تمام بۆ مە بپیڤە و خێرا خۆ د گەل مە بکە [ل مە نەگرە ژ بەر بێ سەروبەریـیا متایێ مە، یان زێدەی متایێ مە بدە مە، یان برایێ مە ژ کەرەما خۆ بەردە]، ب ڕاستی خودێ دێ خەلاتێ خێرکەران دەتێ. ﴿٨٩﴾ [یووسفی] گۆت: ئەرێ هوین دزانن هەوە چ ب سەرێ یووسف و برایێ وی ئینایییە، دەمێ هوین یێت نەزان؟! ﴿٩٠﴾ گۆتن: ئەرێ تو یووسف ب خۆیی، گۆت: ئەرێ ئەز یووسفم و ئەڤە ژی برایێ منە [یێ دەیبابی]، ب ڕاستی خودێ کەرەم د گەل مە کر، ب ڕاستی هەر کەسێ پارێزکاریـیا خودێ بکەت، و بێنا خۆ فرەهـ بکەت، خودێ خێرا [چو] قەنجیکاران بەرزە ناکەت. ﴿٩١﴾ گۆتن: ب خودێ، خودێ تو ب سەر مە ئێخستی، و ب قەدرتر و بلندتر لێ کری، و ب ڕاستی ئەم ب خۆ د خەلەت بوویین. ﴿٩٢﴾ [یووسفی] گۆت: ئەڤرۆ ئەز ل هەوە ناگرم، و گازندە ل سەر هەوە نینە [ما دەم هەوە خەلەتی ل سەر خۆ ئاشکەرا کر، ئەز ل هەوە ناگرم]، خودێ ل هەوە ناگریت یان خودێ ل هەوە نەگریت [و گونەهێت هەوە بغەفرینیت]، و ئەو ژ هەمی دلۆڤانان دلۆڤانترە. ﴿٩٣﴾ ئەڤی قەمیسێ من ببەن، بدانە سەر سەروچاڤێت بابێ من، چاڤێت وی دێ ڕۆن بن، و هوین هەمی مالێت خۆ بینە دەڤ من. ﴿٩٤﴾ ڤێجا وەختێ کاروان ژ مسرێ دەرکەڤتی، بابێ وان گۆت [بۆ حازرێت ل دەڤ جهێ خۆ ل ئەردێ کەنعان]: بێنا یووسفی یا دئێتە من، و ئەگەر هەوە ئەز بێ هۆش و بیر خەرفتی نەدانابم، دا ژ من باوەر کەن. ﴿٩٥﴾ گۆتن: ب خودێ هێژ تو یێ ل سەر ئێك و دویا خۆ یا کەڤن [زێدە حەژێکرنا یووسفی].

فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ فَٱرۡتَدَّ بَصِيرٗاۖ قَالَ
أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُواْ
يَٰٓأَبَانَا ٱسۡتَغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ ﴿٩٧﴾ قَالَ سَوۡفَ
أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩٨﴾ فَلَمَّا
دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَبَوَيۡهِ وَقَالَ ٱدۡخُلُواْ مِصۡرَ
إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ
لَهُۥ سُجَّدٗاۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا
رَبِّي حَقّٗاۖ وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ وَجَآءَ بِكُم
مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ إِنَّ
نصف الحزب ٢٥ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾ ۞ رَبِّ
قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ
فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ
تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ
ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَۖ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ أَجۡمَعُوٓاْ أَمۡرَهُمۡ
وَهُمۡ يَمۡكُرُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿١٠٣﴾



﴿٩٦﴾ ڤێجا وەختێ مزگینئین هاتی، قەمیسێ یووسفی
ئاڤێتیە سەر سەروچاڤێت وی، چاڤێت وی ڕۆن
بوونەڤە، گۆت: من نەدگۆتە هەوە [بێنا یووسفی
یا دئێتە من، یان من نەدگۆتە هەوە هەڕن لێ
بگەڕن ژ ڕەحما خودێ بێ هیڤی نەبن]، و یا ئەز ژ
خودێ دزانم، هوین نوزانن. ﴿٩٧﴾ گۆتن: بابۆ..
داخوازا لێنەگرتن و گونەهـ ژێبرنێ بۆ مە [ژ خودێ]
بکە، ب ڕاستی ئەم یێت گونەهکار بووین.
﴿٩٨﴾ [یەعقووبی] گۆت: پاشی ئەز دێ بۆ هەوە
داخوازا گونەهـ ژێبرنێ ژ خودایێ خۆ کەم، ب
ڕاستی هەر ئەوە یێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤان.
﴿٩٩﴾ ڤێجا وەختێ چۆیینە دەڤ یووسف، دەیبابێت
خۆ برنە دەڤ خۆ، و گۆت: خودێ حەزکەت، ب
پشت ڕاستی و ئێمنی وەرنە مسرێ. ﴿١٠٠﴾ و یووسف،
دەیبابێت خۆ بلندکرن و دانانە سەر تەختی، و هەمی
[دەیباب و برایێت وی پێکڤە] بۆ چۆنە سوجدەیێ
[و ئەڤ سوجدەیە ل دەڤ وان یا دورست بوو، و ل
جهێ سلاڤێ و قەدرگرتنێ بوو، وەکی د پێشڤەڕابوونێ
و ماچکرنا دەستی]، و [یووسفی] گۆت: بابۆ.. ئەڤە ڕاڤەکرنا خەونا منە یا من بەری نوکە دیتی، خودایێ
من ئەو کرە ڕاستی، و قەنجی و کەرەم د گەل من کر، وەختێ ئەز ژ زیندانێ ڕزگار کریم و هوین ژ دەشتێ
و کۆچەراتێ ئینایینە ڤێرێ، پشتی شەیتانی ناڤبەرا من و برایێت من نەخۆش [خراب] کری، ب ڕاستی
خودایێ من چ بڤێت، هویرك دکەت، ب ڕاستی ئەو یێ زانا و کاربنەجهە. ﴿١٠١﴾ خودێوۆ.. تە ژ ملك و
مالدارییێ دا من، و تە ڕاڤەکرنا خەونان نیشا من دا، تویی هەی چێکەرێ ئەرد و ئەسمانان، تویی پشتەڤان و
هاریکارێ من د دنیایێ و ئاخرەتێدا، من موسلمان بمرینە، و من بگەهینە ڕاستکاران. ﴿١٠٢﴾ [هەی موحەمەد]
ئەڤە [چیرۆکا یووسف پێغەمبەر و برایێت وی] ژ بەحس و سالۆخێت نەدیارن، ب وەحی ئەم بۆ تە دبێژین،
و تو ل دەڤ وان [برایێت یووسفی] نەبوویی وەختێ خۆ کرینە ئێك [دا یووسف باڤێژنە د بیرێدا]، و وان
پیلان بۆ دگێڕا. ﴿١٠٣﴾ باراپتر ژ مرۆڤان باوەرییێ نائینن، خۆ تو ل سەر یێ ڕژد بی ژی.

وَمَا تَسۡـَٔلُهُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾
وَكَأَيِّن مِّنۡ ءَايَةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ يَمُرُّونَ عَلَيۡهَا
وَهُمۡ عَنۡهَا مُعۡرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤۡمِنُ أَكۡثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا
وَهُم مُّشۡرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ أَفَأَمِنُوٓاْ أَن تَأۡتِيَهُمۡ غَٰشِيَةٞ مِّنۡ عَذَابِ
ٱللَّهِ أَوۡ تَأۡتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١٠٧﴾ قُلۡ
هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ
وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن
قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓۗ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ
فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن
قَبۡلِهِمۡۗ وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٠٩﴾
حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ
جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُۖ وَلَا يُرَدُّ بَأۡسُنَا عَنِ ٱلۡقَوۡمِ
ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١١٠﴾ لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِۗ
مَا كَانَ حَدِيثٗا يُفۡتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصۡدِيقَ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ
وَتَفۡصِيلَ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿١١١﴾





﴿١٠٤﴾ و تـو ژی [هـەی موحەمـەد] چـو حـەق و کرێیان
ژ وان ناخـوازی [بەرانبـەر قورئانـێ و ئەڤـا تـو بـۆ وان
دبێـژی، وەکـی زانایـێـت جوهیـیان دکـەن]، و ئـەڤ
قورئانـە ب تنـێ دەرس و بیرئینانـە بۆ هەمـی خەلکی [نە
بـەس بۆ قورەیشیـیان ب تنـێ]. ﴿١٠٥﴾ و چەند گەلەکن
ئایەتێـت خـودێ د ئـەرد و ئەسـماناندا ئەوێـت ئـەو د
بـەررا دبـۆرن، و رویـیـێ خـۆ ژێ وەردگـێڕن. ﴿١٠٦﴾ و
باراپـتر ژ وان باوەریـیێ ب خـودێ نائینـن، ئەگـەر ئەو
هـەر د وی وەختیـدا هەڤپشـکان بـۆ خودێ چـێ نەکەن.
﴿١٠٧﴾ ڤێجا ئـەرێ ئـەو پشـت ڕاسـت بـوون، ئیزایـەکا
دژوار ژ دەڤ خـودێ بـۆ وان نائێـت، یـان ڕۆژا قیامەتێ
ژ نشـکەکێڤە ب سـەر وانـدا نائێـت، و وان هـای ژ خـۆ
نـە؟! ﴿١٠٨﴾ [هـەی موحەمـەد] بێـژە: ئەڤـە ڕێـکا منـە
[کـو دەعـوە و بانگهلدێریـیە بـۆ ڤـی دینـی]، و ئـەز ب
زانـین و ب بەلگەیـێـت ئاشـکەرا بانگی بـۆ ڕێکا خودێ
هلددێـرم، ئـەز و هنـدی ب دویڤ من کەڤتـین، و پاقژی
بـۆ خـودێ بیـت ژ هەمـی کێماسـیـیان، و ئـەز نـە ژ وانم
یـێـت هەڤپشـکان بـۆ خـودێ چـێ دکـەن. ﴿١٠٩﴾ و مـە
بـەری تـە چـو پێغەمبەر نەشـاندینە ژ خەلکـێ گوندان، مە وەحی بـۆ هنارتبیت، ئەگـەر زەلام نەبـن [ئانکو مرۆڤ
بـوون نـە ملیاکـەت..]، ڤێجـا مـا ئـەو د ئەردیـدا ناگـەڕن [و بزانـن]، کا دویماهیـکا یـێـت بـەری وان بـوو چ؟ و
ب ڕاسـتی ئاخـرەت بـۆ پارێـزکاران چێـترە، ڤێجـا ما هویـن ڤـێ نوزانـن. ﴿١١٠﴾ گاڤـا پێغەمبـەر [ژ بـاوەری ئینانا
ملەتێـت خـۆ] بێ هیڤی بوویـین، و هزر کریـن کو ئەو درەویـن هاتنە دانان ژ بـەرێ ملەتێت خۆڤە، و سـەرکەڤتنا
ئەو ل هیڤیـیێ نەهات، وی دەمی سـەرکەڤتن و هاریکاریـیا مە گەهشـتە وان، ڤێجا ئەو هاتە رزگارکرن یـێ مە
ڤیایـی [پێغەمبـەر و یـێـت بـاوەری د گـەل ئینایـین]، و ئیزایا مە ژ ملەتـێ گونەهـکار نائێتە ڤەگێڕتـن و ژێ نادەینە
پـاش. ﴿١١١﴾ ب ڕاسـتی د سەرهاتیـیێت وانـدا دەرس و چامە هەبـوون بۆ ئاقلـداران، ئەڤ قورئانە نـە ئاخڤتنەکا
چێکریـیە [هەروەکـی گـاور دبێژن]، بەلـێ ڕاسـتدەرئێخا کتێبێت بەری خۆیـە، و دیارکەر و ڕۆنکـەرە ب درێژی
بـۆ هەمـی کاروبارێـت دینـی، و ڕاسـتەڕێیی و دلۆڤانیـیە بۆ وان ئەوێـت باوەریـیێ دئینن.

سُورَةُ الرَّعْدِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِۗ وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ
وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ١ ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ
كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُم
بِلِقَآءِ رَبِّكُمۡ تُوقِنُونَ ٢ وَهُوَ ٱلَّذِي مَدَّ ٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ
وَأَنۡهَٰرٗاۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ
ٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ٣ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ
قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ صِنۡوَانٞ
وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ
فِي ٱلۡأُكُلِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ٤ ۞وَإِن تَعۡجَبۡ
فَعَجَبٞ قَوۡلُهُمۡ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ
أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ
أَعۡنَاقِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٥

ثلاثة أرباع الحزب ٢٥



## سۆرەتا ڕەعەد

### ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٤٣) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ ب ڤـی ڕەنگـی دئێتـە خوانـدن ئەلـف لام، میـم، ڕا، و ئـەڤ تیپـە ئیشـارەتن ل سـەر ئیعجـازا قورئانـێ، و ئـەڤ ئایەتێت ڤـێ سـۆرەتێ ئایەتێـت قورئانێنـە، قورئانا ژ دەڤ خودایــێ تە بۆ تە هاتییـە خوارێ، کـو قورئانەکا هـەق و دورسـتە، بەلـێ باراپـتر ژ مرۆڤـان باوەریــێ ب ڤـێ هەقیــێ نائینـن، ئەڤـە [سـۆرەتە] ئایەتێـت کتێبا (قورئانـا) ڕۆنکـەرن. ﴿٢﴾ ئەو خودایــێ ئەسـمان وەکی هویـن دبینن بێ سـتوین بلندکرین، پاشـی بلندبوو سـەر عەرشـی [بلندبوونـەکا بـێ چاوایی و لائقـی وی] و ڕۆژ و هەیـڤ بـن ئەمری خۆ کرن [ئێخسـتنە د بەرژەوەندیـیا بەنیــیاندا]، و هەمـی دئێن و دچن هەتـا ڕۆژەکا دیارکری ل دەڤ خـودێ [کـو ڕۆژا قیامەتییـە] و کاروبارێـت ئافراندنـێ ب ڕێڤـە دبـەت و ئایـەت و نیشـانان بـۆ هەوە ڕۆن دکـەت [دا هویـن پـێ بگەهنە تاك و تەنیاییـیا خودێ و دەستهەلاتداریـیا وی پێ بنیاسـن]، بەلکی هوین بێ گۆمـان باوەریــێ ب ژڤانێ خودایــێ خـۆ بینن کـو ڕۆژا قیامەتییە. ﴿٣﴾ و ئەو خودایــێ ئەرد ژ بەرێك کێشـایی و دەشـتکری [کـو ب کـێر ژیانـێ بهێـت ]، و چیاییێـت بنەجهــ[کـو بـۆ ئـەردی ببنـە سـنگ و نەهێلـن ژ بەرێك بچیـت]، و ڕوبـار ئێخسـتنە تێـدا، و ژ هەمی ڕەنگێـت فێقی جۆت جۆتـە دان [نێر و مێ، بچویـك و مەزن، ترش و تەحـل، تیـژ و شرین...هتد] شـەڤێ ب سـەر ڕۆژێ دادەدەت، و ب ڕاسـتی ئەڤە [ئەڤێت بۆرین ژ بەرێك کێشـانا ئـەردی، هەتـا دان و چێکرنـا فێقیــێ ڕەنـگ ڕەنـگ] نیشـان و بەلگەنـە بـۆ وان ئەوێـت هـزرا خـۆ تێـدا دکـەن. ﴿٤﴾ و د ئەردیـدا هنـدە پارچەیــێت ب ڕەخێکڤـە و نێزیکـی ئێـك [بەلـێ نەوەکی ئێکن، ئەڤە یــێ قەلـەوە و ئەڤە نـە] و جنیکێـت تـری و چاندنـێ و دارقەسـپێت وەکـی ئێـك [دو تـا ژ ئێك بنـێ دەرکەڤتی] یــێت هەیـن نەوەکی ئێـك [هـەر ئێـك ل سـەر بنـێ خۆ]، یــێت هەیـن هەمی ب ئێـك ئـاڤ دئێنە ئاڤـدان، و ئـەم خوارنا هنـدەکان ب سـەر هنـدەکان دئێخـین، ب ڕاسـتی ئەڤـە هەمـی [کـو ئـەرد ب سـەرێکڤەیە و نەوەکـی ئێکـە، و ئێك ئـەرد چەند ڕەنگێـت شـینکاتی ژێ دەردکەڤـن، و گەلـە ڕەنگێت فێقی ل سـەر ئاخەکێ شـین دبـن، و ب ئاڤەکـێ دئێنە ئاڤدان بەلـێ تـام و ڕەنگێـت وان ژێـك جودانە]، نیشـان و بەلگەنە بـۆ وان ئەوێت تـێ دگەهن و ئەقلێ خۆ ددەنە شـۆلی. ﴿٥﴾ و ئەگـەر تـو بـۆ تشـتەکی عەجێبگرتی ببـی، ئاخڤتنا وان جهـێ عەجێبگرتنییـە و عەجێبە، دەمـێ دبێژن ئەرێ پشـتی ئـەم دبینـە ئاخ، جـارەکا دی دێ سـاخ بینەڤـە؟! ئەڤە ئەون یــێت بـاوەری ب هێز و شـیانا خـودێ نەیی، و ئەڤـە ئـەون یــێت زنجـیر و قەید د سـتۆیاندا، و ئەڤـە دۆژەهینە و هەروهـەر دێ د دۆژەهێـدا مینن.

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ وَقَدْ خَلَتْ مِن
قَبْلِهِمُ ٱلْمَثُلَٰتُ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ
وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٦﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَآ
أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦٓ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٌ وَلِكُلِّ قَوْمٍ
هَادٍ ﴿٧﴾ ٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ
وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَىْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ ﴿٨﴾ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ
وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْكَبِيرُ ٱلْمُتَعَالِ ﴿٩﴾ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ
أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ
بِٱلنَّهَارِ ﴿١٠﴾ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ
يَحْفَظُونَهُۥ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟
مَا بِأَنفُسِهِمْ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ وَمَا
لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴿١١﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا
وَطَمَعًا وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ
وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِۦ وَيُرْسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا
مَن يَشَآءُ وَهُمْ يُجَٰدِلُونَ فِى ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ ﴿١٣﴾



﴿٦﴾ و ئەو لەزا جزاكرنێ ل تە دكەن بەری باشیێ [ژ لەكەڤە دگۆتن كا ئیزایا تو مە پێ دترسینی، بۆچی بۆ مە نائێت؟]، و ب ڕاستی بەری وان جزایێت بۆرین، ئەو جزا یێت ب سەرێ یێت وەكی وان هاتین، ئەوێت ئایەت و پێغەمبەرێت خۆ درەوین دانایین، ب ڕاستی خودایێ تە بۆ مرۆڤان د سەر ستەما وانرا لێنەگر و گونەهـ ژێبەرە، و ب ڕاستی خودایێ تە یێ ئیزاگرانە. ﴿٧﴾ و ئەوێت گاوربوویین دبێژن: بلا موعجیزەیەك ژ دەڤ خودایێ وی بۆ هاتبا خواری [بێی كو چو بۆ ڤێ قورئانێ و موعجیزەیێت دی یێت دیتین وەكی كەربوونا هەیڤێ و زانا ئاڤێ د ناڤ تلاندا... هتد، بدانن] ب ڕاستی بەس تو ئاگەهداركەری [ئانكو تو یێ هاتییە هنارتن، دا وان هشیار بكەی و بترسینی] و هەر ملەتەكی پێغەمبەرێ خۆ یێ هەی [ئانكو هەر پێغەمبەرەكی دێ ڕەنگەكێ موعجیزەیان دەینێ]. ﴿٨﴾ و ب ڕاستی خودێ دزانیت كا هەر مێیەك ب چ ئاڤس و ئاڤا دبیت و كا مالبچویك ب چ كێم دبیت [ب بوونا بچویكی] و كا ب چ زێدە دبیت [ب چێبوونا بچویكی]، و هەر تشتەكێ هەبیت ل دەڤ وی [ل دەڤ خودێ]، وەختێ خۆ یێ دەستنیشانكری یێ هەی، نەدچیتە پاش و نەدئێتە پێش. ﴿٩﴾ زانایێ تشتێ ڤەشارتی [غەیبێ] و تشتێ بەرچاڤە، یێ مەزنە هەمی تشت د بن ویدانە، و یێ بلندە د سەر هەمی تشتانرایە ب خۆیاتی و سالۆخ و كریارێت خۆڤە. ﴿١٠﴾ ل دەڤ وی ئێكە، چ ئێك ژ هەوە د دلێ خۆدا ئاخڤتنا خۆ بێژیت یان ئاشكەرا.. و چ ئێك ژ هەوە خۆ ب شەڤێ ڤەشێریت، و چ ڕۆژێ ب ڕێكا خۆ بچیت، هەر دزانیت. ﴿١١﴾ بۆ ڤان [مەخسەد یێ ئاخڤتنا خۆ د دلێ خۆدا دبێژیت یان ئاشكەرا دكەت، و یێ خۆ ب شەڤێ ڤەدشێریت و ڕۆژێ ب ڕێكا خۆ دچیت] ملیاكەتێت هەین ل دویڤ ئێك و د دۆر وەردئێن، و وان ب ئەمرێ خودێ ژ سینگی و پشتێڤە دپارێزن، ب ڕاستی خودێ سەروبەرێ چو ملەتان ناگوهۆڕیت و خێر و كەرەمێت خۆ ژ وان نابڕیت، هەتا ئەو ژ دەڤ خۆ نەگوهۆڕن، و ئەگەر خودێ بەلایەك و ئاتافەك بۆ ملەتەكی ڤیا، چو ڤەگرتن بۆ نینە، و وان ژ بلی خودێ چو پشتەڤان نینن [هەوارا خۆ بگەهیننێ]. ﴿١٢﴾ و ئەوە برویسیان بۆ ترسێ و تەماییێ [تەماییا هاتنا بارانێ] نیشا هەوە ددەت، و هەر ئەوە عەورێت گرانێت بارانێ چێ دكەت. ﴿١٣﴾ و هەر ئەوە برویسی تەسبیح و پەسنا وی دكەن، و ژ كێماسیان پاقژ دكەن، و ملیاكەت ژی ژ ترسا ئیزایا وی تەسبیحا وی دكەن، و برویسیان دهنێریت هەر كەسێ بڤێت دێ پێ هنگێڤیت [دگەل ڤێ ژی هێژ] ئەو ب خۆ جڕەبڕێ د دەرهەقێ خودێدا دكەن، و ل شیانا خودێ ب شكن، و ب ڕاستی خودێ یێ تەكبیر موكومە بۆ نەیارێت خۆ.

لَهُۥ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ ۖ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَىْءٍ إِلَّا
كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ ۚ وَمَا دُعَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ
إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿١٤﴾ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا
وَكَرْهًا وَظِلَٰلُهُم بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ ۩ ﴿١٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ سَجْدَة
وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ لَا يَمْلِكُونَ
لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَمْ هَلْ
تَسْتَوِى ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُ ۗ أَمْ جَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُوا۟ كَخَلْقِهِۦ فَتَشَٰبَهَ
ٱلْخَلْقُ عَلَيْهِمْ ۚ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّٰرُ ﴿١٦﴾ أَنزَلَ
مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌۢ بِقَدَرِهَا فَٱحْتَمَلَ ٱلسَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا ۚ
وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِى ٱلنَّارِ ٱبْتِغَآءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَٰعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُۥ ۚ
كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ وَٱلْبَٰطِلَ ۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَآءً ۖ
وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ
ٱلْأَمْثَالَ ﴿١٧﴾ لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا۟
لَهُۥ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦٓ ۚ
أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٨﴾



﴿١٤﴾ كەلیما تەوحیدێ (لا إله إلا الله) یا ویـیە و داخـوازا دوعایا ڕاست ژ ویـیە، و ئەوێت گازییا غەیری خـودێ دكـەن گازیـیا وان ب تشتەكی نائێتە وەرگرتن، و ئەڤـە وەكـی ویـیە یـێ هـەردو مستێت خـۆ درێژكرینە ئاڤـێ دا ئـاڤ بگەهیتە دەڤـێ وی، و ئـاڤ ب خـۆ ناگەهیتێ، و دوعـا و عیبادەتـێ گـاوران بـۆ بوتـان، ژ گومڕایـی و بەرزەبوونـێ پێڤەتـر نینـە. ﴿١٥﴾ و كا چ د ئـەرد و ئەسـمانیدا هەیـە، و سیبەرا وان ژی سپێدە و ئێڤـاران بڤێن نەڤێن سوجدەیـێ بـۆ خـودێ دبـەن [ئانكو د بـن برپـار و فەرمانـا خودێڤەنە]. ﴿١٦﴾ [هـەی موحەمـەد] بێـژە: كـی خودانـێ ئـەرد و ئەسمانانە؟ بێـژە: خودێیـە، [پاشـی] بێـژە: ئـەرێ چـاوا هـەوە ژ بلی خـودێ پشـتەڤان و پەرسـتی گرتینە، نەشـێن مفایەكـی یـان زیانەكـێ بگەهیننـە خـۆ ب خۆ؟[پاشـی] بێژە: ئـەرێ مرۆڤێ كۆرە [گاور] و ب چاڤ [موسلمان] وەكـی ئێكـن، یـان ژی تاریاتـی و ڕۆناهـی وەكـی ئێكن [گـاوری و بـاوەری]، یـان ژی وان هنـدە هەڤپشـك بـۆ خـودێ دانایـینە، چێكـری وەكـی چێكرییـێت وی ئافراندینـە؟! ڤێجـا چێكـری ل دەڤ وان وەكـی ئێـك لـێ هاتینە، ژێك نانیاسـن؟! بێـژە: خودێ چێكـەرێ هەمی تشتییـە، و ئـەو یـێ تـاك و تەنیـا و سـەردەت و دەستهەلاتدارە ل سـەر هەمـی تشـتان. ﴿١٧﴾ [مەتـەلا هەقییـێ و پویچییـێ و پەرسـتنا خـودێ و پەرسـتنا پویـچ و بوتـان وەكـی ڤێیـە] خودێ بـاران ژ ئەسـمانان دارێـت، ڤێجا هـەر شـیڤ و نهالەكـێ تەمەتـی وێ ئـاڤ تـێرا چـۆ [نهالا بچویـك كێم ئـاڤ تێرا چـۆ، و یا مـەزن گەلـەك]، ڤێجا لەیـی و لێمشـت چـۆن و كەفـەكا بلنـد د گەل خـۆ ڕاكر [ئەڤە ئـەو مەتەلە یـا خودێ گۆتـی، د دەرهەقی هەقییـێ و پویچییێدا، مەتـەلا هەقییـێ د بنەجهیـیا خـۆدا، و پویچییـێ د نەمانـا خـۆدا، وەكـی بارانییـە ژ ئەسمانان بێتە سـەر ئـەردی و ببیتـە لەیـی و لێمشـت و كەڤێ د گـەل خۆ ڕاكـەت، هندی هەقییـە ئەو ئاڤا سپییـە ئـەوا د ئەردیدا دمینیـت، و هنـدی پویچییـە ئەو كەفە ئـەوا ب كێر چو نەئێت و كـەس مفایی ژێ نەكـەت]، و [مەتەلا دی] وەكی وی تشتییـە ئـەوێ هویـن ئاگری ل سـەر هەلدكـەن، دا بۆ خۆ بگەهنـە چەكەكێ ژنـان وەكی زێـڕی و زیڤی، یان دا بگەهنـە متایەكـێ دی وەكـی ڕساسـی و سـفری، ئەڤـە ژی وەكـی وێ ئاڤێ كەفەك ب سـەر دكەڤیـت، و ب ڤی ڕەنگـی خـودێ بۆ دیاركرنا هەقییـێ و پویچییـێ مەتـەلان دئینیت، ڤێجا ئەو كەفا ب سـەر دكەڤیت [چ ب سـەر ئاڤێ و چ ب سـەر حەلاندنـا مەعدەنـان وەكـی زێـڕی و زیڤی و سـفری و ڕساسـی] بێ مفـا دچیـت و نامینیت، بەلـێ ئـەوا مفایـی دگەهینیتـە خەلكـی و ب كـێر دئێت [وەكی ئاڤـێ و مەعدەنـێ پاقـژ] د ئەردیدا دمینیـت [ئانكو هەقـی هۆسـا دێ مینیـت و پویچـی دێ چیـت و ب كـێر نائێـت]، هۆسـا خـودێ مەتـەلان دئینیت. ﴿١٨﴾ یـێت بەرسـڤا خودایـێ خۆ دایـین بەحەشـت بۆ وانە، و ئەوێت بەرسڤا خودایـێ خۆ نەدایـین [ڕۆژا قیامەتێ] ئەگەر هنـدی د ئەردیـدا هەی یـێ وان بایە، و هنـدی دی ژی دگەل، دا د پێـش خۆڤە دەن [بەلـێ ژ وان نائێتە وەرگرتن، و ژ ئێزایـێ ڕزگـار نابـن]، ئەهـا ڤـان حسـابەكا ڕەش یـا هـەی، و جهـێ وان دۆژەهە و پیسـە جهە.

الحزب ٢٦

۞أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ
أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾
وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ
وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ
وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ وَيَدۡرَءُونَ
بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا
وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ
عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾
وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ
مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ
ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ
وَيَقۡدِرُۚ وَفَرِحُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا
مَتَٰعٞ ﴿٢٦﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قُلۡ
إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَنۡ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾





﴿١٩﴾ ئەرێ ئەوێ دزانیت ئەڤا بۆ تە ژ دەڤ خودایێ تە هاتییە خوارێ وەحییە و ڕاستە، وەکی وییە یێ کۆرە و ڤێ نەزانیت [کو ئەڤە ڕاستە و هەقە]، و ب ڕاستی ئەو ب تنێ دێ بۆ خۆ پێڤەچن ئەوێت تێگەهشتی و ئاقلدار. ﴿٢٠﴾ [و ئاقلدار] ئەون ئەوێت پەیمانا خودێ ب جه دئینن، و ئەو پەیمانا وان دایییە خودێ ناشکێنن. ﴿٢١﴾ و ئەون ئەوێت یا خودێ فەرمان پێ دایی ب گەهیننە ئێك، دگەهیننە ئێك [وەکی مرۆڤاتییێ و چاڤدێرییا ئێتیم و هەژاران]، و ژ خودایێ خۆ دترسن و پارێزکارییا وی دکەن، و سەهمێ ژ حسابا ڕۆژەکا ڕەش دکەن. ﴿٢٢﴾ و ئەون یێت بۆ نکارێ (رازیبوونا) خودێ بێنا خۆ فرەه دکەن [ل سەر گوهدارییا خودێ، و ل سەر تشتێ حەرام، و ل سەر قەدەرا خودێ]، و نڤێژێت خۆ وەکی خودێ ژێ ڤیایی دکەن، و ئاشکەرا و نەپەنی ژ وی ڕزقێ مە دایییێ ددەن و دکەنە خێر، و باشییێ شوینا خرابییێ ددانن، و خرابییێ ب باشییێ ددەنە پاش، ئەڤان خەلاتێ وان بەحەشتە. ﴿٢٣﴾ بەحەشتێت ئاکنجیبوونێ، ئەوێت ئەو و ئەوێت قەنج ژ دەیباب و هەڤسەر و دویندەها خۆ دچنە تێدا، و ملیاکەت د هەمی دەرگەهانرا ب سەر وانڤە دچن [سەرا وان ددەن]. ﴿٢٤﴾ [دبێژنێ] سلاڤ ل هەوە بن ژ بەر وێ بێنفرەهییا هەوە ل سەر پارێزکارییا خودێ کری، هەوە پیرۆز بیت ئەڤ دویماهیکا هۆسا یا جوان. ﴿٢٥﴾ و ئەوێت پەیمانا خودێ پشتی موکومکرنێ دشکێنن، و ئەو تشتێ خودێ فەرمان پێ کری بگەهیتە ئێك دبڕن، و خرابییێ د ئەردیدا دکەن، ئەڤان لەعنەت و دویرکەڤتن ژ دلۆڤانییا خودێ بۆ وان بیت، و دویماهیکەکا خراب ژی بۆ وان یا هەی. ﴿٢٦﴾ خودێ بۆ یێ بڤێت ڕزقی بەرفرەه و کێم دکەت، و ئەو ب ژینا دنیایێ [ئەو تشتێ خودێ دایییێ] شایی بوون، و ژیانا دنیایێ ل بەر ئاخرەتێ ژ متایەکێ کێم پێڤەتر نینە. ﴿٢٧﴾ و ئەوێت گاوربوویین دبێژن: دێ بلا موعجیزەیەك بۆ وی [ژی] ژ دەڤ خودایێ وی هاتبایە [وەکی موعجیزەیێت مووسا پێغەمبەر و عیسا پێغەمبەری]، بێژە: [ئەو کارەکە ب دەستێ خودێیە، ڤێجا یێ خودێ ڕاستەڕێ نەکری، موعجیزە ژی فایدەی وی ناکەن]، خودێ هەر کەسێ بڤێت دێ بەرزەکەت، و هەر کەسێ ب تەوبەیێ ب بالڤە بزڤڕیت، دێ ڕاستەڕێ کەت. ﴿٢٨﴾ [ئەوێت ب بال خودێڤە زڤڕین و هاتینە ڕاستەڕێکرن] ئەون ئەوێت باوەری ئینایین و دلێ وان ب بیرئینان و زکرێ خودێ ڤەدهەسیت و تەنا دبیت، [باش] بزانن دل ب بیرئینان و زکرێ خودێ ڤەدهەسن و تەنا دبن.

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمۡ وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ ٢٩
كَذَٰلِكَ أَرۡسَلۡنَٰكَ فِيٓ أُمَّةٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهَآ أُمَمٞ لِّتَتۡلُوَاْ
عَلَيۡهِمُ ٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَهُمۡ يَكۡفُرُونَ بِٱلرَّحۡمَٰنِۚ قُلۡ هُوَ رَبِّي
لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ مَتَابِ ٣٠ وَلَوۡ أَنَّ قُرۡءَانٗا
سُيِّرَتۡ بِهِ ٱلۡجِبَالُ أَوۡ قُطِّعَتۡ بِهِ ٱلۡأَرۡضُ أَوۡ كُلِّمَ بِهِ ٱلۡمَوۡتَىٰۗ
بَل لِّلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ جَمِيعًاۗ أَفَلَمۡ يَاْيۡـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن لَّوۡ يَشَآءُ
ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۗ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم
بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ أَوۡ تَحُلُّ قَرِيبٗا مِّن دَارِهِمۡ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ وَعۡدُ
ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ٣١ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن
قَبۡلِكَ فَأَمۡلَيۡتُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ثُمَّ أَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ
عِقَابِ ٣٢ أَفَمَنۡ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۗ وَجَعَلُواْ
لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلۡ سَمُّوهُمۡۚ أَمۡ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَم
بِظَٰهِرٖ مِّنَ ٱلۡقَوۡلِۗ بَلۡ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ مَكۡرُهُمۡ وَصُدُّواْ عَنِ
ٱلسَّبِيلِۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ٣٣ لَّهُمۡ عَذَابٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَقُّۖ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ ٣٤



﴿٢٩﴾ ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت قەنج
کرین، خۆشترین ژیان و باشترین دویماهیك بۆ وان
هەیە. ﴿٣٠﴾ و هۆسا [کا چاوا مە پێغەمبەر بەری تە
هنارتینە] مە تو ژی هنارتییە ناڤ ئوممەتەکێ، بەری
وان گەلەك ئوممەت ییێت هاتین و چۆیین، دا ئەوا مە
بۆ تە ب وەحی هنارتی بۆ وان بخوینی، و ئەو ب خۆ
بێ باوەرن ژ خودێ، بێژە: ئەو خودایێ منە، ژ وی
پێڤەتر چو خودا نینن، من خۆ هەلپەسارتێ و پشتا
خۆ پێ موکوم کر، و زڤڕینا من هەر ب بال ویڤەیە.
﴿٣١﴾ و ئەگەر ب [خواندنا] کتێبەکێ چیا ژ جهێ خۆ
چۆبانە و ئەرد پێ پەق پەق بووبایە، و مری پێ هاتبانە
ئاخاڤتن [دا ئەڤ قورئانە بیت]، بەلێ هەمی کاروبار
ب خودێنە، ئەرێ ئەوێت باوەری ئینایین ژ باوەری
ئینانا گاوران بێ هیڤی نەبوویینە، و بزانن نێ ئەگەر
خودێ ڤیابایە، دا هەمی مرۆڤان ڕاستەڕێ کەت، و
ئەوێت گاوربوویین ژ بەر یا وان کری بەردەوام ئاتاف
و نەخۆشی دێ ب سەرێ وان ئێن، یان ژی ئەو بەلا
و ئاتاف دێ نێزیکی مالێت وان بن [ڤێجا بلا بترسن
نەکو سەرشەقێت وان ب سەر واندا بێنە خواری یان وان بهنگێڤیت] هەتا ژڤانێ خودێ دئێت [بۆ وان،
بمرن یان قیامەت ل وان ڕابیت]، خودێ ژ پەیمانا خۆ لێڤە نابیت. ﴿٣٢﴾ ب ڕاستی ترانە ب پێغەمبەرێت
بەری تە ژی ییێت هاتینە کرن، ڤێجا مە دەلیڤە و مۆلەت دا وان ییێت باوەری نەئینایین [و مە ل دویڤ وان
بەردا]، پاشی مە ئەو ب ئیزایا خۆ هنگاڤتن، ڤێجا بەرێ خۆ بدێ کا جزا و ئیزایا من بۆ وان یا چاوا بوو.
﴿٣٣﴾ ئەرێ ئەوێ زێرەڤان و شاهد ل سەر هەمی کەسان و ئاگەهدار ب هەمی کار و کریارێت وان، چ قەنج
چ خراب، و هەر ئێکی جزایێ وی ل دویڤ کارێ وی بدەتێ، وەکی وییە یێ ئەڤە هەمی نەیی، کو بوت
و سەنەمێت هەوەنە [ئانکو ئەو خودایێ ب ئاگەهـ ژ هەمی تشتان و ڕێڤەبەرێ جیهانێ، نەوەکی وان بوتانە
ئەوێت موشرکان بۆ کرینە هەڤپشك] و [گاوران] هەڤپشك بۆ خودێ چێکرینە، [هەی موحەمەد] بێژە: کا
ناڤ و سالۆخێ وان هەڤپشکێت هەوە بۆ خودێ چێکرین بێژن [وان چ سالۆخ هەنە پێ هێژایی پەرستنێ
ببن]، یان ژی هوین خودێ ئاگەهداری وێ دکەن یا ئەو د ئەردیدا ژێ بێ ئاگەهـ؟! [کو ئەوە ـ ب دیتنا هەوە
ـ هەڤپشك هەنە پێ نوزانیت]، یان ژی هوین ئاخڤتنەکا بێ بنیات و نەڕاست دکەن.. [نەخێر وەنینە یا ئەو
دبێژن و دکەن، خودێ چو هەڤپشك نینن]، بەلکی فند و فێلێت وان [شەیتانی و گاوری و دژمنیا وان بۆ
ئیسلامێ و چێکرنا هەڤپشکان بۆ خودێ] بۆ وان هاتینە خەملاندن، و ژ ڕێکا خودێ ییێت هاتینە پاشڤەبرن،
و هەر کەسێ خودێ گومڕا و بەرزە بکەت، ڕاستەڕێکەر بۆ نینە. ﴿٣٤﴾ د دنیاییدا دێ ڤان گاوران هەڤتووشی
ئیزایەکێ کەین [ب کوشتنێ و ئێخسیرکرنێ و هەمی ڕەنگێت ئاتافان]، و ب ڕاستی ئیزایا ئاخرەتێ ل سەر
وان گرانتر و مەزنترە، و وان چو پارێزڤان نینن وان ژ ئیزایا خودێ بپارێزن.

الحزب ٢٦

* مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ ۖ
أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا ۚ تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ ۖ وَّعُقْبَى
ٱلْكَـٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَفْرَحُونَ
بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ ۖ وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُۥ ۚ قُلْ إِنَّمَآ
أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ ۚ إِلَيْهِ أَدْعُوا۟ وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ ﴿٣٦﴾
وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَـٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا ۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ
مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا وَاقٍ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ
أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً ۚ وَمَا كَانَ
لِرَسُولٍ أَن يَأْتِىَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴿٣٨﴾
يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ ۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَـٰبِ ﴿٣٩﴾ وَإِن مَّا
نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَـٰغُ
وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴿٤٠﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا
مِنْ أَطْرَافِهَا ۚ وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ ۚ وَهُوَ سَرِيعُ
ٱلْحِسَابِ ﴿٤١﴾ وَقَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلِلَّهِ ٱلْمَكْرُ جَمِيعًا ۖ
يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ ۗ وَسَيَعْلَمُ ٱلْكُفَّـٰرُ لِمَنْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٤٢﴾



﴿٣٥﴾ رەوشا وێ بەحەشتێ ئەوا ژڤان بۆ پارێزكاران پێ هاتییە دان، ڕوبار د بنڕا دچن و فێقی و سیبەرا وێ بەردەوامن [نە فێقی خلاس دبیت وەكی یێ دنیایێ، و نە سیبەر كێم دبیت و دچیت]، و ئەڤەیە دویماهیكا وان ئەوێت پارێزكاری كرین، و دویماهیكا گاوران ژی ئاگرە. ﴿٣٦﴾ و ئەوێت كتێب بۆ هاتین [جوهی و فەلەیێت موسلمان بوویین وەكی عەبدوللایێ كوڕێ سەلامی و نەجاشی و... هتد] كەیفا وان ب وێ دئێت یا بۆ تە هاتی [كو ئەڤ قورئانەیە، چونكی د كتێبێت واندا شاهد و مزگینی پێ هەنە]، و هندەك دەستەك و كۆم یێت هەین [ژ جوهی و فەلەیان ئەوێت باوەری ب موحەمەدی نەئینایین] باوەرییێ ب هندەك قورئانێ نائینن، بێژە: ب ڕاستی فەرمانا من یا ب هندێ هاتییە كرن، ئەز خودێ ب تنێ بپەرێسم و چو هەڤپشكان بۆ چێ نەكەم، و ئەز خەلكی بەس بۆ ڕێك و پەرستنا وی تنێ ڤەخوینم، و زڤرینا من هەر ب بال ویڤەیە. ﴿٣٧﴾ [كا چاوا مە كتێب بەری تە ب زمانێ وان ملەتان هنارتینە یێت پێغەمبەر بۆ چوویین] وەسا مە ئەڤ قورئانە بۆ تە ب زمانێ عەرەبی ئینایییە خوارێ، و ئەگەر تو ب دویڤ دلخوازییا وان بكەڤی پشتی وێ زانینا بۆ تە هاتی [ئەگەر پشتی ڤێ تو گوهێ خۆ بدەیە دلخوازییا وان]، ڤێجا تە ژ بلی خودێ چو هاریكار و پارێزڤان نینن [تە ژ ئیزایا خودێ بپارێزن]. ﴿٣٨﴾ و ب ڕاستی مە بەری تە پێغەمبەر یێت هنارتین [ئەو ژی وەكی تە مرۆڤ بوون] و مە ب ژن و دویندەهـ ئێخستبوون، و بۆ چو پێغەمبەران بەری تە چێ نەدبوو موعجیزەیەكێ بینیت، ئەگەر ب دەستویرا خودێ نەبایە، هەر تشتەكێ هەبیت وەختێ خۆ یێ دیاركری و كتێبا خۆ یا تێدا نڤیسی هەیە [نەدئێتە پێش و نەدچیتە پاش]. ﴿٣٩﴾ [و د ڤێ كتێبێدا] هەچییا خودێ بڤێت ژێ دبەت، و هەچییا بڤێت دهێلیت، و كتێبا سەرەكی و ئەسلی [كو دەپێ پارستییە] ل دەڤ وییە. ﴿٤٠﴾ و ب ڕاستی ئەگەر ئەم هندەك ژ وێ ئیزایا مە ژڤان و پەیمان پێ داییە وان، ب سەرێ وان بینین [هێژ تو یێ ساخ] و نیشا تە بدەین، یان ژی [هێژ مە نیشا تە نەدایی] ئەم تە بمرینین، ڤێجا ب ڕاستی بەس گەهاندنا ڤێ پەیامێ ل سەر تەیە، و حساب و جزایێ وان ل سەر مەیە [نە ل سەر تەیە]. ﴿٤١﴾ ئەرێ ما ئەو نابینن ئەم ئەردی ل دۆرماندۆرێت وان كێم دكەین، [و ئەردێ وان بەربەر كێم دكەین، و موسلمانان ل سەر وان سەردەست دكەین، و ب دەست موسلمانانڤە بەرددەین]، و خودێ حوكمی دكەت و كەس نینە حوكمێ وی ڤەگریت، و ئەو ب خۆ یێ حسێب سڤكە. ﴿٤٢﴾ و ب ڕاستی گاورێت بەری وان [بەری خەلكێ مەكەهێ] پیلان و ئۆیین ب خرابی بۆ پێغەمبەرێت خۆ گێڕان، و خودێ ب هەمی پیلان و ئۆیینان یێ ئاگەهدارە [ئانكو نەخشەكێشانا كەسێ بەرانبەری نەخشەكێشانا خودێ نینە]، دزانیت كا هەر كەسەك چ دكەت، و گاور دێ زانن كا دویماهیكا كێ [یا وان یان یا موسلمانان] دێ یا باش بیت.

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَسۡتَ مُرۡسَلٗاۚ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدَۢا
بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ وَمَنۡ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلۡكِتَٰبِ ﴿٤٣﴾

## سُورَةُ إِبۡرَاهِيمَ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ
إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴿١﴾
ٱللَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَوَيۡلٞ
لِّلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٖ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسۡتَحِبُّونَ
ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ
ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٖ ﴿٣﴾ وَمَآ
أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ
فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ
ٱلۡحَكِيمُ ﴿٤﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنۡ أَخۡرِجۡ
قَوۡمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرۡهُم بِأَيَّىٰمِ
ٱللَّهِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ ﴿٥﴾



﴿٤٣﴾ و ئەویێت گاوربوویین دبێژن: تو نە پێغەمبەری، [هەی موحەمەد] بێژە: بەسی منە خودێ د ناڤبەرا من و هەوەدا، و ئەوێت زانینا کتێبان ل دەڤ هەی [ژ وان ئەوێت موسلمان بوویین وەکی عەبدوللایێ کورێ سەلامی و نەجاشی]، شاهد بن ل سەر پێغەمبەرینیا من.

## سۆرەتا ئیبراهیم

### ل مەکەهێ هاتیە خوارێ (٥٢) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ ب ڤی ڕەنگی دئێتە خواندن، ئەلف، لام، ڕا، ئەڤ قورئانە کتێبەکە مە بۆ تە ئینایییە خوارێ دا مرۆڤان ژ تاریستانێ [تاریستانا شرك و گاورییێ] ب دەستویریا خودێ دەربێخیە ڕۆناهیا باوەرییێ، ڕێکا خودایێ سەردەست و هێژایی شوکور و سوپاسییێ. ﴿٢﴾ ئەو خودایێ هندی د ئەرد و ئەسمانان‌دا هەی یێ وی، و هیلاك و نەخۆشی بۆ گاوران بیت ژ ئیزایەکا دژوار و گران. ﴿٣﴾ ئەوێت ژیانا دنیایێ ب سەر یا ئاخرەتێ دئێخن، و ڕێکا خودێ ل بەر خەلکی دگرن، و خوار و ڤیچ دخوازن، دا خەلکی ژێ بدەنە پاش، ئەڤە یێت د گومڕاییێیەکا دویر و ئاشکەرادا. ﴿٤﴾ و مە چو پێغەمبەر نەهنارتینە ئەگەر ب زمانێ وی ملەتی نەبیت یێ مە بۆ هنارتی [دا فەرمان و بەرنامەیێ خودێ] بۆ وان دیار بکەت، [پشتی پێغەمبەر بۆ وان دیار دکەت، ئەو نەشێت کەسێ ڕاستەڕێ بکەت]، ڤێجا یێ خودێ بڤێت دێ گومڕا و بەرزەکەت، و یێ بڤێت ژی دێ ڕاستەڕێ کەت، و ئەوە یێ سەردەست و کاربنەجهـ. ﴿٥﴾ و ب سویند مە مووسا ب موعجیزەیێت خۆ [کو نەهـ موعجیزە بوون] هنارت، [و مە گۆتێ] ملەتێ خۆ ئسرائیلیان [ئەوێت کەڤتینە د بن عەبدینیا فیرعەونیدا] ژ تاریستانا گاورییێ دەربێخە ڕۆناهیا باوەرییێ، و ڕویدان و قەومینێت خودێ [ئەوێت ب سەرێ ملەتان هاتین و پێ د هیلاك چۆیین] بینە بیرا وان، ب ڕاستی د ئینانەبیرا ڤان ڕویدانان‌دا نیشان و بەلگەیێت [مەزن] یێت هەین [ل سەر شیان و دەستهەلاتداریا خودێ] بۆ هەر ئێکێ گەلەك سەبرکێش و زێدە سوپاسدار بیت.

وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ
إِذۡ أَنجَىٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ
وَيُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي
ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ٦ وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكُمۡ
لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡۖ وَلَئِن كَفَرۡتُمۡ إِنَّ عَذَابِي
لَشَدِيدٞ ٧ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكۡفُرُوٓاْ أَنتُمۡ وَمَن فِي
ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ ٨ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَبَؤُاْ
ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ
مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لَا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا ٱللَّهُۚ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم
بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرَدُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فِيٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَقَالُوٓاْ إِنَّا كَفَرۡنَا
بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِي شَكّٖ مِّمَّا تَدۡعُونَنَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ ٩
نصف الحزب ٢٦ ۞ قَالَتۡ رُسُلُهُمۡ أَفِي ٱللَّهِ شَكّٞ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ
يَدۡعُوكُمۡ لِيَغۡفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرَكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ
مُّسَمّٗىۚ قَالُوٓاْ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا
عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأۡتُونَا بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ١٠



﴿٦﴾ و بیننە بیرا خۆ وەختێ مووسایی گۆتییە ملەتێ
خۆ: نیعمەت و کەرەمێت خودێ بیننە بیرا خۆ، وەختێ
هوین ژ فیرعەونییان رزگار کرین، کو وان ئیزایەکا
خراب و دژوار ددا بەر هەوە، کورێت هەوە دکوشتن
و ژن و کچێت هەوە [بۆ خدامینیا خۆ] دهێلان، ب
راستی ئەڤە ئەزموون و جەرباندنەکا مەزن بوو بۆ
هەوە. ﴿٧﴾ و بیننە بیرا خۆ وەختێ خودایێ هەوە
راگەهاندی [و هوین ئاگەهدار کرین] ئەگەر هوین
شوکور و سوپاسیا خودێ بکەن، ئەز دێ نیعمەتێت
خۆ ل هەوە زێدەکەم، و ئەگەر هوین چاڤکۆرەیییێ
بکەن، و نیعمەتێت من نەئیننە بەر چاڤێت خۆ [ئانکو
سوپاسیا نیعمەتێت من نەکەن] هنگی بزانن ئیزایا
مە یا گران و دژوارە. ﴿٨﴾ مووسایی گۆت: ئەگەر
هوین و هندی ئەوێت د ئەردیدا هەین گاور ببن [یان
سوپاسیا نیعمەتێت خودێ نەکەن]، ب راستی خودێ
یێ بێ منەتە و چو پاکی ب هەوە نینە [و سوپاسی و
شوکورا هەوە چو لێ زێدە ناکەت، و نەسوپاسیا
هەوە چو لێ کێم ناکەت]، و هێژایی سوپاسییێیە
[چونکی نیعمەتێت وی گەلەکن، و فایدەیێ سوپاسداریا وی هەر ل هەوە دزڤریت]. ﴿٩﴾ ئەرێ بەحس و
خەبەرێت ئەوێت بەری هەوە بۆ هەوە نەهاتییە، ملەتێ نووح و عاد و (سەموود) و یێت پشتی وان هاتین،
ژ بلی خودێ کەس نوزانیت کا چەند بوون، پێغەمبەرێت وان ب موعجیزە و نیشانێت ئاشکەراکەر بۆ هاتن،
ڤێجا هەردو دەستێت خۆ ژ کەرباندا کێشانە د دەڤێت خۆدا و گەزتن، و گۆتن: ب راستی ئەم باوەرییێ ب
وی تشتی نائینین یێ هوین پێ هاتین، و ب راستی ئەم بەرانبەری وی تشتێ هوین داخوازا مە بۆ دکەن ب
گۆمانین [ژێ بێ باوەرین]. ﴿١٠﴾ پێغەمبەرێت وان گۆتن: ئەرێ [هەوە] شك و گۆمانەك د خودێدا هەیە،
چێکەرێ ئەرد و ئەسمانان داخوازا هەوە دکەت، دا گونەهێت هەوە ژێ ببەت [یێت وی بڤێن]، و هەوە هەتا
وەختەکێ دیارکری بهێلیت و گیرۆ بکەت، گۆتن: هوین ژی مرۆڤن وەکی مە، هەوە دڤێت هوین بەرێ مە
ژ وان پەرستییان وەرگێرن، ئەوێت باب و باپیرێت مە دپەرستن، ڤێجا [ئەگەر هوین راست پێغەمبەر بن] کا
بەلگە و نیشانەکا رۆن و دیار بۆ مە بینن.

قَالَتۡ لَهُمۡ رُسُلُهُمۡ إِن نَّحۡنُ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ
يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأۡتِيَكُم
بِسُلۡطَٰنٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١١﴾
وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنَا سُبُلَنَاۚ وَلَنَصۡبِرَنَّ
عَلَىٰ مَآ ءَاذَيۡتُمُونَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾
وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمۡ لَنُخۡرِجَنَّكُم مِّنۡ أَرۡضِنَآ
أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۖ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ رَبُّهُمۡ لَنُهۡلِكَنَّ
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسۡكِنَنَّكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ
ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ وَٱسۡتَفۡتَحُواْ
وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٖ ﴿١٥﴾ مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ وَيُسۡقَىٰ
مِن مَّآءٖ صَدِيدٖ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأۡتِيهِ
ٱلۡمَوۡتُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٖۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ
عَذَابٌ غَلِيظٞ ﴿١٧﴾ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ أَعۡمَٰلُهُمۡ
كَرَمَادٍ ٱشۡتَدَّتۡ بِهِ ٱلرِّيحُ فِي يَوۡمٍ عَاصِفٖۖ لَّا يَقۡدِرُونَ
مِمَّا كَسَبُواْ عَلَىٰ شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ ﴿١٨﴾



﴿١١﴾ پێغەمبەرێت وان گۆتنە وان: [راستە] ئەم ژی
مرۆڤین، وەكی هەوە، بەلێ خودێ كەرەما خۆ ب
پێغەمبەراتییێ د گەل وی بەندەیی دكەت یێ وی بڤێت
[و وی وەسا ڤیا ڤێ كەرەمێ د گەل مە بكەت]، و بۆ
مە نەدورستە ئەم نیشان و بەلگەیەكی بۆ هەوە بینین
ئەگەر ب دەستویریا خودێ نەبیت، و بلا خودان
باوەر پشتا خۆ ب خودێ گەرم بكەن. ﴿١٢﴾ و ما مە چ
دەستویردان هەیە ئەم خۆ ب هیڤیا خودێڤە نەهێلین،
و پشتا خۆ پێ گەرم نەكەین، ب ڕاستی وی بەرێ مە
یێ دایییە وان ڕێكان یێت ئەم وی پێ بنیاسین، و ب
سویند ئەم دێ بێنا خۆ فرەهـ كەین ل سەر وێ ئەزیەتا
هەوە گەهاندییە مە، و بلا پشتگەرمیخواز پشتا خۆ
بەس ب خودێ [ب تنێ] گەرم بكەن. ﴿١٣﴾ و ئەوێت
گاوربوویین گۆتنە پێغەمبەرێت خۆ: ب سویند ئەم
دێ هەوە ژ ئەردێ خۆ دەرئێخین، یان هوین دێ
جارەكا دی زڤڕنەڤە سەر دینێ مە، ڤێجا هنگی خودێ
وەحی بۆ وان هنارت، بێ گۆمان دێ ستەمكاران د
هیلاك بەین. ﴿١٤﴾ و بێ گۆمان ئەم دێ هەوە پشتی
وان ل سەر ئەردێ وان ئاكنجی كەین [ئەو ئەردێ ئەوان گەف ل هەوە دكرن كو هەوە ژێ دەربێخن]، ئەڤ
پەیمانە [ڤڕكرن و نەهێلانا وان، و ئاكنجیكرنا هەوە ل جهێ وان] بۆ وییە ئەوێ ژ ڕاوەستیانا بەرهەمبەری من
و ڕۆژا قیامەتێ بترسیت. ﴿١٥﴾ و پێغەمبەران داخوازا سەركەڤتنێ ژ خودایێ خۆ كر [ل سەر نەیاران]، [ڤێجا
خودێ بۆ ئینا]، و هەمی خۆمەزنكەرێت زێدە سەرڕەق خوسارەت و بێ هیڤی بوون. ﴿١٦﴾ و [وێ ڕۆژێ]
جەهنەم و دۆژەهـ ب دویڤ وانڤەیە، و دێ ب ئاڤا كێم و زۆخێ ئێنە ئاڤدانێ [دێ ئاڤا كێم و زۆخێ دەنە
وان]. ﴿١٧﴾ دێ ب زەحمەت داقورچینیت و نەشێت خۆش داعویریت، و مرن ژ هەمی ڕەخانڤە دئێتێ، بەلێ
نامریت [كو تەنا ببیت] و ئیزایەكا گران یا ل دویڤ وی. ﴿١٨﴾ مەتەلا وان ئەوێت باوەری ب خودایێ خۆ
نەئینایین، كار و كریارێت وان وەكی خۆلییەكێنە هوڕەبایەك ل ڕۆژەكا ب هوڕوبا لێ بدەت، ئەو نەشێن خێر
و كریارێت خۆ ب دەست خۆڤە بینن [چونكی ب گاورییێ یێت پویچ كرین، وەكی خۆلییا هوڕەبای بری
نائێتە زڤڕاندن] ئەها ئەڤەیە گومڕاییا كویر و دویر.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِن يَشَأْ
يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿٢٠﴾
وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟
إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ
مِن شَىْءٍ ۚ قَالُوا۟ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ ۖ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ
أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا
قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ
فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ
أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ
مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ
بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ
أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ
تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ۖ تَحِيَّتُهُمْ
فِيهَا سَلَٰمٌ ﴿٢٣﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً
كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾



﴿١٩﴾ ئەرێ ما تە نەزانییە خودێ ئەرد و ئەسمان
ب زانایی و حیکمەت چێکرینە [کو ب ڕێکا وان
بگەهنە دەستهەلاتداریا خودێ]، ئەگەر بڤێت دێ
هەوە بەت و مرینیت، و هندەك مرۆڤێت نوی دێ
ئینیت. ﴿٢٠﴾ و ئەڤە ل بەر خودێ نەیا ب زەحمەتە.
﴿٢١﴾ و [ڕۆژا قیامەتێ] ئەو هەمی [ب کار و کریارێت
خۆڤە] دێ بەرانبەری خودێ ئاشکەرا بن، ڤێجا [وی
وەختی] بندەست و بەلنگاز دێ بێژنە وان یێت ئەو
تەپەسەرکرین و خۆ مەزنکرین [ئەوێت ئەو سەردابرین
و نەهێلایین باوەرییێ بینن] ئەم دویکەڤتییێت هەوە
بووین، ئەرێ هوین دشێن تشتەکی ژ ئیزایا خودێ ژ
مە بدەنە پاش، دێ بێژن: ئەگەر خودێ ئەم ڕاستەڕێ
کربانە ئەم ژی دا هەوە ڕاستەڕێ کەین، وەکی ئێکە
بۆ مە، چ ئەم نالنالێ بکەین، و چ ئەم بێنا خۆ فرەه
بکەین، ڕزگاربوونا مە نینە. ﴿٢٢﴾ [ڤێجا وەختێ حەق
و حساب ب دویماهیک دئێت، و بەحەشتی دچنە د
بەحەشتێدا، و دۆژەهی دچنە د دۆژەهێدا] شەیتان دێ
بێژیت: ب ڕاستی خودێ پەیمان ب دورستی دابوو
هەوە، و من ژی پەیمان دابوو هەوە [کو چو حساب و بەحەشت و دۆژەه نینن]، ڤێجا من درەو ل هەوە
کر، و من چو دەستهەلات ل سەر هەوە نەبوو [ئەز ب خورتی و کۆتەکی پێ بەرێ هەوە بدەمە گاورییێ و
گونەهان]، ژ بلی هندێ من گازی هەوە کر، و هوین ژی ل دویڤ گازییا من هاتن [هەوە گوهێ خۆ دا من و
بوونە گاور]، ڤێجا گازندەیان ژ من نەکەن، و گازندەیان ژ خۆ بکەن، ئەز نەشێم د هەوارا هەوە بهێم و هەوە
ژ ئیزایێ ڕزگار بکەم، و هوین ژی نەشێن د هەوارا من بهێن و من ژ ئیزایێ ڕزگار بکەن. ب ڕاستی ئەز یێ
بەریمە ژ کریارا هەوە ئەز د دنیایێدا پێ کریمە هەڤپشك بۆ خودێ، بێ گۆمان بۆ ستەمکاران ئیزایەکا ب
ژان و دژوار هەیە. ﴿٢٣﴾ و ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت قەنج کرین، ڕەوانەی وان بەحەشتان کرن
ئەوێت ڕوبار د بنڕا دچن، و ب دەستویرییا خودایێ خۆ دێ هەروهەر تێدا مینن، و ملیاکەت سلاڤی وان
دکەن. ﴿٢٤﴾ ئەرێ ما تە نەدیت کا چاوا خودێ مەتەلەك ئینا و ڕۆنکر، پەیڤا پاك و پاقژ [کو (لا إله إلا الله)ـە]
وەکی دارەکا پاقژە، بنێ وێ و ڕە و ڕویشالێت وێ یێت د ئەردیدا چۆیین، و یا بنەجهە و تایێت وێ یێت ل
بەر ئەسمانی.

تُؤۡتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينِۭ بِإِذۡنِ رَبِّهَاۗ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ
لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ٢٥ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٖ
كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجۡتُثَّتۡ مِن فَوۡقِ ٱلۡأَرۡضِ مَا لَهَا مِن
قَرَارٖ ٢٦ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡقَوۡلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَۚ وَيَفۡعَلُ ٱللَّهُ
مَا يَشَآءُ ٢٧ ۞ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا
وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ ٢٨ جَهَنَّمَ يَصۡلَوۡنَهَاۖ وَبِئۡسَ
ٱلۡقَرَارُ ٢٩ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا لِّيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِهِۦۗ قُلۡ
تَمَتَّعُواْ فَإِنَّ مَصِيرَكُمۡ إِلَى ٱلنَّارِ ٣٠ قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ يُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ
مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا بَيۡعٞ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ٣١ ٱللَّهُ ٱلَّذِي
خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ
بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ لِتَجۡرِيَ
فِي ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡأَنۡهَٰرَ ٣٢ وَسَخَّرَ لَكُمُ
ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ دَآئِبَيۡنِۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ ٣٣

ثلاثة أرباع الحزب ٢٦



﴿٢٥﴾ هەمی وەختان ب دەستویرییا خودایێ خۆ بەر
و فێقیێ خۆ ددەت، و خودێ مەتەلان بۆ مرۆڤان
دئینیت بەلکی [هزرا خۆ تێدا بکەن] بۆ خۆ پێڤە
بچن. ﴿٢٦﴾ و مەتەلا پەیڤا پیس [پەیڤا گاوری و
بەرزەبوونێ] وەکی دارەکا پیسە ب رە و رویشالڤە ژ
ئەردی هاتبیتە هلکێشان، چو راوەستیان و خۆجهی بۆ
نینە [هەروەسا پەیڤا گاورییێ خۆراگرتن و بەرەکەت
نینە]. ﴿٢٧﴾ خودێ ئەوێت باوەری ئینایین ب ئاخڤتنا
بنەجە رادگریت [کو پەیڤا (لا إله إلا الله)] د ژیانا
دنیاییدا [ئانکو وەختێ د گۆریدا پسیار ژێ دئێتەکرن]
و د قیامەتێ ژیدا و ل بەر ستەمکاران بەرزە دکەت
[نەشێن بەرسڤا خۆ د گۆریدا بدەن، و بێ بەرسڤن ژی
رۆژا حسێب د گەل دئێتەکرن]، و خودێ چ بڤێت وێ
دکەت. ﴿٢٨﴾ ئەرێ ما تە نەدیت، ئەوێت نیعمەت و
کەرەما خودێ ژ چاڤکۆرەیی گوهارتی، و ملەتێ خۆ
[ب سەرەڕقییا خۆ] کێشاینە خانییێ بنبری و هیلاکێ.
﴿٢٩﴾ ئەو خانی دۆژەهە دێ چنە تێدا، و دێ تامکەنە
گەرما وێ، و چ پیسە بنەجهە. ﴿٣٠﴾ و وان هەڤال
و هەڤپشك بۆ خودێ چێکرینە، دا خەلکی ژ رێکا خودێ دەربێخن [هەی موحەمەد] بێژە [وان]: ل سەر
خۆشییێت خۆ بن، دوماهیکا هەوە هەر ئاگرە. ﴿٣١﴾ [هەی موحەمەد] بێژە بەندەیێت من ئەوێت باوەری
ئینایین: [کا چاوا مە فەرمانا وان کرییە] بلا نڤێژان بکەن و ژ رزقێ مە داییە وان، بلا ژ نەپەنی و ئاشکەرا،
خێران ژێ بدەن، بەری هاتنا وێ رۆژێ، ئەوا نە کرین و نە فرۆتن و نە دۆستینی و نە هەڤالینی، تێدا هەی.
﴿٣٢﴾ خودێ ئەوە یێ ئەرد و ئەسمان چێکرین و باران ژ ئەسمانی ئینایییە خوارێ، ڤێجا [ب وێ بارانێ]
فێقییێت رەنگ رەنگ یێت بۆ هەوە دەرئێخستین و کرینە رزقێ هەوە، و گەمی بۆ هەوە یێت سەرنەرم
کرین و ب ساناهی ئێخستین، دا ب ئەمرێ خودێ د دەریاییدا بچن، [و هەوە و تشتێت هەوە ژ جهەکی
ببەنە جهەکێ دی]. و روبیار بۆ هەوە ساناهی و بەردەست کرن [دا هوین ژێ ڤەخۆن و تۆڤچینییا خۆ پێ
بکەن]. ﴿٣٣﴾ و رۆژ و هەیڤ ژی یێت ب بەر خزمەتا هەوە ئێخستین، و بەردەوامن د راستکرنێدا (اصلاح)
یان بەردەوامن د چۆنێدا بێ راوەستیان، و شەڤ و رۆژ ژی یێت بۆ هەوە ساناهی کرین [دا هوین د شەڤێدا
ڤەهەسن و د رۆژێدا بۆ خۆ شۆل بکەن].

وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُۚ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ
لَا تُحْصُوهَآۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٞ كَفَّارٞ ٣٤ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ
رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنٗا وَٱجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ
ٱلْأَصْنَامَ ٣٥ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ فَمَن
تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣٦ رَّبَّنَآ
إِنِّيٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ
ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ
تَهْوِيٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ٣٧
رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُۗ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ
مِن شَيْءٖ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ٣٨ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي
وَهَبَ لِي عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَۚ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ
ٱلدُّعَآءِ ٣٩ رَبِّ ٱجْعَلْنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا
وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ ٤٠ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ
يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ ٤١ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ
ٱلظَّٰلِمُونَۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٖ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ٤٢



﴿٣٤﴾ و هەر تشتێ هەوە ژێ خواستی یێ دایییە هەوە، و ئەگەر هوین نیعمەت و کەرەمێت خودێ بهەژمێرن هوین نەشێن بهەژمێرن [چونکی هندی گەلەکن ب دویماهیك نائێن]، ب ڕاستی مرۆڤ زێدە ستەمکار و زێدە چاڤنقە. ﴿٣٥﴾ و بینە بیرا خۆ وەختێ ئیبراهیم پێغەمبەر گۆتی: خودێوۆ تو ڤی باژێری [مەکەهێ] ئێمن بکە و بکە جهێ ئێمنییێ، و من و زارۆکێت من ژ پەرستنا بوتان دویربێخە. ﴿٣٦﴾ خودێوۆ ب ڕاستی وان بوتان گەلەك مرۆڤ یێت د سەردابرین، ڤێجا هەچییێ ل دویڤ من هات و ڕێکا من گرت ئەو ژ منە، و یێ گوهێ خۆ نەدا من، ب ڕاستی تو یێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانی. ﴿٣٧﴾ خودایێ مە ب ڕاستی من هندەك ژ دویندەها خۆ [ئیسماعیل و بچویکێت وی]، یێت ل نهالەکا بێ شینکاتی ل دەڤ مالا تە یا موحەرەم [کەعبەیێ] ئاکنجی کرین، خودایێ مە، دا نڤێژان [تێدا] بکەن، ڤێجا دلێ هندەك مرۆڤان ب نك وانڤە ببە [بچنە دەڤ وان، و ئەو ب تنێ نەمینن]، و ڤێقییێت ڕەنگ ڕەنگ ب ڕزقێ وان بکە، دا سوپاسییا تە بکەن. ﴿٣٨﴾ خودایێ مە ب ڕاستی ئەوا ئەم ڤەدشێرین و نەڤەشێرین تو دزانی، و چو تشت د ئەرد و ئەسمانیدا ل بەر خودێ بەرزە نابن. ﴿٣٩﴾ هەمی شوکور و سوپاسی بۆ وی خودایی ئەوێ ب پیراتی ئیسماعیل و ئیسحاق دایینە من، ب ڕاستی خودایێ من یێ گوهدێر و دوعا قەبویلکەرە. ﴿٤٠﴾ خودێوۆ تو من و هندەکان ژ دویندەها من ژ نڤێژکەران [ب ڕەنگێ پێدڤی] دانە، خودایێ مە، و دوعایا مە قەبویل بکە. ﴿٤١﴾ خودایێ مە گونەهێت من و دەیبابێت من و خودان باوەران، ڕۆژا حەق و حساب دئێتەکرن، ژێ ببە [دوعا بۆ دەیبابێت خۆ کرن بەری بزانیت ئەو دژمنێت خودێنە]. ﴿٤٢﴾ و هزر نەکە خودێ یێ بێ ئاگەهە ژ وێ یا ستەمکار دکەن، نێ [ب تنێ] حسێب و جزایێ وان بۆ ڕۆژەکێ ب پاش دئێخیت، چاڤ تێدا بەق دبن و ژ ترساندا نانقن.

مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ
وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ ٱلْعَذَابُ
فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ
دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ أَوَلَمْ تَكُونُوٓا۟ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ
مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟
أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ
ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدْ مَكَرُوا۟ مَكْرَهُمْ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ
وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ ﴿٤٦﴾ فَلَا
تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ
ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ
وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ
مُّقَرَّنِينَ فِي ٱلْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ
وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴿٥٠﴾ لِيَجْزِيَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ
إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٥١﴾ هَٰذَا بَلَٰغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا۟ بِهِۦ
وَلِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٥٢﴾





﴿٤٣﴾ وێ ڕۆژێ ئەو ب لەزن [و ل کەسێ نازڤڕن]، و
سەرێت وان سەرئەڤرازن [ژ ترساندا کەس بەرێ خۆ
نادەتە کەسێ، و چاڤێت هەمیان سەرئەڤرازن کا دێ
حسێبا وی چاوا بیت]، و چاڤێت وان زیق دمینن و
ناکەڤنە سەرێك، و دلێت وان ڤالا دبن ژ تێگەهشتنێ
[ژ ترس و گوهشینێ]. ﴿٤٤﴾ [هەی موحەمەد]
مرۆڤان ژ وێ ڕۆژا ئیزا بۆ وان دئێت [کو ڕۆژا
قیامەتێیە] بترسینە، ڤێجا ئەوێت ستەمکاری کرین
دێ بێژن: خودایێ مە، هەتا وەختەکێ نێزیك مە
بهێلە، دا ئەم بەرسڤا بانگ و گازییا تە بدەین، و ڕێکا
پێغەمبەران بگرین و ل دویڤ وان بچین [و ملیاکەت
دێ بێژنێ]، ما هەوە بەری نوکە سویند نەخواربوو
هوین دێ د ئەردیدا مینن و چو قیامەت نینن.
﴿٤٥﴾ و ما هوین نە ئەو بوون، ئەوێت هوین ل جهێ
وان ئاکنجی بوویین ئەوێت ستەم ل خۆ کرین؟ و
بۆ هەوە دیاربوو کا مە چ ل وان کر، و مە بۆ هەوە
مەتەل دیارکرن و ئینان [بەلێ هەوە بۆ خۆ چو ژێ
نەگرت]. ﴿٤٦﴾ ب ڕاستی وان [موشرکێت مەکەهێ]
پیلان و ئۆیین [بۆ پویچکرنا ئیسلامێ و بەرسینگگرتنا هەقییێ و کوشتنا پێغەمبەری] گێڕان، و جزایێ
پیلانگێڕان یێ ل دەڤ خودێ، و خودێ پێ ئاگەهە، و هەرچەندە ئەو پیلانێت ئەوان گێڕایین، دا چیایان ژ
جهـ بەن [و پیلانێت وان ئەو نەبوون یێت بشێن چیایان (کو ئیسلام و بانگ و گازییا ئیسلامێیە) ژ بن بکەن
و ژ جهـ ببەن]. ﴿٤٧﴾ هزر نەکە ئەو پەیمانا خودێ داییە پێغەمبەرێت خۆ لێڤە ببیت و ب جهـ نەئینیت، ب
ڕاستی خودێ یێ سەردەست و تۆلڤەکەرە. ﴿٤٨﴾ ڕۆژا ئەڤ ئەردە ب ئەردەکێ دی، و ئەسمان ب هندەك
ئەسمانێت دی دئێنە گوهۆڕین، و هەمی ژ گۆڕان بۆ خودایێ ب تنێ و ستۆچەمین دەردکەڤن. ﴿٤٩﴾ و د وێ
ڕۆژێدا [ڕۆژا قیامەتێ] دێ بینی گاور و موشرك پێکڤە یێت هاتینە قەید و زنجیرکرن [یان دەست و پییێت
وان د قەید و زنجیراندا یێت گەهاندینە ئێك]. ﴿٥٠﴾ جلکێت وان ژ قەترانێنە [قەتران دۆنەکە ژ دارەکێ دئێتە
وەرگرتن دبێژنێ (ئەبهەل) و دئێتە کەلاندن، حێشترا گوڕی پێ دئێتە دۆنکرن، و ئەو ب خۆ یا نویسەك و
بێهن پیس و تیژ و ئاگرگرە، جەهنەمی ڕۆژا قیامەتێ دێ پێ ئێنە هنوین، هەتا وەکی جلکان لێ دئێت ل بەر
وان، دا تیژی و گەنیاتی و گەزتن و زوی ئاگر گرتن ل سەر وان کۆم ببن]. و ئاگر ل سەر سەروچاڤێت وان
بلند دبیت و هەمییێ ڤەدگریت. ﴿٥١﴾ دا خودێ جزایێ هەر مرۆڤەکی کاچ کار و کریار کرینە [ژ باشی و
خرابییان] بدەتێ، و ب ڕاستی خودێ د حەق و حسابێدا یێ دەست سڤکە. ﴿٥٢﴾ ئەڤ قورئانە ڕاگەهاندنەکە
بۆ هەمی مرۆڤان، و دا پێ بێنە شیرەتکرن و ترساندن و ئاگەهدارکرن، و دا بزانن [ب وان بەلگە و نیشانێت
ڕۆن و ئاشکەرا تێدا] ب ڕاستی ئەو [یێ هێژایی پەرستنێ] خودایەکێ تاك و تەنیایە، و دا خودان ئاقل و
ئاقلدار بۆ خۆ چام و عیبرەتان ژێ وەرگرن.

سُورَةُ الحِجْرِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الجزء ١٤ الحزب ٢٧

الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَقُرۡءَانٖ مُّبِينٖ ١ رُّبَمَا يَوَدُّ
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ كَانُواْ مُسۡلِمِينَ ٢ ذَرۡهُمۡ يَأۡكُلُواْ
وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلۡهِهِمُ ٱلۡأَمَلُۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ٣ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا
مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٞ مَّعۡلُومٞ ٤ مَّا تَسۡبِقُ مِنۡ أُمَّةٍ
أَجَلَهَا وَمَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ ٥ وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِي نُزِّلَ عَلَيۡهِ
ٱلذِّكۡرُ إِنَّكَ لَمَجۡنُونٞ ٦ لَّوۡ مَا تَأۡتِينَا بِٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ
مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٧ مَا نُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَمَا كَانُوٓاْ
إِذٗا مُّنظَرِينَ ٨ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩
وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي شِيَعِ ٱلۡأَوَّلِينَ ١٠ وَمَا يَأۡتِيهِم
مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ١١ كَذَٰلِكَ نَسۡلُكُهُۥ
فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ١٢ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَقَدۡ خَلَتۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ ١٣
وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعۡرُجُونَ ١٤
لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتۡ أَبۡصَٰرُنَا بَلۡ نَحۡنُ قَوۡمٞ مَّسۡحُورُونَ ١٥



## سۆرەتا حیجر

**ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٩٩) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ [ب ڤی ڕەنگی دئێتە خواندن، ئەلف، لام، ڕا، ئیشارەتن بۆ ئیعجازا قورئانێ] ئەڤە ئایەتێت کتێب و قورئانا ڕۆنکەرن. ﴿٢﴾ ئەوێت گاوربوویین [وەختێ سەرکەڤتنا موسلمانان دبینن یان وەختێ بۆ وان دیار دبیت ئەو د خەلەت بوون، و دین ل دەڤ خودێ بەس موسلمانەتییە]، تێ هەیە خۆزیان بخوازن کو د موسلمانبانە. ﴿٣﴾ بهێلە بخۆن و ڤەخۆن و خۆشییان ببەن، و هیڤی و ئومێد، وان ژ بیرڤە بکەن، دێ زانن [کا دویماهیکا کار و کریارێت وان دێ بیتە چ؟!]. ﴿٤﴾ و مە خەلکێ چو گوندان د هیلاك نەبرییە ئەگەر [هیلاکبوونا وان] وەختەکێ دیارکری نەبیت. ﴿٥﴾ و چو ملەت د بەری وەختێ خۆڕا [وەختێ مرنێ و تێچۆنێ] ناکەن، و ژ وەختێ خۆ ژی نائێنە گیرۆکرن. ﴿٦﴾ و [گاوران] گۆتن، هەی ئەو کەسێ قورئان بۆ هاتییە خوارێ، ب ڕاستی تو یێ دینی. ﴿٧﴾ کا بلا تە ملیاکەت بۆ مە ئینابانە [کو مە دیتبان و شادەیی بۆ تە دابانە، یان ئەم جزاکربانە ل سەر درەوین دانانا مە بۆ تە]، ئەگەر تو ڕاست دبێژی [و تو پێغەمبەری]. ﴿٨﴾ و ئەم ملیاکەتان نائینینە خوارێ ئەگەر بۆ حیکمەتەکێ نەبیت، ئینانا وان بخوازیت، و ئەگەر مە ملیاکەت ئینابانە خوارێ [وەکی ئەو پێشنیار دکەن]، دەرفەت بۆ وان نەدهاتە دان. ﴿٩﴾ ب ڕاستی مە قورئان یا ئینایییە خوارێ و ب ڕاستی ئەم ب خۆ ژی بۆ پارێزڤانین و دێ پارێزین. ﴿١٠﴾ ب سویند مە پێغەمبەر بۆ ملەتێت بەری تە ژی یێت هنارتین. ﴿١١﴾ و چو پێغەمبەر بۆ وان نەدچۆن، ئەگەر وان [ئەوێت بۆ هاتین] ترانە پێ نەکربانە. ﴿١٢﴾ و وەسا ئەم بەرزەبوونێ دئێخینە د دلێت گونەهکاراندا. ﴿١٣﴾ باوەرییێ ب قورئانێ نائینن، و ڕێکا خودێ د ملەتێت بۆریدا هۆسا یا چۆیی [هەر ملەتەکێ پێغەمبەر درەوین دانایی، خودێ یێت د هیلاك برین]. ﴿١٤﴾ و ئەگەر مە دەرگەهەك بۆ وان ل ئەسمانی ڤەکربایە و تێڕا سەرکەڤتبانە. ﴿١٥﴾ [دیسا] دا بێژن: چاڤێت مە یێت هاتینە گرێدان و گرتن، بەلکی سێرە (سحر) یا ل مە هاتییە کرن.

وَلَقَدۡ جَعَلۡنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ١٦
وَحَفِظۡنَٰهَا مِن كُلِّ شَيۡطَٰنٖ رَّجِيمٍ ١٧ إِلَّا مَنِ ٱسۡتَرَقَ ٱلسَّمۡعَ
فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٞ مُّبِينٞ ١٨ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا
رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡزُونٖ ١٩ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ
فِيهَا مَعَٰيِشَ وَمَن لَّسۡتُمۡ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ٢٠ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا
عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٖ مَّعۡلُومٖ ٢١ وَأَرۡسَلۡنَا
ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَسۡقَيۡنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمۡ
لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ٢٢ وَإِنَّا لَنَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحۡنُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ٢٣
وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ مِنكُمۡ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ ٢٤
وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحۡشُرُهُمۡۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ٢٥ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا
ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ٢٦ وَٱلۡجَآنَّ خَلَقۡنَٰهُ مِن
قَبۡلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ٢٧ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا
مِّن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ٢٨ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ
مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ٢٩ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ
أَجۡمَعُونَ ٣٠ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ٣١





﴿١٦﴾ و مە رێك یێت ئێخستینە د ئەسمانیدا [ستێرێت گەڕۆك تێدا دئێن و دچن]، و مە [ئەسمانێ دنیایێ] بۆ تەماشەكەران یێ خەملاندی. ﴿١٧﴾ و مە ئەسمان ژ هەر شەیتانەكێ ڕەجماندی یێ پارستی.
﴿١٨﴾ ژ بلی وی یێ ب دزیڤە گوهدارییێ بكەت، ڤێجا دێ بزۆتەكێ دیار [پارچەیەكە ژ هەسارێ (كەوكەبان)] ب دویڤ كەڤیت. ﴿١٩﴾ و مە ئەرد یێ دەشت كری، و مە چیایێت بنەجه یێت ئێخستینە تێدا [دا بۆ ببنە سنگ و نەلڤلڤیت]، و مە هەمی تشت ب پیڤان و كێشان [ل دویڤ هەوجەیییێ] تێدا یێت شینكرین.
﴿٢٠﴾ و مە ژیارا بۆ هەوە و بۆ وان ژی، یێت هوین نەڕازقێت وان، ئێخستیە تێدا [وەكی عەیال و خزمەتكار و جانەوەران، دا هوین هزر نەكەن هوین ڕزقێ وان ددەن]. ﴿٢١﴾ و چو تشت نینە [بەندە مفایی ژێ بكەن] ئەگەر ژێدەر و سەروكانییا وان ل دەڤ مە نەبیت، و ئەگەر ب ئەندازەیەكا دیاركری نەبیت ئەم نادەین و ناهنێرین. ﴿٢٢﴾ و مە با دارئاڤزكەر [و عەورهەلگر] یێ هنارتی، ڤێجا مە باران ژ ئەسمانی دارێت و مە هوین پێ ئاڤدان [هوین و ئەرد و جانەوەرێت هەوە]، و هەوە ب خۆ نەدشیا هوین ڤەگرن [ئەگەر مە بۆ هەوە ڤەنەگرتبایە]. ﴿٢٣﴾ و ب ڕاستی ئەم ب تنێ ژیانێ ددەین و دمرینین، و میراتگر [یێ دنیایێ هەمییێ] ئەمین. ﴿٢٤﴾ و ب ڕاستی ئەم دزانین پێشییێت هەوە [ژ دویندەها ئادەمی] كی بوویییە و كی مرییە، و كی مایییە و كی دێ بیت هەتا ڕۆژا قیامەتێ. ﴿٢٥﴾ و ب ڕاستی خودایێ تە دێ وان هەمییان [ڕۆژا قیامەتێ] كۆم كەت، ب ڕاستی خودێ یێ كاربنەجه و زانایە. ﴿٢٦﴾ و ب ڕاستی مە مرۆڤ ژ تەقنەكا ڕەشا گەنییا كزرا وێنەكری یێ چێكری. ﴿٢٧﴾ و بەری وان مە ئەجنە یێت ژ ئاگرەكێ سنجری چێكرین.
﴿٢٨﴾ وەختێ خودایێ تە گۆتییە ملیاكەتان: ب ڕاستی ئەز دێ مرۆڤەكی ژ تەقنەكا ڕەشا گەنییا كزرا وێنەكری چێ كەم. ﴿٢٩﴾ و ئەگەر من دورست كر و من ڕوح دایێ، ڤێجا هوین هەمی بۆ هەرنە سوجدەیێ.
﴿٣٠﴾ و ملیاكەت هەمی بۆ چۆنە سوجدەیێ. ﴿٣١﴾ ئبلیس (شەیتان) تێ نەبیت، نەڤیا د گەل وان بیت ئەوێت چۆینە سوجدەیێ.

قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ لَمۡ أَكُن
لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٣٣﴾
قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ﴿٣٤﴾ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ
ٱلدِّينِ ﴿٣٥﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿٣٦﴾ قَالَ فَإِنَّكَ
مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ
أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٣٩﴾
إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٤٠﴾ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ
مُسۡتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ
ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٤٣﴾
لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ ﴿٤٤﴾ إِنَّ
ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾
وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾
لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴿٤٨﴾
الحِزْبُ ٢٧ ۞ نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي
هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ وَنَبِّئۡهُمۡ عَن ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٥١﴾



﴿٣٢﴾ [خودێ] گۆت: هەی ئبلیس تە چیە، بۆچی تو د گەل سوجدەبران نەبوویی. ﴿٣٣﴾ گۆت: ئەز نە ئەوم [نەلائیقی منە] یێ بۆ مرۆڤەکی کو تە ژ تەقنەکا ڕەشا گەنییا کزرا وێنەکری چێکری، بچمە سوجدەیێ. ﴿٣٤﴾ [خودێ] گۆت: ڤێجا تو ژێ [ژ ناڤ ملیاکەتان، یان ژ بەحەشتێ، یان ژ ئەسمانی، یان ژ ناڤ کەرەمێت من] دەرکەڤە، ب ڕاستی تو یێ زربارى ژ دلۆڤانییا من. ﴿٣٥﴾ و لەعنەت ل تە بن هەتا ڕۆژا قیامەتێ. ﴿٣٦﴾ [شەیتانی] گۆت: خودایێ من هەتا ڕۆژا قیامەتێ و ڕابوونێ، خۆ ل من بگرە [و من نەمرینە]. ﴿٣٧﴾ [خودێ] گۆت: تو ژ خۆلێگرتییانی. ﴿٣٨﴾ هەتا وەختێ دیارکری [وەختێ پفکرنا بۆقا ئێکێ، کو هەمی دمرن و کەس نامینت]. ﴿٣٩﴾ [شەیتانی] گۆت: خودێوۆ چونکی تە ئەز [بۆ خاترا وان] گومڕا و بەرزەکرم، ب سویند ئەز دێ گونەهان بۆ وان د دنیایێدا خەملینم [و وان د بەر خرابییێڕا کەم]، و هەمییان دێ د سەردا بەم [د بەر گومڕایی و بەرزەبوونێڕا کەم]. ﴿٤٠﴾ ژ بلی وان بەندەیێت تە، ئەوێت بژارە و سەرپشك. ﴿٤١﴾ [خودێ] گۆت: [ئەڤ ئاخڤتنا تو دبێژی کو تو نەشێی بەندەیێت من یێت بژارە و سەرپشك د سەردا ببەی] ئەڤە ڕێکەکە ل سەر منە ئەز ڕابگرم و بپارێزم. ﴿٤٢﴾ ب ڕاستی تە دەستهەلات ل سەر بەندەیێت من نینە، و ژ بلی وان ئەوێت ب دویڤ تە دکەڤن ژ سەرداچۆییان. ﴿٤٣﴾ و ب ڕاستی دۆژەهـ ژڤان و جهێ وان هەمییانە [سەرداچۆییانە]. ﴿٤٤﴾ [دۆژەهێ] حەفت دەرگەهـ یێت هەین، و هەر دەرگەهەکی پشکەکا دیارکری یا بۆ هەی. ﴿٤٥﴾ ب ڕاستی پارێزکار د ناڤ باغ و کانیاندانە. ﴿٤٦﴾ [ملیاکەت دێ بێژنێ] ب سلامەتی و ئێمنی هەڕنە د ناڤ وان باغ و کانییاندا. ﴿٤٧﴾ و مە ئەو کەرب و کینا د دلێت واندا هەی ئینادەر، ڤێجا ئەو برا [وەکی برایێت ئێك] ل سەر تەختان بەرانبەری ئێکن. ﴿٤٨﴾ تێدا [د بەحەشتێدا] ناوەستن، و ئەو ژێ نائێنە دەرئێخستن. ﴿٤٩﴾ [هەی موحەمەد] بەندەیێت من ئاگەهدار بکە، کو ب ڕاستی ئەزم گونەهـ ژێبەر و دلۆڤان. ﴿٥٠﴾ و ب ڕاستی ئیزایا منە ئیزایا دژوارە. ﴿٥١﴾ و بەحسێ مێڤانێت ئیبراهیمی بۆ وان بکە.

إِذْ دَخَلُواْ عَلَيْهِ فَقَالُواْ سَلَٰمًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُواْ
لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰٓ أَن
مَّسَّنِيَ ٱلْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُواْ بَشَّرْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ
فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْقَٰنِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ
رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٧﴾
قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ
إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ إِنَّهَا لَمِنَ
ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ
إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُواْ بَلْ جِئْنَٰكَ بِمَا كَانُواْ فِيهِ
يَمْتَرُونَ ﴿٦٣﴾ وَأَتَيْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٦٤﴾ فَأَسْرِ
بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَٱتَّبِعْ أَدْبَٰرَهُمْ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ
وَٱمْضُواْ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴿٦٥﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ أَنَّ
دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴿٦٦﴾ وَجَآءَ أَهْلُ ٱلْمَدِينَةِ
يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ضَيْفِي فَلَا تَفْضَحُونِ ﴿٦٨﴾
وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓاْ أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٠﴾



﴿٥٢﴾ وەختێ چۆیینە دەڤ، و گۆتن: سلاڤ ل تە بن،
[ئیبراهیمی] گۆت: ب ڕاستی ئەم ژ هەوە دترسین.
﴿٥٣﴾ گۆتن: نەترسە ب ڕاستی ئەم مزگینیا کوڕەکێ
زانا ددەینە تە. ﴿٥٤﴾ گۆت: ئەرێ پشتی ئەز پیربوویم
هوین مزگینییێ ددەنە من؟ ڤێجا ب چ مزگینییێ ددەنە
من؟! ﴿٥٥﴾ وان گۆت: مە مزگینیا ڕاست و دورست
دا تە، ڤێجا ژ بێ هیڤیان نەبە. ﴿٥٦﴾ ئیبراهیمی
گۆت: ما کی ژ دلۆڤانییا خودێ بێ هیڤی دبیت، ژ
بلی ژ ڕێدەرکەڤتییان. ﴿٥٧﴾ [پشتی ئیبراهیمی زانی
ملیاکەتن] گۆت: گەلی هنارتییان هەوە خێرە [هوین
بۆ چ هاتینە هنارتن]؟ ﴿٥٨﴾ گۆتن: ئەم ب ئیزایەکا
دژوارڤە، بۆ ملەتەکێ گونەهکار یێت هاتینە هنارتن
[کو ملەتێ (لووط)یێیە]. ﴿٥٩﴾ ژ بلی مالا (لووطی)، ب
ڕاستی ئەم وان هەمییان دێ ڕزگارکەین. ﴿٦٠﴾ ژنا وی
تێ نەبیت، ب ڕاستی مە ئەو یا دانایی، ژ وان ئەوێت
د ناڤ ئیزاییێدا دمینن. ﴿٦١﴾ ڤێجا وەختێ ئەو هنارتی،
هاتینە دەڤ بنەمالا (لووطی). ﴿٦٢﴾ (لووطی) گۆت:
هوین ملەتەکێ بیانی و نەنیاسن. ﴿٦٣﴾ گۆتن: [ئەم ب
چو تشتێ وەسا نەهاتینە کو تو مە نەنیاسی، ئەم قاسدێت خودێینە] ئەم ب وێ ئیزاییێڤە بۆ تە یێت هاتین،
یا ملەتێ تە د هاتنا وێدا ب شك. ﴿٦٤﴾ و مە ڕاستیا بۆ تە ئینایی [کو ئیزادانا وانە]، و ب ڕاستی ئەم
ڕاستیبێژین. ﴿٦٥﴾ ڤێجا د وەختەکێ شەڤێدا، مرۆڤێت خۆ دەربێخە و تو ل دویڤ وان هەرە [نەکو ئێك
ژ وان بمینیت یان ب پاش خۆڤە بزڤریت، و د ئیزایا واندا بکەلیت]، و بلا کەس ژ هەوە ب پاش خۆڤە
نەزڤریت [و بەرێ خۆ نەدەتێ کا چ ب سەرێ وان دئێت]، و هەڕنە وی جهی یێ فەرمانا هەوە پێ هاتییە
کرن. ﴿٦٦﴾ و مە وەحی بۆ (لووطی) هنارت، کو ئەڤان هەمییان وەختێ سپێدە ب سەر واندا دئێت، دێ
ئێنە قوتبڕکرن. ﴿٦٧﴾ و خەلکێ باژێری هاتن ب کەیفخۆشی مزگینی ددانە ئێك و دو [بۆ کرنا خرابییێ].
﴿٦٨﴾ (لووطی) گۆت: ئەڤە مێڤانێت منن، من شەرمزار نەکەن. ﴿٦٩﴾ و ژ خودێ بترسن [د دەرهەقا مێڤانێت
مندا]، و هەتکا من نەبەن. ﴿٧٠﴾ [خەلکێ باژێری] گۆتن: ما مە تو ژ مێڤانکرنا بیانییان نەدابوویییە پاش.

قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ٧١ لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ
يَعۡمَهُونَ ٧٢ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ٧٣ فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا
سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ ٧٤ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ ٧٥ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٖ مُّقِيمٍ ٧٦ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٧٧ وَإِن كَانَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ لَظَٰلِمِينَ ٧٨
فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٖ مُّبِينٖ ٧٩ وَلَقَدۡ كَذَّبَ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡحِجۡرِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٨٠ وَءَاتَيۡنَٰهُمۡ ءَايَٰتِنَا فَكَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ ٨١
وَكَانُواْ يَنۡحِتُونَ مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ٨٢ فَأَخَذَتۡهُمُ
ٱلصَّيۡحَةُ مُصۡبِحِينَ ٨٣ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ٨٤
وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَإِنَّ
ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞۖ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ ٨٥ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ
ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ ٨٦ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي
وَٱلۡقُرۡءَانَ ٱلۡعَظِيمَ ٨٧ لَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا
مِّنۡهُمۡ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ٨٨ وَقُلۡ
إِنِّيٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلۡمُبِينُ ٨٩ كَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَى ٱلۡمُقۡتَسِمِينَ ٩٠





﴿٧١﴾ گـۆت: ئەڤـە ژنێـت هـەوە کچێـت منـن، ئەگـەر
هـەوە دڤێـت هـەڕن نڤینـا وان و گـڕێ خـۆ داڕێـژن.
﴿٧٢﴾ سـویند ب ژیـیێ تـە [سـویندە ژ خـودێ ب
ژیـیێ پێغەمبـەری]، ئـەو د پەریشـان و گێـژن، د گـڕێ
خـۆدا. ﴿٧٣﴾ دگـەل ڕۆژهەلاتـێ قێڕیـیەکا ب هێـز
ئـەو هنگاڤتـن. ﴿٧٤﴾ ڤێجـا مـە باژێـرێ وان سـەروبن
کـر [و ئـەو هێلانـە د ناڤـدا]، و مـە هنـدەك خڕەبەرێـت
ئاخا سـۆتی ب سـەر وانـدا باراندن. ﴿٧٥﴾ و ب ڕاسـتی
ئـەڤ ڕویدانێـت هەنـێ ئایـەت و نیشـانن بـۆ کەسێت
هشـیار و شـارەزا. ﴿٧٦﴾ و ب ڕاسـتی [کاڤلێـت وان]
ل سـەر ڕێـکان [ڕێ و ڕێبارێـت وان]، هێـژ وەکـی خـۆ
یـێت مایـین. ﴿٧٧﴾ و ب ڕاسـتی ئەڤـە [سەرهاتیـیا
وان، و کا چ ب سـەرێ وان هـات وەختـێ د ڕێـکا
خودێـدا ڕاوەستیایـین و مایـینە ل سـەر سـەرڕەقی و
خرابیـیا خـۆ] دەرس و نیشـانەکە بـۆ خـودان بـاوەران.
﴿٧٨﴾ خەلکـێ وارێ تـێر داروبـار و تێکـڕا [ملەتـێ
شـوعەیبی] د ستەمکار بـوون. ﴿٧٩﴾ ڤێجـا مـە تـۆل
ل وان ڤەکـر، و ب ڕاسـتی ئـەڤ هەردووکـە [مەدیـەن
باژێـرێ شـوعەیب پێغەمبـەر، و سـەدووم گونـدێ (لـووط) پێغەمبـەر] کاڤلێـت وان ل سـەر ڕێکـەکا دیـارن.
﴿٨٠﴾ و خەلکـێ حیجـرێ [گونـدێ صالـح پێغەمبـەر و مالێـت (سـەموود)، کو دکەڤتـە د ناڤبەرا (مەدینە)یـێ و
تەبووکێـدا] پێغەمبـەر درەوین دانان. ﴿٨١﴾ و مە موعجیزەیـێت خـۆ بۆ وان ئینان [ژ وان موعجیزەیا حێشـترێ]،
ڤێجا پشـتا خۆ دانێ و ڕوییـێ خۆ ژێ وەرگێڕان [ژ بەر هندێ ژی ئەو حێشـتر کوشـتن، و بێ ئەمریـیا پێغەمبەرێ
خـۆ کـرن]. ﴿٨٢﴾ و وان خانیـییێت ئێمن بۆ خۆ د چیایاندا دکـۆلان [دا نەهەڕفن و دویری دزیکـەر و دژمنان بن،
یان ل دویڤ هزرکرنا وان دا ژ ئیزایا خودێ د ئێمن بن]. ﴿٨٣﴾ ڤێجا د گەل هەلاتنا سپێدەیـێ، قێڕیـیەکا ب هێز
ئـەو هنگاڤتـن [و قوتبڕکـرن]. ﴿٨٤﴾ و ئـەوا وان ب دەسـت خۆڤە ئینایی [ژ کۆلانا خانیـییێت ئاسـێ د چیایاندا]،
ئـەو ژ ئیزایـا خـودێ ڕزگـار نەکـرن [و مفـا نەگەهانـدە وان]. ﴿٨٥﴾ و مـە ئـەرد و ئەسمـــان و هنـدی د ناڤبـەرا
وانـدا، چـێ نەکرینە ئەگەر ب هەقیـیێ نەبیت [ئانکو مە یـێت ب دادپـەروەری چێکرین، دا هـەر ئێك ب کریارا
خـۆ بێتـە جزاکـرن]، و ب ڕاسـتی ڕۆژا قیامەتـێ هـەر دێ ئێت، ڤێجا تـو ل وان ببـۆرە، لێبۆرینەکا نـەرم و حەلیم.
﴿٨٦﴾ و ب ڕاسـتی خودایـێ تەیـە زێدەچێکـەر و زێدەزانـا. ﴿٨٧﴾ و مـە حەفـت ئایەتێـت هەر دئێنـە دوبارەکرن
[کـو فاتیحەیـە]، و قورئانـا مەزن یـێت دایـینە تـە. ﴿٨٨﴾ ڤێجا [هـەی موحەمـەد] چاڤێ خۆ نەبە وێ خۆشـی و
نیعمەتـا مـە دایـییە هنـدەك ژ وان [نەموسلمـــانان]، و خەمـێ ژ وان نەخـۆ [کو باوەریـیێ ب تە نائینـن]، و خۆ
بـۆ خـودان بـاوەران بشـکێنە [خـۆ بـۆ وان ب سـاناهی بێخـە]. ﴿٨٩﴾ و بێـژە: ب ڕاسـتی ئـەز ئاگەهدارکەرەکێ
ڕۆنکـەرم [ب ئاشـکەرایی ئـەز دبێژمە هەوە، ژ هەوە ناڤەشـێرم، دێ ئیزا ب سـەر هەوەدا ئێـت]. ﴿٩٠﴾ هەروەکی
مـە ب سـەر جوهـی و فەلەیاندا ئینایـییە خوارێ.

ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ
أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ
عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ٱلَّذِينَ
يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ۚ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَقَدْ نَعْلَمُ
أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن
مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾

## سُورَةُ النَّحْلِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نصف الحزب ٢٧

أَتَىٰٓ أَمْرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١﴾
يُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ
عِبَادِهِۦٓ أَنْ أَنذِرُوٓاْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ﴿٢﴾ خَلَقَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣﴾ خَلَقَ
ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٤﴾ وَٱلْأَنْعَٰمَ
خَلَقَهَا ۗ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٥﴾
وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾



﴿٩١﴾ ئەوێت قورئان پارچە پارچە کرین [باوەرییێ ب
هندەکێ دئینن، و ژ هندەکێ بێ باوەرن]. ﴿٩٢﴾ ڤێجا
ب خودایێ تە کەم، ئەم دێ پسیاریێ ژ وان هەمییان
کەین [ئێك ئێك]. ﴿٩٣﴾ ژ کار و کریارێت وان دکرن.
﴿٩٤﴾ ڤێجا ئەوا فەرمانا تە پێ دئێتەکرن ئاشکەرا بکە،
و ڕوییێ خۆ ژ موشرکان وەرگێڕە، و پویتەی ب وان
نەکە. ﴿٩٥﴾ ب ڕاستی مە بەلا ترانەکەران ژ تە ڤەکر
[کو پێنج کەس بوون: وەلیدێ کوڕێ موغیرەی و
(عاسێ) کوڕێ وائیلی و ئەسوەدێ کوڕێ (موتتەلبی)
و ئەسوەدێ کوڕێ (عبد یغووسی) و (حارسێ)
کوڕێ قەیسی، خودێ ب ئاتافەکێ برن و بەلا وان
ژ پێغەمبەری ڤەکر]. ﴿٩٦﴾ ئەوێت پەرستییەکێ دی
د گەل خودێ پەرستی ددانن، ڤێجا ئەو دێ زانن
[کا دویماهییا وان ل ئاخرەتێ دێ یا چاوا بیت].
﴿٩٧﴾ و ب ڕاستی ئەم دزانین کو دلێ تە، ب ئەوا ئەو
دبێژن، تەنگ دبیت. ﴿٩٨﴾ ڤێجا تو ب پەسەندکرنا
خودایێ خۆ، خودایێ خۆ ژ کێم و کاسیان پاقژ بکە،
و ژ سوجدەبەران بە [ئانکو هەر نەخۆشییەکا بگەهیتە
تە، تەسبیحات و زکرێ خودێ و نڤێژ، دێ ل سەر تە سڤك کەن]. ﴿٩٩﴾ و هەتا دمری [ئانکو هندی یێ
ساخی] خودایێ خۆ بپەرێسە.

## سۆرەتا نەحل

### ل مەکەهێ هاتیە خوارێ (١٢٨) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ ئەمرێ خودێ هات [ئانکو قیامەت نێزیك بوو]، ڤێجا لەزێ لێ نەکەن، ب ڕاستی خودێ ژ وێ شرکا
ئەو دکەن یێ پاقژ و بلندە. ﴿٢﴾ [خودێ] ملیاکەتان [جبریل و ئەوێت د گەلدا ژ پاریزڤانێت وەحییێ] ب
وەحییێ و ب ئەمرێ خۆ ل سەر وی بەندەیێ خۆ یێ وی بڤێت دئینیتە خوارێ [دا مرۆڤان هشیار بکەن و]،
دا نیشا مرۆڤان بدەن: کو ب ڕاستی چو خودێ نینن ژ بلی من، ڤێجا ژ من بترسن و پاریزکارییا من بکەن.
﴿٣﴾ ئەرد و ئەسمان ب هەقییێ و بۆ حیکمەتەکێ [نە گۆترە] چێکرینە، ڤێجا خودێ د سەر وێ شرکێرایە
یا ئەو دکەن [حاشای خودێ ژ وێ شرکا ئەو دکەن]. ﴿٤﴾ مرۆڤ یێ ژ چپکەکێ چێکری، ڤێجا [پشتی
ئافراندنا وی تمام بووی] ئەو وەکی هەڤرکەکێ ئاشکەرایە [بۆ خودایێ خۆ ئەوێ ئەو ژ ئاڤەکا کێم چێکری].
﴿٥﴾ و تەرش [حێشتر و چێل و پەز و بزن] ژی یێت چێکرین، بۆ هەوە گەرماتی یا تێدا [ئانکو ئەو جلکێت
هوین خۆ پێ گەرم دکەن ژ هری و موییێ وان چێ دکەن]، و هندەك فایدەیێت دی ژی بۆ هەوە یێت تێدا
هەین، و هوین دخۆن ژی. ﴿٦﴾ و بۆ هەوە جوانی یا د هاتنا واندا هەی [وەختێ ئێڤاری ژ چەرێ ڤەدگەڕن]،
و د بەردانا واندا ژی [وەختێ سپێدەیێ بەرددەنە چەرێ].

وَتَحۡمِلُ أَثۡقَالَكُمۡ إِلَىٰ بَلَدٖ لَّمۡ تَكُونُواْ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ
ٱلۡأَنفُسِۚ إِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ٧ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ
وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٨
وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ وَمِنۡهَا جَآئِرٞۚ وَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ
أَجۡمَعِينَ ٩ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم
مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ١٠ يُنۢبِتُ لَكُم
بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ
ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ١١
وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ
وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ
يَعۡقِلُونَ ١٢ وَمَا ذَرَأَ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُخۡتَلِفًا
أَلۡوَٰنُهُۥٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ١٣
وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا
وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَاۖ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ
فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ١٤





﴿٧﴾ و بارێت هەوە يێت گران بۆ باژێرەكى هەلدگرن، كو هوين نەدگەهشتنێ ب زەحمەتەكا زەحمەت نەبايە، ب راستى خودايێ هەوە يێ ميهرەبان و دلۆڤانە. ﴿٨﴾ و هەسپ و حێشتر و كەر يێت بۆ هەوە چێكرين دا هوين لێ سويار ببن [و بارێت خۆ پێ ڤەگوهێزن]، و جوانييە ژى بۆ هەوە [وەختێ هوين لێ سوار دبن و ب سوارييا خۆ شاهى دبن]، و ژ تشتێ هەوە زانين پێ نەيى ژى دێ چێ كەت [وەكى ئالاڤێت هاتن و چۆنێ]. ﴿٩﴾ و ل سەر خودێيە رێكا راست [نيشا بەندەيێت خۆ بدەت و بۆ رۆن بكەت] و هندەك رێ هەنە يێت خوار و ڤيچن [ئەو ژى رێكێت بەرزەبوون و گاورييێ و رێكێت خەلكێت سەرداچۆيينە، ئەوێت ب دويڤ دلخوازييان كەڤتين]، و ئەگەر خودێ ڤيابايە دا هەوە هەمييان راستەرێ كەت. ﴿١٠﴾ ئەو ئەوە يێ ئاڤ بۆ هەوە ژ عەوران ئينايیە خوار، هوين ژێ ڤەدخۆن، و ژ وێ ئاڤێ شينكاتى و داروبار شين دبيت، و هوين تەرشێت خۆ لێ دچەرينن. ﴿١١﴾ و خودێ بۆ هەوە پێ [ب وێ ئاڤێ] چاندن و زەيتوين و دارقەسپ و ترى و هەمى رەنگێت فێقى شين دكەت، ب راستى د ڤێ چەنديدا بەلگە و نيشان بۆ وان يێت هەين ئەوێت هزرا خۆ دكەن. ﴿١٢﴾ و خودێ شەڤ و رۆژ، و هەيڤ و رۆژ يێت ئێخستينە د بەرژەوەندييا هەوەدا، و ستێر ژى ب ئەمرێ وى سەرنەرم و موسەخەرن. ب راستى ئەڤە نيشان و بەلگەنە بۆ وان ئەوێت عەقلێ خۆ ددەنە شۆلى. ﴿١٣﴾ و هەر تشتەكێ رەنگ رەنگێ د ئەرديدا بۆ هەوە چێكرى [ژ جانەوەر و شينكاتى و مەعدەنان]، ب راستى ئەڤە نيشان و بەلگەنە بۆ وان ئەوێت بۆ خۆ چام و عيبرەتان وەردگرن. ﴿١٤﴾ و هەر ئەوە دەريا ئێخستييە د بن خزمەتا هەوەدا، دا هوين گۆشتێ نوى و تەر ژێ بخۆن و دا هوين لۆلۆ و مەرجانان ژێ دەربێخن و بكەنە بەر خۆ، و تو گەمييێت مەزن تێدا دبينى ئاڤێ شەق دكەن و دچن، و دا هوين ب رێكا دەريايێ بازرگانييێ بكەن و دا هوين سوپاسييا وى بكەن.

وَأَلْقَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَأَنْهَٰرًا وَسُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥﴾ وَعَلَٰمَٰتٍ وَبِٱلنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ﴿١٦﴾ أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿١٩﴾ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْوَٰتٌ غَيْرُ أَحْيَآءٍ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٢١﴾ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٌ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٢٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْتَكْبِرِينَ ﴿٢٣﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ قَالُوٓا۟ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ لِيَحْمِلُوٓا۟ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ قَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَى ٱللَّهُ بُنْيَٰنَهُم مِّنَ ٱلْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ ٱلسَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾



﴿١٥﴾ و چیایێت مەزن و بنەجهـ یـێت ئێخستینە د ئەردیدا دا ئـەرد هـەوە ڕاگریـت، و ڕوویبار و ڕێـك ژی بـۆ هـەوە یـێت کرینـە تێـدا، دا هویـن ب وان ڕوویبـار و ڕێـکان ڕاستەرێ ببـن بـۆ ئارمانجێت خـۆ. ﴿١٦﴾ و گەلـەك نیشـان و عەلامـەت یـێت ئێخستینە د ئەردیدا کـو ڕێـکان بـۆ خـۆ پـێ بزانـن، و ب ستێران ژی ڕێـکا خـۆ دزانـن. ﴿١٧﴾ ڤێجا ئـەرێ ئـەوێ ئافراندنـێ دکـەت وەکـی ویـیە یـێ ئافراندنـێ نەکـەت [نەشـێت بکـەت]. ڤێجا مـا هویـن هـزرا خـۆ ناکـەن. ﴿١٨﴾ و ئەگـەر هویـن نیعمەتێـت خـودێ [ل سـەر خۆ] بهەژمێـرن هویـن نەشـێن بهەژمێـرن [نائێنـە هەژمارتـن]، و ب ڕاسـتی خـودێ یـێ گونەهـ ژێبـەر و دلۆڤانـە. ﴿١٩﴾ و خـودێ ئـەوا هویـن ڤەدشـێرن و ئـەوا هویـن ئاشـکەرا دکـەن دزانیـت. ﴿٢٠﴾ و ئەوێـت ئـەو ژ بلی خـودێ دپەرێسـن و هـەوارا خـۆ دگەهیننـێ، چـو چـێ ناکـەن و چـو نـادەن و ئـەو ب خـۆ چێکـری و دایـینە. ﴿٢١﴾ ئـەو یـێت مرینـە و نەیـێت سـاخن، و ئـەو ب خـۆ نوزانـن کەنگـی دێ ئێنـە ڕاکـرن بـۆ قیامەتـێ.

﴿٢٢﴾ و خودایـێ هـەوە خودایەکـێ ب تنێیـە، ڤێجـا ئەوێـت باوەریـیێ ب ئاخرەتـێ نەئینن، دلێـت وان باوەری تێـدا نینـە و چـو نانیاسـن، و چـو تێـدا ناچیـت، و ئـەو خـۆ د سـەر هەڤیـێڕا دبینـن. ﴿٢٣﴾ ڕاستە و بـێ گۆمانە خـودێ ئـەوا ئـەو ڤەدشـێرن و ئەوا ئەو ئاشـکەرا دکـەن دزانیت، ب ڕاسـتی خودێ حـەژ خۆمەزنکـەران ناکەت. ﴿٢٤﴾ و ئەگـەر بـۆ وان بێتـە گۆتن: خودایـێ هەوە چ ئینایـیە خوارێ، دێ بێژن: ئەفسانەیـێت پێشیـیان یـێت ئینایـینە خـوارێ. ﴿٢٥﴾ [و وان ئـەڤ بـێ بەختیـیە کـر] دا ئـەو هەمـی گونەهێت خـۆ، و هنـدەك گونەهێت وان ژی، ئەوێـت ئـەوان ژ نەزانـین د سـەردابرین، ڕۆژا قیامەتـێ هەلبگرن، بزانن ئـەو بارەکێ پیس هەلدگرن و پیسـە گونەهـە ئەو دکەن. ﴿٢٦﴾ ب ڕاسـتی یـێت بەری وان پیلان و ئۆیـین گێڕان [دا خەلکی ژ پێغەمبـەران ڤەرەڤینن، و ئـەو تشـتێ ئـەو پێ هاتین کو وەحیـیا خودێیـە درەو بدانن]. ڤێجا خودێ ئاڤاهیـیێ وان ژ بن کر و بان ب سـەر وانـدا هاتـە خـوارێ، و ئیـزا ژ وی ڕەخیڤـە هاتە وان یـا هزرا وان بـۆ نەدچۆ.

ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يُخْزِيهِمْ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ
كُنتُمْ تُشَـٰٓقُّونَ فِيهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ إِنَّ ٱلْخِزْىَ
ٱلْيَوْمَ وَٱلسُّوٓءَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ
ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ۖ فَأَلْقَوُا۟ ٱلسَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوٓءٍۭ ۚ بَلَىٰٓ ۚ
إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ
خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَلَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾ ۞ وَقِيلَ
لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ مَاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۚ قَالُوا۟ خَيْرًا ۗ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى
هَـٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۚ وَلَدَارُ ٱلْـَٔاخِرَةِ خَيْرٌ ۚ وَلَنِعْمَ دَارُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٠﴾
جَنَّـٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ ۖ
لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْزِى ٱللَّهُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣١﴾
ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ ۙ يَقُولُونَ سَلَـٰمٌ عَلَيْكُمُ
ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن
تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ أَمْرُ رَبِّكَ ۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن
قَبْلِهِمْ ۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَـٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٣٣﴾
فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٤﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٢٧



﴿٢٧﴾ پاشـی ڕۆژا قیامەتـێ خـودێ دێ وان ڕسـوا و ڕەزیـل کـەت، و دێ بێژیتـە وان: کا ئـەو هەڤپشـکێت مـن ئەوێـت هەوە ل سـەر خاتـرا وان هەڤڕکـی و دژمنی [یا پێغەمبـەر و موسـلمانان] دکـر، [د وی وەختیـدا] ئەوێـت خودێ زانین دایـیێ [ژ زانا و بانگهلدێران] دێ بێژن: ب ڕاسـتی ئەڤـرۆ [کو ڕۆژا قیامەتێیە] شـەرمزاری و ڕسـوایی و ئیـزا بـۆ گاورانـە. ﴿٢٨﴾ ئەوێـت سـتەم ل خـۆ کریـن، وەختـێ ملیاکـەت ڕوحێـت وان دکێشـن دەسـت ژ هەڤڕکـی و دژمنیـێ بـەردان و تەسـلیمی ئەمـرێ خودێ بـوون، دێ بێـژن: مە چو خرابـی نەدکر. بەلـێ [کارێ هـەوە خرابـی بـوو] ب ڕاسـتی خـودێ دزانیـت کا هـەوە چ دکـر. ﴿٢٩﴾ ڤێجـا د دەرگەهێـت جەهنەمـێرا هەڕنـە ژۆر، هەروهـەر تێـدا (د جەهنەمێـدا) بمینـن، ڤێجـا جهـێ خۆمەزنکـەران چەنـدێ پیسـە. ﴿٣٠﴾ و گۆتنـە پارێـزکاران: خودایـێ هەوە چ ئینایـیە خـوارێ؟ گۆتـن: قەنجی. یـێت قەنجی د ڤێ دنیایـێدا کریـن دێ قەنجـی بـۆ وان هەبیـت و خـێر و خەلاتـێ ئاخرەتێ [بۆ وان ژ قەنجیـیا د دنیایـێدا گەهشتیـیە وان] چێتر و پترە، و ب ڕاسـتی باشـترین ئاڤاهیـیێ پارێـزکاران ئاڤاهیـیێ ئاخرەتێیە. ﴿٣١﴾ [ئەو ئاڤاهی] بەحەشـتێت خۆجهیـێنە دێ چنـە تێـدا، ڕوبیـار د بنڕا دچـن و وان چ بڤێـت یـێ تێـدا هـەی، و هۆسـا خـودێ پارێـزکاران خـەلات دکـەت. ﴿٣٢﴾ ئەوێـت ملیاکـەت ڕوحێـت وان دکێشـن، و ئـەو یـێت پـاك و پاقـژ ژ شرك و گونەهان، ملیاکـەت سـلاڤ دکەنە وان و دبێژنێ (السـلام علیکم) سـلاڤ ل سـەر هـەوە بن [د خۆشیـیێدا بمینـن] و ژ بەر کار و کریارێـت هـەوە کریـن هەڕنـە د بەحەشـتێدا. ﴿٣٣﴾ ئـەرێ ئـەو ل هیڤیـیا چنە، ئـەو ل هیڤیـیێنە ملیاکەت [یـێت ڕوحکێشـانێ] بۆ وان بێن [ڕوحا وان بسـتینن]، یان ژی ل هیڤیـیێنە ئەمرێ خودایـێ تە [ب ئیزادانا وان] بهێـت، هۆسـا ئەوێـت بـەری وان ژی چۆیـین وەکـی وان دکـر [و ژ بـەر کار و کریارێـت وان، خـودێ د هیـلاك بـرن]، و خـودێ سـتەم ل وان نەکریـیە بەلـێ وان ب خـۆ سـتەم ل خـۆ کـر. ﴿٣٤﴾ ڤێجـا جزایـێ کریارێت وان ئـەو هنگاڤتـن، و ئـەوا وان ترانـە بـۆ خۆ پێ دکـر [کو ئیزایا خودێیە] ب سـەر وانـدا هـات و دۆرماندۆرێت وان گرتن.

وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن
شَيۡءٖ نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ
فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٣٥
وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ
وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ
حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٣٦ إِن تَحۡرِصۡ عَلَىٰ هُدَىٰهُمۡ
فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَن يُضِلُّۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ٣٧
وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَا يَبۡعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُۚ بَلَىٰ
وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٣٨
لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي يَخۡتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ
أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰذِبِينَ ٣٩ إِنَّمَا قَوۡلُنَا لِشَيۡءٍ إِذَآ أَرَدۡنَٰهُ أَن نَّقُولَ
لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٤٠ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ
لَنُبَوِّئَنَّهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗۖ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ
يَعۡلَمُونَ ٤١ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ٤٢



﴿٣٥﴾ و ئەوێت هەڤال و هەڤپشك بۆ خودێ چێكرین
گۆتن: ئەگەر خودێ ڤیابایە نە مە و نە باب و
باپیرێت مە، كەسێ دی ژ بلی خودێ نەدپەرست، و
مە چو تشت [ل دەڤ خۆ] بێی وی حەرام نەدكر،
و هۆسا ئەوێت بەری وان ژی خودانێت خۆ و ڤێ
بوون [عەینی دروێ دكرن]، ڤێجا ما تشتەك ل
سەر پێغەمبەران هەیە ژ بلی راگەهاندنا ئاشكەرا.
﴿٣٦﴾ ب سویند مە بۆ هەر ملەتەكی پێغەمبەرەك
هنارتییە [دا بێژنە وان] خودێ ب تنێ بپەرێسن، و
پەرستنا غەیری خودێ نەكەن [وەكی سەرەگاوران
و شەیتانی و بوتان و خێڤزانكان]، ڤێجا هندەك ژ وان
خودێ یێت راستەرێ كرین، و هندەكان ژێ گومڕایی
و بەرزەبوون بۆ كەڤت. ڤێجا د ئەردیدا بگەڕن و بەرێ
خۆ بدەنێ كا دویماهیا درەوینان [وەكی ملەتێ عاد
و (سەموود) و ملەتێ نووح و شوعەیب] بوو چ؟!
﴿٣٧﴾ هندی تو خۆ بێێشینی و هندی تو یێ هشیار بی ل
سەر راستەڕێكرنا وان [تو نەشێی وان راستەڕێ بكەی]،
و ب راستی خودێ وی راستەڕێ ناكەت، ئەوێ وی
گومڕا و بەرزەكری [ئانكو یێ خودێ گومڕایی بۆ ڤیایی و رێكا گومڕاییێ گرتی، كەس نەشێت راستەڕێ
بكەت]، و وان چو پشتەڤان و هاریكار نینن [دەستێ وان بگرن و راستەڕێ بكەن، یان ئێزایا خودێ ژ وان
بدەنە پاش]. ﴿٣٨﴾ و وان سویندێت مەزن ب خودێ سویند خوارن كو یێ مر خودێ ساخ ناكەتەڤە، بەلێ..
[خودێ دێ هەمی مریان ساخ كەتەڤە] و ئەڤە سۆز و پەیمانە ژ دەڤ خودێ، بەلێ باراپتر ژ مرۆڤان نوزانن.
﴿٣٩﴾ [وان پشتی مرنێ دێ ساخكەتەڤە] دا بۆ وان ئەوا ئەو تێدا ژێك جودا دیار بكەت، و دا ئەوێت
گاوربوویین [باوەری نەئینایین كو خودێ دێ وان ساخكەتەڤە] بزانن كو وان درەو دكر. ﴿٤٠﴾ ب راستی
ئاخڤتنا مە ئەڤەیە گاڤا مە بڤێت تشتەك هەبیت، ئەم بێژین هەبە دێ هەبیت. ﴿٤١﴾ و ئەوێت بۆ خودێ
مشەخت بوویین پشتی ستەم لێ هاتییە كرن، ئەم دێ وان ل جهەكێ دی یێ باش د ڤێ ژیانێدا ئاكنجی
كەین، و خەلاتێ ئاخرەتێ هێژ مەزنترە ئەگەر ئەو بزانن. ﴿٤٢﴾ ئەو ئەون [ئەوێت ستەم ل وان هاتییە كرن
و هاتینە ئێزادان و ژ وەلاتێ خۆ هاتینە دەرئێخستن] ئەوێت بێهنا خۆ فرەهـ كرین و سەبر كێشایین [ل سەر
نەخۆشییان]، و پشتا خۆ ب خودێ گەرم دكەن.

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ
ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٤٣ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ
ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ٤٤
أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخۡسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ
أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ٤٥ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ
فِي تَقَلُّبِهِمۡ فَمَا هُم بِمُعۡجِزِينَ ٤٦ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ عَلَىٰ تَخَوُّفٖ فَإِنَّ
رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٌ ٤٧ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ
يَتَفَيَّؤُاْ ظِلَٰلُهُۥ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدٗا لِّلَّهِ وَهُمۡ دَٰخِرُونَ ٤٨
وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن دَآبَّةٖ
وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ٤٩ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ
سجدة الحزب ٢٨ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ۩ ٥٠ ۞ وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ
ٱثۡنَيۡنِۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ٥١ وَلَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًاۚ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَتَّقُونَ ٥٢ وَمَا بِكُم مِّن
نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ ٥٣ ثُمَّ إِذَا
كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنكُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ ٥٤





﴿٤٣﴾ و مە بەری تە کەس نەشاندیە، ئەم وەحییێ بۆ بهنێرین، ئەگەر زەلام نەبن [ئانکو هەر پێغەمبەرەکێ هاتیە هنارتن زەلامە و مرۆڤە و نە ملیاکەتە]، ڤێجا ئەگەر هوین [ڤێ] نەزانن ژ زانا و خودان زانینان بپرسن [ئانکو گەلێ قورەیشییان ئەگەر هوین ڤێ نەزانن پسیارا خودان کتێبان (جوهی و فەلەیان) بکەن، دا بۆ هەوە بێژن کو هەمی پێغەمبەر مرۆڤ بوون، نە ملیاکەت..]. ﴿٤٤﴾ مە [ئەو پێغەمبەر] ب نیشان و بەلگەییێت ئاشکەراکەر [کو ببنە نیشانێت ڕۆن ل سەر ڕاستییا وان] و ب کتێبان هنارتن، و مە قورئان بۆ تە ئینا خوار، دا تو بۆ مرۆڤان ئەوا بۆ وان هاتی، ئاشکەرا بکەی، و بەلکی هزرا خۆ بکەن و ل خۆ بزڤرن. ﴿٤٥﴾ ئەرێ ما ئەوێت پیلان و ئۆیینێت خرابییێ گێڕایین [دا خەلکی د سەردا ببەن یان دا تە ب دربێ زەلامەکی بکوژن]، پشت ڕاست بوویینە کو خودێ وان د ئەردیدا نابەتە خوارێ، یان ئیزا ژ وی ڕەخیڤە بۆ وان نائێت یێ وان هزر ژێ نەدکر؟! ﴿٤٦﴾ یان ژی ئیزا د وەغەر و کار و چۆن و هاتن و بازرگانییا واندا وان بهنگێڤیت، ڤێجا نە بشێن ژێ برەڤن و نە بشێن ژ خۆ بدەنە پاش. ﴿٤٧﴾ یان ژی دەمێ ئەو ب ترس [کو ژ بن بچن و یا ب سەرێ یێت بەری وان هاتی بێتە سەرێ وان ژی] وان بهنگێڤیت و ئیزایێ بدەتە وان، ب ڕاستی خودایێ هەوە میهرەبان و دلۆڤانە. ﴿٤٨﴾ ئەرێ ما ئەو بەرێ خۆ نادەنە وان تشتێت خودێ چێکرین، کا چاوا سیبەرا وان ڕاست و چەپ دئێتە ڤەگوهاستن و خوار دبیت، و خۆشکاندی سوجدەیێ بۆ خودێ دبەن. ﴿٤٩﴾ و هندی د ئەرد و ئەسماناندا هەی، ژ جانەوەران و ملیاکەت ژی هەمی سوجدەیێ بۆ خودێ دبەن و خۆ مەزن ناکەن. ﴿٥٠﴾ ئەو ژ خودایێ خۆ یێ د سەر خۆڕا دترسن، و ئەمرێ وان ب چ هاتیە کرن وێ دکەن. ﴿٥١﴾ و خودێ ئەمر کر: دو پەرستییان نەگرن [پەرستنا دو خودایان نەکەن]، ب ڕاستی خودایێ هەوە ب تنێ ئێکە، و ژ من ب تنێ بترسن. ﴿٥٢﴾ و چ د ئەرد و ئەسماناندا هەیە بۆ وییە، و تاعەت و گوهداری و پەرستن و دلبێشیا بەردەوام بۆ وییە، ئەرێ ڤێجا هوین خۆ ب ئێکێ دی ژ بلی خودێ دپارێزن و دترسن. ﴿٥٣﴾ و هەر نیعمەت و کەرەمەکا هوین تێدا بن ژ خودێیە، پاشی هەر وەختەکێ نەخۆشییەك گەهشتە هەوە، ڤێجا دێ هوین لاڤلاڤا خۆ ب هەوار و دەنگێ بلند گەهیننە وی. ﴿٥٤﴾ پاشی هەر وەختەکێ ئەو نەخۆشی ل سەر هەوە ڕاکر، دەستەکەك ژ هەوە هەڤپشکان بۆ خودایێ خۆ چێ دکەن.

لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡۚ فَتَمَتَّعُواْ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَجۡعَلُونَ
لِمَا لَا يَعۡلَمُونَ نَصِيبٗا مِّمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡۗ تَٱللَّهِ لَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ
تَفۡتَرُونَ ﴿٥٦﴾ وَيَجۡعَلُونَ لِلَّهِ ٱلۡبَنَٰتِ سُبۡحَٰنَهُۥ وَلَهُم مَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٥٧﴾
وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٞ ﴿٥٨﴾
يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ
أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿٥٩﴾ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ
بِٱلۡأٓخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوۡءِۖ وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٦٠﴾
وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلۡمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيۡهَا مِن دَآبَّةٖ
وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ
سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ﴿٦١﴾ وَيَجۡعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكۡرَهُونَۚ وَتَصِفُ
أَلۡسِنَتُهُمُ ٱلۡكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ
وَأَنَّهُم مُّفۡرَطُونَ ﴿٦٢﴾ تَٱللَّهِ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٖ مِّن قَبۡلِكَ
فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَهُمۡ
عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٦٣﴾ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ
ٱلَّذِي ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٦٤﴾



﴿٥٥﴾ [ئەو ڤی کاری دکەن] دا چاڤیێت خۆ ژ وان
کەرەم و نیعمەتان بگرن ئەوێت مە د گەل وان کرین،
ڤێجا هوین د خۆشییێدا بمینن بەلێ هوین دێ زانن
[کا دویماهییا هەوە دێ بیتە چ؟]. ﴿٥٦﴾ ئەو پشکەکێ ژ
وی رزقێ مە دایییە وان، بۆ وان [بوتان] ددانن ئەوێت
چو تشتی نەزانن، ب خودێ [رۆژا قیامەتێ] پسیارا
هەوە دێ ل سەر وان درەوان ئێتەکرن ئەوێت هەوە
دکرن. ﴿٥٧﴾ و وان [ملیاکەت] کچ بۆ خودێ دانان،
[حاشای خودێ] خودێ ژ ڤێ گۆتنا وان یێ پاك و
پاقژە، و کا وان چ دڤیا ئەو بۆ خۆ ددانان. ﴿٥٨﴾ و هەر
وەختێ مزگینی ب کچێ بۆ ئێکی بێتە دان [کو خودێ
کچەکا دایییێ]، دێ ناڤچاڤێت وی تێکچن و ڕەش
بن، و دێ کەربگرتی بیت و دێ کەربێ داعویریت.
﴿٥٩﴾ ژ بەر مزگینییا خراب و ل سەر گران، خۆ ژ
خەلکی ڤەدشێریت [و نوزانیت] ئەرێ وێ کچێ
شکەستی و ڕەزیل بهێلیت، یان ژی ب ساخی بن ئاخ
بکەت، هشیار بن پیسە حوکمە ئەو دکەن [وەختێ
ئەو کچێت ئەو پێ نەخۆش ب بال خودێڤە لێ ددەن،
و کوران ب بال خۆڤە لێ ددەن]. ﴿٦٠﴾ ئەوێت باوەرییێ ب ئاخرەتێ نەئینن سالۆخەتێ پیس و خراب بۆ
وانە، و سالۆخەتێ پاك و بلند بۆ خودێیە و ئەوە یێ سەردەست و کاربنەجه. ﴿٦١﴾ و ئەگەر خودێ مرۆڤان
ب ستەما وان ئیزا بدەت [ئانكو ژ بەر ستەما وان ئیزا بۆ وان ئینابایە]، تشتێ ل سەر ڕوییێ ئەردی بلڤلڤیت
نەدهێلا، بەلێ وان بۆ وەختەکێ دیارکری گیرۆ دکەت [کو ڕۆژا قیامەتێیە]، ڤێجا ئەگەر وەختێ وان هات،
نە بیستەکێ ل پاش و نە بیستەکێ پێش دکەڤن. ﴿٦٢﴾ و وێ بۆ خودێ ددانن یا وان بۆ خۆ نەڤێت [ئانكو
کچان بۆ خودێ ددانن، و وان ب خۆ کچ نەڤێن] و ژ درەو دبێژن: ب ڕاستی بەحەشت بۆ مەیە [ئەگەر
قیامەت ژی هەبیت]، ب ڕاستی ئاگر بۆ وانە و ئەو دێ ل پێشییێ بن، و دێ تێدا ئێنە هێلان و ئێنە ژ بیرکرن.
﴿٦٣﴾ ب خودێ بەری تە مە بۆ گەلەك ملەتان پێغەمبەر هنارتینە، ڤێجا شەیتانی کریارێت وان یێت خراب
بۆ وان خەملاندن، ڤێجا ئەڤرۆ [کو ڕۆژا قیامەتێیە] شەیتان سەرکار و تەکێ وانە [ڤێجا بلا ل هیڤییێ بن کا
شەیتان دێ چ هاریکارییا وان کەت]، و ئیزایەکا دژوار بۆ وان هەیە. ﴿٦٤﴾ و مە ئەڤ قورئانە بۆ تە ئینایییە
خوارێ، دا تو بۆ وان دیار بکەی ئەوا ئەو تێدا ب گۆمان و دودل و [مە ئەڤ قورئانە بۆ تە ئینایییە خوارێ]،
دا ببیتە ڕێکا ڕاستەڕێیی و دلۆڤانییێ بۆ وان ئەوێت باوەرییێ دئینن.

وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ فِي
ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ٦٥ وَإِنَّ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةٗۖ نُّسۡقِيكُم
مِّمَّا فِي بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيۡنِ فَرۡثٖ وَدَمٖ لَّبَنًا خَالِصٗا سَآئِغٗا لِّلشَّٰرِبِينَ ٦٦
وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا
حَسَنًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ٦٧ وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ
أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ ٦٨ ثُمَّ
كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسۡلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلٗاۚ يَخۡرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا
شَرَابٞ مُّخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٞ لِّلنَّاسِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ
يَتَفَكَّرُونَ ٦٩ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمۡۚ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ
أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡ لَا يَعۡلَمَ بَعۡدَ عِلۡمٖ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٞ قَدِيرٞ ٧٠
وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلرِّزۡقِۚ فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُواْ
بِرَآدِّي رِزۡقِهِمۡ عَلَىٰ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَهُمۡ فِيهِ سَوَآءٌۚ أَفَبِنِعۡمَةِ
ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ٧١ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا
وَجَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةٗ وَرَزَقَكُم مِّنَ
ٱلطَّيِّبَٰتِۚ أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ وَبِنِعۡمَتِ ٱللَّهِ هُمۡ يَكۡفُرُونَ ٧٢



﴿٦٥﴾ و خودێ ئاڤ [باران] ژ ئەسمانی ئینا خوارێ، ڤێجا ئەرد پشتی مری [هشك بوویی] ساخكر و شینكر، ب ڕاستی ئەڤە بەلگە و نیشانەكا ئاشكەرایە بۆ وان ئەوێت ژ دل گوهێ خۆ ددەنێ. ﴿٦٦﴾ و ب ڕاستی بۆ هەوە د تەرشاندا [د پەز و چێل و حێشتراندا، د چێكرن و سەرنەرمكرنا واندا بۆ هەوە] دەرس و چامە هەنە، و د زكێ واندا د ناڤبەرا ڕیخێ و خوینێدا شیرەكێ زەلال و پارزنی ددەینە هەوە كو ب ساناهی د گەوریێیا واندا بچیت یێت ڤەدخۆن. ﴿٦٧﴾ و هوین ژ فێقیێێ دارقەسپێ و مێوێت تری مەیێ [ئارەقێ] و ڕزقێ پاك و چاك [وەكی ترشی و ڕیچۆلێ و قەسپ و مێویژان و دۆشاڤێ و شەربەتێ... هتد] ژێ دگرن و چێ دكەن، ب ڕاستی ئەڤە بەلگە و نیشانەكە بۆ وان ئەوێت ئەقلێ خۆ ددەنە شۆلی. ﴿٦٨﴾ و خودایێ تە ئیلهام دا مێشا هنگڤینی، كو جهێ خۆ ل چیا و داران و د وان ئاڤاهیێیێت دئێنە ئاڤاكرندا بكە. ﴿٦٩﴾ پاشی ژ هەمی فێقیان بخۆ، ڤێجا ئەو ڕێكێت خودایێ تە ئیلهاما تە پێ كری ب ساناهی بگرە و تێرا هەرە. و د ناڤ هناڤێت وێدا ڤەخوارنەكا ڕەنگ ڕەنگ دەردكەڤیت، دەرمانە بۆ مرۆڤان، ب ڕاستی ئەڤە نیشانەكا ئاشكەرایە بۆ وان ئەوێت هزرا خۆ دكەن. ﴿٧٠﴾ و خودێ هوین یێت چێكرین پاشی دێ هەوە مرینیت و هندەك ژ هەوە دێ ئێنە هێلان هەتا ژییێ نەهشییێ، دا یێ هاتییە هێلان پشتی زانینێ چو نەزانیت، ب ڕاستی خودێ خودان شیان و زانایە. ﴿٧١﴾ و خودێ هندەك ژ هەوە ب سەر هندەكان ئێخستینە د ڕزقیدا، ڤێجا ئەوێت خودێ ڕزق داییێ و ب سەر یێت دی هاتینە ئێخستن، بەرهەڤ نینن ڕزقێ خۆ بدەنە كۆلەیێت خۆ دا هەمی وەك ئێك لێ بێن [پا چاوا ئەو دورست دكەن بەندەیێت خودێ د ملكێ خودێدا پشكدار بكەن و بیننە ڕێزەكێ]. ئەرێ ئەو نیعمەتێت خودێ نائیننە بەرچاڤێت خۆ؟!. ﴿٧٢﴾ و خودێ بۆ هەوە ژ نفشێ هەوە هەڤسەر و هەڤگیان چێكرینە، و كوڕ و نەڤی ژ وان هەڤسەران داینە هەوە، و تشتێ پاك و پاقژ كرییە ڕزقێ هەوە، ئەرێ ڤێجا ئەو باوەرییێ ب پویچییێ و باتلی دئینن [كو بوتێت وان زیانێ یان مفایی دگەهیننە وان]، و چاڤێت خۆ ژ كەرەم و نیعمەتێت خودێ دگرن.

وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ
إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧٤﴾ ۞ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا
مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَمَن رَّزَقْنَٰهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا
فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا ۖ هَلْ يَسْتَوُۥنَ ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ
بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ
أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ
أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ ۖ هَلْ يَسْتَوِى هُوَ وَمَن يَأْمُرُ
بِٱلْعَدْلِ ۙ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾ وَلِلَّهِ غَيْبُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَآ أَمْرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ
ٱلْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٧٧﴾
وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا
وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ
تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ مُسَخَّرَٰتٍ فِى جَوِّ ٱلسَّمَآءِ
مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٧٩﴾

ربع الحزب ٢٨



﴿٧٣﴾ و وان ژ بلی خودێ دپەرێسن ئەوێت نە شیان
هەی رزقەکی ژ ئەسمانان بۆ وان بهێنن [وەکی بارانێ]
و نە دشێن رزقەکی بۆ وان ژ ئەردی دەربێخن [وەکی
داروبار و شینکاتی]، و خۆ ئەگەر بزاڤێ ژی بکەن
هەر نەشێن. ﴿٧٤﴾ ڤێجا چو نموونەیان بۆ خودێ
نەئینن [چونکی خودێ ئێکە و کەس وەکی وی نینە، و
وان دگۆت خودێ خودانێ هەمی گەردوونییە، ئەو ژ
هندێ مەزنترە ئەم ئێکسەر وی بپەرێسین، ڤێجا دڤێت
هندەك د ناڤبەرا مە و ویدا بن]، ب راستی خودێ
[خرابییا نموونەیا هوین دئینن] دزانیت و هوین
ب خۆ نوزانن [کا ئەڤ نموونەیە چەند نەیا د جهێ
خۆدایە]. ﴿٧٥﴾ خودێ نموونەیەك ئینا، کۆلەیەکێ بێ
هێز و نەچار کو نەشێت چو ب دەست خۆڤە بینیت،
و ئێکێ دی مە کەرەم د گەل کربیت و رزقەکێ باش
ژ دەڤ خۆ مە دابیتێ، ڤێجا نەپەنی و ئاشکەرا ژێ
دمەزێخیت [د رێکێت خێرێدا]، ئەرێ ما ئەڤە وەکی
ئێکن [ئەرێ بەندەیێ ئازاد و یێ د بن کۆلەتیێڤە و ب
خودان وەکی ئێکن، ئەها هۆسا خودایێ رزقدار و
چێکەر، و بەرێت ئەو دپەرێسن نەوەکی ئێکن]، و حەمد و سەنا هەمی بۆ خودێنە بەلێ باراپتر ژ وان نوزانن.
﴿٧٦﴾ و خودێ نموونەیەك ئینا و دیارکر، دو زەلامان، ئێك ژ وان یێ کەڕ بیت و نەشێت چو بکەت [چونکی
یێ بێ فامە و نەشێت باخڤیت]، و ئەو خۆ ب خۆ بارە ل سەر خودانێ خۆ و سەرکارێ خۆ [چونکی
نەشێت ب کارێ خۆ رابیت]، هەر جهێ بەرێ وی بدەتێ سەرفراز نابیت و خێر ژێ چێ نابیت. ڤێجا ئەرێ
ئەڤە و [یێ دورست و ژیر و ژێهاتی] ئەوێ فەرمانێ ب دادپەروەرییێ دکەت و ئەو ب خۆ ژی ل سەر رێکا
راست و دورست بیت وەکی ئێکن [مەخسەد ژ ئینانا ڤێ نموونەیێ ئەوە کو ئەو بوتێت هشك و بێ ئەزمان
ئەوێت ئەو بۆ خۆ دکەنە هەڤپشك وەکی خودێ نابن]. ﴿٧٧﴾ و زانینا غەیبا ئەرد و ئەسمانان یا خودێیە
[و کەس د گەل پشکدار نینە]، و کارێ رۆژا قیامەتێ ل دەڤ خودێ [د هاتن و لەزوبەز و ساناهیبوونا خۆدا]
وەکی گرتن و ڤەکرنا چاڤییە یان هێژ نێزیکترە، و ب راستی خودێ ل سەر هەمی تشتان یێ دەستهەلاتدارە.
﴿٧٨﴾ و خودێ هوین ژ زکێت دەیکێت هەوە دەرئێخستن [بچویك و لاواز] هەوە چو نەدزانی، و گوهـ و
چاڤ و دل دانە هەوە، دا هوین سوپاسی و شوکورا خودێ بکەن [دا هوین هەر ئەندامەکی ژ ڤان د جهێ وی
یێ دورستدا ب کاربینن]. ﴿٧٩﴾ ئەرێ ما ئەو بەرێ خۆ نادەنە بالندەیان، وەسا یێت هاتینە چێکرن کو ب
ساناهی ل ئەسمانی بفڕن، و کەس وان ڕاناگریت و ناپارێزیت خودێ نەبیت، ب ڕاستی ئەڤە بەلگە و نیشانن
[ل سەر دەستهەلاتداریا خودێ] بۆ وان ئەوێت باوەرییێ دئینن.

وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ
ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ
وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ ٨٠
وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ
ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ
ٱلۡحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ
عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ ٨١ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ
ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٨٢ يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا
وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٨٣ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٖ
شَهِيدٗا ثُمَّ لَا يُؤۡذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ ٨٤
وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلۡعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمۡ وَلَا هُمۡ
يُنظَرُونَ ٨٥ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ شُرَكَآءَهُمۡ قَالُواْ
رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدۡعُواْ مِن دُونِكَۖ
فَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلَ إِنَّكُمۡ لَكَٰذِبُونَ ٨٦ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَى
ٱللَّهِ يَوۡمَئِذٍ ٱلسَّلَمَۖ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ٨٧





﴿٨٠﴾ و خودێ خانییێت هەوە بۆ هەوە کرینە جهێ ئاکنجیبوونێ، و ژ پیستێت تەرشان بۆ هەوە خانی چێکرینە [وەکی کوین و ڕەشمالان] کو ڕۆژا هوین ئاکنجی دبن و کوینێت خۆ ڤەددەن، و ڕۆژا هوین وەغەرێ دکەن د سڤکن بۆ هەوە و ژ هرییا پەزی و لڤاییا حێشتران و موییێ بزنان ناڤمالی بۆ هەوە چێ کرییە، مفایی بۆ خۆ ژێ وەرگرن هەتا دەمەکی [هەتا وەختێ مرنێ]. ﴿٨١﴾ و خودێ بۆ هەوە ژ وی تشتێ وی چێکری سیبەر و سە داییێ [دا ژ گەرما ڕۆژێ بێنە پارستن] و بۆ هەوە شکەفت ئێخستینە د چیایاندا، و جلك [ژ هرییێ] بۆ هەوە چێکرین، هەوە ژ گەرما ڕۆژێ بپارێزن و دیسا هندە جلك یێت داینە هەوە [وەکی زری کومزرییان] هەوە ژ دژوارییا شەڕی بپارێزن، و هۆسا کەرەم و قەنجییێت خۆ ل سەر هەوە تمام دکەت، دا هوین ب دورستی خۆ بسپێرنە خودێ [ل بەر ئەمرێ وی ڕاوەستن]. ﴿٨٢﴾ ڤێجا ئەگەر وان ڕوییێ خۆ وەرگێڕا [و موسلمان نەبوون پشتی ڤان نیشان و بەلگەیان ژێ، چو ل سەر تە نینە و تو چو خوسارەت نابی] یا ل سەر تە، ب ڕاستی بەس ڕاگەهاندنا ئاشکەرایە. ﴿٨٣﴾ ئەو نیعمەت و کەرەمێت خودێ [ب دەڤی] دزانن، پاشی [ب کریارێت خۆ] ئینکار دکەن [وەختێ ئەو ئێکێ دی ژ بلی خودانێ ڤان نیعمەتان دپەرێسن] و باراپتر ژ وان چاڤنقن، و نیعمەتێت خودێ ئینکار دکەن. ﴿٨٤﴾ و ڕۆژا ئەم ژ هەر ملەتەکی شاهدەکی [کو پێغەمبەرێ وانە] بۆ دئینین، پاشی دەستویری بۆ گاوران نائێتەدان کو عوزرا خۆ بخوازن و ژ وان نائێتە خواستن ئەو ژ خرابییا خۆ بزڤڕن، و ژ نوی خودایێ خۆ ب گۆتنەکێ یان ب کریارەکێ ڕازی بکەن [چونکی ڕۆژا قیامەتێ نە ڕۆژا کارییە، بەلێ ڕۆژا جزاکرن و خەلاتانە ل سەر کار و کریارێت دنیایێ]. ﴿٨٥﴾ و وەختێ ستەمکار ئیزا و عەزابێ دبینن، ڤێجا ئیزایا وان نە ل سەر وان سڤك دبیت، و نە ژی مۆلەت و دەرفەت بۆ وان دئێتەدان [سەر ژ نوی تۆبە بکەن]. ﴿٨٦﴾ وەختێ موشرك ئەوێت بۆ خودێ کرینە هەڤپشك [کو پەرستییێت وانن] دبینن، دێ بێژن: خودێوۆ ئەڤە ئەو هەڤپشکێت مەنە ئەوێت مە بۆ تە چێکرین و مە شوینا تە دپەرستن [ڤێجا هەڤێ مە ژ وان چێکە، وان ئەم د سەردابرین]، ڤێجا پەرستییان ئاخڤتنا وان ل وان زڤراند، ب ڕاستی هوین درەوینن [مە چوجا نەگۆتییە هەوە مە بپەرێسن]. ﴿٨٧﴾ د وێ ڕۆژێدا ئەوێت ستەمکار و گاوڕ تەسلیمی حوکمێ خودێ دبن، و ئەو هزرا وان دکر [کو بوت و پەرستییێت وان دێ مەهدەر و بەرەڤانییێ بۆ کەن] ل وان بەرزەبوو.

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا
فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ ﴿٨٨﴾ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ فِي
كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدًا عَلَيۡهِم مِّنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَجِئۡنَا بِكَ
شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ
شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٨٩﴾ ۞إِنَّ ٱللَّهَ
يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ
ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾
وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلۡأَيۡمَٰنَ
بَعۡدَ تَوۡكِيدِهَا وَقَدۡ جَعَلۡتُمُ ٱللَّهَ عَلَيۡكُمۡ كَفِيلًاۚ إِنَّ
ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿٩١﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّتِي نَقَضَتۡ
غَزۡلَهَا مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثٗا تَتَّخِذُونَ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا
بَيۡنَكُمۡ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرۡبَىٰ مِنۡ أُمَّةٍۚ إِنَّمَا يَبۡلُوكُمُ ٱللَّهُ
بِهِۦۚ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٩٢﴾
وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن
يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَلَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٣﴾

نصف الحزب ٢٨



﴿٨٨﴾ ئەوێت گاور بوویین و خەلك ژی ژ ڕێكا
خودێ داینە پاش [چ ب خورتی، چ ژی ب خەملاندنا
گاوریێ ل بەر وان]، دێ ئیزایێ ل سەر ئیزایێ ل
سەر وان زێدەكەین [جارەكێ چونكی هێژایی وێ
ئیزایێنە، یا دویێ ژ بەر سەردابرنا خەلكی] ژ بەر وێ
خرابیا وان دكر. ﴿٨٩﴾ و بینە بیرا وان ڕۆژا ئەم بۆ هەر
ملەتەكی ژ وان ب خۆ، شاهدەكی ل سەر وان دئینین
[پێغەمبەرێت وان، دا شادەیییێ ل سەر وان بدەن]،
و ئەم تە ژی ل سەر ڤان [موسلمانان] شاهد دئینین.
و مە ئەڤ قورئانە بۆ تە ئینا خوارێ، كو ڕۆنكەرا
هەمی تشتانە و ڕێكا هیدایەتێیە، و دلۆڤانی و مزگینییە
بۆ موسلمانان. ﴿٩٠﴾ ب ڕاستی خودێ فەرمانێ ب
دادپەروەرییێ و قەنجییێ و هاریكاریا كەس و كاران
ب دانێ، دكەت، و نەهییێ ژ هەمی گونەهێت كرێت
و كریارێت نە د گەل سروشتێ مرۆڤان و كریارێت
تەرێف [ئەوێت شریعەتی دورست نەكرین] و ستەم
و خۆمەزنكرنێ دكەت، خودێ ڤان شیرەتان ل هەوە
دكەت دا هوین بۆ خۆ پێڤە بچن. ﴿٩١﴾ و هوین سۆز
و پەیمانێت خۆ ب جه بینن گاڤا هەوە سۆز و پەیمان دا، و سویندێت خۆ پشتی هەوە، خودێ ل سەر
خۆ كرییە شاهد و زێرەڤان و موكومكرین نەشكێنن، ب ڕاستی تشتێ هوین دكەن خودێ دزانیت و پێ
ئاگەهە. ﴿٩٢﴾ ڤێجا هوین ژی وەكی وێ [ژنێ] نەبن ئەوا هریا خۆ پشتی موكوم ڕێسایی كرییە هریڤە
[ئانكو سۆز و پەیمانان نەدەن و موكوم كەن پاشی بشكێنن، وەكی وێ ژنێ ئەوا ڕیسێ خۆ كرییەهریڤە]، و
سویندخوارنا خۆ بكەنە حیلە و حەوالە و ڕێكا خاپاندنێ د ناڤبەرا خۆ ب خۆدا، چونكی هوین دبینن هندەك
[كو قورەیشینە] ب مال و مرۆڤان پترن ژ هندەكێت دی [موسلمانن]، ب ڕاستی خودێ هەوە ب ڤان سۆز
و پەیمانان دجەڕبینیت [كا سۆز و پەیمانا هەوە داییە پێغەمبەری هوین دێ ب جهـ ئینن یان دێ شكێنن
چونكی قورەیشی پتر و ب هێزترن ژ موسلمانان] و [خودێ] دێ ڕۆژا قیامەتێ ئەو تشتێ هوین تێدا ژێك
جودا، بۆ هەوە ئاشكەراكەت [و هەر ئێكی دێ جزایێ وی دەتێ]. ﴿٩٣﴾ و ئەگەر خودێ حەزكربایە دا هەوە
هەمیان پێكڤە كەتە ئێك ملەت و ئێك دین، بەلێ یێ خودێ بڤێت دێ ژ ڕێكا ڕاست بەرزەكەت و یێ
بڤێت دێ ڕاستەڕێ كەت، و ب ڕاستی پسیار ژ هەوە دێ ئێتەكرن ل سەر وان كریاران یێت هەوە دكرن.

وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ
ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَكُمۡ
عَذَابٌ عَظِيمٞ ٩٤ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ إِنَّمَا
عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٩٥ مَا عِندَكُمۡ
يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٖۗ وَلَنَجۡزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجۡرَهُم
بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٩٦ مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا
مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ
وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٩٧
فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ٩٨
إِنَّهُۥ لَيۡسَ لَهُۥ سُلۡطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ
يَتَوَكَّلُونَ ٩٩ إِنَّمَا سُلۡطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوۡنَهُۥ وَٱلَّذِينَ
هُم بِهِۦ مُشۡرِكُونَ ١٠٠ وَإِذَا بَدَّلۡنَآ ءَايَةٗ مَّكَانَ ءَايَةٖ
وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفۡتَرِۭۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ
لَا يَعۡلَمُونَ ١٠١ قُلۡ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ
لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ١٠٢



﴿٩٤﴾ و هوین [گەلی موسلمانان] سویندێت خۆ نەکەنە رێکا حیلە و حەوالە و غەدر و خیانەتێ د ناڤبەرا خۆدا، ڤێجا ژ بەر هندێ پێ ل سەر رێکا راست بتەحسن و ژ هەڤییێ دەرکەڤن پشتی بنەجهـ بوویین، و ئیزا و عەزاب [ل دنیایێ] هەوە بهنگێڤیت ژ بەر دانەپاشا خەلکی ژ دینێ خودێ [ب سویند و پەیمانێت ژ درەو] [و رۆژا قیامەتێ] بۆ هەوە ئیزایەکا مەزن هەیە. ﴿٩٥﴾ و پەیمانا هەوە د گەل خودێ دایی [کو هوین پشتەڤانی و هاریکاریا پێغەمبەری بکەن و رێکا وی بگرن و بەرنەدەن]، ب بهایەکێ کێم نەگوهۆڕن و نەفرۆشن، ب راستی ئەوا ل دەڤ خودێ بۆ هەوە چێترە ئەگەر هوین بزانن. ﴿٩٦﴾ [چونکی] ئەوا ل دەڤ هەوە [ژ سامان و زێر و زینەتان] نامینیت [چەند گەلەك ژی بیت]، بەلێ ئەوا ل دەڤ خودێ دێ مینیت، و ب راستی ئەوێت [ژ بەر مە هاتینە ئیزادان و نەخۆشی گەهشتییێ] و سەبر کێشایین، ب راستی ئەم دێ ژ کار و کریارێت وان چێتر وان خەلات کەین. ﴿٩٧﴾ هەر کەسێ کارێ قەنج بکەت و خودان باوەر ژی بیت ژ ژن و مێران، دێ ژیانەکا سەرفەراز و پاقژ د ڤێ دنیایێدا دەینێ و [رۆژا قیامەتێ] ئەم دێ ژ کار و کریارێت وان چێتر وان خەلات کەین. ﴿٩٨﴾ ڤێجا ئەگەر تە ڤیا قورئانێ بخوینی، ژ خودێ بخوازە تە ژ وەسواس و ئاوازێت شەیتانێ لەعنەتی و ژ رەحما خودێ دەرئێخستی بپارێزیت [ئانکو بێژە (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) دا شەیتان تە ژ تێگەهشتنا قورئانێ و کارپێکرنا وێ دویر نەئێخیت]. ﴿٩٩﴾ ب راستی وی چو دەستهەلات ل سەر وان نینە ئەوێت باوەری ئینایین، و پشتا خۆ ب خودایێ خۆ گەرم دکەن. ﴿١٠٠﴾ ب راستی دەستهەلاتداریا وی بەس ل سەر وانە ئەوێت ب دویڤ وی کەڤتین، و وی دکەنە دۆستێ خۆ و بۆ خۆ دکەنە سەرکار و رێبەر، و ئەوێت بۆ خودێ هەڤپشکان چێ دکەن. ﴿١٠١﴾ و ئەگەر ئەم ئایەتەکێ ل جهێ ئایەتەکا دی بینین [ئانکو فەرمانا ئایەتەکێ ب فەرمانا ئایەتەکا دی راکەین و نەسخ کەین]، و خودێ چێتر دزانیت کا ئەو چ دئینیتە خوارێ [ئانکو خودێ چێتر دزانیت کا چ ب کێر مرۆڤان دئێت و چ پتر د خێرا واندایە] دێ بێژن: تو [هەی موحەمەد] درەوان ب ناڤێ خودێ دکەی، بەلکی باراپتر ژ وان [چو ژ حیکمەت و نهێنیا نەسخکرنێ] نوزانن. ﴿١٠٢﴾ [هەی موحەمەد] بێژە وان: ب راستی جبریلی ئەڤ قورئانە ژ دەڤ خودایێ تە ب هەقییێڤە [بێ خەلەتی و گرێدایی ب حیکمەتێڤە] ئینایییە خوارێ، دا ئەوێت باوەری ئینایین موکوم بکەت، و دا ببیتە مزگینی و راستەرێیی بۆ موسلمانان.

وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّهُمۡ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٞۗ لِّسَانُ
ٱلَّذِي يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ أَعۡجَمِيّٞ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيّٞ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهۡدِيهِمُ ٱللَّهُ
وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ إِنَّمَا يَفۡتَرِي ٱلۡكَذِبَ ٱلَّذِينَ
لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴿١٠٥﴾
مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ
مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ
صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾
ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى
ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾
أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَسَمۡعِهِمۡ
وَأَبۡصَٰرِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴿١٠٨﴾ لَا جَرَمَ
أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿١٠٩﴾ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ
لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ
وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٠﴾



﴿١٠٣﴾ و ب سويند ئەم دزانين كو ئەو دبێژن: [ئەڤێ
قورئانێ] مرۆڤەك [بەنی ئادەمەك نە ملياكەتەك
وەكی ئەو دبێژيت] نيشا وی ددەت. [ئەڤە دێ چاوا
كەڤتە بەرێك] و ئەوێ هزرا وان بۆ دچيت [كو وی
موحەمەد يێ فێری قورئانێ كری]، زمانێ وی بيانی
و نە عەرەبييە [چو ژ ڕەوانبێژيا عەرەبی نوزانيت]،
و ئەڤ قورئانە زمانەكێ عەرەبی يێ خودان بەيان
و فەساحەتە. ﴿١٠٤﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەرييێ
ب ئايەتێت خودێ [قورئانێ] نەئينن، خودێ وان
[هندی ل سەر گاورييێ بن] ڕاستەڕێ ناكەت، و
[ڕۆژا قيامەتێ] بۆ وان ئيزايەكا دژوار و ب ژان هەيە.
﴿١٠٥﴾ ئەو درەوان دكەن ئەوێت باوەرييێ ب ئايەتێت
خودێ [قورئانێ] نەئينن، [ڤێجا چاوا درەو دێ كەڤتە
ڕەنگێ پێغەمبەری و ئەو كەسێ ئێكێيە باوەری ب
قورئانێ ئينايی] و ئەڤێت هۆ دبێژن ئەون درەوكەر.
﴿١٠٦﴾ هەر كەسێ پشتی باوەری ئينانێ باوەرييێ ب
خودێ نەئينيت [و گاور ببيت]، ژ بلی وی يێ خورتی
لێ هاتييە كرن و دلێ وی يێ تژی باوەری، بەلێ ئەوێ
دلێ وی بۆ گاورييێ ڤەببيت و پێ خۆش ببيت، غەزەب و كەربا خودێ ل سەر وان بيت، و ئيزايەكا مەزن
بۆ وان هەيە. ﴿١٠٧﴾ ئەڤە [ئيزايا ژێگۆتی] چونكی وان ژيانا دنيايێ هەلبژارت و ب سەر ئاخرەتێ ئێخست
و پتر ڤيا، و ب ڕاستی خودێ ئەوێت گاوربوويين ڕاستەڕێ ناكەت. ﴿١٠٨﴾ ئەڤە ئەون ئەوێت خودێ مۆر
ل سەر دل و گوهـ و چاڤێت وان دانايی، و ئەڤەنە يێت بێ ئاگەهن. ﴿١٠٩﴾ ب ڕاستی و بێ شك ئەڤەنە يێت
خوسارەت ڕۆژا قيامەتێ. ﴿١١٠﴾ پاشی ب ڕاستی خودايێ تە بۆ ئەوێت مشەخت بوويين [ژ مەكەهێ] پشتی
هاتينە ئيزادان، پاشی [پشتی مشەختبوونێ] جيهاد كرين، و سەبر [ل سەر جيهادێ] كێشايين، ب ڕاستی
خودايێ تە پشتی ڤێ [مشەختبوون و جيهاد و سەبركێشانێ] يێ گونەهـ ژێبەر و لێنەگر و دلۆڤانە.

*يَوۡمَ تَأۡتِي كُلُّ نَفۡسٖ تُجَٰدِلُ عَن نَّفۡسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ
نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١١١﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا
قَرۡيَةٗ كَانَتۡ ءَامِنَةٗ مُّطۡمَئِنَّةٗ يَأۡتِيهَا رِزۡقُهَا رَغَدٗا مِّن
كُلِّ مَكَانٖ فَكَفَرَتۡ بِأَنۡعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ
ٱلۡجُوعِ وَٱلۡخَوۡفِ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدۡ جَآءَهُمۡ
رَسُولٞ مِّنۡهُمۡ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿١١٣﴾
فَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَٱشۡكُرُواْ
نِعۡمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴿١١٤﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ
عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحۡمَ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ
ٱللَّهِ بِهِۦۖ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ
رَّحِيمٞ ﴿١١٥﴾ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ
هَٰذَا حَلَٰلٞ وَهَٰذَا حَرَامٞ لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۚ إِنَّ
ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ﴿١١٦﴾ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ
وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا مَا قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ
مِن قَبۡلُۖ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١١٨﴾



﴿١١١﴾ [بینە بیرا خۆ] ڕۆژا هەر کەسەك دئێت [کو ڕۆژا قیامەتێیە] و د بەر خۆ ب تنێدا جڕەبڕێ دکەت، و جزایێ کارێ هەر کەسەکی دێ ئێتە دان و ستەم ل وان نائێتەکرن [نە خێرێت وان کێم دبن، نە ژی خرابی ل سەر وان زێدە دبن]. ﴿١١٢﴾ و خودێ [خەلکێ] گوندەکی دکەتە نموونە، ژین و ژیارا خۆ تەنا و تەسەل دبۆراندن، و ژ هەمی ڕەخانڤە ڕزقەکێ بەرفرەهـ بۆ وان دهات، بەلێ شوینا شوکور و سوپاسیا خودێ بکەن، نیعمەت و کەرەمێت وی [یێت خودێ] نەئینانە بەر چاڤێت خۆ و نە شوکوراندن. خودێ ژی کراسێ برسێ و ترسێ کرە بەر وان و ژار و ژیر کرن، ژ بەر وان کار و کریارێت ئەوان دکرن. ﴿١١٣﴾ ب سویند پێغەمبەرەك هەر ژ وان ب خۆ بۆ وان هات، باوەری پێ نەئینان و درەوین دانان، ڤێجا ئیزایێ ئەو هنگاڤتن و ئەو یێت ستەمکار. ﴿١١٤﴾ ڤێجا هوین [گەلی مرۆڤان] ژ وی ڕزقێ خودێ دایییە هەوە ب دورستی [ب حەلالی] و پاقژی بخۆن، و سوپاسیا نیعمەتا خودێ بکەن ئەگەر هوین ڕاست وی ب تنێ دپەرێسن. ﴿١١٥﴾ ب تنێ [گۆشتێ] مرار و خوین [یا ڕۆن] و گۆشتێ بەرازی، و یێ نە بۆ خودێ هاتییە سەرژێکرن، ل سەر هەوە هاتییە حەرامکرن، بەلێ یێ نەچار و مەجبوور بیت [ئەڤێت بۆری بخۆت]، ب وی شەرتی دل ل سەر نەبیت و ژ هەوجەیییێ نەبۆرینیت [خودێ لێ ناگریت چونکی]، ب ڕاستی خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿١١٦﴾ نەکو هوین ژ درەو [بێ بەلگە و نیشان] ڤی حەلالکەن و ڤی حەرامکەن و بێژن: ئەڤە دورستە [حەلالە] و ئەڤە نەدورستە [حەرامە]، دا هوین پێ درەوان ژ کیسێ خودێ بکەن. ب ڕاستی ئەوێت درەوان ب ناڤێ خودێ دکەن سەرفەراز نابن. ﴿١١٧﴾ د ڤێ دنیایێدا دێ خۆشییەکا کێم بەن، و ڕۆژا قیامەتێ دێ کەڤنە د ئیزایەکا زێدە ب ژاندا. ﴿١١٨﴾ و ل سەر جوهییان ژی، ئەو تشتێ بەری نوکە مە بۆ تە گۆتی [کو حەرامە] مە حەرام کرییە. و مە ب ڤێ [حەرامکرنێ] ستەم ل وان نەکرییە، بەلێ وان ب خۆ ستەم ل خۆ دکر.

ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ
ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾ إِنَّ
إِبۡرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةٗ قَانِتٗا لِّلَّهِ حَنِيفٗا وَلَمۡ يَكُ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٢٠﴾
شَاكِرٗا لِّأَنۡعُمِهِۚ ٱجۡتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٢١﴾
وَءَاتَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٢٢﴾
ثُمَّ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ أَنِ ٱتَّبِعۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ
مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٢٣﴾ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبۡتُ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ
فِيهِۚ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا
كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ
وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ
هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٢٥﴾
وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦۖ وَلَئِن
صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ
إِلَّا بِٱللَّهِۚ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُ فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ ﴿١٢٧﴾
إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ﴿١٢٨﴾



﴿١١٩﴾ پاشی ب ڕاستی خودایێ تە بۆ ئەوێت ژ
نەزانین گونەهـ کرین، و پشتی هنگی پەشێمان بوویین
و تۆبە کرین و کار و کریارێت قەنج کرین، ب ڕاستی
خودایێ تە پشتی ڤێ [پەشێمانی و تۆبەکرنێ] گونەهـ
ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿١٢٠﴾ ب ڕاستی ئیبراهیم، ب تنێ،
ملەتەك بوو [ئانكو قەنجیا ملەتەكی ل دەڤ وی
ب تنێ هەبوو، یان زانایێ خێرێ بوو، و هەچیێ
د دویڤڕا هاتی بۆ خۆ (خێر) ژێ وەرگرتییە، یان د
وی شەریعەتیدا یێ زانا بوو ئەوێ خودێ بۆ هەمی
ملەتان هنارتی، یان وەختەكی ئەو ب تنێ خودان
باوەر بوو، و مرۆڤێت وی هەمی د گاوربوون] ل
بەر ئەمرێ خودێ یێ ڕاوەستایی بوو، و ژ خواری
و خرابییێ یێ ڤەدەر بوو، و ئەو ب خۆ ژی نە ژ
موشركان بوو. ﴿١٢١﴾ شوكورداریێ نیعمەتێت خودێ
بوو، خودێ ئەو هەلبژارت بوو، و ڕاستەڕێ كربوو بۆ
دینێ ڕاست و دورست. ﴿١٢٢﴾ و مە د دنیایێدا كەرەم
د گەل كر [كرە پێغەمبەر، یان كوڕێت باش دانێ، یان
ناڤدێركر د ناڤ هەمی دینان‌دا، یان ئەو كەرەم گۆتنا
مەیە دەمێ ئەم دبێژین: (كما صليت على ابراهيم)] و ب ڕاستی ئەو د ئاخرەتێدا ژ بەحەشتییانە. ﴿١٢٣﴾ پاشی
[هەی موحەمەد] مە وەحی بۆ تە هنارت [و مە گۆتە تە] دینێ ئیبراهیمی بگرە، دینەكێ ڤەدەرە ژ خواری
و پویچییێ، و ئەو ب خۆ ژی نە ژ موشركان بوو. ﴿١٢٤﴾ ب ڕاستی شەنبی ل سەر وان ب تنێ هاتە دانان
[كو ڕێزێ لێ بگرن و شۆل تێدا نەكەن] ئەوێت تێدا ژێك جودا بوویین، و ب ڕاستی ڕۆژا قیامەتێ خودایێ
تە دێ حوكمی و بڕیارێ د ناڤبەرا واندا كەت ل سەر وی تشتێ ئەو تێدا ژێك جودا. ﴿١٢٥﴾ و ب حیكمەت
[ئانكو ب ئاخڤتنا بنەجهـ و موكوم و ب دەلیل و نیشان و ب نەرمی و ب ئاوایەكێ كارلێكەر] و شیرەتا قەنج
[كو پێ بزانن تە ب وان شیرەتان خێرا وان دڤێت، و تە چو مەرەمێت دی نینن یان ژی ب قورئانێ ئەوا
كو ئەو ب خۆ حیكمەت و شیرەتكارەكا قەنج]، بانگهلدێرە بۆ ڕێكا خودایێ خۆ [كو ئیسلامە]، و ب
وێ ڕێكێ دان و ستاندنێ د گەل وان بكە یا ژ هەمییان چێتر. ب ڕاستی خودایێ تە چێتر دزانیت كا كینە
ڕێكا وی بەرزەكرین، و كا كینە ڕاستەڕێ بوویین [ئانكو خودێ چێتر وان دنیاسیت، یێ خێر تێدا بیت دێ
ڕاستەڕێ كەت، و یێ گومڕا بیت ڕاستەڕێییا وی نە ب تەیە]. ﴿١٢٦﴾ و ئەگەر هەوە تۆلڤەكرن ڤیا ڤێجا
هندی (تەمەتی) ئەوا ب سەرێ هەوە هاتی تۆلێ بستینن، و ئەگەر هوین سەبرێ بكێشن [و یێ بەرانبەری
خۆ ئازابكەن و تۆلێ ژێڤەنەكەن، پشتی هوین سەردەستی وی دبن]، نێ ئەڤە بۆ بێنفرەهان باشتر و چێترە.
﴿١٢٧﴾ و سەبرا خۆ بكێشە [ل سەر وێ ئەزیەتا بۆ تە چێ دبیت] و ئەگەر سەبرا تە ژ خودێ نەبیت، بێ
هاریكارییا وی سەبرا تە سەرناگریت، و خەما وان نەخۆ [گاڤا باوەری نەئینان] و دلتەنگ نەبە ژ بەر پیلان
و ئۆیینێت ئەو ددانن. ﴿١٢٨﴾ ب ڕاستی خودێ یێ د گەل وان ئەوێت پارێزكار و قەنجیكار و قەنجیخواز
[ب پشتەڤانی و هاریكارییا خۆ].

## سُورَةُ الإِسْرَاءِ

الجزء ١٥ الحزب ٢٩

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سُبْحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى
ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِي بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ
هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ١ وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ
هُدًى لِّبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُواْ مِن دُونِي وَكِيلًا ٢
ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ٣
وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِي ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِي ٱلْأَرْضِ
مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ٤ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا
بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُواْ خِلَٰلَ
ٱلدِّيَارِۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ٥ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ
عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ٦
إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَاۚ فَإِذَا
جَآءَ وَعْدُ ٱلْأٓخِرَةِ لِيَسُـُٔواْ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُواْ ٱلْمَسْجِدَ
كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُواْ مَا عَلَوْاْ تَتْبِيرًا ٧





## سۆرەتا ئیسراء

### ل مەکەهێ هاتیە خوارێ (١١١) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ ژ هەمی کێماسیان پاك و پاقژە، ئەوێ بەندەیێ خۆ د شەڤەکێدا ژ مزگەفتا مەسجدولحەرام بۆ مزگەفتا ئەقسا [کو قودسە] ب شەڤ بری، ئەوا مە دۆرماندۆری وێ ب خێر و بەرەکەت ئێخستی [ب رویبار و فێقی ئێخستی و کریە جهێ چەند پێغەمبەران]، دا ئەم نیشان و ئایەتێت خۆ [ل سەر دەستێ لاتداریا خۆ] نیشا [پێغەمبەری] بدەین، ب راستی ئەو ب خۆ یێ گوهدێر و بینەرە. ﴿٢﴾ و مە تەورات دا مووسایی، و مە بۆ ئسرائیلیان کرە رێکا هیدایەتێ، [و مە گۆتە وان] ژ بلی خودێ چو پەرستیان نەگرن کو کاروبارێت خۆ ب هیڤیێڤە بهێلن. ﴿٣﴾ دویندەها ئەوێت مە د گەل نووحی هەلگرتین [و رزگارکرین، مە بابێت هەوە ژ تۆفانێ رزگار کرن، ڤێجا سوپاسیا نیعمەتا خودێ بکەن] ب راستی نووح بەندەیەکێ زێدە شوکوردار بوو. ﴿٤﴾ و مە ئسرائیلی د تەوراتێدا، ئاگەهدارکرن کو ب راستی هوین دێ دوجا خرابییێ د ئەردیدا کەن، و ب راستی [ب خرابی و ستەما خۆ] هوین دێ ب سەر خەلکی کەڤن سەرکەڤتنەکا گەلەك مەزن. ﴿٥﴾ ڤێجا گاڤا وەختێ جزادانا جارا ئێکێ هات، ئەم دێ هندەك بەندەییێت خۆ ییێت خودان هێز و شیان د شەڕاندا ب سەر هەوەدا هنێرین، کو د ناڤ وەلاتێ هەوەدا بێن و بچن و کوشتنێ بێخنە ناڤ هەوە، و ئەڤە ژڤانەکێ راست و دورستە و هەر دێ ئێت. ﴿٦﴾ پاشی [پشتی هەوە تۆبەکری و هوین پەشێمان بووییین] مە هێزا هەوە جارەکا دی زڤڕاندەڤە، دا هوین ل سەر وان زال ببن و سەربکەڤن، و مە هوین ب مال و کوڕان ب هێز ئێخستن، و مە لەشکەرێ هەوە ژ ییێ نەیارێت هەوە پتر لێ کر. ﴿٧﴾ و ئەگەر هوین قەنجییێ [چ گۆتن چ کریار] بکەن، هوین دێ ل خۆ کەن، و ئەگەر هوین خرابییێ [چ گۆتن چ کریار] بکەن، هوین دێ [زیانێ] ل خۆ کەن. ڤێجا گاڤا ژڤانێ جزادانا دووێ هات [و هەوە دەست ب خرابییان کر، دیسا ئەم دێ وان بەندەییێت خورت و ب هێز ب سەر هەوەدا هنێرین وەکی جارا ئێکێ]، دا [وێ ئیزا و ئەزیەتێ پێ بدەنە بەر هەوە] سەروچاڤێت هەوە ب کول و کۆڤان بێخن و دا بچنە د مزگەفتێڤە [مزگەفتا قودسێ]، هەروەکی جارا ئێکێ چۆیینە تێڤە [و کەڤتینە د ناڤ وەلاتێ هەوەدا و کوشتن ئێخستیە ناڤ هەوە و ب خورتی هوین دەرئێخستین]، و دا هەر تشتێ ئەو ل سەر زال ببن کاڤل و وێران بکەن و ژ بن ببەن.

عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يَرۡحَمَكُمۡۚ وَإِنۡ عُدتُّمۡ عُدۡنَاۚ وَجَعَلۡنَا جَهَنَّمَ لِلۡكَٰفِرِينَ
حَصِيرًا ٨ إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَهۡدِي لِلَّتِي هِيَ أَقۡوَمُ وَيُبَشِّرُ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرًا كَبِيرًا ٩
وَأَنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا ١٠
وَيَدۡعُ ٱلۡإِنسَٰنُ بِٱلشَّرِّ دُعَآءَهُۥ بِٱلۡخَيۡرِۖ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ عَجُولًا ١١
وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيۡنِۖ فَمَحَوۡنَآ ءَايَةَ ٱلَّيۡلِ وَجَعَلۡنَآ ءَايَةَ
ٱلنَّهَارِ مُبۡصِرَةً لِّتَبۡتَغُواْ فَضۡلًا مِّن رَّبِّكُمۡ وَلِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ
ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ وَكُلَّ شَيۡءٖ فَصَّلۡنَٰهُ تَفۡصِيلًا ١٢ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ
أَلۡزَمۡنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦۖ وَنُخۡرِجُ لَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلۡقَىٰهُ
مَنشُورًا ١٣ ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبًا ١٤
مَّنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ
عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ
رَسُولٗا ١٥ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا
فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ١٦ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِنَ ٱلۡقُرُونِ
مِنۢ بَعۡدِ نُوحٖۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا ١٧



﴿٨﴾ [پشتی جارا دوویێ ژی ئەگەر هوین پەشێمان ببن و جارەکا دی تۆبە بکەن و گونەهان بهێلن] دبیت خودایێ هەوە ڕەحمێ ب هەوە ببەت و هەوە ئازا بکەت، و ئەگەر هوین زڤڕینەڤە [سەر کار و کریارێت خۆ یێت خراب] ئەم ژی دێ زڤڕینەڤە [سەر ئیزادانا هەوە] و دۆژەهـ مە بۆ گاوران یا کریە زیندان.
﴿٩﴾ ب ڕاستی ئەڤ قورئانە بەرێ مرۆڤی ددەتە وێ ڕێکێ یا ژ هەمییان ڕاستر، و مزگینییێ ددەتە خودان باوەران، ئەوێت کار و کریارێت ڕاست و دورست دکەن کو وان خەلاتەکێ مەزن یێ هەی. ﴿١٠﴾ و ب ڕاستی ئەوێت باوەرییێ ب ئاخرەتێ نەئینن، مە ئیزا و عەزابەکا دژوار و ب ژان بۆ وان یا بەرهەڤکری.
﴿١١﴾ و مرۆڤ کا چاوا دوعایا خێرێ بۆ خۆ دکەت، وەسا نفرینان ژی ل خۆ دکەت [ڤێجا ئەگەر ئەو نفرینا مرۆڤی ل خۆ کری خودێ قەبویل کربایە د جهدا مرۆڤ دا تێ چیت، بەلێ خودێ ژ کەرەم و ڕەحما خۆ وان نفرینان قەبویل ناکەت]، و مرۆڤ هەر یێ ب لەزە [و ژ بەر وێ لەزێ کا چاوا داخوازا خێرێ دکەت، وەسا داخوازا خرابییێ ژی بۆ خۆ دکەت]. ﴿١٢﴾ و شەڤ و ڕۆژ [دویف ئێك هاتنا وان و د ناڤێکداچۆنا وان، کورتی و درێژیا وان] مە کرنە دو دەلیل و نیشان [ل سەر دەستهەلاتداریا خودێ]، ڤێجا مە نیشانا شەڤێ کرە تاری و مە نیشانا ڕۆژێ کرە ڕۆناهی، دا هوین [ب ڕۆناهیا ڕۆژێ و ب کارێ تێدا دکەن] ژ کەرەما خودایێ خۆ بخوازن، و دا هوین هەژمارا سالان [و هەیڤان] و حسێبێ بزانن، و هەمی تشت [ژ دینی و دنیایێ] مە یێ ب بەرفرەهی ئاشکەراکری [مە دویر و درێژ یێ دیارکری]. ﴿١٣﴾ و هەر مرۆڤەکی مە کارێ وی یێ ئێخستییە ستویێ وی، و ڕۆژا قیامەتێ دەفتەرا کار و کریارێت وی دێ بۆ دەرئێخین، دێ ڤەکری بینیت. ﴿١٤﴾ [ئەڤە دەفتەرا کار و کریارێت تەیە] دەفتەرا خۆ بخوینە، ڤێجا تو ب خۆ ئەڤرۆ بەسی خۆیی حسێبێ د گەل خۆ بکەی. ﴿١٥﴾ هەر کەسێ ڕاستەڕێ بوویی، ب ڕاستی بۆ خۆ یێ ڕاستەڕێ بوویی، و هەر کەسێ گومڕا و بەرزەبوویی زیانێ بەس ل خۆ دکەت، و کەس گونەها کەسێ ڕاناکەت، و هەتا ئەم پێغەمبەران نەهنێرین ئیزادان و عەزابێ نادەین. ﴿١٦﴾ و ئەگەر مە ڤیا ئەم [خەلکێ] گوندەکی د هیلاك ببەین، ئەم دێ فەرمانێ ب گوهداری و تاعەتی دەینە دەولەمەند و سەرکار و سەروەرێت وان، ڤێجا ژ ڕێکا ڕاست دەرکەڤتن و فەرمانا مە ب جهـ نەئینان، ڤێجا هێژایی ژڤان و گەفێ بوون و مە گوند کاڤل و وێران کر و مە ژ بن کر. ﴿١٧﴾ و مە چەند [ئانکو گەلەك] ملەت ژ چەرخێت بۆری یێت پشتی نووحی د هیلاك برینە [وەکی (سەموود) و عاد]، و بەسە کو خودایێ تە ئاگەهدار و بینەرێ گونەهێت بەندەیێت خۆ بیت.

مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ
جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا ﴿١٨﴾ وَمَنۡ أَرَادَ
ٱلۡأٓخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ
سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا ﴿١٩﴾ كُلّٗا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنۡ
عَطَآءِ رَبِّكَۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحۡظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ
فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ وَلَلۡأٓخِرَةُ أَكۡبَرُ دَرَجَٰتٖ وَأَكۡبَرُ
تَفۡضِيلٗا ﴿٢١﴾ لَّا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقۡعُدَ مَذۡمُومٗا
مَّخۡذُولٗا ﴿٢٢﴾ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۚ
إِمَّا يَبۡلُغَنَّ عِندَكَ ٱلۡكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوۡ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ
أُفّٖ وَلَا تَنۡهَرۡهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوۡلٗا كَرِيمٗا ﴿٢٣﴾ وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا
جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي
صَغِيرٗا ﴿٢٤﴾ رَّبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمۡۚ إِن تَكُونُواْ صَٰلِحِينَ
فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلۡأَوَّٰبِينَ غَفُورٗا ﴿٢٥﴾ وَءَاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ
وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرۡ تَبۡذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلۡمُبَذِّرِينَ
كَانُوٓاْ إِخۡوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِۖ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورٗا ﴿٢٧﴾

ربع الحزب ٢٩

٢٨٤



﴿١٨﴾ و هەر كەسێ [ب كریارێت خۆ] دنیا بڤێت،
ئەم د دنیایێدا بۆ وی تشتێ مە بڤێت [نە یێ وی
بڤێت و دخوازیت] ب لەز دێ دەینێ، پاشی [ڕۆژا
قیامەتێ] دۆژەهـ مە یا بۆ ئێخستی و ئامادەكری، دێ
ڕەزیل و دویرئێخستی ژ دلۆڤانییا خودێ چیتە تێدا.
﴿١٩﴾ و هەر كەسێ [ب كار و كریارێت خۆ] ئاخرەت
بڤێت و كارێ ئاخرەتێ بكەت و یێ خودان ئیمان ژی
بیت، ئەڤان كارێ وان دێ ژێ ئێتە وەرگرتن و قەبویل
كرن. ﴿٢٠﴾ ئەم ژ دانا خودایێ تە ددەینە هەمییان و
كەسێ ژێ بێ بار ناكەین، چ یێت ژیانا دنیایێ ڤیایین
و چ ئەوێت ژیانا ئاخرەتێ ڤیایین، و چ ئەوێت هەردو
ڤیایین و چ كافر و چ خودان باوەر، و دانا خودایێ تە
ژ كەسێ یا ڤەگرتی نینە. ﴿٢١﴾ [هەی موحەمەد] بەرێ
خۆ بدەیێ كا مە چاوا هندەك ژ وان ب سەر هندەكێت
دی ئێخستینە [ب مالی و قەدری و ساخلەمییێ و...
هتد]، و دەرەجەیێت ئاخرەتێ مەزنترن و فەرقترن.
﴿٢٢﴾ و چو هەڤپشكان بۆ خودێ چێ نەكە، و ژ بلی
وی كەسێ دی نەپەرێسە ئەگەر دێ یێ ڕسوا و لۆمەدار
و بێ هاریكار بی. ﴿٢٣﴾ و خودایێ تە فەرمانا دایی هوین پەرستنا وی ب تنێ بكەن، و د گەل دەیبابان د
قەنج بن، و ئەگەر ئێك ژ وان یان هەردو ل دەڤ تە پیربوون، تو [د خزمەتكرنا واندا] نەبێژە وان (ئۆف) ژی
[كو تو وەستیان و بێزاریا خۆ ژ وان دیار بكەی]، و ل وان نەخوڕە و وان پاشڤە نەبە و [شوینا (ئۆف ئۆفێ)]
ئاخڤتنەكا نەرم و جوان د گەل وان بكە. ﴿٢٤﴾ و خۆ زێدە بۆ وان بشكێنە و زێدە دلۆڤانییێ د ڕاستا واندا بكە
[زێدە خۆ بۆ وان نەرم بكە و خۆ بشكێنە، و وان بینە دەڤ خۆ و خودان بكە، هەورەكی وان ب بچویكاتی
تو ب بەر خۆڤە ئینایی و خودانكری] و بێژە: خودێوۆ دلۆڤانییێ ب وان ببە هەروەكی وان ب بچویكاتی
دلۆڤانی ب من بری، و ئەز مەزن كریم. ﴿٢٥﴾ خودایێ هەوە ئەوا د دلێت هەوەدا هەی چێتر دزانیت، و
ئەگەر هوین د باش بن و تۆبە بكەن [دێ ل هەوە بۆریت چونكی]، خودێ بۆ وان ئەوێت زێدە ل خۆ
دزڤڕن گونەهـ ژێبەرە. ﴿٢٦﴾ و ماف و هەقێ كەس و كاران [ژ سەرەدان و حەژێكرن و هاریكارییێ... هتد]،
و بەلنگاز و ڕێڤنگان بدەیێ، و دەستدڕیاییێ دەستدڕیانێ [د مالێ خۆدا] نەكە [دەستدڕیان ئەوە مرۆڤ مالێ
خۆ د نەگوهداریێا خودێدا بمەزێخیت یان بێخیتە نە د جهێ هەژیدا]. ﴿٢٧﴾ ب ڕاستی یێت دەستدڕیایی
برایێت شەیتانینە، و شەیتان د نیعمەتێت خودایێ خۆدا یێ چاڤنق بوو [و برایینیا وان د ڤێرێدایە شەیتانی
شوكور و سوپاسیا نیعمەتا خودێ نەكر، ئەڤە ژی وەختێ مالێ خۆ د گوهداریا خودێدا نەمەزێخن، ئەڤە
وان سوپاسیا خودێ نەكر، و ئەو و شەیتان بوونە برایێت ئێك].

وَإِمَّا تُعۡرِضَنَّ عَنۡهُمُ ٱبۡتِغَآءَ رَحۡمَةٖ مِّن رَّبِّكَ تَرۡجُوهَا فَقُل لَّهُمۡ قَوۡلٗا
مَّيۡسُورٗا ﴿٢٨﴾ وَلَا تَجۡعَلۡ يَدَكَ مَغۡلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبۡسُطۡهَا
كُلَّ ٱلۡبَسۡطِ فَتَقۡعُدَ مَلُومٗا مَّحۡسُورًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ
لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا ﴿٣٠﴾ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ
أَوۡلَٰدَكُمۡ خَشۡيَةَ إِمۡلَٰقٖۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُهُمۡ وَإِيَّاكُمۡۚ إِنَّ قَتۡلَهُمۡ كَانَ
خِطۡـٔٗا كَبِيرٗا ﴿٣١﴾ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ
سَبِيلٗا ﴿٣٢﴾ وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ
وَمَن قُتِلَ مَظۡلُومٗا فَقَدۡ جَعَلۡنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلۡطَٰنٗا فَلَا يُسۡرِف فِّي
ٱلۡقَتۡلِۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورٗا ﴿٣٣﴾ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي
هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥۚ وَأَوۡفُواْ بِٱلۡعَهۡدِۖ إِنَّ ٱلۡعَهۡدَ كَانَ
مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٤﴾ وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ إِذَا كِلۡتُمۡ وَزِنُواْ بِٱلۡقِسۡطَاسِ ٱلۡمُسۡتَقِيمِۚ
ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلٗا ﴿٣٥﴾ وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ إِنَّ
ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٦﴾
وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخۡرِقَ ٱلۡأَرۡضَ وَلَن تَبۡلُغَ
ٱلۡجِبَالَ طُولٗا ﴿٣٧﴾ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكۡرُوهٗا ﴿٣٨﴾



﴿٢٨﴾ و ئەگەر تو ڕوییێ خۆ ژ شەرماندا و ژ بەر
نەبوونا ڕزقێ خودایێ خۆ ژ وان وەرگێڕی [چونكی
چو د دەستێ تەدا نینە بدەیە وان]، ڤێجا تو ئاخڤتنەكا
خۆش و نەرم د گەل وان بكە. ﴿٢٩﴾ و دەستێ خۆ
ژ قەلسی نەئاڤێژە حەفكا خۆ [كو چو ژ دەستێ تە
دەرنەكەڤیت]، و دەستێت خۆ ئێكجار ژی ڤەنەكە
[كو تو دەرێژییێ بكەی. ڕێكەكا ناڤنجی د ناڤبەرا
چرویكی و دەرێژییێدا بگرە]، و [ئەگەر وەنەكەی] دێ
بییە ژ لۆمەدار و دەستڤالا و ڕویتان. ﴿٣٠﴾ ب ڕاستی
خودایێ تە یێ بڤێت ڕزقێ وی بۆ زێدە و كێم
دكەت، ب ڕاستی ئەو ئاگەهدار و بینەرێ بەندەیێت
خۆیە. ﴿٣١﴾ و بچویكێت خۆ ژ ترسا هەژارییێ
نەكوژن، هەر ئەم ڕزقێ وان و یێ هەوە ژی ددەین، ب
ڕاستی كوشتنا وان گونەهەكا مەزنە. ﴿٣٢﴾ و نێزیكی
زنایێ و دەهمەن پیسییێ نەبن، ب ڕاستی ئەو كارەكێ
زێدەكرێتە و ڕێكا وێ پیسە ڕێكە. ﴿٣٣﴾ و ئەو نەفسا
خودێ كوشتنا وێ حەرامكری ژ بلی هندێ ب بەر
تۆلێ بێتە ئێخستن، نەكوژن، و هەر كەسێ بێ غال و
غەرەز بێتە كوشتن، ڤێجا ب ڕاستی مە دەستهەلاتا داییە خوینوەرگرێ وی، ڤێجا بلا ژ تخویبان نەبۆریت
[كو ئێكێ دی بكوژیت یان پشتی كوشتنێ كارەكێ دی لێ بكەت]، و خودێ ئەو دەستهەلات داییێ و
هاریكاری بۆ كری. ﴿٣٤﴾ و نێزیكی مالێ سێوی نەبن، ئەگەر ب باشترین ڕێك نەبیت [كو پێ مالێ وی
بپارێزی و شۆل پێ بكەی] هەتا بالغ و ئاقل نەبن، و پەیمانا خۆ ب جهـ بینن، ب ڕاستی پسیارا پەیمانێ دێ ژ
هەوە ئێتەكرن. ﴿٣٥﴾ و پیڤانێ ب دورستی [بێ كێماسی] بپیڤن ئەگەر هەوە پیڤان كر، و ب ترازییا ڕاست
و دورست بكێشن، ئەڤە بۆ هەوە چێترە و دویماهیكەكا باشترە. ﴿٣٦﴾ و تشتێ تو چو ژێ نەزانی ل دویڤ
نەچە، ب ڕاستی مرۆڤ ژ گوهـ و چاڤ و دلێ خۆ بەرپرسە. ﴿٣٧﴾ ب شاهی و مەزناتی ل سەر ئەردی ب
ڕێڤە نەچە، ب ڕاستی تو ب چۆنا خۆ نەشێی ئەردی كون بكەی و بكەلێشی، و تو ب درێژییێ ژی ناگەهییە
چیایان. ﴿٣٨﴾ ئەڤە هەمی [كریارێت بۆری یێت خودێ فەرمانا مە ب نەكرنا وان كری]، كرنا وان هەمییان
ل دەڤ خودایێ تە گونەهە.

ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا
ءَاخَرَ فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومٗا مَّدۡحُورًا ٣٩ أَفَأَصۡفَىٰكُمۡ رَبُّكُم
بِٱلۡبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًاۚ إِنَّكُمۡ لَتَقُولُونَ قَوۡلًا عَظِيمٗا ٤٠
وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَا فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لِيَذَّكَّرُواْ وَمَا يَزِيدُهُمۡ إِلَّا نُفُورٗا ٤١
قُل لَّوۡ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٞ كَمَا يَقُولُونَ إِذٗا لَّٱبۡتَغَوۡاْ إِلَىٰ ذِي ٱلۡعَرۡشِ سَبِيلٗا ٤٢
سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوّٗا كَبِيرٗا ٤٣ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ
ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن
لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ٤٤ وَإِذَا قَرَأۡتَ
ٱلۡقُرۡءَانَ جَعَلۡنَا بَيۡنَكَ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ حِجَابٗا
مَّسۡتُورٗا ٤٥ وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ
وَقۡرٗاۚ وَإِذَا ذَكَرۡتَ رَبَّكَ فِي ٱلۡقُرۡءَانِ وَحۡدَهُۥ وَلَّوۡاْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِمۡ نُفُورٗا ٤٦
نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَسۡتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذۡ يَسۡتَمِعُونَ إِلَيۡكَ وَإِذۡ هُمۡ نَجۡوَىٰٓ
إِذۡ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ٤٧ ٱنظُرۡ
كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَالَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ٤٨
وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا ٤٩



﴿٣٩﴾ ئەڤە [مەخسەد ئەو بڕیارێت بۆرین ژ گۆتنا خودێ ﴿وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ هەتا ڤێ ئایەتێ] هندەك ژ وان حیكمەتانە ئەوێت خودایێ تە ب وەحی بۆ تە هنارتین، و چو پەرستیایان د گەل خودێ نەگرە [ئەگەر وەبكەی]، دێ شەرمزار و دویرئێخستی ژ دلۆڤانیا خودێ بۆ جەهنەمێ ئێیە هاڤێتن. ﴿٤٠﴾ ڤێجا ئەرێ خودایێ هەوە كوڕ خۆسەر بۆ هەوە ئێخستن، و بۆ خۆ ژ ملیاكەتان كچ دانان؟! ب ڕاستی هوین ئاخڤتنەكا گەلەك مەزن [د كرێتی و نەجوانیا خۆدا] دكەن، [وەختێ هوین خۆ ب قەدرتر دبینن و كوڕان بۆ خۆ ددانن، و ئەوێت هەوە نەڤێن كو كچن بۆ خودێ دئێخن]. ﴿٤١﴾ ب ڕاستی مە دوبارە و ب درێژی و ب گەلەڕەنگان [بەلگە و نموونە] د ڤێ قورئانێدا ئینایینە، دا بیرا خۆ بینن، بەلێ [دوبارەكرن و درێژی ئینانا ڤان نیشانان] ژ بلی دویركەڤتن ژ هەقیێ چو یێ دی ل وان زێدە ناكەت. ﴿٤٢﴾ بێژە ئەگەر د گەل خودێ هندەك پەرستییێت دی هەبانە هەروەكی ئەو دبێژن، دا بزاڤێ كەن ب ڕێكەكێ خۆ نێزیكی خودانێ عەرشی بكەن [یان ژی دا بزاڤێ كەن ل سەر خودانێ عەرشی زال ببن هەروەكی هەمی خویندكار د دنیایێدا ڤی كاری دكەن]. ﴿٤٣﴾ خودێ یێ پاك و پاقژ و زێدە بلندە ژ وێ یا ئەو دبێژن. ﴿٤٤﴾ و هەر حەفت ئەسمان و ئەرد و هندی تێدا هەمی خودێ ژ كێماسیان پاقژ دكەن، و چو تشت نینن سوپاسیا خودێ ب پاقژی نەكەن، بەلێ هوین تەسبیحا وان تێناگەهن، ب ڕاستی خودێ لەزێ ل جزایی ناكەت و یێ گونەهـ ژێبەرە. ﴿٤٥﴾ و هەر وەختێ تو قورئانێ دخوینی، ئەم پەردەیەكێ د ناڤبەرا تە و ئەوێت باوەرییێ ب ئاخرەتێ نەئینن دادنین [كو قورئانێ تێنەگەهن]. ﴿٤٦﴾ و مە پەردە ل سەر دلێت وان یێت دانایین دا قورئانێ تێنەگەهن، و مە گرانی یا ئێخستییە د گوهێت واندا [كو گول قورئانێ نەبن]، و هەر وەختێ د قورئانێدا تە ناڤێ خودایێ خۆ ب یەكتایی ئینا [تە گۆت خودایێ من تاك و تەنایە، و بێ هەڤال و هۆگر و هەڤپشكە]، پشتا خۆ ددەنە تە و دڕەڤن [دا گولێ نەبن خودێ ئێكە]. ﴿٤٧﴾ ئەم چێتر دزانین كا بۆچی ئەو گوهداریا تە دكەن وەختێ ئەو گوهداریا تە دكەن، [گوهداریا تە دكەن بۆ ترانەكرنێ ب تە و قورئانێ] و [دیسا] مە چێتر ئاگەهـ ژێ هەیە وەختێ پستەپستێ دكەن، و دەڤێ خۆ دبەنە بەر گوهێت ئێكدو، وەختێ ستەمكار دبێژن: ئەوێ هوین ل دویڤ دچن مرۆڤەكی سێرەلێكری و عەقلچۆیی پێڤەتر نینە. ﴿٤٨﴾ بەرێ خۆ بدێ كا چاوا ئەو نموونەیان بۆ تە دئینن [دبێژن: ساحرە، شاعر و هەلبەستڤانە، دینە... هتد]، و ئەو [ب ڤان بێ بەختییان] گومڕا و بەرزەبوون، و نەشێن ڕێكا هەقییێ بگرن [یان ب سەر چو ڕێكان هەلنابن د بەرئەڤل بن، كو بشێن پێ تانان د تە بقوتن]. ﴿٤٩﴾ و گۆتن ئەرێ ئەگەر ئەم بووینە هەستی و هەلوەریایین و پرت و بەلاڤە بوویین، جارەكا دی دێ زێندی بینەڤە و بینە مرۆڤەكێ نوی.

نصف الحزب ٢٩

۞ قُلْ كُونُوا۟ حِجَارَةً أَوْ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوْ خَلْقًا مِّمَّا يَكْبُرُ فِى
صُدُورِكُمْ ۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَا ۖ قُلِ ٱلَّذِى فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۚ
فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ ۖ قُلْ عَسَىٰٓ أَن
يَكُونَ قَرِيبًا ﴿٥١﴾ يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِۦ وَتَظُنُّونَ
إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٥٢﴾ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ
إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوًّا
مُّبِينًا ﴿٥٣﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ ۖ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ
يُعَذِّبْكُمْ ۚ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿٥٤﴾ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ
بِمَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّۦنَ عَلَىٰ
بَعْضٍ ۖ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن
دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ
ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ
وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ
مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ وَإِن مِّن قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ
أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا ﴿٥٨﴾





﴿٥٠﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: هوین ببنە بەر یان
ئاسن. ﴿٥١﴾ یان ژی هەر تشتەکێ دی یێ کو هوین
د دلێ خۆدا مەزنتر (ب زەحمەتتر) دبینن [هوین ببنە
چ، ببنە ئەو، هەر پشتی مرنێ دێ ساخ بنەڤە]، ڤێجا
ئەو دێ بێژن: کی دێ مە زڤرینیتەڤە [پشتی ئەم پویچ
دبین] بێژە: ئەو دێ هەوە زڤرینیتەڤە ئەوێ هوین جارا
ئێکێ چێکرین، ئەو دێ سەرێ خۆ [بۆ ترانەپێکرنێ]
ل تە هەژینن و دێ بێژن: ئەڤە کەنگییە، بێژە: دبیت
یا نێزیك بیت. ﴿٥٢﴾ ڕۆژا گازی هەوە دکەت [دا ژ
گۆڕان ڕابن]، و ڤێجا هوین دێ ب سوپاسیا ویڤە
بەرسڤێ دەن [و ژ گۆڕان دێ ڕابن و دێ بەر ب مەیدانا
حەشرێڤە چن]، و هوین دێ هزرکەن ژ دەمەکێ
کێم پێڤەتر هوین د گۆڕیدا نەماینە. ﴿٥٣﴾ [هەی
موحەمەد] بێژە بەندەیێت من [خودان باوەران]
وەختێ [دگەل هەڤپشك چێکەران] دئاخڤن، بلا
باشترین ئاخڤتنێ بکەن، ب ڕاستی شەیتان [ب ڕێکا
ئاخڤتنێت ڕەق و زڤر] خرابییێ دئێخیتە د ناڤبەرا واندا،
ب ڕاستی شەیتان بۆ مرۆڤی دژمنەکێ ئاشکەرایە.
﴿٥٤﴾ خودایێ هەوە، هەوە چێتر دنیاسیت، ئەگەر بڤێت دێ دلۆڤانییێ ب هەوە بەت، و ئەگەر بڤێت دێ
هەوە ئیزادەت، و مە تو نەهنارتی دا تو ل سەر وان ببییە زێرەڤان و بەرپرس [کو ب کۆتەکی وان بینییە سەر
ئیمانێ]. ﴿٥٥﴾ و خودایێ تە ب وان یێت د ئەرد و ئەسماناندا هەین زاناترە [کا کینە و کا چاوانن و هەرئێك
هێژایی چیە؟] و ب ڕاستی مە هندەك پێغەمبەر یێت ب قەدرتر ئێخستین ژ هندەکێت دی، و زەبوور مە یا
داییە داوودی. ﴿٥٦﴾ [هەی موحەمەد] بێژە [موشرکان] کا گازی وان بکەن ئەوێت هەوە هزر دکر کو ئەو
خودێنە ژ بلی خودێ [بلا هاریکاریا هەوە بکەن]، نێ ئەو نەشێن چو زیانێ ل سەر هەوە ڕاکەن یان ژ هەوە
ڤەگوهێزن بۆ هندەکێت دی. ﴿٥٧﴾ ئەوێت ئەو [موشرك] دپەرێسن [و بۆ خۆ خودا حسێب کرین وەکی
ملیاکەت و مرۆڤ و ئەجنەیان]، کا کی ژ وان پتر نێزیکی خودێیە، ئەها ئەو دا بگەهنە ڕازیبوونا خودایێ خۆ
بۆ خۆ ل ڕێکان دگەڕن، و ب پەرستنا خودێ دلۆڤانیا وی دخوازن و ژ ئیزایا وی دترسن، ب ڕاستی ئیزایا
خودایێ تە گەلەکا گرانە، هەمی ژێ دترسن و خۆ ژێ دپارێزن. ﴿٥٨﴾ نینە گوندەك [ژ گوندێت گاوران یان
گونەهکاران] ئەگەر ئەم بەری ڕۆژا قیامەتێ د هیلاك نەبەین یان ژی بەرهنگاری ئیزایەکا دژوار نەکەین، ئەڤە
د کتێبێدا [د دەپێ پارستیدا (لەوحێ مەحفووز)] یا نڤێسییە.

وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَۚ
وَءَاتَيۡنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبۡصِرَةٗ فَظَلَمُواْ بِهَاۚ وَمَا نُرۡسِلُ بِٱلۡأٓيَٰتِ
إِلَّا تَخۡوِيفٗا ٥٩ وَإِذۡ قُلۡنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِٱلنَّاسِۚ وَمَا جَعَلۡنَا
ٱلرُّءۡيَا ٱلَّتِيٓ أَرَيۡنَٰكَ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلۡمَلۡعُونَةَ
فِي ٱلۡقُرۡءَانِۚ وَنُخَوِّفُهُمۡ فَمَا يَزِيدُهُمۡ إِلَّا طُغۡيَٰنٗا كَبِيرٗا ٦٠
وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ
قَالَ ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ٦١ قَالَ أَرَءَيۡتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِي
كَرَّمۡتَ عَلَيَّ لَئِنۡ أَخَّرۡتَنِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَأَحۡتَنِكَنَّ
ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٗا ٦٢ قَالَ ٱذۡهَبۡ فَمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ فَإِنَّ
جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمۡ جَزَآءٗ مَّوۡفُورٗا ٦٣ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ
مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكۡهُمۡ
فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِ وَعِدۡهُمۡۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا
غُرُورًا ٦٤ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٞۚ وَكَفَىٰ
بِرَبِّكَ وَكِيلٗا ٦٥ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِي يُزۡجِي لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ فِي
ٱلۡبَحۡرِ لِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ٦٦





﴿٥٩﴾ چـو تشـت نەبـوو رێگـر ئـەم موعجیزەیـان [هەروەكـی خەلكـیٚ مەكەهـیٚ ژ تـە دخـوازن كـو تـو سەفایـیٚ بـۆ بكەیـە زێـر و چیایـێت مەكەهـیٚ ژ وان دویربێخـی] بهنێریـن، ئـەو نەبیـت، یـێت بـەری وان موعجیـزە مـە بـۆ هنارتن و بـاوەری پـیٚ نەئینـان و درەو دانـان [ڤێجـا مـە بەرئاتـاف كـرن، نەكـو ئەڤـە ژی وەكی وان بكـەن و وەكـی وان هێژایـی ئاتافەكـیٚ ببـن] و مـە حێشـتر دا (سـەموود) [ملەتـیٚ صالـح پێغەمبـەر وەك موعجیزەیـەك] نیشـانەكا ڕۆنكـەر، ڤێجـا وان سـتەم ل خـۆ كـر [و خـۆ بەرهنگـاری ئیزایـیٚ كـر چونكـی وان گوهـیٚ خـۆ نـەدا صالحـی و حێشـتر كوشـت] و ئـەم موعجیزەیـان ناهنێریـن ئەگـەر بـۆ ترسـاندنیٚ نەبـن. ﴿٦٠﴾ و بینـە بـیرا خـۆ وەختیٚ مە گۆتیـیە تە، ب ڕاسـتی خودایـیٚ تـە ب دورسـتی دەسـتهەلات ل سـەر هەمـی مرۆڤـان هەیـە [و هەمـی یـێت د بـن دەسـتیٚ ویڤـە]، و ئـەو دیتنـا مـە ب تـە [شـەڤا میعراجـیٚ (چۆنـا تـە بـۆ ئەسمـانان)] دایـیە دیتنیٚ، مە ب تە نـەددا دیتنیٚ ئەگەر بـۆ جەرباندنـا خەلكی نەبایە [كا دیٚ چاوا سەرەدەرییـیٚ د گـەل ڤـیٚ ڕویدانـا عنتیكە كـەن]. و دارا لەعنەت لـیٚ كری د قورئانێـدا هاتی [كـو دارا زەقوومێیە] مە نەئینایـیە ئەگـەر ژ بـەر جەرباندنـا مرۆڤـان نەبیـت. و ئـەم وان [ب بەلگـە و نیشـان و موعجیزەیـێت ئاشـكەرا كـو وان راوەسـتینن و پاشـڤە ببـەن] دترسـینین، بەلـیٚ ئـەڤ ترسـاندنە چـو ل وان زێدەناكـەت ژ بـلی زێدە سـەرداچۆنیٚ.

﴿٦١﴾ و وەختیٚ مە گۆتیـیە ملیاكەتان بۆ ئادەمی هەرنە سوجدەیـیٚ [سوجدەیا ڕێزگرتنیٚ نەیا پەرستنیٚ] هەمیـیان سـوجدە بـر [ئبلیـس] تـیٚ نەبیـت، گـۆت: ئەز چـاوا سوجدەیـیٚ بۆ وی ببـەم، ئـەویٚ تـە ژ هەرییـیٚ چێكری؟!

﴿٦٢﴾ [شـەیتانی] گـۆت: كا بـۆ مـن بێژە، ئەڤیٚ تە قەدریٚ وی ب سـەر یـیٚ من ئێخسـتی، و ئـەز ب خۆ ژ وی ب قەدرتـر، ب ڕاسـتی ئەگـەر تـو مـن هەتـا ڕۆژا قیامەتـیٚ بهێلی دیٚ ب سـەر دویندەها ویدا گـرم، و د سـەردا بەم و دیٚ ڕە و ڕویشـالێت باشیـیٚ ژ ناڤ وان هەلكێشـم، كێمەك ژ وان تیٚ نەبن [ئەو ژی ئەون یـێت خودیٚ پارسـتین ب گۆتنـا خـۆ ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ ﴾، ئانكـو ب ڕاسـتی بەندەیـێت مـن تە چو دەسـتهەلات ل سـەر وان نینـە]. ﴿٦٣﴾ [خـودیٚ] گـۆت: هـەرە [ئەڤـە مـە تـو هێلایـی و یـا تـە پـیٚ چـیٚ ببیت بكـە]، ڤێجـا هەر كەسـیٚ گوهـیٚ خـۆ بدەتـە تـە و ب دویـڤ تـە بكەڤیـت، دۆژەهـ جزایـیٚ هـەوە هەمیـیانە كـو جزایەكـیٚ تمامە.

﴿٦٤﴾ هەچیـیٚ تـە شیایـیٚ ژ وان، ب گازیـیا خـۆ بئارینـە و د سـەردا ببە، و ب سـوار و پەیایـێت خۆڤە گازی وان بكـە، و د مـال و زاڕۆكێـت وانـدا پشـكدار ببە، و سـۆز و پەیمانان بدە وان، و شـەیتان ژ خاپاندنـیٚ پێڤەتر چو نادەتە وان. ﴿٦٥﴾ ب ڕاسـتی بەندەیـێت من [یـێت پارێزكار و ڕاسـتكار] تە چو دەسـتهەلات ل سـەر وان نینە، بەسـی وانـە خودایـیٚ تە بـۆ وان زێرەڤان و پشـتەڤان بیـت. ﴿٦٦﴾ [گـەلی مرۆڤان] خودایـیٚ هەوە ئەوە یـیٚ ب سـاناهی و هێـدی گەمیـیان د دەریایانـدا دبـەت، دا هوین ل دویـڤ خـێر و كەرەما وی بگـەڕن [ئانكـو دا هوین داخـوازا قازانجـیٚ بازرگانیـیٚ بكەن]، ب ڕاسـتی خـودیٚ بۆ هەوە یـیٚ دلۆڤانە.

وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِى ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ ۖ فَلَمَّا
نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ كَفُورًا ﴿٦٧﴾ أَفَأَمِنتُمْ
أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ثُمَّ
لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ وَكِيلًا ﴿٦٨﴾ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً
أُخْرَىٰ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ
ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِۦ تَبِيعًا ﴿٦٩﴾ ۞ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ
ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ
وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ يَوْمَ نَدْعُوا۟
كُلَّ أُنَاسٍۭ بِإِمَٰمِهِمْ ۖ فَمَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ
يَقْرَءُونَ كِتَٰبَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧١﴾ وَمَن كَانَ
فِى هَٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ فَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٧٢﴾ وَإِن
كَادُوا۟ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ
عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ ۖ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴿٧٣﴾ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ
لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ
ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٢٩



﴿٦٧﴾ و ئەگەر نەخۆشییەك د دەریایێدا بگەهیتە هەوە، ڤێجا ئەوێت هوین ژ بلی خودێ دپەرێسن و هەوارێ بۆ دبەن، ژ بیرا هەوە دچن و خودێ ب تنێ دمینتە ل بیرا هەوە [ژ خودێ پێڤەتر هوین کەسێ نابینن د هانا هەوە بهێت، و هەوە رزگار بکەت]، ڤێجا وەختێ هوین رزگار کرن و برنە دێمی هەوە رویێ خۆ ژ باوەرییێ وەرگێرا [و دزڤرنە سەر ئێك و دویا خۆ کو پەرستنا بوتانە]، و ب راستی مرۆڤ یێ نە شوکوردارە، بۆ نیعمەتێت خودێ نائینیتە بەر چاڤێت خۆ.
﴿٦٨﴾ ئەرێ هوین پشت راست بوون کو خودێ هەوە ل رەخێ دێمی د ئەردیدا نابەتە خوارێ، یان ژی هورەبایەکێ ب بەرەشیشك ب سەر هەوەدا نائینیت، پاشی هوین کەسێ نەبینن خۆ ل هەوە بکەتە خودان، و ب کاروبارێت هەوە رابیت و هەوە ژ ئیزایا خودێ بپارێزیت.
﴿٦٩﴾ یان ژی هوین ئێمن بوون کو جارەکا دی خودێ هەوە نازڤرینیتەڤە دەریایێ و بایەکێ ب هێز کو هەر تشتێ بکەڤیتە بەر ببەت و باڤێژیت ب سەر هەوەدا نائینیت، ژ بەر گاوریا هەوە [یان چاڤنقیا هەوە] هەوە بخەندقینیت، پاشی هوین کەسێ نەبینن تۆلا هەوە ژ مە بخوازیت.
﴿٧٠﴾ و ب راستی مە دویندەها ئادەمی یێت ب رێز و رویمەت ئێخستین، و مە ئەو د دێمی و ئاڤێدا یێت هەلگرتین و گێراندین [ئانکو مە شیانا داییە هەوە، هوین ب پییان و دەواران و گەمییان و ئالەتێت دی قویناخێت درێژ ببرن]، و رزقێ پاك و پاقژ مە دا وان، و مە ئەو ب سەر گەلەك چێکرییێت خۆ ئێخستن و ب قەدرتر لێ کرن.
﴿٧١﴾ [بۆ ملەتێ خۆ بێژە:] رۆژا ئەم گازی هەمی مرۆڤان دکەین هەر ئێك ب پێشییێ خۆڤە [خودانێت تەوراتێ ب تەوراتێ، و یێت ئنجیلێ ب ئنجیلێ، و یێت قورئانێ ب قورئانێ، یان ژی ب پێغەمبەرێت خۆڤە یان ژی ب کتێبا کاروبارێت خۆڤە]، ڤێجا هەر کەسێ کتێبا وی ب دەستێ راستێ بۆ بێتە دان، ئەڤە دێ کتێبا خۆ خوینن و تەمەتی دەزییێ پشتا بەرکێ قەسپێ ستەم ل وان نائێتەکرن [کو خێرەکا وان کێم ببیت یان گونەهەك ل سەر وان زێدە ببیت].
﴿٧٢﴾ ئەوێ د ڤێ دنیایێدا یێ کۆرە بیت [دلتاری بیت و هەقییێ نەبینیت]، ئەو د ئاخرەتێدا ژی یێ کۆرەیە و گومراترە ژی [و نائێتە راستەرێکرن بۆ رێکا رزگاربوونێ].
﴿٧٣﴾ و چو نەمابوو هەڤپشك چێکەر (موشرك) دا تە د سەردا بەن، و تە خاپینن ژ وێ وەحیا مە بۆ تە هنارتی، دا تو ژبلی وێ وەحیا مە بۆ تە هنارتی ب سەر مەڤە نی، ئەها هنگی، دا تە بۆ خۆ کەنە دۆست و هەڤال.
﴿٧٤﴾ و ئەگەر مە تو رانەگرتبایی و نەپارستبایی، نێزیك بوو تو دا پیچەکێ ب رەخێ وانڤە چی.
﴿٧٥﴾ ڤێجا ئەگەر تە وەکربایە [و تە گوهێ خۆ دابایە وان]، ئەم دا تە دوقات د دنیایێ و ئاخرەتێدا ب بەر ئیزا ئێخین، پاشی تە بۆ خۆ کەس نەددیت پشتەڤانییا تە بکەت، و دەستان بۆ تە ل سەر مە بهەلینیت.

وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ۖ
وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٧٦﴾ سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا
قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا ۖ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴿٧٧﴾ أَقِمِ
ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ۖ
إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ
بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾
وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِى مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِى مُخْرَجَ صِدْقٍ
وَٱجْعَل لِّى مِن لَّدُنكَ سُلْطَٰنًا نَّصِيرًا ﴿٨٠﴾ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ
ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ
شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾
وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ۖ وَإِذَا مَسَّهُ
ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسًا ﴿٨٣﴾ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ
بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ﴿٨٤﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ
أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ
بِٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴿٨٦﴾



﴿٧٦﴾ و چو نەمابوو دا ب دژمناییا خۆ تە عێجز و تەنگاڤ كەن، دا تە ژ مەكەهێ دەربێخن [و ئەگەر وان ئەڤە كربایە و وان تو دەرئێخستبایی]، هنگی پشتی تە، ئەو ژ دەمەكێ كێم پێڤەتر نەدمان. ﴿٧٧﴾ ئەڤە رێكا مەیە د گەل پێغەمبەرێت مە، ئەوێت مە بەری تە هنارتین [كو ئەم وی ملەتی بەرئاتاف كەین ئەوێ پێغەمبەرێ خۆ ژ ناڤ خۆ دەردئێخیت]، و تو چو گوهۆرینێ بۆ رێكا مە [ڤێ] نابینی. ﴿٧٨﴾ وەختێ رۆژ ل نیڤا ئەسمانی وەردگەڕیت هەتا شەڤتارییێ تو نڤێژان بكە، و نڤێژا سپێدێ ژ بیر نەكە [نڤێژا سپێدێ ب قورئانێ هاتە ب ناڤكرن چونكی قورئان ب درێژی ل سەر دئێتە خواندن]، چونكی ب راستی نڤێژا سپێدەییان ملیاكەت ل سەر شاهدن [ب شەڤ و رۆژ تێدا حازر دبن، و خۆ تێدا پێك دگوهۆڕن، ڤێجا هەردو جوین ل سەر دبنە شاهد]. ﴿٧٩﴾ و وەختەكی ژ شەڤێ، رابە نڤێژان ب قورئانێ بكە [ئانكو قورئانێ تێدا بخوینە] كو فەرزەكا زێدەیە [ل سەر هەر پێنج نڤێژان] بۆ تە ب تنێ، دا خودایێ تە ب وان نڤێژان تە بگەهینیتە جهێ پەسنكری [ئەو جهێ سوپاسیا تە تێدا دئێتەكرن رۆژا مەهدەرا مەزن دكەی]. ﴿٨٠﴾ بێژە: خودێوۆ هەر كاروبارەكێ هەبیت ب رەنگەكێ تو پێ رازی، ب من بدەكرن و من بكە د ناڤدا، و هەر كاروبارەكێ هەبیت ب رەنگەكێ تو پێ رازی من ژێ دەربێخە، و تو ژ دەڤ خۆ من ب هێز بێخە و هاریكارییا من بكە. ﴿٨١﴾ و بێژە: هەقی و ئیسلام و ئەو ڤژانێ خودێ ب سەركەڤتنا وان دایی هات، و پویچی و شیرك چۆ نەما، ب راستی پویچی و شیرك هەر یا چۆییە. ﴿٨٢﴾ و ئەم هندەك ئایەت و سۆرەتان ژ قورئانێ دئینینە خوارێ، دەرمان و دلۆڤانینە بۆ خودان باوەران، و ژ زیانێ پێڤەتر ل ستەمكاران زێدە ناكەن. ﴿٨٣﴾ و هەر وەختەكێ مە كەرەم و نیعمەت د گەل مرۆڤی كر، روییێ خۆ وەرگێڕا [ژ بیرئینان و سوپاسیا خودێ]، و ژ مەزناتی خۆ [ژ مە] دویرئێخست، و هەر وەختێ نەخۆشییەكێ هنگاڤت گەلەك بێ هیڤی دبیت. ﴿٨٤﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: هەر ئێك وەكی خۆ [كا یێ چاوایە وەسا] كار دكەت، ڤێجا خودایێ هەوە چێتر دزانیت كا كی راستەرێترە. ﴿٨٥﴾ و ئەو پسیارا روحێ ژ تە دكەن [كا چیە؟] بێژە: روح ژ كارێ خودایێ منە [ئانكو ئەو ب تنێ و ب دورستاهی دزانیت كا چیە]، و ژ كێمەكا زانینێ پێڤەتر بۆ هەوە نەهاتییە دان. ﴿٨٦﴾ و ب سویند ئەگەر مە ڤیابایە، ئەو قورئانا مە بۆ تە هنارتی دا ژ سەر دلێ تە بەین، و پاشی تە بۆ خۆ كەس نەددیت پشتەڤانییا تە بكەت.

﴿٨٧﴾ بەلێ مە ئەڤە، ژ دلۆڤانییا خودایێ تە، بۆ تە نەڤیاییە [كو ئەم ژ سەر دلێ تە ڕاكەین و ژ بیرا تە ببەین]، ب ڕاستی كەرەما خودێ ل سەر تە گەلەكە. ﴿٨٨﴾ بێژە: ب سویند ئەگەر مرۆڤ و ئەجنە هەمی پێكڤە كۆم ببن كو ئەو قورئانەكا وەكی ڤێ قورئانێ بینن، نەشێن وەكی وێ بینن خۆ ئەگەر هەمی بۆ ئێكدو پشتەڤان و هاریكار ژی بن. ﴿٨٩﴾ و ب ڕاستی مە بۆ مرۆڤان هەمی نموونە، و گەلەك جاران و ب ڕێكێت جودا جودا، د ڤێ قورئانێدا یێت ئینایین، بەلێ باراپتر ژ مرۆڤان ڕێكا ڕازی نەبوون و ئینكارێ گرتن. ﴿٩٠﴾ و گۆتن: قەد ئەم باوەرییێ ب تە نائینین هەتا تو كانییەكێ بۆ مە ژ ئەردی دەرنەئێخی. ﴿٩١﴾ یان ژی جنیكەكا دارقەسپان و مێوێت تری تە هەبیت، ڤێجا تو ڕوویباران د ناڤرا دەربێخی و د بنڕا ببەی. ﴿٩٢﴾ یان ژی ئەسمانی پرت پرت ب سەر مەدا بینی هەروەكی تو دبێژی، یان ژی تو خودێ و ملیاكەتان بینی و ئەم ببینین. ﴿٩٣﴾ یان ژی تە خانییەك ژ زێڕی هەبیت، یان ژی بچییە ئەسمانان، خۆ تو بچییە ئەسمانان ژی دیسا ئەم باوەرییێ ب تە نائینین، هەتا تو كتێبەكێ بۆ مە نەئینی كو ئەم بخوینین [و ببیتە شاهد و بەلگە ل سەر پێغەمبەراتییا تە]، بێژە: پاك و پاقژی بۆ خودایێ من بیت، ما ئەز چمە ژ مرۆڤەكێ پێغەمبەر پێڤەتر. ﴿٩٤﴾ و چو تشتان مرۆڤ [مەخسەد خەلكێ مەكەهێ] پشتی هاتنا ڕاستەڕێییێ ژ باوەرییێ نەدا پاش، ئەو نەبیت [ژ نەزانین] دگۆتن: ئەرێ خودێ مرۆڤەك، پێغەمبەر هنارتییە؟! ﴿٩٥﴾ بێژە: ئەگەر خەلكێ ئەردی ملیاكەتبان، و وەكی هەوە ب ساناهی ل سەر ئەردی هاتن و چۆن كربانە، دا ئەم ژی ملیاكەتەكێ پێغەمبەر ژ ئەسمانان بۆ وان هنێرین. ﴿٩٦﴾ بێژە: بەسی منە خودێ د ناڤبەرا من و هەوەدا شادەییێ ل سەر پێغەمبەرینییا من بدەت، ب ڕاستی ئەو شارەزا و بینەرێ بەندەییێت خۆیە.



إِلَّا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ إِنَّ فَضۡلَهُۥ كَانَ عَلَيۡكَ كَبِيرٗا ٨٧ قُل
لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ
لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ٨٨
وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٖ فَأَبَىٰٓ أَكۡثَرُ
ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورٗا ٨٩ وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ
لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا ٩٠ أَوۡ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٞ مِّن نَّخِيلٖ
وَعِنَبٖ فَتُفَجِّرَ ٱلۡأَنۡهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفۡجِيرًا ٩١ أَوۡ تُسۡقِطَ ٱلسَّمَآءَ
كَمَا زَعَمۡتَ عَلَيۡنَا كِسَفًا أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ
قَبِيلًا ٩٢ أَوۡ يَكُونَ لَكَ بَيۡتٞ مِّن زُخۡرُفٍ أَوۡ تَرۡقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ
وَلَن نُّؤۡمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيۡنَا كِتَٰبٗا نَّقۡرَؤُهُۥۗ قُلۡ
سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا ٩٣ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ
أَن يُؤۡمِنُوٓاْ إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرٗا
رَّسُولٗا ٩٤ قُل لَّوۡ كَانَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَلَٰٓئِكَةٞ يَمۡشُونَ مُطۡمَئِنِّينَ
لَنَزَّلۡنَا عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكٗا رَّسُولٗا ٩٥ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ
شَهِيدَۢا بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا ٩٦

وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ
مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا
وَصُمًّا ۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴿٩٧﴾
ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا
وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ﴿٩٨﴾ ۞ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ الحزب ٣٠
ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ
وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا ﴿٩٩﴾
قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّىٓ إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ
ٱلْإِنفَاقِ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا ﴿١٠٠﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ
ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ
إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ
هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ
يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴿١٠٢﴾ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ
فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴿١٠٣﴾ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ
ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴿١٠٤﴾



﴿٩٧﴾ و ئەوێ خودێ ڕاستەڕێ بکەت، ئەوە یێ ڕاستەڕێکری، و هەر کەسێ خودێ [ژ بەر کار و کریارێت وی] وی گومڕا و بەرزە بکەت، ڤێجا ژ بلی خودێ تو چو هاریکاران بۆ نابینی، و ئەم ڕۆژا قیامەتێ دێ وان ل سەر سەروچاڤان کۆرە و کەڕ و لال کۆمکەین، و جهێ وان دۆژەهە و هەر وەختێ گوڕیا وێ داهات، ئەم گوڕی و سۆتنێ لێ زێدە دکەین. ﴿٩٨﴾ ئەڤە جزایێ وانە چونکی وان باوەری ب نیشان و بەلگەیێت مە نەدئینان [و باوەر نەدکرن دێ ڕابنەڤە] و دگۆتن: ئەرێ ئەگەر ئەم بووینە هەستی و ئاخ، جارەکا دی دێ زێندی بینەڤە کو ببینە چێکرییەکێ نوی. ﴿٩٩﴾ ئەرێ ما ئەو نابینن ب ڕاستی ئەو خودایێ ئەرد و ئەسمان چێکرین [ئەڤێ بشێت ڤان ئەرد و ئەسمانان چێکەت]، دشێت وەکی وان [ژ مرۆڤان] چێکەت، و وەختەك بۆ وان [مرنا وان و ڕابوونا وان ژ گۆڕان] یێ دانایی شك تێدا نینە، بەلێ ستەمکاران ژ ڕێکا گاوریێ پێڤەتر نەگرت. ﴿١٠٠﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: ئەگەر هوین خودانێت گەنجینە و گەنجخانەیێت کەرەما خودایێ من بانە، هوین دا قەلسییێ کەن [و هەوە نەددا کەسێ] ژ ترسا خلاسبوونا وێ، نێ مرۆڤ گەلەکێ چڕویك و چاڤترسیاییە. ﴿١٠١﴾ و ب ڕاستی مە نەهـ موعجیزەیێت ئاشکەرا دانە مووسایی، ڤێجا پسیارا ئسرائیلیان بکە وەختێ ئەڤ موعجیزە بۆ هاتین [دا بۆ هەمی جوهییان ڕاستیا ڤی تشتێ پێغەمبەری گۆتی دیار ببیت، و ل سەر خۆ ببنە شاهد]، ڤێجا فیرعەونی گۆتێ: هەی مووسا ئەز وەسا هزر دکەم تو یێ سێرەلێکری و ئەقلچۆیی. ﴿١٠٢﴾ [مووسایی] گۆت: ب ڕاستی تو دزانی ئەڤ موعجیزەیێت بۆ من هاتین کو نیشان و بەلگەیێت ئاشکەرانە، ژ خودایێ ئەرد و ئەسمانان پێڤەتر کەسێ دی نەئینایینە خوارێ، و ب ڕاستی هەی فیرعەون ئەز تە هیلاکچۆیی دبینم. ﴿١٠٣﴾ و فیرعەونی ڤیا [ئسرائیلیان] ژ مسرێ دەربێخیت و وان تەنگاڤ بکەت، ڤێجا مە ئەو و هندی دگەل، هەمی [د دەریایێدا] خەندقاندن. ﴿١٠٤﴾ و پشتی ڤێ مە گۆتە ئسرائیلیان ل وی ئەردی ئاکنجی ببن [ئەوێ فیرعەونی دڤیا هەوە ژێ دەربێخیت]، ڤێجا ئەگەر وەختێ ڕۆژا قیامەتێ هات، هەوە هەمییان پێکڤە دێ ئینین [ژ گۆڕان ڕاکەین، دا حوکوم د ناڤبەرا هەوەدا بێتەکرن].

وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ وَبِٱلۡحَقِّ نَزَلَۗ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿١٠٥﴾
وَقُرۡءَانٗا فَرَقۡنَٰهُ لِتَقۡرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكۡثٖ وَنَزَّلۡنَٰهُ تَنزِيلٗا ﴿١٠٦﴾
قُلۡ ءَامِنُواْ بِهِۦٓ أَوۡ لَا تُؤۡمِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهِۦٓ إِذَا يُتۡلَىٰ
عَلَيۡهِمۡ يَخِرُّونَۤ لِلۡأَذۡقَانِۤ سُجَّدٗاۤ ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبۡحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ
وَعۡدُ رَبِّنَا لَمَفۡعُولٗا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ يَبۡكُونَ وَيَزِيدُهُمۡ
خُشُوعٗا۩ ﴿١٠٩﴾ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ سَجدَة
ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا وَٱبۡتَغِ
بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا ﴿١١٠﴾ وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي لَمۡ يَتَّخِذۡ وَلَدٗا وَلَمۡ يَكُن
لَّهُۥ شَرِيكٞ فِي ٱلۡمُلۡكِ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلِيّٞ مِّنَ ٱلذُّلِّۖ وَكَبِّرۡهُ تَكۡبِيرَۢا ﴿١١١﴾

سُورَةُ الكَهفِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ﴿١﴾ سَكتة لطيفة على ألف عوجا
قَيِّمٗا لِّيُنذِرَ بَأۡسٗا شَدِيدٗا مِّن لَّدُنۡهُ وَيُبَشِّرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ
ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرًا حَسَنٗا ﴿٢﴾
مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدٗا ﴿٣﴾ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗا ﴿٤﴾





﴿١٠٥﴾ و مە قورئان ب هەقییێڤە ئینایییە خوارێ، [دا هەقییێ و ڕاستییێ ئاشكەرا بكەت] و ب هەقییێڤە یا هاتییە خوارێ، و مە تو نەهنارتی بۆ هندێ نەبیت ببییە مزگینئین و ئاگەهداركەر. ﴿١٠٦﴾ و مە قورئان جودا جودا بۆ تە ئینا خوار دا تو هێدی هێدی بۆ خەلكی بخوینی، و مە پیچ پیچە [ل دویڤ بەرژەوەندییان] ئینا خوارێ. ﴿١٠٧﴾ بێژە: چ هوین باوەرییێ پێ بینن یان پێ نەئینن، ب ڕاستی ئەوێت زانین [ب قورئانێ و ب هاتنا پێغەمبەری] بەری نوكە بۆ هاتی، گاڤا قورئان بۆ وان هاتە خواندن، ب لەز دكەڤنە سەر سەروچاڤێت خۆ، بۆ سوجدەبرنێ. ﴿١٠٨﴾ و دبێژن: پاك و پاقژی [ژ هەمی كێماسییان] بۆ خودایێ مە بیت، ب ڕاستی پەیمانا خودایێ مە دایی، هات. ﴿١٠٩﴾ و دكەڤنە سەر سەروچاڤێت خۆ و سوجدەیێ دبەن، و دكەنە گری و [خواندنا قورئانێ] ترسا وان پتر لێ دكەت. ﴿١١٠﴾ بێژە: حەزكەی ب ناڤێ خودێ گازی بكەن، حەزكەی ب ناڤێ دلۆڤان گازی بكەن، ب كیژ ناڤی گازی دكەن، گازی بكەن، نێ خودێ باشناڤ یێت هەین، و تو نڤێژا خۆ ب دەنگێ بلند نەكە و د دلێ خۆدا ژی نەكە [كو كەسێ گول دەنگێ تە نەبیت]، و ڕێكەكێ بگرە د ناڤبەرا هەردوكاندا بیت. ﴿١١١﴾ و بێژە: پەسن و سوپاسی هەمی بۆ وی خودایی ئەوێ چو زارۆك بۆ خۆ نەگرتین، و چو هەڤپشك د مالدارییێدا بۆ نەیی، و یێ چو هاریكار و پشتەڤان ژ هەوجەیی بۆ نەیی، و وی ژ هەمی كێم و كاسییان مەزنتر لێ بكە [كو زارۆك یان هەڤپشك یان پشتەڤان و هاریكار هەبن].

## سۆرەتا كەهف

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (١١٠) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ سوپاس و پەسن هەمی بۆ وی خودایی، ئەوێ قورئان بۆ بەندەیێ خۆ ئینایییە خوارێ، و چو خواری و كێماسی نەكرییە تێدا. ﴿٢﴾ كتێبەكا ڕاست و بێ جوداییە و پارێزڤانا كتێبێت بەری خۆیە، دا گاور و گونەهكاران ژ ئیزایەكا دژوار بترسینیت و مزگینییێ بدەتە خودان باوەران، ئەوێت كار و كریارێت قەنج دكەن، كو ب ڕاستی خەلاتەكێ باش بۆ وان هەیە كو بەحەشتە. ﴿٣﴾ و هەروهەر دێ د ناڤدا [د ناڤ بەحەشتێدا] مینن. ﴿٤﴾ و [دیسا] دا ئەوان، ئەوێت گۆتین خودێ زارۆكەكێ بۆ خۆ گرتی [ژ ئیزایێ] بترسینیت.

مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِءَابَآئِهِمْۚ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ
أَفْوَٰهِهِمْۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ٥ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ
عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ٦ إِنَّا
جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ٧
وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ٨ أَمْ حَسِبْتَ
أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُواْ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ٩
إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُواْ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ
رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ١٠ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ
فِي ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ١١ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ
ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓاْ أَمَدًا ١٢ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم
بِٱلْحَقِّۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ١٣
وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًاۖ لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ١٤
هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةًۖ لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم
بِسُلْطَٰنٍۭ بَيِّنٍۖ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ١٥





﴿٥﴾ نە ئەو و نە باب و باپیرێت وان چو ژ هندێ
نوزانن، ئەڤە ئاخڤتنەکا مەزنە ژ دەڤێ وان دەردکەڤیت،
و ئەو ژ درەوێ پێڤەتر نابێژن. ﴿٦﴾ ڤێجا تێ هەیە تو ژ
خەم و کۆڤانان خۆ بکوژی، ئەگەر ئەو باوەرییێ ب
ڤێ قورئانێ نەئینن. ﴿٧﴾ و ب ڕاستی تشتێ ل سەر
ئەردی هەی، مە یێ بۆ کرییە خەمل و جوانی، دا
وان (مرۆڤان) بجەڕبینین کا کی ژ وان یێ کار باشترە.
﴿٨﴾ ب ڕاستی هندی ل سەر ئەردی [ژ خەمل و
جوانییێ و هەر تشتێ تێدا ڕۆژا دویماهیکا دنیایێ]،
دێ کەینە ئاخەکا ڕویت و ڕەوال و بێ شینکاتی.
﴿٩﴾ ئەرێ تە هزر کر [هەی موحەمەد] کو خەلکێ
شکەفتێ و ڕەقیمێ [ڕەقیم یان ناڤێ وی چیایە یێ
شکەفت لێ، یان ئەو نهالە ئەڤا شکەفت تێدا، یان
ناڤێ گوندێ وانە، یان ناڤێ وی تەحتەبەری بوو یێ
ناڤێ وان ل سەر نڤیسی، و باراپتر ژ تەفسیرزانان ل
سەر ئەڤا دویماهییێنە] ژ نیشان و موعجیزەیێت مە
یێت عەجێبییە [ئانکو هزر نەکە ئەڤە ژ هەمی نیشان
و موعجیزەیێت مە عەجێبترە]. ﴿١٠﴾ بێژە وان، دەمێ
وان گەنج و لاوان خۆ گەهاندییە شکەفتێ، و وان گۆت: خودێوۆ، تو دلۆڤانییەکێ ژ دەڤ خۆ ب مە ببە
[ل ئاخرەتێ ل مە ببۆرە، و مە ئێمن بکە ژ نەیاران، و ڕزقی ل ڤێ دنیایێ بدە مە]، و ڤی کارێ مە ڕاست بکە
و ب ساناهی بێخە. ﴿١١﴾ و د شکەفتێدا چەند قەدەر سال و زەمانان، مە پەردا خەوێ ب سەر گوهێت وان
دادا [کو وان گول چو نەبیت و هەر نڤستی بمینن]. ﴿١٢﴾ پاشی مە ئەو ژ خەوێ هشیارکرن، دا بزانین کا کی
ژ هەردو جوینان دزانیت، کا ئەو چەند ماینە [ئەڤە ئیشارەتە کو ئەو ل سەر وەختێ مانا خەلکێ شکەفتێ د
شکەفتێدا، د ژێک جودا بوون]. ﴿١٣﴾ ئەم سەرهاتییا وان ب دورستی بۆ تە ڤەدگێڕین، ب ڕاستی ئەو هندەک
خورت و لاو بوون باوەری ب خودایێ خۆ ئینابوون، و مە ژی پتر ڕاستەڕێکرن [و مە ڕاگرتن و دلێ وان
موکومتر لێ کر، کو خۆ ل بەر هەر نەخۆشییەکا هەبیت بگرن]. ﴿١٤﴾ و مە دلێت وان [ب سەبر و ڕاستی
و ڕاگرتنێ] قاهیم کرن، وەختێ [بەرانبەری خوندکاری] ڕابوویین، و گۆتین: خودایێ مە، خودایێ ئەرد
و ئەسمانانە، ژ بلی وی ئەم چو خودایێت دی ناپەرێسین [و ئەگەر مە ژ بلی وی ئێکێ دی پەرست] هنگی
ب ڕاستی ئەم ئاخڤتنەکا دویر ژ هەقییێ دبێژین. ﴿١٥﴾ ئەڤێت هە، ملەتێ مە [خەلکێ باژێرێ مە] شوینا
خودێ، چەند پەرستییەکێت دی دپەرێسن. کا بلا نیشانەکا ئاشکەرا ل سەر خوداینییا وان بینن، ما کی ژ
وی ستەمکارترە یێ درەوان ب ناڤێ خودێ بکەت؟

وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ
يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا ١٦
۞ وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ
ٱلۡيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ
مِّنۡهُۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن
يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا ١٧ وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا
وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم
بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ لَوِ ٱطَّلَعۡتَ عَلَيۡهِمۡ لَوَلَّيۡتَ مِنۡهُمۡ
فِرَارٗا وَلَمُلِئۡتَ مِنۡهُمۡ رُعۡبٗا ١٨ وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ
لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡۚ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ كَمۡ لَبِثۡتُمۡۖ قَالُواْ لَبِثۡنَا
يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۚ قَالُواْ رَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثۡتُمۡ فَٱبۡعَثُوٓاْ
أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ
طَعَامٗا فَلۡيَأۡتِكُم بِرِزۡقٖ مِّنۡهُ وَلۡيَتَلَطَّفۡ وَلَا يُشۡعِرَنَّ
بِكُمۡ أَحَدًا ١٩ إِنَّهُمۡ إِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ يَرۡجُمُوكُمۡ
أَوۡ يُعِيدُوكُمۡ فِي مِلَّتِهِمۡ وَلَن تُفۡلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا ٢٠

الحزب ٣٠



﴿١٦﴾ و گاڤا هەوە خۆ ژ وان و یێت ئەو شوینا خودێ دپەرێسن [ژ بوتان]، دویر ئێخست و خۆ ژێ دا پاش، ڤێجا خۆ بگەهیننە [هەرنە] شکەفتێ، خودایێ هەوە دێ بەروبیاڤێ دلۆڤانییا خۆ ل سەر هەوە فرەهـ کەت، و کاروبارێ هوین تێدا و تشتێ هوین مفایی ژێ وەردگرن، ژ خوارن و ڤەخوارنێ، دێ بۆ هەوە ب ساناهی ئێخیت. ﴿١٧﴾ و تو دێ بینی وەختێ ڕۆژ دهەلێت تیرۆژکێت وێ ڕێکا خۆ ل سەر ڕەخێ ڕاستێ یێ شکەفتێ دگوهێزیت، و وەختێ ئاڤا دبیت ژ ملێ چەپێڤە ل وان نادەت، و ژ وان دبۆریت و ئەو د نیڤا شکەفتێڤە بوون [ئانکو نە هەلاتنێ و نە ئاڤابوونێ، ڕۆژێ ل وان نەددا هەر چەندە دەرێ شکەفتێ یێ ڤەکری ژی بوو، و ئەو د نیڤا وێدا بوون]، ئەڤە ژ نیشانێت [دەستهەلاتدارییا] خودێنە، و هەر کەسێ خودێ ڕاستەڕێ بکەت، نێ ئەوە ڕاستەڕێکری، و هەر کەسێ گومڕا و بەرزە بکەت، نێ تو چو هاریکار و ڕێبەر و ڕێناسان بۆ نابینی. ﴿١٨﴾ و یا ژ تەڤە د هشیارن و ئەو ب خۆ د نڤستینە [چونکی چاڤێت وان د ڤەکری بوون و ئەو ب خۆ د نڤستی بوون]، و مە ئەو ل سەر تەنشتا ڕاستێ و چەپێ دقولپاندن و دزڤڕاندن، و سەیێ وان ژی هەردو دەستێت وی ل بەر دەرازینکا شکەفتێ د درێژکری بوون، و ئەگەر تە ئەو دیتبانە [ل سەر وی حالی] دا [دلێ تە] تژی ترس بیت و دا ژێ ڕەڤی. ﴿١٩﴾ [و مە چاوا ئەو نڤاندبوون] وەسا مە ئەو هشیار ژی کرن، دا د ناڤبەرا خۆدا پسیار بکەن [کا ئەو چەند ماینە د شکەفتێڤە]، ئێکی ژ وان گۆت: ئەرێ هوین چەند ماینە؟ گۆتن: ڕۆژەکێ یان دانەکێ ڕۆژێ [و ئەوێت بۆ وان نەدیار کا چەند ماینە نڤستی] گۆتن: خودێ دزانیت کا هوین چەند ماینە، ڤێجا کا ئێکی ژ خۆ ب ڤان پارەیێت خۆ بهنێرنە بازێری، بلا بەرێ خۆ بدەتێ کا چ خوارن ژ هەمییان حەلالتر و پاقژترە بلا بۆ هەوە بینیت، بەلێ بلا یێ هشیار بیت [هویر بەرێ خۆ بدەتێ، دا نەئێتە نیاسین و دا کەس د سەردا نەبەت و نەخاپینیت]، کەسێ ب هەوە نەحەسینیت. ﴿٢٠﴾ ب ڕاستی ئەگەر ئەو ب سەر هەوە هەلبن دێ هەوە ب کەڤران کوژن، یان دێ هەوە زڤڕیننە سەر دینێ خۆ [و ئەگەر هوین زڤڕینە سەر دینێ وان]، هوین وی وەختی چوجا سەرفراز نابن.

وَكَذَٰلِكَ أَعۡثَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ لِيَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَأَنَّ
ٱلسَّاعَةَ لَا رَيۡبَ فِيهَآ إِذۡ يَتَنَٰزَعُونَ بَيۡنَهُمۡ أَمۡرَهُمۡۖ فَقَالُواْ
ٱبۡنُواْ عَلَيۡهِم بُنۡيَٰنٗاۖ رَّبُّهُمۡ أَعۡلَمُ بِهِمۡۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ
أَمۡرِهِمۡ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدٗا ﴿٢١﴾ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٞ
رَّابِعُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ وَيَقُولُونَ خَمۡسَةٞ سَادِسُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ
رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِۖ وَيَقُولُونَ سَبۡعَةٞ وَثَامِنُهُمۡ كَلۡبُهُمۡۚ قُل رَّبِّيٓ
أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا قَلِيلٞۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمۡ إِلَّا مِرَآءٗ
ظَٰهِرٗا وَلَا تَسۡتَفۡتِ فِيهِم مِّنۡهُمۡ أَحَدٗا ﴿٢٢﴾ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْيۡءٍ
إِنِّي فَاعِلٞ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ
إِذَا نَسِيتَ وَقُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَهۡدِيَنِ رَبِّي لِأَقۡرَبَ مِنۡ هَٰذَا رَشَدٗا ﴿٢٤﴾
وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا ﴿٢٥﴾
قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ لَهُۥ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ
أَبۡصِرۡ بِهِۦ وَأَسۡمِعۡۚ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيّٖ وَلَا يُشۡرِكُ
فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا ﴿٢٦﴾ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ
رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا ﴿٢٧﴾



﴿٢١﴾ و هۆسا مە خەلك ب وان حەساندن و ب سەر وان هەلكرن دەمێ خەلكی د ناڤبەرا خۆدا جڕەبڕ و گەنگەشە ل سەر ڕابوونا پشتی مرنێ دكرن، دا [ئەو خەلك] بزانن پەیمانا خودێ [ب ڕابوونا پشتی مرنێ] ڕاستە و هەر دێ ئێت، و شك و گۆمان د قیامەتێدا نینە [مە ئەو چاوا د خەو برن وەسا مە هشیاركرن]، د وی وەختیدا [وەختێ وان ئەو هۆسا دیتین، و ئەو ل پێش چاڤان مراندین] د ناڤ خۆدا جڕەبڕ دكرن، ڤێجا هندەكان دگۆت: گونبەتەكێ ل سەر وان ئاڤا بكەن، خودایێ وان چێتر دزانیت [ژ وان ئەوێت ب سەر وان هەلبوویین و جڕەبڕێ ل سەر وان دكەن، كا ئەو كی بوون و كا كارێ وان چ بوو]، و ئەوێت ب سەر وان هەلبوویین گۆتن: ئەم دێ مزگەفتەكێ [ل بەر دەرێ شكەفتێ] ل سەر وان ئاڤاكەین. ﴿٢٢﴾ [ئەوێت بەحسێ وان كرین ژ جوهیيان ل سەر وەختێ پێغەمبەری] دێ بێژن: ئەو سێ بوون، یێ چارێ سەیێ وان بوو [و هندەكێت دی ژ وان] دبێژن: پێنج بوون، یێ شەشێ سەیێ وان بوو، هەما ژ نك خۆ و بێ بەلگە هۆ دبێژن، [و هندەكێت دی ژ وان] دبێژن: ئەو حەفت بوون و یێ هەشتێ سەیێ وان بوو، بێژە: خودایێ من هەژمارا وان چێتر دزانیت [كا ئەو چەند بوون]، كەس [هەژمارا وان] نوزانیت كێمەك تێ نەبن، ئێدی تو د ڕاستا وان خۆرت و لاواندا ژ گەنگەشەیەكا بەرچاڤ و ئاشكەرا [وەكی ئەڤا مە بۆ تە وەحی پێ هنارتی، بێ كێم و زێدەیی] پێڤەتر نەكە، و پسیارا وان ژ كەسێ نەكە [ئەڤ وەحیا مە بۆ تە هنارتی د دەرهەقێ واندا بەسی تەیە]. ﴿٢٣﴾ و [هەی موحەمەد] تو بۆ كرنا چو تشتی نەبێژە، ئەز سوبەهی دێ ڤی [تشتی] كەم. ﴿٢٤﴾ ئەگەر نەبێژی: هەكە خودێ حەز بكەت [ئانكو بێژە: ئەگەر خودێ حەز بكەت ئەز دێ ڤی تشتی كەم]، و ئەگەر تە ژ بیر كر [تو بێژی (ئەگەر خودێ حەز بكەت)] خودایێ خۆ بینە بیرا خۆ [داخوازا لێبۆرینێ ژێ بكە، و بێژە: (ئەگەر خودێ حەز بكەت ـ إن شاء الله)]، و بێژە: ئەز هیڤی دكەم خودایێ من بەرێ من بدەتە ڕێكا ژ ڤێ چێتر [ئانكو هیڤی دكەم شوینا ڤێ ژ بیركرنێ خودێ بەرێ من بدەتە خێرەكێ ژ ڤێ ژ بیركرنێ یا چێتر بیت]. ﴿٢٥﴾ و ئەو سێ سەد سالان [نڤستی] د شكەفتا خۆدا مان [ل دویڤ حسێبا ڕۆژێ] و نەهـ سالێت دی لێ زێدە كرن [ل دویڤ حسێبا هەیڤێ]. ﴿٢٦﴾ بێژە: خودێ چێتر دزانیت كا ئەو چەند مایینە [نڤستی د شكەفتێدا]، و غەیبا ئەرد و ئەسمانان یا ویيە، چەندێ ب چاڤە و چەندێ ب گوهە. و وان [خەلكێ ئەرد و ئەسمانان] ژ بلی خودێ چو هاریكار نینن و خودێ كەسێ د حوكمێ خۆدا پشكدار ناكەت. ﴿٢٧﴾ [و هەی موحەمەد] ژ كتێبا خودایێ خۆ ئەوا ب وەحی بۆ تە هاتی بخوینە، و چو گوهۆڕین بۆ پەیڤێت وێ نینە [ئانكو كەس نەشێت بگوهۆڕیت]، و تە ژ بلی وی ژی، كەس نینە تە ڤەحەوینیت.

وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ
يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ
أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴿٢٨﴾ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن
شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ
وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ
ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ مَنۡ أَحۡسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ
لَهُمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ
مِن ذَهَبٖ وَيَلۡبَسُونَ ثِيَابًا خُضۡرٗا مِّن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَّكِـِٔينَ
نصف الحزب ٣٠ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۚ نِعۡمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتۡ مُرۡتَفَقٗا ﴿٣١﴾ ۞ وَٱضۡرِبۡ
لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا
بِنَخۡلٖ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا ﴿٣٢﴾ كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا وَلَمۡ
تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٞ فَقَالَ
لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا ﴿٣٤﴾



﴿٢٨﴾ [هەی موحەمەد] تو سەبرێ خۆ ل سەر وان بکێشە، و وان نەهێلە ئەوێت سپێدە و ئێڤاران گازی خودایێ خۆ دکەن [و خودایێ خۆ دپەرێسن، و ب پەرستن و گازیا خۆ]، قایلبوون و ڕازیبوونا خودایێ خۆ دڤێن، و بەرێ خۆ ژ وان وەرنەگێڕە [چەند د هەژار و دەست تەنگ بن بۆ هندە کەنکەنە و گرەگران]، و تە دڤێت زەنگین و خەلکێ دنیایێ ل دیوانا تەبن و گوهێ خۆ نەدە وی یێ مە دلێ وی ژ بیرئینانا خۆ بێ ئاگەهـ کری، و ب دویڤ دلخوازیا خۆ کەتی، و کارێ وی زێدە خرابییە. ﴿٢٩﴾ و بێژە: هەق [هەر ئەوە ئەوێ ژ دەڤ خودایێ هەوە هاتی [کو ئیسلام و قورئانە]، ڤێجا هەر کەسێ بڤێت بلا باوەرییێ بینیت، و هەر کەسێ بڤێت ژی بلا گاور ببیت، ب ڕاستی مە بۆ ستەمکاران ئاگرەکێ وەسا یێ بەرهەڤکری، کو گوڕیا وی یا ل وان هاتییە ئێك، و ئەگەر هەوار کرن [ئاڤەك خواستن] دێ بەرسڤا وان ب ئاڤەکا وەکی سفرێ حەلیایی ئێتەدان [وەسا یا شارییایە] سەروچاڤان دبرێژیت، چ پیسە ڤەخوارنە و چ پیسە جهە لێ خۆجهـ دبن. ﴿٣٠﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت ڕاست و قەنج کرین، ب ڕاستی ئەم خەلاتێ وی یێ کارێ ڕاست و قەنج کری بەرزە ناکەین. ﴿٣١﴾ ئەڤان بەحەشتێت ئاکنجیبوونێ بۆ وانن، کو ڕوبیار د بنڕا دچن، ئەو د وێ بەحەشتێدا ب بازنێت زێری دئێنە خەملاندنێ، و جلکێت کەسکێت ئارمیشێ تەنك و ستویر دێ کەنە بەر خۆ، و د پالدایینە ل سەر تەختێت چارچەڤکری، چ خەلاتەکێ باشە و چ خۆش جهە لێ خۆجهـ و ئاکنجی. ﴿٣٢﴾ و نموونەیا دو زەلامان بۆ وان بێژە، مە ئێك ژ وان دو جنیکێت هەمی جوینێت تری تێدا دابوویێ، و مە دۆرماندۆرێت هەردو جنیکان ب دارقەسپان گرتبوو، و ناڤبەرا هەردو جنیکان ژی کربوو چاندن. ﴿٣٣﴾ هەردو جنیك کەڤتبوونە بەری، و چو [چو سالان] ژێ کێم نەدبوو [هەردەم بەرێ وان یێ تمام بوو]، و مە ڕوبیار ئێخستبوو د ناڤبەرا هەردووکاندا. ﴿٣٤﴾ و [خودانێ هەردو جنیکان] هندەك مالێ دی ژی هەبوو، ڤێجا دان و ستاندن د گەل هەڤالێ خۆ کر، و گۆتێ: ئەز ژ تە ب مالترم، و ئەز ژ تە ب هێزتر و ب پشتەڤانترم.

وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ
أَبَدٗا ٣٥ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ
خَيۡرٗا مِّنۡهَا مُنقَلَبٗا ٣٦ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرۡتَ
بِٱلَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلٗا ٣٧
لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ٣٨ وَلَوۡلَآ إِذۡ دَخَلۡتَ
جَنَّتَكَ قُلۡتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ
مَالٗا وَوَلَدٗا ٣٩ فَعَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يُؤۡتِيَنِ خَيۡرٗا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرۡسِلَ
عَلَيۡهَا حُسۡبَانٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصۡبِحَ صَعِيدٗا زَلَقًا ٤٠ أَوۡ يُصۡبِحَ
مَآؤُهَا غَوۡرٗا فَلَن تَسۡتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبٗا ٤١ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ
فَأَصۡبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيۡهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ
عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُشۡرِكۡ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ٤٢ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ
فِئَةٞ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ٤٣ هُنَالِكَ ٱلۡوَلَٰيَةُ
لِلَّهِ ٱلۡحَقِّۚ هُوَ خَيۡرٞ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ عُقۡبٗا ٤٤ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ
فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ٤٥





﴿٣٥﴾ و چـۆ د نـاڤ جنیـکا خـۆدا، د گـەل وێ سـتەمێ
ئـەوا وی ل خـۆ کـری، گـۆت: ئەز بـاوەر ناکـەم ڕۆژەك
هەبیـت ئـەڤ جنیکـە نەمینیـت، و دویمـــاهیکەك بـۆ
هەبیـت. ﴿٣٦﴾ و ئـەز بـاوەر ناکەم قیامـەت ژی هەبیت،
و ئەگـەر [هەبیـت ژی و ئـەز خودانـێ ڤـی ڕەز و بـاغ و
مالیـــیەتی و] ئەز بێمـە زڤڕاندن ب بال خودایـــێ خۆڤە،
ب ڕاسـتی ئـەز دێ جنیکـەکا ژ ڤێ چێـتر و جهەکێ چێتر
بـۆ خـۆ بینـم. ﴿٣٧﴾ هەڤالـێ وی لـێ زڤڕانـد و گۆتـێ:
ئـەرێ تـە خـۆ بـێ بـاوەر کـر ژ وی خودایـی، ئـەوێ تو
جـارا ئێکـێ ژ ئاخـێ، پاشـی ژ چپکـەکا ئاڤـێ چێکری،
پاشـی تـو کریــیە زەلامەکـێ دورسـت و بـێ کێـم و
کاسـی. ﴿٣٨﴾ بەلـێ ئـەز مرۆڤەکـم باوەریـــێ دئینم کو
خـودێ خودانێ منە، و ئەز چو هەڤپشـکان بۆ خودایـــێ
خـۆ چێناکـەم. ﴿٣٩﴾ بلا وەختێ تو دچۆیـە د ناڤ جنیکا
خـۆدا، تـە گۆتبایە: ئەڤـە ئەوە یا خـودێ حەزکـری، بێی
خـودێ چـو هێـز و شـیان نینـن، و ئەگـەر تـو مـن ببینی
مـال و زاڕۆکێـت مـن ژ یـێت تـە کێمـترن. ﴿٤٠﴾ ئـەز
هیڤـی دکـەم خودایـــێ مـن جنیکەکا ژ یـا تە چێـتر بدەتە
مـن، و ئاتافەکـێ ژ ئەسمـــانی [وەکـی برویسیـــیان] ب سـەر جنیـکا تـەدا بینیـت، و بکەتـە ئەردەکـێ ڕویـت و
ڕەوال و حـولی. ﴿٤١﴾ یـان ژی ئاڤـا وێ د ئەردیـدا ببەتـە خـوارێ، کـو تـو نەشـێی ل دویـڤ بچـی و بزڤڕینیەڤـە.
﴿٤٢﴾ و فێقیـــێ وی هەمـی پویـچ بوو، نەما، ڤێجا دەسـتێت خۆ [لێکدان]، بەرویشـت کرن [ژ پەشێمـانیـــێ] ل
سـەر وی مالـێ لـێ مەزاختـی، و جنیك هەمی ب سـەرێکدا هاتبـوو خـوارێ، ئینا گۆت: خۆزی مـن چو شریك
بـۆ خودایـــێ خـۆ چـێ نەکربانـە. ﴿٤٣﴾ وی چـو دەسـتەك نەبوون ژ بـلی خـودێ، د هەوارێ بـێن و هاریکاریـــیا
وی بکـەن، و وی ب خـۆ ژی پـێ چـێ نەدبـوو بەرەڤانیـــێ ژ خۆ بکـەت. ﴿٤٤﴾ ئەهـا د ڤی کراسیدا هاریکاری
بـەس ژ خودێیـە [کەسـێ دی نەشـێت هاریکاریـــێ بکـەت]، چێترین خـەلات ئەوە یـێ ئـەو ددەت، و چێترین
دویمـــاهیك ئـەوە یـا ئـەو ددەت. ﴿٤٥﴾ بێژە وان هندی دنیایـە وەکی ئاڤەکێیـە مە ژ ئەسمـــانان ئینابیتـە خوارێ،
و ب ڤـێ ئاڤـێ گـل و گیایـــێ ئـەردی هەمـی تێکـڕا شـین بـوو، و پاشـی بوو پویـش و پەلـەخ و بـای بەلاڤەکر و
تەڕابـەڕا کـر، و خـودێ ل سـەر هەمی تشـتان خودان دەسـتهەلاتە.

ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ
خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ أَمَلٗا ﴿٤٦﴾ وَيَوۡمَ نُسَيِّرُ ٱلۡجِبَالَ وَتَرَى
ٱلۡأَرۡضَ بَارِزَةٗ وَحَشَرۡنَٰهُمۡ فَلَمۡ نُغَادِرۡ مِنۡهُمۡ أَحَدٗا ﴿٤٧﴾ وَعُرِضُواْ
عَلَىٰ رَبِّكَ صَفّٗا لَّقَدۡ جِئۡتُمُونَا كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةِۭۚ بَلۡ زَعَمۡتُمۡ
أَلَّن نَّجۡعَلَ لَكُم مَّوۡعِدٗا ﴿٤٨﴾ وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلۡمُجۡرِمِينَ
مُشۡفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ
لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَاۚ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ
حَاضِرٗاۗ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا ﴿٤٩﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ
لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ
أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ
بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا ﴿٥٠﴾ ۞ مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ثلاثة أرباع الحزب ٣٠
وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ﴿٥١﴾
وَيَوۡمَ يَقُولُ نَادُواْ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُمۡ فَدَعَوۡهُمۡ
فَلَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُمۡ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُم مَّوۡبِقٗا ﴿٥٢﴾ وَرَءَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ
ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمۡ يَجِدُواْ عَنۡهَا مَصۡرِفٗا ﴿٥٣﴾



﴿٤٦﴾ مال و زارۆك ڕەوشا ژیانا دنیایێنە، و كار و
كریارێت قەنج و گوهداریـیا خودێ، بۆ هەوە ل دەڤ
خودایێ تە ب خێرتر و ب هیڤیترن. ﴿٤٧﴾ و بیژە
وان ڕۆژا ئەم چیایان ژ بن دكەین، و تو ئەردی
ئاشكەرا [بێ گر و چیا و كەند و كۆر] دبینی، و
ئەم وان هەمییان كۆم دكەین، كەسێ ژ وان ناهێلین.
﴿٤٨﴾ و هەمی پێكڤە بەرانبەری خودایێ تە ب ڕیز
هاتنە ڕاوەستاندن، ب ڕاستی كا جارا ئێكێ مە هوین
چاوا دابوون [ڕویس و پێخواس و سەركۆل و بێ مال
و زارۆك]، هوین وەسا جارەكا دی هاتنە بەر دەستێ
مە، هەوە هزر دكر ئەم چو ژڤانان بۆ هەوە نادانین
[هەوە هزر دكر قیامەت نینە]. ﴿٤٩﴾ و كتێب [یێت
كار و كریارێت وان] هاتنە دانان [ئانكو هەر ئێك ب
سەر كار و كریارێت خۆ هەلبوو]، ڤێجا وێ ڕۆژێ دێ
گونەهكاران بینی، وەختێ ئەو كریارێت خۆ د كتێبێدا
دبینن ژێ دترسن، و دبێژن: وەی خۆلی ب سەرێ مە،
ئەڤە چ كتێبە؟ چو هویر و گر نینن هێلابن و تێ بۆری
بیت و نەنڤێسیبن، و هەر گونەهەكا وان د دنیایێدا كری
دیتن یا نڤێسییە، و خودایێ تە ستەمێ ل كەسێ ناكەت. ﴿٥٠﴾ و بیژە وان، دەمێ مە گۆتییە ملیاكەتان بۆ
ئادەمی هەرنە سوجدەیێ [سوجدەیا ڕێز گرتنێ نەیا پەرستنێ]، ڤێجا هەمی چۆنە سوجدەیێ [ئبلیس] تێ
نەبیت، ئەو ژ ئەجنەیان بوو، و ژ ئەمرێ خودایێ خۆ دەركەڤت، ئەرێ هوین وی و دویندەها وی شوینا من
بۆ خۆ دكەنە پشتەڤان، و ئەو دژمنێت هەوە، چ پیسە گوهۆڕینە ستەمكار دكەن [وەختێ خودێ دهێلن و
شەیتانی بۆ خۆ دكەنە پشتەڤان]. ﴿٥١﴾ من ئەو [ئبلیس و دویندەها وی] ل سەر چێكرنا ئەرد و ئەسمانان نە
حازركربوون، و نە ل سەر چێكرنا وان ب خۆ ژی، و ئەز نە ئەوم یێ ئەوێت خەلكی د سەردا دبەن، بۆ خۆ
بكەمە هاریكار. ﴿٥٢﴾ و ڕۆژا [خودێ] دبێژیت: كا گازی وان هەڤپشكان بكەن ئەوێت هەوە دكرنە هەڤپشك
بۆ من [كا دێ فایدەی هەوە كەن و دێ شێن مەهدەرێ بۆ هەوە بكەن!]، ئینا هەوار كرنە وان، بەلێ بەرسڤا
وان نەدان، و مە جهێ هیلاكێ [كو دۆژەهە] ئێخستە د ناڤبەرا واندا. ﴿٥٣﴾ و گونەهكاران ئاگر دیت و ل
دەڤ وان بوو ئێقین و گومان نەما، ئەو دێ كەڤنە تێدا و چو چارە بۆ خۆ نەدیتن كو وان ژێ [ژ ئاگری] بدەتە
پاش.

وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَا فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٖۚ وَكَانَ
ٱلۡإِنسَٰنُ أَكۡثَرَ شَيۡءٖ جَدَلٗا ٥٤ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤۡمِنُوٓاْ
إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّهُمۡ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمۡ سُنَّةُ
ٱلۡأَوَّلِينَ أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ قُبُلٗا ٥٥ وَمَا نُرۡسِلُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ
إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَۚ وَيُجَٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ
لِيُدۡحِضُواْ بِهِ ٱلۡحَقَّۖ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَمَآ أُنذِرُواْ هُزُوٗا ٥٦
وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعۡرَضَ عَنۡهَا وَنَسِيَ
مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُۚ إِنَّا جَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ
وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗاۖ وَإِن تَدۡعُهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ فَلَن يَهۡتَدُوٓاْ إِذًا
أَبَدٗا ٥٧ وَرَبُّكَ ٱلۡغَفُورُ ذُو ٱلرَّحۡمَةِۖ لَوۡ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُواْ
لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلۡعَذَابَۚ بَل لَّهُم مَّوۡعِدٞ لَّن يَجِدُواْ مِن دُونِهِۦ
مَوۡئِلٗا ٥٨ وَتِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰٓ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَعَلۡنَا
لِمَهۡلِكِهِم مَّوۡعِدٗا ٥٩ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبۡرَحُ حَتَّىٰٓ
أَبۡلُغَ مَجۡمَعَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ أَوۡ أَمۡضِيَ حُقُبٗا ٦٠ فَلَمَّا بَلَغَا مَجۡمَعَ
بَيۡنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ سَرَبٗا ٦١





﴿٥٤﴾ و ب ڕاستی مە بۆ مرۆڤان د ڤێ قورئانێدا ژ هەمی ڕەنگان نموونە ئینایینە، بەلێ مرۆڤ ژ هەمی تشتان پتر یێ مەدەرك و قاویش كێشە. ﴿٥٥﴾ و چو تشتی مرۆڤ ژ هندێ نەدانە پاش كو باوەرییێ بینن، و داخوازا لێبۆرینێ ژ خودایێ خۆ بكەن، پشتی ڕاستەڕێیی پێغەمبەر و قورئان] بۆ وان هاتی، ئەو نەبیت دویماهییا ئەوێت بەرێ ب سەرێ وان بهێت، یان ژی هەمی ڕەنگێت ئیزایێ ب ئاشكەرایی بۆ وان بهێن. ﴿٥٦﴾ و ئەم پێغەمبەران ناهنێرین ئەگەر بۆ هندێ نەبیت دا ببنە مزگینئین و ئاگەهداركەر، و ئەوێت گاوربوویین ب پویچییێ جرەبڕێ دكەن، دا هەقییێ پێ بێ هێز بكەن و نەهێلن و ببەن، و بەلگە و نیشانێت من [كو قورئانە] و ئیزایا پێ هاتینە ترساندن ب ترانە وەردگرن. ﴿٥٧﴾ و ما كی ژ وی ستەمكارترە یێ ب نیشان و ئایەتێت خودێ بێتە شیرەتكرن، پاشی پشتا خۆ بدەتێ [هزرا خۆ تێدا نەكەت و خۆ تێ نەگەهینیت]، و كریارێت ب دەستێ خۆ كرین [ژ خرابی و گونەهان] ژ بیر بكەت [هزرا خۆ د دویماهیكا واندا نەكەت]. و دا د قورئانێ نەگەهن، مە پەردە یێت ئێخستینە سەر دلێت وان، و مە كەڕاتی و گرانی یا ئێخستییە د گوهێت واندا، و ئەگەر داخوازا وان بكەی بۆ ڕاستەڕێییێ ژی [باوەرییێ و قورئانێ] ئەو چوجا ڕاستەڕێ نابن [چونكی نە هەقییێ دبینن، و نە گولێ دبن، و نە تێ دگەهن]. ﴿٥٨﴾ و خودایێ تە گونەهـژێبەر و خودان دلۆڤانییە، ئەگەر خودێ ل وان گرتبایە ژ بەر ئەوا وان كری، دا لەزێ ل ئیزادانا وان كەت، بەلێ وان ژڤانەك یێ هەی [گاڤا هات]، وان چو جە نینن وان ڤەحەوینیت. ﴿٥٩﴾ ئەڤە ئەو گوندن ئەوێت مە د هیلاك برین دەمێ وان ستەم كری، و مە بۆ د هیلاكبرنا وان ژڤانەكێ ئاشكەرا دانابوو [گەلی قورەیشییان دویر نەدانن ئەوا ب سەرێ وان هاتی، ب سەرێ هەوە ژی بێت]. ﴿٦٠﴾ و بیژە وان وەختێ مووسایی گۆتییە خزمەتكارێ خۆ ئەز دێ هنگی ڕاوەستم هەتا دگەهمە جهێ تێكەلبوونا هەردو دەریایان، یان ژی وەختەكێ درێژ، ب سالان ئەز دێ چم [هەتا بگەهمە وی جهی]. ﴿٦١﴾ ڤێجا وەختێ گەهشتییە جهێ تێكەلبوونا هەردو دەریایان، ماسییێ خۆ ژ بیر كرن، ڤێجا [ماسییێ وان] ڕێكا خۆ د ناڤ دەریایێدا گرت و چۆ .

فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدۡ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا
هَٰذَا نَصَبٗا ٦٢ قَالَ أَرَءَيۡتَ إِذۡ أَوَيۡنَآ إِلَى ٱلصَّخۡرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ
ٱلۡحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيۡطَٰنُ أَنۡ أَذۡكُرَهُۥۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ
فِي ٱلۡبَحۡرِ عَجَبٗا ٦٣ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبۡغِۚ فَٱرۡتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا
قَصَصٗا ٦٤ فَوَجَدَا عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا
وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا ٦٥ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن
تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا ٦٦ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ
صَبۡرٗا ٦٧ وَكَيۡفَ تَصۡبِرُ عَلَىٰ مَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ خُبۡرٗا ٦٨ قَالَ
سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرٗا وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرٗا ٦٩ قَالَ فَإِنِ
ٱتَّبَعۡتَنِي فَلَا تَسۡـَٔلۡنِي عَن شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ أُحۡدِثَ لَكَ مِنۡهُ ذِكۡرٗا ٧٠
فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَاۖ قَالَ أَخَرَقۡتَهَا
لِتُغۡرِقَ أَهۡلَهَا لَقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـًٔا إِمۡرٗا ٧١ قَالَ أَلَمۡ أَقُلۡ إِنَّكَ
لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ٧٢ قَالَ لَا تُؤَاخِذۡنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا
تُرۡهِقۡنِي مِنۡ أَمۡرِي عُسۡرٗا ٧٣ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمٗا فَقَتَلَهُۥ
قَالَ أَقَتَلۡتَ نَفۡسٗا زَكِيَّةَۢ بِغَيۡرِ نَفۡسٖ لَّقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـٔٗا نُّكۡرٗا ٧٤



﴿٦٢﴾ ڤێجا وەختێ ژ وێرێ [جهێ گەهشتنا هەردو
دەریایان] بۆرین، مووسایی گۆتە خزمەتكارێ
خۆ، كا زادێ مە بینە، ب ڕاستی مە زەحمەت د ڤێ
وەغەرا خۆدا دیت. ﴿٦٣﴾ گۆت: دئێتە بیرا تە
وەختێ ئەم ل بەر كەڤری ڕوینشتین؟! من ماسی ل
وێرێ هێلا و ژ بیركر، و ژ شەیتانی پێڤەتر ژ بیرا من
نەبر ئەز بێژمە تە، وی ماسی [ئەوێ مری] ڕێكا
خۆ ب ئاوایەكێ عەجێب د ناڤ دەریایێدا گرت و
چۆ. ﴿٦٤﴾ [مووسایی] گۆت: ئەها تشتێ مە دڤیا
ئەڤەبوو، ڤێجا هەردو ل دەوسا (شۆپا) خۆ زڤرینەڤە.
﴿٦٥﴾ و هەردووكان بەندەیەك ژ بەندەیێت مە [خدر
پێغەمبەر] دیت، مە دلۆڤانی ژ نك خۆ پێ بربوو
[و تێگەهشتن و ئەقل ژ نك خۆ دابوویێ]، و مە ژ دەڤ
خۆ فێری زانینەكێ كربوو. ﴿٦٦﴾ [مووسایی] گۆت
ئەرێ دێ هێلی ئەز د گەل تە بێم، بەلێ تو وێ زانینێ
نیشا من بدەیی یا نیشا تە هاتییە دان، كو بۆ من ببیتە
ڕێبەر؟ ﴿٦٧﴾ گۆت: ب ڕاستی تو نەشێی بێهنا خۆ د
گەل من فرەهـ بكەی. ﴿٦٨﴾ و دێ چاوا بێهنا خۆ ل
سەر تشتەكی فرەهكەی، تو تێنەگەهی و چو بۆ تە ل سەر نەهاتبیتە گۆتن؟ ﴿٦٩﴾ [مووسایی] گۆت: خودێ
حەزكەت دێ من بینی بێنفرەهـ، و ئەز [د چو تشتاندا] بێ ئەمریا تە ناكەم. ﴿٧٠﴾ گۆت: ئەگەر تە خۆ دا د
گەل من، پسیارا چو تشتان ژ من نەكە، هەتا ئەز ب خۆ وی تشتی بۆ تە نەبێژم. ﴿٧١﴾ ڤێجا هەردو ب ڕێ
كەڤتن، دەمێ ل گەمییێ سویار بوویین، یێ مووسا دگەل، گەمی كونكر، [مووسایی] گۆتێ: تە كونكر دا
خەلكێ تێدا بخەندقینی؟! ب ڕاستی ئەڤە تشتەكێ مەزن بوو تە كری. ﴿٧٢﴾ گۆت: ما من نەگۆتبوو تە
ب ڕاستی تو نەشێی بێهنا خۆ د گەل من فرەهـ بكەی؟ ﴿٧٣﴾ [مووسایی] گۆت: ل من نەگرە تشتێ من ژ
بیركری، و بارێ من هند گران نەكە كو ئەز نەشێم د گەل تە بهێم. ﴿٧٤﴾ ڤێجا هەردو چۆن هەتا بچویكەك
دیتین، ئینا [یێ مووسا د گەل] ئەو بچویك كوشت [مووسایی] گۆت: ئەرێ تە چاوا مرۆڤەكێ پاقژ و بێ
گونەهـ و نە د بەر كەسێدا كوشت؟! ب ڕاستی ئەڤە تشتەكێ زێدە خراب بوو تە كری.

۞ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴿٧٥﴾ قَالَ إِن
سَأَلۡتُكَ عَن شَيۡءِۭ بَعۡدَهَا فَلَا تُصَٰحِبۡنِيۖ قَدۡ بَلَغۡتَ مِن لَّدُنِّي
عُذۡرٗا ﴿٧٦﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهۡلَ قَرۡيَةٍ ٱسۡتَطۡعَمَآ أَهۡلَهَا فَأَبَوۡاْ
أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارٗا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥۖ
قَالَ لَوۡ شِئۡتَ لَتَّخَذۡتَ عَلَيۡهِ أَجۡرٗا ﴿٧٧﴾ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيۡنِي
وَبَيۡنِكَۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأۡوِيلِ مَا لَمۡ تَسۡتَطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرًا ﴿٧٨﴾ أَمَّا
ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتۡ لِمَسَٰكِينَ يَعۡمَلُونَ فِي ٱلۡبَحۡرِ فَأَرَدتُّ أَنۡ
أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٞ يَأۡخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصۡبٗا ﴿٧٩﴾ وَأَمَّا
ٱلۡغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤۡمِنَيۡنِ فَخَشِينَآ أَن يُرۡهِقَهُمَا طُغۡيَٰنٗا
وَكُفۡرٗا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدۡنَآ أَن يُبۡدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيۡرٗا مِّنۡهُ زَكَوٰةٗ وَأَقۡرَبَ
رُحۡمٗا ﴿٨١﴾ وَأَمَّا ٱلۡجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ فِي ٱلۡمَدِينَةِ
وَكَانَ تَحۡتَهُۥ كَنزٞ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحٗا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن
يَبۡلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسۡتَخۡرِجَا كَنزَهُمَا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ
وَمَا فَعَلۡتُهُۥ عَنۡ أَمۡرِيۚ ذَٰلِكَ تَأۡوِيلُ مَا لَمۡ تَسۡطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرٗا ﴿٨٢﴾
وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَن ذِي ٱلۡقَرۡنَيۡنِۖ قُلۡ سَأَتۡلُواْ عَلَيۡكُم مِّنۡهُ ذِكۡرًا ﴿٨٣﴾



﴿٧٥﴾ [یێ مووسا د گەل] گۆت: ما من نەگۆتە تە تو نەشێی بێهنا خۆ د گەل من فرەهـ بکەی؟ ﴿٧٦﴾ [مووسایی] گۆت: ئەگەر من پشتی ڤێ، پسیارا تشتەکێ دی ژ تە کر، هەڤالینیيا من نەکە، و ب ڕاستی تو ژ ڕەخێ منڤە یێ دەستویردایی. ﴿٧٧﴾ ئینا جارەکا دی هەردوکان، دا ڕێ هەتا گەهشتینە گوندەکی، خوارن ژ خەلکێ گوندی خواستن، بەلێ خەلکێ گوندی خوارن نەدا وان و مێڤان نەکرن. دیوارەك ل وی گوندی دیتن نێزیك بوو بهەڕفیت و ب سەرێکدا بهێت، ئینا [یێ مووسا دگەل] ئەو دیوار ڕاکر و دورستکر، [مووسایی] گۆت: تە دشیا تو پالەتیيا خۆ وەرگری [ئانکو بلا تە تشتەك بەرانبەری دورستکرنا دیواری وەرگرتبایە، دا مە ژی خوارنەك بۆ خۆ پێ کڕیبایە، ژ خەلکێ ڤی گوندێ نان نەدایییە مە و ئەم مێڤان نەکرین]. ﴿٧٨﴾ [خدری] گۆت: ئەها ئەڤە وەختێ ژێکڤەبوونا من و تەیە، [ژ نوی] ئەز دێ بۆ تە ڕاڤەکرنا وان تشتان بێژم، ئەوێت تە نەشیایی بێهنا خۆ ل سەر فرەهـ بکەی. ﴿٧٩﴾ هندی گەمی بوو یا هندەك بەلنگازان بوو د دەریاییدا بۆ خۆ شۆل دکرن، من ڤیا ئەز ب عەیب بێخم چونکی خوندکارەك د ڕێکا واندا بوو، هەر گەمییەکا دورست و بێ عەیب هەبایە ب خورتی ژ خودانان دستاند [ڤێجا من ڤیا ئەز کون بکەم، دا ببینیت یا کونە و ب کێرناهێت]. ﴿٨٠﴾ و هندی بچویك بوو، دەیبابێت وی د خودان باوەر بوون، ئەم ترسیاین [وەختێ مەزن دبیت] دەیبابێت خۆ ب خرابیيا خۆ بەر ب گاوری و سەرداچۆنێڤە ببەت [هندی هند حەژێ دکرن]. ﴿٨١﴾ ڤێجا مە ڤیا، خودایێ وان، شوینا وی بچویکی، بچویکەکێ چێتر و پاقژتر و دلۆڤانتر بدەتە وان. ﴿٨٢﴾ و هندی دیوار بوو، یێ دو بچویکێت سێوی بوو ژ خەلکێ باژێری، و گەنجخانەیەکا وان هەردو سێویيان دبن وی دیواریڤە بوو، و بابێ وان ژی یێ ڕاستکار و قەنج بوو، ڤێجا خودایێ تە ڤیا [ئەز دیوارێ وان دورست بکەم] هەردو بچویك بگەهنە تمامیيا عەقلێ خۆ، و گەنجخانەیا خۆ دەربێخن، ئەڤە دلۆڤانییەکە ژ خودایێ تە ب وان بری، و من ئەڤ تشتە ژ دەڤ خۆ نەکرینە، و ئەڤەیە ڕاڤەکرنا تشتێ من کری و تە نەشیایی بێهنا خۆ ل سەر فرەهـ بکەی. ﴿٨٣﴾ [هەی موحەمەد] ئەو پسیارا خودانێ ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤایێ [زیلقەرنەینی] ژ تە دکەن [کا کی بوو، و چیرۆکا وی چاوا بوو؟]، بێژە: ئەز دێ بۆ هەوە د ڕاستا ویدا قورئانێ خوینم.

إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبٗا ٨٤ فَأَتۡبَعَ
سَبَبًا ٨٥ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغۡرِبَ ٱلشَّمۡسِ وَجَدَهَا تَغۡرُبُ فِي عَيۡنٍ حَمِئَةٖ
وَوَجَدَ عِندَهَا قَوۡمٗاۗ قُلۡنَا يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ
فِيهِمۡ حُسۡنٗا ٨٦ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوۡفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ
فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا نُّكۡرٗا ٨٧ وَأَمَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُۥ جَزَآءً
ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنۡ أَمۡرِنَا يُسۡرٗا ٨٨ ثُمَّ أَتۡبَعَ سَبَبًا ٨٩ حَتَّىٰٓ
إِذَا بَلَغَ مَطۡلِعَ ٱلشَّمۡسِ وَجَدَهَا تَطۡلُعُ عَلَىٰ قَوۡمٖ لَّمۡ نَجۡعَل لَّهُم مِّن
دُونِهَا سِتۡرٗا ٩٠ كَذَٰلِكَۖ وَقَدۡ أَحَطۡنَا بِمَا لَدَيۡهِ خُبۡرٗا ٩١ ثُمَّ
أَتۡبَعَ سَبَبًا ٩٢ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيۡنَ ٱلسَّدَّيۡنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوۡمٗا
لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلٗا ٩٣ قَالُواْ يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِنَّ يَأۡجُوجَ
وَمَأۡجُوجَ مُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَهَلۡ نَجۡعَلُ لَكَ خَرۡجًا عَلَىٰٓ أَن
تَجۡعَلَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَهُمۡ سَدّٗا ٩٤ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيۡرٞ فَأَعِينُونِي
بِقُوَّةٍ أَجۡعَلۡ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُمۡ رَدۡمًا ٩٥ ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ
بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارٗا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ
قِطۡرٗا ٩٦ فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا ٩٧



﴿٨٤﴾ و ب ڕاستی مە ئەو د ئەردیدا ب هێز و شیان ئێخستبوو [چاوا بڤێت وێ د ئەردیدا بکەت]، و [دا بگەهیتە ئارمانجا خۆ] مە هەمی ڕێکێت زانین و شیانێ دابوونێ. ﴿٨٥﴾ ڤێجا [دا بگەهیتە ڕۆژئاڤاییێ] ڕێکەك گرت [و چۆ]. ﴿٨٦﴾ هەتا گەهشتییە جهێ ئاڤابوونا ڕۆژێ، دیت ڕۆژ د کانییەکا تەقنەڕەشێدا ئاڤا دبیت، و ملەتەك ل وێرێ دیت، مە گۆت: ئەی زیلقەرنەین یان وان ب ئیزا بکوژە، یان ژی چاك و نەرم بە د گەل وان [و هێدی هێدی و ب خۆشی وان بینە سەر ڕێکا ڕاست]. ﴿٨٧﴾ [زیلقەرنەینی] گۆت: هندی ئەوە یێ ستەم کری [هەڤپشك بۆ خودێ چێکرین] ئەم دێ وی ب ئیزا کوژین، پاشی ئەو دێ ب بال خودایێ خۆڤە ئێتە زڤڕاندن، و [خودایێ وی] ئیزایەکا زێدە و دژوار و نەدیتی [کەسێ نەدیتی] دێ دەتە بەر وان. ﴿٨٨﴾ و بەلێ هەر کەسێ باوەرییێ بینیت و کار و کریارێت قەنج و ڕاست بکەت، خەلاتێ وی بەحەشتە و ئەم ژ ڕەخێ خۆڤە دێ فەرمانێت ساناهی لێ کەین [ئانکو ئەم بارێ وی گران ناکەین و ل سەر ب زەحمەت نائێخین].
﴿٨٩﴾ و [دا بگەهیتە ڕۆژهەلاتێ] ڕێکەك گرت [و چۆ]. ﴿٩٠﴾ هەتا گەهشتییە جهێ دەستپێکێ [ئەولی] ڕۆژ لێ ددەت، ل وێرێ ڕۆژ دیت، ل سەر ملەتەکی دهەلێت مە چو بۆ وان چێ نەکربوو کو ڕۆژ ل وان نەدەت [بێ جلك و بێ ئاڤاهی بوون]. ﴿٩١﴾ وەسا [کا چ ب سەرێ خەلکێ ڕۆژئاڤاییێ ئینا، ئەو ب سەرێ خەلکێ ڕۆژهەلاتی ژی ئینا، یێ باوەری ئینای هێلا، و یێ گاور بووی و ل سەر گاورییا خۆ مای کوشت] و ب ڕاستی مە ئاگەهـ ژ هەمییێ هەبوو چ ئەوێ هەی و چ ئەوێ دهاتەکرن. ﴿٩٢﴾ پاشی ڕێکەك گرت [و چۆ].
﴿٩٣﴾ هەتا گەهشتییە د ناڤبەرا دو چیاباندا، ل وێرێ ملەتەك دیت چو زمان نەدزانین [یێ وان ب خۆ نەبایە].
﴿٩٤﴾ وان گۆت: هەی زیلقەرنەین یەئجووج و مەئجووج خرابییێ د ئەردێ مەدا دکەن، ئەگەر ئەم پشکەکێ ژ مالێ خۆ بۆ تە بدانین، تو دێ د ناڤبەرا مە و واندا ناڤبرەکێ چێکەی؟ ﴿٩٥﴾ [زیلقەرنەینی] گۆت: ئەو مال و ملك و شیانا خودایێ من دایییە من، ژ وێ پشکا هوین ژ مالێ خۆ بۆ من دئێخن چێترە، ڤێجا ب هێزێ [ب زەلامان و ئالاڤان] هاری من بکەن، دا د ناڤبەرا هەوە و واندا ناڤبڕ و سکرەکێ موکوم چێکەم.
﴿٩٦﴾ قەد و پرتێت ئاسنی بۆ من بینن [ڤێجا ئەو قەد و پرت د نیڤەکا هەردو ڕەخاندا دانانە سەرێك]، هەتا هەردو ڕەخ گەهاندینە ئێك [پاشی زیلقەرنەینی] گۆتە [وان]: ب کویرهان پفکەنێ و ئاگری خۆش بکەن [وان ژی ئاگر خۆش کر هەتا ئاسن سۆر بوویی] و بوویییە ئاگر [زیلقەرنەینی] گۆت: سفرێ حەلیایی بۆ من بینن دا داڕێژمە سەر. ﴿٩٧﴾ [ڤێجا ناڤبڕ و سکرەکێ زێدە موکوم و قایم د ناڤبەرا واندا چێکر] وان نەشیا د سەرڕا بهێن [هندی یێ بلند بوو]، و نەشیان کون بکەن ژی [هندی یێ قایم بوو].

ربع الحزب ٣١

قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي ۖ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ ۖ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي
حَقًّا ﴿٩٨﴾ ۞ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ ۖ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ
فَجَمَعْنَٰهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾ وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَٰفِرِينَ عَرْضًا ﴿١٠٠﴾ ٱلَّذِينَ
كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِي غِطَآءٍ عَن ذِكْرِي وَكَانُوا۟ لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا ﴿١٠١﴾
أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن يَتَّخِذُوا۟ عِبَادِي مِن دُونِيٓ أَوْلِيَآءَ ۚ إِنَّآ
أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ نُزُلًا ﴿١٠٢﴾ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا ﴿١٠٣﴾
ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ
صُنْعًا ﴿١٠٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَلِقَآئِهِۦ فَحَبِطَتْ
أَعْمَٰلُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُمْ جَهَنَّمُ
بِمَا كَفَرُوا۟ وَٱتَّخَذُوٓا۟ ءَايَٰتِي وَرُسُلِي هُزُوًا ﴿١٠٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟
ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا
لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا ﴿١٠٨﴾ قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي لَنَفِدَ
ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾ قُلْ إِنَّمَآ
أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟
لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾



﴿٩٨﴾ [زیلقەرنەینی] گۆت: ئەڤە [مەخسەد ئەڤ ناڤبرە] دلۆڤانییەکە ژ خودایێ من، گاڤا وەختێ ژڤانێ خودایێ من [ب هەرفتنا وێ] هات، خودایێ من دێ د گەل ئەردی دەشت کەت، ب راستی ژڤانێ خودایێ من [ب هەرفتنا ڤێ ناڤبرێ و دەرکەڤتنا یەئجووج و مەئجووجان] راستە و هەر دێ ئێت. ﴿٩٩﴾ و د وێ رۆژێدا [رۆژا دەرکەڤتنا یەئجووج و مەئجووجان یان رۆژا قیامەتێ] ئەم دێ هێلین مرۆڤ وەکی پێلێت دەریایێ ب ناڤ ئێك بکەڤن، و بۆقا دووێ هاتە لێدان [مە هەمی ساخکرن] و مە هەمی پێکڤە کۆمکرن. ﴿١٠٠﴾ و د وێ رۆژێدا [رۆژا ئەم وان هەمییان کۆم دکەین، کو رۆژا قیامەتێیە] دێ دۆژەهێ بۆ گاوران بەرچاڤکەین و نیشا وان دەین. ﴿١٠١﴾ ئەوێت چاڤێت وان، ژ بیرئینان و تێگەهشتنا بەلگە و نیشانێت من، گرتی و پەردە ل سەر، و نەدشیان گوهدارییا قورئانێ بکەن. ﴿١٠٢﴾ ئەرێ ئەوێت گاوربوویین هزرکرن کو ئەو دێ شێن بەندەیێت من [ملیاکەت و عیسا پێغەمبەری و شەیتانان] شوینا من کەنە پشتەڤان بۆ خۆ، ب راستی مە دۆژەه بۆ گاوران یا کرییە وارگەه. ﴿١٠٣﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: ئەرێ بێژمە هەوە [گەلی مرۆڤان] کا کی ژ هەمییان پتر د کریارێت خۆدا د خوسارەتن؟ ﴿١٠٤﴾ [ئەو ئەون] ئەوێت کار و کریارێت وان د ژیانا دنیایێدا [ب گاورییێ] پویچ بوویین، و ئەو ل وێ هزرێ بوون کو قەنجی بوو وان دکر. ﴿١٠٥﴾ ئەڤە ئەون ئەوێت باوەری ب نیشان و بەرهەمبەربوونا خودێ نەئینایین، ڤێجا [ژ بەر هندێ] کار و کریارێت وان پویچ بوون، [دیسا ژ بەر ڤێ چەندێ] رۆژا قیامەتێ ئەم چو قەدر و قیمەتی بۆ وان نادانین. ﴿١٠٦﴾ ئەڤە جزایێ وان دۆژەهە ژ بەر باوەری نەئینانا وان، و یارییپێکرنا وان ب نیشان و بەلگە و پێغەمبەرێت من. ﴿١٠٧﴾ ب راستی ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت قەنج کرین، بەحەشتا فیردەوس بۆ وان وارگەهە. ﴿١٠٨﴾ هەروهەر دێ تێدا بن، و نەڤێن ژێ دەرکەڤنە جهەکێ دی. ﴿١٠٩﴾ بێژە: ئەگەر دەریا ببنە حوبر بۆ پەیڤێت خودایێ من [و پێ بێنە نڤێسین]، دێ ئاڤا دەریایان ب دویاهی ئێت بەری پەیڤێت خودایێ من ب دویماهی بێن، و ئەگەر هندی وان ژێ بێنە سەر هەر دێ ب دویماهی ئێن، و پەیڤێت خودایێ من ب دویماهی نائێن. ﴿١١٠﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: ئەز ژی مرۆڤەکم وەکی هەوە، وەحی بۆ من دئێت، کو ب راستی خودایێ هەوە خودایەکێ ب تنێیە، ڤێجا هەر کەسێ خەلاتێ خودێ بڤێت و ژ ئێزایا وی بترسیت و ل هیڤییا بەرهەمبەربوونا خودێ بیت، بلا کار و کریارێت قەنج بکەت، و کەسێ نەکەتە هەڤپشك د پەرستنا خودایێ خۆدا.

سُورَةُ مَرۡيَمَ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

كٓهيعٓصٓ ١ ذِكۡرُ رَحۡمَتِ رَبِّكَ عَبۡدَهُۥ زَكَرِيَّآ ٢ إِذۡ
نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيّٗا ٣ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ مِنِّي
وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا ٤
وَإِنِّي خِفۡتُ ٱلۡمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِي وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي
عَاقِرٗا فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا ٥ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنۡ
ءَالِ يَعۡقُوبَۖ وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيّٗا ٦ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا
نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ لَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ مِن قَبۡلُ سَمِيّٗا ٧
قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا
وَقَدۡ بَلَغۡتُ مِنَ ٱلۡكِبَرِ عِتِيّٗا ٨ قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ
رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞ وَقَدۡ خَلَقۡتُكَ مِن قَبۡلُ وَلَمۡ تَكُ
شَيۡـٔٗا ٩ قَالَ رَبِّ ٱجۡعَل لِّيٓ ءَايَةٗۖ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا
تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا ١٠ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ
ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ١١



## سۆرەتا مەریەم

**ل مەكەهێ هاتیـە خوارێ (٩٨) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ [هۆسا دئێتە خواندن: كاف، ها، یا، عەین، صاد،
و ڕاڤەكرنا ڤان ڕەنگە تیپان د سۆرەتێت بۆریدا هاتییە
دیاركرن]. ﴿٢﴾ [ئەڤا بۆ تە دئێتە خواندن] بیرئینانا
دلۆڤانییا خودایێ تەیە ب بەندەیێ خۆ زەكەریا [ئەم
بۆ تە ڤەدگێرین]. ﴿٣﴾ وەختێ ب دەنگەكێ نزم گازی
خودایێ خۆ كری. ﴿٤﴾ گۆت: خودێوۆ ب ڕاستی
هەستییێ من [ژ پیراتی] یێ سست و خاڤ بووی،
و سەرێ منێ سپی بووی، خودێوۆ ئەز چوجا ژ
دوعاكرنا تە بێ هیڤی نەبوویمە، و چوجا هیڤیان ژ تە
نابڕم. ﴿٥﴾ [خودێوۆ] ب ڕاستی ئەز ژ مرۆڤێت خۆ
یێت خوینێ [پسمام و كەس و كارێت خۆ] دترسم،
[كو پشتی من ب دورستی ب كارێ ڤی دینی نەرابن،
و ئەمانەتی نەپارێزن و ب دنیایێڤە مژویل ببن، و ڤی
دینی بەرزە بكەن] و [تو دزانی] كابانییا [ژنا] من ژی بچویك نابن، ڤێجا تو ژ دەڤ خۆ [ژ كەرەما خۆ]
كوڕەكی بدە من. ﴿٦﴾ دا ببیتە وێرسێ من و وێرسێ بنەمالا یەعقووبی [وێرسییا زانین و پێغەمبەراتییێ نەیا
مالی]، و خودێوۆ بكە ژ وان ئەوێت تو ژێ ڕازی. ﴿٧﴾ هەی زەكەریا ب ڕاستی ئەم مزگینییا كوڕەكی ددەینە
تە، ناڤێ وی یەحیایە، مە بەری نوكە كەس ب ڤی ناڤی ب ناڤ نەكریە. ﴿٨﴾ [زەكەرییایی] گۆت: خودێوۆ
چاوا دێ من كوڕەك هەبیت؟ و ژنا من بچویك نابن، و ئەز ب خۆ ژی هندێ پیربوویم، ئەزێ كەڤتیم.
﴿٩﴾ [خودێ] گۆت: هۆسا خودایێ تە حەزكرییە، و گۆت: ئەڤە ل بەر من یا ب ساناهییە، و بەری وی
من، تو ب خۆ ژی یێ چێكری و تو چو نەبووی. ﴿١٠﴾ [زەكەرییایی] گۆت: خودێوۆ، نیشانەكێ بدە من
[ئەز پێ بزانم كابانییا من یا گرانە]، [خودێ] گۆت: نیشانا تە ئەڤەیە تو نەشێی سێ شەڤ و ڕۆژان، و تو
یێ دورست، د گەل خەلكی باخڤی. ﴿١١﴾ ئینا ل سەر میحرابێ بەرانبەری ملەتێ خۆ ڕاوەستیا [نەشیا د گەل
وان باخڤیت]، ڤێجا ب ئیشارەتان گۆتە وان سپێدە و ئێڤاران خودایێ خۆ ژ كێماسییان پاقژ بكەن.

يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ١٢
وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةٗۖ وَكَانَ تَقِيّٗا ١٣ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَيۡهِ وَلَمۡ
يَكُن جَبَّارًا عَصِيّٗا ١٤ وَسَلَٰمٌ عَلَيۡهِ يَوۡمَ وُلِدَ وَيَوۡمَ يَمُوتُ
وَيَوۡمَ يُبۡعَثُ حَيّٗا ١٥ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ
مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا ١٦ فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا
فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا ١٧ قَالَتۡ إِنِّيٓ
أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ١٨ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ
رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا ١٩ قَالَتۡ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي
غُلَٰمٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا ٢٠ قَالَ كَذَٰلِكِ
قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞۖ وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ وَرَحۡمَةٗ
مِّنَّاۚ وَكَانَ أَمۡرٗا مَّقۡضِيّٗا ٢١ ۞ فَحَمَلَتۡهُ فَٱنتَبَذَتۡ بِهِۦ
مَكَانٗا قَصِيّٗا ٢٢ فَأَجَآءَهَا ٱلۡمَخَاضُ إِلَىٰ جِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ
قَالَتۡ يَٰلَيۡتَنِي مِتُّ قَبۡلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسۡيٗا مَّنسِيّٗا ٢٣
فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ أَلَّا تَحۡزَنِي قَدۡ جَعَلَ رَبُّكِ تَحۡتَكِ سَرِيّٗا ٢٤
وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ٢٥

نصف الحزب ٣١





﴿١٢﴾ هەی یەحیا ڤێ كتێبێ [كو تەوراتە] ب هێز و رژد وەربگرە و حوكمی پێ بكە، و هەر ژ بچویكاتی مە عەقل و تێگەهشتنا تەوراتێ دابوویێ. ﴿١٣﴾ و مە ژ دەڤ خۆ دلۆڤانی پێ بربوو، و دابوویێ [كو یێ دلۆڤان بیت بۆ دەیبابێت خۆ و خەلكی]، و مە ئەو پاقژ و پیرۆزكر، و ئەو ب خۆ ژی یێ پارێزكار بوو. ﴿١٤﴾ و یێ باش بوو بۆ دەیبابێت خۆ، و خۆ مەزن نەدكر و یێ نەگوهدار نەبوو. ﴿١٥﴾ و سلاڤ ل سەر بن رۆژا بووی، و رۆژا دمریت، و رۆژا پشتی مرنێ زێندی دبیتەڤە. ﴿١٦﴾ [هەی موحەمەد] تو د ڤێ قورئانێدا بەحسێ مەریەمێ بكە، دەمێ خۆ ژ مرۆڤێت خۆ ڤەدەركری، و رۆژهەلاتا مزگەفتێ [قودسێ] بۆ خۆ كریە جهـ [دا عیبادەتێ تێدا بكەت]. ﴿١٧﴾ ڤێجا وێ پەردەیەك ئێخستە د ناڤبەرا خۆ و واندا، مە جبریل هنارتە دەڤ، و خۆ بۆ ئینا سەر رەنگێ مرۆڤەكێ دورست. ﴿١٨﴾ [ئینا مەریەمێ گۆت] ئەز خۆ ب خودێ ژ تە دپارێزم، ئەگەر تو ئەو بی یێ ژ خودێ بترسی [نێزیكی من نەبە].

﴿١٩﴾ [جبریلی] گۆت: ب راستی ئەز بەس هنارتییێ خودایێ تەمە [ئەز یێ هنارتیم] دا كورەكێ پاك و پاقژ بدەمە تە. ﴿٢٠﴾ [مەریەمێ] گۆت: چاوا دێ من كورەك بیت، و هەتا نوكە كەسێ دەستێ خۆ نەكریە من [كەس نێزیكی من نەبوویە]، و ئەز ب خۆ ژی نەیا دەهمەن پیس؟! ﴿٢١﴾ گۆت: هۆسا خودایێ تە حەزكریە [تە بچویك هەبیت بێی شوی بكەی و بێی كەس دەستێ خۆ بكەتە تە]، و گۆت: ئەڤە ل بەر خودایێ تە تشتەكێ ب ساناهییە [ئەم هۆسا دێ وی دەین]، دا بكەینە نیشانەك [ل سەر شیان و دەستهەلاتداریا خۆ] بۆ مرۆڤان، و دا بكەینە دلۆڤانییەك ژ مە [هەر بۆ مرۆڤان]، و ئەڤ تشتە خودێ حەزكربوو، و دا هەر ئێت. ﴿٢٢﴾ ڤێجا [مەریەم] ب حال كەڤت، ڤێجا ژ بەر هندێ چۆ جهەكێ دویر. ﴿٢٣﴾ ڤێجا ژانێت بچویكبوونێ، بەرێ وێ دا قورمێ دارقەسپێ [هەروەكی دڤیا خۆ ب تشتەكیڤە بگریت] و گۆت: خۆزی ئەز بەری ڤێ مربامە، و تشتەكێ بێ قیمەت و هاڤێتی بامە و هاتبامە ژ بیركرن [نەكو ئەڤە ب سەرێ من هاتبایە]. ﴿٢٤﴾ ڤێجا [وەختێ ئەڤ ئاخڤتنە گۆتی و هۆسا ب خەم كەڤتی] [جبریلی یان عیسای] د بنڤە گازی كرێ، خەمێ نەخۆ، خودایێ تە جۆكەكا ئاڤێ یا ئێخستییە بن تە. ﴿٢٥﴾ و قورمێ دارقەسپێ ب نك خۆڤە بهەژینە، (رطەب)ێت تەر و گەهشتی دێ ب سەر تەدا وەریێن [و دا بزانیت خودێ كەرەما د گەل كری و خەمێت وێ سڤك ببن كانییا ئاڤێ ل دەڤ دەرئێخست و جۆك ژێ دچۆ، و قورمێ دارا هشك شینكر و ئینا بەری، و ب هەژیانا وێ و ئەو ب خۆ یا لاواز، (رطەب) ژێ وەراندن].

فَكُلِي وَٱشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًاۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِيٓ
إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا ﴿٢٦﴾ فَأَتَتْ
بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥۖ قَالُوا۟ يَٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا فَرِيًّا ﴿٢٧﴾
يَٰٓأُخْتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ
أُمُّكِ بَغِيًّا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِۖ قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي
ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي
نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ
وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي
جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ
وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴿٣٣﴾ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَۖ قَوْلَ ٱلْحَقِّ
ٱلَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍۖ سُبْحَٰنَهُۥٓۚ
إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ
فَٱعْبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٣٦﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ
بَيْنِهِمْۖ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٣٧﴾ أَسْمِعْ بِهِمْ
وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلْيَوْمَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾





﴿٢٦﴾ ڤێجا [وان ڕوتەبان] بخۆ و [وێ ئاڤێ] ڤەخۆ، و چاڤێت تە بلا [ب وی بچویکی کو عیسایە] ڕۆن و گەش ببن، و بلا دلێ تە پێ خۆش ببیت، و ئەگەر تە مرۆڤەك دیت، بێژە: ب ڕاستی من بۆ خودایێ دلۆڤان نەزرا دایی، ئەز ژ خەلکی یا ب ڕۆژی بم و نەئاخڤم، ڤێجا ئەڤرۆ ئەز چو مرۆڤان نائاخێڤم.
﴿٢٧﴾ ڤێجا پاشی [مەریەمێ] بچویکێ خۆ هەلگرت، و ئینا دەڤ مرۆڤێت خۆ [ملەتێ وێ بەرسینگێ وێ گرت] و گۆتن: هەی مەریەم ب سویند تە تشتەکێ زێدە خراب و نەبوویی، یێ کری. ﴿٢٨﴾ هەی خویشکا هاروونی نە بابێ تە یێ خراب بوو، و نە دەیکا تە یا دەهمەن پیس بوو. ﴿٢٩﴾ ڤێجا [مەریەمێ] ئیشارەت کرە عیسایی، گۆتن: ئەم چاوا د گەل بچویکەکێ ساڤا د لاندکێدا باخڤین. ﴿٣٠﴾ [عیسایی] گۆت: ئەز بەندەیێ خودێمە، ئنجیلا دایییە من، و ئەز یێ کریمە پێغەمبەر [ئانکو خودێ یا بۆ من نڤێسی، ئنجیلێ بدەتە من و من بکەتە پێغەمبەر].
﴿٣١﴾ و ئەز یێ پیرۆزکریم ئەز ل کیڤە بم، و ئەمرێ من یێ ب نڤێژ و زەکاتێ کری، هندی ئەز یێ ساخ بم. ﴿٣٢﴾ [دیسا ئەمرێ من یێ کری] ئەز بۆ دەیکا خۆ یێ باش بم [و قەدرێ وێ بگرم]، و ئەز نەکریمە خۆمەزنکەر و نەگوهدار، و ئەز ژ ڕەحما خۆ بێ هیڤی نەکریمە. ﴿٣٣﴾ سلاڤ ل سەر من بن، ڕۆژا ئەز بوویم و ڕۆژا ئەز دمرم، و ڕۆژا پشتی مرنێ زێندی دبمەڤە. ﴿٣٤﴾ ئەڤەیە ڕاستییا عیسایێ کوڕێ مەریەمێ [نە ئەوا فەلە دبێژن]، و ئەوا ئەو تێدا ب گۆمان.
﴿٣٥﴾ نە شایی (لائقی) خودێیە کوڕەك هەبیت [وی پاکی ب کەسێ نینە]، ئەو [ژ ڤان گۆتنان] یێ پاقژە، ئەگەر کار و فەرمانەك ڤیا، دێ بێژیتێ هەبە دێ بیت. ﴿٣٦﴾ ب ڕاستی خودێ خودانێ من و هەوەیە، ڤێجا وی بپەرێسن، ئەڤەیە ڕێکا ڕاست. ﴿٣٧﴾ بەلێ پشتی عیسایی، دەستەك و کۆمێت [ئسرائیلیان] د ڕاستا ویدا، ژێك جودا بوون [هەر ئێکی تشتەك دگۆت، هندەکان کرە خودێ ب خۆ، و هندەکان کرە کوڕێ خودێ، و هندەکان کرە ئێك ژ سێ خودێیان، هندەکان دەیکا وی ب دەهمەن پیسییێ گونەهکار کر]، ڤێجا ئیزا و نەخۆشی بۆ وان بیت ئەوێت بێ باوەر ژ دیتنا ڕۆژەکا مەزن [کو ڕۆژا قیامەتێیە]. ﴿٣٨﴾ ڕۆژا دئێنە دەڤ مە [کو ڕۆژا قیامەتێیە] چەند باش گولێ دبن و چەند باش دبینن، بەلێ ستەمکار ئەڤرۆ [د ڤێ دنیایێدا] د بەرزەبوونەکا ئاشکەرادانە.

وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡحَسۡرَةِ إِذۡ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ وَهُمۡ
لَا يُؤۡمِنُونَ ٣٩ إِنَّا نَحۡنُ نَرِثُ ٱلۡأَرۡضَ وَمَنۡ عَلَيۡهَا وَإِلَيۡنَا يُرۡجَعُونَ ٤٠
وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ٤١ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ
يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا ٤٢
يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدۡ جَآءَنِي مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَمۡ يَأۡتِكَ فَٱتَّبِعۡنِيٓ أَهۡدِكَ صِرَٰطٗا
سَوِيّٗا ٤٣ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ
عَصِيّٗا ٤٤ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ
فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا ٤٥ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنۡ ءَالِهَتِي
يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ لَأَرۡجُمَنَّكَۖ وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا ٤٦ قَالَ
سَلَٰمٌ عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا ٤٧
وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدۡعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ
أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيّٗا ٤٨ فَلَمَّا ٱعۡتَزَلَهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن
دُونِ ٱللَّهِ وَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۖ وَكُلًّا جَعَلۡنَا نَبِيّٗا ٤٩
وَوَهَبۡنَا لَهُم مِّن رَّحۡمَتِنَا وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ لِسَانَ صِدۡقٍ عَلِيّٗا ٥٠
وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ٥١



﴿٣٩﴾ [هەی موحەمەد] تو وان ژ ڕۆژا کەسەرێ و
زێدەپەشێمانییێ بترسینە [ڕۆژا خراب ل سەر خرابیا
خۆ پەشێمان دبیت، و باش ل سەر کێمیا باشیا خۆ
پەشێمان دبیت]، ڕۆژا حسێب ب دویماهیك دئێت
[ڕۆژا بەحەشتی دچنە بەحەشتێ و دۆژەهی دچنە
دۆژەهێ]، و بەلێ ئەو [ژ ڤێ ڕۆژێ] د بێ ئاگەهن،
و باوەرییێ پێ نائینن. ﴿٤٠﴾ ب ڕاستی ئەم دێ بینە
وێرسێت ئەردی و هندی ل سەر ئەردی، [و ژ بلی
مە کەس نامینیت] و هەمی دێ ب بال مەڤە زڤڕن.
﴿٤١﴾ [هەی موحەمەد] تو د ڤێ قورئانێدا بەحسێ
سەرهاتیا ئیبراهیمی بکە، ب ڕاستی ئەو پێغەمبەرەکێ
زێدە ڕاستبێژ بوو [یان زێدە باوەری ب ئایەتێت
خودێ هەبوو]. ﴿٤٢﴾ دەمێ گۆتییە بابێ خۆ، بابۆ تو
بۆچی وی دپەرێسی، یێ نە گولێ دبیت و نە دبینیت،
و نەشێت تە ژ چو تشتی بێ منەت بکەت [ئانکو
نەشێت چو ژ تە بدەتە پاش]؟! ﴿٤٣﴾ بابۆ، ب ڕاستی
ئەو زانین یا بۆ من هاتی [کو وەحییە] بۆ تە نەهاتییە،
ڤێجا گوهێ خۆ بدە من و ل دویڤ من وەرە، ئەز دێ
بەرێ تە دەمە ڕێکەکا ڕاست یا بێ کێماسی. ﴿٤٤﴾ بابۆ گوهێ خۆ نەدە شەیتانی، و بوتان نەپەرێسە، ب
ڕاستی شەیتان ئەوە یێ نەگوهداریا خودایێ دلۆڤان کری. ﴿٤٥﴾ بابۆ ب ڕاستی ئەز دترسم ئیزایەك ژ نك
خودایێ دلۆڤان، تە بهنگێڤیت، ڤێجا ژ بەر هندێ ببییە هەڤال و تاگرێ شەیتانی. ﴿٤٦﴾ [بابێ وی گۆتێ]:
هەی ئیبراهیم ئەرێ تو بەرێ خۆ ژ پەرستییێت من وەردگێڕی؟! ئەگەر ئەڤا تو دبێژی تو نەهێلی، ئەز دێ تە
ب بەران کوژم، و وەختەکێ درێژ ژی من بهێلە. ﴿٤٧﴾ [ئیبراهیمی] گۆت: سلاڤ ل سەر تە بن [ب خاترا
تە]، ئەز دێ داخوازا لێنەگرتنێ بۆ تە ژ خودایێ خۆ کەم، خودایێ من زێدە خێر و کەرەم، یێت د گەل من
کرین، و زێدە چاڤدێریا من یا کری. ﴿٤٨﴾ و ئەز دێ خۆ ژ هەوە و یێت هوین ژ بلی خودێ دپەرێسن،
دویرئێخم و دەمە پاش، و ئەز دێ دوعایێ ژ خودایێ خۆ ب تنێ کەم [و وی ب تنێ پەرێسم]، هیڤی دکەم
ئەز ب گازیکرنا خودایێ خۆ بێ هیڤی نەبم. ﴿٤٩﴾ ڤێجا دەمێ ئیبراهیم، ئەو و ئەوێت وان ژ بلی خودێ
دپەرستن هێلایین، مە ئیسحاق [کوڕێ وی] و یەعقووب [نەڤییێ وی] دانێ، و مە هەمی ژێ کرنە پێغەمبەر.
﴿٥٠﴾ و مە ژ دلۆڤانیا خۆ خێرێت دنیایێ و ئاخرەتێ دانە وان، و مە ناڤێ وان ب قەنجی و سەرفەرازی د ناڤ
خەلکیدا هێلا [کو هەمی ئایین ب باشی بەحسێ وان دکەن]. ﴿٥١﴾ و د ڤێ قورئانێدا بەحسێ مووسایی بکە،
ب ڕاستی ئەو یێ بژارە بوو، و ئەو ژ پێغەمبەرێت مەزن بوو.

وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ﴿٥٢﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن
رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ﴿٥٣﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ
صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ
وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا ﴿٥٥﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ
كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٦﴾ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ
ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ وَمِن
ذُرِّيَّةِ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنۡ هَدَيۡنَا وَٱجۡتَبَيۡنَآۚ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ
ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَبُكِيّٗا۩ ﴿٥٨﴾ ۞ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ
خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴿٥٩﴾
إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ
وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴿٦٠﴾ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ
بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا ﴿٦١﴾ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا
سَلَٰمٗاۖ وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿٦٢﴾ تِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِي
نُورِثُ مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيّٗا ﴿٦٣﴾ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمۡرِ رَبِّكَۖ لَهُۥ
مَا بَيۡنَ أَيۡدِينَا وَمَا خَلۡفَنَا وَمَا بَيۡنَ ذَٰلِكَۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّٗا ﴿٦٤﴾

سَجۡدَة — ثلاثة أرباع الحِزْب ٣١





﴿٥٢﴾ و مە ژ ڕەخێ ڕاستێ یێ چیایێ (طوور)
گازی کرێ، و مە نێزیکی خۆ کر [نێزیکیا پێك
و پایەیێ، نە نێزیکیا جهی] هەتا مە ئاخافتی، و
وی گول ئاخڤتنا مە بووی. ﴿٥٣﴾ و مە ژ دلۆڤانی و
کەرەما خۆ برایێ وی هاروون د گەل کرە پێغەمبەر.
﴿٥٤﴾ و د ڤێ قورئانێدا بەحسێ ئیسماعیل پێغەمبەر بکە،
ب ڕاستی ئەو یێ پەیمان ڕاست بوو و پێغەمبەر بوو.
﴿٥٥﴾ وی ئەمرێ مالا خۆ ب نڤێژکرن و زەکاتدانێ
دکر، و ئەو ب خۆ ژی ل دەڤ خودایێ خۆ جهێ
ڕازیبوونێ بوو. ﴿٥٦﴾ و تو د ڤێ قورئانێدا بەحسێ
ئدریس پێغەمبەر بکە، ب ڕاستی ئەو پێغەمبەرەکێ
زێدە ڕاستگۆ بوو. ﴿٥٧﴾ و مە ئەو هلدا جهەکێ
بلند. ﴿٥٨﴾ ئەڤە [پێغەمبەرێت بۆرین] ئەو پێغەمبەرن
ئەوێت خودێ کەرەما خۆ د گەل کری، ئەوێت ژ
دویندەها ئادەمی و ژ وان ئەوێت د گەل نووح پێغەمبەر
ڕاکرین [د گەمیێدا]، و ئەوێت ژ دویندەها ئیبراهیمی و
ژ دویندەها یەعقووبی و ژ وان ئەوێت مە ڕاستەڕێکرین
و هەلبژارتین، هەر وەختێ ئایەتێت خودایێ دلۆڤان ل
سەر وان دئێنە خواندن [ژ ترسا خودێ] دکەڤن و ب گریڤە دچنە سوجدەیێ. ﴿٥٩﴾ ڤێجا پشتی وان [باشان]
دویندەهەکا خراب هات، نڤێژ هێلان و ب دویڤ دلخوازیان کەڤتن، ڤێجا ئەو دێ نەخۆشی و ئێزایێ بینن.
﴿٦٠﴾ ژ بلی وان ئەوێت تۆبەکرین [ژ کریارێت خۆ پەشێمان بووین]، و باوەری ئینایین و کار و کریارێت
باش کرین، ڤێجا ئەڤە دێ چنە بەحەشتێ و چو ستەم ل وان نائێتەکرن [چو ژ خەلاتێ وان نائێتە کێمکرن].
﴿٦١﴾ ئەو بەحەشت بەحەشتێت ئاکنجیبوونێنە ئەوێت خودایێ دلۆڤان ژڤان پێ دایییە بەندەیێت خۆ، و وان
باوەری پێ ئینایی بێی ببینن، و ژڤانێ خودێ هەر دێ ب جە ئێت. ﴿٦٢﴾ د بەحەشتێدا وان گول ئاخڤتنا
پویچ و پەلاچ نابیت، ژ سلاڤێ پێڤەتر، و سپێدە و ئێڤاران [بەردەوام و بێ ڤەبرین] ڕزقێ وان دئێتە بەر
وان. ﴿٦٣﴾ ئەڤە ئەو بەحەشتە ئەوا ئەم دکەینە ڕزقێ وان بەندەیێت خۆ، ئەوێت پارێزکار. ﴿٦٤﴾ [وەختێ
جبریل ل پێغەمبەری گیرۆبووی و پێغەمبەر ژ بەر هندێ نەخۆش بووی، خودێ ئەمر دا جبریلی بێژیت]: و
ئەم ملیاکەت نائێینە خوارێ ئەگەر ب ئەمرێ خودایێ تە و ب دەستویریا وی نەبیت، هندی بەری مە و
هندی پشتی مە و هندی د ناڤبەرا هەردوویاندا، هەمی یێ خودێیە و ب ئەمرێ وییە، و خودایێ تە [چو ژ
کاروبارێت بەندەیان] ژ بیر ناکەت [ڤێجا تو ژ بیر نەکرییە].

رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ
هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا ﴿٦٥﴾ وَيَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوۡفَ
أُخۡرَجُ حَيًّا ﴿٦٦﴾ أَوَلَا يَذۡكُرُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ
وَلَمۡ يَكُ شَيۡـٔٗا ﴿٦٧﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَحۡشُرَنَّهُمۡ وَٱلشَّيَٰطِينَ ثُمَّ
لَنُحۡضِرَنَّهُمۡ حَوۡلَ جَهَنَّمَ جِثِيّٗا ﴿٦٨﴾ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ
شِيعَةٍ أَيُّهُمۡ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ عِتِيّٗا ﴿٦٩﴾ ثُمَّ لَنَحۡنُ أَعۡلَمُ بِٱلَّذِينَ
هُمۡ أَوۡلَىٰ بِهَا صِلِيّٗا ﴿٧٠﴾ وَإِن مِّنكُمۡ إِلَّا وَارِدُهَاۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ
حَتۡمٗا مَّقۡضِيّٗا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ
فِيهَا جِثِيّٗا ﴿٧٢﴾ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٖ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَيُّ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ خَيۡرٞ مَّقَامٗا وَأَحۡسَنُ نَدِيّٗا ﴿٧٣﴾
وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هُمۡ أَحۡسَنُ أَثَٰثٗا وَرِءۡيٗا ﴿٧٤﴾
قُلۡ مَن كَانَ فِي ٱلضَّلَٰلَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ مَدًّاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوۡاْ
مَا يُوعَدُونَ إِمَّا ٱلۡعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ فَسَيَعۡلَمُونَ مَنۡ هُوَ شَرّٞ
مَّكَانٗا وَأَضۡعَفُ جُندٗا ﴿٧٥﴾ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ هُدٗىۗ
وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٞ مَّرَدًّا ﴿٧٦﴾





﴿٦٥﴾ خودایێ ئەرد و ئەسمانان و [خودایێ] هندی د ناڤبەرا واندا [هەر ئەوە]، ڤێجا وی بپەرێسە، و خۆ ل سەر پەرستنا وی ڕابگرە، ئەرێ ما تو هەڤکویفەکی بۆ دبینی [ما ئێك هەیە هەڤبەرێ وی بیت؟!]. ﴿٦٦﴾ و مرۆڤ [یێ گاور] دبێژیت: ئەرێ ما ئەگەر ئەز مرم، جارەکا دی دێ زێندی بمەڤە. ﴿٦٧﴾ ئەرێ ما مرۆڤی بیر نائێت، مە بەری نوکە ئەو یێ دایی، و ئەو چو نەبوو. ﴿٦٨﴾ ب خودایێ تە کەم دێ وان و شەیتانان پێکڤە کۆمکەین، پاشی ئەم دێ وان ل سەر چۆکان ل دۆر دۆژەهێ خرکەین. ﴿٦٩﴾ پاشی ئەم دێ ژ هەر کۆمەکێ [ژ کۆمێت ل سەر خەلەتیێ پێکهاتین]، وی دەرئێخین یێ ژ هەمییان ب جورئەت و ب وێرتر ل سەر نەگوهداریا خودێ [کو سەروەر و سەرداریێت وانن د خرابییێدا، ئێك ئێکە دێ هاڤێژینە د ئاگریدا]. ﴿٧٠﴾ پاشی ئەم چێتر دزانین کا کی ژ وان هێژاترە ل پێشییێ باڤێژینە د دۆژەهێدا، و تامکەتە ئێزایا وێ. ﴿٧١﴾ و کەس ژ هەوە نینە د سەرڕا (د سەر دۆژەهێرا) نەچیت [خودان باوەر دێ د سەرڕا بۆرنە بەحەشتێ، و گاور دێ کەڤنە تێدا] ئەڤە فەرمانەکا ڤەبڕییە ژ خودایێ تە. ﴿٧٢﴾ پاشی ئەوێت پارێزکاریا خودێ کرین ئەم دێ وان ڕزگارکەین، و ئەم دێ ستەمکاران ل سەر چۆکان تێدا هێلین. ﴿٧٣﴾ و هەر دەمێ ئایەتێت مە یێت ڕۆن و ئاشکەرا بۆ وان (موشرکان) دهاتنە خواندن، ئەوێت گاوربوویین دگۆتنە ئەوێت باوەری ئینایین [گەلی خودان باوەران کا بەرێ خۆ بدەنێ]، ژ مە ڤان هەردو جوینان [خودان باوەرێت هەژار و گاورێت زەنگین]، جهێ کێ ژ مە چێترە، و دیوانا کێ ژ مە خۆشترە؟! ﴿٧٤﴾ و مە چەند ملەت بەری وان د هیلاك برینە، مال و ناڤمالیا وان ژ یا وان چێتر بوو، و سەر و خولکێ وان ژ یێ وان خۆشتر بوو. ﴿٧٥﴾ [هەی موحەمەد] بێژە [وان ئەوێت هزر دکەن ئەو چێترن و ئەو یێت ل سەر هەقییێ]: ژ مە و هەوە کا کی د تاریاتی و بەرزەبوونێدایە، بلا خودایێ دلۆڤان ل دویڤ بەردەت، و بهێلیتە د ئەوا ئەو تێدا، هەتا وێ دبینن یا خودێ ژڤان پێ دایی، ڤێجا یان ئێزایا ڤێ دنیایێ دێ بینن یان ژی ئێزایا ئاخرەتێ دێ بینن، نێ وێ ڕۆژێ دێ زانن کا جهێ کێ خرابترە و لەشکەرێ کێ لاوازترە؟ ﴿٧٦﴾ و ئەوێت ڕاستەڕێ بووین، خودێ ڕاستەڕێیا وان دێ پتر لێ کەت، و کار و کریارێت قەنج ئەوێت بۆ مرۆڤی ل دەڤ خودێ دمینن، ل دەڤ خودایێ تە ب خێرترن و دویماهیکا وان باشترە [ژ وان تشتان ئەوێت ئەو خۆ پێ مەزن دکەن ژ مال و مالداریێ].

أَفَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي كَفَرَ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالٗا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾
أَطَّلَعَ ٱلۡغَيۡبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحۡمَٰنِ عَهۡدٗا ﴿٧٨﴾ كَلَّاۚ
سَنَكۡتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلۡعَذَابِ مَدّٗا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ
مَا يَقُولُ وَيَأۡتِينَا فَرۡدٗا ﴿٨٠﴾ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةٗ
لِّيَكُونُواْ لَهُمۡ عِزّٗا ﴿٨١﴾ كَلَّاۚ سَيَكۡفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمۡ وَيَكُونُونَ
عَلَيۡهِمۡ ضِدًّا ﴿٨٢﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّآ أَرۡسَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ
تَؤُزُّهُمۡ أَزّٗا ﴿٨٣﴾ فَلَا تَعۡجَلۡ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمۡ عَدّٗا ﴿٨٤﴾
يَوۡمَ نَحۡشُرُ ٱلۡمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ وَفۡدٗا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ
إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرۡدٗا ﴿٨٦﴾ لَّا يَمۡلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ
ٱلرَّحۡمَٰنِ عَهۡدٗا ﴿٨٧﴾ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا ﴿٨٨﴾ لَّقَدۡ
جِئۡتُمۡ شَيۡـًٔا إِدّٗا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ
وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ وَتَخِرُّ ٱلۡجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوۡاْ لِلرَّحۡمَٰنِ وَلَدٗا ﴿٩١﴾
وَمَا يَنۢبَغِي لِلرَّحۡمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا ﴿٩٣﴾ لَّقَدۡ أَحۡصَىٰهُمۡ
وَعَدَّهُمۡ عَدّٗا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمۡ ءَاتِيهِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَرۡدًا ﴿٩٥﴾





﴿٧٧﴾ [هەی موحەمەد] ئەرێ تە دیت و بۆ تە بێژم
سەرهاتیا وی ئەوێ باوەری ب ئایەتێت مە نەئینایی
و ئینكار كرین [و باوەرنەكری جارەكا دی پشتی مرنێ
دێ ساخكەینەڤە]، و گۆت: [ڕۆژا ئەز ژ گۆڕێ ڕادبم و
زێندی دبمەڤە] دێ مال و عەیالەكێ زێدەتر بۆ من ئێتە
دان [ئەڤ ئایەتە د دەرهەقێ (وائیلێ كوڕێ عاسی)یدا
هاتیە خوارێ (خەببابێ كوڕێ ئەرتی) دەینەك ل سەر
بوو، دەینێ خۆ ژێ خواست، گۆتێ: هەتا تو خۆ بێ
باوەر نەكەی ژ موحەمەدی، ئەز دەینێ تە نادەمە تە،
ئینا گۆت: ب خودێ ئەز ژێ بێ باوەر نابم هەتا تو
نەمری و ساخ ببیەڤە، ئینا گۆت: دەمێ ڕادبمەڤە وەرە
دەڤ من، دێ دەینێ تە دەمە تە]. ﴿٧٨﴾ ئەرێ ئەو
ب سەر غەیبێ هلبوویییە، یان ژی سۆز و پەیمانەك
[ب ڤێ چەندێ] ژ خودێ وەگرتییە. ﴿٧٩﴾ نەخێر
وەسا نینە [بلا پاشڤە بچیت ڤێ ئاخڤتنێ نەكەت] ئەو
ئاخڤتنا ئەو دكەت ئەم دێ نڤێسین، و ئەم دێ ئیزایێ ل
سەر زێدە درێژكەین. ﴿٨٠﴾ و ئەوا ئەو دبێژیت [ژ مال
و عەیالی] ئەم دێ بینە وێرس [پشتی ئەم وی د هیلاك
دبەین]، و ئەو ب تنێ تەك زەلام دێ ئێتە دەڤ مە. ﴿٨١﴾ و ئەوان غەیری خودێ بۆ خۆ كرنە پەرستی، دا بۆ
وان ببنە هێز و پشتەڤانی. ﴿٨٢﴾ نەخێر وەسا نینە [بلا وێ هزرێ نەكەن]، پەرستییێت وان ڕۆژا قیامەتێ دێ
ئینكارا پەرستنا وان كەن، و دێ بۆ وان بنە دژ. ﴿٨٣﴾ ئەرێ ما تو نابینی، مە شەیتانێت سەردەستی گاوران
كرین، دا وان بزخینن و ب ئارینن و د بەر گونەهانڕا بكەن. ﴿٨٤﴾ ڤێجا تو [ل هیلاكا وان] یێ ب لەز نەبە،
ئەم ڕۆژێت وان [یان كریارێت وان] بۆ وان دهەژمێرین [ڕۆژ و كریارێت وان ل سەر وان ب حسێبن].
﴿٨٥﴾ ڕۆژا [قیامەتێ] ئەم پارێزكاران دەستەك دەستەك ل دەڤ خودایێ دلۆڤان [ب ڕێز و ڕویمەت] كۆم
دكەین. ﴿٨٦﴾ و ڕۆژا ئەم گونەهكاران ژی ب تنێ [وەكی حێشترا تێنی ئەوا قەستا ئاڤێ دكەت] دهاژۆینە
دۆژەهێ. ﴿٨٧﴾ [وێ ڕۆژێ] نە كەس مەهدەرێ دكەت و نە مەهدەر بۆ كەسێ دئێتەكرن، بۆ وی نەبیت یێ
خودایێ دلۆڤان پەیمان ب (لا إله إلا الله) دابیتێ. ﴿٨٨﴾ [و گاوران] گۆتن: خودایێ دلۆڤان زاڕۆكەكێ
بۆ خۆ دایی [و ئەڤە گۆتنا جوهی و فەلە و وان عەرەبانە ئەوێت دگۆتن: ملیاكەت كچێت خودێنە].
﴿٨٩﴾ ب سویند [گەلی موشركان] هەوە ئاخڤتنەكا زێدە كرێت و زێدە مەزن كریە. ﴿٩٠﴾ [ئاخڤتنا هەوە هند
یا مەزنە] وەختە ئەسمان ژ بەر تیك تیك ببن، و ئەرد بكەلشیت و كەركەر ببیت، و چیا ب سەرێكدا بهەڕفن.
﴿٩١﴾ چونكی هەوە زاڕۆك بۆ خودایێ دلۆڤان دانان. ﴿٩٢﴾ و نە شایی (لائقی) خودایێ دلۆڤانە زاڕۆكان
بۆ خۆ بدانیت. ﴿٩٣﴾ تشتەك نینە د ئەرد و ئەسماناندا ب بەندەیی نەئێتە دەڤ خودایێ دلۆڤان [ڤێجا خودێ
چ پاكی ب زاڕۆكان هەیە؟]. ﴿٩٤﴾ ب سویند [خودێ ئەو هەمی] ب حسێب یێت زەبت كرین، و هویر
هویر یێت هەژمارتین [كەس بەرزە نابیت و كەس گیرۆ نابیت، هەمی دێ ل بەر دەستێت وی بەرهەڤ بن].
﴿٩٥﴾ و ڕۆژا قیامەتێ هەمی كتكتە و ب تنێ، دێ ئێنە بەر دەستێ خودێ.

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ
ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا ﴿٩٦﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ
ٱلۡمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوۡمٗا لُّدّٗا ﴿٩٧﴾ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم
مِّن قَرۡنٍ هَلۡ تُحِسُّ مِنۡهُم مِّنۡ أَحَدٍ أَوۡ تَسۡمَعُ لَهُمۡ رِكۡزَۢا ﴿٩٨﴾

## سُورَةُ طه

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحزب ٣٢

طه ﴿١﴾ مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ ﴿٢﴾ إِلَّا تَذۡكِرَةٗ
لِّمَن يَخۡشَىٰ ﴿٣﴾ تَنزِيلٗا مِّمَّنۡ خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلۡعُلَى ﴿٤﴾
ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴿٥﴾ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي
ٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَمَا تَحۡتَ ٱلثَّرَىٰ ﴿٦﴾ وَإِن تَجۡهَرۡ بِٱلۡقَوۡلِ
فَإِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخۡفَى ﴿٧﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ
ٱلۡحُسۡنَىٰ ﴿٨﴾ وَهَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿٩﴾ إِذۡ رَءَا نَارٗا
فَقَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ
أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى ﴿١٠﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ ﴿١١﴾ إِنِّيٓ
أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ﴿١٢﴾





﴿٩٦﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ئینایین و کار و
کریارێت قەنج کرین، خودایێ دلۆڤان دێ وان
خۆشتڤی کەت [ئانکو حەژێکرنا وان دێ ئێخیتە د
دلێ مرۆڤاندا]. ﴿٩٧﴾ ڤێجا ب ڕاستی مە قورئان
ب زمانێ تە ب ساناهی هنارت، دا تو پێ مزگینییێ
بدەیە پارێزکاران، و دا تو ملەتەکێ جڕەبڕ زڤر و ڕەق
پێ بترسینی. ﴿٩٨﴾ و مە چەند ملەت بەری وان یێت
د هیلاك برین و ڤەبراندین، ئەرێ ما پێژنەکا ئێك ژ
وان دئێتە تە، یان ژی تو کپینا ئێك ژ وان گولێ دبی؟!
[هەمی بێ سەروشوین چۆن و نەمان، کا چاوا مە ئەو
بنبڕکرن، ئەم دشێین ڤان ژی وەسا بنبڕ بکەین].

## سۆرەتا طاها

### ل مەکەهێ هاتیيە خوارێ (١٣٥) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ [هۆسا دئێتە خواندن (طاها)، ئەڤە و هەمی
تیپێت دەستپێکا سۆرەتان ئیشارەتن ل سەر ئیعجازا
قورئانێ]. ﴿٢﴾ [هەی موحەمەد] مە قورئان ل سەر تە نەئینایییە خوارێ، دا تو بوەستی و زەحمەتێ ببەی
[ژ بەر زێدە خەمخوارنا تە ل سەر گاوری و نەباوەری ئینانا وان، و ڕاوەستیانا تە یا زێدە درێژ ل سەر
نڤێژێ]. ﴿٣﴾ [مە ئەڤ قورئانە نەئینایییە خوار] ژ بەر هندێ نەبیت دا ببیتە بیرئینان بۆ وان ئەوێت ژ
خودێ دترسن. ﴿٤﴾ [ئەڤ قورئانە] ژ نك وی یا هاتییە خوارێ، ئەوێ ئەرد و ئەسمانێت بلند چێکرین.
﴿٥﴾ خودایێ دلۆڤان ل سەر عەرشێ خۆ بلندبوو [بلندبوونەکا لائقی وی و یا بێ چاوایی]. ﴿٦﴾ و هندی د
ئەرد و ئەسماناندا و هندی د ناڤبەرا واندا، و هندی د بن ئەردی ژێڤە هەر یێ ویيە. ﴿٧﴾ و ئەگەر تو دەنگێ
خۆ [بۆ دوعایێ و زکری] بلند بکەی [یان ژی د دلێ خۆدا بێژی، ل دەڤ خودێ هەر ئێکە]، ب ڕاستی
خودێ نهێنییێ، و تشتێ ژێ ڤەشارتیتر و نەپەنیتر ژی دزانیت. ﴿٨﴾ خودێ ئێکە و ژ وی پێڤەتر چو خودایێت
دی نینن، و باشناڤ و ناڤێت گەلەپیرۆز هەر یێت وینە. ﴿٩﴾ ما سەرهاتییا مووسایی بۆ تە نەهاتییە؟!
﴿١٠﴾ دەمێ ئاگرەك [ژ دویرڤە] دیتی، ئینا گۆتە مالا خۆ: ل ڤێرێ بن، ب ڕاستی ئاگرەك ب بەرچاڤێ من
کەڤت [ئەز دێ چم بەرێ خۆ دەمێ] بەلکی ئەز بۆ هەوە بزۆتکەکی ژێ بینم، یان ئەز ڕێناسەکی ل دەڤ
ئاگری ببینم [ڕێکێ نیشا مە بدەت]. ﴿١١﴾ ڤێجا وەختێ هاتییە دەڤ [ئاگری]، گازییەك هاتێ: هەی
مووسا. ﴿١٢﴾ ب ڕاستی ئەز خودایێ تەمە، ڤێجا تو پێلاڤێت خۆ بێخە، تو یێ ل نهالا پیرۆز، (طووا)یێ.

وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ١٣ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠
فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ
أَكَادُ أُخۡفِيهَا لِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا تَسۡعَىٰ ١٥ فَلَا يَصُدَّنَّكَ
عَنۡهَا مَن لَّا يُؤۡمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرۡدَىٰ ١٦ وَمَا تِلۡكَ
بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ١٧ قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيۡهَا
وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخۡرَىٰ ١٨ قَالَ أَلۡقِهَا
يَٰمُوسَىٰ ١٩ فَأَلۡقَىٰهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٞ تَسۡعَىٰ ٢٠ قَالَ خُذۡهَا
وَلَا تَخَفۡۖ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلۡأُولَىٰ ٢١ وَٱضۡمُمۡ يَدَكَ
إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخۡرَىٰ ٢٢ لِنُرِيَكَ
مِنۡ ءَايَٰتِنَا ٱلۡكُبۡرَى ٢٣ ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ٢٤ قَالَ
رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ٢٥ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ٢٦ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن
لِّسَانِي ٢٧ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ٢٨ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ٢٩ هَٰرُونَ
أَخِي ٣٠ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ٣١ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ٣٢ كَيۡ نُسَبِّحَكَ
كَثِيرٗا ٣٣ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ٣٤ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا ٣٥ قَالَ قَدۡ
أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ٣٦ وَلَقَدۡ مَنَنَّا عَلَيۡكَ مَرَّةً أُخۡرَىٰٓ ٣٧



﴿١٣﴾ و من تو [بۆ پێغەمبەراتییێ] یێ هەلبژارتی،
ڤێجا تو گوهداریا وێ بکە یا ب وەحی بۆ تە دئێت.
﴿١٤﴾ ب ڕاستی ئەزم خودێ [ئانکو ئەڤێ گازی تە
دکەت، ئەوە خودێ]، و چو پەرستی ژ بلی من هێژایی
پەرستنێ نینن، ڤێجا من ب تنێ بپەرێسە و نڤێژێ
بکە، دا ئەز ل بیرا تە بم [یان ژی ل وەختێ بیرئینانا
من (کو نڤێژە) نڤێژێ بکە]. ﴿١٥﴾ ب ڕاستی قیامەت
دێ هەر ئێت، ئەز کەسێ پێ ناحەسینم [کا کەنگی
دێ ئێت، ڤێجا کەس نوزانیت کا کەنگێ دێ ئێت]،
دا هەر کەس ب کار و کریارێت دکەت، بێتە جزاکرن.
﴿١٦﴾ ڤێجا بلا ئەوێت باوەرییێ پێ [ب هاتنا
ڕۆژا قیامەتێ] نەئینن، و ب دویڤ دلخوازیا خۆ
کەڤتین، بەرێ تە ژێ وەرنەگێڕن [و تە ژ باوەریئینان
و خۆکارکرنێ بۆ وێ ڕۆژێ سارنەکەن]، ئەگەر
تو ژی دێ د هیلاك چی. ﴿١٧﴾ هەی مووسا ئەو
چیە د دەستێ تە یێ ڕاستێدا؟ [دا مووسا بزانیت
دارێ ویە، نە تشتەکێ دیە د دەستێ ویدا].
﴿١٨﴾ [مووسایی] گۆت: ئەو دارێ منە، ئەز ددەمە بەر
خۆ، و ئەز بەلگێت داران بۆ پەزێ خۆ پێ دوەرینم، و هندەك هەوجەییێت دی ژی من یێت پێ هەین.
﴿١٩﴾ [خودێ] گۆت: هەی مووسا وی داری [ژ دەستێ خۆ] باڤێژە. ﴿٢٠﴾ ڤێجا مووسایی [دار] هاڤێت،
هند دیت [ب قودرەتا خودێ] بوو مارەك، ب لەز و سڤك دچۆ. ﴿٢١﴾ [خودێ] گۆت: ڕاکە و نەترسە،
جارەکا دی ئەم دێ وەکی بەرێ زڤڕینینەڤە. ﴿٢٢﴾ و دەستێ خۆ ببە بن کەفشێ خۆ، دێ بێ نەساخی
و بێ ئێش، سپی و برسقی دەرکەڤیت [هەر چەندە دەستێت وی د ڕەش ئەسمەر بوون]، ئەڤە ژی
موعجیزەیەکا دیە [ژ بلی یا داری]. ﴿٢٣﴾ [ڤێ موعجیزەیێ ژی د گەل یا دی وەرگرە] دا ئەم هندەك
نیشان و موعجیزەیێت خۆ یێت مەزن نیشا تە بدەین [ل سەر دەستهەلاتداریا خۆ ل سەر هەمی تشتان].
﴿٢٤﴾ هەڕە دەڤ فیرعەونی، ب ڕاستی ئەو زێدە یێ د سەردا چۆیی. ﴿٢٥﴾ گۆت: خودێوۆ بێنا من فرەهـ بکە
[دا بشێم خۆ ل بەر بارێ پێغەمبەراتییێ بگرم، و سەبرێ ل سەر ئەزیەت و ئاخڤتنێت فیرعەونی و دەستەکا
وی بکێشم]. ﴿٢٦﴾ و کاروبارێ من، بۆ من ب ساناهی بێخە. ﴿٢٧﴾ و [خودێوۆ] گرێکەکا ئەزمانێ من ڤەکە.
﴿٢٨﴾ دا ئاخڤتنا من تێ بگەهن. ﴿٢٩﴾ و ئێکی ژ مالا من، بۆ من بکە پشتەڤان و هاریکار. ﴿٣٠﴾ و بلا ئەو
ژی هاروونێ برایێ من بیت. ﴿٣١﴾ پشتا من پێ قاییم بکە، و پێ ب هێز بێخە. ﴿٣٢﴾ و تو وی بکە هەڤال
و هەڤپشکێ من د پێغەمبەراتییێدا. ﴿٣٣﴾ دا ئەم پێکڤە و گەلەك، تە ژ کێم و کاسییان پاقژ بکەین. ﴿٣٤﴾ و دا
پێکڤە و گەلەك زکرێ تە بکەین، و تە ب دوعایێ و پەرستنێ بینینە بیرا خۆ. ﴿٣٥﴾ ب ڕاستی تە ئاگەهـ ژ مە
هەیە. ﴿٣٦﴾ [خودێ] گۆت: هەی مووسا یا تە دڤیا و تە دخواست، بۆ تە هات. ﴿٣٧﴾ ب سویند جارەکا
دی ژی مە کەرەم و نیعمەت د گەل تە کربوو [ڕۆژا مە تو ژ دەستێت فیرعەونی ڕزگارکری، دەمێ کوڕ د ناڤ
ئسرائیلییاندا بووبانە دکوشتن].

إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ
فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ۚ وَأَلْقَيْتُ
عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ
هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا
وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ۚ
فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾
وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِى ﴿٤١﴾ ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِى وَلَا
تَنِيَا فِى ذِكْرِى ﴿٤٢﴾ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا
لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ
عَلَيْنَآ أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَآ ۖ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾
فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ
وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ۖ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ ۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ
ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَآ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ
وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ
كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٥١﴾



﴿٣٨﴾ وەختێ [تو بووی] مە ئەو ئیلهام دا دەیكا تە، یا مە دایێ. ﴿٣٩﴾ [ئەو ئیلهام ژی ئەڤە بوو] كو ئەوی [كوركێ خۆ، مووسایی] بكە د سندۆقەكێدا، و باڤێژە د رویبارێ نیلیدا، دا ئاڤ وی بدەتە رەخەكی، ئێك دێ وی بەت دژمنێ منە ژی و دژمنێ وییە ژی، و من ژ دەڤ خۆ تو خۆشتڤی كربووی، دا د بن چاڤدێریا منڤە بێیە خودانكرن. ﴿٤٠﴾ وەختێ خویشكا تە ل دویڤ تە دهات، و دگۆتە مالا فیرعەونی [وەختێ بۆ تە ل داییەنەكێ دگەریان، پشتی تە شیرێ كەسێ نەخواری] ئەرێ ئەز وێ مالێ نیشا هەوە بدەم یا خودانی و سەرەگوهییێ ژێ بكەت [ئەوان گۆتە خویشكا تە: بەلێ، خویشكا تە ژی دەیكا تە نیشا وان دا]، ڤێجا جارەكا دی مە تو زڤراندییە دەڤ دەیكا تە، دا چاڤێت وێ ب تە رۆن ببن، و دا ب خەم نەكەڤیت [و پشتی تو مەزن بووی] وەختێ تە ئێك [ب خەلەتیڤە] كوشتی، ڤێجا مە تو ژ خەما وێ كوشتنێ رزگاركری، و مە تو ب بەر گەلەك بەلا و ئاتافان ئێخستی، بەلێ هەرگاڤ مە تو قورتال دكری. و چەند سالەكان تو مایییە د ناڤ خەلكێ مەدیەنێدا [بازێرێ شوعەیبی]، پاشی ل دویڤ وەختێ مە دانایی [كو ئەز دێ تێدا د گەل تە ئاخڤم و دێ تە كەمە پێغەمبەر] تو هاتی هەی مووسا. ﴿٤١﴾ و من تو ژێگرتی و هەلبژارتی بۆ وەحی و پێغەمبەراتییا خۆ. ﴿٤٢﴾ هەرە تو و برایێ خۆ، ب موعجیزەیێت منڤە، و سستییێ د بیرئینانا مندا نەكەن [دا بۆ هەوە ببیتە هاریكار د جهێنانا ئەركێ هەوەدا]. ﴿٤٣﴾ هەردو هەرنە دەڤ فیرعەونی، ب راستی ئەو زێدە یێ سەرداچۆیی. ﴿٤٤﴾ ڤێجا ب ئاخڤتنەكا نەرم د گەل باخڤن، بەلكی ل خۆ بزڤریت، و گوهێ خۆ بدەتە هەقییێ یان ژی [ژ هاتنا ئیزایا هوین ژێ دبێژن] بترسیت. ﴿٤٥﴾ [مووسا و هاروونی] گۆتن: خودێوۆ ئەم دترسین [دەرفەتێ نەدەتە مە ئەم د گەل باخڤین] لەزێ ل ئیزادانا مە بكەت، یان زێدەتر د سەردا بچیت [د دەرهەقێ تەدا وێ بێژیت یا نەلائیق و یا نەئێتە گۆتن، یان ژی مە هند بئێشینیت ژ هەمییێ ببەتە دەرێ]. ﴿٤٦﴾ [خودێ] گۆت: نەترسن ئەز یێ د گەل هەوە [هەمی تشتان]، گولێ دبم و دبینم [كا چ د ناڤبەرا هەوەدا دقەومیت]. ﴿٤٧﴾ ڤێجا هوین هەردو هەرنە دەڤ و بێژنێ: ب راستی ئەم هنارتییێت خودایێ تەینە، ئسرائیلییان د گەل مە بهنێرە [ژ وان ڤەبە، و ژ بن ئێخسیری و كۆلەتییێ دەربێخە] ئێدی وان ئیزا نەدە، و ب سویند مە نیشان و موعجیزەیێت ئاشكەرا ژ دەڤ خودایێ تە بۆ تە ئینایینە [كو بۆ مە ببنە نیشان و شاهد كو ئەم راست پێغەمبەرێت خودێینە]، و سلامەتی ژ ئیزایا خودێ، بۆ وییە یێ رێكا راست گرتی و باوەری ب خودێ ئینایی. ﴿٤٨﴾ ب راستی وەحی بۆ مە هاتییە، كو ئیزا و هیلاك [د دنیایێ و ئاخرەتێدا] بۆ وییە یێ ئایەت و پێغەمبەران درەو بدانن، و پشتا خۆ بدەنێ و باوەرییێ پێ نەئینن. ﴿٤٩﴾ [فیرعەونی] گۆت: خودایێ هەوە كییە، هەی مووسا؟ ﴿٥٠﴾ [مووسا یی] گۆت: خودایێ مە ئەوە یێ هەر تشتەكێ چێكری، ئەو داییێ [ژ رەنگ و وێنەیان] یێ ب كێر وی بهێت، پاشی هەمی راستەرێكرن [بۆ وێ ئارمانجێ یا ئەو بۆ هاتینە چێكرن]. ﴿٥١﴾ [فیرعەونی] گۆت: باشە پا حالێ ملەتێت بەرێ دێ چ بیت؟ [بۆچ نائێنە ساخكرن و حساب د گەل نائێتەكرن؟ ئەگەر ئەڤا هوین دبێژن یا راست بیت].

قَالَ عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٖۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ ٱلَّذِي
جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدٗا وَسَلَكَ لَكُمۡ فِيهَا سُبُلٗا وَأَنزَلَ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّن نَّبَاتٖ شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾ كُلُواْ
وَٱرۡعَوۡاْ أَنۡعَٰمَكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ ﴿٥٤﴾ ۞ مِنۡهَا
خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ ﴿٥٥﴾ وَلَقَدۡ
أَرَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ﴿٥٦﴾ قَالَ أَجِئۡتَنَا لِتُخۡرِجَنَا
مِنۡ أَرۡضِنَا بِسِحۡرِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٥٧﴾ فَلَنَأۡتِيَنَّكَ بِسِحۡرٖ مِّثۡلِهِۦ
فَٱجۡعَلۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكَ مَوۡعِدٗا لَّا نُخۡلِفُهُۥ نَحۡنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانٗا
سُوٗى ﴿٥٨﴾ قَالَ مَوۡعِدُكُمۡ يَوۡمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحۡشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحٗى ﴿٥٩﴾
فَتَوَلَّىٰ فِرۡعَوۡنُ فَجَمَعَ كَيۡدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴿٦٠﴾ قَالَ لَهُم
مُّوسَىٰ وَيۡلَكُمۡ لَا تَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا فَيُسۡحِتَكُم بِعَذَابٖۖ
وَقَدۡ خَابَ مَنِ ٱفۡتَرَىٰ ﴿٦١﴾ فَتَنَٰزَعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ وَأَسَرُّواْ
ٱلنَّجۡوَىٰ ﴿٦٢﴾ قَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخۡرِجَاكُم
مِّنۡ أَرۡضِكُم بِسِحۡرِهِمَا وَيَذۡهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلۡمُثۡلَىٰ ﴿٦٣﴾
فَأَجۡمِعُواْ كَيۡدَكُمۡ ثُمَّ ٱئۡتُواْ صَفّٗاۚ وَقَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡيَوۡمَ مَنِ ٱسۡتَعۡلَىٰ ﴿٦٤﴾

الحزب ٣٢



﴿٥٢﴾ [مووسایی] گۆت: زانینا كار و كریار و حالێ
وان ل دەڤ خودایێ من د دەپێ پارستیدا نڤێسییە،
خودایێ من د چو تشتاندا خەلەت نابیت، و چو ژ
بیر ناكەت. ﴿٥٣﴾ ئەوێ ئەرد بۆ هەوە خۆشكری و
دەشتكری [و بەرهەڤكری بۆ ژیانا هەوە]، و رێك بۆ
هەوە ئێخستینە تێدا، و باران ژ ئەسمانی (ژ ئەوران) بۆ
هەوە باراندین، ڤێجا مە هەمی رەنگ و جوینێت گل و
گیایی و شینكاتی، ئەوێت نەوەكی ئێك و ژێك جودا
[د فایدەیێ خۆدا و د رەنگێ خۆدا و د تاما خۆدا و د
بێنا خۆدا] پێ دەرئێخستن. ﴿٥٤﴾ ژێ بخۆن و تەرش
و كەوالێ خۆ لێ بچەرینن، و ب راستی ئەڤە نیشان
و ئایەتێت رۆنن بۆ ئاقلداران. ﴿٥٥﴾ مە هوین ییێت
ژ ئاخێ چێكرین و دێ هەوە زڤرینینەڤە تێدا [پشتی
هوین دمرن]، و جارەكا دی دێ هەوە ژێ دەرئێخینەڤە.
﴿٥٦﴾ ب سویند مە هەمی موعجیزەییێت خۆ [هەر
نەهـ] نیشا فیرعەونی دان [ئێخستنە بەرچاڤان]، بەلێ
هەمی درەو دانان، و رازی نەبوو باوەرییێ بینیت و
رێكا هەقییێ بگریت. ﴿٥٧﴾ [فیرعەونی] گۆت: هەی
مووسا ئەرێ تو بۆ مە هاتی، دا مە ب سێرەبەندییا خۆ ژ ئەردێ مە دەربێخی. ﴿٥٨﴾ ڤێجا [ژ بەر هندێ] ئەم
ژی دێ ب سێرەبەندییەكا وەكی یا تە ئێینە تە، ڤێجا ژڤانەكی بۆ مە و خۆ بدانە ل جهەكێ دەشت، كەس ژ
مە پشتا خۆ نەدەتە ڤی ژڤانی، نە ئەم، نە تو. ﴿٥٩﴾ [مووسایی] گۆت: ژڤانێ هەوە [كو ئەم و هوین تێدا
بگەهینە ئێك] بلا رۆژا جەژنێ [رۆژا خۆ خەملاندنێ] بیت [دا هەمی ئامادە ببن]، و خەلك تێشتەگەهێ
كۆم ببن. ﴿٦٠﴾ ڤێجا فیرعەونی پشتا خۆ دا مووسایی و چۆ، و هەمی فندوفێل و سێرەبەندێت خۆ كۆمكرن،
پاشی [رۆژا جەژنێ] هات. ﴿٦١﴾ مووسایی گۆتە وان، وەی ئیزا و نەخۆشی بۆ هەوە بیت، درەوان ب ناڤێ
خودێ نەكەن [نەبێژن موعجیزەییێت وی سحرن]، ئەگەر دێ هەوە ب ئیزایەكێ بنبركەت، و ب راستی ئەو
خوسارەت بوو، ئەوێ درەوان ب ناڤێ خودێ بكەت. ﴿٦٢﴾ [سێرەبەند، پشتی مووسا بۆ وان ئاخڤتی] ژێك
جودا بوون [هندەكان گۆت: ئەو ژی وەكی مە سێرەبەندە، و هندەكان گۆت: ئەڤە نە ئاخڤتنا سێرەبەندانە]،
و خۆ خلوەكرن و بوو پستەپستا وان. ﴿٦٣﴾ گۆتن: ئەڤە هەردو سێرەبەندن، دڤێن هەوە ب سێرەبەندییا خۆ
ژ ئەردێ هەوە دەربێخن، و دڤێن دینێ هەوە یێ ژ هەمییان چێتر نەهێلن. ﴿٦٤﴾ ڤێجا هێز و نەخشەییێت
خۆ كۆمكەنە سەرێك و كارێ خۆ باش بكەن، پاشی ئێك رێز [بۆ ژڤانی] وەرن، و ب سویند ئەڤرۆ ئەوێ
سەرفەرازە ئەوێ سەربكەڤیت.

قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَلۡقَىٰ ٦٥ قَالَ بَلۡ
أَلۡقُواْۖ فَإِذَا حِبَالُهُمۡ وَعِصِيُّهُمۡ يُخَيَّلُ إِلَيۡهِ مِن سِحۡرِهِمۡ أَنَّهَا
تَسۡعَىٰ ٦٦ فَأَوۡجَسَ فِي نَفۡسِهِۦ خِيفَةٗ مُّوسَىٰ ٦٧ قُلۡنَا لَا تَخَفۡ إِنَّكَ
أَنتَ ٱلۡأَعۡلَىٰ ٦٨ وَأَلۡقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلۡقَفۡ مَا صَنَعُوٓاْۖ إِنَّمَا صَنَعُواْ
كَيۡدُ سَٰحِرٖۖ وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيۡثُ أَتَىٰ ٦٩ فَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدٗا
قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ٧٠ قَالَ ءَامَنتُمۡ لَهُۥ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ
لَكُمۡۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِي عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحۡرَۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ
وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ وَلَتَعۡلَمُنَّ
أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابٗا وَأَبۡقَىٰ ٧١ قَالُواْ لَن نُّؤۡثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ
ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِي فَطَرَنَاۖ فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ إِنَّمَا تَقۡضِي هَٰذِهِ
ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ ٧٢ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغۡفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكۡرَهۡتَنَا
عَلَيۡهِ مِنَ ٱلسِّحۡرِۗ وَٱللَّهُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ٧٣ إِنَّهُۥ مَن يَأۡتِ رَبَّهُۥ مُجۡرِمٗا
فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ ٧٤ وَمَن يَأۡتِهِۦ مُؤۡمِنٗا قَدۡ
عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ ٧٥ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ
تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ٧٦



﴿٦٥﴾ [سێرەبەندان] گۆتن: هەی مووسا یان تو باڤێژە یان ئەم بەراهیکێ دێ هاڤێژین، [تە دڤێت دەستپێکێ تو دارێ خۆ باڤێژە، تە دڤێت ئەم دێ وەریسێت خۆ هاڤێژین؟]. ﴿٦٦﴾ [مووسایی] گۆت: نە هوین باڤێژن، ڤێجا وەختێ وان وەریس و دارێت خۆ هاڤێتین، ژ سێرەبەندییا وان وەسا هاتە بەر چاڤێت مووسایی کو یێت دلڤلڤن و دچن. ﴿٦٧﴾ ڤێجا [وەختێ مووسایی هۆسا دیتی] د دلێ خۆدا ترسیا. ﴿٦٨﴾ مە گۆتێ: نەترسە، سەرکەفتن هەر یا تەیە. ﴿٦٩﴾ و ئەو تشتێ د دەستێ تە یێ ڕاستێدا باڤێژە [کو دارێ تەیە]، دێ وەریس و دارێت وان داعویریت، و سێرەبەندییا وان دێ پویچ کەت، ب ڕاستی ئەڤا وان کری فندوفێلا سێرەبەندانە [و نەڕاستییە]، و سێرەبەند سەرفەراز نابن ل هەر جهەکێ هەبن. ﴿٧٠﴾ ڤێجا سێرەبەند داچەمیان و چۆنە سوجدەیێ [پشتی هەقی ئاشکەرا بووی و کارێ وان پویچ بووی]، و گۆتن: مە باوەری ب خودایێ هاروونی و مووسایی ئینا. ﴿٧١﴾ [فیرعەونی] گۆت: ئەرێ هەوە باوەری پێ ئینا بەری ئەز دەستویرییا هەوە بدەم؟ ب ڕاستی ئەو مەزنێ (مامۆستایێ) هەوەیە یێ سێرەبەندی نیشا هەوە دایی [فیرعەونی ب ڤێ ئاخفتنێ ڤیا ل بەر خەلکی بەرزەکەت، و وەسا دیارکەت کو ئەڤا مووسایی ژی کری هەر سحرە، و وی دزانی وان چو تشت ل دەڤ مووسایی وەرنەگرتییە، و مووسا ب خۆ ژی نە مەزن و سەیدایێ وانە]، ڤێجا ب سویند ئەز دێ دەست و پییێت هەوە چەپ و ڕاست ژێڤەکەم، پاشی ئەز دێ هەوە هەمییان ب قورمێت دارقەسپانڤە هەلاویسم [هەتا دمرن]، و هنگی هوین دێ زانن کا ئیزایا کێ ژ مە [یا من یان یا خودایێ مووسایی] دژوارتر و ب دۆمترە. ﴿٧٢﴾ گۆتن: قەد ئەم تە ب سەر وان نیشان و بەلگەییێت ئاشکەرا ئەویێت بۆ مە هاتین، و وی خودایێ ئەم چێکرین نائێخین و هەلنابژێرین، ڤێجا تو چ دکەی بکە [و بزانە] بەس تو دشێی د ڤێ دنیاییدا تشتەکی بکەی [تشتێ تە دڤێت تو بکەی بەس یێ ڤێ دنیاییێیە، و پشتی ڤێ ئەم دێ چینە دەڤ خودایێ خۆ، و تە چو دەستهەلات ل سەر مە نابیت]. ﴿٧٣﴾ ب ڕاستی مە باوەری ب خودایێ خۆ ئینا، دا ل گونەهێت مە [خەلەتییێت مە]، و گونەها سێرەبەندییێ ئەوا تە ب خورتی ب مە دایییە کرن ببۆریت و ژێ ببەت، و خەلاتێ خودێ چێترە، و جزایێ وی دژوارتر و ب دۆمترە. ﴿٧٤﴾ ب ڕاستی هەر کەسێ، گونەهکار ل سەر گاورییێ، بچیتە بەر دەستێ خودایێ خۆ دۆژەهـ بۆ وییە، نە تێدا دمریت [دا تەنا ببیت]، و نە زێندی دبیت [دا وەکی مرۆڤان بژیت]. ﴿٧٥﴾ و هەر کەسێ خودان باوەر و ب کار و کریارێت قەنجڤە ب بال [خودایێ خۆ] ڤە بزڤریت، ئەها ئەڤان پێك و پایەیێت بلند بۆ وانن. ﴿٧٦﴾ [ئەو پێك و پایە] بەحەشتێت ئاکنجیبوونێنە، ڕوبار د بنڕا دئێن و دچن، و ئەو [خودانێت پێك و پایەیان] هەروهەر دێ تێدا بن، و ئەڤە خەلاتێ وییە ئەوێ خۆ ژ گونەهان پاقژ دکەت و خۆ ژێ دویر دئێخیت.

وَلَقَدۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِي فَٱضۡرِبۡ لَهُمۡ طَرِيقٗا
فِي ٱلۡبَحۡرِ يَبَسٗا لَّا تَخَٰفُ دَرَكٗا وَلَا تَخۡشَىٰ ٧٧ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ
بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلۡيَمِّ مَا غَشِيَهُمۡ ٧٨ وَأَضَلَّ فِرۡعَوۡنُ قَوۡمَهُۥ
وَمَا هَدَىٰ ٧٩ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ قَدۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ عَدُوِّكُمۡ وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ
جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنَ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ ٨٠ كُلُواْ مِن
طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبِيۖ
وَمَن يَحۡلِلۡ عَلَيۡهِ غَضَبِي فَقَدۡ هَوَىٰ ٨١ وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ
نصف الحزب ٣٢ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ٨٢ ۞ وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن
قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ ٨٣ قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ
رَبِّ لِتَرۡضَىٰ ٨٤ قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ
ٱلسَّامِرِيُّ ٨٥ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗاۚ قَالَ
يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ
أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُم
مَّوۡعِدِي ٨٦ قَالُواْ مَآ أَخۡلَفۡنَا مَوۡعِدَكَ بِمَلۡكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلۡنَآ
أَوۡزَارٗا مِّن زِينَةِ ٱلۡقَوۡمِ فَقَذَفۡنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلۡقَى ٱلسَّامِرِيُّ ٨٧





﴿٧٧﴾ ب سویند مە وەحی بۆ مووسایی هنارت: ب
شەڤ بەندەییێت مە [ئسرائیلییان] ژ [مسرێ] دەربێخە،
و رێکەکا زوها ژ دەریایی بۆ وان بگرە [ئانکو دارێ خۆ
ل دەریایێ بدە، دا رێکەکا زوها بۆ وان ڤەبیت و تێرا
بچن]، نە هوین بترسن [فیرعەون و قولپا وی] بگەهنە
هەوە، و نە هوین ژ خەندقاندنێ بترسن. ﴿٧٨﴾ ڤێجا
فیرعەون ب لەشکەرێ خۆڤە ب دویڤ وان کەڤتن، و
د دەریاییدا ئەو ب سەرێ وان هات یا ب سەرێ وان
هاتی [دەریا ل وان هاتە ئێك و هەمی خەندقاندن].
﴿٧٩﴾ [ب ڤی کارێ خۆ] فیرعەونی ملەتێ خۆ گومڕا
و بەرزەکر، و بەرێ وان نەدا رێکا ڕاست. ﴿٨٠﴾ گەلی
ئسرائیلییان، ب ڕاستی مە هوین ژ دژمنێ هەوە رزگار
کرن، و مە ژڤان ل ڕەخێ ڕاستێ یێ چیایێ (طوور)،
دا هەوە [کو خودێ تەوراتێ بدەتە هەوە پشتی مووسا
حەفتێ ژ ئسرائیلییان بۆ وی ژڤانی هەلدبژێریت]، و مە
گەزۆ و سویسك [بالەفرەکە] بۆ هەوە ئینانە خوارێ.
﴿٨١﴾ ڤێجا ژ حەلالێ پاك و پاقژێ مە ب ڕزقێ هەوە
کری بخۆن، و پێ د سەردا نەچن، دا کەربا من هەوە
نەگریت، و هەر کەسێ کەربا من ژێ گرت، [ئەو] کەڤتە د ئاگریدا. ﴿٨٢﴾ ب ڕاستی ئەز، بۆ هەر کەسێ
تۆبە بکەت و باوەرییێ بینیت و کار و کریارێت قەنج بکەت، پاشی خۆ ل سەر ڤێ چەندێ ڕابگریت هەتا
دمریت، گونەهـ ژێبەرم. ﴿٨٣﴾ [پشتی ئسرائیلی ل دەشتا سینایێ ئاکنجیبوویین، مووسایی هاروون هێلا د
ناڤ واندا، و چۆ چیایێ (طوور) د گەل حەفتێ زەلامێت ژێگرتی، ل دویڤ ژڤانا خودێ دایی یێ کو
تەوراتێ بدەتێ، و مووسا هند یێ ب لەز بوو هەر حەفتێ هێلانە ل پشت خۆ، و د بەری وانڕا کر، و گۆتە
وان: د دویڤ منڕا وەرن]، هەی مووسا [ئەو] چ بوو تو ل ملەتی ب لەز ئێخستی [کو تو وان بهێلی و د
بەری وانڕا بکەی]. ﴿٨٤﴾ [مووسایی] گۆت: ئەو یێت د دویڤ منڕا دئێن، و من لەز کر، دا تو ژ من ڕازی
ببی. ﴿٨٥﴾ [خودێ] گۆت: ب ڕاستی پشتی تو هاتی، مە ملەتێ تە یێ جەرباندی، و سامری ئەو یێت د
سەردا برین. ﴿٨٦﴾ ئینا مووسا زێدە کەربگرتی و خەمگین زڤڕی ناڤ ملەتێ خۆ، و گۆت: ملەتێ من، ما
خودایێ هەوە پەیمانەکا قەنج نەدابوو هەوە [کو تەوراتێ بدەتە هەوە] ئەرێ ما وەختێ وێ [پەیمانێ] هند ل
هەوە درێژ بووبوو؟ [هوین ب ڤی کاری ڕابین] یان ژی هەوە دڤیا ب ڤێ کریارێ کەربەك ژ خودایێ هەوە
[ئیزایەك] هەوە بگریت، ڤێجا هەوە ئەو پەیمانا دایییە من [کو ل سەر ڤی دینی بمینن و چو خەلەتییان
نەکەن، هەتا ئەز دزڤڕمەڤە] شکاند و ب جهـ نەئینا. ﴿٨٧﴾ گۆتن: ب ڕاستی مە نە ب کەیفا خۆ پەیمانا تە
شکاندییە، بەلێ هندەك زێر و زینەتێت فیرعەونی ل دەڤ مە بوون، مە هاڤێتن [مە هاڤێتنە د ناڤ ئاگریدا دا ژ
گونەهێ ڕزگار ببین]، و هەروەسا سامری ژی کا چ د گەل بوو هاڤێت [و قالبێ گۆلکەکی د ئاخێدا چێکر، و
ئاگر تێدا هەلکر، و ئەو زێر هاڤێتە تێدا، هۆسا گۆلکەك ژ زێری چێکر].

فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٞ فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ
وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ ٨٨ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَلَّا يَرۡجِعُ إِلَيۡهِمۡ قَوۡلٗا
وَلَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا ٨٩ وَلَقَدۡ قَالَ لَهُمۡ هَٰرُونُ
مِن قَبۡلُ يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِي
وَأَطِيعُوٓاْ أَمۡرِي ٩٠ قَالُواْ لَن نَّبۡرَحَ عَلَيۡهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرۡجِعَ
إِلَيۡنَا مُوسَىٰ ٩١ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذۡ رَأَيۡتَهُمۡ ضَلُّوٓاْ ٩٢
أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ أَفَعَصَيۡتَ أَمۡرِي ٩٣ قَالَ يَبۡنَؤُمَّ لَا تَأۡخُذۡ بِلِحۡيَتِي
وَلَا بِرَأۡسِيٓۖ إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقۡتَ بَيۡنَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ
وَلَمۡ تَرۡقُبۡ قَوۡلِي ٩٤ قَالَ فَمَا خَطۡبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ٩٥ قَالَ
بَصُرۡتُ بِمَا لَمۡ يَبۡصُرُواْ بِهِۦ فَقَبَضۡتُ قَبۡضَةٗ مِّنۡ أَثَرِ
ٱلرَّسُولِ فَنَبَذۡتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتۡ لِي نَفۡسِي ٩٦ قَالَ
فَٱذۡهَبۡ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَۖ وَإِنَّ لَكَ
مَوۡعِدٗا لَّن تُخۡلَفَهُۥۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِي ظَلۡتَ عَلَيۡهِ
عَاكِفٗاۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِي ٱلۡيَمِّ نَسۡفًا ٩٧ إِنَّمَآ
إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَسِعَ كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمٗا ٩٨



﴿٨٨﴾ ڤێجا [سامری] بۆ وان [پەیکەرەکێ] لەشێ گۆلکەکێ بێ گیان چێکر، دەنگێ چێلێ هەبوو، ئینا گۆتن: ئەڤەیە خودایێ هەوە و خودایێ مووسایی، وی (مووسایی) یێ ژ بیرکری [کو خودایێ وی ئەڤەیە ل ڤێرێ، و یێ چۆیە چیایێ (طوور) لێ دگەڕیت]. ﴿٨٩﴾ ڤێجا ما ئەو نابینن [ئەو گۆلك] چو ئاخڤتنان ل وان نازڤرینیت و چو زیان و مفایی ل وان ناکەت؟ ﴿٩٠﴾ و ب سویند بەری مووسا بزڤریتەڤە، هاروونی ب خۆ ژی گۆتە وان: ملەتێ من، ب ڕاستی هوین ب ڤی گۆلکی یێت هاتینە جەڕباندن و یێ بۆ هەوە بوویە فتنە، و ب ڕاستی خودایێ هەوە، خودایێ دلۆڤانە، ڤێجا ل دویڤ من وەرن و گوهێ خۆ بدەنە من. ﴿٩١﴾ ئەوان گۆت: ئەم دێ هەر مینینە ل سەر پەرستنا گۆلکی، هەتا مووسا دزڤریتەڤە دەڤ مە. ﴿٩٢-٩٣﴾ [پشتی مووسا ژ ڤژانا خودێ داییێ زڤریەڤە، و هۆسا ملەتێ خۆ دیتی، گۆت:] هەی هاروون چ وەل تە کر، تو وەکی من نەکەی [وەکی من کەربێت تە ڤەنەبن]، و بەرێ وان ژ سەرداچۆنێ وەرنەگێڕی وەختێ تە دیتین د سەرداچۆن، ئەرێ تە فەرمانا من ب پشت گوهێ خۆڤە هاڤێت؟! ﴿٩٤﴾ [هاروونی] گۆت: هەی کوڕێ دەیکا من، سەر و ڕهێت من نەکێشە، ئەز دترسیام [ئەگەر من خورتییەك ل وان کربایە، و ژ کریارا وان کری دابانە پاش، نەیارەتی د ناڤبەرا واندا چێ ببایە، و ب ناڤ ئێك کەڤتبانە و]، تو بێژی تە ئسرائیلی ژێکڤەکرن، و تە خۆ ل هیڤیا من نەگرت [ژ بەر هندێ من هێلان هەتا تو بزڤری]. ﴿٩٥﴾ [مووسا ل سامری زڤری و] گۆتێ: هەی سامری تە بۆچی ئەڤە کر و ژ بەر چ ؟ ﴿٩٦﴾ [سامری] گۆت: من ئەو دیت یا وان نەدیتی [من دیت وەختێ جبرائیل هاتییە دەڤ تە و چۆیی]، ڤێجا من مستەکا ئاخێ ژ شوین پێ هەسپێ جبرائیلی ڕاکر، و هاڤێتە د ناڤ ئاگریدا [دگەل وی زێر و زینەتی]، و هۆسا نەفسا من ئەڤ کارە بۆ من خەملاند و جوان کر. ﴿٩٧﴾ [مووسایی] گۆت: هەرە ژ ناڤ مە دەرکەڤە، و جزایێ تە د ڤێ دنیایێدا [هندی تو تێدا بژی] ئەوە، نە تو دەستێ خۆ بکەیە کەسێ، و نە کەس دەستێ خۆ بکەتە تە [ئانکو نە تو بشێی تێکەلیا کەسێ بکەی، و نە کەس بشێت تێکەلیا تە بکەت]، و تە ژڤانەکێ هەی ڕۆژا قیامەتێ تو ژێ ناهێیە ڤەگرتن. و بەرێ خۆ بدە پەرستییێ خۆ ئەوێ تو مایییە ل سەر پەرستنا وی، ب سویند ئەم دێ سۆژین، پاشی خۆلیا وی دێ بەلاڤکەین، و هاڤێژینە د دەریایێدا. ﴿٩٨﴾ ب ڕاستی پەرستییێ هەوە، یێ ڕاست و دورست، بەس خودێیە و ژ بلی وی چو پەرستییێت ڕاست و دورست نینن، و زانینا وی هند یا بەرفرەهە هەمی تشتان ڤەدگریت.

كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ ۚ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا
ذِكْرًا ﴿٩٩﴾ مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا ﴿١٠٠﴾
خَٰلِدِينَ فِيهِ ۖ وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ حِمْلًا ﴿١٠١﴾ يَوْمَ يُنفَخُ
فِى ٱلصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَٰفَتُونَ
بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ
أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴿١٠٤﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ
فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾
لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ
لَهُۥ ۖ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴿١٠٨﴾
يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِىَ لَهُۥ
قَوْلًا ﴿١٠٩﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ
عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ۞ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ
ظُلْمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ
ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا ﴿١١٢﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا
فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٣٢



﴿٩٩﴾ و هۆسا ئەم سالۆخ و سەرهاتیییێت بۆری بۆ
تە ڤەدگێڕین، و مە ژ دەڤ خۆ قورئان یا دایییە تە.
﴿١٠٠﴾ ڤێجا هەر کەسێ بەرێ خۆ ژێ وەرگێڕیت
[و باوەرییێ پێ نەئینیت]، ب ڕاستی ئەو ڕۆژا قیامەتێ
دێ بارەکێ گران [ژ ئیزاییێ و گونەهێ] هەلگریت.
﴿١٠١﴾ هەروهەر دێ د بن ڤی باریڤە مینن، و چ پیسە
بارە ڕۆژا قیامەتێ وان هەی. ﴿١٠٢﴾ ڕۆژا پف ل بۆقێ
دئێتەکرن، و ئەم ستەمکار و گونەهکاران وێ ڕۆژێ
دێ چاڤشین و کۆرە کۆمکەین. ﴿١٠٣﴾ وێ ڕۆژێ دێ
پستەپستێ د ناڤبەرا خۆدا کەن [و دێ پسیارێ ژ ئێکدو
کەن، ئەرێ ئەم چەند د دنیایێدا ماینە]، ڤێجا د ناڤ
خۆدا دبێژن: ژ دەهـ ڕۆژەکان پێڤەتر ئەم نەماینە.
﴿١٠٤﴾ و ئەم ب ئەوا ئەو [د ناڤبەرا خۆدا پستەپستێ
ل سەر دکەن] دبێژن، ئاگەهدارتر و زاناترین، دەمێ
یێ ژ هەمییان هشیارتر دبێژیت: هوین ژ ڕۆژەکێ
پێڤەتر نەماینە. ﴿١٠٥﴾ و ئەو پسیارا چیایان ژ تە
دکەن [کا ڕۆژا قیامەتێ دێ چ لێ ئێن] بێژە: خودایێ
من دێ ژ بن کەت، پاشی دێ وەکی تۆزێ لێ کەت
و بەرەبا کەت [و دێ وەکی هرییا ژەنی لێ کەت]. ﴿١٠٦﴾ ڤێجا دێ ڕویت و ڕەوال کەت، و کەتە دەشت.
﴿١٠٧﴾ [وەسا دێ کەتە دەشت] تو خۆ کەند و کۆر و گرکەکی تێدا نابینی. ﴿١٠٨﴾ وێ ڕۆژێ [کو ڕۆژا
قیامەتییە] هەمی دێ ل دویڤ گازییا خودێ چن [بۆ مەیدانا حەشرێ]، و ب پشت گوهڤە هاڤێتن بۆ
[گازییێ] نینە [کو ل دویڤ گازییێ نەچن و چەپان ل خۆ بدەن]، و هەمی دەنگ بۆ خودایێ دلۆڤان
کەڕبوون، وێ ڕۆژێ ژ پستەپستێ پێڤەتر تو نابهیسی. ﴿١٠٩﴾ وێ ڕۆژێ مەهدەرا کەسێ فایدە ناکەت، ئەو
نەبیت یێ خودایێ دلۆڤان دەستویر داییێ، و ژ گۆتنا وی ڕازی [ب تنێ مەهدەرا وی فایدە دکەت].
﴿١١٠﴾ خودێ یێ ئاگەهدارە ژ وان کریاران ئەویێت وان کرین، و ئەویێت ئەو دێ کەن، و ئەو چوجا ب سەر
زانینا وی هەلنابن. ﴿١١١﴾ [و وێ ڕۆژێ] هەمی سەروچاڤ بۆ خودایێ هەروهەر مایی و ڕێبەر، [د هەمی
کار و کریارێت هەبوونێدا] شکەستن و سەرچەمیایی بوون، و ب ڕاستی ئەو خوسارەت بوو، ئەوێ شرك
و گاوری د گەل، و کری. ﴿١١٢﴾ و هەر کەسێ کار و کریارێت چاك بکەت، و ئەو ب خۆ ژی یێ خودان
باوەر بیت، ڤێجا ئەو، نە ژ ستەمەکێ دترسیت نە ژی ژ کێمکرنەکێ [ئانکو نە دترسیت گونەهێت وی بێنە
زێدەکرن، و نە ژی دترسیت خێرێت وی بێنە کێمکرن]. ﴿١١٣﴾ [کا مە چاوا کتێب بەری تە ب زمانێ وان
ملەتان هنارتینە، ئەویێت پێغەمبەر مە بۆ هنارتین]، و هۆسا ئەڤ قورئانە ژی مە بۆ تە ب زمانێ عەرەبی
هنارتییە، و مە د ڤێ قورئانێدا ب گەلە ڕەنگان نیشان و گەف [ب ئیزادانێ] بۆ وان ئینایینە، دا خۆ [ژ گونەهێ
و گاورییێ] بپارێزن، یان ژی دا پێڤەچۆنەکێ بۆ وان چێکەت.

فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۗ وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مِن قَبۡلِ أَن
يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥۖ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ﴿١١٤﴾ وَلَقَدۡ عَهِدۡنَآ
إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبۡلُ فَنَسِيَ وَلَمۡ نَجِدۡ لَهُۥ عَزۡمٗا ﴿١١٥﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا
لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾
فَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوّٞ لَّكَ وَلِزَوۡجِكَ فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا
مِنَ ٱلۡجَنَّةِ فَتَشۡقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ ﴿١١٨﴾
وَأَنَّكَ لَا تَظۡمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضۡحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ
ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ
لَّا يَبۡلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنۡهَا فَبَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا
يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾
ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا
جَمِيعَۢاۖ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى
فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنۡ أَعۡرَضَ
عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ
أَعۡمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ﴿١٢٥﴾



﴿١١٤﴾ ڤێجا خودایێ ڕاست و خوندکار [یێ
هەمی خوندکار هەوجەی وی]، یێ [ژ وێ شرك و
سالۆخەتێ موشرك ددەنێ] بلند و پاقژە، و لەزێ ل
[خواندنا] قورئانێ نەكە، هەتا وەحییا خودێ بۆ تە ب
دویماهیك نەئێت، و بێژە: خودێوۆ زانینا من زێدە بكە.
﴿١١٥﴾ و ب سویند بەری نوكە مە فەرمان ل ئادەمی
كربوو [كو ژ دارەكێ نەخۆت]، ڤێجا وی [قەویاتی
و فەرمانا مە] ژ بیركر، و مە سەبر و خۆڕاگرتن
[ژ نەخوارنا وێ دارێ] ل دەڤ نەدیت. ﴿١١٦﴾ و بێژە وان:
وەختێ مە گۆتییە ملیاكەتان سوجدەیێ بۆ ئادەمی
ببەن [سوجدەیا سلاڤ و ڕێزگرتنێ، نە سوجدەیا
پەرستنێ]، ئبلیس تێ نەبیت، یێت دی هەمی
[بۆ ئادەمی] چۆنە سوجدەیێ. ﴿١١٧﴾ ڤێجا مە گۆت:
هەی ئادەم، ب ڕاستی ئەڤە دژمنێ تە و ژنا تەیە، ڤێجا
[هشیار بن] هەوە ژ بەحەشتێ دەرنەئێخیت، ئەگەر دێ
زەحمەت و وەستیانێ بینی [ب ژیانا خۆ یا دنیایێڤە].
﴿١١٨﴾ تە ئەو بیت، نە تو تێدا [د بەحەشتێدا] برسی
ببی، و نە ژی تێدا ڕویس ببی. ﴿١١٩﴾ و نە تێدا تێنی
دبی، و نە ژی گەرما هەتاڤێ ل تە ددەت. ﴿١٢٠﴾ ڤێجا شەیتانی وەسواس و گۆمان ئێخستە دلێ وی [و د بەر
خەلەتییرا كر]، گۆت: هەی ئادەم ئەز دارا هەرمانێ و ملكێ بێ ڤەبرین، نیشا تە بدەم؟ ﴿١٢١﴾ [ڤێجا ب
فندوفێلێ خاپاندن و د بەر خەلەتییرا كرن] وان ژ وێ دارێ خوار [ئەو دارا خودێ نەهییا وان ژێ كری،
ڤێجا وەختێ خوارین] شەرمگەهها وان (عەورەتا وان) بۆ وان دیاربوو، و دەست هاڤێتنێ بەلگێت بەحەشتێ
ژێڤەكرن و دانانە سەر، و ئادەمی نەگوهدارییا خودایێ خۆ كر، ڤێجا نەگەهشتە ئارمانجا خۆ [یان ژی ژیانا
وی نەخۆش بوو، ب هاتنەخوارا وی بۆ دنیایێ]. ﴿١٢٢﴾ پاشی [ئادەم ژ كریارا خۆ پەشێمان بوو، و تۆبە كر
و] خودایێ وی ئەو بۆ پێغەمبەراتییێ هەلبژارت، و تۆبە ژێ قەبویل كر و ل سەر قایم كر. ﴿١٢٣﴾ [خودێ]
گۆت: هوین هەردو ژ بەحەشتێ داكەڤن [بۆ سەر ئەردی] هندەك ژ هەوە ل هندەكان نەیار و دژمن، و هەر
گاڤا ڕاستەڕێكرنەك ژ بەرێ منڤە بۆ هەوە هات [كو كتێبا خودێیە یان هنارتنا پێغەمبەرەكییە]، ڤێجا هەر
كەسێ ڕێكا ڕاستەڕێكرنا من بگریت، نە بەرزە دبیت و نە بەرهنگاری نەخۆشییێ دبیت. ﴿١٢٤﴾ و هەر
كەسێ ڕوییێ خۆ ژ من و كتێبا من [كو قورئانە] وەرگێڕیت [و باوەرییێ پێ نەئینیت]، ب ڕاستی د ڤێ
دنیایێدا بارا وی ژیانەكا تەنگ و تارییە، و ڕۆژا قیامەتێ ئەم دێ وی كۆرە كۆمكەین. ﴿١٢٥﴾ دێ بێژیت:
خودێوۆ بۆچی تە ئەز كۆرە ئینایییمە مەیدانا حەشرێ؟ و ئەز ب خۆ [د دنیایێدا] یێ ب چاڤ بووم.

قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ١٢٦
وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَنۡ أَسۡرَفَ وَلَمۡ يُؤۡمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦۚ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ
أَشَدُّ وَأَبۡقَىٰٓ ١٢٧ أَفَلَمۡ يَهۡدِ لَهُمۡ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ
يَمۡشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ ١٢٨
وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامٗا وَأَجَلٞ مُّسَمّٗى ١٢٩
فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ
وَقَبۡلَ غُرُوبِهَاۖ وَمِنۡ ءَانَآيِٕ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡ وَأَطۡرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ
تَرۡضَىٰ ١٣٠ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ زَهۡرَةَ
ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا لِنَفۡتِنَهُمۡ فِيهِۚ وَرِزۡقُ رَبِّكَ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰ ١٣١ وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ
بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَاۖ لَا نَسۡـَٔلُكَ رِزۡقٗاۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكَۗ وَٱلۡعَٰقِبَةُ
لِلتَّقۡوَىٰ ١٣٢ وَقَالُواْ لَوۡلَا يَأۡتِينَا بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّهِۦٓۚ أَوَلَمۡ تَأۡتِهِم
بَيِّنَةُ مَا فِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ ١٣٣ وَلَوۡ أَنَّآ أَهۡلَكۡنَٰهُم بِعَذَابٖ
مِّن قَبۡلِهِۦ لَقَالُواْ رَبَّنَا لَوۡلَآ أَرۡسَلۡتَ إِلَيۡنَا رَسُولٗا فَنَتَّبِعَ
ءَايَٰتِكَ مِن قَبۡلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخۡزَىٰ ١٣٤ قُلۡ كُلّٞ مُّتَرَبِّصٞ فَتَرَبَّصُواْۖ
فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ أَصۡحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِيِّ وَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ ١٣٥



﴿١٢٦﴾ [خودێ] گۆت: هۆسا نیشان و ئایەتێت
مە بۆ تە هاتن، و تە خۆ لێ کۆرە دکر، و تە ددانە
پشت خۆ، و ئەڤرۆ تو ژی وەسا دێ [د ئاگریدا]
ئێیە هێلان و ژ بیرکرن. ﴿١٢٧﴾ و هۆسا ئەم ئەوێت
زێدە د ناڤ گونەهێدا چۆین، و باوەری ب نیشان و
ئایەتێت خودایێ خۆ نەئینایین، جزا دکەین، و ئیزایا
ئاخرەتێ دژوارتر و بەردەوامترە. ﴿١٢٨﴾ ئەرێ ما ئەو
د بێ ئاگەهـ بوون، و خودێ بۆ وان دیارنەکربوو کا
مە چەند [ملەت] بەری وان د هیلاك بربوون؟ و ئەو
د ناڤ کاڤلەخانییێت وانرا دچن [و ب چاڤێ خۆ وان
کاڤلەخانییان دبینن]، ب راستی ئەڤە [شوینوارێت
ملەتێت د هیلاکچۆیی] ئایەت و نیشانن، بۆ مرۆڤێت
خودان ئەقل. ﴿١٢٩﴾ و ئەگەر پەیمانا پاشئێخستنا
ئیزادانا وان [بۆ رۆژا قیامەتێ] ژ خودایێ تە نەهاتبایە
دان، و ئەگەر وەختەکێ دیارکری [کو رۆژا قیامەتێیە
وان نەبایە، دا ئیزادانا وان یا پێدڤی بیت. ﴿١٣٠﴾ ڤێجا
سەبرا خۆ ل سەر ئەوا ئەو دبێژن بکێشە، و بەری
رۆژهەلاتنێ [نڤێژا سپێدێ] و بەری رۆژئاڤابوونێ
[نڤێژا ئێڤاری]، و هندەك ژ وەختێت شەڤێ [نڤێژا عەیشا]، و سەروبنێت رۆژێ [نڤێژا مەغرەب و نیڤرۆ]،
خودێ پاك و پاقژ بکە، و حەمدا وی بکە، دا بگەهییە وێ یا پێ رازی ببی. ﴿١٣١﴾ و تو چاڤێت خۆ نەبە
وان خۆشییان، ژ خەمل و جوانییا دنیایێ، ئەڤێت مە دایینە هندەك گاوران، دا وان پێ بجەرببینین، و رزقێ
خودایێ تە [کا چەند ژ دنیایێ دایییە تە، و ئەو خەلاتێ ئاخرەتێ ئەوێ دێ دەتە تە کو بەحەشتە] چێتر و
دۆمدرێژترە. ﴿١٣٢﴾ و فەرمانا مالا خۆ [ملەتێ خۆ] ب نڤێژێ بکە، و تو ژی ل سەر یێ بەردەوام بە، ئەم چو
رزقی ژ تە ناخوازین [کو تو رزقێ خۆ یان یێ مالا خۆ بدەی]، ئەم یێ رزقێ تە ددەین، و دویماهیکا ب
خێر یا پارێزکارانە. ﴿١٣٣﴾ و گۆتن: بلا وی موعجیزەیەك ژ دەڤ خودایێ خۆ بۆ مە ئینابایە [دا مە باوەر ژێ
کربایە]، ئەرێ ما مزگینییا هاتنا پێغەمبەری د کتێبێت بەری نوکەدا بۆ وان نەهاتبوو؟! ﴿١٣٤﴾ و ئەگەر مە ئەو،
بەری هاتنا پێغەمبەری و ئینانەخوارا قورئانێ، ب ئیزایەکێ د هیلاك بربانە، دا بێژن خودێوۆ بلا تە پێغەمبەرەك
بۆ مە هنارتبایە، دا ئەم ل دویڤ ئایەت و نیشانێت تە چۆباینە، بەری ئەم [ب ئیزایا دنیایێ] بێینە رسواکرن،
و [ب ئیزایا ئاخرەتێ] بێینە شەرمزارکرن. ﴿١٣٥﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: ئەم هەمی [ئەم و هوین] دچاڤەرێینە
[کا دویماهییا مە و هەوە دێ بیتە چ؟] ڤێجا هوین خۆ بگرن و بەرێ خۆ بدەنێ، دێ زانن کانێ کینە خودانێت
رێکا راست و یێت راستەرێ.. [کا ئەمین یان هوینن].

سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الجزء ١٧ الحزب ٣٣
ٱقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ ١
مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا ٱسْتَمَعُوهُ وَهُمْ
يَلْعَبُونَ ٢ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَى ٱلَّذِينَ
ظَلَمُوا۟ هَلْ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ أَفَتَأْتُونَ ٱلسِّحْرَ وَأَنتُمْ
تُبْصِرُونَ ٣ قَالَ رَبِّي يَعْلَمُ ٱلْقَوْلَ فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ
وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ٤ بَلْ قَالُوٓا۟ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍۭ بَلِ
ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ٥
مَآ ءَامَنَتْ قَبْلَهُم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ ٦
وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِمْ فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ
ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ٧ وَمَا جَعَلْنَٰهُمْ جَسَدًا
لَّا يَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَمَا كَانُوا۟ خَٰلِدِينَ ٨ ثُمَّ صَدَقْنَٰهُمُ
ٱلْوَعْدَ فَأَنجَيْنَٰهُمْ وَمَن نَّشَآءُ وَأَهْلَكْنَا ٱلْمُسْرِفِينَ ٩
لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَٰبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ١٠





## سۆرەتا ئەنبیاء

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (١١٢) ئایەتە

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ وەختێ حسێبا خەلكی [ل سەر كار و كریارێت وان كرین كو رۆژا قیامەتێیە] نێزیك بوو، و ئەو ب خۆ یێت د بێ ئاگەهییەكا تمامدا و [ب دنیایێ و دلخوازییێت دنیایێڤە] د مژویلن. ﴿٢﴾ و نینە چو یێ نوی ژ قورئانێ، ژ دەڤ خودایێ تە، بۆ وان نەئێت، و ئەو ب ترانەڤە گوهداریێ بۆ نەكەن. ﴿٣﴾ دلێت وان د مژویل و بێ ئاگەهن، و ئەوێت ستەمكار پستەپستێ د ناڤبەرا خۆدا دكەن، و دبێژن: ئەرێ ما موحەمەد ژی نە مرۆڤە وەكی هەوە؟ ڤێجا هوین چاوا ل دویڤ سحرێ دچن و هوین ب خۆ دبینن [كو سحرە]. ﴿٤﴾ [پێغەمبەری] گۆت: ب ڕاستی خودایێ من هەر گۆتنەكا د ئەرد و ئەسماناندا دئێتەكرن، ژێ ب ئاگەهە [ڤێجا چاوا پستەپستا هەوە دێ ل بەر بەرزەبیت]، و ئەو ب خۆ گوهدێر و زێدە زانایە [ئاگەه ژ هەمی گۆتن و پستەپستان هەیە، و چو ل بەر بەرزە نابیت]. ﴿٥﴾ و گۆتن [ئەڤا موحەمەد دبێژیت نەوەحییە]: تێكەلەخەون و خەونرۆژكن، و دبیت هەما ژ دەڤ خۆ [ئەڤ قورئانە] چێكربیت، و ژ درەو ب بال خودێڤە لێدابیت، و دبیت هەلبەستڤان بیت [و ئەگەر وەسا نینە] پا بلا وەكی وان پێغەمبەرێت بەری وی هاتینە هنارتن، موعجیزەیەكێ بۆ مە بینیت. ﴿٦﴾ خەلكێ چو ژ وان گوندان، ئەوێت بەری قورەیشییان مە د هیلاك برین، باوەری ب وان موعجیزەیان نەئینایییە، ئەوێت وان ژ پێغەمبەرێت خۆ خواستین، ڤێجا ئەو دێ باوەرییێ پێ ئینن؟ [ئەگەر ببینن، نە.. ئەو ببینن ژی باوەرییێ پێ نائینن]. ﴿٧﴾ و مە بەری تە چو پێغەمبەر نەهنارتینە، و وەحی بۆ هنارتبیت ئەگەر زەلام نەبن [ئانكو مرۆڤ بوون، نە ملیاكەت بوون]، ڤێجا ئەگەر هوین ڤێ نەزانن پسیارا زانا و خودان كتێبان بكەن [كا پێغەمبەر هاتییە، ئەگەر مرۆڤ نەبیت و زەلام نەبیت؟]. ﴿٨﴾ و مە ئەو پێغەمبەر نەكربوونە لەشەكێ وەسا، كو خوارنێ نەخۆن و مرن بۆ وان نەبیت [ئەو ژی وەكی هەر مرۆڤەكێ هەبیت دمرن]. ﴿٩﴾ پاشی ئەو پەیمانا مە دایییە وان [كو ئەم وان ڕزگار بكەین، و نەیارێت وان بەرئاتاف بكەین]، مە ب جە كر و ڕاست دەرئێخست، ڤێجا ئەو و ئەوێت مە بڤێن، مە ڕزگار كرن، و ئەوێت زێدە د گاوری و بەرزەبوونێدا چۆیین، مە بەرئاتاف كرن. ﴿١٠﴾ ب سویند [گەلی مرۆڤان] مە كتێبەك بۆ هەوە ئینایییە خوارێ، سەربلندییا هەوە یا تێدا، ئەرێ ما هوین تێ ناگەهن؟

وَكَمۡ قَصَمۡنَا مِن قَرۡيَةٖ كَانَتۡ ظَالِمَةٗ وَأَنشَأۡنَا بَعۡدَهَا قَوۡمًا
ءَاخَرِينَ ١١ فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأۡسَنَآ إِذَا هُم مِّنۡهَا يَرۡكُضُونَ ١٢
لَا تَرۡكُضُواْ وَٱرۡجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتۡرِفۡتُمۡ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ
تُسۡـَٔلُونَ ١٣ قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ١٤ فَمَا زَالَت تِّلۡكَ
دَعۡوَىٰهُمۡ حَتَّىٰ جَعَلۡنَٰهُمۡ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ١٥ وَمَا خَلَقۡنَا
ٱلسَّمَآءَ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا لَٰعِبِينَ ١٦ لَوۡ أَرَدۡنَآ أَن نَّتَّخِذَ
لَهۡوٗا لَّٱتَّخَذۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ١٧ بَلۡ نَقۡذِفُ بِٱلۡحَقِّ عَلَى
ٱلۡبَٰطِلِ فَيَدۡمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٞۚ وَلَكُمُ ٱلۡوَيۡلُ مِمَّا تَصِفُونَ ١٨
وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَنۡ عِندَهُۥ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ
عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسۡتَحۡسِرُونَ ١٩ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ
لَا يَفۡتُرُونَ ٢٠ أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ ءَالِهَةٗ مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ هُمۡ يُنشِرُونَ ٢١
لَوۡ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَاۚ فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ
عَمَّا يَصِفُونَ ٢٢ لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ٢٣ أَمِ ٱتَّخَذُواْ
مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡۖ هَٰذَا ذِكۡرُ مَن مَّعِيَ وَذِكۡرُ
مَن قَبۡلِيۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡحَقَّۖ فَهُم مُّعۡرِضُونَ ٢٤



﴿١١﴾ و خەلكێ گەلە گوندان ستەمكار بوون، مە
هەمی د هیلاك برن، و مە هندەك ملەتێت دی د
دویڤ وانرا ئینان. ﴿١٢﴾ ڤێجا وەختێ وان ئیزایا
مە دیتی و پێ حەسیایین، ل خۆ دان و ژێ رەڤین.
﴿١٣﴾ [ملیاكەت دێ بێژنێ] نەكەنە غار و نەرەڤن، و ل
وان نیعمەتان بزڤرن، ئەوێت هوین پێ بەتران بوویین،
و ل خانییێت خۆ بزڤرن، بەلكی پسیار ژ هەوە بێتەكرن
[كا ئەڤە چیە ب سەرێ هەوە هاتی، و كا دێ چاوا خۆ
ژێ پارێزن، هەر ژ لەكەڤە]. ﴿١٤﴾ گۆتن: وەی ئیزا و
نەخۆشی بۆ مە بیت، و خۆلی ب سەرێ مە وەربیت،
ب راستی ئەم د ستەمكار بوویین. ﴿١٥﴾ ڤێجا بێ
ڤەبرین، ئەڤە نفرینا وان بوو [وەی خۆلی ب سەرێ
مە وەربیت]، هەتا مە ئەو وەكی گیایێ دوری لێ
كرین و تەمراندین [بێ دەنگ كرین]. ﴿١٦﴾ و مە
ئەرد و ئەسمان و هندی د ناڤبەرا واندا هەی، بێ مفا
و ژ قەستا نەدایینە. ﴿١٧﴾ و ئەگەر مە ڤیابایە خۆ ب
تشتەكیڤە مژویل بكەین [وەكی كوری و ژنێ]، دا
تشتەكی ل دەڤ خۆ بۆ خۆ گرین [نە ئەوێت هوین
دبێژن]، ئەگەر ئەم ئەو باینە یێت مە وەكربایە. ﴿١٨﴾ [نە وەنینە وەكی ئەو دبێژن] بەلێ ئەم هەقی و
راستییێ ب سەر پویچییێ دئێخین، [هەقی و راستی] پویچییێ ناهێلیت و پویچ دكەت، ڤێجا پویچی
دچیت و نامینیت، و ئیزا و نەخۆشی بۆ هەوە بیت ژ بەر وان سالۆخەتێت هوین ب بال خودێڤە لێ ددەن.
﴿١٩﴾ و هندی د ئەرد و ئەسماناندا هەمی یێ خودێیە، و ئەوێت ل دەڤ ژی [ئانكو ملیاكەت] خۆ ل سەر پەرستنا
وی مەزن ناكەن، و قەت ناوەستن. ﴿٢٠﴾ شەڤ و رۆژان، خودێ ژ هەمی كێماسییان پاقژ دكەن، و سست نابن.
﴿٢١﴾ یان ژی وان هندەك پەرستی بۆ خۆ ل ئەردی گرتینە، ئەو [پەرستی] مرییان ساخ دكەن [ب روح
دئێخن]. ﴿٢٢﴾ و ئەگەر ژ بلی خودێ هندەك پەرستی د ئەرد و ئەسماناندا هەبانە، دا ئەرد و ئەسمان ب سەرێكدا
ئێن و وێران بن، ڤێجا پاك و پاقژی بۆ خودێ بن خودانێ عەرشی، ژ وێ سالۆخەتا ئەو ب بالڤە لێ ددەن.
﴿٢٣﴾ و پسیار ژێ نائێتەكرن كا چ دكەت، بەلێ پسیار ژ وان دێ ئێتەكرن [كا وان چ دكر چونكی ئەو بەندەنە
و بەندە ژی ژ كارێ خۆ یێ بەرپرسە]. ﴿٢٤﴾ ئەرێ وان هندەك پەرستییێت دی شوینا خودێ بۆ خۆ كرینە
خودێ؟ [هەی موحەمەد] بێژە وان: [ئەگەر راستە ئەو بوتێت هوین دپەرێسن خودێنە، وەكی هوین دبێژن]
بەلگە و نیشانا خۆ [ل سەر خوداتییا وان] بینن [و هوین نەشێن چونكی وەسا نینە] و ئەڤە، ئەو كتێبا بۆ من
هاتی و كتێبێت بەری من ژی هاتین [چو بەلگە و نیشان بۆ پشتەڤانییا هەوە تێدا نینن]، بەلكی باراپتر ژ
موشركان هەقییێ نوزانن، ڤێجا لەوا روییێ خۆ ژێ وەردگێرن و ژێ بێ ئاگەهن.

وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ
إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۚ
بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُۥ بِٱلْقَوْلِ وَهُم
بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ
وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾
ربع الحزب ٣٣ ۞ وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّىٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ
جَهَنَّمَ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟
أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا
مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ وَجَعَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ
رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَّعَلَّهُمْ
يَهْتَدُونَ ﴿٣١﴾ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ
ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ ﴿٣٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ
وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ
ٱلْخُلْدَ ۖ أَفَإِي۟ن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ
ٱلْمَوْتِ ۗ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً ۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾





﴿٢٥﴾ و مە چو پێغەمبەر بەری تە نەهنارتینە، ئەگەر مە وەحی بۆ نەهنارتبیت، و مە نە گۆتبیتێ چو پەرستییێت ڕاست و دورست ژ من پێڤەتر نینن، ڤێجا من ب تنێ بپەرێسن. ﴿٢٦﴾ و گۆتن: خودایێ دلۆڤان زارۆکێت بۆ خۆ چێکرین، و ئەو ب خۆ یێ پاك و پاقژە ژ ڤێ چەندێ، و [ئەوێت ئەو دکەنە زارۆك بۆ خودێ کو ملیاکەتن] بەندەییێت وی یێت ب ڕێز و ڕویمەتن. ﴿٢٧﴾ و ئەو [ملیاکەت] چو ئاخڤتنان ناکەن بەری ئاخڤتنا خودێ [هەتا خودێ نەبێژیت و فەرمانێ نەدەت، نائاخڤن]، و ئەو ب خۆ ل بەر ئەمرێ وی د ڕاوەستیاینە و بێ ئەمریا وی ناکەن. ﴿٢٨﴾ و خودێ دزانیت کا وان چ کرییە و کا دێ چ کەن [ئەو چو کار و گۆتنان بێی خودێ ناکەن]، و مەهدەرێ بۆ کەسێ ناکەن، بۆ وی نەبیت یێ خودێ پێ خۆش و بۆ بڤێت [ئەو ژی خودانێت خۆ و ڤێ گۆتنێنە (لا إله إلا الله)]، و ئەو [ملیاکەت] بەردەوام د ترسا خودێدانە. ﴿٢٩﴾ و هەر ئێکێ [ژ ملیاکەتان] بێژیت: ئەز پەرستیمە شوینا خودێ، ئەم دێ دۆژەهێ کەینە جزایێ وی، و هۆسا ئەم ستەمکاران جزا دکەین. ﴿٣٠﴾ ئەرێ ما ئەوێت گاوربووین، نەددیتن و هزرا خۆ ناکەن کو ب ڕاستی ئەرد و ئەسمان پێکڤەبوون، ڤێجا مە ژێکڤەکرن، و هەر تشتەکێ خودان ڕوح مە یێ ژ ئاڤێ چێکری، ئەرێ د گەل ڤێ ژی هێژ ئەو باوەرییێ نائینن؟! ﴿٣١﴾ و مە چیاییێت بنەجهـ ییێت ئێخستینە د ئەردیدا، دا نەئێت و نەچیت [ژ جهـ نەچیت]، و مە ڕێکێت فرەهـ ییێت ئێخستینە تێدا، دا ئەو ب سەر کاروبارێت خۆ هەلبن. ﴿٣٢﴾ و مە ئەسمان یێ کرییە بانەکێ پارستی [ژ کەڤتنێ]، و ئەو ژ نیشان و بەلگەییێت مە کرینە تێدا [وەکی ڕۆژێ و هەیڤێ و ستێران] بێ ئاگەهن. ﴿٣٣﴾ و خودێ ئەوە، یێ شەڤ و ڕۆژ، و ڕۆژ و هەیڤ دایین، و هەر ئێك د چەرخا خۆدا دچیت و دگەڕیت. ﴿٣٤﴾ و مە بۆ کەسێ بەری تە، نەمری [هەروهەر ساخی] نەداییە، ئەرێ ئەگەر تو مری ئەو نامرن؟ [ئەڤ ئایەتە د دەرهەقێ واندا هاتە خوارێ ئەوێت دگۆتن: ئەم دێ خۆ لێ گرین هەتا دمریت، و وان هزر نەدکر ئەو ژی دێ مرن].
﴿٣٥﴾ ب ڕاستی هەر نەفسەکا هەبیت دێ مریت، و ئەم هەوە ب قەنجی و خرابییان دجەڕبینین، و هەر هوین دێ ب بال مەڤە زڤڕن.

وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا
ٱلَّذِي يَذۡكُرُ ءَالِهَتَكُمۡ وَهُم بِذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَٰنِ هُمۡ
كَٰفِرُونَ ﴿٣٦﴾ خُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ مِنۡ عَجَلٖۚ سَأُوْرِيكُمۡ
ءَايَٰتِي فَلَا تَسۡتَعۡجِلُونِ ﴿٣٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ
إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ لَوۡ يَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ
لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمۡ وَلَا
هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾ بَلۡ تَأۡتِيهِم بَغۡتَةٗ فَتَبۡهَتُهُمۡ فَلَا
يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ
بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ
بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٤١﴾ قُلۡ مَن يَكۡلَؤُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ
مِنَ ٱلرَّحۡمَٰنِۚ بَلۡ هُمۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِم مُّعۡرِضُونَ ﴿٤٢﴾
أَمۡ لَهُمۡ ءَالِهَةٞ تَمۡنَعُهُم مِّن دُونِنَاۚ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَ
أَنفُسِهِمۡ وَلَا هُم مِّنَّا يُصۡحَبُونَ ﴿٤٣﴾ بَلۡ مَتَّعۡنَا هَٰٓؤُلَآءِ
وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۗ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَنَّا نَأۡتِي
ٱلۡأَرۡضَ نَنقُصُهَا مِنۡ أَطۡرَافِهَآۚ أَفَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾





﴿٣٦﴾ و وەختێ ئەوێت گاوربوویـــین تە دبینـن ترانەیان
ب تـە دکەن، و دبێژنـە ئێکدو: ئەڤەیە ب خرابی بەحسێ
بوتێـت هـەوە دکـەت؟ [و ئـەو پێغەمبـەری عەیبـدار
دبینـن، کو بەحسێ بوتێت وان ب خرابـی بکەت] و ئەو
ب خـۆ باوەریـیێ نائینـن کـو خودایـێ دلۆڤان یـێ بێ
هەڤـال و هەڤپشـکە، ڤێجـا هـەر وەختەکـێ بەحسێ تاك
و تەنیایـیـیا خودایـێ دلۆڤان هاتەکرن، پەسـەند ناکەن و
باوەریـیێ پـێ نائینـن. ﴿٣٧﴾ مرۆڤ یـێ ل سـەر لەزێ
هاتیـیە خۆرسـتکرن و چێکـرن [بەری وەختـی لەزێ ل
تشـتی دکەت]. [ئـەڤ ئایەتـە د دەرهەقێ قورەیشیـیاندا
هاتیـیە خـوارێ، وەختـێ وان لـەز ل وێ ئیزایـێ دکـر
ئـەوا پێغەمبـەری ژێ دگـۆت] نێزیـك ئـەز دێ نیشـان و
ئایەتێـت خـۆ نیشـا هـەوە دەم، ڤێجا لـەزێ ل مـن نەکەن
[کـو ئـەز بـەری وەختـێ دیارکـری بـۆ هـەوە بینـم].
﴿٣٨﴾ و دبێـژن: کا کەنگیـیە ئـەو ژڤان [هاتنا ئیزایـێ]،
ئەگـەر هویـن ڕاسـت دبێـژن. ﴿٣٩﴾ ئەگـەر ئەوێـت
گاوربوویـین زانیبانـە وەختـێ ئاگـر دۆماندۆرێـت
وان دگریـت، ل وان دئێتـە ئێـك، و نەشـێن ئاگـری ژ
سـەروچاڤ و پشـتێت خـۆ بدەنـە پـاش، و هاریـکاری و پشـتەڤانی ژی بـۆ وان نائێتەکـرن، وان لـەز ل ئیزایـی
نەدکـر. ﴿٤٠﴾ بەلـێ ئـەو ئیـزا دێ ژ نشـکەکێڤە بـۆ وان ئێـت، و دێ وان شـەپرزە و مەندەهـۆش کـەت [و نوزانن
کا چ بکـەن]، و نەشـێن پاشـڤەببەن و دەرفـەت ژی بـۆ وان نائێتـەدان کو ئـەو بۆ خۆ تۆبـە بکەن، و ل خـۆ بزڤڕن.
﴿٤١﴾ و ب سـویند ترانـە ب پێغەمبەرێـت بـەری تـە ژی یـێت هاتینەکـرن، ڤێجـا تشـتێ وان ترانـە پـێ دکـر، ب
سـەرێ وان هـات و ئـەو هنگاڤتـن. ﴿٤٢﴾ [هـەی موحەمەد] بێـژە: کیە هـەوە ب شـەڤ و ڕۆژ ژ ئیزایا خودایـێ
دلۆڤـان دپارێزیـت؟ بەلـێ ئـەو نـە ئەون بیننـە بیرا خـۆ کـو خودێیـە وان دپارێزیـت. ﴿٤٣﴾ یـان ژی وان ژ بلی مە
هنـدەك پەرستیـیێت دی هەنـە، وان ژ ئیزایـا مە ددەنە پاش؟! ئەو [پەرستیـیێت وان گرتین] نەشـێن هاریکاریـیا
خـۆ بکـەن [هەتـا هاریکاریـیا وان بکـەن]، و بەرەڤانیـیێ ژ وێ ئیزایـێ ناکـەن یـا ئـەم دئینینە سـەرێ وان [یان
هاریـکاری ژ مـە بـۆ وان نائێتـە دان]. ﴿٤٤﴾ و مە نیعمـەت د گەل وان و بـاب و باپیرێت وان کـرن، ژیەکێ درێژ د
خۆشـیاندا بۆراندیـن [ڤێجـا وان هـزر دکـر ئـەڤ نیعمەتە هـەر دێ مینن، و ئـەو هەر دێ د دنیایـێدا سـاخ مینن و
نامـرن، ڤێجـا د سـەرداچۆن]، ئـەرێ مـا ئەو نابینـن [و تێناگەهن] ئـەم ئەردێـت وان ژ هەمی ڕەخانڤـە کێم دکەین
[ب دەسـتێت موسـلمانانڤە دبەیـن، و ژ دەسـتێت وان دەردئێخـین]، یـان ژی مـا ئـەو نابینن ئـەم ئـەردێ دێم بەرە
بـەرە کێـم دکەیـن و بـەر ئاڤـێ دئێحـین، ڤێجا ئـەون یـێت سـەرکەڤتی [یـان ئەمین]؟!

قُلْ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلْوَحْيِ ۚ وَلَا يَسْمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا
مَا يُنذَرُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ
لَيَقُولُنَّ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ
ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ
مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾
وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٱلْفُرْقَانَ وَضِيَآءً وَذِكْرًا
لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ
مُشْفِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَهَٰذَا ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ أَنزَلْنَٰهُ ۚ أَفَأَنتُمْ لَهُۥ
نصف الحزب ٣٣ مُنكِرُونَ ﴿٥٠﴾ ۞ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا
بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ
أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ
لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا
بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾
وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾



﴿٤٥﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: ئەز ب تنێ ب وەحییێ
هەوە هشیار دکەم و پێ دترسینم، بەلێ یێ
کەڕ (نەبهیس) گول گازییێ نابیت دەمێ دئێتە
ئاگەهدارکرن [ئانکو گەلی موشرکان هوین وەکی
مرۆڤێت کەڕن، هوین چو فایدەیی ژ ڤێ هشیارکرنێ
نابینن]. ﴿٤٦﴾ و ئەگەر پیچەکا ئیزایا خودایێ تە
وان بگریت، دێ بێژن: وەی بۆ ئیزا و نەخۆشیا مە،
ب ڕاستی ئەم یێت ستەمکار بووین. ﴿٤٧﴾ و ئەم
تەرازوییێت ڕاست و دورست بۆ ڕۆژا قیامەتێ دێ
دانین، ڤێجا کەسێ کێمترین ستەم ژی لێ نائێتەکرن
[نە خێرێت وی کێم دبن، و نە ژی گونەهێت وی زێدە
دبن]، خۆ ئەگەر [خرابی یان باشیا وی] تەمەتی
دندکەکا تۆڤێ خەندەلکێ ژی بیت، ئەم دێ ئینین
[و بۆ کێشین]، ژ خۆ بۆ حسێب و هەژمارتنێ، ئەم
بەسی خۆینە. ﴿٤٨﴾ و ب سویند مە کتێبا جوداکەر
[د ناڤبەرا هەقی و نەهەقییێدا] و ڕاستەڕێکەر، و یا
ب بیرئین بۆ پارێزکاران، دا مووسایی و هاروونی.
﴿٤٩﴾ [پارێزکار ئەون] ئەوێت دەمێ ب تنێ [کو کەس
وان نەبینیت ژی] ژ خودایێ خۆ دترسن، و ئەو خۆ ژ ڕۆژا قیامەتێ ژی دترسن. ﴿٥٠﴾ و ئەڤ قورئانە شیرەت
و بیرئینانەکا پیرۆزە، مە ئینایییە خوارێ، ڤێجا چاوا هوین باوەر ناکەن یا ژ دەڤ خودێ هاتی [هەر چەندە
هوین دهەقینن، کو تەورات یا ژ دەڤ خودێ هاتی]. ﴿٥١﴾ ب سویند مە تێگەهشتن و ڕاستەڕێکرن هەر ژ
بچویکاتی دابوو ئیبراهیمی، و ب ڕاستی مە دزانی ئەو هێژایی دانا مەیە. ﴿٥٢﴾ وەختێ گۆتییە بابێ خۆ و
ملەتێ خۆ، ئەڤە چ بوت و پەیکەرن هوین پێڤەڕسیایین و دپەرێسن. ﴿٥٣﴾ گۆتن: ب ڕاستی مە ددیت باب
و باپیرێت مە ئەو دپەرستن [ئەم ژی ژ بەر ڤێ چەندێ وان دپەرێسین]. ﴿٥٤﴾ گوت: ب ڕاستی هوین ب
باب و باپیرێت خۆڤە یێت د بەرزەبوونەکا ئاشکەرادا. ﴿٥٥﴾ گۆتن: ئەرێ تە ڕاستی بۆ مە ئینایییە [ئانکو تو
یێ مجدی]، یان ژی تو ترانەیان بۆ خۆ ب مە دکەی. ﴿٥٦﴾ گۆت: [نەخێر ئەو نە خودایێت هەوەنە] بەلێ
خودایێ هەوە خودانێ ئەرد و ئەسمانانە، ئەوێ ئەرد و ئەسمان چێکرین، و ئەز ل سەر ڤێ چەندێ [کو خودا
خودایێ هەوەیە، و چێکەرێ ئەرد و ئەسمانانە] ژ شاهدامە. ﴿٥٧﴾ و سویند ب خودێ ئەز دێ بوتێت هەوە
شکێنم، پشتی هوین ژ دەڤ دچن.

فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾
قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٩﴾
قَالُوا۟ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ فَأْتُوا۟
بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوٓا۟ ءَأَنتَ
فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ
هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ
أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُوا۟
عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ
أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا
يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ
أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ
فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾
وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ
وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَوَهَبْنَا
لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً وَكُلًّا جَعَلْنَا صَٰلِحِينَ ﴿٧٢﴾





﴿٥٨﴾ ڤێجا [پشتی چۆیین] ئیبراهیمی هەمی
بوتێت وان پرت پرت کرن، یێ مەزن تێ نەبیت،
دا بۆ پسیارێ لێ بزڤرن [پسیار ژێ بکەن کا کێ
شکاندینە، و بزانن وان چو پێ چێ نابیت، یان ژی
دا بزڤرنە ئیبراهیمی، دا وی سەنەمی بۆ وان بکەتە
نیشان کو ئەو یێت خەلەتن]. ﴿٥٩﴾ [وەختێ زڤڕین
و هۆسا بوتێت خۆ شکاندی و پرت پرت کری
دیتین] گۆتن: کێ ئەڤە ب سەرێ پەرستییێت مە
ئینایە؟ کێ وەکربیت، ب ڕاستی ئەو ژ ستەمکارانە
[و دڤێت بێتە جزاکرن]. ﴿٦٠﴾ گۆتن: مە یا بهیستی،
لاوەکی ب خرابی بەحسێ وان دکر، دبێژنێ
ئیبراهیم. ﴿٦١﴾ گۆتن: کا وی بیننە پێش چاڤێت
خەلکی، دا ئەوێت دنیاسن شادەیییێ ل سەر بدەن.
﴿٦٢﴾ [وەختێ ئیبراهیم ئینایین] گۆتن: هەی ئیبراهیم
ئەرێ تە ئەڤە ب سەرێ پەرستییێت مە ئینایییە.
﴿٦٣﴾ [ئیبراهیمی] گۆت: [نە من وەنەکرییە] بەلکی
یێ ژ هەمیان مەزنتر یا وەکری، ڤێجا پسیارا وان
[بوتێت شکەستی] بکەن ئەگەر ئەو بن یێت باخڤن
[یان تێ بگەهن]. ﴿٦٤﴾ ڤێجا [ئەو بوتپەرست] ل خۆ زڤڕین [وان ب خۆ گۆتە ئێکدو پشتی بۆ وان
دیاربووی، ئەو بوتێت وان دپەرستن هندەك لەشێت هشکن، و وان ستەما ل خۆ کری وەختێ ئەو پەرستین
یێت نەشێن باخڤن]، و گۆتن: ب ڕاستی هوین یێت ستەمکارن [ئانکو ئەم یێت ستەمکارین وەختێ ئەم
ڤان دپەرێسین، نە ئەوێ ئەو شکاندین]. ﴿٦٥﴾ پاشی زڤڕینە سەر نەزانین و ڕکێنا خۆ، و گۆتن: نێ تو
ژی دزانی ئەڤ بوتە نائاخڤن. ﴿٦٦﴾ [ئیبراهیمی] گۆت: ڤێجا پا چاوا هوین وان شوینا خودێ دپەرێسن،
ئەوێت نە چو مفایی دگەهیننە هەوە و نە چو زیانێ. ﴿٦٧﴾ ئۆف بۆ هەوە و بۆ وان یێت هوین شوینا خودێ
دپەرێسن، ما هوین ئاقلەکی بۆ خۆ ناگرن [بزانن هوین یێت خەلەتن، وەختێ هوین وان دپەرێسن].
﴿٦٨﴾ [ڤێجا وەختێ چو نیشان و دەلیل د دەست واندا نەماین] گۆتن: ئیبراهیمی بسۆژن و پەرستییێت
خۆ ب سەربێخن، ئەگەر هەوە ل بەرە هوین تشتەکی ل ئیبراهیمی بکەن [هۆسا هوین دێ تۆلا بوتێت خۆ
ڤەکەن]. ﴿٦٩﴾ [پشتی وان ئیبراهیم هاڤێتییە ناڤ ئاگری] مە گۆتە [ئاگری] ئاگرۆ بۆ ئیبراهیمی سار ببە،
و بۆ وی ببە سلامەتی. ﴿٧٠﴾ و وان دڤیا ئیبراهیمی ب ئاگری بسۆژن، بەلێ مە ئەو خوسارەتر و زیانکارتر
لێ کرن. ﴿٧١﴾ و مە ئەو [ئیبراهیم] و (لووط) پێغەمبەر ژ وان قورتالکرن، و مە برنە ئەردێ مە بۆ خەلکی
پیرۆزکری، و تژی خێر و بەرەکەت کری. ﴿٧٢﴾ و [پشتی مە قورتالکری] مە ئیسحاق دایێ، و یەعقووب
ژی د سەرڕا زێدەیی دوعایا وی، مە دایێ، و مە ئەو هەمی [ئیبراهیم، (لووط)، ئیسحاق، یەعقووب] کرنە
خودانێت خێرێ و باشییێ.

وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ
ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا
عَٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ
ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ۗ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ
فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُ فِى رَحْمَتِنَآ ۖ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾
وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَنَجَّيْنَٰهُ
وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَنَصَرْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَوْمِ
ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ
أَجْمَعِينَ ﴿٧٧﴾ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ
إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾
فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَسَخَّرْنَا
مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ ۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾
وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ ۖ
فَهَلْ أَنتُمْ شَٰكِرُونَ ﴿٨٠﴾ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ
إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا ۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَىْءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾



﴿٧٣﴾ و مە ئەو كرنە پێشی، ب فەرمانا مە راستەرێكرنێ دكەن، و مە وەحی بۆ وان هنارت كو كارێت چاك بكەن، و نڤێژان بكەن، و زەكاتێ بدەن، و هەمیان ئەم دپەرستین. ﴿٧٤﴾ و (لووط) ژی مە كربوو پێشی، و مە پێغەمبەراتی و تێگەهشتن و زانین دابوویێ، و مە ئەو ژ وی گوندێ پویچاتی دكرن [كو زەلام تالۆقی زەلامی دبوو] رزگار كر، ب راستی ئەو ملەتەكێ خراب و ژ رێ دەركەفتی بوون. ﴿٧٥﴾ و مە ئەو [(لووط) پێغەمبەر] ئێخستە د ناڤ دلۆڤانیا خۆدا، ب راستی ئەو ژ قەنجان بوو. ﴿٧٦﴾ و بەری ڤان پێغەمبەران، نووحی ژی گازی خودایێ خۆ كر [كو ئەم وی رزگار بكەین و ملەتێ وی د هیلاك ببەین، پشتی بێ هیڤی بووی ئەو باوەرییێ بینن]، ڤێجا مە دوعایا وی قەبویل كر، و مە ئەو و مالا وی ژ تۆفانێ، و كۆڤانەكا مەزن رزگار كرن. ﴿٧٧﴾ و مە ئەو ژ وی ملەتێ نیشان و ئایەتێت مە درەو ددانان، پاراست و بەرەڤانی ژێ كر [كو نەشێن چو ئەزیەتێ بگەهیننێ]، ب راستی ئەو ملەتەكێ خراب بوون، ڤێجا ژ بەر هندێ مە ئەو هەمی [بچویك و مەزن] د ئاڤێدا خەندقاندن [چونكی یێت بەردەوام بوون ل سەر گونەهێ]. ﴿٧٨﴾ و بەحسێ داوود و سولەیمانی بكە وەختێ هەردووكان حوكم د دەرهەقێ زەڤیا چاندیدا كری، وەختێ پەزێ هندەكان ب شەڤ كەفتییە د ناڤدا [و پویچ كری] [و هەردووكان شریعەت د ناڤبەرا هەردو جویناندا دكر، خودانێت پەزی و یێت زەڤییێ]، و ئەم ل سەر حوكمێ هەردوكان شاهد بووین، و مە ئاگەهـ ژێ هەبوو [و داوودی گۆت: دڤێت خودانێ پەزی، پەزێ خۆ شوینا زیانا (زەرەرا) گەهشتییە زەڤیا چاندی، بدەتە خودانێ زەڤییێ]. ﴿٧٩﴾ و مە سولەیمان ب ڤی حوكمی تێگەهاند [و گۆت: دڤێت پەزی بدەینە ڤ خودانێ زەڤییێ، مفایی بۆ خۆ ژێ وەرگریت و زەڤییێ بدەینە ڤ خودانێ پەزی، و چاڤێ خۆ بدەتە زەڤییێ هەتا وەكی وێ شەڤێ لێ دكەت، ئەو شەڤا پەزێ وی كەفتییێ، پاشی ئەو [خودانێ پەزی] زەڤییێ بۆ بهێلیت و یێ دی ژی پەزێ وی بۆ بهێلیت، ئینا داوودی گۆت دێ حوكم ئەو بیت یێ تە گۆتی]، و مە پێغەمبەراتی و زانین و تێگەهشتن دابوونە هەردوكان، و مە چیا و تەیر و تەوال بۆ داوودی سەرنەرم كربوون، د گەل وی حەمد و تەسبیحا خودێ دكرن، و ئەم ڤان تشتان دشێین بكەین، و ئەم دكەین ژی. ﴿٨٠﴾ و مە چێكرنا زری و كومزریان نیشا داوودی دابوو، دا هەوە ژ چەكێ دژمنێ هەوە بپارێزیت، ئەرێ هوین سوپاسییا ڤان نیعمەتان دكەن؟ [ئانكو سوپاسییا ڤان نیعمەتان بكەن]. ﴿٨١﴾ و مە هورەبا بۆ سولەیمانی سەرنەرم كربوو، ب ئەمرێ وی بچیتە وی جهێ مە پیرۆز كری، و تژی خێر و بەرەكەت كری [كو ئەردێ شامێیە]، و ب راستی مە ئاگەهـ ژ هەمی تشتی هەبوو [ئانكو هەمی تشت ب زانین و ب ئەمرێ مە چێ دبوو].

وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعۡمَلُونَ عَمَلٗا دُونَ
ذَٰلِكَۖ وَكُنَّا لَهُمۡ حَٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾ ۞وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ
رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾
فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرّٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ
وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾
وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾
وَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ فِي رَحۡمَتِنَآۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٦﴾
وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ
فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي
كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ
مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَزَكَرِيَّآ
إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾
فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا
لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ
وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٣٣



﴿٨٢﴾ و ژ شەیتانان، مە هندەك بۆ سەرنەرم كربوون،
خۆ بۆ نقۆم دكرنە بنێ دەریایان، دا بۆ لۆلۆ و
مەرجانان دەربێخن، و ژ بلی ڤی ژی، شۆلەكێ دی
ژی بۆ دكر [وەكی ئاڤاكرنا باژێران، و ئاڤاهیێت
بلند، یێت كو مرۆڤ نەشێن پێ رابن]، و ئەم بۆ وان
پارێزڤان بووین [دا ئەو خرابیێ نەكەن، و ژ ئەمرێ
سولەیمانی دەرنەكەڤن].
﴿٨٣﴾ و ئەیووب وەختێ
نەساخ بووی گازی خودایێ خۆ كر، خودێوۆ ب
راستی دەردەكێ گران ئەز یێ گرتیم، و تو ژ هەمی
دلۆڤانان دلۆڤانتری.
﴿٨٤﴾ ئینا مە دوعایا وی قەبویل
كر، و ئەو دەردێ گرتی، مە ژێ دا پاش، و مە كوڕ
و كچێت وی، و جارەكا دی تەمەتی وان ژ دلۆڤانیا
خۆ دانێ، دا عیبادەتكەر بیرا خۆ بینن، و بێنا خۆ
فرەهـ بكەن، هەروەكی ئەیووبی بێنا خۆ فرەهكری.
﴿٨٥﴾ و بەحسێ ئیسماعیل و ئدریس و (ذا الكفل)
بكە، كو هەمی ژ دەستەكا سەبركێشان بوون.
﴿٨٦﴾ مە ژی ئەو ئێخستنە د ناڤ دلۆڤانیا خۆدا
[د ناڤ پێغەمبەراتیێ یان بەحەشتێدا]، ب راستی ئەو
ژ باشان بوون.
﴿٨٧﴾ و بەحسێ خودانێ نەهنگی بكە، وەختێ كەربگرتی دەركەڤتی، و هزركر ئەم ب چو
جزایان وی تەنگاڤ ناكەین [ڤێجا ئەو ژ گەمیێ هاتە هاڤێتن، و نەهنگی داعویرا]، ئینا د تاریستاناندا [تاریا
شەڤێ، تاریا دەریایێ و تاریا زكێ نەهنگی] هەواركر.. خودێوۆ ب راستی ژ بلی تە چو پەرستی نینن، پاكی
و پاقژی [ژ هەمی كێماسیان] هەر بۆ تەیە، ب راستی [ئەز هێژایی ڤی جزاییمە و]، من ستەم ل خۆ كر.
﴿٨٨﴾ ڤێجا مە دوعایا وی قەبویل كر، و مە ئەو ژ كۆڤان و تەنگاڤیێ رزگاركر، و هۆسا ئەم خودان باوەران
[ژ تەنگاڤیان] رزگار دكەین [ئەگەر هەوارا خۆ بگەهیننە مە].
﴿٨٩﴾ و بەحسێ [پێغەمبەرێ مە] زەكەریای
بكە، وەختێ گازی خودایێ خۆ كری، خودێوۆ، من نەهێلە ب تنێ [بێ كوڕ.. كو ئەو كوڕ ببیتە وێرسێ
من و جهێ من بگریت، و ئەگەر تو نەدەیە من ژی، ئەز ب خەم ناكەڤم]، ب راستی تو باشترین وێرسی.
﴿٩٠﴾ مە دوعایا وی قەبویل كر و مە یەحیا دایێ، و مە ژنا وی ب بچویك ئێخست [كو بەری هنگی بچویك
نەدبوون]، [مە دوعایێت وان پێغەمبەران قەبویلكرن] چونكی ب راستی وان لەز ل خێران دكرن، و ژ ترسا
ئیزایا مە، و تەمایی بۆ نیعمەتێت مە دوعا ژ مە دكرن، و وان بەس بۆ مە خۆ دشكاندن، و ل بەر فەرمانا مە
د راوەستیایی بوون.

وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا
وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩١﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ
أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾
وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡۖ كُلٌّ إِلَيۡنَا رَٰجِعُونَ ﴿٩٣﴾
فَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَا كُفۡرَانَ
لِسَعۡيِهِۦ وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ ﴿٩٤﴾ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ
أَهۡلَكۡنَٰهَآ أَنَّهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴿٩٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ
يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾
وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا
ظَٰلِمِينَ ﴿٩٧﴾ إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ
حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ لَوۡ كَانَ
هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةٗ مَّا وَرَدُوهَاۖ وَكُلّٞ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٩٩﴾
لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَهُمۡ فِيهَا لَا يَسۡمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ﴿١٠١﴾





﴿٩١﴾ و بەحسێ مەریەمێ بکە، ئەوا خۆ دەهمەن پاقژ ڕاگرتی و پارستی، و مە فەرمانا جبریلی کر پفکەتە سینگێ وێ [و مە عیسا ئێخستە زکێ وێ]، و مە ئەو و کوڕێ وێ، کرنە نیشانەك [ل سەر دەستهەلاتداریا خودێ] بۆ هەمی خەلکی. ﴿٩٢﴾ ب ڕاستی ئەڤ دینە، دینێ ئیسلامێ [دینێ تەوحیدێیە، و دینێ هەمی پێغەمبەرانە] دینەکێ ب تنێیە، [ئانکو ئێك دینە و ئەوە یێ هەمی پێغەمبەر پێ هاتین] و ئەز خودایێ هەوەمە، ڤێجا [گەلی موسلمانان] پەرستنا من ب تنێ بکەن. ﴿٩٣﴾ [ئەڤ پێغەمبەرە وەکی خەلەکێت زنجیران ل دویڤ ئێك هاتینە، و هەمی ئێك دین بوون، دینێ وان دینێ تەوحیدێ بوو] و دویکەڤتییێت وان ل سەر دینێ خۆ ژێك ڤەقەتیان، و بوونە دەستەك دەستەك و ژێك جودا بوون، و هەمی دێ هەر ب بال مەڤە زڤڕن. ﴿٩٤﴾ ڤێجا هەر کەسێ کار و کریارێت باش بکەت و باوەری ژی هەبیت، بزاڤا وی بەرزە نابیت، و ئەم هەمی کار و کریارێت وی بۆ دنڤێسین. ﴿٩٥﴾ و ل خەلکێ وی گوندی ئەوێ مە [ژ بەر خرابییا وان] د هیلاك بری، حەرام بیت ئەو جارەکا دی بزڤڕنە دنیایێ. ﴿٩٦﴾ هەتا وەختێ سکرێ یەئجووج و مەئجووجان ڤەدبیت، و ئەو ژ هەمی جهێت بلند ب لەز دادکەڤن [ئانکو هندی هند گەلەکن، ژ هەمی ڕێکان دئێن، دا خرابییێ بکەن]. ﴿٩٧﴾ و وەختێ ڕابوونا پشتی مرنێ نیزێك بوو [چونکی دەرکەڤتنا یەئجووج و مەئجووجان ژ نیشانێت قیامەتێنە]، ڤێجا وی وەختی چاڤێت ئەوێت گاوربوویین، ڤەکری و بەق دمینن [و ژ ترساندا ناکەڤنە سەرێك و دبێژن]: وەی ئێزا و نەخۆشی بۆ مە بیت، ب ڕاستی ئەم ژ ڤێ یێت بێ ئاگەهـ بوویین [و مە کارێ خۆ بۆ ڤێ نەکربوو]، بەلکی ئەم یێت ستەمکار بوویین. ﴿٩٨﴾ ب ڕاستی هوین و ئەوێت هوین شوینا خودێ دپەرێسن، ئاردووك و دارودوییێ جەهنەمێنە، هوین [دگەل وان] دێ چنە تێدا. ﴿٩٩﴾ و ئەگەر ئەڤە (بوتێت هوین دپەرێسن) پەرستییێت دورست بانە، نەدچۆنە د جەهنەمێدا، و ئەو هەمی ژی تێکدا [بوت و بوتپەرێس] دێ هەروهەر تێدا مینن. ﴿١٠٠﴾ دبیتە نالەنال و خرخڕا سینگێ وان د دۆژەهێدا و [ژ بەر دژوارییا ئێزایا دۆژەهێ]، ئەو چو یێ دی نابهیسن. ﴿١٠١﴾ ئەوێت بەری نوکە سۆز و پەیمانا ڕزگاربوونێ، مە ب ڕزقێ وان کری [وەکی عوزەیری و عیسایی و ملیاکەتان]، ئەو ژێ (ژ دۆژەهێ) د دویرن.

لَا يَسۡمَعُونَ حَسِيسَهَاۖ وَهُمۡ فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ
خَٰلِدُونَ ﴿١٠٢﴾ لَا يَحۡزُنُهُمُ ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ
ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿١٠٣﴾
يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ كَمَا
بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا
فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ وَلَقَدۡ كَتَبۡنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعۡدِ
ٱلذِّكۡرِ أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾
إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَٰغٗا لِّقَوۡمٍ عَٰبِدِينَ ﴿١٠٦﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ
إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ قُلۡ إِنَّمَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ
إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٨﴾
فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُلۡ ءَاذَنتُكُمۡ عَلَىٰ سَوَآءٖۖ وَإِنۡ أَدۡرِيٓ أَقَرِيبٌ
أَم بَعِيدٞ مَّا تُوعَدُونَ ﴿١٠٩﴾ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ مِنَ
ٱلۡقَوۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا تَكۡتُمُونَ ﴿١١٠﴾ وَإِنۡ أَدۡرِي لَعَلَّهُۥ
فِتۡنَةٞ لَّكُمۡ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ﴿١١١﴾ قَٰلَ رَبِّ ٱحۡكُم
بِٱلۡحَقِّۗ وَرَبُّنَا ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١١٢﴾



﴿١٠٢﴾ وان گول پێژنا دۆژەهێ ژی نابیت [ئانكو
دەنگێ ئاگرێ دۆژەهێ ناچیتە گوهێ وان]، و كا
دلێ وان د بەحەشتێدا دچیتە چ، دێ هەروهەر بۆ وان
هەبیت. ﴿١٠٣﴾ ترسا مەزنا ڕۆژا قیامەتێ وان ب خەم
نائێخیت [چونكی ئەو ژێ د ئێمنن و ژ وان ناگریت]،
و ملیاكەت [ل بەر دەرگەهێت بەحەشتێ] ب بەر
وانڤە دئێن [و دبێژنێ]: ئەڤە ڕۆژا هەوەیە، ئەو ڕۆژە
ئەوا ژڤان بۆ هەوە پێ دهاتە دان. ﴿١٠٤﴾ [بەحسێ
وێ ڕۆژێ بۆ بكە] ڕۆژا ئەم ئەسمانی وەكی پێچانا
تۆمارێ دپێچین، و [پاشی] كا جارا ئێكێ مە ئەو چاوا
چێكربوون، وەسا ئەم دێ وان زڤڕینینەڤە [ئانكو كا مە
چاوا ئەو ژ زكێت دەیكێت وان، پێخواس و ڕویس و
نەسونەتكری دان، ڕۆژا قیامەتێ ژی وەسا ئەم دێ وان
زڤڕینینەڤە]، و ئەڤە پەیمانەكە ل سەر مە [دڤێت ب جهـ
بێت]، و ئەم دێ هەر ب جهـ ئینین. ﴿١٠٥﴾ و ب سویند
مە د زەبوورێدا (كتێبا داوود پێغەمبەری) نڤیسی بوو
پشتی تەوراتێ، كو ب ڕاستی بەندەیێت من یێت
قەنجیكار [مەخسەد پێ ملەتێ پێغەمبەرێ مەیە] دێ
بنە وێرسێت ئەردی. ﴿١٠٦﴾ و ب ڕاستی ئەڤە [ئەڤ سۆرەتە یان ئەڤ قورئانە] بەسی وانە، یێت ب دورستی
خودێ دپەرێسن [ئانكو ئەڤ قورئانە بەسی مرۆڤیە، مرۆڤی بگەهینیتە خۆشیا دنیایێ و ئاخرەتێ].
﴿١٠٧﴾ و [هەی موحەممەد] مە تو نەهنارتی، ئەگەر بۆ هندێ نەبیت، بۆ خەلكێ هەمی جیهانان ببیە دلۆڤانی.
﴿١٠٨﴾ بێژە: ب ڕاستی بەس ئەو وەحیا بۆ من هاتی ئەڤەیە، كو خودایێ هەوە، خودایەكێ ب تنێیە، ڤێجا
موسلمان ببن. ﴿١٠٩﴾ ڤێجا ئەگەر وان بەرێ خۆ ژ ئیسلامێ وەرگێڕا [و موسلمان نەبوون]، بێژە: من هوین
هەمی وەكی ئێك ب ئەمرێ خودێ ئاگەهداركرن، و ئەز نوزانم ئەو ژڤانێ بۆ هەوە هاتیە دان [كو ڕۆژا
قیامەتێ و ئیزایا وێیە]، یێ نێزیكە یان یێ دویرە [بەلێ هەر دێ ئێت]. ﴿١١٠﴾ و ب ڕاستی خودێ ئاخڤتنا
ئاشكەرا دزانیت، و یا هوین ڤەدشێرن ژی دزانیت [ئانكو ئەو دژمناتیا هوین ئاشكەرا دكەن بۆ ئیسلامێ و
موسلمانان، و ئەو نەڤیان و كەرب و كینا هوین بۆ ئیسلامێ و موسلمانان د سینگێ خۆدا ڤەدشێرن، خودێ پێ
ئاگەهدارە، و دێ هەوە ل سەر جزاكەت]. ﴿١١١﴾ و ئەز نوزانم، دبیت [گیرۆبوونا جزاكرنا هەوە] جەرباندن
بیت بۆ هەوە [كا هوین دێ چ كەن]، یان ژی دبیت خۆشیەك بیت، هەتا وەختەكێ ئاشكەرا ل دەڤ خودێ
هوین تێدا بمینن. ﴿١١٢﴾ [پێغەمبەری] گۆت: خودێوۆ تو حوكمی ب هەقییێ د ناڤبەرا مە و ڤاندا بكە، و
خودایێ مە یێ دلۆڤان هاریكارێ مە بیت، ل سەر وان درەوێت هوین د ڕاستا خودێدا دكەن.

## سُورَةُ الحَجِّ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحزب ٣٤ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ ١
يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ وَتَضَعُ كُلُّ
ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ
وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ٢ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ
بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيۡطَٰنٖ مَّرِيدٖ ٣ كُتِبَ عَلَيۡهِ أَنَّهُۥ
مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهۡدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ٤
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم
مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ
مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ
إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ
وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا
يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا
ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ٥



## سۆرەتا حەج

**ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٧٨) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ گەلی مرۆڤان پارێزکاریـیا خودایـێ خـۆ بکـەن، ب ڕاسـتی بیڤەلـەرزا ڕۆژا قیامەتـێ تشـتەكێ مەزنـە. ﴿٢﴾ ڕۆژا هویـن [وێ بیڤەلـەرزێ] دبینـن، هەمـی دایـین و مـاك، ساڤاشـیرێ خـۆ، ژ بـیر دكـەن و دهێلن، و هەمـی ئاڤـس و گرانـە، بەردهاڤێـژن، و دێ مرۆڤـان بینـی سەرخۆشـن، و ئـەو ب خۆ نە د سەرخۆشـن، بەلێ ئیزایا خودایـێ تە یـا گرانە. ﴿٣﴾ و هنـدەك مرۆڤ هەنە [وەكـی (نەضـرێ)ێ كـوڕێ (حـارڤ)ی و مـوشركان] گەنگەشەیـێ د دەرهەقـێ خودێـدا دكـەن، بێـی كـو زانینـەك هەبیـت [و هـزر دكەن خـودێ نەشـێت جارەكا دی، پشـتی مرنـێ وان سـاخكەتەڤە]، و ب دویـڤ هـەر شـەیتانەكێ خرِیایـی و خرابیخواز دكەڤن. ﴿٤﴾ ل سـەر وی شـەیتانی یـێ هاتیـیە نڤێسین، كو ب ڕاسـتی ئەوێ ب دویـڤ وی بكەڤیـت و ڕێـكا وی بگریـت، ئـەو دێ وی بـەرزە و گومـڕا كـەت، و بـەرێ وی دێ دەتـە ئیزایا ئاگـری. ﴿٥﴾ گـەلی مرۆڤـان ئەگـەر هویـن ژ ڕابوونـا پشـتی مرنـێ ب گۆمـان و دودلن [هویـن بەرێ خـۆ بدەنە چێكرنـا خـۆ یا جـارا ئێكێ]، ب ڕاسـتی مە هویـن [ئانكو بابێ هـەوە ئادەم] جارا ئێكێ یـێـت ژ ئاخـێ چێكرین، پاشـی ژ چپكەكـێ، پاشـی ژ خوینپـارەی، پاشـی ژ گۆشـتپارەیەكا بێ كێماسـی و تەكـووز، و ژ ئێكا نەتەكووز، دا بـۆ هـەوە دیـار بكەیـن [ئەم خـودان شـیانین ل سـەر هەمـی تشـتان]، و ئـەم وێ د مالبچویكاندا خۆجـە دكەین و ڕادگریـن، هەتـا وەختەكـێ دیاركری، یـێ مە بڤێت، پاشـی دێ هـەوە بچویك دەیـن [پیچ پیچـە دێ هەوە مەزن كەیـن] دا ب دورسـتی تـێ بگەهـن و بالـغ ببـن، و هنـدەك ژ هـەوە [بـەری بالـغ ببـن] دمـرن، و هنـدەك ژ هەوە دمینـن هەتـا زێـدە پـیر و بـێ چـارە دبـن، دا چو تشـتان پشـتی دزانـی نەزانیـت، و تـو ئـەردی دبینی هشـك و بێ شینكاتیـیە، گاڤـا مـە باران ب سـەردا ئینـا، ئەو ئەردێ هشـك ب شـینكاتی دهەژیـێت و دوەرمیـت، و ژ هەمی ڕەنگێـت جوان یـێـت شـینكاتی، شـین دكەت.

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ
قَدِيرٞ ﴿٦﴾ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡعَثُ مَن فِي
ٱلۡقُبُورِ ﴿٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى
وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ﴿٨﴾ ثَانِيَ عِطۡفِهِۦ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ لَهُۥ فِي
ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَنُذِيقُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴿٩﴾ ذَٰلِكَ
بِمَا قَدَّمَتۡ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿١٠﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ
مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ
أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ
هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١١﴾ يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ
وَمَا لَا يَنفَعُهُۥۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ ﴿١٢﴾ يَدۡعُواْ لَمَن
ضَرُّهُۥٓ أَقۡرَبُ مِن نَّفۡعِهِۦۚ لَبِئۡسَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَلَبِئۡسَ ٱلۡعَشِيرُ ﴿١٣﴾
إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ
تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿١٤﴾ مَن كَانَ
يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ بِسَبَبٍ إِلَى
ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لۡيَقۡطَعۡ فَلۡيَنظُرۡ هَلۡ يُذۡهِبَنَّ كَيۡدُهُۥ مَا يَغِيظُ ﴿١٥﴾





﴿٦﴾ ئەڤـە [دانـا مرۆڤـان، و شـینکرنا ئـەردێ هشـك و ڕویـت و ڕەوال، ب هەمـی ڕەنگێـت شینکاتیـیێ] دا بزانن، ب ڕاسـتی هەبوونـا خودێ یا بنەجهـە [ئانکو چو گۆمـان تێـدا نینـە]، و ئـەوە مریـیان سـاخ دکـەت، و بێ گۆمـان ئـەو ل سـەر هەمی تشـتان یـێ دەسـتهەلاتدارە. ﴿٧﴾ [و دا بزانـن] بـێ گۆمـان ڕۆژا قیامەتـێ هـەر دێ ئێـت، و چـو گۆمـان و دودلی د هاتنـا وێـدا نینـە، و بـێ گۆمـان هنـدی د گۆڕانـدا، خـودێ دێ وان هەمیـیان سـاخکەت و ڕاکەتەڤـە. ﴿٨﴾ و ژ مرۆڤـان هندەك یـێت هەیـن بـێ زانـین و بـێ ڕێنیشـاندەر، و بـێ وەحـی و بـێ کتێبـەکا ڕۆنکـەر [هەبیـت]، مەدەڕکیـیێ د دەرهەقـێ خودێـدا دکـەن. ﴿٩﴾ ئـەو ستۆیـێ خـۆ ژ مەزناتـی و ژ ڕوی وەرگـێڕان ژ هەقیـیێ بـاددەن، دا مرۆڤـان ژ ڕێـکا خـودێ دویربێخـن، ڕسـوایی و شـەرمزاری د دنیایـێدا بـۆ وانـە، و ڕۆژا قیامەتـێ ژی دێ وان کەینـە د ئیزایـا دۆژەهـێ یـا مرۆڤسـۆژدا. ﴿١٠﴾ ئـەڤ ئیزایـە ژ بـەر وێیە یـا تـە ب دەسـتێت خـۆ بـەری نوکـە کـری، و خـودێ ب ڕاسـتی د ڕاسـتا بەندەیـێت خۆدا نەیـێ ستەمکارە.
﴿١١﴾ و ژ مرۆڤـان هنـدەك یـێت هەیـن ل هەجەتـن [نـە د بنەجهـن، و ب گۆمانـن] د پەرسـتنا خودێـدا، ڤێجـا ئەگـەر قەنجیـیەك گەهشـتێ، دێ ل سـەر دینـێ خۆ مینیـت، و ئەگەر نەخۆشـیـیەك [هـەر نەخۆشـیـیەکا هەبیت بـۆ جەڕباندنـا وی] گەهشـتێ، دێ جـارەکا دی زڤڕیتەڤـە سـەر گاوریـیێ، [و هۆسـا] دنیـا و ئاخرەت ژ دەسـت خـۆ کـرن، نێ خوسارەتیـیا بەرچاڤ و ئاشـکەرا ئەها ئەڤەیە. ﴿١٢﴾ [ئەڤێ هۆسـا زڤڕیـیە سـەر گاوریـیێ] وی شـوینا خودێ دپەرێسـیت، یـێ کـو نە فایدەیـی دگەهینیتێ نـە ژی زیانـێ، ئەها ئەڤەیـە بەرزەبوون و گومڕاییـیا کویـر و دویـر. ﴿١٣﴾ ئەڤـە وی دپەرێسـیت یـێ کو زیانا وی [د دنیایـێ و ئاخرەتێدا] ژ مفایـێ وی [یـێ ئەو بۆ ددانـن] نێزیکتـر، ئـەو چ پیسـە پشـتەڤانە، و چ پیسـە هەڤالـە [بۆ خـۆ گرتـی]. ﴿١٤﴾ ب ڕاسـتی خـودێ دێ وان ئەوێـت بـاوەری ئینایـین و کار و کریارێـت ڕاسـت و قەنـج کریـن، بەتـە وان بەحەشـتان ئەوێـت ڕویبـار د ناڤدا دئێن و دچـن، ب ڕاسـتی خـودێ وێ دکەت یـا وی بڤێت. ﴿١٥﴾ هەر کەسـێ هزر بکـەت، خودێ هاریکاریـیا پێغەمبـەرێ خـۆ د دنیایـێ و ئاخرەتێـدا ناکـەت و وی ب سـەر نائێخیـت، بـلا [ژ کەربێـت خـۆدا] وەریسـەکی بێخیتـە بانـی و ستۆیـێ خـۆ تـێ دانیت و خـۆ بخەندقینیت، و بلا بـەرێ خۆ بدەتـێ کا ئەڤا وی کری، سـەرکەڤتنا خـودێ بـۆ پێغەمبـەری، ئـەوا [گـاور] بـۆ کەربگرتـی بوویـی، دێ بـەت.

وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَٰهُ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يُرِيدُ ﴿١٦﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ
وَٱلۡمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ
ٱلۡقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ
يَسۡجُدُۤ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلشَّمۡسُ
وَٱلۡقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلۡجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٞ مِّنَ
ٱلنَّاسِۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيۡهِ ٱلۡعَذَابُۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن
سجدة — ربع الحزب ٣٤ مُّكۡرِمٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ۩ ﴿١٨﴾ ۞هَٰذَانِ خَصۡمَانِ
ٱخۡتَصَمُواْ فِي رَبِّهِمۡۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قُطِّعَتۡ لَهُمۡ ثِيَابٞ
مِّن نَّارٖ يُصَبُّ مِن فَوۡقِ رُءُوسِهِمُ ٱلۡحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصۡهَرُ بِهِۦ
مَا فِي بُطُونِهِمۡ وَٱلۡجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنۡ حَدِيدٖ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ
أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا مِنۡ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا وَذُوقُواْ عَذَابَ
ٱلۡحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ
أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗاۖ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ﴿٢٣﴾



﴿١٦﴾ و هۆسا مە قورئان ئینا خوار، و قورئان هەمی نیشان و ئایەتێت ئاشکەراکەر، و ب ڕاستی خودێ وی ڕاستەڕێ دکەت، یێ وی بڤێت.
﴿١٧﴾ ب ڕاستی ئەوێت موسلمان بووین [و باوەری ب موحەمەدی ئینایین]، و ئەوێت بووینە جوهی [دویکەڤتییێت مووسایی] و سابئین [جوینەکە ژ جوهی و فەلەیان ڤەبووینە، ستێران دپەرێسن، و هندەك دبێژن ملیاکەتان دپەرێسن] و فەلە و ئاگرپەرێس، و ئەوێت هەڤپشك بۆ خودێ دانایین [کو عەرەبێت بوتپەرێس بوون]، خودێ ڕۆژا قیامەتێ دێ حوکمی د ناڤبەرا واندا کەت و وان ژێکڤەکەت، ب ڕاستی خودێ ل سەر هەمی تشتان یێ شیاندارە.
﴿١٨﴾ ئەرێ ما تو نابینی، هندی د ئەرد و ئەسماناندا هەی، و ڕۆژ و هەیڤ و ستێر و چیا و دار و جانەوەر، و گەلەك ژ مرۆڤان ژی بۆ خودێ دچنە سوجدەیێ و بن ئەمری وینە، و گەلەك ژ وان ژی هێژایی ئیزایێ دبن [ئەوێت خۆ مەزن دبینن و گوهدارییا خودێ نەکەن]، و هەر کەسێ خودێ وی [ب گاورییێ و نەخۆشییێ] ڕسوا و ڕەزیل بکەت، ڤێجا وی کەس نینە وی ب قەدر بێخیت [و کەیفخۆش بکەت، و ئیزایا خودێ ل سەر ڕاکەت]، ب ڕاستی خودێ چ بڤێت وێ دکەت.
﴿١٩﴾ ئەڤە دو جوینێت هەڤڕکن [جوینا موسلمانان و جوینا گاوران] د ڕاستا خودایێ خۆدا ب هەڤڕك چۆینە، ڤێجا ئەوێت گاوربووین [جوینا گاوران]، دێ جلك ژ ئاگری بۆ وان ئێنە کەرکرن، و ئاڤا زێدە کەلیایی دێ ب سەر سەرێ واندا ئێتە ڕێتن.
﴿٢٠﴾ تشتێ د زکێ واندا هەی [ژ ڕویڤیك و بەزی] و پیستێ وان، دێ حەلینیت.
﴿٢١﴾ و گورزێت ئاسنی ل وان دئێنە دان [ملیاکەتێت زێرەڤان د دۆژەهێدا ل سەرێت وان ددەن، ئەگەر ڤیان ژ دۆژەهێ دەرکەڤن].
﴿٢٢﴾ و هەر وەختێ وان ڤیا ژ ئاگری دەرکەڤن، ژ بەر وێ هناڤسۆتنا ژ ئاگری دگەهیتە وان، جارەکا دی دێ بۆ ناڤ ئێنە ڤەگێڕان، و تامکەنە ئیزایا دۆژەهێ [و ملیاکەت دێ بێژنە وان: دێ تامکەنە ئیزایا دۆژەهێ یا مرۆڤسۆژ].
﴿٢٣﴾ ب ڕاستی خودێ، ئەوێت باوەری ئینایین [جوینا موسلمانان] و کار و کریارێت ڕاست و قەنج کرین، دێ وان بەتە وان بەحەشتان، ئەوێت ڕوبیار د بنڕا دئێن و دچن، و تێدا دئێنە خەملاندن، ب بازنێت زێری، و ب لۆلۆ و مراریان، و جلکێ وان تێدا ئارمویشە.

وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٢٤﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسْجِدِ
ٱلْحَرَامِ ٱلَّذِى جَعَلْنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلْعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلْبَادِۚ
وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍۭ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٥﴾
وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ
بِى شَيْـًٔا وَطَهِّرْ بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ
ٱلسُّجُودِ ﴿٢٦﴾ وَأَذِّن فِى ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ
كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾ لِّيَشْهَدُواْ
مَنَٰفِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُواْ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَٰتٍ
عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِۖ فَكُلُواْ مِنْهَا
وَأَطْعِمُواْ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ ثُمَّ لْيَقْضُواْ تَفَثَهُمْ
وَلْيُوفُواْ نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُواْ بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٢٩﴾
ذَٰلِكَۖ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ
رَبِّهِۦۗ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمُ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْۖ
فَٱجْتَنِبُواْ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ وَٱجْتَنِبُواْ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾



﴿٢٤﴾ ئـەڤ جوینـە [جوینا موسـلمانان د ژیانا دنیایـێدا]
بـۆ ئاخڤتنا پاقـژ و بژویـن [کو ئـەو ژی پەیڤا ئێکتایـیێیە
(لا إلـه إلا الله)] هاتنـە ڕاسـتەڕێکرن، و بۆ ڕێـکا خودێ
[کو ئیسـلامە] ڕاسـتەڕێ بوون. ﴿٢٥﴾ ب ڕاستی ئەوێت
گاوربوویـین، و ڕێـکا خـودێ و مزگەفتـا کەعبەیـێ ل
خەلکـی دگرن، و خەلکـی ژێ ددەنە پاش، ئـەو مزگەفتا
مـە بـۆ هەمـی خەلکی وەکـی ئێـك دانایـی [بێ فـەرق و
جودایی]، چ یـێ وێرێ بیت [ئانکو ئاکنجیـیێ مەکەهێ
بیت]، یـان ژی ژ دەرڤـە هاتبیت [هەقێ هەمیـیان وەکی
ئێکـە، تێـدا نڤێـژان بکـەن، و تەوافـا وێ بکـەن]، و هـەر
کەسـێ بڤێت و بکەتە د دلێ خۆدا، د مزگەفتا کەعبەیـێدا
گونەهەکـێ بکـەت، و ژ ڕێـکا ڕاسـت دەرکەڤیـت، ئـەم
دێ ئیزایـەکا دژوار دەینـێ. ﴿٢٦﴾ و بێـژە وان: دەمـێ
مـە جهـێ کەعبەیـێ بـۆ ئیبراهیمـی دیارکری، و کریـیە
جهـێ لێزڤڕینـێ و پەرسـتنێ، و مـە گۆتـێ چو تشـتان بۆ
مـن نەکە هەڤـال و هەڤپشـك، و مـالا من [کـو کەعبەیە]
بـۆ تەوافکـەر و ئاکنجـی و داچەمیایـی و سـوجدەکەران
[نڤێژکـەران] پاقـژ بکـە. ﴿٢٧﴾ و گـازی مرۆڤـان بکـە
بـۆ حەجـێ، ڤێجـا پەیـادە و سـویاری حێشـترێت لاواز و وەسـتیایی، ژ هەمـی ڕەخ و ڕوی و کنارێـت دنیایـێ،
دێ قەسـت کەنـێ. ﴿٢٨﴾ دا بـۆ خـۆ مفایـان [یـێت دینـی و دنیایـێ] ببینـن، و زکرێ خودێ ل سـەر ڤەکوشـتنا
قوربانـان، ژ پـەزی و چێـلان و حێشـتران، بکـەن [ئانکـو ناڤـێ خودێ بینـن]، د هنـدەك ڕۆژێت ئاشـکەرادا [کو
ڕۆژا قوربانیـیە و هەرسـێ ڕۆژێت د دویڤڕا] ل سـەر وی ڕزقێ خودێ دایـییە وان ژ گیاندارێت ڕاگرتنێ یـێت
گیاخـۆر [وەکـی کەوالی و حێشـتران و چێـلان]، ڤێجا هویـن ژێ [ژ قوربانـان] بخۆن، و ژێ بدەنە ژارێ دەسـت
تەنـگ. ﴿٢٩﴾ پاشـی [پشـتی ڤەکوشـتنا قوربانـی، و ڕەجمـا ئێکـێ] بـلا قرێـژا خـۆ ڕاکـەن و باڤێـژن [ئەڤـا ژ بـەر
ئیحرامـان نەدشـیان ژ خـۆ ڤەکـەن، ڤێجا بلا سـەرێ خۆ کـورت بکەن یـان بتراشـن، و مویـیێت دی ژێڤەکەن، و
نینـۆکان بتراشـن]، و بـلا قوربانێـت ئێخسـتینە سـەر خۆ، بـدەن، و بلا تەوافـا مالا پـیرۆز بکەن [ئانکو بـلا تەوافا
(افاضه)یـێ بکـەن]. ﴿٣٠﴾ کاروبارێـت حەجـێ ئەڤەنـە ئەوێـت مـە ئەمـر پـێ کریـن، و هەر کەسـێ ئەو تشـتێ
خـودێ ئەمـر پـێ کری بکـەت، و ئـەوێ حەرامکری نەدەنە سـەر و مـەزن بدانیت، و ڕێـزێ لێ بگریـت، نێ ئەڤە
ل دەڤ خودایـێ وی بـۆ چێـترە، [گـەلی مرۆڤـان] هەمـی تـەرش [ژ پـەزی و حێشـتران و چێلان] بۆ هـەوە هاتە
حەلالکـرن و دورسـتکرن، ژ بـلی وان، ئەوێـت حەرامیـیا وان، بـۆ هـەوە د ئایەتـا حەرامکرنێـدا هاتبنـە خواندن
[بزڤڕنـە ئایەتـا (٣) ژ سـۆرەتا مائیدە]، ڤێجا خۆ ژ پیسـییێ [ئانکـو بوتان] بپارێزن، و خۆ ژ گۆتنـا پویچ و درەوێ
و شەهدەزۆرییێ بپارێـزن، و خـۆ ژێ دویـر بێخن.

حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيۡرَ مُشۡرِكِينَ بِهِۦۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ فَتَخۡطَفُهُ ٱلطَّيۡرُ أَوۡ تَهۡوِي بِهِ ٱلرِّيحُ فِي مَكَانٖ سَحِيقٖ ٣١
ذَٰلِكَۖ وَمَن يُعَظِّمۡ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقۡوَى ٱلۡقُلُوبِ ٣٢
لَكُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلۡبَيۡتِ
ٱلۡعَتِيقِ ٣٣ وَلِكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا مَنسَكٗا لِّيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ
مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۗ فَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَلَهُۥٓ
أَسۡلِمُواْۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُخۡبِتِينَ ٣٤ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ
قُلُوبُهُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمۡ وَٱلۡمُقِيمِي ٱلصَّلَوٰةِ
وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣٥ وَٱلۡبُدۡنَ جَعَلۡنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ
ٱللَّهِ لَكُمۡ فِيهَا خَيۡرٞۖ فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا صَوَآفَّۖ فَإِذَا وَجَبَتۡ
جُنُوبُهَا فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرۡنَٰهَا
لَكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٣٦ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا
وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقۡوَىٰ مِنكُمۡۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمۡ لِتُكَبِّرُواْ
نصف الحزب ٣٤ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٣٧ ۞إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ
عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ ٣٨



﴿٣١﴾ بەرێ خۆ ژ هەمی دینێت پویچ وەرگێڕن، و بەرێ خۆ بدەنە دینێ ڕاست و دورست، و هەڤپشكان بۆ خودێ چێ نەكەن، ب ڕاستی هەر كەسێ هەڤپشكان بۆ خودێ چێ كەت، هەروەكی ژ بلندایییێ ژۆردا كەتی [ئانكو ژ بلندایییا ئیمانێ ژۆردا كەتییە نزماتیا گاورییێ]، ڤێجا بالندەیەك هێژ ل هەوا خۆ لێ بدەت، یان ژی با وی باڤێژیتە جهەكێ دویر و كویر. ﴿٣٢﴾ ئەڤ ئەمرە خودێ بۆ هەوە ئاشكەراكر و هەر كەسێ ئەمرێت خودێ [رێ و نیشانێت دینێ وی ژ وان، قوربان و رێ و نیشانێت حەجێ] مەزن بدانیت، وەكی ئەمر پێ هاتی، ب جهـ بكەت، ب ڕاستی ئەڤە [ئانكو مەزن وەرگرتنا ئەمرێت خودێ یان قوربانی] نیشانا ترسیانا دلانە ژ خودێ. ﴿٣٣﴾ و فایدە و مفا بۆ هەوە، د وان قوربانانـدا، یێت هەین [سواربوونا وان و شیر و موی و هریا وان] هەتا وەختەكێ دیاركری [ئانكو هەتا ڕۆژا قوربانی ب خۆ]، پاشی جهێ ڤەكوشتنا وان مالا پیرۆزە. ﴿٣٤﴾ و بۆ هەر ملەتەكی، مە قوربانگەهەك [جهێ سەرژێكرنا قوربانان] یا دانایی، دا ناڤێ خودێ ل سەر وان قوربانان، ژ تەرشێت مە ب ڕزقێ وان كرین، بینن، ڤێجا خودایێ هەوە [ئەوێ هەمی دینێت ئەسمانی ئینایینە خوارێ] ئێك خودایە، ڤێجا خۆ هەلپەسێرنە وی ب تنێ، و مزگینییێ بدە وان ئەوێت خۆ بۆ خودێ دشكێنن، و بەردەوام بەرئەمری وی بن. ﴿٣٥﴾ ئەوێت گاڤا ناڤێ خودێ دئێتە ئینان، دلێ وان ژ ترساندا دلەرزیت، و گاڤا نەخۆشییەك گەهشتە وان، سەبرێ خۆ ل سەر دكێشن، و بەردەوام نڤێژان ب ڕەنگێ پێدڤی دكەن، و ژ تشتێ مە ب ڕزقێ وان كری، دكەنە خێر. ﴿٣٦﴾ و مە چێل و حێشتر یێت داین و دورستكرین، بۆ هەوە ببنە قوربان، و بۆ هەوە هندەك مفایێت دی ژی یێت تێدا هەین [وەكی سواربوون و شیری و... هتد]، ڤێجا گاڤا هەوە دەست و پییێت وان ب ڕێز گرێدان [ئانكو هەوە ڤەكوشتن]، ناڤێ خودێ ل سەر بینن، و وەختێ دكەڤنە سەر تەنشتا خۆ [پشتی دئێنە ڤەكوشتن] ژێ بخۆن، و ژێ بدەنە هەژارێ ڕازی ب ڕزقێ خۆ [ل مالا خۆ]، و یێ خۆ نیشا هەوە ددەت، دا هوین ژێ بدەنێ بێی ژ هەوە بخوازیت، و هۆسا ئەڤە [جانەوەرێت مەزن] مە بۆ هەوە یێت سەرنەرم كرین، دا هوین سوپاسی و شوكورا خودێ بكەن. ﴿٣٧﴾ د بنیرا نە گۆشتێ وان [قوربانان] و نە خوینا وان ناگەهیتە خودێ، بەلێ ترسیان و گوهدارییا هەوە بۆ خودێ، دێ گەهیتێ، و هۆسا مە بۆ هەوە یێت سەرنەرم كرین، دا هوین خودێ مەزن بنیاسن [ئانكو بێژن (الله أكبر)]، چونكی وی هوین یێت ڕاستەڕێكرینە ئەحكامێت دینێ خۆ، و مزگینییێ بدە شۆل بنەجهان. ﴿٣٨﴾ ب ڕاستی خودێ زێدە زێدە بەرەڤانییێ ژ وان دكەت، ئەوێت باوەری ئینایین، ب ڕاستی خودێ حەژ هەمی خائین [ئەوێت خیانەتێ د ئەمانەتێ خودێدا دكەن] و نیعمەت ژ بیركەران ناكەت.

أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ
لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟
رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ
صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ
كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ
عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ
وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ
وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَتْ
قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ ﴿٤٢﴾ وَقَوْمُ إِبْرَٰهِيمَ وَقَوْمُ
لُوطٍ ﴿٤٣﴾ وَأَصْحَٰبُ مَدْيَنَ ۖ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ ۖ فَأَمْلَيْتُ لِلْكَٰفِرِينَ
ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٤﴾ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ
أَهْلَكْنَٰهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ فَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ
مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴿٤٥﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ
لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا
لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾



﴿٣٩﴾ دەستویریـیـا شـەڕی بـۆ وان هاتـەدان ئەوێـت
شـەڕێ وان دئێتەکـرن، ژ بـەر وێ سـتەما ل وان هاتیـیە
کـرن، ب ڕاسـتی خودێ ل سـەر هاریکرن و پشتەڤانیـیا
وان، خـودان شـیانە. ﴿٤٠﴾ ئەوێـت ژ نەهەقـی ژ مالێـت
وان هاتینـە دەرئێخسـتن [گونەهـا وان بـەس ئـەو بـوو]
دگۆتـن: خودانـێ مـە خودێیـە، و ئەگـەر خـودێ هندەك
مـرۆڤ ب هنـدەکان نەدابانە پـاش، گەلەك سـەومەعە و
دێـر و کنیشـتە و مزگەفـت، ئەوێـت گەلەك ناڤـێ خودێ
تێـدا دئێنـە گۆتـن، دا ئێنـە هەڕافتـن (کاڤلکـرن)، و ب
ڕاسـتی خـودێ دێ وی ب سـەرئێخیت و هاریکاریـیا
وی دێ کـەت، ئـەوێ دینـێ خـودێ ب سـەربێخیت و
هـاری دینـێ وی بکەت، ب ڕاسـتی خودێ یـێ ب هێز
و دەسـتهەلاتدارە. ﴿٤١﴾ [ئەوێـت ژ مالێـت خـۆ هاتینـە
دەرئێخسـتن و مشـەخت بوویـین، یان ژی ئەوێت دینێ
خـودێ ب سـەر دئێخـن] ئـەون ئەوێـت گاڤـا مـە جهێ
وان د ئەردیـدا کـر و ب هێـز ئێخسـتن، دێ نڤێـژان کەن،
و زەکاتـێ دەن و ئەمـری ب قەنجیـیێ کـەن و نەهیـیا
خرابیـیێ کـەن، و ب ڕاسـتی دویماهیـیا هەمـی تشـتان
ب دەسـتێ خودێیـە [ئانکـو دینـێ خـۆ هـەر دێ ب سـەرئێخیت]. ﴿٤٢﴾ و [هـەی موحەمەد] ئەگەر [قورەیشـی]
تـە درەویـن بدانـن [ئەڤـە نەتشـتەکێ نویـیە]، ب ڕاسـتی بـەری وان، ملەتـێ نـووح و عـاد و (سـەموود) ژی،
پێغەمبەرێـت خۆ درەوین یـێت دانایـین. ﴿٤٣﴾ هەروەسـا ملەتـێ ئیبراهیم پێغەمبـەر و ملەتێ (لـوط) پێغەمبەر
ژی... ﴿٤٤﴾ و هەروەسـا خەلکـێ مەدیەنـێ ژی [ملەتـێ شـوعەیب پێغەمبـەری ژی، پێغەمبـەرێ خۆ شـوعەیب
درەویـن دانـان]، و مووسـا ژی [ژ بـەرێ فیرعەونیـیانڤە] درەویـن هاتـە دانـان، ڤێجـا مـە دەرفـەت و مۆلەت دا
گـاوران [و مـە تۆلڤەکـرن ل وان گیرۆکـر]، پاشـی مـە ئـەو ب ئیزایـێ هنگاڤتـن، ڤێجا بـەرێ خـۆ بدەیـێ، کا
نەڕازیبوونـا مـن و گوهۆڕینـا مـن ل سـەر وان، یا چـاوا بـوو. ﴿٤٥﴾ ڤێجا گەلەك گونـد، مە یـێت د هیلاك برین،
و ئـەو یـێت ستەمکار بـوون، ڤێجـا خانیـیێت وان کاڤلـن و دیـوار ب سـەرێکدا هاتینـە، و بـیر بـێ خودانن، و
قەسرێـت ب گێچـێ ئاڤاکـری، ڤالا مایـینە. ﴿٤٦﴾ ئـەرێ ما ئەو د ئەردیـدا نەگەڕیاینـە [ببینن کا مـە چەند ملەت
بـەری وان بەرئاتـاف کرینـە، و کاڤلێـت وان پێـش چاڤـن]، دا بـۆ خۆ پێڤەبچـن، و دل هەبـن ئاقلەکی بـۆ خۆ پێ
بگـرن، و گوهــ هەبن شـیرەتان گولـێ ببن، نێ نـە چاڤێت وان د کۆرەنـە [کو هەقیـیێ نەبینن ]، بەلـێ دلێت وان
ئەوێـت د سـینگێ وانـدا د کۆرەنە.

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ ۚ وَإِنَّ يَوْمًا
عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ
أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٨﴾
قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٩﴾ فَٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٥٠﴾
وَٱلَّذِينَ سَعَوْا۟ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ
ٱلْجَحِيمِ ﴿٥١﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِىٍّ إِلَّآ
إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلْقَى ٱلشَّيْطَٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلْقِى
ٱلشَّيْطَٰنُ ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٢﴾ لِّيَجْعَلَ
مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْقَاسِيَةِ
قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَلِيَعْلَمَ
ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ
فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ
مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ حَتَّىٰ
تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ ﴿٥٥﴾



﴿٤٧﴾ [هەی موحەمەد] ئەو لەزا هاتنا ئیزایێ ژ تە دکەن [و دبێژنە تە: ئەگەر تو ڕاست دبێژی، بلا ڤێ گاڤێ ئەو ئیزایا تو مە پێ دترسینی، ب سەرێ مە بێت]، و خودێ ب ڕاستی پەیمانا دایی و لێڤەنابیت، [هنگی ئیزا دێ ئێت، دەمێ وی دەستنیشانکری، و لەزا وان چو کارلێکرنا خۆ د حوکمێ خودێدا نینە]، و ب ڕاستی هزار سالێت هەوە، ڕۆژەکە ل دەڤ خودێ [ئانکو خودایێ تە زێدە یێ حەلیمە، لەزێ ل جزادانێ ناکەت]. ﴿٤٨﴾ و مە دەرفەت و مۆلەت دا چەند گوندان، و ئەو یێت ستەمکار بوون [وەکی هەوە]، پاشی مە ئەو ب ئیزایێ د هیلاك برن، و هەمی هەر ب بال مەڤە دێ زڤڕنەڤە. ﴿٤٩﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: گەلی مرۆڤان ئەز بەس ئاگەهدارکەرەکێ ئاشکەرامە بۆ هەوە [و من دەست د ئینانا ئیزایێدا نینە]. ﴿٥٠﴾ ڤێجا ئەوێت باوەری ئینایین، و کار و کریارێت ڕاست و قەنج کرین، بۆ وان لێنەگرتن [گونەهـ ژێبرن]، و ڕزقەکێ باش یێ هەی. ﴿٥١﴾ و ئەوێت بەرگەڕیان د ڕاستا قورئانا مەدا کرین، دا بەتال بکەن، وخەلکی ژ باوەری پێ ئینانێ گران دکەن ئەو دۆژەهینە. ﴿٥٢﴾ و مە چو پێغەمبەر بەری تە نەهنارتینە، ئەگەر وەختێ ئەو [وەحیا بۆ هاتی] دخوینیت، شەیتانی هندەك وەسواس نەهاڤێتبیتە د ناڤدا، بەلێ خودێ ئەوا شەیتانی هاڤێتییە د ناڤدا [ژ وەسواسێ] ڕادکەت و پویچ دکەت، پاشی ئایەتێت خۆ د دلێ پێغەمبەراندا موکوم و بنەجهـ دکەت، و خودێ زێدە زانا و کاربنەجهە. ﴿٥٣﴾ خودێ ڤێ ڕێ ددەتە شەیتانی، دا ئەو وەسواسا شەیتان چێ دکەت، بۆ ئەوێت شك و دوڕوییاتی د دلێ واندا هەی، و ئەوێت دلێت وان ڕەق [کو ئیمان نەچیتە تێدا، ژ بەر شرکا وان] ببیتە بەلا و جەڕباندن، و ب ڕاستی ستەمکار [موشرك و دوڕوی] یێت د ڕکۆیییەکا دویری هەقییێدا. ﴿٥٤﴾ و دا ئەوێت زانین بۆ هاتییە دان [ئەوێت باوەری ب خودێ و پێغەمبەری هەی، و جودایییێ د ناڤبەرا هەقی و نەهەقییێدا دکەن] بزانن، ب ڕاستی ئەڤ قورئانە وەحییا دورستە ژ خودایێ تە، دا باوەرییێ پێ بینن، و دلێ وان بەرانبەر تەنا ببیت و بۆ مە ڤەببیت، ب ڕاستی خودێ بەرێ وان ئەوێت باوەری ئینایین، ددەتە ڕێکا ڕاست. ﴿٥٥﴾ و ئەوێت گاوربووییین، بەردەوام دێ میننە د دودلییێدا، د ڕاستا قورئانێدا، هەتا ژ نشکەکێڤە قیامەت ل وان ڕادبیت، یان ژی ئیزایا ڕۆژا قیامەتێ ب خۆ، بۆ وان بێت.

ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٖ لِّلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٞ
مُّهِينٞ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ
أَوْ مَاتُواْ لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ
خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٥٨﴾ لَيُدْخِلَنَّهُم مُّدْخَلٗا يَرْضَوْنَهُۥۗ
وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٞ ﴿٥٩﴾ ۞ ذَٰلِكَۖ وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ
مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيْهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ
لَعَفُوٌّ غَفُورٞ ﴿٦٠﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي
ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ
بَصِيرٞ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ
مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٦٢﴾
أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَتُصْبِحُ ٱلْأَرْضُ
مُخْضَرَّةًۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴿٦٣﴾ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦٤﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٣٤



﴿٥٦﴾ وێ ڕۆژێ [کو ڕۆژا قیامەتێیە] ملك و
دەستهەلات بەس بۆ خودێیە، خودێ دێ حوکمی
د ناڤبەرا واندا کەت، ڤێجا ئەوێت باوەری ئینایین
و کار و کریارێت قەنج کرین، دێ د بەحەشتێت
خۆشدا بن. ﴿٥٧﴾ و ئەوێت گاوربوویین و نیشان و
ئایەتێت مە درەو و دانایین، ئەها ئەڤان، دێ ئیزایەکا
ڕسواکەر و شەرمزارکەر بۆ هەبیت. ﴿٥٨﴾ و ئەوێت
د ڕێکا خودێدا مشەخت بوویین [مەخسەد پێ
ئەوێت ژ مەکەهێ مشەخت بوویینە مەدینەیێ]،
پاشی هاتینە کوشتن [شەهید بوویین]، یان ژی د
مشەختبوونا خۆدا مرین، بێ گۆمان خودێ دێ
ڕزقەکێ باش دەتە وان، ب ڕاستی خودێ چێترین
ڕزقدارە. ﴿٥٩﴾ خودێ دێ وان بەتە جهەکی [کو
بەحەشتە]، ئەو پێ ڕازی ببن، و ب ڕاستی خودێ
یێ زێدە زانا و حەلیمە [ئانکو لەزێ ل ئیزادانێ
ناکەت]. ﴿٦٠﴾ [بڕیارا مە دایی، ئەڤەیە] هەر کەسێ
ستەم لێ هاتبیتەکرن، و ئەو تەمەتی ستەما لێ هاتییە
کرن، تۆلا خۆ ڤەکەت، پاشی [جارەکا دی] ستەم لێ
بێتەکرن، ب ڕاستی خودێ دێ هاریکاریا وی کەت، و ب ڕاستی خودێ لێبۆر و لێنەگرە [گونەهـ ژێبەرە].
﴿٦١﴾ ئەڤە [ئانکو ئەڤ هاریکاریە] ژ بەر هندێیە خودێ [یێ خودان شیانە] شەڤێ دکەتە د ڕۆژێدا [ڤێجا
ڕۆژێ درێژ دکەت]، و ڕۆژێ دکەتە د شەڤێدا [ڤێجا شەڤێ درێژ دکەت]، و ب ڕاستی خودێ گوهدێر و
بینەرە. ﴿٦٢﴾ چێکرنا شەڤ و ڕۆژان هۆسا، دا بزانن خودێ یێ هەقە، و چو پەرستییێت ڕاست و دورست،
ژ بلی وی نینن، و دا بزانن ئەوێت ئەو شوینا خودێ دپەرێسن یێت پویچن، و ب ڕاستی خودێ یێ بلند و
مەزنە. ﴿٦٣﴾ ئەرێ ما تو نابینی، کو ب ڕاستی خودێ ئاڤێ ژ ئەسمانی دئینیتە خوارێ، ڤێجا ئەرد پێ کەسك
دبیت، ب ڕاستی خودێ زێدە هویربین و شارەزایە. ﴿٦٤﴾ هندی د ئەرد و ئەسماناندا هەی یێ ویە، و ب
ڕاستی خودێیە یێ زەنگین، و هێژایی سوپاسییێ.

أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡفُلۡكَ تَجۡرِي
فِي ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦ وَيُمۡسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا
بِإِذۡنِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٦٥﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ
أَحۡيَاكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡۗ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَكَفُورٞ ﴿٦٦﴾
لِّكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا مَنسَكًا هُمۡ نَاسِكُوهُۖ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ
فِي ٱلۡأَمۡرِۚ وَٱدۡعُ إِلَىٰ رَبِّكَۖ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدٗى مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٦٧﴾
وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحۡكُمُ
بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾
أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّ
ذَٰلِكَ فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٧٠﴾ وَيَعۡبُدُونَ
مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا وَمَا لَيۡسَ لَهُم بِهِۦ
عِلۡمٞۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٖ ﴿٧١﴾ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا
بَيِّنَٰتٖ تَعۡرِفُ فِي وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلۡمُنكَرَۖ يَكَادُونَ
يَسۡطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتۡلُونَ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِنَاۗ قُلۡ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرّٖ مِّن
ذَٰلِكُمُۚ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٧٢﴾





﴿٦٥﴾ ئەرێ ما تو نابینی، کو ب ڕاستی خودێ، تشتێ د ئەردیدا هەی، یێ بۆ هەوە سەرنەرم کری [وەکی جانەوەر و دار و ڕوبیاران، و... هتد، و هەمی یێت ئێخستینە د خزمەتا هەوەدا]، و گەمی بۆ هەوە یێت سەرنەرم کرین ب ئەمرێ خودێ د دەریاباندا دچن، و ئەسمانی ڕادگریت، دا نەکەڤیتە سەر ئەردی، ب دەستویریا وی نەبیت [کو ئەو ژی ڕۆژا قیامەتێیە]، ب ڕاستی خودێ بۆ مرۆڤان ب ڕەحم و دلۆڤانە.
﴿٦٦﴾ و ئەو ئەوە یێ هوین داین، پاشی دێ هەوە مرینیت، پاشی دێ هەوە ساخکەتەڤە، ب ڕاستی مرۆڤ زێدە یێ چاڤنق و نیعمەت ژ بیرکەرە.
﴿٦٧﴾ و بۆ هەر ملەتەکی [مەخسەد بۆ خەلکێ هەر دینەکی] مە بەرنامە و ڕێکەك یا دانایی، ئەو ل سەر دچن و عیبادەتێ خۆ دکەن، ڤێجا گوهێ خۆ نەدەنە مەدەڕکی و هەڤڕکیا وان، و بلا چو کارلێکرنێ ل تە نەکەن، و گازی مرۆڤان بکە بۆ پەرستنا خودایێ خۆ، ب ڕاستی تو یێ ل سەر ڕێکا ڕاستا بێ خواری [کو ئیسلامە]. ﴿٦٨﴾ و ئەگەر ئەو [پشتی هەقی بۆ وان ئاشکەرا بووی] جڕەبڕێ د گەل تە بکەن، بێژە: تشتێ هوین دکەن خودێ چێتر دزانیت [ئانکو جڕەبڕێ د گەل وان نەکە، و بێژە وان خودێ کریارێت هەوە چێتر دزانیت، و چێتر دزانیت کا هوین هێژایی چ جزایینە].
﴿٦٩﴾ ڕۆژا قیامەتێ خودێ دێ حوکمی د ناڤبەرا هەوەدا کەت، ل سەر وی تشتێ هوین [موسلمان و گاوران] تێدا ژێك جودا. ﴿٧٠﴾ ئەرێ ما تو نوزانی، کو ب ڕاستی هندی د ئەرد و ئەسماناندا هەی خودێ ژێ ب ئاگەهە؟ ب ڕاستی هەمی [هەمی زانینا ل دۆر ئەرد و ئەسمانان، و کا چ تێدا هەیە] ل دەڤ وی یا نڤێسییە، و ئەڤە ل دەڤ وی یا ب ساناهییە. ﴿٧١﴾ و ئەو وان شوینا خودێ دپەرێسن، ئەوێت چو بەلگە و نیشان وان پێ نەیی، و ستەمکاران چو هاریکار و پشتەڤان نینن. ﴿٧٢﴾ و گاڤا ئایەتێت مە یێت ڕۆن و ئاشکەرا ل سەر وان هاتنە خواندن، تو دێ نەڕازیبوونێ د سەروچاڤێت وانڕا بینی [هندی کەربگرتی دبن ژێ]، ئەوێت پشتا خۆ داینە باوەرییێ، نێزیکە خۆ د وان وەرکەن ئەوێت ئایەتێت مە بۆ وان دخوینن، بێژە: ئەرێ ئەز بۆ هەوە یا ژ ڤێ خرابتر و گرانتر بێژم؟ ئێزایا ئاگریە، خودێ پەیمانا پێ دایییە وان ئەوێت گاوربوویین، و ئەو پیسە دویماهیکە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٞ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ
تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابٗا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ
وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ
ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ ٧٣ مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓۚ
إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ٧٤ ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ
رُسُلٗا وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ٧٥ يَعۡلَمُ
مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ٧٦
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ
رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ۩ ٧٧ سَجۡدَة
وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ
وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ
إِبۡرَٰهِيمَۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ وَفِي
هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيۡكُمۡ وَتَكُونُواْ
شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِۚ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ
وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ ٧٨



«٧٣» گەلی مرۆڤان نموونەیەك هاتە دیاركرن،
ڤێجا گوهێ خۆ بدەنێ، ب ڕاستی ئەوێت هوین
شوینا خودێ دپەرێسن، نەشێن مێشەكێ چێ بكەن
(بدەن)، خۆ ئەگەر هەمی پێكڤە [بۆ چێكرنا مێشێ]
كۆم ببن ژی، و ئەگەر مێش تشتەكی ژ وان ڕاكەت،
ئەو نەشێن ژێ بستینن، داخوازكەر [كو بوتە، ئەوێ
دخوازیت تشتێ مێشێ ل سەر ڕاكری بێتە زڤراندن]
و داخوازكری [كو مێشە، داخوازكرییە ژ بەرێ بوتیڤە
كو تشتێ وێ بری بزڤرینیتەڤە]، هەردو ژی [ئانكو
مێش و بوت] لاوازن و بێ هێزن. «٧٤» [ب ڕاستی
وەختێ ئەو ڤان بوتێت لاواز و بێ هێز دپەرێسن]
وان ب ڕەنگەكێ پێدڤی قەدرێ خودێ نەگرتییە
[و ب دورستی نەنیاسییە]، ب ڕاستی خودێ هێزدار
و سەردەستە. «٧٥» ب ڕاستی خودێ ژ ملیاكەتان و
ژ مرۆڤان ژی، هنارتییان هەلدبژێریت، و بێ گۆمان
خودێ گوهدێر و بینەرە. «٧٦» خودێ ژ كار و
كریارێت وان كرین و یێت دێ كەن، ب ئاگەهە، و
هەمی كاروبار دێ ب بال خودێڤە زڤرن. «٧٧» هەی
ئەو كەسێت هەوە باوەری ئینایین، داچەمیێن و هەرنە سوجدەیێ [ئانكو نڤێژان ب ڕەنگێ پێدڤی بكەن]،
و خودایێ خۆ بپەرێسن، و باشییێ بكەن، دا هوین سەرفەراز ببن. «٧٨» و جیهادێ د ڕێكا خودێدا بكەن،
جیهادەكا دورست بۆ خودێ كو هوین ژ لۆمەیا كەسێ نەترسن، و شیانێت خۆ هەمییان تێدا بمەزێخن.
وی هوین [گەلی موسلمانان، بۆ دینێ خۆ] یێت هەلبژارتین، و چو بەرتەنگی و گرانی [یا زێدەی شیانا
هەوە] نەكرییە د دینیدا، دینێ هەوە یێ بەرفرەهكری، بەرفرەهییا دینێ بابێ هەوە ئیبراهیمی، و خودێ
بەری قورئانێ بینیتە خوارێ د كتێبێت بەرێدا، هوین ب ناڤێ موسلمان ب ناف كرینە، و د ڤێ قورئانێدا ژی،
مە هوین ب عەینی ناڤی ب ناف كرینە، دا پێغەمبەر ل سەر هەوە ببیتە شاهد [كو پەیاما خودێ گەهاندە
هەوە]، و دا هوین ژی ل سەر خەلكی [ڕۆژا قیامەتێ] ببنە شاهد، ڤێجا نڤێژێت خۆ ب ڕەنگێ پێدڤی و
بەردەوام بكەن، و زەكاتا مالێ خۆ بدەن، و خۆ ب ڕێكا خودێ یا ڕاستڤە بگرن، ئەو (خودێ) پشتەڤان و
هاریكارێ هەوەیە، و ئەو چەند پشتەڤان و هاریكارەكێ باشە.

سُورَةُ المُؤْمِنُونَ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الجزء ١٨ الحزب ٣٥

قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ١ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ٢
وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ٣ وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ
فَاعِلُونَ ٤ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ٥ إِلَّا عَلَىٰ
أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ٦ فَمَنِ ابْتَغَىٰ
وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ٧ وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ
وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ٨ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ٩ أُولَٰئِكَ
هُمُ الْوَارِثُونَ ١٠ الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ١١
وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ ١٢ ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً
فِي قَرَارٍ مَكِينٍ ١٣ ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ
مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ
أَنْشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ١٤ ثُمَّ
إِنَّكُمْ بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ١٥ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ ١٦
وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَائِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ الْخَلْقِ غَافِلِينَ ١٧





## سۆرەتا موئمینوون

**ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (١١٨) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ ب ڕاستی خودان باوەر سەرفەراز بوون. ﴿٢﴾ ئەو [خودان باوەر]ێت خۆشكێن، و ب ترس د نڤێژێت خودا. ﴿٣﴾ و ئەوێت [هەمی دەمان] پشتا وان ل گۆتن و كریارێت پویچ [و خۆ ژێ ددەنە پاش]. ﴿٤﴾ و ئەوێت دلێ خۆ ژ شرك و گونەهان پاقژ دكەن [زەكات ل ڤێرێ باراپتر پاقژییا دەروونییە، چونكی ئەڤ ئایەتە ل مەكەهێ هاتییە خوار، و زەكات ل مەدینەیێ هاتییە فەرزكرن، و هندەك زانا دبێژن مەخسەد هەر زەكاتا مالییە]. ﴿٥﴾ و ئەوێت دەهمەن پاقژ و ناموس پارێز. ﴿٦﴾ بۆ هەڤسەرێت خۆ نەبن، یان جاریێت خۆ، و د ڤێدا ل وان نائێتە گرتن. ﴿٧﴾ و هەر كەسێ د سەر ڤانرا دەرباز ببیت [ئانكو ژ هەڤسەر و جاریا خۆ زێدەتر بچیت، ئەو زۆردار و ستەمكارە]، ب ڕاستی ئەڤە ئەون یێت ژ تخویبێ خودێ دەركەڤتین. ﴿٨﴾ و ئەوێت ئەمانەتی و سۆز و پەیمانا خۆ دپارێزن. ﴿٩﴾ و ئەوێت ل نڤێژێت خۆ هشیار [ب ڕەنگێ پێدڤی و ل وەختی و ب ترس و بەردەوام دكەن]. ﴿١٠﴾ ئەڤەنە (خودانێت ڤان سالۆخەتان) ویرس. ﴿١١﴾ ئەوێت ب ویرسی بەحەشت دگەهیتێ و ئەو دێ هەر تێدا مینن. ﴿١٢﴾ و ب سویند مە مرۆڤ ژ هێڤێنێ هەرییێ چێكرییە. ﴿١٣﴾ پاشی مە ئەو كرە چپكەك، و خۆجهكر د مالبچویكیدا. ﴿١٤﴾ پاشی مە ئەو چپكە كرە خوینپارە (خوینەكا قەرسی و پێكڤە)، پاشی مە ئەو خوینپارە كرە گۆشتپارە، پاشی مە ژ گۆشتپارەی هەستی دا، و مە هەستی ب گۆشتی كراسكر و نخافت، پاشی [پشتی ڤان قوناخان، مە ڕوح دایێ]، و كرە چێكرییەكێ دی، و پاكی و بلندی بۆ باشترین و چێترین چێكەر. ﴿١٥﴾ پاشی [پشتی ڤێ چێكرنێ] ب ڕاستی هوین دێ مرن. ﴿١٦﴾ پاشی [پشتی مرنا هەوە ژی] ب ڕاستی ڕۆژا قیامەتێ، هوین دێ ساخ بنەڤە. ﴿١٧﴾ ب سویند مە حەفت ئەسمان یێت د سەر هەوەڕا چێكرین، و ئەم ژ چێكرنا وان نە د بێ ئاگەهین [پشتی چێكرنێ ئەم چاڤدێرییێ ژی لێ دكەین].

وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّٰهُ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ
ذَهَابٍۭ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ
وَأَعْنَٰبٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَجَرَةً
تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَآءَ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْءَاكِلِينَ ﴿٢٠﴾
وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا
مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٢٢﴾
وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ
مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ
وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا
ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ فَتَرَبَّصُوا۟ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٢٥﴾
قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٢٦﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ أَنِ ٱصْنَعِ
ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ ۙ فَٱسْلُكْ
فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ
ٱلْقَوْلُ مِنْهُمْ ۖ وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ۖ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٢٧﴾



﴿١٨﴾ و مە ئاڤەك ب پیڤان ژ عەوران ئینایییە خوارێ
[ئانكو ل دویڤ هەوجەییێ، نە هند گەلەك بیت
ئەردی هەمییێ بن ئاڤ بكەت و بغەرقینیت، و نە هند
كێم بیت یێت ل سەر ئەردی تێنی بمینن، و داروبار
نەمینن]، ڤێجا مە ئەو باران [بۆ هەوە] د ئەردیدا هێلا
و ڕاگرت [د كانی و ڕویبارانددا و... هتد]، و [كا مە
چاوا شیا وێ ئاڤێ بینین] ئەم وەسا دشێین وێ ئاڤێ
ببەین ژی. ﴿١٩﴾ ڤێجا مە بۆ هەوە جنیكێت دارقەسپان
و ڕەزێت تری پێ چێكرن، و بۆ هەوە د وان جنیكاندا
ژ بلی قەسپان و تری، گەلەك ڕەنگێت دی یێت فێقی
یێت هەین و ژ وی فێقی هوین [هەمی سالوەختان]
دخۆن. ﴿٢٠﴾ و مە [ب وێ ئاڤێ] دارەك دا، ل چیایێ
(طووری سیناء) شین دبیت [كو زەیتوونە]، و فێقییێ
وێ دبیتە ڕوین و پێخوارن بۆ یێ بڤێت بخۆت.
﴿٢١﴾ و ب ڕاستی چام و عیبرەت بۆ هەوە یێت د
چێلان و حێشتران و پەزیدا [كو هوین پێ بگەهنە
مەزناتییا خودێ، ئەگەر هوین هزرا خۆ تێدا بكەن]،
ئەم شیرێ وان ددەینە هەوە و گەلەك مفایێت دی ژی
بۆ هەوە یێت تێدا هەین، و هوین گۆشتێ وان ژی دخۆن. ﴿٢٢﴾ و هوین سواری وان و گەمییان دبن و ل
سەر دئێنە هەلگرتن [و د ئاڤ و دێمیدا دئێنە ڤەگوهازتن]. ﴿٢٣﴾ و ب سویند مە نووح [ب پێغەمبەراتی] بۆ
ملەتێ وی هنارت، گۆت: ملەتێ من.. خودێ ب تنێ بپەرێسن، هەوە چو پەرستییێت ڕاست و دورست
ژ بلی وی نینن، ئەرێ ما هوین ژ ئێزایا وی ناترسن، ئەو خودایێ هەوە، و هوین غەیری وی دپەرێسن.
﴿٢٤﴾ كەنكەنەیێت ملەتێ وی ئەوێت گاوربوویین گۆتن: ئەڤە ژ مرۆڤەكێ وەكی هەوە پێڤەتر نینە، و
نەپێغەمبەرە، دڤێت خۆ ل سەر هەوە مەزن بكەت [ئان دڤێت ب ڤێ گۆتنێ خۆ ل سەر هەوە ب قەدر
بێخیت]، و ئەگەر خودێ ڤیابایە پێغەمبەرەكی بهنێریت دا ملیاكەتەكی هنێریت، مە ئەڤە ژ باب و باپیرێت خۆ
یێت بەرێ گولێ نەبوویە كو پێغەمبەر مرۆڤ بن. ﴿٢٥﴾ ئەو مرۆڤەكێ دینە، ڤێجا ژ بەر هندێ هەتا دەمەكی
خۆ لێ بگرن [بەلكی چێ ببیت یان ژی بمریت]. ﴿٢٦﴾ [نووحی] گۆت: خودێوۆ چونكی وان ئەز درەوین
دانام، تو هاریكارییا من بكە، و من ب سەر وان بێخە [ئانكو وان د هیلاك ببە و بەرئاتاف بكە]. ﴿٢٧﴾ ڤێجا
مە وەحی بۆ نووحی هنارت، و مە گۆتێ گەمییێ ل بەر چاڤێت مە و ب چاڤدێرییا مە و ل دویڤ وەحییا
مە چێكە، ڤێجا گاڤا فەرمانا مە هات [كو ئێزا ب سەر واندا بێت]، و ئاڤ د تەنویرێ زا و هلاڤێت، و تو ژ
هەر نێر و مێیەكی [ژ وان جانەوەرێت د ئەردیدا]، و مالا خۆ و كەس و كارێت خۆ، ژ بلی وان یێت فەرمانا
مە ب هیلاكبرنا وان هاتی و بۆری، بكە د گەمییێدا، و پسیارا وان ژ من نەكە ئەوێت ستەم كرین [كو ئەز وان
ڕزگار بكەم]، ب ڕاستی ئەو د خەندقینە [دێ د ئاڤێدا خەندقن].

فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى
نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٨﴾ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ
خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا
مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟
ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا
مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ
مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٣٤﴾
أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾
۞ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا
ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا
رَجُلٌ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُۥ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ
ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٣٩﴾ قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَٰدِمِينَ ﴿٤٠﴾
فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ بِٱلْحَقِّ فَجَعَلْنَٰهُمْ غُثَآءً ۚ فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قُرُونًا ءَاخَرِينَ ﴿٤٢﴾

ربع الحزب ٣٥



﴿٢٨﴾ ڤێجا گاڤا تو و ئەوێت د گەل تە، ل گەمیێ سواربوون، بێژە: هەمی سوپاسی و شوکور و حەمد بۆ وی خودایێ، ئەم ژ ملەتێ ستەمکار رزگارکرین. ﴿٢٩﴾ و بێژە: خودێوۆ من ئینانەخوارەکا پیرۆز بینە خوارێ [کو ئەم پێ ژ هەمی نەخۆشیان د پارستی بین]، و تو ژ هەمی خودان کەرەمان کەرەمدارتری. ﴿٣٠﴾ و ب راستی ئەڤە [سەرهاتیا نووحی] بەلگە و نیشانن [ل سەر شیان و دەستهەلاتداریا خودێ]، هەرچەندە مە ئەو پێ دجەرباندن [دا دیاربیت کا کی گوهدارە، و کی نەگوهدارە]. ﴿٣١﴾ پاشی مە د دویڤ وانرا، ملەتەکێ دی ئینا. ﴿٣٢﴾ و مە پێغەمبەرەك بۆ وان هەر ژ وان هنارت [و گۆتە وان] خودێ بپەرێسن، هەوە ژ بلی وی چو پەرستیێت راست و دورست نینن، ڤێجا ما هوین ژ خودێ ناترسن، غەیری وی دپەرێسن. ﴿٣٣﴾ و کەنکەنەیێت ملەتێ وی ئەوێت گاوربوویین، و رۆژا قیامەتێ درەو دانایین، و ئەوێت مە خۆشی و بەرفرەهی د ژیانا دنیایێدا دایینێ [گۆتن]: ئەڤ پێغەمبەرە ژ مرۆڤەکێ وەکی هەوە پێڤەتر نینە، و نەپێغەمبەرە، هوین چ دخۆن و ڤەدخۆن، ئەو ژی وی دخۆت و ڤەدخۆت. ﴿٣٤﴾ و ئەگەر هوین گوهێ خۆ بدەنە مرۆڤەکێ وەکی خۆ، ب راستی هنگی هوین خوسارەتن. ﴿٣٥﴾ ئەرێ ئەو پەیمانێ ددەتە هەوە و دبێژیت، گاڤا هوین مرن و بوونە ئاخ و هەستی، جارەکا دی [رۆژا قیامەتێ] دێ رابنەڤە. ﴿٣٦﴾ یا دویر دویرە، پەیمانا بۆ هەوە هاتییە دان ب جهـ بێت، و جارەکا دی هوین ساخ ببنەڤە. ﴿٣٧﴾ چو ژیان نینن، ژ ژیانا مە یا دنیایێ پێڤەتر، هندەك ژ مە دێ مرن و هندەك دێ بن و ژین [و دنیا هەر یا هۆسایە]، و پشتی مرنێ ئەم ساخ نابینەڤە. ﴿٣٨﴾ ئەو ژ بلی هندێ کو زەلامەکێ درەوینە، درەوان ژ کیسێ خودێ دکەت، چو یێ دی نینە، و ئەم باوەر ژێ ناکەین. ﴿٣٩﴾ [پێغەمبەرێ وان] گۆت: [پشتی بۆ دیاربووی کو ئەو د بنیرا باوەرییێ پێ نائینن] خودێوۆ هاری من بکە، و من ب سەر وان بێخە، و تۆلێت من ل وان ڤەکە چونکی ئەو من درەوین ددانن. ﴿٤٠﴾ [خودێ] گۆت: نێزیك ئەو دێ [ژ کار و کریارێت خۆ، و درەوین دانانا تە] پەشێمان بن. ﴿٤١﴾ ڤێجا هشکەقیرییەکێ ئەو هنگاڤتن، و مە ئەو وەکی لێمشتێ (گلێشێ ئاڤ ب خۆرا دئینت) لێ کرن، ڤێجا هیلاك، و دویری ژ دلۆڤانیا خودێ، بۆ ملەتێ ستەمکار بیت. ﴿٤٢﴾ پاشی پشتی وان، مە هندەك دەستەکێت دی ئینان.

مَا تَسۡبِقُ مِنۡ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ ﴿٤٣﴾ ثُمَّ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا
تَتۡرَاۖ كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةٗ رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُۖ فَأَتۡبَعۡنَا بَعۡضَهُم بَعۡضٗا
وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَحَادِيثَۚ فَبُعۡدٗا لِّقَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ ﴿٤٤﴾ ثُمَّ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ
وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ
فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لِبَشَرَيۡنِ مِثۡلِنَا
وَقَوۡمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾ فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُواْ مِنَ ٱلۡمُهۡلَكِينَ ﴿٤٨﴾
وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ لَعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ ﴿٤٩﴾ وَجَعَلۡنَا
ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةٗ وَءَاوَيۡنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبۡوَةٖ ذَاتِ قَرَارٖ وَمَعِينٖ ﴿٥٠﴾
يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا
تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ﴿٥١﴾ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ
فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ فَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ زُبُرٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ
فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ فَذَرۡهُمۡ فِي غَمۡرَتِهِمۡ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٥٤﴾ أَيَحۡسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم
بِهِۦ مِن مَّالٖ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمۡ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ بَل لَّا يَشۡعُرُونَ ﴿٥٦﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنۡ خَشۡيَةِ رَبِّهِم مُّشۡفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُم
بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ ﴿٥٩﴾



﴿٤٣﴾ و ب ڕاستی چو ملەت د ئیزادان و نەمانا خۆدا،
ب پێش و پاش وی وەختێ بۆ وان هاتیە دانان،
ناکەڤن. ﴿٤٤﴾ پاشی مە پێغەمبەرێت خۆ ئێك ل
دویڤ ئێکی هنارت، و هەر ملەتێ پێغەمبەرێ وان
بۆ دهات پێغەمبەرێ خۆ درەوین ددانان، ڤێجا مە ژێ
ئێك ل دویڤ ئێکی بەرئاتاف کرن و د هیلاك برن، و
مە کرنە سەرهاتی و پێ ئاخڤتنا خەلکی، ڤێجا هیلاك
و دویری ژ دلۆڤانیا خودێ بۆ وی ملەتی بیت ئەوێ
باوەریێ نەئینیت. ﴿٤٥﴾ پاشی مە مووسا و برایێ
وی هاروون، ب موعجیزەیێت خۆڤە و ب بەلگە و
نیشانێت ئاشکەراڤە هنارتن. ﴿٤٦﴾ بۆ دەڤ فیرعەونی
و ملەتێ وی، بەلێ خۆ مەزن کرن [و باوەری
پێ نەئینان]، و ئەو ملەتەکێ دفن بلند بوون.
﴿٤٧﴾ و گۆتن: ئەم چاوا باوەریێ ب دو مرۆڤان
بینین، کو ئەو ژی وەکی مە مرۆڤن و ملەتێ وان
سەپان و خزمەتکارێت مەنە. ﴿٤٨﴾ ڤێجا [فیرعەونی
و قولپا وی] مووسا و هاروون درەوین دانان، ڤێجا
دویماهیا وان د هیلاك چۆن. ﴿٤٩﴾ و ب سویند
مە تەورات دا مووسایی، دا ئسرائیلی پێ ڕاستەڕێ ببن. ﴿٥٠﴾ و مە عیسایێ کوڕێ مەریەمێ و دەیکا وی
مەریەم کرنە موعجیزە و نیشانەکا ئاشکەرا [ل سەر هێز و شیانداریا خودێ، وەختێ عیسا بێ باب دایی]،
و مە ل جهەکێ بلند و دەشت و ب داروبار و ب کانی ئاکنجی کرن. ﴿٥١﴾ گەلی پێغەمبەران ژ پاك و پاقژێ
حەلال بخۆن، و کار و کریارێت باش بکەن، ب ڕاستی تشتێ هوین دکەن ئەز پێ ئاگەهدارم. ﴿٥٢﴾ و بزانن
[گەلی پێغەمبەران] ئەڤە دینێ هەوەیە، ئێك دینە [کو دینێ تەوحیدێیە]، و ئەز خودایێ هەوەمە [بێ هەڤال و
هەڤپشکم]، ڤێجا پارێزکاریا من بکەن و ژ من بترسن. ﴿٥٣﴾ ڤێجا [دویکەڤتیێت پێغەمبەران] د کارێ دینێ
خۆدا [هەرچەندە ئێك دینە و د بنیاتا خۆدا ئێکە، دینێ تەوحیدێیە] ژێکڤەبوون و ژێك ڤەقەتیان، و بوونە
دەستەك دەستەك و کۆم کۆم، هەر کۆمەك [ئەوێت ژێکڤەبوویین، و ل سەر دینێ خۆ ژێك جودا بوویین]،
ب وێ یا وان هەی، دلخۆش و شادن. ﴿٥٤﴾ ڤێجا [هەی موحەمەد] وان د ناڤ نەزانین و بێ ئاگەهیا واندا
بهێلە [و تەنگاڤ نەبە ژ بەر گیرۆبوونا ئیزادانا وان]، هەتا دمرن [پاشی خودێ دێ وان ب ئاگرێ دۆژەهێ
ئیزا دەت]. ﴿٥٥﴾ ئەرێ [گاور] هزر دکەن، ئەو مال و عەیالێ ئەم [د دنیایێدا] ددەینە وان. ﴿٥٦﴾ لەزە ئەم
بۆ وان ل خێر و خۆشیان دکەین؟ نەخێر [وەسا نینە وەکی ئەو هزر دکەن] نوزانن ئەڤە سەردابرنە، دا پتر
گونەهان بکەن و پتر هێژایی جزایی ببن، ئەو ب خۆ ناحەسن ژێ. ﴿٥٧﴾ و ئەوێت ژ ترسا جزایێ خودایێ
خۆ، بەردەوام ب ترس و ڤەجنقی و هشیار. ﴿٥٨﴾ و ئەوێت باوەریێ ب ئایەتێت خودایێ خۆ [ئانکو
کتێبێت خودایێ خۆ، هەمییان بێ فەرق و جوداهی] دئینن. ﴿٥٩﴾ و ئەوێت چو هەڤال و هەڤپشکان بۆ
خودایێ خۆ چێ ناکەن.

وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ٦٠
أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَهُمۡ لَهَا سَٰبِقُونَ ٦١ وَلَا نُكَلِّفُ
نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ وَلَدَيۡنَا كِتَٰبٞ يَنطِقُ بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ٦٢
بَلۡ قُلُوبُهُمۡ فِي غَمۡرَةٖ مِّنۡ هَٰذَا وَلَهُمۡ أَعۡمَٰلٞ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ
هُمۡ لَهَا عَٰمِلُونَ ٦٣ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذۡنَا مُتۡرَفِيهِم بِٱلۡعَذَابِ إِذَا هُمۡ
يَجۡـَٔرُونَ ٦٤ لَا تَجۡـَٔرُواْ ٱلۡيَوۡمَۖ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ٦٥ قَدۡ كَانَتۡ
ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ تَنكِصُونَ ٦٦
مُسۡتَكۡبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرٗا تَهۡجُرُونَ ٦٧ أَفَلَمۡ يَدَّبَّرُواْ ٱلۡقَوۡلَ أَمۡ
جَآءَهُم مَّا لَمۡ يَأۡتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٦٨ أَمۡ لَمۡ يَعۡرِفُواْ رَسُولَهُمۡ
فَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ٦٩ أَمۡ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةُۢۚ بَلۡ جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ
وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ٧٠ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ
ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ فَهُمۡ
عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ ٧١ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ خَرۡجٗا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيۡرٞۖ
وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ٧٢ وَإِنَّكَ لَتَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٧٣
وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ٧٤



﴿٦٠﴾ و ئەوێت سەدەقەیان ژ وی مالی ددەن، یێ خودێ دایییە وان [یان ژی وێ خێر و باشییا ئەو دکەن، دکەن]، و دلێ وان یێ ب ترسە [دترسن خودێ ژ وان قەبویل نەکەت] چونکی دێ هەر ب بال خودێڤە زڤڕن. ﴿٦١﴾ خودانێت ڤان سالۆخەتانن لەزێ ل خێران دکەن، و بەری خەلکی، خۆ دهاڤێژنە خێرێ. ﴿٦٢﴾ و ئەم کەسێ ژ شیانا وی زێدەتر ژێ ناخوازین [ڤێجا چاوا بشێت، بلا وەسا باشی و خێران بکەت، ئەگەر نەشیا ژ پێڤە نڤێژێ بکەت، بلا ڕوینشتی بکەت...]، و کتێبەکا ل دەڤ مە هەی [کو کتێبا کار و کریارانە] هەقی پێ ئاشکەرا دبیت و ڕاستییێ دبێژیت، و چو ستەم ل وان نائێتەکرن [نە گونەهێت وان ل سەر زێدە دبن، و نە خێرێت وان کێم دبن]. ﴿٦٣﴾ بەلێ دلێت گاوران ژ ڤێ قورئانێ [یان ژ کتێبا کار و کریاران] د بێ ئاگەهن، و وان ژ بلی وێ ئەوا دکەن [کو شرك و گاورییە]، هندەك کارێت خرابێت دی یێت هەین، بۆ کاردکەن. ﴿٦٤﴾ ڤێجا گاڤا مە زەنگین و مەزنێت وان ئەوێت د خێر و خۆشییاندا ڕابووین، بەرهنگاری ئیزا و عەزابێ کرن، دبیتە هەوار هەوارا وان. ﴿٦٥﴾ چو زارزار و هەوار هەوارێ ئەڤرۆ نەکەن، چو هاریکاری ژ دەڤ مە بۆ هەوە نینە [هوین پێ بێنە رزگار کرن ژ وێ ئیزایا هوین تێدا]. ﴿٦٦﴾ ب سویند قورئانا من د دنیایێدا بۆ هەوە دهاتە خواندن [و هەوە گولێ دبوو]، و هوین ل سەر پاشپانییێت خۆ دزڤڕین، و هەوە پشتا خۆ ددایێ، و گوهداریيا وێ نەدکر. ﴿٦٧﴾ و هەوە خۆ ب کەعبەیێ [ل سەر موسلمانان] مەزن دکر [و هەوە دگۆت: ئەم خودانێت کەعبەیێینە، و کەس ب سەر مە ناکەڤیت]، و هەوە د شەڤبێرییێت خۆدا تەعن ددانانە قورئانێ، و د دەرهەقێ وێدا هوین کرێت دئاخڤتن. ﴿٦٨﴾ [ئەو وێ دکەن یا دکەن، و گاور دبن و باوەرییێ نائینن، چونکی ئەو د قورئانێ ناگەهن و هزرا خۆ تێدا ناکەن، دا بزانن موعجیزەیە و نیشانا ڕاستییا پێغەمبەرییە، و دا باوەرییێ پێ بینن] ئەرێ ئەو د قورئانێ ناگەهن؟ یان ئەو بۆ وان یا هاتی، یا بۆ باب و باپیرێت وان نەهاتی [ژ بەر هندێ دویر ددانن، و باوەرییێ پێ نائینن]. ﴿٦٩﴾ یان ژی وان پێغەمبەرێ خۆ [بەری نوکە ب ڕاستبێژی و دلبێشی و ئەمینیێ] نەناسییە، لەو باوەرییێ پێ نائینن. ﴿٧٠﴾ یان ژی دبێژن: [موحەممەد] یێ دینە [و ئەو دزانن ئەو ژ وان هەمییان ب ئاقلترە]؟ وەسا نینە وەکی ئەو دبێژن، باوەری نەئینانا وان نە ژ بەر ڤان هەجەتانە، بەلێ [موحەممەدی] ڕاستی [کو ئیسلامە و دینێ دورستە] یا بۆ وان ئینایی، و باراپتر ژ وان حەژ ڕاستییێ ناکەن. ﴿٧١﴾ و ئەگەر هەقی و ڕاستی ل دویڤ دلخوازی و حەزکرنا وان هاتبایە، دا ئەرد و ئەسمان و هندی تێدا پویچ بن، بەلێ مە قورئان دا وان، کو سەربلندییا وان یا تێدا، بەلێ ئەو ڕوییێ خۆ ژ ڤێ قورئانێ و سەربلندییا خۆ وەردگێڕن. ﴿٧٢﴾ یان ژی تو خویك و خەراجەکی ل سەر پێغەمبەراتییا خۆ ژ وان دخوازی؟ [ژ بەر هندێ باوەر ژ تە ناکەن]، و ب ڕاستی ڕزقێ خودایێ تە و دانا وی بۆ تە چێترە، و ئەو باشترین ڕزقدارە. ﴿٧٣﴾ و ب ڕاستی تو بەرێ وان ددەیە ڕێکا ڕاست [کو ئیسلامە]. ﴿٧٤﴾ و ئەوێت باوەری ب ڕۆژا قیامەتێ نەیی، ئەو ژ ڕێکا ڕاست د ڤەدەرن.

نصف الحِزْب ٣٥

۞ وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّواْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ
يَعْمَهُونَ ﴿٧٥﴾ وَلَقَدْ أَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُواْ لِرَبِّهِمْ
وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴿٧٦﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ
إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ
وَٱلْأَفْـِٔدَةَۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي ذَرَأَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ
وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٩﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يُحْيِۦ وَيُمِيتُ وَلَهُ ٱخْتِلَٰفُ
ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٨٠﴾ بَلْ قَالُواْ مِثْلَ مَا قَالَ
ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوٓاْ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا
لَمَبْعُوثُونَ ﴿٨٢﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ
إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨٣﴾ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن
فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلْ أَفَلَا
تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ
ٱلْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَنۢ
بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن
كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾





﴿٧٥﴾ و ئەگەر ئەم دلۆڤانیێ ب وان ببەین، و
ئەو نەخۆشی و تەنگاڤیا گەهشتییە وان ل سەر
وان ڕاکەین، بێ گۆمان ئەو دێ پتر ڕژدییێ د
زێدە خرابییا خۆدا کەن، و هەر دێ تێدا زڤڕن.
﴿٧٦﴾ و ب سویند مە ئەو بەرهنگاری ئیزاییێ کرن،
[دگەل هندێ ژی] ئەو خۆ بۆ خودایێ خۆ ناشکێنن،
و خۆشکاندی دوعایان ناکەن. ﴿٧٧﴾ [و مانە د ڤی
سەروبەریدا] هەتا مە دەرگەهەکێ ئیزا و عەزابەکا
دژوار ل سەر وان ڤەکری [ئانکو هەتا ئەمرێ خودێ
ب قیامەتێ هاتی، ڤێجا ب بەر وێ ئیزاییێ کەڤتن یا
وان هزر بۆ نەدکر]، ڤێجا ژ نوی ڕەق ڕاوەستیان و بێ
هیڤی بوون. ﴿٧٨﴾ و خودێ ئەوە یێ گوهـ و چاڤ
و دل داینە هەوە، و کێمەك ژ هەوە سوپاسییا خودێ
دکەن. ﴿٧٩﴾ و خودێیە یێ هوین داینە سەر ئەردی،
و ب بال ویڤە دێ زڤڕن و کۆم بن. ﴿٨٠﴾ و ئەوە یێ
ساخییێ و مرنێ ددەت، و گوهۆڕینا شەڤ و ڕۆژان
[کێمکرن و زێدەکرنا وان] کارێ وییە، ئەرێ ما هوین
هزرا خۆ ناکەن، دا تێ بگەهن. ﴿٨١﴾ نە [وان ئەقل
نینە، و تێ ناگەهن] ئەوان ژی ئەو گۆت ئەوا ئەوێت کەڤن، بەری وان گۆتی. ﴿٨٢﴾ گۆتن: ئەرێ ئەگەر
ئەم مرین و بووینە ئاخ و هەستی، ئەرێ جارەکا دی پشتی مرنێ ئەم دێ ساخبینەڤە؟! ﴿٨٣﴾ ب سویند
ئەڤ پەیمانە [کو جارەکا دی پشتی مرنێ ئەم دێ ژ گۆڕان ڕابین] دگەل مە و باب و باپیرێت مە هاتبوو
دان، بەری هاتنا موحەممەدی [بەلێ پا کا، مە چو باب و باپیرێت خۆ نەدیتن ژ گۆڕان ڕابووین]، و ئەڤە ژ
ئەفسانە و چیڤانۆکان پێڤەتر نینە. ﴿٨٤﴾ [هەی موحەممەد بێژە وان]: باشە ئەرد و هندی تێدا، یێ کێیە؟ ئەگەر
هوین ڕاست تشتەکی دزانن. ﴿٨٥﴾ دێ بێژن یێ خودێیە، بێژە [وان]: ڤێجا ما هوین بۆ خۆ چامەکێ ناگرن
[پێ بزانن، یێ ئەرد و ئەسمان داین هوین ژی یێت داین، دێ هەوە بەت و ساخکەتەڤە]. ﴿٨٦﴾ [هەی
موحەممەد بێژە وان]: کییە خودانێ هەر حەفت ئەسمانان، و خودانێ عەرشێ مەزن؟ ﴿٨٧﴾ دێ بێژن یێت
خودێنە، بێژە: ڤێجا ما هوین ژ ئیزایا وی ناترسن، هوین غەیری وی دپەرێسن؟ ﴿٨٨﴾ بێژە: ملکێ مەزن و
گەنجخانەیێت هەمی تشتان د دەستێ کێ دانە؟ و ئەو کییە، یێ بڤێت بەرەڤانییێ ژێ دکەت، و د هەوارا وی
دئێت، و کەس نەشێت کەسێ ژ ئیزایا وی بدەتە پاش و بەرەڤانییێ ژێ بکەت، ئەگەر هوین ڕاست تشتەکی
دزانن [کا بۆ من بێژن ئەو کییە]؟ ﴿٨٩﴾ دێ بێژن: ئەو هەمی یێت خودێنە، بێژە: ڤێجا پا چاوا هوین دئێنە
خاپاندن، و بەرێ هەوە ژ پەرستنا خودێ دئێتە وەرگێڕان.

بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ٩٠ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن
وَلَدٖ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنۡ إِلَٰهٍۚ إِذٗا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهِۭ بِمَا خَلَقَ
وَلَعَلَا بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ٩١
عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٩٢ قُل رَّبِّ
إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ ٩٣ رَبِّ فَلَا تَجۡعَلۡنِي فِي ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٩٤
وَإِنَّا عَلَىٰٓ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمۡ لَقَٰدِرُونَ ٩٥ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي
هِيَ أَحۡسَنُ ٱلسَّيِّئَةَۚ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ٩٦ وَقُل رَّبِّ
أَعُوذُ بِكَ مِنۡ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ٩٧ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن
يَحۡضُرُونِ ٩٨ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ رَبِّ
ٱرۡجِعُونِ ٩٩ لَعَلِّيٓ أَعۡمَلُ صَٰلِحٗا فِيمَا تَرَكۡتُۚ كَلَّآۚ إِنَّهَا
كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَاۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ١٠٠
فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ١٠١
فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٠٢ وَمَنۡ
خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فِي جَهَنَّمَ
خَٰلِدُونَ ١٠٣ تَلۡفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمۡ فِيهَا كَٰلِحُونَ ١٠٤



﴿٩٠﴾ بەلێ وەسا نینە وەكی ئەو دبێژن، مە ڕاستی و هەقی یا بۆ وان ئینایی [كو پێدڤییە ل دویڤ بچن]، و ب ڕاستی ئەو درەوان دكەن [د گۆتنا خۆدا كو خودێ زارۆكەكێ بۆ خۆ گرتی یان هەڤپشكەكێ هەی]. ﴿٩١﴾ خودێ چو زارۆك بۆ خۆ نەگرتینە، و چو پەرستی ژی د گەل وی نینن [و ئەگەر وەسا بایە وەكی ئەو دبێژن، كو پەرستییەكێ دی د گەل هەبایە]، دا هەر پەرستییەك كا چ چێكرییە پێڤە مینیت، و دا هندەك خۆ ب سەر هندەكان ئێخن، خودێ یێ پاك و پاقژە ژ وان سالۆخەتێت ب بالڤە لێ ددەن [ئانكو ژ عەیالی و هەڤبەری]. ﴿٩٢﴾ خودێ زانایێ نهێنی و ئاشكەرایانە، و خودێ د سەر وێ شركێڕایە یا ئەو دكەن، و ژێ بلندترە. ﴿٩٣﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: خودێوۆ ئەگەر ئەو پەیمانا ب ئیزایێ و عەزابێ تە داییە وان [د دنیایێ و ئاخرەتێدا]، هەر دێ نیشا من دەی. ﴿٩٤﴾ خودێوۆ هنگی تو من نەئێخە د گەل ستەمكاران. ﴿٩٥﴾ و ب ڕاستی ئەم دشێین، ئەو پەیمانا ب ئیزایێ مە داییە وان، نیشا تە بدەین [و وان هەمییان ب بەر ئیزایێ بێخین، بەلێ خودێ گیرۆ دكەت، چونكی دزانیت هندەك ژ وان دێ باوەرییێ ئینن]. ﴿٩٦﴾ [هەی موحەمەد] خرابییا ئەو د ڕاستا تەدا دكەن، ب باشییێ بدە پاش [ئانكو ب سالۆخەتێت چێتر و باشتر بدە پاش، ئەو ژی لێبۆرین و بەروەگێڕانە ژ كار و كریارێت گاوران]، و ئەم چێتر دزانین كا ئەو چ د ڕاستا تەدا دبێژن. ﴿٩٧﴾ و بێژە: خودێوۆ ئەز خۆ ب تە دپارێزم، ژ پالدان و زخاندن و وەسواسا شەیتانان. ﴿٩٨﴾ و خودێوۆ ئەز خۆ ب تە دپارێزم، ژ بەرهەڤبوون و حازربوونا وان [كو ئەو بشێن ب وەسواس و ئاوازێت خۆ، خرابییەكێ ب من بدەنە كرن]. ﴿٩٩﴾ [بەردەوام ئەو دێ د شركێ و گونەهێدا بن، یان ب خرابی دێ بەحسێ تە كەن] هەتا وەختێ مرنا ئێك ژ وان دئێت، دێ بێژیت: خودێوۆ، من بزڤرینەڤە [دنیایێ، دا ئەز تە بپەرێسم]. ﴿١٠٠﴾ دا ئەز كریارا قەنج [د دنیایێدا] ئەوا من هێلایی، بكەم، نەخێر زڤرین بۆ دنیایێ نینە، نەخێر ڤێجا بلا وێ داخوازێ نەكەن، ئەوا چێ نەبیت، ئەو ئاخڤتنەكە ئەو بۆ خۆ دكەن، و ناڤبرەك هەتا ڕۆژا قیامەتێ یا ل بەر سینگێ وان [ناهێلیت ئەو بزڤرنە دنیایێ]. ﴿١٠١﴾ و ئەگەر پف ل بۆقێ هاتە دان، هنگی مرۆڤانی [مرۆڤانییا خوینێ] د ناڤبەرا واندا نامینیت [كەسێ ئاگەهـ ژ كەسێ نامینیت خۆ پێ مەزنكەت یان مفایی بگەهینیتێ]، و كەس پسیارا كەسێ ناكەت [هەر ئێك ب خۆڤە یێ مژویلە]. ﴿١٠٢﴾ ڤێجا ئەو كەسێ تەرازوییا وی ب كار و كریارێت قەنج گران بوو، ئەڤە دێ د سەرفەراز بن. ﴿١٠٣﴾ و ئەو كەسێ تەرازوییا وی ب كار و كریارێت قەنج سڤك ببیت، ئەڤە ئەون ئەوێت خۆ خوسارەت كرین، و هەروهەر دێ د دۆژەهێدا مینن. ﴿١٠٤﴾ ئاگر سەروچاڤێت وان دسۆژیت، و لێڤێت وان دقورمچن، و ددانێت وان قیچ دبن، و گەلەك كرێت دبن.

أَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ١٠٥
قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتۡ عَلَيۡنَا شِقۡوَتُنَا وَكُنَّا قَوۡمٗا ضَآلِّينَ ١٠٦
رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡهَا فَإِنۡ عُدۡنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ١٠٧
قَالَ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ١٠٨ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡ
عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَا وَأَنتَ
خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ١٠٩ فَٱتَّخَذۡتُمُوهُمۡ سِخۡرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوۡكُمۡ ذِكۡرِي
وَكُنتُم مِّنۡهُمۡ تَضۡحَكُونَ ١١٠ إِنِّي جَزَيۡتُهُمُ ٱلۡيَوۡمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ
أَنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ١١١ قَٰلَ كَمۡ لَبِثۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ عَدَدَ
سِنِينَ ١١٢ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ فَسۡـَٔلِ ٱلۡعَآدِّينَ ١١٣
قَٰلَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗاۖ لَّوۡ أَنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ١١٤
أَفَحَسِبۡتُمۡ أَنَّمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ عَبَثٗا وَأَنَّكُمۡ إِلَيۡنَا لَا تُرۡجَعُونَ ١١٥
فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡكَرِيمِ ١١٦
وَمَن يَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرۡهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ
فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ١١٧
وَقُل رَّبِّ ٱغۡفِرۡ وَٱرۡحَمۡ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ١١٨



﴿١٠٥﴾ [وەختێ ئەو زارزارێ دکەن، خودێ دبێژیتە
وان]: ئەرێ ما نیشانێت من (ئایەتێت قورئانا من) بۆ
هەوە د دنیایێدا نەدهاتنە خواندن، و هەوە درەو ددانان.
﴿١٠٦﴾ دێ بێژن: خودێوۆ خرابی و دلخوازیا مە، سەر
ژ مە ستاند، و ئەم ملەتەکێ گومڕا و سەرکۆرە بووین.
﴿١٠٧﴾ خودێوۆ، مە ژ ئاگرێ دۆژەهێ دەربێخە [و مە
بزڤڕینەڤە دنیایێ]، ڤێجا ئەگەر ئەم [پشتی تو مە ژ
ئاگری دەردئێخی، و دزڤڕینیەڤە دنیایێ] جارەکا
دی ل گاوریێ و خرابیێ و گونەهێ زڤڕین، هنگی
ئەم یێت ستەمکارین. ﴿١٠٨﴾ [خودێ] دێ بێژیت:
ڕەزیل و ڕسوا تێدا بمینن [توتبن وەکی سەیان] و
بێ دەنگ بن، و د گەل من نەئاخڤن. ﴿١٠٩﴾ [ژ بیرا
هەوە چۆ، کا هەوە چاوا ترانە بۆ خۆ ب موسلمانان
دکرن؟] ب ڕاستی دەستەکەك ژ بەندەیێت من هەبوون
دگۆتن: خودێوۆ مە باوەری ئینا، ڤێجا ل مە نەگرە،
و گونەهێت مە ژێ ببە و دلۆڤانیێ ب مە ببە، و تو
چێترین دلۆڤانی. ﴿١١٠﴾ [چونکی وان بۆ خۆ ئەڤ
دوعایە ژ من دکر] ڤێجا هەوە کرنە پێیاریکەر و
پێترانکێت خۆ [هوین هند مانە ب ترانەپێکرنا وانڤە]، هەتا [ترانەپێکرنا] وان ئەز ژ بیرا هەوە بریم، و هەوە
[د دنیایێدا] ب وان دکرە کەنی. ﴿١١١﴾ ب ڕاستی من ئەڤرۆ ژ بەر سەبرا وان [ل سەر ئەزیەت و ترانەپێکرنا
هەوە] کێشایی، ئەو خەلاتکرن، ب ڕاستی هەر ئەوون یێت سەرفەراز. ﴿١١٢﴾ خودێ دێ بێژیتە وان: هوین
چەند سالان د دنیایێدا مایینە؟. ﴿١١٣﴾ دێ بێژن: ئەم ڕۆژەکێ یان ژی دانەکێ ڕۆژێ یێت مایین، کا پسیارا
حسابداران بکە. ﴿١١٤﴾ گۆت: [ڕاستە] هوین ژ وەختەکێ کێم پێڤەتر نەمایینە، ئەگەر هەوە زانیبایە [هوین
نەدمانە ب ڤی ژیێ کێمڤە، و هەوە پشتا خۆ نەددا ژیانا هەروهەر و خۆشییێت بەردەوام]. ﴿١١٥﴾ [گەلی
مرۆڤان] ئەرێ هوین هزر دکەن، مە هوین ژ قەستا یێت دایین [جزا و خەلات نینە]، و هوین جارەکا دی ب
بال مەڤە نائێنە زڤراندن. ﴿١١٦﴾ ڤێجا خودێ ژ هندێ [کو ژ قەستا هەوە چێ کەت و بدەت] بلندتر و پاقژترە،
ئەوە خوندکارێ ڕاست و دورست، چو پەرستییێت ڕاست و دورست ژ بلی وی نینن، ئەوە خودانێ عەرشێ
پیرۆز. ﴿١١٧﴾ و هەر کەسێ پەرستیەکێ دی د گەل خودێ بپەرێسیت، وی چو بەلگە و نیشان نەبن، حسێبا
وی بەس ل دەڤ خودایێ ویە [ئەو دێ جزایێ وی دەتێ]، ب ڕاستی گاور سەرفەراز نابن. ﴿١١٨﴾ و [هەی
موحەمەد] بێژە: خودێوۆ گونەهان ژێ ببە و دلۆڤانیێ ب من ببە، و تو چێترین دلۆڤانی.

## سُورَةُ النُّورِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ثلاثة أرباع الحزب ٣٥

سُورَةٌ أَنزَلْنَٰهَا وَفَرَضْنَٰهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَآ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١﴾
ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ۖ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا
رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا
طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ
لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ
يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ
جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا
ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ وَٱلَّذِينَ
يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ
شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ
إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ
بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ
ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾





## سۆرەتا نوور

**ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٦٤) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ ئەڤە سۆرەتەکە مە ئینایییە خوارێ، و ئەحکامێت تێدا، مە یێت فەرزکرین، و مە نیشانێت ئاشکەرا یێت تێدا ئینایینە خوار، دا هوین پێڤە بچن [و کار ب وان بریاران بکەن]. ﴿٢﴾ زناکەرا شوینەکری و زناکەرێ ژن نەئینایی، هەر ئێکی سەد قامچیان لێ بدەن، و بلا دلێ هەوە ل سەر حسێبا دینێ خودێ، نەمینتە ب وانڤە [کو هوین ئەمرێ خودێ ب جهـ نەئینن]، ئەگەر هوین ئەو بن ئەوێت هەوە باوەری ب خودێ و رۆژا قیامەتێ هەی، و بلا کۆمەك ژ موسلمانان جزادانا وان ببینن [دا پتر پێڤەبچن و جزایێ وان پتر یێ گران بیت، و دا نێزیکی ڤێ گونەهێ نەبن]. ﴿٣﴾ زەلامێ زناکەر نەهێژایە دەهمەن پاقژەکێ مارە بکەت، یا زناکەر یان یا موشرك هێژایی ویە، و ژنا زناکەر نەهێژایە شوی ب دەهمەن پاقژەکی بکەت، زەلامێ زناکەر یان موشرك هێژایی وێیە، و ئەڤ کارە (زنا) ل سەر خودان باوەران یێ هاتییە حەرامکرن. ﴿٤﴾ و ئەوێت ب زنایێ، بێ بەختییێ ل ژنێت دەهمەن پاقژ دکەن، پاشی چار شاهدان ل سەر نەئینن، ڤێجا هەشتێ قامچیان ل وان بدەن، و چو جاران شادەییا وان قەبویل نەکەن، و ب راستی ئەڤە [ئەوێت ژ بێ بەختی ژنێت دەهمەن پاقژ گونەهکار دکەن] ژ رێکا راست دەرکەڤتینە. ﴿٥﴾ ئەو نەبن یێت پشتی هنگی تۆبەکرین، و کریارا خۆ دورستکرین [بێ بەختییا خۆ هەڤاندین، و دیارکرین کو ئەو د شادەییا خۆدا درەوین و بێ بەخت بوون، و تۆبەیا خۆ ئاشکەراکرین] ب راستی خودێ یێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٦﴾ و ئەوێت هەڤسەرێت خۆ ب زنایێ گونەهکار دکەن، و ژ بلی خۆ چو شاهد ل سەر نەبن، شادەییا ئێك ژ وان [کو جزایی ل سەر وان راکەت] چار جاران بێژیت و شادەییێ بدەت [ب سویند ئەز د شادەییا خۆدا ژ راستگۆیانم]. ﴿٧﴾ و جارا پێنجێ بێژیت لەعنەتێت خودێ ل سەر من بن، ئەگەر ئەز [د شادەییا خۆدا] ژ درەوینان بم. ﴿٨﴾ و ئیزایا دنیایێ دێ ل سەر ژنێ رابیت، ئەو چار جاران شادەییێ بدەت [و بێژیت: ئەز سویند دخۆم] ئەو [ب ڤێ شادەییا خۆ] ژ درەوینانە. ﴿٩﴾ و د شادەییا پێنجێدا بێژیت: غەزەبا خودێ ل سەر من بیت، ئەگەر ئەو [د شادەییا خۆدا] ژ راستگۆیان بیت. ﴿١٠﴾ و ئەگەر کەرەم و دلۆڤانییا خودێ ل سەر هەوە نەبایە [دا هوین د هیلاك چن و شەرمزار بن، و دا خودێ لەزێ ل ئیزادانا هەوە کەت]، و خودێ ب راستی تۆبەوەرگر و کاربنەجهە.

إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ
هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ
كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١١﴾ لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ
وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمۡ خَيۡرٗا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ ﴿١٢﴾ لَّوۡلَا
جَآءُو عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَۚ فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُوْلَٰٓئِكَ
عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ
فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ لَمَسَّكُمۡ فِي مَآ أَفَضۡتُمۡ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾
إِذۡ تَلَقَّوۡنَهُۥ بِأَلۡسِنَتِكُمۡ وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم مَّا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ
وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ ﴿١٥﴾ وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ
قُلۡتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ
عَظِيمٞ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثۡلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم
مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ إِنَّ
ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ
أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوۡلَا
فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٠﴾





﴿١١﴾ ب ڕاستی ئەوێت ئەو بێ بەختی [د ڕاستا
عائیشایێ دەیکا موسلمانان‌دا] کرین دەستەکەکە
[چەندەکن] ژ هەوە، حسێب نەکەن [گەلی مالا ئەبو
بەکری] ئەڤ درەوە بۆ هەوە یا خرابە، بەلێ [ئەڤ
درەوە] بۆ هەوە قەنجی و خێرە [چونکی خودێ
بۆ هەوە دێ ب خێر نڤێسیت، دێ بەرائەتا هەوە ب
وەحییێ دیارکەت، و پاك و پاقژیا وێ دێ کەتە
قورئان و دێ مینیت، و پێڤەچۆنە بۆ موسلمانان، کو
بۆ خۆ پێڤەبچن و زوی گوهێ خۆ نەدەنە هەمی
ئاخڤتنان، و هەر خێر بۆ هەوەیە] و هەر ئێك ژ وان
تەمەتی گونەها خۆ یێ گونەهکارە [گونەها هەر
ئێکی ل دویڤ پێ ئاخڤتن و تێکڤەدانا وییە]، و ئەوێ
ژ وان باراپتر بوویە سەرێ سەبەبا ڤێ بێ بەختییێ، ئیزا
و عەزابەکا مەزن یا بۆ وی هەی. ﴿١٢﴾ بلا وەختێ
هەوە [ئەو درەو د ڕاستا عائیشایێدا] بهیستی، زەلام
و ژنێت خودان باوەر، هزرا باشییێ ژ خۆ کربایە
[پێدڤی بوو وان خۆ ل جهێ عائیشایێ و سەفوانی
دانابانە، ئەرێ ئەو ب خۆ دێ کارەکێ هۆسا کەن، دا
زانیبانە (عائیشا و سەفوان) هەردو ژ ڤی کاری دویرتر و پاقژترن]، و بلا گۆتبانە: ئەڤە درەوەکا ئاشکەرایە.
﴿١٣﴾ بلا وان [ئەوێت ب ڤێ بێ بەختی و درەوێ ئاخڤتین] چار شاهد ل سەر بێ بەختی و درەوا خۆ ئینابانە
[و نەشێن بینن چونکی بێ بەختییە]، ڤێجا ئەگەر ئەو شاهدان نەئینن، ئەڤە ئەو ل دەڤ خودێ درەوینن.
﴿١٤﴾ و ئەگەر کەرەم و دلۆڤانییا خودێ ل دنیایێ و ئاخرەتێ ل سەر هەوە نەبایە، دا ژ بەر وێ بێ بەختییا
هەوە د دەرهەقێ عائیشایێدا کری، ئیزایەکا مەزن هەوە هنگێڤیت. ﴿١٥﴾ وەختێ هەوە ئەڤ ئاخڤتنە ژ ئێکدو
ڤەدگوهاست و هوین پێ دئاخڤتن، و هەوە ب دەڤێ خۆ ئەو دگۆت یا چو ڕاستی بۆ نەی، و هەوە ئاگەهەك
ژێ نەی، و هوین هزر دکەن ئەڤە چو نینە و تشتەکێ کێمە، و ئەو ب خۆ ل دەڤ خودێ زێدە یێ مەزنە.
﴿١٦﴾ و بلا وەختێ [هەوە ئەو بێ بەختی و درەو، د ڕاستا عائیشایێدا] بهیستی، هەوە گۆتبایە: بۆ مە نەدورستە
و نابیت ئەم ب ڤێ بێ بەختییێ باخڤین، پاکی و پاقژی بۆ خودێ بیت، ئەڤە چەند زرە بێ بەختییەکا مەزنە.
﴿١٧﴾ خودێ شیرەتان ل هەوە دکەت، دا هوین جارەکا دی نەزڤرنە بێ بەختییەکا وەکی ڤێ، هندی هوین
یێت ساخ بن، ئەگەر هوین ئەو بن یێت ڕاست هەوە باوەری ئینایی. ﴿١٨﴾ و خودێ بەلگە و نیشانان
[ل سەر ئەحکام و بڕیارێت موکوم] بۆ هەوە ڕۆن و ئاشکەرا دکەت [دا پێڤەبچن، و ب سنج و ڕەوشت
بکەڤن]، و خودێ زێدە زانا و کاربنەجهە. ﴿١٩﴾ ب ڕاستی ئەوێت حەز دکەن [و پێ خۆش]، کریارێت زێدە
کرێت و خراب [وەکی زنایێ] د ناڤ واندا بەلاڤ ببن، ئەوێت باوەری ئینایین ئیزایەکا دژوار و ب ژان بۆ
وان د دنیایێ و ئاخرەتێدا یا هەی، و خودێ [ئەوا د دلاندا] دزانیت [کا کێ دڤێت، و حەز دکەت خرابی و
پویچی بەلاڤ ببیت]، و هوین نوزانن. ﴿٢٠﴾ و ئەگەر کەرەم و دلۆڤانییا خودێ ل سەر هەوە نەبایە [هوین دا
بەرهنگاری ئیزایەکا مەزن بن]، و ب ڕاستی خودێ زێدە یێ ب ڕەحم و دلۆڤانە.

۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ
خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا
فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ
ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ٢١ وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ
مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ
فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ
لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ٢٢ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ
ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ
عَظِيمٞ ٢٣ يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا
كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٢٤ يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ
ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ ٢٥ ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ
لِلۡخَبِيثَٰتِۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ
أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ٢٦ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ
وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ٢٧



﴿٢١﴾ گەلی كەسێت هەوە باوەری ئینایی، ب دویڤ پێنگاڤێت شەیتانی نەكەڤن، و هەر كەسێ ل دویڤ پێنگاڤێت شەیتانی بچیت [بلا بزانیت]، ب ڕاستی شەیتان فەرمانێ ب كریارێت زێدە كرێت و خرابییێ دكەت، و ئەگەر ژ كەرەم و دلۆڤانییا خودێ نەبایە [كو دەرگەهێ تۆبەیێ ل هەوە ڤەكری]، كەس ژ هەوە [ژ گونەها وێ بێ بەختییا د ڕاستا عائیشایێدا هاتییە كرن] پاقژ نەدبوو، بەلێ یێ خودێ بڤێت [و هەژی بیت] دێ پاقژكەت، و خودێ ب خۆ گوهدێر و زێدە زانایە. ﴿٢٢﴾ و بلا خودانێت خێر و سەدەقە و كەرەم و بەرفرەهییێ [ئەوێت دەست بەری هەمییان د دینێ خودێدا هەی، كو ئەبو بەكرە] سویند نەخۆن، كو قەنجی و خێرێ د گەل كەس و كارێت خۆ یێت هەژار و بەلنگاز و مشەختی یێت ڕێكا خودێ ناكەن، و بلا ل وان ببۆرن و چاڤێ خۆ ژ وان بگرن و ئازا بكەن، ما هەوە نەڤێت خودێ ل هەوە نەگریت و گونەهێت هەوە ژێ ببەت، و خودێ ب خۆ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٢٣﴾ ب ڕاستی ئەوێت ژنێت دەهمەن پاقژ و دلساخ و بێ غال و غەرەز و ئاگەهـ ژ چو نەیی و خودان ئیمان [ئەوێت نە چو خرابی دكرن، و نە خرابی د دلیدا، مەخسەد عائیشایە و ژنێت دی یێت پێغەمبەری، و هەر ژنەكا دی یا خودانا ڤان سالۆخەتان] ب زنایێ گونەهكار دكەن، د دنیایێ و ئاخرەتێدا، لەعنەت یێت لێ هاتینەكرن [ئانكو هاتینە دەرئێخستن و دویرئێخستن ژ دلۆڤانییا خودێ]، و ئیزایەكا مەزن بۆ وان یا هەی. ﴿٢٤﴾ [و ئەو ئیزایا مەزن دێ د وێ ڕۆژا ب سەهم و ترسدا بیت، كو ڕۆژا قیامەتێیە] ڕۆژا ئەزمان و دەست و پێیێت وان، شادەییێ ل سەر وان ددەن، ل سەر وێ ئەوا وان دكر. ﴿٢٥﴾ وێ ڕۆژێ خودێ جزایێ وان یێ ڤەبری [یێ بێ كێم و زێدەهی] دێ دەتە وان، و [وێ ڕۆژێ] دێ زانن خودێ یێ عادلە، و ستەمێ ل كەسێ ناكەت. ﴿٢٦﴾ و ژنێت دەهمەن پیس بۆ زەلامێت دەهمەن پیسن، و زەلامێت دەهمەن پیس بۆ ژنێت دەهمەن پیسن، و ژنێت پاك و دەهمەن پاقژ بۆ زەلامێت پاك و دەهمەن پاقژن، و زەلامێت پاك و دەهمەن پاقژ بۆ ژنێت پاك و دەهمەن پاقژن [عائیشا یا پاك و پاقژ بوو، لەوا خودێ كرە هەڤسەرا پێغەمبەرێ خۆ]، ئەڤە [ئەوێت دەهمەن پاقژ، پێغەمبەر و عائیشا و سەفوان] ژ وێ ئاخڤتنا ئەو دكەن، یێت پاك و بەرینە، بۆ وان گونەهـ ژێبرن و ڕزقەكێ پیرۆز یێ هەی.

﴿٢٧﴾ گەلی ئەوێت هەوە باوەری ئینایین، نەچنە د چو خانییانڤە ژ بلی خانییێت خۆ، هەتا هوین دەستویرییێ وەرنەگرن، و سلاڤ نەكەنە خودانێت وان [كو بێژن (السلام علیكم) بێمە ژۆر؟ جارەكێ یان سێ جاران]، ئەڤە بۆ هەوە چێترە [كو هوین بێ دەستویری و ژ نشكەكێڤە بچنە ژۆر]، دا هوین كار ب ڤان ڕەوشتان بكەن [د دەرهەقێ دەستویر وەرگرتنێدا بەری بچنە د خانییەكێڤە].

فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدٗا فَلَا تَدۡخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤۡذَنَ لَكُمۡۖ
وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْۖ هُوَ أَزۡكَىٰ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا
تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ٢٨ لَّيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا
غَيۡرَ مَسۡكُونَةٖ فِيهَا مَتَٰعٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا
تَكۡتُمُونَ ٢٩ قُل لِّلۡمُؤۡمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِمۡ وَيَحۡفَظُواْ
فُرُوجَهُمۡۚ ذَٰلِكَ أَزۡكَىٰ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا يَصۡنَعُونَ ٣٠
وَقُل لِّلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَغۡضُضۡنَ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِنَّ وَيَحۡفَظۡنَ
فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنۡهَاۖ وَلۡيَضۡرِبۡنَ
بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّۖ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ
أَوۡ ءَابَآئِهِنَّ أَوۡ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآئِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ
أَوۡ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوۡ نِسَآئِهِنَّ
أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيۡرِ أُوْلِي ٱلۡإِرۡبَةِ مِنَ
ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفۡلِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يَظۡهَرُواْ عَلَىٰ عَوۡرَٰتِ ٱلنِّسَآءِۖ
وَلَا يَضۡرِبۡنَ بِأَرۡجُلِهِنَّ لِيُعۡلَمَ مَا يُخۡفِينَ مِن زِينَتِهِنَّۚ وَتُوبُوٓاْ
إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣١



﴿٢٨﴾ و ئەگەر هەوە كەس تێڤە (د وان خانيانڤە،
ئەوێت هەوە دڤێن بچنێ) نەديت، ديسا نەچنە ژۆر
هەتا دەستويری بۆ هەوە دئێتە دان، و ئەگەر [خودانێ
مالێ] گۆتە هەوە بزڤڕن، ڤێجا [بێ دلمان] بزڤڕن، و
زڤڕين بۆ هەوە باشتر و پاقژترە، و خودێ ئاگەهداری
وێيە ئەوا هوين دكەن. ﴿٢٩﴾ گونەهـ ل سەر هەوە
نينە كو هوين [بێ دەستويری] بچنە د وان خانيانڤە،
ئەوێت بۆ مالان نەهاتينە ئاڤاكرن [وەكی ئۆتێلان و
دەزگەهێت گشتی] ئەوێت هەوە هەوجەيی پێ هەی،
و تشتێ هوين ئاشكەرا دكەن يان نەپەنی.. خودێ پێ
ئاگەهە [و ئەڤە گەفە بۆ وی يێ ل دويڤ ڕەوشتێت
دەستوير وەرگرتنێ نەچيت، بۆ چۆنەژۆرا خانييێت
خەلكی]. ﴿٣٠﴾ و بێژە خودان باوەران، بلا چاڤێ
خۆ ژ بەرێخۆدانا نەدورست و حەرام وەرگێڕن، و
بلا دەهمەن و ناموسا خۆ بپارێزن، ئەڤە بۆ وان چێتر
و پاقژترە [بكەڤنە د پيساتييا گونەهێدا]، ب ڕاستی
خودێ ئاگەهداری وێيە، ئەوا ئەو دكەن. ﴿٣١﴾ و بێژە
ژنێت خودان باوەران بلا چاڤێت خۆ ژ بەرێخۆدانا
نەدورست و حەرام وەرگێڕن، و بلا دەهمەن و ناموسا خۆ بپارێزن، و بلا جهێ خەمل و چەكێت خۆ [كو
جهێ بازن و حنجۆل (خلخال) و گوهار و ڕستكێت حەفكێ و ڕستكێت دكەڤنە سەر سينگی و تۆقا سەری]
دەرنەئێخن، و ديارنەكەن [بۆ بيانيان]، ژ بلی جهێ دياربوونا، وێ بڤێ نەڤێ، و بێی ئنيەتا خراب [وەكی هەردو
دەست و سەروچاڤان و گوستيرك و كلێ چاڤان]، و بلا دەرسۆكا خۆ ب سەر سينگێ خۆدا بەردەن [بلا
دەرسۆكا وان، پرچ و ستۆ و سينگێ وان، ژ بيانيان ڤەشێريت]، و بلا جهێ خەملا خۆ [ژ بلی هەردو دەست
و سەروچاڤان] و جوانييا خۆ [يا سينگی و پرچێ و لنگان]، [بۆ كەسێ] ديار نەكەن، ژ بلی بۆ زەلامێت
خۆ يان بابێت خۆ يان خەزويرێت خۆ يان زارۆكێت خۆ [يان نەڤيێت خۆ] يان زارۆكێت زەلامێت خۆ
[ئانكو نەڤسيێت خۆ] يان برايێت خۆ يان برازايێت خۆ يان خوارزايێت خۆ يان ژنێت د گەل خۆ [بۆ
خزمەتێ يان هەڤالينيێ] يان جاريێت خۆ، يان ئەو زەلامێت تێكەليا وان دكەن ئەوێت هەوجەيی ب ژنان
نەمايی [وەكی خولام و پالە و ساويلكەيان]، يان بچويكێت چو ژ شەهوەتێ نەزانن، و ب سەر شەرمگەها
ژنان هەلنەبوويين و بلا پيێت خۆ ل ئەردی نەدەن، دا چەكێ خۆ يێ ڤەشارتی [حنجۆلێت پيان] ئاشكەرا
بكەن، و هوين هەمی گەلی خودان باوەران ببال خدويڤە تۆبە بكەن، دا سەرفەراز ببن.

وَأَنكِحُواْ ٱلۡأَيَٰمَىٰ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنۡ عِبَادِكُمۡ وَإِمَآئِكُمۡۚ إِن
يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ٣٢
وَلۡيَسۡتَعۡفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغۡنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ
وَٱلَّذِينَ يَبۡتَغُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ
عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرٗاۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ ءَاتَىٰكُمۡۚ وَلَا تُكۡرِهُواْ
فَتَيَٰتِكُمۡ عَلَى ٱلۡبِغَآءِ إِنۡ أَرَدۡنَ تَحَصُّنٗا لِّتَبۡتَغُواْ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَاۚ وَمَن يُكۡرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعۡدِ إِكۡرَٰهِهِنَّ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣٣
وَلَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖ وَمَثَلٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ
الحزب ٣٦ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ٣٤ ۞ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ
مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌۖ ٱلۡمِصۡبَاحُ فِي زُجَاجَةٍۖ
ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ
لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ
نُّورٌ عَلَىٰ نُورٖۚ يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَ
لِلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ٣٥ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرۡفَعَ
وَيُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ٣٦





﴿٣٢﴾ و هوین [گەلی خودان باوەران] بۆ ئەوێت ژن نەئینایی، ژنان بینن، و یێت نەشویکری بدەنە شوی، دیسا کۆلەیێت خۆ ژی یێت خودان باوەر، ژنان بۆ بینن، و بدەنە شوی [و بلا خۆ نەڤەگرن ژ ژنئینانێ یان ژ شویکرنێ، ژ بەر دەستتەنگی و خیزانیێ]، و ئەگەر ئەو یێت فەقیر ژی بن، خودێ ژ کەرەما خو دێ وان زەنگین کەت [زەنگینیا دلی، یان یا مالی، یان هەردووکان پێکڤە]، و خودێ یێ زانایە، و کەرەما وی یا بەرفرەهە. ﴿٣٣﴾ و ئەوێت نەشێن ژنێ بینن، بلا پاکی و پاقژیا خۆ بپارێزن [و بلا زەحمەتێ بۆ خۆ چێکەن بۆ ڤێ چەندێ]، هەتا خودێ ژ کەرەما خۆ وان بێ منەت دکەت [و بشێن ژنێ بینن]، و کۆلەیێت هەوە ئەوێت دڤێن پێکهاتنەکێ (تفاقەکێ) د گەل هەوە بنڤیسن، دا ئازاد ببن، ڤێجا هوین تفاقێ و نڤیسکاریێ ل سەر هندەك مالی د گەل وان بکەن و بنڤیسن، ئەگەر هوین ببینن د ئەمینن و دشێن ڤێ پێکهاتنێ ب جهـ بینن، و ژ مالێ خودێ ئەوێ خودێ دایییە هەوە بدەنە وان، و زنایێ ب خورتی [و نەخورتی] ب جاریێت خۆ نەدەنە کرن، دا هندەك مالێ دنیایێ ب دەست خۆڤە بینن، ئەگەر وان پاقژی بڤێت، و هەر کەسێ ب خورتی زنایێ ب وان بدەتەکرن، و خودێ پشتی خورتیلێکرنا هەوە [بۆ وان]، گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٣٤﴾ ب سویند [گەلی خودان باوەران] مە ئایەت و ئەحکامێت ئاشکەراکەر، و سەرهاتیێت وان ئەوێت بەری هەوە بۆرین بۆ هەوە ئینان، کو چامە و شیرەتن بۆ پارێزکاران. ﴿٣٥﴾ خودێ ڕۆناهیا ئەرد و ئەسمانانە [ئانکو ئەوە یێ ئەرد و ئەسمانان ڕۆن دکەت]، مەتەلا ڕۆناهیا خودێ [د دلێ بەندەیێ خودان باوەردا] وەکی کولەکەکێیە [د دیواریرا و یا نەڤەکری] و چرایەك تێدا بیت، ئەو چرایە د شویشەیەکا زەلال و گەشدا بیت، ئەو شویشە هند یا زەلال بیت، هەروەکی ستێرەك ژ ڕۆژێ، و ئەو چرا ب زەیتا دارەکا پیرۆز هەلبیت [کو دارا زەیتوونییە]، و ئەو دارە نە هەردەم بەرۆژە و نە هەردەم نزار [ئانکو نە ڕۆژ لێ ددەت هەمی وەختان، و نە ل بەر سیبەرێیە هەمی وەختان]، نێزیکە زەیتا وێ ڕۆناهیێ بدەت، خۆ ئەگەر ئاگر ژی ڤێ نەکەڤتبیت [ئانکو دلێ خودان باوەر یێ ڕۆنە، ب وێ ڕۆناهیا خودێ کرییە تێدا، ب ڕاستەڕێکرنا خودێ کارێ خۆ دکەت، بەری زانین بۆ بێت، و گاڤا زانین بۆ هات ڕۆناهیا وی زێدەتر لێ دئێت، ڤێجا ڕۆناهی دکەڤتە سەر ڕۆناهیێ] ڕۆناهی ل سەر ڕۆناهیێیە، یێ خودێ بڤێت ڕاستەڕێ دکەت و بەرێ وی ددەتە ڕۆناهی و هیدایەتا خۆ، و خودێ نموونەیان بۆ مرۆڤان دئینیت و دیار دکەت، و خودێ ئاگەهـ ژ هەمی تشتان هەیە. ﴿٣٦﴾ [ئەو ڕۆناهیا] د مزگەفتاندا ئەو مزگەفتێت خودێ ئەمرکری بلند بێنە ئاڤاکرن، و قەدر و ڕێز بۆ بێنە گرتن، و ئایەتێت خودێ تێدا بێنە خواندن، و زکرێ وی تێدا بێتەکرن، و سپێدە و ئێڤاران [ئانکو پێنج وەختان] نڤێژ بۆ تێدا بێنەکرن.

رِجَالٞ لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٞ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ
وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوۡمٗا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلۡقُلُوبُ وَٱلۡأَبۡصَٰرُ ٣٧
لِيَجۡزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحۡسَنَ مَا عَمِلُواْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضۡلِهِۦۗ وَٱللَّهُ
يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ٣٨ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَعۡمَٰلُهُمۡ كَسَرَابِۭ
بِقِيعَةٖ يَحۡسَبُهُ ٱلظَّمۡـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمۡ يَجِدۡهُ شَيۡـٔٗا
وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ٣٩
أَوۡ كَظُلُمَٰتٖ فِي بَحۡرٖ لُّجِّيّٖ يَغۡشَىٰهُ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ
سَحَابٞۚ ظُلُمَٰتُۢ بَعۡضُهَا فَوۡقَ بَعۡضٍ إِذَآ أَخۡرَجَ يَدَهُۥ لَمۡ يَكَدۡ
يَرَىٰهَاۗ وَمَن لَّمۡ يَجۡعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورٗا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ٤٠ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ
ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلطَّيۡرُ صَٰٓفَّٰتٖۖ كُلّٞ
قَدۡ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسۡبِيحَهُۥۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَفۡعَلُونَ ٤١ وَلِلَّهِ مُلۡكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ ٤٢ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزۡجِي
سَحَابٗا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيۡنَهُۥ ثُمَّ يَجۡعَلُهُۥ رُكَامٗا فَتَرَى ٱلۡوَدۡقَ يَخۡرُجُ مِنۡ
خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٖ فِيهَا مِنۢ بَرَدٖ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ
وَيَصۡرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُۖ يَكَادُ سَنَا بَرۡقِهِۦ يَذۡهَبُ بِٱلۡأَبۡصَٰرِ ٤٣





﴿٣٧﴾ [ڤان خانییان ئانكو مزگەفتان] هندەك زەلام
یێت تێدا، بازرگانی و كڕین و فرۆتن، وان ژ زكر
و بیرئینانا خودێ و كرنا نڤێژان و دانا زەكاتێ [بێ
ئاگەهـ و مژویل] ناكەن، ژ ڕۆژەكێ دترسن [كو ڕۆژا
قیامەتییە] دل و چاڤ تێدا دزڤڕن و ڕاناوەستن [دل خۆ
دقوتن، و د ناڤبەرا هیڤی و بێ هیڤیێدا دئێن و دچن،
و چاڤ ژ ڤی ملی بۆ ملێ دی دزڤڕن، كا دێ كەڤیتە
د گەل كیژ ملی، ملێ دۆژەهێ یان بەحەشتێ یان].
﴿٣٨﴾ دا خودێ ژ كار و كریارێت وان كرین، چێتر وان
خەلات بكەت، و كەرەما خۆ بۆ وان پتر لێ بكەت،
و یێ خودێ بڤێت بێ حسێب و بێ هەژمار، ڕزقی
ددەتێ. ﴿٣٩﴾ و ئەوێت گاوربوویین، كار و كریارێت
وان وەكی لەیلانەكێیە، ل ئەردەكێ دەشت و بێ
شینكاتی، یێ تێنی [ژ دویرڤە] هزر دكەت ئاڤە، دەمێ
دگەهیتە دەڤ دبینیت چو نینە [ئانكو نەئاڤە ڤەخۆت،
ڤێجا بێ هیڤی دبیت، هزر دكەت كار و كریارێت باش
یێت كرین، و دێ مفای گەهینیتێ، هەروەكی یێ تێنی
هزرا ئاڤێ ژ لەیلانێ كری، ڤێجا دەمێ گەهشتییە
دەڤ، دیت چو نینە و تەیستەیسوكە، هۆسا یێ گاور ژی ل دویڤ هزرا خۆ، ڕۆژا قیامەتێ دێ ئێت، كو
كار و كریارێت هەین، بەلێ دێ بینیت چو كار و كریار نینن، چونكی ب گاوریا خۆ، یێت پویچ كرین]،
و دێ بینیت خودێ یێ ل بەر ڕاوەستیایە، ڤێجا جزایێ كار و كریارێت وی ب دورستی دێ دەتێ، و خودێ
د حسابێدا یێ دەست سڤكە. ﴿٤٠﴾ یان ژی [كار و كریارێت وان] وەكی تاریستانەكێنە، د دەریایەكا پڕ ئاڤ
و كویردا بیت، پێل ل سەر بلند بن و ل سەر وان پێلان پێلێت دی هەبن و بلند ببن، و ل سەر وان پێلان
عەورەكێ ڕەشێ تاری هەبیت، ئەڤە تاریستانن [تاریستانا عەوران، تاریستانا پێلان، تاریستانا دەریایێ ب
خۆ] تاریستان ل سەر تاریستانێیە [تاریستانەكا وەسایە] ئەگەر مرۆڤ دەستێ خۆ دەربێخیت، نەشێت دەستێ
خۆ ببینیت [ڤێجا ڤان گاوران ژی ڕێكا خۆ یا تژی تاری كری، چو سیناهیێ نابینن كو ژێ دەركەڤن]، و
هەر كەسێ خودێ ڕاستەڕێ نەكەت، كەس نینە وی ڕاستەڕێ بكەت. ﴿٤١﴾ ما تە نەزانییە هندی د ئەرد و
ئەسمانان هەی، و باڵندەیێت چەنگ ڤەكری ل ئەسمانان، هەمی تێكدا، خودێ ژ تشتێ نەهێژا پاقژ دكەن، و
ب ڕاستی هەر ئێكێ [ملیاكەتان، مرۆڤان، جناوەران و گیانەوەران] نڤێژ و تەسبیحا خۆ یا زانی، و خودێ
زێدە زانا و ب ئاگەهە ژ وێ یا ئەو دكەن. ﴿٤٢﴾ و خودانیا ئەرد و ئەسمانان یا خودێیە [ئەو ب تنێ ئەرد و
ئەسمانان دگێڕیت، و دەستكاریێ تێدا دكەت]، و زڤڕین و دویماهیك هەر ب بال خودێڤەیە. ﴿٤٣﴾ ما تو
نابینی خودێ، هێدی عەوران [بۆ جهێ بڤێت] دبەت و دهاژۆت، پاشی ددەتە ئێك و كۆم دكەتە سەرێك،
و پاشی دئێخیتە سەرێك، ڤێجا دێ بینی باران دێ ژێ باریت، و ژ عەورێت وەكی چیایان تەرگێ دبارینیت،
ڤێجا یێ بڤێت [ژ بەندەیێت خۆ] پێ دهنگێڤیت، و یێ بڤێت ژێ ددەتە پاش، نێزیكە شەوق و ڕۆناهیا
برویسیێ، چاڤان كۆرە بكەت.

يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿٤٤﴾
وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٖ مِّن مَّآءٖۖ فَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ بَطۡنِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن
يَمۡشِي عَلَىٰ رِجۡلَيۡنِ وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰٓ أَرۡبَعٖۚ يَخۡلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُۚ
إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٤٥﴾ لَّقَدۡ أَنزَلۡنَآ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖۚ
وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٤٦﴾ وَيَقُولُونَ
ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعۡنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٞ مِّنۡهُم مِّنۢ بَعۡدِ
ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ
لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلۡحَقُّ
يَأۡتُوٓاْ إِلَيۡهِ مُذۡعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرۡتَابُوٓاْ أَمۡ يَخَافُونَ
أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَرَسُولُهُۥۚ بَلۡ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّمَا
كَانَ قَوۡلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ أَن
يَقُولُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن
يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخۡشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقۡهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾
نصف الحزب ٣٦ ۞ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَئِنۡ أَمَرۡتَهُمۡ لَيَخۡرُجُنَّۖ قُل
لَّا تُقۡسِمُواْۖ طَاعَةٞ مَّعۡرُوفَةٌۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٥٣﴾





﴿٤٤﴾ خودێیە شەڤ و ڕۆژان وەردگێڕیت [ل دویڤ ئێك دئینیت، ئێكێ كورت دكەت، ئێكێ درێژ دكەت، و ئێكێ سار دكەت، ئێكێ گەرم دكەت]، ب ڕاستی ئەڤە [ئینان و برنا عەوران، و ئینانەخوارا بارانێ و تەرگێ، و وەرگێڕانا شەڤ و ڕۆژان] چامە و عیبرەتەكە بۆ ئاقلداران. ﴿٤٥﴾ و خودێ هەمی جاندار (خودان ڕوح) ژ ئاڤێ یێت داین، هندەك ژ وان ل سەر زكی دچن [وەكی مار و كرمان]، و هندەك ل سەر دو پیان دچن [وەكی مرۆڤان و بالندەیان]، و هندەك ژی ل سەر چار پیان دچن [وەكی تەرش و دەواران]، و خودێ چ بڤێت و چاوا بڤێت، وەسا چێ دكەت، ب ڕاستی خودێ ل سەر هەمی تشتان خودان شیانە. ﴿٤٦﴾ و ب سویند مە نیشان و بەلگەیێت ئاشكەراكەر یێت هنارتین، و یێ خودێ بڤێت دێ بەرێ وی دەتە ڕێكا ڕاست. ﴿٤٧﴾ و [دوڕوی] دبێژن: مە باوەری ب خودێ و پێغەمبەری ئینا، و مە گوهداریا وان كر، پاشی پشتی قێ، دەستەكەك ژ وان ڕوییێ خۆ وەردگێڕن، و ئەڤە، نە ئەون ئەوێت باوەری ئینایین. ﴿٤٨﴾ و ئەگەر داخوازا وان هاتەكرن بۆ حوكمێ خودێ و پێغەمبەری، دا [پێغەمبەر] حوكمی د ناڤبەرا واندا بكەت، دەستەكەك ژ وان پشتا خۆ ددەنێ، و ڕوییێ خۆ وەردگێڕن. ﴿٤٩﴾ و ئەگەر ئەو یێت هەق بن، ب لەز دێ قەستا پێغەمبەری كەن، و دێ گوهداریا وی كەن. ﴿٥٠﴾ ئەرێ [خۆدانەپاشا وان و قەبویلنەكرنا حوكمێ تە، ژ بەر هندێیە چونكی] نەساخییەك د دلێ واندایە، یان ژی ل تە ب شكن [هێژ باوەر ناكەن تو پێغەمبەری]، یان ژی دترسن خودێ و پێغەمبەرێ وی ستەمێ ل وان بكەن؟!! [نەخێر ئەڤە هەمی وەسا نینە]، بەلێ ئەو ب خۆ د ستەمكار بوون [لەوا نەچۆنە دەڤ پێغەمبەری، دا حوكمی د ناڤبەرا واندا بكەت]. ﴿٥١﴾ وەختێ خودان باوەر بۆ حوكمێ خودێ و پێغەمبەری دئێنە داخوازكرن، دا [پێغەمبەر] حوكمی د ناڤبەرا واندا بكەت، ئاخڤتنا وان بەس ئەڤەیە، دبێژن: مە گولێ بوو، و مە ب جهـ ئینا، و ئەڤەنە یێت سەرفەراز. ﴿٥٢﴾ و هەر كەسێ گوهداریا خودێ و پێغەمبەرێ وی بكەت [ئەمرێ وان ب جهـ بینیت]، و ژ خودێ بترسیت و پارێزكاریا وی بكەت، ئها ئەڤەنە یێت سەركەڤتی و سەرفەراز. ﴿٥٣﴾ و [دوڕوییان] ژ كەل سویند خوار، ئەگەر تو ئەمرێ وان بكەی [ژ وەلاتێ خۆ دەركەڤن، یان بۆ خەزایێ دەركەڤن] دێ دەركەڤن، بێژە: [ژ درەو] سویند نەخۆن، تاعەت و گوهداریا هەوە یا ئاشكەرایە [ئەزمانە و كریار د گەل نینە، و سویندا هەوە درەوە]، ب ڕاستی خودێ شارەزایی كارێ هەوەیە.

قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ
وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ
إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟
ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ
ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ
لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ
بِى شَيْـًٔا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾
وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ
تُرْحَمُونَ ﴿٥٦﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ
وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ وَلَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٥٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ
ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ
ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ لَيْسَ عَلَيْكُمْ
وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ
كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٨﴾



﴿٥٤﴾ [هەی موحەمەد] بێژە [وان]: گوهداریا خودێ و پێغەمبەری بکەن، و ئەگەر وان [گوهداری نەکر و] رویێ خۆ وەرگێڕا، ڤێجا بزانن پێغەمبەری یا ل سەر خۆ [کو ڕاگەهاندنە] ڕاکر، و یا هەوە ل سەر هەوەیە [کو هوین گوهداریا وی بکەن، و بەر ئەمرێ وی بن]، و ئەگەر هوین گوهداریا وی [پێغەمبەری] بکەن، دێ ڕاستەڕێ بن، و ژ بلی گەهاندنا ڕۆنکەر و ئاشکەرا، چو یێ دی ل سەر پێغەمبەری نینە.
﴿٥٥﴾ ژ هەوە ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت قەنج کرین، خودێ پەیمانا دایییە وان، ل جهێ هندەکێت دیتر ئاکنجی بکەت، هەروەکی یێت بەری وان [ئسرائیلی] ل جهێ هندەکێت دیتر ئاکنجی کرین، و دینێ وان ئەوێ خودێ بۆ وان هەلبژارتی دێ سەرفەراز و بنەجهـ کەت، و ترسا وان دێ گوهۆریت و کەتە تەناهی و ئێمناهی، [چونکی] پەرستنا من دکەن و چو هەڤپشکان بۆ من چێ ناکەن، و هەر کەسێ پشتی ڤێ گاور ببیت، ئەو ژ ڕێکا ڕاست ڤەدەر و دەرکەڤتینە. ﴿٥٦﴾ [گەلی خودان باوەران] نڤێژان بەردەوام و ب ڕەنگێ پێدڤی بکەن، و زەکاتێ بدەن و گوهداریا پێغەمبەری بکەن، دا دلۆڤانی ب هەوە بێتە برن. ﴿٥٧﴾ و هزر نەکە ئەوێت گاوربوویین، دشێن خودێ نەچار بکەن، کو وان د ئەردیدا ئیزا نەدەت [یان ئەو ژ ئیزایا خودێ برەڤن، و ژ وان نەگریت] و جهێ وان ئاگرە، و ئاگر چ پیسە جهـ و پیسە دویماهیکە.
﴿٥٨﴾ گەلی خودان باوەران، بلا کۆلەیێت هەوە و دیسا بچویکێت هەوە ژی [کچ و کوڕ]، ئەوێت هێژ بالق نەبوویین، سێ وەختان دەستویرییێ ژ هەوە بخوازن [بەری بێنە وێ مەزەلا هوین تێڤە] بەری نڤێژا سپێدێ، و وەختێ هوین پشتی نڤێژا نیڤرۆ خۆ دشەلینن [جلکێت خۆ دئێخن]، و پشتی نڤێژا عەیشا، ئەڤە سێ وەختن، جلکێ هەوە ب دورستی ل سەر هەوە نامینیت، ژ بلی ڤان هەرسێ وەختان، نە گونەهـ ل سەر هەوەیە و نە ل سەر وانە [بێ دەستویری بێنە دەڤ هەوە] ئەو دئێنە دەڤ هەوە و دچن، هندەك ژ هەوە ژی دئێن و دچنە دەڤ ئێکدو، و هۆسا خودێ ئەحکام و ئایەتان بۆ هەوە دیار دکەت، و خودێ ب خۆ یێ زانا و کاربنەجهە.

وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا
ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ
ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٩﴾ وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ
ٱلَّٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ
ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ ۖ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ
لَّهُنَّ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٦٠﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا
عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ
أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ
أُمَّهَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ
أَوْ بُيُوتِ أَعْمَٰمِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ
أَخْوَٰلِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم
مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوْ صَدِيقِكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن
تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا ۚ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا۟
عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً ۚ كَذَٰلِكَ
يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦١﴾



﴿٥٩﴾ و گاڤا بچویكێت هەوە بالق بوون، بلا ئەو ژی دەستویرییێ بخوازن [بەری بێنە دەڤ هەوە] هەروەكی ئەوێت بەری وان [ژ ئەوێت بەری وان مەزن بووین و بالق بووین، هەمی وەختان نەبەس ڤان سێ وەختان] دەستویرییێ دخوازن، هۆسا خودێ بڕیار و ئەحكامێت خۆ بۆ هەوە دیار دكەت، و خودێ زێدەزانا و كاربنەجهە. ﴿٦٠﴾ و ژنێت ژ بچویكان و ژ عوزران بووین، و دل [ژ بەر پیراتییێ] ل سەر شویكرنێ نەمایی، گونەهـ ل سەر وان نینە ئەو هندەك جلكێت خۆ نەكەنە بەر خۆ [وەكی دەرسۆكێ]، ئەگەر ئنیەتا وان ئەو نەبیت لەشێ خۆ نیشا كەسێ بدەن، و ئەگەر ئەو جلكێت خۆ هەمیان بكەنە بەر خۆ، بۆ وان چێترە، و خودێ گوهدێر و زێدە زانایە. ﴿٦١﴾ چو گونەهـ ل سەر كۆرە و سەقەت و نەخۆشان نینە [دگەل هەوە خوارنێ بخۆن، یان ژ جیهادێ ڤەمینن]، و ل سەر هەوە ژی گونەهـ نینە هوین ل مالێت خۆ [ل مالا كوڕ و كچێت خۆ، یان مالا هەڤسەرا خۆ بێی دەستویرەكا تایبەت] بخۆن، و دیسا گونەهـ ل سەر هەوە نینە، هوین ل مالێت بابێت خۆ، یان ل مالێت دەیكێت خۆ، یان ل مالێت برایێت خۆ یان ل مالێت خویشكێت خۆ، یان ل مالێت مامێت خۆ، یان ل مالێت مەتێت خۆ، یان ل مالێت خالێت خۆ، یان ل مالێت خالەتێت خۆ، یان ل وان مالێت كلیلێت وان د دەست هەوەدا [ئەوێت هەوە هەقێ دەستكارییێ تێدا هەی]، یان ل مالێت هەڤالێت خۆ، بێ دەستویری بخۆن، و چو گونەهـ ل سەر هەوە نینە، هوین پێكڤە بخۆن یان جودا جودا.. ڤێجا ئەگەر هوین چۆنە د هندەك مالانڤە، سلاڤكەنە ئێكدو ب سلاڤا خودێ یا دلڤەكەر، و هۆسا خودێ بڕیار و ئەحكامان بۆ هەوە دیار دكەت، دا هوین تێ بگەهن.

إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُواْ مَعَهُۥ
عَلَىٰٓ أَمۡرٖ جَامِعٖ لَّمۡ يَذۡهَبُواْ حَتَّىٰ يَسۡتَـٔۡذِنُوهُۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَـٔۡذِنُونَكَ
أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ فَإِذَا ٱسۡتَـٔۡذَنُوكَ
لِبَعۡضِ شَأۡنِهِمۡ فَأۡذَن لِّمَن شِئۡتَ مِنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمُ
ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٦٢ لَّا تَجۡعَلُواْ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ
بَيۡنَكُمۡ كَدُعَآءِ بَعۡضِكُم بَعۡضٗاۚ قَدۡ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ
يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمۡ لِوَاذٗاۚ فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ
أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ أَوۡ يُصِيبَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٦٣ أَلَآ إِنَّ
لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قَدۡ يَعۡلَمُ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ وَيَوۡمَ
يُرۡجَعُونَ إِلَيۡهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُواْۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ٦٤

سُورَةُ الفُرۡقَانِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ثلاثة أرباع الحزب ٣٦
تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ١
ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَمۡ يَتَّخِذۡ وَلَدٗا وَلَمۡ يَكُن
لَّهُۥ شَرِيكٞ فِي ٱلۡمُلۡكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖ فَقَدَّرَهُۥ تَقۡدِيرٗا ٢



﴿٦٢﴾ خودان باوەریێت ڕاست و دورست، ئەون ئەوێت باوەری ب خودێ و پێغەمبەرێ وی ئینایین، و هەر وەختێ ئەو د گەل پێغەمبەری د کارەکێ گرنگدا بن [ئانکو بۆ پەرستن و تاعەتەکێ کۆم ببن، وەکی خوتبە و جیهادێ، یان ژی نڤێژا جەژنێ]، پێغەمبەری ناهێلن و بچن، هەتا دەستویریێ ژێ نەخوازن، ب ڕاستی ئەوێت دەستویریێ ژ تە دخوازن، ئەو ئەون ئەوێت ب دورستی باوەری ب خودێ و پێغەمبەرێ وی ئینایین، ڤێجا ئەگەر وان بۆ هندەك كاروبارێت خۆ دەستویری ژ تە خواست، ڤێجا یێ تە ڤیا، دەستویریێ بدەێ، و داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ بکە، ب ڕاستی خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٦٣﴾ [گەلی خودان باوەران] هوین گازیکرنا پێغەمبەری بۆ خۆ [ئانکو دەمێ گازی هەوە دکەت]، وەکی گازیکرنا خۆ بۆ ئێکدو لێ نەکەن [یان ژی گازی پێغەمبەری نەکەن، وەکی هوین گازی ئێکدو دکەن، کو بێژن: هەی موحەمەد، یان بابێ قاسمی، بەلکو ب ڕێز و تەقدیر گازیکەنێ، و ب دەنگەکێ نزم، بێژنێ: هەی پێغەمبەرێ خودێ]، ب سویند خودێ ئاگەهـ ژ وان هەیە، ئەوێت ژ هەوە خۆ ڤەددزن و خۆ ددەنە بەرێك، و ئێك ئێکە دەردکەڤن، ڤێجا بلا ئەوێت ب گۆتنا پێغەمبەری نەکەن هشیار بن، و ژ خۆ بترسن ئاتافەك [چ کوشتن و هەر تشتەکێ دی د دنیایێدا] ب سەرێ وان بێت، یان ژی ئێزایەکا ب ژان و دژوار [ل ئاخرەتێ] وان هنگێڤیت و بگریت. ﴿٦٤﴾ بزانن [و هشیار بن، ب گۆتنا وی بکەن] ب ڕاستی هندی د ئەرد و ئەسمانانداهەی، یێ خودێیە، ب سویند هوین ل سەر چ بن [چ ئارمانج و ئنیەتا هەوە ل بەر بیت]، خودێ پێ ئاگەهە و دزانیت، و ڕۆژا ئەو ب بالڤە دزڤڕن، هندی وان کری دێ وان پێ ئاگەهدارکەت، و خودێ زێدە زانایە ب هەر تشتەکێ هەی.

## سۆرەتا فورقان

### ل مەکەهێ هاتیە خوارێ (٧٧) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ پاك و بلند بوو، و پڕ خێر و بەرەکەت بوو، ئەو خودایێ، فورقان [ئانکو قورئان، ئەوا ڤاڤێرێ دئێخیتە ڕاستیێ و پویچییێ، و حەلالیێ و حەرامییێ] بۆ بەندەیێ خۆ هنارتی، دا بۆ خەلکی ببیتە پێغەمبەر و ئاگەهدارکەر. ﴿٢﴾ ئەوێ خودانیا ئەرد و ئەسمانان یا وی، و چو کوڕ و کچ بۆ خۆ نەدانایین و نەگرتین، و چو هەڤال و هەڤپشك د خودانییێ و ملکیدا بۆ نەیی، و یێ هەمی تشت داییین و چێکرین، ڤێجا کا چ ب کێر وان دئێت، بێ کێماسی بۆ وان پەیداکرن.

وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ
وَلَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا وَلَا يَمۡلِكُونَ مَوۡتٗا
وَلَا حَيَوٰةٗ وَلَا نُشُورٗا ٣ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ
إِفۡكٌ ٱفۡتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيۡهِ قَوۡمٌ ءَاخَرُونَۖ فَقَدۡ جَآءُو ظُلۡمٗا
وَزُورٗا ٤ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٱكۡتَتَبَهَا فَهِيَ تُمۡلَىٰ
عَلَيۡهِ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ٥ قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِي يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ
فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ٦
وَقَالُواْ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأۡكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشِي فِي
ٱلۡأَسۡوَاقِ لَوۡلَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَلَكٞ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ٧
أَوۡ يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٞ يَأۡكُلُ مِنۡهَاۚ وَقَالَ
ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ٨ ٱنظُرۡ
كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَٰلَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ
سَبِيلٗا ٩ تَبَارَكَ ٱلَّذِيٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيۡرٗا مِّن ذَٰلِكَ
جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَيَجۡعَل لَّكَ قُصُورَۢا ١٠ بَلۡ
كَذَّبُواْ بِٱلسَّاعَةِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ١١



﴿٣﴾ و وان هندەك پەرستی شوینا خودێ پەرستن، چو نادەن و چو چێ ناکەن، و ئەو ب خۆ [ژ لایێ مرۆڤانڤە] یێت هاتینە چێکرن، و نەشێن زیانەکێ یان مفایەکی بگەهیننە خۆ ب خۆ [ڤێجا چاوا دێ گەهیننە هەوە]، و نە ژیان وان پێ چێ دبیت، و نە مرن، و نە ساخکرنا پشتی مرنێ.. ﴿٤﴾ و ئەوێت گاور بووین، گۆتن: ئەڤ [قورئانە] درەوە ژ دەڤ خۆ یا چێکری و ئینایی، و هندەکان [ژ جوهی و فەلەیان] هاریکاریا وی ل سەر چێکرنا ڤێ درەوێ یا کری، و ب سویند وان گاوران [ب ڤێ گۆتنا خۆ، کو پێغەمبەرێ عەرەب، ئەڤ قورئانا موعجیزە، ژ هندەکێت نەعەرەب، یا وەرگرتی] ستەم و بێ بەختییەکا مەزن کرییە. ﴿٥﴾ و گۆتن: [ئەڤ قورئانە] ئەفسانە و چیرۆك و چیڤانۆکێت پێشیانە، ئەوی [موحەمەدی] یێت داینە نڤێسین، ڤێجا ئەو [یێت بۆ نڤێسی] سپێدە و ئێڤاران بۆ دخوینن [دا ژ بەر بکەت]. ﴿٦﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: ئەوێ نهینی و ڤەشارتییێت ئەرد و ئەسمانان دزانیت، ئەڤ قورئانە یا ئینایییە خوارێ، ب راستی خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە [لەو لەزێ ل ئیزادانا هەوە ناکەت، ل سەر درەو و بێ بەختیا، هوین دکەن]. ﴿٧﴾ و گۆتن: ئەڤە چ پێغەمبەرە؟ [ئانکو چاوا ئەڤە دێ بیتە پێغەمبەر، و ئەو وەکی مە] خوارنێ دخۆت، و ل سویکان دگەڕییێت [بۆ خزمەتان، هەروەکی ئەم دچین]، بلا ملیاکەتەك د گەل هاتبایە خوارێ، و بۆ ببایە شاهد [دا مە باوەری پێ ئینابایە]. ﴿٨﴾ یان ژی گەنجخانەیەك [ژ ئەسمانان] بۆ وی هاتبایە [دا پاکی ب کەسێ نەمابایە، و هەوجەی بازاڕێ نەبایە]، یان ژی جنیکەك هەبایە ژێ خواربایە [دیسا هەوجەی کەسێ نەبایە]، و ئەوێت ستەمکار گۆتن: هوین ل دویڤ مرۆڤەکێ سحرلێکری پێڤەتر ناچن [ئەڤێ هوین ل دویڤ دچن ژ مرۆڤەکی سحرلێکری پێڤەتر نینە]. ﴿٩﴾ بەرێ خۆ بدەیێ کا چاوا نموونەیان بۆ تە دئینن، ڤێجا گومڕا و بەرزەبوون، و ب سەر چو ڕێکان هەلنابن [ڤەگەڕنەڤە هەقییێ و ڕێکا ڕاست]. ﴿١٠﴾ پاك و بلندبوو و پڕ خێر و بەرەکەت بوو [ئەو خودایێ] ئەگەر ڤیا دێ ژ گەنجخانە و جنیکان چێتر دەتە تە، جنیکێت ڕوبیار د ناڤڕا دئێن و دچن، و دێ قەسران ژی [دگەل وان جنیکان] دەتە تە. ﴿١١﴾ [باوەری نەئینانا وان ب تە، نە ژ بەر زادخوارن، و چۆنا تە بۆ سویکانە، وەکی ئەو دبێژن] بەلێ وان ڕۆژا قیامەتێ ب خۆ، درەو دانا و باوەری پێ نەئینا، و مە بۆ وان ئەوێت قیامەتێ درەو ددانن، ئاگرەکێ دژوار یێ بەرهەڤکری.

إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾
وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْا هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴿١٣﴾
لَّا تَدْعُوا الْيَوْمَ ثُبُورًا وَاحِدًا وَادْعُوا ثُبُورًا كَثِيرًا ﴿١٤﴾
قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ الْخُلْدِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ ۚ كَانَتْ
لَهُمْ جَزَاءً وَمَصِيرًا ﴿١٥﴾ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَاءُونَ خَالِدِينَ ۚ
كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْئُولًا ﴿١٦﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا
يَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ فَيَقُولُ أَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِي
هَٰؤُلَاءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا السَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُوا سُبْحَانَكَ مَا كَانَ
يَنبَغِي لَنَا أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَاءَ وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ
وَآبَاءَهُمْ حَتَّىٰ نَسُوا الذِّكْرَ وَكَانُوا قَوْمًا بُورًا ﴿١٨﴾
فَقَدْ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفًا
وَلَا نَصْرًا ۚ وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا ﴿١٩﴾
وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ
الطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِي الْأَسْوَاقِ ۗ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ
لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴿٢٠﴾





﴿١٢﴾ وەختێ ئـەو ئاگـر ژ جهەكـێ دویـر وان دبینیـت،
گورگـورِ و گورپەگورپـا وی، ژ دویـر دبهیسـن
[و دگەهیتـە وان]. ﴿١٣﴾ و وەختـێ ئـەو گرێدایـی، و د
جهەكـێ تەنگـڕا بۆ نـاڤ دۆژەهـێ دئێنـە ئاڤێتـن، هنگی
دێ نفرینـان ل خـۆ كـەن، و داخـوازا نەمانـا خـۆ كـەن.
﴿١٤﴾ ئەڤـرۆ جارەكـێ ب تنێ داخـوازا نەمانا خۆ نەكەن،
بەلـێ گەلـەك جاران داخـوازا نەمانێ بكەن [ئەڤـرۆ ئیزایا
ل سـەر هـەوە گەلەكـە، و یـا بـێ ڤەبـڕە، و ژ هنـدێ پترە
هویـن جارەكـێ ب تنـێ داخـوازا نەمانـێ بكـەن، و ل
گـەل هنـدێ ژی بـێ هیڤـی بـن ژ نەمانـێ]. ﴿١٥﴾ [هەی
موحەمـەد] بێـژە [وان]: ئـەرێ ئەڤە [ئاگرێ هۆسـا یـێ
دژوار] بـۆ هـەوە چێـترە، یـان ژی بەحەشـتا هەروهـەر
هـەی، ئـەوا پەیـمان بـۆ پارێـزكاران پـێ هاتیـیە دان، كو
دێ بیتـە خەلاتـێ وان و دویماهیـیا وان. ﴿١٦﴾ وان چ
بڤێـت یـێ تێـدا هـەی، و هەروهـەر دێ تێـدا مینـن، و
ئەڤـە پەیمانەكە ژ خودایـێ تـە، هێژایە ژێ بێتە خواسـتن.
﴿١٧﴾ و ڕۆژا خـودێ وان و ئەوێـت وان شـوینا خـودێ
دپەرسـتن كـۆم دكـەت، و دێ بێژیتە وان [پەرستیـیان]:
ئـەرێ هـەوە بەندەیـێت مـن ئەڤـە، د سـەردابرینە و بەرزەكرینـە، یـان وان ب خـۆ ڕێ بەرزەكر و د سـەرداچۆن؟
﴿١٨﴾ ئـەو دێ بێـژن: ئـەم تـە ژ هەمـی كێماسیـیان پاقـژ دكەیـن، بـۆ مـە دورسـت نەبـوو، ئـەم چـو پشـتەڤانان ژ
بلی تـە، بـۆ خـۆ بگریـن [هەتـا كو ئـەم بێژینـە وان مـە بپەرێسـن]، بەلـێ تـە خۆشـی دانـە وان و بـاب و باپیرێت
وان، هەتـا بیرئینانـا تـە ژ بیركریـن، و سوپاسیـیا نیعمەتێت تـە نەكریـن، و ئـەو ب خـۆ ملەتەكـێ چۆیـی بوون.
﴿١٩﴾ [خـودێ دێ بێژیتـە وان] ڤێجـا [ئەڤـە ئەون یـێت هەوە دپەرسـتن] وان هویـن ب وێ ئاخڤتنا هـەوە دكر،
هویـن درەویـن دەرئێخسـتن، ڤێجـا هوین [وی وەختـی، گەلی گاوران] نەشـێن ئیـزا و عەزابێ ژ خـۆ بدەنە پاش،
و نەشێن هاریكاریـیا خـۆ [یان یـا ئێكدو] ژی بكـەن، و كی ژ هەوە سـتەمێ بكەت [ئانكو هەڤپشـكان بۆ خودێ
چـێ بكـەت]، ب ڕاسـتی ئەم دێ ئیزایـەكا مەزن دەینـێ. ﴿٢٠﴾ و مە چو پێغەمبـەر بەری تە نەهنارتینـە، ئەگەر وان
ب ڕاسـتی زاد نەخواربیـت و ل سـویكان نەگەڕیابـن، و مـە هنـدەك ژ هـەوە بۆ هندەكێـت دی یـێت كرینە جهێ
جەڕباندنـێ [هـەژاران ب زەنگینـان دجەڕبینین كا دێ سـەبری كێشـن، و زەنگینان ب هـەژاران دجەڕبینین كا دێ
سوپاسیـیا خـودێ كـەن، و هنـدەك ژ هـەژاران دێ بـەری زەنگینان موسـلمان بـن، كا گرگرە دێ چ كـەن] كا دێ
سـەبرێ [بەرانبـەر ئێكـدو] كێشـن؟ و خودایـێ تە ئاگەهــژ وان هەیە [كا كی دێ سـەبرا خۆ كێشیت، و كی خۆ
ل بـەر ناگریت].

۞ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ
أَوۡ نَرَىٰ رَبَّنَاۗ لَقَدِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ وَعَتَوۡ عُتُوّٗا كَبِيرٗا ٢١
يَوۡمَ يَرَوۡنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشۡرَىٰ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُجۡرِمِينَ وَيَقُولُونَ
حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ٢٢ وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَٰهُ
هَبَآءٗ مَّنثُورًا ٢٣ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ يَوۡمَئِذٍ خَيۡرٞ مُّسۡتَقَرّٗا
وَأَحۡسَنُ مَقِيلٗا ٢٤ وَيَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ
تَنزِيلًا ٢٥ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ لِلرَّحۡمَٰنِۚ وَكَانَ يَوۡمًا عَلَى
ٱلۡكَٰفِرِينَ عَسِيرٗا ٢٦ وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ
يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ٢٧ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ
أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ٢٨ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ
وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولٗا ٢٩ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ
إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا ٣٠ وَكَذَٰلِكَ
جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا مِّنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيٗا
وَنَصِيرٗا ٣١ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ
وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ٣٢



﴿٢١﴾ و ئەوێت باوەری ب ڕۆژا قیامەتێ نەی [و نە ل وێ هیڤییێ، ل بەر دەستێ خودێ ڕاوەستن] گۆتن: بلا ملیاکەت ب سەر مەدا هاتبانە خوارێ، یان مە خودایێ خۆ دیتبایە [دا مە باوەری ئینابایە]، ب سویند خۆ مەزن دیتن و خۆ مەزن کرن، و مەزناتی یا ژ قامێ دەرئێخستین. ﴿٢٢﴾ ڕۆژا ئەو ملیاکەتان دبینن، وێ ڕۆژێ نەخۆزیا گونەهکاران، و ملیاکەت دێ بێژنە وان: مزگینی ل هەوە یا حەرام و حەرامکرییە. ﴿٢٣﴾ و دێ کار و کریارێت وان کرین [ئەوێت وان هزر دکر کو باشینە، و دێ فایدەی گەهینینە وان] ئینین، و دێ وەکی تۆزا بەربا لێ کەین. ﴿٢٤﴾ و بەحەشتییان وێ ڕۆژێ، جهێ وان خۆشتر و چێترە، و وان چێترین جە بۆ بێنڤەدانا نیڤرۆ یێ هەی. ﴿٢٥﴾ ڕۆژا ئەسمان ب عەورێ سپی پرت پرت دبیت، و ملیاکەت ل دویڤ ملیاکەتی دئێنە خوارێ. ﴿٢٦﴾ وێ ڕۆژێ خودانی و ملك، ب دورستی یێ خودایێ دلۆڤانە، و ئەو ڕۆژ ل سەر گاوران ڕۆژەکا زێدە گران و ب زەحمەتە. ﴿٢٧﴾ و ڕۆژا ستەمکار هەردو دەستێت خۆ دکرینیت و دگەزیت و لەق ددەت، و دبێژیت: خۆزی من ڕێکا سەرفەرازییێ د گەل پێغەمبەری گرتبایە. ﴿٢٨﴾ وەی هەوار، خۆزی من فلان [ئەڤێ ئەز ژ ڕێکا ڕاست دەرئێخستیم، و ئەز د سەردا بریم، من بۆ خۆ] نەکربایە هەڤال، و من هەڤالینیا وی نەکربایە. ﴿٢٩﴾ ب سویند وی بەرێ من ژ ڕێکا ڕاست وەرگێڕا، پشتی ئەز ڕاستەڕێ بوویم و من باوەری ئینایی، نێ شەیتان زێدە یێ هڤال هێلە [پشتی مرۆڤان سەردا دبەت، و ژ ڕێکا ڕاست دەردئێخیت، وان ب تنێ دهێلیت]. ﴿٣٠﴾ و پێغەمبەری گۆت: خودێوۆ، ب ڕاستی ملەتێ من ژ ڤێ قورئانێ یێت دویر کەڤتین، و دەست یێت ژێ بەردایین. ﴿٣١﴾ و [کا چاوا ملەتێ تە دژمنیا تە دکەت] وەسا مە بۆ هەر پێغەمبەرەکی، دژمن ژ گونەهکاران یێت دانایین، و بەسی تەیە خودایێ تە ڕاستەڕێکەر و هاریکارێ تە بیت. ﴿٣٢﴾ و ئەوێت گاوربوویین گۆتن: بلا قورئان ب جارەکێ و پێکڤە بۆ هاتبایە خوارێ [وەکی هەمی کتێبێت دی یێت ئەسمانی]. پیچ پیچە و جودا جودا ئەم قورئانێ بۆ تە دئینینە خوارێ، دا دلێ تە پێ موکوم بکەین و ب هێز بێخین [و تو دلێت موسلمانان پێ ب هێز بێخی، دا ب ساناهی ژ بەر بکەن و تێ بگەهن، و دا بەردەوام بەرسڤا گاوران بدەی، ل سەر وان تشتێت وان دڤێن تە تێدا ئاسێ بکەن]، و مە قورئان ئایەت ئایەت [ئانکو پیچ پیچە] ب تە [ب ڕێکا جبریلی] دا خواندنێ.

وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا ﴿٣٣﴾
ٱلَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ
شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٣٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ
وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرًا ﴿٣٥﴾ فَقُلْنَا ٱذْهَبَآ
إِلَى ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَدَمَّرْنَٰهُمْ تَدْمِيرًا ﴿٣٦﴾
وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُواْ ٱلرُّسُلَ أَغْرَقْنَٰهُمْ وَجَعَلْنَٰهُمْ لِلنَّاسِ
ءَايَةً ۖ وَأَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَاْ
وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونًۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴿٣٨﴾ وَكُلًّا
ضَرَبْنَا لَهُ ٱلْأَمْثَٰلَ ۖ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ أَتَوْاْ عَلَى
ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِىٓ أُمْطِرَتْ مَطَرَ ٱلسَّوْءِ ۚ أَفَلَمْ يَكُونُواْ يَرَوْنَهَا ۚ
بَلْ كَانُواْ لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴿٤٠﴾ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ
إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ إِن كَادَ
لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا ۚ وَسَوْفَ
يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ أَرَءَيْتَ
مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾





﴿٣٣﴾ [هەی موحەمەد] و ئەو [مەخسەد پێ موشرك]
چـو پسیار و پێشنیارێت عنتیکە یـێت وەسا [ژ بـۆ
شـکاندنا تـە] بـۆ تـە نائینـن، ئەگـەر ئـەم بـۆ تـە بەرسـڤا
وان دورسـت، و هێـژ ژ پسـیارا وان ڕۆنـتر و ب ڕامانـتر
نەئینـین. ﴿٣٤﴾ ئەوێـت ل سـەر سـەروچاڤان بـەر ب
دۆژەهـێ دئێنـە کۆمکـرن و ڕاکێشـان، ئەڤـان جهـێ وان
هێـژ خرابـترە، و ڕێبەرزەتـرن ژی. ﴿٣٥﴾ ب سـویند مـە
تـەورات دا مووسـایی، و مـە برایـێ وی هـاروون ژی
دا دگـەل، و بـۆ کـرە هاریـکار و پشـتەڤان. ﴿٣٦﴾ ڤێجـا
مـە گۆتـە وان [مەخسـەد پـێ مووسـا و هـاروون]:
هویـن هـەردو هەڕنـە دەڤ وی ملەتـی، ئـەوێ نیشـان
و موعجیزەیـێت مـە دەرو دانایـین [بەلـێ ملەتـێ
ژێکۆتـی گوهـێ خـۆ نـەدا وان، و ب گۆتنـا وان نەکر]،
ڤێجـا مـە ژی ژ بـەر هنـدێ ب دژواری د هیـلاك بـرن.
﴿٣٧﴾ و ملەتـێ نووحـی ژی [مە ڤەبرانـدن] وەختێ وان
پێغەمبەر دەروین دانایـین [و یـێ پێغەمبەرەکی درەوین
دانیـت و باوەرییـێ پێ نەئینیـت، ئەو هەمـی پێغەمبەران
درەویـن ددانیـت و باوەرێـی پـێ نائینیـت]، مـە ئـەو
[د ئاڤێـدا] خەندقانـدن، و بـۆ خەلکـی کرنە چامـە، و مە ئیزایـەکا ب ژان و دژوار بۆ سـتەمکاران بەرهەڤکرییـە.
﴿٣٨﴾ و مـە عـاد و (سـەموود) [ملەتـێ هـوود پێغەمبـەر و ملەتێ (صالـح) پێغەمبـەر] و خودانێت بـیرێ [ملەتێ
شـوعەیب پێغەمبـەر، و هاتییـە گۆتـن خەلکـێ بـیرێ: ژ گوندیـت سـەموودە و هاتییـە گۆتـن: خەلکـێ گوندێ
انتاکیانـە ئەوێـت چێروکا وان دسـۆرەتا یاسـیندا هاتـی و هاتییـە گۆتـن: ملەتەکـە ل دۆر بـیرێ کـۆم بـوو بوون
و ژ بـەر نەبـاوەری پـێ ئێنانـا وان خـودێ ئێخسـتنە د بیرێـدا و هەمـی هیـلاك بـرن، و هاتییـە گۆتـن: ملەتەکـێ
گونەهـکارە پێغەمبـەرێ خـۆ کرنـە دبیرێـدا و ل سـەر سـەردەرکر]، و گەلـەك ملەتێـت دی ژی، د ناڤبـەرا وانـدا
مـە ڤەبرانـدن. ﴿٣٩﴾ و مـە بـۆ هەمییـان بەلگە و نیشـان [و سـەرهاتی و سـەربۆرێت ملەتێت بۆری] ئینـان، ڤێجا
وەختـێ وان ئـەڤ بەلگـە و نیشـانە ب پشـت گوهـێ خۆڤە هاڤێتـین [و چو بـۆ خـۆ ژێ وەرنەگرتـین]، مە هەمی
ڤەبرانـدن و قڕکـرن. ﴿٤٠﴾ و ب سـویند [قورەیشـی] یـێت هاتینـە وی گونـدی و یـێت تێڕا چۆیـین، ئـەوێ مە
بارانـا بـەران ب سـەردا بارانـدی [گوندێ سـەدووم کو ژ مەزنتریـن گوندێت (لووط) یـیە]، ئەرێ مـا وان بەرێ
خـۆ نەددایـێ کا چ ب سـەرێ وان هاتییە؟ بەلـێ ئـەو بـاوەری ب ڕابوونـا پشـتی مرنـێ نائینن [لەو بـۆ خۆ چو
چامـە و عیبرەتـان ژێ ناگـرن]. ﴿٤١﴾ و هـەر وەختێ ئەو تـە ببینن، ترانەیان بـۆ خۆ ب تە دکەن، و دبێـژن: ئەڤەیە،
یـێ خودێ کرییـە پێغەمبەر؟!. ﴿٤٢﴾ و [دێ بێژن] ئەگەر ژ بەر وێ سـەبرێ نەبایە ئەوا مە ل سـەر پەرستییێت
خـۆ کێشـایی، نێزیـك بـوو ئەو [مەخسـەد موحەمـەد] بـەرێ مـە ژ وان وەرگێڕیت، و ئـەم پەرسـتنا وان بهێلین، و
وەختـێ ئـەو ئیزا و عەزابـێ [یـا خـودێ] دبینـن، هنگـی دێ زانـن، کا کـی یـێ گومڕا و ڕێ بەرزەیە [ئـەو یان
موسـلمان]. ﴿٤٣﴾ کا بێژە من: ئەوێ دلخوازییـا خۆ کرییـە پەرستییێ خۆ [و ب دلخوازییـا خۆ کری، و گوهێ
خـۆ دایییە دلـێ خۆ]، ڤێجـا ما تـو دێ وی پارێـزی [کو ئـەو ب دویڤ دلخوازییـا خـۆ نەکەڤیت]؟.

أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا
كَالْأَنْعَامِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ
وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴿٤٥﴾
ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴿٤٦﴾ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ
اللَّيْلَ لِبَاسًا وَالنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾ وَهُوَ
الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ ۚ وَأَنْزَلْنَا مِنَ
السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَيْتًا وَنُسْقِيَهُ
مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَامًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا ﴿٤٩﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَاهُ بَيْنَهُمْ
لِيَذَّكَّرُوا فَأَبَىٰ أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٥٠﴾ وَلَوْ شِئْنَا
لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَذِيرًا ﴿٥١﴾ فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُمْ
بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا ﴿٥٢﴾ ۞ وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَٰذَا
عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا
وَحِجْرًا مَحْجُورًا ﴿٥٣﴾ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُ
نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ
مَا لَا يَنْفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ ۗ وَكَانَ الْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِ ظَهِيرًا ﴿٥٥﴾

الحِزْبُ ٣٧



﴿٤٤﴾ یـان ژی تـو ل وێ هزرێیـی کـو باراپـتر ژ وان
[شـیرەتان] گولـێ دبن یـان تـێ دگەهن، ب ڕاسـتی ئەو
[د گولێبـوون و تێگەهشـتنا خـۆدا] وەکـی جانەوەرانـە،
بەلکـی خرابـتر و ڕێبەرزەتـرن ژی. ﴿٤٥﴾ مـا تـو بـەرێ
خـۆ نادەیـە [هێـز و شـیان و دورسـتکرنا] خودایـێ
خـۆ، کا خودایـێ تـە چـاوا سـیبەر درێـژ کریـیە [ژ
دەرکەڤتنـا ڕۆژێ هەتـا ئاڤابوونـا وێ]، و ئەگـەر ڤیابایـە
دا ڕاوەسـتینیت [ژ جهەکـی نەدچـۆ جهەکـی]، پاشـی
مـە ڕۆژ بـۆ کـرە سـەبەب و نیشـان. ﴿٤٦﴾ پاشـی هێدی
هێـدی، پیـچ پیچە مـە ئەو سـیبەر هەلچنی (مـە نەهێلا).
﴿٤٧﴾ و ئـەو [خـودا] ئەوە، یـێ شـەڤ بۆ هەوە کریـیە
پـەردە و کراس [چونکی شـەڤ ب تاریـیا خۆ، لەشـان
ژ دیتنـێ ڤەدشـێریت، هەروەکـی جلـك لەشـێ مرۆڤـی
ڤەدشـێرن]، و مـە نڤسـتن بـۆ هەوە یا کریـیە ڤەهەسـیان
[بـۆ نەهێلانـا وێ وەسـتیانا هوین د بزاڤا خۆ یـا ڕۆژانەدا
دبینـن، و جـارەکا دی دزڤڕنەڤـە سـەر بزاڤـا خـۆ]، و مە
ڕۆژ یـا کریـیە وەختـێ ڕابـوون و بەلاڤبوونـا هـەوە.
﴿٤٨﴾ و هـەر ئەوە بای بەری دلۆڤانیـیا خـۆ (بارانێ) ب
مزگینـی دهنێریـت، و مـە ئاڤەکا پاقژ ژ عـەوران دارێـت. ﴿٤٩﴾ دا ئەم پـێ (ب وێ ئاڤێ) ئەردەکێ مری و هشـك
و بێ شـینکاتی سـاخکەین و شـین بکەیـن، و دا گەلـەك ژ ئەوێت مە [ژ ئاڤێ] دایـین و چێکریـن، ژ جانەوەران و
تـەرش و تـەوالان یـان خەلکێ دەشـتێ و گەلـەك مرۆڤان [خەلکـێ باژێران]، ئـاڤ بدەین. ﴿٥٠﴾ و ب سـویند مە
ئـەو بـاران ب گەلـەك ڕەنگـان ب سـەر واندا باراندیـیە [ل هندەك جهـان دبارینـین و ل هندەکان نـە، ل هندەکان
گەلەکـێ دبارینـین و ل هنـدەکان کێـم دبارینین، و ل هندە جهێـت ب ڕەخێکڤـە ل ڕەخەکی دبارینـین، و ل ڕەخێ
دی نـە]، دا مـرۆڤ هـزرا خـۆ بکـەن و بزانن [ئـەوێ ئەرد سـاخکری، دشـێت مریـیان ژی ژ گـۆڕان ڕاکەتەڤە و
سـاخ بکـەت]، بەلـێ باراپـتر ژ مرۆڤـان بەرانبـەری نیعمەتـا بـاران هاتنـێ نـە د سوپاسـدارن. ﴿٥١﴾ و ئەگـەر مە
ڤیابایـە، دا بـۆ هـەر گوندەکـی پێغەمبەرەکـی هنێریـن [وان ژ ئیزایـا ڕۆژا قیامەتـێ بترسـینیت ]، [بەلـێ ژ بۆ قەدر
و ڕێزگرتنـا تـە، مـە تـو کریـیە پێغەمبـەرێ هەمیـیان ]. ﴿٥٢﴾ ڤێجا [هـەی موحەمـەد] گوهێ خۆ نـەدە گاوران،
و جیهـادەکا مـەزن ب قورئانـێ د گـەل وان بکـە. ﴿٥٣﴾ و ئـەوە یـێ هێلایی هەردو دەریـا بگەهنە ئێـك و بکەڤنە
ڕەخێـك، ئەڤـە یـا شرین و خۆشـە، و ئەڤـە زێدە یا سـویرە (شـۆرە) [نائێتە ڤەخـوارن] و ناڤبـڕەك یا ئێخسـتیـیە د
ناڤبـەرا وانـدا [دا تێکـەل نەبـن ]، و ئێـکا ل ئێکـێ حەرامکری تێکـەلی ئێك ببن [نەیا شرین سـویر (شـۆر) دبیت،
و نەیـا سـویر شریـن دبیت، و هـەر ئێك وەکی خۆ دمینیـت]. ﴿٥٤﴾ و ئەوە یـێ مرۆڤ ژ ئاڤێ چێکری، و کریـیە
مـێر [کـو مرۆڤانیـیا خوینـێ پێ چێ دبیـت] و ژن [کو خزمانی پێ چێ دبیت]، و خودایـێ تە یـێ پێڤەهاتیـیە.
﴿٥٥﴾ [دگـەل ڤـێ ژی ئـەو] وان شـوینا خـودێ دپەرێسـن ئەوێت نـە فایدەیـی دگەهیننـە وان، نـە ژی زیانێ.. و
گـاور هاریـکار و پشـتەڤانێت ئێکدونـە ل سـەر نەگوهداری و نەیارەتیـیا خودایـێ خۆ.

وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ٥٦ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ
مِنۡ أَجۡرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ٥٧ وَتَوَكَّلۡ
عَلَى ٱلۡحَيِّ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِهِۦۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ
بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ٥٨ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ
وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ ٱلرَّحۡمَٰنُ
فَسۡـَٔلۡ بِهِۦ خَبِيرٗا ٥٩ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسۡجُدُواْۤ لِلرَّحۡمَٰنِ قَالُواْ
وَمَا ٱلرَّحۡمَٰنُ أَنَسۡجُدُ لِمَا تَأۡمُرُنَا وَزَادَهُمۡ نُفُورٗا۩ ٦٠ تَبَارَكَ سجدة
ٱلَّذِي جَعَلَ فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجٗا وَقَمَرٗا
مُّنِيرٗا ٦١ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ خِلۡفَةٗ لِّمَنۡ أَرَادَ
أَن يَذَّكَّرَ أَوۡ أَرَادَ شُكُورٗا ٦٢ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ
عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ٦٣
وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ٦٤ وَٱلَّذِينَ
يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ
غَرَامًا ٦٥ إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ٦٦ وَٱلَّذِينَ إِذَآ
أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا ٦٧





﴿٥٦﴾ [هەی موحەمەد] مە تو نە هنارتییە، بۆ هندێ
ب تنێ نەبیت ببییە مزگینئین و ئاگەهدارکەر.
﴿٥٧﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: ئەز چو کرێیان بەرانبەری
گەهاندنا ڤێ پەیامێ ژ هەوە ناخوازم، بەلێ یێ بڤێت
ڕێیەکێ بۆ خودایێ خۆ بگریت، بلا بگریت [ئانکو
ئەز چو مالی ژ هەوە ناخوازم، تشتێ ئەز دخوازم ئەوە،
کو هوین ڕێکا خودێ بگرن، و کرێیا من خودێ دێ
دەتە من]. ﴿٥٨﴾ و پشتا خۆ ب خودایێ هەر ساخ،
ئەوێ مرن بۆ نەیی، گەرەم بکە، و تەسبیح و پەسنا وی
بکە، و ژ کێم و کاسیان پاقژ بکە، و بەسی ویە ئەو ب
گونەهێت بەندەیێت خۆ یێ ئاگەهدار و شارەزا بیت.
﴿٥٩﴾ ئەوێ ئەرد و ئەسمان و هندی د ناڤبەرا واندا
هەی، د شەش ڕۆژاندا داین، پاشی بلندبوویە سەر
عەرشی [بلندبوونەکا هێژایی وی، و بێ چاوایی]، ئەو
خودایێ دلۆڤانە، ڤێجا ژ وی بخوازە، ئەو یێ شارەزایە
[یان پسیارا خۆ د ڕاستا خودێدا، ژ شارەزایان بکە].
﴿٦٠﴾ و وەختێ پێغەمبەر دبێژیتە [وان موشرکان]:
بۆ خودایێ دلۆڤان هەڕنە سوجدەیێ، دێ بێژن:
[خودایێ] دلۆڤان کیییە؟ ئەرێ ئەم سوجدەیێ بۆ وی ببەین یێ تو دبێژییە مە [و یێ ئەم نەنیاسین]؟! و ڤێ
گۆتنێ ئەو پتر ژ دینی دویر ئێخستن. ﴿٦١﴾ پاك و بلندبوو، و پڕ خێر و بەرەکەت بوو ئەو خودایێ ئەسمان
بۆ ستێران کرییە جهـ و قویناخ، و ڕۆژا گەش و هەیڤا ڕۆنکەر کرینە تێدا. ﴿٦٢﴾ و ئەو خودایێ شەڤ و ڕۆژ
ئێخستینە دویڤ ئێك، کو ئێك جهێ ئێکێ بگریت، بۆ یێ بڤێت [کەرەم و نیعمەتێت] خودێ بینیتە بیرا
خۆ یان سوپاسییا وی بکەت. ﴿٦٣﴾ و بەندەیێت خودایێ دلۆڤان [یێت دورست] ئەون، ئەوێت ب ئەدەب
و بێ مەزنایی، ل سەر ئەردی ب ڕێڤە دچن، و ئەگەر نەزانان [ب ڕەقی] ئاخاڤتن، ئاخڤتنەکا وەسا دبێژن
ژ گونەهێ ب سلامەت بن، و وەکی وان ب ڕەقی وان نائاخێڤن. ﴿٦٤﴾ و ئەون ئەوێت بۆ خودایێ خۆ،
شەڤان ب سوجدە و ڕابوونانڤە دبۆرینن [ئانکو شەڤنڤێژان دکەن]. ﴿٦٥﴾ و ئەون ئەوێت دبێژن: خودێوۆ،
عەزابا دۆژەهێ ژ مە بدە پاش، ب ڕاستی عەزابا وێ یا بەردەوامە [ئەگەر مرۆڤێ گاور گرت، ژێڤە نابیت].
﴿٦٦﴾ ب ڕاستی دۆژەهـ پیسە بنەجهـ و پیسە وارگەهـ. ﴿٦٧﴾ و ئەون ئەوێت وەختێ مالی دمەزێخن، نە
دەرێژییێ دکەن و نە چرویکییێ دکەن، و ئەو د ناڤبەرا ڤان هەردو سالۆخەتاندا ناڤنجینە.

وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ
ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن
يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ٦٨ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ
يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ٦٩ إِلَّا مَن تَابَ
وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ
سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ٧٠
وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ٧١
وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغۡوِ مَرُّواْ كِرَامًا ٧٢
وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا
صُمًّا وَعُمۡيَانًا ٧٣ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا
مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ
إِمَامًا ٧٤ أُوْلَٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ
وَيُلَقَّوۡنَ فِيهَا تَحِيَّةٗ وَسَلَٰمًا ٧٥ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ
حَسُنَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ٧٦ قُلۡ مَا يَعۡبَؤُاْ بِكُمۡ رَبِّي
لَوۡلَا دُعَآؤُكُمۡۖ فَقَدۡ كَذَّبۡتُمۡ فَسَوۡفَ يَكُونُ لِزَامَۢا ٧٧



﴿٦٨﴾ و ئەون ئەوێت ژ بلی خودێ، دوعایان ژ کەسێ دی نەکەن [ژ بلی خودێ کەسێ نەپەرێسن] و ئەو، ئەو مرۆڤێ خودێ کوشتنا وی دورست نەکری، و ب هەقی نەبیت [کو بەرانبەر ئێکێ دی بێتە کوشتن] ناکوژن، و زنایێ و دەهمەن پیسییێ ناکەن، و هەرکەسێ ڤان بکەت، دێ گونەهـ ل سەر ستویر بن، و دێ پێ ئێتە جزاکرن. ﴿٦٩﴾ ڕۆژا قیامەتێ ئیزا دێ ل سەر بیتە دوقات، و هەروهەر دێ ڕەزیل و شەرمزار تێدا مینیت [چونکی گونەهـ ژی دا د گەل گاورییێ]. ﴿٧٠﴾ ژ بلی وی یێ تۆبەکری و باوەری ئینای و کار و کریارێت ڕاست و قەنج کرین، ئەڤێت هۆسا، خودێ دێ گونەهێت وان کەتە خێر [ئانکو دێ گونەهێت وان ژێبەت، و خێران دێ ل جهێ وان دانیت]، و خودێ ب خۆ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٧١﴾ و ئەوێ تۆبە بکەت و [پاشی] کارەکێ ڕاست و باش بکەت، ب ڕاستی ئەو زڤرینەکا دورست ب بال خودێڤە زڤڕی. ﴿٧٢﴾ و ئەون ئەوێت بەرهەڤ نەبن خرابییێ و پویچییێ بکەن [چ شرك چ درەو چ شەهدەزۆری چ ژی هەر تشتەکێ پویچێ دی]، و ئەوێت گاڤا د بەر تشتێ بێ فایدەڕا [چ گۆتن چ کریار] دبۆرن، ڕوییێ خۆ ژێ وەردگێڕن، بێ خۆ شکاندن [نە پشکدارییا وان دکەن، نە ژی ژ وان ڕازی دبن]. ﴿٧٣﴾ و ئەون ئەوێت گاڤا ب ئایەتێت قورئانێ هاتنە شیرەتکرن یان بۆ هاتنە خواندن، خۆ لێ کەڕ و کۆرە ناکەن [گوهـ و چاڤێت خۆ بۆ ڤەدکەن]. ﴿٧٤﴾ و ئەون ئەوێت دبێژن: خودێوۆ، تو وان هەڤسەر و وێ دویندەهێ بدە مە، ئەوێت چاڤ پێ ڕۆن و خۆش دبن [و دل پێ ڤەهەسن]، و تو مە بۆ پارێزکاران، بکە پێشی و جهێ چاڤلێکرنێ د باشییێدا. ﴿٧٥﴾ ئەڤە [خودانێت ڤان سالۆخەتان] دێ ب بلندترین جهێت بەحەشتێ ئێنە خەلاتکرن، ژ بەر وێ سەبرا وان ل سەر پەرستن و گوهدارییا خودێ کێشایی، و ب خێرهاتن و ب سلاڤ، ملیاکەت دێ ب بەرڤە ئێن. ﴿٧٦﴾ هەروهەر دێ تێدا بن، چ خۆش جە و چ خۆش وارگەهە. ﴿٧٧﴾ ما خودێ دێ چ ل هەوە کەت، و چ ژ هەوە دێ گەهیتێ [ئانکو دەولەمەندە، و چو پاکی ب هەوە نینە، و هوین نەداینە دا هوین مفایەکی بگەهیننێ] ژ بلی پەرستنا هەوە بۆ وی [ئانکو هوین بەس بۆ پەرستنا خۆ، یێت داین]، ب سویند [گەلی گاورێت خەلکێ مەکەهێ] هەوە پێغەمبەر و قورئان درەو دانان، ڤێجا هوین دێ ب بەر ئیزاییێ کەڤن و ئیزا ژ هەوە ڤەنابیت.

## سورة الشعراء

بسم الله الرحمن الرحيم

الحزب ٣٧

طسٓمٓ ﴿١﴾ تلك ءايات الكتاب المبين ﴿٢﴾ لعلك باخع نفسك ألا
يكونوا مؤمنين ﴿٣﴾ إن نشأ ننزل عليهم من السماء ءاية فظلت
أعناقهم لها خاضعين ﴿٤﴾ وما يأتيهم من ذكر من الرحمن محدث
إلا كانوا عنه معرضين ﴿٥﴾ فقد كذبوا فسيأتيهم أنبؤا ما كانوا به
يستهزءون ﴿٦﴾ أولم يروا إلى الأرض كم أنبتنا فيها من كل زوج كريم ﴿٧﴾
إن في ذلك لآية وما كان أكثرهم مؤمنين ﴿٨﴾ وإن ربك لهو العزيز
الرحيم ﴿٩﴾ وإذ نادى ربك موسى أن ائت القوم الظالمين ﴿١٠﴾ قوم فرعون
ألا يتقون ﴿١١﴾ قال رب إني أخاف أن يكذبون ﴿١٢﴾ ويضيق صدري
ولا ينطلق لساني فأرسل إلى هارون ﴿١٣﴾ ولهم علي ذنب فأخاف
أن يقتلون ﴿١٤﴾ قال كلا فاذهبا بآياتنا إنا معكم مستمعون ﴿١٥﴾
فأتيا فرعون فقولا إنا رسول رب العالمين ﴿١٦﴾ أن أرسل معنا
بني إسرائيل ﴿١٧﴾ قال ألم نربك فينا وليدا ولبثت فينا من عمرك
سنين ﴿١٨﴾ وفعلت فعلتك التي فعلت وأنت من الكافرين ﴿١٩﴾



## سۆرەتا شوعەراء

**ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٢٢٧) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ [هۆسا دئێتە خواندن (طا، سین، میم) و ئەڤە و
هەمی تیپێت دەستپێکا سۆرەتان، نیشانن ل سەر ئیعجازا
قورئانێ]. ﴿٢﴾ ئەڤە ئایەتێت کتێبا رۆنکەرن. ﴿٣﴾ نێزیکە
تو ژ خەمان خۆ بکوژی و د هیلاك ببەی، چونکی ئەو
باوەرییێ نائینن. ﴿٤﴾ و ئەگەر مە حەزکربایە، ئەم دا
موعجیزەیەکێ ژ ئەسمانی بۆ وان هنێرین، دا ستۆیێت وان
هەر چەمیایی بۆ مینن [ڤیابانە نەڤیابانە دا باوەرییێ ئینن،
بەلێ مە ئەڤ باوەرییە ژ وان نەڤێت و ئەم وەناکەین، مە
دڤێت ئەو، ب دلێ خۆ و بێ کۆتەکی، باوەرییێ بینن].
﴿٥﴾ و چو ئایەتێت نوی ژ قورئانێ، ژ دەڤ خودایێ دلۆڤان
[بۆ گاور و موشرکان] نەدهاتن، ئەگەر وان روییێ خۆ
ژێ وەرنەگێڕابایە [و ب درەو نەدانابایە]. ﴿٦﴾ ب سویند
وان [ئەو هەقییا بۆ وان هاتی] درەو دانا [و باوەری پێ
نەئینا]، ڤێجا نێزیك دێ زانن کا دێ چ ب سەرێ وان ئێت [و جزایێ وێ، ئەوا وان ترانە پێ دکرن، دێ هەر ئێت].
﴿٧﴾ ما وان بەرێ خۆ نەددا ئەردی، کا چاوا مە ب هەمی رەنگێت پڕ مفا، شینکرییە [ئەوێت کەسێ شیانا وان نەی،
ژ بلی خودێ]. ﴿٨﴾ ب راستی ئەڤە بەلگە و نیشانەکە [رۆن و ئاشکەرایە ل سەر ئێکتاییا خودێ، و ل سەر شیانا
وی کو جارەکا دی مریان پشتی مرنێ ساخکەتەڤە]، بەلێ باراپتر ژ وان باوەرییێ نائینن. ﴿٩﴾ و ب راستی خودایێ
تە یێ سەردەست و زال [زالە ل سەر وان کو وان ئیزا بدەت، و دشێت تۆلێ ل وان ڤەکەت] و دلۆڤانە [وەختێ
مۆلەت داییە بەندەیێت خۆ، و لەز ل ئیزادانا وان نەکری]. ﴿١٠﴾ و بێژە وان وەختێ خودایێ تە گازی مووسایی کری
و گۆتیێ، هەرە دەڤ ملەتێ ستەمکار. ﴿١١﴾ ملەتێ فیرعەونی، ما ئەو ژ ئیزادانا خودێ ناترسن. ﴿١٢﴾ [مووسایی]
گۆت: خودێوۆ، ب راستی ئەز دترسم ئەو من درەوین دانن، و باوەر ژ من نەکەن. ﴿١٣﴾ و سینگێ من [ژ بەر درەو
دانانا وان بۆ من] تەنگ ببیت، و ئەزمانێ من نەگەڕیت، ڤێجا [جبرائیلی ب وەحییێ] بهنێرە بۆ هاروونی [دا د گەل من
ببیتە پێغەمبەر، و بۆ من ببیتە هاریکار]. ﴿١٤﴾ و وان تۆلەکا ل سەر من، ڤێجا ئەز دترسم [بەری پەیاما تە بگەهینمە
وان، تۆلا خۆ ل من ڤەکەن و] من بکوژن. ﴿١٥﴾ [خودێ] گۆت، نەخێر [ئەو نەشێن تە بکوژن]، ڤێجا تو و هاروون
ب نیشان و موعجیزەیێت مەڤە هەرن، ب راستی ئەز یێ د گەل هەوە [ب پارستن و چاڤدێرییا خۆڤە]، و من های
ژێ هەیە [کا دێ چ بێژن، و دێ چ بێژنە هەوە]. ﴿١٦﴾ هوین هەردو هەرنە دەڤ فیرعەونی، و بێژنێ، ب راستی ئەم
هەردو هنارتییێت خودانێ هەمی جیهانانین. ﴿١٧﴾ ڤێجا ئسرائیلیان د گەل مە بهنێرە [و بەس وان ئەزیەت بدە].
﴿١٨﴾ [ڤێجا وەختێ فیرعەونی مووسا دیتی، و ئاخڤتنێت وی بهیستین] گۆت: ما مە تو ب بچویکاتی د ناڤ
خۆدا خودان نەکربووی؟ و تو ب سالان د ناڤ مەدا نەمابووی؟ [ڤێجا کەنگی و د کیرێڕا تو بوویە پێغەمبەر].
﴿١٩﴾ [و بەرانبەری قەنجییێت مە د گەل تە کرین] تە ئەو کریار ژی کریا تە کری [ئانکو تە ئێك ژ مە کوشت]، و
دیارە تو ژ چاڤنەق و بێ نان و خوێیانی [وەختێ تە قەنجییێت مە ژ بیرکرین، و ئێك ژ مە کوشتی].

قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ
فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا
عَلَىَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾
قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾
قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ
ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾
قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾
قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾
قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ
مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾
وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ
إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم
بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ
حَٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴿٣٧﴾ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ
لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٣٨﴾ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾



﴿٢٠﴾ [مووسایی] گۆت: من ئەو کریارە کر، و من نەزانی دێ ئێتە کوشتن [مەخسەدا من کوشتنا وی نەبوو، دەمێ من کری]. ﴿٢١﴾ ڤێجا وەختێ ئەز ژ هەوە ترسیایم، ئەز ژ هەوە رەڤیم [ژ ترسا هندێ هوین من بکوژن]، ڤێجا خودایێ من پێغەمبەراتی و زانین دا من، و ئەز کرمە ژ پێغەمبەران. ﴿٢٢﴾ و تو ڤێ ل سەر من دکەیە منەت کو تە ئەز خودان کریمە، و تە ئسرائیلی بۆ خۆ کرینە کۆلە و سەپان [تە کورێت وان دکوشتن، و کچێت وان بۆ خۆ دکرنە خدام، هەر ژ بەر هندێ دەیکا من ژ ترساندا، ئەز ب ئاڤێدا بەردام، و تە ئەز ژ ئاڤێ ئینامە دەر و خودانکرم، و ل بەر چاڤێت تە ئەز مەزن بووم]. ﴿٢٣﴾ فیرعەونی گۆت: خودانێ هەمی جیهانان کیـیە؟ ﴿٢٤﴾ [مووسایی] گۆت: [خودانێ هەمی جیهانان] خودانێ ئەرد و ئەسمانان و هندی د ناڤبەرا واندایە، ئەگەر هەوە ئێقین ب تشتەکی هەبیت، ئەڤە ژ هەمی تشتان هێژاترە هەوە ئێقین پێ هەبیت، چونکی یێ ئاشکەرایە. ﴿٢٥﴾ [فیرعەونی] گۆتە یێت دەوروبەرێت خۆ، هەوە گولێ هەیە [کا مووسا چ دبێژیت]؟!. ﴿٢٦﴾ [مووسایی] گۆت: [بەلێ] ئەو خودایێ هەوەیە، و خودایێ باب و باپیرێت هەوەیێت کەڤنە ژی. ﴿٢٧﴾ [فیرعەونی] گۆت: ب راستی ئەڤ پێغەمبەرێ هەوە، ئەڤێ بۆ هەوە هاتییە هنارتن، یێ دینە. ﴿٢٨﴾ [مووسایی] گۆت: ئەو خودایێ رۆژهەلاتێ و رۆژئاڤاییێیە و هندی د ناڤبەرا واندا، ئەگەر هەوە عەقل هەبیت [چونکی هەر ئەوە یێ هەرۆ، رۆژێ ژ ملێ رۆژهەلاتێ دەردئێخیت، و ل ملێ رۆژئاڤاییێ ئاڤا دکەت، و هوین ڤێ چەندێ ب چاڤێ سەرێ خۆ دبینن، ما ئەڤە عەقلەکی نادەتە هەوە]. ﴿٢٩﴾ [فیرعەونی] گۆت: ئەگەر تە خودایەکێ دی ژ بلی من گرت، ب سویند ئەز دێ تە کەمە د زیندانێدا [و ئەڤە رێکەکا کەڤنەوییـیە، هەر گاڤەکا دژمنێت پەیاما خودێ بێ هیڤی بوون، رێکا پەیاما خودێ ب دان و ستاندنێ بگرن، دەست ب گەف و ئێشاندن و زیندانکرنێ دکەن]. ﴿٣٠﴾ [مووسایی] گۆت: خۆ ئەگەر ئەز بەلگە و نیشانەکا ئاشکەرا ژی بۆ تە بینم [تو دێ هەر من کەیە د زینداندا؟]. ﴿٣١﴾ [فیرعەونی] گۆت: کا وێ بەلگە و نیشانێ بینە، ئەگەر تو ژ راستگۆیان بی [دا سەحکەینێ، کا وەسایە وەکی تو دبێژی]. ﴿٣٢﴾ ڤێجا [مووسایی] دارێ خۆ هاڤێت، و بوو مارەکێ دورست و ئاشکەرا. ﴿٣٣﴾ و دەستێ خۆ [ژ پاخلا خۆ] دەرئێخست، سپی بۆ تماشەکەران دەرکەڤت. ﴿٣٤﴾ [فیرعەونی] گۆتە سەرۆك و گرەگرێت دۆرماندۆری خۆ: ب راستی ئەڤە سێرەبەندەکێ زێدە زانایە. ﴿٣٥﴾ دڤێت هەوە ب سێرەبەندییا خۆ ژ ئەردێ هەوە [کو مسرە] دەربێخیت، ڤێجا کا هوین چ دبێژن [ئەم چ لێ بکەین]، و چ فەرمانێ ددەن [د راستا ویدا]. ﴿٣٦﴾ گۆتن: وی و برایێ وی گیرۆکە، و کۆمکەران بهنێرە بازێران. ﴿٣٧﴾ بلا هەمی سێرەبەندێت زێدەزانا بۆ تە بینن. ﴿٣٨﴾ ڤێجا سێرەبەند هەمی ل وەختێ دیارکری، هاتنە کۆمکرن. ﴿٣٩﴾ [وێ رۆژێ فیرعەونی] گۆتە خەلکی: لەزێ بکەن کۆم ببن.

لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُواْ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ
قَالُواْ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ قَالَ نَعَمْ
وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٤٣﴾
فَأَلْقَوْاْ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُواْ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ
ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿٤٥﴾
فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾
رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّهُۥ
لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ۚ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ
وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٩﴾ قَالُواْ لَا ضَيْرَ ۖ إِنَّآ
إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ
أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥١﴾ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم
مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ
لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾
فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾
كَذَٰلِكَ ۖ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٣٧





﴿٤٠﴾ بەلكی ئەم ب دویڤ سێرەبەندان بکەڤین،
ئەگەر ئەو سەرکەڤتن [وەسا خۆ دیارکرن هەروەکی
ئەو د گەل کەسێ نە، و نە وان سێرەبەند کۆمکرینە].
﴿٤١﴾ ڤێجا وەختێ سێرەبەند [ئەوێت هاتینە کۆمکرن]
هاتینە دەڤ فیرعەونی، گۆتنێ: ئەرێ خەلاتەك بۆ
مە هەیە، ئەگەر ئەم سەرکەڤتین. ﴿٤٢﴾ [فیرعەونی]
گۆت: بەلێ.. [هەوە خەلاتێ خۆ یێ هەی] و دێ
ژ وان ژی بن، یێت نێزیکی من. ﴿٤٣﴾ مووسایی
گۆتە وان [گەلی سێرەبەندان]: کا دێ چ هاڤێژن،
باڤێژن. ﴿٤٤﴾ ڤێجا [سێرەبەندان] وەریس و دارێت
خۆ هاڤێتن، و گۆتن: ب مەزناتی و هێزا فیرعەونی،
ئەم دێ سەرکەڤین. ﴿٤٥﴾ ڤێجا [پاشی] مووسایی
دارێ خۆ هاڤێت [و وەختێ دارێ خۆ هاڤێتی]، وی
[دارێ مووسایی] وەریس و دارێت وان [سێرەبەندان]
ب جارەکێ داعویران [و ئەو چاڤ سحراندن، و
خاپاندنا وان کری، هەمی پویچ کر]. ﴿٤٦﴾ ڤێجا
[وەختێ سێرەبەندان ئەڤ ڕاستییە دیتی، و هەقی
ئاشکەرا بووی و سێرەبەندییا وان پویچ بووی]
سێرەبەندان خۆ بەردا ئەردی، و چۆنە سوجدەیێ. ﴿٤٧﴾ گۆتن: مە باوەری ب خودایێ، هەمی خەلکی،
ئینا. ﴿٤٨﴾ خودایێ مووسایی و هاروونی. ﴿٤٩﴾ [فیرعەونی] گۆتە [سێرەبەندان]: ئەرێ هەوە باوەری
پێ ئینا، بەری ئەز دەستویرییا هەوە بدەم، دیارە ئەو مەزن و مامۆستا و سەیدایێ هەوەیە، یێ سێرەبەندی
نیشا هەوە دایی، ڤێجا هوین دێ زانن [کا ئەز دێ چ ب سەرێ هەوە ئینم]، ب ڕاستی ئەز دێ دەست و
پییێت هەوە چەپ و ڕاست ژێڤەکەم، پاشی دێ هەوە هەمییان ب دارانڤە هەلاویسم، هەتا هوین دمرن.
﴿٥٠﴾ [سێرەبەندان] گۆتن: خەم ناکەت [هەر تشتێ بێتە سەرێ مە، ژ بەر باوەرییئینانا مە ژ ئێزایا دنیایێ،
چو زیانێ ناگەهینیتە مە]، ب ڕاستی ئەم دێ ب بال خودایێ خۆڤە زڤرین. ﴿٥١﴾ چونکی مە بەری
هەمییان باوەری پێ ئینا، ئەم تەمایییا هندێ دکەین، خودایێ مە ل مە نەگریت، و گونەهێت مە ژێ ببەت.
﴿٥٢﴾ و مە وەحی بۆ مووسایی هنارت، کو ب شەڤ بەندەیێت من [ئەوێت باوەری پێ ئینایین، ژ
ئسرائیلییان] دەربێخیت [ژ مسرێ بۆ سەر دەریایا سۆر]، ب ڕاستی ئەو دێ ب دویڤ هەوە کەڤن.
﴿٥٣﴾ ڤێجا [دەمێ] فیرعەون [ب دەرکەڤتنا وان حەسیایی] هنارتە هەمی باژێران، و لەشکەر کۆمکر.
﴿٥٤﴾ [و فیرعەونی] گۆت: ب ڕاستی ئەڤە دەستەکەکا کێمن [و بێ مرۆڤن]. ﴿٥٥﴾ و ب ڕاستی وان کەربێت
مە یێت ڤەکرین. ﴿٥٦﴾ و ئەم هەمی یێت کارکری و هشیارین [هەچییێ دژی مە ڕاوەستیت، و ژ بەر ئەمرێ
مە دەرکەڤیت، ئەم ناهێلین]. ﴿٥٧﴾ ڤێجا مە ئەو هەمی [فیرعەون و لەشکەرێ وی] ژ جنێك و باخچە و
کانیان دەرئێخستن. ﴿٥٨﴾ و مە ئەو ژ گەنجخانە و شوینوارێت وان، یێت خۆش و بەرفرەهـ دەرئێخستن.
﴿٥٩﴾ و هۆسا مە ئەو دەرئێخستن، و ئسرائیلی کرنە وێرس و میراتخۆرێت وان. ﴿٦٠﴾ و د گەل ڕۆژهەلاتێ
[فیرعەون و لەشکەرێ خۆ] ب دویڤ وان کەڤتن.

فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ٦١
قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ٦٢ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ
ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ٦٣
وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ ٦٤ وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ ٦٥
ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ٦٦ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ
أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ٦٧ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ٦٨
وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ ٦٩ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ ٧٠
قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ٧١ قَالَ هَلۡ
يَسۡمَعُونَكُمۡ إِذۡ تَدۡعُونَ ٧٢ أَوۡ يَنفَعُونَكُمۡ أَوۡ يَضُرُّونَ ٧٣ قَالُواْ
بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ٧٤ قَالَ أَفَرَءَيۡتُم مَّا كُنتُمۡ
تَعۡبُدُونَ ٧٥ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلۡأَقۡدَمُونَ ٧٦ فَإِنَّهُمۡ عَدُوّٞ لِّيٓ
إِلَّا رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٧٧ ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهۡدِينِ ٧٨ وَٱلَّذِي هُوَ
يُطۡعِمُنِي وَيَسۡقِينِ ٧٩ وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ ٨٠ وَٱلَّذِي
يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحۡيِينِ ٨١ وَٱلَّذِيٓ أَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي
يَوۡمَ ٱلدِّينِ ٨٢ رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ٨٣



﴿٦١﴾ ڤێجا وەختێ هەردو كۆم بۆ ئێك ئاشكەرا بووین، و ئێكدو دیتین، هەڤالێت مووسایی گۆتن: بێ گۆمان ئەڤە گەهشتنە مە. ﴿٦٢﴾ [مووسایی] گۆت: نەخێر.. ئەو ناگەهنە مە [نەترسن]، ب ڕاستی خودایێ من یێ د گەل من [ب ڕاستەڕێییێ و هاریكاریا خۆڤە]، دێ ڕێكەكێ بۆ مە ڤەكەت و نیشا مە دەت. ﴿٦٣﴾ ڤێجا مە وەحی بۆ مووسایی هنارت، مە گۆتێ: داریێ خۆ ل دەریایێ بدە [داریێ خۆ لێدا]، ڤێجا دەریا ژێكڤەبوو، بوو دو فلق و هەر فلقەكا ئاڤێ وەكی چیایەكێ مەزن بوو [ئبن عەباس دبێژیت: دوازدە ڕێكێت هشك ل دویڤ هەژمارا ئویجاخێت ئسرائیلییان لێ ڤەبوون]. ﴿٦٤﴾ و هنگی (وی دەمی) مە ئەوێت دی [فیرعەون و لەشكەرێ وی] نێزیكی وان كرن [هەتا هەمی گەهشتینە دەریایێ، و داینە دویڤ وان]. ﴿٦٥﴾ و مە مووسا و ئەوێت دگەل، هەمی ڕزگار كرن. ﴿٦٦﴾ پاشی ئەوێت دی [ئانكو فیرعەون و ئەوێت د گەل وی، ئەوێت داینە دویڤ وان، و دڤیان مووسایی و ئسرائیلییان ڤەگێڕن] هەمی مە خەندقاندن [و مە دەریا لێ ئینا ئێك]. ﴿٦٧﴾ ب ڕاستی ئەڤە [د چیرۆكا مووسایدا، هەر ژ دەسپێكێ هەتا فیرعەون و لەشكەرێ وی د ئاڤێدا خەندقین] نیشان و بەلگەیەكا ئاشكەرا و گۆمانبڕە [ل سەر دەستهەلاتداریا خودێ، و ل سەر هندێ كو خودێ دێ خودان باوەران هەر سەرئێخیت و ڕزگار كەت، و دێ دژمنێت وان بەرئاتاف كەت، چەند ب هێز بن]، و پتریا وان [ملەتێ مووسایی] نە ژ خودان باوەران بوون. ﴿٦٨﴾ و ب ڕاستی خودایێ تە، تۆلێ ژ دژمنێت خۆ ڤەدكەت، و دلۆڤانییێ ب وەلیێت خۆ دبەت. ﴿٦٩﴾ و بەحسێ ئیبراهیمی بۆ وان بكە. ﴿٧٠﴾ دەمێ گۆتییە بابێ خۆ و ملەتێ خۆ، ئەرێ هوین چ دپەرێسن؟. ﴿٧١﴾ گۆتن: ئەم هندەك بوتان دپەرێسین، و ئەم بەردەوامین ل سەر پەرستنا وان. ﴿٧٢﴾ [ئیبراهیمی] گۆت: [ئەرێ ئەڤێت هوین دپەرێسن] وان های ژ هەوە هەیە، وەختێ هوین گازی وان دكەن؟. ﴿٧٣﴾ یان ژێ ئەو مفا و زیانەكێ دگەهیننە هەوە؟. ﴿٧٤﴾ [چو بەرسڤ بۆ نەدیتن ئینا] گۆتن: نە [نە های ژ مە هەنە، و نە چو مفایی دگەهیننە مە، و نە ژێ چو زیانێ..] بەلێ مە دیت باب و باپیرێت مە ژێ، هەر ئەڤە دكرن [بوت دپەرستن، ڤێجا ئەم ژێ چاڤ ل وان دكەین]. ﴿٧٥﴾ [ئیبراهیمی] گۆت: ئەرێ هەوە هزرا خۆ كرییە، كا هوین چ دپەرێسن؟. ﴿٧٦﴾ هوین و باب و باپیرێت خۆ یێت كەڤن [دزانن هوین چ دپەرێسن؟]. ﴿٧٧﴾ ب ڕاستی ئەو هەمی دژمنێت منن، ژ بلی خودانێ هەمی جیهانان كو خودێیە. ﴿٧٨﴾ ئەوێ ئەز دایم [ئەوە خودانێ هەمی جیهانان]، و ئەو دێ بەرێ من دەتە ڕێكا ڕاست [نە بوتێت هوین دپەرێسن]. ﴿٧٩﴾ و ئەوێ خوارن و ڤەخوارنێ ددەتە من [ئانكو من ب خوارن و ڤەخوارنا خۆ ساخ دهێلیت]. ﴿٨٠﴾ و ئەوێ گاڤا ئەز نەساخ بووم، ئەو ساخی و سلامەتییێ ددەتە من، و من ساخ دكەت. ﴿٨١﴾ و ئەوێ من دمرینیت، و پاشی پشتی مرنێ من ساخ دكەتەڤە. ﴿٨٢﴾ و ئەوێ ئەز ژێ ب هیڤی، كو گونەهێت من ڕۆژا قیامەتێ و جزادانێ ژێ ببەت. ﴿٨٣﴾ خودێوۆ تو زانین و تێگەهشتن و پێغەمبەراتییێ بدە من، و تو من [د دنیایێ و ئاخرەتێدا] بگەهینە مرۆڤێت باش و ڕاستكار.

وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ٨٤ وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ
ٱلنَّعِيمِ ٨٥ وَٱغۡفِرۡ لِأَبِيٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ٨٦ وَلَا تُخۡزِنِي يَوۡمَ
يُبۡعَثُونَ ٨٧ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ٨٨ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ
سَلِيمٖ ٨٩ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ ٩٠ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ
لِلۡغَاوِينَ ٩١ وَقِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ ٩٢ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلۡ
يَنصُرُونَكُمۡ أَوۡ يَنتَصِرُونَ ٩٣ فَكُبۡكِبُواْ فِيهَا هُمۡ وَٱلۡغَاوُۥنَ ٩٤ وَجُنُودُ
إِبۡلِيسَ أَجۡمَعُونَ ٩٥ قَالُواْ وَهُمۡ فِيهَا يَخۡتَصِمُونَ ٩٦ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي
ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ٩٧ إِذۡ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٩٨ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا
ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٩٩ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ١٠٠ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٖ ١٠١ فَلَوۡ
أَنَّ لَنَا كَرَّةٗ فَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٠٢ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ
أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ١٠٣ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ١٠٤ كَذَّبَتۡ
قَوۡمُ نُوحٍ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ١٠٥ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ١٠٦
إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ١٠٧ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ١٠٨ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ
عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٠٩ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
الحِزْبُ ٣٨ وَأَطِيعُونِ ١١٠ ۞ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ١١١



﴿٨٤﴾ و تـو ناڤێ من ب قەنجی و باشـی بهێلـە د ناڤ واندا،
یێـت د دویـڤ منڕا دئێن [کو ب باشـی بەحسـێ من بکەن
هەتـا ڕۆژا قیامەتـێ، ئەڤە د دنیاییـدا]. ﴿٨٥﴾ و تو من [ڕۆژا
قیامەتـێ] بکـە ژ وێرسـێت بەحەشـتا پـڕ خـێر و بەرەکەت.
﴿٨٦﴾ و گونەهێـت بابـێ مـن ژێ ببـە، ب ڕاسـتی ئـەو ژ
ڕێبـەرزە و گۆمڕایانـە. [هەلبـەت ئـەڤ دوعایـە ژ ڤانەکێ
بـوو و بـەری بزانیـت بابـێ وی باوەرییـێ نائینیـت و دێ ل
سـەر گاورییـێ چیـت]. ﴿٨٧﴾ و تو من ڕسـوا و شـەرمزار
نەکـە، وێ ڕۆژا هەمـی خـودان ڕوح تێـدا زێنـدی دبـن، و
کـۆم دبـن. ﴿٨٨﴾ ڕۆژا کوڕ و کچ و چو تشـتێ دی فایدەی
نەگەهینیتـە مرۆڤـی. ﴿٨٩﴾ ژ بلـی کـو مـرۆڤ ب دلەکـێ
سـاخلەم و دورسـت و ب بـاوەر بچیتـە دەڤ خـودێ.
﴿٩٠﴾ و بەحەشـت بـۆ خودێنـاس و پارێـزکاران بەرهـەڤ
بـوو، و هاتـە نێزیککـرن. ﴿٩١﴾ و دۆژەهـ بۆ سـەرداچۆیی
و گونەهـکاران پێشـچاڤ بـوو. ﴿٩٢﴾ و دێ بێژنـە وان:
کانـێ ئەوێـت هـەوە پەرسـتین؟. ﴿٩٣﴾ ئـەرێ ئەوێت هەوە
شـوینا خـودێ پەرسـتین هاری هـەوە دکـەن [ئانکـو هەوە
ژ ئیزایـا خـودێ ڕزگـار دکـەن]، یـان ژێ دشـێن هـاری
خـۆ بکـەن [و ئیزایـێ ژ خـۆ بدەنـە پـاش]. ﴿٩٤﴾ ڤێجـا ئـەو و پەرسـتییێت وان، ئێـك ل دویـڤ ئێکـی سەروسـەر
هاڤێتنـە تێـدا [د جەهنەمێـدا]. ﴿٩٥﴾ و هەمی لەشـکەرێ شـەیتانی ژی سەروسـەر هاڤێتنـە د جەهنەمێـدا. ﴿٩٦﴾ گۆتنە
پەرسـتییێت خـۆ، و جڕەبڕا وان بـوو د دۆژەهێدا. ﴿٩٧﴾ سـویند ب خـودێ ئەم د خەلەتـی و گومڕاییەکا ئاشـکەرادا
بوویـین. ﴿٩٨﴾ وەختـێ مـە هویـن ئینایینـە ڕێـزا خـودێ [و مـە هویـن پەرسـتین]. ﴿٩٩﴾ ژ گونەهکاران [سـەرگاور
و کەنکەنەیـان، ژ شـەیتانێت جنـاوەر و مرۆڤـان] پێڤەتـر، کەسـێ ئـەم د سـەردا نەبریـن. ﴿١٠٠﴾ ڤێجـا ئەڤـرۆ مـە چـو
مەهدەرچـی نینـن [وەکی خـودان باوەران هەیـن، ژ پێغەمبەر و ملیاکەتـان]. ﴿١٠١﴾ و چو هەڤالێت نێزیك و خۆشـتڤی
ژی نینـن [کـو هاریکارییـا مـە بکەن، و مـە ژ ئیزایا خـودێ ڕزگار بکەن، یـان هەڤالینییـا وان بکەین، چونکـی قیامەتێ
بـەس موسـلمان هەڤالینییا ئێکـدو دکـەن، و یێت دی چەند خۆشـتڤییێت ئێك بـوون د دنیاییـدا، ڕۆژا قیامەتـێ هند دبنە
نەیارێـت ئێـك]. ﴿١٠٢﴾ و ئەگـەر زڤڕینـەکا دی، مە هەبایە بـۆ دنیایێ، ئەم دا بینە خـودان باوەر. ﴿١٠٣﴾ ب ڕاسـتی ئەڤە
[بەحسـکرنا پێغەمبـەران و دویماهیـکا گـاوران ڕۆژا قیامەتـێ] نیشـان و بەلگەیە، بەلـێ باراپتر ژ وان [ژ قورەیشـییان]
بـاوەری نەئینـان. ﴿١٠٤﴾ و ب ڕاسـتی خودایێ تە سەردەسـتی دژمنێت خۆیـە، و دلۆڤانە بۆ خودێناسـان. ﴿١٠٥﴾ ملەتێ
نووحـی ژی، پێغەمبـەر درەویـن دانـان. ﴿١٠٦﴾ وەختـێ برایـێ وان نووحی، گۆتییە وان: ما هوین ژ خودێ ناترسـن؟
[هویـن غەیـری وی دپەرێسـن]. ﴿١٠٧﴾ ب ڕاسـتی ئـەز بـۆ هـەوە پێغەمبەرەکـێ ئەمینـم. ﴿١٠٨﴾ ڤێجا تەقوایـا خودێ
بکـەن [ب گوهداریـیا وی خـۆ ژ ئیزایـێ بدەنـە پـاش]، و گوهـێ خـۆ بدەنـە مـن [پەرسـتنا غەیـری خـودێ بهێلن].
﴿١٠٩﴾ [و ل سـەر گەهاندنـا ڤـێ نامەیێ، و ڤان شـیرەتان] ئەز چـو کرێیان ژ هـەوە ناخوازم [ئەز چو ژ هـەوە ناخوازم،
هویـن ژبـەر، گوهـێ خـۆ نەدەنـە من]، کرێیـا من ل سـەر خودانـێ جیهانانـە. ﴿١١٠﴾ ڤێجا ژ خـودێ بترسـن، و گوهێ
خـۆ بدەنـە مـن. ﴿١١١﴾ گۆتـن: ئـەم دێ چـاوا باوەرییـێ ب تە ئینـن [و ب دویـڤ تە کەڤـین]، و ئەوێت بـاوەری ب تە
ئینایـین و ل دویـڤ تـە هاتـین، ئـەون یێت بـێ ڕێـز و ڕویمەت.

قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١١٢﴾ إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّي ۖ
لَوْ تَشْعُرُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٤﴾ إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ
مُّبِينٌ ﴿١١٥﴾ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ ﴿١١٦﴾ قَالَ رَبِّ
إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَٱفْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِي وَمَن مَّعِيَ
مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١١٩﴾
ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ ٱلْبَاقِينَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ
أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٢١﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٢﴾ كَذَّبَتْ
عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّي لَكُمْ
رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ
مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ
ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾
وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾
وَٱتَّقُوا۟ ٱلَّذِيٓ أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَٰمٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾
وَجَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣٥﴾
قَالُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ ٱلْوَٰعِظِينَ ﴿١٣٦﴾



﴿١١٢﴾ [نووحی] گۆت: ما ئەز چ دزانم وان چ دکر؟ [ئانکو یا فەر ل دەڤ من نە شۆلێ وانە، کا چ دکەن؟ یا فەر ئەوە باوەرییێ بینن]. ﴿١١٣﴾ حسێبا وان بەس یا ل دەڤ خودێ، ئەگەر هوین بزانن. ﴿١١٤﴾ و ئەز نەئەوم یێ خودان باوەران دەربێخم [ل سەر خاترا هەوە]. ﴿١١٥﴾ و ئەز بەس پێغەمبەر و ئاگەهدارکەرەکێ رۆنکەرم. ﴿١١٦﴾ گۆتن ئەگەر تو [عەیبدارکرنا دینێ مە، و وان ئاخفتنێت تو د راستا بوتێت مەدا دکەی] بەس نەکەی، هەی نووح، ب راستی دێ ژ وان بی، ئەوێت ب بەران دئێنە کوشتن. ﴿١١٧﴾ [نووحی] گۆت: خودێوۆ ملەتێ من، ئەز درەوین دانام [و گوهێ خۆ نەدانە من، و عیناد د درەودانانا مندا کرن]. ﴿١١٨﴾ ڤێجا [خودێوۆ] تو حوکمی د ناڤبەرا من و واندا بکە، و تو من و خودان باوەرێت د گەل من، رزگار بکە. ﴿١١٩﴾ ڤێجا مە ئەو و هندی دگەل، د گەمیا بارکریدا، رزگار کرن. ﴿١٢٠﴾ پاشی ئەوێت مایی، مە د ئاڤێدا خەندقاندن. ﴿١٢١﴾ ب راستی ئەڤە [رزگارکرنا نووحی و هندی د گەل هۆسا، و خەندقاندنا ئەوێت مایی] چامە و نیشانەکە، د گەل هندێ ژی، باراپتر ژ وان باوەری نەئینان.

﴿١٢٢﴾ ب راستی خودایێ تە سەردەستی دژمنێت خۆیە، و دلۆڤانە بۆ خودێناسان. ﴿١٢٣﴾ [و ملەتێ] عاد ژی، پێغەمبەر درەوین دانان [و باوەری ب وان نەئینا، و یێ باوەرییێ ب پێغەمبەرەکی نەئینیت، هەروەکی وی باوەری ب چویان نەئینایی]. ﴿١٢٤﴾ وەختێ برایێ وان هوود، گۆتییە وان: ما هوین [ژ ئیزا و تۆلا] خودێ ناترسن، هوین غەیری وی دپەرێسن. ﴿١٢٥﴾ ب راستی ئەز بۆ هەوە، پێغەمبەرەکێ ئەمینم. ﴿١٢٦﴾ ڤێجا ژ [ئیزایا] خودێ بترسن، و گوهێ خۆ بدەنە من، و ب گۆتنا من بکەن. ﴿١٢٧﴾ [و ل سەر گەهاندنا ڤێ نامەیێ، و ڤان شیرەتان] ئەز چو کرێیان ژ هەوە ناخوازم [و ئەز چو ژ هەوە ناخوازم، هوین گوهێ خۆ نەدەنە من]، کرێیا من بەس ل سەر خودانێ هەمی جیهانانە. ﴿١٢٨﴾ ئەڤە چیە بۆ پویچییێ و خۆمەزنکرنێ، هوین ل سەر هەر جهەکێ بلند، و ل سەرێ هەر رێکەکێ ئاڤاهییەکێ بلند [وەکی چیایەکی]، ئاڤا دکەن؟!. ﴿١٢٩﴾ و هوین ئاڤاهییێت زێدە موکوم و ئاسێ بۆ خۆ ئاڤا دکەن، ب ئنیەتا هندێ، هوین هەروهەر دێ مینن و نامرن. ﴿١٣٠﴾ و گاڤا هەوە ئێك گرت و کەڤتە لەپێ هەوە [بۆ تۆلڤەکرن و جزادانێ]، هەوە ب دورندەیی و دژواری ئێشاند و ئیزادا. ﴿١٣١﴾ ڤێجا ژ خودێ بترسن، و گوهێ خۆ بدەنە من. ﴿١٣٢﴾ و ژ وی بترسن و پارێزکارییا وی بکەن، ئەوێ ئەڤ کەرەمە د گەل هەوە کری، یا هوین دزانن. ﴿١٣٣﴾ ئەوێ تەرش و کەوال و زارۆك دایینە هەوە. ﴿١٣٤﴾ و ئەوێ جنێك و کانی ژی دایینە هەوە. ﴿١٣٥﴾ ب راستی ترسا من ل سەر هەوە، ترسا ئیزایا رۆژەکا گرانە [ئەگەر هوین د ڤێ گاوری و نەگۆهدارییا خۆدا بمینن]. ﴿١٣٦﴾ ئەوان [هۆسا بەرسڤا هوود دا]، گۆتن: تو شیرەتان ل مە بکەی یان نەکەی، ل دەڤ مە ئێکە [ئەم پویتە ب ئاخفتن و شیرەتێت تە ناکەین، و د بنیرا ئەڤا ئەم ل سەر ئەم ناهێلین، و ب دویڤ تە ناکەڤین].

إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلۡأَوَّلِينَ ١٣٧ وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ١٣٨ فَكَذَّبُوهُ
فَأَهۡلَكۡنَٰهُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ١٣٩
وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ١٤٠ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ١٤١ إِذۡ
قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ١٤٢ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ١٤٣
فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ١٤٤ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ
إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٤٥ أَتُتۡرَكُونَ فِي مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ١٤٦
فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ١٤٧ وَزُرُوعٖ وَنَخۡلٖ طَلۡعُهَا هَضِيمٞ ١٤٨
وَتَنۡحِتُونَ مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا فَٰرِهِينَ ١٤٩ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ١٥٠
وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمۡرَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ١٥١ ٱلَّذِينَ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ
وَلَا يُصۡلِحُونَ ١٥٢ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلۡمُسَحَّرِينَ ١٥٣ مَآ أَنتَ
إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا فَأۡتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ١٥٤ قَالَ
هَٰذِهِۦ نَاقَةٞ لَّهَا شِرۡبٞ وَلَكُمۡ شِرۡبُ يَوۡمٖ مَّعۡلُومٖ ١٥٥ وَلَا تَمَسُّوهَا
بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابُ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ١٥٦ فَعَقَرُوهَا فَأَصۡبَحُواْ
نَٰدِمِينَ ١٥٧ فَأَخَذَهُمُ ٱلۡعَذَابُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ
أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ١٥٨ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ١٥٩



﴿١٣٧﴾ و ئەڤـا ئـەم ل سـەر، دینـیٔ بـاب و باپیرێـت
مەیـە. ﴿١٣٨﴾ و ئـەم نائێینـە ئیـزادان [ئانکـو قیامـەت
نینـە]. ﴿١٣٩﴾ و وان [هـوود] درەویـن دانـا [و بـاوەری
پـێ نەئینـا]، ئینـا مـە ژی ئـەو ڤەبرانـدن، ب ڕاسـتی
ئەڤـە [ڤەبرانـدن و هیلاکبرنـا وان] چامـە و نیشـانەکە،
د گـەل هنـدێ ژی، باراپـتر ژ وان بـاوەری نەئینـان.
﴿١٤٠﴾ ب ڕاسـتی خودایـێ تـە، سەردەسـتی دژمنێـت
خۆیـە، و دلۆڤانـە بـۆ خودێناسـان. ﴿١٤١﴾ ملەتـێ
(سـەموود) ژی، پێغەمبەر درەوین دانـان. ﴿١٤٢﴾ وەختـێ
برایـێ وان (صالـح) پێغەمبـەر، گۆتیـە وان: مـا هوین
ژ خـودێ ناترسـن [هویـن غەیـری وی دپەرێسـن]؟.
﴿١٤٣﴾ ب ڕاسـتی ئـەز بـۆ هـەوە پێغەمبەرەکـێ ئەمینـم.
﴿١٤٤﴾ ڤێجـا ژ خـودێ بترسـن، و گوهـێ خـۆ بدەنە من.
﴿١٤٥﴾ و ئـەز [ل سـەر گەهاندنا فەرمانێـت خودێ و ڤان
شـیرەتان] چو کرێیان ژ هـەوە ناخوازم [گوهداریـیا من
ل هـەوە یـا گـران بیـت، و ژ بـەر هنـدێ، هویـن گوهـێ
خـۆ نەدەنـە مـن]، کرێیـا مـن بـەس یـا ل سـەر خودانـێ
هەمـی جیهانـان. ﴿١٤٦﴾ ئـەرێ هویـن ل وێ هزرێنـە،
هۆسا ئێـمن بمینـنە د ڤـان خـێر و خۆشیانـدا [و خودێ هـەوە ئیزا نـەدەت، ل سەر گاوریـیا هویـن دکـەن]؟!.
﴿١٤٧﴾ [بمیننـە] د نـاڤ ڤـان جنیـك و کانیانـدا؟. ﴿١٤٨﴾ و [بمیننـە] د نـاڤ چاندنـی و دارقەسـپێت ڤێقـی
گەهشـتیدا؟. ﴿١٤٩﴾ و هویـن [ب هۆسـتایی] خانیـێت بەرفرەهــ د چیایانـدا دکۆلـن. ﴿١٥٠﴾ ڤێجـا ژ خـودێ
بترسـن، و گوهـێ خـۆ بدەنـە مـن. ﴿١٥١﴾ و گوهـێ خـۆ نەدەنـە زێـدە خـراب و مـوشرك و کەنکەنەیـان.
﴿١٥٢﴾ ئەوێت خرابیـێ د ئەردیدا دکەن، و باشیـێ ناکەن [مەخسـەد پێ ئەو نەهـ کەسـە بوون یـێت خۆ کرینە
قولپەك، و ب کوشـتنا حێشـترێ ڕابوویـین ]. ﴿١٥٣﴾ گۆتن: ب ڕاسـتی تو ژ وانی یـێت زێدە سـحر لێ هاتیـە
کرن [و سـحرێ چو ئەقل بۆ نەهێلایی، ڤێجا تو هزر دکەی، پویچی هەقیـیە، و هەقیـیا ئەم ل سـەر پویچیـیە].
﴿١٥٤﴾ و تـو ژی مرۆڤەکـێ وەکـی مـە.. و ئەگـەر ڕاسـتە تـو پێغەمبـەری کا بەلگـە و نیشـانەکی بـۆ مـە بینـە.
﴿١٥٥﴾ [صالـح پێغەمبـەر] گۆتـە [وان]: ئەڤە حێشـترەکە [بەلگە و نیشـانە بۆ هـەوە، هەروەکی هەوە خواسـتی]،
ڕۆژەکـێ ئـاڤ بـۆ هەوەیـە، و ڕۆژەکـێ ژی بۆ حێشـترێیە. ﴿١٥٦﴾ و [هشـیار بن] دەسـتێ خۆ ب خرابـی نەکەنێ،
ئەگـەر دێ ئیزایـەکا مـەزن هەوە گریت. ﴿١٥٧﴾ ڤێجا وان حێشـتر کوشـت و [وەختێ نیشـان و دەسـتپێکێت ئیزایا
خـودێ دیتین] پەشـێمان بـوون. ﴿١٥٨﴾ ڤێجا ئیزایـێ ئەو هنگاڤتـن [بزڤرە ئایەتێـت (٦٤ـ٦٨) ژ سـۆرەتا هوود]،
و ب ڕاسـتی ئەڤـە [حێشـترا صالـح پێغەمبـەر و ئیزادانا ملەتـێ وی] چامە و نیشـانەکە، د گەل هنـدێ ژی باراپتر
ژ وان بـاوەری نەئینان. ﴿١٥٩﴾ و ب ڕاسـتی خودایـێ تە، سەردەسـتی دژمنێـت خۆیە، و دلۆڤانە بۆ خودێناسـان.

كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا
تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ
أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٤﴾
أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم
مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴿١٦٦﴾ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ
لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴿١٦٧﴾ قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ﴿١٦٨﴾
رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٩﴾ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٧٠﴾
إِلَّا عَجُوزًا فِي ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿١٧١﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم
مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم
مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٧٥﴾ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ
لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّي لَكُمْ
رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٧٨﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ
مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٨٠﴾ ۞ أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَلَا
تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾
وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿١٨٣﴾

ربع الحزب ٣٨



﴿١٦٠﴾ ملەتێ (لووط) پێغەمبەر ژی، پێغەمبەر درەوین
دانان [و ئەوێ پێغەمبەرەکی درەوین دانیت، یێ وەیە
هەچکو هەمی درەوین دانایین]. ﴿١٦١﴾ وەختێ برایێ
وان (لووط) پێغەمبەر، گۆتییە وان: ما هوین ژ [ئێزایا]
خودێ ناترسن؟. ﴿١٦٢﴾ ب ڕاستی ئەز بۆ هەوە
پێغەمبەرەکێ ئەمینم. ﴿١٦٣﴾ ڤێجا ژ خودێ بترسن،
و گوهێ خۆ بدەنە من، و ب گۆتنا من بکەن.
﴿١٦٤﴾ و ئەز چو کرێیان [بەرانبەر گەهاندنا ئەمرێت
خودێ و باوەری ئینانا هەوە] ژ هەوە ناخوازم
[دا هوین باوەرییێ نەئینن و ل هەوە یا گران بیت]،
کرێیا من بەس یا ل سەر خودانێ هەمی جیهانان.
﴿١٦٥﴾ ئەرێ چاوا ژ خەلکی هەمییێ، هوین تالۆقی
زەلامان دبن؟!. ﴿١٦٦﴾ و هەڤسەرێت خودێ بۆ هەوە
دورستکرین، و ژ بەر هەوە دایین دهێلن، ب ڕاستی
هوین ملەتەکێ زێدە سەرداچۆیینە. ﴿١٦٧﴾ گۆتن:
هەی (لووط)، ئەگەر تو ڤێ نەهێلی و ژێڤە نەبی،
ئەم دێ تە ژ ناڤ خۆ دەرئێخین. ﴿١٦٨﴾ [(لووط)
پێغەمبەر] گۆت: ب ڕاستی کەربێت من گەلەك ژ
کارێ هەوە یێ کرێت ڤەدبن. ﴿١٦٩﴾ خودێوۆ، تو من و مالا من، ژ کارێ ئەو دکەن، ڕزگار بکە [مە د
ئاگرێ واندا نەسۆژە]. ﴿١٧٠﴾ ڤێجا [وەختێ هاتنا ئێزایا مە هاتی] مە ئەو و مالا وی، هەمی رزگار کرن.
﴿١٧١﴾ پیرەژنەك تێ نەبیت [کو ژنا (لووط) پێغەمبەر ب خۆ بوو] ژ وان بوو، ئەوێت مایینە د ناڤ ئێزایێدا.
﴿١٧٢﴾ و پشکا مایی ژی، مە د هیلاك برن. ﴿١٧٣﴾ و مە بارانەك ب سەر واندا ئینا [بارانەکا ئنتیکە، بەرێت
سۆتی و هشك ب سەر واندا باراندن]، ڤێجا پیسە باران بوو، بارانا وی ملەتێ ژ لایێ پێغەمبەرێ وانڤە،
هاتییە ترساندن و هشیارکرن [بەلێ د گەل هندێ ژی، ل خۆ نەزڤڕین]. ﴿١٧٤﴾ ب ڕاستی ئەڤە [چیرۆکا
(لووط) پێغەمبەر، و ڕزگارکرنا وی و ئێزادانا ملەتێ وی] چامە و نیشانەکە، د گەل هندێ ژی بارپتر ژ وان
باوەری نەئینان. ﴿١٧٥﴾ و ب ڕاستی خودایێ تە سەردەستی دژمنێت خۆیە، و دلۆڤانە بۆ بەندەیێت خۆ.
﴿١٧٦﴾ ب ڕاستی خەلکێ جهێ تێر دار، و دار لێ تێکڕا [مەخسەد پێ خەلکێ مەدیەنییە، ملەتێ شوعەیب
پێغەمبەر]، پێغەمبەر درەوین دانان. ﴿١٧٧﴾ وەختێ شوعەیبی گۆتییە وان: ما هوین ژ [ئێزایا] خودێ ناترسن؟.
﴿١٧٨﴾ ب ڕاستی ئەز بۆ هەوە پێغەمبەرەکێ ئەمینم. ﴿١٧٩﴾ ڤێجا ژ خودێ بترسن، و گوهێ خۆ بدەنە من، و
ب گۆتنا من بکەن. ﴿١٨٠﴾ و ئەز چو کرێیان [بەرانبەر گەهاندنا فەرمانێت خودێ، و موسلمانبوونا هەوە] ژ
هەوە ناخوازم [دا گوهدارییا من ل هەوە یا گران بیت، و هوین گوهێ خۆ نەدەنە من]، کرێیا من بەس یا ل
سەر خودانێ هەمی جیهانان. ﴿١٨١﴾ ب دورستی پیڤانێ بکەن، و نەبنە ژ وان یێت پیڤانێ کێم دکەن [دزییێ
د پیڤانێدا نەکەن]. ﴿١٨٢﴾ و ب تەرازوییا ڕاست و دورست بکێشن. ﴿١٨٣﴾ و تشتێت خەلکی [د کێشان و
پیڤانێدا] کێم نەکەن، و خرابییێ د ئەردیدا نەکەن و بەردوام و ل سەر یێت بەردەوام بن.

وَٱتَّقُوا۟ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ
ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ
ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ
مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨٨﴾ فَكَذَّبُوهُ
فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾
إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ
لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٩١﴾ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ
ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ
عَرَبِىٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً
أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٩٧﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ
ٱلْأَعْجَمِينَ ﴿١٩٨﴾ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٩﴾ كَذَٰلِكَ سَلَكْنَٰهُ
فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٢٠٠﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ
ٱلْأَلِيمَ ﴿٢٠١﴾ فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٠٢﴾ فَيَقُولُوا۟
هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿٢٠٤﴾ أَفَرَءَيْتَ
إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾



﴿١٨٤﴾ و هوین [گەلی ملەتێ من] ژ وی بترسن،
ئەوێ هوین و ملەتێت بەرێ، داین. ﴿١٨٥﴾ گۆتن:
ب ڕاستی تو ژ وانی یێ زێدە سحر لێ هاتیە كرن
[و چو ئاقل ل دەڤ نەمایی]. ﴿١٨٦﴾ تو ژی هەر
مرۆڤەكێ وەكی مەیی [و تو نەپێغەمبەری، چونكی
تو مرۆڤی]، [ب هزرا وان مرۆڤ نابنە پێغەمبەر، و
پێغەمبەر دڤێت ژ ملیاكەتان بن]، و ژ هزرا درەوینان
پێڤەتر، ئەم ژ تە ناكەین. ﴿١٨٧﴾ ڤێجا كا چەند كەر
و پرتەكان ژ ئەسمانی ب سەر مەدا بینە، ئەگەر تو
ڕاست دبێژی [كو تو پێغەمبەری]. ﴿١٨٨﴾ [شوعەیب
پێغەمبەر] گۆت: خودایێ من چێتر ئاگەهداری كار
و كریارێت هەوەیە [ئەگەر هوین هێژایی وێ ئیزایێ
بن یا هەوە خواستی، دێ هەوە پێ ئیزادەت، و
ئەگەر هوین هێژایی ئیزایەكا دی بن، ئەو یا ل دەڤ
خودێ، وی چاوا بڤێت دێ وەسا هەوە ئیزادەت].
﴿١٨٩﴾ ڤێجا وان شوعەیب درەوین دانا، ئینا ئیزایا ڕۆژا
عەوری ئەو هنگاڤتن [چەند ڕۆژەكان خودێ گەرم ب
سەر واندا ئینا، ژ مالێت خۆ دەركەڤتن و بەرێ خۆ دانە
دەشتێ، خودێ عەورەك ب سەر واندا هنارت، سیبەر ل وان كر، ڤێجا هەمیان خۆ دا بن، ئینا خودێ ئاگر
ب سەر واندا باراند، و هەمی سۆتن]، ب ڕاستی ئەو ئیزایە، ئیزایا ڕۆژەكا گران بوو. ﴿١٩٠﴾ ب ڕاستی ئەڤە
[ئیزادانا ملەتێ شوعەیب پێغەمبەر ب ڤی ئاوایی] چامە و نیشانەكە، د گەل هندێ ژی باراپتر ژ وان باوەری
نەئینان. ﴿١٩١﴾ و ب ڕاستی خودایێ تە سەردەستی دژمنێت خۆیە، و دلۆڤانە بۆ خودێناسان. ﴿١٩٢﴾ ب ڕاستی
ئەڤ قورئانە، خودانێ هەمی جیهانان، یا ئینایییە خوارێ. ﴿١٩٣﴾ جبریلی یا ئینایییە خوارێ. ﴿١٩٤﴾ ئینا سەر
دلێ تە، دا ببییە پێغەمبەر [وەكی پێغەمبەرێت بەری خۆ]، و ژ ئاگەهداركەران بی. ﴿١٩٥﴾ ب زمانێ عەرەبی،
یێ ڕۆن و ئاشكەرا [مە ئینا خوارێ]. ﴿١٩٦﴾ و ب ڕاستی مزگینی و سالۆخەتێت ڤێ قورئانێ، یێت د كتێبێت
دی یێت ئەسمانیدا هاتین [كو یا ڕاستە، و ژ دەڤ خودێیە، و بۆ موحەمەدی دێ ئێتە خوارێ]. ﴿١٩٧﴾ ئەرێ
ما ئەڤە نە نیشان و بەلگەیە، بۆ وان (بۆ خەلكێ مەكەهێ) زانایێت ئسرائیلیان [یێت جوهیان، وەكی
عەبدوللایێ كوڕێ سەلامی]، شادەیییێ بۆ قورئانێ بدەن [كو یا ژ دەڤ خودێ هاتی]. ﴿١٩٨﴾ و ئەگەر
ئەڤ قورئانە مە ل سەر هندەك بیانییان [نەعەرەبان] ئینابایە خوارێ. ﴿١٩٩﴾ و [ب دورستی و ڕەوانبێژییا
قورئانێڤە] ڤان بیانییان ئەڤ قورئانە بۆ وان خواندبایە، وان هەر باوەری پێ نەدئینا. ﴿٢٠٠﴾ هۆسا مە [باوەری
نەئینان ب قورئانێ، یان شیرك و گاوری] یا كرییە د دلێت گونەهكاراندا. ﴿٢٠١﴾ ئەو [گاور] هەتا ئیزایا
ب ژان و دژوار نەبینن، باوەرییێ پێ (ب قورئانێ) نائینن [بەلێ وێ ڕۆژێ باوەری فایدەی وان ناكەت].
﴿٢٠٢﴾ و ئەو ئیزا ژ نشكەكێڤە، دێ بۆ وان ئێت، و وان های ژ خۆ نە. ﴿٢٠٣﴾ [ڤێجا وەختێ ئیزایێ ب چاڤێت
خۆ دبینن] دێ بێژن: ئەرێ ئەم نائێینە گیرۆكرن، و دەرفەت بۆ مە نائێتە دان [دا ئەم باوەرییێ بینین]؟!
﴿٢٠٤﴾ ئەرێ ئەو چاوا لەزێ ل هاتنا ئیزایا مە دكەن؟! ﴿٢٠٥﴾ كا بێژە من ئەگەر مە ئەو ـ ب سالان ـ ب
خۆشی ئێخستن. ﴿٢٠٦﴾ پاشی ئەو ئیزایا پەیمان پێ هاتییەدان، ب سەرێ وان هات.

مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا
مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ ﴿٢٠٨﴾ ذِكۡرَىٰ وَمَا كُنَّا
ظَٰلِمِينَ ﴿٢٠٩﴾ وَمَا تَنَزَّلَتۡ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ
وَمَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّمۡعِ لَمَعۡزُولُونَ ﴿٢١٢﴾
فَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾
وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ
مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنۡ عَصَوۡكَ فَقُلۡ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٢١٦﴾
وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾
وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٢٢٠﴾
هَلۡ أُنَبِّئُكُمۡ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ
أَفَّاكٍ أَثِيمٖ ﴿٢٢٢﴾ يُلۡقُونَ ٱلسَّمۡعَ وَأَكۡثَرُهُمۡ كَٰذِبُونَ ﴿٢٢٣﴾
وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلۡغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّهُمۡ فِي كُلِّ وَادٖ
يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمۡ يَقُولُونَ مَا لَا يَفۡعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱنتَصَرُواْ مِنۢ
بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْۗ وَسَيَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٖ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾



﴿٢٠٧﴾ هنگـی دێ چ فایـدەی وان کەن، ئەو خۆشییێت وان [ب سالان] برین؟ ﴿٢٠٨﴾ و مە چو گوند د هیلاك نەبرینە، ئەگەر [بەری هنگی] مە ئەو ئاگەهدار نەکربن [و پێغەمبەر بۆ وان نەهنارتبن، و ژ ڤێ رۆژێ نەترساندبن]. ﴿٢٠٩﴾ دا [هیلاکبرنا وان] ببیتە چامە و دەرس [دا کەسێ دی چاڤ ل وان نەکەت]، و ئەم [د ئیزادانا واندا] نە یێت ستەمکار بوویین. ﴿٢١٠﴾ شەیتانان ئەڤ قورئانە نەئینایییە خوارێ [وەکی گاور دبێژن، ئەڤ قورئانە وەکی وان ئاخڤتنانە ئەوێت شەیتان بۆ خێڤزانکان دئینن]. ﴿٢١١﴾ و بۆ وان نابیت و نەدورستە، و نەشێن ژی [ڤێ قورئانێ بینن]. ﴿٢١٢﴾ ب راستی ئەو [شەیتان] ژ بهیستنێ [یا قورئانێ یان یا ملیاکەتان] د دویر ئێخستینە [ب رێکا ملیاکەت و ستێران]. ﴿٢١٣﴾ چو پەرستییان د گەل خودێ نەپەرێسە [و بۆ نەکە هەڤپشك]، ئەگەر دێ بییە ژ وان یێت ب بەر ئیزایێ دکەڤن [ئانکو هەی موحەمەد، تو ژ خۆشڤیترین بەندەیێت منی، بەلێ د گەل هندێ ژی، ئەگەر تو پەرستییەکێ دی ژ بلی من بپەرێسی، دێ تە ئیزادەم]. ﴿٢١٤﴾ و [ل پێشییێ و ب ئاشکەرایی] مروڤ و لێزمێت خۆ یێت نێزیك، ئاگەهدار بکە. ﴿٢١٥﴾ یێ نەرم و قەدرگر بە، بۆ وان خودان باوەرێت ب دویڤ تە هاتین. ﴿٢١٦﴾ و ئەگەر وان گوهێ خۆ نەدا تە، بێژە: ب راستی ئەز یێ بەریمە ژ وێ یا هوین دکەن. ﴿٢١٧﴾ و پشتا خۆ، ب خودایێ خودان هێز و دلۆڤان، گەرم بکە و گرێ بدە. ﴿٢١٨﴾ ئەوێ تە دبینیت، دەمێ تو ب تنێ رادبییە نڤێژێ. ﴿٢١٩﴾ و تە دبینیت، وەختێ تو د گەل نڤێژکەران رادبی و درووینی. ﴿٢٢٠﴾ ب راستی هەر ئەوە یێ گوهدێر و زێدەزانا. ﴿٢٢١﴾ ئەرێ ئەز بێژمە هەوە، کا شەیتان ب سەرکێدا دئێنە خوار. ﴿٢٢٢﴾ ئەو ب سەر هەر زێدە درەوینەکێ زێدە گونەهکاردا [وەکی خێڤزانکان] دئێنە خوار. ﴿٢٢٣﴾ ئەو [مەخسەد شەیتان] گوهڤەچنییێ دکەن [گوهێ خۆ ددەنە بانێ بلند، دا تشتێ گولێ دبن بدزن، و بۆ هەڤالێت خۆ یێت خێڤزانك بێژن، و ئەو سەد درەوان تێکەلی وێ دکەن، یا شەیتان بۆ وان دبێژیت] و باراپتر ژ وان درەوین و درەوکەرن. ﴿٢٢٤﴾ و هۆزانڤان [یێت نەموسلمان، و یێت گاور] مرۆڤێت سەرداچۆیی، ب دویڤ وان دکەڤن [و گوهێ خۆ ددەنە وان]. ﴿٢٢٥﴾ ما تو نابینی ئەو د هەمی رێك و هونەرێت درەوێدا، ل دویڤ سەرێ خۆ دچن [جار دهاڤێژنە ڤی، و جار یێ دی، جار ڤێ بێ بەختیێ، جار یا دی، دکەن]. ﴿٢٢٦﴾ و ب راستی ئەو وێ دبێژن، یا ناکەن. ﴿٢٢٧﴾ ژ بلی وان ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت راست و باش کرین، و گەلەك زکرێ خودێ کرین و خۆ ب سەرئێخستین، پشتی ستەم ل وان هاتییە کرن (ئانکو هاڤێتینە وان گاوران ئەوێت هاڤێتینە موسلمانان)، و ئەوێت ستەم کرین، دێ زانن کا ئەو دێ بۆ چ دویماهیك زڤرن.

سُورَةُ النَّمْلِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نصف الحزب ٣٨

طسٓۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ ١ هُدٗى وَبُشۡرَىٰ
لِلۡمُؤۡمِنِينَ ٢ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ
هُمۡ يُوقِنُونَ ٣ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُمۡ
يَعۡمَهُونَ ٤ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ وَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ
ٱلۡأَخۡسَرُونَ ٥ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلۡقُرۡءَانَ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ٦ إِذۡ قَالَ
مُوسَىٰ لِأَهۡلِهِۦٓ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا سَـَٔاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ ءَاتِيكُم بِشِهَابٖ قَبَسٖ
لَّعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ ٧ فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِيَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِي ٱلنَّارِ وَمَنۡ حَوۡلَهَا
وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٨ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٩
وَأَلۡقِ عَصَاكَۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنّٞ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ
يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفۡ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ١٠ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ
حُسۡنَۢا بَعۡدَ سُوٓءٖ فَإِنِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١١ وَأَدۡخِلۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ
بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖۖ فِي تِسۡعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَقَوۡمِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا
فَٰسِقِينَ ١٢ فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَٰتُنَا مُبۡصِرَةٗ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ١٣



## سۆرەتا نەمل

### ل مەکەهێ هاتیـە خوارێ (٩٣) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هۆسـا دئێتـە خوانـدن: (طا، سـين)، و ئـەڤ ڕەنگە
تیپـە نیشـانن ل سـەر ئیعجـازا قورئانـێ. ئەڤـە ئایەتێـت
قورئانـێ و کتێبا ڕۆنکەرن. ﴿٢﴾ ڕاسـتەڕێیی و مزگینییـە
بـۆ خودان بـاوەران. ﴿٣﴾ ئەوێت بـەردەوام و ب ڕەنگێ
پێدڤـی نڤێـژان دکـەن، و زەکاتێ ددەن، و باوەریـیەکا بێ
گۆمـان، باوەریـیێ ب ئاخرەتـێ دئینن. ﴿٤﴾ ب ڕاسـتی
ئەڤێـت باوەریـیێ ب ئاخرەتـێ نەئینـن، مـە کار و
کریارێت وان یـێت ل بـەر وان شرینکریـن، و د چاڤێت
وانـدا یـێت جوانکریـن، و هـەر دێ د خرابیـیا خـۆدا
زڤـڕن [ئانکـو چوجـا ژێ دەرناکەڤـن]. ﴿٥﴾ ئەڤـە ئەون
ئەوێـت بـۆ وان [د دنیایـێ و ئاخرەتێـدا]، دژوارتریـن
ئیـزا هـەی، و ئەو د ئاخرەتێدا ژ هەمییـان خوسـارەتترن.
﴿٦﴾ و ب سـویند تـو قورئانـێ، ژ دەڤ خودایـێ
کاربنەجهـ و زێدەزانـا، وەردگـری. ﴿٧﴾ [بێـژە وان] وەختێ مووسـایی گۆتیـیە هەڤسـەرا خۆ، ئـەزێ ژ دویرڤە
ئاگرەکـی دبینم، [خـۆ ل ڤـێرێ بگـرن] ئـەز دێ بۆ هـەوە ئاخفتنەکـێ [ل سـەر ڕێکێ ئینم، کـو ئـەم ب ڕێکا خۆ
بکەڤـین]، یـان ژی دێ بـۆ هـەوە بزۆتەکی ژێ ئینـم، دا [ئاگرەکی بـۆ خۆ هەلکەیـن ] هوین خۆ پێ گـەرم بکەن.
﴿٨﴾ ڤێجا وەختێ مووسـا گەهشـتییە دەڤ ئاگری، هاتە گازیکرن: ئەڤێ ل دەڤ ئاگری [کو مووسـایە] و یـێت
ل دۆر ئاگـری [کـو ملیاکەتـن] پیرۆزبـوون [پڕ خێر و بەرەکـەت بوون]، و پـاك و پاقژی ژ هەمی کێماسیـیان، بۆ
خودانـێ هەمـی جیهانـان بیـت. ﴿٩﴾ هەی مووسـا ب ڕاسـتی [ئـەوێ گـازی تە دکـەت، و د گەل تـە دئاخڤیت]
ئـەزم، خودایـێ سەردەسـت و کاربنەجهــ. ﴿١٠﴾ و دارێ خـۆ باڤێـژە، ڤێجـا وەختـێ مووسـایی دارێ خۆ دیتی،
ب لـەز وەکـی تیرەمارەکـی خـۆ دهاڤێژیـت و دچیـت [ژ ترسـاندا]، ڕەڤـی و ل پشـت خـۆ نەزڤڕی، [مـە گۆتێ]
هـەی مووسـا، نەترسـە، ب ڕاسـتی پێغەمبـەر ل دەڤ مـن ناترسـن. ﴿١١﴾ بەلـێ ئـەوێ سـتەم کـری [ژ مرۆڤـان،
ئەوێـت نەپێغەمبەر] ئەو [ژ بەر گونەهێت خۆ دترسیت] پاشـی تۆبە بکەت، شـوینا خرابیـیێ قەنجیـیێ بکەت،
ب ڕاسـتی ئـەز گونەهــژێبـەر و دلۆڤانـم [ئەڤە مزگینییـە بـۆ مرۆڤان، هەر کەسـێ پشـتی گونەهێ تۆبـە بکەت،
خـودێ دێ تۆبەیـا وی وەرگریـت]. ﴿١٢﴾ و دەسـتێ خـۆ بکـە د پاخلا خۆدا، دەسـتێ تـە بێ ئێش و برسـقی دێ
دەرکەڤیـت، و ب ڤـان نەهــ موعجیزەیـان هـەرە دەڤ فیرعەونـی و ملەتێ وی، ب ڕاسـتی ئـەو ملەتەکـێ ژ ڕێکا
ڕاسـت دەرکەڤتینە. ﴿١٣﴾ ڤێجا پشـتی مووسا ب موعجیزەیـێت مە، یـێت ڕۆن و ئاشکەراڤە، هاتیـیە دەڤ وان،
گۆتن: ئەڤە سێرەبەندییـەکا ئاشـکەرایە.

وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ
كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ عِلْمًا ۖ
وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾
وَوَرِثَ سُلَيْمَـٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ
ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾
وَحُشِرَ لِسُلَيْمَـٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ
يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَـٰٓأَيُّهَا
ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَـٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَـٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ
لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ
أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ
صَـٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٩﴾
وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِىَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ
مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَا۟ذْبَحَنَّهُۥٓ
أَوْ لَيَأْتِيَنِّى بِسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ
أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾





﴿١٤﴾ و هەر چەندە ژ دل دزانین [ئەڤە موعجیزەنە ژ
دەڤ خودێ، و نەسحرە]، بەلێ ژ ستەم و مەزناتی درەو
دانان و باوەری پێ نەئینان، ڤێجا برێنێ، کا دویماهییا
خرابکاران یا چاوایە. ﴿١٥﴾ ب سویند مە زانینەك
دابوو داوود و سولەیمانی [ئەو ژی زانینا زمانێ باڵەفڕ
و تەوالان بوو]، و هەردووکان گۆت: هەمی پەسن و
سوپاسی بۆ خودێ بن، ئەوێ قەدرێ مە هەردوویان
ب سەر قەدرێ گەلەك ژ بەندەیێت خۆ یێت خودان
باوەر ئێخستی. ﴿١٦﴾ و سولەیمان بوو وێرسێ داوودی
[د پێغەمبەراتییێدا]، و گۆت: گەلی مرۆڤان، ب ڕاستی
خودێ زمانێ باڵەفڕان یێ نیشا مە دایی، و هەمی
تشت یێت دایینە مە [ئانکو کەرەمێت مەزن، د
گەل مە یێت هاتینەکرن]، ب ڕاستی ئەڤە کەرەمەکا
ئاشکەرایە. ﴿١٧﴾ و بۆ سولەیمانی، لەشکەرێ وی ژ
ئەجنە و مرۆڤ و تەیران هاتنە کۆمکرن، [هندی هند
گەلەك بوون، و دا ژێك ڤەنەقەتن] ڕێزێت پێشییێ
دهاتنە ڕاوەستاندن، دا یێت دویماهیکێ بگەهنێ.
﴿١٨﴾ هەتا لەشکەرێ وی گەهشتییە نهالا مێریان
[نهالەکە ل شامێ، گەلەك یا ب مێرییە]، مێرییەکێ گۆت: گەلی مێرییان هەرنە د جهێت خۆڤە، سولەیمان و
لەشکەرێ خۆ هەوە نەهەڕشینن، بێی کو هەست پێ بکەن و پێ بحەسن. ﴿١٩﴾ ڤێجا سولەیمان ب ئاخفتنا
وێ، گرنژی و کەنی، و گۆت: خودێوۆ، دەستێ من بگرە ئەز سوپاسییا تە بکەم، ل سەر وان کەرەمێت تە د
گەل من و دەیبابێت من کرین، و ئەز وان کار و کریارێت قەنج بکەم ئەوێت تو ژێ ڕازی، و ب دلۆڤانییا خۆ
من ژ بەندەیێت خۆ یێت باش، حسێب بکە [یان من بێخە د گەل وان، و ناڤێ من د گەل ناڤێ وان دانە، و
من د گەل وان د بەحەشتا خۆدا کۆم بکە]. ﴿٢٠﴾ و سولەیمانی چاڤێ خۆ ل باڵەفڕان گێڕا، و گۆت: بۆچی ئەز
هودهودی نابینم، یان ژی ئەو نەیێ حازرە. ﴿٢١﴾ یان ئەز دێ ئیزایەکا مەزن دەمە بەر وی، یان دێ ڤەکوژم،
یان ژی ئەو [ژ بەر نەهاتنا خۆ] دێ نیشانەکا ڕۆن و ب هێز بۆ من ئینیت. ﴿٢٢﴾ و گەلەك پێڤە نەچۆ [هودهود
هات] گۆت: ئەز ب سەر وێ هەلبووم یا تو ب سەر هەلنەبووی، و من سالۆخەکێ ڕاست و بێ گۆمان ژ
سەبەئێ، یێ بۆ تە ئینایی.

إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ وَلَهَا
عَرۡشٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ
مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ
فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخۡرِجُ ٱلۡخَبۡءَ فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَيَعۡلَمُ مَا تُخۡفُونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ
لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ۩ ﴿٢٦﴾ ۞قَالَ سَنَنظُرُ
أَصَدَقۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ٱذۡهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا
فَأَلۡقِهۡ إِلَيۡهِمۡ ثُمَّ تَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَٱنظُرۡ مَاذَا يَرۡجِعُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلۡمَلَؤُاْ إِنِّيٓ أُلۡقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٞ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ
بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣١﴾
قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ
تَشۡهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُواْ نَحۡنُ أُوْلُواْ قُوَّةٖ وَأُوْلُواْ بَأۡسٖ شَدِيدٖ وَٱلۡأَمۡرُ
إِلَيۡكِ فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً
أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٤﴾
وَإِنِّي مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ فَنَاظِرَةُۢ بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٣٥﴾

سجدة — ثلاثة أرباع الحزب ٣٨





﴿٢٣﴾ ب ڕاستی [ل ویرێ] من دیت ژنەکێ سەرۆکاتی
ل وان دکر، و چو نینە خودێ ژی نەدابیتێ، وێ
تەختەکێ مەزن [یێ سەرۆکاتی و میراتی] یێ هەی.
﴿٢٤﴾ من دیت وێ و ملەتێ وێ، شوینا بۆ خودێ
سوجدەیێ ببەن، بۆ ڕۆژێ سوجدە دبرن، و شەیتانی
ئەڤ کارێ وان، بۆ وان یێ خەملاندی، ڤێجا [شەیتانی
ب ڤی کارێ خۆ] ئەو ژ ڕێکا ڕاست یێت داینە پاش،
و ئەو ڕاستەڕێ نابن. ﴿٢٥﴾ [و شەیتانی کارێ وان بۆ
جوانکر] دا سوجدەیێ بۆ خودێ نەبەن، ئەو خودایێ
تشتێ ڤەشارتی [وەکی بارانێ و شینکاتی و نهێنیێت
گەردوونی] د ئەرد و ئەسماناندا ئاشکەرا دکەت، و
تشتێ هوین ب ڤەشارتن و ئاشکەرایی دکەن، دزانیت.
﴿٢٦﴾ خودێ ئەوە یێ چو پەرستییێت ڕاست و
دورست ژ وی پێڤەتر نەی، ئەو خودانێ عەرشێ
مەزنە. ﴿٢٧﴾ [سولەیمانی] گۆت: دێ بەرێ خۆ
دەینێ کا تو ڕاست دبێژی، یان ژی تو درەوان دکەی.
﴿٢٨﴾ تو ئەڤێ نامەیا من ببە، باڤێژە بەر وان، پاشی
خۆ ژ وان بدە پاش، و بڕێنێ کا دێ چ بەرسڤێ دەن؟.
﴿٢٩﴾ [ڤێجا وەختێ هودهودی، نامە هاڤێتیە بەر وان و خوندکارا وان] گۆت: گەلی ڕویسپیان، نامەیەکا
ب قەدر یا بۆ من هاتی. ﴿٣٠﴾ ئەو ژی ژ دەڤ سولەیمانییە، و یا تێدا هاتی: (بسم الله الرحمن الرحیم). ب
ناڤێ خودایێ دلۆڤان و پڕ دلۆڤین. ﴿٣١﴾ و خۆ ل سەر سەرێ من مەزن نەکەن، و موسلمان وەرنە دەڤ
من [ئانکو موسلمان ببن]. ﴿٣٢﴾ گۆت: گەلی ڕویسپیان د ڕاستا ڤی کاریدا بێژن، کا ئەز چ بکەم و ئەز بێی
هەوە چو بڕیاران نادەم، هوین تێدا پشکدار و حازر نەبن. ﴿٣٣﴾ گۆتن: ئەم خودان هێز و دەستهەلاتین، و
د شەڕاندا مێرخاسین، و فەرمان فەرمانا تەیە، بڕێنێ کا دێ چ فەرمان دەی [ئەم دێ فەرمانا تە ب جهـ ئینین].
﴿٣٤﴾ گۆت: ب ڕاستی گاڤا خوندکار [ب خورتی] چۆنە د گوندەکیدا، گوندی کاڤل و وێران دکەن، و
ڕویسپی و ماقویلێت وان دشکێنن و ڕەزیل دکەن، و کارێ وان هەر ئەڤەیە. ﴿٣٥﴾ و ئەز دێ دیارییەکێ بۆ
وان هنێرم، و دێ بەرێ خۆ دەمێ، کا ئەوێت من هنارتین دێ ب چ سەر، زڤڕن [ژ نوی ئەم دێ بڕیارێ دەین،
کا ئەم دێ چ کەین]؟.

فَلَمَّا جَآءَ سُلَيۡمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٖ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيۡرٞ مِّمَّآ
ءَاتَىٰكُمۚ بَلۡ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمۡ تَفۡرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ٱرۡجِعۡ إِلَيۡهِمۡ فَلَنَأۡتِيَنَّهُم
بِجُنُودٖ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخۡرِجَنَّهُم مِّنۡهَآ أَذِلَّةٗ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾
قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَيُّكُمۡ يَأۡتِينِي بِعَرۡشِهَا قَبۡلَ أَن يَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣٨﴾
قَالَ عِفۡرِيتٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَۖ
وَإِنِّي عَلَيۡهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٞ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ أَنَا۠
ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ إِلَيۡكَ طَرۡفُكَۚ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسۡتَقِرًّا عِندَهُۥ
قَالَ هَٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّي لِيَبۡلُوَنِيٓ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا
يَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيّٞ كَرِيمٞ ﴿٤٠﴾ قَالَ نَكِّرُواْ لَهَا
عَرۡشَهَا نَنظُرۡ أَتَهۡتَدِيٓ أَمۡ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهۡتَدُونَ ﴿٤١﴾ فَلَمَّا
جَآءَتۡ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرۡشُكِۖ قَالَتۡ كَأَنَّهُۥ هُوَۚ وَأُوتِينَا ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهَا
وَكُنَّا مُسۡلِمِينَ ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعۡبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ إِنَّهَا كَانَتۡ مِن
قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ ﴿٤٣﴾ قِيلَ لَهَا ٱدۡخُلِي ٱلصَّرۡحَۖ فَلَمَّا رَأَتۡهُ حَسِبَتۡهُ لُجَّةٗ
وَكَشَفَتۡ عَن سَاقَيۡهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ صَرۡحٞ مُّمَرَّدٞ مِّن قَوَارِيرَۗ قَالَتۡ رَبِّ
إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٤﴾



﴿٣٦﴾ ڤێجا وەختێ [هنارتی] هاتینە دەڤ سولەیمانی، [سولەیمان پێغەمبەر] گۆت: هوین مالی ددەنە من [هوین ب مالی، من ڕازی دکەن، دا هەوە بهێلم، و دەینەکەمە هەوە چو نەبێژمە هەوە]، و تشتێ خودێ دایییە من [ژ پێغەمبەراتی و خوندکاری و کەرەمان]، چێترە ژ وی تشتێ یێ دایییە هەوە، ئەز نەئەوم یێ کەیف ب دیاریان دئێت، بەلێ هوینن کەیفا هەوە ب دیاریان دئێت. ﴿٣٧﴾ بزڤرە دەڤ وان، و بێژە وان: ئەم دێ لەشکەرەکێ وەسا بەینە سەر وان، نەشێن بەرسینگێ وان بگرن، و ئەم دێ وان ڕەزیل و شکەستی ژ وێرێ [ژ سەبەئێ] دەرئێخین. ﴿٣٨﴾ [سولەیمانی] گۆت: گەلی ڕویسپییان، کی ژ هەوە دێ تەختێ خوندکاریا سەبەئێ، بۆ من ئینیت، بەری ئەو موسلمان بێنە دەڤ من. ﴿٣٩﴾ عفریتەکی ژ ئەجنەیان گۆت: ئەز دێ بۆ تە ئینم، هێژ تو ژ دیوانا خۆ نەڕابوویی، و ب ڕاستی ئەز بۆ ئینانا تەختێ خوندکارییێ، خودان شیان و ئەمینم. ﴿٤٠﴾ و ئەوێ زانینەك ژ كتیبێ هەی [کو ناڤێ خودێ، یێ مەزن دزانی] گۆت: ئەز دێ بۆ تە ئینم، بەری چاڤێت تە ژ بەرێخۆدانا دویر بێنە وەرگێران، ڤێجا وەختێ ل دەڤ خۆ دیتی یێ دانایییە، گۆت: ئەڤە ژ کەرەما خودایێ منە، دا من بجەرببینیت، کا ئەز دێ سوپاسیا وی کەم، یان ژی دێ چاڤنقییێ کەم [و کەرەمێت وی نائینمە بەرچاڤێت خۆ]، و ئەوێ سوپاسییێ دکەت نێ بۆ خۆ دکەت [ئانکو مفایێ سوپاسییێ هەر بۆ ویە]، و ئەوێ چاڤنقییێ دکەت و سوپاسییێ نەکەت [بلا بزانیت]، ب ڕاستی خودێ پاکی ب سوپاسیا وی نینە، و یێ بێ منەت و خودان کەرەمە. ﴿٤١﴾ [سولەیمانی] گۆت: تەختێ وێ، یێ خوندکارییێ، بگوهۆڕن [گوهۆڕینەکا وەسا بێخنە تێدا، کو نەنیاسیت]، دا بزانین کا دێ پێ حەسیت، و تەختێ خۆ نیاسیت یان نە.. ﴿٤٢﴾ ڤێجا وەختێ [بەلقیس] هاتی، گۆتێ: ئەرێ تەختێ تە یێ هۆسایە؟ گۆت: هەروەکی ئەڤە ئەوە و [سولەیمانی گۆت]: بەری بەلقیسێ خودێ زانین دابوو مە، و ئەم بەری وێ [بەلقیس] بۆ خودێ موسلمان بوویین. ﴿٤٣﴾ و ئەو پەرستییێ وێ شوینا خودێ دپەرست، ئەو [ژ موسلمانبوونێ و ڕێکا ڕاست] دا پاش، ب ڕاستی ئەو ژ وان بوو یێت گاور. ﴿٤٤﴾ [سولەیمانی] گۆتە وێ (گۆتە بەلقیسێ): کەرەمکە هەرە د قەسرێڤە، ڤێجا وەختێ [وێ ڕێکا قەسرێ] دیتی، هزرکر ئاڤەکا کویرە، دەلنگێت خۆ هەلدان [دا بدەتە ناڤ وێ ئاڤێ]، [سولەیمانی] گۆت: [دەلنگێت خۆ هەلنەدە] ب ڕاستی ئەڤە قەسرەکا حولیکرییە و ژ شویشەیییە، [ڤێجا وەختێ بەلقیسێ ئەڤە زانی] گۆت: خودێوۆ، ب ڕاستی من ستەم یا ل خۆ کری [وەختێ من ڕۆژ پەرستی]، و ئەز د گەل سولەیمانی بۆ خودێ، خودانێ هەمی جیهانان، موسلمان بووم.

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ
فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَا قَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ
بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ ۖ لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ اللَّهَ لَعَلَّكُمْ
تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُوا اطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ ۚ قَالَ طَائِرُكُمْ
عِندَ اللَّهِ ۖ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴿٤٧﴾ وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ
تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾
قَالُوا تَقَاسَمُوا بِاللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُ وَأَهْلَهُ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِ
مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَمَكَرُوا
مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَانظُرْ
كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَاهُمْ وَقَوْمَهُمْ
أَجْمَعِينَ ﴿٥١﴾ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوا ۗ إِنَّ
فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥٢﴾ وَأَنجَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا
وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَتَأْتُونَ
الْفَاحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٥٤﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ
شَهْوَةً مِّن دُونِ النِّسَاءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿٥٥﴾





﴿٤٥﴾ و ب سویند بۆ (سەموود)، مە برایێ وان (صالح) هنارت، گۆتە وان: خودێ بپەرێسن، ڤێجا ئەو بوونە دو جوین، و هەڤرکیا ئێك و دو كرن، و مانە پێكڤە [جوینا موسلمانان، و جوینا گاوران].
﴿٤٦﴾ [(صالح)ی] گۆت: ملەتێ من، هوین بۆچی لەزێ ل ئیزایێ دكەن بەری دلۆڤانییێ [ئانكو بۆچی هوین باوەری ئینانێ گیرۆ دكەن، ئەو باوەری ئینانا دلۆڤانییێ بۆ هەوە دئینیت، و هوین گاورییێ ب پێش دئێخن، ئەو گاوریا ئیزایێ بۆ هەوە دئینیت]. بلا هەوە داخوازا لێبۆرینێ ژ خودێ كربایە، دا دلۆڤانی ب هەوە هاتبایە برن [و هوین نەهاتبانە ئیزادان].
﴿٤٧﴾ و گۆتن [هەی (صالح)] ئەم بێ وەغەریا خۆ ژ تە و یێت د گەل تە دبینین [چونكی پشتی تو هاتی، نەخۆشی ل دویڤ ئێك یێت ب سەرێ مە دئێن] [(صالح) پێغەمبەر] گۆت: [بزانن] ب ڕاستی هەر خۆشی و نەخۆشییەكا بگەهیتە هەوە ژ خودێیە [بەلێ باراپتر ژ وان نوزانن كو هەر نەخۆشییەكا ب سەرێ وان بهێت یان هاتبیت، ژ گونەهێت وانە و نە ژ (صالح)یە]، بەلێ هوین ملەتەكن، ب ڤێ چەندێ [ب هاتنا خۆشی و نەخۆشییان] دئێنە جەرباندن.
﴿٤٨﴾ و د باژێریدا [د باژێرێ حیجردا] نەهـ كەس [ژ كورێت كەنكەنیان] هەبوون، خرابی د ئەردیدا دكرن و باشی نەدكرن. ﴿٤٩﴾ بۆ ئێكدو سویند خوارن، و گۆتن: ب شەڤ ئەم دێ ب سەر (صالح)ی و مالا ویدا گرین [و دێ كوژین، و كەسێ های ژێ نە]، پاشی دێ بێژینە سەمیانێ وی [یێ خوینا وی دخوازیت]، مە كوشتنا مرۆڤێ تە نەدیتییە، و مە ئاگەهـ ژێ نینە، و ئەم ڕاست دبێژین [و درەوان ناكەین]. ﴿٥٠﴾ و وان [بۆ كوشتنا (صالح)ی، و یێت دگەل] نەخشە و پیلان گێڕان و خودێ بەرسینگێ وان گرت، بێی وان های ژ خۆ هەبیت. ﴿٥١﴾ ڤێجا برێنێ، كا دویماهیكا نەخشەیێ وان بوو چ؟! مە ئەو و ملەتێ وان، هەمی پێكڤە ڤەبراندن. ﴿٥٢﴾ و ئەڤە خانییێت وانن، كاڤل و ڤالانە ژ بەر ستەما وان كری، ب ڕاستی ئەڤە بەلگە و نیشانەكا ئاشكەرایە، بۆ وان ئەوێت دزانن. ﴿٥٣﴾ و ئەوێت باوەری ئینایین و پارێزكاریا خودێ دكرن، مە ڕزگار كرن. ﴿٥٤﴾ و بێژە وان: وەختێ (لووط) پێغەمبەر ژی گۆتییە ملەتێ خۆ، ئەرێ هوین ڤی كارێ پویچ و زێدەكرێت ل بەر چاڤان دكەن، و هوین دزانن یێ پویچ و كرێتە؟. ﴿٥٥﴾ ئەرێ چاوا هوین ژ حیزاتییا خۆ تالۆقەتی زەلامان دبن، شوینا ژنان؟! بەلێ هوین ملەتەكێ ساویلكە و نەفامن [لەو هوین هۆ دكەن].

۞ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوۡمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخۡرِجُوٓاْ ءَالَ
لُوطٖ مِّن قَرۡيَتِكُمۡۖ إِنَّهُمۡ أُنَاسٞ يَتَطَهَّرُونَ ٥٦ فَأَنجَيۡنَٰهُ
وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ قَدَّرۡنَٰهَا مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ٥٧ وَأَمۡطَرۡنَا
عَلَيۡهِم مَّطَرٗاۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلۡمُنذَرِينَ ٥٨ قُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ
وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَىٰٓۗ ءَآللَّهُ خَيۡرٌ أَمَّا يُشۡرِكُونَ ٥٩
أَمَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ
مَآءٗ فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهۡجَةٖ مَّا كَانَ لَكُمۡ أَن
تُنۢبِتُواْ شَجَرَهَآۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ يَعۡدِلُونَ ٦٠
أَمَّن جَعَلَ ٱلۡأَرۡضَ قَرَارٗا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنۡهَٰرٗا وَجَعَلَ
لَهَا رَوَٰسِيَ وَجَعَلَ بَيۡنَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ حَاجِزًاۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ
بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٦١ أَمَّن يُجِيبُ ٱلۡمُضۡطَرَّ إِذَا
دَعَاهُ وَيَكۡشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجۡعَلُكُمۡ خُلَفَآءَ ٱلۡأَرۡضِۗ
أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ٦٢ أَمَّن يَهۡدِيكُمۡ فِي
ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ وَمَن يُرۡسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَيۡ
رَحۡمَتِهِۦٓۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٦٣





﴿٥٦﴾ ڤێجا ملەتێ وی چو بەرسڤ نەبوو، ژ وێ
پێڤەتر نەبیت، گۆتن: بنەمالا (لووط)ی ژ گوندێ
خۆ دەربێخن، ب ڕاستی ئەو خۆ پاقژ ددانن.
﴿٥٧﴾ ڤێجا مە ئەو و مرۆڤێت وی [ئەوێت باوەری
ئینایین] رزگار كرن، ژ بلی ژنا وی، مە ئەو دا د گەل
وان ئەوێت د ناڤ ئیزایێدا مایین. ﴿٥٨﴾ و مە بارانەك
ب سەر واندا باراند [بارانا، بەرێت سۆتی]، ڤێجا
بارانا وان، ئەوێت هاتینە ئاگەهداركرن [و فایدە بۆ خۆ
ژێ نەكرین] پیسەباران بوو. ﴿٥٩﴾ [هەی موحەمەد]
بێژە: حەمد و سوپاسی بۆ خودێ [ل سەر كەرەمێت
وی، و نەهێلانا ملەتێت گاور ژ بەرێ ویڤە]، و سلاڤ
ل سەر بەندەیێت وی، ئەوێت وی هەلبژارتین [كو
پێغەمبەرن]. ئەرێ خودێ و پەرستنا وی چێترە، یان
ژی هەڤپشكێت هوین چێ دكەن و پەرستنا وان..؟!.
﴿٦٠﴾ ئەرێ ئەوێت هەوە بۆ خودێ كرینە هەڤپشك
چێترن، یان ئەوێ ئەرد و ئەسمان چێكرین و باران
بۆ هەوە ژ عەوران باراندی..؟! ڤێجا مە باخچەیێت
دلڤەكەر و جوان پێ شینكرن، هەوە نەدشیا داروبارێ
وان شین بكەن [ئەگەر مە بۆ هەوە شین نەكربایە]، ئەرێ پەرستیەكێ دی د گەل خودێیە [هەتا هوین بپەرێسن
یان ژی چێكرن و دانێ ب بالڤە لێ بدەن] نەخێر وەسا نینە، بەلێ ئەو ملەتەكن، هەڤبەران بۆ خودێ چێ
دكەن، و بەرێ خۆ ژ هەقییێ وەردگێڕن. ﴿٦١﴾ ئەرێ ئەوێت هەوە بۆ خودێ كرینە هەڤپشك چێترن، یان ژی
ئەوێ ئەرد بۆ هەوە ل سەر ئاوایێ هێكێ ڕاستكری و بۆ ژینێ خۆشكری، و ڕوباریێت ئاڤێ ئێخستینە تێدا،
و چیا بۆ كرینە سنگ، دا نەهەژیت، و ناڤبڕ دانایینە د ناڤبەرا هەردو دەریایاندا [دا ئاڤا شرین و سویر (شۆر)
تێكەلی ئێك نەبن]؟ ئەرێ پەرستیەكێ دی د گەل خودێ هەیە [هەتا ئەو، وی بپەرێسن، یان ژی خودێ
ب تنێ ئەڤە دایینە]؟ [نەخێر.. ئەو بێ هەڤپشكە، و چو پەرستی د گەل نینن]، بەلێ باراپتر ژ وان نوزانن.
﴿٦٢﴾ ئەرێ ئەوێت هەوە بۆ خودێ كرینە هەڤپشك چێترن، یان ژی ئەوێ بەرسڤا تەنگاڤی ددەت، گاڤا
هەوارا خۆ دگەهینیتێ، یان ژی نەخۆشییێ [ل سەر وان] ڕادكەت و ددەتە ئالەكی، و هەوە دكەتە وێرسێت
ئەردی [ب نەهێلانا هندەك ملەتێت بەری هەوە]..؟! ئەرێ پەرستیەكێ دی د گەل خودێ هەیە [كو هوین
بپەرێسن، یان ژی خودێ ب تنێیە، ئەڤێ دكەت]؟ و هوین كێم كەرەم و نیعمەتێت خودێ، دئیننە بیرا خۆ.
﴿٦٣﴾ ئەرێ ئەوێت هەوە بۆ خودێ كرینە هەڤپشك چێترن، یان ژی ئەوێ هەوە د تاریستانا دێمی و دەریایێدا
ڕاستەرێ دكەت، و بەری ڕەحمەتا خۆ [ئانكو بارانێ] مزگینی دهنێریت..؟! ئەرێ پەرستیەكێ دی د گەل
خودێ هەیە [كو هوین بپەرێسن، یان ژی خودێ ب تنێیە ڤی كاری دكەت]؟ خودێ بلندتر و پاقژترە ژ وێ
شركا، ئەو دكەن.

أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ
أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾ قُل
لَّا يَعْلَمُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ
أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلْمُهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ بَلْ هُمْ فِى
شَكٍّ مِّنْهَا ۖ بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَءِذَا
كُنَّا تُرَٰبًا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ ﴿٦٧﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا هَٰذَا
نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾
قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٦٩﴾
وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُن فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿٧٠﴾
وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٧١﴾ قُلْ عَسَىٰٓ
أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ ٱلَّذِى تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ
لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ
رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٤﴾ وَمَا مِنْ غَآئِبَةٍ
فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٧٥﴾ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ
يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾





﴿٦٤﴾ ئـەرێ ئەوێـت هـەوە بـۆ خـودێ كرینە هەڤپشـك
چێـترن، یان ژی ئـەوێ جـارا ئێكێ دەسـت ب چێكرنێ
دكـەت، پاشـی [پشـتی مرنـێ] سـاخ دكەتەڤـە، و ڕزقێ
هـەوە ژ ئەرد و ئەسـمانان ددەت..؟! ئەرێ پەرستیـیەكێ
دی د گـەل خـودێ هەیـە [هەتـا هویـن بپەرێسـن، و بـۆ
خـودێ بكەنـە هەڤپشـك]. [هـەی موحەمـەد] بێـژە:
نیشـان و بەلگەیـا خۆ بینـن، ئەگـەر هوین ڕاسـت دبێژن
[كـو خـودێ هەڤپشـكەكێ هـەی]. ﴿٦٥﴾ بێـژە: كـەس
د ئـەرد و ئەسـماناندا، ژ بـلی خـودێ، تشـتێ ڤەشـارتی
و نەدیـار نوزانیـت، و كـەس نوزانیـت كەنگـی دێ ژ
گـۆڕان ڕابنەڤـە. ﴿٦٦﴾ هەمـی ئەگەرێـت زانینـا وان ب
هاتنـا قیامەتـێ، هـەر چەنـدە هەنـە ژی، كەڤتـن و نەمـان
[هنـد نیشـان و بەلگەیـێت بەرچـاڤ هەنـە، پـێ بزانن،
ب ڕاسـتی قیامـەت هـەر دێ ئێـت] بەلێ [دگـەل هندێ
ژی] ئـەو ب هاتنـا قیامەتـێ ب گومانـن، بەلكـی ئـەو
ژی (ژ دیتنـا نیشـان و بەلگەیـێت قیامەتـێ، و یـێت
وان بگەهیننـە هەقیـیێ) د كۆرەنـە. ﴿٦٧﴾ و ئەوێـت
گاوربوویـین، گۆتـن: ئـەرێ ئەگەر [پشـتی مرنـێ] ئەم
و بـاب و باپیرێـت خـۆ بوویـینە ئاخ، ئـەرێ جـارەكا دی، دێ ژ گـۆڕان ڕابینەڤە؟. ﴿٦٨﴾ ب سـویند بـەری نوكە
ژی، سـۆز و پەیـمان بـۆ مـە و بـاب و باپیرێـت مـە، ب ڤـێ چەنـدێ هاتبوونـە دان [ئەگـەر وەسـابایە، دا بـاب و
باپیرێـت مـە، ژ گـۆڕان ڕابنەڤـە]، ب ڕاسـتی ئەڤـە [ئـەڤ پەیمانـە] ژ چـیرۆك و چیڤانۆكێـت بـەرێ پێڤەتـر نینـە.
﴿٦٩﴾ [هـەی موحەمـەد] بێـژە وان: د ئەردیـدا بگـەڕن، پاشـی بڕێننـێ، كا دویماهیـكا گونەهـكاران بـوو چ؟.
﴿٧٠﴾ [هـەی موحەمـەد] ب خەم نەكەڤە ل سـەر [نەبـاوەری ئینانـا] وان، و تەنگاڤ نەبە ژ بەر پیلان و ئۆیـینێت،
ئـەو دگـێڕن [خـودێ دێ تـە پارێزیت، و دێ هاریكاریـیا تە كـەت]. ﴿٧١﴾ و دبێـژن: ژڤان و پەیمانـا هوین مە ب
ئێزایـا وێ دترسـینن، كا كەنگـی دێ ئێت، ئەگەر هوین ڕاسـت دبێـژن. ﴿٧٢﴾ بێژە: دبیت هندەك ژ وێ [ئێزایـێ]
ئـەوا هویـن لەزێ لـێ دكەن، گەلەك یا نێزیكـی هەوە بیت [و هەوە بهنگێڤیت]. ﴿٧٣﴾ و ب ڕاسـتی خودایـێ تە،
خـودان كەرەمە ل سـەر مرۆڤـان، بەلێ باراپتر ژ وان نە د شـوكوردارن. ﴿٧٤﴾ و ب ڕاسـتی خودایـێ تە، دزانیت
كا چ د سـینگێ خۆدا دڤەشـێرن، و كا چ ئاشـكەرا دكەن. ﴿٧٥﴾ و چو یـێ ڤەشـارتی و نەدیار د ئەرد و ئەسـماناندا
نینـە، ئەگـەر د دەپـێ پاراسـتیدا نەبیت [ژ وان تشـتان: ئـەو ئێزایا ئەو لـەزێ لێ دكەن، یـا دەستنیشانكریـیە، ڤێجا
چـاوا ئـەو لەزێ لـێ دكەن؟]. ﴿٧٦﴾ ب ڕاسـتی ئـەڤ قورئانە، پڕانیـیا تشـتێ ئسرائیلی تێـدا ژێك جـودا، بۆ وان
[ئسرائیلیـیان] ڤەدگێڕیت و ئاشـكەرا دكەت، [وەكی جودابوونا وان دكار عیسـایدا].

وَإِنَّهُۥ لَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٧٧ إِنَّ رَبَّكَ يَقۡضِي بَيۡنَهُم
بِحُكۡمِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡعَلِيمُ ٧٨ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۖ إِنَّكَ عَلَى
ٱلۡحَقِّ ٱلۡمُبِينِ ٧٩ إِنَّكَ لَا تُسۡمِعُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَلَا تُسۡمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ
إِذَا وَلَّوۡاْ مُدۡبِرِينَ ٨٠ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِي ٱلۡعُمۡيِ عَن ضَلَٰلَتِهِمۡۖ إِن
تُسۡمِعُ إِلَّا مَن يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسۡلِمُونَ ٨١ ۞ وَإِذَا وَقَعَ
ٱلۡقَوۡلُ عَلَيۡهِمۡ أَخۡرَجۡنَا لَهُمۡ دَآبَّةٗ مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ تُكَلِّمُهُمۡ أَنَّ
ٱلنَّاسَ كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ٨٢ وَيَوۡمَ نَحۡشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٖ
فَوۡجٗا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُمۡ يُوزَعُونَ ٨٣ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو قَالَ
أَكَذَّبۡتُم بِـَٔايَٰتِي وَلَمۡ تُحِيطُواْ بِهَا عِلۡمًا أَمَّاذَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٨٤
وَوَقَعَ ٱلۡقَوۡلُ عَلَيۡهِم بِمَا ظَلَمُواْ فَهُمۡ لَا يَنطِقُونَ ٨٥ أَلَمۡ
يَرَوۡاْ أَنَّا جَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ لِيَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ فِي
ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٨٦ وَيَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن
فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۚ وَكُلٌّ أَتَوۡهُ
دَٰخِرِينَ ٨٧ وَتَرَى ٱلۡجِبَالَ تَحۡسَبُهَا جَامِدَةٗ وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِۚ
صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍۚ إِنَّهُۥ خَبِيرُۢ بِمَا تَفۡعَلُونَ ٨٨

ربع الحزب ٣٩



﴿٧٧﴾ و ب ڕاستی ئەڤ قورئانە، ڕاستەڕێیی و
دلۆڤانییە بۆ خودان باوەران. ﴿٧٨﴾ ب ڕاستی
خودایێ تە، دێ ب بڕیارێت خۆ حوکمی د ناڤبەرا
واندا کەت [ل سەر تشتێ ئەو تێدا ژێك جودا]، و
هەر ئەوە یێ سەردەست و زێدەزانا. ﴿٧٩﴾ ڤێجا تو
پشتا خۆ ب خودێ گەرم بکە، ب ڕاستی تو یێ ل
سەر هەقییا ئاشکەرا. ﴿٨٠﴾ ب ڕاستی تو مرییان
[گاورێت دلێ وان ژ هەقییێ تاری بوویی]، و کەڕان
[ئەوێت گوهێت وان ژ بهیستنا هەقییێ گرتی]، نەشێی
وەلێ بکەی، گول گازییێ ببن، ئەگەر وان پشتا خۆ دا
هەقییێ. ﴿٨١﴾ و تو نەشێی ئەوێت کۆرە، ژ بەرزەبوون
و گومڕابوونا تێدا، ڤەگێڕی و ڕاستەڕێ بکەی، ب تنێ
ئەو نەبن ئەوێت باوەری ب قورئانا مە ئینایین، تو
دشێی وەلێ بکەی گولێ ببن، نێ هەر ئەون ئەوێت
خۆ سپارتینە خودێ. ﴿٨٢﴾ و ئەگەر قیامەت [و ئەڤا
ئایەتان ژێ دگۆت، ژ هاتنا قیامەتێ و ترس و سەهما
وێ] نێزیکی وان بوو، ئەم دێ بۆ وان گیانەوەرەکی ژ
ئەردی دەربێخین، د گەل وان باخڤیت [و بێژیت]: ب
ڕاستی مرۆڤان باوەرییەکا موکوم نەبوو کو ئەم دێ دەرکەڤین [وەك نیشانەك ژ نیشانێت مەزناتییا خودێ].
﴿٨٣﴾ و ڕۆژا ئەم ژ هەر ملەتەکی کۆمەك، ژ وان ئەوێت ئایەت و نیشانێت مە درەو دانایین [و باوەری پێ
نەئینایین] کۆم دکەین [کو ڕۆژا قیامەتێیە]، ڤێجا ئەوێت بەراهیکێ دێینە ڕاوەستاندن، دا یێت دویماهیکێ
بگەهنێ، و ببنە ئێك ڕێز. ﴿٨٤﴾ گاڤا دێینە مەیدانا حەشرێ [و جهێ حسابێ]، خودێ دێ بێژتە وان: هەوە
نیشان و ئایەتێت من درەو دانان، بێی هوین تشتەکی ژێ بزانن، و ئەو چ بوو هەوە دکر [ئەو چ بوو هوین
ژ ڤێ ڕۆژێ دایینە پاش، و وەل هەوە کری، هوین درەو بدانن]. ﴿٨٥﴾ و ئیزا ل سەر وان پێدڤی بوو، ژ بەر
ستەما وان کری، ڤێجا ئاخفتن ژ وان نائێت [چونکی وان چو هەجەت نینن، بۆ خۆ بگرن]. ﴿٨٦﴾ ما نابینن
مە شەڤ یا دایییە وان، دا تێدا بڤەهەسن، و مە ڕۆژ یا ڕۆنکری [دا کاروبارێت خۆ تێدا ب ڕێڤە ببەن]، ب
ڕاستی ئەڤە [شەڤ کرنە جهێ ڤەهەسینێ، و ڕۆنکرنا ڕۆژێ] چامە و نیشانن، بۆ وان ئەوێت باوەرییێ دئینن.
﴿٨٧﴾ و ڕۆژا پف ل بۆقێ دئێتەدان، هنگی ئەوێت د ئەرد و ئەسماناندا هەین، هەمی دێ ترسن، ژ بلی وان
ئەوێت خودێ نەڤیایی بترسن [ئەو ژی شەهید و پێغەمبەرن]، و هەمی مەلویل و ڕەزیل دێ ئێنە دەڤ خودێ.
﴿٨٨﴾ [وێ ڕۆژێ کو ڕۆژا قیامەتێیە] دێ چیایان بینی، یا ژ تەڤە د ڕاوەستاینە، و ئەو ب خۆ کا چاوا عەور
دچن، وەسا دچن، ئەڤە چێکرنا خودێیە، ئەوێ هەمی تشت موکوم و بنەجهـ چێکری، و خودێ ئاگەهـ ژ وێ
هەیە یا هوین دکەن.

مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا وَهُم مِّن فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴿٨٩﴾
وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا
مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ ٱلَّذِى
حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَىْءٍ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩١﴾
وَأَنْ أَتْلُوَا۟ ٱلْقُرْءَانَ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ
وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿٩٢﴾ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ
سَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعْرِفُونَهَا ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾

سُورَةُ القَصَصِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ نَتْلُوا۟ عَلَيْكَ
مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ
فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ
طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ
مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟
فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾



﴿٨٩﴾ [وێ رۆژێ] هەچیێ بێت خێر هەبن، دێ
گەهیتە خێرەکا چێتر [خودێ دەهـ قات دێ دەتێ]،
و ئەو ژ ترس و سەهما وێ رۆژێ ئێمنن. ﴿٩٠﴾ و هەر
کەسێ بێت، و کار و کریارێت وی هەمی گونەهـ
بن، یان هەڤال و هەڤپشك بۆ خودێ چێکربن، دێ
سەروسەر کەڤتە د دۆژەهێدا [دەرگەهڤانێت دۆژەهێ
دێ بێژنێ]، هوین نائێنە جزاکرن ب وێ نەبیت یا
هەوە دکر. ﴿٩١﴾ [هەی موحەمەد بێژە] ب راستی
فەرمانا من یا هاتیە کرن، کو ئەز خودایێ ڤی
باژێری ب تنێ بپەرێسم، ئەو باژێرێ خودێ ب رێز و
رویمەت ئێخستی و ئێمنکری، و هەمی تشت [دگەل
ڤی باژێری] یێ ویە، و ئەمرێ من یێ هاتیە کرن،
ئەز ل بەر ئەمرێ وی راوەستم، و ژ خۆسپارتیان بم.
﴿٩٢﴾ و [ئەمرێ من یێ هاتیە کرن] ئەز قورئانێ
[بۆ هەوە] بخوینم [دا هەوە پێ بترسینم، و داخوازکەمە
گوهداریا خودێ]، ڤێجا هەر کەسێ راستەرێ ببیت،
ب راستی بۆ خۆ ب تنێ دێ راستەرێ بیت، و هەر
کەسێ گومرا ببیت [زیانێ ل خۆ دکەت]، ڤێجا بێژە:
ئەز بەس ژ ئاگەهدارکەرانم [یا ل سەر خۆ من گەهاندە هەوە، و چو یێ دی ژ بلی ڤێ، ل سەر من نینە].
﴿٩٣﴾ و بێژە: حەمد و سوپاسی هەمی بۆ خودێ، نێزیك دێ ئایەت و نیشانێت [ل سەر دەستهەلاتداریا]
خۆ نیشا هەوە دەت، ڤێجا هوین دێ نیاسن و زانن، و خودایێ تە ژ تشتێ هوین دکەن، نەیێ بێ ئاگەهە.

## سۆرەتا قەصەص

### ل مەکەهێ هاتیە خوارێ (٨٨) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هۆسا دئێتە خواندن (طا، سین، میم)، [بۆ راڤەکرنا ڤان رەنگە تیپان بزڤرە سەرێ سۆرەتا بەقەرە].
﴿٢﴾ ئەڤە ئایەتێت کتێبا (قورئانا) رۆنکەرن. ﴿٣﴾ ئەم بۆ وان ئەوێت باوەری ب قورئانێ هەی، سالۆخێ
مووسایی و فیرعەونی وەکی چێبووی، ب وەحی بۆ تە دهنێرین. ﴿٤﴾ ب راستی فیرعەونی، ل سەر
ئەردێ مسرێ، زێدە خۆ مەزنکر، و زۆرداری ژ قامێ دەرئێخست، و خەلکێ وێ کرنە دەستەك دەستەك و
ژێکڤەکرن، و کۆمەك ژ وان [کو ئسرائیلینە] تەپەسەرکرن، کورێت وان دکوشتن، و کچێت وان [بۆ خدامینیا
خۆ] دهێلان، ب راستی ئەو ژ خرابان بوو. ﴿٥﴾ و مە دڤێت کەرەمێ د گەل وان بکەین ئەوێت د مسرێدا
هاتینە تەپەسەرکرن، کو ئسرائیلینە [و وان ژ زۆرداریا فیرعەونی رزگار بکەین]، و وان بکەینە پێشی و جهێ
چاڤلێکرنێ، و وان بکەینە ویرس [ل مسرێ].

وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا
مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ
أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِي
وَلَا تَحْزَنِيٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾
فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ
فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾
وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ
عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾
وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا ۖ إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِۦ لَوْلَآ
أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتْ
لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ ۖ فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١١﴾
۞ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ
عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَٰصِحُونَ ﴿١٢﴾
فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ
أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾

نصف الحزب ٣٩





﴿٦﴾ و ئەوان د ئەردیدا بنەجهـ بکەین [و تێدا دەستهەلاتدار بکەین]، و تشتێ فیرعەون و هامان و لەشکەرێ وان ژێ دترسیان [مەخسەد نەمانا ملك و دەستهەلاتداریا وانە]، نیشا فیرعەون و هامان و لەشکەرێ وان هەردوویان، ژ ئیسرائیلیان، بدەین. ﴿٧﴾ و [وەختێ مووسا بووی] مە ئیلهام بۆ دەیکا مووسایی هنارت کو شیری بدە مووسایی، و ئەگەر تو ژێ ترسیای [بێتە کوشتن هەروەکی هەمی کورێت ئسرائیلیان دئێنە کوشتن]، ڤێجا وی [بکە د سندۆقەکێدا و] باڤێژە د ڕوبباریدا (د نیلیدا) و نەترسە [ناخەندقیت] و ب خەم نەکەڤە، ب ڕاستی دێ ئەوی بۆ تە زڤڕینینەڤە، و دێ وی کەینە پێغەمبەر. ﴿٨﴾ ڤێجا مالا فیرعەونی ئەو ژ ئاڤێ ئینادەر، دا [بۆ وان وەکی کوڕەکی لێ بێت، و ببیتە ڕۆناهیا چاڤێت وان، بەلێ دویماهیێ] بۆ وان ببیتە نەیار و کۆڤان، ب ڕاستی فیرعەون و هامان و لەشکەرێ وان، هەمی یێت گونەهکار بوون. ﴿٩﴾ و ژنا فیرعەونی [وەختێ مووسا دیتی، کەتە دلێ وێ] گۆت: [ئەڤ بچویکە دێ بۆ من و تە ببیتە جهێ کەیف و دلخۆشیێ، نەکوژن، بەلکی ب کێر مە بێت، یان ژی بکەینە کوڕێ خۆ، و ئەو نوزانن [هیلاکا وان دێ ل سەر دەستێ وی بیت، و دێ بۆ وان ببیتە نەیار و کۆڤان]. ﴿١٠﴾ و چو هزر ل سەر دلێ دەیکا مووسایی نەما [ژ مووسایی پێڤەتر، کا چ ب سەری هات] نێزیك بوو دا ئاشکەراکەت [کو مووسا کوڕێ وێیە]، ئەگەر مە دلێ وێ موکوم نەکربایە و ب هێز نەئێخستبایە [ب وێ ئیلهاما مە داییێ، کو فیرعەون کوڕێ وێ ناکوژیت، و جارەکا دی دێ کوڕێ وێ بۆ زڤڕینینەڤە]، دا ببیتە ژ وان ئەوێت خودان باوەر [و باوەری ب ژڤانا خودێ هەی]. ﴿١١﴾ و گۆتە خویشکا وی: ل دویڤ هەرە [کا دێ چ لێ ئێت]، [خویشکا وی ئەو] ژ دویرڤە دیت، و وان نەدزانی ئەو خویشکا وییە [ل دویڤ دئێت]. ﴿١٢﴾ و مە نەهێلا ئەو شیرێ چو دایینان بخۆت، بەری ئەم وی بزڤڕینینە دەڤ دەیکا وی، [ئینا خویشکا وی] گۆت: [پشتی زانی ئەو یێ ل دایینەکێ دگەڕن] ئەرێ ئەز مالەکێ نیشا هەوە بدەم، وی بۆ هەوە خودان بکەت و سەرەگوهیێ لێ بکەت، و وان خێرا وی بڤێت و بۆ د دلبێش بن. ﴿١٣﴾ ڤێجا مە ئەو زڤڕاندەڤە دەڤ دەیکا وی، دا چاڤێت وێ پێ ڕۆن ببن، و دا ب خەم نەکەڤیت، و دا بزانیت کو ب ڕاستی فەرمانا خودێ یا ڕاستە و یا ب جهێ خۆیە، بەلێ باراپتر ژ مرۆڤان ڤێ نوزانن.

وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى
ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤﴾ وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا
فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ ۖ
فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ
مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ۖ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ
مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى فَٱغْفِرْ لِى فَغَفَرَ لَهُۥٓ ۚ إِنَّهُۥ
هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ فَلَنْ أَكُونَ
ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ ﴿١٧﴾ فَأَصْبَحَ فِى ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا
ٱلَّذِى ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥ ۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِىٌّ
مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِٱلَّذِى هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ
يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِى كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا بِٱلْأَمْسِ ۖ إِن تُرِيدُ
إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ
ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ
إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ إِنِّى لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢٠﴾
فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ ۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢١﴾



﴿١٤﴾ و وەختێ [مووسا] گەهشتییە کاملانا خۆ
[ژ ئەقلی و هێزێ]، مە پێغەمبەراتی و زانین دایێ، و
هۆسا ئەم قەنجیکاران خەلات دکەین. ﴿١٥﴾ و بێی
کو خەلکێ باژێری [مسرێ] پێ بحەسیت، چۆ
ناڤ باژێری، ڤێجا دیت دو زەلام تێدا ب شەڕن،
ئەڤە ژ ملەتێ ویە و ئەڤێ دی ژ دژمنێ ویە، ڤێجا
ئەڤێ ژ ملەتێ وی هەوارا خۆ گەهاندێ، و داخواز
ژێ کر هاریکاریا وی بکەت ل سەر دژمنێ وی،
ئینا مووسایی کولمەك دانایێ کوشت، گۆت: ئەڤە ژ
کارێ شەیتانییە [شەیتانی ب من دا کرن]، ب ڕاستی
ئەو دژمنەکێ گومڕاکەرێ ئاشکەرایە. ﴿١٦﴾ گۆت:
خودێوۆ، ب ڕاستی من ستەم ل خۆ کر [ب کوشتنا ڤی
مرۆڤی، و ب ڤێ کریارا شەیتانی ب من دایییەکرن]،
ڤێجا ل من نەگرە و گونەهێت من ژێ ببە، ڤێجا
خودێ گونەهێت وی ژێ برن، و ئەوە گونەهـ ژێبەر
و دلۆڤان. ﴿١٧﴾ و گۆت: خودێوۆ، ژ بەر وێ کەرەما
تە د گەل من کری [کو تە ئەز یێ ب هێز ئێخستیم]،
ئەز چوجا نابمە پشتەڤان و هاریکار بۆ گونەهکاران.
﴿١٨﴾ ڤێجا ب ترس ما د ناڤ باژێریدا، و زێرەڤانی ل خۆ دکر [دترسیا نەخۆشییەك ب سەری بێت ژ بەر
کوشتنا وی مرۆڤێ فیرعەونی]، دیت ئەوێ دوهی هاریکاری ژێ خواستی، [جارەکا دی] یێ هەوارا خۆ
دگەهینیتێ، مووسایی گۆتێ: ب ڕاستی تو گومڕایەکێ ئاشکەرایی. ﴿١٩﴾ ڤێجا وەختێ مووسایی ڤیایی ئەوێ
دژمنێ هەردووکان (ئەوێ قوبتی) ب هێز بگریت، ئەوێ ئسرائیلی [هزرکر مووسا دێ وی گریت و کوژیت،
ژ بەر هندێ ترسیا و] گۆت: تە دڤێت تو من ژی بکوژی، هەروەکی دوهی تە ئێك کوشتی، تە دڤێت
[ب ڤی کارێ خۆ] ببییە ژ زەبەردەستێت خوینرێژ دئەردیدا، و تە نەڤێت تو ژ وان بی یێت قەنجییێ دکەن.
﴿٢٠﴾ زەلامەك [ژ فیرعەونیان ژ حەز ژێکەرێت وی] ژ دویماهیا باژێری ب لەز هاتە دەڤ مووسایی، و
گۆت: هەی مووسا، ب ڕاستی مەزنێت باژێری یێت کۆم بوویین، و یێ تەکبیرێ دکەن دا تە بکوژن،
ڤێجا [ژ باژێری] دەرکەڤە، ب ڕاستی من خێرا تە دڤێت. ﴿٢١﴾ ڤێجا مووسا ب ترس ژ باژێری دەرکەڤت،
و زێرەڤانی ل خۆ دکر [نەکو تشتەك ب سەری بێت] گۆت: خودێوۆ، من ژ ملەتێ ستەمکار ڕزگار بکە.

وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهْدِيَنِي سَوَآءَ
ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ
ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِۖ قَالَ
مَا خَطْبُكُمَاۖ قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُۖ وَأَبُونَا
شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ
رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا
تَمْشِي عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ
أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَاۚ فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ قَالَ
لَا تَخَفْۖ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا
يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُۖ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِيُّ ٱلْأَمِينُ ﴿٢٦﴾
قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَيَّ هَٰتَيْنِ عَلَىٰٓ أَن
تَأْجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٍۖ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَۖ
وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ
ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَۖ أَيَّمَا ٱلْأَجَلَيْنِ
قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَٰنَ عَلَيَّۖ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٢٨﴾



﴿٢٢﴾ ڤێجا وەختێ [مووسایی] بەرێ خۆ دایییە ملێ [باژێرێ ] مەدیەنێ، گۆت: من هیڤییە خودایێ مـن بەرێ مـن بدەتـە رێکا ڕاست [و ڕێ ل بـەر مـن بـەرزە نەبیـت]. ﴿٢٣﴾ ڤێجا وەختێ هاتییە سەر ئاڤا مەدیەنـێ، کۆمـەکا مرۆڤـان ل سـەر ئاڤـێ دیتـن، پـەزێ خـۆ ئـاڤ ددان، و ژ وان پێـدا [یـان د بـن وانـدا] دو ژن دیتـن پـەزێ خـۆ ددانـە پـاش و ڤەدگـێڕان [دا نەچیتـە نـاڤ یــێ خەلکـی، ئینـا دلـێ مووسـایی مـا ب وانڤە]، گـۆت: هـەوە خێرە، بۆچـی هویـن پـەزێ خـۆ ددەنـە پـاش؟! وان [هەردوویان] گـۆت: بابێ مـە پیرەمێرەکێ ب نـاڤ سـالڤە چۆیـییە [و مـە ژ وی پێڤەتـر کـەس نینە بـۆ مـە بێتـە بـەر پـەزی، و ژ نەچـاری ئـەم یـێت هاتینـە بـەر..] و ئـەم پـەزێ خـۆ ئـاڤ نادەیـن، هەتـا شـڤان هەمـی بـەری مـە پـەزێ خـۆ ئـاڤ نـەدەن و نەبـەن. ﴿٢٤﴾ ئینـا [مووسـایی] پـەزێ وان بـۆ وان ئاڤدا، پاشـی پشـتا خـۆ دا وان، و چـۆ بـن سـیبەرێ، ڤێجـا [بـۆ خـۆ] گـۆت: خودێـوۆ، ب ڕاسـتی هـەر کەرەمـا تـو د گـەل مـن بکـەی، ئـەز یــێ هەوجەمـە [و ئەز یــێ برسـیمە]. ﴿٢٥﴾ [پاشـی] ئێـك ژ وان هـەردو ژنـان ب شـەرمڤە هاتـە دەڤ [مووسـایی] و گۆتـێ: بابـێ مـن داخـوازا تـە دکـەت، دا هەقـێ ئاڤدانـا تە بۆ مـە کری، بدەتە تە، ڤێجا وەختێ مووسـا هاتیـیە دەڤ، و چیرۆکا خـۆ بۆ ڤەگێڕایی [بابـێ وان کچـان]، گۆتـێ: نەترسـە، تـو ژ ملەتـێ ستەمکار قورتـال بـووی. ﴿٢٦﴾ ئێکـێ ژ وان هـەردو کچان، گۆت: باب ب شـڤانی بگرە، ب ڕاسـتی یـێ ژ هەمیـیان چێتر تو ب شـڤانی بگری، ئەوە یـێ ب هێز و ئەمین. ﴿٢٧﴾ [بابـێ کچـان گۆتـە مووسـایی]: مـن دڤێـت ئێـك ژ هـەردو کچێـت خـۆ ل تـە مـار بکـەم، ب شـەرت تو هەشـت سـالان شڤانیـیا مـن بکـەی، ژ خۆ ئەگـەر تو تمامکـەی و بکەیـە دەهــ، ئەڤـە قەنجیـیەکە ژ دەڤ تە، من نەڤێـت ئـەز زەحمەتـێ بـۆ تـە چێکەم [کو تـو بکەیـە دەهـ سـال]، و ئەگەر خـودێ حەزکـەت، دێ مـن ژ مرۆڤێت بـاش بینـی. ﴿٢٨﴾ [مووسـایی] گـۆت: ئەڤـە پەیمانە (قەولـە) د ناڤبەرا من و تەدا، و کیشـك ژ هـەردو وەختان من ب جهــ ئینـا، [هەشـت سـال یان دەهـ سـال] زێـدە ژ من نائێتە خواسـتن و چو ل سـەر من نینە، و خودێ شـاهدە ل سـەر ئەڤا ئـەم دبێژین.

ثلاثة أرباع الحزب ٣٩

۞ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلۡأَجَلَ وَسَارَ بِأَهۡلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ
ٱلطُّورِ نَارٗاۖ قَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم
مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ جَذۡوَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ ٢٩
فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ فِي ٱلۡبُقۡعَةِ
ٱلۡمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ
ٱلۡعَٰلَمِينَ ٣٠ وَأَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا
جَآنّٞ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ يَٰمُوسَىٰٓ أَقۡبِلۡ وَلَا تَخَفۡۖ
إِنَّكَ مِنَ ٱلۡأٓمِنِينَ ٣١ ٱسۡلُكۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ
بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖ وَٱضۡمُمۡ إِلَيۡكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهۡبِۖ
فَذَٰنِكَ بُرۡهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ
كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ٣٢ قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلۡتُ مِنۡهُمۡ نَفۡسٗا
فَأَخَافُ أَن يَقۡتُلُونِ ٣٣ وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا
فَأَرۡسِلۡهُ مَعِيَ رِدۡءٗا يُصَدِّقُنِيٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ٣٤
قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجۡعَلُ لَكُمَا سُلۡطَٰنٗا فَلَا
يَصِلُونَ إِلَيۡكُمَا بِـَٔايَٰتِنَآۚ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلۡغَٰلِبُونَ ٣٥



﴿٢٩﴾ ڤێجا گاڤا مووسایی وەختێ خۆ ب دویماهی
ئینایی و مالا خۆ بری، [ب شەڤ] ئاگرەك ل رەخێ
[راستێ یێ چیایێ (طوور)] دیت، [ئینا] گۆتە
مالا خۆ: ل ڤێرێ راوەستن، ئەزێ ئاگرەكی ژ دویر
دبینم [ئەز دێ چم بەرێ خۆ دەمێ]، بەلكی ئەز
بۆ هەوە ئاخڤتنەكێ [كو رێكێ ڤێ بكەڤین] یان
بزۆتكەكی ئاگری بینم، دا هوین خۆ پێ گەرم بكەن.
﴿٣٠﴾ و وەختێ هاتییە دەڤ [ئاگری]، ژ رەخێ راستێ
یێ نهالێ، ژ وی جهێ پیرۆز ژ دارێ، هاتە گازیكرن:
هەی مووسا، ب راستی ئەز خودێمە، خودانێ هەمی
جیهانان. ﴿٣١﴾ و دارێ خۆ باڤێژە، ڤێجا وەختێ دیتی
وەكی تیرەماری ب لەز و سڤك دچیت، ژ ترسان رەڤی
و ل خۆ نەزڤڕی، [خودێ] گۆت: هەی مووسا، بزڤرە
و نەترسە، تو ژ وانی یێت ئێمن. ﴿٣٢﴾ و دەستێ خۆ
بكە د پاخلا خۆدا، دەستێ تە بێ نەساخی و بێ ئێش،
دێ سپی و سیس (برسقی) دەركەڤیت [هەرچەندە
دەستێ وی یێ رەش ئەسمەر بوو] ئەڤە دو نیشان و
موعجیزەنە ژ دەڤ خودایێ تە بۆ فیرعەونی و ملەتێ
وی [ژ كەنكەنە و مەزن و دویفچۆییێت وی]، ب راستی ئەو ملەتەكێ ژ رێ دەركەڤتینە. ﴿٣٣﴾ [مووسایی]
گۆت: خودێوۆ، ب راستی من ئێكێ ژ وان كوشتی، ڤێجا ئەز دترسم من بكوژن [و تۆلا خۆ ڤەكەن].
﴿٣٤﴾ و هاروونێ برایێ من ژ من ب ئەزمانترە، ڤێجا د گەل من فڕێكە هاریكار و پشتەڤان، كو من راست
دەربێخیت، ئەز دترسم ئەو من درەوین دانن. ﴿٣٥﴾ خودێ گۆت: ئەم دێ پشتا تە ب برایێ تە قایم كەین،
و هاریكاریا تە كەین، و ئەم دێ ب نیشان و موعجیزەیێت خۆ دەستهەلاتێ دەینە هەوە، ڤێجا ئەو نەشێن
نێزیكی هەوە ببن ژ بەر وان ئایەت و موعجیزەیێت مە داینە هەوە، هوین و یێت ب دویڤ هەوە دكەڤن،
دێ سەركەڤن [نە ئەو].

فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٖ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ
مُّفۡتَرٗى وَمَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ٣٦
وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ مِنۡ عِندِهِۦ وَمَن
تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٣٧
وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ
غَيۡرِي فَأَوۡقِدۡ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجۡعَل لِّي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ
أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٣٨
وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَظَنُّوٓاْ
أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ ٣٩ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ
فِي ٱلۡيَمِّۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٠
وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ
لَا يُنصَرُونَ ٤١ وَأَتۡبَعۡنَٰهُمۡ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗۖ
وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلۡمَقۡبُوحِينَ ٤٢ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا
مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ
بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ٤٣



﴿٣٦﴾ ڤێجا وەختێ مووسا ب نیشان و ئایەت و
موعجیزەیێت مە یێت ئاشکەرا بۆ وان [فیرعەونی و
کۆما وی و ملەتێ وی] هاتی، گۆتن: ئەڤە [ئەڤا تو
دکەی، داری دکەیە مار، و دەستێ خۆ سپی ژ پاخلا
خۆ دەردئێخی] ژ سحرەکا چێکری پێڤەتر نینە، و مە
ئەڤە ژ باب و باپیرێت خۆ یێت بەرێ، نەبهیستییە.
﴿٣٧﴾ مووسایی گۆت: ب ڕاستی خودایێ من
چێتر دزانیت کا کی ب ڕاستەڕێییێ ژ دەڤ خودێ
هاتییە، و کا دویماهیا خێرێ و سەرکەڤتنێ یا کێیە،
ب ڕاستی خودێ ستەمکاران سەرفەراز ناکەت.
﴿٣٨﴾ فیرعەونی گۆت: گەلی مەزن و ماقویلان، ژ
بلی خۆ، ئەز چو خودایان بۆ هەوە نابینم [ئانکو ژ
بلی من، هەوە چو پەرستی نینن]، ڤێجا هامانۆ، تو بۆ
من ئاگری بدە بن هەڕییێ [ئانکو تابووکان چێکە]،
و قەسرەکا بلند بۆ من ئاڤاکە، ئەز بچمە سەربانێ
وێ، بەلکی خودایێ مووسایی ببینم، و ب ڕاستی
ل دەڤ من ئەو ژ درەوینانە. ﴿٣٩﴾ و ب نەهەقی وی
[فیرعەونی] و لەشکەرێ وی د ئەردێ مسرێدا خۆ
مەزن کرن، و هزرکرن ئەو ب بال مەڤە نازڤڕن. ﴿٤٠﴾ ڤێجا مە ئەو و لەشکەرێ وی گرتن، و هاڤێتنە د
دەریایێدا [و مە هەمی خەندقاندن، و کەس ژێ نەما]، ڤێجا بەرێ خۆ بدێ کا دویماهیا ستەمکاران، یا چاوا
بوو؟. ﴿٤١﴾ و مە ئەو [د دنیایێدا] کرنە سەرێت گاورییێ [چاڤ ل وان بێتەکرن]، و [خەلکی] بۆ ئاگری
گازی دکەن، و ڕۆژا قیامەتێ هاریکاریا وان نائێتەکرن. ﴿٤٢﴾ و د ڤێ دنیایێدا مە لەعنەت [و دویرکەڤتن ژ
دلۆڤانیا خودێ] ب دویڤ وان ئێخست [ژ خودێ و ملیاکەت و باوەریداران]، و ڕۆژا قیامەتێ ژی، ئەو ژ
وانن ئەوێت ژ دلۆڤانیا خودێ دویرئێخستی. ﴿٤٣﴾ ب سویند مە کتێب [تەورات] دا مووسایی، پشتی مە
ملەتێت چەرخێت بۆری د هیلاك برین [وەکی ملەتێ نووح و عاد و (سەموود) و فیرعەون و ملەتێ وی]، دا
[ئەو کتێب] بۆ مرۆڤان ببیتە ڕۆناهیا دلان [کو هەقییێ پێ ببینن] و ڕێکا ڕاستەڕێیی و دلۆڤانییێ، دا بۆ خۆ
شیرەتان ژێ وەرگرن.

وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ وَمَا كُنتَ
مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٤٤﴾ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ
ٱلْعُمُرُ ۚ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ
ءَايَٰتِنَا وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٤٥﴾ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ
ٱلطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا وَلَٰكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا
مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٦﴾
وَلَوْلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا۟
رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ وَنَكُونَ
مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟
لَوْلَآ أُوتِىَ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ مُوسَىٰٓ ۚ أَوَلَمْ يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أُوتِىَ
مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۖ قَالُوا۟ سِحْرَانِ تَظَٰهَرَا وَقَالُوٓا۟ إِنَّا بِكُلٍّ كَٰفِرُونَ ﴿٤٨﴾
قُلْ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبٍ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَآ أَتَّبِعْهُ
إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٩﴾ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكَ فَٱعْلَمْ
أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَآءَهُمْ ۚ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ
هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٠﴾



﴿٤٤﴾ و [هەی موحەمەد] وەختێ ئەم د گەل مووسایی ئاخفتین [و مە پێغەمبەراتی دایییێ، و هنارتییە دەڤ فیرعەونی و ملەتێ وی] تو ل ڕەخێ ڕۆژئاڤایێ چیایێ (طوور) نەبووی، و تو نە یێ حازر بووی [وەختێ مە وەحی بۆ مووسایی ئینایییە خوارێ]. ﴿٤٥﴾ بەلێ مە چەند ملەت و چەند دەست، پشتی مووسایی [هەتا گەهشتییە تە] دان و ئینان، ڤێجا وەخت ب سەر وانڤە چۆ [و دەرفەت ل سەر وان درێژ بوو، شەریعەت و ئەحکام گوهارتن، و کاروبارێت دینی ژ بیرکرن، و ئەمرێ خودێ هاتە هێلان و پەیمانا وی دانە پشت خۆ، ڤێجا مە تو هنارتی، دا کاروبارێت دینی نوی بکەی]، و تو یێ ئاکنجی ژی نەبووی د ناڤ خەلکێ مەدیەنێدا [دا سەرهاتییا مووسایی و شوعەیبی و هەردو کچێت شوعەیبی بزانی]، دا ئایەتێت مە [د ڕاستا واندا] بۆ خەلکێ مەکەهێ بخوینی، بەلێ مە تو هنارتی پێغەمبەر [و مە ئەڤ سەرهاتییە بۆ تە دیارکرن، و ئەگەر ژ بەر هندێ نەبایە کو تو پێغەمبەری، تە سالۆخێت وان نەدزانین]. ﴿٤٦﴾ و تو ب ڕەخ چیایێ (طوور) ژیڤە نەبووی، وەختێ مە گازی کرییە مووسایی [و مە ئاخافتی] بەلێ خودایێ تە ژ دلۆڤانییا خۆ [وەحی بۆ تە هنارت، و بۆ تە گۆت:] دا ملەتەکی هشیار و ئاگەهدار بکەی [ئانکو دا بۆ وان ببییە پێغەمبەر]، کو بەری تە چو پێغەمبەر بۆ وان نەهاتبوون، وان ئاگەهدار بکەن و دا ل خۆ بزڤڕن. ﴿٤٧﴾ و ئەگەر ژ بەر هندێ نەبایە، وەختێ بەلایەك ژ بەر کار و کریارێت وان دهاتە سەرێ وان، بێژن: خودێوۆ، دێ بلا تە پێغەمبەرەك بۆ مە هنارتبایە، دا ئەم ژی ل دویڤ نیشان و ئایەتێت تە هاتباینە [و ئەڤە نەهاتبایە سەرێ مە]، و ئەم بووبایینە ژ خودان باوەران [مە تو پێغەمبەر نەدهنارتی، چونکی ئەگەر مە ئەو بەری هنارتنا تە ئیزادابانە، دا بێژن ئەڤە ژ کەنگی وەرە پێغەمبەر بۆ مە نەهاتینە، بلا خودێ پێغەمبەرەك بۆ مە هنارتبایە، دا مە ژی گوهێ خۆ دابایێ و باوەری پێ ئینابایە، ڤێجا دا وان ئەڤ هەجەتە نەمینیت، مە تو هنارتی پێغەمبەر]. ﴿٤٨﴾ ڤێجا وەختێ هەقی ژ دەڤ مە، بۆ [خەلکێ مەکەهێ] هاتی [کو هاتنا پێغەمبەرییە ب ڤێ قورئانێ]، گۆتن: بلا تشتێ بۆ مووسایی هاتی [ژ موعجیزەیان] بۆ وی ژی هاتبایە، ئەرێ ما وان [ئەوێت وەکی وان] بەری نوکە، ئەوا پێ مووسا پێ هاتی درەو نەدانا، و گۆتن: [تەورات و قورئان] دو سحرن، پشتەڤانییا ئێکدو دکەن [ل سەر درەوێ بۆ ئێکدو دبنە شاهد]، و گۆتن: مە باوەری ب هەردووکان نینە. ﴿٤٩﴾ [هەی موحەمەد] بێژە [وان]: ئەگەر هوین ڕاست دبێژن [کو ئەڤ هەردو کتێبە وەسانن وەکی هوین دبێژن]، کا هوین کتێبەکێ ژ دەڤ خودێ بینن، ژ ڤان هەردو کتێبان [تەورات و قورئانێ] یا ڕاستەڕێتر بیت، دا ئەز بگرم و ل دویڤ بچم. ﴿٥٠﴾ و ئەگەر وان بەرسڤا تە نەدا [و نەشیان کتێبەکا ژ قورئانێ و تەوراتێ ڕاستەڕێتر، ژ دەڤ خودێ بینن، یان ژی ل دویڤ تە نەهاتن و باوەری ب تە و قورئانا بۆ تە هاتی نەئینان]، ڤێجا بزانە ئەو بەس یێت ل دویڤ هەوا و دلخوازییا خۆ دچن [و وان چو بەلگە و نیشان نینن]، و ما کی ژ وی ڕێبەرزەتر و گۆمڕاترە یێ ب دویڤ دلخوازییا خۆ بکەڤیت، بێی کو وی ڕاستەڕێکرنەك ژ دەڤ خودێ هەبیت، ب ڕاستی خودێ ملەتێ ستەمکار [ئەوێ ب دویڤ هەوایێ سەرێ خۆ دکەڤیت] ڕاستەڕێ ناکەت.

الحِزْبُ ٤٠

۞وَلَقَدۡ وَصَّلۡنَا لَهُمُ ٱلۡقَوۡلَ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾ ٱلَّذِينَ
ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتۡلَىٰ
عَلَيۡهِمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلِهِۦ
مُسۡلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡتَوۡنَ أَجۡرَهُم مَّرَّتَيۡنِ بِمَا صَبَرُواْ وَيَدۡرَءُونَ
بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُواْ
ٱللَّغۡوَ أَعۡرَضُواْ عَنۡهُ وَقَالُواْ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡ سَلَٰمٌ
عَلَيۡكُمۡ لَا نَبۡتَغِي ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿٥٦﴾
وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآۚ أَوَلَمۡ
نُمَكِّن لَّهُمۡ حَرَمًا ءَامِنٗا يُجۡبَىٰٓ إِلَيۡهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَيۡءٖ رِّزۡقٗا
مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن
قَرۡيَةِۭ بَطِرَتۡ مَعِيشَتَهَاۖ فَتِلۡكَ مَسَٰكِنُهُمۡ لَمۡ تُسۡكَن مِّنۢ
بَعۡدِهِمۡ إِلَّا قَلِيلٗاۖ وَكُنَّا نَحۡنُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴿٥٨﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ
مُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبۡعَثَ فِيٓ أُمِّهَا رَسُولٗا يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ
ءَايَٰتِنَاۚ وَمَا كُنَّا مُهۡلِكِي ٱلۡقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهۡلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾



﴿٥١﴾ و ب سويند مە ئايەتێت قورئانێ ناڤبەين ناڤبەين و ل دويڤ ئێك، بۆ وان هنارتن [ئانكو مە ئەحكامێت قورئانێ بۆ قورەيشيان ل دويڤ ئێك هنارتن]، دا بۆ خۆ شيرەتان ژێ وەربگرن، و ل خۆ بزڤڕن.
﴿٥٢﴾ ئەوێت بەری ڤێ قورئانێ مە كتێب داينێ [مەخسەد پێ جوهی و فەلە، ئەوێت موسلمان بووين]، ئەو باوەرييێ ب ڤێ قورئانێ دئينن.
﴿٥٣﴾ و وەختێ [ئەڤ قورئانە] بۆ وان دئێتە خواندن، دبێژن مە باوەری پێ ئينا، ب ڕاستی ئەڤە هەقييە ژ نك خودايێ مە، ب ڕاستی بەری وێ ژی [بەری قورئان بێتە خوارێ] ئەم د موسلمان بووين [و مە باوەری هەبوو دێ پێغەمبەرەك ئێت، و قورئان دێ بۆ ئێتە خوارێ]. ﴿٥٤﴾ ئەڤە دوجا دێ خەلاتێ خۆ وەرگرن [ئانكو خێرا وان دوقات دێ ئێتە نڤيسين] ژ بەر سەبرا وان كێشايی، و ژ بەر باشييا ئەو شوينا خرابييێ دكەن، و خرابييا ئەو ب باشی ددەنە پاش، و ژ بەر وان خێر و سەدەقەيێت ژ وی تشتی ددەن، ئەوێ مە داييیە وان. ﴿٥٥﴾ و دەمێ وان گول قەسە و گۆتنێت سەقەت و شكەستی دبيت [ژ گاوران]، پشتا خۆ ددەنێ و دبێژن: ئەم ل سەر ڕێكا خۆ و هوين ل سەر ڕێكا خۆ، پشت ڕاست بن ئەم بەرسڤا هەوە نادەين و ل هەوە نازڤڕينين، و مە نەڤێت تێكەلييا نەزانان بكەين. ﴿٥٦﴾ و تو نەشێی ئەوێ تە بڤێت ڕاستەڕێ بكەی، بەلێ خودێيە يێ بڤێت ڕاستەڕێ دكەت، و ئەو چێتر دزانيت كا كی دێ باوەرييێ ئينيت، و كا بەرێ كێ ل ڕێكا ڕاستە. ﴿٥٧﴾ و [موشركێت مەكەهێ] گۆتن: ئەگەر ئەم بێينە سەر دينێ تە [هەی موحەمەد]، ئەم دێ ژ ئەردێ خۆ ئێينە دەرئێخستن [ئانكو عەرەب هەمی دێ نەيارەتييا مە كەن، و ل سەر مە كۆم بن، و مە هێزا بەرسينگگرتنا وان نينە]، ما مە ئەو د حەرەمەكا ئێمندا بنەجهـ نەكربوون [ئەو د گاور، كەسێ زێدەگاڤی ل سەر وان نەدكر، ڤێجا چاوا ئەگەر موسلمان بوون ژ خۆ دترسن، زێدەگاڤی ل سەر وان بێتەكرن]، و ژ كەرەما مە، ڤێقييێ هەمی جهان و هەمی تشتان دئێتێ، بەلێ باراپتر ژ وان ڤێ نوزانن [كو ئێمنكرن و پەيدابوونا ڤێقييێ هەمی جهان ل وێرێ، وی جهێ هشك و بێ دار و دەرامەت، كەرەمەكە ژ دەڤ خودێ]. ﴿٥٨﴾ و گەلەك گوند، مە قڕكرن ل سەر پێ خۆ چۆبوون و بەتران ببوون، و سوپاسييا خودێ نەدكرن ل سەر كەرەمێت وی، ڤێجا ئەڤە مالێت وانن [كاڤلن]، پشتی وان ئاڤا نەبووينە و كەس لێ خۆجهـ نەبووييیە، ب ڕێباری نەبيت [ئەگەر جارەكێ ڕێڤنگ و ڕێبار تێرا چۆبن، و بێنا خۆ لێ ڤەدابن]، و ئەم بووينە وێرسێت وان [كەس ژ وان و دويندەها وان نەمابوون]. ﴿٥٩﴾ و خودايێ تە چو گوندان د هيلاك نابەت، بەری پێغەمبەرەكی بهنێريتە ناڤ، نيشان و ئايەتێت مە ب سەر واندا بخوينيت [وان هشيار بكەت، و ڕێكا ڕاست بۆ وان ديار بكەت]، و مە چو گوند د هيلاك نەبرينە، ئەگەر خەلكێ وان ب خۆ يێ ستەمكار نەبيت.

وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتُهَاۚ وَمَا عِندَ
ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَفَمَن وَعَدۡنَٰهُ وَعۡدًا حَسَنٗا
فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعۡنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ثُمَّ هُوَ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ
مِنَ ٱلۡمُحۡضَرِينَ ﴿٦١﴾ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ أَيۡنَ شُرَكَآءِيَ
ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ رَبَّنَا
هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغۡوَيۡنَآ أَغۡوَيۡنَٰهُمۡ كَمَا غَوَيۡنَاۖ تَبَرَّأۡنَآ إِلَيۡكَۖ
مَا كَانُوٓاْ إِيَّانَا يَعۡبُدُونَ ﴿٦٣﴾ وَقِيلَ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ فَدَعَوۡهُمۡ فَلَمۡ
يَسۡتَجِيبُواْ لَهُمۡ وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَۚ لَوۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ يَهۡتَدُونَ ﴿٦٤﴾
وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبۡتُمُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٦٥﴾ فَعَمِيَتۡ
عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَنۢبَآءُ يَوۡمَئِذٖ فَهُمۡ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿٦٦﴾ فَأَمَّا مَن تَابَ
وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلۡمُفۡلِحِينَ ﴿٦٧﴾
وَرَبُّكَ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخۡتَارُۗ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُۚ سُبۡحَٰنَ
ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٦٨﴾ وَرَبُّكَ يَعۡلَمُ مَا تُكِنُّ
صُدُورُهُمۡ وَمَا يُعۡلِنُونَ ﴿٦٩﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ لَهُ
ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلۡأُولَىٰ وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٧٠﴾





﴿٦٠﴾ و هەر تشتەكێ خودێ داییە هەوە، خەمل
و متایێ دنیایێیە، و یێ ل دەڤ خودێ چێترە و پتر
دمینیت، ما هوین تێناگەهن [یێ مایی چێترە، ژ یێ
پویچ دبیت]؟ ﴿٦١﴾ ئەرێ ئەوێ مە ژ دەڤ خۆ، پەیمان
ب بەحەشتێ داییێ كو هەر دێ گەهیتێ، وەكی وییە
یێ مە ب متایێ ژیانا دنیایێ كەیفخۆش كری [ئەوێ
ب كول و كۆڤان و زوی دچیت، و نەمینیت]، پاشی
ڕۆژا قیامەتێ ئەو دێ ژ وان بیت، ئەوێت د دۆژەهێدا
دئێنە بەرهەڤكرن؟ ﴿٦٢﴾ و ڕۆژا خودێ گازی وان
دكەت، و دبێژیت: كا هەڤپشكێت هەوە ژ درەو بۆ
من چێ دكرن ل كیڤەنە [هاریكاریا هەوە بكەن]؟
﴿٦٣﴾ و ئەوێت هێژایی گەف و ئیزایا مە بووین،
گۆتن: خودێوۆ ئەوێت مە د سەردابرین ئەڤەنە، كا
ئەم چاوا د سەردا چۆبووین، مە ئەو ژی وەسا د
سەردابرن [ب دلێ وان، نە ب كۆتەكی]، ڤێجا ئەم ژ
وان یێت بەرینە، وان ئەم نەدپەرستین [ئەو ب دویڤ
دلخوازیا خۆ كەڤتبوون]. ﴿٦٤﴾ و ڕۆژا [خودێ]
دبێژیت: كا گازی وان هەڤپشكان بكەن، یێت هەوە
بۆ خودێ چێكرین [كا دێ فایدەی هەوە كەن، و بەرەڤانییەكێ ژ هەوە كەن]، ڤێجا گازی وان دكەن بەلێ
بەرسڤا وان نادەن، ڤێجا وەختێ هەمی ئیزایێ و دۆژەهێ دبینن [هنگی ژ دل، پەشێمان دبن و دبێژن:] خۆزی
ئەم د دنیایێدا ژ ڕاستەڕێ و خودان باوەران باینە. ﴿٦٥﴾ و ڕۆژا [خودێ] گازی وان دكەت، و دبێژیت: هەوە
چاوا بەرسڤا پێغەمبەران دا؟. ﴿٦٦﴾ وێ ڕۆژێ هەجەت و بەرسڤ ل بەر وان بەرزە دبن [و نوزانن دێ چ
بێژن]، و پسیارا ئێكدو ژی ناكەن [ئێك تشتەكی ژ ئێكی بگریت، یان تشتەكی بۆ بێژیت، چونكی كەسێ چو
هەجەت نینن]. ﴿٦٧﴾ بەلێ هەچییێ تۆبە بكەت و باوەرییێ بینیت، و كار و كریارێت باش بكەت، ئەڤە دێ
د سەرفەراز بن. ﴿٦٨﴾ و خودایێ تە، چ بڤێت وی چێ دكەت، و وی دهەلبژێریت، هەلبژارتن شۆلێ وییە،
نەیێ وانە [ئەڤ ئایەتە د ڕاستا وێ چەندێدا هاتە خوار، وەختێ قورەیشییان گۆتی: بلا ئەڤ قورئانە بۆ ئێك
ژ هەردو ماقویلێت مەكەهێ و تائیفێ هاتبایە خوار، یان وەختێ جوهییان گۆتی: بەس ئەگەر جبرائیل نەبایە
یێ وەحییێ بۆ موحەمەدی دئینیت، ئەم دا باوەرییێ پێ ئینین]، و ب ڕاستی خودێ یێ پاك و پاقژە ژ وێ
شركا ئەو دكەن. ﴿٦٩﴾ و كا ئەو چ د دلێ خۆدا ڤەدشێرن، یان ژی ئاشكەرا دكەن، خودایێ تە پێ دزانیت.
﴿٧٠﴾ و ئەوە خودایێ تاك و تەنیا، چو پەرستییێت ڕاست و دورست ژ وی پێڤەتر نینن، و حەمد و سوپاسی
د دنیایێ و ئاخرەتێدا هەر بۆ وییە، و حوكم د ناڤبەرا بەندەیاندا هەر یێ وییە، و زڤرینا هەوە هەر ب بال
ویڤە یە.

قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ
ٱلْقِيَـٰمَةِ مَنْ إِلَـٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ ۖ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ٧١
قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ
يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَنْ إِلَـٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ
فِيهِ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ٧٢ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ
وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ
تَشْكُرُونَ ٧٣ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ
كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ٧٤ وَنَزَعْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا فَقُلْنَا
هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ فَعَلِمُوٓا۟ أَنَّ ٱلْحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنْهُم
مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ٧٥ ۞ إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ الحِزْبُ ٤٠
فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ
بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ
لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ٧٦ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۖ
وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ
وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ٧٧



﴿٧١﴾ [هەی موحەمەد] بێژە [وان]: كا بێژنە من ئەگەر خودێ هەتا ڕۆژا قیامەتێ، بەردەوام ل هەوە بكەتە شەڤ [و بێ ڤەبڕین درێژ بكەت] كیژ پەرستی [ژ ئەوێت هوین دپەرێسن] هەیە ژ بلی خودێ بشێت، بۆ هەوە ڕۆناهییەكێ بینیت؟! ڤێجا ما هوین گوهێت خۆ ڤەناكەن، تێ بگەهن. ﴿٧٢﴾ بێژە: كا بێژنە من ئەگەر خودێ هەتا ڕۆژا قیامەتێ، بەردەوام ل هەوە بكەتە ڕۆژ، كیژ پەرستی ژ بلی خودێ هەیە، بشێت بۆ هەوە شەڤەكێ بینیت، هوین تێدا ڤەهەسن؟! ڤێجا ما هوین د بێ چاڤن، نابینن. ﴿٧٣﴾ و ژ دلۆڤانییا خۆ شەڤ و ڕۆژ یێت بۆ هەوە داین، دا د شەڤێدا ڤەهەسن، و دا د ڕۆژێدا ژ ڕزقێ وی بخوازن [تێدا شۆل بكەن]، و دا هوین سوپاسییا خودایێ خۆ بكەن. ﴿٧٤﴾ و ڕۆژا [خودێ] گازی وان دكەت، و دبێژیت: كا هەڤپشكێت هەوە ژ درەو بۆ من چێ دكرن، ل كیڤەنە [بلا هاریكارییا هەوە بكەن]. ﴿٧٥﴾ و ڕۆژا ئەم ژ ناڤ هەر ملەتەكی شاهدەكی دەردئێخین [دا شادەیییێ ل سەر كریارێت وان بدەت، ئەو ژی پێغەمبەرێ وان ب خۆیە] و دبێژنە وان (موشركان): كا بەلگە و نیشانێت خۆ بینن [كو هەڤپشك من یێت هەین]، هنگی دێ زانن خودێ ئێكە، و یێ بێ هەڤال و هەڤپشكە، و ئەو هزر و تەخمینا وان دكر [ئانكو مەهدەر و بەرەڤانییا بوتان]، ل وان بەرزەبوو [و نەما]. ﴿٧٦﴾ ب ڕاستی قاروون ژ ملەتێ مووسایی بوو، ڤێجا خۆ مەزن كر ل سەر سەرێ ملەتێ خۆ، و ستەم ل وان كر، و مە هند گەنجخانە دابوونێ، هەتا ڕاكرنا كلیلێت وان ژی، بۆ دەستەكەكا ب هێزا زەلامان یا گران بوو، وەختێ ملەتێ وی [ئەوێت باوەری ئینایین] گۆتییێ: د سەردا نەچە و بەتران نەبە، ب ڕاستی خودێ حەژ بەترانان ناكەت. ﴿٧٧﴾ و ب وی تشتێ خودێ دایییە تە، ئاخرەتێ بخوازە، و بارا خۆ ژ دنیایێ ژی ژ بیر نەكە، و كا چاوا خودێ قەنجی د گەل تە كرییە، تو ژی وەسا قەنجییێ [دگەل بەندەیێت وی] بكە، و د ئەردیدا ل دویڤ خرابییێ نەگەڕە، ب ڕاستی خودێ حەژ خرابكەران ناكەت.

قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ أَوَلَمۡ يَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَهۡلَكَ
مِن قَبۡلِهِۦ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مَنۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرُ جَمۡعٗاۚ
وَلَا يُسۡـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٧٨ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ
فِي زِينَتِهِۦۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا يَٰلَيۡتَ لَنَا
مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ٧٩ وَقَالَ ٱلَّذِينَ
أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ
صَٰلِحٗاۚ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ٨٠ فَخَسَفۡنَا بِهِۦ
وَبِدَارِهِ ٱلۡأَرۡضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٖ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ
ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُنتَصِرِينَ ٨١ وَأَصۡبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوۡاْ
مَكَانَهُۥ بِٱلۡأَمۡسِ يَقُولُونَ وَيۡكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن
يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُۖ لَوۡلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا لَخَسَفَ بِنَاۖ
وَيۡكَأَنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٨٢ تِلۡكَ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ نَجۡعَلُهَا لِلَّذِينَ
لَا يُرِيدُونَ عُلُوّٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فَسَادٗاۚ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ٨٣
مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا
يُجۡزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٨٤



﴿٧٨﴾ قاروونی گۆت: ب ڕاستی [ئەڤ زەنگینییە،
و ئەڤ مالە] من ب زانینا خۆ یێ پەیداکری، ما
وی نەدزانی کو ب ڕاستی خودێ بەری وی، گەلەك
ملەتێت ژ وی ب هێزتر و تێرمالتر، یێت د هیلاك
برین؟! و پسیارا گونەهکاران ژ گونەهێت وان
نائێتەکرن [هەجەتەکێ بۆ خۆ بگرن، بۆ هەجەتێ پسیار
ژ وان نائێتە کرن، هەکە وەکێ دی پسیار ب خۆ هەر یا
هەی، خودێ دبێژیت: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسۡـَٔلَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾].
﴿٧٩﴾ ڤێجا [جارەکێ] قاروون ب خەمل و کەشخەیییا
خۆڤە، دەرکەڤتە ناڤ ملەتێ خۆ، ئەوێت گەلەك
حەژ ژیانا دنیایێ دکەن، گۆتن: خۆزی ئەو تشتێ
خودێ دایییە قاروونی، دابایە مە ژی [ئانکو خۆزی
ئەم ژی وەکی وی زەنگین بباینە]، ب ڕاستی ئەو
خودان شەنسەکێ مەزنە. ﴿٨٠﴾ و ئەوێت تێگەهشتی
گۆتن: وەی بۆ هەوە، خەلاتێ خودێ بۆ وان ئەوێت
باوەری ئینایین و کار و کریارێت باش کرین چێترە
[ژ دنیایێ هەمییێ، نەبەس ژ ئەڤا خودێ دایییە
قاروونی]، و کەس ناگەهیتە ڤی خەلاتی [یان
بۆ کەسێ هەلناکەڤیت بگەهیتێ]، ئەو نەبن یێت سەبرکێش [ل سەر عیبادەتان، و هێلانا دلخوازییان].
﴿٨١﴾ ڤێجا مە ئەو [مەخسەد قاروون] ب مال و خانیڤە، د ئەردیدا برە خوار، و وی چو دەستەك نەبوون،
غەیری خودێ، هاریکارییا وی بکەن، و ئەو ب خۆ ژی نەدشیا هاریکارییا خۆ بکەت. ﴿٨٢﴾ و ئەوێت
دوهی خۆزی دخواست، شوینا قاروونی بانە [ئەڤرۆ] یێ دبێژن: ئاخ! [ئەو چ خۆزی بوو، مە خواستی]
هۆسانە خودێ بۆ هەر بەندەیێ بڤێت ژ بەندەیێت خۆ، ڕزقێ وی بەرفرەهـ و کێم دکەت [ئانکو دان و
نەدانا ڕزقی، ب قەدریڤە نە یاگرێدایییە]، و ئەگەر خودێ کەرەم د گەل مە نەکربایە، دا مە ژی د ئەردیدا
بەت، [ڤێجا پەشێمان بوون، و گۆتن:] هەچکو گاور سەرفەراز نابن. ﴿٨٣﴾ ئەڤا تە بهیسی، و سالۆخا وێ
بۆ تە هاتی ژیانا ئاخرەتێیە، ئەم دێ دەینە وان ئەوێت نە مەزناتی و نە ستەم د ئەردیدا دڤێت، نە ژی خرابی،
و دویماهیکا باش هەر یا پارێزکارانە. ﴿٨٤﴾ هەر کەسێ بێت و خێرەك هەبیت، ژ وێ خێرێ چێتر دێ بۆ
هەبیت، و هەر کەسێ بێت و گونەهەك هەبیت، ئەوێت گونەهـ کرین ب وان گونەهێت وان کرین پێڤەتر
نائێنە جزاکرن.

إِنَّ ٱلَّذِي فَرَضَ عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٖۚ قُل رَّبِّيٓ
أَعۡلَمُ مَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ وَمَنۡ هُوَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٨٥ وَمَا كُنتَ
تَرۡجُوٓاْ أَن يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبُ إِلَّا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۖ فَلَا
تَكُونَنَّ ظَهِيرٗا لِّلۡكَٰفِرِينَ ٨٦ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنۡ ءَايَٰتِ
ٱللَّهِ بَعۡدَ إِذۡ أُنزِلَتۡ إِلَيۡكَۖ وَٱدۡعُ إِلَىٰ رَبِّكَۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ
ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٨٧ وَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ
كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥۚ لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٨٨

## سُورَةُ العَنكَبُوتِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

۞ الحِزْب ٤٠
الٓمٓ ١ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ
لَا يُفۡتَنُونَ ٢ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ
صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٣ أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ
ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسۡبِقُونَاۚ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ٤ مَن كَانَ يَرۡجُواْ
لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٓتٖۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٥ وَمَن
جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفۡسِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦





﴿٨٥﴾ ئەوێ قورئان بۆ تە ئینایییە خوار، و ل سەر تە واجب کری [بخوینی و کار پێ بکەی، و بگەهینی] جارەکا دی دێ تە زڤرینیتەڤە مەکەهێ [یان پشتی مرنێ جارەکا دی دێ تە ساخکەت بۆ قیامەتێ، دا پسیارا تە ل سەر قورئانێ بێتەکرن] بێژە: خودایێ من [ژ من و هەوە] چێتر راستەرێکریان دنیاسیت [و دزانیت کی پتر هێژایی خەلاتییە]، و کا کی د گومراییێ کا ئاشکەرادایە [ئەز یان هوین]؟ ﴿٨٦﴾ و تو نە ل هیڤییێ بووی، ئەڤ قورئانە ب وەحی بۆ تە بێتە خوار، بەلێ دلۆڤانییەك بوو ژ خودایێ تە، ڤێجا بۆ گاوران نەبە پشتەڤان [ئانکو دەڤنەرمییێ بۆ وان نەکە]. ﴿٨٧﴾ بلا ئەو [گاور و موشرك] تە ژ جهێنان و کارپێکرنا قورئانێ نەدەنە پاش، پشتی بۆ تە هاتییە خوارێ، و بۆ رێکا خودایێ خۆ گازی خەلکی بکە، و نەبە ژ وان یێت هەڤال و هەڤپشکان بۆ چێ دکەن. ﴿٨٨﴾ و چو پەرستییان د گەل خودێ نەپەرێسە، چو پەرستییێت راست و دورست نینن، ئەو نەبیت، و هەمی تشت دێ چن و نامینن، ئەو نەبیت، ژێکڤەکرن و حوکم د ناڤبەرا بەندەیێت ویدا یێ وییە، و هوین هەر دێ ب بال ویڤە زڤرن.

## سۆرەتا عەنکەبووت

### ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٦٩) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هۆسا دئێتە خواندن (ئەلف، لام، میم) ل دۆر راڤەکرنا ڤان تیپان، بزڤرە دەستپێکا سۆرەتا بەقەرە. ﴿٢﴾ ئەرێ ما مرۆڤ ل وێ هزرێنە، گاڤا گۆتن: مە باوەری [ب خودێ] ئینا [دێ ئێنە هێلان، و ئەزیەت ناگەهیتە وان]، و نائێنە جەرباندن و ئمتیحانکرن [ب گەلەك رەنگێت جەرباندن و ئمتیحانان]. ﴿٣﴾ و ب سویند ئەوێت بەری وان [ژ تاگرێت پێغەمبەران]، مە [ب هەمی رەنگێت نەخۆشییان] جەرباندن [و ڤان ژی، مادەم ئەو دبێژن مە باوەری ئینا، و خۆ ژ خودان باوەران ددانن، دێ وان ب نەخۆشییان جەرببینین]، دا خودێ ئەوێت راست [د گۆتنا خۆ یا بۆریدا: (مە باوەری ئینا)] ژ ئەوێت درەوین، ئاشکەرا بکەت [و دیار بکەت کا کی یێ راستە، وەختێ دبێژیت مە باوەری ئینا، و کا کی درەوان دکەت؟].
﴿٤﴾ یان ژی ئەوێت کریارێت خراب کرین [ئەوێت چو پویتەی نەدەنە گونەهێ، و گونەهـ ل دەڤ وان چو نە]، وێ هزرێ دکەن ئەم نەشێین وان ئیزا بدەین، و ئەو دێ ژ ئیزایا مە رەڤن، پیسە هزرە ئەو دکەن [وەختێ ئەو وێ هزرێ دکەن، کو ئەو دێ ژ ئیزایا خودێ قورتال بن]. ﴿٥﴾ و هەر کەسێ هیڤییا خەلاتێ خودێ هەی [یان ژی ژ حسابا وی بترسیت، یان ژی ژ دیتنا وی بترسیت]، [بلا کارەکێ باش بکەت و چو هەڤپشکان بۆ خودێ چێ نەکەت]، ب راستی وەختێ خودێ بۆ قیامەتێ و حسابێ دەستنیشانکری، هەر دێ ئێت [ڤێجا بلا بۆ وێ رۆژێ بکەن]، و خودێ ب خۆ گوهدێرە [بۆ هەر تشتەکێ بەندەییێت وی دبێژن]، و زێدە زانایە [بۆ هەر تشتەکی]. ﴿٦﴾ و هەر کەسێ جیهادێ [دگەل خۆ، یان د گەل شەیتانی، یان د گەل گاوران] بکەت، ب راستی ئەو بۆ خۆ جیهادێ دکەت [چونکی مفا و فێقییێ وێ جیهادێ، هەر ل وی دزڤریت]، و خودێ پاکی ب جیهادا کەسێ نینە، چ د گەل خۆ و نەفسا خۆ، چ ژی د گەل ئێکێ دی]، ب راستی خودێ پاکی ب کەسێ نینە [نە هەوجەیی ب پەرستنا وان هەیە، نە ژی گونەهـ و نەگوهداریـیا وان زیانێ دگەهینیتێ].

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ
وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ ٱلَّذِى كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٧﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ
بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ
فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾
وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِى ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٩﴾
وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِىَ فِى ٱللَّهِ جَعَلَ
فِتْنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ ۖ وَلَئِن جَآءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ
إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ ۚ أَوَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِى صُدُورِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾
وَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ ﴿١١﴾
وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا
وَلْنَحْمِلْ خَطَٰيَٰكُمْ وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنْ خَطَٰيَٰهُم مِّن
شَىْءٍ ۖ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٢﴾ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ
أَثْقَالِهِمْ ۖ وَلَيُسْـَٔلُنَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿١٣﴾
وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ
إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾



﴿٧﴾ و ئەوێت باوەری ئینایین و كار و كریارێت باش
كرین، ب ڕاستی ئەم دێ گونەهێت وان ڕاكەین
و ژێبەین، [و ڕۆژا قیامەتێ] و ئەم دێ ب چێترین
كریارێت وان، وان خەلاتكەین. ﴿٨﴾ و مە ئەمرێ
مرۆڤان پێ كری، قەنجی و باشییێ د گەل دەیبابێت
خۆ بكەن، و ئەگەر ئەو ژ تە بخوازن و خۆ ب تەڤە
بوەستینن، دا تو وی تشتێ تە زانین پێ نەی، بۆ مە
بكەیە هەڤال و هەڤپشك، ڤێجا تو گوهێ خۆ نەدە وان
[بۆ گونەهێ، چ شرك چ هەر گونەهەكا دی] و زڤرینا
هەوە ب بال من ڤەیە، ڤێجا هەر ئێكی ل دویڤ كارێ
ئەو دكەت دێ جزاكەین [ئەڤە مزگینییەكا خۆشە، بۆ
وی یێ باش د گەل دەیبابێت خۆ و ڕێكا ڕاست گرتی،
و گەفە بۆ وی یێ د گەل دەیبابێت خۆ خراب و ڕێكا
خراب گرتی]. ﴿٩﴾ و ئەوێت باوەری ئینایین و كار و
كریارێت باش كرین، ب ڕاستی ئەم [د بەحەشتێدا] دێ
وان دەینە د گەل خۆش مرۆڤان. ﴿١٠﴾ و ژ مرۆڤان یێ
هەی دبێژیت من باوەری ب خودێ ئینا، و گاڤا ئەو
[ژ بەر باوەری ئینانا خۆ و] بۆ خودێ [و د ڕێكا خودێدا]
هاتە ئەزیەتدان [و نەخۆشی و زیان گەهشتێ]، ئەزیەت و زیانا مرۆڤان وەكی ئیزایا خودێ ددانیت [دا بۆ خۆ
بكەتە هەجەت، باوەرییێ بهێلیت و سەبری نەكێشیت، و گوهدارییا وان مرۆڤان بكەت ل سەر تشتێ ئەو ژێ
دخوازن، هەلبەت ژ ترسا ئیزایا وان، كا چاوا مرۆڤێ موسلمان ژ ترسا ئیزایا خودێ گاورییێ دهێلیت، و گوهدارییا
خودێ دكەت و تشتێ ئەمرێ وی پێ هاتییە كرن ب جهـ دئینیت]، و ئەگەر سەركەڤتنەك ژ خودایێ تە بێت،
دێ بێژن: نێ ئەم ژی د گەل هەوە بووین [مە ژی د دەستكەڤتیاندا پشكدار بكەن]، ئەرێ ما خودێ ئەوا د دلێ
خەلكیدا، چێتر نوزانیت [ئانكو ئەو ژ وان چێتر دزانیت، كا چ د دلێت وان ب خۆدا هەیە]. ﴿١١﴾ ب ڕاستی خودێ
ئەوێت باوەری ئینایین [و دلسۆژ د باوەرییا خۆدا] و دوڕوییان، دێ ژێك ئاشكەراكەت. ﴿١٢﴾ و ئەوێت گاور
بووین [ئانكو گاوران] گۆتە ئەوێت باوەری ئینایین [ئانكو موسلمانان]: ل دویڤ مە وەرن و وەرنە سەر
ڕێكا مە، ئەم دێ گونەهێت هەوە ب ستۆیێ خۆڤە گرین، و ئەو چو ژ گونەهێت وان هەلناگرن [ئەوێت
وان ب ستۆیێ خۆڤە گرتین]، ب ڕاستی ئەو درەوان دكەن. ﴿١٣﴾ [بەلێ] ب ڕاستی ئەو [گاور و خودانێت
ئاخڤتنا: (ئەگەر گونەهـ بیت، ئەم دێ گونەهێت هەوە هەلگرین)] دێ گونەهێت خۆ، و هندەك گونەهێت دی
ژی د گەل گونەهێت خۆ هەلگرن [گونەهێت خۆ و گونەهێت وان ئەوێت وان د سەردابرین و ژ ڕێكا ڕاست
دەرئێخستین]، و بێ شك ڕۆژا قیامەتێ، دێ پسیارا وێ درەوا وان دكر [كو دێ گونەهێا غەیری خۆ هەلگرن]
ژ وان ئێتەكرن. ﴿١٤﴾ و ب سویند مە نووح، پێغەمبەر هنارتە دەڤ ملەتێ وی، ڤێجا هزار كێم پێنجی سالان،
ما د ناڤ واندا [بەردەوام گازی وان دكر، د گەل هندێ ژی ژ بلی كێمەكێ، كەسێ دی باوەری پێ نەئینا و
بەردەوام ئەزیەتا وی دهاتەكرن و وی سەبر دكێشا، ڤێجا دڤێت، هەی موحەمەد، تو پتر بێنا خۆ فرەهـ بكەی،
چونكی ئەڤە چەندەكا كێمە تو د ناڤ ملەتێ خۆدا، د گەل هندێ ژی هەژمارا ئەوێت باوەری ب تە ئینایی،
گەلەكن]، ڤێجا ئەو ب بەر تۆفانێ [ئاڤا بۆش و گەلەك] كەڤتن، و ئەو یێت ستەمكار بوون.

فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَصۡحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلۡنَٰهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٥
وَإِبۡرَٰهِيمَ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُۖ ذَٰلِكُمۡ
خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ١٦ إِنَّمَا تَعۡبُدُونَ مِن
دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا وَتَخۡلُقُونَ إِفۡكًاۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعۡبُدُونَ مِن
دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ لَكُمۡ رِزۡقٗا فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ
وَٱعۡبُدُوهُ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓۖ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ١٧ وَإِن تُكَذِّبُواْ
فَقَدۡ كَذَّبَ أُمَمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡۖ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ
ٱلۡمُبِينُ ١٨ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ كَيۡفَ يُبۡدِئُ ٱللَّهُ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ
يُعِيدُهُۥٓۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ١٩ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ
فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ بَدَأَ ٱلۡخَلۡقَۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأٓخِرَةَۚ
إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٠ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرۡحَمُ
مَن يَشَآءُۖ وَإِلَيۡهِ تُقۡلَبُونَ ٢١ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي
ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن
وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ٢٢ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ
أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحۡمَتِي وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٢٣





﴿١٥﴾ ڤێجا مە ئەو و هندی د گەل د گەمیێدا رزگار كرن، و مە ئەو [گەمی، یان ئەو رویدان، یان رزگاربوون، یان جزاكرنا گاوران ب خەندقاندنێ] كرە چامە و نیشان بۆ خەلكی. ﴿١٦﴾ و ئیبراهیم ژی، مە پێغەمبەراتی دایێ، و مە بۆ ملەتێ وی هنارت، وەختێ گۆتییە ملەتێ خۆ خودێ ب تنێ بپەرێسن و ژ وی ب تنێ بترسن، ئەڤە [پەرستنا وی ب تنێ، و ترس ژ وی ب تنێ] بۆ هەوە [ژ شركێ و پەرستنا بوتان] چێترە، ئەگەر هوین بزانن [كا چ بۆ هەوە باشە، و چ بۆ هەوە خرابە]. ﴿١٧﴾ ب راستی ئەوێت هوین شوینا خودێ دپەرێسن، بەس بوت و پەیكەرن، و هوین درەوان دكەن [وەختێ هوین وان پەرستییان دپەرێسن، و دكەنە هەڤپشكێت خودێ، و دبێژن دێ بۆ مە بنە مەهدەرچی ل دەڤ خودێ]، ب راستی ئەوێت هوین شوینا خودێ دپەرێسن، چو رزقی نادەنە هەوە، ڤێجا رزقی بۆ خۆ ژ خودێ ب تنێ بخوازن، و وی ب تنێ بپەرێسن، و شوكور و سوپاسیا وی ب تنێ بكەن، و هوین دێ هەر ب بال وی ب تنێڤە زڤرن.

﴿١٨﴾ و ئەگەر هوین [پێغەمبەرێ خۆ] درەوین دانن، ب سویند هندەك ملەتێت دی ژی، بەری هەوە پێغەمبەرێت خۆ درەوین دانان [ڤێجا بۆ هەوە دیاربوو، كا چ ب سەرێ وان هات ژ بەر درەوین دانانا وان بۆ پێغەمبەرێت خۆ، ڤێجا ژ خۆ بترسن و ڤێ دویڤاهیكێ]، و ژ راگەهاندنا ئاشكەرا پێڤەتر، چو یا دی ل سەر پێغەمبەری نینە. ﴿١٩﴾ ما ئەو [ئەوێت باوەری ب رۆژا قیامەتێ نەی] نابینن، و نوزانن كا چاوا خودێ جارا ئێكێ ئەو داینە و چێكرینە [ئەو ژ نەبیێ یێت داین، و وان ژ چپكەكا ئاڤێ پشتی د چەند قۆناخەكانرا دبەت، دەردئێخیتە سەر دنیایێ، بلا بزانن ئەوێ ئەو هۆسا داین، دێ وان پشتی مرنێ ساخكەتەڤە ژی، ب راستی ئەڤە [دان و مراندن و زڤراندن] ل بەر خودێ یا ب ساناهییە. ﴿٢٠﴾ بێژە [وان ئەوێت باوەری ب رۆژا قیامەتێ نەی]: د ئەردیدا هەرن و بەرێ خۆ بدەنێ، كا چاوا بۆ جارا ئێكێ خودێ چێكریان [دگەل گەلەكیا وان، و جوداییا سروشت و زمان و رەنگێ وان] چێ دكەت [دا هوین عەجێبیا چێكرییێت خودێ ب چاڤ ببینن، و بزانن یێ جارا ئێكێ ددەت، جارا دویێ ب ساناهیتر دشێت ساخكەتەڤە]، پاشی خودێ [پشتی مرنێ] دێ وان بۆ قیامەتێ راكەتەڤە، ب راستی خودێ ل سەر هەمی تشتان یێ خودان شیانە. ﴿٢١﴾ هەر كەسێ بڤێت [و هێژایی هندێ بیت] دێ ئیزا دەت، و هەر كەسێ بڤێت دێ دلۆڤانییێ پێ بەت، و هوین دێ ب بال ویڤە زڤرن [ئانكو جزادان و خەلاتكرن د دەستێ وی ب تنێ دایە]. ﴿٢٢﴾ [گەلی مرۆڤان] هوین نەشێن خودێ نەچار بكەن كو هوین ژ ئیزایێ قورتال ببن، نە ل ئەردی و نە ل ئەسمانی، و ژ خودێ پێڤەتر هەوە چو هاریكار و پشتەڤان نینن. ﴿٢٣﴾ و ئەوێت باوەری ب قورئانێ و رۆژا قیامەتێ نەئینایین، ئەو یێت ژ دلۆڤانیا من بێ هیڤی بوویین، و بۆ ڤان ئیزایەكا ب ژان و دژوار یا هەی.

فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ
فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٤﴾
وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ
فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۖ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم
بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ
وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ۞ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌۘ وَقَالَ
إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾
وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ
ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ وَءَاتَيْنَٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَاۖ وَإِنَّهُۥ
فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ
إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ
مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ
ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ
قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ
ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٤٠





﴿٢٤﴾ ڤێجا بەرسڤا ملەتێ ئیبراهیمی ژ ڤێ پێڤەتر
نەبوو، گۆتن: [هوین ئیبراهیمی] بکوژن یان بسۆژن،
و [پشتی وان نەخشەیێ سۆتنێ بۆ کێشایی، و هاڤێتیه
د ناڤ ئاگریدا] خودێ ئەو ژ ئاگری ڕزگارکر، ب
ڕاستی ئەڤە [رزگارکرنا ئیبراهیمی ژ ئاگرێ شارییی]
چامە و نیشانن، بۆ وان ئەوێت باوەرییێ دئینن.
﴿٢٥﴾ [و ئیبراهیمی ] گۆت: ب ڕاستی هوین ژ بلی
خودێ پەیکەر و بوتان دپەرێسن، دا ڤیان و حەژێکرن
د ژیانا دنیایێدا د ناڤبەرا هەوەدا هەبیت [و ل سەر
کۆم ببن]، پاشی ڕۆژا قیامەتێ [ئەو حەژێکرنا ل
سەر پویچییێ هاتی، نامینیت]، هوین دێ بەرائەتا
خۆ ژ ئێکدو کەن، و دێ لەعنەتان ل ئێکدو کەن، و
جهێ هەوە ئاگرە، و چو هاریکار ژی بۆ هەوە نابن.
﴿٢٦﴾ ڤێجا (لووط)ی باوەری پێ ئینا [برازایێ
وی بوو، و کەسێ ئێکێ بوو باوەری پێ ئینایی]، و
ئیبراهیمی گۆت: ب ڕاستی ئەز دێ ژ بۆ خودایێ
خۆ مشەخت بم [ئانکو ئەز دێ ژ ناڤ ملەتێ خۆ
دەرکەڤمە وی جهێ خودێ بۆ من حەزکری]، ب
ڕاستی خودێ یێ دەستهەلاتدار و کاربنەجهە. ﴿٢٧﴾ و مە ئیسحاق و [کوڕێ ئیسحاقی] یەعقووب دانێ،
و مە پێغەمبەراتی و دانا کتێبان ئێخستە د ناڤ دویندەها ویدا، و هێژ د دنیایێدا مە خەلاتێ وی دایێ [ژنەکا
باش و عەیالەکێ قەنج، کو پێغەمبەراتی هەر د ناڤ واندا یا بەردەوام بیت]، و ئەو د ئاخرەتێدا ژی ژ کێرهاتی
و سەرڕاستانە. ﴿٢٨﴾ بێژە وان وەختێ مە (لووط)، پێغەمبەر ژی بۆ ملەتێ وی هنارتی، و گۆتییە ملەتێ خۆ:
ب ڕاستی هوینێ پویچاتییەکێ دکەن کەسێ ژ خەلکی بەری هەوە نەکرییە. ﴿٢٩﴾ ئەرێ چاوا [هوین ژنان
دهێلن و] دچنە دەڤ زەلامان، و ڕێکان دگرن [کوشتنێ دکەن، و مالی تالان دکەن، یان ژی ڕێکێ ل ڕێڤنگان
دگرن، دا پویچییێ د گەل وان بکەن]، و هوین کارێ کرێت [و یێ خودێ پێ نەخۆش، ب ئاشکەرایی]
د دیوانێت خۆدا دکەن؟ ڤێجا بەرسڤا ملەتێ وی ژ هندێ پێڤەتر نەبوو، گۆتن: ئەگەر تو ڕاست دبێژی،
ئیزایا خودێ [ئەوا تو مە پێ دترسینی] بۆ مە بینە. ﴿٣٠﴾ گۆت: خودێوۆ، هاریکارییا من ل سەر ملەتێ
خرابکار بکە.

وَلَمَّا جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ قَالُوٓاْ إِنَّا مُهۡلِكُوٓاْ
أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِۖ إِنَّ أَهۡلَهَا كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ٣١
قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطٗاۚ قَالُواْ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَن فِيهَاۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ
وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ٣٢ وَلَمَّآ
أَن جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗاۖ
وَقَالُواْ لَا تَخَفۡ وَلَا تَحۡزَنۡ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهۡلَكَ إِلَّا
ٱمۡرَأَتَكَ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ٣٣ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهۡلِ
هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ٣٤
وَلَقَد تَّرَكۡنَا مِنۡهَآ ءَايَةَۢ بَيِّنَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ٣٥
وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗا فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ
وَٱرۡجُواْ ٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ٣٦
فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ
جَٰثِمِينَ ٣٧ وَعَادٗا وَثَمُودَاْ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم
مِّن مَّسَٰكِنِهِمۡۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ
فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُواْ مُسۡتَبۡصِرِينَ ٣٨





﴿٣١﴾ و وەختێ هنارتییێت مە [کو ملیاکەتن]
ب مزگینیڤە هاتینە دەڤ ئیبراهیمی، گۆتن: ب
ڕاستی ئەم یێت هاتین، دا خەلکێ ڤی گوندی
[گوندێ (لووط)ی سەدووم] د هیلاك ببەین، ب
ڕاستی خەلکێ وی گوندی یێت ستەمکار بوون.
﴿٣٢﴾ ئیبراهیمی گۆت: نێ (لووط) یێ تێدا [هوین
دێ چاوا د هیلاك بەن] گۆتن: ئەم چێتر دزانین کا
کی تێدایە، ب ڕاستی ئەم دێ وی و مرۆڤێت وی
[ئەوێت باوەری پێ ئینایین ڕزگارکەین]، ژنا وی تێ
نەبیت، دێ ژ وان بیت ئەوێت د ناڤ ئیزایێدا دمینن.
﴿٣٣﴾ ڤێجا وەختێ هنارتییێت مە [ل سەر ڕەنگێ
مێڤانان] هاتینە دەڤ (لووط)ی، هاتنا وان پێ نەخۆش
بوو، و ب هاتنا وان تەنگاڤ بوو [ترسیا دەستدرێژی
ل سەر وان بێتەکرن]، و گۆتن: نەترسە [ل سەر مە
ژ ملەتێ خۆ] و ب خەم نەکەڤە، ئەم دێ تە و مالا
تە [ئەوێت باوەری ب تە ئینایین] ڕزگارکەین، ژنا
تە تێ نەبیت، ئەو دێ ژ وان بیت ئەوێت د ناڤ
ئیزایێدا دمینن. ﴿٣٤﴾ ب ڕاستی ژ بەر دەرکەڤتنا
وان ژ گوهداریا خودێ و پێغەمبەری، ئەم دێ ئیزایەکێ ژ ئەسمانی ب سەر خەلکێ ڤی گوندیدا ئینین.
﴿٣٥﴾ ب سویند مە نیشانەکا ئاشکەرا ژ گوندی هێلا [ئەو ژی کاڤلن]، بۆ وان یێت ئەقلێ خۆ ددەنە شۆلی
و تێ دگەهن. ﴿٣٦﴾ و مە بۆ مەدیەن، برایێ وان شوعەیب هنارت، گۆت: ملەتێ من، خودێ بپەرێسن و
ژ ڕۆژا قیامەتێ بترسن، و خرابییێ د ئەردیدا نەکەن. ﴿٣٧﴾ ڤێجا وان شوعەیب درەوین دانا، و ژ بەر هندێ
بیڤەلەرزا ب هێز ئەو هنگاڤتن، و ئەو ل سەر چۆکان د خانییێت خۆڤە مرن و بێ بزاڤ مان. ﴿٣٨﴾ و مە عاد
و (سەموود) ژی د هیلاك برن، و ب سویند [گەلی خەلکێ مەکەهێ] هیلاکا وان ژ کاڤلێت وان بۆ هەوە یا
ئاشکەرایە، و شەیتانی کار و کریارێت وان بۆ وان جوانکرن [ڤێجا هزرکرن ئەو گاوری و نەگوهداریا ئەو
دکەن، یا دورستە و ژ وێ چێترە یا پێغەمبەر دبێژن]، و ڕێکا باوەری ئینانێ ب خودێ و پێغەمبەری ل وان
گرت، و ئەو ب خۆ یێت تێگەهشتی بوون [ئەگەر هزرا خۆ کربانە، دشیان هەقی و نەهەقییێ ژێك ڤاڤێرن،
بەلێ ئاقلێ خۆ نەدانە شۆلی و هزرا خۆ نەکرن].

وَقَٰرُونَ وَفِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَۖ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ
فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ ٣٩
فَكُلًّا أَخَذۡنَا بِذَنۢبِهِۦۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِ حَاصِبٗا
وَمِنۡهُم مَّنۡ أَخَذَتۡهُ ٱلصَّيۡحَةُ وَمِنۡهُم مَّنۡ خَسَفۡنَا بِهِ
ٱلۡأَرۡضَ وَمِنۡهُم مَّنۡ أَغۡرَقۡنَاۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ
وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٤٠ مَثَلُ ٱلَّذِينَ
ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلۡعَنكَبُوتِ
ٱتَّخَذَتۡ بَيۡتٗاۖ وَإِنَّ أَوۡهَنَ ٱلۡبُيُوتِ لَبَيۡتُ ٱلۡعَنكَبُوتِۚ
لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٤١ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يَدۡعُونَ مِن
دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٤٢ وَتِلۡكَ
ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ ٤٣
خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٤٤ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ
وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ
وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ٤٥



﴿٣٩﴾ و قاروون و فیرعەون و هامان ژی، مە نەهێلان
(د هیلاك برن)، و بێ شك مووسا بۆ وان ب موعجیزە
و نیشانێت ئاشكەراڤە هات، بەلێ وان د ئەردیدا خۆ
[ل سەر پەرستنا خودێ] مەزن دیتن، و ئەو نە ئەو
بوون ژ ئیزایا مە قورتال ببن. ﴿٤٠﴾ و مە هەر ئێك ب
گونەها وی هنگاڤت، و مە هورەبایەكێ ب بەرەشیشك
ب سەر هندەكاندا هنارت، و هشكەقێرییەكا ب هێز
هندەكێت دی هنگاڤتن، و هندەك ژ وان مە د ئەردیدا
برنە خوارێ، و هندەكێت دی مە د ئاڤێدا خەندقاندن،
و خودێ ستەم و نەهەقی ل وان نەكر، بەلێ وان ب خۆ
ستەم و نەهەقی ل خۆ كر. ﴿٤١﴾ مەتەلا وان كەسان
ئەوێت غەیری خودێ بۆ خۆ كرینە سەمیان و پشتەڤان
[یان ژی ئەوێت بوت كرینە هەڤال و هەڤپشك بۆ
خودێ]، وەكی مەتەلا تەڤنپیركێیە خانییەك بۆ خۆ
چێ كربیت [چونكی خانییێ تەڤنپیركێ چو مفایی
ناگەهینیتێ، نە ژ گەرمێ و نە ژ سەرماییێ، و نە ژ
بارانێ و نە ژ دژمنی دپارێزیت، هۆسا ئەوێت غەیری
خودێ بۆ خۆ بكەنە پشتەڤان، ب چو ڕەنگان فایدەی
ل وان ناكەن، و چو ژ وان نادەنە پاش]، و ب ڕاستی لاوازترین و سستترین خانی، خانییێ تەڤنپیركێیە، ئەگەر
ئەو بزانن. ﴿٤٢﴾ ب ڕاستی خودێ دزانیت، ئەوێت ئەو ژ بلی وی دپەرێسن چو نینن [نە دشێن زیانێ بكەن،
و نە مفایی دگەهینن]، و ئەو ییێ سەردەست و كاربنەجهە. ﴿٤٣﴾ و ڤان نموونەیان ئەم بۆ مرۆڤان دیار
دكەین، و كەس تێ ناگەهیت، زانا نەبن. ﴿٤٤﴾ و خودێ ئەرد و ئەسمان، ژ خۆ نەدایینە [بۆ حیكمەتەكێ ییێت
داین]، ب ڕاستی ئەڤە [دانا ئەرد و ئەسمانان] چامە و نیشانەكە بۆ خودان باوەران. ﴿٤٥﴾ [هەی موحەمەد]
هەر وەحییەكا بۆ تە ژ ڤێ قورئانێ هاتی، بخوینە [بخوینە و باوەر پێ بكە، و بكە كار]، و [وەسا] نڤێژێ بكە
[وەكی فەرمانا تە پێ هاتییە كرن]، ب ڕاستی نڤێژ بەرێ مرۆڤی ژ هەمی گونەهێت زێدەپیس، و كریارێت نە
د گەل سروشتێ مرۆڤان، و كریارێت كرێت و نەشرین [ئەوێت شەریعەتی دورست نەكرین] وەردگێریت، و
نڤێژ ژ هەمی پەرستنێت دی مەزنترە، و خودێ دزانیت كا هوین چ دكەن.

۞وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا
ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ
إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿٤٦﴾
وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ
ٱلۡكِتَٰبَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَمِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ وَمَا
يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن
قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ
ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿٤٨﴾ بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ
أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ وَقَالُواْ
لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٞ مِّن رَّبِّهِۦۖ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ
وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ
ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ
لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ
شَهِيدٗاۖ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
بِٱلۡبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾



﴿٤٦﴾ د گەل خودانێت كتێبان [جوهى و فەلەیان] مەدەرِكانێ نەكەن، ب باشترین رِێك نەبیت [ب نەرمی و جوان وان باخێڤن، و ئەگەر وان خۆ نەزانكر و رەق د گەل هەوە ئاختن، وەكى وان نەكەن]، ئەڤە ژ بلى وان ئەوێت زێدە ستەم كرین و زێدە دژمن ژوان [یێت رێكا نەرم نە وەرگرین و بەردەوام دژمنكارییێ دكەن و دەست ژ نەیارییێ و بەرگەریانا نەیارییێ بەرنەدەن]. و [گەلى موسلمانان] بێژن: مە باوەرى ب وێ ئینا یا بۆ مە هاتییە خوارێ [كو قورئانە]، و یا بۆ هەوە ژى هاتییە خوارێ [كو تەورات و ئنجیلن، ئانكو مە باوەرى ئینا كو هەردو یێت ژ دەڤ خودێ هاتین، و هەردو شەریعەتێت خودێ بوون، هەتا قورئان و پێغەمبەر هاتى]، و خودایێ مە و خودایێ هەوە ئێكە، و ئەم [بەس] ل بەر فەرمانا وى ب تنێ د راوەستیاینە. ﴿٤٧﴾ و كا چاوا مە بۆ یێت بەرى تە كتێب هنارتن، وەسا مە بۆ تە ژى ئەڤ قورئانە ئینا خوارێ [و هنارت]، ڤێجا ئەوێت كتێب بۆ هاتین [مەخسەد پێ خودان باوەرێت وانن، وەكى عەبدوللایێ كورێ سەلامى] باوەرییێ پێ دئینن، و ژ ڤان ژى [ئانكو ئەوێت موسلمان بوویین ژ خەلكێ مەكەهى] یێت هەین باوەرییێ پێ دئینن، و ژ بلى گاوران [ئەوێت سەررەق ل سەر گاورییێ]، كەس نینە باوەرییێ ب قورئانێ نەئینیت. ﴿٤٨﴾ و بەرى قورئان بۆ تە بێتە خوارێ، تە خواندن نەدزانى، و تە چو كتێب نەخواندینە، و تە نڤێسین نەدزانى و چو كتێب ب دەست نەنڤێسینە، و ئەگەر تە بەرى نوكە خواندن و نڤێسین زانیبایە، هنگى دا گاور [ل قورئانێ] ب شك كەڤن. ﴿٤٩﴾ نەخێر وەسا نینە وەكى ئەو هزر دكەن، ئەڤ قورئانە نیشان و بەلگەیێت ئاشكەرا یێت پارستینە د سینگێ زاناییاندا، و بەس ئەو باوەرییێ ب قورئانێ نائینن، یێت زێدە ستەمكار. ﴿٥٠﴾ و دبێژن: دێ بلا موعجیزە و نیشان ژ خودایێ وى بۆ هاتبانە [دا مە ژى باوەرى پێ ئینابایە]، بێژە: ب راستى موعجیزە یێت ل دەڤ خودێ [كەنگى ئەو موعجیزە بڤێن و بۆ كێ بڤێن دێ ئینیت، و نە د دەست مندانە]، و هندى ئەزم، ئەز بەس ئاگەهداركەرەكێ ئاشكەراكەرم. ﴿٥١﴾ ئەرێ ما نە بەسى وانە، ئەڤ كتێبە [كو قورئانە] مە بۆ تە هنارتى، و بۆ وان دئێتە خواندن، ب راستى ئەڤ قورئانە دلۆڤانى و شیرەت و بیرئینانە، بۆ وان ئەوێت باوەرییێ دئینن. ﴿٥٢﴾ هەى موحەمەد، بێژە وان: د ناڤبەرا من و هەوەدا خودێ شادەیییێ بدەت بەسە، هندى د ئەرد و ئەسماناندا هەى ئەو ژێ ب ئاگەهە، و ئەوێت باوەرى ب بوتان ئینایین و باوەرى ب خودێ نەئینایین ئەو د خوسارەتن.

وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِ وَلَوۡلَآ أَجَلٞ مُّسَمّٗى لَّجَآءَهُمُ ٱلۡعَذَابُۚ
وَلَيَأۡتِيَنَّهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ٥٣ يَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِ
وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ٥٤ يَوۡمَ يَغۡشَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ
مِن فَوۡقِهِمۡ وَمِن تَحۡتِ أَرۡجُلِهِمۡ وَيَقُولُ ذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٥٥
يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ٥٦
كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ٥٧ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ غُرَفٗا تَجۡرِي
مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ نِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ٥٨ ٱلَّذِينَ
صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ٥٩ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٖ لَّا تَحۡمِلُ
رِزۡقَهَا ٱللَّهُ يَرۡزُقُهَا وَإِيَّاكُمۡۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٦٠ وَلَئِن
سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ
لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ٦١ ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ
عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ٦٢ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم
مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِ مَوۡتِهَا
لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ قُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ٦٣



﴿٥٣﴾ و ئەو لەزا ئیزایێ ل تە دکەن، و ئەگەر وەختێ
ئیزایا وان نەهاتبایە دانان [کو ڕۆژا قیامەتێیە]، دا
ئیزا بۆ وان ئێت، و ب سویند ژ نشکەکێڤە ئیزا دێ
بۆ وان ئێت، و وان های ژ خۆ نە. ﴿٥٤﴾ و ئەو لەزا
هاتنا ئیزایێ ل تە دکەن، و وێ ڕۆژێ دۆژەهـ دێ
دۆرماندۆرێت گاوران گریت. ﴿٥٥﴾ ڕۆژا ئیزا، د
سەر وانڕا و د بن وانڕا، وان دگریت، و خودێ دێ
بێژیتە وان: تامکەنە وێ یا هەوە دکر. ﴿٥٦﴾ گەلی
بەندەیێت من، ئەوێت هەوە باوەری ب من ئینایین
[ئەگەر هوین نەشێن د جهێ خۆدا، ب دورستی من
بپەرێسن]، ڤێجا ب ڕاستی ئەردێ من یێ فرەهە،
ڤێجا من ب تنێ بپەرێسن. ﴿٥٧﴾ هەمی کەس دێ
تامکەتە مرنێ [کەس ژێ قورتال نابیت]، پاشی هوین
دێ ب بال مەڤە زڤڕن. ﴿٥٨﴾ و ئەوێت باوەری ئینایین
و کار و کریارێت ڕاست و دورست کرین، ئەم دێ وان
د ژۆرێت بلندێت بەحەشتێدا، بەحەشتا ڕویبار دبنڕا
دچن ئاکنجی کەین، و هەر دێ تێدا مینن، و چ خۆش
خەلاتە خەلاتێ وان ئەوێت کار و کریارێت ڕاست و
دورست دکەن. ﴿٥٩﴾ ئەوێت بێنا خۆ فرەهـ کرین [ل سەر پەرستنا خودێ و ئەزیەتا گاوران، و نەخۆشییێت
ڕێکێ]، و پشتا خۆ ب خودێ گەرم کرین. ﴿٦٠﴾ و چەند جانەوەر یێت هەین [ژ لاوازییا خۆ] نەشێن ل
دویڤ ڕزقێ خۆ بگەڕن و بەرهەڤ بکەن، خودێ ڕزقێ وان و یێ هەوە ددەت، و ئەو (خودێ) گوهدێر و
زێدە زانایە [بەلێ ئەڤ جانەوەرێت لاواز هەرچەندە ب خۆ نەشێن ڕزقێ خۆ بەرهەڤ بکەن، د گەل هندێ
ژی ژ ڕزقێ خۆ ناترسن، ڤێجا بۆچی هوین وەکی وان نینن، و نە د لاوازن ژی]. ﴿٦١﴾ و ئەگەر تو پسیارا
وان بکەی، کێ ئەرد و ئەسمان چێ کرینە، و کێ ڕۆژ و هەیڤ سەرنەرم کرینە؟ [کو ل دویڤ بەرژەوەندییێت
بەندەیان، و ب ئاوایەکێ موکوم و بنەجهـ بێن و بچن] دێ بێژن: خودێ.. ڤێجا پا چاوا بەرێ وان ژ هەقی و
ڕاستییێ دئێتە وەرگێڕان؟. ﴿٦٢﴾ و خودێ بۆ هەر کەسێ بڤێت ژ بەندەیێت خۆ، ڕزقی بەرفرەهـ و بەرتەنگ
دکەت، ب ڕاستی خودێ ئاگەهـ ژ هەمی تشتان هەیە. ﴿٦٣﴾ و ئەگەر تو پسیارا وان بکەی، کێ باران ژ
عەوران ئینایییە خوارێ، و پشتی مرنا ئەردی و هشکبوونا وی، ئەرد شینکرییە؟ دێ بێژن: خودێ.. بێژە
هەمی پەسن و سوپاسی بۆ خودێ، بەلێ باراپتر ژ وان تێ ناگەهن، و ئەقلێ خۆ نادەنە شۆلی.

وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ
ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٦٤ فَإِذَا رَكِبُواْ فِي ٱلۡفُلۡكِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ
مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ إِذَا هُمۡ يُشۡرِكُونَ ٦٥
لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ وَلِيَتَمَتَّعُواْۚ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ٦٦
أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا جَعَلۡنَا حَرَمًا ءَامِنٗا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنۡ
حَوۡلِهِمۡۚ أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ وَبِنِعۡمَةِ ٱللَّهِ يَكۡفُرُونَ ٦٧
وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓۚ
أَلَيۡسَ فِي جَهَنَّمَ مَثۡوٗى لِّلۡكَٰفِرِينَ ٦٨ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ
فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩

سُورَةُ الرُّومِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ
بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ
مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٤
بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ٥

الحزب ٤١ ربع





﴿٦٤﴾ ئەڤ ژیانا دنیایێ ژ مژویلی و ترانەیان پێڤەتر نینە، و ژیانا ڕاست ژیانا ئاخرەتێیە [چونكی نە مرن تێدایە، و نە نەساخی و نە خەم و نە وەستیان..] ئەگەر بزانن. ﴿٦٥﴾ و وەختێ ئەو ل گەمیێ سویار دبن [و بێ هیڤی دبن كو ئێك وان ڕزگار بكەت، و پێل ژ هەمی ڕەخانڤە ب سەر واندا دئێن، ژ ترسان]، بەس دێ گازی خودێ ب تنێ كەن [و بوتێت وان دێ ژ بیرا وان چن]، ڤێجا گاڤا خودێ ئەو ڕزگاركرنە دێمی، دیسا دزڤرنەڤە سەر شركێ. ﴿٦٦﴾ بلا شوكور و سوپاسیا كەرەمێت مە د گەل وان كرین نەكەن، و بلا خۆشیان پێ ببەن، دێ [ئەو] دویماهیكا خۆ زانن [كا دێ چ ب سەرێ وان ئێت؟]. ﴿٦٧﴾ ما ئەو [مەخسەد خەلكێ مەكەهێ] نابینن، كا چاوا مە جهێ وان [مەكەهــ] كرییە جهەكی ب ڕێز و ڕویمەت و پیرۆز و پارستی و ئێمن، و خەلك دۆرماندۆری وان دئێنە قەپەچەكرن [دئێنە كوشتن، یان دكەنە كۆلە بۆ خۆ]، ڤێجا چاوا ئەو باوەریێ ب پویچییێ و بوتان دئینن، و كەرەم و نیعمەتێت خودێ نائینە بەر چاڤێت خۆ. ﴿٦٨﴾ ئەرێ ما كی ژ وی ستەمكارترە، ئەوێ ژ درەو ژ كیسێ خودێ باخڤیت، یان ژی كتێبا خودێ و پێغەمبەرێ وی پشتی بۆ هاتی، درەو بدانیت، ئەرێ ما بۆ گاور و خودێ نەناسان جهــد دۆژەهێدا نینە؟. ﴿٦٩﴾ و ئەوێت ژ دل جیهاد [دگەل نەفسا خۆ، و شەیتانی و نەیارێت دینی] ژ بۆ مە كری، ئەم دێ بەرێ وان دەینە ڕێكێت خۆ یێت خێرێ، ئەو ڕێكێت وان دگەهیننە ڕازیبوونا مە، و ب ڕاستی خودێ [ب پشتەڤانی و سەركەڤتن و هاریكاریا خۆ] یێ د گەل قەنجیكاران.

## سۆرەتا رووم

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٦٠) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ هۆسا دئێتە خواندن: (ئەلف، لام، میم) و ئەڤ ڕەنگە تیپە نیشانن ل سەر ئیعجازا قورئانێ. ﴿٢﴾ ڕۆم هاتە شكاندن [ب دەستێ فورسێ]. ﴿٣﴾ د نێزیكترین ئەردا [ژ مەكەهێ یان ژ فورسێ]، و ئەو پشتی شكەستنا خۆ دێ ب سەركەڤن. ﴿٤﴾ د چەند سالێت بێندا [ژ سێیان هەتا دەهان] و ئەمر و فەرمان هەر یێ خودێیە، بەری سەركەڤتنێ و پشتی سەركەڤتنێ ژی [چو تشت بێی خودێ چێ نابیت]. ﴿٥﴾ وێ ڕۆژێ [ڕۆژا سەركەڤتنا ڕۆمێ ل سەر فورسێ] دێ كەیفا خودان باوەران ئێت ب سەركەڤتن و هاریكاریا خودێ [چونكی سەركەڤتنا خودان كتێبان ل سەر ئاگرپەرێسان و سەركەڤتنا موسلمانان ل سەر قورەیشییان د بەدرێدا كەڤتنە د ڕۆژەكێدا]، یێ خودێ بڤێت دێ هاریكاریا وی كەت و ب سەرئێخیت، و هەر ئەوە یێ سەردەست و دلۆڤان.

وَعْدَ ٱللَّهِ ۖ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾
يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ
غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا
مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى
ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟
أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا۟ ٱلْأَرْضَ وَعَمَرُوهَآ أَكْثَرَ مِمَّا
عَمَرُوهَا وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ
لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ثُمَّ كَانَ
عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ ٱلسُّوٓأَىٰٓ أَن كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ بِهَا
يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾
وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبْلِسُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٢﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن
شُرَكَآئِهِمْ شُفَعَٰٓؤُا۟ وَكَانُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿١٣﴾
وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَهُمْ فِى رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ﴿١٥﴾





﴿٦﴾ [سەرکەڤتنا ڕۆمیٚ ل سەر فورسیٚ پشتی شکەستن ل سەر دەستیٚ فورسیٚ دیتی] سۆز و پەیمانا خودێیە، و خودیٚ ژ سۆز و پەیمانا خۆ لیٚڤەنابیت، بەلیٚ باراپتر ژ مرۆڤان ڤیٚ نوزانن. ﴿٧﴾ ئەو تشتیٚ سەرڤەسەرڤە و پیٚشچاڤ ژ ژیانا دنیاییٚ دزانن [ب تنیٚ تیٚرا هەوجەییا خۆ ژ دنیاییٚ دزانن]، و ئەو ژ ژیانا ئاخرەتیٚ [و خۆشییێت ویٚ] د بیٚ ئاگەهن [ژ بەر هندیٚ کاریٚ خۆ بۆ ئاخرەتیٚ ناکەن]. ﴿٨﴾ ئەریٚ ما وان هزرا خۆ د خۆدا نەکرییە، بزانن خودیٚ ئەرد و ئەسمان و هندی د ناڤبەرا واندا، نەداینە ئەگەر بۆ حیکمەتەکیٚ و وەختەکیٚ دیارکری [کو ڕۆژا قیامەتێیە] نەبیت، و گەلەك مرۆڤ باوەرییٚ ب ڕۆژا قیامەتیٚ نائینن. ﴿٩﴾ ئەریٚ ما ئەو د ئەردیدا نەگەڕیاینە، بەریٚ خۆ بدەنیٚ کا دویماهیا ئەوێت بەری وان یا چاوا بوو؟ ئەو ژ وان ب هێزتربوون و وان ئەرد پتر ڤەکۆلابوو و پتر ئاڤاکربوو، و پێغەمبەرێت وان ب نیشان و موعجیزەڤە بۆ وان هاتن [دگەل هندیٚ ژی باوەری پیٚ نەئینان، ئینا خودیٚ ڤەبراندن]، و خودیٚ نە ئەو بوو یێ نەهەقی و ستەمیٚ ل وان بکەت، بەلیٚ وان ب خۆ نەهەقی و ستەم ل خۆ دکر. ﴿١٠﴾ پاشی دویماهیکا وان ئەوێت خرابی کرین پیسترین دویماهیك بوو، چونکی وان نیشان و ئایەتێت خودیٚ [ئەوێت بۆ پێغەمبەران هاتین] درەو دانان و ترانە بۆ خۆ پیٚ دکرن. ﴿١١﴾ خودێیە جارا ئێکیٚ مرۆڤ چێکری، پاشی جارەکا دی پشتی مرنیٚ دیٚ ساخ کەتەڤە، پاشی دیٚ هەر ب بال ویڤە زڤڕن. ﴿١٢﴾ و ڕۆژا قیامەت ڕادبیت، گونەهکار بیٚ دەنگ و بیٚ هیڤی دبن. ﴿١٣﴾ و وان [ویٚ ڕۆژیٚ] چو مەهدەر و بەرەڤانی ژ وان ئەوێت وان بۆ خودیٚ کرینە هەڤپشك نینە، و ئەو [پشتی زانین، چو مفا ناگەهیتە وان] حاشاییٚ ل وان هەڤپشکان دکەن. ﴿١٤﴾ و ڕۆژا قیامەت ڕادبیت، ویٚ ڕۆژیٚ [خودان باوەر و گاور] ژێك جودا دبن [خودان باوەر دچنە بەحەشتیٚ، و گاور دچنە جەهنەمیٚ]. ﴿١٥﴾ و هندی ئەون ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت ڕاست و دورست کرین، ئەو د مێرگا بەحەشتێدا کەیف خۆش دبن.

وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلۡأٓخِرَةِ
فَأُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ ١٦ فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمۡسُونَ
وَحِينَ تُصۡبِحُونَ ١٧ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ
وَعَشِيّٗا وَحِينَ تُظۡهِرُونَ ١٨ يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ
ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ وَيُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ وَكَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ ١٩
وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٞ
تَنتَشِرُونَ ٢٠ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ
أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ
إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ٢١ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ
خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡۚ
إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡعَٰلِمِينَ ٢٢ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم
بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبۡتِغَآؤُكُم مِّن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ٢٣ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ
خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَيُحۡيِۦ بِهِ ٱلۡأَرۡضَ
بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ٢٤





﴿١٦﴾ و هندی ئەون ئەوێت گاور بووین، و نیشان
و ئایەتێت مە [ئانکو قورئان] و ڕۆژا قیامەتێ درەو
دانایین، ئەڤە د ئیزایێدا دێ ئێنە کۆمکرن [و ژێ
دەرناکەڤن]. ﴿١٧﴾ و هەر دەمێ ل هەوە دبیتە سپێدە
و ئێڤار، خودێ [ژ هەمی کێماسیان] پاقژ بکەن.
﴿١٨﴾ د ئەرد و ئەسماناندا و هەمی ئێڤاران، و هەر
دەمەکێ ل هەوە دبیتە نیڤرۆ، پەسن و شوکور هەر یێت
خودێنە. ﴿١٩﴾ خودێیە زێندی ژ مری ددەت و مری ژ
زێندی ددەت، و ئەردی پشتی هشکبوونا وی ساخ
دکەت، و هوین ژی هۆسا دێ [ژ گۆڕێت خۆ] ڕابنەڤە.
﴿٢٠﴾ و ژ نیشانێت مەزناتی و دەستهەلاتداریا وی، ئەوە
وی هوین ژ ئاخێ چێکرن [ئانکو بابێ هەوە ئادەم ژ
ئاخێ چێکر]، پاشی هوین بوونە گەلەك مرۆڤ [و ل
سەر ئەردی] بەلاڤبوون. ﴿٢١﴾ و ژ نیشانێت مەزناتی و
دەستهەلاتداریا وی، ئەوە وی هەر ژ هەوە [ژ گیانێ
هەوە] بۆ هەوە هەڤسەر چێکرن، دا سەبر و هەدارا
هەوە پێ بێت، و ل دەڤ ڤەهەسن و ڤیان و دلۆڤانی
ئێخستە د ناڤبەرا هەوەدا، ب ڕاستی ئەڤە [دان و چێکرنا
هەڤسەران هۆسا] نیشانێت ئاشکەرانە [ل سەر مەزناتی و دەستهەلاتداریا خودێ] بۆ وان ئەوێت هزرا خۆ
[تێدا] دکەن. ﴿٢٢﴾ و ژ نیشانێت مەزناتی و دەستهەلاتداریا وی، چێکرنا ئەرد و ئەسمانان و جودایی و
نەوەکهەڤیا زمان و ڕەنگێت هەوەیە، ب ڕاستی ئەڤە نیشانێت ئاشکەرانە [ل سەر مەزناتی و دەستهەلاتداریا
خودێ] بۆ مرۆڤێت زانا و تێگەهشتی. ﴿٢٣﴾ و ژ نیشانێت مەزناتی و دەستهەلاتداریا وی، نڤستنا هەوەیە د
شەڤ و ڕۆژاندا و بەرگەڕیان و داخوازکرنا هەوەیە بۆ ڕزقێ خودێ ب شەڤ و ڕۆژ، ب ڕاستی ئەڤە نیشان
و بەلگەیێت ئاشکەرانە [ل سەر مەزناتی و دەستهەلاتداریا خودێ] بۆ وان ئەوێت گوهدارییێ دکەن، دا تێ
بگەهن. ﴿٢٤﴾ و ژ نیشانێت مەزناتی و دەستهەلاتداریا وی، ئەوە برویسیان بۆ ترسێ و تەمایا بارانێ نیشا
هەوە ددەت و بارانێ ژ ئەوران دبارینیت، ڤێجا ئەردی پشتی هشکبوونا وی پێ ساخ دکەت و [شین دکەت]
ب ڕاستی ئەڤە نیشانێت ئاشکەرانە [ل سەر مەزناتی و دەستهەلاتداریا خودێ] بۆ وان ئەوێت ئەقلێ خۆ
ددەنە شۆلی و تێ دگەهن.

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦۚ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ
دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴿٢٥﴾ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿٢٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ
يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِۚ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا
مِّنْ أَنفُسِكُمْۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن
شُرَكَآءَ فِى مَا رَزَقْنَٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ
كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ
يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍۖ
فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقِمْ
وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًاۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَاۚ
لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ
نصف الحزب ٤١ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟
ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟
دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًاۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾



﴿٢٥﴾ و ژ نیشانێت مەزناتی و دەستهەلاتداریا وی، ئەوە ئەرد و ئەسمان [بێ ستوین] ب ئەمرێ وی راوەستاینە، پاشی ئەگەر [رۆژا قیامەتێ] جارەكێ ب تنێ گازی هەوە بكەت [كو ژ گۆران رابن]، ئێكسەر هوین هەمی دێ ژ گۆران رابن. ﴿٢٦﴾ و هندی د ئەرد و ئەسماناندا هەین [ژ ملیاكەت و مرۆڤ و ئەجنەیان] یێت خودێنە، و هەمی ل بەر فەرمانا وینە. ﴿٢٧﴾ و خودێ ئەوە یێ جارا ئێكێ مرۆڤ چێكری و دایی، پاشی دێ وان [پشتی مرنا وان] ساخكەتەڤە، و ئەڤە [زڤراندن و ساخكرنا وی پشتێ مرنێ] یا ب ساناهیترە [ژ چێكرنا جارا ئێكێ] و پەسن و سالۆخەتا ژ هەمییان بلندتر د ئەرد و ئەسماناندا یا ویـیە، و ئەوە سەردەست و كاربنەجهـ. ﴿٢٨﴾ هەر ژ هەوە ب خۆ، خودێ نموونەیەك بۆ هەوە دیاركر، ئەرێ كی ژ هەوە هەیە رازی بیت كۆلەیێ وی [كو ئەو ژی وەكی هەوە مرۆڤە، و هەوە ئەو نەدایییە] ببیتە هەڤپشكێ وی د وی رزقیدا یێ من دایییە هەوە، ڤێجا هوین هەردو [د وی رزقیدا] وەكی ئێك بن، و ئەڤە ببیتە ئەگەرا هندێ هوین وەسا ژ وان بترسن كا چاوا هوین ژ هەڤپشكێت خۆ یێت ئازاد دترسن [ڤێجا ئەگەر هوین قەبویل نەكەن كۆلەیێت هەوە ئەوێت وەكی هەوە مرۆڤ و هەوە نەدایین ببنە هەڤپشكێت هەوە، پا چاوا هوین چێكری و بەندەیێت خودێ بۆ خودێ دكەنە هەڤپشك]، و هۆسا ئەم نیشان و ئایەتێت خۆ رۆن و ئاشكەرا دكەین، بۆ وان ئەوێت ئەقلێ خۆ ددەنە شۆلی و تێ دگەهن. ﴿٢٩﴾ [نەخێر.. وان چو هەجەت و نیشان نینن، هەڤپشكان بۆ خودێ چێ بكەن] بەلێ ئەوێت ستەم كرین، ژ نەزانین ب دویڤ دلخوازییا خۆ كەفتن، ڤێجا كی دێ وی راستەرێ كەت ئەوێ خودێ گومراكری [و رێ ل بەر بەرزەكری]، و چو هاریكار ژی وان نابن [وان ژ ئیزایا خودێ بپارێزن]. ﴿٣٠﴾ [هەی موحەمەد] ڤێجا تو ب دورستی بەرێ خۆ بدە دینێ راست و دورست، و رویێ خۆ ژ هەمی هزروبیرێت نەدورست وەرگێرە، و بەرێ خۆ بدە ئیسلامێ، دینێ خودێیە، ئەوێ خودێ مرۆڤ ل سەر دایین. دایی و چێكرییێ خودێ گوهۆرین بۆ نینە، ئەڤەیە دینێ راست و دورست، بەلێ باراپتر ژ مرۆڤان ڤێ [راستییێ] نوزانن. ﴿٣١﴾ و هوین هەمی بەرێ خۆ بدەنە دینێ راست و دورست كو ئیسلامە، و ل خودێ بزڤرن و ژ وی بترسن، و نڤێژان ب رەنگێ پێدڤی بكەن، و ژ وان نەبن ئەوێت هەڤال و هەڤپشكان بۆ خودێ چێ دكەن. ﴿٣٢﴾ ژ وان [نەبن] ئەوێت دینێ خۆ پارچە پارچەكرین و ژێكڤەكرین و بووینە جوین جوین، و هەر جوینەك ب وێ شاییە ئەوا وان هەی.

وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرّٞ دَعَوۡاْ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيۡهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم
مِّنۡهُ رَحۡمَةً إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ ٣٣ لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ
ءَاتَيۡنَٰهُمۡۚ فَتَمَتَّعُواْ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ٣٤ أَمۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ
سُلۡطَٰنٗا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُواْ بِهِۦ يُشۡرِكُونَ ٣٥ وَإِذَآ أَذَقۡنَا
ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ فَرِحُواْ بِهَاۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ
إِذَا هُمۡ يَقۡنَطُونَ ٣٦ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ
وَيَقۡدِرُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٣٧ فَـَٔاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ
حَقَّهُۥ وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ
وَجۡهَ ٱللَّهِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٣٨ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن رِّبٗا
لِّيَرۡبُوَاْ فِيٓ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرۡبُواْ عِندَ ٱللَّهِۖ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن
زَكَوٰةٖ تُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُضۡعِفُونَ ٣٩
ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ ثُمَّ رَزَقَكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡۖ هَلۡ مِن
شُرَكَآئِكُم مَّن يَفۡعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَيۡءٖۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ
عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٤٠ ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ
أَيۡدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعۡضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ٤١



﴿٣٣﴾ و هەر وەختێ نەخۆشییەك بگەهیتە مرۆڤان، دوعا ژ خودایێ خۆ دكەن و ل وی دزڤرن [و تۆبە دكەن]، پاشی ئەگەر خودێ ژ نك خۆ دلۆڤانییەك دا وان [دوعایا وان قەبویل كر و ئەو ژ وێ نەخۆشییێ دەرئێخستن] دێ بینی دەستەكەك ژ وان پشتی ڤێ ژی هەڤپشكان بۆ خودایێ خۆ چێ دكەن. ﴿٣٤﴾ ڤێجا بلا ئەو كەرەمێت مە د گەل وان كرین ژ بیرا خۆ ببەن و سوپاسییا نیعمەتێت مە نەكەن و بلا خۆشییێ ببەن، نێ نێزیك ئەو دێ زانن [كا چ ئیزا ل دویڤ وان خۆشییێت بەروەخت دێ ئێت]. ﴿٣٥﴾ یان ژی مە نیشانەكا ب هێز [یان كتێبەك] بۆ وان هنارتییە، شادەییێ ل سەر وێ شركێ ددەت یا ئەو دكەن. ﴿٣٦﴾ و گاڤا مە كەرەمەك د گەل مرۆڤان كر پێ بەتران دبن، و كەیفخۆش دبن [كەیفخۆشییا سەرداچۆنێ نەیا سوپاسدارییێ]، و گاڤا نەخۆشییەكێ هەر ژ بەر وێ ئەوا وان كری، ئەو هنگاڤتن، وێ گاڤێ دێ بینی [ژ دلۆڤانییا خودێ] بێ هیڤی دبن. ﴿٣٧﴾ ما نابینن كو ب راستی خودێیە، یێ رزقی زێدە و كێم دكەت بۆ وی یێ بڤێت [ئانكو ئەوە ددەت و دبەت، ڤێجا گاڤا دایێ بلا د سەردا نەچیت، و هەر گاڤا ژێ ستاند بلا بێ هیڤی نەبیت]، ب راستی ئەڤە چامە و نیشانن بۆ وان ئەوێت خودان باوەر. ﴿٣٨﴾ ڤێجا هەقێ مرۆڤێت خۆ و بەلەنگاز و رێڤنگان [ژ خێرێ و مرۆڤینییێ] بدەیێ، ئەڤە [دانا هەقییێ] بۆ وان ئەوێت رازیبوونا خودێ دڤێن چێترە، و هەر ئەڤەنە یێت سەرفەراز. ﴿٣٩﴾ و ئەو مالێ هوین ب سەلەف ددەنە خەلكی، دا د مالێ خەلكیدا زێدەیی بچیتە سەر [و ب سەر بكەڤیت] خودێ بەرەكەتێ نائێخیتێ، و ئەو مالێ هوین ب ئنیەتا پاقژكرنا گونەهان ددەن، و ئنیەتا هەوە ژ دانا وی رازیبوونا خودێ بیت. ئەڤێت هۆسا مالی ددەن، ئەون ئەوێت خودێ خەلاتێ وان چەند قات ددەتێ. ﴿٤٠﴾ خودێیە یێ هوین دایین، پاشی رزقێ هەوە دا، پاشی دێ هەوە مرینیت، پاشی دێ هەوە ساخكەتەڤە، ئەرێ ئێك ژ بوتێت هەوە [ئەوێت هەوە كرینە هەڤپشك بۆ خودێ] هەیە تشتەكی ژ ڤان بكەت؟! خودێ یێ پاك و پاقژە ژ وێ شركا ئەو دكەن. ﴿٤١﴾ خرابی و نەخۆشی و تەنگاڤی ل گوند و باژێرێت سەر ئاڤێ و ل یێت نە ل سەر ئاڤێ، ئاشكرابوو ژ بەر گونەهێت مرۆڤان، دا تاما جزایێ هندەك ژ وان گونەهان نیشا وان بدەت، بەلكی تۆبە بكەن و ل خۆ بزڤرن.

قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلُ ۚ
كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ ﴿٤٢﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ ٱلْقَيِّمِ مِن
قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۖ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ ﴿٤٣﴾ مَن
كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ ﴿٤٤﴾
لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ مِن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ
ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ وَلِيُذِيقَكُم
مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَلِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ
تَشْكُرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم
بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ ۖ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ
ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ
فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ
خِلَـٰلِهِۦ ۖ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٨﴾
وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ لَمُبْلِسِينَ ﴿٤٩﴾
فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَـٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ
إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾



﴿٤٢﴾ [هەی موحەمەد] بێژە [گەلی خەلکێ مەکەهێ]:
د ئەردیدا هەڕن [و بگەڕن] بڕێننێ کا دویماهییا
ئەوێت بەری هەوە هاتین یا چاوا بوو، باراپتر ژ وان
هەڤپشك چێکەربوون. ﴿٤٣﴾ ڤێجا بەرێ خۆ بدە
دینێ ڕاست و دورست [کو ئیسلامە] بەری ڕۆژەك
بێت، دانەپاش بۆ نینە، وێ ڕۆژێ هەمی مرۆڤ دێ
ژێکڤەبن [هندەك دێ چنە بەحەشتێ، و هندەك دێ
چنە دۆژەهێ]. ﴿٤٤﴾ هەر کەسێ باوەرییێ نەئینیت
ئەو زیانێ ل خۆ دکەت، و هەر کەسێ کارەکێ باش
بکەت ڕێکێ بۆ خۆ خۆش دکەت. ﴿٤٥﴾ [وێ ڕۆژێ
خودێ مرۆڤان ژێکڤە دکەت] دا ئەوێت باوەری
ئینایین و کار و کریارێت قەنج کرین ژ کەرەما خۆ
وان خەلات بکەت، و ب ڕاستی خودێ حەژ گاوران
ناکەت. ﴿٤٦﴾ و ژ نیشانێت مەزناتی و دەستهەلاتدارییا
وی، ئەوە بایی ب مزگینی دهنێریت، دا ژ دلۆڤانییا خۆ
بارانێ بدەتە هەوە، و دا گەمی ب قودرەت و فەرمانا
وی ل سەر ئاڤێ بێن و بچن، و دا هوین بازرگانییێ
ب ڕێکا ئاڤێ بکەن، و دا هوین شوکور و سوپاسییا
خودێ بکەن. ﴿٤٧﴾ ب سویند [هەی موحەمەد] مە بەری تە پێغەمبەر ییێت بۆ ملەتێت وان هنارتین، ڤێجا
ئەو ب موعجیزە و نیشانێت ئاشکەراڤە [ل سەر ڕاست پێغەمبەراتییا خۆ] بۆ وان هاتن، [بەلێ وان باوەری
ب پێغەمبەرێت خۆ نەئینان و نەیارەتییا وان کرن]، ڤێجا مە تۆل ل گونەهکاران ڤەکر، و ب سەرئێخستن
و هاریکارییا خودان باوەران هەقە ل سەر مە. ﴿٤٨﴾ خودێیە ئەوێ بای دهنێریت [ڤێجا ئەو با] ئەوران
ڕادکەت و دبەت، چاوا بڤێت وەسا ل ئەسمانان بەلاڤ دکەت و دکەتە پرتی پرتی، ڤێجا تو دێ بینی باران
ژ وان ئەوران دەردکەڤیت، و گاڤا خودێ ئەو باران ب سەر هندەك بەندەییێت خۆ ییێت وی بڤێن باراند،
پێ کەیف خۆش دبن و دبشکورن. ﴿٤٩﴾ هەر چەندە ئەو [بەندە] بەری هاتنا وێ بارانێ، ژ هاتنا وێ د بێ
هیڤی بوون. ﴿٥٠﴾ ڤێجا [هەی موحەمەد] بەرێ خۆ بدە نیشانێت دلۆڤانییا خودێ [ئەوێت ب هاتنا بارانێڤە
گرێدایی، وەکی شینبوونا گل و گیایی و داروباری و هەمی ڕەنگێت فێقی، و ساخکرنا ئەردێ هشك و
مری] کا چاوا خودێ ئەردی پشتی هشك بوویی ساخ دکەت، ب ڕاستی ئەوێ ئەردی پشتی هشکبوون و
مرنا وی ساخ دکەت، ئەو دێ مرییان ساخکەتەڤە، و ئەو ل سەر هەمی تشتان خودان شیانە.

وَلَئِنۡ أَرۡسَلۡنَا رِيحٗا فَرَأَوۡهُ مُصۡفَرّٗا لَّظَلُّواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ يَكۡفُرُونَ ٥١
فَإِنَّكَ لَا تُسۡمِعُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَلَا تُسۡمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوۡاْ
مُدۡبِرِينَ ٥٢ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِ ٱلۡعُمۡيِ عَن ضَلَٰلَتِهِمۡۖ إِن تُسۡمِعُ إِلَّا
مَن يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسۡلِمُونَ ٥٣ ۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم
مِّن ضَعۡفٖ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ ضَعۡفٖ قُوَّةٗ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ
قُوَّةٖ ضَعۡفٗا وَشَيۡبَةٗۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡقَدِيرُ ٥٤
وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقۡسِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ مَا لَبِثُواْ غَيۡرَ
سَاعَةٖۚ كَذَٰلِكَ كَانُواْ يُؤۡفَكُونَ ٥٥ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ
ٱلۡعِلۡمَ وَٱلۡإِيمَٰنَ لَقَدۡ لَبِثۡتُمۡ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡبَعۡثِۖ
فَهَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡبَعۡثِ وَلَٰكِنَّكُمۡ كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٥٦ فَيَوۡمَئِذٖ
لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَعۡذِرَتُهُمۡ وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ ٥٧
وَلَقَدۡ ضَرَبۡنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٖۚ
وَلَئِن جِئۡتَهُم بِـَٔايَةٖ لَّيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا
مُبۡطِلُونَ ٥٨ كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ٥٩
فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ وَلَا يَسۡتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ٦٠

ثلاثة أرباع الحزب ٤١





﴿٥١﴾ ب سویند ئەگەر ئەم بایەكی [ب سەر چاندنا واندا] بهنێرین، ڤێجا [ئەو بـا ئێشەكێ بەرهنگاری چاندنا وان بكەت پشتی كەسك بوونێ، و زەر بكەت] و ئەو چاندنا خۆ زەر ببینن، دێ بینی پشتی ڤێ [زەربوونا چاندنا وان] دەڤ ب گازندەنە و شوكور و سوپاسیـیا نیعمەتا خودێ ناكەن و دێ كەرەمێت خودێ ژ بیركەن، هەروەكی خودێ چوجا كەرەم و نیعمەت د گەل وان نەكرین]. ﴿٥٢﴾ ڤێجا ب ڕاستی تو نەشێی وە ل مریـیان بكەی گول تە ببن [ئەڤ گاورە ژی ل ڕێزا مریانە، چونكی چو فام ناكەن]، و تو نەشێی گازیـیا خۆ ژی بگەهینیـیە كەڕان، ئەگەر چۆن و پشتا خۆ دانە تە. ﴿٥٣﴾ یێ خودێ كۆرە و گومڕاكری تو نەشێی ڕاستەڕێ بكەی، تو نەشێی گازیـیا خۆ ب گوهێ كەسێ بێخی كو تێ بگەهن، ئەو نەبن یێت باوەریـیێ ب نیشان و ئایەتێت مە دئینن، و ئەڤەنە خۆ سپارتینە خودێ و ل بەر فەرمانا وی ڕاوەستیایی. ﴿٥٤﴾ خودێ ئەوە یێ هوین ژ لاوازیـیێ [ئانكو ژ چپكەكا ئاڤێ] چێ كرین، و پشتی وێ لاوازیـیێ هوین ب هێز ئێخستن [مەخسەد هێزا تۆلازینیـیێ]، و پشتی ب هێزئێخستنا هەوە هوین لاواز و پیركرن، ئەوی چ بڤێت چێ دكەت و ئەو یێ زانا و خودان شیانە. ﴿٥٥﴾ و ڕۆژا قیامەت ڕادبیت گونەهكار دێ سویند خۆن، ئەو [د دنیایێدا] ژ بیستەكێ پێڤەتر نەماینە، [د دنیایێدا ژی] وەسا بەرێ خۆ ژ هەقیـیێ وەردگێڕان [و دگۆتن: هەما هەر ژیانا دنیایێیە، و چو ژیان پشتی مرنێ نینن]. ﴿٥٦﴾ و ئەوێت خودێ زانین و باوەری ب ڕزقێ وان كری، گۆتن: ب سویند هوین هند یێت مایین هندی خودێ بۆ هەوە نڤیسی هەتا ڕۆژا قیامەتێ، ئەها ئەڤەیە ڕۆژا قیامەتێ بەلێ هەوە نەدزانی [ئەو ڕۆژ هەر دێ ئێت]. ﴿٥٧﴾ ڤێجا وێ ڕۆژێ هەجەتگرتنا ستەمكاران فایدەی وان ناكەت، و نائێنە دەستویردان ژی هەجەتان بگرن، و داخواز ژی ژ وان نائێتەكرن خودایێ خۆ ژ نوی ب گۆتنەكێ یان كریارەكێ ڕازی بكەن. ﴿٥٨﴾ ب سویند د ڤێ قورئانێدا مە ژ هەمی نموونەیان [ئەوێت دبنە نیشان ل سەر ئێكتایـیا خودێ، و ڕاست پێغەمبەراتیـیا پێغەمبەرێ وی] بۆ مرۆڤان یێت دیاركرین و ئینایین، و ئەگەر تو موعجیزەیەكێ بۆ وان بینی [هەروەكی ئەو ژ تە دخوازن]، ئەوێت بێ باوەر دێ بێژن: ئەڤا هوین دبێژن ژ درەوێ پێڤەتر نینە. ﴿٥٩﴾ هۆسا خودێ دلێ چونەزانان تاری دكەت. ﴿٦٠﴾ ڤێجا سەبرا خۆ [ل سەر ئەزیەت و نەخۆشیـیا وان] بكێشە، ب ڕاستی پەیمانا خودێ یا ڕاستە [دێ تە ب سەرئێخیت، و دێ دینێ تە ب سەر هەمی دینان ئێخیت]، و بلا ئەوێت باوەری نەی تە سار نەكەن، ژ خۆڕاگرتن و سەبركێشانێ.

سُورَةُ لُقۡمَانَ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾ هُدٗى وَرَحۡمَةٗ
لِّلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم
بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٥﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ
لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ
عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسۡتَكۡبِرٗا
كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا كَأَنَّ فِيٓ أُذُنَيۡهِ وَقۡرٗاۖ فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٧﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾
خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٩﴾ خَلَقَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ
بِكُمۡ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٖۚ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَنۢبَتۡنَا
فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا
خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿١١﴾



## سۆرەتا لوقمان

**ل مەكەهێ هاتیـیە خوارێ (٣٤) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ هۆسا دئێتە خواندن (ئەلف، لام، میم) و ل دۆر ڕاڤەكرنا ڤان تیپان بزڤرە دەستپێكا سۆرەتا بەقەرە.
﴿٢﴾ ئەڤە ئایەتێت كتێبەكا ڕێك و پێك و موكومە.
﴿٣﴾ ڕێكا ڕاستەڕێیی و دلۆڤانییێیە بۆ قەنجیكاران [ئەوێت خودێ دپەرێسن هەروەكی دبینن، و ل وێ هزرێنە ئەگەر ئەو خودێ نەبینن خودێ وان هەر دبینیت]. ﴿٤﴾ [قەنجیكار] ئەون ئەوێت بەردەوام و ب ڕەنگێ پێدڤی نڤێژان دكەن، و زەكاتێ ددەن و ژ ئاخرەتێ بێ گۆمانن. ﴿٥﴾ ئەڤەنە ل سەر ڕاستەڕێییا خودایێ خۆ، و هەر ئەڤەنە یێت سەرفەراز. ﴿٦﴾ و هندەك مرۆڤ یێت هەین [مەخسەد پێ (نضرێ كوڕێ حارڤی)یە] ئاخڤتنێت پویچ و بێ تام دكڕین، دا ژ نەزانین ڕێكا خودێ ل بەر خەلكی بەرزەكەن [و وان ژ ئیسلامێ بدەنە پاش]، و دا بۆ خۆ ترانەیان ب ئایەتێت خودێ بكەن، و بۆ ئەڤێت هە ئیزایەكا هەتكبەر یا هەی. ﴿٧﴾ و ئەڤێ ژ ڤان مرۆڤان، گاڤا ئایەتێت مە بۆ دهاتنە خواندن ژ مەزناتی پشتا خۆ ددایێ و دچۆ هەچكو نەبهیستین، هەروەكی ژ هەردو گوهێت خۆ یێ كەڕ و گران، ڤێجا مزگینیا ئیزایەكا ب ژان و دژوار بدە وی. ﴿٨﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ئینایین و كار و كریارێت ڕاست و دورست كرین، بەحەشتێت تێر خێر و بێر بۆ وانە. ﴿٩﴾ و هەروهەر دێ تێدا مینن، و ئەڤە پەیمانەكا هەقە ژ دەڤ خودێ، و ئەوە یێ سەردەست و كاربنەجهـ. ﴿١٠﴾ وەكی هوین دبینن ئەسمان بێ ستوین یێت چێ كرین، و چیایێت مەزن و بنەجهـ یێت ئێخستینە د ئەردیدا دا ئەرد هەوە نەهەژینیت، و ژ هەمی ڕەنگان جانەوەر تێدا بەلاڤكرن، و مە ئاڤەك (بارانەك) ژ ئەسمانی (ژ ئەوران) داڕێت، مە پێ ژ هەمی ڕەنگێت جوان و پڕ مفا شینكاتی د ئەردیدا دا و شینكر. ﴿١١﴾ ئەڤەیە دان و چێكرنا خودێ، ڤێجا كا بێژنە من ئەڤێت هوین شوینا خودێ دپەرێسن، چ دایییە و چ چێ كرییە؟ [نەخێر وان چو نەدایییە و چو چێ نەكرییە] بەلێ ستەمكار یێت د گومڕاییەكا ئاشكەرادا.

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا
يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَ
لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ
لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ
وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ
إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ
لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ
وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم
بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ يَٰبُنَىَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ
خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ
بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ
بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ
مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ
مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ
وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾



﴿١٢﴾ و ب سویند مە ئەقل و تێگەهشتن و زانین
و حیکمەت دابوو لوقمانی [و مە گۆتێ] شوکور
و سوپاسیا خودێ بکە، و هەر کەسێ سوپاسیا
خودێ بکەت، ب ڕاستی ئەو بەس یێ بۆ خۆ
[شوکورا خودێ] دکەت، و هەر کەسێ سوپاسیا
نیعمەتێت وی نەکەت [خودێ منەت ب سوپاسیا
وی نینە]، و خودێ یێ دەولەمەندە و هێژایی پەسن
و سوپاسییێیە. ﴿١٣﴾ و چیرۆکا لوقمانی بۆ وان
بێژە: وەختێ کوڕێ خۆ شیرەت کری و گۆتیێ:
کوڕێ من چو هەڤپشکان بۆ خودێ چێ نەکە، ب
ڕاستی هەڤپشک پەرێسی [شرك] ستەمەکا مەزنە.
﴿١٤﴾ و مە ئەمرێ مرۆڤان کر د گەل دەیبابێت خۆ د باش
بن نەخاسمە [دگەل] دەیکێ، نەخۆشی و بێ تاقەتی ل
دویڤ نەخۆشی و بێ تاقەتیێ پێ برن دەمێ د زکیدا،
و دو سالان ل سەرێك شیر دایێ ژ نوی ژ شیرڤەکر، و
مە گۆتێ: سوپاسیا من بکە من تو دایی، و شوکور
و سوپاسیا دەیبابێت خۆ بکە تو خودانکری، و
هوین هەر دێ ب بال منڤە زڤرن. ﴿١٥﴾ و ئەگەر
دەیبابێت تە مانە ب تەڤە، تە د بەر هندێرا بکەن تو تشتەکی بۆ من بکەیە هەڤپشك تو چو ژێ نەزانی، گوهێ
خۆ نەدە وان، و د دنیایێدا ب قەنجی و باشی د گەل وان ببۆرینە [خۆ ژ وان دویر نەئێخە، و یێ باش بە د
گەل وان، بەس گوهدارییا وان د شرکێدا نەکە]، و [و ددینێ خودا هەکە نە یێت موسلمان بن، د دنیایێدا
د گەل یێ باشبە بەلێ ڕێکا وان و دینێ وان نە گرە و] ڕێکا وی (دینێ وی) بگرە یێ بەرێ خۆ داییە
من [بۆ تۆبەکرن و دلبێشییێ]، پاشی دێ هەر ب بال منڤە زڤرن، [تۆ و دەیبابێت تە و ئەو] ڤێجا [هنگی]
یا هەوە کری دێ بۆ هەوە بێژم [و هەوە پێ ئاگەهدارکەم]. ﴿١٦﴾ کوڕێ من گونەه و خرابی ئەگەر [چەندا
بچویك بیت] تەمەتی دندکا تۆڤێ خەندەلکێ بیت، و د ناڤ کەڤرەکیدا بیت، یان ژی ل هەر جهەکێ بیت ژ
ئەرد و ئەسمانان، خودێ دێ هەر ئینیت، ب ڕاستی خودێ یێ هویربین و شارەزایە. ﴿١٧﴾ کوڕێ من نڤێژان
ب ڕەنگێ پێدڤی بکە، و داخوازا کرنا باشییێ بکە و داخوازا دانەپاشا خرابییێ و گونەهێ بکە، و سەبری
ل سەر نەخۆشییا دگەهیتە تە بکێشە، ب ڕاستی ئەڤە [پارستنا نڤێژێ، و داخوازکرنا باشییێ، و دانەپاشا
خرابییێ، و سەبرکێشان ل سەر نەخۆشییان] ژ وان کارانە ئەوێت دڤێت مرۆڤ ل سەر یێ هشیار و ڕژد
بیت. ﴿١٨﴾ [کوڕێ من] ژ مەزناتی ڕوییێ خۆ ژ خەلکی وەرنەگێرە، و قەبە و دفن بلند ب ڕێڤە نەچە، ب
ڕاستی خودێ حەژ وان ناکەت ئەوێت قەبە و دفن بلند و زێدە ب خۆ شاهی. ﴿١٩﴾ [کوڕێ من] د ڕێڤەچۆنا
خۆدا یێ ناڤنجی بە [نە هێدی هێدی و نە حێل، و نە ب مەزناتی و نە مریچۆك] و دەنگێ خۆ نزم بکە و زڕ
نەکە، ب ڕاستی دەنگێ ژ هەمییان نەخۆشتر زڕینا کەرانە [ئەگەر دەنگ بلندی جوانی بایە چو دەنگ ژ یێ
کەری د بلندتر نینن].

أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ
عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ۗ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ
بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُوا۟
مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۚ أَوَلَوْ كَانَ
ٱلشَّيْطَٰنُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٢١﴾ ۞ وَمَن يُسْلِمْ
وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ۗ
وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُۥٓ ۚ إِلَيْنَا
مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٣﴾
نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٢٤﴾
وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ
ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ
مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ
مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾ مَّا خَلْقُكُمْ
وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٨﴾

الحِزْب ٤٢





﴿٢٠﴾ مـا هویـن نابینن خـودێ هندی د ئەرد و ئەسمانان‌دا
یـێ بۆ هەوە سـەرنەرم و بەردەسـت کـری، و کەرەمێت
خـۆ یـێت ئاشـکەرا [وەکـی ئیسلامەتیـێ... هتـد] و
نەئاشـکەرا [وەکـی ئەقـل و زانـین و تێگەهشـتنێ... و
هتـد] ل سـەر هـەوە یـێت بەرفرەهــ کریـن، و د گـەل
هنـدێ ژی هنـدەك مـرۆڤ یـێت هەیـن بـێ زانـین و
بـێ ڕاستەڕێییـیەك و بـێ کتێبـەکا ڕۆنکـەر، جرەبڕێ
د دەرهەقـێ خودێـدا دکـەن. ﴿٢١﴾ و گاڤـا موسـلمانان
دگۆتـە وان: ل دویـڤ وێ بکەڤـن یـا خـودێ ئینایـیـە
خـوارێ دگۆتـن: نەخـێر ئـەم دێ ب دویـڤ وێ کەڤـین
ئـەوا مـە بـاب و باپیرێـت خـۆ ل سـەر دیتـی. [ئـەرێ
ئـەو هـەر دێ ل دویـڤ وان چـن خـۆ ئەگـەر د خەلـەت
ژی بـن] و شـەیتان بـەرێ وان بدەتـە ئاگـرێ دۆژەهـێ
ژی؟! ﴿٢٢﴾ و هـەر کەسـێ خـۆ بسـپێریتە خـودێ و ل
بـەر فەرمانـا وی یـێ ڕاوەستیای بیـت [شـۆل بنەجهـ
بیـت]، و ئـەو ب خۆ ژی یـێ قەنجیکار بیـت، ئەڤە وی
خـۆ ب چنبلـێ (قولپـا) ژ هەمیـیان موکومترڤـە گـرت
[ئانکـو ڕێـکا سەرفرازیـیێ، و ترس ب دویڤـە نینە]، و
دویماهیـکا هەمـی کاروبـاران هـەر ب بـال خودێڤەیـە. ﴿٢٣﴾ و هـەر کەسـێ گـاور ببیت ڤێجـا بلا گاوریـیا وی
تـە ب خـەم نەئێخیـت [چونکـی تـە ئەوا ل سـەر خۆ ڕاکـر، تە گازیـیا خـۆ گەهانـدە وان]، زڤڕینا وان هەمیـیان
ب بـال مەڤەیـە، ڤێجـا تشـتێ وان کـری ئـەم دێ بـۆ وان بێژیـن [پـێ جزا و خـەلات کەیـن]، ب ڕاسـتی خودێ
دزانیـت کا چ د دلاندایـە و پـێ ئاگەهـە. ﴿٢٤﴾ [د دنیایـێدا] ئـەم دێ وان هێلین پیچەکێ خۆشییـێ ببەن، پاشـی
[ڕۆژا قیامەتـێ] دێ وان نەچارکەیـن بکەڤنـە د ئیزایـەکا دژوار و گرانـدا. ﴿٢٥﴾ و ئەگـەر تـو پسـیارا وان بکـەی
کـێ ئـەرد و ئەسمـان دایـینە؟ دێ بێژن: خودێ.. بێژە هەمی پەسـن و شـوکور بۆ خودێ [ل سـەر ڤـێ هەقاندنا
هـەوە د ڕاسـتا خودێـدا، و پەسـەندکرنا هـەوە خودایـێ ئـەرد و عەسمـانان خودێیە و ل سـەر ئاشـکراکرنا هەوە
ئـەو هێژایـی پەرستنێـیە و یـا هویـن ل سـەر یـا خەلەتـە و نـە یـا دورسـتە پـا چـاوا هویـن ئێکـێ دی ژ بـلی وی
دپەرێسـن و دکەنـە شریـك]، بەلێ باراپتر ژ وان نوزانن [کا مەخسـەدا ڤـێ هەقاندنێ چیـە؟]. ﴿٢٦﴾ هندی د ئەرد
و ئەسمـانان‌دا هـەی یـێ خودێیە، ب ڕاسـتی خودێ یـێ دەولەمەنـدە و هێژایـی شـوکوراندنێیە. ﴿٢٧﴾ و ئەگەر
هـەر دارەکا د ئەردیـدا هـەی قەلەم و خامـە بن، و دەریایـێت هەین حەفت دەریایـێت دی ژی بێنە سـەر و هەمی
حوبـر بـن [و ب وان قەلـەم و خامەیـان و ب وی حوبـری ئاخڤتـن و پەیڤێـت خـودێ بێنە نڤێسـین] هـەر زانین و
ئاخڤتـن و پەیڤێت خودێ ب دویمـاهی نائێن، ب ڕاسـتی خودێ یـێ سەردەسـت و کاربنەجهـە. ﴿٢٨﴾ چێکرنا
هـەوە [ل دەسـتپێکێ] و سـاخکرنا هـەوە ژ گۆڕان [پشـتی مرنـێ] وەکـی [دان و چێکرنا] مرۆڤەکـی ب تنێیە، ب
ڕاسـتی خـودێ یـێ گوهدێـر و بینەرە.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ
فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِىٓ إِلَىٰٓ
أَجَلٍ مُّسَمًّى وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٩﴾
ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ
ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ
تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ إِنَّ
فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ
كَٱلظُّلَلِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ
فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْا۟ يَوْمًا لَّا يَجْزِى وَالِدٌ
عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ
حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ
ٱلْغَرُورُ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ
وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا
وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾



﴿٢٩﴾ مـا تـو نابینی خودێ شـەڤێ دکەتە د نـاڤ ڕۆژێدا،
و ڕۆژێ دکەتـە د نـاڤ شـەڤێدا [هـەردووکان ب ڤـێ
چەنـدێ کـورت و درێژ دکـەت]، و ڕۆژ و هەیڤ یـێت
بـۆ هـەوە خزمـەت خـۆش کریـن [یـێت ئێخسـتینە د
خزمەتـا هـەوەدا] هـەر ئێـك هەتـا وەختەکـێ دیارکـری
دێ ئێـت و چیـت، و تشـتێ هویـن دکەن خـودێ ژێ ب
ئاگەهـە. ﴿٣٠﴾ خـودێ ڤێ دکەت دا هویـن بزانن خودێ
یـێ هەقـە و ئەوێت شـوینا وی دئێنە پەرسـتن د پویچ و
بەتالـن، و خودێیە یـێ بلنـد و مەزن. ﴿٣١﴾ مـا تو نابینی
گەمـی ژ کـەرەم و دلۆڤانیـیا خـودێ د دەریایـێدا دئێت
و دچیـت، دا خـودێ نیشـانێت دەستهەلاتداریـیا خـۆ
نیشـا هـەوە بـدەت، ب ڕاسـتی ئەڤـە چامـە و نیشـانن
بـۆ وان ئەوێـت زێـدە بێنفرەهـــ و زێـدە شـوکوردار.
﴿٣٢﴾ گاڤـا پێلـەکا ئاڤـا دەریایـێ وەکـی ئـەوران یـان
وەکـی چیایـان ب سـەر وانـدا گـرت، ژ دل بـەس دێ
دوعایـێ ژ خـودێ ب تنـێ کـەن، ڤێجـا گاڤـا خـودێ
قورتالکـرن و گەهاندنـە ئـەردێ دێم، دێ بینـی هندەك ژ
وان نیڤ نیڤەنە [هندەك ب دورسـتی سوپاسـیا خودێ
ناکـەن، و هنـدەك د بنڕا سوپاسـیا خودێ ناکـەن و نیعمەتێت خودێ نائیننـە بەرچاڤێت خۆ] کەس نیشـانێت مە
درەو نادانیـت و ئینـکار ناکـەت زێدە پەیمان شـکێن و زێدە گـاور نەبن. ﴿٣٣﴾ گـەلی مرۆڤان پارێزگاریـیا خودێ
بکـەن، و ژ ڕۆژەکـێ بترسـن [کـو ڕۆژا قیامەتێیـە] نـە باب شـوینا عەیـالی و نە عەیـال شـوینا بابێ دئێتـە جزاکرن
[بـاب و زاڕۆك چـو مفایـی ناگەهیننـە ئێـك]، ب ڕاسـتی پەیمانـا خودێ دایـی یا ڕاستە [و دێ هەر وەسـا ئێت]،
ڤێجـا بـلا ژیانـا دنیایـێ هـەوە نەخاپینیت، و هـەوە د سـەردا نەبەت، و بـلا شـەیتان ژی هەوە ب کەرەمـا خودێ
نەخاپینیـت [کـو هویـن گونەهان بکەن و بێـژن کەرەما خودێ یـا مەزنە و تۆبـە نەکەن]. ﴿٣٤﴾ ب ڕاسـتی خودێ
دزانیـت کا قیامـەت کەنگـی دێ ئێـت، و ئـەوە بارانـێ دبارینیـت، و دزانیـت کا چ د مالبچویکاندایە [بـەری ببیتە
مـرۆڤ]، و کـەس نوزانیـت کا سـوبەهی چ دێ ئێتـە سـەری، و کـەس نوزانیت کا ل کـیرێ و ل کیڤـە دێ مریت،
ب ڕاسـتی خـودێ زانا و شـارەزایە.

سُورَةُ السَّجْدَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢
أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۚ بَلۡ هُوَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أَتَىٰهُم
مِّن نَّذِيرٖ مِّن قَبۡلِكَ لَعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ ٣ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى
ٱلۡعَرۡشِۖ مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيّٖ وَلَا شَفِيعٍۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ٤
يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ يَعۡرُجُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ
مِقۡدَارُهُۥٓ أَلۡفَ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ ٥ ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ
ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ٦ ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥۖ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَٰنِ
مِن طِينٖ ٧ ثُمَّ جَعَلَ نَسۡلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ ٨
ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ
وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ٩ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ
أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدِۢۚ بَلۡ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ كَٰفِرُونَ ١٠ ۞ قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم
مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ تُرۡجَعُونَ ١١

ربع الحزب ٤٢



## سۆرەتا سەجدە

**ل مەکەهێ هاتیـیە خوارێ (٣٠) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ هۆسا دئێتـە خوانـدن (ئەلـف، لام، میـم)، ل دۆر
راڤەکرنـا ڤـان ڕەنگـە تیپـان بزڤـرە دەسـتپێکا سـۆرەتا
بەقـەرە. ﴿٢﴾ هنارتـن و ئینانەخـوارا ڤـێ قورئانێ گۆمان
تێـدا نینـە ژ دەڤ خودانـێ هەمـی جیهانانـە. ﴿٣﴾ یـان
ژی دبێـژن [موحەمـەد]: ئـەڤ قورئانـە ژ نـك خـۆ چـێ
کریـیە [وی یـا دانایـی، و ب بـال خودێڤـە لـێ ددەت]،
نەخێر وەسـا نینە وەکـی ئـەو دبێژن، بەلـێ ئەو ڕاستیـیە
ژ نـك خودایـێ تـە، دا تـو ملەتەکـی پـێ هشـیار بکـەی
و بترسـینی، کـو بـەری تـە چـو پێغەمبـەر بـۆ نەهاتینـە دا
ڕاسـتەڕێ ببـن. ﴿٤﴾ خودێیـە، ئـەوی ئـەرد و ئەسـمـان
و هنـدی د ناڤبـەرا وانـدا د شـەش ڕۆژانـدا یـێـت چـێ
کریـن، پاشـی بلندبـوو سـەر عەرشـی [بلندبوونـەکا بێ
چاوایـی و هێژایـی وی]، و هـەوە ژ غەیـری خـودێ چو
هاریـکار و بەرەڤـان و مەهدەرچـی نینـن، ڤێجـا مـا هویـن پێڤەناچن و چامـان وەرناگـرن. ﴿٥﴾ ئەو (خـودێ) ژ
ئەسمـانی کاروبـارێ ئـەردی [هەتـا ڕۆژا قیامەتـێ] ب ڕێڤە دبەت. پاشـی ئەڤ کاروبـارە د ڕۆژەکێـدا [کو ڕۆژا
قیامەتیـیە] دێ بلندبنـە دەڤ وی، درێژاهیـیا وێ ڕۆژێ ب هەژمارا هەوە هزار سـالێت هەوەنە. ﴿٦﴾ ئەڤە [ئەوێ
ئـەرد و ئەسمـان و هنـدی د ناڤبـەرا وانـدا دایـین، و ئـەوێ کاروبارێـت دنیایـێ بەس د دەسـت ویدا] زانایـێ
نهێنـی و ئاشـکەرایانە، سەردەسـت و دلۆڤانـە. ﴿٧﴾ ئـەوە یـێ دان و چێکرنـا هەمـی تشـتان موکـوم و بنەجهـ و
بـاش چێکـری، و ژ تـەقنێ [جـارا ئـێکێ] دەسـت ب چێکرنـا مرۆڤان [مەخسـەد پـێ ئادەمـە، بابێ مرۆڤان]
کـر. ﴿٨﴾ پاشـی دویندەهـا وی ژ چیـکا ئاڤـەکا کێم بها چێ کر. ﴿٩﴾ پاشـی دورسـتکر و ڕوح دایـێ، و گوهـ و
چـاڤ و ئەقـل دانـە هەوە، و کێـم ژ هەوە هەنە سوپاسـی و شـوکورا خودێ بکەن، یـان ژی هوین کێم شـوکور و
سوپاسیـیا خـودێ دکـەن. ﴿١٠﴾ و [ئەوێـت بـاوەری ب ڕۆژا قیامەتـێ نەیی] گۆتن: ئـەرێ ئەگەر ئـەم د ئەردیدا
بـەرزە بوویـین [و بوویـینە ئـاخ]، ئەرێ جارەکا دی سـەر ژ نوی ئـەم دێ ئێینـە چێکرن و سـاخکرن؟! بەلێ ئەو
باوەریـیێ ب ڕۆژا قیامەتـێ نائینـن [لـەو ڤێ دبێـژن]. ﴿١١﴾ [هەی موحەمەد] بێـژە بەلێ ئەو ملیاکەتێ بۆ سـتاندنا
ڕوحـا هـەوە هاتیـیە دانـان دێ ڕوحـا هـەوە ستینیت، پاشـی هویـن دێ ب بال خودایـێ خۆڤـە زڤڕن.

وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ
رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴿١٢﴾
وَلَوْ شِئْنَا لَءَاتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ
ٱلْقَوْلُ مِنِّى لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٣﴾
فَذُوقُوا۟ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمْ ۖ
وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا يُؤْمِنُ
بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ
رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ
عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ
يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ
جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا ۚ
لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ
جَنَّٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُوا۟
فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَآ أُعِيدُوا۟ فِيهَا
وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾

سجدة





﴿١٢﴾ [هەی موحەمەد] ئەگەر تە گونەهکار وەختێ سەرێ وان یێ شۆر و چەمیایی، ل دەڤ خودایێ وان دیتبانە [دا عەجێبیان بینی]، [دبێژن]: خودێوۆ مە دیت و مە گولێ بوو [ژڤانێ تە دایی مە دیت و ڕاستیا پێغەمبەرێ تە مە گولێبوو]، ڤێجا تو مە بزڤڕینەڤە [دنیایێ] ئەم دێ کار و کریارێت باش کەین [هەروەکی تە ئەمرێ مە پێ کری]، ب ڕاستی ئەم پشتڕاست بووین و گۆمان ل دەڤ مە نەما [کو موحەمەد ڕاست پێغەمبەرە، و قیامەت ژی یا ڕاستە]. ﴿١٣﴾ و ئەگەر مە ڤیابایە، دا [ب خورتی] هەمی مرۆڤان ڕاستەرێ کەین [بەلێ مە دڤێت ئەو ب کەیفا خۆ ڕێکا ڕاست بگرن]، بەلێ سۆز و پەیمانا من دایی ب جهێ خۆیە، دێ جەهنەمێ ژ ئەجنە و مرۆڤان تژی کەم. ﴿١٤﴾ دێ تامکەنە [ئێزایا جەهنەمێ] ژ بەر ژ بیرکرنا هەوە بۆ دیتنا ڤێ ڕۆژێ، ئەم ژی ب ڕاستی دێ هەوە هێلینە د ڤێ ئێزایێدا، دێ ڤێجا تامکەنە ئێزایا بەردەوام ژ بەر وان کار و کریارێت هەوە [د دنیایێدا] دکرن. ﴿١٥﴾ ب ڕاستی، ئەو باوەرییێ ب ئایەتێت مە دئینن و بۆ خۆ مفایی ژێ وەردگرن، ئەوێت ئەگەر پێ دئێنە شیرەتکرن دکەڤن (دادچەمیێن)، و ب گریڤە دچنە سوجدەیێ، و خودێ ژ هەمی کێماسیان پاك و پاقژ دکەن و حەمد و سوپاسیا وی دکەن، و خۆ [ل سەر پەرستنا وی] مەزن ناکەن. ﴿١٦﴾ قەوی تەنشتێت وان ناکەڤنە سەر نڤینان [ئانکو کێم دنڤن، و ڕادبن شەڤنڤێژان دکەن]، و ب ترس و هیڤیڤە دوعایان ژ خودێ دکەن، و ڕزقێ مە داییە وان خێر و سەدەقەیان ژێ ددەن. ﴿١٧﴾ کەس نوزانیت چ خەلات یێ بۆ وان هاتییە ڤەشارتن، چاڤێت وان پێ ڕۆن ببن و ب دیتنا وی شاد ببن، ژ بەر وان کار و کریارێت وان دکرن. ﴿١٨﴾ ڤێجا ئەرێ ئەوێ خودان باوەر بیت، وەکی وییە ئەوێ ژ ڕێکا ڕاست دەرکەڤتی..؟ نەخێر، نەوەکی ئێکن. ﴿١٩﴾ هندی ئەون ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت ڕاست و دورست کرین، جهێ وان بەحەشتێت خۆجهیێنە، ئەڤە قەدرگرتنە بۆ وان ژ بەر وان کار و کریارێت ئەوان [د دنیایێدا] دکرن. ﴿٢٠﴾ و هندی ئەون ئەوێت ژ ڕێکا ڕاست دەرکەڤتین جهێ وان ئاگرە، هەر گاڤا ڤیان ژ ئاگری دەرکەڤن [وەختێ گوڕیا ئاگری وان بلند دکەت و ب سەردئێخیت، جارەکا دی ئاگر ب خۆ وان ب بن خۆ دئێخیتەڤە]، جارەکا دی بۆ ناڤ ئاگری دێ ئێنە زڤڕاندن [ڤێجا دەرگەهڤانێت جەهنەمێ] دێ بێژنێ: دێ تامکەنە ئێزایا ئاگرێ هەوە درەو ددانا.

وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ
لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ
رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ ۚ إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾
وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ
مِّن لِّقَآئِهِۦ ۖ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٣﴾
وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ ۖ
وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ
يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٢٥﴾ أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ
كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ
فِى مَسَٰكِنِهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَٰتٍ ۖ أَفَلَا يَسْمَعُونَ ﴿٢٦﴾
أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا نَسُوقُ ٱلْمَآءَ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِۦ
زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَٰمُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ ۖ أَفَلَا يُبْصِرُونَ ﴿٢٧﴾
وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْفَتْحُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٨﴾
قُلْ يَوْمَ ٱلْفَتْحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِيمَٰنُهُمْ وَلَا هُمْ
يُنظَرُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَٱنتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴿٣٠﴾





﴿٢١﴾ بێ گۆمان ئەم ئیزایا دنیایێ بەری ئیزایا مەزنتر
[یا قیامەتێ] دێ دەینە بەر وان، دا ئەو ل خۆ بزڤڕن.
﴿٢٢﴾ و ما كی ژ وی ستەمكارترە ئەوێ ب ئایەتێت
خودایێ خۆ بێتە شیرەتكرن، پاشی پشتا خۆ بدەتێ،
بێ گۆمان ئەم دێ تۆلێ ژ گونەهكاران ڤەكەین.
﴿٢٣﴾ ب سویند مە تەورات دا مووسایی، ڤێجا تو
[هەی موحەمەد] د ڕاستا وێدا دودل نەبە كو مە یا
داییێ، و مە یا كریيە ڕاستەڕێیی بۆ ئسرائیلیيان.
﴿٢٤﴾ و مە هندەك ژ وان كرنە پێشی و جهێ
چاڤلێكرنێ، ب ئەمرێ مە ڕاستەڕێكرن دكر، وەختێ
وان سەبر كێشایی [ل سەر پەرستنێ و ل سەر
ئەزیەتێت د ڕێكا خودێدا گەهشتینێ]، و ژ دل باوەری
ب ئایەتێت مە ئینایی. ﴿٢٥﴾ ب ڕاستی خودایێ
تە ڕۆژا قیامەتێ، دێ حوكمی د ناڤبەرا واندا كەت
[ئانكو د ناڤبەرا موسلمان و گاوراندا، یان پێغەمبەران
و ملەتێت واندا] ل سەر وی تشتی، یێ ئەو تێدا نە
ئێك و ژێك جودا. ﴿٢٦﴾ ئەرێ ما قڕكرن و ڤەبراندنا
خەلكێ چەرخێت بەری وان [وەكی عاد و (سەموود)
و ..هتد] ئەوێت د مالێت خۆدا [ب كەیف و شاهی] دهاتن و دچۆن، بۆ وان ڕاستی دیار نەكر؟ ئەڤە [قڕكرن
و ڤەبراندنا وان هەمییان] نیشانن ل سەر سەردەستی و دەستهەلاتداریيا مە، ڤێجا ما گوهێت خۆ ڤەناكەن؟!.
﴿٢٧﴾ ئەرێ ما ئەو نابینن ئەم بەرێ بارانێ ددەینە ئەردێ هشك و بێ شینكاتی، و چاندنێ پێ دەردئێخین،
تەرشێت وان و ئەو ب خۆ ژێ ژێ دخۆن، ڤێجا ما نابینن [و بزانن ئەوێ ئەردێ هشك ساخكری، دشێت
وان ژی پشتی مرنێ ساخكەتەڤە]. ﴿٢٨﴾ و دبێژن كا كەنگی ئەو حوكوم د ناڤبەرا مە و هەوەدا دێ ئێتەكرن
[ئانكو كەنگی دێ ڕۆژا قیامەتێ ئێت]، ئەگەر هوین ڕاست دبێژن. ﴿٢٩﴾ بێژە: ڕۆژا قیامەتێ فایدەی گاوران
ناكەت ژ نوی باوەرییێ بینن و دەرفەت ژی بۆ وان نائێتە دان، ژ نوی تۆبە بكەن و ل خۆ بزڤڕن. ﴿٣٠﴾ ڤێجا
ژ وان بگەڕە و خۆ بگرە [كا دێ چ ئیزا ئێتە سەرێ وان]، و ب ڕاستی ئەو ژی یێ خۆ دگرن [كا دێ چ ب
سەرێ هەوە ئێت].

## سُورَةُ الأَحْزَابِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَۚ إِنَّ ٱللَّهَ
كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ١ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَۚ
إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ٢ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِۚ
وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ٣ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِۦۚ
وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔي تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْۚ وَمَا جَعَلَ
أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ
وَهُوَ يَهْدِي ٱلسَّبِيلَ ٤ ٱدْعُوهُمْ لِأٓبَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ
فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْۚ وَلَيْسَ
عَلَيْكُمْ جُنَاحٞ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمًا ٥ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْۖ
وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْۗ وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٖ
فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓاْ إِلَىٰٓ
أَوْلِيَآئِكُم مَّعْرُوفٗاۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورٗا ٦

نصف الحزب ٤٢



## سۆرەتا ئەحزاب

**ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٧٣) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ هەی پێغەمبەر ل سەر پارێزگاریا خودێ بمینە و زێدەتر لێ بکە، و بەردەوامبە ل سەر نە گوهدانا گاور و دوروییان [گوهێ خۆ چوجا نەدە وان]، ب ڕاستی خودێ یێ زانا و کاربنەجهە. ﴿٢﴾ و هەر وەحییەکا ژ خودایێ تە بۆ تە دئێت ل دویڤ هەرە، ب ڕاستی خودێ یێ ئاگەهدارە ب وێ ئەوا هوین دکەن. ﴿٣﴾ و پشتا خۆ ب خودێ گەرم بکە، و بەسی تەیە خودێ پشتەڤانێ تە بیت. ﴿٤﴾ خودێ دو دل نەکرینە د سینگێ چو زەلامان دا [دلەکی گاوری تێدا بیت، و ئێکی ئیسلام]، و ژنێت هەوە ئەوێت هوین دبێژنێ هوین وەکی دەیکا مەنە [ئانکو هوین وەکی دەیکا مە ل مە حەرام بن]، خودێ نەکرینە دەیکێت هەوە، و زڕکوڕێت هەوە [ئەوێت هوین ب کوڕینی خودان دکەن، و نە کوڕێت هەوە]، خودێ نەکرینە کوڕێت هەوە. ئەڤە [گۆتنا هەوە بۆ ژنێت هەوە: هوین وەکی دەیکێت مەنە ل مە، و دانانا زڕکوڕان ل جهێ کوڕان] ئاخڤتنەکە هوین بۆ خۆ دبێژن [چو بڕیار و حوکم ل سەر نائێنە دانان، نە ژنێت هەوە پێ دبنە دەیکێت هەوە، و نە زڕکوڕێت هەوە پێ دبنە کوڕێت هەوە]، و خودێ ڕاستییێ دبێژیت: [نە ژن دەیکێت هەوەنە و نە زڕکوڕ کوڕێت هەوە یێت دورستن]، و هەر ئەوە ڕێکا ڕاست دیار دکەت. ﴿٥﴾ هوین ب ناڤێ بابێت وان گازی وان بکەن، ئەڤە [گازیکرنا وان ب ناڤێ بابێت وان] ل دەڤ خودێ دورسترە، ڤێجا ئەگەر هوین نەزانن بابێت وان کینە ئەو برایێت هەوە یێت دینینە و هەڤالێت هەوەنە، و گونەهـ ل سەر هەوە نینە ئەگەر هوین ب خەلەتیڤە [ب ناڤێ کوڕینییێ] گازی وان بکەن، بەلێ بۆ هەوە گونەهە ئەگەر هوین ب مەخسەد و ژ دل بێژن، و خودێ یێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٦﴾ پێغەمبەر ژ خودان باوەران هێژاتر و فەرترە بۆ وان، ئەو گوهێ خۆ بدەنێ [د هەمی کاروبارێت ژیانا خۆ دا، و ئەگەر پێغەمبەر فەرمانەکێ ل وان بکەت و دلێ وان تشتەکێ دی بێژیت، دڤێت گوهێ خۆ بدەنە پێغەمبەری، نەدەنە دلێ خۆ چونکی پێغەمبەر ژ وان ب خۆ دلۆڤانترە بۆ وان]، و ژنێت پێغەمبەری دەیکێت وانن، و لێزم و نێزیکێت مرۆڤی هندەك ژ وان هێژاتر و هەقترن د میراتخۆرییێدا ژ هندەکێت دی ژ خودان باوەر و مشەختیان، ژ بلی هندێ هوین قەنجییەکێ د گەل برایێت خۆ یێت خودان باوەر و مشەخت د ژیانا خۆدا بکەن، یان ب وەسیەت بۆ وان ڤەبڕن ئەڤە دورستە، و ئەڤ حوکمە [میراتخۆرییا مرۆڤێت ئێك بۆ ئێکدو] د کتێبا خودێدا [ئانکو د دەپێ پارستیدا] یا نڤیسی بوو.

وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمۡ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٖ وَإِبۡرَٰهِيمَ
وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۖ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظٗا ٧
لِّيَسۡـَٔلَ ٱلصَّٰدِقِينَ عَن صِدۡقِهِمۡۚ وَأَعَدَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمٗا ٨
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ
جُنُودٞ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا وَجُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ
بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ٩ إِذۡ جَآءُوكُم مِّن فَوۡقِكُمۡ وَمِنۡ أَسۡفَلَ
مِنكُمۡ وَإِذۡ زَاغَتِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلۡقُلُوبُ ٱلۡحَنَاجِرَ
وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ١٠ هُنَالِكَ ٱبۡتُلِيَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَزُلۡزِلُواْ
زِلۡزَالٗا شَدِيدٗا ١١ وَإِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم
مَّرَضٞ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورٗا ١٢ وَإِذۡ قَالَت طَّآئِفَةٞ
مِّنۡهُمۡ يَٰٓأَهۡلَ يَثۡرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمۡ فَٱرۡجِعُواْۚ وَيَسۡتَـٔۡذِنُ فَرِيقٞ
مِّنۡهُمُ ٱلنَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوۡرَةٞ وَمَا هِيَ بِعَوۡرَةٍۖ إِن يُرِيدُونَ
إِلَّا فِرَارٗا ١٣ وَلَوۡ دُخِلَتۡ عَلَيۡهِم مِّنۡ أَقۡطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُواْ ٱلۡفِتۡنَةَ
لَأٓتَوۡهَا وَمَا تَلَبَّثُواْ بِهَآ إِلَّا يَسِيرٗا ١٤ وَلَقَدۡ كَانُواْ عَٰهَدُواْ
ٱللَّهَ مِن قَبۡلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلۡأَدۡبَٰرَۚ وَكَانَ عَهۡدُ ٱللَّهِ مَسۡـُٔولٗا ١٥



﴿٧﴾ بۆ وان بێژە وەختێ مە پەیمان ژ پێغەمبەران وەرگرتی [من ب تنێ بپەرێسن و داخوازا پەرستنا من ب تنێ بکەن، و باوەرییێ ب ئێکدو بینن و ب دلبێشی شیرەتان ل ملەتێت خۆ بکەن و پەیمانا خودێ بگەهینن] و مە پەیمان ژ تە ژی وەرگرت و ژ نووحی ژی و ژ ئیبراهیمی ژی و ژ مووسایی ژی و ژ عیسایێ کورێ مەریەمێ ژی.. و مە پەیمانەکا موکوم ژ وان وەرگرت [کو ئەو پەیمانا خۆ ب جهـ بینن].
﴿٨﴾ [مە ئەڤ پەیمانە ژ وان وەرگرت] دا خودێ پسیارا ڕاستگۆیان ژ ڕاستگۆتنا وان بکەت [دا ڕۆژا قیامەتێ پسیارا پێغەمبەران ل سەر ڕاستیيا وان، و ئەو پەیاما ئەو پێ هاتینە هنارتن بکەت کا دورست ب جهـ ئینان]، و مە بۆ گاوران ئیزایەکا ب ژان و دژوار یا بەرهەڤکری. ﴿٩﴾ گەلی خودان باوەران نیعمەتێت خودێ بیننە بیرا خۆ، دەمێ لەشکەرەکێ [مەزن] ب سەر هەوەدا گرتی [ئەو ژی قورەیشی بوون، و بەنی ئەسەد و بەنی (غەطفان) و بەنی عامر و بەنی سولەیم و بەنی (قورەیظە) و بەنی (نەضیر) بوون، نێزیکی دوازدە هزاران]، ڤێجا مە هوڕەبایەك و لەشکەرەك [مەخسەد ملیاکەتن] هنارتنە سەر وان، هەوە نەددیتن و ئەوا هوین دکەن خودێ دبینیت. ﴿١٠﴾ وەختێ ئەو ژ [ڕەخێ] سلال و خوارێڤە هاتینە هەوە، و وەختێ چاڤ، زیق مایینە ل دژمنان، و وەختێ دلان ژ ترساندا خۆ ل گەوریان دایی [قوتێنەکا زێدە کەتییێ ژ ترساندا]، و وەختێ هەر ئێك ژ هەوە هزرەك ژ خودێ دکر. ﴿١١﴾ ل وێرێ خودان باوەر [ب ترسێ و سەبرکێشانێ] هاتنە جەڕباندن، و زێدە شەپرزەبوون. ﴿١٢﴾ و وەختێ دوڕوییان و ئەوێت نەساخی د دلێ واندا هەی [ئەو ژی هەر دوڕوینە، و نەساخی سالۆخەتە بۆ وان] گۆتین: ئەو پەیمانا خودێ و پێغەمبەرێ وی دایییە مە [کو ئەم دێ ب سەرکەڤین]، ژ خاپاندنێ پێڤەتر نەبوو. ﴿١٣﴾ و وەختێ دەستەکەکێ ژ وان [دوڕوییان] گۆتی: گەلی خەلکێ (یەثریبێ)ێ (خەلکێ مەدینەیێ) جهێ هەوە ل ڤێرێ نەما [هەر بميننە ل سەر ڤی دینی]، ڤێجا بزڤرنە مالێت خۆ [و دینێ خۆ یێ بەرێ] و دەستەکەك ژ وان دەستویرییێ ژ پێغەمبەری دخوازن [دا بزڤرنە مالێت خۆ]، دبێژن: مالێت مە د بەردراینە، و ئەو ب خۆ مالێت وان نە د بەردراینە، و وان ژ ڕەڤینێ پێڤەتر چو یێ دی نەڤێت. ﴿١٤﴾ و ئەگەر ئەو دژمن ژ هەمی ڕەخانڤە بێنە وان و ب سەر واندا بگرن، پاشی ژ وان بخوازن گاور ببن و شەڕێ موسلمانان بکەن، دێ گوهێ خۆ دەنە وان و هندەك خۆ بۆ وان گیرۆ ناکەن دەمەکێ کێم نەبیت. ﴿١٥﴾ و ب سویند وان بەری نوکە پەیمان دابوو خودێ کو ئەو نەڕەڤن، و پشتا خۆ نەدەنە دژمنی، و پەیمانا وان دایییە خودێ دڤێت ب جهـ بینن.

قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا
لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ
إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ۚ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ
ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾ ۞ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ
لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً
عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ
كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم
بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟ فَأَحْبَطَ
ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٩﴾ يَحْسَبُونَ
ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا۟ ۖ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم
بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ۖ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم
مَّا قَٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢٠﴾ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ
لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾
وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ
وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٤٢



﴿١٦﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: رەڤین فایدەی هەوە ناکەت ئەگەر هوین ژ مرنێ یان ژ کوشتنێ برەڤن، و ئەگەر هوین برەڤن ژی ژ دەمەکێ کێم پێڤەتر هوین خۆشییێ نابەن [چونکی ئەوێ ب شیری نەمریت دێ ب تشتەکێ دی مریت، و ژ مرنێ قورتال نابیت]. ﴿١٧﴾ بێژە: ئەو کییە هەوە ژ خودێ بپارێزیت، ئەگەر نەخۆشییەک بۆ هەوە ڤیا یان ژی دلۆڤانییەک بۆ هەوە ڤیا؟ و چو هاریکار و پشتەڤانان ژ بلی خودێ بۆ خۆ نابینن. ﴿١٨﴾ ب سویند خودێ ئاگەهـ ژ وان هەیە، و وان [ژ هەوە] دنیاسیت ئەوێت هەڤالێت خۆ سست دکرن و ئاستەنگ دئێخستنە د پێشیا واندا، و ئەوێت دگۆتنە هەڤالێت خۆ، خۆ بدەنە د گەل مە [ئەم دترسین هوین بێنە کوشتن]، ژ کێمەکێ پێڤەتر ژ وان نائێنە شەری [ئەو ژی هەر ژ نەچاری یان ژی بۆ رویمەتیێ]. ﴿١٩﴾ دلرەشن د گەل هەوە [و ژ دلرەشی هاریکاریا هەوە ناکەن و د گەل هەوە خەندەکێ ناکۆلن و وان باشی بۆ هەوە نەڤێت]، ڤێجا ئەگەر بوو شەڕ، و ترس بۆ وان چێ بوو، دێ بینی بەرێ خۆ ددەنە تە و چاڤێت وان وەکی وی دزڤرن ئەوێ ل بەر مرنێ، ڤێجا ئەگەر شەڕ و ترس نەما ب ئەزمانێت تیژ و دژوار تانان د هەوە دقوتن [و ئەزیەتا هەوە دکەن و پشک و باران ژ دەستکەڤتییان دخوازن]، ئەو ب خۆ ل سەر دەستکەڤتییان د هشیارن، ئەڤان باوەری نەئینایە، ڤێجا خودێ کار و کریارێت وان پویچ کرن، و ئەڤە ل دەڤ خودێ یا ب ساناهییە. ﴿٢٠﴾ وێ هزرێ دکەن [لەشکەرێ] کۆمێت هەڤالبەند ژ دۆر مەدینەیێ نەچۆینە، و ئەگەر جارەکا دی ئەو کۆمێت هەڤالبەند [قورەیشی و قولپا وان] بێنەڤە، ئەو دورویێ دێ خۆزییا خوازن ئەو ل دەشتێ بانە ل ناڤ کۆچەران [نەکو ئەڤرۆ ل مەدینەیێ بانە]، ل وێرێ پسیارا حالێ هەوە کربانە، و ئەگەر ئەو د ناڤ هەوە ژیدا بانە [وەختێ شەری] ژ شەرەکێ کێم (بێخێر) پێڤەتر نەدکرن [وێ کێما شەری ژی بۆ رویمەتییێ دکەن]. ﴿٢١﴾ ب سویند پێغەمبەرێ خودێ بۆ هەوە باشترین نموونە بوو چاڤ لێ بێتەکرن [د باوەرموکومییێدا و د خۆڕاگرتن و سەبرکێشانێدا، وەختێ تەنگاڤی و نەخۆشییان] بۆ وی یێ ژ خودێ و رۆژا قیامەتێ بترسیت و گەلەک زکرێ خودێ بکەت [و خودێ هەر ل بیرێ بیت]. ﴿٢٢﴾ و وەختێ موسلمانان (خودان باوەران) کۆمێت هەڤالبەند دیتین [قورەیشی و قولپا وان] گۆتن: ئەڤە ئەو پەیمانە ئەوا خودێ و پێغەمبەرێ وی دایییە مە، و خودێ و پێغەمبەرێ وی راست دبێژن و وان کۆمێت هەڤالبەند ژ باوەری و راوەستیانا ل بەر ئەمرێ خودێ پێڤەتر ل خودان باوەران زێدەنەکر.

مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن
قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ لِّيَجْزِىَ
ٱللَّهُ ٱلصَّـٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ
يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٤﴾ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ
ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَـٰهَرُوهُم مِّنْ
أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ
فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ
وَدِيَـٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ
شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢٧﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ
ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ
سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ
ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾
يَـٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَـٰعَفْ
لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾





﴿٢٣﴾ د نـاڤ خـودان باوەرانـدا هنـدەك زەلام يـێت
هەيـن ئـەو پەيمانـا وان د گـەل خـودێ دايـى، ب جهـ
ئينـا، ڤێجـا هنـدەك ژ وان شـەهيد بوون و مـرن و هندەك
ژ وان يـێ ل هيڤيـێ شـەهيد ببـن، و پەيمـانا خـۆ د
بنـیرا نەگوهۆڕینـە [و لێڤـە نەبوويـینە]. ﴿٢٤﴾ دا خودێ
ڕاسـتگۆيان ب ڕاستيـيا وان خەلات بكـەت [ژ بەر مانا
وان ل سـەر پەيمانا دايـين]، و دوروويـيان ژى ئيزا بدەت
ئەگـەر بڤێت، يـان ژى ڕێ ل بەر وان خـۆش بكەت تۆبە
بكـەن، ب ڕاستى خودێ يـێ گونەهـ ژێبـەر و دلۆڤانە.
﴿٢٥﴾ و خـودێ ئەوێـت گـاور بوويـين [قورەيشـى و
هەڤالبەندێـت وان] ب كـەرب و كينـا وانڤـە زڤڕاندنەڤە،
بێـى كو سـەركەڤتنەكێ ب دەسـت خۆڤە بينـن و بگەهنە
باشيـيەكێ [بەلێ شكەسـتى و خوسـارەت و وەسـتيايى
زڤڕيـن]، و خـودێ [ب ملياكەتـان و ب وى هوڕەبايـێ
هنارتـى] بـەلا شـەڕى ژ موسلمـانان ڤەكـر، و خـودێ
يـێ ب هێـز و دەسـتهەلاتدارە. ﴿٢٦﴾ خـودێ ئەوێـت
هاريكاريـيا كۆمێـت هەڤالبەنـد كريـن ژ جوهيـيان
[مەخسـەد جوهيـيێت (قورەيظينە) ئەوێت هاريكاريـيا
قورەيشيـيان كريـن ل سـەر موسلمـانان، و ئـەو پەيمانـا د ناڤبـەرا خـۆ و پێغەمبەريدا شـكاندين]، ژ كەلهەيـێت
وان ئينانـە خـوارێ، و تـرس و لـەرز ئێخستە دل و هناڤێـت وان، دەسـتەكەك هـەوە كوشـتن و دەسـتەكەك هەوە
ئێخسـيركرن. ﴿٢٧﴾ و خـودێ ئـەردێ وان و خانيـيێت وان و مالـێ وان بـۆ هـەوە هێـلان، و ئەردەكـێ دى ژى
هێشـتا هويـن نەچۆيـينێ [مەخسـەد پـێ ئـەردێ خەيبەرێيـە، خـودێ مزگينى پـێ دا موسـولمانان، هێژ نەهاتيـيە
ڤەكـرن]، و ب ڕاسـتى خـودێ ل سـەر هەمـى تشـتان خـودان شـيانە. ﴿٢٨﴾ هـەى پێغەمبـەر بێـژە ژنێـت خـۆ:
ئەگـەر هويـن حـەژ ژيانا دنيايـێ و جوانيـيا وێ دكـەن [پتر ژ ڤيانا خـودێ و پێغەمبـەرى] ، ڤێجـا وەرن دا هەقێ
هـەوە بدەمـە هەوە، و ئـەز هەوە ب دلخۆشـى بـەردەم. ﴿٢٩﴾ و ئەگەر هەوە خـودێ و پێغەمبەرێ وى و خۆشـيا
ئاخرەتـێ و قيامەتـێ بڤێن، ب ڕاسـتى خـودێ بۆ يـێت قەنجيكار ژ هـەوە، خەلاتەكـێ مەزن يـێ بەرهەڤكرى.
﴿٣٠﴾ گـەلى ژنێـت پێغەمبـەرى هەچيـيا ژ هـەوە گونەهـەكا كرێتا ئاشـكەرا بكەت، دوقـات دێ ئێتـە جزاكرن، و
ئەڤـە ل دەڤ خـودێ يا ب ساناهيـيە.

۞وَمَن يَقۡنُتۡ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعۡمَلۡ صَٰلِحٗا نُّؤۡتِهَآ
أَجۡرَهَا مَرَّتَيۡنِ وَأَعۡتَدۡنَا لَهَا رِزۡقٗا كَرِيمٗا ٣١ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ
لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّۚ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ
فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ٣٢ وَقَرۡنَ
فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰۖ وَأَقِمۡنَ
ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ إِنَّمَا
يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ
تَطۡهِيرٗا ٣٣ وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنۡ
ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلۡحِكۡمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ٣٤
إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ
وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ
وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ
وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلۡحَٰفِظِينَ
فُرُوجَهُمۡ وَٱلۡحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا
وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا ٣٥





﴿٣١﴾ و كـی ژ هـەوە [مەخسـەد پـێ ژنێـت پێغەمبەرینە] گوهداریـیـا خـودێ و پێغەمبـەرێ وی بكـەت و ل بـەر ئەمـرێ وان یـا ڕاوەسـتیایی بیـت و كارەكـێ ڕاسـت و دورسـت بكەت، دوجاركـی دێ خەلاتـێ وێ دەینێ، و مـە ڕزقەكـێ باش [كو بەحەشـتە] یـێ بـۆ بەرهەڤكری. ﴿٣٢﴾ گـەلی ژنێـت پێغەمبـەری هوین نەوەكـی چو ژنێت دینـە، ئەگـەر هویـن تەقوایا خـودێ بكەن، ڤێجـا ئاخڤتنا خـۆ ب نازكـی نەكـەن [وەختـێ هویـن د گـەل زەلامان دئاخڤـن]، دا ئـەوێ نەسـاخی و خرابـی د دلیـدا هـەی تەمایـی نەكەڤتـە دلی، و ئاخڤتنـەكا عەدەتـی بئاخڤـن. ﴿٣٣﴾ و د مالێـت خۆدا بن [بـێ هەوجەیی دەرنەكەڤن]، و جوانیـیـا خۆ ئاشـكەرا نەكەن وەكی ئاشـكەراكرنا سەر وەختـێ نەزانینـا بـەرێ، و نڤێـژان ب ڕەنگـێ پێدڤـی و بـەردەوام بكـەن و زەكاتـێ بـدەن و گوهداریـیـا خودێ و پێغەمبـەرێ وی بكـەن، گـەلی خەلكـێ ڤـێ مالـێ ب ڕاسـتی خـودێ دڤێت هـەوە ژ قرێـژا گونەهان بشـۆت، و پاقژیـیەكا پاقـژ هـەوە پاقـژ بكـەت. ﴿٣٤﴾ و بیننە بیرا خـۆ [ئانكو بخوینـن و تێ بگەهـن و كار پـێ بكەن] ئەو ئایەتێـت خـودێ [ئانكو قورئانـێ]، و ئەو ئاخڤتنێـت پێغەمبەری ئەوێـت د مالێت هەوەدا دئێنـە خواندن و گۆتن، ب ڕاسـتی خـودێ یـێ هویربـین و شـارەزایە. ﴿٣٥﴾ زەلامێت موسـلمان و ژنێـت موسـلمان، و زەلامێت خودان بـاوەر و ژنێـت خـودان بـاوەر، و زەلامێت بەر ئەمری خـودێ و ژنێت بـەر ئەمری خودێ، و زەلامێت ڕاسـتگۆ و ژنێـت ڕاسـتگۆ، و زەلامێت سـەبركێش و ژنێت سـەبركێش، و زەلامێـت ژ خودێ ترس و ژنێـت ژ خودێ ترس، و زەلامێـت خێركـەر و ژنێـت خێركەر، و زەلامێـت ڕۆژیگر و ژنێت ڕۆژیگـر، و زەلامێت نامویسـا خۆ دپارێزن و ژنێـت نامویسـا خـۆ دپارێـزن، و زەلامێـت گەلـەك خـودێ ل بـیرا وان و گەلـەك زكـری دكەن و ژنێـت خودێ گەلـەك ل بـیرا وان و گەلـەك زكری دكەن، ب ڕاسـتی خودێ بۆ ڤان [هەمیـیان] گونەهژێـبرن و خەلاتەكێ مەزن یـێ بەرهەڤكری.

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ
لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا
مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ
أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ
مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ۖ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ
مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَـٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ
أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾
مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ ۖ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى
ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾ ٱلَّذِينَ
يُبَلِّغُونَ رِسَـٰلَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ
بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَـٰكِن
رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾
يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ
بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَـٰٓئِكَتُهُۥ
لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾





﴿٣٦﴾ بۆ چو زەلامێت خودان باوەر و بۆ چو
ژنێت خودان باوەر دورست نینە، ئەگەر خودێ و
پێغەمبەرێ خۆ فەرمانەك دان، ئەو ب كەیفا خۆ بن ب
جهـ بینن یان نەئینن، و هەركەسێ بێ ئەمریا خودێ
و پێغەمبەرێ وی بكەت ب ڕاستی ئەو گومڕا بوو،
گومڕابوونەكا ئاشكەرا. ﴿٣٧﴾ بینە بیرا خۆ وەختێ
تە دگۆتە ئەوێ خودێ ب ڕاستەڕێكرنا خۆ كەرەم د
گەل كری، و تە ژی ب ئازادكرنا وی كەرەم د گەل
كری: ژنا خۆ بەرنەدە و ژ خودێ بترسە (لەزێ د
بەردانا وێدا نەكە)، و تو وێ د دلێ خۆدا ڤەدشێری
[ماركرنا وێ پشتی ئەو بەردەت] یا كو خودێ دڤێت
ئاشكەرا بكەت، و تو ژ لۆمەییا خەلكی دترسی و
خودێ هێژاترە تو ژێ بترسی و شەرمێ ژێ بكەی،
ڤێجا وەختێ زەیدی هەوجەیی پێ [ب زەینەبا كچا
جەحشی] نەمای و بەردای، مە ل تە ماركر، دا چو
تەنگاڤی ل سەر خودان باوەران نەمینیت د ماركرنا
ژنێت زڕكوڕێت خۆدا ئەگەر زڕكوڕان بەردان، و
ب ڕاستی ئەمرێ خودێ هاتە دان [بێی لێڤەبوون].
﴿٣٨﴾ چو لێگرتن و ڕەخنە و عەیبداری ل سەر پێغەمبەری نینە، د وی تشتیدا یێ خودێ بۆ ئێخستی و بۆ
دورستكری [وەكی ماركرنا زەینەبێ یان ماركرنا گەلەك ژنان]، ڕێكا خودێ بۆ پێغەمبەرێت بۆرین ژی هەر
ئەڤە بوو [تشتێ خودێ ئەمر كری بێ ترس بكەن]، و ئەمرێ خودێ یێ ڤەبڕییە. ﴿٣٩﴾ و پێغەمبەرێت بەری
نوكە بۆرین ئەون ئەوێت پەیاما خودێ دگەهینن و ژ خودێ دترسن، و ژ بلی خودێ ژ كەسێ دی ناترسن،
و بەسە خودێ [بۆ هەوە] زێرەڤان و حسابدار بیت. ﴿٤٠﴾ موحەمەد نە بابێ كەس ژ زەلامێت هەوەیە،
بەلێ پێغەمبەرێ خودێیە و پێغەمبەرێ دویماهیێییە، و ب ڕاستی خودێ هەمی تشتان دزانیت و پێ ئاگەهە.
﴿٤١﴾ گەلی خودان باوەران، خودێ گەلە بیننە بیرا خۆ و گەلە زكرێ وی بكەن. ﴿٤٢﴾ و سپێدە و ئێڤاران
خودێ ژ كێماسییان پاقژ بكەن. ﴿٤٣﴾ ئەوە دلۆڤانییێ ب هەوە دبەت، و ملیاكەت دوعایا گونەهـ ژێبرنێ بۆ
هەوە دكەن، دا خودێ هەوە ژ تاریستانا گونەهان دەربێخیت و ببەتە ڕۆناهیا باوەرییێ، و ب ڕاستی خودێ
بۆ خودان باوەران یێ دلۆڤانە.

تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ ۚ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا
إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم
مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ
وَدَعْ أَذَىٰهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٤٨﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ
مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ۖ
فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٤٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ
إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّٰتِىٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ
يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ
وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِى هَاجَرْنَ مَعَكَ وَٱمْرَأَةً
مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِىِّ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِىُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا
خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۗ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا
عَلَيْهِمْ فِىٓ أَزْوَٰجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ لِكَيْلَا
يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٠﴾





﴿٤٤﴾ و سلاڤا وان [ئەوا ل خودان باوەران دئێتە كرن] رۆژا دگەهنە خودێ [وەختێ مرنێ یان وەختێ ژ گۆڕان رادبن، یان وەختێ دچنە د بەحەشتێدا] تەناهی و ئێمنیيە، و خودێ خەلاتەكێ باش و بەرفرەهـ یێ بۆ وان بەرهەڤكری. ﴿٤٥﴾ هەی پێغەمبەر مە تو یێ هنارتی، دا ببیيە شاهد و مزگینئین و ئاگەهداركەر. ﴿٤٦﴾ و دا ب دەستویریيا خودێ داخوازا رێكا خودێ بكەی، و دا ببیيە چرایەكێ ڕۆنكەر و گەش. ﴿٤٧﴾ و مزگینییێ بدە خودان باوەران، كو ب ڕاستی وان ل دەڤ خودێ كەرەمەكا مەزن یا هەی. ﴿٤٨﴾ گوهێ خۆ نەدە گاور و دورویيان و پویتە ب ئەزیەتا وان نەكە، و پشتا خۆ ب خودێ گەرم بكە، و بەسی تەیە خودێ پشتەڤانێ تە بیت. ﴿٤٩﴾ گەلی خودان باوەران ئەگەر هەوە ژنێت خودان باوەر ماركرن، پاشی هەوە بەردان بەری هوین بچنە نڤینا وان، هەوە چو مۆلەت (ژڤان) ل سەر وان نینن وان بهێلنە تێدا [شوی نەكەن هەتا ئەو مۆلەتا دەستنیشانكری ب دویماهی دئێت]، ڤێجا هەقێ وان [خەلاتەكێ قەنج و هاریكاریيەكێ] بدەنە وان، و ب تازەیی و بێ ئەزیەت دەست ژ وان بەردەن. ﴿٥٠﴾ هەی پێغەمبەر ب ڕاستی هەڤسەرێت تە ئەوێت تە مەهرێت وان داین، مە بۆ تە یێت حەلالكرین، هەروەسا جاریێت تە و دۆتمامێت تە و كچ مەتێت تە و كچ خالێت تە و كچ خالەتێت تە ئەوێت د گەل تە مشەخت بوویین، و هەر ژنەكا خودان باوەر ـ ب شەرتەكی خۆ پێشكێشی پێغەمبەری بكەت و پێغەمبەری بڤێت مار بكەت ـ ئەڤە ژی بۆ تە ب تنێ دورستە ژ بلی خودان باوەر و موسلمانان [ئەڤە هەمی خودێ بۆ تە یێت دورست كرین تو مار بكەی]، ب سویند ئەم دزانین مە چ ل سەر موسلمانان د ڕاستا هەڤسەرێت وان و جاریێت واندا فەرزكریيە [ژ خودانكرنێ و دانا مەهرێ و گرتنا شاهدان و هەژمارا هەڤسەران كو ژ چاران دەرباز نەبن]، مە ئەڤە بۆ تە تایبەت كر دا تەنگاڤی ل تە نەبیت، و خودێ یێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە.

الحزب ٤٣

۞ تُرۡجِي مَن تَشَآءُ مِنۡهُنَّ وَتُـٔۡوِيٓ إِلَيۡكَ مَن تَشَآءُۖ وَمَنِ ٱبۡتَغَيۡتَ
مِمَّنۡ عَزَلۡتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكَۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعۡيُنُهُنَّ
وَلَا يَحۡزَنَّ وَيَرۡضَيۡنَ بِمَآ ءَاتَيۡتَهُنَّ كُلُّهُنَّۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ
مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمٗا ﴿٥١﴾ لَّا يَحِلُّ لَكَ
ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ
حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ
شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ﴿٥٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ
إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنۡ
إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ
لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ
وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ وَإِذَا سَأَلۡتُمُوهُنَّ مَتَٰعٗا فَسۡـَٔلُوهُنَّ
مِن وَرَآءِ حِجَابٖۚ ذَٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ وَقُلُوبِهِنَّۚ
وَمَا كَانَ لَكُمۡ أَن تُؤۡذُواْ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓاْ أَزۡوَٰجَهُۥ
مِنۢ بَعۡدِهِۦٓ أَبَدًاۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾
إِن تُبۡدُواْ شَيۡـًٔا أَوۡ تُخۡفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴿٥٤﴾



﴿٥١﴾ یا تە بڤێت [ژ هەڤسەرێت خۆ] شەڤا وێ
گیرۆکەی گیرۆکە، و یا تە بڤێت شەڤا وێ بینیە
پێش بینە پێش، و یا تە بڤێت و نە شەڤا وێ، چو ل
سەر تە نینە تو بچیە دەڤ، ئەڤ حوکمە [کو تو یێ
ب کەیفا خۆیی، شەڤا خۆ بدەیە کێ دێ دەیە وێ،
حوکمێ خودێیە] باشتر و چێتر دێ وان ڕازی کەت،
کو چو نەچیتە د دلێت واندا و ب خەم نەکەڤن، و
خودێ دزانیت کا چ د دلێت هەوەدایە، و خودێ یێ
زانا و بێنفرەهە ل سەر جزاکرنێ. ﴿٥٢﴾ پشتی ڤان
هەڤسەرێت تە هەین، چو ژن بۆ تە دورست نینن
[تو ل خۆ مار بکەی]، و بۆ تە نەدورستە هندەکێت
دی شوینا وان بینی [ئێکێ بەردەی ئێکا دی شوینێ
بینی، یان ئێك بمریت ئێکا دی شوینێ بینی]، خۆ
ئەگەر جوانیا وان بکەڤیتە دلێ تە ژی ژ بلی جاریێت
تە، ب ڕاستی خودێ ل سەر هەمی تشتان زێرەڤانە.
﴿٥٣﴾ گەلی خودان باوەران نەچنە د خانییێت
پێغەمبەریڤە، ژ بلی هندێ ئەو دەستویریا هەوە بدەت
بۆ خوارنەکێ، بەلێ وەختەکێ وەسا نەبیت خوارن
نەیا حازربیت و هوین خۆ ل هیڤییێ بگرن [هەتا چێدبیت]، بەلێ ئەگەر هوین هاتنە داخوازکرن بۆ خوارنێ
هەرن، و ئەگەر هەوە خوارن خوار ڤەرەڤن (بەلاڤ ببن) و نەمیننە ڕوینشتی، بمیننە ب ئاخڤتنێڤە، ب ڕاستی
کارێ هەوە ئەڤە [چۆنا مالا پێغەمبەری بێ دەستویری یان ژی مانە ل هیڤیا خوارنێ ل وێرێ هەتا چێدبیت
یان ژی مانا ب ئاخڤتنێڤە] ئەزیەتێ بۆ پێغەمبەری چێ دکەت، ڤێجا ئەو شەرم ژ هەوە دکەت [ڤێ بۆ هەوە
بێژیت]، بەلێ خودێ شەرم ژ دیارکرنا هەقییێ ناکەت، و هەر وەختێ هەوە هەوجەییەك ژ ژنێت پێغەمبەری
خواست یان هەوە ڤیا وان باخێڤن، ڤێجا ل پشت پەردەیێ ژێ بخوازن یان باخێڤن، ئەڤە بۆ دلێ هەوە و
دلێ وان ژی چێترە، و د بنیڕا بۆ هەوە نەدورستە هوین ئەزیەتێ بۆ پێغەمبەرێ خودێ چێکەن، و بۆ هەوە
نەدورستە ژی هوین پشتی وی ژنێت وی مار بکەن، ب ڕاستی ئەڤە [مارکرنا ژنێت پێغەمبەری پشتی وی]
ل دەڤ خودێ گونەهەکا مەزنە. ﴿٥٤﴾ ئەگەر هوین تشتی ئاشکەرا بکەن یان ژی [د دلێت خۆدا] ڤەشێرن
[ل دەڤ خودێ ئێکە]، و خودێ ژ هەمی تشتان ب ئاگەهە.

لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِيٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ
أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ
أَيْمَٰنُهُنَّۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ شَهِيدًا ٥٥
إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيْهِ وَسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ٥٦ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ
ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا
مُّهِينًا ٥٧ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ
مَا ٱكْتَسَبُواْ فَقَدِ ٱحْتَمَلُواْ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ٥٨
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ
يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا
يُؤْذَيْنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ٥٩ ۞ لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ
وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْمُرْجِفُونَ فِي ٱلْمَدِينَةِ
لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ٦٠ مَّلْعُونِينَۖ
أَيْنَمَا ثُقِفُوٓاْ أُخِذُواْ وَقُتِّلُواْ تَقْتِيلًا ٦١ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي
ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلُۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ٦٢

نصف الحزب ٤٣



﴿٥٥﴾ چـو گونەهــ ل سـەر وان نینـە [مەخسـەد ژنێـت پێغەمبـەری]، ئـەو ل دەڤ بابێـت خـۆ و کورێـت خـۆ و برایــێت خـۆ و برازایــێت خـۆ و خوارزایــێت خۆ و ژنێـت موسـلمان و کۆلەیــێت خۆ نـە د پەردەپـۆش بن، و ژ خـودێ بترسـن ب ڕاسـتی خـودێ ل سـەر هەمـی تشـتان یــێ حـازرە و دبینیت. ﴿٥٦﴾ ب ڕاسـتی خودێ و ملیاکەتێـت وی سـەلەواتان ددەنـە سـەر پێغەمبـەری [و سـەلەوات ژ خـودێ، دلۆڤانیـیە، و ژ ملیاکەتـان، دوعانـە]. گـەلی خودان بـاوەران هوین ژی سـەلەوات و سـلاڤان بدەنە سەر [و بێژن: (السـلام علیك أیها النبی)] و ب دورسـتی ل بـەر ئەمـرێ پێغەمبـەری ڕاوەسـتن. ﴿٥٧﴾ ب ڕاسـتی ئەوێـت وان کاران دکـەن یـێت خـودێ پـێ نەخـۆش، و ئەزیەتـا پێغەمبـەرێ وی دکـەن، خـودێ د دنیایــێ و ئاخرەتێـدا لەعنـەت یـا ل وان کـری و ئیزایـەکا هەتکبـەر بـۆ وان یـا بەرهەڤکری. ﴿٥٨﴾ وب ڕاسـتی ئەوێـت ژ نەهەقـی ئەزیەتـا زەلامێت خـودان بـاوەر و ژنێـت خـودان بـاوەر دکـەن [ب هـەر ڕەنگەکـێ هەبیـت ب ئەزمانـێ خـۆ یـان ب دەسـتێ خـۆ] و بێـی وان تشـتەك کربیـت ، ب سـویند وان سـتەم و بێ بەختیـیەکا مـەزن و گونەهـەکا زێدە ئاشـکەرا کر. ﴿٥٩﴾ هـەی پێغەمبـەر بێژە هەڤسـەرێت خـۆ و کچێت خۆ و ژنێت موسـلمانان بـلا جلبابێت (کراسـێ ئێك پارچە یـێ هەمـی لەشـی دگریت) خۆ ب سـەر خۆدا بەردەنـە خوارێ، ئەڤە باشـترە پێ بێنە نیاسـین [کو ژنێـت ئازادنە، نـە جێرینـە] و ئەزیـەت بـۆ وان چێ نەبیـت، و خـودێ یــێ گونەهـ ژێبـەر و دلۆڤانـە [ل وان ناگریـت ئەگەر هەتا نوکـە جلبابێـت خـۆ ب سـەر خـۆدا نەبەردابنـە خـوارێ]. ﴿٦٠﴾ ب سـویند ئەگـەر دوروی و ئەوێت نەسـاخی د دلـێ وانـدا هەی [هەر دوروینـە] و ئەوێت بەلبەلەیــێ ب درەوان و گۆتگۆتکان د مەدینەیــێدا بەلاڤ دکەن، ئەوا ئەو ل سەر [ژ دورویـیاتیــێ و خرابیــێ و بەلبەلەیــێ] نەهێلن، ئەم دێ تە سەردەستی وان کەین [دێ ئەمرێ تە کەیـن تـو وان ئیـزا بدەی]، پاشـی [تـو وەل وان بکەی] ژ جیرانەتیـیا تـە د مەدینەیــێدا وەختەکێ کێـم نەبیت یان جیرانیـیەکا کێـم نەبیت بچـن. [و نێزکـی هـەوە نەمینـن]. ﴿٦١﴾ [دوی دەمـێ کێم] لەعنـەت لێ بن، هـەر جهێ لـێ بـن و لـێ بێنە دیتـن حکمـێ وان [ئەگەر ل سـەر دورویـیاتیـیا خۆ بمینن] لـێ بێنە گرتـن و لێ بێنە کوشـتن. ﴿٦٢﴾ ئەڤـە ڕێـکا خودێیـە د وان دورویــیاندا ئەوێت بـەری هەوە بۆرین [ئـەم لەعنەتان ل وان دکەیـن، و وان چو ئەمانـەت نینـە ئەوێت ئاشـکەرا دورویـیاتیــێ د گـەل پێغەمبەران دکـەن]، و تو چـو گوهۆڕینێ بـۆ ڕێکا خودێ نابینی.

يَسۡـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِۚ وَمَا يُدۡرِيكَ
لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ
لَهُمۡ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿٦٥﴾
يَوۡمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيۡتَنَآ أَطَعۡنَا ٱللَّهَ
وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا
فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ
وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ﴿٦٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ
ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا ﴿٦٩﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ
لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ
فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا
ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ﴿٧٢﴾ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ
وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ وَٱلۡمُشۡرِكَٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ
عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمَۢا ﴿٧٣﴾





﴿٦٣﴾ خەلـك پسـيارا قيامەتـێ ژ تـە دكـەن [پسـيارا
وەختـێ وێ ژ تـە دكـەن، كا كەنگـی دێ ئێـت] بێـژە:
ب ڕاسـتی بـەس خـودێ دزانيـت، و مـا تـو چ دزانـی،
تـێ هەيـە قيامـەت يـا نێزيـك بيـت؟. ﴿٦٤﴾ ب ڕاسـتی
خودێ لەعنەتا ل گاوران كری، و ژ دلۆڤانيـيا خۆ يـێت
دويرئێخسـتين، و ئاگرەكێ سـنجری و شـاريايی يـێ بۆ
وان بەرهەڤكـری. ﴿٦٥﴾ هەروهـەر دێ تێـدا بـن، و چـو
هاريـكار و پشـتەڤانان بـۆ خـۆ نابينـن. ﴿٦٦﴾ و ڕۆژا
سـەروچاڤێت وان د ئاگـرێ جەهنەمێدا دئێنـە وەرگێڕان،
دێ بێـژن: خـۆزی مـە گوهـێ خـۆ دابايـە خـودێ و
مـە گوهـێ خـۆ دابايـە پێغەمبـەری [ئانكـو خـۆزی مـە
بـاوەری ب خـودێ و پێغەمبـەری ئينابايـە، دا ئـەم ئەڤرۆ
نەكەڤتباينـە د ڤـی حاليـدا]. ﴿٦٧﴾ و گۆتـن: خودێـوۆ،
ب ڕاسـتی مـە گوهـێ خـۆ دا سـەرۆك و مەزنێـت خـۆ،
و وان ڕێـكا ڕاسـت ل بەر مـە بەرزەكـر. ﴿٦٨﴾ خودێوۆ
وان دوقـات ئێـزا بـدە [ئێزايـا گاوريـيا وان، و ئێزايـا ژ
ڕێ دەرئێخسـتنا مـە]، و لەعنەتـا ژ هەميـيان مەزنتر (يان
گەلـەك و زێـدە لەعنەتـان) ل وان بكـە. ﴿٦٩﴾ گـەلی
خـودان بـاوەران [پێغەمبەرێ خۆ نەئێشـينن] وەكی وان نەبن ئەوێت مووسـا ئەزيەت دايـين [و تشـت ب دويڤڤە
نايـن]، ڤێجـا خـودێ ديارکـر ئـەوێ پاقژە ژ گۆتنێـت وان، و ئـەو ب خۆ ل دەڤ خودێ يـێ ب ڕێـز و ڕويمەت
بـوو. ﴿٧٠﴾ گـەلی خـودان باوەران ژ خـودێ بترسـن [د هەمی كاروبارێـت خۆدا]، و ئاخڤتنا ڕاسـت بێژن [ديسـا
د هەمـی كاروبارێـت خـۆدا]. ﴿٧١﴾ دێ پەرسـتنا هەوە قەبويلكەت، و بـەرێ هەوە دەتە كار و كريارێت ڕاسـت و
دورسـت، و دێ گونەهێـت هـەوە ژێبەت، و هەر كەسـێ گوهـێ خۆ بدەتە خـودێ و پێغەمبەرێ وی، ب ڕاسـتی
ئەڤـە ئـەو ب سەرفەرازيـيەكا مـەزن سـەرفەراز بـوو. ﴿٧٢﴾ [گـەلی مرۆڤان] ب ڕاسـتی مـە ئەمانەت [ئـەڤ دينە
و فەرمانێـت تێـدا] دانـا بـەر ئـەرد و ئەسمـان و چيايـان [ب كەيفـا خـۆ بۆ خـۆ هەلبژێرن، ئەگـەر بڤێن ڕاكەن و
ئەگـەر نەڤێـن نـە] نەڤيان ڕاكـەن و ژێ ترسـيان، و مرۆڤی هەلگرت، ب ڕاسـتی ئەو [بۆ خۆ ] يـێ سـتەمكار بوو
و يـێ نـەزان بوو [دويماهيـيا خۆ نەدزانی]. ﴿٧٣﴾ [و خـودێ ئەڤ ئەمانەتە دا مرۆڤـان] دا زەلام و ژنێت دوڕوی
و زەلام و ژنێـت مـوشرك ئێـزا بـدەت، و دا خـودێ تۆبەيـێ بدەتـە سـەر زەلام و ژنێت خـودان بـاوەر، و خودێ
يـێ گونەهـ ژێبـەر و دلۆڤانە.

سُورَةُ سَبَإٍ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ
فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ١ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا
يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۚ وَهُوَ
ٱلرَّحِيمُ ٱلْغَفُورُ ٢ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ ۖ
قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ ۖ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ
ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ
وَلَآ أَكْبَرُ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ٣ لِّيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ
كَرِيمٌ ٤ وَٱلَّذِينَ سَعَوْ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ
لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ٥ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ
ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ
ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ٦ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَلْ نَدُلُّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ
يُنَبِّئُكُمْ إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمْ لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ٧



## سۆرەتا سەبەء

### ل مەکەهێ هاتیـە خوارێ (٥٤) ئایەتە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هەمی شوکور و سوپاسی بۆ وی خودایی، ئەوێ هندی د ئەرد و ئەسمانان‌دا هەی یێ وی، و حەمد و شوکور د ئاخرەتێدا ژی بۆ وینە [بەندەیێت وی ئەوێت دچنە بەحەشتێ دبێژن: (سوپاسی بۆ وی خودایی ئەوێ سۆز و پەیمانا خۆ بۆ مە ب جهـ کری)]، و ئەوە یێ کاربنەجهـ و شارەزا. ﴿٢﴾ دزانیت کا چ د ئەردیدا دچیت [کا چ د ناڤدا دچیت، ژ ئاڤێ و خزینەیان و هەر تشتەکێ دی]، و کا چ ژێ دەردکەڤیت [ژ شینکاتی و کانی و بیران و مەعدەنان... هتد]، و کا چ ژ ئەسمانی دئێتە خوارێ [ژ بارانێ و گژلۆکێ و بەفرێ و برویسیان و ملیاکەتان و کتێبان و... هتد.]، و کا چ بلند دبیتە ئەسمانی [ژ کریارێت باش و دوعایێ و روحان و ملیاکەتان و تەیر و تەوالان و هەلمێ و... هتد.]، و ئەو دلۆڤان و گونەهـ ژێبەرە. ﴿٣﴾ و ئەوێت گاوربوویین گۆتن: قیامەت ل مە نا رابیت و نائێت، بێژە: [نەخێر وەنینە وەکی هوین دبێژن] بەلێ ب خودێ زانایێ نهینیان، دێ ل هەوە رابیت، و تەمەتی دندکا تۆزکێ نە د ئەسمانان‌دا نە ژی د ئەردیدا ل بەر بەرزە نابیت، و نە بچویکتر و نە مەزنتر ژی نینە ئەگەر ئاگەهـ ژێ نەبیت، و د دەپێ پارستیدا نەیێ نڤیسی بیت. ﴿٤﴾ [قیامەت هەر دێ ئێت و هەمی کار و کریارێت وان ل سەر وان دێ ئێنە نڤیسین] دا خودێ ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت راست و دورست کرین خەلات بکەت، ئەڤان گونەهـ ژێبرن و رزقەکێ باش [کو بەحەشتە و خۆشییێت بەحەشتێنە] بۆ وان یێ هەی. ﴿٥﴾ و ئەوێت بزاڤێ دکەن گۆمانێ بێخنە د قورئانا مەدا، و باوەری پێ نەئێتە ئینان، و هزر دکەن پێغەمبەری ئاسێ دکەن ب هلێخستنا گۆمانێت خۆ، ئەڤان ئیزایەکا ب ژان و دژوار بۆ وان یا هەی. ﴿٦﴾ و ئەوێت خودێ زانین ب رزقێ وان کری، دزانن ئەڤا بۆ تە ژ نك خودایێ تە هاتیە خوارێ [کو قورئانە] راستە، و بەرێ مرۆڤی ددەتە خودایێ سەردەست و هێژایی سوپاسی و شوکورێ. ﴿٧﴾ و ئەوێت گاوربوویین گۆتن: ئەرێ هەوە دڤێت ئەم زەلامەکی نیشا هەوە بدەین بۆ هەوە تشتەکی [ئنتیکە] بێژیت: ئەگەر هوین ژێك پەرتین و بوونە ئاخ، جارەکا دی سەر ژ نوی دێ ساخ بنەڤە.

أَفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ
فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ ٨ أَفَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ
وَمَا خَلۡفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِن نَّشَأۡ نَخۡسِفۡ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ
أَوۡ نُسۡقِطۡ عَلَيۡهِمۡ كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ
لِّكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ٩ ۞ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضۡلٗاۖ
يَٰجِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُۥ وَٱلطَّيۡرَۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلۡحَدِيدَ ١٠ أَنِ ٱعۡمَلۡ
سَٰبِغَٰتٖ وَقَدِّرۡ فِي ٱلسَّرۡدِۖ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ
بَصِيرٞ ١١ وَلِسُلَيۡمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهۡرٞ وَرَوَاحُهَا شَهۡرٞۖ
وَأَسَلۡنَا لَهُۥ عَيۡنَ ٱلۡقِطۡرِۖ وَمِنَ ٱلۡجِنِّ مَن يَعۡمَلُ بَيۡنَ يَدَيۡهِ بِإِذۡنِ
رَبِّهِۦۖ وَمَن يَزِغۡ مِنۡهُمۡ عَنۡ أَمۡرِنَا نُذِقۡهُ مِنۡ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ١٢
يَعۡمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٖ كَٱلۡجَوَابِ
وَقُدُورٖ رَّاسِيَٰتٍۚ ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ
ٱلشَّكُورُ ١٣ فَلَمَّا قَضَيۡنَا عَلَيۡهِ ٱلۡمَوۡتَ مَا دَلَّهُمۡ عَلَىٰ مَوۡتِهِۦٓ
إِلَّا دَآبَّةُ ٱلۡأَرۡضِ تَأۡكُلُ مِنسَأَتَهُۥۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلۡجِنُّ
أَن لَّوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٱلۡغَيۡبَ مَا لَبِثُواْ فِي ٱلۡعَذَابِ ٱلۡمُهِينِ ١٤

ثلاثة أرباع الحزب ٤٣



﴿٨﴾ ئەرێ ئەو درەوان ژ کیسێ خودێ دکەت یان ژی یێ دینە [ڤێ ئاخڤتنێ دکەت]؟ [و وان دزانی یێ ڕاستگۆیە و ئەو ژ هەمیان یێ ب ئاقلترە]، نەخێر وەسا نینە وەکی ئەو دبێژن، بەلێ ئەوێت باوەرییێ ب قیامەتێ نەئینن، یێت د ئیزایێ و بەرزەبوونەکا کویردا.
﴿٩﴾ ئەرێ ما ئەو تشتێ ل پێشیا خۆ و ل پشت [دۆرماندۆری] خۆ ژ ئەردی و ئەسمانی نابینن؟ [و هەر جهێ بچنێ و هەر ڕەخێ بەرێ خۆ بدەنێ دێ ئەرد و ئەسمانان بینن، ما ئەڤە بەسی وان نینە پێ بزانن خودێ ئێکە، و پێ بزانن ئەوێ ئەڤ ئەرد و ئەسمانە دایین دشێت وان پشتی مرنێ ساخکەتەڤە] ئەگەر مە بڤێت دێ وان د ئەردیدا بەینە خواری [هەروەکی مە ب سەرێ قاروونی ئینایی] یان ئەسمانی پارچە پارچە ب سەر واندا بینینە خواری [هەروەکی مە ب سەرێ ملەتێ شوعەیبی ئینایی]، ئەڤە چامە و نیشانن بۆ هەر بەندەیەکێ ل خودێ بزڤریت و تۆبە بکەت.
﴿١٠﴾ ب سویند مە ژ دەڤ خۆ کەرەم [پێغەمبەراتی، زەبوور، نەرمکرنا چیایی، نەرمکرنا ئاسنی و نیشادانا چێکرنا زری و کومزریان... هتد] د گەل داوودی کربوو، [و مە گۆت:] گەلی چیایان و گەلی بالەفڕ و تەوالان تەسبیحێ لێ ڤەگێڕن، و مە ئاسن ژی بۆ نەرم و بەردەست کربوو [چاوا بڤێت وەلێ بکەت]. ﴿١١﴾ و مە گۆتێ: زری و کومزرییێت شۆڕ چێکە، و موکوم و ل قایدە [ب کێرهاتی، نە مەزن و نە بچویك] چێکە، و کار و کریارێت ڕاست و دورست بکەن، ب ڕاستی هەر تشتەکێ هوین دکەن ئەز دبینم. ﴿١٢﴾ و مە با (هەوا) بۆ سولەیمانی سەرنەرم بن دەست کربوو [ب ئەمرێ وی دچۆ و دهات]، سپێدەیان قویناخا هەیڤەکێ دچۆ و ئێڤاران قویناخا هەیڤەکێ دچۆ، و مە سفر بۆ حەلاند وەکی کانییێ دچۆ، و ژ ئەجنەیان دەستەکەك ب دەستویرییا خودێ ل بەر دەستێت وی شۆل دکرن، و هەچییێ ژ وان ژ ئەمرێ مە دەرکەڤیت، ئەم دێ ئیزایا ئاگرێ دژوار دەینە بەر وان. ﴿١٣﴾ تشتێ سولەیمانی بڤێت [ئەجنە] بۆ چێ دکەن، ژ ئاڤاهی و مزگەفت و پەیکەران، و لەگەنێت مەزن یێت وەکی جابییان (برکێت مەزن)، و قازانێت ل سەر کوچکان ڕاوەستیایی [هندی هند د مەزن بوون نەدهاتنە ڕاکرن]، [و مە گۆتە وان:] مالا داوودی سوپاسی و شوکورا خودێ بکەن، و کێمەك ژ بەندەیێت من سوپاسدارن. ﴿١٤﴾ ڤێجا وەختێ مە بڕیارا مرنا وی دایی [سەرێ خۆ دانا سەر دارێ خۆ و مر ئەجنە ب مرنا وی نەدحەسیان، ژ ترساندا بەردەوام شۆل دکرن]، چو تشتی ئەجنە ب مرنا وی ئاگەهدار نەکرن، خوێرك نەبیت، دارێ وی دخوار، ڤێجا وەختێ کەتی [پشتی دارێ وی، خۆ ل سەر گرتی، شکەستی و کەڤتی] بۆ ئەجنەیان ئاشکەرابوو و زانی، ئەگەر وان نهێنی و غەیب زانیبایە، ئەو هند نەدمانە ب کارێت گرانڤە.

لَقَدۡ كَانَ لِسَبَإٖ فِي مَسۡكَنِهِمۡ ءَايَةٞۖ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٖ وَشِمَالٖۖ
كُلُواْ مِن رِّزۡقِ رَبِّكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥۚ بَلۡدَةٞ طَيِّبَةٞ وَرَبٌّ غَفُورٞ ١٥
فَأَعۡرَضُواْ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ سَيۡلَ ٱلۡعَرِمِ وَبَدَّلۡنَٰهُم بِجَنَّتَيۡهِمۡ
جَنَّتَيۡنِ ذَوَاتَيۡ أُكُلٍ خَمۡطٖ وَأَثۡلٖ وَشَيۡءٖ مِّن سِدۡرٖ قَلِيلٖ ١٦
ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِمَا كَفَرُواْۖ وَهَلۡ نُجَٰزِيٓ إِلَّا ٱلۡكَفُورَ ١٧
وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ ٱلۡقُرَى ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا قُرٗى ظَٰهِرَةٗ
وَقَدَّرۡنَا فِيهَا ٱلسَّيۡرَۖ سِيرُواْ فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ١٨
فَقَالُواْ رَبَّنَا بَٰعِدۡ بَيۡنَ أَسۡفَارِنَا وَظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَجَعَلۡنَٰهُمۡ
أَحَادِيثَ وَمَزَّقۡنَٰهُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ
شَكُورٖ ١٩ وَلَقَدۡ صَدَّقَ عَلَيۡهِمۡ إِبۡلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا
فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٢٠ وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيۡهِم مِّن سُلۡطَٰنٍ
إِلَّا لِنَعۡلَمَ مَن يُؤۡمِنُ بِٱلۡأٓخِرَةِ مِمَّنۡ هُوَ مِنۡهَا فِي شَكّٖۗ
وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَفِيظٞ ٢١ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن
دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي
ٱلۡأَرۡضِ وَمَا لَهُمۡ فِيهِمَا مِن شِرۡكٖ وَمَا لَهُۥ مِنۡهُم مِّن ظَهِيرٖ ٢٢





﴿١٥﴾ ب سویند بۆ خەلكێ سەبەئێ د جهێ واندا [مەئربێ] نیشانەك [ل سەر دەستهەلاتداریا خودێ و قەنجییێت وی و پێدڤیا سوپاسیا وی] هەبوو، دو جنیكێت مەزن هەبوون، ئێك ل رەخێ راستێ و ئێك ل رەخێ چەپێ [و مە گۆتە وان:] ژ رزقێ خودایێ خۆ [ئانكو فێقییێ ڤان جنیكان] بخۆن و سوپاسی و شوكورا وی بكەن، باژێرەكێ ب خێر و بێر و پاقژە [باژێرێ هەوە]، و خودایێ هەوە یێ گونەهـ ژێبەرە. ﴿١٦﴾ ڤێجا وان رویێ خۆ وەرگێرا [سوپاسیا خودێ نەكرن و گاوربوون]، مە ژی لێمشتەكا چو خۆ ل بەر نەگریت، ب سەر واندا هنارت، و مە هەردو جنیكێت وان [یێت ب خێر و بەرەكەت] كرنە دوو جنیكێت فێقی، یێ زێدە تەحل و ب گەز، و كێمەكا كنێران د ناڤدا. ﴿١٧﴾ ژ بەر گاوری و نەشوكوردارییا وان، مە ئەو هۆسا ئیزادان، و ما ئەم ژ زێدە نەشوكورداران پێڤەتر، ئیزا ددەین؟!. ﴿١٨﴾ و مە د ناڤبەرا وان [خەلكێ سەبەئێ] و وان گوندان‌دا ئەوێت مە ب بەرەكەت ئێخستین [كو گوندێت شامێ بوون] رێزە گوندێت بەرچاڤ دانابوون [ژ یەمەنێ بۆ شامێ گوند ب گوند دهاتن، و هەوجە نەدبوون خوارنێ د گەل خۆ بینن]، و مە تەمەتی ئێك ژ ئێكدو دویرئێخستبوون [و مە گۆتە وان] ب شەڤ و رۆژ و ئێمن [و بێ ترس] هەرن و وەرن. ﴿١٩﴾ [ڤێجا شوینا ئەو سوپاسیا خودێ بكەن كو هۆسا خودێ گوندێت وان رێزكرین، بێ زەحمەت و بێ ترس ژ ڤی گوندی بچنە یێ دی، د سەر پێ خۆدا چۆن] و گۆتن: خودێوۆ گوندێت مە ژێك دویربێخە، و وان [ب ڤێ داخوازێ] ستەم ل خۆ كر، ڤێجا مە ئەو كرنە چیرۆك و ئێخستنە سەر ئەزمانێ خەلكی و مە ئەو تەرابەراكرن، ب راستی ئەڤە نیشان و دەرسن بۆ هەر زێدە بێنفرەهەكێ زێدە سوپاسدار. ﴿٢٠﴾ ب سویند شەیتانی هزرا خۆ د راستا واندا [كو ئەگەر ئەو وان د سەردا ببەت، دێ د سەردا چن] دورست دەرئێخست، ڤێجا دەستەكەك ژ خودان باوەران تێ نەبیت، ئەڤێت دی هەمی ب دویڤ وی كەڤتن. ﴿٢١﴾ و شەیتانی چو هێز و دەستهەلات ل سەر وان نەبوو [ب خورتی وان د بەر گاورییێرا بكەت]، بەلێ [مە رێك دا شەیتانی ب وەسواسا خۆ، مرۆڤان د سەردا ببەت] دا ئەم ئەوێت باوەری ب ئاخرەتێ هەی ژ وان ئەوێت باوەری ب ئاخرەتێ نەی و ژێ ب گۆمان، ژێك بنیاسین و ژێك جودا بكەین، و خودایێ تە زێرەڤانە ل سەر هەمی تشتان. ﴿٢٢﴾ بێژە: [گەلی موشركان] كا گازی وان بكەن ئەوێت هەوە هزر دكرن، كو ئەو پەرستییێت راست و دورستن شوینا خودێ [بلا هاریكارییا هەوە بكەن]، هندی دندكا تۆزكێ [ژ خرابی و باشییێ] د دەست واندا نینە، نە ل ئەردی و نە ل ئەسمانان، و وان چو هەڤپشكی د [چێكرن و خودانی و رێڤەبرنا] ئەرد و ئەسماناندا نینە، و چو پشتەڤانی و هاریكاری [بۆ رێڤەبرنا ئەرد و ئەسمانان] ژ وان ناگەهیتە خودێ.

وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن
قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾
الحِزْبُ ٤٤ ۞ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ
وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ قُل
لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ
يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٦﴾
قُلْ أَرُونِىَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ ۖ كَلَّا ۚ بَلْ هُوَ ٱللَّهُ
ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ
بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾
وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾
قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٠﴾
وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا
بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ
رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ
ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾



﴿٢٣﴾ و مەهـدەرا کەسـێ ل دەڤ خـودێ فایـدە ناکەت،
یـا وی نەبیـت یـێ خـودێ دەستویریـیـا وی بـدەت
[ژ ملیاکـەت و پێغەمبـەران، و یـێ خـودێ وێ ڕۆژێ
کەرەمـێ د گـەل بکـەت]، گاڤـا تـرس ل سـەر دلـێ وان
[مەخسـەد یـێ مەهدەرچیـیان] نەما، دێ بێژنـە ئێکدو:
خودایـێ هەوە چ گـۆت [د دەرهەقـێ مەهدەرێدا]، دێ
بێـژن: هەقی گۆت [ئـەو ژی دەستویردانە ب مەهدەرێ
بۆ وی یـێ بڤێت] و ئەوە یـێ بلند و مـەزن. ﴿٢٤﴾ بێژە:
کیـیە ڕزقـێ هـەوە ژ ئـەرد و ئەسمـانان ددەت؟ بێـژە:
خودێیـە، و [بێـژە] ب ڕاسـتی ئـەم یـان هویـن، [ئێـك ژ
مـە ڤـان هەردو جوینان] یان یـێت ل سـەر ڕێکا ڕاسـت
یـان یـێت د بەرزەبوونـەکا ئاشـکەرادا. ﴿٢٥﴾ تـو [هەی
موحەمـەد] بێـژە [وان]: پسـیارا هـەوە نائێتەکـرن ژ وێ
یـا مـە کری، و پسـیارا مـە ژی نائێتەکـرن ژ وێ یـا هوین
دکـەن. ﴿٢٦﴾ بێـژە: خودایـێ مـە، دێ مە و هـەوە پێکڤە
کۆمکەت، پاشـی ب دورسـتی دێ حوکمـی د ناڤبەرا مە
و هـەوەدا کـەت، و ئەوە حاکمـێ زانـا. ﴿٢٧﴾ بێژە [گەلی
مـوشرکان]: کا وان ئەوێـت هـەوە هەڤپشـك بـۆ خودێ
دانایـین نیشـا مـن بـدەن [دا ببینـم و بزانـم کا وان چ پـێ چێ دبیـت]، نە بلا هەڤپشـکان بـۆ خودێ چـێ نەکەن،
ب ڕاسـتی خـودێ یـێ سەردەسـت و کاربنەجهـە. ﴿٢٨﴾ [هەی موحەمـەد] مە تو نەهنارتیـیە بۆ هنـدێ نەبیت،
تـو بـۆ هەمی مرۆڤان ببیـیە مزگینـکار و هشـیارکەر، بەلێ باراپـتر ژ مرۆڤان ڤـێ نوزانن. ﴿٢٩﴾ و دبێـژن: کەنگی
ئـەو ژڤـان و پەیـمان [ئـەوا هوین مـە ب ئیزایا وێ دترسـینن] دێ ئێـت، ئەگەر هوین ڕاسـت دبێـژن. ﴿٣٠﴾ [هەی
موحەمـەد] بێـژە: بـۆ هـەوە ڕۆژەکا هـەی، هوین نە بیسـتەکێ ژێ پـاش دکەڤن، و نە بیسـتەکێ ژێ پێـش دکەڤن.
﴿٣١﴾ و ئەوێـت گاوربوویـین گۆتـن: ئـەم د بنـڕا نـە باوەریـیێ ب ڤـێ قورئانـێ، و نـە ب کتێبێـت بـەری وێ
[هاتـین] دئینـین، و ئەگـەر تو ببینی وەختێ سـتەمکار ڕاوەسـتیایی بەرانبەر خودایـێ خۆ، هنـدەك ژ وان ئاخڤتنێ
[ب جرەبـڕ و گازنـدە] ل هنـدەکان دزڤرینـن [دا تشـتەکێ ب سـەهم بینـی]، ئەوێـت هاتینـە تەپەسـەرکرن دبێژنە
ئەوێـت خـۆ ل سـەر سـەرێ وان مـەزن کریـن، ئەگـەر هویـن نەبانە ئـەم دا ژ خـودان بـاوەران بین.

قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ
عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُمۖ بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ
ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ إِذۡ
تَأۡمُرُونَنَآ أَن نَّكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجۡعَلَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ
لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَۚ وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَغۡلَٰلَ فِيٓ أَعۡنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۖ
هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ
مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾
وَقَالُواْ نَحۡنُ أَكۡثَرُ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٣٥﴾
قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ
ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُم بِٱلَّتِي تُقَرِّبُكُمۡ
عِندَنَا زُلۡفَىٰٓ إِلَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَزَآءُ
ٱلضِّعۡفِ بِمَا عَمِلُواْ وَهُمۡ فِي ٱلۡغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ
يَسۡعَوۡنَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ ﴿٣٨﴾
قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥۚ
وَمَآ أَنفَقۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَهُوَ يُخۡلِفُهُۥۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٣٩﴾



﴿٣٢﴾ و ئەوێت خۆ مەزن کرین [کو گرەگرە و سەرۆکن] گۆتنە تەپەسەرکریان [کو دویڤەلانك و دویڤچۆیینە]: ئەرێ ما مە هوین ژ رێکا راست و باوەرییێ دانەپاش پشتی بۆ هەوە هاتی؟! نەخێر وەسا نینە، بەلێ هوین ب خۆ د گونەهکار بوون.
﴿٣٣﴾ و ئەوێت هاتینە تەپەسەرکرن گۆتنە وان ئەوێت خۆ ل سەر سەرێ وان مەزن کرین: نەخێر وەسا نینە وەکی هوین دبێژن، بەلێ پیلان و ئۆیینێت هەوە ب شەڤ و رۆژ، وەل مە کر ئەم نە ژ خودان باوەران بین دەمێ هەوە ئەمرێ مە دکر ئەم باوەرییێ ب خودێ نەئینین، و هەڤبەران بۆ چێکەین و هەردو جوینان [سەرۆکان و دویکەڤتییێت وان] پەشێمانییا خۆ ڤەشارتن [کو باوەری نەئینایینە] دەمێ ئیزا دیتین، و قەید و زنجیر مە کرنە ستۆیێت وان ئەوێت گاوربوویین، و ئەو ل سەر کار و کریارێت وان دکرن، پێڤەتر نائێنە جزاکرن. ﴿٣٤﴾ و مە بۆ خەلکێ چو گوندان پێغەمبەر نەهنارتینە، دەولەمەند و گرەگرە و سەرکردەیێت وان نەگۆتبن: ب راستی تشتێ هوین پێ هاتین مە باوەری پێ نینە. ﴿٣٥﴾ و گۆتن: ئەم ژ هەوە د تێر مال و عەیالترین [و ئەڤە نیشانا هندێیە خودێ ژ مە رازییە، لەوا ئەڤ بەرفرەهییە د مال و عەیالیدا یا دایییە مە]، و ئەم [رۆژا قیامەتێ ژی] نائێینە ئیزادان.
﴿٣٦﴾ بێژە: ب راستی خودایێ من بۆ یێ بڤێت رزقی بەرفرەهـ و بەرتەنگ دکەت، بەلێ باراپتر ژ مرۆڤان ڤێ نوزانن. ﴿٣٧﴾ و نە مالێ هەوە و نە عەیالێ هەوە، ئەوە یێ هەوە نێزیکی مە بکەت، نابێژم خودانێت وان باوەرییێ بینن و کارەکێ راست و دورست بکەن، ئەڤان دوقات خەلات یێ بۆ هەی، ژ بەر وان کار و کریارێت وان کرین، و ئەو ب خۆ د بلندەجهێت بەحەشتێدا د ئێمنن. ﴿٣٨﴾ و ئەوێت بزاڤێ دکەن گۆمانێ بێخنە د قورئانا مەدا و باوەری پێ نەئێتە ئینان، و هزردکەن پێغەمبەری ئاسێ دکەن ب هلئێخستنا گۆمانێت خۆ، ئەڤە دێ کەڤنە د ئیزاییدا. ﴿٣٩﴾ بێژە: ب راستی خودایێ من بۆ بەندەیێ خۆ یێ بڤێت، رزقی بەرفرەهـ و بەرتەنگ دکەت، و هەر تشتەکێ هوین د خێرێدا بمەزیخن [بکەنە خێر]، ئەو خەلاتەکی ل شوینێ ددانیت [چ ل دنیایێ و چ ل ئاخرەتێ]، و ئەو ب خۆ ژی چێترین رازقە (رزقدەهـ).

وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟
يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ۖ بَلْ كَانُوا۟
يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ
بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ
ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ
قَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ
وَقَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى ۚ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا
جَآءَهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٣﴾ وَمَآ ءَاتَيْنَٰهُم مِّن كُتُبٍ
يَدْرُسُونَهَا ۖ وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ ﴿٤٤﴾ وَكَذَّبَ
ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَمَا بَلَغُوا۟ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ فَكَذَّبُوا۟
رُسُلِى ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٥﴾ ۞ قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن (الحزب ٤٤)
تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ ۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن
جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَىْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٤٦﴾ قُلْ
مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ
كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٤٧﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٤٨﴾



﴿٤٠﴾ و ڕۆژا خودێ وان هەمییان کۆم دکەت [مەزن و دویکەڤتییێت وان]، پاشی دێ بێژتە ملیاکەتان: ئەرێ ئەڤان هوین دپەرستن؟ ﴿٤١﴾ [ملیاکەتان] گۆتن: ئەم تە ژ هەمی کێماسییان پاقژ دکەین [کو هەڤپشکەك تە هەبیت] تویی سەمیان و هاریکارێ مە، نە ئەو، بەلێ وان ئەجنە دپەرستن [ئانکو شەیتان و لەشکەرێ وی] باراپتر ژ وان باوەری یا ب وان هەی. ﴿٤٢﴾ ڤێجا ئەڤرۆ کەس ژ هەوە نە فایدەی نە ژی زیانێ نا گەهینیتە کەسێ [ئانکو نە پەرستییان و نە ژی پەرستکاران تشتەك ژ مفا و زیانێ د دەستیدانە] و دێ بێژینە ئەوێت ستەم کرین: تامکەنە ئیزایا وی ئاگری ئەوێ هەوە درەو ددانا و باوەری پێ نەدئینا. ﴿٤٣﴾ و وەختێ ئایەتێت مە یێت ئاشکەراکەر بۆ وان دئێنە خواندن، دبێژن: ئەڤە [ئانکو موحەمەد] نەپێغەمبەرە، تنێ زەلامەکە دڤێت هەوە ژ وان پەرستییان بدەتە پاش ئەوێت باب و باپیرێت هەوە دپەرستن. و گۆتن: ئەڤ قورئانە ژ درەوێ پێڤەتر نینە، [موحەمەدی یا ژ دەڤ خۆ ئینای] و ئەوێت گاوربووین د دەرهەقێ قورئانێدا پشتی بۆ وان هاتی گۆتن: ئەڤە ژ سحرەکا ئاشکەرا پێڤەتر نینە. ﴿٤٤﴾ و مە بەری ڤێ قورئانێ چو کتێب بۆ [خەلکێ مەکەهێ] نەهنارتبوون ئەو بخوینن [و بۆ وان ببیتە بەلگە ل سەر شرکا وان]، و مە بەری تە ژی چو پێغەمبەر بۆ وان نەهنارتبوون [کو داخوازا وان بۆ شرکێ بکەن، یان وان ژێ بترسینن، ڤێجا ئەو چاوا تە درەوین ددانن]. ﴿٤٥﴾ و ئەوێت بەری وان ژی پێغەمبەرێت خۆ درەوین دانان، و ئەڤە [ئانکو قورەیشی] ناگەهنە دەهێکا وێ یا مە داییە وان [ژ مال و هێزێ]، د گەل هندێ ژی پێغەمبەرێت من درەوین دانان، ڤێجا بەرێ خۆ بدەیێ کا نەڕازیبوونا من و گوهۆڕینا من ل سەر وان یا چاوا بوو [و ئەز چاوا ل وان قولپیم]. ﴿٤٦﴾ [هەی موحەمەد] بێژە [وان]: ئەز بەس ئێك شیرەتێ ل هەوە دکەم، ئەو ژی ئەڤەیە: هوین ئێك ئێکە و دو دویە بۆ خودێ ڕابن [ئانکو بۆ دیارکرنا ڕاستییێ ب تنێ]، پاشی هزرا خۆ [د موحەمەدی و پەیاما ویدا] بکەن، [هنگی دێ بۆ هەوە ئاشکەرا بیت] چو دیناتی ل دەڤ هەڤالێ هەوە نینە [و ئەو پێغەمبەرە و نەیێ دینە، و نەساحرە وەکی هوین دبێژن]، و ئەو تنێ پێغەمبەر و ئاگەهدارکەرە، هەوە ژ ئیزایا ڕۆژەکا ب ترس و دژوار دترسینیت. ﴿٤٧﴾ بێژە: ئەگەر من [بەرانبەر گەهاندنا پەیاما خودێ] مالەك ژ هەوە خواستبیت، بلا بۆ هەوە بیت [ئانکو من چو مال بەرانبەری ڤێ پەیامێ ژ هەوە نەخواستییە و ناخوازم ژی]، خەلاتێ من ل سەر خودێیە، و ئەو زێرەڤان و شاهدە ل سەر هەمی تشتان. ﴿٤٨﴾ بێژە: ب ڕاستی خودایێ من وەحییێ بۆ پێغەمبەرێت خۆ دهنێریت [یان ژی خودایێ من هەقییێ دئینیت، پویچییێ پێ ناهێلیت]، و ئەو زانایێ نهێنیانە.

قُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَمَا يُبۡدِئُ ٱلۡبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ قُلۡ إِن ضَلَلۡتُ
فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفۡسِيۖ وَإِنِ ٱهۡتَدَيۡتُ فَبِمَا يُوحِيٓ إِلَيَّ رَبِّيٓۚ إِنَّهُۥ
سَمِيعٞ قَرِيبٞ ﴿٥٠﴾ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ فَزِعُواْ فَلَا فَوۡتَ وَأُخِذُواْ مِن
مَّكَانٖ قَرِيبٖ ﴿٥١﴾ وَقَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن
مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٢﴾ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۖ وَيَقۡذِفُونَ
بِٱلۡغَيۡبِ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٣﴾ وَحِيلَ بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ مَا يَشۡتَهُونَ
كَمَا فُعِلَ بِأَشۡيَاعِهِم مِّن قَبۡلُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ فِي شَكّٖ مُّرِيبِۭ ﴿٥٤﴾

سُورَةُ فَاطِرٍ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ جَاعِلِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُوْلِيٓ
أَجۡنِحَةٖ مَّثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۚ يَزِيدُ فِي ٱلۡخَلۡقِ مَا يَشَآءُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ
كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١﴾ مَّا يَفۡتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحۡمَةٖ فَلَا مُمۡسِكَ لَهَاۖ
وَمَا يُمۡسِكۡ فَلَا مُرۡسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ
يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴿٣﴾



﴿٤٩﴾ بێژە: ڕاستی هات [كو ئێكینیا خودێیە و ئیسلام و قورئانە]، و پویچی نەما، ژ نوی پێڤە نازڤڕیتەڤە. ﴿٥٠﴾ بێژە: ئەگەر ئەز هاتبمە خاپاندن و بەرزەبووبم، ب ڕاستی ئەز بۆ خۆ یێ بەزەبوویم [ئانكو زیانا من بەس بۆ منە]، و ئەگەر ئەز ڕاستەڕێ بووبم، ئەڤە ژ بەر وێ وەحییێیە ئەوا خودایێ من بۆ من هنارتی، ب ڕاستی خودایێ من یێ گوهدێر و نێزیكە. ﴿٥١﴾ و ئەگەر تو وان ببینی دەمێ ڤەدجنقن [دەمێ دمرن یان ژ گۆڕان ڕادبن یان ئێزایا دۆژەهێ دبینن]، [دێ تشتەكێ حێبەتی و عەجێب بینی] نێ ڕەڤین و قورتالبوون [ژ ئێزایا خودێ] نینە، و ئەو ژ جهەكێ نێزیك [مەیدانا حەشرێ] هاتنە گرتن. ﴿٥٢﴾ و گۆتن: مە باوەری ب موحەمەدی ئینا، و ئەو چاوا ژ جهەكێ دویر دێ گەهنە ئیمان و باوەرییێ [وان دشیان نێزیك د دنیایێدا باوەرییێ پێ بینن، و جهێ باوەرییێ دنیا بوو نە ئاخرەت، ئەڤرۆ ژ ڤێ دویراتییێ كو ئاخرەتە ئەو ناگەهنە باوەرییێ]. ﴿٥٣﴾ ب سویند [ئەوا وان نوكە باوەری پێ ئینایی] وان بەری نوكە [د دنیایێدا] باوەری پێ نەبوو، و ئەو دویر ژ ڕاستییێ د دەرهەقێ غەیبێدا دئاخڤتن [دگۆتن: قیامەت و جەهنەم و بەحەشت نینن]. ﴿٥٤﴾ و ناڤبەرا وان و یا وان دڤیا و دلێ وان دچۆیێ [ژ تۆبە و باوەری ئینانێ و قورتالبوونێ و زڤڕینا دنیایێ] هاتە ناڤبڕكرن، هەروەكی ب سەرێ هەڤالێت وان یێت بەری وان هاتی، ب ڕاستی ئەو [د دەرهەقێ دینی و پێغەمبەری و قیامەتێدا] د گۆمانگەهەكا (جهێ) گۆمانێدا بوون.

## سۆرەتا فاطر

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٤٥) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هەمی شوكور و پەسن بۆ خودێ، چێكەرێ ئەرد و ئەسمانان، ئەوێ ملیاكەتێت خودان چەنگ، دوو چەنگ و سێ چەنگ و چارچەنگ كرینە قاسد، و تشتێ خودێ بڤێت ل چێكریان زێدە دكەت، ب ڕاستی خودێ ل سەر هەمی تشتان یێ دەستهەلاتدارە. ﴿٢﴾ هەر تشتێ خودێ ژ دلۆڤانییا خۆ بدەتە مرۆڤان [ژ خزینەییێت كەرەما خۆ و ژ نیعمەتا باران و ژ تەناییێ و ژ زانین و تێگەهشتنێ... هتد]، كەس نینە ڤەگریت، و چییێ وی ڤەگرت ژی كەس نینە پشتی ڤەگرتنا وی بینیت، و ئەو ب خۆ یێ سەردەست و كاربنەجهە. ﴿٣﴾ گەلی مرۆڤان قەنجییا خودێ د گەل هەوە كری بیننە بیرا خۆ، ئەرێ چێكەرەكێ دی غەیری خودێ د ئەرد و ئەسمانیدا هەیە ڕزقێ هەوە بدەت؟ [نەخێر نینن، یێ ڕزقی ددەت بەس خودێیە]، چو پەرستییێت ڕاست و دورست ژ بلی وی نینن، ڤێجا چاوا هوین ژ هەقییێ و ئێكینیا خودێ وەردگێڕن.

وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ
ٱلْأُمُورُ ﴿٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ
ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ
عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم
مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا فَإِنَّ
ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۖ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ
حَسَرَٰتٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٨﴾ وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ
ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ
بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ۚ
إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ ۚ وَٱلَّذِينَ
يَمْكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۖ وَمَكْرُ أُو۟لَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴿١٠﴾
وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَٰجًا ۚ
وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ
وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١١﴾





﴿٤﴾ و [هـەی موحەمـەد] ئەگـەر [ملەتێ تە، قورەیشـی]
تـە درەویـن دانـن [ئەڤـە نەتشـتەكێ نویـیـە]، ب ڕاسـتی
پێغەمبەرێـت بـەری تـە ژی درەوین یـێت هاتینـە دانان،
و هەمـی كاروبـار دێ ب بـال خودێڤە زڤـڕن. ﴿٥﴾ گەلی
مرۆڤـان ب ڕاسـتی پەیمانـا خـودێ [د ڕاسـتا قیامەتـێ و
حیسـابێ و بەحەشـتێ و دۆژەهێـدا] یـا ڕاسـتە، ڤێجا بلا
ژیانـا دنیایـێ هەوە د سـەردا نەبەت و هـەوە نەخاپینیت،
و بـلا [شـەیتان] هـەوە ب [بەرفرەهیـیا دلۆڤانـی] یـا
خـودێ نەخڕینیـت. ﴿٦﴾ ب ڕاسـتی شـەیتان دژمنـێ
هەوەیـە، ڤێجـا هویـن ژی وی ب دژمـن بنیاسـن، ب
ڕاسـتی ئـەو دەسـتەكا خـۆ بـۆ هنـدێ گـازی دكـەت دا
د گـەل بچنـە دۆژەهـێ [و دا د جەهنەمێـدا ب هەڤـال
بكەڤیـت]. ﴿٧﴾ ئەوێـت گاوربوویـین بـۆ وان ئیزایـەكا
دژوار و گـران یا هـەی، و ئەوێت باوەری ئینایـین و كار
و كریارێـت ڕاسـت و دورسـت كرین، گونەهــژێبرن و
خەلاتەكـێ مـەزن بـۆ وان یـێ هـەی. ﴿٨﴾ ڤێجـا ئەرێ
ئەوێ كارێ وی یـێ خراب بۆ هاتیـیە خەملاندن، ڤێجا
ببینیت یـێ باشە [وەكی ویـیە یـێ كارێ باش و خراب
ژێـك دنیاسـیت، و نەفسـا وی و شـەیتان نەشـێن وی د سـەردا ببـەن، و كارێ خـراب د چاڤـێ ویدا بـاش بكەن؟
نەخـێر.. نەوەكـی ئێكن]، ڤێجا ب ڕاسـتی یـێ خودێ بڤێت گومڕا دكەت و یـێ بڤێت ڕاسـتەڕێ دكەت، ڤێجا
ژ خەمێـت وانـدا خـۆ د هیـلاك نەبە، ب ڕاسـتی خـودێ ئاگەهــژ وێ هەیە یـا ئەو دكـەن. ﴿٩﴾ و خودێیـە ئەوێ
بـای دهنێریـت و ئـەوران پـێ ب بـزاڤ دئێخیـت و بـەلاڤ دكـەت، ڤێجـا ئـەم بـەرێ وی ددەینـە جهەكـێ مری
(هشـك و تێنـی)، و ئـەم ئـەردی پشـتی مرنـا وی پـێ سـاخ دكەیـن، ڕابوونـا مریـیان ژی [پشـتی مرنـا وان] یـا
هۆسـایە. ﴿١٠﴾ هـەر كەسـێ هێـز و پشـتەڤانی بڤێت، ب ڕاسـتی هێـز و پێڤەهاتن هەمـی یا خودێیە [یـان ژی هەر
كەسـێ ڕێـز و ڕویمـەت و سـەرفەرازی بڤێـت بـلا پەرسـتن و گوهداریـیا خـودێ ب تنـێ بكـەت، خـودێ دێ
وی سـەرفەرازكەت]، ئاخڤتنـا خـێرێ [هەمـی چ زكـر چ داخوازكرنا باشـییێ و دانەپاشـا خرابیـیێ، چ خواندنا
قورئانـێ، چ ژی هـەر تشـتەكێ دی یـێ پاقژ و بـاش] بلند دبیتە دەڤ خودێ، و كارێ ڕاسـت و دورسـت خودێ
قەبویـل دكـەت [یان كارێ ڕاسـت و دورسـت ئاخڤتنا خـێرێ بلند دكەت، چونكـی ئەگەر ئاخڤتن نەبـوو كریار،
خـودێ وەرناگریـت و بلنـد ناكـەت، یان ژی كارێ ڕاسـت و دورسـت خودانێ خـۆ بلند دكـەت]، و ئەوێت فند
و فێـلان بـۆ خرابیـیێ دكـەن بـۆ وان ئیزایـەكا دژوار و گـران یا هەی، و فنـد و فێلێـت وان دێ پویچ بـن و نامینن
[ئـەڤ ئایەتـە ئیشـارەتە بۆ وێ پیلانا قورەیشـیـیان دانایی دەمێ پێكڤە كۆمبوویـین ، و تەكبیرا كوشـتنا پێغەمبەری
یـان گرتنـا وی یـان زیندانكـرن و حەبسـكرنا وی یـان سـەرگومكرنا وی كریـن]. ﴿١١﴾ و خودێ هویـن ژ ئاخێ
چێكـرن، پاشـی ژ چپكـەكا ئاڤێ، پاشـی هویـن كرنە ژن و مـێر [ئانكو نـێر و مێ]، و چـو ناكەڤتە زكێ چـو مێیان
و چـو مـێ بـارێ د زكـێ خـۆدا نادانن، ئەگەر ب زانـین و تەقدیـرا وی نەبیت، و ژیـیێ چو ژی درێـژان ژی درێژ
نابیـت و ژیـێ كەسـێ كێـم نابیت، ئەگەر خـودێ ئاگەهــژێ نەبیت و د دەپێ پاراسـتیدا نە یـێ نڤێسـی بیت، و
ب ڕاسـتی ئەڤـە ل بەر خـودێ یا ب ساناهیـیە.

وَمَا يَسۡتَوِي ٱلۡبَحۡرَانِ هَٰذَا عَذۡبٞ فُرَاتٞ سَآئِغٞ شَرَابُهُۥ وَهَٰذَا
مِلۡحٌ أُجَاجٞۖ وَمِن كُلّٖ تَأۡكُلُونَ لَحۡمٗا طَرِيّٗا وَتَسۡتَخۡرِجُونَ
حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَاۖ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ
وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ١٢ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ
ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي
لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ لَهُ ٱلۡمُلۡكُۚ وَٱلَّذِينَ
تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمۡلِكُونَ مِن قِطۡمِيرٍ ١٣ إِن
تَدۡعُوهُمۡ لَا يَسۡمَعُواْ دُعَآءَكُمۡ وَلَوۡ سَمِعُواْ مَا ٱسۡتَجَابُواْ لَكُمۡۖ
وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُونَ بِشِرۡكِكُمۡۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثۡلُ خَبِيرٖ ١٤
نصف الحزب ٤٤ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ
ٱلۡحَمِيدُ ١٥ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَأۡتِ بِخَلۡقٖ جَدِيدٖ ١٦
وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٖ ١٧ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ وَإِن
تَدۡعُ مُثۡقَلَةٌ إِلَىٰ حِمۡلِهَا لَا يُحۡمَلۡ مِنۡهُ شَيۡءٞ وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰٓۗ
إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَۚ
وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفۡسِهِۦۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ ١٨



﴿١٢﴾ ئەڤ هەردو دەریایە وەکی ئێك نابن، ئەڤە یا خۆش و شرینە و ئەڤە یا زێدە سویرە (شۆرە) [و نائێتە ڤەخوارن]، و ژ هەردووکان ژی هوین گۆشتەکی تەڕ دخۆن و هوین لۆلۆ و مەرجانان ژێ دەردئێخن، و دکەنە خەملا بەژنا خۆ و [تو ] گەمییێت مەزن تێدا دبینی ئاڤێ شەق دکەن و دئێن و دچن، دا هوین ژ کەرەما خودێ رزقی بۆ خۆ پەیدا بکەن و بازرگانییێ پێ بکەن، و دا هوین شوکور و سوپاسییا وی بکەن. ﴿١٣﴾ شەڤێ دئێخیتە د ناڤ ڕۆژێڕا، و ڕۆژێ دئێخیتە د ناڤ شەڤێڕا [هەردووکان هۆسا کورت و درێژ دکەت ]، و ڕۆژ و هەیڤ یێت بەر ئەمری خۆ کرین، هەر ئێك هەتا دەمەکێ دەستنیشانکری دگەڕیت، ئەوێ ڤان کاران دکەت خودێیە، خودایێ هەوە، ملك هەمی یێ ویە، و ئەوێت هوین شوینا خودێ دپەرێسن، وان تیڤلێ بەرکێ قەسپێ ژی نینە. ﴿١٤﴾ ئەگەر هوین گازی وان [بوتان] بکەن، گازییا هەوە گولێ نابن [چونکی بەرن]، و ئەگەر خۆ گولێ بین ژی بەرسڤا هەوە نادەن، و ڕۆژا ئاخرەتێ ژی [پشتی خودێ وان ب ئەزمان دئێخیت]، دێ خۆ ژ شرکا هەوە بەری کەن، و کەس وەکی منێ شارەزا، تە ئاگەهدار ناکەت. [و چ شارەزا تەئاگەهدارناکەن وەکی ڤی شارەزاییێ ئەڤە بۆ تە گۆتی کو خودێیە]. ﴿١٥﴾ گەلی مرۆڤان هوین هەوجەیی خودێنە، و خودێ ب خۆ یێ دەولەمەندە، و منەت ب کەسێ نینە و هێژایی سوپاسییێیە. ﴿١٦﴾ و ئەگەر بڤێت دێ هەوە بەت [و ناهێلیت] و خەلکەکێ نوی دێ [شوینا هەوە] ئینیت. ﴿١٧﴾ و ئەڤە [نەهێلانا هەوە و ئینانا هندەك مرۆڤێت دی شوینا هەوە] ل دەڤ خودێ نەیا ب زەحمەتە. ﴿١٨﴾ [و کەس گونەهێ ناکەت ئەگەر ل سەر نەئێتە جزاکرن] و کەس بارێ گونەها کەسێ ڕاناکەت، و ئەگەر ئێکێ بارگران [ژ گونەهان] ژ ئێکێ دی بخوازیت هندەك ژ بارێ وی ڕاکەت، ڕاناکەت، بلا خۆ مرۆڤێ وی ژی بیت. و بەس تو وان دترسینی [بەس ئەو بۆ خۆ فایدەیی ژ ئاگەهدارکرنا تە دبینن]، ئەوێت دەمێ ئەو ب تنێ [و کەس وان نەبینیت ژی] ژ خودایێ خۆ دترسن، و بەردەوام و ب ڕەنگێ پێدڤی نڤێژان دکەن، و هەر کەسێ [ب تۆبەیێ و کار و کریارێت باش و ب باوەرییێ] خۆ [ژ پیساتییا گاورییێ و گونەهان] پاقژ بکەت، ب ڕاستی ئەو بۆ خۆ، خۆ پاقژ دکەت [خێر و خەلات هەر بۆ وی دزڤرن، و خودێ چو پاکی پێ نینە]، و دویماهیك ژی هەر ب بال خودێڤەیە.

وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ﴿٢٠﴾
وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا
ٱلْأَمْوَٰتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي
ٱلْقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا
وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ
فَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ
وَبِٱلزُّبُرِ وَبِٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَخَذْتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۖ
فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٢٦﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ
مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ
جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾
وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ
إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا
رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ
أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾



﴿١٩﴾ و یــێ كـۆره و یــێ ب چـاڤ وەكـی ئێـك نیـنن
[ئـانكو خـودان بـاوەر و گـاور وەكـی ئێـك نیـنن].
﴿٢٠﴾ و تاریاتـی و ڕۆناهـی ژی (پویچـی و هەقی) وەكی
ئێـك نینـن. ﴿٢١﴾ و سـیبەر و هەتـاڤ ژی (بەحەشـت و
جەهنـەم) وەكـی ئێـك نینـن. ﴿٢٢﴾ سـاخ و مـری ژی
وەكی ئێك نینن [ئانكو یـێ سـاخ ب ئیمانێ، و یـێ مری
ب گاوریـیێ]. ب ڕاسـتی خـودێ یـێ بڤێـت گازیـیا
ڕاستیـیێ ب گوهـی دئێخیـت [و ڕاسـتەڕێ دكـەت]،
بەلـێ تـو نەشـێی مریـیێت د گۆڕانـدا وەلێ بكـەی گول
تـە ببـن. ﴿٢٣﴾ تـو بـەس پێغەمبـەر و ئاگەهداركـەری.
﴿٢٤﴾ ب ڕاسـتی [هـەی موحەمـەد] مـە تـو ب هەقیـیێ
یـێ هنارتـی، دا ببیـیە مزگینـكار و ئاگەهداركەر، و چو
ملـەت نەبووینـە ئەگـەر پێغەمبـەرەك بـۆ وان نەهاتبیـت.
﴿٢٥﴾ و ئەگـەر ئـەو تـە درەویـن دانـن [و بـاوەر ژ تـە
نەكـەن، خەمـێ نەخـۆ]، ب ڕاسـتی ئەوێـت بـەری وان
ژی پێغەمبەرێـت خـۆ درەویـن دانـان، پێغەمبەرێـت وان
ب نیشـانێت ئاشـكەرا و ب كتێبێت ئەسمـانی و ب كتێبا
ڕۆنكەرڤـە [وەكـی تەوراتـێ و ئنجیلێ] بـۆ وان هاتبوون
[دگـەل هنـدێ ژی پێغەمبەرێـت خۆ درەویـن دانان]. ﴿٢٦﴾ پاشـی مە ئەوێت گاوربوویـین ئیـزادان، ڤێجا بەرێ
خـۆ بدەیـێ كا نەڕازیبوونـا مـن و ئیزایـا من ل سـەر وان یا چاوا بـوو؟. ﴿٢٧﴾ ما تـو نابینی كو ب ڕاسـتی خودێ
بـاران ژ ئەسمـانی دارێـت، و مـە گەلە فێقیـیێ ڕەنگ ڕەنگ پێ دەرئێخسـت [هـەر چەندە ئێك ئاڤـە، بەلێ فێقی
نەوەكـی ئێكـە]، و مـە چیـا ژی ب ڕێـك و ڕێزێـت سپی و سـۆر و زێـدە ڕەشـێت، ڕەنـگ نەوەكـی ئێـك یـێت
چێكریـن [ئانكـو ژ بـلی فێقـی مە جودایـی یا ئێخستیـیە د چیایان ژیـدا]. ﴿٢٨﴾ و مـە مرۆڤ و جانـەوەر و كەوال
و پـێرە ژی هۆسـا نەوەكهـەڤ یـێت چێكریـن، ب ڕاسـتی ژ بەندەیـێت وی بـەس زانـا ب دورسـتی ژ خـودێ
دترسـن، ب ڕاسـتی خودێ یـێ سەردەسـت و گونەهـژێبەرە. ﴿٢٩﴾ ب ڕاسـتی ئەوێـت بـەردەوام كتێبا خودێ
[كـو قورئانـە] دخوینـن، و بـەردەوام و ب ڕەنگـێ پێدڤی نڤێـژان دكەن، و ژ ڕزقێ مە دایـییە وان ب ئاشـكەرایی
و ب بەرزەیـیڤە ددەن، ئەڤـە بازرگانیـیەكا بـێ زیـان كـو نەشـكێت، دخـوازن. ﴿٣٠﴾ [ئـەو ڤێ دكـەن] دا خودێ
خەلاتـێ وان ب دورسـتی بدەتـە وان، و ژ كەرەمـا خـۆ پـتر ژی بدەتە وان، ب ڕاسـتی ئـەو گونەهـژێبـەر و زێدە
شـوكوردارە [ئانكـو بەرانبـەری تشـتێ كێـم گەلەكـێ ددەت].

وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ هُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ
يَدَيۡهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرُۢ بَصِيرٞ ﴿٣١﴾ ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ
ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ فَمِنۡهُمۡ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ وَمِنۡهُم
مُّقۡتَصِدٞ وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ
ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا يُحَلَّوۡنَ
فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗاۖ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ﴿٣٣﴾
وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ
شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِيٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلۡمُقَامَةِ مِن فَضۡلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا
فِيهَا نَصَبٞ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٞ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ
نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقۡضَىٰ عَلَيۡهِمۡ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُم مِّنۡ
عَذَابِهَاۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي كُلَّ كَفُورٖ ﴿٣٦﴾ وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ
فِيهَا رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ
أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ
فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ
غَيۡبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٣٨﴾





﴿٣١﴾ و ئەوا مە ژ ڤێ كتێبێ [كو قورئانە] بۆ تە ب وەحی هنارتی، ب ڕاستی هەر ئەوە هەقی [و گۆمان تێدا نینە] و ڕاستدەرئێخا كتێبێت بەری خۆیە [كو ئنجیل و تەوراتن]، ب ڕاستی خودێ شارەزا و بینەرێ بەندەیێت خۆیە. ﴿٣٢﴾ پاشی مە ئەڤ قورئانە دا ملەتێ تە و مە دا وان ئەوێت مە ژ ناڤ بەندەیێت خۆ هەلبژارتین، ڤێجا هندەك ژ وان ستەمكارن بۆ خۆ [ئەون ئەوێت خودانێت گونەهێت مەزن]، و هندەك ژ وان ناڤنجینە [د كاروبارێت دینیدا]، و هندەك ژ وان ب دەستویرییا خودێ لەزێ ل قەنجییان دكەن و بەردەوام دبن ل سەر، و ئەڤەیە (دانا قورئانێیە) كەرەما مەزن. ﴿٣٣﴾ [خەلاتێ وان] بەحەشتێت ئاكنجیبوونێنە دێ چنە تێدا، و خەملا وان د وێ بەحەشتێدا: بازنێت زێری و لۆلۆنە، و جلكێ وان تێدا ئارمویشە. ﴿٣٤﴾ و ئەو دێ بێژن: هەمی شوكور و پەسن بۆ خودێ، ئەوێ هەمی خەمێت مە ڤەڕەڤاندین و نەهێلایین، ب ڕاستی خودایێ مە گونەهـ ژێبەر و خەلاتبەخشە (خەلاتدەهە). ﴿٣٥﴾ [ئەو خودایێ] ژ كەرەما خۆ ئەم كرینە د بەحەشتا ئێورینێدا، نە وەستیان تێدا دگەهیتە مە و نە كەرخین. ﴿٣٦﴾ و ئەوێت گاوربووین ئاگرێ دۆژەهێ بۆ وانە، نە وان تمام دكەت دا بمرن [و پێ ڕەحەت ببن]، و نە ئێزایا وێ ل سەر وان سڤك دبیت، هۆسا ئەم هەمی زێدە گاوران ئێزا ددەین. ﴿٣٧﴾ و تێدا دبیتە هەوار هەوارا وان [و دبێژن]: خودێوۆ مە دەربێخە، دا ئەم كارێ ڕاست و دورست بكەین، نە ئەوێ بەری نوكە مە دكر، [خودێ دێ بێژیتە وان] ما مە هند دەرفەت و ژی [د دنیایێدا] نەدا هەوە، كو یێ بڤێت تێدا ل خۆ بزڤریت، ل خۆ بزڤریت و پێغەمبەر ژی بۆ هەوە هاتبوون [كو هەوە ژ ڤی جهی بترسینن]، دێ ڤێجا بخۆن و تامكەنێ، ب ڕاستی چو هاریكار و پشتەڤان بۆ ستەمكاران نینن. ﴿٣٨﴾ ب ڕاستی خودێ زانایێ غەیبا ئەرد و ئەسمانانە، و ئاگەهداری وێیە یا د سینگاندا ڤەشارتی.

هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَلَا
يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ
كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا ﴿٣٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن
دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ ۚ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ
بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا ۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ
إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤١﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَهُمْ
نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ
مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤٢﴾ ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ ۚ
وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ
ٱلْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾
أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن
قَبْلِهِمْ وَكَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَىْءٍ
فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴿٤٤﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٤٤



﴿٣٩﴾ و ئـەوە یـێ هویـن د ئەردیـدا کرینـە وێرسـێت
ملەتێـت بـۆری، ڤێجا ئـەوێ گاور ببیـت زیانا گاوریـیا
وی بـۆ ویـیە، و گاوریـیا گـاوران ل دەڤ خـودێ ژ بلی
کـەرب و نەڤیانـێ چـو ل وان زێـدە ناکـەت، و گاوریـیا
گـاوران ژ خوسـارەتی و زیانـێ پێڤەتـر چـو یـێ دی
ل وان زێـدە ناکـەت. ﴿٤٠﴾ [هـەی موحەمـەد] بێـژە:
[گـەلی مـوشرکان] بێژنـە مـن هەڤپشـکێت هـەوە ئەوێت
هویـن شـوینا خـودێ دپەرێسـن، کا وان چ ژ ئـەردی
دایـییە؟! یان ژی وان پشکداریـیەك د ئەسمـاناندا هەیە
[د چێکـرن و خودانیـیا وانـدا]، یـان ژی مـە کتێبـەك بۆ
وان ئینایـییە، و ئـەو پـێ [ل سـەر شرکا خـۆ] خـودان
بەلگـە و نیشـانن؟! نەخـێر [چـو تشـتێ وەسـا نینـە دا
ئـەو وان بـۆ خـودێ بکەنـە هەڤپشـك] بەلێ سـتەمکار ژ
پەیمانێـت درەو یـێت خاپاندنـێ پێڤەتـر نادەنـە ئێکـدو.
﴿٤١﴾ ب ڕاسـتی خودێیـە ئـەرد و ئەسمـانان ڕادگریـت
کـو نەکەڤـن، و ئەگـەر بکەڤـن ژی کـەس نینـە ژ بـلی
وی وان [هـەردووکان] ڕابگریـت، ب ڕاسـتی خـودێ
یـێ بێنفرەهـە لـەزێ ل جزاکرنـێ ناکەت و یـێ گونەهـ
ژێبـەرە. ﴿٤٢﴾ و [قورەیشیـیان بـەری هاتنـا پێغەمبـەری] ژ کەل سـویند خوارن [پشـتی زانین جوهـی و فەلەیان
پێغەمبەرێـت خـۆ درەویـن یـێت دانایـین] کـو ئەگـەر پێغەمبەرەك بـۆ وان هاتبایـە، ئـەو دا ژ جوهـی و فەلەیان
ڕاسـتەڕێتر بـن [یـان دا زوی ڕاسـتەڕێ بـن و باوەریـیێ ب پێغەمبەرێ خۆ ئینـن]، ڤێجا وەختـێ پێغەمبەر بۆ وان
هاتـی چـو ل وان زێدەنەکر ژ هنـدێ پێڤەتر، کو پتر ژ هەڤیـیێ دویرکەڤتن. ﴿٤٣﴾ [دویرکەڤتنـا وان ژ پێغەمبەری،
و بـاوەری نەئینـا وان ب پەیامـا وی، نـە ژ بەر هنـدێ بوو کـو وان پێغەمبەر حاشـا درەوین ددانابوو، بەلـێ] ژ بەر
خۆمەزنکرنـێ د ئەردیـدا و ژ بـەر خرابـی گێڕانـێ [د دەرهەقـێ پێغەمبـەری و موسـلمانانـدا] بـاوەری نەئینان، و ژ
هەڤیـیێ دویرکەڤتـن، و پیلانگێڕانا خـراب ژ خودانێ خۆ پێڤەتر کەسـێ ناهنگێڤیت، ئەرێ ئەو ل هیڤیـیا هندێنە
دویماهیـکا یـێت بۆریـن ب سـەرێ وان بهێـت، ڤێجا تـو چ گوهۆڕینێ بـۆ ڕێکا خـودێ نابینی [ئـەو وی ملەتی د
هیـلاك دبـەت ئـەوێ د ڕێـکا پێغەمبـەرێ خـۆدا ڕادوەسـتیت] و تـو نابینی ئێزایـا خـودێ ژ هندەکان [کـو هێژای
ئێزایـێ بـن] بـۆ هندەکێت دی بێتـە ڤەگوهاسـتن. ﴿٤٤﴾ ئەرێ ما ئـەو د ئەردیدا ناگـەڕن (نائێن، ناچـن)، دا ببینن
کا دویماهیـیا یـێت بـەری وان یـا چـاوا بـوو؟ و ئـەو ژ وان ب هێزتر بوون، و تشـتەك نینـە د ئەرد و ئەسمـاناندا
بشـێت خـودێ نەچـار بکـەت وان ئێـزا نـەدەت، ب ڕاسـتی خودێ یـێ زانـا و پێڤەهاتیـیە.

وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهۡرِهَا
مِن دَآبَّةٖ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ فَإِذَا
جَآءَ أَجَلُهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرَۢا ٤٥

## سُورَةُ يسٓ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يسٓ ١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ٢ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٣ عَلَىٰ
صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٤ تَنزِيلَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ٥ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا
مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمۡ فَهُمۡ غَٰفِلُونَ ٦ لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ
فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٧ إِنَّا جَعَلۡنَا فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ أَغۡلَٰلٗا فَهِيَ إِلَى
ٱلۡأَذۡقَانِ فَهُم مُّقۡمَحُونَ ٨ وَجَعَلۡنَا مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ سَدّٗا
وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ سَدّٗا فَأَغۡشَيۡنَٰهُمۡ فَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ٩ وَسَوَآءٌ
عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ١٠ إِنَّمَا تُنذِرُ
مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكۡرَ وَخَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِۖ فَبَشِّرۡهُ بِمَغۡفِرَةٖ
وَأَجۡرٖ كَرِيمٍ ١١ إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ
وَءَاثَٰرَهُمۡۚ وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ ١٢





﴿٤٥﴾ ئەگەر خودێ مرۆڤان ژ بەر کار و کریارێت وان کرین [ژ گونەهـ و خرابییان] ئێزا دابانە، چو خودان ڕوح ل سەر ڕوییێ ئەردی نەدهێلان، بەلێ وان بۆ وەختەکێ ڤەبڕی گیرۆ دکەت [کو ڕۆژا قیامەتێیە]، ڤێجا ئەگەر وەختێ وان هات [هەر ئێک ل دویڤ کارێ خۆ دێ ئێتە جزاکرن]، و خودێ ئاگەهـ ژ بەندەیێت خۆ هەیە [و دزانیت هەر ئێک هێژایی چییە].

## سۆرەتا یاسین

### ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٨٣) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هۆسا دئێتە خواندن (یاسین)، و ل دۆر ڕاڤەکرنا ڤان ڕەنگەتیپان ل دەستپێکا سۆرەتا بەقەرە بزڤرە. ﴿٢﴾ سویند ب قورئانا ئایەتێت وێ ڕامان موکوم و ب ڕێك و پێك. ﴿٣﴾ ب ڕاستی [هەی موحەمەد] تو ژ پێغەمبەرانی. ﴿٤﴾ تو یێ ل سەر ڕێکا ڕاست. ﴿٥﴾ ڕێکا خودایێ سەردەست و دلۆڤان هنارتی. ﴿٦﴾ [مە تو هنارتی و مە وەحی بۆ تە فرێکر، و قورئان بۆ تە ئینا خوارێ] دا ملەتەکی [کو قورەیشییێت سەردەمێ پێغەمبەری بوون] ئاگەهدار بکەی، [و دا بۆ وان بییە پێغەمبەر] بەری تە، چو پێغەمبەر بۆ باب و باپیرێت وان نەهاتبوون ژ بەر هندێ د بێ ئاگەهن [ژ باوەرییێ و ڕێکا ڕاست]. ﴿٧﴾ ب سویند باراپتر ژ وان هێژای ئیزاییێ بوون، ژ بەر ڕژدییا وان ل سەر بێ باوەرییێ. ﴿٨﴾ ب ڕاستی مە ستۆییێت وان یێت ئێخستینە د قەید و زنجیراندا، ئەو قەید و زنجیر هەتا ئەرزنکێنە، ڤێجا ستۆییێت وان بلندن و نەشێن بچەمینن، [ژ بەر قەید و زنجیران]. ﴿٩﴾ و مە ل پێشییا وان ناڤبڕەك دانا، و مە ل پشت وان ناڤبڕەك دانا، و مە پەردەیەك ئێخستە بەر چاڤێت وان، ڤێجا ئەو [هەقییێ] نابینن. ﴿١٠﴾ [ژ بەر گاورییا وان] ل دەڤ وان ئێکە تو وان بترسینی یان نەترسینی هەر باوەرییێ نائینن. ﴿١١﴾ تو ب تنێ وی دترسینی و ئاگەهدار دکەی [ئانکو ب تنێ ئەو بۆ خۆ مفایی ژ ترساندنا تە وەردگریت] ئەوێ ل دویڤ قورئانێ دچیت، و وەختێ ئەو ب تنێ و ب نهێنی ژ خودایێ دلۆڤان دترسیت، ڤێجا ئەوێ هۆسا مزگینییا گونەهـ ژێبرنێ و خەلاتەکێ ب ڕێز و ڕویمەت بدە وی. ﴿١٢﴾ ب ڕاستی ئەمین مرییان ساخ دکەین، و کریارێت وان [د ژیانا خۆدا کرین] و یێت [پشتی مرنا خۆ] ب پاش خۆڤە هێلایین، ئەم هەمییان دنڤیسین و هەمی تشت [ژ کار و کریارێت بەندەیان] مە یێت د کتێبەکا دیارکەردا [مەحسەدێ پێ دەپێ پارستییە] هەژمارتین و دیارکرین [ئانکو ب هەژمار مە یێت نڤیسین].

وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿١٣﴾
إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ
إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ ﴿١٤﴾ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا
وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ ﴿١٥﴾ قَالُواْ
رَبُّنَا يَعۡلَمُ إِنَّآ إِلَيۡكُمۡ لَمُرۡسَلُونَ ﴿١٦﴾ وَمَا عَلَيۡنَآ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ
ٱلۡمُبِينُ ﴿١٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ
وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٨﴾ قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ أَئِن
ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ
رَجُلٞ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٠﴾ ٱتَّبِعُواْ
مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ
ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢٢﴾ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً
إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا
وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ إِنِّيٓ ءَامَنتُ
بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ﴿٢٥﴾ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي
يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴿٢٧﴾



﴿١٣﴾ [هـەی موحەمـەد] بـۆ قورەیشیـیان سەرهاتیـیا
خەلکـێ وی گونـدی [گونـدێ ئەنتاکیـا، ئـەوێ نوکـە
دکەڤیتـە تورکیـا] ڤەگـێڕە، وەختـێ پێغەمبـەر بـۆ هاتین.
﴿١٤﴾ وەختـێ مـە دو [پێغەمبـەر] بـۆ وان هنارتین، و وان
هـەردو درەوین دانایـین، مە یـێ سێیـێ بۆ پشتەڤانیـیا
وان هنـارت، و گۆتـن: ب ڕاسـتی ئـەم بـۆ هـەوە یـێت
هاتینـە هنارتـن. ﴿١٥﴾ [خەلکـێ ئەنتاکیـا] گۆتـن: ب
ڕاسـتی هوین ژی مرۆڤـن وەکی مە، و خودایـێ دلۆڤان
چو تشـتێ وەسـا نەهنارتیـیە [هوین پێ ژ مـە چێتر بن]،
و هویـن ژ درەوێ پێڤەتر نابێژن. ﴿١٦﴾ گۆتن: خودایـێ
مـە دزانیـت ئەم بـۆ هـەوە یـێت هاتینـە هنارتـن [ئەگەر
ئـەم درەویـن باینـە خـودێ بـۆ مـە نەدهێـلا]. ﴿١٧﴾ و ژ
گەهاندنـا ڤێ پەیاما ئاشـکەراکەر پێڤەتر، تشـتەکێ دی ل
سـەر مە نینە [و ئەڤـە مە گەهانـد]. ﴿١٨﴾ و گۆتن: [گەلی
هنارتیـیان] ب ڕاستی ئەم بێ وەغەریـیا (بێ ئێغبالیـیا)
خـۆ ژ هـەوە دبینـین، و ئەگـەر هویـن ڤـێ نەهێلـن ئەڤـا
هویـن دبێـژن هویـن بـەس نەکـەن، ب ڕاسـتی دێ هەوە
بەربـاران کەیـن، و دێ ئێزایەکا مەزن ژ مـە گەهیتە هەوە.
﴿١٩﴾ پێغەمبـەران گـۆت: بـێ وەغەریـیا هـەوە یـا د گەل هـەوە [ئەو ژی گاوریـیا هەوەیـە، و هویـن ب خۆنە]
ئـەرێ هـەر گاڤـەکا هوین هاتنە شـیرەتکرن [و هویـن ژ دویڤاهیـکا کرێت هاتنە ترسـاندن] دێ بێ وەغەریـیا خۆ
ژ مـە بینـن، و گەفـان ل مـە کەن، وەسـا نینـە وەکی هویـن دبێژن و هزر دکـەن، بەلێ هویـن ب خۆ ملەتەکـێ زێدە
سەرداچۆیـینە. ﴿٢٠﴾ زەلامـەك ژ دویڤاهیـیا باژێـری ب لـەز دهـات، گـۆت: گەلی ملەتـێ من گوهێ خـۆ بدەنە
ڤـان هنارتیـیان (پێغەمبـەران). ﴿٢١﴾ گوهـێ خۆ بدەنـە وان ئەوێت چـو کرێیـان [بەرانبەری خێرا بۆ هـەوە دڤێن
و دبێـژن] ژ هـەوە نەخـوازن، و ل سـەر ڕێـکا ڕاسـتن. ﴿٢٢﴾ و مـا بـۆچ ئـەز وی ناپەرێسـم یـێ ئـەز چێکریـم و
دایـیم، و هویـن هەمـی هـەر دێ ب بـال ویڤە زڤـڕن [بۆچ هوین وی ناپەرێسـن ئـەوێ هوین دایـین، و هەر دێ
پشـتی مرنـێ ب بـال ویڤە زڤـڕن]. ﴿٢٣﴾ ئـەرێ ئەز هنـدەك پەرستیـیێت دی شـوینا وی بپەرێسـم؟! [نەخێر ئەز
وەناکـەم] ئەگـەر خودایـێ دلۆڤـان نەخۆشیـیەك بۆ من بڤێت، بەرەڤانیـیا وان قـەت فایدەی من ناکـەت و چو ژ
مـن نادەتـە پـاش، و ئەو نەشـێن من قورتـال ژی کەن. ﴿٢٤﴾ [ئەگـەر ئەز غەیری وی بپەرێسـم] ب ڕاسـتی هنگی
ئـەز یـێ د گومڕایـیيەکا ئاشـکەرادا. ﴿٢٥﴾ ب ڕاسـتی من باوەری ب خودایـێ هـەوە ئینا، ڤێجا هـەوە گول من
هەبیـت [دا هویـن ڕۆژا قیامەتـێ بـۆ مـن ببنـە شـاهد]. ﴿٢٦﴾ [ملەتـێ وی پشـتی ئـەڤ ئاخڤتنە ژێ گولـێ بووی
کوشـت، ڤێجـا پشـتی هاتیـیە کوشـتن] خودێ گۆتـێ هـەرە د بەحەشـتێدا [ڤێجـا وەختـێ چۆیە د بەحەشـتێدا]
گـۆت: خـۆزی ملەتـێ مـن زانیبایـە. ﴿٢٧﴾ کا چـاوا خودایـێ مـن گونەهێـت مـن ژێ بـرن، و کا چ قـەدر دا من
[وەختـێ ئـەڤ کەرەمـە د گەل مـن کری].

۞وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِن جُندٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا
مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾
يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ
يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ
أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿٣١﴾ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٣٢﴾
وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلْأَرْضُ ٱلْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَٰهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا
فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ
وَأَعْنَٰبٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ ٱلْعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأْكُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦ
وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى
خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ
وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ
فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا
ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ
عَادَ كَٱلْعُرْجُونِ ٱلْقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ
ٱلْقَمَرَ وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾



﴿٢٨﴾ و پشتی کوشتنا وی مە چو لەشکەر ژ ئەسمانی
[بۆ نەهێلانا وان] ب سەر ملەتێ ویدا نەئینا خوار و
مە نەدئینا خوار ژی [چونکی ئەو ژ هندێ کێمترن].
﴿٢٩﴾ هەما هندبوو تنێ هشکەقێرییەکێ ئەو
هنگاڤتن، ڤێجا ئێکسەر تەمرین [ئانکو مرن و بێ
دەنگ بوون، وەکی ئاگری وەختێ ڤەدمریت].
﴿٣٠﴾ مخابن بۆ وان بەندەیان، چو پێغەمبەر بۆ وان
نەدهاتن وان ترانە بۆ خۆ پێ نەکربان. ﴿٣١﴾ ما وان
نەددیت کا مە چەند ملەت بەری وان د هیلاك بربوون،
و ئەو جارەکا دی نازڤرنە دنیایێڤە. ﴿٣٢﴾ و ب ڕاستی
ئەو هەمی ل دەڤ مە دێ بەرهەڤ بن. ﴿٣٣﴾ و ئەردێ
هشك و مری بۆ وان نیشان و بەلگەیەکە [کو خودێ
دێ مریان ژ گۆڕان ڕاکەتەڤە]، ئەم وی ئەردی [پشتی
مرنا وی، ب بارانێ] ساخ دکەین و شین دکەینەڤە،
ڤێجا مە دان و دەرامەت بۆ وان ژ ئەردی دەرئێخست،
و ئەو ژێ دخۆن و پێ دژین. ﴿٣٤﴾ و مە جنیکێت
دارقەسپان و ییێت تری کرنە تێدا، و مە گەلە کانی ژێ
دەرئێخستن. ﴿٣٥﴾ دا ژ فێقییێ وان جنیکان و تشتێ
وان ژێ چێکری [وەکی خۆشاڤێ و دۆشاڤێ] بخۆن، ئەرێ ڤێجا ما سوپاسیا خودێ ناکەن؟! ﴿٣٦﴾ پاك و
پاقژی [ژ هەمی کێماسیان و ژ تشتێ نەهێژا] بۆ وی خودایی ئەوێ هەمی تشت جۆت [نێر و مێ] داین، چ
ژ وی یێ ئەرد شین دکەت، و چ ژ وان ب خۆ [کو کرینە ژن و مێر]، و چ ژ وی یێ ئەو نەزانن. ﴿٣٧﴾ و شەڤ
ژی بۆ وان بەلگە و نیشانەکا دییە [ل سەر شیان و دەستهەلاتداریا خودێ]، ئەم ڕۆژێ ژێ دەردئێخین، ڤێجا
ئەو دمینن د تارییێدا. ﴿٣٨﴾ [و نیشانەکا دی ژی بۆ وان] ڕۆژ ژی بەر ب بنەجهیا خۆ دچیت [ئەوا خودێ
بۆ دانایی و ژێ دەرناکەڤیت]، ئەڤە ژ دانانا خودایێ سەردەست و زانایە. ﴿٣٩﴾ و هەیڤ ژی مە چۆنا وێ
یا کرییە قویناخ قویناخ [هەر شەڤەکێ یا ل جهەکی، د شەڤا دویماهییێدا جارەکا دی وەکی دەستپێکێ لێ
دئێتەڤە]، و هۆسا قویناخ قویناخ دچیت هەتا جارەکا دی وەکی بستیکا ئویشییێ قەسپێ یێ کەڤن لێ دئێت.
﴿٤٠﴾ نە بۆ ڕۆژێ دبیت، بگەهیتە هەیڤێ، و نە بۆ شەڤێ ژی دبیت، بەری ڕۆژێ بێت، و هەر ئێك د چەرخا
خۆدا دزڤریت.

وَءَايَةٞ لَّهُمۡ أَنَّا حَمَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقۡنَا
لَهُم مِّن مِّثۡلِهِۦ مَا يَرۡكَبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِن نَّشَأۡ نُغۡرِقۡهُمۡ فَلَا صَرِيخَ لَهُمۡ
وَلَا هُمۡ يُنقَذُونَ ﴿٤٣﴾ إِلَّا رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا
قِيلَ لَهُمُ ٱتَّقُواْ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيكُمۡ وَمَا خَلۡفَكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٤٥﴾
وَمَا تَأۡتِيهِم مِّنۡ ءَايَةٖ مِّنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِمۡ إِلَّا كَانُواْ عَنۡهَا
مُعۡرِضِينَ ﴿٤٦﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنُطۡعِمُ مَن لَّوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطۡعَمَهُۥٓ إِنۡ
أَنتُمۡ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ
صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ تَأۡخُذُهُمۡ وَهُمۡ
يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ تَوۡصِيَةٗ وَلَآ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ
يَرۡجِعُونَ ﴿٥٠﴾ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ
يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرۡقَدِنَاۜۗ هَٰذَا مَا وَعَدَ
ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٥٢﴾ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ
وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ جَمِيعٞ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ ﴿٥٣﴾ فَٱلۡيَوۡمَ لَا تُظۡلَمُ
نَفۡسٞ شَيۡـٔٗا وَلَا تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٥٤﴾

سكتة لطيفة على الألف



﴿٤١﴾ و نیشـانەکا دی بۆ وان، مە دویندەها وان د گەمیـیا
بارکریـدا هەلگرتـن [یـان مە بابێـت وان د گـەل نووحی
د گەمیـیا تژیـدا قورتالکـرن]. ﴿٤٢﴾ و مـە بۆ وان تشـتێ
وەکی گەمیـیێ یـێ ئـەو لێ سـوار دبـن دان و چێکرن.
﴿٤٣﴾ و ئەگـەر مـە بڤێـت ئـەم دێ وان [د ئاڤێـدا]
خەندقینـین، کـو کـەس نەبیت د هـەوارا وان بێـت، و نە
ئـەو دئێنە قورتالکـرن. ﴿٤٤﴾ [ئانکو نائێنـە ڕزگارکرن] ژ
بـلی هندێ ئەم دلۆڤانیـیەکێ ژ دەڤ خـۆ ب وان ببەین، و
دا خۆشیـیێ ب ژیانـێ ببـەن هەتا وەختەکـێ ڤەبڕی [کو
وەختـێ مرنا وانـە]. ﴿٤٥﴾ و هـەر وەختەکـێ پێغەمبەری
دگۆتـە وان: خـۆ ژ ئیزایـا دنیایـێ و یا ئاخرەتـێ بپارێزن
[بترسـن و وی تشـتی نەکـەن یـێ هویـن پـێ هێژایـی
ئێـك ژ هـەردو ئیزایـان ببـن]، دا دلۆڤانـی ب هـەوە
بێتـە بـرن [بەلـێ هـەوە گوهـداری نەدکـر و بـەرێ خـۆ
وەردگـێڕا]. ﴿٤٦﴾ و چـو بەلگـە و نیشـان ژ نیشـانێت
خودایـێ وان بـۆ وان نەدهاتـن، ئەگەر وان ڕوییـێ خۆ
ژێ وەرنەگێڕابایـە. ﴿٤٧﴾ و ئەگـەر بێژنـە وان: ژ ڕزقـێ
خودێ دایـییە هـەوە د ڕێـکا خێرێدا بمەزێـخن ئەوێت
گاوربوویـین دێ بێژنـە ئەوێـت بـاوەری ئینایـین: ئەم چـاوا خوارنـێ بدەینە وی ئـەوێ ئەگەر خـودێ بڤێت دێ
دەتـێ [ئانکـو مـادەم خودێ نەدایـییێ ئەم ژی نادەینێ و خودێ یـێ ڤیایی یـێ برسـی بیت، ڤێجا چـاوا ئەم دێ
دژی حەزکرنـا خـودێ ڕابـین]، ب ڕاسـتی هویـن [گـەلی خـودان باوەران ب ڤـێ داخـوازا هوین ژ مـە دخوازن]
یـێ د خەلەتـی و گومڕایـییەکا ئاشـکەرادا. ﴿٤٨﴾ و دبێـژن: کا کەنگی ئەو ژڤـان و پەیمان [ئانکـو ڕۆژا قیامەتێ]
دێ ئێـت ئەگـەر هویـن ژ ڕاسـتگۆیانن. ﴿٤٩﴾ ئـەو بـەس یـێ ل هیڤیـیا هشکەقێڕیـیەکێ ب تنێ [پڤـا ئێکێیە ل
بۆقـێ] وان بگریـت، و ئـەو ب جڕەبڕێڤـە [و ئـەو ژ ئاخرەتێ د بـێ ئاگەهــ]. ﴿٥٠﴾ ڤێجا [دەمێ ئـەو ڕۆژ دهێت]
ئـەو نەشـێن قەویاتیـیەکێ بکـەن [ئانکـو وەسیەتەکێ ل کـەس و کارێـت خـۆ بکـەن کا چ وان هەیە و چ ل سـەر
وان هەیـە]، و نەشـێن بزڤڕنـە مـالا خـۆ ژی [دەڤ کـەس و کارێـت خـۆ هنـدی هاتنـا ڕۆژا قیامەتێ یـا ب لەزە].
﴿٥١﴾ وەختـێ پـف ل بۆقـێ هاتـەدان [پفکرنـا ڕابوونـێ ژ گـۆڕان]، وێ گاڤـێ هەمـی ب لـەز دێ ژ گـۆڕان
دەرکەڤـن، و قەسـتا خودایـێ خـۆ کـەن. ﴿٥٢﴾ دێ بێـژن: وەی خـۆلی ب مـە وەربیـت، کـێ ئـەم ژ گۆڕێـت مـە
ڕاکریـن؟ [دێ بەرسـڤا وان هێتـە دان] ئەڤـە ئـەوە یـا خودایـێ دلۆڤـان پەیـمان پـێ دایـی، و پێغەمبەران ڕاسـت
دگـۆت. ﴿٥٣﴾ [ڕابوونـا ژ گـۆڕان] ژ پفەکـێ ب تنـێ پێڤەتـر نەبـوو، و هنگـی ئـەو هەمـی ل دەڤ مـە دێ ئێنـە
حازرکـرن. ﴿٥٤﴾ و ئەڤـرۆ [ئانکـو د ڕۆژا قیامەتێدا] چو سـتەم ل کەسـێ نائێتەکـرن، و هوین نائێنـە خەلاتکرن و
جزاکـرن، ب وان کار و کریـاران نەبیـت یـێت هـەوە کریـن.

إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ ٥٥ هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ
فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ٥٦ لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ
وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ٥٧ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ٥٨ وَٱمۡتَٰزُواْ
ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٥٩ ۞أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ
أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٦٠ وَأَنِ
ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ٦١ وَلَقَدۡ أَضَلَّ مِنكُمۡ
جِبِلّٗا كَثِيرًاۖ أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ ٦٢ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي
كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ٦٣ ٱصۡلَوۡهَا ٱلۡيَوۡمَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ٦٤
ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم
بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ٦٥ وَلَوۡ نَشَآءُ لَطَمَسۡنَا عَلَىٰٓ أَعۡيُنِهِمۡ
فَٱسۡتَبَقُواْ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبۡصِرُونَ ٦٦ وَلَوۡ نَشَآءُ لَمَسَخۡنَٰهُمۡ
عَلَىٰ مَكَانَتِهِمۡ فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مُضِيّٗا وَلَا يَرۡجِعُونَ ٦٧
وَمَن نُّعَمِّرۡهُ نُنَكِّسۡهُ فِي ٱلۡخَلۡقِۚ أَفَلَا يَعۡقِلُونَ ٦٨ وَمَا
عَلَّمۡنَٰهُ ٱلشِّعۡرَ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُۥٓۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ وَقُرۡءَانٞ مُّبِينٞ ٦٩
لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيّٗا وَيَحِقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٧٠

الحزب ٤٥



﴿٥٥﴾ و بەحەشتی ئەڤرۆ ب خۆشیانڤە یێت مژویلن.
﴿٥٦﴾ ئەو و هەڤسەرێت خۆ ل بەر سیبەران و ل سەر
تەختان یێت پالدایینە. ﴿٥٧﴾ وان د بەحەشتێدا هەمی
رەنگێت فێقی یێت هەین، و هەر تشتێ ئەو بخوازن.
﴿٥٨﴾ و سلاڤ، ب گۆتن ژ دەڤ خودایێ دلۆڤان،
ل وان دئێتەکرن. ﴿٥٩﴾ گەلی گونەهکاران ئەڤرۆکە
خۆ بدەنە رەخەکی [و ژ خودان باوەران جودا ببن].
﴿٦٠﴾ گەلی دویندەها ئادەمی ما من فەرمانا هەوە
نەکربوو هوین شەیتانی نەپەرێسن، و گوهێ خۆ
نەدەنێ، بێ گۆمان ئەو بۆ هەوە دژمنەکێ ئاشکەرایە.
﴿٦١﴾ و هوین من بپەرێسن، ئەڤەیە رێکا راست.
﴿٦٢﴾ ب سویند [شەیتانی] گەلەك مرۆڤ ژ هەوە
یێت د سەردابرین و گومراکرین، ما هەوە عەقل
نەبوو بزانن دژمنە؟! ﴿٦٣﴾ ئەڤە ئەو جەهنەمە ئەوا
[هوین د دنیایێدا و ل سەر ئەزمانێ پێغەمبەران] سۆز
و پەیمان بۆ هەوە پێ دهاتە دان. ﴿٦٤﴾ دێ ئەڤرۆ
هەرنە تێدا و تامکەنە گەرما وێ، ژ بەر وێ گاوریێ
ئەوا هەوە دکر. ﴿٦٥﴾ ئەڤرۆ ئەم دێ دەڤێت وان
مۆرکەین [کو دەڤێت وان بێنە گرتن و نەشێن باخڤن]، ڤێجا دەستێت وان دێ د گەل مە ئاخڤن، و پێیێت
وان دێ شادەیییێ دەن کا وان چ دکر. ﴿٦٦﴾ و ئەگەر مە ڤیابایە دا چاڤێت وان [قوریشیان] کۆرەکەین، ب
وێ کۆرەیێڤە بکەڤنە سەر رێکێ [دا وەکی هەر جار بچن]، ما چاوا دێ [رێکێ] بینن [و چاڤێت وان یێت
هاتینە کۆرەکرن]، [ئانکو ئەگەر مە ڤیابایە دا وان کۆرەکەین ژ راستەرێییێ، کربانە و نەکربانە راستەرێ
نەبووبانە]. ﴿٦٧﴾ و ئەگەر مە ڤیابایە دا وان د جهێ کرنا گونەهێدا گوهۆرین و کەینە تشتەکێ دی، کو وان
نەشیابایە نە بچن، نە بزڤرنەڤە. ﴿٦٨﴾ و هەر کەسێ ئەم ژی درێژ ژی بکەین، دێ سەر و دێم و خولکێ وی
گوهۆرین [کو هێدی هێدی بێ هێز ببیت، و بگەهیتە ژیێ ژبەرخۆ ئاخڤتنێ و خەرفینێ]، ما ئەو تێ ناگەهن.
﴿٦٩﴾ و مە موحەمەد فێری هوزانێ نەکرییە و بۆ نەدورستە ژی فێرببیتێ، و ئەڤە [ئانکو کتێبا موحەمەد
پێ هاتی] بەس زکر و بیرئینان و قورئانەکا ئاشکەرایە. ﴿٧٠﴾ مە ئەڤ قورئانە بۆ موحەمەدی یا هنارتی، دا
زێندیان ئاگەهدار بکەت [ئانکو دا ئاقلدار و خودان باوەران ئاگەهدار بکەت، چونکی ئەو ب تنێ مفایی بۆ
خۆ ژ ئاگەهدارکرنێ دبینن]، و دا گەفا مە د راستا گاوراندا [کو ئەم دێ وان ئێزا دەین] راست دەربێخیت.

أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا خَلَقۡنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ أَنۡعَٰمٗا
فَهُمۡ لَهَا مَٰلِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلۡنَٰهَا لَهُمۡ فَمِنۡهَا رَكُوبُهُمۡ
وَمِنۡهَا يَأۡكُلُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَهُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَمَشَارِبُۚ
أَفَلَا يَشۡكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةٗ
لَّعَلَّهُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَهُمۡ وَهُمۡ
لَهُمۡ جُندٞ مُّحۡضَرُونَ ﴿٧٥﴾ فَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ إِنَّا نَعۡلَمُ
مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَ ﴿٧٦﴾ أَوَلَمۡ يَرَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ
مِن نُّطۡفَةٖ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا
مَثَلٗا وَنَسِيَ خَلۡقَهُۥۖ قَالَ مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٞ ﴿٧٨﴾
قُلۡ يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلۡقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾
ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلۡأَخۡضَرِ نَارٗا فَإِذَآ أَنتُم
مِّنۡهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيۡسَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ
بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُمۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٨١﴾
إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾
فَسُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٨٣﴾



﴿٧١﴾ مـا ئـەو نابینـن مـە كـەوال و پـێرە ژ چێكرنـا خـۆ
یـێت بـۆ وان چێكریـن، و ئـەو خودانێـت وانـە؟ [و ب
كەیفـا خـۆ مالملكیـیێ تێـدا دكـەن]. ﴿٧٢﴾ و مـە یـێت
بـۆ وان سـەرنەرم كریـن و ئێخسـتینە د خزمەتـا وانـدا،
ڤێجـا ئـەو ل هنـدەكان سـوار دبـن و هنـدەكان دخـۆن.
﴿٧٣﴾ گەلـەك مفایـێت دی و گەلـەك ڤەخوارنێـت
دی ژی، بـۆ وان یـێت تێـدا هەیـن، ڤێجـا مـا شـوكور و
سوپاسیـیا خـودێ ناكـەن. ﴿٧٤﴾ و وان شـوینا خـودێ
بـوت پەرسـتن، بەلكـی هاریكاریـیا وان بهێتەكـرن.
﴿٧٥﴾ و [ئـەو بـوت] نەشـێن هاریكاریـیا وان بكـەن، و
ئـەو ب خـۆ [د دنیایـێدا] بـۆ وان بوتان لەشـكەر بوون،
و ل بـەر خزمەتـا وان یـێت ڕاوەسـتیایی بـوون [بەلـێ
ئەو نەشـێن ئەڤـرۆ هاریكاریـیا وان بكـەن]. ﴿٧٦﴾ ڤێجا
بـلا ئاخڤتنێـت وان [د دەرهەقـێ تـەدا و د دەرهەقـێ وان
بوتانـدا یـێت ئەو دپەرێسـن] تـە ب كۆڤـان نەئێخن، ب
ڕاسـتی یـا ئـەو ئاشـكەرا دكـەن و ڤەدشـێرن، مـە ئاگەهـ
ژێ هەیـە [و دێ وان ل سـەر ئیزادەیـن]. ﴿٧٧﴾ ئـەرێ
مـا مـرۆڤ نابینیـت و نوزانیـت مـە ئـەو یـێ ژ چپكەكێ
چێكـری، و ئـەو ڤـێ گاڤـێ ڤـێ زێـدە جرەبـڕێ دكـەت و دژمنەكـی ئاشـكەرایە [ئـەڤ ئایەتـە د دەرهەقـێ (ئەبو
جەهـل)دا هاتیـیە خـوارێ]. ﴿٧٨﴾ [ئـەڤ مرۆڤـێ ڤـێ جرەبـڕێ د دەرهەقـێ ڕۆژا قیامەتێـدا دكـەت] خـۆ و
چێكرنا خۆ ژ بیركر و نموونـەیەك بۆ مە ئینا، و گۆت: كی دێ ڤـان هەستیـێت ڕزی و پێتی ساخكەتـەڤـە؟!.
﴿٧٩﴾ بێـژە: ئـەوێ جـارا ئێكـێ دایـین ئـەو دێ [وان هەسـتیان] سـاخكەتەڤە، و ئـەو ل سـەر چێكرنـا هـەر
تشـتەكی زانـا و خـودان شـیانە. ﴿٨٠﴾ ئـەوێ بـۆ هەوە ژ دارا شـین ئاگر دایـی، ڤێجا هویـن ئاگری پـێ هەلدكەن.
﴿٨١﴾ ئـەرێ مـا ئەوێ ئەرد و ئەسمـان دایـین و چێكرین [دگەل مەزناتیـیا پێ چێكرین]، نەشـێت یـێت وەكی
وان چـێ بكـەت و بـدەت؟ بەلـێ ئـەو دشـێت و ئـەوە چێكـەر و زێـدە زانـا. ﴿٨٢﴾ ب ڕاسـتی كار و فەرمانا وی
ئـەوە: گاڤـا تشـتەك ڤیـا دێ بێژتێ هەبـە دێ بیت. ﴿٨٣﴾ ڤێجا پـاك و پاقژی ژ هەمی كێماسیـیان بـۆ وی خودایی،
ئـەوێ ملكینـی و خودانیـیا هەمی تشـتان د دەسـتدا، و هوین هـەر دێ ب بال ویڤـە زڤڕن.

## سُورَةُ الصَّافَّاتِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ﴿١﴾ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا ﴿٢﴾ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴿٣﴾ إِنَّ إِلَٰهَكُمۡ
لَوَٰحِدٞ ﴿٤﴾ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَرَبُّ ٱلۡمَشَٰرِقِ ﴿٥﴾ إِنَّا زَيَّنَّا
ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِزِينَةٍ ٱلۡكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفۡظٗا مِّن كُلِّ شَيۡطَٰنٖ مَّارِدٖ ﴿٧﴾
لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰ وَيُقۡذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٖ ﴿٨﴾ دُحُورٗاۖ وَلَهُمۡ
عَذَابٞ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنۡ خَطِفَ ٱلۡخَطۡفَةَ فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٞ ثَاقِبٞ ﴿١٠﴾
فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ أَهُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَم مَّنۡ خَلَقۡنَآۚ إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّن طِينٖ لَّازِبِۭ ﴿١١﴾
بَلۡ عَجِبۡتَ وَيَسۡخَرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ذُكِّرُواْ لَا يَذۡكُرُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا رَأَوۡاْ ءَايَةٗ
يَسۡتَسۡخِرُونَ ﴿١٤﴾ وَقَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَءِذَا مِتۡنَا
وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ﴿١٦﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ ﴿١٧﴾ قُلۡ نَعَمۡ
وَأَنتُمۡ دَٰخِرُونَ ﴿١٨﴾ فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٞ وَٰحِدَةٞ فَإِذَا هُمۡ يَنظُرُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُواْ
يَٰوَيۡلَنَا هَٰذَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿٢٠﴾ هَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢١﴾
نصف الحزب ٤٥ ۞ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ
ٱللَّهِ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمۡۖ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾



## سۆرەتا صافات

**ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (١٨٢) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ سویند ب ملیاكەتێت ب ڕێز ڕاوەستیایین.
﴿٢﴾ سویند ب ملیاكەتێت ل عەوران دخوڕن و دهاژۆن. ﴿٣﴾ سویند ب ملیاكەتێت قورئان خوین.
﴿٤﴾ ب ڕاستی خودایێ هەوە هەر ئێكە.
﴿٥﴾ خودانێ ئەرد و ئەسمانانە و هندی د ناڤبەرا واندا، و خودانێ ڕۆژهەلاتانە. ﴿٦﴾ ب ڕاستی مە ئەسمانێ دنیایێ یێ ب خەملا ستێران جوانكری.
﴿٧﴾ و مە ئەسمان یێ ژ هەمی شەیتانێت خڕیایی و سەرداچویی پاراستی. ﴿٨﴾ دا گول ئاخفتنا ڕوینشتییێت جیهانا بلند نەبن [و ئەگەر پێكۆلێ بكەن گوهداریێ بكەن]، ژ هەمی ڕەخانڤە ستێر دچنێ. ﴿٩﴾ دا دویر بكەڤن [و گوهڤەچنینێ نەكەن]، و ئیزایەكا بەردەوام و بێ ڤەبرین بۆ وانە. ﴿١٠﴾ [و شەیتان ئاخفتنا ملیاكەتان گولێ نابن] ژ بلی وی یێ ب دزیڤە ئاخفتنەكێ برەڤینیت [ئەو ئاخفتن ژی وەحی نەبیت، چونكی وەحی یا ژ وان پاراستییە، بەلێ هەر ئەو ئاخفتنا ملیاكەت د ناڤبەرا خۆدا دكەن]، و ئەوی ژی گوریەكا ئاگری یا كونكەر ب دویڤ دكەڤیت. ﴿١١﴾ پسیارا وان [گاور و موشركان، ئەوێت باوەری ب ڕۆژا قیامەتێ نەی] بكە، كا چێكرنا وان مەزنترە یان یا ئەوێت مە چێكرین [ژ ئەرد و ئەسمان و ملیاكەتان]، ب ڕاستی مە مرۆڤ یێ ژ هەریەكا نویسەك چێكری [ڤێجا چاوا ئەو ساخكرنا پشتی مرنێ دویر ددانن]. ﴿١٢﴾ بەلێ تو [ژ چێكرنا خودێ] حێبەتی دبی، و ئەو ترانەیان ب تە دكەن [ژ بەر حێبەتیبوونا تە، و تەئكیدكرنا تە ل سەر هاتنا ڕۆژا قیامەتێ]. ﴿١٣﴾ و هەر وەختێ ئەو بێنە شیرەتكرن، پێڤە ناچن و ل خۆ نازڤرن. ﴿١٤﴾ و هەر وەختێ ئەو موعجیزەیەكێ [ژ موعجیزەیێت پێغەمبەری] ببینن، زێدە ترانەیان پێ دكەن، و غەیری خۆ د بەر هندێرا دكەن ترانەیان پێ بكەن. ﴿١٥﴾ و دبێژن: ئەڤە ژ سێرەبەندییەكا ئاشكەرا پێڤەتر نینە. ﴿١٦﴾ ئەرێ ئەگەر ئەم مرین و بووینە ئاخ و هەستی، ئەرێ جارەكا دی ئەم دێ ساخبینەڤە. ﴿١٧﴾ و باب و باپیرێت مە یێت پێشییێ ژی [دێ ڕابنەڤە]؟ ﴿١٨﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: بەلێ هوین و باب و باپیرێت خۆ دێ ساخبنەڤە، و هوین د ڕسوا و ڕەزیل. ﴿١٩﴾ [دویر نەبینن] ب پفا دووێ هوین دێ ساخ بن، ڤێجا هوین دێ بینن [كا خودێ دێ چ ئیزایێ دەتە بەر هەوە]. ﴿٢٠﴾ [و پشتی ئەو ڕۆژا قیامەتێ دبینن] دێ بێژن: وەی خۆلی ب سەرێ مە، ئەڤەیە ڕۆژا جزادانێ. ﴿٢١﴾ ئەڤە ڕۆژا ژێكجوداكرنا قەنجی و خرابییێیە، ڕۆژا كۆمبوون و ژێكڤاڤارتنێیە ئەوا هەوە درەو ددانا. ﴿٢٢﴾ ئەوێت ستەم كرین و هەڤالێت وان [یێت وەكی وان] و ئەوێت وان شوینا خودێ دپەرستن كۆم بكەن. ﴿٢٣﴾ و [ستەمكاران و هەڤالێت وان وپەرستییێت وان] بەرێ وان بدەنە ڕێكا دۆژەهێ.
﴿٢٤﴾ و وان [ستەمكاران] ڕاوەستینن، ب ڕاستی ئەو یێت بەرپرسن، دڤێت پسیار ژ وان بێتە كرن.

مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلْ هُمُ ٱلْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ ﴿٢٦﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ
عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٨﴾
قَالُواْ بَل لَّمْ تَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍۭ
بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَٰغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَآ إِنَّا لَذَآئِقُونَ ﴿٣١﴾
فَأَغْوَيْنَٰكُمْ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِى ٱلْعَذَابِ
مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ
لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا
لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍۭ ﴿٣٦﴾ بَلْ جَآءَ بِٱلْحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣٧﴾ إِنَّكُمْ
لَذَآئِقُواْ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٩﴾
إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾ فَوَٰكِهُ
وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٤﴾
يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍۭ ﴿٤٥﴾ بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٤٦﴾
لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ
ٱلطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ
بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّى كَانَ لِى قَرِينٌ ﴿٥١﴾



﴿٢٥﴾ هەوە چیە هوین هاریکاریا ئێکدو ناکەن.
﴿٢٦﴾ نەخێر [هاریکاریا ئێکدو ناکەن]، بەلێ
ئەڤرۆ چو ژ کەسێ نائێت. ﴿٢٧﴾ و ئەو [گرەگر و
خزمەتکار] ل ئێك و دو زڤرین، و گازندە ژ ئێك
کرن. ﴿٢٨﴾ [ئەوێت خزمەتکار گۆتنە سەرۆکێت
خۆ] ب ڕاستی هوین ژ بەرێ خێرێڤە دهاتنە مە کو
دینە، و هەوە ل بەر مە سار دکر [ئانکو هەوە دینێ
مە ژ دەستێ مە دکر]. ﴿٢٩﴾ ئینا کەنکەنەیان گۆتن:
وەسا نینە، نە ژ بەر هندێ هوین موسلمان نەبوون،
بەلێ هوین ب خۆ د بێ باوەر بوون. ﴿٣٠﴾ و مە چو
خورتی ل هەوە نەدکر، بەلێ هوین ب خۆ ملەتەکێ
زێدە سەرداچۆیی بوون. ﴿٣١﴾ ڤێجا ئیزایا خودێ
ل سەر مە و هەوە فەربوو [مەخسەدا وان ئەڤەیە
﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ ئانکو: دێ جەهنەمێ
ژ تە و دویکەفتییێت تە هەمییان تژی کەین]. ب
ڕاستی و ئەم هەمی هەر دێ تامکەینە وێ ئیزایێ.
﴿٣٢﴾ و مە هوین د سەردابرن، و ئەم ب خۆ ژی
یێت سەرداچۆیی بووین [نە ب خورتی مە هوین د
سەردابرن، بەلێ ئەم یێت سەرداچۆیی بووین، هوین ژی ل دویف مە هاتن]. ﴿٣٣﴾ ڤێجا ب ڕاستی ئەڤرۆ
ئەو هەمی [سەرۆك و خزمەتکار] د ئیزایێدا د هەڤپشکن. ﴿٣٤﴾ ب ڕاستی ئەم ڤێ ب سەرێ گونەهکاران
دئینین. ﴿٣٥﴾ و هەر وەختێ دگۆتە وان: ژ بلی خودێ چو پەرستی نینن هێژایی پەرستنێ بن، وان خۆ مەزن
دکر [و باوەری نەدئینان]. ﴿٣٦﴾ و دگۆتن: ئەرێ ما ئەم دێ پەرستییێت خۆ ژ بەر هەلبەستڤانەکی دین هێلین.
﴿٣٧﴾ نەخێر [وەنینە ئەو نەیێ دینە، و نە هەلبەستڤانە] و هەر تشتەکێ پێ هاتی ڕاستە، و ڕاستدەرئێخێ
هەمی پێغەمبەرانە. ﴿٣٨﴾ ب ڕاستی هوین دێ تامکەنە ئیزایا تێر ژان و دژوار. ﴿٣٩﴾ و هوین نائێنە ئیزادان ب
وان کار و کریاران نەبیت، ئەوێت هەوە دکرن. ﴿٤٠﴾ بەلێ بەندەیێت خودێ یێت ژێگرتی. ﴿٤١﴾ ئەڤان ڕزقێ
خۆ یێ ئاشکەرا و ڤەبڕی یێ هەی. ﴿٤٢﴾ ژ هەمی ڕەنگێت فێقی، و د قەدرگرتینە. ﴿٤٣﴾ و د قەدرگرتینە د وان
بەحەشتاندا ئەوێت تێر خۆشی. ﴿٤٤﴾ ل سەر تەختان بەرانبەری ئێکن. ﴿٤٥﴾ و مەی ژ ڕوبیارێت بەحەشتێ
ل سەر وان دئێتە گێڕان. ﴿٤٦﴾ ئەو مەی یا سپییە و گەلەکا خۆشە بۆ وان یێت ڤەدخۆن. ﴿٤٧﴾ نە سەرێ
وان پێ دئێشیت و نە گێژ دبن، و نە پێ سەرخۆش دبن [ئانکو نە سەرگێژی تێدایە و نە سەرخۆشی].
﴿٤٨﴾ و وان پەرییێت چاڤێت وان بەس ل زەلامێت وان [و ژ بیانیان گرتی]، و چاڤ گر و چاڤ مەزن یێت
هەین. ﴿٤٩﴾ دێ بێژی لۆلۆیا دەست تێڤە نەدایییە [هندی هند ئەو پەری د جوان و زەلالن]. ﴿٥٠﴾ خەلکێ
بەحەشتێ د بەحەشتێدا دێ بەرێ خۆ دەنە ئێك، و پسیاران ژ ئێك و دو کەن [کا چ د دنیایێدا ب سەرێ وان
دهات]. ﴿٥١﴾ ئێك ژ وان دێ بێژیت: من [د دنیایێدا] هەڤالەك هەبوو [باوەری ب قیامەتێ نەبوو].

يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا
لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِى سَوَآءِ
ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّى
لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا
ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾
لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ
ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ
فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾
فَإِنَّهُمْ لَءَاكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ
عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾
إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾
وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم
مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾
إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٧٤﴾ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ
ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾



﴿٥٢﴾ دگۆت: ئەرێ تو ژ وانی ئەوێت باوەر دكەن كو قیامەت دێ رابیت. ﴿٥٣﴾ ئەرێ گاڤا ئەم مرین و بووینە ئاخ و هەستی، ئەم دێ ئێینە جزاكرن و حساب د گەل مە دێ ئێتەكرن؟! [ئەڤە تشتەكێ دویرە، تو چاوا باوەر دكەی]. ﴿٥٤﴾ ئەوێ دئاخڤت گۆتە بەحەشتییان: كا د گەل من چاڤێت خۆ ل دۆژەهێ بگێڕن، كا حالێ وی هەڤالێ من چیە د دۆژەهێدا؟!. ﴿٥٥﴾ ڤێجا وی چاڤێ خۆ ل دۆژەهێ گێڕا، ئەو [هەڤالێ خۆ] د نیڤا دۆژەهێدا دیت. ﴿٥٦﴾ گازی كرێ و گۆت: ب خودێ كەم نێزیك بوو تو من ژی تێ ببەی. ﴿٥٧﴾ و ئەگەر دلۆڤانیا خودایێ من نەبایە، ئەز ژی دا د گەل تە د دۆژەهێدا بم. ﴿٥٨﴾ [ڤێجا ئەو ل هەڤالێت خۆ یێت بەحەشتی زڤری، و گۆت:] ئەرێ هندە ئێدی ئەم نامرین؟. ﴿٥٩﴾ هەما مرن بەس مرنا ئێكێ بوو، خلاس ئەم نائێینە ئیزادان. ﴿٦٠﴾ ئەڤا ئەڤەیە سەرفەرازیا مەزن. ﴿٦١﴾ بلا بۆ سەرفەرازیا ژڤی ڕەنگی، كاركەر كاربكەن. ﴿٦٢﴾ ئەڤە سەرفەرازتر و ب قەدرترە، یان دارا زەقوومێ. ﴿٦٣﴾ مە ئەو دار یا كرییە بەلا و نەخۆشی بۆ گاوران. ﴿٦٤﴾ ب ڕاستی ئەو دارەكە، ژ بنێ دۆژەهێ دەردكەڤیت. ﴿٦٥﴾ فێقییێ وێ، دێ بێژی سەرێت شەیتانانە. ﴿٦٦﴾ ب ڕاستی ئەو [گاور] دێ ژێ خۆن، و دێ زكێ خۆ پێ تژی كەن. ﴿٦٧﴾ پاشی دێ ڤەخوارنەكا تێكەل [ژ كێم و زوخ و ئاداڤێ] و زێدە كەل ب سەردا كەن. ﴿٦٨﴾ پاشێ دێ چنە دۆژەهێ. ﴿٦٩﴾ ب ڕاستی وان باب و باپیرێت خۆ یێت دیتین گومڕا. ﴿٧٠﴾ ڤێجا ئەو ل دەوسا وان دبەزن. ﴿٧١﴾ ب سویند بەری ملەتێ تە، باراپتر ژ ملەتێت بۆری د گومڕابوون. ﴿٧٢﴾ و ب سویند مە پێغەمبەر بۆ وان هنارتبوون، كو وان ئاگەهدار بكەن. ﴿٧٣﴾ ڤێجا برێنێ، كا دویماهیكا وان ئەوێت هاتینە ئاگەهداركرن، یا چاوا بوو؟. ﴿٧٤﴾ ژ بلی بەندەیێت خودێ، یێت ژێگرتی ژ وان [ئەوێت باوەری ئینایین]. ﴿٧٥﴾ ب سویند نووح پێغەمبەر هەوارا خۆ گەهاندە مە، و ئەم چ خۆش بەرسڤدەهین [بەرسڤا وی، مە لاو دا]. ﴿٧٦﴾ و مە ئەو و مالا وی [ئانكو ئەوێت ل سەر دینێ وی]، ژ تەنگاڤیا مەزن [خەندقینێ] قورتالكرن.

وَجَعَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلۡبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٧٨﴾ سَلَٰمٌ
عَلَىٰ نُوحٖ فِي ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ
مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَإِنَّ مِن
شِيعَتِهِۦ لَإِبۡرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذۡ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلۡبٖ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ
وَقَوۡمِهِۦ مَاذَا تَعۡبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفۡكًا ءَالِهَةٗ دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾
فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ فَنَظَرَ نَظۡرَةٗ فِي ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾
فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٞ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ مُدۡبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمۡ
فَقَالَ أَلَا تَأۡكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمۡ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيۡهِمۡ ضَرۡبَۢا
بِٱلۡيَمِينِ ﴿٩٣﴾ فَأَقۡبَلُوٓاْ إِلَيۡهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعۡبُدُونَ مَا تَنۡحِتُونَ ﴿٩٥﴾
وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ وَمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُواْ ٱبۡنُواْ لَهُۥ بُنۡيَٰنٗا فَأَلۡقُوهُ
فِي ٱلۡجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيۡدٗا فَجَعَلۡنَٰهُمُ ٱلۡأَسۡفَلِينَ ﴿٩٨﴾
وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبۡ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠٠﴾
فَبَشَّرۡنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٖ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعۡيَ قَالَ يَٰبُنَيَّ
إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ فَٱنظُرۡ مَاذَا تَرَىٰۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ
ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٤٥



﴿٧٧﴾ و مە دویندەها وی ب تنێ ل سەر ئەردی هێلا
[ئانکو ئەڤێت پشتی وان هاتین هەمی ژ دویندەها وانن
و ژ وان یێت هاتین]. ﴿٧٨﴾ و مە ناڤێ وی ب قەنجی د
ناڤ یێت پشتی ویدا هێلا. ﴿٧٩﴾ سەرانسەری جیهانێ
سلاڤ ل نووحی بن [ئانکو سەرانسەری جیهانێ
ب قەنجی ناڤێ وی دئینن، و سلاڤان ددەنە سەر].
﴿٨٠﴾ و هۆسا ئەم قەنجیکاران خەلات دکەین.
﴿٨١﴾ و ئەو ژ وان بەندەیێت مە بوو ئەوێت خودان
باوەر. ﴿٨٢﴾ پاشی یێت دی هەمی، مە خەندقاندن.
﴿٨٣﴾ و ب ڕاستی ئیبراهیم ژ وان بوو، ئەوێت ڕێك
و ڕێبازا وی گرتین. ﴿٨٤﴾ وەختێ ب دلەکێ پاك و
پاقژ [ژ شرك و گۆمانێ ]، بەرێ خۆ داییە خودێ.
﴿٨٥﴾ وەختێ گۆتییە بابێ خۆ و ملەتێ خۆ، هوین
چ دپەرێسن؟ ﴿٨٦﴾ ئەرێ هەوە دڤێت پەرستیەکێ
ژ درەو شوینا خودێ بپەرێسن. ﴿٨٧﴾ هوین چ هزر
ژ خودانێ هەمی جیهانان دکەن [دێ ڤێ بۆ هەوە
هێلیت، هوین وی بهێلن و غەیری وی بپەرێسن].
﴿٨٨﴾ [ژ بەر وێ ئنیەتا د دلێ خۆدا ڤەشارتی، و دا ڕۆژا
جەژنێ د گەل ملەتێ خۆ دەرنەکەڤیت] دیتنا ستێران، پشتی بەرێ خۆ داییێ، کرە هەجەت بۆ نەساخییێ.
﴿٨٩﴾ و گۆت: [ئەز نەشێم د گەل هەوە دەرکەڤم] ب ڕاستی ئەز یێ نەساخم. ﴿٩٠﴾ و وان ژی پشتا خۆ
دانە ئیبراهیمی و چۆن. ﴿٩١﴾ پاشی ب بەرزەییڤە چۆ دەڤ بوتێت وان، و گۆت: ما هوین ناخۆن [هندی
خوارن ل بەر وان بوو، هۆ گۆتە وان]. ﴿٩٢﴾ هەوە چیە هوین بۆچی نائاخڤن. ﴿٩٣﴾ پاشی بەر ب وان چۆ،
و ب دەستێ ڕاستێ و ب هێز دانا وان [هەمی هویر هویرکرن ژ بلی یێ ژ هەمییان مەزنتر، ئەڤە هێلا دا لێ
بزڤڕن، و د خۆ و بوتێت خۆ ب وی ڕەنگی دیتین، و
زانین ئیبراهیمی ئەڤە یا کری] ب لەز بەرف وی چۆن. ﴿٩٥﴾ [ئینا ئیبراهیمی] گۆتە [وان]: ئەرێ هوین وان
دپەرێسن ئەوێت هوین ب دەستێت خۆ دادتراشن. ﴿٩٦﴾ و خودێ هوین و بوتێت هوین چێ دکەن، هەردو
یێت داین [ڤێجا چاوا هوین وی ناپەرێسن، و کەس ژ وی پێڤەتر هێژایی پەرستنێ نینە]. ﴿٩٧﴾ گۆتن:
ئێتوینەکێ بۆ چێکەن، و باڤێژنە د ناڤ ئاگرێ شارایادا. ﴿٩٨﴾ و وان ڤیا ئیبراهیمی ب ئاگری بسۆژن، بەلێ
مە ئەو ب بن ئێخستن. ﴿٩٩﴾ [و ئیبراهیمی] گۆت: ئەز دێ بەر ب خودایێ خۆڤە چم [ئەز دێ چمە وی
جهێ خودێ گۆتییە من هەرێ]، دێ من سەرڕاست و ڕاستەڕێ کەت. ﴿١٠٠﴾ ئیبراهیمی گۆت: خودێوۆ
کوڕەکێ باش بدە من. ﴿١٠١﴾ ئینا مە مزگینی ب کوڕەکێ نەرم و حەلیم داییێ. ﴿١٠٢﴾ ڤێجا وەختێ کوڕێ
وی گەهشتییە ژییێ بسپۆرییێ، کو د گەل بێت و بچیت و شۆل بکەت ئیبراهیمی گۆتێ: کوڕێ من، من د
خەونێدا دیت من تو سەرژێ دکری، ڤێجا بەرێ خۆ بدێ کا تو چ دبێژی؟ [ئەڤ پسیارە ژێ کر، دا بزانیت
کا چەند سەبر هەیە] ئینا گۆت: بابۆ وێ بکە یا ئەمرێ تە پێ هاتییە کرن، خودێ حەزکەت دێ من ژ
بێنفرەهان بینی.

فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ ١٠٣ وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ١٠٤
قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٠٥ إِنَّ
هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ ١٠٦ وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ ١٠٧ وَتَرَكۡنَا
عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ١٠٨ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ١٠٩ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي
ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١١٠ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١١١ وَبَشَّرۡنَٰهُ
بِإِسۡحَٰقَ نَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ١١٢ وَبَٰرَكۡنَا عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ إِسۡحَٰقَۚ
وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحۡسِنٞ وَظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ مُبِينٞ ١١٣ وَلَقَدۡ مَنَنَّا
عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ١١٤ وَنَجَّيۡنَٰهُمَا وَقَوۡمَهُمَا مِنَ ٱلۡكَرۡبِ
ٱلۡعَظِيمِ ١١٥ وَنَصَرۡنَٰهُمۡ فَكَانُواْ هُمُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ١١٦ وَءَاتَيۡنَٰهُمَا
ٱلۡكِتَٰبَ ٱلۡمُسۡتَبِينَ ١١٧ وَهَدَيۡنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ١١٨
وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِمَا فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ١١٩ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ
وَهَٰرُونَ ١٢٠ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٢١ إِنَّهُمَا
مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٢٢ وَإِنَّ إِلۡيَاسَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ١٢٣
إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ١٢٤ أَتَدۡعُونَ بَعۡلٗا وَتَذَرُونَ أَحۡسَنَ
ٱلۡخَٰلِقِينَ ١٢٥ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ١٢٦



﴿١٠٣﴾ ڤێجا وەختێ هەردو ل بەر ئەمرێ خودێ هاتین و گوهداریا وی کرین، و وەختێ ئیبراهیمی کوڕێ خۆ دەڤ و دەڤ ئێخستییە سەر ئاخێ [و کێر دانایە سەر ستۆیێ وی]. ﴿١٠٤﴾ مە گازی کرێ: هەی ئیبراهیم. ﴿١٠٥﴾ ب سویند تشتێ مە د خەونێدا ئەمرێ تە پێ کری، تە ب جهـ ئینا [رابوون و ل بەرهاتنا هەوە، مە ژ هەوە قەبویل کر]، و هۆسا ئەم قەنجیکاران خەلات دکەین [و ژ تەنگاڤیان قورتال دکەین]. ﴿١٠٦﴾ ب ڕاستی ئەڤەیە جەرباندن و ئمتیحانا مەزن. ﴿١٠٧﴾ و مە قوربانەکێ مەزن، ژ پێش کوڕێ ویڤە، هنارت. ﴿١٠٨﴾ و مە ناڤێ وی ب باشی د ناڤ یێت پشتی ویدا هێلا. ﴿١٠٩﴾ سلاڤ ل ئیبراهیمی بن [هەمی کەس سلاڤان ددەنە سەر، ب باشی ناڤێ وی دئینن]. ﴿١١٠﴾ هۆسا ئەم قەنجیکاران خەلات دکەین. ﴿١١١﴾ ب ڕاستی ئەو ژ بەندەیێت مە یێت خودان باوەر بوو. ﴿١١٢﴾ و مە مزگینی [ب کوڕەکێ دی] ب ئیسحاقی دایێ، کو دێ بیتە پێغەمبەر و ژ باشان. ﴿١١٣﴾ و مە بەرەکەت دا وی و دا ئیسحاقی، و ژ دویندەها وان هندەك د باش بوون، و هندەك بۆ خۆ ستەمکارێت ئاشکەرا بوون. ﴿١١٤﴾ و ب سویند مە منەت و کەرەما د گەل مووسایی و هاروونی ژی کری. ﴿١١٥﴾ و مە ئەو هەردو و ملەتێ وان ژی، ژ تەنگاڤی و نەخۆشیا مەزن، قورتالکرن. ﴿١١٦﴾ و مە هاری وان کر و مە ئەو ب سەرئێخستن، و سەرکەڤتی، بوونە ئەو. ﴿١١٧﴾ و مە تەوراتا ڕۆن و ئاشکەرا دا وان. ﴿١١٨﴾ و مە هەردو ڕاستەڕێ کرن. ﴿١١٩﴾ و مە ناڤێ وان ب باشی د ناڤ یێت د دویڤ واندا هێلا. ﴿١٢٠﴾ و سلاڤ ل سەر مووسایی و هاروونی بن. ﴿١٢١﴾ و ئەم هۆسا قەنجیکاران خەلات دکەین. ﴿١٢٢﴾ ب ڕاستی ئەو هەردو ژ بەندەیێت مە یێت خودان باوەر بوون. ﴿١٢٣﴾ و ب ڕاستی ئلیاس ژ پێغەمبەرانە. ﴿١٢٤﴾ وەختێ گۆتییە ملەتێ خۆ: ما هوین ژ خودێ ناترسن. ﴿١٢٥﴾ هوین بەعلی [ناڤێ بوتەکێ وانە] دپەرێسن، و هوین پەرستنا باشترین چێکەری دهێلن؟. ﴿١٢٦﴾ کو خودێیە، خودانێ هەوە و یێ باب و باپیرێت هەوە.

فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٢٨﴾
وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلْ يَاسِينَ ﴿١٣٠﴾ إِنَّا
كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣١﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾
وَإِنَّ لُوطًا لَّمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٣﴾ إِذْ نَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٣٤﴾
إِلَّا عَجُوزًا فِي ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿١٣٥﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٣٦﴾ وَإِنَّكُمْ
لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِٱلَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٣٨﴾ وَإِنَّ
يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾
فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾
فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ
الحزب ٤٦ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾ ۞ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا
عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ
يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾ فَٱسْتَفْتِهِمْ
أَلِرَبِّكَ ٱلْبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلْبَنُونَ ﴿١٤٩﴾ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثًا
وَهُمْ شَٰهِدُونَ ﴿١٥٠﴾ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ
ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾



﴿١٢٧﴾ و وان [ئلیاس] درەوین دانا، ب ڕاستی ئەو
[د دۆژەهێدا] دێ ئێنە بەرهەڤکرن. ﴿١٢٨﴾ ژ بلی
بەندەیێت مە یێت ژێگرتی [ژ وان]، بۆ باوەری و
گوهداریێ. ﴿١٢٩﴾ و ناڤێ وی ب باشی، مە د ناڤ
یێت دویڤ ویدا هێلا. ﴿١٣٠﴾ سلاڤ ل سەر ئلیاسی
بن. ﴿١٣١﴾ ئەم هۆسا قەنجیکاران خەلات دکەین.
﴿١٣٢﴾ ب ڕاستی ئەو ژ بەندەیێت مە یێت خودان باوەر
بوو. ﴿١٣٣﴾ و ب ڕاستی (لووط) ژی ژ پێغەمبەرانە.
﴿١٣٤﴾ وەختێ مە ئەو و مالا وی هەمی قورتالکرین.
﴿١٣٥﴾ پیرەژنەك تێ نەبیت [ئەو ژی ژنا وی بوو]،
ما د گەل وان ئەوێت د ناڤ ئێزایێدا ماین.
﴿١٣٦﴾ پاشی یێت مایی، مە د هیلاك برن.
﴿١٣٧﴾ و هوین سپێدەیان د بەر [کاڤلێت] وانڕا
دبۆرن. ﴿١٣٨﴾ و ب شەڤێ ژی [د بەرڕا دبۆرن]، ڤێجا
ما هوین بۆ خۆ ئەقلەکی ناگرن. ﴿١٣٩﴾ ب ڕاستی
یوونس ژی ژ پێغەمبەرانە. ﴿١٤٠﴾ وەختێ [بێی
دەستویریا خودایێ خۆ ژ ملەتێ خۆ] ڕەڤی، و چۆیە
د گەمیا بارکریدا. ﴿١٤١﴾ [پشتی بارێ گەمیێ گران
بووی و ڤیاین سڤك بکەن، و گەمی ژ بارگرانی نەچۆیی] پشك د ناڤبەرا ئەوێت د گەمیێدا هاتە ئاڤێتن،
ڤێجا ئەو، بوو ژ وان ئەوێت پشك لێ کەڤتی. ﴿١٤٢﴾ [خۆ ئاڤێتە د ئاڤێدا] و نەهنگەکی داعویرا، و ئەو
یێ لۆمەدار بوو. ﴿١٤٣﴾ و ئەگەر ئەو ژ وان نەبایە ئەوێت خودێ ژ کێماسیان پاقژ دکەن [ئانکو ئەگەر وی
گەلەك زکر نەکربایە، ژ دەرڤە و د زکێ نەهنگی ژیدا]. ﴿١٤٤﴾ دا هەتا ڕۆژا قیامەتێ، مینیتە د زکێ نەهنگیدا.
﴿١٤٥﴾ و مە ئەمرێ نەهنگی کر باڤێژیتە ئەردەکێ ڕویت و بێ شینکاتی، و ئەو (یوونس) یێ نەساخ.
﴿١٤٦﴾ و مە کوندکەك (کولند زەرەك) ل سەر شینکر [دا سیبەرێ لێ بکەت، و دەمەکی د بنڤە بمینیت،
هەتا ب سەر خۆڤە دئێت]. ﴿١٤٧﴾ و مە ئەو بۆ سەد هزاران یان پتر هنارت. ﴿١٤٨﴾ ڤێجا وان هەمیان
باوەری [پێ] ئینا، ڤێجا مە ژی هەتا دەمەکێ ئاشکەرا [ئەو ژی دەمێ مرنێیە] خۆشی دانە وان.
﴿١٤٩﴾ ڤێجا [هەی موحەمەد] پسیارا وان (قورەیشیان) بکە: ئەرێ کچ یێت خودایێ تەنە و کوڕ یێت وانن؟!
﴿١٥٠﴾ یان ژی مە ملیاکەت ل بەر چاڤێت وان مێ چێ کرینە؟ ﴿١٥١﴾ هشیار بن و بزانن ژ بێ بەختی ئەو ڤێ دبێژن.
﴿١٥٢﴾ [دبێژن] خودێ زاڕۆکێ هەی، و ب ڕاستی ئەو درەوان دکەن. ﴿١٥٣﴾ ئەرێ [خودێ] کچ شوینا
کوڕان بۆ خۆ ژێ گرتینە.

مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾ أَمْ لَكُمْ سُلْطَٰنٌ
مُّبِينٌ ﴿١٥٦﴾ فَأْتُواْ بِكِتَٰبِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٥٧﴾ وَجَعَلُواْ بَيْنَهُۥ
وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًاۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾
سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٠﴾
فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ ﴿١٦١﴾ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾
إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ ﴿١٦٤﴾
وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴿١٦٥﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلْمُسَبِّحُونَ ﴿١٦٦﴾
وَإِن كَانُواْ لَيَقُولُونَ ﴿١٦٧﴾ لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٦٨﴾
لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٩﴾ فَكَفَرُواْ بِهِۦۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿١٧٠﴾ وَلَقَدْ
سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾
وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿١٧٣﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٤﴾ وَأَبْصِرْهُمْ
فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٥﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٧٦﴾ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ
فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٧﴾ وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٨﴾ وَأَبْصِرْ
فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٩﴾ سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾
وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٨٢﴾





﴿١٥٤﴾ هەوە خێرە [هوین] چاوا حوکمی دکەن؟! [هوین کوڕان ژ کچان چێتر ددانن، پاشی هوین کچان بۆ خودێ ددانن، و کوڕان بۆ خۆ]. ﴿١٥٥﴾ ڤێجا ما هوین هزرا خۆ ناکەن؟! [بزانن هوین د خەلەتن]. ﴿١٥٦﴾ یان ژی هەوە بەلگە و نیشانەکا ڕۆن و ئاشکەرا [ل سەر ئەڤا هوین دبێژن] هەیە؟!. ﴿١٥٧﴾ ڤێجا ئەگەر هوین ڕاست دبێژن کتێبا خۆ بینن [ئەوا ڤێ چەندێ دیار دکەت و ل دەڤ خودێ هاتبیت]. ﴿١٥٨﴾ و موشرکان د ناڤبەرا خودێ و ملیاکەتاندا مرۆڤانی یا دانایی [دبێژن: حاشا خودێ تێکەلیا د گەل ئەجنەیان کری، ملیاکەت یێت ژێ چێ بوویین]، و ملیاکەت ب خۆ دزانن ئەوێت ئەڤ گۆتنە کرین، دێ د جەهنەمێدا ئێنە بەرهەڤکرن. ﴿١٥٩﴾ و پاك و پاقژی بۆ خودایی، ژ وی سالۆخەتێ ئەو ب بالڤە لێ ددن. ﴿١٦٠﴾ بەلێ بەندەیێت مە یێت ژێگرتی دبەرینە، ژ بالڤەلێدانا ڤی سالۆخەتی ب بال خودێڤە. ﴿١٦١﴾ ڤێجا ب ڕاستی هوین، و د گەل وان ئەوێت هوین دپەرێسن. ﴿١٦٢﴾ هوین نەشێن کەسێ د سەردا ببەن [و ژ ڕێکا خودێ دەربێخن]. ﴿١٦٣﴾ ئەو نەبیت، یێ هێژایی دۆژەهێ. ﴿١٦٤﴾ [ملیاکەت دبێژن]: هەر ئێك ژ مە جهەکێ دیارکری [د زانین و پەرستنێدا] یێ هەی [نەشێت ژێ دەرکەڤیت، و بدەتە سەر]. ﴿١٦٥﴾ و ئەم بۆ ب جهکرنا ئەمرێ خودێ، ب ڕیز یێت ڕاوەستیاینە. ﴿١٦٦﴾ و ئەم خودێ، ژ کێماسییان و تشتێ نەهێژایی وی، پاقژ دکەین. ﴿١٦٧﴾ هەرچەندە [موشرکان بەری هاتنا پێغەمبەری و بەری هاتنەخوارا قورئانێ] دگۆتن: ﴿١٦٨﴾ ئەگەر مە کتێبەك ژ کتێبێت پێشییان [وەکی تەوراتێ و ئنجیلێ]، هەبایە [ئانکو بۆ مە هاتبایە]. ﴿١٦٩﴾ ئەم دا بینە بەندەیێت خودێ، یێت خوری و ژێگرتی. ﴿١٧٠﴾ ڤێجا [وەختێ کتێب بۆ وان هاتی] باوەری پێ نەئینان، و دێ زانن دویماهیا گاوریا وان دێ بیتە چ. ﴿١٧١﴾ ب سویند پەیمانا مە بۆ بەندەیێت مە، یێت پێغەمبەر، بۆری بوو [هات بوو]. ﴿١٧٢﴾ کو ب ڕاستی ئەو دێ سەرکەڤن، و هاریکاریا وان دێ ئێتەکرن. ﴿١٧٣﴾ و لەشکەرێ مە و کۆما مە، هەر ئەو دێ سەرکەڤن. ﴿١٧٤﴾ ڤێجا وان بهێلە، و بەرێ خۆ ژ وان وەرگێڕە هەتا دەمەکێ دی [هەتا ئەم ئەمرێ تە ب شەڕی دکەین، د گەل وان]. ﴿١٧٥﴾ و [وەختێ ئەو دەم دئێت] بەرێ خۆ بدێ، کا دێ چ ب سەرێ وان ئێت [ژ کوشتن و ئێخسیرکرنێ، ڕۆژا بەدرێ] ئەو ب خۆ ژی دێ بینن. ﴿١٧٦﴾ ئەرێ ئەو لەزێ ل هاتنا ئیزایا مە دکەن؟. ﴿١٧٧﴾ ڤێجا ئەگەر ئیزایا مە [ئەوا ئەو لەزێ لێ دکەن] ئەو گرتن، ڤێجا نەخۆزیا سپێدەهیا وان، ئەوێت هاتینە ئاگەهدارکرن و پێڤە نەچوویین. ﴿١٧٨﴾ ڤێجا تو بەرێ خۆ ژ وان وەرگێڕە و وان بهێلە هەتا دەمەکێ دی. ﴿١٧٩﴾ و بەرێ خۆ بدێ [کا دێ چ ب سەرێ وان ئێت]، و ئەو ب خۆ ژی دێ بینن. ﴿١٨٠﴾ پاك و پاقژی بۆ خودایێ تە، خودانێ هێز و شیان و دەستهەلاتدارییێ، ژ وی سالۆخەتێ ئەو ب بال خودێڤە لێ ددن. ﴿١٨١﴾ و سلاڤ و ئێمنایی ل پێغەمبەران بن. ﴿١٨٢﴾ و هەمی سوپاسی و پەسن بۆ خودایێ جیهانان.

سُورَةُ صٓ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ١ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ ٢
كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ ٣ وَعَجِبُوٓاْ
أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ ٤ أَجَعَلَ
ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ٥ وَٱنطَلَقَ ٱلۡمَلَأُ مِنۡهُمۡ أَنِ
ٱمۡشُواْ وَٱصۡبِرُواْ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٞ يُرَادُ ٦ مَا سَمِعۡنَا
بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ ٧ أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ
مِنۢ بَيۡنِنَاۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّن ذِكۡرِيۚ بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ عَذَابِ ٨ أَمۡ عِندَهُمۡ
خَزَآئِنُ رَحۡمَةِ رَبِّكَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡوَهَّابِ ٩ أَمۡ لَهُم مُّلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ
وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ فَلۡيَرۡتَقُواْ فِي ٱلۡأَسۡبَٰبِ ١٠ جُندٞ مَّا هُنَالِكَ مَهۡزُومٞ مِّنَ
ٱلۡأَحۡزَابِ ١١ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَعَادٞ وَفِرۡعَوۡنُ ذُو ٱلۡأَوۡتَادِ ١٢
وَثَمُودُ وَقَوۡمُ لُوطٖ وَأَصۡحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَحۡزَابُ ١٣ إِن كُلٌّ إِلَّا
كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ ١٤ وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ
مَّا لَهَا مِن فَوَاقٖ ١٥ وَقَالُواْ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ١٦



## سۆرەتا صاد

**ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٨٨) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ هۆسا دئێتە خواندن (صاد) [ل دۆر ڕاڤەکرنا ڤان ڕەنگە تیپان بزڤرە دەستپێکا سۆرەتا بەقەرە]، و سویند ب قورئانا خودان قەدر و شیرەت، و ئەوا هەمی تشتێت بەندە بۆ هەوجە ژ کاروبارێت دینی، تێدا. ﴿٢﴾ [و گۆمان ب ئێکجاری تێدا نینە، و باوەری نەئینانا موشرکان ب قورئانێ، نە ژ بەر هندێیە کو ئەو تێدا یێت ب شکن] بەلێ ئەوێت گاور بووین، یێت د خۆمەزنکرن و ژێکڤەبوونێدا. ﴿٣﴾ مە گەلەك ملەت بەری وان یێت د هیلاك برین و ب بەرئیزا ئێخستین [ڤێجا وەختێ ئیزا ب سەر واندا هاتی] کرنە هەوار، بەلێ وەختێ ڕزگاربوونێ نەمابوو. ﴿٤﴾ و حێبەتی بوون دەمێ کو پێغەمبەرەك، ژ وان ب خۆ بۆ وان هاتی، و گاوران گۆت: ئەڤە سێربەندەکێ زێدە درەوکەرە. ﴿٥﴾ ئەرێ هەمی پەرستی کرنە ئێك پەرستی؟ ب ڕاستی ئەڤە تشتەکێ زێدە عەجێبە. ﴿٦﴾ و گرەگر و کەنکەنەیێت وان دەرکەڤتن، و گۆتن: ل سەر یا خۆ بن [و نەچنە د دینێ ویدا]، و خۆ ل سەر پەرستنا پەرستییێت خۆ ڕاگرن، ئەڤە [تشتەکێ مەزنە]، موحەمەدی ژ مە دڤێت. ﴿٧﴾ مە ئەڤە [ئانکو تەوحید] د دینێ دویماهیکێدا [کو مەسیحییەتە] نەبهیستییە، ب ڕاستی ئەڤە تشتەکە وی ژ دەڤ خۆ پێ دەرێخستی. ﴿٨﴾ ئەرێ ژ ناڤ مە هەمییان، قورئان بۆ وی ب تنێ هات؟ [ما ژ بلی وی کەس نەبوو، ژ مە ڤان گرەگر و ماقویلان، قورئان بۆ بێت] نەخێر، نە ژ زانین، باوەرییێ ب قورئانێ نائینن بەلێ لێ ب شکن (د دودلن)، ب ڕاستی هێژ وان تام نەکرییە ئیزایا من [لەوا وەدبێژن، و باوەرییێ پێ نائینن]. ﴿٩﴾ یان ژێ گەنجخانەیێت دلۆڤانییا خودایێ تە، یێ سەردەست و کەرەم بەخش، ل دەڤ وانن [دا ئەو ب کەیفا خۆ بدەنە وی یێ وان بڤێت، و ژ وی ڤەگرن یێ وان نەڤێت، و گرەگرێت خۆ هەلبژێرن کو قورئان بۆ وان بێت، و موحەمەدی ب سەرڤە نەبینن]. ﴿١٠﴾ یان ژێ خودانییا ئەرد و ئەسمانان و هندی د ناڤبەرا واندا، یا وانە؟ [ڤێجا ئەگەر وەسا بیت] بلا ل وان ڕێکان سەربکەڤن ئەوێت وان بگەهیننە ئەسمانان [و وەحییێ بۆ وی بینە خوارێ یێ وان بڤێت]. ﴿١١﴾ ئاخر [خۆدانێت ڤان گۆتنان] ئەو لەشکەرەکە بۆ دژمنایا پێغەمبەری یێ ڤێککەڤتی، و هەر دێ شکێت [و ئەڤ ڕۆژا بەدرێ جههات قورەیشی ڕەڤین و شەکستن]. ﴿١٢﴾ بەری وان ملەتێ نووحی و عاد و فیرعەونێ خودان لەشکەر [لەشکەرێ ب زەند و باسك و ب هێز]، پێغەمبەرێت خۆ درەوین دانان. ﴿١٣﴾ و ملەتێ (سەموود) و ملەتێ (لووط) پێغەمبەر ژێ، و خەلکێ جهێت تێر داروبار و داروبار تێکڕا [ملەتێ شوعەیبی]، پێغەمبەرێت خۆ درەوین دانان، و ئەڤە بوون یێت ب هێز [خودێ هەمی د هیلاك برن]. ﴿١٤﴾ کەس ژ وان نەبوو پێغەمبەرێ خۆ درەوین نەدانایی، ڤێجا ئیزایا من ل سەر وان فەر بوو [ئانکو ل سەر وان واجب بوو]. ﴿١٥﴾ ئەڤە [مەخسەد گاورێت مەکەهێ و یێت وەکی وان] ئەڤا خۆ ل چو نەگرتییە ژ پفکرنەکێ پێڤەتر نەبیت، کو تەمەتی وەختێ د ناڤبەرا دو چرێت دۆتنا حێشترێ ژی، خۆ ناگریت. ﴿١٦﴾ [ژ لەکەڤە] دگۆتن: خودێوۆ لەزێ بۆ مە ل بارا مە بکە [ژ وێ ئیزایا کو دێ دەیە مە]، بەری ڕۆژا قیامەتێ.

ٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلۡأَيۡدِۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ١٧ إِنَّا
سَخَّرۡنَا ٱلۡجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحۡنَ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِشۡرَاقِ ١٨ وَٱلطَّيۡرَ
مَحۡشُورَةٗۖ كُلّٞ لَّهُۥٓ أَوَّابٞ ١٩ وَشَدَدۡنَا مُلۡكَهُۥ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحِكۡمَةَ
الحزب ٤٦ وَفَصۡلَ ٱلۡخِطَابِ ٢٠ ۞ وَهَلۡ أَتَىٰكَ نَبَؤُاْ ٱلۡخَصۡمِ إِذۡ تَسَوَّرُواْ
ٱلۡمِحۡرَابَ ٢١ إِذۡ دَخَلُواْ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنۡهُمۡۖ قَالُواْ لَا تَخَفۡۖ
خَصۡمَانِ بَغَىٰ بَعۡضُنَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فَٱحۡكُم بَيۡنَنَا بِٱلۡحَقِّ وَلَا تُشۡطِطۡ
وَٱهۡدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ٢٢ إِنَّ هَٰذَآ أَخِي لَهُۥ تِسۡعٞ وَتِسۡعُونَ نَعۡجَةٗ
وَلِيَ نَعۡجَةٞ وَٰحِدَةٞ فَقَالَ أَكۡفِلۡنِيهَا وَعَزَّنِي فِي ٱلۡخِطَابِ ٢٣ قَالَ
لَقَدۡ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعۡجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦۖ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡخُلَطَآءِ لَيَبۡغِي
بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٞ مَّا هُمۡۗ
سجدة وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسۡتَغۡفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّۤ رَاكِعٗاۤ وَأَنَابَ۩ ٢٤
فَغَفَرۡنَا لَهُۥ ذَٰلِكَۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ٢٥
يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ
وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ
عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا نَسُواْ يَوۡمَ ٱلۡحِسَابِ ٢٦



﴿١٧﴾ [هەی موحەمەد] سەبرێ خۆ ل سەر گۆتنا ئەو دكەن بكێشە، و بەندەیێ مە داوودێ ب هێز بینە بیرا خۆ، ب ڕاستی ئەو [د هەمی كاروبارێت خۆدا] زێدە ل خودێ دزڤری. ﴿١٨﴾ مە چیا بۆ وی سەرنەرم كربوون، د گەل داوودی ئێڤار و سپێدەیان، خودێ ژ كێماسیان پاقژ بكەن. ﴿١٩﴾ و بالەفر ژی مە بۆ سەرنەرم كربوون، كو ژ هەمی ڕەخانڤە كۆم دبوون، هەمیان تەسبیح لێ ڤەدگێڕا. ﴿٢٠﴾ و مە دەستهەلاتداریا وی ب هێز و موكوم كربوو، و مە پێغەمبەراتی و تێگەهشتنا ژێكڤەكرن و پێكئینانا هەڤڕكان، دابوویێ. ﴿٢١﴾ ئەرێ بەحسێ هەردو هەڤڕك و شكیاتكەران، بۆ تە [هەی موحەمەد] نەهاتییە كرن، وەختێ ب سەر دیوارێ میحرابێ كەڤتین و هاتینە دەڤ داوودی. ﴿٢٢﴾ وەختێ هەردو چۆینە دەڤ داوود، ئینا ژ وان ڤەجنقی و ترسیا، گۆتن: ژ مە نەترسە، ئەم دو هەڤڕكین ئێك ژ مە غەدر و نەهەقیا ل یێ دی كری، ڤێجا ب هەقییێ حوكمی د ناڤبەرا مەدا بكە، و ژ هەقییێ دەرنەكەڤە، و بەرێ مە بدە ڕێكا ڕاست و هەقییێ. ﴿٢٣﴾ [ئێك ژ وان گۆت]: ئەڤی برایێ من نۆت و نەهـ میە یێت هەین، و من میهەك ب تنێ یا هەی، و دبێژیتە من وێ ژی بدە من، و ب ئاخڤتنێ ژی دشێتە من. ﴿٢٤﴾ [داوودی] گۆت: ب سویند وی ب داخوازا خۆ ڤێ، كو میها تە بكەتە د ناڤ میهێت خۆدا، غەدرا ل تە كری، و ب ڕاستی گەلەك هەڤپشك [شریك] غەدرێ ل ئێكدو دكەن، ژ بلی وان یێت باوەری ئینایین و كار و كریارێت قەنج كرین، و ئەڤە ژی دكێمن، و داوودی زانی مە ئەو [ب ڤێ دۆزێ] جەرباند، ئینا داخوازا لێبۆرینێ ژ خودایێ خۆ كر، و كەڤت و چۆ سوجدەیێ و ل خۆ زڤری و تۆبەكر. ﴿٢٥﴾ ڤێجا مە ژی ئەو [گونەها وی] بۆ ژێبر و ئەم لێ بۆرین، و ب ڕاستی وی جهێ خۆ، و ڤەگەڕیانەكا باش، ل دەڤ مە هەیە [كو بەحەشتە]. ﴿٢٦﴾ هەی داوود مە تو كرییە جهگر د ئەردیدا، ڤێجا حوكمی ب هەقییێ د ناڤبەرا خەلكیدا بكە، و ب دویڤ دلخوازییێ نەكەڤە، ئەو دێ تە ژ ڕێكا خودێ دەرئێخیت، ب ڕاستی ئەوێت ژ ڕێكا خودێ دەردكەڤن، ئیزایەكا ب ژان و دژوار بۆ وان یا هەی، ژ بەر ژ بیركرنا وان بۆ ڕۆژا قیامەتێ و حسابێ.

وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًاۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِي ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾
كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ
ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾
إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِٱلْعَشِيِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّيٓ أَحْبَبْتُ
حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَيَّۖ
فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَٰنَ
وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَهَبْ
لِي مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾
فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجْرِي بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً حَيْثُ أَصَابَ ﴿٣٦﴾ وَٱلشَّيَٰطِينَ
كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلْأَصْفَادِ ﴿٣٨﴾ هَٰذَا
عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ
مَـَٔابٍ ﴿٤٠﴾ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيْطَٰنُ
بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَۖ هَٰذَا مُغْتَسَلُۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴿٤٢﴾



﴿٢٧﴾ و مە ئەرد و ئەسمان و هندی د ناڤبەرا واندا
ژ قەستا نەدایینە، یێت باوەری نەئینایین ڤێ هزرێ
دکەن [ل وێ هزرێنە ژ قەستا یێت هاتینە چێکرن،
و قیامەت و حساب نینن]، ڤێجا ئیزا و نەخۆشیا
ئاگری بۆ وان بیت ئەوێت باوەری نەئینایین.
﴿٢٨﴾ ئەرێ ما ئەم دێ ئەوێت باوەری ئینایین و
کار و کریارێت ڕاست و دورست کرین، و ئەوێت
خرابیێ د ئەردیدا دکەن، دێ ئینینە ڕێزەکێ، یان ژی
ئەم دێ خودێترس و تەقواداران و گونەهکاران ئینینە
ڕێزەکێ [ئانکو ئەگەر ڕۆژا قیامەتێ و حساب نەبیت،
ئەڤە وەکی ئێك لێهاتن، و ئەڤە نەیا بەرئاقلە]؟.
﴿٢٩﴾ ئەڤە کتێبەکا پیرۆزە [مەخسەد پێ قورئانە]، مە
بۆ تە ئینایییە خوارێ، دا هزرێت خۆ د ئایەتێت وێدا
بکەن [و تێ بگەهن و کار پێ بکەن]، و دا خودان
عەقل بۆ خۆ پێڤە بچن، و شیرەتان ژێ وەرگرن.
﴿٣٠﴾ و مە سولەیمان دا داوودی و ئەوچ خۆش بەندە
بوو، و ئەو زێدە یێ تۆبەدار بوو. ﴿٣١﴾ وەختێ ئێڤاری
هەسپێت کەحێل نیشادایین. ﴿٣٢﴾ و سولەیمانی گۆت:
ب ڕاستی من ڤیانا هەسپان یا ب سەر زکرێ خودێ ئێخستی، [ژ بەر زێدە ڤیانا وی بۆ جیهادێ] و ئەو
ما ب هەسپانڤە هەتا ڕۆژ ئاڤابوویی، و نڤێژا ئێڤاری ژێ چوویی. ﴿٣٣﴾ [پشتی دیتی نڤێژا ئێڤاری ژێ چۆ ژ
بەر هەسپان] گۆت: کا وان هەسپان بۆ من بزڤریننەڤە، و دەست ئاڤێتێ ل پێ و ستۆیێت وان دا و ڤەکوشتن.
﴿٣٤﴾ و ب سویند مە سولەیمان جەرباند، و مە لەشەك دانابوو سەر تەختێ وی، پاشی تۆبەکر و ل خودایێ
خۆ زڤڕی. ﴿٣٥﴾ گۆت: خودێوۆ گونەهێت من ژێ ببە و ل من نەگرە، و ملك و مالدارییەکا وەسا بدە
من بۆ کەسێ پشتی من چێ نەبیت، ب ڕاستی تو زێدە کەرەمبەخشی. ﴿٣٦﴾ و مە با (هەوا) بن ئەمری
سولەیمانی کربوو، هێدی و ل دویڤ فەرمانا وی، دچۆ وی جهی یێ وی دڤیا. ﴿٣٧﴾ و مە هەمی ئەجنەیێت
هۆستا [وان ئاڤاهیان بۆ ئاڤا بکەن یێت وی بڤێن]، و خۆنقۆرکەرێت ئاڤان ژی [کو دوڕ و مەرجانان بۆ ژ بنێ
دەریایان بیننە دەرێ]، بن ئەمری وی کربوون. ﴿٣٨﴾ و هندەکێت دی ژی مە بن ئەمری وی کربوون، د قەید
و زنجیراندا د گرێدایی بوون [ئەو ژی عفریتێت شەیتانان بوون]. ﴿٣٩﴾ ئەڤە خەلات و دانا مەیە، ڤێجا تە
دڤێت ژێ بدە یان ڤەگرە و نەدە، چو ل سەر تە نینە. ﴿٤٠﴾ و ب ڕاستی وی جهەکێ ب قەدر د دنیایێدا یێ
ل دەف مە هەی، و زڤڕینەکا باش د ئاخرەتێدا یا ب بال مەڤە هەی. ﴿٤١﴾ و بەحسێ بەندەیێ مە، ئەیووب
پێغەمبەر، بکە، وەختێ گازی خودایێ خۆ کری: خودایێ من، ب ڕاستی شەیتانی ئەز یێ بەرهنگاری
زەحمەتێ و ئێزایێ کریم. ﴿٤٢﴾ [مە گۆتێ] پێ خۆ ل ئەردی بدە [دا کانی بۆ تە ل ئەردی بزێن]، ئەڤە ئاڤەکا
سارە بۆ شویشتنێ و ڤەخوارنێیە [خودێ دو کانی بۆ هەلاڤێتن، ئێکێ خۆ پێ شویشت لەشێ وی هەمی
ساخلەم بوو، و یا دی ژێ ڤەخوار هناڤێت وی هەمی پێ ساخ بوون].

وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٤٣
وَخُذۡ بِيَدِكَ ضِغۡثٗا فَٱضۡرِب بِّهِۦ وَلَا تَحۡنَثۡۗ إِنَّا وَجَدۡنَٰهُ صَابِرٗاۚ نِّعۡمَ
ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٞ ٤٤ وَٱذۡكُرۡ عِبَٰدَنَآ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ أُوْلِي
ٱلۡأَيۡدِي وَٱلۡأَبۡصَٰرِ ٤٥ إِنَّآ أَخۡلَصۡنَٰهُم بِخَالِصَةٖ ذِكۡرَى ٱلدَّارِ ٤٦
وَإِنَّهُمۡ عِندَنَا لَمِنَ ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ٤٧ وَٱذۡكُرۡ إِسۡمَٰعِيلَ
وَٱلۡيَسَعَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ وَكُلّٞ مِّنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ٤٨ هَٰذَا ذِكۡرٞۚ وَإِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ
لَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ٤٩ جَنَّٰتِ عَدۡنٖ مُّفَتَّحَةٗ لَّهُمُ ٱلۡأَبۡوَٰبُ ٥٠ مُتَّكِـِٔينَ
نصف الحزب ٤٦ فِيهَا يَدۡعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ وَشَرَابٖ ٥١ ۞ وَعِندَهُمۡ قَٰصِرَٰتُ
ٱلطَّرۡفِ أَتۡرَابٌ ٥٢ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ٥٣ إِنَّ هَٰذَا
لَرِزۡقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ٥٤ هَٰذَاۚ وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٖ ٥٥
جَهَنَّمَ يَصۡلَوۡنَهَا فَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ٥٦ هَٰذَا فَلۡيَذُوقُوهُ حَمِيمٞ
وَغَسَّاقٞ ٥٧ وَءَاخَرُ مِن شَكۡلِهِۦٓ أَزۡوَٰجٌ ٥٨ هَٰذَا فَوۡجٞ
مُّقۡتَحِمٞ مَّعَكُمۡ لَا مَرۡحَبَۢا بِهِمۡۚ إِنَّهُمۡ صَالُواْ ٱلنَّارِ ٥٩ قَالُواْ
بَلۡ أَنتُمۡ لَا مَرۡحَبَۢا بِكُمۡۖ أَنتُمۡ قَدَّمۡتُمُوهُ لَنَاۖ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرَارُ ٦٠
قَالُواْ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدۡهُ عَذَابٗا ضِعۡفٗا فِي ٱلنَّارِ ٦١



﴿٤٣﴾ و مە ژ دلۆڤانییا خۆ مالا وی زڤڕاند، و هندی دی ژی دگەل.. دا خودان عەقل بۆ خۆ پێڤە بچن [و بزانن ئەوێ سەبرێ ل سەر نەخۆشییێ بکێشیت، خودێ دێ خەلات کەت، چ ل دنیایێ و چ ل ئاخرەتێ]. ﴿٤٤﴾ و [مە گۆتە ئەیووب پێغەمبەر] قەفتەکا دارکان د دەستێ خۆ بگرە، و ل ژنا خۆ بدە، و سویندا خۆ ب جهـ بینە و نەشکێنە [ژ بەر ئەگەرەکێ سویند خواربوو، ئەگەر ب سەر خۆڤە هات ئەو سەد قامچیان ل ژنا خۆ بدەت، ئینا خودێ ب ڤی ڕەنگی سویندا وی بۆ ب جهـ ئینا]، ب ڕاستی مە دیت ئەو [ل سەر وێ بەلایا مە داییێ] یێ سەبرکێش و بێنفرەهە، چ خۆش بەندەیە، ب ڕاستی ئەو ب ڕێکا تۆبەیێ زێدە ل خودێ دزڤڕی. ﴿٤٥﴾ و بەحسێ بەندەیێت مە ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووبی بکە، ئەوێت ب هێز د پەرستنێدا، و شارەزا د دینیدا. ﴿٤٦﴾ ب ڕاستی مە ئەو بۆ خۆ یێت ژێگرتین، ژ بەر سالۆخەتەکێ کو بەردەوام د هزرا ئاخرەتێدا بوون. ﴿٤٧﴾ و ب ڕاستی ئەو ل دەڤ مە ژ هەلبژارتییێت باشانن. ﴿٤٨﴾ و بەحسێ ئیسماعیل و ئەلیەسەع و (ژا الکفل) بکە، ئەو هەمی ژ باشان بوون. ﴿٤٩﴾ ئەڤە [ڤەگێڕانا سوحبەتا پێغەمبەرێت بۆری] سەربلندییە بۆ وان، و پارێزکاران دویماهیکەکا باش، یا هەی. ﴿٥٠﴾ کو بەحەشتێت ئاکنجیبوونێنە، و دەرگەهـ بۆ وان ل تاقن [ئانکو باش دڤەکرینە]. ﴿٥١﴾ ئەو یێت پالداینە تێدا، گەلەك فێقی و گەلەك ڤەخوارنێ تێدا دخوازن. ﴿٥٢﴾ و پەری یێت چاڤێت وان بەس ل زەلامێت وان ب تنێ، و یێت ئێك دەست و ئێك ژی (عەمر) یێت هەین. ﴿٥٣﴾ ئەڤە ئەو خەلاتە یێ بۆ ڕۆژا حسابێ، پەیمان بۆ هەوە پێ هاتییەدان. ﴿٥٤﴾ ب ڕاستی ئەڤە ئەو ڕزقە، ئەو کەرەمە یا مە د گەل هەوە کری، چو ڤەبڕین و دویماهیك بۆ نینە. ﴿٥٥﴾ خەلاتێ پارێزکاران ئەڤەیە، و ب ڕاستی سەرداچۆییان پیسترین دویماهیك یا هەی. ﴿٥٦﴾ دۆژەهە دێ چنە تێدا و دێ تامکەنە گەرما وێ، و ئەو چ پیسەجهە. ﴿٥٧﴾ ئەڤە جزایێ وانە، ڤێجا بلا تامکەنێ، ئاڤەکا زێدە کەل و ب کێم و ئاداڤە. ﴿٥٨﴾ و هندەك ئیزایا دی ژی یا گەلەك ڕەنگ و وەکی ڤێ بۆ وان یا هەی. ﴿٥٩﴾ ئەڤە کۆمەکە [ژ خزمەتکارێت هەوە ئەوێت هەوە د دنیایێدا د سەردابرین] د گەل هەوە دێ ئێنە د دۆژەهێدا، [سەرۆك و گرەگر دێ بێژن:] ب خێر نەئێن، ب ڕاستی ئەو دێ چنە د دۆژەهێدا، و دێ تامکەنە گەرما وێ. ﴿٦٠﴾ [دویڤکەفتی] دێ بێژن [دێ بێژنە سەرۆك و گرەگرێت خۆ]: هوین ب خێر نەئێن [هوین نەهێت خۆ ب سەر دەهێت مە دئێخن]، هەوە ئەڤە ب سەرێ مە ئینا ئەم ئێخستنە د دۆژەهێدا [هوین د دنیایێدا ل بەر مە دزڤڕین و دهاتن و دچۆن، و هەوە نەدهێلا ئەم ڕێکا ڕاست بگرین، و هەوە ل بەر مە بەرزە دکر]، ڤێجا ئەڤە پیسە بنەجهە [بۆ مە و بۆ هەوە]. ﴿٦١﴾ و گۆتن: خودێوۆ هەر کەسێ ئەڤە ئینایییە سەرێ مە، ڤێجا تو ئیزایا وی یا ئاگری دوقات بکە [ئیزایەك ژ بەر گاوریا وی، و ئیزایا دی ژ بەر سەردابرنا وی بۆ مە].

وَقَالُواْ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالٗا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلۡأَشۡرَارِ ﴿٦٢﴾ أَتَّخَذۡنَٰهُمۡ
سِخۡرِيًّا أَمۡ زَاغَتۡ عَنۡهُمُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقّٞ تَخَاصُمُ أَهۡلِ
ٱلنَّارِ ﴿٦٤﴾ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٞۖ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٦٥﴾
رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفَّٰرُ ﴿٦٦﴾ قُلۡ هُوَ نَبَؤٌاْ
عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ أَنتُمۡ عَنۡهُ مُعۡرِضُونَ ﴿٦٨﴾ مَا كَانَ لِيَ مِنۡ عِلۡمِۭ بِٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰٓ
إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰٓ إِلَيَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾ إِذۡ قَالَ
رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن طِينٖ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ
فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ
أَجۡمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبۡلِيسَ ٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ
يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ أَسۡتَكۡبَرۡتَ أَمۡ كُنتَ
مِنَ ٱلۡعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن
طِينٖ ﴿٧٦﴾ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيۡكَ لَعۡنَتِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ
ٱلدِّينِ ﴿٧٨﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿٧٩﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ
ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴿٨١﴾ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ
لَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٨٣﴾





﴿٦٢﴾ و [ئەو سەرۆك و کەنکەنە] دێ بێژنە ئێکدو مە
خێرە، ئەم وان زەلامان نابینین ئەوێت مە [د دنیایێدا]
ژ خرابان دهەژمارتن. ﴿٦٣﴾ ئەرێ ئەم د ترانەپێکرنا
خۆدا د خەلەت بووین [و ئەو د بەحەشتێدانە] یان
ژی [د دۆژەهێدانە و] ب بەرچاڤێت مە ناکەڤن؟.
﴿٦٤﴾ بێ گۆمان ئەڤە ڕاستییە [ب ڤی ڕەنگی مەزن
و دویکەڤتی دێ میننە پێکڤە]، و ئەڤەیە جڕەبڕا
دۆژەهیان. ﴿٦٥﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: ئەز بەس
ئاگەهدارکەرم [هەوە ژ جزایێ خودێ، و ئیزایا وی
دترسینم]، و چو پەرستییێت ڕاست و دورست، ژ
بلی خودایێ تاك و تەنیا و خودان دەستهەلات ل سەر
هەمی تشتان، نینن. ﴿٦٦﴾ خودانێ ئەرد و ئەسمانان
و هندی د ناڤبەرا واندا، خودایێ سەردەست و
گونەهـ ژێبەرە. ﴿٦٧﴾ بێژە ئەڤە [ئەوا من بۆ هەوە
گۆتی کو ئەز پێغەمبەرم، و ئەز هەوە ژ ئیزایەکا مەزن
دترسینم، و چو خودێ ژ بلی خودایی نینن] سالۆخەکا
مەزنە [ڤێجا ب فەر وەرگرن، و ب سڤکی نەگرن].
﴿٦٨﴾ هوین بەرێ خۆ ژێ وەردگێڕن؟!. ﴿٦٩﴾ من
چو ژ ملیاکەتان نەدزانی [بەری وەحی بۆ من بێت] وەختێ وان جڕەبڕ [د ڕاستا حیکمەتا چێکرنا ئادەمیدا]
دکر. ﴿٧٠﴾ و وەحی بۆ من نائێت ئەگەر ژ بەر هندێ نەبیت کو ئەز بەس ئاگەهدارکەرەکێ ئاشکەرامە [ژ
بەر ئاگەهدارکرنا هەوە وەحی بۆ من دئێت]. ﴿٧١﴾ وەختێ خودایێ تە گۆتییە ملیاکەتان: ئەز دێ مرۆڤەکی
ژ هەڕییێ چێ کەم. ﴿٧٢﴾ ڤێجا ئەگەر من دورست کر و من ڕوح و جان دا سەر، هوین هەمی بۆ هەڕنە
سوجدەییێ. ﴿٧٣﴾ ئینا ملیاکەت هەمی بۆ چۆنە سوجدەییێ. ﴿٧٤﴾ ئبلیس تێ نەبیت خۆ مەزن دیت، و بوو
ژ گاوران. ﴿٧٥﴾ [خودایی] گۆت: هەی ئبلیس، ئەو چ بوو نەهێلای تو سوجدەییێ بۆ وی ببەی، یێ من
ب دەستێت خۆ چێ کری، ئەرێ تە ڤێ گاڤێ خۆ مەزن دیت یان ژی تو ژ وانی یێت هەروهەر خۆ مەزن
ددانن؟. ﴿٧٦﴾ گۆت: ئەز ژ وی چێترم، تە ئەز یێ ژ ئاگری چێکریم، و تە ئەو یێ ژ هەڕییێ چێکری.
﴿٧٧﴾ [خودێ] گۆت: دێ ژ ناڤ کۆما ملیاکەتان یان ژ بەحەشتێ یان ژ ئەسمانی یان ژ ناڤ کەرەمێت من
دەرکەڤە، و ب ڕاستی تو یێ زڕباری ژ دلۆڤانییا خودێ. ﴿٧٨﴾ و تو یێ زڕباری ژ دلۆڤانییا من، و لەعنەتێت
من ل سەر تە بن هەتا ڕۆژا قیامەتێ. ﴿٧٩﴾ [شەیتانی] گۆت: خودێوۆ هەتا ڕۆژا قیامەتێ دەرفەتێ بدە من
[و من نەمرینە]. ﴿٨٠﴾ [خودێ] گۆت: ب ڕاستی تو ژ دەستویرداییانی. ﴿٨١﴾ هەتا ڕۆژا وەختێ دیارکری
[وەختێ پفکرنا بۆقا ئێکێ، و مرنا هەمییان]. ﴿٨٢﴾ [شەیتانی] گۆت: خودێوۆ ئەز ب مەزناتییا تە کەم، وان
هەمییان [مەخسەد دویندەها ئادەمی] دێ د سەردا بەم. ﴿٨٣﴾ ژ بلی بەندەیێت تە، یێت هەلبژارتی و خۆسەر.

قَالَ فَٱلۡحَقُّ وَٱلۡحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ
أَجۡمَعِينَ ﴿٨٥﴾ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾
إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ ﴿٨٨﴾

## سُورَةُ الزُّمَرِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ
ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا
لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ
مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ
بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ
كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ﴿٣﴾ لَّوۡ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدٗا لَّٱصۡطَفَىٰ
مِمَّا يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ سُبۡحَٰنَهُۥۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٤﴾
خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيۡلَ عَلَى
ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيۡلِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ
كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمًّىۗ أَلَا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفَّٰرُ ﴿٥﴾



﴿٨٤﴾ [خـــودێ] گـــۆت: ڕاســـتی ســـویندا منـــە، و ژ ڕاستیـــیێ پێڤەتـر ئـەز نابێـژم. ﴿٨٥﴾ ب ڕاسـتی ئەز دێ دۆژەهـێ ژ هـەوە هەمیـــیان تـژی کـەم، ژ تـە و هنـدی ب دویـڤ تـە دکەڤـن. ﴿٨٦﴾ [هـەی پێغەمبـەر] بێـژە: [بەرانبـەری پێغەمبەراتیـــیا خـۆ] ئـەز چـو کرێیـان ژ هـەوە ناخـوازم، و ئـەز نـە ژ وانـم یـێت خـۆ تشـتەك ددانـن، و ئـەو ب خـۆ ئـەو نـە [و هویـن بـاش دزانـن ئەگـەر ئـەز پێغەمبـەر نەبامـە، مـن نەدگۆتـە هـەوە ئـەز پێغەمبـەرم]. ﴿٨٧﴾ و ئـەڤ قورئانـە چامـە و دەرسـن بـۆ خەلکـێ هەمـی جیهانـان. ﴿٨٨﴾ و ب ڕاسـتی پشـتی دەمەکـێ دی [ئانکـو ڕۆژا قیامەتـێ]، هویـن دێ ڕاستیـــیا سـالۆخێ وێ زانـن.

## سۆرەتا زومەر

### ل مەکەهێ هاتیـیە خوارێ (٧٥) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ ئەڤـە، ئینانەخوارا قورئانێ ژ خودایـێ سەردەست و کاربنەجهـە. ﴿٢﴾ ب ڕاسـتی مـە ئـەڤ قورئانـە ب هەقیـیێ بـۆ تـە ئینـا خـوارێ، ڤێجـا خـودێ بپەرێسـە، و د پەرسـتنا ویـدا یـێ دلبێش بـە [ئانکو بلا بـەس تە مەرەم ژ پەرسـتنێ، ئەو ب تنێ بیت]. ﴿٣﴾ هشیار بن پەرسـتن بـەس بـۆ ویـیە [ئانکو چـو کار نائێنە قەبویلکرن، ئەگەر ژ دل و خۆسـەر بـۆ وی ب تنێ نەبـن]، و ئەوێت غەیری خـودێ بـۆ خـۆ کرینـە پەرسـتی و پشـتەڤان، [دبێژن] ئـەم وان ناپەرێسـین ئەگەر بـۆ هنـدێ نەبیت دا مـە نێزیکی خـودێ بکـەن، ب ڕاسـتی خـودێ دێ حوکمـی د ناڤبـەرا وانـدا کـەت، ل سـەر وی تشـتێ ئـەو تێدا ژێـك جودا بوویـین [ژ کاروبارێـت دینـی]، ب ڕاسـتی خودێ، یـێ درەوین و زێدەگاور، ڕاستەرێ ناکـەت. ﴿٤﴾ و ئەگەر خـودێ ڤیابایـە بـۆ خۆ ئێکـی بکەتە کوڕ یان کـچ، دا ژ ناڤ چێکریـــیێت خۆ هەچیـێ ڤیابایە بۆ خـۆ هەلبژێریت، پـاك و پاقـژە [ژ زاڕۆکان]، و ئەوە خودایـێ تاك و سەردەسـت و دەسـتهەلاتدار. ﴿٥﴾ ئەوی ئەرد و ئەسمـان ب هەقیـیێ یـێت چـێ کریـن، شـەڤێ ل ڕۆژێ دپێچیت و ڕۆژێ ل شـەڤێ.. و ڕۆژ و هەیف یـێت بـن ئەمری خۆ کریـن [کـو د خێرا بەنیاندا بـن]، و هەمی دئێن و دچـن هەتا ڕۆژەکا دەستنیشـانکری [کـو ڕۆژا قیامەتێیـە]، بزانن ئەوە یـێ سەردەسـت و گونەهـ ژێبەر.

خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ ثُمَّ جَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم
مِّنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖۚ يَخۡلُقُكُمۡ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ
خَلۡقٗا مِّنۢ بَعۡدِ خَلۡقٖ فِي ظُلُمَٰتٖ ثَلَٰثٖۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ لَهُ
ٱلۡمُلۡكُۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ ٦ إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ
ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡۖ وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَۖ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ
لَكُمۡۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٧
ثلاثة أرباع الحزب ٤٦ ۞وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيۡهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعۡمَةٗ
مِّنۡهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ مِن قَبۡلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادٗا لِّيُضِلَّ
عَن سَبِيلِهِۦۚ قُلۡ تَمَتَّعۡ بِكُفۡرِكَ قَلِيلًا إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ ٨
أَمَّنۡ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ سَاجِدٗا وَقَآئِمٗا يَحۡذَرُ ٱلۡأٓخِرَةَ
وَيَرۡجُواْ رَحۡمَةَ رَبِّهِۦۗ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ
لَا يَعۡلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٩ قُلۡ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٞۗ
وَأَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجۡرَهُم بِغَيۡرِ حِسَابٖ ١٠



﴿٦﴾ هوین هەمی ژ گیانەکی ب تنێ یێت چێ کرین، پاشی هەڤسەرا وی ژێ چێکر، و هەشت جوت ژ تەرش و کەوالان یێت چێ کرین [ژ پەزێ سپی نێر و مێ، و ژ پەزێ ڕەش نێر و مێ، و ژ حێشتران نێر و مێ، و ژ چێلان نێر و مێ]، و هەوە د زکێت دەیکێت هەوەدا، چێکرن ل دویڤ چێکرنێ [چێکا ئاڤییە دبیتە خوینپارە، پاشی گوشتپارە، پاشی هەستی و گوشت]، د سێ تاریستاناندا [تاریستانا زکی و یا مالبچویکی و یا پزدانی] چێ دکەت، ئەوێ ڤێ دکەت، خودێیە، خودانێ هەوەیە، سەروەری بو ویە، و چو پەرستییێت ڕاست و دورست غەیری وی نینن، ڤێجا هوین چاوا ڕوییێ خو ژ ئێکینیا خودێ وەردگێڕنە هەڤپشك چێکرنێ. ﴿٧﴾ ئەگەر هوین گاور ببن [گەلی مروڤان]، ب ڕاستی خودێ یێ بێ منەتە ژ [پەرستنا] هەوە، و ئەوی گاوری بو بەندەیێت خو نەڤێت، و ئەمرێ کەسێ ناکەت گاور ببیت، و ئەگەر هوین سوپاسیا وی بکەن هەر ئەڤەیە یا وی ژ هەوە دڤێت، و نینە کەسەك گونەهێ بکەت و ل سەر نەئێتە جزاکرن، و کەس گونەها کەسێ هەلناگریت، و پاشی زڤڕینا هەوە هەر ب بال خودایێ هەوەڤەیە [ڤێجا وێ ڕوژێ کو ڕوژا قیامەتێیە]، دێ هەوە ب وی تشتێ هەوە دکر ئاگەهدارکەت، ب ڕاستی هەر تشتەکێ د دلاندا هەی ژێ ب ئاگەهە. ﴿٨﴾ و مروڤی گاڤا نەخوشییەك گەهشتێ دێ دوعایان ژ خودایێ خو کەت و لێ زڤڕیت، پاشی گاڤا خودێ کەرەمەك ژ دەڤ خو د گەل کر، نەخوشیا بەری نوکە دوعا بو دکرن، ژ بیر کر، و هەڤبەر بو خودێ چێ کرن، دا خەلکی د سەردا ببەت و ژ ڕێکا خودێ دەربێخیت، بێژە: پیچەکێ خوشییێ ب گاوریا خو ببە، ب ڕاستی تو ژ دوژەهیانی. ﴿٩﴾ ئەرێ ئەڤە [ئەڤێ بەری نوکە ئاخڤتن ل سەر] وەکی وییە یێ د وەختێت شەڤێدا ڕادبیت و سوجدەیان دبەت، و ژ ئیزایا ئاخرەتێ دترسیت و ژ دلوڤانیا خودایێ خو یێ ب هیڤییە؟ بێژە: ئەرێ ما ئەوێت [ئەرکێت خو] دزانن [و کار پێ دکەن] و ئەوێت نەزانن وەکی ئێکن؟ ب ڕاستی بەس خودان ئەقل بو خو شیرەتان وەردگرن. ﴿١٠﴾ [هەی موحەمەد] بێژە بەندەیێت من ئەوێت باوەری ئینایین ژ خودێ بترسن [ئەمرێ وی ب جهـ بینن، و خو ژ نەهییا وی بدەنە پاش] ئەوێت د ڤێ دنیایێدا قەنجی کرین، بو وان قەنجی [د دنیایێ و ئاخرەتێدا] یێت هەین، و ئەردێ خودێ یێ بەرفرەهە [ئەوێ نەشێت د جهێ خودا خودێ بپەرێسیت و چاکییێ بکەت، بلا بچیتە وی جهی ئەوێ تێدا بشێت خودێ بپەرێسیت]، ب ڕاستی ب تنێ خوراگر و سەبرکێشان [ئەوێت سەبرا خو، ل سەر مشەختبوونێ و ئەو ئەزیەتا د ڕێکا خودێدا دگەهیتە وان، دکێشن] خەلاتێ وان بێ حسێب دێ ئێتەدان.

قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿١١﴾ وَأُمِرۡتُ لِأَنۡ أَكُونَ
أَوَّلَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٢﴾ قُلۡ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ
عَظِيمٖ ﴿١٣﴾ قُلِ ٱللَّهَ أَعۡبُدُ مُخۡلِصٗا لَّهُۥ دِينِي ﴿١٤﴾ فَٱعۡبُدُواْ مَا شِئۡتُم مِّن
دُونِهِۦۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ
أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٥﴾ لَهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ ظُلَلٞ مِّنَ ٱلنَّارِ
وَمِن تَحۡتِهِمۡ ظُلَلٞۚ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥۚ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴿١٦﴾
وَٱلَّذِينَ ٱجۡتَنَبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعۡبُدُوهَا وَأَنَابُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰۚ
فَبَشِّرۡ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ
أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٨﴾
أَفَمَنۡ حَقَّ عَلَيۡهِ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي ٱلنَّارِ ﴿١٩﴾
لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ غُرَفٞ مِّن فَوۡقِهَا غُرَفٞ مَّبۡنِيَّةٞ تَجۡرِي
مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ ٱلۡمِيعَادَ ﴿٢٠﴾ أَلَمۡ تَرَ
أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ
يُخۡرِجُ بِهِۦ زَرۡعٗا مُّخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ
يَجۡعَلُهُۥ حُطَٰمًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٢١﴾



﴿١١﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: ب ڕاستی فەرمانا من یا هاتییە کرن، ئەز خودێ ب تنێ و ب دلبێشی بپەرێسم، و پەرستنا من خۆسەر بۆ وی بیت. ﴿١٢﴾ و ئەمرێ من یێ هاتییە کرن کو ئەز ببمە موسلمانێ ئێکێ [ژ ڤی ملەتی]. ﴿١٣﴾ بێژە: ب ڕاستی ئەز ژ ئیزایا ڕۆژا مەزن [کو ڕۆژا قیامەتێیە] دترسم، ئەگەر ئەز گوهێ خۆ نەدەمە خودایێ خۆ [و پەرستنێ ژ دل بۆ وی نەکەم]. ﴿١٤﴾ بێژە: ئەز خودێ ب تنێ دپەرێسم، و پەرستنا من خوری بۆ وییە [و ئەز پەرستنا خۆ ب شرکێ و ڕویمەتییێ و چو تشتێ دی تێکەل ناکەم]. ﴿١٥﴾ ڤێجا چ یێ هەوە بڤێت شوینا خودێ بپەرێسن، بپەرێسن، بێژە نێ خوسارەت ئەون ئەوێت ڕۆژا قیامەتێ خۆ و مالێ خۆ خوسارەت کرین، هشیار بن، ئەڤەیە خوسارەتییا ئاشکەرا. ﴿١٦﴾ ئەڤان [د دۆژەهێدا] ل هنداڤی وان ئاگر تەختە تەختەیە، و د بن واندا ژی ئاگر تەختە تەختەیە [ئانکو ئاگری دۆرماندۆرێت وان یێت گرتین]، خودێ بەندەیێت خۆ ب ڤی ئاگری دترسینیت، گەلی بەندەیێت من خۆ ژ [ئیزایا] من بپارێزن. ﴿١٧﴾ و ئەوێت خۆ ژ پەرستنا سەرگاوری [ئەوێ شوینا خودێ دئێتە پەرستن] داینە پاش و ل خودێ زڤرین، مزگینی [ل سەر زمانێ پێغەمبەران یان وەختێ ل بەر مرنێ یان وەختێ ژ گۆڕان ڕادبنەڤە] ل وان بیت، ڤێجا مزگینییێ بدە بەندەیێت من. ﴿١٨﴾ ئەوێت گول ئاخڤتنان دبن و ل دویف یا چێتر دچن، ئەڤەنە یێت خودێ ڕاستەڕێ کرین، و هەر ئەڤەنە خودان ئەقل. ﴿١٩﴾ ئەرێ ئەوێ ئیزا بۆ واجب بوویی، و د ناڤ ئاگریدا، ما تو دشێی وی ڕاستەڕێ بکەی کو قورتال ببیت [پێغەمبەر ل سەر باوەرئینانا ملەتێ خۆ گەلەکێ ڕژد بوو، و خەمێت مەزن ژێ دخوارن، ئینا خودێ ئاگەهدار کر کو ئەوێ خودێ ئاگر بۆ ئێخستی، ئەو نەشێت ب خورتی باوەرییێ بکەتە د سەریدا، دا قورتال ببیت، ڤێجا ب بەر ناکەڤیت تو خۆ د خەمێت واندا د بەر نەمانێرا ببەی]. ﴿٢٠﴾ بەلێ ئەوێت تەقوایا خودایێ خۆ کرین، وان جهێت بلند د سەردا جهێت بلندێت ئاڤاکری یێت هەین ڕوبیار د بنرا دچن، ئەڤە پەیمانا خودێیە، و خودێ پەیمانا خۆ ناشکێنیت. ﴿٢١﴾ ما تو نابینی نێ خودێیە ئاڤێ ژ ئەسمانی دئینیتە خوارێ، و وێ ئاڤێ دکەتە کانی د ئەردیدا، پاشی چاندنێت ڕەنگ ڕەنگ پێ دەردئێخیت، پاشی هشك دبن، ڤێجا دێ بینی زەر بوون، پاشی دکەتە پویشەکی پرت پرت، ب ڕاستی ئەڤە [ئینانەخوارا ئاڤێ بۆ شینکرنا گیای و چاندنێ ب ڤی ڕەنگی] نیشان و چامەیە بۆ خودان ئەقلان.

أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ فَوَيْلٌ
لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٢﴾
ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ
جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ
إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن
يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ أَفَمَن يَتَّقِى بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ
ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٢٤﴾
كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ
لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٥﴾ فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ٱلْخِزْىَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ
ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى
هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا
غَيْرَ ذِى عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٢٨﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ
شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ
ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٩﴾ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم
مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴿٣١﴾





﴿٢٢﴾ ئەرێ ئەوێ خودێ سینگێ وی بۆ ئیسلامێ ڤەکربیت [ڤێجا ئیسلام وەرگرتبیت، و ڕاستەڕێ بوویبیت]، ڤێجا ئەو ژ بەر وێ سینگفرەهییێ ل بەر ڕاستەڕێییێ و ڕۆناهییا خودایێ خۆ بیت [وەکی ویـیە یێ مۆر ل سەر دلێ وی هاتییەدانان و دلێ وی ڕەق بووی] ڤێجا ئیزا و نەخۆشی بۆ وان بیت ئەوێت دلێت وان ژ بیرئینان و زکرێ خودێ یێت ڕەق، ئەڤە یێت د ڕێبەرزەبوونەکا ئاشکەرادا.
﴿٢٣﴾ خودێ چێترین کەلام [کو قورئانە] هنارت، کتێبەکە [ئایەتێت وێ د لێکدان و ڕەوانبێژی و دارشتن و ڕامان و ئەحکام و دورستی و ڕاستی و هیدایەت و حیکمەت و ئیعجازا خۆدا] وەکی ئێکە و یا دوبارەیە [د چیرۆك و بەحس و ئەحکام و فەرمان و شیرەتێت خۆدا]، ڤێجا ئەوێت ژ خودێ ترس [دەمێ دخوینن] لەشێ وان [ژ ترساندا] دلەرزیت، پاشی لەش و دلێت وان بۆ زکر و بیرئینانا خودێ نەرم دبن، ئەڤەیە [ئەڤ قورئانەیە] ڕاستەڕێییا خودێ، یێ بڤێت پێ ڕاستەڕێ دکەت، و هەر کەسێ خودێ گومڕا بکەت کەس نینە وی ڕاستەڕێ بکەت.
﴿٢٤﴾ ڤێجا ئەرێ ئەوێ خۆ ب سەروچاڤێت خۆ ژ ئیزایا دژوار و گرانا ڕۆژا قیامەتێ بپارێزیت [وەکی ویـیە یێ ژێ ئێمن و پشتڕاست] و ملیاکەت دێ بێژنە ستەمکاران دێ بخون و تامکەنە وێ یا هەوە کری و هەوە ب سەرێ خۆ ئینایی.
﴿٢٥﴾ ئەوێت بەری وان ژی [مەخسەد بەری موشرکێت قورەیشییان] پێغەمبەرێت خۆ درەوین دانان، ڤێجا وەسا ئیزا بۆ وان هات، وان های ژێ نە.
﴿٢٦﴾ و خودێ د ژیانا دنیایێدا ڕسوایی و شەرمزاری دا وان و ئیزایا قیامەتێ هێژ مەزنترە ئەگەر [ئەو] بزانن.
﴿٢٧﴾ و ب ڕاستی مە ژ هەمی نموونەیان [گەلەك جاران و ب ڕێکێت جودا جودا] بۆ مرۆڤان، د ڤێ قورئانێدا، یێت ئینایین، دا ل خۆ بزڤرن و شیرەتان بۆ خۆ ژێ وەرگرن.
﴿٢٨﴾ قورئانەکە ب زمانێ عەرەبییە، و یا بێ کێم و کاسی و بێ خوار و ڤیچییە، دا ئەو خۆ ژ گاورییێ بپارێزن.
﴿٢٩﴾ خودێ دو کۆلەیان دکەتە نموونە: ئێکی چەند مرۆڤێت دژی ئێك تێدا د پشکدار بن [و هەر ئێك بۆ خۆ ڤەکێشیت، و ئەو نەزانیت کێ ڕازی بکەت و کێ ڕازی نەکەت، و گوهێ خۆ بدەتە کێ و نەدەتە کێ] و یێ دی کۆلەیێ زەلامەکی ب تنێ بیت [و ئەڤە ئەوە یێ خودێ ب تنێ دپەرێسیت و بەندەیێ خودێ ب تنێ] ئەرێ ئەڤ هەردووکە وەکی ئێکن؟ هەمی سوپاسی و پەسن بۆ خودێ بن [ئەوێ بەس ئەو هێژایی پەرستنێ]، بەلێ بارا پتر ژ وان ڤێ نوزانن [و هەڤپشکان بۆ خودێ چێ دکەن].
﴿٣٠﴾ بێ گۆمان تو دێ مری و ئەو ژی دێ مرن [کەس نینە نەمریت].
﴿٣١﴾ پاشی، ب ڕاستی هوین ڕۆژا قیامەتێ ل دەڤ خودایێ خۆ دێ د گەلێك ب جرە چن [تو دێ بەلگە و نیشانان ل سەر وان ئینی، کو تە ئەمرێ خودێ ب دورستی گەهاندە وان، و ئەو دێ ل بەر گەڕن هندەك هەجەتێت لاواز و پویچ بۆ خۆ بگرن].

*فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ
إِذْ جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِى
جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾
لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٤﴾
لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم
بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ
عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ
فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ۗ
أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴿٣٧﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ
مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِىَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ
ضُرِّهِۦٓ أَوْ أَرَادَنِى بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ
قُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ يَٰقَوْمِ
ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَٰمِلٌ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾
مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٤٠﴾





﴿٣٢﴾ ڤێجا ما کی ژ وی ستەمکارترە یێ ب ناڤێ خودێ درەوان بکەت، و پێغەمبەری درەوین بدانیت پشتی بۆ هاتی، ئەرێ ما جهێ گاوران د دۆژەهێدا نینە؟. ﴿٣٣﴾ و ئەوێ هاتی، و ڕاستی [کو قورئانە و ئەڤ ئیسلامەیە] ئینایی [کو پێغەمبەرە]، و ئەوێت باوەر ژێ کرین [کو موسلمانن]، نێ ئەڤەنە یێت تەقوادار [یێت خۆ ژ شرکێ پاراستین]. ﴿٣٤﴾ ئەوا وان بڤێت بۆ وان ل دەڤ خودایێ وان هەیە، و ئەڤەیە خەلاتێ قەنجیکاران. ﴿٣٥﴾ [خەلاتێ وان ئەڤەیە] دا خودێ خرابترین کارێ وان کری بۆ ژێ ببەت و بنخێڤیت، و ب چێترین کارێ وان کری، وان خەلات بکەت. ﴿٣٦﴾ ئەرێ ما خودێ نەبەسی بەندەیێ خۆیە [مەخسەد پێغەمبەرە، کو خودێ بەسی ویە وی ژ خرابیا نەیارێت وی بپارێزیت]، و تە ب غەیری خودێ [مەخسەد بوتێت وانن] دترسینن [ڤێجا نەترسە هندەك بەرێت ڕەق و هشکن، نە زیانێ دگەهینن و نە مفایی]، و هەر کەسێ خودێ گومڕا بکەت، کەس نینە وی ڕاستەڕێ بکەت. ﴿٣٧﴾ و هەر کەسێ خودێ ڕاستەڕێ بکەت، کەس نینە وی د سەردا ببەت و گومڕا بکەت، ما خودێ یێ سەردەست و تۆلڤەکەر نینە؟.

﴿٣٨﴾ و ئەگەر تو پسیارێ ژ وان بکەی: کێ ئەرد و ئەسمان چێ کرینە؟ دێ بێژن: خودێ، بێژە [وان]: کا بۆ من بێژن ئەرێ ئەوێت هوین شوینا خودێ دپەرێسن، ئەگەر خودێ ڤیا نەخۆشیەکێ [چ نەخۆشیا هەبیت] بگەهینیتە من، ئەو دشێن وێ نەخۆشیا وی ڤیایی ل سەر من وەرگێڕن؟ یان ژی ئەگەر خودێ ڤیا دلۆڤانیەکێ [خێرەکێ] ب من ببەت [ئەوێت هوین ل شوینا خودێ دپەرێسن] ئەرێ ئەو دشێن ڕێکێ ل دلۆڤانیا وی بگرن؟ بێژە: خودێ بەسی منە، و ئەوە یێ پشت گەرمیخواز پشتا خۆ پێ گەرم دکەن.

﴿٣٩﴾ بێژە: ملەتێ من، ل سەر وی کاری بن یێ هوین دکەن، ئەز ب خۆ ژی دێ ل سەر کارێ خۆ بم.

﴿٤٠﴾ و هوین دێ زانن کا ئیزا دێ بۆ کێ ئێت کو ڕسوا و شەرمزار بکەت، و کا ئیزایا بەردەوام دێ کێ گریت.

إِنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ
فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم
بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِي
لَمۡ تَمُتۡ فِي مَنَامِهَاۖ فَيُمۡسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيۡهَا ٱلۡمَوۡتَ
وَيُرۡسِلُ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ
يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَۚ قُلۡ
أَوَلَوۡ كَانُواْ لَا يَمۡلِكُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَعۡقِلُونَ ﴿٤٣﴾ قُل
لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعٗاۖ لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ ثُمَّ
إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُ ٱشۡمَأَزَّتۡ
قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن
دُونِهِۦٓ إِذَا هُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿٤٥﴾ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ عَٰلِمَ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحۡكُمُ بَيۡنَ عِبَادِكَ
فِي مَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوۡ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَا فِي
ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفۡتَدَوۡاْ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلۡعَذَابِ
يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمۡ يَكُونُواْ يَحۡتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾



﴿٤١﴾ ب ڕاستی مە كتێب [ئەڤ قورئانە] ب ڕاستییێڤە
و ب ڕێكا تە بۆ خەلكی هنارت، ڤێجا هەر كەسێ
ڕاستەڕێ بیت بۆ خۆ ڕاستەڕێ دبیت، و هەر كەسێ
گومڕا ببیت زیانێ دێ ل خۆ كەت، و تو پارێزەرێ
وان نینی [هەتا وان بەر ب باوەری ئینانێڤە ببەی،
یان ب كۆتەكی وە ل وان بكەی، باوەرییێ بینن].
﴿٤٢﴾ و خودێ جان و ڕوحان وەختێ مرنێ [كو مرنا
مەزنە] و وەختێ نڤستنێ [كو مرنا بچویكە] دستینیت،
ڤێجا یا مرن بۆ ئێخستی دگریت و نابەردەت و یا
دی هەتا دەمەكێ دیاركری بەردەدەت، و ب ڕاستی
ئەڤە نیشان و بەلگەنە بۆ وان ئەوێت هزرا خۆ دكەن.
﴿٤٣﴾ [نەخێر وان هزرا خۆ نەكر] بەلێ وان غەیری
خودێ بۆ خۆ كرنە مەهدەرچی. بێژە: ئەگەر خۆ وان
چو نەبیت و چو نەزانن ژی [هەر دێ وان بۆ خۆ كەنە
مەهدەرچی]. ﴿٤٤﴾ بێژە: مەهدەری هەمی یا خودێیە
[و كەس نینە بێی دەستویرییا وی مەهدەریێ بكەت]،
و مالدارییا ئەرد و ئەسمانان هەر یا ویە، پاشی
هەر دێ ب بال ویڤە زڤڕن [ئەو دێ حوكمی د ناڤبەرا
هەوەدا كەت]. ﴿٤٥﴾ و ئەگەر ناڤێ خودێ ب تنێ هاتەئینان، دلێت وان ئەوێت باوەری ب ئاخرەتێ نەی
تێك دچن، و ئەگەر بەحسێ غەیری خودێ هاتەكرن، وێ گاڤێ ب كەیف دكەڤن. ﴿٤٦﴾ بێژە: خودێوۆ،
چێكەرێ ئەرد و ئەسمانان، زانایێ نهێنی و ئاشكەرایان، تو حوكمی د ناڤبەرا بەندەیێت خۆدا دكەی، د وی
تشتێ ئەو تێدا ژێك جودا. ﴿٤٧﴾ و ب ڕاستی [ڕۆژا قیامەتێ] ئەگەر هندی د ئەردیدا هەی یێ ستەمكاران
بایە، هندی دی ژی د گەل یێ وان بایە، دا [وێ ڕۆژێ] ژ پێش خۆڤە دەن ژ بەر ئیزایا گران یا وێ ڕۆژێ، و
ئەو [ئیزا و نەخۆشییا دۆژەهێ] بۆ وان ژ نك خودێ ئاشكەرا بوو، یا هزرا وان بۆ نەدچۆ.

وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ
يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٤٨﴾ فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَٰهُ
نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍۭ بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ وَلَٰكِنَّ
أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٩﴾ قَدْ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَآ
أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٥٠﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ
مَا كَسَبُواْ ۚ وَٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْ هَٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّـَٔاتُ
مَا كَسَبُواْ وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥١﴾ أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ
ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾
الحزب ٤٧ ۞ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ
مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ
ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُواْ لَهُۥ مِن
قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحْسَنَ
مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ
بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ
عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾



«٤٨» [وێ رۆژێ كو رۆژا قیامەتێیە] خرابییا كار و
كریارێت وان كرین بۆ وان دیاربوو، و ئەو ئیزایا وان
ترانە پێ دكرن، دۆرماندۆرێت وان گرتن. «٤٩» ڤێجا
هەر وەختێ نەخۆشییەك [چ نەساخی چ خێزانی و
ژاری و... هتد] گەهشتە مرۆڤی، دێ دوعایان ژ مە
كەت [ئەم وێ نەخۆشییێ ل سەر راكەین]، پاشی
ئەگەر مە كەرەمەك ژ دەڤ خۆ دایێ، دێ بێژیت ئەڤە
یا شارەزاییا منە، نەخێر وەسا نینە [نە یا شارەزاییا
تەیە] بەلێ ئەڤە [كەرەما مە دایی تە] جەرباندنە [كا
دێ سوپاسییا خودێ كەی یان دێ سەرداچی]،
بەلێ باراپتر ژ مرۆڤان ئەڤێ نوزانن [كو دانا مالی
جەرباندنە و ژ بەر هندێ ژی د سەر پێ خۆدا دچن].
«٥٠» ب سویند ئەوێت بەری وان ژی ئەڤە دگۆت
[وەكی قاروونی و دەستەكا وی]، و ئەو مال و ملكێ
وان كۆمكری، ئەو ژ ئیزایا خودێ قورتال نەكرن [و
فایدەی وان نەكر]. «٥١» و جزایێ كریارێت وان ئەو
هنگاڤتن، و ئەوێت ستەم كرین ژ وان دێ جزایێ
كریارێت وان، وان هنگێڤیت، و نە دشێن ژێ برەڤن،
و نە دشێن ژ خۆ بدەنە پاش. «٥٢» ما وان نەزانییە كو خودێیە رزقی بۆ وی یێ وی بڤێت بەرفرەه و
بەرتەنگ دكەت، و ب راستی ئەڤە [بەرفرەهكرن و بەرتەنگكرنا رزقی] نیشان و چامەنە بۆ وان ئەوێت
باوەرییێ دئینن. «٥٣» [هەی موحەمەد تو ب ناڤێ خودایێ خۆ] بێژە [وان]: هەی بەندەیێت من، هەی
ئەوێت هەوە زێدە گونەه كرین و هەوە د كرنا گونەهاندا، داییە سەر هەمی تخوبیان، ژ دلۆڤانییا خودێ
بێ هیڤی نەبن، ب راستی خودێ ل هەمی گونەهان دبۆریت، و هەمی گونەهان ژێ دبەت، ب راستی
ئەوە گونەه ژێبەر و دلۆڤان. «٥٤» و ل خودایێ خۆ بزڤرن و تۆبە بكەن و خۆ بسپێرنە وی [ل بەر ئەمرێ
وی ب تنێ د راوەستای بن]، بەری ئیزا ب سەر هەوەدا بێت، پاشی هنگی هاریكارییا هەوە نائێتەكرن.
«٥٥» و هوین [گەلی بەندەیێت من] ل دویڤ ڤێ قورئانێ هەرن [ئەحكامێت وێ ب جه بینن]، بەری ژ
نشكەكێڤە ئیزا ب سەر هەوەدا بێت و هەوە های ژ خۆ نە. «٥٦» [كار ب قورئانێ بكەن] دا كەس [رۆژا
قیامەتێ] نەبێژیت: حەیف و مخابن بۆ وێ تەخسیری و سستییا من د دگوهدانا خودێدا كری، و حەیف و
مخابن ئەز ژ ترانەپێكەران بووم.

أَوۡ تَقُولَ لَوۡ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوۡ تَقُولَ
حِينَ تَرَى ٱلۡعَذَابَ لَوۡ أَنَّ لِي كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٨﴾
بَلَىٰ قَدۡ جَآءَتۡكَ ءَايَٰتِي فَكَذَّبۡتَ بِهَا وَٱسۡتَكۡبَرۡتَ وَكُنتَ
مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى
ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسۡوَدَّةٌۚ أَلَيۡسَ فِي جَهَنَّمَ مَثۡوًى لِّلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾
وَيُنَجِّي ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ بِمَفَازَتِهِمۡ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ
وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ
شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿٦٢﴾ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٦٣﴾ قُلۡ
أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ أَيُّهَا ٱلۡجَٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدۡ
أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ
لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ
ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ
قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ
مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٦٧﴾





﴿٥٧﴾ یـان بێژیت ئەگـەر خودێ ئـەز ڕاسـتەڕێ كربامە،
ئـەز دا ژ پارێزكاران بـم [ئەڤرۆ]. ﴿٥٨﴾ یـان ژی وەختێ
ئیزایـــێ دبینیت بێژیت: خۆزی ئەز جـارەكا دی زڤڕیبامە
[دنیایـــێ]، و ئـەز ژ قەنجیكاران بامە. ﴿٥٩﴾ بەلێ نیشـان
و ئایەتێت من [د دنیایـــێدا] بۆ تە هاتبوون [و تو دشـیایی
ڕاسـتەڕێ ببـی، ئەگەر تـە باوەری پـێ ئینابایـە]، بەلێ تە
درەو دانـان، و تـە خـۆ مـەزن كـر و تـو ژ گـاوران بووی
[ڤێجـا ژ نـوی تـو دبێـژی ئەگەر خـودێ ئـەز ڕاسـتەڕێ
كربامە و جارەكا دی زڤڕیبامە دنیایـــێ، و تو ب خۆ بەری
نوكـە د دنیایـــێدا بـووی، و هەمی ڕێكێت ڕاسـتەڕێكرنێ
ل بـەر چاڤێـت تـە یـێت دیاربـوون بەلـێ تـە نەگرتـن].
﴿٦٠﴾ و ڕۆژا قیامەتـێ ئەوێـت درەو ب ناڤـێ خـودێ
كرین [هەڤپشـك بۆ چێ كریـن]، دێ بینی ڕوی ڕەشـن،
مـا جە بـۆ ئەوێـت خـۆ مـەزن دكـەن د دۆژەهێـدا نینە؟.
﴿٦١﴾ و ئەوێـت تەقـوا خـودێ كریـن [و خـۆ ژ شركـێ
پارسـتین]، خـودێ دێ وان قورتالكـەت ژ بـەر چۆنـا
وان ل سـەر ڕێـكا سەرفەرازیـــێ، نە ئیـزا دگەهیتە وان و
نـە ژی ب خـەم دكەڤـن. ﴿٦٢﴾ خـودێ چێكـەرێ هەمی
تشـتانە، و هەر ئەوە سـەخبێركەر و سـەركارێ هەمی تشـتان. ﴿٦٣﴾ كلیلێت ئەرد و ئەسمـــانان یـێت وینە [كارێ
ڕێڤەبرنـا ئەرد و ئەسمـــانان بەس یـــێ ویـــیە]، و ئەوێت باوەری ب نیشـان و موعجیزەیـێت خودێ نەئینایـــین،
ئـەون یـێت خوسـارەت. ﴿٦٤﴾ بێژە: گـەلی نەزانان، ئەرێ هویـن ئەمرێ من دكـەن، ئەز ئێكـێ دی شـوینا خودێ
بپەرێسـم. ﴿٦٥﴾ ب سـویند وەحـی بـۆ تـە و بـۆ پێغەمبەرێت بـەری تە یا هاتـی، ئەگەر تو هەڤپشـكان بـۆ خودێ
چـێ كـەی دێ كار و كریارێـت تـە پویـچ بـن، و دێ بیـیە ژ وان ئەوێـت خوسـارەت. ﴿٦٦﴾ [نـە وی نەپەرێسـە
یـــێ ئـەو ئەمـرێ تـە پێ دكـەن] بەلـێ خـودێ بپەرێسـە و ژ شـوكورداران بـە. ﴿٦٧﴾ وان [ئەوێت هەڤپشـكان بۆ
خـودێ چـێ دكەن] ب دورسـتی و ب ڕەنگێ پێدڤـی، ڕێز ل خودێ نەگرتیـیە [و وەك پێدڤی نەنیاسیـیە و مەزن
نەدانایە]، و ئەرد هەمی ڕۆژا قیامەتێ د دەسـتێ ویدایە، و ئەسمـــان ژی د دەسـتێ وی یـــێ ڕاسـتێدا د پێچایـــینە،
و خـودێ یـــێ پاك و بلنـدە ژ وێ شركا ئـەو دكەن.

وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ
إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ٦٨
وَأَشۡرَقَتِ ٱلۡأَرۡضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ وَجِاْيٓءَ
بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ٦٩
وَوُفِّيَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَا يَفۡعَلُونَ ٧٠
وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا
فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ
يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ
هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٧١
قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى
ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ٧٢ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ
زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا
سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ٧٣ وَقَالُواْ
ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ
نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلۡجَنَّةِ حَيۡثُ نَشَآءُۖ فَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ٧٤





﴿٦٨﴾ و بۆق [بۆقا ئێکێ] هاتە پفکرن، ڤێجا هندی
د ئەرد و ئەسماناندا هەی دکەڤن و دمرن، ژ بلی وی
یێ خودێ حەز نەکری بمریت [کو ئسرافیل ب
خۆیە، پاشی پشتی هنگی ئەو ژی دمریت]، پاشی
جارەکا دی پف ل بۆقێ هاتەدان، هنگی ئەو دێ
ژپێڤە راوەستن و چاڤەرێ بن [کا دێ چ ب سەرێ
وان ئێت]. ﴿٦٩﴾ و ئەردێ مەحشەرێ ب نوورها
خودایێ خۆ رۆن بوو، و کتێبێت کار و کریاران هاتنە
دانان، و پێغەمبەر و شاهد [ئەو ملیاکەتێت کریارێت
بەندەیان دنڤێسن] هاتنە حازرکرن، و حوکم ب
دورستێ د ناڤبەرا واندا [بەندەیاندا] هاتەکرن، و ستەم
ل کەسێ ژ وان نائێتەکرن [نە خێرێت وان کێم دبن،
و نە گونەهێت وان زێدە دبن]. ﴿٧٠﴾ و هەر ئێک
دگەهیتە وێ یا وی کری [جزایێ خۆ دستینیت]، و
خودێ ب وێ یا ئەو دکەن ژوان ب ئاگەهدارترە، [ژ
خێر و گۆنەهان و چ ژکار و کریاریارێت وان ل بەر
بەرزەنابیت]. ﴿٧١﴾ و ئەوێت گاوربووین کۆم کۆم
بۆ جەهنەمێ دێ ئێنە ئاژۆتن، گاڤا گەهشتنە دەڤ،
دەرگەهێت [جەهنەمێ] دێ [بۆ وان] ڤەبن، دەرگەهڤانێت دۆژەهێ دێ بێژنە وان: ئەرێ ما پێغەمبەر ژ هەوە
ب خۆ، بۆ هەوە نەهاتبوون، ئایەتێت خودێ بۆ هەوە بخوینن، و هەوە ژ دیتنا ڤێ رۆژێ بترسینن؟ دێ
بێژن: بەلێ [پێغەمبەر بۆ مە هاتبوون، و ئەم ژ ڤێ رۆژێ ترساندبووین]، بەلێ ئەمرێ خودێ ب ئیزادانێ
د راستا مە گاوراندا د جهێ خۆدا بوو [و ئەم هێژایی ڤێ بووین ئەڤا هاتییە سەرێ مە]. ﴿٧٢﴾ دێ بێژنە
وان، [ما دەم وەسایە ڤێجا] رێکا دەرگەهێت جەهنەمێ بگرن و هەروهەر تێدا بمینن، وەی چ پیسە جهە
جهێ خۆمەزنکەران [ئەوێت خۆ ژ پەرستنا خودێ مەزنتر دیتین]. ﴿٧٣﴾ و ئەوێت پارێزکارییا خودێ کرین
دەست دەست بۆ بەحەشتێ دێ ئێنە رەوانەکرن، ڤێجا گاڤا گەهشتنە دەڤ بەحەشتێ دەرگەهێت وێ بۆ وان
ڤەدبن، و دەرگەهڤانێت وێ دێ بێژنە وان: سلاڤ ل هەوە بن، هوین ژ گونەهان هاتنە پاقژکرن، و هەرنە د
بەحەشتێدا و هەروهەر تێدا بن. ﴿٧٤﴾ و [بەحەشتی] دێ بێژن: هەمی پەسن و شوکور بۆ وی خودایی ئەوێ
پەیمانا خۆ ئەوا داییە مە ب جه کری، و ئەردێ بەحەشتێ گەهاندییە مە هەر جهێ مە بڤێت لێ ئاکنجی
ببین، و چ خۆش خەلاتە، خەلاتێ وان ئەوێت کار و کریارێت ڤەنج دکەن.

وَتَرَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ
رَبِّهِمْ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ ۚ وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٥﴾

سُورَةُ غَافِرٍ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نصف الحزب ٤٧

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٢﴾ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ
وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ ذِى ٱلطَّوْلِ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ إِلَيْهِ
ٱلْمَصِيرُ ﴿٣﴾ مَا يُجَٰدِلُ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَا يَغْرُرْكَ
تَقَلُّبُهُمْ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿٤﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَٱلْأَحْزَابُ
مِنۢ بَعْدِهِمْ ۖ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍۭ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ ۖ
وَجَٰدَلُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ فَأَخَذْتُهُمْ ۖ فَكَيْفَ
كَانَ عِقَابِ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ
كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ
وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ
لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَٱغْفِرْ
لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٧﴾



﴿٧٥﴾ و تو دێ ملیاکەتان بینی ل دۆر عەرشی وەرهاتین، و پەسن و شوکور و تەسبیحا خودێ دکەن، و خودێ ژ هەمی کێماسییان پاقژ دکەن، و ب دادوەری حوکم د ناڤبەرا واندا [بەحەشتی و دۆژەهیاندا] هاتەکرن، و بەحەشتی دێ بێژن: هەمی پەسن و شوکور بۆ خودانێ هەمی جیهانان.

## سۆرەتا غافر

### ل مەکەهێ هاتیە خوارێ (٨٥) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ هۆسا دئێتە خواندن (حا، میم)، ل دۆر ڕاڤەکرنا ڤان ڕەنگە تیپان، بزڤرە سەرێ سۆرەتا (بەقەرە). ﴿٢﴾ ئینانەخوارا ڤێ قورئانێ ژ نک خودایێ سەردەست و زێدە زانایە. ﴿٣﴾ گونەهـ ژێبەر و تۆبەوەرگر و ئیزا گران و خودان کەرەمە، چو پەرستی یێت ڕاست و دورست ژ وی پێڤەتر نینن، و دویماهیا هەر تشتەکی ب بال ویڤەیە. ﴿٤﴾ کەس مەدەرکییێ د ئایەتێت خودێدا ناکەت گاور نەبن، ڤێجا گەڕیان و هاتن و چۆنا وان [ئانکو بازرگانی و سلامەتیا وان، د گەل گاورییا وان] د وەلاتاندا بلا تە نەخاپینیت [کو تو وێ هزرێ بکەی ئەو نا ئێنە ئیزا دان و ناهێنە سزاکرن ل سەر کاروکریارێت خۆ]. ﴿٥﴾ بەری وان، ملەتێ نووحی و دەستەك و کۆمێت پشتی وان ژی هاتین، پێغەمبەرێت خۆ درەوین دانان، و هەر ملەتەکی کرە دلێ خۆ و ل بەر گەڕیا پێغەمبەرێ خۆ بهنگێڤن [نەخۆشییەکێ بیننە سەری]، و ب نەهەقییێ جڕەبڕ کرن [ل دویڤ هزرا وان] هەقییێ بێ هێز بکەن و نەهێلن، ڤێجا من ئەو ئیزا دان، بەرێ خۆ بدێ کا ئیزادانا من یا چاوا بوو؟! ﴿٦﴾ ئەها ب ڤی ڕەنگی فەرمانا [ئیزایا] خودایێ تە بۆ گاوران واجب بوو، کو ئەو دۆژەهینە. ﴿٧﴾ و ئەوێت عەرشی هەلدگرن، و ئەوێت دۆرماندۆر تەسبیح و حەمدا خودایێ خۆ دکەن [ئانکو ب سوپاسییا خودایێ خۆ، خودایێ خۆ ژ هەمی کێماسییان پاقژ دکەن]، و ب دورستی باوەرییێ پێ دئینن، و داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ ئەوێت باوەری ئینایین دکەن [و دبێژن]: خودێوۆ دلۆڤانی و زانینا تە، هەمی تشت یێت ڤەگرتین، ڤێجا گونەهێت وان ئەوێت تۆبەکرین و ڕێکا تە گرتین ژێ ببە، و وان ژ ئاگرێ دۆژەهێ بپارێزە.

رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ
مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ
ٱلْحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ
يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٩﴾ إِنَّ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ
أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى ٱلْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ ﴿١٠﴾ قَالُوا۟ رَبَّنَآ
أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ
إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِىَ ٱللَّهُ
وَحْدَهُۥ كَفَرْتُمْ ۖ وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُوا۟ ۚ فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ
ٱلْعَلِىِّ ٱلْكَبِيرِ ﴿١٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ
ٱلسَّمَآءِ رِزْقًا ۚ وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ فَٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ
مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ رَفِيعُ
ٱلدَّرَجَٰتِ ذُو ٱلْعَرْشِ يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ
مِنْ عِبَادِهِۦ لِيُنذِرَ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ ﴿١٥﴾ يَوْمَ هُم بَٰرِزُونَ ۖ لَا يَخْفَىٰ
عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ ۚ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿١٦﴾



﴿٨﴾ خودێوۆ تو وان [خودان باوەران] و یێت باش ژ
باب و باپیر و هەڤسەر و دویندوها وان، بکە د بەحەشتا
عەدەن و ئاکنجیبوونێدا، ئەوا تە سۆز و پەیمان پێ دایییە
وان، نێ تویی یێ سەردەست و کاربنەجهـ. ﴿٩﴾ و وان
ژ ئیزایا خرابییان بپارێزە، و هەر کەسێ وێ ڕۆژێ تو ژ
ئیزایا خرابییان بپارێزی، ئەڤە [بێ گومان] تە دلۆڤانی
پێ بر، و ئەڤەیە سەرفەرازییا مەزن. ﴿١٠﴾ و ئەوێت
گاوربوویین دێ ئێنە گازیکرن [ژ بەرێ ملیاکەتانڤە]،
ب ڕاستی کەربا [زێدە نەڤیانا] خودێ ژ کەربا هەوە بۆ
هەوە مەزنترە، وەختێ هوین بۆ باوەری ئینانێ دهاتنە
گازیکرن، هەوە باوەری نەدئینا. ﴿١١﴾ دێ بێژن:
خودێوۆ تە دو جاران ئەم یێت مراندین، و دو
جاران ژی تە ئەم یێت ساخکرین [زێندی کرین]،
و مە گونەهێت خۆ ل سەر خۆ ئاشکەراکرن، ئەرێ
ڕێکەك بۆ دەرکەڤتنێ [ژ جەهنەمێ] هەیە [ئەم ژێ
دەرکەڤین و بزڤڕینە سەر دنیایێ]. ﴿١٢﴾ ئەڤ ئیزایا
هوین تێدا ب ڕاستی یا هندێیە، هەر وەختێ خودێ
ب تنێ دهاتە پەرستن هەوە خۆ نەڕازی دکر، و
وەختێ هەڤپشك بۆ دهاتنە چێ کرن هەوە باوەری دئینا، و فەرمان بەس یا خودایێ بلند و مەزنە [وی ئەڤ
حوکمە ل سەر هەوە یێ دانایی، کو هوین هەروهەر د دۆژەهێدا بن]. ﴿١٣﴾ ئەوە نیشانێت [شیانا] خۆ نیشا
هەوە ددەت، و ڕزقی بۆ هەوە ژ ئەسمانی دئینیتە خوارێ، و ژ بلی وان ئەوێت بەرێ خۆ داینە خودێ،
کەسێ دی بۆ خۆ چام و دەرسان ژ ڤان نیشانان ناگریت. ﴿١٤﴾ ڤێجا خودێ بپەرێسن، و بلا پەرستنا هەوە
ژ دل بۆ وی بیت، بلا گاوران پێ نەخۆش ژی بیت. ﴿١٥﴾ [خودێ] پایەبلند و سالۆخەت مەزنە، خودان
عەرشە، وەحییێ ب فەرمانا خۆ بۆ هەر کەسێ بڤێت ژ بەندەیێت خۆ دهنێریت، دا مرۆڤان ژ ڕۆژا ڤێککەڤتنێ
[کو ڕۆژا قیامەتێیە] بترسینیت و ئاگەهدار بکەت. ﴿١٦﴾ ڕۆژا [هەمی ژ گۆڕان دەردکەڤن و] ئاشکەرا دبن،
چو کریارێت وان ل بەر خودێ بەرزە نابن. [هەر خودێ دێ بێژیت:] ئەرێ ئەڤرۆ سەروەری و ملکینی یا
کێیە؟ [هەر خودێ دێ بەرسڤێ دەت و بێژیت:] سەروەری و ملکینی یا خودایێ تاك و تەنیا و سەردەستە.

ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۚ لَا ظُلۡمَ ٱلۡيَوۡمَۚ إِنَّ
ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ١٧ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡأٓزِفَةِ إِذِ ٱلۡقُلُوبُ
لَدَى ٱلۡحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَۚ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ حَمِيمٖ وَلَا شَفِيعٖ
يُطَاعُ ١٨ يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ ١٩ وَٱللَّهُ
يَقۡضِي بِٱلۡحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقۡضُونَ
ثلاثة أرباع الحزب ٤٧ بِشَيۡءٍۗ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ٢٠ ۞ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي
ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ مِن قَبۡلِهِمۡۚ
كَانُواْ هُمۡ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ
بِذُنُوبِهِمۡ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ ٢١ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ
كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَكَفَرُواْ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُۚ
إِنَّهُۥ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢٢ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا
وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ٢٣ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَقَٰرُونَ
فَقَالُواْ سَٰحِرٞ كَذَّابٞ ٢٤ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ مِنۡ
عِندِنَا قَالُواْ ٱقۡتُلُوٓاْ أَبۡنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ وَٱسۡتَحۡيُواْ
نِسَآءَهُمۡۚ وَمَا كَيۡدُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ ٢٥



﴿١٧﴾ ئەڤرۆ هەر ئێك ل دویڤ كریارێت خۆ دێ
ئێتە جزاكرن، ئەڤرۆ ستەمكاری نینە، [نە خێرێت
كەسێ كێم دبن، و نە گونەهێت كەسێ پتر لێ
دئێن] و خودێ د حسابا خۆدا یێ دەست سڤكە.
﴿١٨﴾ و تو وان ژ ڕۆژا نێزیك [كو ڕۆژا قیامەتێیە]
بترسینە، ڕۆژا دل [ژ ترساندا] خۆ ل گەوریێ ددەن،
و تژی كول و كۆڤان و دامایی دبن، وێ ڕۆژێ
ستەمكاران چو كەسێت خۆ یێت نێزیك و چو
مەهدەرچی نینن، مەهدەرا وان بێتە وەرگرتن.
﴿١٩﴾ خودێ خیانەتا چاڤان [بەرێخۆدانا ب دزی و
نهێنیڤە] و ئەوا د دلاندا ڤەشارتی، ژێ ب ئاگەهە.
﴿٢٠﴾ و خودێ ب هەقییێ حوكمی و دادوەرییێ
دكەت، و ئەوێت ئەو شوینا خودێ دپەرێسن، وان
چو پێ چێ نابیت. و خودێ یێ گوهدێر و بینەرە.
﴿٢١﴾ ئەرێ ما ئەو د ئەردیدا نەگەڕیاینە، ببینن كا
دویماهیكا ئەوێت بەری وان بوو چ؟ ئەو ژ وان ب
هێزتر بوون و وان پتر شوینوار د ئەردیدا هەبوون، و
خودێ ئەو ب گونەهێت وان د هیلاك برن و نەهێلان،
و ئەوان كەس نەبوو وان ژ ئیزایا خودێ بپارێزیت. ﴿٢٢﴾ ئەڤ ئیزایە یا هندێ بوو، پێغەمبەرێت وان، ب
نیشان و موعجیزەیێت ئاشكەراڤە بۆ وان دهاتن، و وان باوەری ب وان [پێغەمبەران] نەدئینا، ئینا خودێ ئەو
د هیلاك برن، و خودێ یێ ب هێز و ئیزا دژوارە. ﴿٢٣﴾ ب سویند مە مووسا ب موعجیزەیێت خۆڤە، و ب
نیشان و بەلگەیەكا ڕۆن و ئاشكەراڤە هنارت. ﴿٢٤﴾ بۆ فیرعەونی و هامانی و قاروونی [پشتی موعجیزەیێت
من ل سەر دەستێ مووسایی دیتین] گۆتن: ئەڤە سێربەندەكێ درەوینە. ﴿٢٥﴾ ڤێجا گاڤا [مووسا] ب هەقییێ
[ب موعجیزەیێت دورست و ئاشكەراڤە] ژ لایێ مەڤە بۆ وان چۆیی، گۆتن: كوڕێت وان ئەوێت باوەری پێ
ئینایین بكوژن، و كچێت وان ساخ بهێلن [بۆ خدامینیا مە]، و پیلانگێڕانا گاوران یا پویچە.

وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ذَرُونِيٓ أَقۡتُلۡ مُوسَىٰ وَلۡيَدۡعُ رَبَّهُۥٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ
أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ ٢٦
وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذۡتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٖ لَّا يُؤۡمِنُ
بِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ٢٧ وَقَالَ رَجُلٞ مُّؤۡمِنٞ مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ
يَكۡتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدۡ
جَآءَكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمۡۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبٗا فَعَلَيۡهِ
كَذِبُهُۥۖ وَإِن يَكُ صَادِقٗا يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡۖ
إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ ٢٨ يَٰقَوۡمِ لَكُمُ
ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ
إِن جَآءَنَاۚ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ
إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ٢٩ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ
عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ ٣٠ مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ
وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ ٣١
وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ ٣٢ يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ
مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ٣٣



﴿٢٦﴾ و فیرعەونی گۆت: ژ من بگەڕن دا ئەز مووسایی بکوژم، و بلا پاشی گازی خودایێ خۆ بکەت [بلا خودایێ وی وی ژ من قورتال بکەت]، ئەز دترسم [ئەگەر ئەز وی نەکوژم] ئەو دینێ هەوە بگوهۆڕیت، یان ژی خرابییێ د ئەردیدا بەلاڤ بکەت. ﴿٢٧﴾ و مووسایی گۆت: ئەز خۆ ب خودایێ خۆ و خودایێ هەوە، ژ هەر خۆمەزنکەرەکێ بێ باوەر ژ ڕۆژا قیامەتێ، دپارێزم. ﴿٢٨﴾ و زەلامەکێ خودان باوەر ژ مالا فیرعەونی بەلێ باوەریا خۆ ڤەدشارت، گۆت: ئەرێ هوین دێ مرۆڤەکی کوژن چونکی دبێژیت: خودانێ من خودێیە، و ب موعجیزەڤە یێ بۆ هەوە ژ دەڤ خودایێ هەوە هاتی، و ئەگەر ئەو یێ درەوین بیت درەوا وی دێ ل وی زڤریت، و ئەگەر یێ ڕاستگۆ بیت هندەك ژ وێ ئێزایا هەوە پێ دترسینیت، دێ ژ هەوە گریت [ئەو هندە بەسە، هەوە د هیلاك ببەت]، ب ڕاستی خودێ وی ڕاستەڕێ ناکەت یێ زێدە خراب و درەوین. ﴿٢٩﴾ هەی ملەتێ من، ئەڤرۆ سەروەری یا هەوەیە، و هوین د ئەردیدا [ل سەر ئسرائیلیان] زال و سەردەستن، ڤێجا ئەگەر ئێزایا خودێ ب سەر مەدا هات، کییە هاریکاری و پشتەڤانییا مە بکەت و مە ژێ قورتال بکەت؟ فیرعەونی گۆت: ئەز ژ وێ پێڤەتر بۆ هەوە نابێژم یا بەری نوکە من گۆتی [ئەز ژ وێ چێتر نابینم یا ئەز دبینم، کو بێتە کوشتن دا دۆزا وی ب دویماهیك بێت]، و ئەز [ب وێ یا ئەز چێتر دبینم] ژ ڕێکا ڕاست پێڤەتر نیشا هەوە نادەم؟. ﴿٣٠﴾ و ئەوێ خودان باوەر [و ژ بنەمالا فیرعەونی] گۆت: هەی ملەتێ من [ئەگەر هوین باوەرییێ ب مووسایی نەئینن، و هەر بەرگەڕیانا کوشتنا وی بکەن] ئەز دترسم ڕۆژەکا [ب ئێزا] وەکی ڕۆژا کۆم و دەستەکان [کۆمێت ل سەر پێغەمبەرێت خۆ بوویینە دەستەك] ب سەر هەوەدا بێت. ﴿٣١﴾ و ئەز دترسم ئێزایەکا وەکی یا ملەتێ نووح و عاد و (سەموود) و ئەوێت پشتی وان هاتین ب سەرێ هەوە بێت، و ب ڕاستی خودێ ستەم بۆ چو بەندەیان نەڤێت [ئانکو کەسێ بێ گونەه ئێزا نادەت]. ﴿٣٢﴾ و هەی ملەتێ من، ترسا من ل سەر هەوە ترسا ڕۆژا گازیکرنێیە (ڕۆژا قیامەتێ) [گازیکرن تێدا مشە دبیت و خەلکێ بەحەشتێ و جەهنەمێ گازی ئێك دکەن، و گاور ب خۆ ژی د ناڤبەرا خۆدا گازی ئێکدو دکەن، و دبیتە لاڤلاڤا وان و جرەبرا وان]. ﴿٣٣﴾ ڕۆژا هوین پشتا خۆ ددەنە ئاگری و دڕەڤن، و هەوە چو پارێزڤان نینن کو هەوە ژ ئێزایا خودێ بپارێزن، و هەر کەسێ خودێ گومڕا و بەرزە بکەت، کەس نینە وی ڕاستەڕێ بکەت.

وَلَقَدۡ جَآءَكُمۡ يُوسُفُ مِن قَبۡلُ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلۡتُمۡ فِي
شَكّٖ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلۡتُمۡ لَن يَبۡعَثَ ٱللَّهُ
مِنۢ بَعۡدِهِۦ رَسُولٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ
مُّرۡتَابٌ ٣٤ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ
أَتَىٰهُمۡۖ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ
يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلۡبِ مُتَكَبِّرٖ جَبَّارٖ ٣٥ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ
يَٰهَٰمَٰنُ ٱبۡنِ لِي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَبۡلُغُ ٱلۡأَسۡبَٰبَ ٣٦ أَسۡبَٰبَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗاۚ
وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِۚ
وَمَا كَيۡدُ فِرۡعَوۡنَ إِلَّا فِي تَبَابٖ ٣٧ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ
يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُونِ أَهۡدِكُمۡ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ٣٨ يَٰقَوۡمِ
إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ
دَارُ ٱلۡقَرَارِ ٣٩ مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةٗ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَاۖ
وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ
يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ يُرۡزَقُونَ فِيهَا بِغَيۡرِ حِسَابٖ ٤٠



﴿٣٤﴾ و ب سويند بەری [مووسایی] یووسف [ژ دەڤ خودێ] ب نیشانێت ئاشکەرا و موعجیزەیانڤە بۆ هەوە هاتبوو، و هوین هێژ ژ وان نیشانان د دودلن ئەوێت یووسف بۆ هەوە ئینایین، ڤێجا گاڤا یووسف مری، هەوە گۆت: خلاس، خودێ پشتی یووسف چو پێغەمبەران نافرێت، هۆسا خودێ وی گومڕا دکەت ئەوێ زێدە خراب، و د ئێکینییا خودێدا ب گۆمان.
﴿٣٥﴾ [یێت زێدە خراب و ب شك ئەڤەنە] ئەوێت مەدەرکییێ د نیشان و ئایەتێت خودێدا دکەن بێ بەلگە و نیشانەك وان هەبیت، مەدەرکییا وان کەربا خودێ و یا خودان باوەران پتر و مەزنتر لێ کر، و هۆسا خودێ دلێ هەر خۆمەزنکەر و زێدە خراب و هەق دژمنەکی مۆر دکەت. ﴿٣٦﴾ و فیرعەونی گۆت: هامانۆ تو بۆ من قەسرەکا بلند ئاڤاکە [بچمە سەر] بەلکی بگەهمە دەرگەهـو ڕێکان. ﴿٣٧﴾ دەرگەهـو ڕێکێت ئەسمانان، دا بەرێ خۆ بدەمە خودایێ مووسایی، و ئەز دبینم ئەو ژ درەوینانە، و هۆسا کار و کریارێت وی یێت خراب بۆ هاتنە جوانکرن و ژ ڕێکا ڕاست هاتە ڤەدەرکرن، و پیلانگێڕانا فیرعەونی ژ خوسارەتییێ پێڤەتر نەبوو. ﴿٣٨﴾ و ئەوێ باوەری ئینایی گۆت: هەی ملەتێ من، گوهێ خۆ بدەنە من و ل دویڤ من وەرن، ئەز دێ بەرێ هەوە دەمە ڕێکا ڕاستی و سەرفەرازییێ.
﴿٣٩﴾ هەی ملەتێ من، ژیانا ڤێ دنیایێ ب تنێ خۆشییەکا دۆمکورتە، و ئاخرەتە جهێ ئاکنجیبوون و بنەجهییێ. ﴿٤٠﴾ هەر کەسێ [د ڤێ دنیایێدا] گونەهەکێ بکەت، ئەو تەمەتی گونەها خۆ دێ ئێتە جزاکرن، و هەر کەسێ باشییێ بکەت، چ مێر بیت چ ژن، و ئەو یێ خودان باوەر بیت، ئەڤە دێ چنە د بەحەشتێدا و ڕزقێ وان بێ حسێب و هەژمار دێ ئێتە بەر وان.

۞وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾
تَدۡعُونَنِي لِأَكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشۡرِكَ بِهِۦ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ
عِلۡمٞ وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا
تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ لَيۡسَ لَهُۥ دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ
وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٤٣﴾
فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡۚ وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ
إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ
وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ
عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ
فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٦﴾ وَإِذۡ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ
فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ
تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ قَالَ
ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُلّٞ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ حَكَمَ
بَيۡنَ ٱلۡعِبَادِ ﴿٤٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ
ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ يُخَفِّفۡ عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٩﴾



﴿٤١﴾ و هەی ملەتێ من ئەڤە چیە، ئەز بەرێ هەوە
ددەمە بەحەشتێ و هوین بەرێ من ددەنە ئاگری؟.
﴿٤٢﴾ هوین بەرێ من ددەنە هندێ ئەز باوەرییێ
ب خودێ نەئینم، و وی بۆ بکەمە هەڤپشك یێ ئەز
چو ژێ نەزانم، و ئەز بەرێ هەوە ددەمە خودایێ
سەردەست و زێدە گونەهـ ژێبەر. ﴿٤٣﴾ بێ گۆمان
ئەوێ هوین بەرێ من ددەنێ نابیت بێتە پەرستن،
چونکی بەرسڤا کەسێ نادەت نە ل دنیایێ و نە ل
ئاخرەتێ، و زڤرینا مە هەمیان ب بال خودێڤەیە، و
ب ڕاستی ئەوێت زێدە گونەهکار ئەون دۆژەهی.
﴿٤٤﴾ ئەڤا ئەز دبێژمە هەوە، نێزیك نەدویر، دێ ئێتە
بیرا هەوە، و ئەز دێ کاروبارێ خۆ هێلمە ب هیڤیا
خودێڤە، ب ڕاستی خودێ ئاگەهـ ژ هەمی بەندەیان
هەیە و دبینیت. ﴿٤٥﴾ ڤێجا خودێ ئەو [خودان
باوەرێ شیرەتکەر] ژ خرابیا وێ پیلانا وان گێڕایی
پاراست، و ئیزایەکا خراب ب سەر بنەمالا فیرعەونیدا
هات. ﴿٤٦﴾ سپێدە و ئێڤاران [ئانکو بەردەوام هەتا
ڕۆژا قیامەتێ] جانێ وان ب ئاگری دئێتە سۆتن، و
ڕۆژا قیامەت ڕادبیت خودێ دێ بێژتە ملیاکەتان: فیرعەونیان بێخنە د ناڤ دژوارترین ئیزادا. ﴿٤٧﴾ و وەختێ
ئەو د ئاگریدا دمیننە پێکڤە و جرەبڕێ دکەن، و ئەوێت تەپەسەر دێ بێژنە وان ئەوێت خۆ مەزن کرین: نێ
ئەم دویکەڤتییێت هەوە بوویین، ما هوین پشکەکێ ژ ئاگری ژ مە ڤەناکەن و هەلناگرن؟. ﴿٤٨﴾ و ئەوێت
خۆ مەزن کرین دێ بێژن: ئەم هەمی وەکی ئێکین د ناڤ ئاگریدا، خلاس، خودێ حوکم د ناڤبەرا بەندەیاندا
کر [و جرەبڕ یا بێ فایدەیە]. ﴿٤٩﴾ و ئەوێت د ئاگریدا دێ بێژنە دەرگەهڤانێت دۆژەهێ: بێژنە خودایێ خۆ
بلا ڕۆژەکێ ب تنێ ئیزایی ل سەر مە سڤك بکەت.

قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ قَالُواْ بَلَىٰۚ
قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾
إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا
وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡۖ
وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٥٢﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى
ٱلۡهُدَىٰ وَأَوۡرَثۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡكِتَٰبَ ﴿٥٣﴾ هُدٗى
وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٥٤﴾ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ
حَقّٞ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ بِٱلۡعَشِيِّ
وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ
بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ
مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ
ٱلۡبَصِيرُ ﴿٥٦﴾ لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ
خَلۡقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٧﴾
وَمَا يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلۡمُسِيٓءُۚ قَلِيلٗا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾



﴿٥٠﴾ [ملیاکەت د بەرسڤا واندا] دێ بێژن: ئەرێ ما
پێغەمبەرێت هەوە ب بەلگە و نیشان و موعجیزەڤە
بۆ هەوە نەهاتبوون؟ دێ بێژن: بەلێ [پێغەمبەرێت
مە ب بەلگە و نیشان و موعجیزەڤە بۆ مە هاتبوون،
بەلێ مە باوەری ب وان نەئینا] ملیاکەت دێ بێژن:
دێ هوین ب خۆ داخوازا سڤککرنا ئیزایێ بۆ خۆ ژ
خودێ بکەن، و داخوازا گاوران [وێ ڕۆژێ] ما دێ
ب چ چیت؟!. ﴿٥١﴾ بێ شك ئەم هەر دێ هاریکاریا
پێغەمبەرێت خۆ و ئەوێت باوەری ئینایین کەین، د
ڤێ دنیایێدا و د وێ ڕۆژێ ژیدا یا شاهد تێدا ڕادبن
[کو ڕۆژا قیامەتێیە]. ﴿٥٢﴾ ڕۆژا عوزرخواستن و
هەجەتا ستەمکاران ب چو نەچیت و مفای وان
نەکەت، و لەعنەت ل وان بیت و پیسە جهـ بۆ وان
بیت. ﴿٥٣﴾ و ب سویند مە ڕاستەڕێیی [هەر تشتەکێ
دیار د دینیدا، چ موعجیزە و چ تەورات و چ تەشریع]
دا مووسایی، و مە ئسرائیلی کرنە وێرسێت تەوراتێ.
﴿٥٤﴾ کو ڕێکا هیدایەتێیە، و بیرئینانە بۆ خودان
ئەقلان. ﴿٥٥﴾ [هەی موحەمەد] ڤێجا سەبرێ [ل سەر
ئەزیەتا گاوران وەکی پێغەمبەرێت بەری خۆ] بکێشە، بێ شك پەیمانا خودێ یا ڕاستە، و داخوازا لێبۆرینێ
بۆ گونەهێت خۆ بکە، و سپێدە و ئێڤاران (ئانکو هەمی دەمان) تەسبیح و حەمدا خودایێ خۆ بکە.
﴿٥٦﴾ ب ڕاستی ئەوێت مەدەرکیێ د ئایەتێت خودێدا دکەن، بێ بەلگە و نیشانەك وان هەبیت، ژ خۆمەزنکرنێ
پێڤەتر د دلێ واندا نینە، و ئەو [مەزناتیێ] وان ناگەهینیتە وێ یا وان دڤێت [کو ئەو ڕۆناهیا دینی ڤەمرینن]،
ڤێجا خۆ ب خودێ [ژ خرابیا وان] بپارێزە، و خۆ ب هێڤیا خودێڤە بهێلە، ب ڕاستی ئەوە یێ گوهدێر
و بینەر. ﴿٥٧﴾ ب سویند چێکرنا ئەرد و ئەسمانان ژ چێکرنا مرۆڤان مەزنترە، بەلێ باراپتر ژ مرۆڤان ڤێ
نوزانن. ﴿٥٨﴾ و مرۆڤێ کۆرە [گاور] و یێ ب چاڤ [خودان باوەر] وەکی ئێك نابن، و ئەوێت باوەری
ئینایین و کار و کریارێت باش کرین، و ئەوێت گونەهکار وەکی ئێك نابن، و کێمن ژ هەوە، هزرا خۆ د ڤان
نموونەیاندا دکەن، و چامەیان ژێ وەردگرن.

إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ
لَا يُؤۡمِنُونَ ٥٩ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ
إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ
دَاخِرِينَ ٦٠ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ
فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ
أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ٦١ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ
خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ٦٢
كَذَٰلِكَ يُؤۡفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ٦٣
ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ قَرَارٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ
وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡ وَرَزَقَكُم مِّنَ
ٱلطَّيِّبَٰتِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ
ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦٤ هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ
لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦٥ ۞ قُلۡ إِنِّي
نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ
ٱلۡبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرۡتُ أَنۡ أُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦٦

الحزب ٤٨



﴿٥٩﴾ ب ڕاستی قیامەت هەر دێ ئێت و چو شك
تێدا نینە، بەلێ باراپتر ژ خەلکی باوەر ناکەن.
﴿٦٠﴾ و خودایێ هەوە گۆت: دوعایێ ژ من بکەن
ئەز دێ بەرسڤا هەوە دەم، ب ڕاستی ئەوێت خۆ ل
سەر پەرستنا من و دوعاکرنێ ژ من مەزن دکەن،
دێ ڕەزیل و ڕسوا چنە د دۆژەهێدا. ﴿٦١﴾ خودێیە
یێ شەڤ بۆ هەوە دایی دا هوین تێدا ڤەهەسن،
و ڕۆژ ڕۆنکرییە [دا هوین کاروبارێت خۆ تێدا ب
ڕێڤەببەن]، ب ڕاستی خودێ خودان کەرەمە ل سەر
خەلکی، بەلێ باراپتر ژ خەلکی سوپاسیا خودێ
ناکەن. ﴿٦٢﴾ ئەڤەیە خودێ، خودانێ هەوە، چێکەرێ
هەمی تشتی، چو پەرستییێت ڕاست و دورست ژ وی
پێڤەتر نینن، ڤێجا هوین چاوا بەرێ خۆ ژ پەرستنا
وی وەردگێرن [بۆ پەرستنا ئێکێ دی]. ﴿٦٣﴾ هۆسا
ئەوێت مەدەرکی د ئایەتێت خودێدا دکرن، بەرێ
وان ژ هەقییێ و ئێکینیا خودێ دئێتە وەرگێران.
﴿٦٤﴾ خودێیە ئەوێ ئەرد بۆ هەوە کرییە جهێ
خۆجهی و ئاکنجیبوونێ و بۆ ژینێ خۆشکری، و
ئەسمان کرییە بان، و وێنە و شکل دا هەوە و وێنەیێ هەوە جوان کر و ڕزقێ پاك و پاقژ دا هەوە، ئەڤەیە
خودێ خودانێ هەوە، ڤێجا پاکی و بلندی بۆ خودێ، خودانێ هەمی خەلکی. ﴿٦٥﴾ ئەوە یێ ساخ و
هەروهەر مایی، چو پەرستییێت ڕاست و دورست نینن ژ وی پێڤەتر، ڤێجا هوین پەرستنا وی ب تنێ بکەن
و چو هەڤپشکان بۆ چێ نەکەن، و هەمی پەسن و شوکور بۆ خودانێ جیهانان. ﴿٦٦﴾ [هەی موحەمەد] بێژە
وان: ب ڕاستی پشتی نیشانێت ئاشکەراکەر ژ خودایێ من، بۆ من هاتین، ڕێك بۆ من نەهاتییە دان ئەز وان
بپەرێسم ئەوێت هوین شوینا خودێ دپەرێسن [پشت ڕاست بن ئەز پەرستنا وان ناکەم]، و ئەمرێ من یێ
هاتییە کرن ئەز خۆ بسپێرمە خودانێ هەمی جیهانان [و بەر ئەمرێ وی ب تنێ ببم].

هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ
يُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡ ثُمَّ لِتَكُونُواْ شُيُوخٗاۚ
وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبۡلُۖ وَلِتَبۡلُغُوٓاْ أَجَلٗا مُّسَمّٗى وَلَعَلَّكُمۡ
تَعۡقِلُونَ ﴿٦٧﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا
يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٦٨﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ
فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ أَنَّىٰ يُصۡرَفُونَ ﴿٦٩﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِٱلۡكِتَٰبِ
وَبِمَآ أَرۡسَلۡنَا بِهِۦ رُسُلَنَاۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴿٧٠﴾ إِذِ ٱلۡأَغۡلَٰلُ
فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسۡحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِي ٱلۡحَمِيمِ
ثُمَّ فِي ٱلنَّارِ يُسۡجَرُونَ ﴿٧٢﴾ ثُمَّ قِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ
تُشۡرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا بَل لَّمۡ نَكُن
نَّدۡعُواْ مِن قَبۡلُ شَيۡـٔٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾
ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمۡ تَفۡرَحُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ
تَمۡرَحُونَ ﴿٧٥﴾ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى
ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٦﴾ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۚ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ
بَعۡضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيۡنَا يُرۡجَعُونَ ﴿٧٧﴾





﴿٦٧﴾ ئەوە یــێ هویــن (ئانکو بابێ هەوە ئــادەم) ژ ئاخێ
چێکریــن، پاشــی ژ چیکەکــێ، پاشــی ژ خوینپارەیەکــی،
پاشــی هــەوە بچویــك ددەت [و پیــچ پیچــە هــەوە
مــەزن دکــەت] دا ب دورســتی تــێ بگەهــن و بالــق
ببــن، پاشــی دا پــیر و کال ببــن، و هنــدەك ژ هــەوە بــەری
بالــق ببــن و بــەری پــیر ببــن دمــرن، و دا بگەهنــە ڕۆژەکا
دەستنیشــانکری، و دا هویــن بــۆ خــۆ عەقلەکــی بگــرن.
﴿٦٨﴾ و ئــەوە یــێ ژینــێ و مرنــێ ددەت [ئانکــو ئــەوە
ســاخ دکــەت و دمرینیــت]، و ئەگــەر کارەك ڤیــا، بــەس
دێ بێژتــێ هەبــە دێ بیــت. ﴿٦٩﴾ ئــەرێ مــا تــو نابینــی
ئەوێــت مەدەرکیــێ د نیشــانێت خودێــدا دکــەن، چــاوا
ڕوییــێ وان ژ هەقییــێ بــۆ نەهەقییــێ دئێتــە وەرگێڕان.
﴿٧٠﴾ ئەوێــت قورئــان و ئــەو تشــتێ مــە پێغەمبەرێــت
خــۆ پــێ هنارتــین درەو دانایــین، ڤێجــا نێزیــك دێ زانن
[کا دویماهیــکا کارێ وان دێ بیتــە چ]. ﴿٧١﴾ وەختــێ
ستۆییــێ وان دکەڤیتە قەیــد و زنجیران و دئێنە ڕاکێشــان.
﴿٧٢﴾ د ئاڤــا شارییاییــدا، پاشــی د ئاگریدا، دئێنە ســۆتن.
﴿٧٣﴾ پاشــی دێ [ملیاکەت] بێژنــە وان: کا ئەوێت هەوە
بــۆ خــودێ دکرنــە هەڤپشــك. ﴿٧٤﴾ هــەوە شــوینا خــودێ دپەرســتن، گۆتــن: ل مــە بەرزەبوون، نــێ [د دنیاییــێ
ژیــدا] ئــەو چــو نەبوون، مە دپەرســتن، ئەها هۆســا خودێ گــاوران گومــڕا و ڕێبــەرزە دکەت. ﴿٧٥﴾ ئــەڤ ئیزایە
یــا وێ کەیفێیــە یــا هــەوە د دنیایــێدا ب گونەهــان دبــر، و یــا وێ بەترانــی و خۆمەزنکرنێیــە یــا هــەوە ژ نەهەقــی
دکــر. ﴿٧٦﴾ دێ هەرنــە دۆژەهــێ، د [هــەر حەفــت] دەرگەهانــڕا و هەروهــەر تێدا بن، و چ پیســە جهــە جهی خۆ
مەزنکــەران. ﴿٧٧﴾ ڤێجــا [هــەی موحەمــەد ل ســەر گۆتن و کریارێت وان] ســەبرا خۆ بکێشــە، ب ڕاســتی پەیمانا
خــودێ یــا ڕاســتە، ڤێجــا یان ئــەم د ژیانا تــەدا دێ هنــدەك ژ وێ [ئیزا] یا مە پەیمــان پێ دایــییە وان نیشــا تە دەین
[دا چاڤێــت تــە پــێ ڕۆن ببــن، ئەڤــە ڕۆژا بــەدرێ چــێ بــوو]، یــان ژی [هێــژ تــە نەدیتی، ئــەو ئیزا ب ســەرێ وان
هاتــی] دێ تــە مرینــین، زڤڕینــا وان ب بــال مەڤەیــە [دێ کیڤە خــلاس بن].

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ
وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ۗ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ
بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ فَإِذَا جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ قُضِيَ بِٱلْحَقِّ وَخَسِرَ
هُنَالِكَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٧٨﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمَ
لِتَرْكَبُوا۟ مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ
وَلِتَبْلُغُوا۟ عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى
ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٨٠﴾ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَأَيَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ
تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ
قُوَّةً وَءَاثَارًا فِي ٱلْأَرْضِ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾
فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرِحُوا۟ بِمَا عِندَهُم مِّنَ
ٱلْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْا۟
بَأْسَنَا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ
مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ
ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِۦ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾





﴿٧٨﴾ و ب سویند مە بەری تە پێغەمبەرێت هنارتین، مە سەرهاتیا هندەك ژ وان یا بۆ تە گۆتی، و مە یا هندەك ژ وان بۆ تە نەگۆتیە، و چو پێغەمبەر نەشێن بێ دەستویریا خودێ چو نیشان و موعجیزەیان بینن، و هەر وەختەكێ فەرمانا خودێ [ب ئیزادانا وان د دنیایێدا یان د قیامەتێدا] هات، كارێ وان ب دویماهی هات، و هنگی ئەوێت ل سەر پویچاتیێ و ب دویڤ پویچیێ دكەڤن خوسارەت بوون. ﴿٧٩﴾ و خودێیە تەرش و كەوال [حێشتر و پەز و چێل] بۆ هەوە دایی، دا سواری هندەكان ببن، و ژ هندەكان بخۆن. ﴿٨٠﴾ و هندەك فایدەیێت دی ژی بۆ هەوە یێت تێدا هەین [و مە بۆ هەوە یێت داین]، دا پێ بگەهنە وێ هەوجەیییا د دلێ هەوەدا [كو بارێت هەوە ژ جهەكی ببەنە جهەكێ دی]، و هوین ل سەر وان و ل سەر گەمیان دئێنە هەلگرتن. ﴿٨١﴾ و خودێ نیشانێت [دەستهەلاتداریيا] خۆ نیشا هەوە ددەت، ڤێجا هوین كیژ نیشانا وی ئینكار دكەن، و باوەرییێ پێ نائینن [چو نیشانێت وی نائێنە ئینكاركرن]. ﴿٨٢﴾ ئەرێ ما ئەو د ئەردیدا نەگەڕیاینە، دا ببینن كا دویماهییا ئەوێت بەری وان بوو چ؟ ئەو ژ وان پتر بوون و ژ وان ب هێزتر بوون، و ژ وان پتر شوینوار د ئەردیدا هەبوون، ڤێجا ئەوا وان ب دەست خۆڤە ئینایی [ژ هێز و ئاڤاهی، یان مالدارییێ] ئەو ژ ئیزایا خودێ رزگار نەكرن [و فایدەی وان نەكر]. ﴿٨٣﴾ ڤێجا وەختێ پێغەمبەرێت وان ب موعجیزە و نیشانێت ئاشكەراڤە بۆ وان هاتین، ب وێ زانینێ ئەوا وان هەی د سەردا چۆن [و پویتە نەدانە وێ زانینێ ئەوا پێغەمبەر پێ هاتین، و خەلك لێ ب گۆمان ئێخستن]، و ئەو ئیزایا وان ترانە پێ دكر دۆرماندۆرێت وان ب خۆ گرتن. ﴿٨٤﴾ ڤێجا وەختێ وان ئیزایا مە دیتی، گۆتن: مە باوەری ب خودێ ب تنێ ئینا، و مە باوەری ب وان تشتان نەما ئەوێت مە بۆ خودێ دكرنە هەڤپشك. ﴿٨٥﴾ ڤێجا باوەری ئینانا وان فایدەی وان نەكر پشتی ئیزایا مە دیتین، ئەڤە رێكا خودێیە د راستا هەمی بەندەیێت ویدا [پشتی ئیزاییێ دبینن ژ نوی باوەرییێ بینن، فایدەی وان ناكەت]، و هنگی گاور دێ خوسارەت بن.

سُورَةُ فُصِّلَتْ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ
قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ
فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ وَفِىٓ
ءَاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَٱعْمَلْ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾
قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ
فَٱسْتَقِيمُوٓا۟ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ
لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٨﴾ ۞ قُلْ أَئِنَّكُمْ
لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ
ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ مِن فَوْقِهَا
وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِىٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَآءً
لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ
لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾

الحزب ٤٨



## سۆرەتا فوصیلەت

**ل مەکەهێ هاتیـیە خوارێ (٥٤) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ هۆسا دئێتە خواندن (حا، میم)، و ل دۆر ڕاڤەکرنا
ڤان ڕەنگە تیپان، بزڤرە دەستپێکا سۆرەتا بەقەرە.
﴿٢﴾ ئەڤ قورئانە ژ دەڤ خودایێ دلۆڤان و خودان
ڕەحم هاتیە خوارێ. ﴿٣﴾ کتێبەکە نیشان و ئایەتێت
وێ ب درێژی هاتینە ئاشکەراکرن، قورئانەکە ب
زمانێ عەرەبییە، ئەوێت دورست تێ دگەهن قەدرێ
وێ دزانن.. ﴿٤﴾ مزگینییە [بۆ مرۆڤێت خودێ] و
ئاگەهدارکەرە [بۆ دژمنێت خودێ]، بەلێ باراپتر
ژ [گاوران] بەرێ خۆ ژێ وەرگێڕان، و گوهێ خۆ
نادەنێ. ﴿٥﴾ و گۆتن: پەردە ل سەر دلێت مەنە، و ئەڤا
تو بۆ مە دبێژی ئەم تێ ناگەهین، و گوهێت مە دکەڕن
مە های ژێ نینە تو چ دبێژی، و پەردەیەکا د ناڤبەرا
مە و تەدا هەی، ڤێجا تو ل سەر دینێ خۆ بە، و ئەم
یێت ل سەر دینێ خۆ. ﴿٦﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: ئەز ژی مرۆڤەکم وەکی هەوە، وەحی بۆ من دئێت
کو ب ڕاستی خودایێ هەوە خودایەکێ ب تنێیە، ڤێجا ڕاست ڕێکا وی بگرن و ل سەر بمینن، و داخوازا
لێبۆرینێ ژێ بکەن، و ئیزا و نەخۆشی بۆ موشرکان بیت. ﴿٧﴾ ئەوێت باوەری ب دانا زەکاتێ نەیی و باوەری
ب ڕۆژا قیامەتێ نەیی. ﴿٨﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت ڕاست و دورست کرین،
خەلاتەکێ بێ ڤەبڕین بۆ وان یێ هەی. ﴿٩﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: ئەرێ هوین باوەرییێ ب وی [خودایی]
نائینن ئەوێ ئەرد د دو ڕۆژاندا چێکری، و هوین هەڤبەران بۆ چێ دکەن؟ ئەو چێکەر، خودانێ جیهانانە.
﴿١٠﴾ و چیایێت بنەجهـ و بلند یێت ئێخستینە د ئەردیدا [دا نەهەژییێت]، و [ب ئاڤ و گـل و گیایی و دار و
دەرامەت و شینکاتی] یێ ب بەرەکەت ئێخستی، و د چار ڕۆژێت تمامدا، ڕزقێ خەلکێ ئەردی ئەوێت
هەوجە دیارکر. ﴿١١﴾ پاشی بەرێ خۆ دا ئەسمانی و ئەو دویکێل بوو، و گۆتە ئەردی و ئەسمانی هەوە بڤێت
و نەڤێت ل دویڤ ئەمرێ من وەرن [کا من چ د ناڤ هەوەدا بۆ مرۆڤان چێ کرییە، دەربێخن] گۆتن: ئەم ب
دلخۆشی و بەر ئەمرێ تە هاتین.

فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ
وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ
ٱلۡعَلِيمِ ١٢ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةٗ مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ
عَادٖ وَثَمُودَ ١٣ إِذۡ جَآءَتۡهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ
خَلۡفِهِمۡ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ قَالُواْ لَوۡ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةٗ
فَإِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ١٤ فَأَمَّا عَادٞ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي
ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةًۖ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ
ٱلَّذِي خَلَقَهُمۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ١٥
فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِيٓ أَيَّامٖ نَّحِسَاتٖ لِّنُذِيقَهُمۡ
عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَخۡزَىٰۖ وَهُمۡ
لَا يُنصَرُونَ ١٦ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى
ٱلۡهُدَىٰ فَأَخَذَتۡهُمۡ صَٰعِقَةُ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡهُونِ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٧
وَنَجَّيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ١٨ وَيَوۡمَ يُحۡشَرُ أَعۡدَآءُ ٱللَّهِ
إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمۡ يُوزَعُونَ ١٩ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيۡهِمۡ
سَمۡعُهُمۡ وَأَبۡصَٰرُهُمۡ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٢٠





﴿١٢﴾ و خودێ د دو ڕۆژاندا كرنە حەفت ئەسمان، هەر ئەسمانەكی كاروبارێ وی دورست كر، و مە ئەسمانێ دنیایێ ب ستێران خەملاند و پاراست [ژ شەیتانان]، ب ڕاستی ئەڤە تەكبیر و تەقدیرا خودایێ دەستهەلاتدار و زانایە. ﴿١٣﴾ ڤێجا ئەگەر وان بەرێ خۆ [ژ باوەریئینان و هزركرنێ د ڤان چێكریاندا] وەرگێڕا، تو بێژە: ئەڤە من هوین ژ هشكەقێڕییەكێ ترساندن، وەكی وێ هشكەقێڕییێ ئەوا عاد و (سەموود) هنگاڤتین. ﴿١٤﴾ وەختێ پێغەمبەر ژ هەمی ڕەخانڤە بۆ وان هاتین [گۆتینە وان:] ژ خودێ پێڤەتر نەپەرێسن، گۆتن: ئەگەر خودایێ مە ڤیابایە پێغەمبەران بهنێریت، دا ملیاكەتان هنێریت، و ب ڕاستی ئەڤا هوین پێ هاتینە هنارتن، ئەم باوەرییێ پێ نائینین. ﴿١٥﴾ هندی عاد بوون ژ نەهەقی خۆ د ئەردیدا مەزن كرن، و گۆتن: كی ژ مە ب هێزترە؟ ما وان نەددیت، ب ڕاستی ئەو خودایێ ئەو چێ كرین ژ وان ب هێزترە، و وان باوەری ب ئایەت و نیشان و موعجزەیێت مە نەدئینا. ﴿١٦﴾ ڤێجا مە هوڕەبایەكێ ب سڕوسەقەم د چەند ڕۆژەكێت كورە و ڕەشدا، ب سەر واندا هنارت، دا ئیزایا ڕسواكرن و شەرمزارییێ د ژیانا دنیایێدا بدەینە بەر وان، و ئیزایا ئاخرەتێ ڕسواتر و شەرمزارترە، و هاریكاری ژی بۆ وان نائێتەكرن. ﴿١٧﴾ هندی (سەموود) بوون مە ڕاستەڕێكرن، بەلێ وان گۆمڕایی ب سەر ڕاستەڕێییێ ئێخست [ئانكو گاوری گرتن، و پشتا خۆ دانە باوەرییێ]، و ژ بەر كار و كریارێت خراب ئەوێت وان دكرن، برویسیا ئاگری و ئیزایا ڕسوابوون و شەرمزارییێ ئەو گرتن. ﴿١٨﴾ و ئەوێت باوەری ئینایین و تەقوا خودێ دكرن [ئانكو ژ خودێ دترسیان، و پاریزكاریا وی دكرن]، مە ڕزگار كرن. ﴿١٩﴾ و ڕۆژا نەیارێت خودێ بۆ دۆژەهێ دئێنە كۆمكرن، و ئەوێت بەراهیكێ [دا ژێك نەڤەقەتن] دئێنە ڕاوەستاندن، دا پێكڤە ببنە ئێك ڕێز و یێت دویاهیێ بگەهنە وان. ﴿٢٠﴾ ڤێجا گاڤا ل دەڤ ئاگری كۆمبوون [و ڤیان كار و كریارێت خۆ ئینكار بكەن]، گوهێت وان و چاڤێت وان و چەرمێ وان دێ شادەییێ ل سەر وان كار و كریاران دەن، یێت وان كرین.

وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا ۖ قَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي
أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾
وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ
وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾
وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّذِي ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَاكُمْ فَأَصْبَحْتُم
مِّنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن يَصْبِرُوا فَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ۖ وَإِن يَسْتَعْتِبُوا
فَمَا هُم مِّنَ الْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾ ۞ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ فَزَيَّنُوا لَهُم
مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ
خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ ﴿٢٥﴾
وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ
لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ فَلَنُذِيقَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا عَذَابًا شَدِيدًا
وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَاءُ أَعْدَاءِ اللَّهِ
النَّارُ ۖ لَهُمْ فِيهَا دَارُ الْخُلْدِ ۖ جَزَاءً بِمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٢٨﴾
وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا رَبَّنَا أَرِنَا الَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ الْجِنِّ
وَالْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ الْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٤٨



﴿٢١﴾ و دێ بێژنە چەرمێ لەشێ خۆ: بۆچی هەوە شادەیی ل سەر مە دا؟ [و ئەم بەرەڤانییێ ژ هەوە دکەین] دێ بێژن: [نە ب مەیە] خودێ ئەم ب ئەزمان ئێخستین، ئەو خودایێ [ئەڤرۆ] هەمی تشت ب ئەزمان ئێخستین، و ئەوی جارا ئێکێ هوین دابوون، و هەر دێ ب بال ویڤە زڤڕن. ﴿٢٢﴾ [وەختێ هەوە گونەهـ دکر] هەوە خۆ ژ گوهـ و چاڤ و چەرمێ خۆ نەدڤەشارت، هوین ل وێ هزرێ بوون شادەییێ ل سەر هەوە نادەن [هەوە بەس خۆ ژ مرۆڤان ڤەدشارت]، و هەوە هزر دکر خودێ گەلەك ژ وان کارێت هەوە دکرن، نوزانیت [ژ بەر هندێ هەوە بستەیی د کرنا گونەهاندا دکر]. ﴿٢٣﴾ و ئەڤەبوو ئەو هزرا هەوە ژ خودایێ خۆ دکر، و ئەڤێ هزرا خەلەت ئەوا هەوە ژ خودێ دکر، هوین د هیلاك برن و هوین بوونە ژ وان ئەوێت خوسارەت. ﴿٢٤﴾ ڤێجا ئەگەر سەبرێ بکێشن ئاگرە جهێ وان، و ئەگەر داخوازا ڕازیبوونێ ژی بکەن، ئەو نە ژ وانە یێت خودێ ژ وان ڕازی بیت، و ئەگەر بخوازن بزڤڕنە دنیایێ دا ژ نوی خودایێ خۆ ڕازی بکەن، زڤڕین بۆ وان نینە [چونکی ڕۆژا قیامەتێ ڕۆژا جزا و خەلاتانە ل سەر کار و کریارێت دنیایێ]. ﴿٢٥﴾ و مە هەڤالێت خراب [ژ مرۆڤ و ئەجنەیان] بۆ [موشرکێت مەکەهێ] یێت دانایینن، ڤێجا کار و کریارێت وان یێت نوکە و یێت پاشەڕۆژێ بۆ وان خەملاندن، ئیزا بۆ وان واجب بوو، ئەو ژی وەکی ملەتێت بەری خۆ ژ ئەجنە و مرۆڤان، هێژایی ئیزایێ بوون، و ب ڕاستی ئەو یێت خوسارەت بوون. ﴿٢٦﴾ و ئەوێت گاور بوویین [ژ خەلکێ مەکەهێ] گۆتن: گوهێ خۆ نەدەنە ڤێ قورئانێ و قەرەبالغێ د بەرڕا بکەن، دا هوین بشێینە وان و وان بێ دەنگ بکەن. ﴿٢٧﴾ و ب ڕاستی ئەم دێ ئیزایەکا گران و دژوار دەینە وان ئەوێت گاوربوویین، و ب ڕاستی ئەم دێ ب جزایێ خرابترین کارێ وان [کو گاوری و شرکە] وان ئیزادەین. ﴿٢٨﴾ ئەڤەیە جزایێ دژمنێت خودێ کو ئاگرە، و هەروهەر دێ تێدا بن، ب ڤێ هاتنە جزاکرن چونکی وان باوەری ب قورئانێ نەدئینا. ﴿٢٩﴾ و ئەوێت گاوربوویین گۆتن: خودێوۆ، کا وان هەردووکان، ئەجنە و مرۆڤان ئەوێت ئەم د سەردابرین و گومڕاکرین نیشا مە بدە، دا ئەم وان بکەینە د بن پیێت خۆڤە، و دا ئەو ب بن بکەڤن [و بکەڤنە د بنێ بنێ ئاگریدا].

إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ
ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ
ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا
وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ
فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾ وَمَنْ أَحْسَنُ
قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ
ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ۚ ٱدْفَعْ
بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ
وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ
إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ
فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٦﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ
ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُواْ لِلشَّمْسِ
وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ
إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُواْ فَٱلَّذِينَ عِندَ
رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ۩ ﴿٣٨﴾ سَجْدَة





﴿٣٠﴾ ب ڕاستی ئەوێت گۆتین: خودانێ مە خودێیە، پاشی ل سەر ڤێ مایین و خۆ ڕاگرتین، ملیاکەت [وەختێ مرنێ] دئێنە دەڤ وان [و دبێژنە وان:] نەترسن [ژ تشتێ هوین دێ ب بەرڤەچن]، و ب خەم نەکەڤن [ژ تشتێ هەوە د دنیایێدا ب پاش خۆڤە هێلایی]، و مزگینیا وێ بەحەشتێ ل هەوە بیت ئەوا پەیمان بۆ هەوە پێ هاتی دان. ﴿٣١﴾ ئەم د ژیانا دنیایێ و ئاخرەتێدا هاریکار و سەمیانێت هەوەینە، و تشتێ هەوە بڤێت یێ بۆ هەوە تێدا هەی، و چ بخوازن ژی بۆ هەوە یێ تێدا هەی. ﴿٣٢﴾ ئەڤە قەدرگرتنەکە ژ دەڤ خودایێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤان. ﴿٣٣﴾ ما ئاخڤتنا کێ ژ یا وی چێترە ئەوێ بەرێ خەلکی ددەتە ڕێکا خودێ و بانگهەلدێریا ڕێکا وی دکەت، و کار و کریارێت ڕاست و دورست دکەت، و بێژیت: ب ڕاستی ئەز ژ موسلمانانم؟. ﴿٣٤﴾ باشی و خرابی وەکی ئێك نابن، خرابیێ ب یا چێتر لادە و نەهێلە، ئەگەر تە ئەڤە کر، هنگی دێ بینی ئەوێ دژمنایی د ناڤبەرا تە و ویدا هەی، دێ وەکی هەڤالەکێ نێزیك و خۆشتڤی لێ ئێت. ﴿٣٥﴾ و کەس ناگەهیتە ڤێ پلەیێ [کو شوینا خرابیێ باشیێ بکەت]، ئەو نەبن ئەوێت سەبرکێش، و کەس وەناکەت، خودان خێرەکێ مەزن نەبیت. ﴿٣٦﴾ و هەر وەختێ ئاوازەك ژ شەیتانی بگەهیتە تە، تو خۆ ب خودێ بپارێزە، ب ڕاستی ئەو یێ گوهدێر و زانایە. ﴿٣٧﴾ ژ نیشانێت مەزناتی و شیانا خودێ شەڤ و ڕۆژ، و ڕۆژ و هەیڤن، سوجدەیێ نە بۆ ڕۆژێ ببەن و نە بۆ هەیڤێ، و سوجدەیێ بۆ وی خودایی ببەن یێ ئەو دایین و ئەو چێکرین، ئەگەر هوین ڕاست وی ب تنێ دپەرێسن. ﴿٣٨﴾ و ئەگەر وان خۆ مەزن کر [و خۆ ب سەر پەرستنا خودێ ئێخستن]، ئەوێت ل دەڤ خودایێ تە [کو ملیاکەتن] شەڤ و ڕۆژ تەسبیحا خودێ دکەن وژ کێماسیان پاقژ دکەن و ناوەستن.

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ
ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ
قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ ۗ أَفَمَن
يُلْقَىٰ فِى ٱلنَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِىٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ ۖ
إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلذِّكْرِ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ
وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ
خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ
لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ ﴿٤٣﴾
وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ۖ
ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ ۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ
لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ
يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ
فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۗ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ
بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿٤٥﴾ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا
فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾



﴿٣٩﴾ و ژ نیشانێت [ژێهاتنا] خودێ [ل سەر ساخکرنا
پشتی مرنێ] ئەوە دێ تو ئەردی هشك بینی، گاڤا
خودێ باران ل سەر باراند گژ دبیت و دبزڤیت و پف
و بلند دبیت، ب ڕاستی ئەوێ ئەردێ مری زێندی
کری، هەر ئەو دێ مریان زێندی کەتەڤە، ب ڕاستی
ئەو ل سەر کرنا هەمی تشتان یێ دەستهەلاتدارە.
﴿٤٠﴾ ب ڕاستی ئەوێت ئایەتێت مە دگوهۆڕن
[و دەستکاریێ تێدا دکەن]، ئەو ل بەر مە بەرزە نابن،
ئەرێ ما کیژ چێترە ئەوێ ملیاکەت دهاڤێژنە ناڤ
ئاگری، یان ژی ئەوێ ڕۆژا قیامەتێ ئێمن دئێت،
هەوە چ دڤێت بکەن، ب ڕاستی تشتێ هوین دکەن
خودێ پێ ئاگەهە. ﴿٤١﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ب
قورئانێ نەئینایین دەمێ بۆ وان هاتی [ئەو دێ جزایێ
گاوری و باوەری نەئینانا خۆ وەرگرن]، و ب ڕاستی
ئەڤ قورئانە کتێبەکا ب ڕێز و بێ وێنە و پارستیە.
﴿٤٢﴾ گوهۆڕین ب چو ڕەنگان ناگەهیتێ، و چوجا
پویچ نابیت [و یا پارستیە ژ کێمکرن و زێدەکرنێ،
و پشتی وێ ژی چو کتێب نائێن، وێ پویچ بکەن]،
چونکی ئەو ژ دەڤ خودایێ کارنبەجهـ، و شایی گەلە پەسنێ، یا هاتیە خوارێ. ﴿٤٣﴾ ئەو چو د ڕاستا
تەدا نابێژن، ئەگەر د ڕاستا پێغەمبەرێت بەری تە ژی دا نەهاتبیتە گۆتن [یان دێ بێژن تو یێ دینی، یان دێ
بێژن سێربەندی، یان دێ بێژن درەوینی]، ب ڕاستی خودایێ تە خودانێ لێبۆرینێیە [بۆ خودان باوەران]، و
خودانێ ئیزایا گران و دژوارە [بۆ گاوران]، [ڤێجا خۆ بهێلە ب هیڤیا ویڤە]. ﴿٤٤﴾ و ئەگەر مە ئەڤ قورئانە
ب ئەزمانەکێ بیانی [ئەعجەمی] ئینابایە خوارێ، دا بێژن بلا ئایەتێت وێ ب ئەزمانەکی هاتبانە دیارکرن، ئەم
تێگەهشتباینە [و دا بێژن] قورئانا بیانی و پێغەمبەرێ عەرەب چاوا دکەڤنە بەرێك؟! بێژە: ئەڤ قورئانە بۆ وان
ئەوێت باوەری ئینایین ڕاستەڕێیی و دەرمانە، و ئەوێت باوەرییێ پێ نەئینن گوهێت وان بۆ بهیستنا قورئانێ
دکەڕن، و قورئان ل سەر وان تاریاتی و کۆرەیییە، ئەڤە [ئەوێت ژ قورئانێ بێ باوەر] د وەسانە هەروەکی
ژ جهەکی دویر دئێنە گازیکرن [نە گازییێ گولێ دبن، و نە تێ دگەهن، ژ بەر هندێ ل دویڤ ناچن].
﴿٤٥﴾ و مە تەورات بۆ مووسایی ئینا، و ئەو ل سەر ژێك جودابوون [د ناڤبەرا ڕاست دانانا وێ و درەو دانانا
وێدا، هەروەکی ملەتێ تە د ڕاستا قورئانێدا کری] و ئەگەر ژ بەر فەرمانا خودێ نەبایە کو وان پێکڤە ئیزا
نادەت، دا حوکمی و دادوەرییێ د ناڤبەرا واندا کەت [ئانکو دا زوی ئیزاییێ بۆ وان ئینیت، ئەوێت قورئانێ
درەو ددانن]، و ب ڕاستی ئەو ل قورئانێ ب شك و گۆمانن. ﴿٤٦﴾ ب ڕاستی هەر کەسێ باشییێ بکەت بۆ
خۆ دکەت، و هەر کەسێ خرابییێ دکەت ل خۆ دکەت، و خودایێ تە ستەمێ ل بەندەیان ناکەت [کەس بێ
گونەهـ نائێتە ئیزادان].

۞إِلَيۡهِ يُرَدُّ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِۚ وَمَا تَخۡرُجُ مِن ثَمَرَٰتٖ مِّنۡ أَكۡمَامِهَا
وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ أَيۡنَ
شُرَكَآءِي قَالُوٓاْ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٖ ٤٧ وَضَلَّ عَنۡهُم
مَّا كَانُواْ يَدۡعُونَ مِن قَبۡلُۖ وَظَنُّواْ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٖ ٤٨
لَّا يَسۡـَٔمُ ٱلۡإِنسَٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلۡخَيۡرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٞ
قَنُوطٞ ٤٩ وَلَئِنۡ أَذَقۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنَّا مِنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُ
لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِي وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّجِعۡتُ إِلَىٰ
رَبِّيٓ إِنَّ لِي عِندَهُۥ لَلۡحُسۡنَىٰۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِمَا عَمِلُواْ
وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٖ ٥٠ وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ
أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ
عَرِيضٖ ٥١ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كَانَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرۡتُم بِهِۦ
مَنۡ أَضَلُّ مِمَّنۡ هُوَ فِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ٥٢ سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا
فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ
أَوَلَمۡ يَكۡفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ٥٣ أَلَآ إِنَّهُمۡ
فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمۡۗ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطُۢ ٥٤



﴿٤٧﴾ زانینا وەختێ هاتنا رۆژا قیامەتێ [کا دێ کەنگی ئێت] ل دەڤ خودێ ب تنێیە، و نینە فێقی ژ پشکۆژکان دەرکەڤیت، و نینە مێ گرانە ببیت و بارێ خۆ دانیت، ئەگەر ب زانین و ئاگەهداریا خودێ نەبیت. و رۆژا [خودێ] گازی وان دکەت: کانێ ئەو هەڤپشکێت هەوە، بۆ من ددانان؟ [بلا بەرەڤانییێ ژ هەوە بکەن، یان ئیزایێ ژ هەوە بدەنە پاش] دێ بێژن: ئەڤە مە راستی گۆت، ب راستی ئەڤرۆ کەس د ناڤ مەدا نینە، شادەییێ بدەت کو ئەو بۆ تە هەڤپشکن. ﴿٤٨﴾ و ئەوێت وان د دنیایێدا دپەرستن ل وان بەرزەبوون، و ئێقین و باوەریکا بێ گۆمان بۆ وان چێ بوو ئەڤرۆ وان رەڤین ژ ئاگری نینە. ﴿٤٩﴾ مرۆڤ ب دوعایا خێرێڤە ناوەستیت [و ناهێلیت، هەر دێ دوعایان ژ خودێ کەت، بەرفرەهییێ بدەتێ و رێکێت ژیانێ ل بەر ب ساناهی بێخیت]، و ئەگەر نەخۆشی و تەنگاڤی گەهشتێ، دێ ژ خێرێ بێ هیڤی بیت، و دێ ژ دلۆڤانیا خودێ بێ ئومێد بیت. ﴿٥٠﴾ و ئەگەر مە ژ دەڤ خۆ کەرەم و نیعمەتەک دایێ، پشتی نەخۆشی و تەنگاڤی گەهشتیێ، دێ بێژیت: ئەڤە هەقێ منە و ئەز هەژیمە [و دێ ژ بیرکەت ئەڤە جەرباندنە]، و ئەز باوەر ناکەم قیامەت دێ رابیت [و ئەگەر رابیت ژی] و ئەز ب بال خودێڤە زڤڕیم، ب راستی من خەلاتەکێ باش یێ ل دەڤ هەی [کا چاوا خودێ کەرەم د دنیایێدا د گەل من کرییە، ل ئاخرەتێ ژی ئەگەر هەبیت دێ وەسا د گەل من کەت]، ب سویند ئەم دێ ئەوێت گاوربوویین ب وان کار و کریاران ئاگەهدارکەین ئەوێت وان کرین، و ب سویند ئەم دێ ئیزایەکا مەزن و گران دەینە بەر وان. ﴿٥١﴾ و ئەگەر مە نیعمەت د گەل مرۆڤی کرن، دێ رویێ خۆ [ژ سوپاسییێ] وەرگێڕیت و دێ خۆ مەزن کەت ل سەر ئەمرێ خودێ، و ئەگەر نەخۆشی و تەنگاڤی گەهشتێ، دێ دەست ب دوعایێت درێژ کەت. ﴿٥٢﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: کا بێژنە من [دێ حالێ هەوە چ بیت] ئەگەر ئەڤ قورئانە ژ دەڤ خودێ هاتبیت و هوین باوەرییێ پێ نەئینن، کی ژ وی گومڕاتر و رێبەرزەترە ئەوێ [هۆسا] د دژمنایی و رکانەکا دویردا دژیت. ﴿٥٣﴾ نێزیک، نەدویر ئەم دێ بەلگە و نیشانێت [ئێکینی و شیانا] خۆ بۆ وان د ئەرد و ئەسماناندا و د وان ب خۆدا ژی ئاشکەرا کەین، دا بۆ وان ئاشکەرا ببیت کو ب راستی ئەڤە (ئەڤ قورئانە و یێ ئینایییە خوارێ، و یێ بۆ هاتی کو پێغەمبەرە) راستە، ئەرێ ما ئەڤە نە بەسی وانە کو خودایێ تە ل سەر هەمی تشتان حازر و شاهدە [ئانکو ما شادەییا خودایێ تە، ب راستیا تە و راستیا قورئانا بۆ تە هاتی، نە بەسی وانە]. ﴿٥٤﴾ هشیار بن، ب راستی ئەو ل رۆژا قیامەتێ ب گۆمانن، هشیار بن خودێ هویر و گرێت هەمی تشتان دزانیت، و چو ل بەر بەرزە نابیت.

سُورَةُ الشُّورَىٰ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

حمٓ ١ عٓسٓقٓ ٢ كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٣ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ٤ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِن فَوۡقِهِنَّۚ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٥ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيۡهِمۡ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ ٦ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ حَوۡلَهَا وَتُنذِرَ يَوۡمَ ٱلۡجَمۡعِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ فَرِيقٞ فِي ٱلۡجَنَّةِ وَفَرِيقٞ فِي ٱلسَّعِيرِ ٧ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ٨ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۖ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡوَلِيُّ وَهُوَ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٩ وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ١٠



# سۆرەتا شوورا

## ل مەكەهێ هاتیـیە خوارێ (٥٣) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١-٢﴾ هۆسا دئێتە خواندن (حا، میم)، (عەین، سین، قاف) و ل دۆر ڕاڤەكرنا ڤان ڕەنگە تیپان، ل دەستپێكا سۆرەتا بەقەرە بزڤرە. ﴿٣﴾ هۆسا وەكی ڤێ سۆرەتێ خودایێ سەردەست و كاربنەجهـ، وەحییێ بۆ تە و پێغەمبەرێت بەری تە دهنێریت. ﴿٤﴾ هندی د ئەرد و ئەسماناندا هەی یێ ویـیە، و ئەو یێ بلند و مەزنە. ﴿٥﴾ نێزیكە [هەر حەفت] ئەسمان [ژ بەر مەزناتییا خودێ، و ژ بەر كرێتییا ئاخفتنا ئەو دەرهەقێ خودێدا دكەن] ل سەرێك شەق شەق ببن، و ملیاكەت پەسنا خودایێ خۆ دكەن و وی ژ كێماسییان پاقژ دكەن، و داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ ئەوێت د ئەردیدا، دكەن، بزانن ب ڕاستی خودێیە گونەهـ ژێبەر و دلۆڤان. ﴿٦﴾ و ئەوێت شوینا خودێ هەڤپشك و بوت گرتین [و دپەرێسن]، خودێ ل سەر كار و كریارێت وان زێرەڤانە، و كار و كریارێت وان نە د دەست تەدانە. ﴿٧﴾ و هۆسا مە قورئان ب ئەزمانێ عەرەبی بۆ تە ئینا خوارێ، دا تو خەلكێ مەكەهێ و دەوروبەرێت وێ پێ ئاگەهدار بكەی و بترسینی، و دا وان ژ ڕۆژا قیامەتێ و كۆمبوونێ، كو چو گۆمان تێدا نینە، بترسینی [وێ ڕۆژێ خەلك دێ بنە دو جوین]، جوینەك دێ چیتە بەحەشتێ و جوینەك دێ چیتە دۆژەهێ. ﴿٨﴾ و ئەگەر خودێ ڤیابایە، دا وان كەتە ئێك دین، بەلێ یێ وی بڤێت دێ كەتە د ناڤ دلۆڤانییا خۆدا، و ستەمكاران چو دۆست و هاریكار نینن. ﴿٩﴾ ئەو غەیری خودێ بۆ خۆ دكەنە سەمیان و پشتەڤان؟! و سەمیان و پشتەڤان بەس خودێیە و ئەوە مرییان زێندی دكەت، و ئەو ل سەر هەمی تشتان یێ دەستهەلاتدارە. ﴿١٠﴾ و هەر تشتەكێ هوین ل سەر ژێك جودا ببن [ژ كاروبارێت دینی]، حوكمێ وی یێ ل دەڤ خودێ، ڤێجا بۆ حوكمێ وی ل خودێ بزڤرن، ئەڤ خودێیە [ئەڤێ حوكمێ هەر تشتەكی ل دەڤ] خودایێ منە، من پشتا خۆ ب وی گرێدا، و د هەمی كاروبارێت خۆدا دێ ل وی زڤرم.

فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا
وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗا يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِۚ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ
ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿١١﴾ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يَبۡسُطُ
ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١٢﴾ ۞ شَرَعَ
لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحٗا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا
وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ
وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ كَبُرَ عَلَى ٱلۡمُشۡرِكِينَ مَا تَدۡعُوهُمۡ إِلَيۡهِۚ ٱللَّهُ
يَجۡتَبِيٓ إِلَيۡهِ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ وَمَا تَفَرَّقُوٓاْ
إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ
مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى لَّقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُواْ
ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُ مُرِيبٖ ﴿١٤﴾ فَلِذَٰلِكَ
فَٱدۡعُۖ وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡۖ وَقُلۡ
ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖۖ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ
ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡۖ لَا حُجَّةَ
بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٥﴾

ربع الحزب ٤٩





﴿١١﴾ ئەو چێكەرێ ئەرد و ئەسمانانە، ژ هەوە ب خۆ، بۆ هەوە هەڤسەر یێت داین، و ژ تەرشان ژی نێر و مێ یێت داین هەوە پێ زێدە دكەت، چو تشت وەكی خودێ [د كاروبار و سالۆخەتاندا] نینە، و ئەو یێ گوهدێر و بینەرە. ﴿١٢﴾ كلیل و خزینەیێت ئەرد و ئەسمانان یێت خودێنە، یێ بڤێت دێ رزقی لێ بەرفرەهـ كەت، و یێ بڤێت دێ لێ بەرتەنگ كەت، ب راستی ئەو هەمی تشتی دزانیت، و تشتەك ل بەر بەرزە نابیت. ﴿١٣﴾ [گەلی موسلمانان] خودێ ئەو دین دا هەوە ئەوێ ئەمرێ نووحی پێ هاتییە كرن، و ئەوێ مە بۆ تە ب وەحی هنارتی و ئەوێ مە ئەمرێ ئیبراهیم و مووسا و عیسایی پێ كری [هەر ئێكە دینێ تەوحیدێیە و ئێكتاپەرستییێیە، بگرن و بپارێزن، و ل سەر ژێك جودا نەبن [كو كار ب هندەكێ بكەن، و هندەكێ بهێلن]، و ئەوێ هوین هەڤپشك چێكەران بۆ گازی دكەن [كو دینێ تەوحیدێیە] ل سەر وان یێ گرانە، و هەر كەسێ خودێ بۆ ئێكینیا خۆ بڤێت، ڤی دینی بۆ دهەلبژێریت، و هەر كەسێ ب تۆبەیێ ب بال خودێڤە بزڤریت، خودێ وی راستەرێ دكەت. ﴿١٤﴾ و [ملەتێت خودان دینێت بەرێ] هنگێ جودایی و ژێكڤەبوون كەڤتە د ناڤبەرا واندا پشتی زانین و نیشانێت ئاشكەرا ژ پێغەمبەرێت وان بۆ وان هاتین، ئەڤە ژی ژ بەر زكرەشییا وان، و ئەگەر ژ بەر وێ فەرمانا خودێ نەبایە كو ئیزادانا وان دێ ئێتە پاشئێخستن هەتا دەمەكێ دەستنیشانكری، خودێ دا وان د هیلاك بەت و ئەو نەدهێلان، و ب راستی ئەوێت پشتی ملەتێت خۆ بوویینە وێرسێت كتێبێ [جوهی و فەلە، هەڤچەرخێت پێغەمبەری] د راستا قورئانێدا یان د راستا پێغەمبەریدا یێت د شك و گۆمانێدا. ﴿١٥﴾ ڤێجا ژ بەر ڤێ ژێكڤەبوون و ژێكجوداهییا وان، تو داخوازا ئێكینیا خودێ بكە و خۆ ل سەر بگرە و ل سەر بەردەوام بە وەكی ئەمرێ تە پێ هاتییە كرن، و ب دویڤ دلخوازییێت وان نەكەڤە، و بێژە: هەر كتێبەكا خودێ ئینایییە خوارێ من باوەری یا پێ هەی، و ئەمرێ من یێ هاتییە كرن ئەز عەدالەتێ د ناڤبەرا هەوەدا بكەم و غەدرێ نەكەم [ئەگەر هوین حوكمێ خۆ بیننە دەڤ من] خودێ خودانێ مەیە و خودانێ هەوەیە ژی، جزایێ كار و كریارێت مە بۆ مەیە و جزایێ كاروبارێت هەوە بۆ هەوەیە، جڕەبڕ د ناڤبەرا مە و هەوەدا نەما [چو نیشان و بەلگە نینن نەهاتینە گۆتن و هەقی ئاشكەرابوو]. خودێ دێ [ڕۆژا قیامەتێ] مە پێكڤە كۆمكەت، دویماهیك و زڤرینا مە هەر ب بال ویڤەیە [هەر ئێكی ل دویڤ كارێ وی دێ جزاكەت و خەلات كەت].

وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ٱسۡتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمۡ
دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ وَلَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٌ ١٦
ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَۗ وَمَا يُدۡرِيكَ
لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٞ ١٧ يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ
بِهَاۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ
أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ لَفِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٍ ١٨
ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ١٩
مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن
كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ
مِن نَّصِيبٍ ٢٠ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ
مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ
وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٢١ تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ
مُشۡفِقِينَ مِمَّا كَسَبُواْ وَهُوَ وَاقِعُۢ بِهِمۡۗ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي رَوۡضَاتِ ٱلۡجَنَّاتِۖ لَهُم
مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ٢٢



﴿١٦﴾ و ئەوێت جڕەبڕیێ د ڕاستا دینێ خودێدا دکەن پشتی خەلك ب بەرڤە هاتی و گرتی، هەجەتا (بەلگە و نیشانا) وان ل دەڤ خودایێ وان یا پویچ و چۆییە، و غەزەب و کەربا خودێ ل سەر وان بیت، و ئیزایەکا دژوار بۆ وان یا هەی.
﴿١٧﴾ خودێ کتێب یێت هنارتین دا هەقییێ بنەجهـ بکەن، و ترازی و داد ژی یێت هنارتین [دا مرۆڤ د هەمی کاروبارێت خۆدا ب دادوەرییێ ڕابن]، و ما تو چ دزانی، بەلکی ڕۆژا قیامەتێ یا نێزیك بیت.
﴿١٨﴾ ئەوێت باوەری ب قیامەتێ نەی لەزێ ل هاتنا وێ دکەن [هەر ژ ترانەپێکرن و باوەری پێ نەئینان]، و ئەوێت باوەری ب ڕۆژا قیامەتێ هەین ژێ دترسن، و دزانن ڕاستە و بێ شکە هەر دێ ئێت، بزانن ب ڕاستی ئەوێت جڕەبڕیێ ل سەر هاتنا ڕۆژا قیامەتێ دکەن و لێ ب شك دکەڤن، ئەو یێت د بەرزەبوونەکا کویر و دویردا.
﴿١٩﴾ خودێ زێدە یێ ب ڕەحم و ب کەرەمە د گەل بەندەیێت خۆ [هەر چەندە گونەهکارن ژی]، و هەر کەسێ بڤێت ڕزقێ وی بەرفرەهـ ددەتێ، و ئەوە یێ ب هێز و سەردەست و خودان دەستهەلات.
﴿٢٠﴾ هەر کەسێ ب کار و کریارێت خۆ خێرا ئاخرەتێ و خۆشییێت وێ بڤێن، ئەم دێ خێرا وێ بۆ زێدەکەین [هەر خێرەك ب دەهـ خێران]، و هەر کەسێ ب کار و کریارێت خۆ خۆشییا دنیایێ بڤێت، ئەم دێ [هند] دەینێ [هندی مە بۆ نڤێسی]، و وی ل ئاخرەتێ چو بار و پشك ژ خێرا کار و کریارێت خۆ نابن.
﴿٢١﴾ ئەرێ وان هەڤپشك هەنە، بۆ وان، ئەو دین دانایە، ئەوێ خودێ ئاگەهـ ژێ نەی و دەستویری پێ نەدایی؟ و ئەگەر ژ بەر هندێ نەبایە کو خودێ حوکمێ پاشئێخستنا ئیزایا وان بۆ ڕۆژا قیامەتێ یێ دایی، دا نوکە حوکمی د ناڤبەرا موشرك و موسلماناندا کەت، و دا لەزێ ل ئیزایا وان کەت، و دا ب دویماهیك ئێن، و ب ڕاستی ستەمکاران ئیزایەکا دژوار یا هەی.
﴿٢٢﴾ [ڕۆژا قیامەتێ] دێ ستەمکاران بینی ژ بەر کار و کریارێت خۆ دترسن و دلەرزن، و ئەو [ڕۆژ کو ڕۆژا قیامەتییە] دێ هەر ب سەر واندا ئێت [بترسن یان نەترسن]، و ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت ڕاست و دورست کرین یێت د ناڤ مێرگێت بەحەشتێدا، و وان چ بڤێت بۆ وان ل دەڤ خودایێ وان یێ هەی، و ئەڤەیە کەرەما مەزن.

ذَٰلِكَ ٱلَّذِي يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۗ
قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰۗ وَمَن يَقۡتَرِفۡ
حَسَنَةٗ نَّزِدۡ لَهُۥ فِيهَا حُسۡنًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ شَكُورٌ ٢٣ أَمۡ يَقُولُونَ
ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗاۖ فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخۡتِمۡ عَلَىٰ قَلۡبِكَۗ وَيَمۡحُ ٱللَّهُ
ٱلۡبَٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٢٤
وَهُوَ ٱلَّذِي يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ وَيَعۡفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ
وَيَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ٢٥ وَيَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۚ وَٱلۡكَٰفِرُونَ لَهُمۡ عَذَابٞ
شَدِيدٞ ٢٦ ۞وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ
وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٖ مَّا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرُۢ بَصِيرٞ ٢٧ وَهُوَ ٱلَّذِي
يُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ مِنۢ بَعۡدِ مَا قَنَطُواْ وَيَنشُرُ رَحۡمَتَهُۥۚ وَهُوَ ٱلۡوَلِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ٢٨
وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٖۚ
وَهُوَ عَلَىٰ جَمۡعِهِمۡ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٞ ٢٩ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا
كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ٣٠ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ
فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ٣١

نصف الحزب ٤٩



﴿٢٣﴾ ئەڤە ئەوە یا خودێ مزگینییێ پێ ددەتە بەندەیێت خۆ، یێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت ڕاست و دورست کرین، و [هەی موحەمەد] بێژە ئەز چو کرێیان بەرانبەری گەهاندنا ڤێ پەیامێ ژ هەوە ناخوازم، حەژێکرنا مرۆڤانییێ نەبیت [تشتێ ئەز ژ هەوە دخوازم ئەوە هوین ئەزیەتا من نەکەن، ژ بەر وێ مرۆڤانییا د ناڤبەرا من و هەوەدا]، و هەر کەسێ باشییەکێ بکەت ئەم دێ باشییا وی بۆ زێدەکەین، ب ڕاستی خودێ زێدە گونەهـ ژێبەر و شوکور وەرگرە. ﴿٢٤﴾ ئەرێ ئەو (قورەیشی) دبێژن: [موحەمەدی] ئەڤ قورئانە ژ دەڤ خۆ ئینای و ژ درەو ب بال خودێڤە لێ ددەت، و ئەگەر تە ل بەر بایە تو تشتەکی ژ درەو ب بال خودێڤە لێ بدەی، خودێ دا دلێ تە مۆرکەت ئەگەر ڤیابایە، و چو تشت نەدما ل بیرا تە، و چو تشت ل سەر دلێ تە نەدهێلا، و [خودێ] پویچییێ ڕادکەت و ژێ دبەت، و هەڤییێ کو ئیسلامە ب ئاخڤتنێت خۆ یێت ب وەحی بۆ پێغەمبەرێ خۆ هنارتین [کو قورئانە] دیار و بنەجهـ دکەت. ب ڕاستی خودێ ژ تشتێ د سینگ و دلاندا ڤەشارتی ب ئاگەهە. ﴿٢٥﴾ و ئەوە تۆبەیێ ژ بەندەیێت خۆ وەردگریت، و ل گونەهێت وان دبۆریت و یا هوین دکەن دزانیت. ﴿٢٦﴾ و دوعایێت وان ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت ڕاست و دورست کرین قەبویل دکەت، و ژ کەرەما خۆ ژ داخوازا وان زێدەتر ددەتە وان، و ئیزایەکا دژوار بۆ گاوران یا هەی. ﴿٢٧﴾ و ئەگەر خودێ رزقێ هەمی بەندەیێت خۆ بەرفرەهـ کربایە [و هەمی زەنگین و بێ منەت کربانە]، دا هەمی د ئەردیدا د سەرداچن، و دا خۆ مەزن کەن، بەلێ ل قایدەیا (قەدارا) وی دڤێت رزقی دئینیتە خوارێ، ب ڕاستی ئەو ل بەندەیێت خۆ شارەزا و ب ئاگەهە.

﴿٢٨﴾ و ئەوە بارانێ [وەختێ هەوجەییێ] دئینیتە خوارێ، پشتی بەندەیێت وی ژ هاتنا وێ بێ هیڤی بوویین، و دلۆڤانییا خۆ [خێر و بێرێت بارانێ] بەلاڤ دکەت، ب ڕاستی ئەوە سەمیانێ، شایی پەسن و سوپاسییێ.

﴿٢٩﴾ و ژ نیشان و بەلگەیێت [مەزناتییا] وی چێکرنا ئەرد و ئەسمانان و هندی خودان روحێت تێدا بەلاڤ کرین، و ئەو ل سەر کۆمکرنا وان ئەگەر بڤێت یێ پێڤەهاتییە. ﴿٣٠﴾ هەر نەخۆشییەکا بگەهیتە هەوە ژ بەر وان کار و کریارانە یێت هەوە کرین، و ل گەلەك گونەهان ژی دبۆریت [جزایی بۆ نادانیت]. ﴿٣١﴾ [گەلی مرۆڤان] هوین نەشێن خودێ نەچار بکەن د ئەردیدا، کو هەوە ئیزانەدەت، و ژ بلی خودێ هەوە چو هاریکار و پشتەڤان نینن.

وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ ٣٢ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ
فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ٣٣
أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟ وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ ٣٤ وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ
يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ٣٥ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ
ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ
يَتَوَكَّلُونَ ٣٦ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا
غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ٣٧ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ
وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ٣٨ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ
ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ٣٩ وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا
وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٠ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ
بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ٤١ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى
ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ أُو۟لَٰٓئِكَ
لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٤٢ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ
ٱلْأُمُورِ ٤٣ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِىٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ وَتَرَى
ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ٤٤



﴿٣٢﴾ و ژ نیشانێت [مەزناتی و دەستهەلاتداریا] وی، چۆن و هاتنا گەمیێت وەکی چیایانە د دەریایێدا. ﴿٣٣﴾ ئەگەر خودێ بڤێت دێ بای ڕاوەستینیت، ڤێجا گەمی دێ د دەریایێدا مینە ڕاوەستیای، ب ڕاستی ئەڤە [ئینان و برنا گەمیان] نیشان و بەلگەنە [ل سەر شیان و دەستهەلاتداریا خودێ] بۆ هەر ئێکێ زێدە سەبرکێش و زێدە شوکوردار. ﴿٣٤﴾ یان ژی [ئەگەر بڤێت دێ هوڕەبایەکێ دژوار ب سەر واندا ئینیت] ژ بەر کار و کریارێت وان کرین دێ وان د هیلاك بەت، و ل گەلەك گونەهێت وان دبۆریت [و ب گونەهێت وان ل وان ناگریت، و وان ژ گەلەك نەخۆشیان قورتال دکەت]. ﴿٣٥﴾ دا ئەوێت گەنگەشە و جڕەبڕێ د ئایەتێت مەدا دکەن، بزانن ئەو ژ ئیزایا مە قورتال نابن. ﴿٣٦﴾ و هەر تشتەکێ خودێ دایییە هەوە ژ پەرتال و خەملا ژیانا دنیایێیە، و تشتێ ل دەڤ خودێ هەی چێتر و ب دۆمترە، بۆ وان ئەوێت باوەری ئینایین و پشتا خۆ ب خودایێ خۆ گەرم کرین. ﴿٣٧﴾ و [ئەوێت باوەری ئینایین ئەون] ئەوێت خۆ ژ گونەهێت مەزن و زێدە کرێت دویر دئێخن، و ئەگەر کەربێت وان ژ ئێکێ ڤەبوون لێ دبۆرن. ﴿٣٨﴾ و ئەوێت ل دویڤ ئەمرێ خودایێ خۆ هاتین، و نڤێژ بەردەوام و ب ڕەنگێ پێدڤی کرین، و کاروبارێ وان [دناڤبەرا هەڤدا] مشێورەتکرنە، و ژ ڕزقێ مە داییە وان [د ڕێکا خودێدا] ددەن. ﴿٣٩﴾ و ئەوێت ئەگەر ستەم لێ هاتەکرن [ژ نەهەقی]، تۆلێت خۆ ل وی ڤەدکەن یێ ستەم ل وان کری، و تەعدایییێ ناکەن [دڤێت موسلمان یێ شکەستی و بێچارە نەبیت بەرامبەر زۆرداریێ و ئازاکرنا وی ژ هێزکاریێ بیت]. ﴿٤٠﴾ و جزایێ خرابیێ خرابییەکا وەکی وێیە، و هەر کەسێ ل وی ببۆریت [ئەوێ خرابی د گەل کری] و ناڤبەرا خۆ و وی خۆش بکەت، دێ خودێ خەلاتێ وی دەتێ، ب ڕاستی خودێ حەژ ستەمکاران ناکەت. ﴿٤١﴾ و یێ تۆلا خۆ ڤەکەت [بێ زێدەیی] پشتی ستەم لێ هاتییە کرن، ڤێجا ئەڤان چو ڕێکێت لێگرتن و لۆمەیان ناچنێ. ﴿٤٢﴾ ئەو دێ بەر لۆمە و لۆمەدار بن ئەوێت زۆرداریێ ل خەلکی دکەن، و ژ نەهەقی خۆ د ئەردیدا مەزن دکەن، و خرابی و دەستدرێژیێ تێدا ل سەر جان و مالێ خەلکی دکەن، ئەڤان ئیزایەکا ب ژان و دژوار بۆ وانە [ڕۆژا قیامەتێ]. ﴿٤٣﴾ و یێ سەبرێ [ل سەر زولمێ] بکێشیت، و [ل زۆرداریێ خۆ] ببۆریت، ئەڤە [سەبرکێشان و لێبۆرین] ژ وان کارانە یێت کو دڤێت مرۆڤ ل سەر یێ هشیار و ڕژد بیت. ﴿٤٤﴾ و هەر کەسێ خودێ وی گومڕا و ڕێبەرزە بکەت، نێ وی پشتی خودێ کەس نینە، خۆ لێ بکەتە خودان و وی ڕاستەرێ بکەت، و دێ بینی گاڤا ستەمکار [ڕۆژا قیامەتێ] ئیزایێ دبینن، دێ بێژن: ئەرێ ڕێکەکا زڤرینێ [بۆ دنیایێ] هەیە.

وَتَرَىٰهُمۡ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ
مِن طَرۡفٍ خَفِيّٖۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ
خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ
فِي عَذَابٖ مُّقِيمٖ ﴿٤٥﴾ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنۡ أَوۡلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم
مِّن دُونِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴿٤٦﴾ ٱسۡتَجِيبُواْ
لِرَبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۚ مَا لَكُم
مِّن مَّلۡجَإٖ يَوۡمَئِذٖ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٖ ﴿٤٧﴾ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ
فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظًاۖ إِنۡ عَلَيۡكَ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ وَإِنَّآ إِذَآ
أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ فَرِحَ بِهَاۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ
بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ فَإِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ كَفُورٞ ﴿٤٨﴾ لِّلَّهِ مُلۡكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثٗا
وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوۡ يُزَوِّجُهُمۡ ذُكۡرَانٗا وَإِنَٰثٗاۖ
وَيَجۡعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًاۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٞ قَدِيرٞ ﴿٥٠﴾ ۞ وَمَا كَانَ
لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحۡيًا أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوۡ يُرۡسِلَ
رَسُولٗا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٞ ﴿٥١﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٤٩



﴿٤٥﴾ و دێ وان بینی بەر ب دۆژەهێڤە دئێنە ئاژۆتن، و ب ترس ژ رسوایی و شەرمزاری ب رەخەکێ چاڤی و بنڤەبنڤە چاڤگێرییێ دکەن، و ئەوێت باوەری ئینایین [پشتی چۆینە بەحەشتێ و دیتین کا چ ب سەرێ گاوران هات] دبێژن: ب راستی خوسارەت ئەون ئەوێت رۆژا قیامەتێ ژ خۆ و کەس و کارێت خۆ بوویین، بزانن ب راستی ستەمکار یێت د ئیزایەکا بەردەوامدا [نە ب دویماهیك دئێت و نە ژێ دەردکەڤن]. ﴿٤٦﴾ و وان ژ بلی خودێ چو هاریکار نەبوون هاریکارییا وان بکەن [و ئیزایا خودێ ژ وان بدەنە پاش]، و هەر کەسێ خودێ وی گومڕا و رێبەرزە بکەت، نێ رێکا رزگاربوونێ بۆ نینە. ﴿٤٧﴾ [گەلی مرۆڤان] بەرسڤا خودایێ خۆ بدەن [ئانکو ب لەز گوهدارییا خودایێ خۆ بکەن، و ل بەر ئەمرێ وی راوەستن]، بەری رۆژەك بێت کەس نەشێت ڤەگێڕیت، و وەلێ بکەت کو خودێ نەئینیت، د وێ رۆژێدا [کو رۆژا قیامەتێیە] نە چو پارێزەر [ژ ئیزایا خودێ] هەوە هەنە، و نە ئێك هەیە ئینکارا وێ ئیزایێ بکەت [ئەوا ب سەرێ هەوە دئێت، چونکی هوین دێ زانن ب دورستی هوین هێژایی وێ ئیزایێنە]. ﴿٤٨﴾ ڤێجا ئەگەر وان روییێ خۆ وەرگێڕا [و ل دویڤ ئەمرێ خودێ نەهاتن و باوەری نەئینان، خەمێ نەخۆ]، نێ مە تو نەهنارتی تو ل سەر وان پارێزکار بی [ب کۆتەکی بەرێ وان بدەیە باوەرییێ] و ژ گەهاندنا پەیاما خودێ پێڤەتر چو یێ دی ل سەر تە نینە، و ئەگەر ئەم ژ بەرێ خۆڤە نیعمەت و کەرەمەکێ بدەینە مرۆڤی پێ کەیفخۆش دبیت [بەتەر دبیت]، و ئەگەر نەخۆشییەك ژ بەر ئەوا وان کری بگەهیتە وان، ڤێجا قەنجییێت بەری نوکە مە د گەل مرۆڤی کرین، ژ بیرا خۆ دبەت. ﴿٤٩﴾ خودانی و فەرمانداریا ئەرد و ئەسمانان یا خودێیە، چ بڤێت چێ دکەت، یێ بڤێت دێ کچان دەتێ و یێ بڤێت دێ کوران دەتێ. ﴿٥٠﴾ یان ژێ دێ کوڕ و کچان پێکڤە دەتێ، هەچییێ وی بڤێت ژی دێ خرش کەت [نە کوڕ دبن و نە کچ..]، ب راستی ئەو یێ زێدە زانا و خودان شیانە. ﴿٥١﴾ و نینە مرۆڤەك خودێ د گەل باخڤیت، ب رێکا وەحییێ [ئیلهامێ] نەبیت [هەروەکی خودێ ئیلهام داییە دەیکا مووسایی، و کرییە د دلێ ویدا کوڕێ خۆ بدانیتە د سندۆقەکێدا، و باڤێژیتە د دەریایێدا]، یان ژی ل پشت پەردەیەکێ [هەروەکی خودێ د گەل مووسایی ئاخڤتی و گول ئاخڤتنا خودێ بوویی، بێی خودێ ببینیت] یان ژی قاسدەکی [ژ ملیاکەتان] بۆ بهنێریت، ڤێجا [ئەو ملیاکەت] ب ئەمرێ خودێ چ یا خودێ بڤێت بۆ وی مرۆڤی ب وەحی بینیت، ب راستی خودێ یێ بلند و کاربنەجهە.

وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ
وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ
وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ
مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾

## سُورَةُ الزُّخْرُفِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا
لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٣﴾ وَإِنَّهُۥ فِىٓ أُمِّ ٱلْكِتَٰبِ لَدَيْنَا
لَعَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا
أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ ﴿٥﴾ وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِىٍّ فِى
ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِىٍّ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٧﴾
فَأَهْلَكْنَآ أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨﴾
وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ
خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ
مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠﴾



﴿٥٢﴾ و كا چاوا مە وەحی بۆ پێغەمبەرێت دی هنارتییە، وەسا مە ب ئەمرێ خۆ قورئان بۆ تە ب وەحی هنارت، و تە [هەی موحەمەد بەری هاتنا وەحییێ] نەدزانی قورئان چییە و باوەری چییە، بەلێ مە قورئان یا کرییە ڕۆناهییەکا وەسا، هەچییێ مە بڤێت ژ بەندەیێت خۆ ئەم ب وێ ڕۆناهییێ ڕاستەڕێ دکەین، و ب ڕاستی تو [هەی موحەمەد] خەلکی بۆ ڕێکا ڕاست [و دینێ دورست] ڕاستەڕێ دکەی.
﴿٥٣﴾ ڕێکا خودایێ هندی د ئەرد و ئەسماناندا هەی یێ وی، و بزانن هەمی کاروبار ب بال خودێڤە دزڤڕن.

## سۆرەتا زوخروف

### ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٨٩) ئایەتە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هۆسا دئێتە خواندن (حا، میم)، و ل دۆر ڕاڤەکرنا ڤان ڕەنگە تیپان، ل دەستپێکا سۆرەتا بەقەرە بزڤڕە.
﴿٢﴾ سویند ب قورئانا ڕۆنکەر. ﴿٣﴾ ب ڕاستی مە ئەڤ قورئانە ب ئەزمانێ عەرەبی یا ئینایییە خوارێ، دا هوین تێ بگەهن. ﴿٤﴾ و ب ڕاستی ئەو د دەپێ پاراستیدا ل دەڤ مە، کتێبەکا ب ڕێز و ڕویمەت و حەکیمە [ئانکو ئایەتێت وێ ب ڕێك و پێك و موکوم هاتینە دارێتن]. ﴿٥﴾ ڤێجا ما چونکی هوین ملەتەکێ زێدە خرابن، ئەم دەستا ژ هەوە بەردەین و هەوە ب قورئانێ شیرەت نەکەین؟!. ﴿٦﴾ و مە چەند پێغەمبەر بۆ ملەتێت بەرێ هنارتینە؟ [ئانکو مە گەلەك پێغەمبەر بۆ وان هنارتن]. ﴿٧﴾ و چو پێغەمبەر بۆ وان نەدهاتن، ئەگەر وان ترانە پێ نەکربانە. ﴿٨﴾ ڤێجا ئەوێت ژ وان هەمییان ب هێزتر مە د هیلاك برن، و سەرهاتییا وان گەلەك جاران د قورئانێدا یا هاتی [ئانکو هەوە دەنگ و باسێت وان یێت زانین، ڤێجا هشیاری دویماهیکا وان بن ئەو ب سەرێ هەوە نەئێت یا ب سەرێ وان هاتی]. ﴿٩﴾ و ئەگەر تو پسیارا وان بکەی: کێ ئەرد و ئەسمان چێ کرینە، دێ بێژن: خودایێ سەردەست و زانا یێت چێ کرین. ﴿١٠﴾ ئەوێ ئەرد بۆ هەوە خۆشکری و ڕائێخستی، و بۆ ژیانا هەوە بەرهەڤکری و ڕێك بۆ هەوە کرینە تێدا، دا هوین [د وەغەرێت خۆدا] ڕاستەڕێ ببن [و بگەهنە وێ یا هەوە دڤێت].

وَٱلَّذِي نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٖ فَأَنشَرۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ
كَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ ١١ وَٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ
لَكُم مِّنَ ٱلۡفُلۡكِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ مَا تَرۡكَبُونَ ١٢ لِتَسۡتَوُۥاْ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ
ثُمَّ تَذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ رَبِّكُمۡ إِذَا ٱسۡتَوَيۡتُمۡ عَلَيۡهِ وَتَقُولُواْ سُبۡحَٰنَ
ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ١٣ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا
لَمُنقَلِبُونَ ١٤ وَجَعَلُواْ لَهُۥ مِنۡ عِبَادِهِۦ جُزۡءًاۚ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ
لَكَفُورٞ مُّبِينٌ ١٥ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخۡلُقُ بَنَاتٖ وَأَصۡفَىٰكُم
بِٱلۡبَنِينَ ١٦ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحۡمَٰنِ مَثَلٗا
ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٌ ١٧ أَوَمَن يُنَشَّؤُاْ فِي
ٱلۡحِلۡيَةِ وَهُوَ فِي ٱلۡخِصَامِ غَيۡرُ مُبِينٖ ١٨ وَجَعَلُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ
ٱلَّذِينَ هُمۡ عِبَٰدُ ٱلرَّحۡمَٰنِ إِنَٰثًاۚ أَشَهِدُواْ خَلۡقَهُمۡۚ سَتُكۡتَبُ
شَهَٰدَتُهُمۡ وَيُسۡـَٔلُونَ ١٩ وَقَالُواْ لَوۡ شَآءَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مَا عَبَدۡنَٰهُمۗ
مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ٢٠ أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ
كِتَٰبٗا مِّن قَبۡلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسۡتَمۡسِكُونَ ٢١ بَلۡ قَالُوٓاْ إِنَّا
وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهۡتَدُونَ ٢٢



﴿١١﴾ و ئەوێ ئاڤ ب پیڤان ژ ئەوران باراندی [ئانكو ل دویڤ هەوجەیییێ ددەت، نە هند گەلەك دبارینیت ئەردی هەمییێ بن ئاڤ بكەت و بغەرقینیت، و نە هند كێم دبارینیت ئەوێت ل سەر ئەردی تێنی و بێ ئاڤ بمینن، و داروبار نەمینن]، ڤێجا مە ئەردەكێ مری پێ ساخكرەڤە و شینكر، هوین ژی هۆسا دێ [ژ گۆڕان] دەركەڤن. ﴿١٢﴾ و ئەوێ هەمی جۆت [نێر و مێ، سار و گەرم، شرین و تەحل، باش و خراب] چێ كرین، و گەمی و تەرش داینە هەوە، هوین لێ سواربن. ﴿١٣﴾ دا هوین ل پشتا وان سواربن، پاشی دا هوین هەر وەختێ ل پشتا وان سواربوون، نیعمەتێت خودێ بیننە بیرا خۆ و بێژن: پاك و پاقژی ژ هەمی كێماسییان بۆ وی خودایی، ئەوێ ئەڤە بۆ مە سەرنەرم كرین، و مە ب خۆ ئەڤ شیانە نەبوون. ﴿١٤﴾ و ئەم هەر دێ ب بال خودایێ خۆڤە زڤڕین. ﴿١٥﴾ و وان [قورەیشییان] هندەك ژ بەندەیێت وی كرنە پشكەك ژ وی (ژ خودێ) [ئانكو ملیاكەت كرنە كچێت خودێ]، ب ڕاستی مرۆڤ چاڤنق و نەشوكوردارەكێ ئاشكەرایە. ﴿١٦﴾ ئەرێ خودێ ژ چێكرییێت خۆ، كچ بۆ خۆ هەلبژارتن، و كوڕ بۆ هەوە ڤەوەژارتن [ب ڕاستی ئەڤە ئاخڤتنەكا گەلەك مەزن و زێدە كرێتە، چاوا هوین خۆ ژ خودێ ب قەدرتر دبینن، و كوڕان بۆ خۆ ددانن، و ئەوێت هەوە نەڤێن كو كچن ب بال ویڤە لێ ددەن]. ﴿١٧﴾ و هەر وەختێ مزگینی بۆ ئێكی ب وێ هاتەدان یا وان بۆ خودێ ددانا [كو كچە]، ناڤچاڤێت وی تێكچۆن و ڕەش و شین بوون، وپری كەرب و كین و خەم بوو و كەربا خۆ داعویرا. ﴿١٨﴾ ئەرێ ئەو وی بۆ خودێ دادانن، یێ د ناڤ زێڕ و زینەتێدا مەزنبوویی، و د هەڤركییێدا نەیێ ب ئەزمان. ﴿١٩﴾ و وان ملیاكەت، ئەوێت بەندەیێت خودێ، مێ دانان، ما وان چێكرنا وان دیتییە؟ شادەییا وان دێ ئێتە نڤێسین، و دێ پسیارا وان ل سەر ئێتەكرن. ﴿٢٠﴾ و گۆتن: ئەگەر خودایێ دلۆڤان ڤیابایە مە ئەو نەدپەرستن، و ئەو ڤێ ژ دەڤ خۆ دبێژن و وان چو بەلگە و نیشان پێ نینن، و ئەو ژ درەوان پێڤەتر نابێژن. ﴿٢١﴾ یان ژی بەری قورئانێ مە كتێبەكا دی داییە وان، ئەو خۆ پێڤە دگرن [كو بۆ خۆ دكەنە نیشان و بەلگە ل سەر بۆچۆنا خۆ، كو حاشا ملیاكەت كچێت خودێنە، یان ژی خودێ ڤیایە ئەو پەرستنا وان بكەن، لەوا ژێ نەداینە پاش]. ﴿٢٢﴾ نەخێر وەسا نینە بەلێ [بەلگەیێ وان ئەڤەیە] دبێژن: مە باب و باپیرێت خۆ ل سەر دین و ڕێكەكێ یێت دیتین، و ئەم ژی ل دویڤ شۆپ و دەوسا وان دچین.

وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ
إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾
۞ قَٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ ۖ قَالُوٓا۟
إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى
بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴿٢٧﴾
وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ بَلْ
مَتَّعْتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿٢٩﴾
وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالُوا۟
لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمْ
يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم
بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٣٢﴾ وَلَوْلَآ
أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ
لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾

الحزب ٥٠





﴿٢٣﴾ و هۆسا مە چو پێغەمبەر بەری تە بۆ خەلکێ
چو گوندان نەهنارتینە، ئەگەر دەولەمەند و گرەگر
و سەرکردەیێت وان نەگۆتبنێ، ب ڕاستی مە باب و
باپیرێت خۆ ل سەر دین و ڕێکەکێ یێت دیتین، و
ئەم ژی ل دویڤ وان دچین. ﴿٢٤﴾ [هەر پێغەمبەرەکێ
بۆ وان هاتبیت گۆتیە وان]: ئەرێ ئەگەر خۆ ئەز
بۆ هەوە تشتەکی بینم ژ وێ چێتر و ڕاستەڕێتر ژی
بیت، یا هەوە باب و باپیرێت خۆ ل سەر دیتین [هەر
دیسا هوین دێ ل شۆپا وان چن] گۆتن: ب ڕاستی
ئەم ژ تشتێ هوین پێ هاتینە هنارتن بێ باوەرین.
﴿٢٥﴾ و مە تۆل ل وان ڤەکر، ڤێجا بەرێ خۆ بدەیێ،
کا دویماهیا ئەوێت پێغەمبەرێت خودێ درەوین
دانایین، بوو چ؟. ﴿٢٦﴾ سەرهاتیا ئیبراهیم پێغەمبەر
بۆ وان بێژە دەمێ گۆتیە بابێ خۆ و ملەتێ خۆ: بێ
گۆمان ئەز یێ بەریمە ژ وان یێت هوین دپەرێسن.
﴿٢٧﴾ بەلێ ئەز وی دپەرێسم یێ ئەز دایم، بێ گۆمان
ئەو دێ من ڕاستەڕێ کەت. ﴿٢٨﴾ و ئیبراهیمی پەیڤا
ئێکینیا خودێ د دویڤ خۆدا هێلا، و کرە پەیڤەکا
هەروهەر هەی، [دا یێ باوەری بڤێت لێ بزڤڕیت]. ﴿٢٩﴾ بەلێ مە خۆشی دانە ڤان و باب و باپیرێت
وان [مەخسەد پێ خەلکێ مەکەهێنە]، هەتا قورئان و پێغەمبەرێ ئاشکەرا بۆ وان هاتی. ﴿٣٠﴾ ڤێجا وەختێ
قورئان بۆ وان هاتی [دا وان ژ بێ ئاگەهیا وان هشیار بکەن]، گۆتن: ئەڤە سحرە، و ب ڕاستی ئەم باوەرییێ
پێ نائینین. ﴿٣١﴾ و گۆتن: بلا ئەڤ قورئانە بۆ ئێك ژ هەردو ماقویلێت ڤان هەردو گوندان هاتبایە خوارێ
[ل تائیفێ: بۆ عورووەیێ کوڕێ مەسعوودێ (سەقەفی)، و ل مەکەهێ: بۆ وەلیدێ کوڕێ موغیرەی، دورست
نەدیتن بۆ موحەمەدێ ئێتیم بێت]. ﴿٣٢﴾ ئەرێ ما لێکڤەکرنا دلۆڤانیا خودایێ تە د دەست واندایە؟ [ئانکو
ما پێغەمبەراتی د دەست واندایە، دا بێژن ئەڤە یێ هەژییە و ئەوێ هە نە.. یان بلا بۆ ڤی هاتبایە و بۆ ئەوێ
هە نەهاتبایە؟] مە ڕزقێ وان د ژیانا دنیایێدا د ناڤبەرا واندا یێ لێکڤەکری، و مە هندەك ژ وان ب سەر
هندەکان یێت ئێخستین، دا هندەك ژ وان هندەکان بۆ خۆ بکەنە خزمەتکار [دا کارێ ژیانێ پێ دورست
ببیت]، [ما ئەو ڤێ نابینن، ڤێجا چاوا ڕازی نینن، خودێ پێغەمبەراتییێ بدەتە وی یێ وی بڤێت] و دلۆڤانیا
خودایێ تە [ڕۆژا قیامەتێ] ژ وێ چێترە، یا ئەو کۆم دکەن [ژ مال و سامانێ دنیایێ]. ﴿٣٣﴾ و ئەگەر ژ بەر
هندێ نەبایە کو خەلك هەمی بچنە سەر گاورییێ و بمیننە ب دنیایێڤە [و موسلمان نەمینن]، ئەم دا بانێت
خانییێت وان ئەوێت باوەری ب خودایێ دلۆڤان نەئینایین کەینە زیڤ، و دا پەیسکێت خانیان ب خۆ ژی
کەینە زیڤ، پێ سەرکەڤتبانە بانی.

وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا ۚ وَإِن
كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ
لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا
فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ
أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ
بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ
إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٩﴾ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ
ٱلصُّمَّ أَوْ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَمَن كَانَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٠﴾ فَإِمَّا
نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴿٤١﴾ أَوْ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِى
وَعَدْنَٰهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴿٤٢﴾ فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِىٓ أُوحِىَ
إِلَيْكَ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ۖ
وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ
أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا
مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَقَالَ إِنِّى رَسُولُ رَبِّ
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٦﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ﴿٤٧﴾





﴿٣٤﴾ و دا دەرگەهێت خانییێت وان و تەختێت ل سەر
پال ددەن کەینە زیڤ. ﴿٣٥﴾ و دا زێر و زینەتی دەینە
وان، و ئەڤە هەمی پەرتالێ ژیانا دنیاییێیە، و ئاخرەت
ل دەڤ خودایێ تە، بۆ پارێزکار و تەقوادارانە.
﴿٣٦﴾ و هەر کەسێ پشت دەتە بیرئینان و زکرێ
خودایێ دلۆڤان و قورئانێ، ئەم دێ شەیتانەکی بۆ
کەینە هەڤال، کو هەروهەر د گەل بیت. ﴿٣٧﴾ و ئەو
شەیتان، وان ژ رێکا خودێ ددەنە پاش، و ئەو هزر
دکەن ئەو یێت ل سەر رێکا راست. ﴿٣٨﴾ [ڤێجا
ئەو هۆسا رێکا شەیتانی دگریت] هەتا دئێتە دەڤ
مە، دێ بێژیت: خۆزی ناڤبەینا من و تە [مەخسەد
پێ شەیتانە] دویراتییا رۆژهەلات و رۆژئاڤایێ بایە،
چ پیسە هەڤال و پیسە تەکی. ﴿٣٩﴾ و د بنیرا فایدەی
هەوە ناکەت، ئەڤرۆ هوین هەمی د ئیزاییێدا هەڤپشك
بن، چونکی هەوە پێکڤە ستەم یا کری [بەروڤاژی
دنیاییێ، دەمێ بەلا دبیتە تەڤایی، سڤك دبیت].
﴿٤٠﴾ ئەرێ ما تو دشێی [هەی موحەمەد] یێ کەر،
وەلێ بکەی گولێ ببیت، یان ئەوێ کۆرە و ئەوێ د
بەرزەبوونەکا ئاشکەرادا راستەرێ بکەی [ڤێجا ب خەم نەکەڤە ژ بەر باوەری نەئینانا وان، دکەرن چونکی
گولێ نابن، کۆرەنە چونکی نابینن]. ﴿٤١﴾ و ئەگەر مە تو مراندی، بەری ئەم وان ئیزادەین، [بزانە] ب
راستی ئەم دێ هەر تۆلێ ل وان ڤەکەین. ﴿٤٢﴾ یان ژی دێ وێ ئیزایا مە پەیمان پێ دایییە تە نیشا وان
دەین، ب راستی ئەم ل سەر وان خودان دەستهەلاتین. ﴿٤٣﴾ و ئەو وەحییا بۆ تە هاتی کو قورئانە باش
بگرە، ب راستی تو یێ ل سەر رێکا راست. ﴿٤٤﴾ و ب راستی ئەڤ قورئانە بۆ تە و ملەتێ تە سەربلندی
و سەرفەرازییە، و رۆژا قیامەتێ دێ پسیارا وێ ژ هەوە ئێتەکرن. ﴿٤٥﴾ [هەی موحەمەد] پسیارا وان بکە،
ئەوێت مە بەری تە هنارتین ژ پێغەمبەران، کا مە پەرستییەك ژ بلی خودایێ دلۆڤان دانایە، بێتە پەرستن [ئانکو
چو پێغەمبەران داخوازا پەرستنا غەیری خودێ نەکرییە]. ﴿٤٦﴾ و ب سویند مە مووسا ب موعجیزەیێت
خۆڤە بۆ فیرعەونی و گرەگر و کەنکەنەییێت وی هنارت، و گۆت: ب راستی ئەز پێغەمبەرێ خودانێ هەمی
جیهانانم. ﴿٤٧﴾ ڤێجا وەختێ مووسا ب موعجیزەییێت مەڤە بۆ وان هاتی، ب چوڤە وەرنەگرتن و پێ کەنین.

وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِيَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا ۖ وَأَخَذْنَٰهُم
بِٱلْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤٨﴾ وَقَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدْعُ لَنَا
رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا
عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿٥٠﴾ وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِى قَوْمِهِۦ
قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِى مِن
تَحْتِىٓ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٥١﴾ أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ مَهِينٌ
وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴿٥٢﴾ فَلَوْلَآ أُلْقِىَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ
مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ
فَأَطَاعُوهُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا
ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُمْ
سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْءَاخِرِينَ ﴿٥٦﴾ ۞ وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا الحزب ٥٠
إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ
هُوَ ۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنْ هُوَ
إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾
وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾



﴿٤٨﴾ و مە چو موعجیزە نیشا وان نەددان، ئەگەر ئەو
ژ یا بەری خۆ یا مەزنتر نەبایە، و [پشتی موعجیزەیان
فایدەی وان نەکری] مە ئەو ئیزادان، دا ل خۆ بزڤڕن.
﴿٤٩﴾ [ڤێجا وەختێ بەرهنگاری ئیزایێ بوویین]
گۆتن: سێربەندۆ ژ خودایێ خۆ بخوازە، ئەو پەیمانا
دایییە تە [پەیمانا ڕاکرنا ئیزایێ ل سەر وی یێ
باوەرییێ بینیت] بۆ مە ب جهـ بکەت، ب ڕاستی ئەم
دێ باوەرییێ ب تە ئینین. ﴿٥٠﴾ ڤێجا وەختێ مە ئیزا
ل سەر وان ڕاکری، وان پەیمانا خۆ شکاند [و ل سەر
گاورییا خۆ مان]. ﴿٥١﴾ و فیرعەونی د ناڤ ملەتێ
خۆدا گازی کر و گۆت: گەلی ملەتێ من ما ملکێ
مسرێ نەیێ منە؟ و ما ئەڤ ڕوبارە دبن [قەسرێت]
منرا ناچن، ما هوین نابینن؟ [و بزانن ئەز چەندێ ب
هێزم، و ملکێ من چەندێ مەزنە]. ﴿٥٢﴾ ما ئەز ژ
ڤی، ئەڤێ بێخێرۆك و ب دورستی نوزانیت باخڤیت،
چێتر نینم؟ ﴿٥٣﴾ [ڤێجا ئەگەر ڕاست پێغەمبەرە] پا
بلا [خودایێ وی] بازنکێت زێڕی دابانێ [و کربانە
زەندکێت خۆ، وەکی مەزنێت وی سەردەمی]، یان ژی
دەمێ هاتی ملیاکەت ژی د گەل هاتبانە. ﴿٥٤﴾ ڤێجا فیرعەونی ملەتێ خۆ ب چو حسێب نەکرن و سڤك زانین
[قیمەت نەدا وان]، ئینا وان ژی گوهدارییا وی کرن، ب ڕاستی ئەو ملەتەکێ ژ ڕێدەرکەڤتی بوون. ﴿٥٥﴾ ڤێجا
وەختێ کەربێت مە ڤەکرین مە تۆل ل وان ڤەکر، و مە هەمی د ئاڤێدا خەندقاندن. ﴿٥٦﴾ و مە ئەو [بۆ گاوران]
کرنە بەراهیکێش، و مە ئەو کرنە چامە بۆ غەیری وان. ﴿٥٧﴾ و وەختێ نموونە ل سەر کوڕێ مەریەمێ هاتییە
دانان [وەختێ ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ﴾
ئانکو: ب ڕاستی هوین، و ئەوێت هوین شوینا خودێ دپەرێسن، داردوویێ دۆژەهێنە. قورەیشییان گۆتە
پێغەمبەری، ما نە مەسیحی، عیسایی دپەرێسن، و تو دبێژی عیسا پێغەمبەرە، ڤێجا ئەگەر ئەو د ئاگریدا بیت
ئەم ژی ڕازینە، ئەم و پەرستییێت خۆ د گەل وی بین، گاورێت قورەیشییان کرنە کەنی، و بوو تیقەلیقا وان]،
ملەتێ تە ب وێ [نموونەیێ دلخۆش بوون] و دەنگێت وان ژ کەیفاندا بلند بوون. ﴿٥٨﴾ و گۆتن: ما بوتێت
مە چێترن یان عیسا [ئەگەر هەر کەسێ شوینا خودێ بێتە پەرستن د ئاگریدا بیت، ئەم ڕازینە بوتێت مە د
گەل عیسایی بن]، و وان ئەڤ نموونەیە بۆ تە نەئینا ئەگەر بۆ جڕەبڕ و گەنگەشەیێ نەبیت، نێ ئەو ملەتەکێ
زێدە چیڕدرێژن و جڕکێشن. ﴿٥٩﴾ [عیسایێ کوڕێ مەریەمێ نەخودێیە، و نە وی گۆتییە وان من بپەرێسن]
ئەو بەس بەندەیەکە، مە نیعمەتا د گەل کری، و مە یێ کرییە نیشان و بەلگەیەك بۆ ئسرائیلییان [ل سەر شیان
و دەستهەلاتدارییا خۆ]. ﴿٦٠﴾ و ئەگەر مە ڤیابایە، دا شوینا هەوە ملیاکەتان کەینە د ئەردیدا.

وَإِنَّهُۥ لَعِلۡمٞ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمۡتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ
مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٦١﴾ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٦٢﴾
وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدۡ جِئۡتُكُم بِٱلۡحِكۡمَةِ
وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعۡضَ ٱلَّذِي تَخۡتَلِفُونَ فِيهِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٦٣﴾
إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٦٤﴾
فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡۖ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ ظَلَمُواْ
مِنۡ عَذَابِ يَوۡمٍ أَلِيمٍ ﴿٦٥﴾ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن
تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٦٦﴾ ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ
بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ يَٰعِبَادِ لَا خَوۡفٌ
عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِـَٔايَٰتِنَا
وَكَانُواْ مُسۡلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ أَنتُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ
تُحۡبَرُونَ ﴿٧٠﴾ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٖ مِّن ذَهَبٖ وَأَكۡوَابٖۖ
وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُۖ وَأَنتُمۡ فِيهَا
خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾ وَتِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ
تَعۡمَلُونَ ﴿٧٢﴾ لَكُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ كَثِيرَةٞ مِّنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴿٧٣﴾



﴿٦١﴾ و ب ڕاستی هاتنا وی [یا عیسایێ کوڕێ مەریەمێ] نیشانە بۆ قیامەتێ، ڤێجا هوین د هاتنا وێ ڕۆژێدا ب گومان نەبن، و ل دویڤ من وەرن، ب ڕاستی ئەڤەیە ڕێکا ڕاست. ﴿٦٢﴾ و [هشیار بن] شەیتان هەوە ژ ڕێکا خودێ نەدەتە پاش، ب ڕاستی ئەو بۆ هەوە دژمنەکێ ئاشکەرا ئاشکەرایە. ﴿٦٣﴾ ڤێجا وەختێ عیسا ب بەلگە و نیشانێت ئاشکەراڤە هاتی، گۆت: ئەز پێغەمبەر بۆ هەوە هاتم، دا هندەك ژ تشتێ هوین تێدا ژێك جودا [ژ ئەحکامێت تەوراتێ] بۆ هەوە ئاشکەرا بکەم، ڤێجا تەقوا خودێ [د فەرمانێت ویدا] بکەن، و گوهێ خۆ بدەنە من. ﴿٦٤﴾ ب ڕاستی خودێ خودانێ منە و خودانێ هەوەیە ژی، ڤێجا وی بپەرێسن، ڕێکا ڕاست هەر ئەڤەیە. ﴿٦٥﴾ [بەلێ پشتی عیسایی]، دەستە و کۆمێت [ئسرائیلیان] د دەرهەقێ ویدا ژێك جودا بوون [و هەر ئێکی تشتەك د ڕاستێدا دگۆت، هندەکان کرە خودێ ب خۆ، و هندەکان کرە کوڕێ خودێ، و هندەکان کرە ئێك ژ سێ خودێیان، و هندەکان دەیکا وی ب دەهمەن پیسیێ گونەهکار کر]، ڤێجا وەیل و ئێزا و نەخوشی بۆ وان بیت، ئەوێت ستەم کرین [ب وان ئاخڤتنێت د دەرهەقێ عیسایدا کرین]، ژ ئیزایا دژوار. ﴿٦٦﴾ ئەرێ ئەو خۆ ل هندێ دگرن، ڕۆژا قیامەتێ ب خافلەتیڤە ب سەر واندا بێت، و وان های ژ خۆ نە. ﴿٦٧﴾ وێ ڕۆژێ [قیامەتێ] هەڤال [ئەوێت د دنیایێدا خۆشڤیێت ئێك] دژمنێت ئێکن، ئەو نەبن ئەوێت ژ بۆ خودێ گەهشتینە ئێك [هەڤالینی و ڤیانا وان د ئاخرەتێ ژیدا هەر دێ مینیت]. ﴿٦٨﴾ هەی بەندەیێت من [ئەوێت هەوە باوەری ئینایین، و هوین بەرئەمری من]، ئەڤرۆ نە ترس بۆ هەوە هەیە، و نە هوین ب خەم دکەڤن. ﴿٦٩﴾ [ئەو نا ترسن و ب خەم ناکەڤن] ئەوێت باوەری ئینایین و خۆ سپارتینە ئەمرێ خودێ. ﴿٧٠﴾ هەرنە د بەحەشتێدا هوین و هەڤسەرێت خۆ، دێ خۆشیان تێدا بینن [ب ڕەنگەکێ وەسا کو ئەو خۆشی ل سەروچاڤێت هەوە دیار ببیت]. ﴿٧١﴾ و ئامانێت زێری [یێت خوارنێ] و پەرداغێت [ڤەخوارنا پاقژ] ل بەر وان دئێنە گێڕان، و دل چ بخوازیت و چاڤ بچنە چ بۆ وان د بەحەشتێدا یێ هەی، و هوین هەروهەر دێ تێدا مینن. ﴿٧٢﴾ و ئەڤ بەحەشتە [ئەوا ب ڤان سالۆخەتان] ژ بەر کار و کریارێت هەوە د دنیایێدا کرین، گەهشتیە هەوە. ﴿٧٣﴾ بۆ هەوە تێدا [ژ بلی خوارن و ڤەخوارنێ] گەلەك فێقی و ژ هەمی ڕەنگان یێ هەی، و هوین ژێ دخۆن.

إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ٧٤ لَا يُفَتَّرُ عَنۡهُمۡ وَهُمۡ
فِيهِ مُبۡلِسُونَ ٧٥ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن كَانُواْ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ ٧٦
وَنَادَوۡاْ يَٰمَٰلِكُ لِيَقۡضِ عَلَيۡنَا رَبُّكَۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ٧٧ لَقَدۡ
جِئۡنَٰكُم بِٱلۡحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَكُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ٧٨ أَمۡ أَبۡرَمُوٓاْ أَمۡرٗا
فَإِنَّا مُبۡرِمُونَ ٧٩ أَمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّا لَا نَسۡمَعُ سِرَّهُمۡ وَنَجۡوَىٰهُمۚ بَلَىٰ
وَرُسُلُنَا لَدَيۡهِمۡ يَكۡتُبُونَ ٨٠ قُلۡ إِن كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ وَلَدٞ فَأَنَا۠ أَوَّلُ
ٱلۡعَٰبِدِينَ ٨١ سُبۡحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ
عَمَّا يَصِفُونَ ٨٢ فَذَرۡهُمۡ يَخُوضُواْ وَيَلۡعَبُواْ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ
ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ٨٣ وَهُوَ ٱلَّذِي فِي ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٞ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ
إِلَٰهٞۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡعَلِيمُ ٨٤ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَعِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٨٥
وَلَا يَمۡلِكُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن
شَهِدَ بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ٨٦ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَهُمۡ
لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ٨٧ وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمٞ
لَّا يُؤۡمِنُونَ ٨٨ فَٱصۡفَحۡ عَنۡهُمۡ وَقُلۡ سَلَٰمٞۚ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ٨٩



﴿٧٤﴾ ب ڕاستی گاور دێ هەروهەر د ئیزایا دۆژەهێدا
مینن. ﴿٧٥﴾ ئیزا ل سەر وان سڤك نابیت [پیچەكێ
بێنا خۆ بدەن]، و ئەو تێدا بێ هیڤینە [ئیزا ل سەر
وان بێنەكێ ژی سڤك ببیت]. ﴿٧٦﴾ و مە ستەم ل
وان نەكربوو، بەلێ وان ب خۆ ستەم ل خۆ كر.
﴿٧٧﴾ [دۆژەهیان] گازی كر: هەی دەرگەهڤانێ
دۆژەهێ، بلا خودایێ تە مە بمرینیت [دا بۆ خۆ
ڕەحەت ببین]، گۆت: ب ڕاستی هوین دێ هەروهەر
تێدا مینن [نە دمرن، و نە دەردكەڤن]. ﴿٧٨﴾ ب سویند
مە هەقی بۆ هەوە ئینا [مە پێغەمبەر بۆ هەوە هنارتن، و
كتێب دانە هەوە، و وان هوین ئاگەهداركرن و داخوازا
گوهدارییێ ژ هەوە كرن، بەلێ هەوە گوهێ خۆ نەدا
وان، و باوەری ب وان نەئینا]، نێ بارا پتر ژ هەوە
هەقی نەدڤیا. ﴿٧٩﴾ یان ژی وان (قورەیشییان) تەكبیرا
خۆ كرییە [تشتەكی ب سەرێ پێغەمبەری بینن، و د
ناڤ جهاندا بكوژن]، ب ڕاستی مە ژی تەكبیرا خۆ
یا كری [تەكبیرا وان ب سەرێ واندا بشكێنین، و
گرەگرێت وان هەمییان ڕۆژا بەدرێ بدەینە كوشتن].
﴿٨٠﴾ یان ژی ئەو هزر دكەن مە گول نهێنی و پستەپستا وان نینە [ئەوا ئەو د (دار الندوه)ڤە د دەرهەقێ
پێغەمبەریدا دكەن]، بەلێ مە گولێ هەیە، و ملیاكەتێت مە ئەوێت ل دەڤ وان هەمییێ دنڤیسن. ﴿٨١﴾ [هەی
موحەمەد] بێژە: ئەگەر خودایێ دلۆڤان كورەك یان كچەك هەبایە، ئەز دا بەری هەمییان پەرێسم [بەلێ
حاشای خودێ، ئەڤە د ڕاستا ویدا دورست نینە]. ﴿٨٢﴾ پاك و پاقژی ژ هەمی كێماسییان بۆ خودانێ ئەرد
و ئەسمانان و خودانێ عەرشی بیت، ژ وان سالۆخەتێت ئەو ب پال خودێڤە لێ ددەن. ﴿٨٣﴾ ڤێجا [هەی
موحەمەد] ژ وان بگەڕە، بلا ل سەر پویچی و نەزانینا خۆ بن، و ترانەیان بۆ خۆ بكەن، هەتا دگەهنە وێ
ڕۆژا خۆ، ئەوا سۆز و پەیمان بۆ وان پێ دئێتە دان. ﴿٨٤﴾ و پەرستییێ ڕاست و دورست و هێژایی پەرستنێ د
ئەسمانیدا ئەوە، و پەرستییێ ڕاست و دورست و هێژایی پەرستنێ د ئەردیدا ژی هەر ئەوە، و ئەوە كاربنەجه و
زانا. ﴿٨٥﴾ و پاكی و بلندی و خێر و بەرەكەت، هەمی بۆ وی بن ئەوێ مالداری و خودانییا ئەرد و ئەسمانان
و هندی د ناڤبەرا واندا یا وی، و ئەو ب تنێ وەختێ ڕابوونا قیامەتێ دزانیت، و هەر هوین دێ ب پال
ویڤە زڤرن. ﴿٨٦﴾ و ئەوێت شوینا خودێ دئێنە پەرستن، چو مەهدەر د دەست واندا نینە، ژ بلی وان ئەوێت
شادەییێ ب دورستی ب پەیڤا ئێكینییا خودێ ددەن، و ئەو بزانن [خودێیە خودانێ وان و ئەو بەندەیێت
وینە]. ﴿٨٧﴾ و ئەگەر تو پسیارا وان بكەی: كێ هوین چێكرینە؟ دێ بێژن: خودێ.. پا چاوا هوین ژ پەرستنا
وی دئێنە دویرئێخستن. ﴿٨٨﴾ [و زانینا ڕۆژا قیامەتێ] و گۆتنا پێغەمبەری [ل دەڤ وییە]، [وەختێ گۆتی:]
خودێوۆ، ب ڕاستی ئەڤە ملەتەكن باوەرییێ نائینن. ﴿٨٩﴾ ڤێجا [هەی موحەمەد] ژ وان بگەڕە و چاڤێت خۆ
ژ وان بگرە، و بێژە وان: دێ هەڕن، نێزیك دێ هوین دویماهییا گاوری و سەرڕەقییا خۆ زانن.

## سُورَةُ الدُّخَانِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ ۚ
إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴿٤﴾ أَمْرًا
مِّنْ عِندِنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٥﴾ رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ
ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦﴾ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ
إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٧﴾ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ رَبُّكُمْ
وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ يَلْعَبُونَ ﴿٩﴾
فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى ٱلنَّاسَ ۖ
هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾
أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوْا۟
عَنْهُ وَقَالُوا۟ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا ۚ إِنَّكُمْ
عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾
نصف الحزب ٥٠ ۞ وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَآءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ ﴿١٧﴾
أَنْ أَدُّوٓا۟ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ ۖ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٨﴾





## سۆرەتا دوخان

### ل مەکەهێ هاتیە خوارێ (٥٩) ئایەتە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هۆسا دئێتە خواندن (حا، میم)، ل دۆر ڕاڤەکرنا ڤان ڕەنگە تیپان، ل دەستپێکا سۆرەتا بەقەرە بزڤرە. ﴿٢﴾ سویند ب کتێبا ڕۆنکەر [کو قورئانە]. ﴿٣﴾ ب ڕاستی مە ئەڤ کتێبە [کو قورئانە] د شەڤەکا پیرۆزدا [کو (لیلة القدر)ــە، شەڤا ب ڕێز و ڕویمەتە] ئینا خوارێ، دا خەلکی پێ هشیارکەین و بترسینین. ﴿٤﴾ د وێ شەڤێدا هەمی کاروبار ب حیکمەت و شارەزایی، دئێنە دیارکرن و ژێك جوداکرن. ﴿٥﴾ ب ئەمر و فەرمان و زانینا مە، ئەڤە هەمی دئێنە دیارکرن، ب ڕاستی ئەم، پێغەمبەران دهنێرین. ﴿٦﴾ [هنارتنا پێغەمبەران] دلۆڤانییەکە ژ خودایێ تە، ب ڕاستی خودایێ تەیە یێ گوهدێر و زێدە زانا. ﴿٧﴾ [ئەوێ قورئان ئینایییە خوارێ] خودایێ ئەرد و ئەسمانانە و هندی د ناڤبەرا واندا، ئەگەر هەوە ئێقین هەبیت [ئەڤە ژ هەمی تشتان هێژاترە، هوین ئێقینێ پێ بینن]. ﴿٨﴾ چو پەرستییێت ڕاست و دورست ژ وی پێڤەتر نینن، و هەر ئەوە ژیانێ و مرنێ ددەت، ئەڤە خودایێ هەوەیە و خودایێ باب و باپیرێت هەوە یێت کەڤنە. ﴿٩﴾ نەخێر وان ئێقین نینە کو خودێیە چێکەرێ ئەرد و ئەسمانان، بەلێ یێت د شك و گۆمانێدا [د ڕاستا قیامەتێدا]، و ترانەیان پێ دکەن. ﴿١٠﴾ ڤێجا [هەی موحەمەد] خۆ بگرە هەتا ئەسمان دویکێلەکا ئاشکەرا دئینیت. ﴿١١﴾ [ئەو دویکێل] ب سەر خەلکیدا دگریت، ئەڤە ئیزایەکا ب ژان و دژوارە. ﴿١٢﴾ [هنگی گاور دێ بێژن:] خودێوۆ، ڤێ ئیزایێ ل سەر مە ڕاکە، ڕاست ئەم دێ باوەرییێ ئینین. ﴿١٣﴾ و چاوا ئەو دێ پێڤە چن و فایدەی ژ ئیزایێ کەن [و ئاخڤتنا خۆ ب جهـ ئینن]، ئەگەر ئیزا ل سەر وان ڕابوو ئەو باوەرییێ بینن، و بەری نوکە [پێغەمبەرەکێ پێغەمبەراتییا وی ئاشکەرا بۆ وان چۆبوو]. ﴿١٤﴾ پاشی پشت دانێ، و گۆتن: ئەڤە فێرکرییەکێ دینە [ئێك ڤێ بۆ دبێژیت، و ئەڤە نە وەحییە بۆ دئێت]. ﴿١٥﴾ ب ڕاستی ئەم دێ پیچەکێ وێ ئیزایێ ل سەر هەوە گیرۆکەین، بەلێ هوین [دیسا] دێ ل گاورییا خۆ زڤرن. ﴿١٦﴾ ڕۆژا ب هێز [کو ڕۆژا قیامەتێیە] ئەم دێ وان گرین، و ئەم دێ وێ ڕۆژێ تۆلێ ل وان ڤەکەین. ﴿١٧﴾ و ب سویند مە بەری وان ملەتێ فیرعەونی [ب هنارتنا مووسایی و هاروونی] جەرباندن، و پێغەمبەرەکێ پیرۆز بۆ وان هات. ﴿١٨﴾ [گۆتە وان] بەندەیێت خودێ [ئسرائیلییان] بسپێرنە من [ئانکو ڕادەستی من بکەن]، ب ڕاستی ئەز بۆ هەوە پێغەمبەرەکێ ئەمین و دەستپاکم.

وَأَن لَّا تَعۡلُواْ عَلَى ٱللَّهِۖ إِنِّيٓ ءَاتِيكُم بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴿١٩﴾ وَإِنِّي عُذۡتُ
بِرَبِّي وَرَبِّكُمۡ أَن تَرۡجُمُونِ ﴿٢٠﴾ وَإِن لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ لِي فَٱعۡتَزِلُونِ ﴿٢١﴾
فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمٞ مُّجۡرِمُونَ ﴿٢٢﴾ فَأَسۡرِ بِعِبَادِي لَيۡلًا إِنَّكُم
مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱتۡرُكِ ٱلۡبَحۡرَ رَهۡوًاۖ إِنَّهُمۡ جُندٞ مُّغۡرَقُونَ ﴿٢٤﴾ كَمۡ
تَرَكُواْ مِن جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٖ وَمَقَامٖ كَرِيمٖ ﴿٢٦﴾ وَنَعۡمَةٖ
كَانُواْ فِيهَا فَٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَۖ وَأَوۡرَثۡنَٰهَا قَوۡمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا
بَكَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَا كَانُواْ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَقَدۡ
نَجَّيۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرۡعَوۡنَۚ إِنَّهُۥ
كَانَ عَالِيٗا مِّنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ ٱخۡتَرۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ عِلۡمٍ عَلَى
ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٢﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُم مِّنَ ٱلۡأٓيَٰتِ مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٞاْ مُّبِينٌ ﴿٣٣﴾
إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ ﴿٣٤﴾ إِنۡ هِيَ إِلَّا مَوۡتَتُنَا ٱلۡأُولَىٰ وَمَا نَحۡنُ
بِمُنشَرِينَ ﴿٣٥﴾ فَأۡتُواْ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣٦﴾ أَهُمۡ
خَيۡرٌ أَمۡ قَوۡمُ تُبَّعٖ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ
مُجۡرِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾
مَا خَلَقۡنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٩﴾



﴿١٩﴾ و خۆ ل سەر خودێ مەزن نەكەن [كو هوین
ئەمرێ وی ب جهـ نەئینن]، ب ڕاستی من بۆ هەوە
بەلگە و نیشانەكا ئاشكەراكەر یا ئینایی. ﴿٢٠﴾ و من
خۆ ب خودایێ خۆ و خودایێ هەوە پاراست، كو
هوین من بكوژن. ﴿٢١﴾ و ئەگەر هوین باوەر ژ من
نەكەن [و باوەرییێ ب خودێ نەئینن]، دێ ژ من ڤەبن
[و ئەزیەتا من نەكەن، هەتا خودێ حوكمی د ناڤبەرا مە
و هەوەدا دكەت]. ﴿٢٢﴾ ڤێجا [وەختێ مووسایی دیتی
ئەو باوەرییێ نائینن، و موعجیزەییێت خودێ درەو
ددانن] دوعا ژ خودایێ خۆ [ل وان] كر [و گۆت:]
ئەڤە ڕاست ملەتەكێ گونەهكارن. ﴿٢٣﴾ [و مە وەحی
بۆ مووسایی هنارت] ب شەڤ بەندەییێت من [ئەوێت
باوەری ب تە ئینایین ژ ئسرائیلییان ژ مسرێ بۆ سەر
دەریایا سۆر] دەربێخە، ب ڕاستی ئەو دێ كەڤنە
دویڤ هەوە. ﴿٢٤﴾ [گاڤا هەوە دا دەریایێ] بستە ژ
دەریایێ دەربازبە، و تە شۆلە ژێ نەبیت بلا [دەریا]
وەكی خۆ بمینیت، ب ڕاستی دویاهیا وی لەشكەری
خەندقینە [چو پێ نەڤێت]. ﴿٢٥﴾ چەند جنیك و
باخچە و كانی وان هێلان. ﴿٢٦﴾ و چەند زەڤییێت چاندی و شوینوارێت خۆش وان هێلان. ﴿٢٧﴾ و چەند
نیعمەت وان هێلان، تێدا خۆشی دبرن. ﴿٢٨﴾ و هۆسا مە ئەو د هیلاك برن، و مە ملەتەكێ دی پشتی وان
كرە وێرسێ ملك و مالداریا وان. ﴿٢٩﴾ و ئەرد و ئەسمان بۆ وان نەگرین [پشتی مە د هیلاك برین]، و
دەرفەت ژی بۆ وان نەهاتە دان [ل خۆ بزڤرن]. ﴿٣٠﴾ و ب سویند مە ئسرائیلی ژ ئیزایا ڕسواكەر قورتالكرن.
﴿٣١﴾ ژ فیرعەونی، ب ڕاستی وی خۆ گەلەك مەزن كر، و زێدە یێ گونەهكاربوو. ﴿٣٢﴾ ب سویند مە ئەو
[ئسرائیلی] ب زانینا خۆ ب سەر خەلكێ وی دەمی ئێخستن. ﴿٣٣﴾ و مە ئەو نیشان و موعجیزە دانە وان،
ئەوێت جەڕباندن و ئمتیحانەكا ئاشكەرا تێدا. ﴿٣٤﴾ و ب ڕاستی ئەڤە (قورەیشی) دبێژن: ﴿٣٥﴾ ژ مرنا مە یا
ئێكێ پێڤەتر نینە، و ئەم [پشتی مرنێ] ساخ نابینەڤە. ﴿٣٦﴾ [و گۆتن] پا كا باب و باپیرێت مە بۆ مە بزڤرینن
[ئەگەر ڕاستە وەكی هوین دبێژن، كو پشتی مرنێ جارەكا دی ئەم دێ ساخ بینەڤە]. ﴿٣٧﴾ ئەرێ ما ئەو ب
هێزترن یان ژی ملەتێ توببەع [یێ حیمیەری، كو ئێك ژ میرێت یەمەنێ بوو]، یان ژی ئەوێت بەری وان
[وەكی عاد و (سەموود)] مە د هیلاك برن، ب ڕاستی ئەو یێت گونەهكاربوون. ﴿٣٨﴾ و ب ڕاستی مە ئەرد
و ئەسمان و تشتێ د ناڤبەرا واندا ژ قەستا چێ نەكرینە. ﴿٣٩﴾ و مە ئەرد و ئەسمان بۆ هەقییێ یێت دایین
[دا هەقی بێتە ئاشكەراكرن، و مرۆڤێ خراب ب خرابییا خۆ بێتە جزاكرن، و یێ باش ب باشییا خۆ بێتە
خەلاتكرن]، بەلێ باراپتر ژ وان ڤێ نوزانن.

إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ مِيقَـٰتُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٠﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِى
مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُ
إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٢﴾ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾
طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾
كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ
ٱلْجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ
ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴿٤٩﴾
إِنَّ هَـٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ
فِى مَقَامٍ أَمِينٍ ﴿٥١﴾ فِى جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٢﴾ يَلْبَسُونَ
مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَـٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾ كَذَٰلِكَ
وَزَوَّجْنَـٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٥٤﴾ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ
فَـٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا
ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضْلًا مِّن
رَّبِّكَ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٥٧﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَـٰهُ بِلِسَانِكَ
لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ فَٱرْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ ﴿٥٩﴾



﴿٤٠﴾ [بێ گۆمان ئەو ڕۆژا ئەو تێدا دودل] ڕۆژا جوداکرنا قەنجییێ و خرابییێ، ڕۆژا کۆمبوونا وان هەمییانە. ﴿٤١﴾ ڕۆژا چو دۆست و کەس و کار نەشێن چو ئێزایێ ژ دۆست و کەس و کارێت خۆ بدەنە پاش، و هاریکاریا وان ژی نائێتەکرن. ﴿٤٢﴾ ئەو نەبیت یێ خودێ دلۆڤانییێ پێ ببەت [کو خودان باوەرن، ب دەستویریا خودێ دێ مەهدەرێ بۆ ئێك و دو کەن]، ب ڕاستی خودێ سەردەست و دلۆڤانە. ﴿٤٣﴾ ب ڕاستی دارا زەقوومێ. ﴿٤٤﴾ زاد و خوارنا زێدە گونەهکارانە [ئانکو گاوران]. ﴿٤٥﴾ وەکی سفرێ حەلیایی د زکێ واندا دکەلیت. ﴿٤٦﴾ وەکی کەلا ئاڤا شاریایی. ﴿٤٧﴾ [خودێ دێ بێژتە ملیاکەتان:] بگرن و ڕاکێشنە نیڤا دۆژەهێ. ﴿٤٨﴾ پاشی ئاڤا زێدە کەل داڕێژنە سەر سەرێ وی. ﴿٤٩﴾ [ملیاکەت دێ بێژنێ:] دێ تامکێ، تە خۆ دەستهەلاتدار و خودان ڕێز و ڕویمەت ددانا. ﴿٥٠﴾ ئەڤە ئەو ئێزایە ئەوا هەوە جڕەبڕ ل سەر دکر [و باوەری پێ نەدئینا]. ﴿٥١﴾ ب ڕاستی پارێزکار و مرۆڤێت خودێ یێت د جهەکێ ئێمندا. ﴿٥٢﴾ د ناڤ باغ و کانیاندانە. ﴿٥٣﴾ و جلکێت ئارمویشێ تەنك و یێ ستویر دکەنە بەر خۆ، و بەرانبەری ئێك و دونە. ﴿٥٤﴾ ئەها بەحەشتی د هۆسانە، و مە پەریێت چاڤگر یێت کرینە هەڤسەرێت وان. ﴿٥٥﴾ بێ ترس [کو تشتەك ل وان بێت] ئەو هەمی ڕەنگێت فێقییان د بەحەشتێدا دخوازن [و دخۆن]. ﴿٥٦﴾ ژ بلی مرنا خۆ یا ئێکێ [کو مرنا دنیاییێیە]، مرنێ نابینن و [خودێ] ئەو ژ ئێزایا دۆژەهێ پاراستن. ﴿٥٧﴾ ئەڤە کەرەمەکە ژ خودایێ تە [داییییە وان]، نێ ئەڤەیە سەرفەرازییا مەزن. ﴿٥٨﴾ بێ گۆمان مە ئەڤ قورئانە ب ئەزمانێ تە بۆ وان ب ساناهی کر، دا پێڤە بچن و ل خۆ بزڤڕن. ﴿٥٩﴾ ڤێجا [هەی موحەمەد] خۆ بگرە [و چاڤێ تە لێ بیت، دێ چ ئێتە سەرێ وان]، ب ڕاستی ئەو ژی یێ ل هیڤییێ [کا دێ چ ئێتە سەرێ تە].

سُورَةُ الجَاثِيَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٣﴾ وَفِي خَلۡقِكُمۡ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٞ لِّقَوۡمٖ
يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزۡقٖ
فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا وَتَصۡرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ءَايَٰتٞ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٥﴾
تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۖ فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعۡدَ ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ
يُؤۡمِنُونَ ﴿٦﴾ وَيۡلٞ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ ﴿٧﴾ يَسۡمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ثُمَّ
يُصِرُّ مُسۡتَكۡبِرٗا كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَاۖ فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٨﴾ وَإِذَا عَلِمَ مِنۡ ءَايَٰتِنَا
شَيۡـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٩﴾ مِّن وَرَآئِهِمۡ جَهَنَّمُۖ
وَلَا يُغۡنِي عَنۡهُم مَّا كَسَبُواْ شَيۡـٔٗا وَلَا مَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡلِيَآءَۖ وَلَهُمۡ
عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠﴾ هَٰذَا هُدٗىۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ عَذَابٞ مِّن
رِّجۡزٍ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ ۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡبَحۡرَ لِتَجۡرِيَ ٱلۡفُلۡكُ فِيهِ بِأَمۡرِهِۦ
وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٥٠



## سۆرەتا جاثیە

### ل مەكەهێ هاتیـە خوارێ (٣٧) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هۆسا دئێتە خواندن (حا، میم)، ل دۆر راڤەكرنا ڤان رەنگە تیپان، ل دەستپێكا سۆرەتا بەقەرە بزڤرە. ﴿٢﴾ ئینانەخوارا قورئانێ ژ خودایێ سەردەست و كاربنەجهە. ﴿٣﴾ ب راستی د ئەرد و ئەسمانانـدا [د وان ب خۆدا، یان د چێكرنا واندا] گەلەك نیشان و بەلگە یێت هەین [ل سەر دەستهەلاتداری و ئێكینیا خودێ] بۆ خودان باوەران. ﴿٤﴾ و چێكرنا هەوە و هەمی رەنگێت جانەوەرێت د ئەردیدا بەلاڤ، نیشان و بەلگەنە بۆ وان ئەوێت هەقیێ پەسەند دكەن و دگرن. ﴿٥﴾ و هاتن و چۆنا شەڤ و رۆژان، و رێژی و بارانێت خودێ ژ ئەسمانی دادرێژیت، و ئەردی پشتی مرنا وی پێ ساخ دكەت، و ئینان و برنا بای، نیشانن [ل سەر هەبوین و دەستهەلاتداریا خودێ] بۆ وان ئەوێت تێ دگەهن. ﴿٦﴾ ئەڤە نیشان و بەلگەیێت خودێنە ئەم بۆ تە ب رێكا وەحیێ دخوینین، ڤێجا ئەگەر ئەو (خەلكێ مەكەهێ) باوەر ژ كەلامێ خودێ نەكەن، و باوەریێ ب بەلگە و نیشانێت وی نەئینن، ئەرێ پا ئەو دێ باوەریێ ب كیش ئاخڤتنێ ئینن؟ ﴿٧﴾ ئیزا و نەخۆشی بۆ هەر زێدە درەوینەكێ زێدە گونەهكار بیت. ﴿٨﴾ [ئەوێ] گولێ دبیت ئایەتێت خودێ (ئانكو قورئان) بۆ دئێنە خواندن، پاشی هەر ل سەر گاوریا خۆ دمینیت و خۆ ژ باوەری ئینانێ مەزنتر دبینیت، هەچكو نەبهیستین، ڤێجا ئەڤێ هۆسا مزگینیا ئیزایەكا دژوار بدەیێ. ﴿٩﴾ و ئەگەر تشتەك ژ ئایەتێت مە [ئەوێت مە بۆ پێغەمبەری ئینایینە خوارێ] زانی، بۆ خۆ دكەنە پێترانك، ئەڤێت هۆسا ئیزایەكا رسواكەر بۆ وان یا هەی. ﴿١٠﴾ دۆژەه یا ل پێشیا وان، و نە ئەوا وان ب دەست خۆڤە ئینایی [ژ مال و مالداریێ] فایدەی وان دكەت، و نە ئەوێت وان شوینا خودێ بۆ خۆ كرینە سەمیان و پشتەڤان [ژ بوتان] فایدەی وان دكەن، و ئیزایەكا گران بۆ وان یا هەی. ﴿١١﴾ ئەڤە (ئەڤ قورئانە) راستەرێیە، و ئەوێت باوەری ب ئایەتێت خودایێ خۆ نەئینایین، ئیزایەكا ژ هەمی ئیزایان دژوارتر بۆ وانە. ﴿١٢﴾ خودێیە دەریا بۆ هەوە سەرنەرم كری، دا گەمی ب دەستویریا وی تێدا بچن و بێن، و دا هوین ژ كەرەما وی بازرگانیێ تێدا بكەن، و دا هوین سوپاسیا وی بكەن. ﴿١٣﴾ و هندی د ئەرد و ئەسمانانـدا هەی خودێ ژ نك خۆ بۆ خێرا هەوە یێت دایین، ب راستی ئەڤە [چێكرنا ئەرد و ئەسمانان هۆسا] نیشان و بەلگەنە بۆ وان ئەوێت هزرا خۆ تێدا دكەن.

قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجْزِىَ
قَوْمًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ
وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۖ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١٥﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا
بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ
وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ ۖ
فَمَا ٱخْتَلَفُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ رَبَّكَ
يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٧﴾
ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ
أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا۟ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ
شَيْـًٔا ۚ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۖ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩﴾
هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٢٠﴾
أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ
مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ
وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾





﴿١٤﴾ بێژە وان ئەوێت باوەری ئینایین: بلا ل وان نەگرن ئەوێت نە ل هیڤیيا وان ڕۆژێت خودێ ب سەرێ ملەتێت بۆری ئینایین، دا خودێ [ڕۆژا قیامەتێ] خەلاتێ وان [ئەوێت ل گاوران نەگرتین، و بێهنا خۆ ل سەر ئەزیەتا وان فرەهـ کرین] بدەتە وان، ژ بەر وان کار و کریارێت [باش ئەوێت] وان [د دنیایێدا] کرین. ﴿١٥﴾ هەر کەسێ باشییێ بکەت بۆ خۆ دکەت، و هەر کەسێ خرابییێ بکەت ل خۆ دکەت، پاشی دێ هوین هەمی ب بال خودایێ خۆڤە زڤڕن. ﴿١٦﴾ ب سویند مە تەورات و حوکم [تێگەهشتن و شارەزاییا دادوەرییێ] و پێغەمبەراتی دا ئسرائیلیيان، و تشتێ پاقژ مە ب ڕزقێ وان کر، و مە ب سەر خەلکی [وی دەمی] ئێخستن. ﴿١٧﴾ و مە نیشان و بەلگەیێت ڕۆن و ئاشکەرا د دەرهەقێ پێغەمبەراتییێ و دینیدا دانە وان، و هنگی جودایی و ژێکڤەبوون کەڤتە د ناڤبەرا واندا، پشتی زانین و نیشانێت ئاشکەرا ژ پێغەمبەرێت وان بۆ وان هاتین، ئەڤە ژی ژ بەر زکرەشیيا وان. ب ڕاستی خودایێ تە ڕۆژا قیامەتێ دێ حوکمی د ناڤبەرا واندا کەت، ل سەر وی تشتێ ئەو ل سەر نەبوویینە ئێك و ژێك جودا. ﴿١٨﴾ پاشی مە تو ل سەر ڕێك و بەرنامەیەکێ ئاشکەرا دانایی [کو تە بگەهینتە هەقییێ]، ڤێجا وێ ڕێکێ بگرە، و ب دویڤ دلخوازیيا نەزانان نەکەڤە. ﴿١٩﴾ ب ڕاستی ئەو [نەزان] قەت چو ئیزایا خودێ ژ تە نادەنە پاش [ئەگەر تو ل دویڤ وان بچی]، و ب ڕاستی ستەمکار دۆست و پشتەڤانێت ئێك و دونە و خودێ هاریکار و سەمیانێ پارێزکارانە. ﴿٢٠﴾ ئەڤ قورئانە بۆ مرۆڤان ڕۆناهیيا دلانە [هەقییێ پێ دبینن]، و ڕێکا هیدایەتێیە و دلۆڤانییە بۆ وان ئەوێت خودان ئێقین [د ڕاستا ڕۆژا قیامەتێدا ئانکو باوەرییەکا موکم پێ هەی]. ﴿٢١﴾ ئەرێ ئەوێت گونەهـ و خرابی کرین، هزر دکەن ئەم دێ وان و ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت ڕاست و دورست کرین، وەکی ئێك لێ کەین، مرن و ژینا وان دێ وەکی ئێك بیت؟ چ پیسە حوکمە ئەو دکەن. ﴿٢٢﴾ و خودێ ئەرد و ئەسمان بۆ هەقییێ یێت داین [ژ خۆ نەداینە]، و دا هەر ئێك ل سەر کار و کریارێت خۆ بێتە جزاکرن، و ستەم ل کەسێ نەئێتە کرن.

أَفَرَءَيۡتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلۡمٖ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمۡعِهِۦ
وَقَلۡبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةٗ فَمَن يَهۡدِيهِ مِنۢ بَعۡدِ ٱللَّهِۚ أَفَلَا
تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ وَقَالُواْ مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا نَمُوتُ وَنَحۡيَا وَمَا يُهۡلِكُنَآ
إِلَّا ٱلدَّهۡرُۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتۡلَىٰ
عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٖ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱئۡتُواْ بِـَٔابَآئِنَآ إِن
كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُحۡيِيكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يَجۡمَعُكُمۡ إِلَىٰ
يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلِلَّهِ مُلۡكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوۡمَئِذٖ يَخۡسَرُ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿٢٧﴾
وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٖ جَاثِيَةٗۚ كُلُّ أُمَّةٖ تُدۡعَىٰٓ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ
تَعۡمَلُونَ ﴿٢٨﴾ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيۡكُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ
مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
فَيُدۡخِلُهُمۡ رَبُّهُمۡ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٣٠﴾ وَأَمَّا
ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَفَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ وَكُنتُمۡ قَوۡمٗا
مُّجۡرِمِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيۡبَ فِيهَا
قُلۡتُم مَّا نَدۡرِي مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنّٗا وَمَا نَحۡنُ بِمُسۡتَيۡقِنِينَ ﴿٣٢﴾





﴿٢٣﴾ ئەرێ تە ئەو دیت ئەوێ خۆشی و دلخوازیا
خۆ کرییە پەرستی بۆ خۆ، و خودێ ژ بەر هندێ
گومڕا و ڕێبەرزە کری، هەرچەندە هەقی ژی دزانی
[بەلێ ڕێکا هەقییێ نەدگرت، ژ بەر هندێ هێژایی
گومڕایی و بەرزەبوونێ بوو، نە هێژایی ڕاستەڕێکرنێ
بوو]، و خودێ دل و گوهێت وی مۆرکرن، و پەردە
ئێخستنە بەر چاڤێت وی، ئەرێ [ئەگەر خودێ
وی ڕاستەڕێ نەکەت] کی هەیە پشتی خودێ وی
ڕاستەڕێ بکەت؟ ڤێجا ما هوین چامەیەکێ بۆ خۆ
ناگرن. ﴿٢٤﴾ و [موشرکان] گۆتن: ژ ژیانا مە یا
دنیایێ پێڤەتر چو ژیانێت دی نینن، هندەك ژ مە دێ
مرن و هندەك دێ بن [و چو قیامەت نینن، ژین و مرن
ئەوە یا د دنیایێدا]، و چو مە نامرینیت ژ بۆرینا زەمانی
پێڤەتر، و وان چو بەلگە و نیشان ب ڤێ چەندێ نینن،
هەما ژ نك خۆ دبێژن. ﴿٢٥﴾ و وەختێ ئایەتێت مە
بێت ڕۆن و ئاشکەرا [ل سەر قیامەتێ و ڕابوونا پشتی
مرنێ] بۆ وان دهاتنە خواندن، وان چو هەجەت و
دەلیل نەبوون [هەقییێ پێ بدەنە پاش] ژ وێ چەندێ
پێڤەتر کو بێژن: ئەگەر هوین ڕاست دبێژن باب و باپیرێت مە بێت مری بۆ مە ساخ بکەن، دا شادەییێ
بۆ هەوە بدەن. ﴿٢٦﴾ بێژە: خودێ هەوە ددەت، پاشی هەوە دمرینیت، پاشی هەوە هەمیان ڕۆژا قیامەتێ
کو چو گۆمان تێدا نینە دێ کۆم کەت، بەلێ باراپتر ژ خەلکی ڤێ نوزانن. ﴿٢٧﴾ خودانی و سەروەریا
ئەرد و ئەسمانان یا خودێیە، و ڕۆژا قیامەت ڕادبیت، وێ ڕۆژێ خرابکار و گاور دێ خوسارەت بن.
﴿٢٨﴾ و [وێ ڕۆژێ] دێ بینی هەر ملەتەك [ئانکو خەلکێ هەر دینەکی ژ ترسا حسابێ] یێت کەڤتینە سەر
چۆکێت خۆ، و هەر ملەتەك بۆ وەرگرتنا کتێبا کار و کریارێت خۆ دێ ئێتە داخوازکرن، ئەڤرۆ هوین دێ ب
وان کار و کریارێت هەوە کرین، ئێنە جزاکرن یان خەلاتکرن. ﴿٢٩﴾ ئەڤە کتێبا مەیە [کتێبا کاروکریارێت
هەوەیە] شادەیییێ ب ڕاستی ل سەر هەوە ددەت، ب ڕاستی هندی هەوە دکر مە دنڤیسی. ﴿٣٠﴾ و هندی
ئەون ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت ڕاست و دورست کرین خودایێ وان دێ وان بەتە د ناڤ
دلۆڤانییا خۆدا [ئانکو د بەحەشتێدا] نێ هەر ئەڤەیە سەرفەرازییا دیار و ئاشکرا. ﴿٣١﴾ و هندی ئەون ئەوێت
گاوربوویین [خودێ دێ بێژیتە وان:] ئەرێ ما ئایەتێت من [ب ڕێکا پێغەمبەران] بۆ هەوە نەدهاتنە خواندن؟
بەلێ هەوە خۆ مەزن کر [و هەوە باوەر ژێ نەکر، و هەوە پشتا خۆ دایێ]، و هوین ملەتەکێ گونەهکاربوون.
﴿٣٢﴾ و هەر وەختێ هاتبایە گۆتن، پەیمانا خودێ [د ڕاستا ساخکرنا پشتی مرنێ و حسابێدا] ڕاستە، و ڕۆژا
قیامەتێ هەر دێ ئێت و شك تێدا نینە، هەوە دگۆت: ئەم نوزانین قیامەت چییە؟ بەلێ ل دەڤ مە خیال و
خولیانە، و ئەم ژێ د پشتڕاست نینین.

وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٣﴾
وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ
وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٤﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ ٱتَّخَذْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا
وَغَرَّتْكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٣٥﴾
فَلِلَّهِ ٱلْحَمْدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٦﴾
وَلَهُ ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٧﴾

سُورَةُ الأَحْقَافِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الجزء ٢٦ الحزب ٥١

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ مَا خَلَقْنَا
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ وَٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ عَمَّآ أُنذِرُوا۟ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن
دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى
ٱلسَّمَٰوَٰتِ ۖ ٱئْتُونِى بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ﴿٤﴾ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن
لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ﴿٥﴾



﴿٣٣﴾ [وێ ڕۆژێ، ڕۆژا قیامەتێ] خرابییا کار و کریارێت وان کرین بۆ وان دیاربوو، و ئەو ئیزایا وان ترانە پێ دکرن، دۆرماندۆرێت وان گرتن. ﴿٣٤﴾ و [وێ ڕۆژێ] دێ بێژنە وان: ئەڤرۆ ئەم دێ هەوە [برسی و تێنی] هێلینە د ئاگریدا، هەروەکی هەوە کار بۆ ڤێ ڕۆژێ نەکری و هێلایی، و دیتنا ڤێ ڕۆژێ ژ بیرا خۆ بری، و جهێ هەوە ئاگرە و چو هاریکار و پشتەڤان ژی هەوە نابن. ﴿٣٥﴾ ئەڤە جزایێ وێیە، هەوە ئایەتێت خودێ کربوونە پێترانك، و ژیانا دنیایێ هوین سەردابرن و خاپاندن، و ئەڤرۆ نە ئەو ژێ دەردکەڤن و نە دەستویری بۆ وان دئێتەدان عوزرێ بخوازن، و ژ وان نائێتە خواستن ژی ئەو خرابییا خۆ بهێلن، و ژ نوی خودایێ خۆ ب گۆتنەکێ یان ب کریارەکێ ڕازی بکەن [چونکی ڕۆژا قیامەتێ نە ڕۆژا کارییە، بەلێ ڕۆژا جزاکرن و خەلاتکرنییە]. ﴿٣٦﴾ ڤێجا پەسن و شوکور هەمی بۆ خودایێ [هەر حەفت] ئەسمانان و خودانێ ئەردی، خودانێ هەمی جیهانان. ﴿٣٧﴾ و مەزناتی د ئەرد و ئەسماناندا یا وییە، و ئەوە سەردەست و کاربنەجه.

## سۆرەتا ئەحقاف

### ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٣٥) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هۆسا دئێتە خواندن (حا، میم)، و ل دۆر ڕاڤەکرنا ڤان ڕەنگە تیپان، ل دەستپێکا سۆرەتا بەقەرە بزڤرە.
﴿٢﴾ ئینانەخوارا ڤێ کتێبێ ژ دەڤ خودایێ سەردەست و کاربنەجهە. ﴿٣﴾ و مە ئەرد و ئەسمان و هندی د ناڤبەرا واندا بۆ هەقییێ، و هەتا دەمەکێ دەستنیشانکری، یێت داین، و ئەوێت گاوربوویین ڕوییێ خۆ ژ وێ وەردگێرن، ئەوا ژێ هاتینە ترساندن [کو ڕۆژا قیامەتییە]. ﴿٤﴾ بێژە: کا بۆ من بێژن ئەوێت هوین شوینا خودێ دپەرێسن کا چ ژ ئەردی داینە؟ یان ژی وان پشکدارییەك د چێکرنا ئەسماناندا هەیە؟ کا کتێبەکێ کو بەری قورئانێ هاتبیت، یان پاشماییەکێ ژ زانینا ملەتێت کەڤن بۆ من بینن [شادەیییێ بۆ هەوە بدەن، هوین د پەرستنا ڤان بوتاندا دورستن]، ئەگەر هوین ڕاست دبێژن. ﴿٥﴾ و ما کی ژ وی گومڕاترە، ئەوێ وی پەرستی شوینا خودێ دپەرێسیت، ئەوێ هەتا ڕۆژا قیامەتێ گول وان نەبیت و بەرسڤا وان نەدەت، و ئەو ب خۆ ژی ژ پەرستن و دوعایێت وان د بێ ئاگەهن.

وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ٦ وَإِذَا
تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا
سِحْرٌ مُّبِينٌ ٧ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ
لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ ۖ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا بَيْنِى
وَبَيْنَكُمْ ۖ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٨ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ
وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠
إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ٩ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ
وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ
إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٠ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ ۚ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا۟ بِهِۦ
فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ١١ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ
إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ
ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ١٢ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا
ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ١٣
أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ١٤



﴿٦﴾ و وەختێ مرۆڤ [ڕۆژا قیامەتێ] دئێنە کۆمکرن،
ئەو (بوتێت وان) دێ بنە دژمنێت وان، و دێ حاشاتیێ
ژ پەرستنا وان کەن [و دێ بەرائەتا خۆ ژ وان کەن].
﴿٧﴾ و وەختێ ئایەتێت مە یێت ئاشکەراکەر بۆ وان
دهاتنە خواندن، ئەوێت گاوربوویین، د ڕاستا قورئانێدا
پشتی بۆ وان هاتی، گۆتن: ئەڤە سحرەکا ئاشکەرایە.
﴿٨﴾ یان ژی دبێژن [موحەمەدی ئەڤ قورئانە] ژ
نك خۆ یا چێکری، بێژە: ئەگەر من ژ نك خۆ چێ
کربیت، هەوە پێ چێنابیت چو ئیزایێ ژ ئیزایا خودێ
ژ من بدەنە پاش، و خودێ ئەڤا هوین د دەرهەقێ
قورئانێدا دبێژن چێتر دزانیت [بێژە:] خودێ بەسە د
ناڤبەرا من و هەوەدا شاهد بیت [ل سەر پێغەمبەراتیا
من]، و ئەوە گونەهـ ژێبەر و دلۆڤان. ﴿٩﴾ بێژە: ئەز
نەپێغەمبەرێ ئێکێمە هاتیمە هنارتن [و بەری من چو
پێغەمبەر نەهاتبنە هنارتن و کتێب بۆ وان نەهاتبن،
بەری من گەلەك پێغەمبەرێت هاتین، و خودێ کتێب
یێت بۆ وان هنارتین، ڤێجا چاوا کتێبا ئەز پێ هاتیم
هوین درەو ددانن؟!]، و ئەز ژ دەڤ خۆ نوزانم کا
خودێ دێ چ ل من و چ ل هەوە کەت [ئەگەر وەحی بۆ من نەئێت]، ژ وەحیا بۆ من دئێت پێڤەتر ئەز ل
دویڤ چو یێ دی ناچم [و یا ل سەر من ئەوە ئەز هەوە بترسینم]، و ئەز ژ ئاگەهدارکەر و پێغەمبەرەکێ
ئاشکرا پێڤەتر نینم. ﴿١٠﴾ کا بێژنە من [حالێ هەوە دێ چ بیت] ئەگەر ئەڤ قورئانە [ئەڤا بۆ من هاتی] ژ
دەڤ خودێ بیت، و هوین باوەرییێ پێ نەئینن و شاهدەك [زانا] ژ ئسرائیلیان شادەییێ ل سەر ڕاستیا
وێ بدەت و باوەرییێ پێ بینیت، و هوین خۆ مەزن بکەن و باوەرییێ پێ نەئینن، ب ڕاستی خودێ ملەتێ
ستەمکار ڕاستەڕێ ناکەت. ﴿١١﴾ و ئەوێت گاوربوویین گۆتە ئەوێت باوەری ئینایین: ئەگەر [ئەڤ دینێ
هەوە و بەلنگازان، باوەری پێ ئینایی کو ئیسلامە] باشی بایە [ڤان بەلنگازان] بەری مە باوەری پێ نەدئینا،
و پشتی وان باوەری پێ نەئینایی، گۆتن: ئەڤە درەوەکا کەڤنە [موحەمەدی ژ ملەتێت کەڤن یا وەرگرتی و ب
بال خودێڤە لێ ددەت]. ﴿١٢﴾ و بەری قورئانێ تەورات پێشی و دلۆڤانی بوو، و ئەڤ قورئانە ڕاستدەرئێخا
کتێبێت بەری خۆیە و ب ئەزمانێ عەرەبییە، دا ئەوێت ستەم کرین بترسینیت و ئاگەهدار بکەت، و مزگینییە
بۆ قەنجیکاران. ﴿١٣﴾ ب ڕاستی ئەوێت گۆتین خودانێ مە خودێیە، پاشی ل سەر ئێکینیا خودێ و ئیسلامێ
مایین، ڤێجا [ڕۆژا قیامەتێ] نە ترس بۆ وان هەیە، و نە ب خەم دکەڤن. ﴿١٤﴾ ئەڤە بەحەشتینە هەروهەر دێ
د بەحەشتێدا مینن، ئەڤە خەلاتە بۆ وان ژ بەر کارێ وان دکر.

وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ إِحۡسَٰنًاۖ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ كُرۡهٗا وَوَضَعَتۡهُ
كُرۡهٗاۖ وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهۡرًاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ
أَرۡبَعِينَ سَنَةٗ قَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ
عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ وَأَصۡلِحۡ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓۖ
إِنِّي تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ
عَنۡهُمۡ أَحۡسَنَ مَا عَمِلُواْ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمۡ فِيٓ أَصۡحَٰبِ
ٱلۡجَنَّةِۖ وَعۡدَ ٱلصِّدۡقِ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِي قَالَ
لِوَٰلِدَيۡهِ أُفّٖ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِيٓ أَنۡ أُخۡرَجَ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلۡقُرُونُ مِن
قَبۡلِي وَهُمَا يَسۡتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيۡلَكَ ءَامِنۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ فَيَقُولُ
مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ
فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ
خَٰسِرِينَ ﴿١٨﴾ وَلِكُلّٖ دَرَجَٰتٞ مِّمَّا عَمِلُواْۖ وَلِيُوَفِّيَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَهُمۡ لَا
يُظۡلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي
حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا فَٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا
كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَفۡسُقُونَ ﴿٢٠﴾





﴿١٥﴾ و مە ئەمریٚ مرۆڤی یێ کری، قەنجی و باشییێ د گەل دەیبابێت خۆ بکەت، دەیکا وی ئەو ب نەخۆشی و زەحمەت [د زکیٚ خۆدا] یێ هەلگرتی، و ب زەحمەت و نەخۆشی یێ بووی، و هەلگرتنا وی هەتا شیرڤەکرنا وی سیهـ هەیڤن [ڤی وەختی هەمییێ دەیك زەحمەتیٚ پێڤە دبەت و نەخۆشیان ل سەر دبینیت]، گاڤا دگەهیتە کاملانا خۆ و دبیتە چل سالی، دبێژیت: خودێوۆ دەستیٚ من بگرە و هاریکارییا من بکە ئەز سوپاسییا تە بکەم ل سەر وان کەرەمێت تە د گەل من و دەیبابێت من کرین، و دەستیٚ من بگرە و هاریکارییا من بکە ئەز ویٚ باشییێ بکەم یا تو پیٚ رازی، و دویندەها من بکە دویندەهەکا باش، و من بەریٚ خۆ دا تە و ئەز ل بەر ئەمریٚ تە یێ راوەستایمە. ﴿١٦﴾ ئەڤەنە، ئەو کار و کریارێت وان یێت باش قەبویل دکەین و ل گونەهێت وان دبۆرین، و ئەڤەنە د گەل خەلکێ بەحەشتیٚ د بەحەشتێدا، ئەڤە ئەو وەعد و پەیمانا راستە ئەوا د دنیایێدا سۆز بۆ وان پیٚ دهاتە دان. ﴿١٧﴾ و ئەو کوریٚ دبێژیتە دەیبابێت خۆ ئۆف بۆ هەوە [ئەز ژ هەوە یێ تێرم]، ئەریٚ هوین من ب هندیٚ دترسینن، ئەز [پشتی مرنیٚ ژ گۆری] دیٚ ساخ بمەڤە، و بەری من ئەڤە چەند ملەت و چەرخ چۆن [و کەس ژ وان نەزڤریڤە]، و ئەو دەیباب هەوارا خۆ دگەهیننە خودیٚ و دبێژنە کوریٚ خۆ: ئەها بۆ تە! بەریٚ تە یێ ل هیلاکێ، باوەرییێ بینە، ب راستی پەیمانا خودیٚ یا راستە [و هەر دیٚ ئێت]، ڤێجا [کوریٚ وان] دیٚ بێژیت: ئەڤە [رابوونا پشتی مرنیٚ] ژ چیرۆك و چیڤانۆکێت پێشیيان پێڤەتر نینە [هوین من پیٚ دترسینن]. ﴿١٨﴾ ئەڤە ژی [خودانێت ڤان سالۆخەتان و کورێت هۆسا و خودانێت ڤان ئاخفتنان] وەکی ملەتێت بەری خۆ ژ ئەجنە و مرۆڤان، هێژایی ئیزایا خودیٚ بوون و یێت خوسارەت هەر ئەو بوون. ﴿١٩﴾ و هەر ئێك ژ ڤان [چ خودان باوەر، چ گاور] ل دویڤ کار و کریارێت خۆ پێك و پایە و پەیسکێت خۆ [ژ جزاکرن و خەلاتکرنیٚ] یێت هەین، دا خودیٚ ل دویڤ وان پێك و پایە و پەیسکان جزاییٚ کار و کریارێت وان دورست بدەتە وان، بێی ستەم ل وان بێتەکرن [نە خێرێت وان کێم دبن، و نە گونەهێت وان پتر لیٚ دئێن]. ﴿٢٠﴾ و رۆژا ئەوێت گاوربوویین پێشبەری ئاگری دئێنە راوەستاندن [و ئاگری ب چاڤێت خۆ دبینن، ملیاکەت دیٚ بێژنە وان:] هەوە خۆشییێت خۆ هەمی د ژیانا دنیایێدا برن و هەوە کەیف پیٚ کر، ڤێجا ئەڤرۆ ژ بەر مەزناتییا ژ نەهەقی هەوە د ئەردیدا دکر، و ژ بەر دەرکەڤتنا هەوە ژ رێکا خودیٚ، هوین دیٚ [ئەڤرۆ] ب ئیزایا رسوایی و سەرشۆرییێ ئێنە جزاکرن.

۞وَٱذۡكُرۡ أَخَا عَادٍ إِذۡ أَنذَرَ قَوۡمَهُۥ بِٱلۡأَحۡقَافِ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ
مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦٓ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ
عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿٢١﴾ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَأۡفِكَنَا عَنۡ ءَالِهَتِنَا فَأۡتِنَا
بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٢﴾ قَالَ إِنَّمَا ٱلۡعِلۡمُ عِندَ ٱللَّهِ
وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ﴿٢٣﴾ فَلَمَّا
رَأَوۡهُ عَارِضٗا مُّسۡتَقۡبِلَ أَوۡدِيَتِهِمۡ قَالُواْ هَٰذَا عَارِضٞ مُّمۡطِرُنَاۚ
بَلۡ هُوَ مَا ٱسۡتَعۡجَلۡتُم بِهِۦۖ رِيحٞ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٤﴾ تُدَمِّرُ كُلَّ
شَيۡءِۭ بِأَمۡرِ رَبِّهَا فَأَصۡبَحُواْ لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمۡۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي
ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدۡ مَكَّنَّٰهُمۡ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمۡ فِيهِ
وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ سَمۡعٗا وَأَبۡصَٰرٗا وَأَفۡـِٔدَةٗ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُمۡ سَمۡعُهُمۡ
وَلَآ أَبۡصَٰرُهُمۡ وَلَآ أَفۡـِٔدَتُهُم مِّن شَيۡءٍ إِذۡ كَانُواْ يَجۡحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ
ٱللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا
مَا حَوۡلَكُم مِّنَ ٱلۡقُرَىٰ وَصَرَّفۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٢٧﴾
فَلَوۡلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرۡبَانًا ءَالِهَةَۢۖ
بَلۡ ضَلُّواْ عَنۡهُمۡۚ وَذَٰلِكَ إِفۡكُهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿٢٨﴾





﴿٢١﴾ [هەی موحەمەد سەرهاتیيا] پێغەمبەرێ عاد
[هوود پێغەمبەر] بۆ [ملەتێ خۆ] بێژە وەختێ ملەتێ
خۆ ل ئەردێ ئەحقافێ ژ ئیزایا خودێ ترساندین، و
پێغەمبەرێت بەری هوودی و پشتی وی ژی [هەمیان
دگۆتن:] ژ غەیری خودێ کەسێ نەپەرێسن، ب ڕاستی
[ئەگەر هوین غەیری وی بپەرێسن] ئەز دترسم ئیزایا
ڕۆژەکا مەزن هەوە بهنگێڤیت. ﴿٢٢﴾ گۆتن: ئەرێ تو
بۆ مە هاتی دا مە ب درەوان ژ [پەرستنا] پەرستییێت
مە بدەیە پاش؟ کا وێ ئیزایا تو مە پێ دترسینی و
گەفێ پێ ل مە دکەی، بۆ مە بینە ئەگەر تو ڕاست
دبێژی. ﴿٢٣﴾ گۆت: ب ڕاستی بەس خودێ دزانیت
[کا ئەو ئیزا کەنگی دێ ئێت]، و ئەڤە من ئەو گەهاندە
هەوە یا ئەز پێ هاتیمە هنارتن، بەلێ ئەز دبینم هوین
ملەتەکێ نەزانن. ﴿٢٤﴾ ڤێجا وەختێ عەورەك دیتین
یێ بەر ب نهالێت وانڤە دئێت [کەیفا وان هات]، و
گۆتن: ئەڤە عەورەکە دێ بارانێ بۆ مە ئینیت [و ئەو
دەمەك بوو خودێ باران ژ وان ڤەگرتبوون، ڤێجا
وەختێ وان ئەو عەور دیتی هزرکرن عەورێ بارانییە
و کەیفا وان پێ هات، و گۆتنە هوودی ئەڤ عەورە دێ بارانێ بۆ مە ئینیت]، [هوودی گۆتە وان:] نەخێر
[ئەڤە نەعەورێ بارانییە، وەکی هوین هزر دکەن] بەلێ ئەڤە ئەو ئیزایە یا هوین لێ ب لەز، ئەڤە بایەکە،
ئیزایەکا ب ژان و دژوار یا تێدا. ﴿٢٥﴾ [ئەو با] هەمی تشتان ب ئەمرێ خودێ وێران دکەت، ڤێجا [وەختێ
ئەو با ب سەر واندا هاتی] وەلێ هاتن ژ خانییێت خۆ پێڤەتر نەددیتن، هۆسا ئەم ملەتێ گونەهکار جزا
دکەین. ﴿٢٦﴾ ب سویند مە ئەو شیان و هێز دابوو وان یا مە نەدایییە هەوە، و مە گوهـ و چاڤ و دل [هەمی
ئالاڤێت تێگەهشتنێ] دابوونە وان، بەلێ [وەختێ ئیزایا خودێ ب سەر واندا هاتی] گوهـ و چاڤ و دلێت
وان فایدەی وان نەکرن، و چو ئیزا ژ وان نەدانە پاش، چونکی وان باوەری ب ئایەتێت خودێ نەدئینان، و ئەو
ئیزایا وان ترانە پێ دکر و لێ ب لەز دۆرماندۆرێت وان گرتن. ﴿٢٧﴾ و ب سویند مە گوندێت دۆرماندۆری
هەوە د هیلاك برن، و مە نیشان و بەلگە ژ هەمی ڕەنگان و گەلە جاران بۆ وان ئینان، دا ل خۆ بزڤڕن.
﴿٢٨﴾ بلا ئەوێت شوینا خودێ، و ب ئنیەتا نێزیکبوونێ ژ خودێ، هاتینە پەرستن هاریکاریيا وان کربانە،
نەخێر شوینا هاریکاریيا وان بکەن ل وان بەرزەبوون، ئەڤە [هاریکاری نەکرنا پەرستییێت وان، و بەرزەبوونا
وان ژ وان] جزایێ درەوا وانە وەختێ ئەو کرینە هەڤپشك بۆ خودێ.

وَإِذۡ صَرَفۡنَآ إِلَيۡكَ نَفَرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ
فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْۖ فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوۡاْ إِلَىٰ قَوۡمِهِم
مُّنذِرِينَ ٢٩ قَالُواْ يَٰقَوۡمَنَآ إِنَّا سَمِعۡنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ
بَعۡدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ
وَإِلَىٰ طَرِيقٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٣٠ يَٰقَوۡمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ
بِهِۦ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُجِرۡكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ٣١
وَمَن لَّا يُجِبۡ دَاعِيَ ٱللَّهِ فَلَيۡسَ بِمُعۡجِزٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَيۡسَ لَهُۥ
مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءُۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ٣٢ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ
أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَلَمۡ يَعۡيَ بِخَلۡقِهِنَّ
بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰۚ بَلَىٰٓۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٣٣
وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَلَيۡسَ هَٰذَا بِٱلۡحَقِّۖ قَالُواْ
بَلَىٰ وَرَبِّنَاۚ قَالَ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ٣٤
فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسۡتَعۡجِل
لَّهُمۡۚ كَأَنَّهُمۡ يَوۡمَ يَرَوۡنَ مَا يُوعَدُونَ لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةٗ
مِّن نَّهَارِۭۚ بَلَٰغٞۚ فَهَلۡ يُهۡلَكُ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٣٥



﴿٢٩﴾ و بۆ ملەتێ خۆ بێژە وەختێ مە بەرێ هندەك ئەجنەیان دایییە تە دا گول قورئانێ ببن، ڤێجا وەختێ ل سەر خواندنا قورئانێ حازر بووین، گۆتن: خۆ بێ دەنگ بکەن و گوهێ خۆ بدەنێ، و وەختێ خواندن ب دویماهیك هاتی، ڤەگەڕیان و ملەتێ خۆ ئاگەهدارکرن. ﴿٣٠﴾ گۆتن گەلی ملەتێ مە، مە گول کتێبەکێ بوو، پشتی مووسایی یا هاتییە خوارێ، ڕاستدەرئێخا کتێبێت بەری خۆیە، بەرێ خۆدانێ خۆ ددەتە دینێ ڕاست و ڕێکا ڕاست. ﴿٣١﴾ گەلی ملەتێ مە، بەرسڤا پێغەمبەرێ خودێ بدەن [کو موحەمەدە] و باوەرییێ پێ بینن، [خودێ] دێ ل گونەهێت هەوە بۆریت، و دێ هەوە ژ ئیزایەکا ب ژان و دژوار قورتال کەت. ﴿٣٢﴾ و هەر کەسێ بەرسڤا پێغەمبەرێ خودێ نەدەت [ئانکو هەر کەسێ باوەرییێ پێ نەئینیت] نەشێت خودێ نەچار بکەت، کو وی ل سەر ئەردی ئیزا نەدەت، و وی ژ بلی خودێ چو هاریکار و پشتەڤان نینن [وی ژ ئیزایا خودێ بپارێزن]، ئەڤە [ئەڤێت بێ باوەر ژ پێغەمبەرێ خودێ] یێت د ڕێبەرزەبوونەکا ئاشکەرادا. ﴿٣٣﴾ ئەرێ ما نوزانن [هزرا خۆ ناکەن] ئەو خودایێ ئەرد و ئەسمان چێ کرین، و ب چێکرنا وانڤە نەوەستیایی و بێ هێز نەبووی، دشێت مریان ژی ساخ بکەتەڤە، بەلێ ئەو دشێت مریان ساخ بکەتەڤە، ب ڕاستی ئەو ل سەر هەر تشتەکی خودان دەستهەلات و شیانە. ﴿٣٤﴾ و ئەوێت گاوربووین ڕۆژا پێشبەری ئاگری دئێنە ڕاوەستاندن [ب چاڤێت خۆ ئاگری دبینن، و بێ هیڤی دبن کو ژێ قورتال ببن]، [ملیاکەت دێ بێژنە وان:] ئەرێ ئەڤ ئیزایە نەڕاستە [هەوە دگۆت ئەم نائێینە ئیزادان، و چو دۆژەهـ نینن]، دێ بێژن: بەلێ ب خودێ ڕاستە [ملیاکەت دێ بێژنە وان:] دێ ڤێجا ژ بەر گاورییا خۆ تامکەنە ئیزای. ﴿٣٥﴾ ڤێجا [هەی موحەمەد] بێنا خۆ [ل سەر کرن و گۆتن و ئەزیەتا گاوران] فرەهـ بکە، هەروەکی پێغەمبەرێت ناڤدێر و ڕژد و مجد ل سەر فەرمانێت خودێ بێنا خۆ فرەهـ کری (پێغەمبەرێت ژێگۆتی ئەڤەنە: (نووح، ئیبراهیم، مووسا، عیسا و موحەمەد)، و ل ئیزادانا وان ب لەز نەبە، وەختێ ئەو وێ ئیزایێ دبینن یا پەیمان بۆ وان پێ هاتییە دان، د وەسانە هەچکو ژ بیستەکێ پێڤەتر ژ ڕۆژێ [د دنیایێدا] نەماینە، ئەڤ قورئانە ڕاگەهاندنەکە [پێغەمبەر دگەهینیتە هەوە] ئەرێ ما کەس هەیە د هیلاك بچیت، ژ بلی ملەتێ ژ ڕێدەرکەڤتی و ڤاڕێ؟! [بەس ئەو دێ د هیلاك چن].

## سُورَةُ مُحَمَّدٍ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ١ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٖ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡ كَفَّرَ
عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَأَصۡلَحَ بَالَهُمۡ ٢ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلۡبَٰطِلَ وَأَنَّ
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلۡحَقَّ مِن رَّبِّهِمۡۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمۡثَٰلَهُمۡ ٣
فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرۡبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثۡخَنتُمُوهُمۡ فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ فَإِمَّا
مَنَّۢا بَعۡدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ أَوۡزَارَهَاۚ ذَٰلِكَۖ وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ
مِنۡهُمۡ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٖۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ
أَعۡمَٰلَهُمۡ ٤ سَيَهۡدِيهِمۡ وَيُصۡلِحُ بَالَهُمۡ ٥ وَيُدۡخِلُهُمُ ٱلۡجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمۡ ٦
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ٧
وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَتَعۡسٗا لَّهُمۡ وَأَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ٨ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَرِهُواْ
مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ ٩ ۞أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ الحزب ٥١
كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۖ وَلِلۡكَٰفِرِينَ أَمۡثَٰلُهَا ١٠
ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ ١١



## سۆرەتا موحەممەد

**ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٣٨) ئایەتە**

**دبێژنێ سۆرەتا قیتال ژی**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ ئەوێت گاوربوویین و ڕێکا خودێ ل خەلکی
گرتین، [خودێ] کارێ وان پویچ و بەرزەکر [و ئەو
کارێ وان ڤیایی د دەرهەقێ پێغەمبەریدا بکەن، د سەرێ
وانڕا شکاند و پویچ کر]. ﴿٢﴾ و ئەوێت باوەری
ئینایین و کار و کریارێت ڕاست و دورست کرین، و
باوەری ب وێ کتێبێ ئینایین ئەوا بۆ موحەممەدی هاتی
[کو قورئانە] و ئەو ڕاستییە ژ خودایێ وان، باوەرییەکا
ڕاست و دورست و بێ گۆمان، خودێ گونەهێت
وان دێ ژێبەت و کاروبارێت وان دێ دورست کەت.
﴿٣﴾ ئەڤە چونکی ئەوێت گاوربوویین ب دویڤ
پویچییێ کەڤتن، و ئەوێت باوەری ئینایین ب دویڤ
وێ هەقییێ کەڤتن ئەوا بۆ وان ژ دەڤ خودایێ وان
هاتی، و خودێ هۆسا نموونەیان ب هەمی ڕەنگان بۆ خەلکی دئینیت و دیار دکەت [دا ل خۆ بزڤرن].
﴿٤﴾ [گەلی موسلمانان] ڤێجا ئەگەر هوین [د شەڕیدا] بەرانبەری گاوران بوون، ڤێجا ل ستۆیێ وان بدەن
[و بکوژن] هەتا هوین زێدە ژێ دکوژن، پاشی ئێخسیر بکەن و باش گرێدەن، و پاشی یان ل سەر وان
بکەنە منەت و بەردەن [بێ بەرانبەر]، یان ژی ب بەدەل و بەرانبەر بەردەن دا شەڕ نەمینیت، ئەڤە حوکمێ
خودێیە، و ئەگەر خودێ ڤیابایە دا ئەو ب خۆ وان د هیلاك بەت و تۆلێ ل وان ڤەکەت، بەلێ [ئەمرێ هەوە
کر هوین جیهادێ د گەل وان بکەن] دا هەوە ب ئێك و دو بجەرببینیت و ئەوێت د ڕێکا خودێدا هاتینە
کوشتن، خودێ کار و کریارێت وان بەرزە ناکەت. ﴿٥﴾ زوی دێ وان ڕاستەڕێ کەت، و دێ کاروبارێت
وان دورست کەت. ﴿٦﴾ و دێ وان بەتە د وێ بەحەشتێدا ئەوا بۆ وان [د دنیایێدا] سالۆخەتێت وێ گۆتین
دا بنیاسن. ﴿٧﴾ گەلی خودان باوەران، هەکە هوین هاریکارییا دینێ خودێ بکەن و ب سەربێخن، خودێ
ژی دێ هاریکارییا هەوە کەت، و هەوە ب سەر گاوران ئێخیت، و دێ هەوە [د شەڕاندا] موکوم کەت.
﴿٨﴾ و ئەوێت گاوربوویین، بەرئاتافبوون و شکەستن بۆ وان بیت، و خودێ دێ کارێ وان پویچ کەت و
ڕاست نائینیت. ﴿٩﴾ ئەڤە چونکی ئەوان تشتێ خودێ ئینایییە خوارێ [کو قورئانە]، نەڤیا، ڤێجا خودێ کار
و کریارێت وان پویچکرن. ﴿١٠﴾ ئەرێ ما ئەو د ئەردیدا نەگەڕیاینە، دا ببینن کا دویماهیا ئەوێت بەری وان
چۆیین یا چاوا بوو؟ خودێ د هیلاك برن، و گاوران ژی ئێکا وەکی ڤێ یا هەی. ﴿١١﴾ ئەڤە [هاریکرن و ب
سەرئێخستنا خودان باوەران، و پیسە دویماهیکا گاوران] ژ بەر هندێیە چونکی خودێ پشتەڤان و هاریکار و
سەرکارێ وانە ئەوێت باوەری ئینایین، و ب ڕاستی گاوران چو هاریکار و پشتەڤان نینن.

إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن
تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ
وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴿١٢﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِىَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ
ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَٰهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴿١٣﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن
رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم ﴿١٤﴾ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى
وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ
طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ۖ وَلَهُمْ
فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ۖ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ وَسُقُوا۟
مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّىٰٓ إِذَا
خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ
ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟
زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ
أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ۖ فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا ۚ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ
ذِكْرَىٰهُمْ ﴿١٨﴾ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ
وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ ﴿١٩﴾





﴿١٢﴾ ب ڕاستی ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت ڕاست و دورست کرین، خودێ دێ وان کەتە د وان بەحەشتاندا ئەوێت ڕویبار د بنڕا دئێن و دچن، و ئەوێت گاوربوویین [د دنیایێدا] خۆشیێ [ب پەرتالێ دنیایێ] دبەن [و د بێ ئاگەهن، و هزرا خۆ د دویماهیکێدا ناکەن ]، و کا چاوا تەرش دخۆن ئەو ژی وەسا دخۆن، و جهێ وان [دویماهیا وان] هەر ئاگرە. ﴿١٣﴾ و گەلەك گوند هەبوون، ژ گوندێ تە، ئەوێ تو دەرئێخستی، ب هێزتر بوون، مە د هیلاك برن و چو هاریکار و پشتەڤان ژی وان نەبوون، بۆ وان بەرەڤانییێ بکەن. ﴿١٤﴾ ئەرێ ئەوێ نیشان و بەلگەیەکا ئاشکەرا ژ نك خودایێ خۆ هەبیت، وەکی ویـیە ئەوێ کار و کریارێت وی یێت خراب بۆ هاتبنە خەملاندن، و ب دویڤ دلخوازییێت خۆ کەڤتبن. ﴿١٥﴾ پەسن و ڕەوشا وێ بەحەشتێ ئەوا پەیمان بۆ پارێزکاران پێ هاتییە دان ب ڤی ڕەنگییە، ڕویبارێت ڕەنگ و تاما ئاڤا وان نەگوهۆڕی یێت تێدا، و ڕویبارێت شیرێ تاما خۆ نەگوهۆڕی ژی.. و ڕویبارێت مەیا خۆش و ب تام، بۆ وان یێت ڤەدخۆن ژێ، و ڕویبارێت هنگڤینێ دۆبە ژی، و ژ هەمی ڕەنگێت فێقی ژی بۆ وان یێت تێدا هەین، و خودێ دێ ل گونەهێت وان ژی بۆریت [ئەرێ ئەوێ د ناڤ ڤان خۆشیاندا بژیت] وەکی ویـیە ئەوێ هەروهەر د ئاگریدا، و ژ ئاڤەکا زێدە شارِیایی ڤەدخۆت، ڤێجا ڕویڤیکێت وان پرت پرت ببن. ﴿١٦﴾ و هندەك ژ وان [ئەوێت وەکی تەرشی دخۆن و ڤەدخۆن، کو دوروینە] گوهدارییا تە دکەن، گاڤا ژ دەڤ تە دەرکەڤتن [ژ لەکەڤە] دبێژنە ئەوێت خودێ زانین دایییە وان [ژ هەڤالێت تە]، ئەڤە ڤی ڤێ گاڤێ چ دگۆت؟ ئەڤە ئەون یێت خودێ دلێ وان مۆرکری و ب دویڤ دلخوازییێت خۆ کەڤتین. ﴿١٧﴾ و ئەوێت ڕاستەڕێ بوویین خودێ پتر ڕاستەڕێ کرن، و بەرێ وان دا پارێزکاری و ترسا خۆ. ﴿١٨﴾ ئەرێ ئەو ل هیڤیا هندێنە قیامەت ژ نشکەکێڤە ب سەر واندا بێت ب سویند نیشانێت وێ قیامەتێ یێت هاتین، ڤێجا چاوا دێ تۆبەکەن ئەگەر قیامەت هات. ﴿١٩﴾ ڤێجا بزانە ژ خودێ پێڤەتر چو پەرستییێت ڕاست و دورست نینن، و داخوازا لێبۆرینێ بۆ گونەهێت خۆ و بۆ گونەهێت هەمی خودان باوەران، چ زەلام چ ژن بکە، و خودێ ئاگەهـ ژ ڕابوون و ڕوینشتن و بنەجها هەوە هەیە [ئانکو چو یێ هەوە لێ بەرزە نابیت].

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌۖ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ
مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ
يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِۖ فَأَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٠﴾
طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌۚ فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُواْ ٱللَّهَ
لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ﴿٢١﴾ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُواْ
فِي ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ
ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَٰرَهُمْ ﴿٢٣﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ
أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم
مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ
لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ لِلَّذِينَ كَرِهُواْ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ
سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ ٱلْأَمْرِۖ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ﴿٢٦﴾
فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ
وَأَدْبَٰرَهُمْ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُواْ مَآ أَسْخَطَ ٱللَّهَ
وَكَرِهُواْ رِضْوَٰنَهُۥ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٢٨﴾ أَمْ حَسِبَ
ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ ٱللَّهُ أَضْغَٰنَهُمْ ﴿٢٩﴾





﴿٢٠﴾ و ئەوێت باوەری ئینایین، [ژ ڤیانا جیهادێ]
دگۆتن: بلا سۆرەتەك هاتبایە خوارێ [ئەمرێ جیهادێ
تێدا بایە]، و ئەگەر سۆرەتەکا ئاشکەراکەر [ئەمرێ
جیهادێ تێدا ئاشکەرا] هاتەخوار و جیهاد تێدا هاتە
فەرزکرن، ئەوێت نەساخی د دلێت واندا هەی، دێ
بینی [ژ ترساندا] وەسا بەرێ خۆ ددەنە تە، وەکی
بەرێخۆدانا وی یێ ل بەر مرنێ، و یا باشتر ئەو
بوو... ﴿٢١﴾ گوهداریا پێغەمبەری کربانە و ئاخڤتنا
خێرێ گۆتبانە، ڤێجا ئەگەر فەرمانا جیهادێ هاتە
دان، بۆ وان چێتر بوو وان ئنیەتا خۆ د گەل خودێ
ڕاست کربانە. ﴿٢٢﴾ و دبیت ئەگەر هوین پشتا خۆ
بدەنە ئیسلامێ، خرابییێ د ئەردیدا بکەن و بەنکێ
مرۆڤاتییێ ببڕن. ﴿٢٣﴾ ئەڤە [ئەوێت پشتا خۆ ددەنە
ئیسلامێ و خرابییێ د ئەردیدا دکەن] ئەون یێت
خودێ لەعنەت لێ کرین [و ژ دلۆڤانییا خۆ دویر
ئێخستین] و کەڕ و کۆرە کرین [نە هەقییێ گولێ دبن،
و نە دبینن]. ﴿٢٤﴾ ڤێجا ما ئەو هزرا خۆ د قورئانێدا
ناکەن؟ نەخێر.. دلێت وان د گرتینە [تێ ناگەهن].
﴿٢٥﴾ ب ڕاستی ئەوێت پشتی ڕێکا ڕاست بۆ وان دیاربووی، و ڤەگەڕیاینە سەر گاوری و گومڕاییا خۆ
یا بەرێ، شەیتانی ڤەگەڕیانا وان بۆ گاورییێ ل بەر وان شرین کر، و ب هیڤی و ئومێدان د سەردا برن.
﴿٢٦﴾ ئەڤە چونکی وان دگۆتە ئەوێت قورئان نەڤیایین [کو جوهی و موشرکن]: ئەم دێ گوهێ خۆ د
هندەکێدا دەینە هەوە [ئەم ژ دل باوەرییێ پێ نائینین، و دێ هەر دژمنییا وی کەین]، و خودێ یا ئەو د دلێ
خۆدا ڤەدشێرن دزانیت. ﴿٢٧﴾ ڤێجا دێ چ کەن و حالێ وان دێ چ بیت، وەختێ ملیاکەت ل بەر و پشتێت وان
ددەن و ڕوحا وان دستینن. ﴿٢٨﴾ ئەڤە [لێدانا بەر و پشتێت وان د گەل ڕوح ستاندنێ] ژ بەر هندێیە، چونکی
ئەو یێت ب دویڤ وی تشتی کەڤتین یێ خودێ پێ نەخۆش [کو هاریکرنا گاورانە]، و تشتێ خودێ پێ
خۆش و ژێ ڕازی وان نەڤیا، ڤێجا خودێ کار و کریارێت وان پویچکرن. ﴿٢٩﴾ یان ژی ئەوێت دوڕوییاتی د
دلێت واندا هەی، هزر دکەن خودێ کەرب و کینا وان دەرنائێخیت و ئاشکەرا ناکەت؟!

وَلَوۡ نَشَآءُ لَأَرَيۡنَٰكَهُمۡ فَلَعَرَفۡتَهُم بِسِيمَٰهُمۡۚ وَلَتَعۡرِفَنَّهُمۡ فِي
لَحۡنِ ٱلۡقَوۡلِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴿٣٠﴾ وَلَنَبۡلُوَنَّكُمۡ حَتَّىٰ نَعۡلَمَ
ٱلۡمُجَٰهِدِينَ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبۡلُوَاْ أَخۡبَارَكُمۡ ﴿٣١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّواْ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ
مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَىٰ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا وَسَيُحۡبِطُ
أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٣٢﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ
وَلَا تُبۡطِلُوٓاْ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ
ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٞ فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡ ﴿٣٤﴾ فَلَا تَهِنُواْ
وَتَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱلسَّلۡمِ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمۡ وَلَن يَتِرَكُمۡ
أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴿٣٥﴾ إِنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞۚ وَإِن تُؤۡمِنُواْ وَتَتَّقُواْ
يُؤۡتِكُمۡ أُجُورَكُمۡ وَلَا يَسۡـَٔلۡكُمۡ أَمۡوَٰلَكُمۡ ﴿٣٦﴾ إِن يَسۡـَٔلۡكُمُوهَا
فَيُحۡفِكُمۡ تَبۡخَلُواْ وَيُخۡرِجۡ أَضۡغَٰنَكُمۡ ﴿٣٧﴾ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ
تُدۡعَوۡنَ لِتُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبۡخَلُۖ وَمَن يَبۡخَلۡ
فَإِنَّمَا يَبۡخَلُ عَن نَّفۡسِهِۦۚ وَٱللَّهُ ٱلۡغَنِيُّ وَأَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُۚ وَإِن
تَتَوَلَّوۡاْ يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾

ثلاثة أرباع الحِزْب ٥١

﴿٣٠﴾ و ئەگەر مە حەزكربایە دا وان نیشا تە دەین، و دا وان ژ سەروسیما و نیشانێت وان نیاسی، و دێ وان ب ئەزمانێ وان نیاسی، و خودێ ئاگەهـ ژ كار و كریارێت هەوە هەیە. ﴿٣١﴾ و ب سویند ئەم دێ هەوە جەڕبینین، دا ئەم جیهادكەر و سەبركێشان بۆ خەلكی ئاشكەرا بكەین، و دا ئەم سالۆخێت هەوە ئاشكەرا بكەین [دا بۆ خەلكی دیار ببیت، كێ گوهداریا خودێ كریە و كێ نەكریە]. ﴿٣٢﴾ ب ڕاستی ئەوێت گاوربووین و ڕێكا خودێ ل خەلكی گرتین، و نەیارەتی و نەگوهداریا پێغەمبەری كرین، پشتی ڕێكا ڕاست بۆ وان ئاشكەرا بووی، ئەڤە چو زیانێ ناگەهیننە خودێ، و دێ تەكبیرا وان پویچ و پەلاچ كەت [و دێ د سەرێ وانڕا شكێنیت]. ﴿٣٣﴾ گەلی خودان باوەران گوهداریا خودێ بكەن و گوهداریا پێغەمبەری بكەن، و كار و كریارێت خۆ [ب گونەهان، یان ب ڕویمەتیێ، یان ب دوڕویاتیێ، یان ب منەتێ] پویچ نەكەن. ﴿٣٤﴾ ب ڕاستی ئەوێت گاوربووین و خەلك ژ ڕێكا خودێ داینە پاش، پاشی مرین و ئەو گاور [و بۆ خۆ تۆبە نەكرین]، ئەڤان خودێ گونەهێت وان ئێكجار ژێ نابەت. ﴿٣٥﴾ ڤێجا [گەلی خودان باوەران] [بەرانبەر دژمنی] سست و خاڤ نەبن، و داخوازا پێكهاتن و ئاشتیێ نەكەن و هوین د سەركەڤتی، و خودێ [ب هاریكاریا خۆ] یێ د گەل هەوە، و خێرا كریارێت هەوە كێم ناكەت [هەلبەت ئەڤە ئەگەر یا ئاشكرابت ئاشتی و پێكهاتن فایدەی ناكەت]. ﴿٣٦﴾ ب ڕاستی ژیانا دنیایێ هەمی ترانە و مژویلاهینە [و زوی دێ چیت]، و ئەگەر هوین باوەریێ بینن و خۆ بپارێزن، دێ خەلاتێ هەوە ب دورستی [ل سەر باوەری و پارێزكاریا هەوە] دەتە هەوە، و چو ژ مالێ هەوە ژی ژ هەوە ناخوازیت [پشكەكا كێم نەبیت، ئەو ژی هەر بۆ ژار و دەست تەنگێت هەوەیە]. ﴿٣٧﴾ و ئەگەر خودێ مالێ هەوە هەمییێ ژ هەوە بخوازیت و ل سەر یێ ڕژد بیت [و بمینیتە ب هەوەڤە كو هوین هەمییێ د ڕێكا خودێدا بمەزێخن]، هوین دێ چڕویكیێ كەن و دێ كەرب و كینا هەوە دەرئێخیت و ئاشكەرا كەت. ﴿٣٨﴾ ئەها هوین ئەڤەنە، دئێنە داخوازكرن دا هوین [مالێ خۆ] د ڕێكا خودێدا [د جیهادێ و ڕێكا خێرێدا] بمەزێخن، ڤێجا هندەك ژ هەوە چڕویكیێ دكەن و هەر كەسێ بەخیلیێ [و چڕویكیێ] بكەت، ب ڕاستی ئەو چڕویكیێ د گەل خۆ دكەت (زیانێ ل خۆ دكەت) و خودێ دەولەمەند و بێ منەتە [هەوجەیی ب هەوە نینە]، و هوین هەژارن [و هەوجەی خودێنە]، و ئەگەر هوین [گەلی مرۆڤان] پشتا خۆ بدەنە گوهداریا خودێ و گوهداریا پێغەمبەرێ وی، و ئەگەر مالی د ڕێكا خودێدا نەمەزێخن، خودێ دێ هەوە ب ملەتەكێ دی گوهۆڕیت، پاشی ئەو وەكی هەوە نابن.

## سُورَةُ الفَتْحِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ
وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾
وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ
ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٤﴾ لِّيُدْخِلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ
جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ
سَيِّـَٔاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٥﴾ وَيُعَذِّبَ
ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ ٱلظَّآنِّينَ
بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ
وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٦﴾ وَلِلَّهِ جُنُودُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٧﴾ إِنَّآ
أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٨﴾ لِّتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ
وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ ۚ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٩﴾



## سۆرەتا فەتح

**ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٢٩) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ ب ڕاستی مە سەرکەڤتنەکا ئاشکەرا و مەزن [کو پێکهاتنا حودەیبییەیە] دا تە. ﴿٢﴾ دا خودێ ل گونەهێت تە یێت پێش و پاش ببۆریت، و کەرەم و نیعمەتا خۆ [ب سەرئێخستنا دینێ تە، و ب ڤەکرنا مەکەهێ] ل سەر تە تمام بکەت، و دا تە ل سەر ڕێکا ڕاست ڕاگریت و موکوم بکەت. ﴿٣﴾ و دا تە ب سەرکەڤتنەکا موکوم ب سەربێخیت، شکەستن تێدا نەبیت. ﴿٤﴾ خودێیە دل ڕەحەتی و تەنایی دارێتییە دلێت خودان باوەران، دا د سەر باوەریا وانڕا باوەریا وان پتر لێ بێت، و لەشکەرێ ئەرد و ئەسمانان یێ خودێیە و خودێ یێ زانا و کاربنەجهە. ﴿٥﴾ [و خودێ ئەو سەرکەڤتن و دل ڕەحەتییە دا] دا زەلام و ژنێت خودان باوەر ببەتە د وان بەحەشتاندا ئەوێت ڕویبار د بنڕا دچن، هەروهەر دێ تێدا مینن، و گونەهێت وان دێ ڕاکەت و ناهێلیت، و ئەڤە ل دەڤ خودێ سەرفەرازییەکا مەزنە. ﴿٦﴾ و دا زەلام و ژنێت دوڕوی و زەلام و ژنێت موشرك ئەوێت هزرێت خەلەت ژ خودێ دکەن [هزر دکەن خودێ هاریکاریا پێغەمبەرێ خۆ و موسلمانان ناکەت، و ئەو جارەکا دی نازڤڕنەڤە مەدینەیێ]، ئیزا بدەت [و ئەو بەلا و ئاتافێت ئەو ل هیڤیێ ب سەرێ موسلمانان بێن]، بەلا و ئاتاف ب سەرێ وان بێن، و خودێ غەزەبێ ل وان بکەت و ژ دلۆڤانیا خۆ دویر بێخیت، و دۆژەهـ یا بۆ وان بەرهەڤکری، و ئەو چ پیسە دویماهیکەکا ڕەشە. ﴿٧﴾ و لەشکەرێ ئەرد و ئەسمانان یێ خودێیە، و خودێ یێ سەردەست و کاربنەجهە. ﴿٨﴾ ب ڕاستی مە تو یێ هنارتی، ببییە شاهد و مزگینێن و ئاگەهدارکەر. ﴿٩﴾ دا هوین [گەلی مرۆڤان] باوەرییێ ب خودێ و پێغەمبەرێ وی بینن، و دا هوین هاریکاریا پێغەمبەرێ وی بکەن و دا ب ڕێز و ڕویمەت بەرێ خۆ بدەنێ، و دا سپێدە و ئێڤاران [ئانکو هەمی دەمان ب پەرستنا خۆ] خودێ ژ کێماسییان پاقژ بکەن.

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ
أَيْدِيهِمْۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ
بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾ سَيَقُولُ
لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا
فَٱسْتَغْفِرْ لَنَاۚ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْۚ قُلْ
فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ
نَفْعًاۢۚ بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًۢا ﴿١١﴾ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن
يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِي
قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٢﴾ وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ
بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَعِيرًا ﴿١٣﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٤﴾ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا
ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْۖ يُرِيدُونَ
أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ ٱللَّهِۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُۖ
فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَاۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾



﴿١٠﴾ ب ڕاستی ئەوێت بەیعا تە دکەن و پەیمانێ [ل سەر مرنێ] ددەنە تە، ب ڕاستی ئەو پەیمانێ ددەنە خودێ، دەستێ خودێ د گەل دەستێ وانە، ڤێجا هەر کەسێ پەیمانا خۆ بشکێنیت، ب ڕاستی ئەو ب وێ شکاندنێ بەس زیانێ ل خۆ دکەت، و هەر کەسێ ئەو پەیمانا دایییە خودێ ب جهـ بکەت، خودێ زوی دێ خەلاتەکێ مەزن دەتێ. ﴿١١﴾ ئەوێت ڤەمایین ژ کۆچەرێت عەرەبان [ئەوێت ژ دەرڤەی باژێران دژیان]، دێ بێژن مال و عەیالێ مە ئەم مژویل کرین [و مە نەشیا د گەل تە بێینە حودەیبییێ، و نە ب مە بوو]، ڤێجا داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ مە ژ خودێ بکە، و ئەو وێ ب ئەزمانێ خۆ دبێژن ئەوا نە د دلێ واندا، بێژە: ئەرێ ئەگەر خودێ زیانەك یان مفایەك بۆ هەوە بڤێت، کی دشێت ڕاوەستینیت و خۆ بدەتە بەر بڕیارا خودێ، نەخێر نەوەسایە [نەهاتنا هەوە نە ژ بەر مال و کەس و کارێت هەوە بوو]، و ب ڕاستی تشتێ هوین دکەن خودێ پێ ئاگەهە. ﴿١٢﴾ بەلێ هەوە [گەلی دوڕوییان] هزر دکر پێغەمبەر و خودان باوەر ئێدی نازڤڕنە ناڤ کەس و کارێت خۆ [و هەمی دێ ئێنە کوشتن، ژ بەر هندێ هوین ترسیان و هەوە ڤەمان هەلبژارت]، و ئەڤ کارێ هەوە د دلێ هەوەدا هاتبوو جوانکرن [لەوا هوین ب ڤەمانا خۆ یێت شایی بوون]، و هەوە هزرێت خراب دکرن و هوین [ل دەڤ خودێ] ملەتەکێ د هیلاك چۆیی بوون. ﴿١٣﴾ و هەر کەسێ [ڕاست و دورست] باوەرییێ ب خودێ و پێغەمبەرێ وی نەئینیت، ب ڕاستی مە ئاگرێ دۆژەهێ بۆ گاوران یێ بەرهەڤکری. ﴿١٤﴾ مالداری و خودانییا ئەرد و ئەسمانان یا خودێیە، یێ بڤێت لێ ناگریت و گونەهێت وی دێ ژێبەت، و یێ بڤێت دێ ئێزادەت، و خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿١٥﴾ ئەوێت ڤەماین [ژ دوڕوییان ئەوێت نەچۆیینە حودەیبییێ] دێ بێژن: ئەگەر هوین دەرکەڤتنە خەیبەرێ دا دەستکەڤتیان بینن بهێلن، ئەم ژی د گەل هەوە بێین، دڤێن پەیمانا خودێ [ئەوا دایییە وان ئەوێت چۆیینە حودەیبییە کو دێ دەستکەڤتییێت خەیبەرێ دەتە وان] بگوهۆڕن، بێژە وان: قەت هوین د گەل مە ناهێن، خودێ بەری نوکە یا گۆتی [دەستکەڤتییێت خەیبەرێ بەس بۆ وینە ئەوێ چۆیییە حودەیبییێ]، ڤێجا دێ بێژن نەخێر خودایێ هەوە نەگۆتییە، بەلێ هوین ژ زکرەشی ناهێلن، نەخێر وەنینە، ئەو کێم تێ دگەهن [و هزرا وان بەس ل سەر دەستکەڤتیانە].

قُل لِّلۡمُخَلَّفِينَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ سَتُدۡعَوۡنَ إِلَىٰ قَوۡمٍ أُوْلِي بَأۡسٍ شَدِيدٖ تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَۖ فَإِن تُطِيعُواْ يُؤۡتِكُمُ ٱللَّهُ أَجۡرًا حَسَنٗاۖ وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ كَمَا تَوَلَّيۡتُم مِّن قَبۡلُ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٦﴾ لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبۡهُ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٧﴾ ۞لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةٗ يَأۡخُذُونَهَاۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿١٩﴾ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةٗ تَأۡخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمۡ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيۡدِيَ ٱلنَّاسِ عَنكُمۡ وَلِتَكُونَ ءَايَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَيَهۡدِيَكُمۡ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ﴿٢٠﴾ وَأُخۡرَىٰ لَمۡ تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهَا قَدۡ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٗا ﴿٢١﴾ وَلَوۡ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوَلَّوُاْ ٱلۡأَدۡبَٰرَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿٢٢﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلُۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا ﴿٢٣﴾

الحزب ٥٢





﴿١٦﴾ بێژە ئەوێت ڤەمایین [ژ حودەیبییێ] ژ کۆچەرێت عەرەبان [ئەوێت ژ دەرڤەی باژێران ئاکنجی]، نێزیك هوین دێ بۆ [شەڕێ] ملەتەکێ ب هێز و شەڕکەر ئێنە داخوازکرن، یان هوین دێ شەڕی د گەل وان کەن یان دێ بێ شەڕ موسلمان بن، ڤێجا ئەگەر هوین گوهدارییێ بکەن [و دەرکەڤن بۆ شەڕی] خودێ دێ خەلاتەکێ باش دەتە هەوە، و ئەگەر هوین پشتا خۆ بدەنێ و ڤەمینن هەروەکی هوین بەری نوکە [ژ حودەیبییێ] ڤەمایین، خودێ دێ هەوە ب ئیزایەکا دژوار و ب ژان ئیزادەت. ﴿١٧﴾ چو گونەه ل سەر کۆرە و سەقەت و نەخۆشان نینە [پشکدارییێ د شەڕیدا نەکەن]، و هەر کەسێ گوهێ خۆ بدەتە خودێ و پێغەمبەرێ وی، خودێ دێ وی بەتە بەحەشتێت ڕویبار د بنڕا دچن، و هەر کەسێ بەرێ خۆ [ژ گوهدارییا خودێ] وەرگێڕیت و پشتا خۆ بدەتێ، خودێ دێ وی ب ئیزایەکا دژوار و ب ژان ئیزادەت. ﴿١٨﴾ ب سویند خودێ ژ خودان باوەران ڕازی بوو وەختێ ل بن دارێ سۆز و پەیمان ددانە تە [ل حودەیبییێ]، ڤێجا خودێ ئەوا د دلێت واندا هەی [ژ دلبێشی و ڕاستییێ] زانی، ئینا دلڕەحەتی و تەناهی ب سەر واندا دارێت، و پەیمان ب سەرکەڤتنەکا نێزیك [کو ڤەکرنا خەیبەرێ بوو] دا وان. ﴿١٩﴾ و گەلەك دەستکەڤتییێت دی ژی دێ گەهنە وان، و خودێ یێ سەردەست و کاربنەجهە. ﴿٢٠﴾ خودێ پەیمان ب گەلەك دەستکەڤتییان یا دایییە هەوە، هوین دێ گەهنێ و دێ ب دەست خۆڤە ئینن، و بۆ هەوە لەز ل ڤێ کر [کو دەستکەڤتییێت خەیبەرێ بوون]، و نەهێلا دەستێ خەلکی [خەلکێ خەیبەرێ و هەڤپەیمانێت وان: ژ ئەسەدیان و غەتەفان] بگەهتە هەوە، و دا ئەڤە بۆ خودان باوەران ببیتە نیشانەك [ل سەر ڕاستیا پێغەمبەری د هەر تشتەکیدا کو پەیمان و ژڤان پێ دایی، و دا بزانن هەر کەسێ ڕێکا خودێ بگریت، خودێ دێ وی خەلات و سەرفەرازکەت]، و دا بەرێ هەوە بدەتە ڕێکا ڕاست [و هەوە ل سەر موکوم بکەت]. ﴿٢١﴾ و هندەك غەنیمە و دەستکەڤتییێت دی ژی [خودێ بۆ هەوە لەز لێ کر کو غەنیمەییێت (هەوەزان) بوون] هەوە نەدشیا ب دەست خۆڤە بینن، بەلێ خودێ ب دەست هەوەڤە ئینان و بۆ هەوە ب ساناهی ئێخستن، و خودێ ل سەر هەر تشتەکی یێ خودان شیانە. ﴿٢٢﴾ و ئەگەر ئەوێت گاوربووییین [خەلکێ مەکەهێ ل حودەیبییێ] شەڕێ هەوە کربانە [و سولح د گەل هەوە نەکربانە] دا شکێن و ڕەڤن، پاشی وان چو دۆست و هاریکار و پشتەڤان نەددیتن. ﴿٢٣﴾ ئەڤە ڕێکا خودێیە د ڕاستا واندا ئەوێت بەری نوکە چۆیین [ئەو دێ پێغەمبەران هەر ب سەر ئێخیت، و هۆسا پەیمان یا دایی (﴿ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغۡلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِيٓ ﴾ - خودێ سۆزا دایی سەرکەڤتن بۆ من و پێغەمبەرێت منە)]، و تو چو گوهۆڕینێ بۆ ڕێکا خودێ نابینی.

وَهُوَ ٱلَّذِي كَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ عَنۡهُم بِبَطۡنِ مَكَّةَ مِنۢ
بَعۡدِ أَنۡ أَظۡفَرَكُمۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ٢٤
هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ
وَٱلۡهَدۡيَ مَعۡكُوفًا أَن يَبۡلُغَ مَحِلَّهُۥۚ وَلَوۡلَا رِجَالٞ مُّؤۡمِنُونَ وَنِسَآءٞ
مُّؤۡمِنَٰتٞ لَّمۡ تَعۡلَمُوهُمۡ أَن تَطَـُٔوهُمۡ فَتُصِيبَكُم مِّنۡهُم مَّعَرَّةُۢ
بِغَيۡرِ عِلۡمٖۖ لِّيُدۡخِلَ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ لَوۡ تَزَيَّلُواْ لَعَذَّبۡنَا
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا ٢٥ إِذۡ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ
عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَأَلۡزَمَهُمۡ كَلِمَةَ ٱلتَّقۡوَىٰ
وَكَانُوٓاْ أَحَقَّ بِهَا وَأَهۡلَهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ٢٦
لَّقَدۡ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءۡيَا بِٱلۡحَقِّۖ لَتَدۡخُلُنَّ ٱلۡمَسۡجِدَ
ٱلۡحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمۡ وَمُقَصِّرِينَ
لَا تَخَافُونَۖ فَعَلِمَ مَا لَمۡ تَعۡلَمُواْ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ
فَتۡحٗا قَرِيبًا ٢٧ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ
ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ٢٨





﴿٢٤﴾ و خودێ ئەوە یێ دەستێت وان ژ هەوە و دەستێت هەوە ژ وان ل حودەیبییێ، پشتی هوین ب سەر وان ئێخستین [و هەوە هەژمارەك ژ وان ئێخسیر كری، ئەوێت ل بەر گەریاین ب سەر هەوەدا بگرن]، و خودێ ئاگەهـ ژ وێ هەیە یا هوین دكەن. ﴿٢٥﴾ ئەون گاور بوویین و رێكا كەعبەیێ ل هەوە گرتین، و نەهێلاین قوربانێت بەرهەڤكری [ئانكو تەرشێت هاتینە گرتن بۆ قوربانییێ] بگەهنە جهێ خۆ یێ ڤەكوشتنێ، و ئەگەر ژ بەر هندەك زەلامێت خودان باوەر و ژنێت خودان باوەر [ئەوێت د ناڤ مەكەهێدا، و باوەریا خۆ دیار نەكرین] نەبایە ـ كو هوین وان نانیاسن ـ دەمێ هوین ب سەر واندا بگرن بكەڤنە بەر پێیێت هەوە، ڤێجا بێی كو هوین بزانن هوین عەیبدار ببن و زیان بگەهیتە هەوە، و خوین بكەڤیتە سەر هەوە [خودێ دەستێ هەوە ل سەر وان ڕانەدكر، و دا هەوە سەردەستی وان كەت، و خودێ ئەڤە كر و هۆسا هوین ژێكڤەكرن] دا ئەوێ خودێ بڤێت ب بەر دلۆڤانییا خۆ بێخیت، و ئەگەر ئەو [گاور و خودان باوەرێت د مەكەهێدا] ژێكڤە ببانە [و ژێك هاتبانە نیاسین]، ئەم دا ئەوێت گاور بوویین ژ وان، ب ئیزادانەكا دژوار و ب ژان، ئیزا دەین. ﴿٢٦﴾ وەختێ ئەوێت گاوربوویین ڕكا نەزانینێ كرینە د دلێ خۆدا [ڕێكا سەرەدانا كەعبەیێ ل هەوە گرتین]، ئینا خودێ دلرەحەتییا خۆ ب سەر پێغەمبەری و ب سەر خودان باوەراندا دارێت، و پەیڤا پارێزكارییێ (لا إله إلا الله محمد رسول الله) بۆ وان هەلبژارت، و ئەو بۆ ڤێ پەیڤێ هێژاتر بوون و خودانێت وێ بوون، و خودێ ئاگەهـ ژ هەر تشتەكی هەیە. ﴿٢٧﴾ ب سویند خودێ خەونا پێغەمبەرێ خۆ ڕاست دەرئێخست، خودێ حەزكەت هوین بێ ترس و ب ئێمن و سەرتراشی و سەركورتكری دێ چنە د مزگەفتا حەرامدا [كو كەعبەیە]، ڤێجا خودێ ئەو [ژ پێكهاتنێ و فایدەیێ وێ] دزانی یا هەوە نەدزانی، ڤێجا بەری وێ سەركەڤتنەكا نێزیك دا هەوە [ئەو ژی ڤەكرنا خەیبەرێ بوو]. ﴿٢٨﴾ ئەوی [خودێ] پێغەمبەرێ خۆ ب ڕاستەرێییێ [كو قورئانە] و ب دینێ ڕاستڤە هنارت، دا دینێ ڕاست (كو ئیسلامە) بكەتە سەرپشكا هەمی دینان، و ب سەر هەمی دینان بێخیت، و بەسە خودێ شاهدێ ڤێ بیت.

مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ
تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ
فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي
ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ
عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ٢٩

## سُورَةُ الحُجُرَاتِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ربع الحزب ٥٢

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ
ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ١ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ
أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ
لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ٢ إِنَّ ٱلَّذِينَ
يَغُضُّونَ أَصۡوَٰتَهُمۡ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمۡتَحَنَ
ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰۚ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ ٣ إِنَّ ٱلَّذِينَ
يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلۡحُجُرَٰتِ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ٤



﴿٢٩﴾ موحەمەد پێغەمبەرێ خودێیە، و ئەوێت د گەل د ڕاستا گاورانـدا یـێت دژوارن، و د ناڤبەرا خۆ ب خۆدا دلۆڤانن، هندی تو دبینی هەر یێ د ڕكووع و سوجدەیێدا، كەرەم و ڕازیبوونا خودێ دخوازن، نیشانا وان یا ل سەروچاڤێت وان ژ بەر سوجدەبرنێ، د تەورات و ئنجیلێدا ژی ئەڤەیە پەسن و سالۆخەتا وان، وەكی شینكاتیەكێنە زیلك دابیت و ب هێز كەڤتبیت و ستویر بووبیت، ڤێجا ل سەر بنێ خۆ ڕاست ڕابووبیت، و جۆتیار ژێ عەجێبگرتی بمینیت [ئەڤە نموونەیەكە خودێ ل سەر هەڤالێت پێغەمبەری ددانیت، دەستپێكێ یێت كێمن، پاشی دێ زێدەبن و پتر لێ ئێن و ب هێز كەڤن، وەكی بنا شینكاتی دەستپێكێ یا لاوازە و ڕۆژ بۆ ڕۆژێ ستویر دبیت]، [و هۆسا موسلمانان زێدە دكەت]، دا كەربێت گاوران پێ ڤەكەت، و ئەوێت ژ وان باوەری ئینایین و كار و كریارێت ڕاست و دورست كرین، خودێ پەیمان ب لێبۆرینێ و خەلاتەكێ مەزن یا دایییە وان.

## سۆرەتا حوجورات

**ل مەدینەیێ هاتیە خوارێ (١٨) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ گەلی ئەوێت هەوە باوەری ئینایین، ب پێشیا خودێ و پێغەمبەرێ وی نەكەڤن [ئانكو چو كاروباران نەكەن، ئەگەر هوین حوكمێ خودێ و پێغەمبەرێ وی ل دوور نەزانن]، و تەقوا خودێ [د هەمی كاروبارێت خۆدا] بكەن، ب ڕاستی خودێ یێ گوهدێر و زێدە زانایە. ﴿٢﴾ گەلی ئەوێت هەوە باوەری ئینایی، دەنگێ خۆ ب سەر دەنگێ پێغەمبەری نەئێخن، و ب دەنگێ بلند پێغەمبەری نەئاخێڤن وەكی هوین ئێك و دو دئاخێڤن، نەكو كار و كریارێت هەوە پویچ ببن بێی هوین پێ بحەسن. ﴿٣﴾ ب ڕاستی ئەوێت دەنگێ خۆ ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ نزم دكەن، ئەڤە ئەون ئەوێت خودێ دلێت وان بۆ تەقوایێ تەرخانكرین، گونەهـ ژێبرن و خەلاتەكێ مەزن بۆ وانە. ﴿٤﴾ ب ڕاستی ئەوێت ژ پشتا خانییان گازی تە دكەن، باراپتر ژ وان نەزانن.

وَلَوۡ أَنَّهُمۡ صَبَرُواْ حَتَّىٰ تَخۡرُجَ إِلَيۡهِمۡ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ
رَّحِيمٞ ٥ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن
تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ٦
وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ
إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ٧
فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٨ وَإِن طَآئِفَتَانِ
مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا
عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ
فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ٩
إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ١٠ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ
عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا
مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ
ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ١١





﴿٥﴾ و ئەگەر وان [ئەویێت ب دەنگێ بلند گازی تە کرین] بێنا خۆ فرەهکربایە، هەتا تو ل وان دەرکەڤتبای بۆ وان چێتر بوو، و خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە.
﴿٦﴾ گەلی ئەویێت هەوە باوەری ئینایین، ئەگەر ئێکێ ڤارێ [ژ وان ئەویێت درەو ل دەڤ چونە] سالۆخەك بۆ هەوە ئینا، ل دویڤ هەڕن [و ڤەکۆلن کا ئەو سالۆخ ڕاستە یان نە، و ئێکسەر ژێ وەرنەگرن، هەتا هوین ژێ پشت ڕاست نەبن]، دا هوین ژ نەزانین زیانێ نەگەهیننە کەسێ، پاشی پەشێمان ببن. ﴿٧﴾ و بزانن کو ب ڕاستی پێغەمبەرێ خودێ یێ د ناڤ هەوەدا [ڤێجا لەزێ ل تشتی نەکەن، و بێ دویڤچۆن سالۆخان وەرنەگرن]، ئەگەر گوهێ خۆ د گەلەك تشتاندا دابایە هەوە و ب ئاخڤتنا هەوە کربایە، هوین دا کەڤنە د تەنگاڤییێدا، و دا زەحمەت بۆ هەوە چێ بیت، بەلێ خودێ باوەری ل بەر دلێ هەوە شرینکر و د دلێ هەوەدا خەملاند، و گاوری و ڤاڕێبوون [ب ڕێکا کرنا گونەهێت مەزن] و هەمی گونەهـ ل بەر هەوە ڕەش کرن، ئەڤەنە سەرڕاست و تێگەهشتی و چەسپان.
﴿٨﴾ [ئەڤە] قەنجی و کەرەم و نیعمەتەکە ژ خودێ، و خودێ زێدەزانا و کاربنەجهە. ﴿٩﴾ [گەلی خودان باوەران] ئەگەر دو دەستەك ژ خودان باوەران ب شەڕکەڤتن وان پێك بینن، و ئەگەر ئێکێ ژ وان دەستدرێژی و ستەم ل یا دی کر، هوین شەڕێ وێ بکەن ئەوا دەستدرێژی و ستەمێ دکەت، دا بزڤڕیتە ئەمرێ خودێ [ئانکو حوکمێ خودێ و شەرعێ وی]، ڤێجا ئەگەر زڤڕی [و دەست ژ شەڕی و دەستدرێژییێ بەردا]، ڤێجا ب دادوەری [هەردو دەستەکان] پێك بینن و عەدالەتێ بکەن، ب ڕاستی خودێ حەژ عادلان دکەت.
﴿١٠﴾ هندی خودان باوەرن برایێت ئێکن، ڤێجا ناڤبەرا برایێت خۆ خۆش بکەن و پێك بینن، و تەقوا خودێ بکەن، دا دلۆڤانی ب هەوە بێتە برن. ﴿١١﴾ گەلی خودان باوەران بلا چو زەلام ترانەیان ب چو زەلامان نەکەن، دبیت ئەویێت ترانە پێ دئێنەکرن چێتر بن ژ وان ئەویێت ترانەیان پێ دکەن، و بلا چو ژن ژی ترانەیان ب چو ژنان نەکەن، دبیت ئەویێت ترانە پێ دئێنەکرن چێتر بن ژ وان ئەویێت ترانەیان پێ دکەن، و تانان د ئێك و دو نەقوتن و ئێك و دو لەکەدار نەکەن، و ب ناڤ و ناسناڤێت کرێت گازی ئێك و دو نەکەن، و چ پیسە تشتە مرۆڤ ب ناڤێ فسقێ بێتە ناڤکرن پشتی باوەری ئینانێ، و هەر کەسێ [ژ تانقوتان و لەکەدارکرنێ و ب ناڤکرنا خەلکی ب ناڤێت پیس] تۆبە نەکەت، ڤێجا ئەڤەنە ئەویێت ستەمکار.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ
إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن
يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ
تَوَّابٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ
شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ
عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ۞ قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن
قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ
وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾
إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ
وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ
ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾ قُلۡ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمۡ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١٦﴾ يَمُنُّونَ
عَلَيۡكَ أَنۡ أَسۡلَمُواْۖ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَيَّ إِسۡلَٰمَكُمۖ بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ
عَلَيۡكُمۡ أَنۡ هَدَىٰكُمۡ لِلۡإِيمَٰنِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ
غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٨﴾

نصف الحزب ٥٢





﴿١٢﴾ گەلی خودان باوەران خۆ ژ گەلەك گۆمانێ (هزرا خەلەت) بپارێزن، ب ڕاستی هندەك گۆمان گونەهن [ئەگەر لێ هاتە خەبەردان یان كارڤەدان ل سەر هاتەكرن] و جاسووسیێ ل سەر ئێك و دو نەكەن، و نەكامیا ئێك و دو نەكەن، ئەرێ ما ئێك ژ هەوە هەیە بڤێت گۆشتێ برایێ خۆ یێ مری بخۆت؟ و هەوە ئەڤە نەڤێت [كا چاوا هەوە ئەڤە نەڤێت، دڤێت وەسا هەوە نەكامیا وی ژی د پشت ویڕا نەڤێت]، و تەقوا خودێ بكەن [ب هێلانا تشتێ ئەمرێ هەوە پێ هاتییە كرن]، ب ڕاستی خودێ تۆبەوەرگر و دلۆڤانە.
﴿١٣﴾ گەلی مرۆڤان، ب ڕاستی مە هوین ژ نێر و مێیەكێ [ئانكو زەلام و ژنەكێ كو ئادەم و حەوانە] یێت داین، و مە هوین یێت كرینە ملەت و عەشیر عەشیر دا ئێك و دو بنیاسن، ب ڕاستی یێ ژ هەوە هەمیان پتر ب ڕێز و ڕویمەت ل دەڤ خودێ، ئەوە یێ ژ هەوە هەمیان تەقواتر [ئانكو یێ ژ هەوە هەمیان پتر ژ خودێ دترسیت]، و خودێ زێدە زانا و شارەزایە.
﴿١٤﴾ عەرەبێت ژ دەرڤەی باژێران گۆتن: مە باوەری ئینا [خێران د گەل مە بكە] بێژە: هەوە باوەری نەئینایە، بەلێ بێژن ئەم [ژ ترسا كوشتن و ئێخسیركرنێ] یێت تەسلیم بووین [یان ژی سەرڤە سەرڤە یێت موسلمان بووین]، و باوەری هێژ نەچۆیە د دلێت هەوەدا، و ئەگەر هوین گوهداریا خودێ و پێغەمبەرێ وی بكەن، خودێ چو ژ خێرا كار و كریارێت هەوە كێم ناكەت، و خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿١٥﴾ خودان باوەرێت دورست ئەون، ئەوێت باوەری ب خودێ و پێغەمبەرێ وی ئینایین، و پاشی ب گۆمان و شك نەكەڤتین، و جیهاد ب مالێ خۆ و نەفسا خۆ د ڕێكا خودێدا كرین، ئەڤەنە یێت ڕاست [د باوەریا خۆدا]. ﴿١٦﴾ ئەرێ هوین دێ ئەوا د دلێ هەوەدا خودێ پێ ئاگەهدار كەن؟ [هوین دێ خودێ ئاگەهداری دینێ خۆ كەن، هوین دبێژن مە باوەری یا ئینایی] و خودێ ب خۆ دزانیت كا چ د ئەرد و ئەسماناندا هەیە، و ژ هەر تشتەكی ب ئاگەهە. ﴿١٧﴾ [كۆچەرێت عەرەب] ل سەر تە دكەنە منەت كو ئەو موسلمان بوون، بێژە: [گەلی كۆچەرێت عەرەب] موسلمانبوونا خۆ ل سەر من نەكەنە منەت، بەلێ خودێ منەتا ل هەوە كری دەمێ بەرێ هەوە دایییە باوەرییێ، ئەگەر هوین [د باوەری ئینانا خۆدا] د ڕاست بن. ﴿١٨﴾ ب ڕاستی خودێ نهێنیا (غەیبا) ئەرد و ئەسمانان دزانیت، و خودێ دبینیت كا هوین چ دكەن [و پێ ئاگەهە].

سُورَةُ قٓ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ١ بَلۡ عَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡ
فَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَيۡءٌ عَجِيبٌ ٢ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗاۖ ذَٰلِكَ
رَجۡعُۢ بَعِيدٞ ٣ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا تَنقُصُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۡهُمۡۖ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ
حَفِيظُۢ ٤ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ فَهُمۡ فِيٓ أَمۡرٖ مَّرِيجٍ ٥
أَفَلَمۡ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوۡقَهُمۡ كَيۡفَ بَنَيۡنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا
وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٖ ٦ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ
وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ٧ تَبۡصِرَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِكُلِّ عَبۡدٖ
مُّنِيبٖ ٨ وَنَزَّلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ مُّبَٰرَكٗا فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ جَنَّٰتٖ
وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ ٩ وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ ١٠ رِّزۡقٗا
لِّلۡعِبَادِۖ وَأَحۡيَيۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ كَذَٰلِكَ ٱلۡخُرُوجُ ١١ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ
قَوۡمُ نُوحٖ وَأَصۡحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ ١٢ وَعَادٞ وَفِرۡعَوۡنُ وَإِخۡوَٰنُ لُوطٖ ١٣
وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ وَقَوۡمُ تُبَّعٖۚ كُلّٞ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ١٤
أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ بَلۡ هُمۡ فِي لَبۡسٖ مِّنۡ خَلۡقٖ جَدِيدٖ ١٥



## سۆرەتا قاف

### ل مەكەهێ هاتیە خوارێ (٤٥) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هۆسا دئێتە خواندن (قاف)، ل دۆر ڕاڤەكرنا ڤان ڕەنگە تیپان، بزڤرە دەستپێكا سۆرەتا (بەقەرە). سویند ب قورئانا ب ڕویمەت و پایە بلند [تو پێغەمبەری و ڕۆژا قیامەتێ ڕاستە]. ﴿٢﴾ [خەلكێ مەكەهێ نە بەس باوەری نەئینان] بەلێ عەجێبگرتی بوون دەمێ پێغەمبەرەك هەر ژ وان بۆ وان هاتی، و گاوران گۆت: ب ڕاستی ئەڤە تشتەكێ عەجێبە و جهێ حێبەتیبوونێیە. ﴿٣﴾ ئەرێ ئەگەر ئەم مرین و بووینە ئاخ [جارەكا دی دێ زیندی بینەڤە؟]، ب ڕاستی ئەڤ زڤرین و ڤەگەڕیانە تشتەكی نەبەرئاقلە و دویرە]. ﴿٤﴾ ب سویند ئەم دزانین كا ئەرد چەندێ ژ لەشێ وان دخۆت و چەند كێم دكەت، و [ژ بلی ڤێ ژی] مە كتێبەكا پارێزەر یا هەی، هەمی تشت تێدا دنڤیسینە. ﴿٥﴾ بەلێ گاڤا قورئان بۆ وان هاتی ئەوان درەو دانا، و ئەو یێت د كاروبارەكێ شەپلیدا [جار دبێژن سێربەندە، و جار دبێژن نابیت پێغەمبەر مرۆڤ بیت، و جار دبێژن دڤێت یێ زەنگین بیت... هتد]. ﴿٦﴾ ما ئەو بەرێ خۆ نادەنە ئەسمانێ د سەر خۆڕا، كا مە چاوا ئاڤاكریە و خەملاندیە؟ و چو كون و دەرز لێ نینن. ﴿٧﴾ و كا مە ئەرد ژی [چاوا] دەشت كریە، و مە چیایێت بنەجهـ ئێخستینە تێدا [دا بۆ بینە سنگ و نەلڤلڤیت]، و كا مە چاوا هەمی ڕەنگێت شینكاتیێ جوان د ئەردیدا شینكرینە. ﴿٨﴾ [ئەڤ كارە، ئاڤاكرنا ئەسمانی و دانانا ئەردی هۆسا] خودێ كر دا دلان ل سەر هەقیێ ڕۆن بكەت، و ببیتە بیرئینان بۆ هەر بەندەیەكێ ل خودێ بزڤریت [و هزرا خۆ د چێكریێت ویدا بكەت]. ﴿٩﴾ و مە ئاڤەكا پڕ خێر و بەرەكەت ژ ئەسمانی باراند، و مە بیستان و باخچە، و دندكێت دبنە دان و دكاك، پێ شینكرن. ﴿١٠﴾ و مە دارقەسپێت بلند، یێت فێقیێ وان ئویشی و ل سەریێك، پێ شینكرن. ﴿١١﴾ دا ببنە ڕزقێ بەندەیان، و مە ب وێ ئاڤێ ئەردەكێ هشك و مری زیندی كر، و زێندیكرنا مریان ژی هەر هۆسایە. ﴿١٢﴾ [هەی موحەمەد ئەگەر ملەتێ تە یێ قورەیشی تە درەوین دانن، ب ڕاستی ئەڤە نە تشتەكێ نویە] بەری وان ملەتێ نووحی و خودانێت بیرێ [ملەتێ شوعەیبی ل دۆر بیرێ كۆم بوون، ڤێجا خودێ هەمی ئێخستنە تێدا]، و (سەموود) ژی پێغەمبەرێت خۆ درەوین دانان. ﴿١٣﴾ و ملەتێ عاد و فیرعەون و ملەتێ (لووط) پێغەمبەر ژی. ﴿١٤﴾ و خەلكێ جهێ تێردار و دارتێكڕا [مەخسەد پێ خەلكێ مەدیەنێیە و ملەتێ شوعەیبی] و ملەتێ توببەعی ژی، هەمیان پێغەمبەرێت خۆ درەوین دانان، و هێژای ئیزایا من بوون. ﴿١٥﴾ ڤێجا ما ئەم ب چێكرنا جارا ئێكێڤە وەستیاینە؟ [هەتا یا بێت بۆ مە یا ب زەحمەت بیت؟] نەخێر [بێزار نەبوویە و پێڤە نەوەستیایە، و زڤرینا وان پشتی بووینە خۆلی، یا دویر نینە وەكی ئەو دبێژن] بەلێ ئەو د چێكرنەكا نویدا ب شكن [هەر چەندە ئەو دزانن جارا ئێكێ مە ئەو یێت چێكرین].

وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ وَنَعۡلَمُ مَا تُوَسۡوِسُ بِهِۦ نَفۡسُهُۥۖ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ
مِنۡ حَبۡلِ ٱلۡوَرِيدِ ١٦ إِذۡ يَتَلَقَّى ٱلۡمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ
قَعِيدٞ ١٧ مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ ١٨ وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ
ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ ١٩ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِۚ ذَٰلِكَ يَوۡمُ
ٱلۡوَعِيدِ ٢٠ وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ ٢١ لَّقَدۡ كُنتَ
فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ ٢٢
وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ٢٣ أَلۡقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٖ ٢٤
مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ مُعۡتَدٖ مُّرِيبٍ ٢٥ ٱلَّذِي جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ
فَأَلۡقِيَاهُ فِي ٱلۡعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ٢٦ ۞ قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطۡغَيۡتُهُۥ وَلَٰكِن (ثلاثة أرباع الحزب ٥٢)
كَانَ فِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٖ ٢٧ قَالَ لَا تَخۡتَصِمُواْ لَدَيَّ وَقَدۡ قَدَّمۡتُ إِلَيۡكُم
بِٱلۡوَعِيدِ ٢٨ مَا يُبَدَّلُ ٱلۡقَوۡلُ لَدَيَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ٢٩ يَوۡمَ
نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمۡتَلَأۡتِ وَتَقُولُ هَلۡ مِن مَّزِيدٖ ٣٠ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ
لِلۡمُتَّقِينَ غَيۡرَ بَعِيدٍ ٣١ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٖ ٣٢
مَّنۡ خَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِ وَجَآءَ بِقَلۡبٖ مُّنِيبٍ ٣٣ ٱدۡخُلُوهَا
بِسَلَٰمٖۖ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُلُودِ ٣٤ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيۡنَا مَزِيدٞ ٣٥



﴿١٦﴾ ب سویند مە مرۆڤ یێ چێکری، و ئەم دزانین
کا دلێ وی بۆ چ دبێژیت و کا چ دکەڤیتە سەر دلێ وی،
و ئەم ژ رها ستۆیێ وی نێزیکتری وینە. ﴿١٧﴾ ئەم ژ
وان هەردو ملیاکەتێت، ل سەر ملێ وی یێ راستێ و
ملێ وی یێ چەپێ و کاروکریارێت وی دنڤیسن، پتر
ئاگەهداری وینە. ﴿١٨﴾ و مرۆڤ چو ئاخفتنان ناکەت
[چ باش چ خراب]، ئەگەر ملیاکەتەکێ کارکری و
زێرەڤانێ دگەل، نەنڤیسیت. ﴿١٩﴾ و سەکەراتا مرنێ د
گەل هەقییێ هات، ئەڤە ئەو بوو یا تو ژێ درەڤی.
﴿٢٠﴾ و پف ل بۆقێ هاتە دان، ئەڤە ئەو رۆژە یا پەیمان
پێ هاتییەدان. ﴿٢١﴾ و هەر ئێك دێ ئێت [چ باش
چ خراب] دو ملیاکەت ییێت دگەل، ئێك دئینیتە
مەیدانا حەشرێ، و یێ دی شادەییێ ل سەر ددەت.
﴿٢٢﴾ ب سویند تو [د دنیاییدا] ژ ڤێ یێ بێ ئاگەه
بووی، و مە پەردە ل سەر تە راکر، و تو ئەڤرۆ یێ چاڤ
تیژ و دژواری [بۆ دیتنێ]. ﴿٢٣﴾ و ملیاکەتێ بەرپرس
ژێ دێ بێژیت: ئەڤە ئەو و کتێبا کار و کریارێت وی
ژی، ل دەڤ من یا حازرە. ﴿٢٤﴾ [خودێ دێ بێژیتە
وان هەردو ملیاکەتێت د گەل دئێن] هەر زێدەگاورەکێ زێدەرکۆیی باڤێژنە د دۆژەهێدا. ﴿٢٥﴾ ئەوێ زێدە
خێرنەکەر و زێدە ستەمکار و ب شك [د دینیدا]. ﴿٢٦﴾ ئەوێ پەرستییەکێ دی بۆ خودێ دکەتە هەڤپشك،
ڤێجا هوین هەردو [مەخسەد پێ هەردو ملیاکەتێت د گەل دئێن]، دێ باڤێژنە د ئیزایا دژوار و گراندا.
﴿٢٧﴾ تەکێ وی یێ شەیتان دێ بێژیت: خودایێ مە، ب راستی نە من ئەو د بەر سەرداچۆنێرا کربوو، ئەو
ب خۆ د سەرداچۆنەکا کویر و دویردا بوو. ﴿٢٨﴾ خودێ دێ بێژیت: هوین هەردو [مرۆڤ و شەیتانێ وی]
ل دەڤ من جرەبرێ نەکەن، و من [د دنیاییدا و ل سەر ئەزمانێ پێغەمبەرێت خۆ، و ب هنارتنا کتێبان] هوین
ژ ڤێ رۆژێ ترساندبوون. ﴿٢٩﴾ و ئاخفتن (پەیمان) ل دەڤ من نائێتە گوهۆرین، و ئەز ستەمێ ل بەندەیان
ناکەم. ﴿٣٠﴾ رۆژا ئەم دبێژینە دۆژەهێ تو تژی بووی؟ دبێژیت: ما [ژ ڤان] هێژ هەنە؟ ﴿٣١﴾ و بەحەشت
بۆ تەقواداران نێزیك دبیت، و یا دویر نینە. ﴿٣٢﴾ ئەڤە ئەوە یا پەیمان پێ هاتییەدان، بۆ هەر تۆبەدارەکێ
پارێزڤان [بۆ تخویبێت خودێ] ژ هەوە. ﴿٣٣﴾ ئەوێ دەمێ ب تنێ و کەس نە ل دەڤ، ژ خودایێ دلۆڤان
بترسیت، و ب دلەکێ ل خودێ زڤری، بێتە دەڤ خودێ. ﴿٣٤﴾ ب سلامەتی [ژ ئیزا و کول و کۆڤانان] هەرنە
د بەحەشتێدا، و رۆژا ژیانا بێ دویماهیك ئەڤەیە. ﴿٣٥﴾ تشتێ وان بڤێت د بەحەشتێدا یێ هەی، و زێدەتر ژی
بۆ وان یێ هەی [ئەو ژی دیتنا خودایێ مەزنە].

وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هُمۡ أَشَدُّ مِنۡهُم بَطۡشٗا فَنَقَّبُواْ
فِي ٱلۡبِلَٰدِ هَلۡ مِن مَّحِيصٍ ﴿٣٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ لِمَن
كَانَ لَهُۥ قَلۡبٌ أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ وَهُوَ شَهِيدٞ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَمَا مَسَّنَا
مِن لُّغُوبٖ ﴿٣٨﴾ فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ
قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ ٱلۡغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ
وَأَدۡبَٰرَ ٱلسُّجُودِ ﴿٤٠﴾ وَٱسۡتَمِعۡ يَوۡمَ يُنَادِ ٱلۡمُنَادِ مِن مَّكَانٖ قَرِيبٖ ﴿٤١﴾
يَوۡمَ يَسۡمَعُونَ ٱلصَّيۡحَةَ بِٱلۡحَقِّۚ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا
نَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ وَإِلَيۡنَا ٱلۡمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلۡأَرۡضُ
عَنۡهُمۡ سِرَاعٗاۚ ذَٰلِكَ حَشۡرٌ عَلَيۡنَا يَسِيرٞ ﴿٤٤﴾ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَقُولُونَۖ
وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖۖ فَذَكِّرۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾

سُورَةُ الذَّارِيَاتِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا ﴿١﴾ فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا ﴿٢﴾ فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا ﴿٣﴾
فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا ﴿٤﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٞ ﴿٥﴾ وَإِنَّ ٱلدِّينَ لَوَٰقِعٞ ﴿٦﴾



﴿٣٦﴾ و مە چەند ملەتێت ژ وان زەبەردەستتر و ب هێزتر، بەری وان د هیلاك برن، گەلە وەلات تێكڤەدابوون، ئەرێ رەڤینەك [ژ مرنێ یان ژ ئیزایا خودێ] وان هەبوو؟. ﴿٣٧﴾ ب راستی ئەڤە [د هیلاكبرنا گوندێت ستەمكار] چامە و دەرسن، بۆ وی یێ خودان عەقل، یان بۆ وی یێ گوهدارییێ دكەت و هشێت وی د سەرێ وی. ﴿٣٨﴾ ب سویند مە ئەرد و ئەسمان و هندی د ناڤبەرا واندا، د شەش رۆژاندا چێكرن، و چو وەستیان ژی نەگەهشتە مە. ﴿٣٩﴾ ڤێجا [هەی موحەمەد] سەبرا خۆ ل سەر یا ئەو دبێژن بكێشە، و بەری رۆژهەلات و رۆژئاڤاییێ، خودایێ خۆ ژ كێماسیيان پاقژ بكە، و پەسن و سوپاسیيا وی بكە. ﴿٤٠﴾ و چەندەكێ ژ شەڤێ ژی تەسبیحا وی بكە، و پشتی نڤێژان ژی.. ﴿٤١﴾ گوهێ خۆ بدێ، رۆژا گازیكەر (ئسرافیل) ژ جهەكێ نێزیك گازی دكەت [و دەنگ دگەهیتە هەر كەسەكی]. ﴿٤٢﴾ رۆژا [هەمی مرۆڤ] وی دەنگێ هەقییێ گولێ دبن، ئەو [رۆژ] رۆژا دەركەڤتنێیە [ژ گۆڕان]. ﴿٤٣﴾ ب راستی ئەم ب تنێ، ژیانێ و مرنێ ددەین، و زڤرین هەر ب بال مەڤەیە. ﴿٤٤﴾ رۆژا ئەرد دكەلشیت، و ئەو ب لەز ژ گۆڕان بەر ب مەیدانا حەشرێ دچن، ئەو كۆمكرنەكا ب ساناهییە ل بەر مە. ﴿٤٥﴾ ئەم چێتر دزانین ئەو چ دبێژن [د دەرهەقێ تە و رۆژا قیامەتێدا]، و تو ل سەر وان نە یێ زۆردەستی [دا ب خورتی وان بكەیە موسلمان]، و ئەوێت ژ ئیزایا مە دترسن، وان ب قورئانێ شیرەت بكە.

## سۆرەتا ذاریات

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٦٠) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ سویند ب بایێت بەلاڤكەر. ﴿٢﴾ و ب ئەورێت باران هەلگر. ﴿٣﴾ ب گەمییێت ب ساناهی دئێن و دچن. ﴿٤﴾ ب ملیاكەتێت كاروباران لێكڤە دكەن. ﴿٥﴾ [سویند ب ڤان هەمیيان] تشتێ پەیمان بۆ هەوە پێ هاتییەدان [ژ مرنێ و قیامەتێ]، راستە. ﴿٦﴾ و رۆژا قیامەتێ و جزادانێ، دێ هەر ئێت.

وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْحُبُكِ ﴿٧﴾ إِنَّكُمْ لَفِى قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ﴿٨﴾ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ
أُفِكَ ﴿٩﴾ قُتِلَ ٱلْخَرَّٰصُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى غَمْرَةٍ سَاهُونَ ﴿١١﴾ يَسْـَٔلُونَ
أَيَّانَ يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿١٢﴾ يَوْمَ هُمْ عَلَى ٱلنَّارِ يُفْتَنُونَ ﴿١٣﴾ ذُوقُوا۟ فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا
ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾
ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾
كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾
وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ
لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ وَفِى ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ
وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَآ أَنَّكُمْ
تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذْ
دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًا ۖ قَالَ سَلَٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ
أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٢٧﴾
فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٢٨﴾
فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴿٢٩﴾
قَالُوا۟ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٠﴾



﴿٧﴾ و سويند ب ئەسمانێ جوان و خودان ڕێكێت
موكوم [ڕێكێت ستێران]. ﴿٨﴾ ب ڕاستی هوین [د
دەرهەقێ موحەمەديدا] هەر جارێ ئاخڤتنەكێ دكەن
[جار دبێژن سێربەندە، و جار دبێژن یێ دینە، و
جار ژی دبێژن هەلبەستڤانە]. ﴿٩﴾ ئەو دێ ژ باوەری
ئینانێ [ب قورئانێ و موحەمەدی] ئێنە دویرئێخستن،
ئەوێت [ژ ڕاستەرێییێ] هاتینە دویرئێخستن.
﴿١٠﴾ لەعنەت ل درەوینان بن [ئەوێت هەر جارەكێ
تشتەكی د دەرهەقێ پێغەمبەریدا دبێژن]. ﴿١١﴾ ئەوێت
د نەزانینێدا، بێ ئاگەه. ﴿١٢﴾ [بۆ ترانە] پسیار دكەن،
پا كەنگییە ڕۆژا جزادانێ (ڕۆژا قیامەتێ)؟ ﴿١٣﴾ ئەو
ڕۆژە ئەوا ئەو ل سەر ئاگری دئێنە سۆتن. ﴿١٤﴾ [وێ
ڕۆژێ ملیاكەت دێ بێژنە وان] دێ ئیزایا خۆ بخۆن و
تامكەنێ، ئەڤە بوو یا هوین [د دنیایێدا و ژ لەكەڤە]
ل هاتنا وێ ب لەز. ﴿١٥﴾ ب ڕاستی پارێزكار یێت
د ناڤ جنیك و كانیاندا. ﴿١٦﴾ تشتێ خودایێ وان
دایییە وان وەردگرن و ڕازینە، ب ڕاستی ئەو بەری
نوكە [د دنیایێدا] ژ قەنجیكاران بوون. ﴿١٧﴾ ئەو
پیچەك ژ شەڤێ دنڤستن. ﴿١٨﴾ و ئەو بەرێ سپێدەیان [خودێ دپەرستن و] و داخوازا ژێبرنا گونەهان ژ
خودێ دكرن. ﴿١٩﴾ و خێزان و ژارێت خواستەك و ڕویت، خودان بار بوون د مالێ واندا. ﴿٢٠﴾ و د ئەردیدا
نیشان و بەلگە گەلەكن، بۆ وان ئەوێت هەقییێ پەسەند دكەن و پشتەڤانییا وێ دكەن. ﴿٢١﴾ و د هەوە ب
خۆدا ژی [نیشان و بەلگە گەلەكن]، ما هوین نابینن؟. ﴿٢٢﴾ و ڕزقێ هەوە و هەر تشتێ پەیمان بۆ هەوە
پێ دئێتەدان یێ ل ئەسمانی. ﴿٢٣﴾ سویند ب خودایێ ئەرد و ئەسمانی، ئەو تشتێ پەیمان بۆ هەوە پێ
هاتییە دان ڕاستە و بێ گۆمانە، هەروەكی ئاخڤتنا هەوە نوكە یا بێ گۆمان ل دەڤ هەوە. ﴿٢٤﴾ ئەرێ بەحسێ
مێڤانێت ئیبراهیمی ئەوێت قەدرگران، گەهشتییە تە. ﴿٢٥﴾ وەختێ چۆینە دەڤ، و سلاڤ كرینێ، سلاڤ
ل وان ڤەگێڕا و گۆت: هوین د نەنیاسن [ئەز هەوە نانیاسم]. ﴿٢٦﴾ ڤێجا ب لەز و بێ مێڤان پێ بحەسن،
چۆ ملێ مالێ و گۆلكەكێ قەلەو [براشتی] ئینا. ﴿٢٧﴾ و نێزیكی وان كر، و گۆت: ما هوین ناخۆن؟.
﴿٢٨﴾ ڤێجا [وەختێ ئیبراهیمی دیتی ئەو ناخۆن] د دلێ خۆدا ژ وان ترسیا، گۆتن: نەترسە، و مزگینییا
كوڕەكێ زانا دانێ. ﴿٢٩﴾ ژنا وی ب دەنگەكێ بلند پێشڤە هات و تەپەك ل سەروچاڤێت خۆ دا، و گۆت:
[وەیلێ ئەزێ چاوا دێ من بچویك بن] و ئەز پیرەژنم و یا خرشم. ﴿٣٠﴾ ملیاكەتان گۆت: [ئەم چاوا
دبێژین، وەسایە] خودایێ تە هۆسا ئەمرێ دایی، و هەر ئەوە كاربنەجهـ و زانا.

الجزء ٢٧ الحزب ٥٣

۞قَالَ فَمَا خَطۡبُكُمۡ أَيُّهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ٣١ قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمٖ
مُّجۡرِمِينَ ٣٢ لِنُرۡسِلَ عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن طِينٖ ٣٣ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ
لِلۡمُسۡرِفِينَ ٣٤ فَأَخۡرَجۡنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٣٥ فَمَا وَجَدۡنَا
فِيهَا غَيۡرَ بَيۡتٖ مِّنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ٣٦ وَتَرَكۡنَا فِيهَآ ءَايَةٗ لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ
ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ٣٧ وَفِي مُوسَىٰٓ إِذۡ أَرۡسَلۡنَٰهُ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ بِسُلۡطَٰنٖ
مُّبِينٖ ٣٨ فَتَوَلَّىٰ بِرُكۡنِهِۦ وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٞ ٣٩ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ
فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٞ ٤٠ وَفِي عَادٍ إِذۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلرِّيحَ
ٱلۡعَقِيمَ ٤١ مَا تَذَرُ مِن شَيۡءٍ أَتَتۡ عَلَيۡهِ إِلَّا جَعَلَتۡهُ كَٱلرَّمِيمِ ٤٢
وَفِي ثَمُودَ إِذۡ قِيلَ لَهُمۡ تَمَتَّعُواْ حَتَّىٰ حِينٖ ٤٣ فَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ
فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ٤٤ فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مِن قِيَامٖ
وَمَا كَانُواْ مُنتَصِرِينَ ٤٥ وَقَوۡمَ نُوحٖ مِّن قَبۡلُۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا
فَٰسِقِينَ ٤٦ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ٤٧ وَٱلۡأَرۡضَ
فَرَشۡنَٰهَا فَنِعۡمَ ٱلۡمَٰهِدُونَ ٤٨ وَمِن كُلِّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَا زَوۡجَيۡنِ
لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ٤٩ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ٥٠
وَلَا تَجۡعَلُواْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ٥١



﴿٣١﴾ [پشتی ئیبراهیمی زانی ملیاکەتن] گۆت: گەلی هنارتییان هەوە خێرە، هوین بۆ چ هاتینە هنارتن. ﴿٣٢﴾ گۆتن: ب ڕاستی ئەم بۆ ملەتەکێ گونەهکار یێت هاتینە هنارتن [کو ملەتێ (لووط) پێغەمبەرە]. ﴿٣٣﴾ دا بەرێت هەڕییێ ب سەردا ببارینین. ﴿٣٤﴾ ئەو بەرێت ل نك خودێ د نیشانکری بۆ زێدە گونەهکاران. ﴿٣٥﴾ و مە ئەوێت باوەریدار هەمی ژ گوندی دەرئێخستن. ﴿٣٦﴾ و مە ژ مالەکا موسلمان پێڤەتر، د وی گوندیدا، نەدیت. ﴿٣٧﴾ و مە نیشانەك (شوینوار و کاڤلێت وان)، بۆ ئەوێت ژ ئیزایا دژوار دترسن، تێدا هێلا. ﴿٣٨﴾ دیسا مە د چیرۆکا موسایدا ژی نیشانەك هێلا، وەختێ مە ب نیشان و بەلگەیێت ڕۆن و ئاشکراڤە، هنارتییە دەڤ فیرعەونی. ﴿٣٩﴾ ڤێجا ب هێز و کۆما خۆڤە پشتا خۆ دا موسایی، و گۆت: یان [موسا] سێربەندە یان ژی یێ دینە. ﴿٤٠﴾ و مە ئەو و لەشکەرێ وی گرتن، و ئاڤێتنە د دەریایێدا [و مە هەمی خەندقاندن، و کەس ژێ نەما] و ئەو یێ لۆمەکار بوو. ﴿٤١﴾ و دیسا د چیرۆکا عادادا ژی [ملەتێ هوود پێغەمبەر]، مە نیشانەك هێلا، وەختێ مە ڕەشەبایەکێ هشك ب سەر واندا هنارتی. ﴿٤٢﴾ هەر تشتێ د سەرڕا دبۆری، پێتی و پرت پرت دکر. ﴿٤٣﴾ دیسا د چیرۆکا (سەموود)دا ژی [ملەتێ صالح پێغەمبەر]، مە نیشانەك هێلا، وەختێ مە گۆتییە وان هەتا دەمەکێ ئاشکەرا بژین و خۆشیان ببەن. ﴿٤٤﴾ و وان خۆ ل سەر گوهداری و پەرستنا خودێ مەزن کر [و ژ ئەمرێ خودێ دەرکەڤتن]، ڤێجا برویسییێ هنگاڤتن و بەرێ وان لێ بوون. ﴿٤٥﴾ نە وان ڕابوون پێ چێ بوو، و نە هاریکارییا وان هاتەکرن. ﴿٤٦﴾ و دیسا مە ملەتێ نووح پێغەمبەر ژی بەری وان د هیلاك برن، ب ڕاستی ئەو ملەتەکێ ژ ڕێدەرکەڤتی بوو. ﴿٤٧﴾ و مە ئەسمان ب هێز یێ چێ کری، و ئەم خودان شیانین. ﴿٤٨﴾ و ئەرد مە یێ ڕائێخستی و دەشتکری [کو ب کێر ژیانێ بێت]، وەی ئەم چ خۆش ئەرد ڕائێخین. ﴿٤٩﴾ و ژ هەر تشتەکی مە جۆتەك دا، دا هوین هزرا خۆ تێدا بکەن. ﴿٥٠﴾ ڤێجا ب بال خودێڤە بزڤرن، و ئەز ژ دەڤ وی بۆ هەوە ئاگەهدارکەرەکێ ئاشکرامە. ﴿٥١﴾ و هوین [گەلی مرۆڤان] چو هەڤپشکان بۆ خودێ چێ نەکەن، ئەز ژ دەڤ خودێ بۆ هەوە ئاگەهدارکەرەکێ ئاشکرامە.

كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ
أَوۡ مَجۡنُونٌ ﴿٥٢﴾ أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ﴿٥٣﴾ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ
فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٖ ﴿٥٤﴾ وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٥﴾ وَمَا
خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَآ أُرِيدُ مِنۡهُم مِّن رِّزۡقٖ
وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطۡعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ ﴿٥٨﴾
فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذَنُوبٗا مِّثۡلَ ذَنُوبِ أَصۡحَٰبِهِمۡ فَلَا
يَسۡتَعۡجِلُونِ ﴿٥٩﴾ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن يَوۡمِهِمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ﴿٦٠﴾

سُورَةُ الطُّورِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلطُّورِ ﴿١﴾ وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ ﴿٢﴾ فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ ﴿٣﴾ وَٱلۡبَيۡتِ
ٱلۡمَعۡمُورِ ﴿٤﴾ وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ ﴿٥﴾ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ﴿٦﴾ إِنَّ
عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٞ ﴿٧﴾ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٖ ﴿٨﴾ يَوۡمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ
مَوۡرٗا ﴿٩﴾ وَتَسِيرُ ٱلۡجِبَالُ سَيۡرٗا ﴿١٠﴾ فَوَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾
ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي خَوۡضٖ يَلۡعَبُونَ ﴿١٢﴾ يَوۡمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ
جَهَنَّمَ دَعًّا ﴿١٣﴾ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾



﴿٥٢﴾ هۆسا چـو پێغەمبـەر بـۆ ئەڤێـت بـەری ڤـان ژی
نەهاتینـە هنارتـن، و وان نەگۆتبیـت [ئـەو پێغەمبـەر]
یـان سێربەندە یـان یـێ دینـە [ڤێجـا ب خـەم نەکەڤـە،
ژ بـەر وێ یـا ئـەو د دەرهەقـێ تـەدا دکـەن و دبێـژن].
﴿٥٣﴾ ئەرێ وان شـیرەت و وەسـیەت ل ئێـك و دو کرینە
[دا هەمـی هۆسـا ل سـەر ئێـك ئاخفتنـێ کـۆم ببـن]،
نەخێر بەلێ ئەو زێدە د سـەرداچوینە. ﴿٥٤﴾ ڤێجا ژ وان
بگـەڕە و بەرێ خـۆ ژ وان وەرگێڕە، تو نەیـێ لۆمەکاری
[یا تە بـەس گەهاندنـە]. ﴿٥٥﴾ و [ب قورئانێ] بەردەوام
شـیرەتان بکـە، ب ڕاسـتی بـەس خـودان بـاوەر فایدەی
ژ شـیرەتان دکـەن. ﴿٥٦﴾ و مـن ئەجنـە و مـرۆڤ بـەس
بۆ هنـدێ یـێت دایـن، مـن بپەرێسـن. ﴿٥٧﴾ مـن چـو
ڕزق ژ وان نەڤێـت [بدەنـە مـن یـان بدەنـە خۆ یـان بدەنە
غەیـری خـۆ، ئـەزم یـێ ڕزقـی ددەم]، و مـن نەڤێت ئەو
خوارنـێ بدەنـە مـن [نـە بۆ مـن، نە بـۆ بەندەیـێت من].
﴿٥٨﴾ ب ڕاسـتی خودێیـە ڕازق و خـودان هێـز و هێـز
موکـوم. ﴿٥٩﴾ ڤێجـا ب ڕاسـتی ئەوێـت سـتەم کریـن
[ژ ملەتـێ تـە و ئەوێـت گاوربوویـین]، پشـك و بـارەك
ژ ئیزایـێ یـا هـەی، وەکـی پشـك و بـارا هەڤالێـت وانـە [ئەوێـت مـە د هیـلاك بریـن ژ ملەتـێ نـووح و عـاد و
(سـەموود)]، ڤێجـا بـلا لەزێ نەکـەن. ﴿٦٠﴾ و ئیزا و نەخۆشـی بۆ وان بن ئەوێـت گاوربوویـین، وێ ڕۆژێ ئەوا
پەیمان بـۆ وان پـێ هاتیـە دان [و ئـەو ڕۆژ، یـان ڕۆژا بەدرێیـە یـان یـا قیامەتێیـە].

## سۆرەتا طوور

### ل مەکەهێ هاتیـە خوارێ (٤٩) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ سـویند ب [چیایـێ] (طوور)ێ [ئەوێ خودێ ل سـەر، د گەل مووسـایی ئاخفتی]. ﴿٢﴾ و سـویند ب وێ
کتێبـا ڕێـز ڕێز نڤێسـی [کو قورئانـە]. ﴿٣﴾ [و ئەو قورئان] د پیسـتەکێ ڤەکریـدا [ئانکو ئەڤ قورئانە یا بەردەسـتە
بۆ هـەوە هەمیـان و یـا ڤەکریـیە و گرتینینـە ل دەڤ پێغەمبـەری تنـێ کـو هویـن چ لێ نەزانـن]. ﴿٤﴾ و سـویند
ب ئاڤاهیـێ ئاڤـا [ئـەوێ دکەڤیتـە ئەسـمانـێ حەفتـێ، ملیاکـەت تێدا خـودێ دپەرێسـن و تەسـبیحا وی دکەن].
﴿٥﴾ و سـویند ب بانـێ بلندکـری [کو ئەسمـانە]. ﴿٦﴾ و سـویند ب دەریایا تژی ئاڤ [یان یـا ڕۆژا قیامەتێ دبیتە
ئاگـر]. ﴿٧﴾ ب ڕاسـتی ئیزایـا خـودێ یـا هاتیـیە [و هەر دێ ئێـت]. ﴿٨﴾ چو ئاسـتەنگ پاشـڤەبەر د ڕێـکا وێدا
[ئیزایـێ] نینـە [نەهێلیـت بێت]. ﴿٩﴾ ڕۆژا ئەسمـان دئێێن و دچن، و دزڤـڕن و ب ناڤێك دکەڤـن. ﴿١٠﴾ و ڕۆژا
چیـا ژی ژ جهـێ خـۆ دچـن [و وەکـی ئەوران دچـن و بەربـا دبـن]. ﴿١١﴾ ڤێجا وەی ئیـزا و نەخۆشـی وێ ڕۆژێ
بۆ وان، ئەوێـت بـێ بـاوەر و ڕۆژا قیامەتـێ درەو ددانـان. ﴿١٢﴾ ئەوێـت ب گـەرمـی ب ناڤ پویچاتیـێدا دچۆن،
و ئاگەهــ ژ خـۆ نـەی. ﴿١٣﴾ ڕۆژا بـۆ دۆژەهێ دئێنـە پالدان پالدانـەکا حێـل. ﴿١٤﴾ [دەرگەهڤانێـت دۆژەهێ دێ
بێژنـە وان:] ئەڤـە ئەو ئاگرە یـێ هـەوە درەو ددانا.

أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴿١٥﴾ ٱصْلَوْهَا فَٱصْبِرُوٓا۟
أَوْ لَا تَصْبِرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ ۖ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾
إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَعِيمٍ ﴿١٧﴾ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ
وَوَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَا
كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ ۖ وَزَوَّجْنَٰهُم
بِحُورٍ عِينٍ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا
بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ ۚ كُلُّ ٱمْرِئٍۭ بِمَا
كَسَبَ رَهِينٌ ﴿٢١﴾ وَأَمْدَدْنَٰهُم بِفَٰكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢٢﴾
يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ ﴿٢٣﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ
غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴿٢٤﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ
بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِىٓ أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴿٢٦﴾
فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا
مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾ فَذَكِّرْ فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ
رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴿٢٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ
ٱلْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ قُلْ تَرَبَّصُوا۟ فَإِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُتَرَبِّصِينَ ﴿٣١﴾

ربع الحزب ٥٣





﴿١٥﴾ ئەرێ ئەڤە [ئەڤ ئاگرە] سحرە؟ یان ژی هوین نابینن؟. ﴿١٦﴾ هەرنە تێدا و تامکەنێ، ڤێجا هوین سەبرا خۆ بکێشن یان نەکێشن ئێکە، هوین وێ دخۆن یا هەوە کری. ﴿١٧﴾ ب ڕاستی پارێزکار و تەقوادار یێت د بەحەشت و خۆشیاندا. ﴿١٨﴾ دلخۆشن ب تشتێ خودایێ وان دایییە وان، و خودایێ وان ئەو ژ ئیزایا دۆژەهێ پاراستن. ﴿١٩﴾ بخۆن و ڤەخۆن، هەوە نۆشی جان بیت، ژ بەر وان کار و کریارێت هەوە دکرن. ﴿٢٠﴾ یێت پالدایینە ل سەر تەختێت ڕێزکری، و مە پەرییێت چاڤگر یێت کرینە هەڤسەرێت وان. ﴿٢١﴾ و ئەوێت باوەری ئینایین و دویندەها وان ژی ل سەر باوەرییێ ڕێکا وان گرتی، مە دویندەها وان گەهاندە وان [د بەحەشتێدا، دا چاڤێت وان ب دویندەها وان ڕۆن ببن و کەیفا وان بێت]، و مە چو ژ کار و کریارێت وان کێم نەکر، هەر ئێك ب کار و کریارێت خۆڤە یێ گرێدایییە. ﴿٢٢﴾ و هەر فێقی و گۆشتەکێ دلێ وان دچیتێ، ئەم ددەینە وان. ﴿٢٣﴾ و ئەو د بەحەشتێدا پەرداغێت مەیێ ژ ئێك و دو وەردگرن، نە ئاخڤتنێت بەروڤاژی [ئانکو بێ مفا] نە ژی یێت ب گونەه، تێدا دبێژن. ﴿٢٤﴾ کوڕەلاو بۆ خزمەتێ ل سەر وان دگەڕن، دێ بێژی لۆلۆیێت دەست لێ نەدایینە [هندی هند زەلال و جوانن]. ﴿٢٥﴾ و [بەحەشتی] بەرێ خۆ ددەنە ئێك و دو، و پسیارا کاروبارێت دنیایێ ژ ئێك و دو دکەن. ﴿٢٦﴾ دێ بێژن: ب ڕاستی ئەم د دنیایێدا [ژ ئیزایا خودێ] یێت د ترسیایی بووین. ﴿٢٧﴾ ڤێجا خودێ کەرەم د گەل مە کر، و ئەم ژ ئاگرێ لەشسوم پاراستین. ﴿٢٨﴾ ب ڕاستی د دنیایێدا، مە ئەو دپەرست و مە دوعا ژ وی دکرن [کو ئەو مە ئازا بکەت، و گونەهێت مە ژێ ببەت]، ب ڕاستی ئەوە قەنجیبەخش و خودان کەرەم و دلۆڤان. ﴿٢٩﴾ ڤێجا [هەی موحەمەد] بەردەوام شیرەتان ل وان بکە، و تو ب کەرەما خودایێ خۆ [ئانکو ب پێغەمبەراتییێ]، نە خێڤزانکی و نە یێ دینی [هەروەکی ئەو دبێژن]. ﴿٣٠﴾ یان ژی دبێژن ئەو هەلبەستڤان و شاعرەکە، و ئەم یێ ل هیڤییێ بەلایەکا دنیایێ بێتە سەری و پێ بچیت [و ئەم ژێ ڕەحەت ببین]. ﴿٣١﴾ [هەی موحەمەد] بێژە: چاڤەڕێی مرنا من بن، ب ڕاستی ئەز ژی د گەل هەوە دێ ژ چاڤەڕێیان بم [و دێ بەرێ خۆ دەینێ، کا خودێ دێ کێ بەرئاتاف کەت].

أَمۡ تَأۡمُرُهُمۡ أَحۡلَٰمُهُم بِهَٰذَآۚ أَمۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ٣٢ أَمۡ يَقُولُونَ
تَقَوَّلَهُۥۚ بَل لَّا يُؤۡمِنُونَ ٣٣ فَلۡيَأۡتُواْ بِحَدِيثٖ مِّثۡلِهِۦٓ إِن كَانُواْ
صَٰدِقِينَ ٣٤ أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ٣٥
أَمۡ خَلَقُواْ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ٣٦ أَمۡ عِندَهُمۡ
خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمۡ هُمُ ٱلۡمُصَۜيۡطِرُونَ ٣٧ أَمۡ لَهُمۡ سُلَّمٞ
يَسۡتَمِعُونَ فِيهِۖ فَلۡيَأۡتِ مُسۡتَمِعُهُم بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ٣٨
أَمۡ لَهُ ٱلۡبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلۡبَنُونَ ٣٩ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ
مُّثۡقَلُونَ ٤٠ أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ ٤١ أَمۡ يُرِيدُونَ
كَيۡدٗاۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هُمُ ٱلۡمَكِيدُونَ ٤٢ أَمۡ لَهُمۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِۚ
سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٤٣ وَإِن يَرَوۡاْ كِسۡفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطٗا
يَقُولُواْ سَحَابٞ مَّرۡكُومٞ ٤٤ فَذَرۡهُمۡ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي فِيهِ
يُصۡعَقُونَ ٤٥ يَوۡمَ لَا يُغۡنِي عَنۡهُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ٤٦
وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ عَذَابٗا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ
لَا يَعۡلَمُونَ ٤٧ وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ
رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ٤٨ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ وَإِدۡبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ٤٩



﴿٣٢﴾ ئەرێ ئەقلێ وان، فەرمانا وان ب ڤێ ئاخڤتنێ دكەت [جار دبێژن قورئان سحرە، یان ژی شۆلێ خێڤزانكانە یان شعرە]، نەخێر وەنینە بەلێ ئەو ملەتەكێ زێدە سەرداچۆیینە [ژ كەرب و عیناد ڤێ ئاخڤتنێ دبێژن]. ﴿٣٣﴾ یان ژی دبێژن: [موحەمەدی ئەڤ قورئانە] یا ژ دەڤ خۆ چێكری؟ نەخێر وەسا نینە بەلێ ئەو باوەرییێ نائینن. ﴿٣٤﴾ بلا ئاخڤتنەكا وەكی قورئانێ بینن، ئەگەر ڕاست دبێژن [كو ئەڤ قورئانە نە ژ دەڤ خودێیە، و موحەمەدی ژ نك خۆ یا چێكری]. ﴿٣٥﴾ ئەرێ ئەو بێ چێكەر هاتینە چێ كرن، یان ژی وان ب خۆ، خۆ دایییە؟. ﴿٣٦﴾ یان ژی وان ئەرد و ئەسمان چێ كرینە؟ نەخێر وان چو ژ ڤان چێ نەكرینە بەلێ ئەو ئێقینێ نائینن [كو خودێیە چێكەرێ وان و یێ ئەرد و ئەسمانان]. ﴿٣٧﴾ یان ژی گەنجخانە و خزینەیێت خودایێ تە د دەست واندانە؟ یان ژی ئەون سەردەست و خودان دەستهەلات [ل سەر هەمی تشتان، چ یا بڤێن دكەن]. ﴿٣٨﴾ یان ژی وان پێسترك هەنە [پێ دچنە ئەسمانان]، و گول [ئاخڤتنا ملیاكەتان] دبن [و ب ڤێ ڕێكێ ب سەر غەیبێ هلدبن، و پێ دزانن ئەو یێت ل سەر هەقییێ، ژ بەر هندێ ڕێكا خۆ ناهێلن]، بلا گوهدێرێ وان، نیشان و بەلگەیەكا ڕۆن و ئاشكەرا بینیت. ﴿٣٩﴾ ئەرێ كچ یێت وینە، و كوڕ یێت هەوەنە؟ ﴿٤٠﴾ یان ژی تو كرێ [ل سەر ڕاگەهاندنا ڤێ پەیامێ] ژ وان دخوازی، ڤێجا ژ بەر هندێ بارێ وان یێ گرانە [و موسلمان نابن و باوەرییێ ب تە نائینن]. ﴿٤١﴾ یان ژی غەیب ل دەڤ وانە، و ئەو دنڤێسن. ﴿٤٢﴾ یان ژی ئەو ل بەر پیلانەكێ دگەڕن؟ نێ ئەو پیلان دێ ب سەرێ واندا شكێت ئەوێت گاوربوویین. ﴿٤٣﴾ یان ژی وان پەرستییەك غەیری خودێ هەیە؟ ب ڕاستی خودێ ژ وێ شركا ئەو ب بال ویڤە لێ ددەن، یێ پاقژە. ﴿٤٤﴾ و ئەگەر ئەو گاور ببینن پارچەیەك یا ژ ئەسمانی دادكەڤیت [هەر باوەرییێ نائینن]، و دێ بێژن عەورە یێ كەڤتییە سەرێك. ﴿٤٥﴾ ڤێجا ژ وان بگەڕە هەتا دگەهنە ڕۆژا خۆ، ئەوا ئەو تێدا د هیلاك دچن (ڕۆژا بەدرێیە، یان یا مرنێ، یان ڕۆژا قیامەتێیە). ﴿٤٦﴾ ڕۆژا نەخشە و پیلانێت وان چو ئێزایا خودێ ژ وان نەدەتە پاش، و هاریكارییا وان ژی نەئێتەكرن [و ئێزا ژ وان نەئێتە ڤەگرتن]. ﴿٤٧﴾ و ب ڕاستی ئێزایەكا دی ژی ژ بلی ئێزایا ئاخرەتێ [كو ئێزایا گۆڕییە]، بۆ ئەوێت ستەم كرین یا هەی، بەلێ باراپتر ژ وان ڤێ نوزانن. ﴿٤٨﴾ ڤێجا سەبری ل سەر حوكمێ خودایێ خۆ بكێشە [و بێنا خۆ ل وان فرەهـ بكە، هەتا ئێزایا مە گۆتی ب سەرێ وان بێت]، و ب ڕاستی تو یێ ل بەر چاڤێت مە و د بن چاڤدێری و پارستنا مەڤە [ڤێجا پویتە ب وان نەكە، و خەما وان ڕانەكە]، و گاڤا تو [ژ ڕوینشتنا خۆ] ڕادبی، خودایێ خۆ ژ كێماسییان پاقژ بكە، و پەسنا وی بكە [بێژە (سبحان الله وبحمده)]. ﴿٤٩﴾ و ب شەڤێ و پشتی ستێر ئاڤا دبن، خودایێ خۆ ژ كێماسییان پاقژ بكە [یان ب شەڤێ ڤان نڤێژان (مەغرەب، عەیشا و شەڤنڤێژان، و دو ڕوكعەتێت بەری سپێدێ) بكە].

سُورَةُ النَّجْمِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ١ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ٢ وَمَا يَنطِقُ عَنِ
ٱلْهَوَىٰٓ ٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ٤ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ٥ ذُو مِرَّةٍ
فَٱسْتَوَىٰ ٦ وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ٧ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ٨ فَكَانَ قَابَ
قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ٩ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ١٠ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ
مَا رَأَىٰٓ ١١ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ١٢ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ١٣
عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ١٤ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ١٥ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ
مَا يَغْشَىٰ ١٦ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ١٧ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ
ٱلْكُبْرَىٰٓ ١٨ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ١٩ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ٢٠
أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ٢١ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ٢٢ إِنْ هِيَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ
سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا
ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ٢٣ أَمْ لِلْإِنسَٰنِ
الحزب ٥٣ مَا تَمَنَّىٰ ٢٤ فَلِلَّهِ ٱلْءَاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ ٢٥ ۞ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
لَا تُغْنِى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ٢٦



## سۆرەتا نەجم

### ل مەکەهێ هاتیە خوارێ (٦٢) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ سویند ب ستێرێ وەختێ ئاڤا دبیت. ﴿٢﴾ هەڤالێ هەوە [مەخسەد پێ پێغەمبەرە] گومڕا نەبوویییە، و چو جارا پویچ نەئاخڤتییە. ﴿٣﴾ و ئەو ژ دەڤ خۆ و ژ دلخوازییا خۆ نائاخڤیت. ﴿٤﴾ و نائاخڤیت ئەگەر ژ وەحییێ نەبیت [ئانکو قورئان ژ وەحییێ پێڤەتر نینە]. ﴿٥﴾ خودانێ هێزا مەزن، ئەڤ وەحییە یا بۆ ئینایی و نیشادایی. ﴿٦﴾ ئەو [یێ وەحی بۆ ئینایی، کو جبریلە] خودان هێز و تێگەهشتن و خودان قەدرە، و ل سەر ڕەنگێ خۆ یێ دورست (د کراسێ ملیاکەتینیێدا) ڕاوەستیا [و خۆ نیشا پێغەمبەری دا]. ﴿٧﴾ و ئەو ل پەرێ ئەسمانی بوو، ملێ ڕۆژئاڤایێ. ﴿٨﴾ پاشی [ئانکو پشتی ل سەر وێنەیێ خۆ یێ دورست، ل پەرێ ئەسمانی دیار بووی] نێزیکی پێغەمبەری بوو، و پتر نێزیک بوو. ﴿٩﴾ و قەدەرا دو کڤانان یان کێمتر [نێزیک] بوو. ﴿١٠﴾ ڤێجا [جبریلی ب ئەمرێ خودێ] ئەو وەحی بۆ بەندەیێ خودێ ئینا ئەوا خودێ بۆ هنارتی. ﴿١١﴾ دلێ پێغەمبەری، ئەوا پێغەمبەری ب چاڤێ خۆ دیتی، درەو نەدانا [کو دیتنا جبریلییە ل سەر وێنەیێ وی یێ دورست]. ﴿١٢﴾ ئەرێ هوین جڕەبڕێ د گەل وی دکەن ل سەر تشتێ وی دیتی؟ ﴿١٣﴾ ب سویند د هاتنەخوارەکا جبریلی یا دی ژیدا پێغەمبەری ئەو (جبریل) ل سەر ڕەنگێ وی یێ دورست دیتبوو. ﴿١٤﴾ [شەڤا چۆنا ئەسمانان] ل دەڤ دارکنێرا خلاسیێ [کو دکەڤیتە ئەسمانێ حەفتێ، ل وێرێ زانینا ملیاکەتان ب دویماهی دئێت، و ژ وێرێ وێڤە ژ خودێ پێڤەتر، کەسێ دی نوزانیت کا چ هەیە]. ﴿١٥﴾ بەحەشتا ئێورگەهێ یا ل دەڤ. ﴿١٦﴾ و دار دیت وەختێ یا نخافتی، ب وی تشتێ پێ نخافتی [کو کەسەک نەشێت ژ بلی خودێ، سالۆخەتێت وێ بێژیت]. ﴿١٧﴾ چاڤێ وی ب چو ڕەخێت دیدا نەهاتە گێڕان، و ژ تخویبێ بۆ هاتییە دانان نەبۆری. ﴿١٨﴾ ب سویند ئەوی [مەخسەد پێغەمبەرە، شەڤا چۆنا ئەسمانان] هندەک نیشانێت مەزن یێت خودایێ خۆ دیتن. ﴿١٩﴾ کا بێژنە من [گەلی قورەیشییان ئەو بوتێت هوین دپەرێسن] لات و عوززا. ﴿٢٠﴾ و یێ سییێ مەنات، کا وان تشتەک ژ وێ شیان و مەزناتییێ هەیە یا خودێ هەی، دا هوین وان بپەرێسن. ﴿٢١﴾ ئەرێ کوڕ بۆ هەوەنە و کچ بۆ خودێ [حاشا وان ملیاکەت دکرنە کچێت خودێ، و وان ب خۆ کچ نەدڤیان]. ﴿٢٢﴾ ئەڤە لێکڤەکرنەکا نەدورستە. ﴿٢٣﴾ ئەڤە [مەخسەد ئەو پەرستییێت ژ بلی خودێ دپەرێسن] ژ هندەک ناڤان پێڤەتر نینن، هەوە و باب و باپیرێت خۆ ناڤێت دانانە سەر، و خودێ چو نیشان و بەلگە پێ نەهنارتینە، و ب ڕاستی ئەو بەس ب دویڤ خیال و خولیان و دلخوازییا خۆ دکەڤن، و ب سویند ڕێکا ڕاستەڕێیییێ [کو ئەڤ قورئانیە] ژ دەڤ خودایێ وان بۆ وان هات [پێ بزانن ئەو بوتن]. ﴿٢٤﴾ ئەرێ مرۆڤی چ بڤێت، دێ بۆ ئێتە جهـ؟ ﴿٢٥﴾ دنیا و ئاخرەت یێت خودێنە [یێ بڤێت دێ ژ دنیایێ و ئاخرەتێ دەتێ، و یێ نەڤێت دێ ژێ ڤەگریت، و نە ب کەیفا مرۆڤینە]. ﴿٢٦﴾ و گەلەک ملیاکەت ل ئەسمانان یێت هەین [هەرچەندە ب شەڤ و ڕۆژ پەرستنا خودێ دکەن]، د گەل هندێ ژی مەهدەرا وان ب چو ناچیت یا وی نەبیت یێ خودێ دەستویرییا وی بدەت و بڤێت [ڤێجا بوت و ب ڤێ بێ بهایا خۆڤە، دێ چاوا مەهدەرێ کەن].

إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ تَسۡمِيَةَ ٱلۡأُنثَىٰ ٢٧
وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغۡنِي مِنَ
ٱلۡحَقِّ شَيۡـٔٗا ٢٨ فَأَعۡرِضۡ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكۡرِنَا وَلَمۡ يُرِدۡ إِلَّا ٱلۡحَيَوٰةَ
ٱلدُّنۡيَا ٢٩ ذَٰلِكَ مَبۡلَغُهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن
سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱهۡتَدَىٰ ٣٠ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي
ٱلۡأَرۡضِ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ
بِٱلۡحُسۡنَى ٣١ ٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَۚ
إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلۡمَغۡفِرَةِۚ هُوَ أَعۡلَمُ بِكُمۡ إِذۡ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ
وَإِذۡ أَنتُمۡ أَجِنَّةٞ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡۖ فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ
بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ٣٢ أَفَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي تَوَلَّىٰ ٣٣ وَأَعۡطَىٰ قَلِيلٗا وَأَكۡدَىٰٓ ٣٤
أَعِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلۡغَيۡبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ٣٥ أَمۡ لَمۡ يُنَبَّأۡ بِمَا فِي صُحُفِ
مُوسَىٰ ٣٦ وَإِبۡرَٰهِيمَ ٱلَّذِي وَفَّىٰٓ ٣٧ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰ ٣٨
وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ٣٩ وَأَنَّ سَعۡيَهُۥ سَوۡفَ يُرَىٰ ٤٠
ثُمَّ يُجۡزَىٰهُ ٱلۡجَزَآءَ ٱلۡأَوۡفَىٰ ٤١ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلۡمُنتَهَىٰ ٤٢
وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضۡحَكَ وَأَبۡكَىٰ ٤٣ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحۡيَا ٤٤



﴿٢٧﴾ ب ڕاستی ئەویت ژ ئاخرەتێ بێ باوەر،
ملیاکەتان دکەنە کچ. ﴿٢٨﴾ و وان چو بەلگە و نیشان
ب ڤێ چەندێ نینن [کو ملیاکەت ییت مێنە، و حاشا
کچێت خودێنە]، بەس ب دویڤ خیال و خولیانان
دکەڤن، و خیال چوجا جهێ هەقییێ ناگریت.
﴿٢٩﴾ ڤێجا [هەی موحەمەد] بەرێ خۆ ژ وی وەرگێرە
ئەوێ پشتا خۆ داییە قورئانێ، و باوەری پێ نەئینایی
و ژ ژیانا دنیایێ پێڤەتر نەڤیایی. ﴿٣٠﴾ ئەڤە ژ ڤێ پێڤەتر
نوزانن و زێدەتر ژێ چێ ناکەن، ب ڕاستی خودایێ
تە چێتر دزانیت کا کی ژ ڕێکا وی دەرکەڤتییە، و ئەو
چێتر دزانیت کا کی ل سەر ڕێکا وییە. ﴿٣١﴾ و هندی
د ئەرد و ئەسماناندا هەی یێ خودێیە [و خودێ ییت
چێ کرین] دا ئەوێت خرابی کرین ب خرابیا وان
جزا بکەت، و دا ئەوێت قەنجی کرین ب قەنجییان
خەلات بکەت. ﴿٣٢﴾ ئەوێت (قەنجیکارێت) ژ بلی
گونەهێت بچویک، خۆ ژ هەمی گونەهێت مەزن و
تەرێف [وەکی زنایێ] دپارێزن، ب ڕاستی لێبۆرینا
خودایێ تە یا بەرفرەهە، خودێ هەوە ژ هەوە ب خۆ
چێتر دناسیت، بەری هەوە بدەت [وەختێ بابێ هەوە ئادەم] ژ ئاخێ چێ کری، و وەختێ هێژ هوین د زکێ
دەیکێت خۆدا [دزانی هوین گونەهێت بچویک هەر دێ کەن]، ڤێجا خۆ پاقژ نەدانن و مەدحێت خۆ نەکەن،
ئەو چێتر دزانیت کی یێ ب تەقوایە. ﴿٣٣﴾ بێژە من ئەوێ بەرێ خۆ ژ ئیمانێ وەرگێڕایی [مەخسەد پێ
وەلیدێ کوڕێ موغیرەیە]. ﴿٣٤﴾ ئەوێ پیچەك ژ مالێ خۆ دایی و قەلسی کری. ﴿٣٥﴾ ئەرێ ئەوی زانینا
غەیبێ ل دەڤە ئەو دبینیت [هەڤالێ وی دێ د پێش ویڤە ئیزایی خۆت]. ﴿٣٦﴾ ئەرێ ئەو ب وێ نەهاتییە
ئاگەهدارکرن، ئەوا بۆ مووسایی د تەوراتێدا هاتی. ﴿٣٧﴾ یان ژێ ئەوا بۆ ئیبراهیمی هاتی، ئەو ئیبراهیمێ
ئەمرێ خودێ دورست ب جهـ کری. ﴿٣٨﴾ [بۆ ئیبراهیمی و مووسایی هاتبوو کو ] کەس [بارێ] گونەها
کەسێ نا ڕاکەت. ﴿٣٩﴾ و ژ وێ پێڤەتر ناگەهیتە مرۆڤی، یا مرۆڤی کری. ﴿٤٠﴾ و ب ڕاستی [ڕۆژا قیامەتێ]
مرۆڤ دێ کار و کریارێت خۆ بینیت. ﴿٤١﴾ پاشی خودێ دێ جزایێ وی [بەرانبەری کار و کریارێت
وی] ب دورستی [بێ کێماسی] دەتێ. ﴿٤٢﴾ و ب ڕاستی دویماهییا هەر تشتەکی یا ل دەڤ خودایێ تە.
﴿٤٣﴾ و ب ڕاستی وی، گری و کەنی، ییت داین. ﴿٤٤﴾ و ب ڕاستی وی، ژین و مرن، ییت داین.

وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴿٤٦﴾
وَأَنَّ عَلَيْهِ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُخْرَىٰ ﴿٤٧﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ ﴿٤٨﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ
رَبُّ ٱلشِّعْرَىٰ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّهُۥٓ أَهْلَكَ عَادًا ٱلْأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَاْ فَمَآ
أَبْقَىٰ ﴿٥١﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُواْ هُمْ أَظْلَمَ وَأَطْغَىٰ ﴿٥٢﴾
وَٱلْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ
تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلْأُولَىٰٓ ﴿٥٦﴾ أَزِفَتِ ٱلْأَزِفَةُ ﴿٥٧﴾
لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴿٥٨﴾ أَفَمِنْ هَٰذَا ٱلْحَدِيثِ
تَعْجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمْ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾
سجدة فَٱسْجُدُواْ لِلَّهِ وَٱعْبُدُواْ ۩ ﴿٦٢﴾

## سُورَةُ القَمَرِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوْاْ ءَايَةً يُعْرِضُواْ وَيَقُولُواْ
سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴿٢﴾ وَكَذَّبُواْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُمْ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣﴾
وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴿٤﴾ حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ فَمَا تُغْنِ
ٱلنُّذُرُ ﴿٥﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَيْءٍ نُّكُرٍ ﴿٦﴾



﴿٤٥﴾ و ب ڕاستی وی، جۆتێ نێر و مێیان، یێ دایی.
﴿٤٦﴾ ژ چێكەكا ئاڤێ، وەختێ دچیتە د مالبچویكیدا.
﴿٤٧﴾ و ب ڕاستی ساخكرنا پشتی مرنێ ژی، هەر
ل سەر ویـیە. ﴿٤٨﴾ و ب ڕاستی ئەوە زەنگینییێ و
قەناعەتێ ددەت. ﴿٤٩﴾ و ب ڕاستی ئەوە خودانێ
ستێرا گلاڤێژێ [ئەو خودایێ هەمی ستێرانە، و
ناڤێ گلاڤێژێ ب تنێ ئینا، چونكی هندەك عەرەبان
دپەرست]. ﴿٥٠﴾ و ب ڕاستی ئەوی عاد [ملەتێ هوود
پێغەمبەر] د هیلاك برن. ﴿٥١﴾ و ئەوی (سەموود) ژی
[ملەتێ (صالح) پێغەمبەر] د هیلاك برن، و كەس ژێ
نەهێلا. ﴿٥٢﴾ و بەری وان ملەتێ نووح پێغەمبەر ژی
د هیلاك بربوون، و ئەو ستەمكارتر و سەرداچۆییتر
بوون. ﴿٥٣﴾ و گوندێت (لووط) پێغەمبەر ژی سەروبن
كرن. ﴿٥٤﴾ و ئەو ئیزا ب سەر واندا ئینا، یا ب سەر
واندا ئینایی [گوندێت وان سەروبن كرن، و كەڤرێت
ئاگری ب سەر واندا بارانـدن]. ﴿٥٥﴾ ڤێجا تو هەی
مرۆڤ، د كیژ نیعمەتا خودایێ خۆدا ب گۆمانی
[كو ئەو نیعمەت نە نیشانە ل سەر ئێكینییا خودێ].
﴿٥٦﴾ ئەڤە [ئانكو موحەمەد] پێغەمبەرەكە ژ پێغەمبەران. ﴿٥٧﴾ قیامەت نێزیك بوو. ﴿٥٨﴾ ژ بلی خودێ،
كەس نەشێت بدەتە پاش و ڕابگریت. ﴿٥٩﴾ ئەرێ هوین ژ ڤێ قورئانێ عەجێبگرتی دبن؟ ﴿٦٠﴾ و پێ
دكەنن [و ژ ترساندا] ناگرین [ناكەنە گری]. ﴿٦١﴾ و بەردەوام هوین یێت د بێ ئاگەهی و سەرگەرمییێدا.
﴿٦٢﴾ ڤێجا سوجدەیێ بۆ خودێ ببەن، و وی بپەرێسن.

## سۆرەتا قەمەر

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٥٥) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ قیامەت نێزیك بوو، و هەیڤ بوو دو كەر [ئەڤە موعجیزەیەك بوو ژ موعجیزەیێت پێغەمبەری].
﴿٢﴾ و هەر موعجیزەیەكا ئەو [ئانكو خەلكێ مەكەهێ] ببینن، ڕوییێ خۆ ژێ وەردگێڕن و باوەرییێ پێ
نائینن، و دبێژن: ئەڤە سێربەندییەكا ب هێز و موكومە. ﴿٣﴾ و ئەوان [ئەو نیشان و موعجیزە] درەو دانان و ب
دویڤ دلخوازییا خۆ كەڤتن، و هەر كاروبارەك دێ گەهیتە دویماهیكا خۆ و جهێ خۆ [خێر دێ گەهیتە جهێ
خێرێ، و خرابی دێ گەهیتە جهێ خرابییێ]. ﴿٤﴾ ب سویند [بۆ خەلكێ مەكەهێ] هند بەحسێ ملەتێت
بەرێ، ئەوێت پێغەمبەرێت خۆ درەوین دانایین د قورئانێدا هاتییە كرن، كو بەسی وان بیت پێ ب پاشڤەبچن
[و یا وان كری، ئەو نەكەن]. ﴿٥﴾ ئەڤ قورئانە حیكمەتەكا تمامە [و یا بێ كێم و كاسییە]، و ئاگەهداركرن
چو فایدەی وان [سەررەقان ژ قورەیشییان] ناكەت. ﴿٦﴾ ڤێجا ژ وان بگەڕە [و خۆ ب وانڤە نەوەستینە]
و وان بهێلە بۆ وێ ڕۆژێ، ئەوا ئسرافیل تێدا، وان گازی دكەتە تشتەكێ نەخۆش [و وان باوەری پێ نەیی].

خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ (٧)
مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ ۖ يَقُولُ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ (٨) * كَذَّبَتْ
قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا۟ عَبْدَنَا وَقَالُوا۟ مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ (٩) فَدَعَا
رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ (١٠) فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ (١١)
وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ (١٢)
وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ (١٣) تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ
كُفِرَ (١٤) وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ (١٥) فَكَيْفَ كَانَ
عَذَابِى وَنُذُرِ (١٦) وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ (١٧)
كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ (١٨) إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا
صَرْصَرًا فِى يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ (١٩) تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ
مُّنقَعِرٍ (٢٠) فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ (٢١) وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ
لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ (٢٢) كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ (٢٣) فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرًا
مِّنَّا وَٰحِدًا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ (٢٤) أَءُلْقِىَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ
بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ (٢٥) سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ (٢٦)
إِنَّا مُرْسِلُوا۟ ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ (٢٧)

الحزب ٥٣ (ثلاثة أرباع)





﴿٧﴾ چاڤشۆڕ و چاڤشکەستی ژ گۆڕان دەردکەڤن،
دێ بێژی کولینە بەلاڤبوویین. ﴿٨﴾ [وێ ڕۆژێ]
یێت ب لەزن [و ل کەسێ نازڤڕن] بەر ب گازیکەری
[کو ئسرافیله] دچن، و ئەوێت گاوربوویین دێ بێژن:
ئەڤە ڕۆژەکا زێدە گرانە. ﴿٩﴾ بەری وان (بەری
خەلکێ مەکەهێ) ملەتێ نووحی باوەری نەئینا،
و بەندەیێ مە درەوین دانا، و گۆتن یێ دینە و ب
پاشڤەبرن [و نەهێلان پەیاما خودایێ خۆ بگەهینیت].
﴿١٠﴾ ئینا [نووحی] گازی خودایێ خۆ کر:
[خودێوۆ] ب ڕاستی [تو دزانی] ئەز یێ بن دەست
و بێ هێزم، ڤێجا هاریکاریا من بکە و تۆلێت من
ل وان ڤەکە. ﴿١١﴾ ڤێجا مە دەرگەهێت ئەسمانی
بۆ ئاڤەکا بۆش ڤەکرن. ﴿١٢﴾ و مە کانی ل ئەردی
دەرکرن، و هەردو ئاڤ [ئاڤا بارانێ و یا کانیان] ل
سەر کارەکێ خودێ نڤیسی ڤێک کەڤتن [ئەو ژی د
هیلاکبرنا ملەتێ نووحییە ب تۆفانێ]. ﴿١٣﴾ و مە ئەو
ل سەر وێ گەمیێ هەلگرت، ئەوا ب دەپ و بزماران
هاتییە چێکرن. ﴿١٤﴾ د بن چاڤدێری و پاراستنا مەڤە
[ئەو گەمی] دچۆ، [و یێت ماین مە د ئاڤێدا خەندقاندن] ئەڤە جزایێ وانە ئەوێت گاوربوویین. ﴿١٥﴾ و ب
سویند کارێ مە کری [و مە ب سەرێ وان ئینایی] مە کرە نیشان و بەلگەیەك [بۆ ئەوێ پێڤە بچیت]،
ڤێجا ئێك هەیە پێڤە بچیت و بۆ ببیتە چامە؟. ﴿١٦﴾ و ئیزا و ئاگەهدارکرنا من یا چاوا بوو [بۆ ئەوێت
چو چامە بۆ خۆ ژ نیشان و بەلگەیێت من وەرنەگرتین]. ﴿١٧﴾ و ب سویند مە قورئان بۆ تێگەهشتن و
ژبەرکرن و شیرەت وەرگرتنێ یا ب ساناهی ئێخستی، ئەرێ ئێك هەیە شیرەت و چامەیان ژێ وەرگریت؟.
﴿١٨﴾ ملەتێ عاد ژی [پێغەمبەرێ خۆ، هوود] درەوین دانا، ڤێجا [بەرێ خۆ بدەنێ] کا ئیزا و ئاگەهداکرنا
من یا چاوا بوو. ﴿١٩﴾ ب ڕاستی مە بایەکێ زێدە سار و ب ڤیزەڤیز، د ڕۆژەکا ڕەش و بەردەوامدا، ب سەر
واندا هنارت. ﴿٢٠﴾ [ئەو با] مرۆڤان وەسا ژ جهێت وان ڕادکەت، دێ بێژی قورمێ دارقەسپا هەلکێشاینە.
﴿٢١﴾ ڤێجا ئیزا و ئاگەهدارکرنا من یا چاوا بوو؟. ﴿٢٢﴾ و ب سویند مە قورئان بۆ تێگەهشتن و ژ بەرکرن
و شیرەت وەرگرتنێ یا ب ساناهی ئێخستی، ئەرێ ئێك هەیە شیرەت و چامەیان ژێ وەرگریت؟.
﴿٢٣﴾ ملەتێ (سەموود) ژی باوەری ب پێغەمبەران نەئینا [و درەوین دانان]. ﴿٢٤﴾ و گۆتن: ئەرێ ئەم دێ
چاوا ب دویڤ مرۆڤەکی کەڤین، ژ مە ب خۆ بیت و یێ ب تنێ ژی بیت؟ ب ڕاستی [ئەگەر ئەم وەبکەین]
ئەم یێت د گومڕاییەکا دویری هەقییێدا، و ئەم یێت دینین. ﴿٢٥﴾ ئەرێ ژ ناڤ مە هەمییان وەحی بەس بۆ
وی هات؟ نەخێر وەنینە وەکی ئەو دبێژیت، چو وەحی بۆ وی نەهاتییە بەلێ ئەو درەوینەکێ بەترانە [دڤێت
ب درەوا پێغەمبەراتییێ خۆ ل سەر سەرێ مە مەزن بکەت]. ﴿٢٦﴾ سوبەهی [مەخسەد پێ، وەختێ ئیزا ب
سەر واندا دئێتە خوارێ] دێ زانن کا کی درەوکەرێ بەترانە؟!! ﴿٢٧﴾ [و مە گۆتە (صالح) پێغەمبەری] ئەم
دێ حێشترێ بۆ جەڕباندنا وان هنێرین، ڤێجا بەرێ خۆ بدێ کا دێ چ ب سەرێ وان ئێت، و بێنا خۆ ل سەر
وان فرەهـ بکە.

وَنَبِّئۡهُمۡ أَنَّ ٱلۡمَآءَ قِسۡمَةُۢ بَيۡنَهُمۡۖ كُلُّ شِرۡبٖ مُّحۡتَضَرٞ ٢٨ فَنَادَوۡاْ صَاحِبَهُمۡ
فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ٢٩ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ٣٠ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ
صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَكَانُواْ كَهَشِيمِ ٱلۡمُحۡتَظِرِ ٣١ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ
لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ٣٢ كَذَّبَتۡ قَوۡمُ لُوطِۭ بِٱلنُّذُرِ ٣٣ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا
عَلَيۡهِمۡ حَاصِبًا إِلَّآ ءَالَ لُوطٖۖ نَّجَّيۡنَٰهُم بِسَحَرٖ ٣٤ نِّعۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَاۚ
كَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَن شَكَرَ ٣٥ وَلَقَدۡ أَنذَرَهُم بَطۡشَتَنَا فَتَمَارَوۡاْ
بِٱلنُّذُرِ ٣٦ وَلَقَدۡ رَٰوَدُوهُ عَن ضَيۡفِهِۦ فَطَمَسۡنَآ أَعۡيُنَهُمۡ فَذُوقُواْ
عَذَابِي وَنُذُرِ ٣٧ وَلَقَدۡ صَبَّحَهُم بُكۡرَةً عَذَابٞ مُّسۡتَقِرّٞ ٣٨ فَذُوقُواْ
عَذَابِي وَنُذُرِ ٣٩ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ٤٠
وَلَقَدۡ جَآءَ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ ٱلنُّذُرُ ٤١ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذۡنَٰهُمۡ
أَخۡذَ عَزِيزٖ مُّقۡتَدِرٍ ٤٢ أَكُفَّارُكُمۡ خَيۡرٞ مِّنۡ أُوْلَٰٓئِكُمۡ أَمۡ لَكُم بَرَآءَةٞ
فِي ٱلزُّبُرِ ٤٣ أَمۡ يَقُولُونَ نَحۡنُ جَمِيعٞ مُّنتَصِرٞ ٤٤ سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ
وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ٤٥ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوۡعِدُهُمۡ وَٱلسَّاعَةُ أَدۡهَىٰ وَأَمَرُّ ٤٦
إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٖ ٤٧ يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ
وُجُوهِهِمۡ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ٤٨ إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ ٤٩



﴿٢٨﴾ وان ئاگەهدار بکە کو ب ڕاستی ئاڤ د ناڤبەرا وان و حێشترێدا یا هاتییە لێکڤەکرن، و هەر ئێکی ڕۆژا خۆ یا هەی. ﴿٢٩﴾ و وان گازی هەڤالێ خۆ کر [خرابێ وان]، و دا سەر ڤی ئەمری و گۆتنا وان ب جهـ کر و [حێشتر] کوشت. ﴿٣٠﴾ ڤێجا ئیزا و ئاگەهدارکرنا من یا چاوا بوو؟! ﴿٣١﴾ ب ڕاستی مە هشکەقێرییەك ب سەر واندا هنارت، وەکی پویش و پەلەخێ پرت پرت لێ هاتن. ﴿٣٢﴾ و ب سویند مە قورئان بۆ تێگەهشتن و ژبەرکرن و شیرەت وەرگرتنێ یا ب ساناهی ئێخستی، ئەرێ ئێك هەیە شیرەت و چامەیان ژێ وەرگریت؟ ﴿٣٣﴾ ملەتێ (لووط) پێغەمبەر ژی پێغەمبەر درەوین دانان [و ئەوێ پێغەمبەرەکی درەوین دانیت، هەچکو هەمی درەوین دانایین]. ﴿٣٤﴾ ب ڕاستی مە بارۆڤەیەکا بەرەشیشکان ب سەر واندا هنارت [مە هەمی د هیلاك برن]، مالا (لووط) پێغەمبەر تێ نەبیت، مە ئەو بەرسپێدەیێ قورتالکرن. ﴿٣٥﴾ [قورتالکرنا وان] نیعمەت و قەنجییەك بوو ژ دەڤ مە، و هۆسا ئەم شوکورداران خەلات دکەین. ﴿٣٦﴾ ب سویند [(لووط) پێغەمبەر] ئەو ژ ئیزایا مە ترساندبوون، بەلێ ئەو ل ڤێ ترساندنێ ب شك بوون [و درەو دانان]. ﴿٣٧﴾ و ب سویند [ملەتێ (لووط) پێغەمبەر] دڤیا (لووط) مێڤانێت خۆ ب دەست وانڤە بەردەت، ئینا مە چاڤێت وان کۆرەکرن، دێ تامکەنە ئیزا و گەفا مە [ئەوا (لووط)ی هوین پێ ئاگەهدارکرین]. ﴿٣٨﴾ و ب سویند سپێدەیێ زوی، ئیزایەکا بەردەوام ئەو گرتن. ﴿٣٩﴾ دێ تامکەنە ئیزا و گەفا مە [یا هوین پێ هاتینە ئاگەهدارکرن]. ﴿٤٠﴾ و ب سویند مە قورئان بۆ تێگەهشتن و ژبەرکرن و شیرەت وەرگرتنێ یا ب ساناهی ئێخستی، ئەرێ ئێك هەیە شیرەت و چامەیان ژێ وەرگریت؟ ﴿٤١﴾ و ب سویند پێغەمبەر بۆ فیرعەونیان ژی هاتن. ﴿٤٢﴾ هەمی موعجیزە و نیشانێت مە درەو دانان، ئینا مە ژی ئەو هنگاڤتن، هنگاڤتنەکا سەردەستەکێ خودان شیان [کو خودێیە]. ﴿٤٣﴾ ئەرێ گاورێت هەوە [گەلی قورەیشییان] ژ وان ئەوێت بەری هەوە چێترین [وەکی ملەتێ نووحی و عاد و (سەموود) و... هتد] چێترن [دا د هیلاك نەچن و نەئێنە ئیزادان] یان ژی ئێمناهی و پشتڕاستییەك بۆ هەوە د کتێبێت ئەسمانیدا هاتییە [کو هوین ل سەر گاورییێ نائێنە ئیزادان ژ بەر هندێ هوین ناترسن]. ﴿٤٤﴾ یان ژی دبێژن: ئەم کۆمەکا [گەلەکین و بەرسینگێ مە نائێتە گرتن و] سەرکەڤتینە. ﴿٤٥﴾ نێزیك نەدویر، ئەو کۆم دێ شکێت و دێ ڕەڤیت [و ئەڤە ڕۆژا بەدرێ چێبوو]. ﴿٤٦﴾ و ژڤانێ ئیزادانا وان [پشتی بەدرێ] ڕۆژا قیامەتییە، و ڕۆژا قیامەتێ هێژ مەزنتر و تەحلترە [ژ ئیزایا دنیایێ]. ﴿٤٧﴾ ب ڕاستی گونەهکار [د دنیایێدا] یێت د گومڕایی و دیناتییێدا. ﴿٤٨﴾ و ڕۆژا ئەو ل سەر دەڤێ د ئاگریدا دئێنە ڕاکێشان [دێ بێژنە وان:] تامکەنە گەرم و گرانییا ئیزایا دۆژەهێ. ﴿٤٩﴾ هەمی تشت مە ب پیڤان و قەدارە یێت دایین.

وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ ﴿٥٠﴾ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَآ
أَشۡيَاعَكُمۡ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٥١﴾ وَكُلُّ شَيۡءٖ فَعَلُوهُ فِي ٱلزُّبُرِ ﴿٥٢﴾
وَكُلُّ صَغِيرٖ وَكَبِيرٖ مُّسۡتَطَرٌ ﴿٥٣﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي
جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ ﴿٥٤﴾ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ﴿٥٥﴾

## سُورَةُ الرَّحْمَٰن

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ﴿٣﴾ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ﴿٤﴾
ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ ﴿٥﴾ وَٱلنَّجۡمُ وَٱلشَّجَرُ يَسۡجُدَانِ ﴿٦﴾
وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ ﴿٧﴾ أَلَّا تَطۡغَوۡاْ فِي ٱلۡمِيزَانِ ﴿٨﴾
وَأَقِيمُواْ ٱلۡوَزۡنَ بِٱلۡقِسۡطِ وَلَا تُخۡسِرُواْ ٱلۡمِيزَانَ ﴿٩﴾ وَٱلۡأَرۡضَ
وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ﴿١٠﴾ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ ﴿١١﴾
وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ وَٱلرَّيۡحَانُ ﴿١٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾
خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ ﴿١٤﴾ وَخَلَقَ ٱلۡجَآنَّ مِن
مَّارِجٖ مِّن نَّارٖ ﴿١٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٦﴾ رَبُّ
ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ وَرَبُّ ٱلۡمَغۡرِبَيۡنِ ﴿١٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٨﴾

الحِزْبُ ٥٤



﴿٥٠﴾ و ئەمركرنا مە بۆ دان و چێكرنا هەر تشتەكی
جارەكە، و د ناقبەرا چاڤ و برویاندا دئێتە جهـ.
﴿٥١﴾ و ب سویند مە گەلە گاورێت وەكی هەوە
یێت د هیلاك برین، ئەرێ كەس هەیە پێڤە بچیت.
﴿٥٢﴾ و هەر تشتەكێ وان كری، هەمی د تۆماراندا یێ
نڤێسییە. ﴿٥٣﴾ و هەمی [كار و كریار] مەزن و بچویك
دنڤێسینە. ﴿٥٤﴾ ب ڕاستی خودێناس و خودێ ترس
یێت د ناڤ بەحەشت و ڕویباراندا. ﴿٥٥﴾ ل وی جهێ
وان پێ خۆش، و ل دەڤ خودایێ خودان شیان و
دەستهەلات.

## سۆرەتا ڕەحمان

**ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٧٨) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ خودایێ دلۆڤان. ﴿٢﴾ قورئان نیشا پێغەمبەری
و ملەتێ وی دا. ﴿٣﴾ [و ئەوی] مرۆڤ چێ كر.
﴿٤﴾ [و ئەوی] ئەزمان و ئاخڤتن نیشادا [كو بشێت
تشتێ بڤێت پێ دیار بكەت]. ﴿٥﴾ ڕۆژ و هەیڤ ل دویڤ حسێبەكێ [یا ب ڕێك و پێك] دگەڕن [و ب ڤێ
گەڕیانێ ئەم هەژمارا هەیڤ و سالوەخەت و سالان دزانین]. ﴿٦﴾ گل و گیا [یێ بێ بن] و دار [بۆ خودێ ]
سوجدەیێ دبەن [ئانكو ل بەر فەرمانا وینە]. ﴿٧﴾ و [ئەوی] ئەسمانێ بلندكری و ترازیا عەدالەتێ یا دانایی
[و ئەمرێ پێ كری]. ﴿٨﴾ دا هوین نەدەنە سەر عەدالەتێ [و د كێشان و پیڤانێدا ستەمێ نەكەن]. ﴿٩﴾ [گەلی
مرۆڤان] كێشانێ ب عەدالەت بكەن، و د كێشان و پیڤانێدا ترازیێ كێم نەكەن. ﴿١٠﴾ و [ئەوی] ئەرد بۆ هەمی
جانەوەر و خودان ڕوحان یێ چێكری. ﴿١١﴾ هەمی ڕەنگێت فێقی و قەسپێت خودان قەلپك، پشكۆژ یێت
تێدا داین. ﴿١٢﴾ و هەمی دەخل و دان و گل و گیایێت بێن خۆش، تێدا یێت داین. ﴿١٣﴾ ڤێجا [گەلی مرۆڤ
و ئەجنەیان] هوین كیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناكەن. ﴿١٤﴾ خودێ مرۆڤ ژ ئاخەكا
هشك، وەكی یا ئامانێ ئاخێ، یێ چێ كری. ﴿١٥﴾ و ئەجنە ژ گوڕییەكا بێ دویكێلا ئاگری یێت چێ
كرین. ﴿١٦﴾ ڤێجا [گەلی مرۆڤ و ئەجنەیان] هوین كیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناكەن.
﴿١٧﴾ [ئەو دلۆڤان] خودایێ هەردو ڕۆژهەلاتان [یا هاڤینێ و یا زڤستانێ]، و خودایێ هەردو ڕۆژئاڤایان
[یا هاڤینێ و یا زڤستانێ]. ﴿١٨﴾ ڤێجا هوین كیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناكەن.

مَرَجَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ يَلۡتَقِيَانِ ١٩ بَيۡنَهُمَا بَرۡزَخٞ لَّا يَبۡغِيَانِ ٢٠ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ
رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٢١ يَخۡرُجُ مِنۡهُمَا ٱللُّؤۡلُؤُ وَٱلۡمَرۡجَانُ ٢٢ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ
رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٢٣ وَلَهُ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡمُنشَـَٔاتُ فِي ٱلۡبَحۡرِ كَٱلۡأَعۡلَٰمِ ٢٤
فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٢٥ كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٖ ٢٦ وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ
رَبِّكَ ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ٢٧ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٢٨
يَسۡـَٔلُهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ ٢٩ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٣٠ سَنَفۡرُغُ لَكُمۡ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ٣١ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٣٢ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ
أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ
إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ٣٣ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٣٤ يُرۡسَلُ عَلَيۡكُمَا
شُوَاظٞ مِّن نَّارٖ وَنُحَاسٞ فَلَا تَنتَصِرَانِ ٣٥ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ ٣٦ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ وَرۡدَةٗ كَٱلدِّهَانِ ٣٧
فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٣٨ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُسۡـَٔلُ عَن
ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٞ وَلَا جَآنّٞ ٣٩ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٤٠
يُعۡرَفُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ بِسِيمَٰهُمۡ فَيُؤۡخَذُ بِٱلنَّوَٰصِي وَٱلۡأَقۡدَامِ ٤١



﴿١٩﴾ خـودێ هـەردو دەریایـان [یـا شریـن و یـا سـویر
(شـۆرە)]، دگەهینیتـە ئێـك و تێکـەلی ئێـك نابـن.
﴿٢٠﴾ ناڤـبرەك یـا د ناڤبـەرا هەردوویانـدا، تێکـەلی ئێـك
نابـن. ﴿٢١﴾ ڤێجـا هویـن کیـژ نیعمەتـا خودایـێ خـۆ
درەو ددانـن و پەسـەند ناکـەن. ﴿٢٢﴾ ژ هـەردو دەریایان
[ل ڤـێرێ مەخسـەد دەریایـا سـویر (شـۆر) ب تنێیـە، و
ناڤـێ هـەردو دەریایـان هاتیـە چونکـی یـێت پێکڤە]،
لۆلـۆ و مەرجـان دەردکەڤـن. ﴿٢٣﴾ ڤێجـا هویـن کیـژ
نیعمەتـا خودایـێ خـۆ درەو ددانـن و پەسـەند ناکـەن.
﴿٢٤﴾ و گەمیـیێت وەکـی چیایـان بلنـد، ئەوێـت د
دەریایـێدا دئێن و دچـن یـێت وینـە [ئانکـو خودێیـە
ڤـان گەمیـیان د گـەل مەزناتیـا وان، ل سـەر ئاڤـێ
رادگریـت]. ﴿٢٥﴾ ڤێجـا هویـن کیـژ نیعمەتـا خودایـێ
خـۆ درەو ددانـن و پەسـەند ناکـەن. ﴿٢٦﴾ هـەر کەسـێ
ل سـەر ئـەردی هـەی، دێ چیـت و نامینیـت [ئانکـو
دێ مریـت و پویـچ بیـت]. ﴿٢٧﴾ و خودایـێ تـە ب
تنێ دێ مینیت ئـەوێ خـودان مەزناتـی و خـودان
کـەرەم. ﴿٢٨﴾ ڤێجـا هویـن کیـژ نیعمەتـا خودایـێ خۆ
درەو ددانـن و پەسـەند ناکـەن. ﴿٢٩﴾ ئەوێـت د ئـەرد و ئەسمـانـاندا هەیـن، هەمی داخـوازان ژ وی دکـەن، و ئەو
هـەر وەختەکـی کارەکـی دکـەت. ﴿٣٠﴾ ڤێجـا هویـن کیـژ نیعمەتـا خودایـێ خـۆ درەو ددانـن و پەسـەند ناکەن.
﴿٣١﴾ [رۆژا قیامەتـێ] دێ دەسـتێ مـە ب هـەوەڕا گەهیـت، گـەلی مـرۆڤ و ئەجنەیـان. ﴿٣٢﴾ ڤێجـا هویـن کیـژ
نیعمەتـا خودایـێ خـۆ درەو ددانـن و پەسـەند ناکـەن. ﴿٣٣﴾ گـەلی ئەجنـە و مرۆڤان، ئەگـەر هوین بشێن ژ رەخ
و رویـێت ئـەرد و ئەسمـانان [ژ قـەزا و قـەدەرا خودێ] دەرکەڤـن دەرکەڤن، و هوین نەشێن دەرکەڤـن ب رێکا
دەسـتهەلاتەکێ نەبیـت [ئـەو ژی یا خودێیـە]. ﴿٣٤﴾ ڤێجا هوین کیژ نیعمەتا خودایـێ خۆ درەو ددانن و پەسـەند
ناکـەن. ﴿٣٥﴾ [رۆژا قیامەتـێ] گوریـیا ئاگـرێ بـێ دویکێل و سـفرێ حەلیایی دێ ب سـەر هەوەدا ئێتـە دارێتن،
و هاریکاریـیا هـەوە ژی نائێتەکـرن [و هویـن ب خـۆ ژی نەشێن هاریکاریـیا ئێـك و دو بکـەن]. ﴿٣٦﴾ ڤێجـا
هویـن کیـژ نیعمەتا خودایـێ خۆ درەو ددانن و پەسـەند ناکەن. ﴿٣٧﴾ ڤێجا وەختێ ئەسمـانـان دکەلشـیت و وەکی
گولـەکا سـۆر، و رویـنـێ داخکـری لێ دئێـت. ﴿٣٨﴾ ڤێجا هوین کیژ نیعمەتا خودایـێ خۆ درەو ددانن و پەسـەند
ناکـەن. ﴿٣٩﴾ و وێ رۆژێ پسیارا گونەهـێ ژ کەسـێ نائێتەکـرن، نـە ژ مرۆڤـان نـە ژ ئەجنەیـان [چونکـی ئـەو
ب سـەر و سـیمایی دئێنـە نیاسـین]. ﴿٤٠﴾ ڤێجـا هویـن کیـژ نیعمەتا خودایـێ خـۆ درەو ددانـن و پەسـەند ناکەن.
﴿٤١﴾ گونەهـکار ب سـەر و سیمایـێ وان دئێنـە نیاسـین، و ملیاکـەت دێ وان د پەرچـەم و پێپلۆکێـت وانـرا گرن
[و ئاڤێژنـە د ئاگریدا].

فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٤٢ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا
ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٤٣ يَطُوفُونَ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَ حَمِيمٍ ءَانٖ ٤٤ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ
رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٤٥ وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ٤٦ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ
رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٤٧ ذَوَاتَآ أَفۡنَانٖ ٤٨ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٤٩
فِيهِمَا عَيۡنَانِ تَجۡرِيَانِ ٥٠ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٥١ فِيهِمَا
مِن كُلِّ فَٰكِهَةٖ زَوۡجَانِ ٥٢ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٥٣ مُتَّكِـِٔينَ
عَلَىٰ فُرُشِۭ بَطَآئِنُهَا مِنۡ إِسۡتَبۡرَقٖۚ وَجَنَى ٱلۡجَنَّتَيۡنِ دَانٖ ٥٤ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٥٥ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ
إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ ٥٦ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٥٧ كَأَنَّهُنَّ
ٱلۡيَاقُوتُ وَٱلۡمَرۡجَانُ ٥٨ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٥٩
هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ٦٠ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ ٦١ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ٦٢ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ ٦٣ مُدۡهَآمَّتَانِ ٦٤ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٦٥
فِيهِمَا عَيۡنَانِ نَضَّاخَتَانِ ٦٦ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٦٧
فِيهِمَا فَٰكِهَةٞ وَنَخۡلٞ وَرُمَّانٞ ٦٨ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٦٩



﴿٤٢﴾ ڤێجا هوین کیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو
دادنن و پەسەند ناکەن. ﴿٤٣﴾ ئەڤە ئەو دۆژەهە
ئەوا گونەهکاران درەو ددانا. ﴿٤٤﴾ ئەو [ئەوێت
دۆژەهێ درەو ددانا] د ناڤبەرا ئاگرێ دۆژەهێ و ئاڤا
زێدە شاریاییدا دئێن و دچن. ﴿٤٥﴾ ڤێجا هوین
کیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند
ناکەن. ﴿٤٦﴾ و ئەوێ ترسا ڕاوەستیانێ بەرانبەری
خودایێ خۆ د دلیدا، دو بەحەشت یێت بۆ هەین.
﴿٤٧﴾ ڤێجا هوین کیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو
ددانن و پەسەند ناکەن. ﴿٤٨﴾ هەردو بەحەشتان،
دارێت وان ب چەق و فێقینە. ﴿٤٩﴾ ڤێجا هوین کیژ
نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناکەن.
﴿٥٠﴾ دو کانی د ناڤرا دچن. ﴿٥١﴾ ڤێجا هوین کیژ
نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناکەن.
﴿٥٢﴾ و ژ هەر فێقییەکی، دو جوین یێت تێدا هەین.
﴿٥٣﴾ ڤێجا هوین کیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن
و پەسەند ناکەن. ﴿٥٤﴾ ل سەر هندەك نڤینان یێت
درێژکرینە، بەتەنێ وان ژ ئارمویشێ ستویرە، و فێقیێ
هەردو بەحەشتان ژی یێ بەردەستە. ﴿٥٥﴾ ڤێجا هوین کیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناکەن.
﴿٥٦﴾ ژنێت چاڤێت وان بەس ل زەلامێت وان، یێت تێدا، و بەری زەلامێت وان، دەستێ کەسێ نەگەهشتییە
وان، نە ژ ئەجنە و نە ژ مرۆڤان. ﴿٥٧﴾ ڤێجا هوین کیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناکەن.
﴿٥٨﴾ دێ بێژی (ئەو ژنێت ژێگۆتی) یاقووت و مەرجانن. ﴿٥٩﴾ ڤێجا هوین کیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو
ددانن و پەسەند ناکەن. ﴿٦٠﴾ و قەنجییێ، چو خەلات ژ قەنجییێ پێڤەتر نینن. ﴿٦١﴾ ڤێجا هوین کیژ نیعمەتا
خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناکەن. ﴿٦٢﴾ و ژ بلی وان هەردو باخچەیان، دو باخچەیێت دی ژی
یێت هەین. ﴿٦٣﴾ ڤێجا هوین کیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناکەن. ﴿٦٤﴾ و هەردو ژی
کەسکەکێ تارینە. ﴿٦٥﴾ ڤێجا هوین کیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناکەن. ﴿٦٦﴾ و د وان
هەردو باخچەیاندا، دو کانی یێت هەین بەردەوام دزێن، و ئاڤ ژ بەر وان دچیت. ﴿٦٧﴾ ڤێجا هوین کیژ
نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناکەن. ﴿٦٨﴾ هەمی ڕەنگێت فێقی و دارقەسپ و هنار یێت تێدا.
﴿٦٩﴾ ڤێجا هوین کیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناکەن.

فِيهِنَّ خَيۡرَٰتٌ حِسَانٞ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾
حُورٞ مَّقۡصُورَٰتٞ فِي ٱلۡخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفۡرَفٍ خُضۡرٖ
وَعَبۡقَرِيٍّ حِسَانٖ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾
تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴿٧٨﴾

## سُورَةُ الوَاقِعَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ربع الحزب ٥٤

إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴿١﴾ لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ ﴿٢﴾ خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ ﴿٣﴾
إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا ﴿٤﴾ وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا ﴿٥﴾ فَكَانَتۡ
هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا ﴿٦﴾ وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ ﴿٧﴾ فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ
مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾
فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٤﴾
عَلَىٰ سُرُرٖ مَّوۡضُونَةٖ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ ﴿١٦﴾





﴿٧٠﴾ و ژنێت رەوشت پاك و جوان یێت تێدا. ﴿٧١﴾ ڤێجا هوین كیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناكەن. ﴿٧٢﴾ ئەو پەری چاڤگر و چاڤرەشن، و د چادرێت خۆدانە. ﴿٧٣﴾ ڤێجا هوین كیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناكەن. ﴿٧٤﴾ و بەری زەلامێت وان، دەستێ كەسەكێ نەگەهشتییە وان، نە ژ ئەجنە و نە ژ مرۆڤان. ﴿٧٥﴾ ڤێجا هوین كیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناكەن. ﴿٧٦﴾ پالا وان [بەحەشتییان] یا ل بالیفكێت كەسك، و مەحفویرێت جوان و ب رویشی. ﴿٧٧﴾ ڤێجا هوین كیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناكەن. ﴿٧٨﴾ پیرۆزە ناڤێ خودایێ تە، یێ خودان مەزناتی و خودان كەرەم.

## سۆرەتا واقیعە

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٩٦) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ [بێژە وان] گاڤا قیامەت رابوو. ﴿٢﴾ كەس نەشێت رابوونا وێ درەو بدانیت [خۆ ئەوێت د دنیایێدا درەو ددانان، دەمێ رابوونا وێ نەشێن درەو بدانن]. ﴿٣﴾ [ئەو رۆژ كو رۆژا قیامەتییە] هندەكان نزم دكەت [دبنە دۆژەهی]، و هندەكان بلند دكەت [و دبنە بەحەشتی]. ﴿٤﴾ گاڤا ئەرد هەژیانەكا مەزن و ب هێز هەژیا. ﴿٥﴾ و چیا پرت پرت بوون. ﴿٦﴾ و بوونە تۆزەكا بەرەبا. ﴿٧﴾ و هنگی هوین دێ بنە سێ جوین. ﴿٨﴾ ڤێجا خودانێت ملێ راستێ [ئەوێت ژ ملێ راستێڤە بۆ بەحەشتێ دئێنە برن]، [یان ژی] خودانێت دەستێ راستێ [ئەوێت كتێبێت كار و كریارێت خۆ ب دەستێ راستێ وەردگرن]، و خودانێت ملێ راستێ [د كاروبار و سالۆخەتێت خۆدا] د چاوانن؟. ﴿٩﴾ و خودانێت ملێ چەپێ [ئەوێت ژ ملێ چەپێڤە بۆ دۆژەهێ دئێنە ئاژۆتن]، یان ژی خودانێت دەستێ چەپێ [ئەوێت كتێبا كار و كریارێت خۆ ب دەستێ چەپێ وەردگرن]، و خودانێت ملێ چەپێ د د چاوانن؟. ﴿١٠﴾ و [جوینێ سێیێ] ئەوێت بەری هەمییان خێرێ دكەن، و بەری هەمییان خۆ دئاڤێژنێ، ئەوێت ل پێشییا هەمییانە [بۆ بەحەشتێ]. ﴿١١﴾ ئەڤەنە نێزیكی خودێ. ﴿١٢﴾ یێت د بەحەشتێت پڕ خێر و بێردا. ﴿١٣﴾ [ئەو بەحەشتی، ئەوێت نێزیكی خودێ] گەلەك ژ پێشیانە. ﴿١٤﴾ و كێمەك ژ پاشیانە [ئانكو ژ ملەتێ پێغەمبەری]. ﴿١٥﴾ ل سەر تەختێت زێركری و رێزكری. ﴿١٦﴾ بەرانبەری ئێك د پالداینە.

يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ
مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا
يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمْثَٰلِ
ٱللُّؤْلُؤِ ٱلْمَكْنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ لَا يَسْمَعُونَ
فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴿٢٦﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ
أَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ
مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ
وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾
فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٌ
مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٠﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ
أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾
لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُوا۟
يُصِرُّونَ عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُوا۟ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا
تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ إِنَّ
ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾



﴿١٧﴾ کورەلاوێت کورِین (هەروهەر د ژیـیەکیدا) ل سەر
وان دگـەرِن [و خزمەتـا وان دکـەن]. ﴿١٨﴾ و پەرداغـان
[یـێت بـێ چنبـل] و ئامانێـت ب لیلیـك و چنبـل
و پەرداغێـت مەیـا کانیـان [ل سـەر وان دگـێرِن].
﴿١٩﴾ نـە سـەرێ وان پـێ دئێشـیت، و نـە پـێ گێـژ و
سـەرخۆش دبـن [ئانکـو نـە سـەرگێژی تێدایـە، و نـە
سەرخۆشـی]. ﴿٢٠﴾ و فێقیـێ وان دڤێـت [ل سـەر وان
دگـێرِن]. ﴿٢١﴾ و گۆشـتێ بالەفـرێ دلێ وان بچیتـێ
[ل سـەر وان دگـێرِن]. ﴿٢٢﴾ و پەریـێت چاڤگـر و
چاڤـرِەش، بـۆ وان یـێت هەیـن. ﴿٢٣﴾ دێ بێـژی
لۆلـۆ و مراریـێت دەسـت لـێ نەدایـینە [هنـد زەلال و
جوانـن]. ﴿٢٤﴾ ئەڤـە خەلاتـێ کار و کریارێـت وانـە.
﴿٢٥﴾ د بەحەشـتێدا نـە گـول ئاخڤتنـا بـێ وەج دبـن، و
نـە یـا ب گونەهــ. ﴿٢٦﴾ ژ سـلاڤێ پێڤەتـر گولـێ نابن.
﴿٢٧﴾ و خودانێـت ملـێ رِاسـتێ، و خودانێـت ملـێ
رِاسـتێ د چاوانـن؟. ﴿٢٨﴾ ئەوێـت د نـاڤ دارنەبکێـت
بـێ سـتری [دارەکـە وەکـی گوهیشـکێ ل جهێـت گەرم
شـین دبیـت] و تـێر فێقیدانـە. ﴿٢٩﴾ و یـێت د نـاڤ
دارمۆزێـت، مۆزێـت وان ل سـەرێك. ﴿٣٠﴾ و یـێت ل بـەر سـیبەرا بـەردەوام. ﴿٣١﴾ و یـێت د نـاڤ ئاڤـەکا د
چیتـدا. ﴿٣٢﴾ و یـێت د نـاڤ فێقیـیەکێ مشـە و بەرفرەهـدا. ﴿٣٣﴾ نـە ئـەو فێقـی، ب دویماهیـك دئێـت، و نـە
ئـەو، ژێ دئێنـە ڤەگرتـن. ﴿٣٤﴾ و یـێت ل سـەر نڤینێـت بلنـد و نـەرم. ﴿٣٥﴾ ب رِاسـتی مـە ژنێـت بەحەشـتێ،
سـەر ژ نـوی دان [ئانکـو پشـتی پیربوویـین و کرێـت بوویـین، مـە جـوان کرنەڤـە]. ﴿٣٦﴾ و مـە کرنـە کـچ.
﴿٣٧﴾ ئەڤیندارێـت زەلامێـت خۆنـە، و ئێـك دەسـت و ئێـك ژینـە (ئێـك عەمـرن). ﴿٣٨﴾ ئەڤـە مە بـۆ خودانێت
ملـێ رِاسـتێ یـێت چێ کریـن. ﴿٣٩﴾ [خودانێت ملێ رِاسـتێ] گەلـەك ژ پێشـیانە. ﴿٤٠﴾ و گەلەك ژێ ژ پاشـیانە
[ژ ملەتـێ پێغەمبـەری]. ﴿٤١﴾ و خودانێـت ملـێ چەپـێ، و خودانێـت ملـێ چەپـێ یـێت چاوانـن؟. ﴿٤٢﴾ ئـەو
یـێت د نـاڤ هەلما ئاگری و ئاڤا شـاریایدا. ﴿٤٣﴾ و یـێت د بن سـیبەرا دویکێـلا تاری تاریدا. ﴿٤٤﴾ نه سـیبەرەکا
هـین و سـارە، و نەیـا هندێیـە کـەس ل بـەر ڤەهەسـیت. ﴿٤٥﴾ ئەو بـەری نوکـە [د دنیایـێدا] د خۆشـیاندا بوون.
﴿٤٦﴾ و ئـەو ل سـەر گونەهـا مـەزن [کـو شرکـە] د بـەردەوام بـوون. ﴿٤٧﴾ و دگۆتن: ئەگـەر ئەم مریـن و بووینە
ئـاخ و هەسـتی، ئەرێ جـارەکا دی ئەم دێ سـاخ بینەڤە؟!. ﴿٤٨﴾ ئەرێ باب و باپیرێت مە یـێت پێشیـێ ژی دێ
رِابنەڤە؟!. ﴿٤٩﴾ بێژە: ب رِاسـتی یـێت پێشیـێ و یـێت پاشیـێ هەمـی. ﴿٥٠﴾ بێ گۆمان هەمـی دێ بۆ وەختێ
رِۆژا دەستنیشـانکری [کـو رِۆژا قیامەتێیـە] ئێنە کۆمکرن.

ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَأٓكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾
فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ
شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾ نَحْنُ خَلَقْنَٰكُمْ فَلَوْلَا
تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ
ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾
عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ
عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا
تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَٰهُ
حُطَٰمًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلْ نَحْنُ
مَحْرُومُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ
مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا
تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ
شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً وَمَتَٰعًا
نصف الحزب ٥٤ لِّلْمُقْوِينَ ﴿٧٣﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ۞ فَلَآ أُقْسِمُ
بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾





﴿٥١﴾ پاشی هوین، گەلی گومڕاییێت، قیامەتێ درەو ددانن. ﴿٥٢﴾ ب ڕاستی هوین دێ ژ دارەکێ خۆن، دارا زەقوومێیە. ﴿٥٣﴾ و هوین دێ زکان پێ تژی کەن. ﴿٥٤﴾ و ئاڤا کەل و شاریایی، هوین دێ ب سەرداکەن. ﴿٥٥﴾ و هوین دێ وەسا ڤەخۆن، وەکی ڤەخوارنا حێشترا تێنی. ﴿٥٦﴾ ئەڤە، ڕۆژا قیامەتێ دێ بۆ وان ئێتە پێشکێشکرن، و دێ ل سەر بنە مێڤان. ﴿٥٧﴾ ب ڕاستی مە هوین یێت چێ کرین، ڤێجا بلا هەوە باوەری هەبیت ئەم دێ هەوە ساخکەینەڤە، [هەروەکی هەوە باوەری هەی مە هوین یێت چێ کرین]. ﴿٥٨﴾ کا بێژنە من، ئەو ئاڤا هوین دئاڤێژنە د مالبچویکا ژنێدا. ﴿٥٩﴾ ئەرێ هوین وێ ئاڤێ ددەن یان ئەم؟. ﴿٦٠﴾ ب ڕاستی مە مرن یا د ناڤبەرا هەوەدا دانایی، و وەختێ وێ یێ دیارکرییە [و هندەك ژ هەوە بچویکاتی دمرن و هندەك ب پیری دمرن، و کەس نینە نەمریت]، و نەکو ئەم نەشێین. ﴿٦١﴾ هەوە ب هندەکێت دی یێت وەکی هەوە بگوهۆڕین، و هەوە ب ڕەنگەکێ دی چێ کەین، هوین پێ نەزانن.
﴿٦٢﴾ و ب سویند هەوە چێکرنا خۆ یا جارا ئێکێ یا زانی [خودێ هوین ژ نەییێ دان، ل بەراهییێ هوین چپکەك بوون، پاشی بوونە خوینپارە، پاشی بوونە گۆشتپارە، پاشی بوونە هەستی، و خودێ هەستی ب گۆشتی کراسکر، و ڕێکا بوونێ بۆ هەوە ب ساناهی ئێخست] و دەرس و چامەیان بۆ خۆ [ژ چێکرنا ئێکێ] وەرگرن [ئەوێ هوین جارا ئێکێ داییـن، دشێت جارەکا دی ژی هەوە بدەتەڤە]. ﴿٦٣﴾ ئەرێ ما هوین نابینن تشتێ هوین دچینن؟!. ﴿٦٤﴾ ئەرێ هوین شین دکەن، یان ئەمین شین دکەین؟. ﴿٦٥﴾ و ئەگەر مە ڤیابایە دا کەینە پویش و پەلەخ، و هوین دا عەجێبگرتی مینن [چاوا شینکاتییێ هۆسا یێ کەسك هشك بوو]. ﴿٦٦﴾ [و دابێژن:] ب ڕاستی زەحمەتا مە، هەروە و بێ بەرانبەر چۆ، و ئەم خوسارەت بووین. ﴿٦٧﴾ بەلکی ئەم زڕباربوویین. ﴿٦٨﴾ ئەرێ ما هوین وێ ئاڤێ نابینن، یا هوین ڤەدخۆن؟!. ﴿٦٩﴾ ئەرێ هوین ژ ئەوران دئیننە خوارێ یان ئەم؟.. ﴿٧٠﴾ و ئەگەر مە ڤیابایە دا وێ ئاڤێ تەحل و سویر (شۆر) کەین، ڤێجا بۆچی هوین سوپاسی و شوکورا خودێ ناکەن. ﴿٧١﴾ ئەرێ ما ئاگرێ هوین هەل دکەن، هوین نابینن؟!. ﴿٧٢﴾ ئەرێ هەوە دارا وی ئاگری داییە، یان مە داییە؟. ﴿٧٣﴾ مە ئەڤ ئاگرە (یێ دنیایێ) یێ کرییە بیرئینان بۆ ئاگرێ ئاخرەتێ [ڤێجا وەختێ وی ئاگری و کارلێکرنا وی دبینیت، دێ ئاگرێ جەهنەمێ ئێتە بیرا وی، و دێ ژ خودێ و ئیزایا وی ترسیت]، و مە یێ کرییە فایدە بۆ ڕێڤنگان. ﴿٧٤﴾ ڤێجا ناڤێ خودایێ خۆ یێ مەزن، ژ هەمی کێماسییان پاك و پاقژ بکە. ﴿٧٥﴾ ڤێجا ب ڕاستی ئەز ب جهێ ستێران سویند دخۆم. ﴿٧٦﴾ و ب ڕاستی ئەڤە سویندەکا مەزنە، ئەگەر هوین بزانن.

إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ٧٧ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ٧٨ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا
ٱلۡمُطَهَّرُونَ ٧٩ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٨٠ أَفَبِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ
أَنتُم مُّدۡهِنُونَ ٨١ وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ ٨٢ فَلَوۡلَآ
إِذَا بَلَغَتِ ٱلۡحُلۡقُومَ ٨٣ وَأَنتُمۡ حِينَئِذٖ تَنظُرُونَ ٨٤ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ
إِلَيۡهِ مِنكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُبۡصِرُونَ ٨٥ فَلَوۡلَآ إِن كُنتُمۡ غَيۡرَ مَدِينِينَ ٨٦
تَرۡجِعُونَهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٨٧ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ٨٨
فَرَوۡحٞ وَرَيۡحَانٞ وَجَنَّتُ نَعِيمٖ ٨٩ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ
ٱلۡيَمِينِ ٩٠ فَسَلَٰمٞ لَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ٩١ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ
ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ٩٢ فَنُزُلٞ مِّنۡ حَمِيمٖ ٩٣ وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ ٩٤
إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلۡيَقِينِ ٩٥ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ٩٦

سُورَةُ الحَدِيدِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١ لَهُۥ مُلۡكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ٢ هُوَ
ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ٣



﴿٧٧﴾ و ب ڕاستی ئەڤە قورئانەکا پیرۆز و پڕ خێر
و بەرەکەتە. ﴿٧٨﴾ یا د کتێبەکا پاراستیدا [کو دەپێ
پاراستییە]. ﴿٧٩﴾ ژ بلی پاك و پاقژان [کو ملیاکەتێت
خودان ڕێز و ڕویمەتن]، دەستێ کەسێ ناگەهیتێ.
﴿٨٠﴾ هنارتنا خودایێ هەمی جیهانانە. ﴿٨١﴾ ئەرێ
هوین سستییێ د ڤێ قورئانێدا دکەن [درەو ددانن
و باوەرییێ پێ نائینن]؟!. ﴿٨٢﴾ و هوین شوینا
سوپاسی و شوکورا ڕزقێ خۆ بکەن درەوان دکەن
[خودێ بارانێ و ڕزقی ددەتە هەوە، شوینا هوین
سوپاسیا وی بکەن هوین درەوان دکەن، و دبێژن
ب ئاخفتنا وێ هە یان ب ڤێ ستێرێ باران بۆ مە
هات]. ﴿٨٣﴾ ڤێجا بلا وەختێ [ڕوح] دگەهیتە
گەوریێ. ﴿٨٤﴾ و هوین وی وەختی بەرێ خۆ ددەنێ
[و چو ژ هەوە نائێت و نەشێن ڕوحا وی بزڤریننەڤە].
﴿٨٥﴾ و ئەم [ب زانین و شیان و دیتنێ] نێزیکتری
وینە ژ هەوە، بەلێ هوین نابینن. ﴿٨٦﴾ ڤێجا ئەگەر
هوین ب کار و کریارێت خۆ نەئێنە جزاکرن، و
حساب نەبیت. ﴿٨٧﴾ وێ [ڕوحێ ئەوا گەهشتییە
گەوریێ] بزڤریننەڤە، ئەگەر هوین ڕاست دبێژن. ﴿٨٨﴾ و ئەگەر ئەو [یێ مری] ژ نێزیکێت خودێ بیت.
﴿٨٩﴾ ڤێجا دلۆڤانی و دلشادی و بێنڤەدان و ڤەهەسیان و بێن خۆشی و بەحەشتا ب خێر و بەرەکەت، یێت
وینە. ﴿٩٠﴾ و ئەگەر ئەو مری ژ خودانێت ملێ ڕاستێ بیت. ﴿٩١﴾ ڤێجا سلاڤ ژ خودانێت ملێ ڕاستێ ل تە
بن، هەی خودانێ ملێ ڕاستێ [ئەڤە دێ بۆ وی ئێتە گۆتن، چونکی دێ چیتە ناڤ وان، و ئەو دێ پێشوازیا
وی کەن و دێ سلاڤکەنێ]. ﴿٩٢﴾ و ئەگەر ئەو مری ژ وان بیت، ئەوێت ڕۆژا قیامەتێ درەو ددانان، و ژ
گومرایان بیت. ﴿٩٣﴾ دێ ئاڤەکا زێدە شاریایی، بۆ ئێتە پێشکێشکرن. ﴿٩٤﴾ و دێ چیتە د دۆژەهێدا ژی.
﴿٩٥﴾ ب ڕاستی ئەڤە [ئەڤا بۆ تە هاتییە گۆتن د دەرهەقێ خەلاتکرن و جزاکرنا باش و خراباندا] ڕاستە، و
چو گومان تێدا نینە. ﴿٩٦﴾ ڤێجا ناڤێ خودایێ خۆ یێ مەزن، ژ هەمی کێماسییان پاك و پاقژ بکە.

## سۆرەتا حەدید

### ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٢٩) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هندی د ئەرد و ئەسماناندا هەیین، خودێ ژ کێماسییان پاقژ دکەن و تەسبیحا وی دکەن، و ئەو سەردەست
و کاربنەجهە. ﴿٢﴾ ملك و خودانییا ئەرد و ئەسمانان یا خودێیە، ئەوە ژیانێ و مرنێ ددەت، و ئەو ل سەر
کرنا هەمی تشتان یێ خودان شیانە. ﴿٣﴾ ئەوە یێ ئێکێ [بەری هەر تشتەکی]، و ئەوە یێ دویماهییێ [ئانکو
یێ هەروهەر مایی]، و ئەوە بلند و سەردەست [هەبوونا وی ب نیشان و بەلگەیان خۆیا و ئاشکەرایە]، و
ئەوە زانایێ تشتێ ڤەشارتی [یان یێ نەبەرچاڤ]، و ئەو ئاگەهداری هەمی تشتانە.

هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ
عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۖ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ
بَصِيرٌ ﴿٤﴾ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥﴾
يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ۚ وَهُوَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ
ٱلصُّدُورِ ﴿٦﴾ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُوا۟ مِمَّا جَعَلَكُم
مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ ۖ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَأَنفَقُوا۟ لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾
وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۙ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ لِتُؤْمِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ وَقَدْ
أَخَذَ مِيثَٰقَكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِۦٓ
ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمْ
لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٩﴾ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ
وَقَٰتَلَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟ ۚ
وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾ مَّن ذَا
ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١١﴾





﴿٤﴾ و ئەوە یێ ئەرد و ئەسمان د شەش ڕۆژاندا چێ کرین، پاشی ب سەر عەرشێ خۆ کەڤت [بلندبوونەکا هێژایی وی و بێ چاوایی]، و هەر تشتەکێ د ئەردیدا دچیت [ژ ئاڤ و خزینەیان و هەر تشتەکێ د بنڤە] و ژێ دەردکەڤیت [ژ چاندن و کانی و بیران... هتد]، و هەر تشتەکێ ژ ئەسمانی دئێتە خوارێ [ژ باران و گژلۆك و بەفر و برویسی و ملیاکەت و کتێبان]، و هەر تشتەکێ بەر پێ بلند دبیت [ژ کریارێت باش و دوعا و جان و ملیاکەت و تەیر و تەوال و هەلمێ و ... هتد] ژێ ب ئاگەهە، و ئەو [ب زانین و شیانا خۆ] هەر جهەکێ هوین لێ بن یێ د گەل هەوە، و خودێ هەر کار و کریارەکا هوین دکەن، ژێ ب ئاگەهە و دبینیت.
﴿٥﴾ سەر و سامانێ ئەرد و ئەسمانان هەر یێ خودێیە، و هەمی کاروبار هەر ب بال خودێڤە دزڤرن.
﴿٦﴾ شەڤێ دکەتە د ناڤ ڕۆژێرا، و ڕۆژێ دکەتە د ناڤ شەڤێرا [و هەردووکان هۆسا کورت و درێژ دکەت]، و خودێ ژ هەر تشتەکێ د دلاندا ڤەشارتی ب ئاگەهە.
﴿٧﴾ [گەلی مرۆڤان] باوەرییێ ب خودێ و پێغەمبەرێ وی بینن، و مالێ خودێ هوین ل سەر کرینە وەکیل ژێ [ب خێر] بدەن، و ژ هەوە ئەوێت باوەری ئینایین و مالێ خۆ د ڕێکا خودێدا مەزاختین، خەلاتەکێ مەزن بۆ وان یێ هەی. ﴿٨﴾ و هەوە خێرە هوین باوەرییێ ب خودێ نائینن؟ و پێغەمبەر یێ داخوازێ ژ هەوە دکەت هوین باوەرییێ ب خودایێ خۆ بینن، و خودێ پەیمان ب باوەری ئینانێ یا ژ هەوە ستاندی [وەختێ هوین ژ پشتا باب ئادەمی دەرئێخستین]، ئەگەر هوین باوەر بکەن. ﴿٩﴾ ئەوە یێ ئایەتێت ئاشکەرا [کو ئایەتێت قورئانێنە] بۆ بەندەیێ خۆ دهنێریت، دا هەوە ژ تاریستانێ دەربێخیتە ناڤ ڕۆناهییێ، و ب ڕاستی خودێ بۆ هەوە گەلەك یێ دلۆڤانە. ﴿١٠﴾ هەوە خێرە هوین مالێ خۆ د ڕێکا خودێدا نامەزێخن، و میراتێ ئەرد و ئەسمانان هەر یێ خودێیە، ئەوێت بەری ڤەکرنا مەکەهێ مالێ خۆ د ڕێکا خودێدا مەزاختین و جیهاد کرین، پایە و پەیسکێت وان ژ یێت وان ئەوێت پشتی ڤەکرنا مەکەهێ مال مەزاختین و جیهاد کرین مەزنترن، ئەڤ هەردوکە وەکی ئێك نینن، د گەل هندێ ژی خودێ پەیمانا خەلاتێ باش [کو بەحەشتە] یا دایییە هەردو جوینان، و خودێ ئاگەهـ ژ وێ هەیە یا هوین دکەن. ﴿١١﴾ هەر کەسێ مالێ خۆ د ڕێکا خودێدا بدەت، خودێ دێ بۆ چەند قاتەکان زێدەکەت [هەر خێرەك ب دەهـ خێرانە، هەتا دگەهیتە حەفت سەدان] و وی خەلاتەکێ هێژاتر ژی [کو بەحەشتە] یێ هەی.

يَوۡمَ تَرَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَسۡعَىٰ نُورُهُم بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ
وَبِأَيۡمَٰنِهِمۖ بُشۡرَىٰكُمُ ٱلۡيَوۡمَ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ
فِيهَاۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٢ يَوۡمَ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ
لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱنظُرُونَا نَقۡتَبِسۡ مِن نُّورِكُمۡ قِيلَ ٱرۡجِعُواْ وَرَآءَكُمۡ
فَٱلۡتَمِسُواْ نُورٗاۖ فَضُرِبَ بَيۡنَهُم بِسُورٖ لَّهُۥ بَابُۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحۡمَةُ
وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلۡعَذَابُ ١٣ يُنَادُونَهُمۡ أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ
وَلَٰكِنَّكُمۡ فَتَنتُمۡ أَنفُسَكُمۡ وَتَرَبَّصۡتُمۡ وَٱرۡتَبۡتُمۡ وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡأَمَانِيُّ
حَتَّىٰ جَآءَ أَمۡرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ١٤ فَٱلۡيَوۡمَ لَا يُؤۡخَذُ مِنكُمۡ
فِدۡيَةٞ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ مَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُۖ هِيَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ
وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ١٥ ۞ أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ
قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلۡحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ
أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلُ فَطَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَمَدُ فَقَسَتۡ قُلُوبُهُمۡۖ وَكَثِيرٞ
مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ١٦ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ قَدۡ بَيَّنَّا
لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ١٧ إِنَّ ٱلۡمُصَّدِّقِينَ وَٱلۡمُصَّدِّقَٰتِ
وَأَقۡرَضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا يُضَٰعَفُ لَهُمۡ وَلَهُمۡ أَجۡرٞ كَرِيمٞ ١٨

ثلاثة أرباع الحزب ٥٤



﴿١٢﴾ رۆژا تو زەلام و ژنێت خودان باوەر دبینی
و ڕۆناهییا وان ل پێشییا وان، و ل ملێ وان یێ
ڕاستێ ب بەر وان دكەڤیت [و ملیاكەت دبێژنە وان:]
ئەڤرۆ مزگینییا بەحەشتێت ڕوبیار دبنڕا دچن، و
هوین هەروهەر دێ تێدا مینن، ل هەوە بیت، و
ئەڤەیە سەرفەرازیا مەزن. ﴿١٣﴾ ڕۆژا زەلام و ژنێت
دوڕوی دبێژنە وان ئەوێت باوەری ئینایین: خۆ ل مە
بگرن دا ڕێكا خۆ ل بەر ڕۆناهییا هەوە ببینین [ئەڤە
وەختێ د سەر پرا سیراتێڕا دەرباز دبن]، ئەو دێ
بێژنە وان: [گەلی دوڕوییان] ب پاش خۆڤە بزڤڕن
[ئانكو بزڤڕنە دنیایێ]، ل دنیایێ بۆ خۆ ل ڕۆناهییێ
بگەڕن، و دیوارەك د ناڤبەرا هەردو جویناندا دێ
ئێتە دانان، دەرگەهەكێ هەی، ژ ناڤدا دلۆڤانییە و ژ
دەرڤە ژی ئیزایە. ﴿١٤﴾ ئەو [دوڕوی] گازی [خودان
باوەران] دكەن و دبێژن: ما ئەم د گەل هەوە نەبوویین
[بۆچی هەوە ئەم هێلاین]، دێ بێژن: بەلێ هوین
[سەرڤە سەرڤە] د گەل مە بوون، بەلێ هەوە خۆ ب
دوڕوییاتیێ د هیلاك بر، و چاڤێ هەوە ل نەخۆشییا
خودان باوەران بوو، و هوین ل دینی ب شك كەڤتن، و هیڤی و ئومێدێت ڤالا هوین د سەردابرن، هەتا
قیامەت ب سەر هەوەدا هاتی، و شەیتانی هوین ب كەرەما خودێ [و بەرفرەهییا ڕەحما وی] خاپاندن.
﴿١٥﴾ و ئەڤرۆ چو بەدەل، نە ژ هەوە [دوڕوییان]، و نە ژی ژ ئەوێت گاوربوویین نائێتە وەرگرتن، جهێ
هەوە ئاگرە، ئاگر هێژایی هەوەیە، و چ پیسە دویماهیكە. ﴿١٦﴾ ئەرێ ما وەخت نەهاتییە دلێ خودان باوەران
ب بیرئینانا خودێ و قورئانێ بترسیت، و ئەو وەكی وان نەبن ئەوێت بەری نوكە [ئانكو بەری هاتنەخوارا
قورئانێ] كتێب بۆ هاتین، و پشتی سال و زەمان ب سەر وانڤە چۆیین، دلێت وان ڕەقبوون و باراپتر ژ
وان ژ ڕێكا ڕاست دەركەڤتن. ﴿١٧﴾ [گەلی مرۆڤان] بزانن خودێیە ئەردی شین دكەت پشتی مرنا وی، ب
سویند مە بۆ هەوە نیشان و بەلگە یێت ئاشكەرا ڕۆنكرین، دا هوین تێ بگەهن و ئەقلێ خۆ بدەنە شۆلی.
﴿١٨﴾ ب ڕاستی زەلام و ژنێت مالێ خۆ د ڕێكا خودێدا داین، و مالێ خۆ ژ دل بۆ ڕازیبوونا خودێ مەزاختین،
خێرا وان چەند قاتەكان دێ ئێتە دان، و وان خەلاتەكێ ب ڕێز و ڕویمەت [كو بەحەشتە] یێ هەی.

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَۖ وَٱلشُّهَدَآءُ
عِندَ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ وَنُورُهُمۡۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ
بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ١٩ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ
ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ
وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ
مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ
مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ٢٠
سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ
وَٱلۡأَرۡضِ أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ
ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٢١ مَآ أَصَابَ
مِن مُّصِيبَةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن
قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٢٢ لِّكَيۡلَا
تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ وَٱللَّهُ
لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ٢٣ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ
ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ٢٤



﴿١٩﴾ و ئەویێت ب دورستی باوەری ب خودێ و پێغەمبەرێ وی ئینایین، ئەون ڕاستگۆ، و شەهیدان ل دەڤ خودایێ خۆ ڕۆناهی و خەلاتێ خۆ یێ هەی، و ئەویێت گاوربوویین و ئایەتێت مە درەو دانایین ئەو دۆژەهینە. ﴿٢٠﴾ [گەلی مرۆڤان] بزانن هندی ژیانا دنیایێیە، ترانە و مژویلی و کەشخەیی و جوانی و خۆمەزنکرنە د ناڤبەرا هەوەدا ب زێدەییا مال و عەیالی، و دنیا وەکی بارانەکێیە شینکاتیا وێ جۆتیاری کەیفخۆش بکەت، پاشی ئەو شینکاتی هشك ببیت و دێ بینی زەربوو، پاشی بوو پویش و پەلەخ، و ئاخرەت ژی یان ئیزایەکا دژوار و گرانە، یان ژی لێبۆرین و ڕازیبوونا خودێیە، و ژیانا دنیایێ ژ پەرتالێ خاپاندنێ پێڤەتر نینە. ﴿٢١﴾ [گەلی خودان باوەران] لەزێ ل ژێبرنا گونەهان ژ بەرێ خودایێ خۆ ڤە بکەن، و لەزێ ل وێ بەحەشتێ بکەن ئەوا فرەهییا وێ هندی فرەهییا ئەرد و ئەسمانی، ئەو بەحەشتا بۆ وان هاتییە بەرهەڤکرن ئەویێت باوەری ب خودێ و پێغەمبەرێت وی ئینایین، ئەڤە کەرەما خودێیە ددەتە وی یێ وی بڤێت، و خودێ خودانێ کەرەما مەزنە. ﴿٢٢﴾ نینە تشتەك د ئەردیدا بقەومیت یان بێتە سەرێ هەوە، و د دەپێ پاراستیدا یێ نڤێسی نەبیت ـ بەری ئەم بدەین ـ و ب ڕاستی ئەڤە ل بەر خودێ یا ب ساناهییە. ﴿٢٣﴾ دا ب خەم نەکەڤن بۆ یا ژ دەستێ هەوە چۆیی، و دا بەتران نەبن ب یا خودێ داییە هەوە، و خودێ حەژ چو خۆمەزنکەرێت قەبە ناکەت. ﴿٢٤﴾ ئەویێت چڕویکییێ دکەن [د ڕاستا فەرمانا خودێدا، و د ڕاستا دەیباب و کەس و کارێت خۆدا و... هتد، و دڤێن خەلك ژی وەکی وان بن]، و فەرمانا خەلکی ژی ب چڕویکییێ دکەن، و هەر کەسێ ڕوییێ خۆ ژ مەزاختنا مالی د ڕێکا خودێدا وەرگێڕیت، ب ڕاستی خودێ منەت پێ نینە، و یێ دەولەمەند و هێژایی شوکور و پەسنێیە.

لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ
وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ فِيهِ
بَأۡسٞ شَدِيدٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ
بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ ٢٥ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحٗا وَإِبۡرَٰهِيمَ
وَجَعَلۡنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلۡكِتَٰبَۖ فَمِنۡهُم مُّهۡتَدٖۖ
وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ٢٦ ثُمَّ قَفَّيۡنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم
بِرُسُلِنَا وَقَفَّيۡنَا بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَۖ وَجَعَلۡنَا
فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأۡفَةٗ وَرَحۡمَةٗۚ وَرَهۡبَانِيَّةً
ٱبۡتَدَعُوهَا مَا كَتَبۡنَٰهَا عَلَيۡهِمۡ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ رِضۡوَٰنِ ٱللَّهِ
فَمَا رَعَوۡهَا حَقَّ رِعَايَتِهَاۖ فَـَٔاتَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۡهُمۡ أَجۡرَهُمۡۖ
وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ٢٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ يُؤۡتِكُمۡ كِفۡلَيۡنِ مِن رَّحۡمَتِهِۦ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ نُورٗا
تَمۡشُونَ بِهِۦ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٢٨ لِّئَلَّا يَعۡلَمَ
أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ أَلَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَأَنَّ
ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٢٩



﴿٢٥﴾ ب سویند مە پێغەمبەرێت خۆ ب بەلگە و
موعجیزەیێت ئاشكەراڤە هنارتن، و مە كتێب و ترازی
و عەدل د گەل وان هنارت دا مرۆڤ [ب ڤان] عەدالەتێ
بكەن د هەمی كاروبارێت خۆدا، و مە ئاسن یێ دایی و
چێكری، هێز و قەوەتەكا دژوار یا تێدا، و مفا و قازانج
ژی بۆ مرۆڤان یێ تێدا، و دا خودێ بزانیت [ئانكو بۆ
هەوە بەرچاڤ بكەت، چونكی خودێ هەر دزانیت]
كا كی دێ باوەرییێ ب غەیبێ ئینیت، و دینێ وی و
پێغەمبەرێت وی ب سەر ئێخیت، ب ڕاستی خودێ
یێ ب هێز و سەردەستە. ﴿٢٦﴾ ب سویند مە نووح
و ئیبراهیم پێغەمبەر هنارتن، و مە پێغەمبەراتی [پشتی
وان] ئێخستە د دویندەها واندا، و مە كتێب بۆ وان
هنارتن [هەر پێغەمبەرەكێ پشتی وان هاتی ژ دویندەها
وان بوو]، ڤێجا هندەك [ژ دویندەها وان] ڕاستەڕێ
بوون، و باراپتر ژ وان ژ ڕێ دەركەڤتن. ﴿٢٧﴾ پاشی
مە پێغەمبەرێت خۆ د دویڤ وانڕا هنارتن، و پشتی
وان مە عیسایێ كوڕێ مەریەمێ هنارت [و مە كرە
پێغەمبەرێ ئسرائیلیان یێ دویماهیێ]، و مە ئنجیل
دایێ و مە نەرمی و دلۆڤانی ئێخستە د دلێت واندا، ئەوێت باوەری پێ ئینایین و ب دویڤ كەتین، و ڕەبەناتیا
ئەو ل سەر دچن [و دەستێت خۆ ژ دنیایێ دشۆن] مە بۆ وان نەنڤیسیبوو، ئەوان ژ نك خۆ ب ئنیەتا ڕازیبوونا
خودێ چێ كربوو، د گەل هندێ ژی وەك پێدڤی ب جهـ نەئینان، و ژ وان ئەوێت باوەری ئینایین مە خەلاتێ
وان دایێ، و گەلەك ژ وان ژ ڕێكا ڕاست دەركەتن و خراب بوون. ﴿٢٨﴾ گەلی خودان باوەران تەقوایا خودێ
بكەن و باوەرییێ ب هەمی پێغەمبەرێت وی بینن، دو پشك و باران ژ دلۆڤانیا خۆ دێ دەتە هەوە [ئێك:
ژ بەر باوەریا هەوە ب موحەمەد پێغەمبەری، و یا دی: ژ بەر باوەریا هەوە ب پێغەمبەرێت بەری وی]، و
دێ ڕۆناهییەكێ دەتە هەوە كو هوین ل بەر [د سەر پرا سیراتێڕا] بچن، و دێ ل گونەهێت هەوە بۆریت، و
خودێ ب خۆ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٢٩﴾ [مە هوین ب ڤێ كەرەما بۆری ئاگەهداركرن] دا خودان كتێب
[كو جوهی و فەلەنە] بزانن چو ژ كەرەما خودێ ب دەستێ وان نینە [نە ئەو دگەهنە ڤێ كەرەمێ یا خودێ
داییە ملەتێ پێغەمبەری، و نە دشێن ژێ ڤەگرن]، و ب ڕاستی كەرەم [پێغەمبەراتی و ڕاستەڕێیی و باوەری]
هەمی ب دەستێ خودێیە، ددەتە وی یێ وی بڤێت و خودێیە خودانێ كەرەما مەزن.

## سُورَةُ المُجَادلَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الجزء ٢٨ الحزب ٥٥

قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ
وَٱللَّهُ يَسۡمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ١ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ
مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمۡۖ إِنۡ أُمَّهَٰتُهُمۡ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي
وَلَدۡنَهُمۡۚ وَإِنَّهُمۡ لَيَقُولُونَ مُنكَرٗا مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ وَزُورٗاۚ وَإِنَّ
ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٞ ٢ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ثُمَّ يَعُودُونَ
لِمَا قَالُواْ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمۡ تُوعَظُونَ
بِهِۦۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ٣ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ
مُتَتَابِعَيۡنِ مِن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ فَإِطۡعَامُ سِتِّينَ
مِسۡكِينٗاۚ ذَٰلِكَ لِتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ
وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٤ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ
كُبِتُواْ كَمَا كُبِتَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ وَقَدۡ أَنزَلۡنَآ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖۚ
وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ ٥ يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُهُم
بِمَا عَمِلُوٓاْۚ أَحۡصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ٦



## سۆرەتا موجادەلە

**ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٢٢) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ ب سویند خودێ گۆتنا وێ ژنا د ڕاستا خو و زەلامی خۆدا جڕەبڕ د گەل تە دکر، و گازندە و خەما خۆ بۆ خودێ دیار دکر، بهیست و خودێ ئاگەهـ ژ دان و ستاندنا هەوە هەبوو، ب ڕاستی خودێ یێ گوهدێر و بینەرە. ﴿٢﴾ و ژ هەوە ئەوێت دبێژنە ژنێت خۆ تو وەکی دەیکا من ل من حەرام بی، ژنێت وان نابنە دەیکێت وان، دەیکێت وان بەس ئەون ئەوێت ئەو ژێ بوویین، و ب ڕاستی ئەو [ب ڤێ ئاخڤتنا خۆ] ئاخڤتنەکا دویری ڕاستییێ و شەرعی، و ئاخڤتنەکا درەو دبێژن، و ب ڕاستی خودێ لێبۆر و گونەهـ ژێبەرە [وەختێ دەرگەهێ ڕزگاربوونێ ب کەفارەتێ بۆ هەوە ڤەکری]. ﴿٣﴾ و ئەوێت دبێژنە ژنێت خۆ تو وەکی دەیکا من ل من حەرام بی و پاشی پەشێمان دبن و لێڤە دبن، ڤێجا بەری ئەو بچنە نڤینا خۆ دڤێت کۆلەیەکی [چ ژن بیت چ مێر] ئازاد بکەن، ئەمرێ هەوە ب ڤێ بڕیارێ دئێتەکرن [دا هوین ڤێ ئاخڤتنێ نەکەن] و هوین چ بکەن خودێ پێ ئاگەهدارە [و چو ل بەر بەرزە نابیت]. ﴿٤﴾ و یێ کۆلە نەدیت و ب دەست نەکەڤت، ڤێجا هێژ نەچۆینە نڤینا ئێك و دو، بلا دو هەیڤان ل سەرێك ب ڕۆژی بیت، و یێ نەشیا [دو هەیڤان یێ ب ڕۆژی بیت] بلا زادی بدەتە شێست بەلنگازان، ئەڤە [بڕیارێت زیهارێ مە دیارکرن] بۆ هندێیە دا هوین باوەرییێ ب خودێ و پێغەمبەرێ وی بینن [کار ب بڕیارا وی بکەن، و ل سەر بڕیارێت نەزانینێ نەمینن]، و ئەڤە تخویب و بڕیارێت خودێنە، و گاوران ئیزایەکا ب ژان و دژوار یا هەی. ﴿٥﴾ ب ڕاستی ئەوێت دژاتی و دژمناتیا خودێ و پێغەمبەرێ وی دکەن کا چاوا ئەوێت بەری وان ڕەزیل و ڕسوا بوون، ئەو ژی وەسا دێ ڕەزیل و ڕسوا بن، و ب سویند مە نیشان و بەلگەیێت ڕۆن و ئاشکەرا یێت هنارتین، و گاوران ئیزایەکا ڕسواکەر و شەرمزارکەر یا هەی. ﴿٦﴾ ڕۆژا خودێ وان هەمییان زێندی دکەتەڤە [دێ هەمییان کۆم کەت]، ڤێجا هەر کارەکێ وان کری [هویر یان گر] دێ وان پێ ئاگەهدار کەت، هەمی [کریارێت وان] خودێ یێت نڤێسین و وان ب خۆ یێت ژ بیرکرین، و خودێ ل سەر هەمی تشتان یێ شاهدە.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ مِن
نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ
مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا
عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٧﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ
نُهُوا۟ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ
وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ ۖ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ
بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ ۚ حَسْبُهُمْ
جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا ۖ فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا
تَنَٰجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ
وَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا
ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ
شَيْـًٔا إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا۟ فِى ٱلْمَجَٰلِسِ فَٱفْسَحُوا۟ يَفْسَحِ
ٱللَّهُ لَكُمْ ۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُوا۟ فَٱنشُزُوا۟ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ
وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١﴾



﴿٧﴾ ئەرێ ما تە نەزانییە کا چ د ئەرد و ئەسمانان‌دا
هەیە خودێ دزانیت، نینە سێ کەس پستەپستێ د
گەلێك بکەن [و یان ب دزیڤە د گەلێك باخڤن] ئەگەر
خودێ یێ چارێ نەبیت [ئانکو ئاگەهـ ژێ نەبیت و
نەزانیت]، و نینە پێنج کەس پستەپستێ د گەلێك بکەن
ئەگەر ئەو یێ شەشێ نەبیت، و نە کێمتر و نە زێدەتر،
نینە خودێ [ب زانینا خۆ] د گەل وان نەبیت هەر جهێ
لێ بن، پاشی دێ ڕۆژا قیامەتێ وان ب کار و کریارێت
وان کرین ئاگەهدار کەت. ب ڕاستی خودێ ژ هەر
تشتەکی ب ئاگەهە. ﴿٨﴾ ئەرێ ما تە ئەو نەدیتینە
ئەوێت نەهیا وان ژ پستەپستێ هاتییە کرن [مەخسەد
پێ جوهی و دوڕوینە]، پاشێ دزڤڕنە وێ ئەوا نەهیا
وان ژێ هاتییە کرن و پستەپستێ ب گونەهکارییێ و
نەیارەتییێ و نەگوهدارییا پێغەمبەری دکەن، و هەر
وەختەکێ دئێنە دەڤ تە وێ سلاڤێ ل تە دکەن ئەوا
خودێ ل تە نەکری، و د دلێ خۆدا دبێژن: پا بلا
خودێ ب ڤێ ئاخڤتنا ئەم دبێژین مە ئیزا بدەت [ئەگەر
ڕاستە موحەمەد پێغەمبەرە]، دۆژەهـ بەسی وانە
تامکەنێ، و دۆژەهـ چ پیسە جهـ و پیسە دویماهیکە. ﴿٩﴾ گەلی خودان باوەران، ئەگەر هەوە پستەپست کر،
ڤێجا پستەپستێ ب گونەهێ و دژمنییێ و بێ ئەمرییا پێغەمبەری نەکەن، و پستەپستێ ب باشییێ و تەقواییێ
بکەن، و ژ وی خودایی بترسن ئەوێ هوین هەمی دێ ب بالڤە ئێنە کۆمکرن. ﴿١٠﴾ ب ڕاستی پستەپست
ژ شەیتانییە، دا خودان باوەران پێ ب خەم بێخیت و ئەو ب خۆ (شەیتان) چو زیانێ ناگەهینیتە وان ب
دەستویرییا خودێ نەبیت، و دڤێت خودان باوەر پشتا خۆ ب خودێ گرێ بدەن. ﴿١١﴾ گەلی خودان باوەران
هەر وەختێ ژ هەوە هاتە داخوازکرن د جڤات و دیوانان‌دا جهی بکەن، جهی بکەن، خودێ ژی دێ ل سەر
هەوە فرەهـ کەت، و هەر وەختێ ژ هەوە هاتە داخوازکرن هوین ڕابن [دا جهێ هندەکێت دی بێتەکرن]
ڕابن، خودێ، ئەوێت ژ هەوە باوەری ئینایین، و زانین ب ڕزقێ وان کری، دێ وان پایە بلند کەت، و کار و
کریارێت هوین دکەن خودێ پێ ئاگەهە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ
صَدَقَةٗۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ
رَّحِيمٌ ١٢ ءَأَشۡفَقۡتُمۡ أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖۚ فَإِذۡ لَمۡ
تَفۡعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ
الحزب ٥٥ وَرَسُولَهُۥۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٣ ۞أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ
قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مَّا هُم مِّنكُمۡ وَلَا مِنۡهُمۡ وَيَحۡلِفُونَ عَلَى ٱلۡكَذِبِ
وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ١٤ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدًاۖ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ
يَعۡمَلُونَ ١٥ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَهُمۡ
عَذَابٞ مُّهِينٞ ١٦ لَّن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ
شَيۡـًٔاۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١٧ يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ
ٱللَّهُ جَمِيعٗا فَيَحۡلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ
عَلَىٰ شَيۡءٍۚ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ١٨ ٱسۡتَحۡوَذَ عَلَيۡهِمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ
فَأَنسَىٰهُمۡ ذِكۡرَ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱلشَّيۡطَٰنِ
هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ١٩ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ فِي
ٱلۡأَذَلِّينَ ٢٠ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغۡلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِيٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ ٢١



﴿١٢﴾ گەلی خودان باوەران ئەگەر هەوە بڤێت ب تنێ د گەل پێغەمبەری باخڤن بەری ئاخڤتنا خۆ یا ب تنێ خێرەكێ [ئانكو سەدەقەیەكێ] بدەن، ئەڤە [دانا سەدەقەیێ بەری ئاخڤتنا هەوە یا ب تنێ د گەل پێغەمبەری] بۆ هەوە باشتر و پاقژترە، ڤێجا ئەگەر هەوە چو نەبوو بدەن، ب ڕاستی خودێ یێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿١٣﴾ ئەرێ هوین ترسیان خیزان و ژار ببن ئەگەر بەری ئاخڤتنا خۆ یا ب تنێ د گەل پێغەمبەری سەدەقەیان بدەن؟ ڤێجا ئەگەر هوین وێ نەكەن [یا ئەمرێ هەوە پێ هاتییە كرن و ل سەر هەوە یا گران بیت]، خودێ ل سەر هەوە سڤك كر [و ل هەوە ناگریت هوین سەدەقەیان بەری ئاخڤتنا خۆ یا ب تنێ د گەل پێغەمبەری نەدەن]، ڤێجا بەردەوام و ب ڕەنگێ پێدڤی نڤێژان بكەن و زەكاتێ بدەن، و گوهداریا خودێ و پێغەمبەرێ وی بكەن، و خودێ ب خۆ ئاگەهداری وێیە یا هوین دكەن. ﴿١٤﴾ ئەرێ ما تە ئەو نەدیتن ئەوێت بوویینە دۆست و پشتەڤانێت وان ئەوێت خودێ غەزەب لێ كری [كو جوهینە]، ئەو [دوڕوی] نە ژ هەوەنە [گەلی موسلمانان] و نە ژی ژ وانن، و ل سەر درەوێ سویند دخۆن [ژ درەو سویند دخۆن كو ئەم موسلمانین، و نە دۆست و هاریكارێت جوهییانین]، و ئەو دزانن ئەو ژ درەو سویند دخۆن. ﴿١٥﴾ خودێ ئیزایەكا دژوار بۆ وان یا بەرهەڤكری، و چ پیسەكار بوو وان كری. ﴿١٦﴾ وان سویندێت خۆ [یێت ژ درەو] بۆ خۆ یێت كرینە مەتال [دا خۆ و مالێ خۆ پێ بپارێزن]، و ڕێكا خودێ ل خەلكی گرتن، وان ئیزایەكا ڕسواكەر و هەتكبەر یا هەی. ﴿١٧﴾ نە مال و نە عەیالێ وان فایدەیێ وان دكەت و نە وان ژ ئیزایا خودێ دپارێزیت، [و بزانن] ئەڤە دۆژەهینە و هەروهەر دێ تێدا مینن. ﴿١٨﴾ ڕۆژا خودێ وان هەمییان زێندی دكەت و بۆ حەق و حسابێ كۆم دكەت، وێ ڕۆژێ كا چاوا ئەڤرۆ بۆ هەوە ژ درەو سویند دخۆن وەسا دێ بۆ خودێ ژی سویند خۆن، و هزر دكەن سویندێت وان وێ ڕۆژێ دێ ب تشتەكی چن [و دێ فایدەی وان كەن هەروەكی سویندا دنیایێ فایدەی وان دكر]، باش بزانە ئەڤە درەوینن. ﴿١٩﴾ شەیتانی سەرێ ژ وان ستاندی [ب وەسواس و خەملاندنا خۆ یێت سەردابرین و هەڤساریێ خۆ یێ كرییە سەرێ وان]، خودایێ وان یێ ژ بیرا وان بری، ئەڤە قولپ و دەستەكا شەیتانینە، باش بزانن خوسارەتی بارا قولپ و دەستەكا شەیتانییە. ﴿٢٠﴾ ب ڕاستی ئەوێت نەیارەتی و دژمناتیا خودێ و پێغەمبەرێ وی دكەن، ئەو ڕسواترین و ڕەزیلترین مرۆڤن. ﴿٢١﴾ خودێ ب خۆ بڕیار یا دایی: بێ گۆمان ئەز و پێغەمبەرێت خۆ، دێ ب سەركەڤین، ب ڕاستی خودێ خودان هێز و سەردەستە.

لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ
ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ
أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَأَيَّدَهُم
بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ
خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ حِزْبُ
ٱللَّهِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾

سُورَةُ الحَشْرِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ
ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ مِن
دِيَـٰرِهِمْ لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ ۚ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا۟ ۖ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ
حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا۟ ۖ وَقَذَفَ
فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِى ٱلْمُؤْمِنِينَ
فَٱعْتَبِرُوا۟ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَبْصَـٰرِ ﴿٢﴾ وَلَوْلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمُ
ٱلْجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ﴿٣﴾



﴿٢٢﴾ نینە هندەك باوەرییێ ب خودێ و رۆژا قیامەتێ بینن، و حەژ وان بكەن ئەوێت نەیارەتیێ و دژمناتیا خودێ و پێغەمبەرێ وی دكەن، خۆ ئەگەر ئەو باب و باپیرێت وان بن، یان زارۆكێت وان بن، یان برایێت وان بن، یان عەشیرەتا وان بیت، ئەڤان خودێ باوەرییا د دلێت واندا نڤێسی و بنەجهكری، و ب هاریكاری و پشتەڤانی و ب سەركەڤتنا خۆ ئەو یێت ب هێز ئێخستین، و دێ وان بەتە بەحەشتێت رویبار د بنرا دچن و هەروهەر دێ تێدا بن، خودێ ژ وان رازی بوو و ئەو ژی ژ خەلاتێ خودایێ خۆ رازی بوون، و ئەڤە كۆما خودێنە و باش بزانن یێت سەرفەراز هەر كۆما خودێنە.

## سۆرەتا حەشر

**ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٢٤) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ هەر تشتەكێ د ئەرد و ئەسماناندا هەی، خودێ ژ هەمی كێماسییان پاقژ دكەت و تەسبیحا وی دكەت، و ئەوە یێ سەردەست و كاربنەجهە. ﴿٢﴾ ئەوە (ئانكو خودێیە) یێ ئەوێت گاوربوویین ژ خودان كتێبان [مەخسەد پێ (بەنی نەظیر)ن] دەرئێخستنا ئێكێ ژ مالێت وان دەرئێخستن، هەوە هزر نەدكر ئەو دێ دەركەڤن و وان ژی هزر دكر كەلهەیێت وان دێ وان ل بەر خودێ ئاسێ كەن، ڤێجا خودێ ب رێكەكا وەسا هاتە وان هزرا وان بۆ نەدچۆ، و وەسا ترس ئێخستە دلێ وان، خانییێت خۆ ب دەستێت خۆ و ب دەستێت خودان باوەران دهەرافتن، ڤێجا گەلی خودان ئەقلان دەرس و چامەیان بۆ خۆ ژ وان وەرگرن [وێ نەكەن یا وان دكر، دا ئەو ب سەرێ هەوە نەئێت یا ب سەرێ وان هاتی]. ﴿٣﴾ و ئەگەر خودێ، دەركەڤتن [ب وی رەنگێ پێ دەركەڤتین] ل سەر وان نەنڤێسیبایە، دا د دنیایێدا وان ئیزادەت [ب كوشتن و ئێخسیركرنێ هەروەكی ب سەرێ (بەنی قورەیظە) ئینایی] و ل ئاخرەتێ ژی ئیزایا ئاگری بۆ وانە.

ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۖ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ
ٱلْعِقَابِ ﴿٤﴾ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ
أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ
عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ
قَدِيرٌ ﴿٦﴾ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ
وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ
دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا
نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾
لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ
يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ
أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن
قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ
حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ
وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾



﴿٤﴾ و ئەڤە [ئەڤ ئیزایە] مە ب سەرێ وان ئینا چونکی وان دژمناتیا خودێ و پێغەمبەرێ وی دکر، و هەر کەسێ دژمناتیا خودێ بکەت، ب ڕاستی جزایێ خودێ [د ڕاستا ویدا] جزایەکێ دژوارە.
﴿٥﴾ هەر دارقەسپەکا هەوە بڕی یان هەوە ل سەر بنێ وێ هێلایی، ب دەستویریا خودێ بوو، و دا خودێ ڕێدەرکەڤتیان [کو جوهیێت (بەنی نەضیر)ـن] بشکێنیت و ڕەزیل بکەت. ﴿٦﴾ و ئەو مالێ خودێ ژ وان ستاندی و دایییە پێغەمبەری، هەوە چو هەسپ و حێشتر د دویڤرا نەدایینە بەزێ [و هەوە زەحمەت پێڤە نەبرییە]، بەلێ خودێ پێغەمبەرێ خۆ ل سەر هەر کەسێ حەز بکەت سەردەست دکەت، خودێ ل سەر هەر تشتەکی خودان دەستهەلاتە. ﴿٧﴾ و ئەو مالێ بێ شەڕ خودێ کرییە دەستکەڤتی بۆ پێغەمبەرێ خۆ، ئەوێ ژ خەلکێ گوندان [گوندێت بەنی (قورەیظە) و (بەنی نەضیر) و گوندێ فەدەك و گوندێ خەیبەر] هاتییە ستاندن، بۆ خودێ و پێغەمبەرێ وی و مرۆڤێت پێغەمبەری [ژ بابکێ هاشم و (موتەلب) ی] و سێوی و بەلەنگاز و ڕێڤنگانە، دا هەر نەمینیتە د دەستێ زەنگینێت هەوەدا، و چ ئەمرێ پێغەمبەری ل هەوە کر بکەن، و نەهیا هەوە ژ چ کر خۆ ژێ بدەنە پاش، و ژ خودێ بترسن [سستیێ د ئەمرێ ویدا نەکەن]، ب ڕاستی جزایێ خودێ جزایەکێ دژوارە. ﴿٨﴾ ئەو مال بۆ وان فەقیر و ژارێت مشەختن ئەوێت ژ ناڤ مال و جهـ و وارێت خۆ هاتینە دەرئێخستن، داخوازا کەرەم و ڕازیبوونا خودایێ خۆ دکەن [ئانکو دا بگەهنە کەرەم و ڕازیبوونا خودایێ خۆ، مشەخت بوون]، و دینێ خودێ ب سەردئێخن و هاریکاریا پێغەمبەرێ وی دکەن، و ئەڤەنە د باوەریا خۆدا ڕاست و دورست. ﴿٩﴾ و ئەوێت بەرێ ل مەدینەیێ ئاکنجی، و باوەری ئینایین بەری مشەخت بچنە مەدینەیێ، ئەو حەژ وان مشەختان دکەن ئەوێت قەستا وان کرین، و چو کەرب و دلڕەشیێ د دلێت خۆدا نابینن بەرانبەری مشەختان، ژ بەر مالێ پێغەمبەری دایییە وان مشەختان، و ئەو وان ب پێش خۆ دئێخن و وان ژ خۆ فەرتر ددانن، خۆ چەند د هەوجە و دەست تەنگ ژی بن، و ئەوێت خۆ ژ چڕویکیا نەفسا خۆ دپارێزن، ئەون سەرفەراز.

وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا
ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ
ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ١٠ * أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ
نَافَقُواْ يَقُولُونَ لِإِخۡوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ
لَئِنۡ أُخۡرِجۡتُمۡ لَنَخۡرُجَنَّ مَعَكُمۡ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمۡ أَحَدًا أَبَدٗا
وَإِن قُوتِلۡتُمۡ لَنَنصُرَنَّكُمۡ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ١١
لَئِنۡ أُخۡرِجُواْ لَا يَخۡرُجُونَ مَعَهُمۡ وَلَئِن قُوتِلُواْ لَا يَنصُرُونَهُمۡ
وَلَئِن نَّصَرُوهُمۡ لَيُوَلُّنَّ ٱلۡأَدۡبَٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ١٢ لَأَنتُمۡ
أَشَدُّ رَهۡبَةٗ فِي صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ
لَّا يَفۡقَهُونَ ١٣ لَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرٗى مُّحَصَّنَةٍ
أَوۡ مِن وَرَآءِ جُدُرِۭۚ بَأۡسُهُم بَيۡنَهُمۡ شَدِيدٞۚ تَحۡسَبُهُمۡ جَمِيعٗا
وَقُلُوبُهُمۡ شَتَّىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ ١٤ كَمَثَلِ
ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَرِيبٗاۖ ذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ
أَلِيمٞ ١٥ كَمَثَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ إِذۡ قَالَ لِلۡإِنسَٰنِ ٱكۡفُرۡ فَلَمَّا
كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٦

نصف الحزب ٥٥



﴿١٠﴾ و ئەوێت د دویڤ وانرا هاتین دبێژن: خودێوۆ
گونەهێت مە و یێت برایێت مە یێت بەری مە باوەری
ئینایین ژێ ببە، و نەڤیانا وان ئەوێت باوەری ئینایین
نەئێخە د دلێت مەدا، و مە د ڕاستا واندا زکرەش نەکە،
خودێوۆ تو میهرەبان و دلۆڤانی. ﴿١١﴾ ئەرێ ما تە ئەو
نەدیتن ئەوێت دوڕوییاتی کرین، گۆتنە برایێت خۆ
ئەوێت گاوربووین ژ خودانێت کتێبان [مەخسەد پێ
جوهییێت (بەنی نەضیر)ـن]: ب سویند ئەگەر هوین
هاتنە دەرئێخستن ئەم ژی د گەل هەوە دێ دەرکەڤین،
و ئەم د ڕاستا هەوەدا گوهداریيا کەسێ ناکەین، و
ئەگەر شەڕێ هەوە هاتەکرن ئەم دێ هاریکاریيا
هەوە کەین، و خودێ شادەیییێ ددەت کو ئەو
درەوینن. ﴿١٢﴾ ئەگەر ئەو [ئانکو (بەنی نەضیر)] بێنە
دەرئێخستن د گەل وان دەرناکەڤن و ئەگەر شەڕ ژی د
گەل وان بێتەکرن هاریکاریيا وان ناکەن، و ئەگەر ئەو
هاریکاریيا وان بکەن ژی [دێ شکێن و خۆ ناگرن]
دێ ڕەڤن، پاشی هاریکاریيا وان ژی نائێتەکرن.
﴿١٣﴾ ب ڕاستی [گەلی خودان باوەران] سەهما هەوە
د دلێت واندا ژ سەهما خودێ پترە، چونکی ئەو ملەتەکێ تێنەگەهشتینە. ﴿١٤﴾ ئەو هەمی پێکڤە [دوڕوی و
جوهییێت (بەنی نەضیر)] چوجا نەشێن شەڕێ هەوە بکەن، ئەگەر نە د ناڤ هندەك گوندێت ئاسێدا بن یان
ل پشت دیواران بن [دا خۆ ل پشت ڤەشێرن، هندی هند ترسنۆکن] نەلێکی و دژمنایییەکا دژوار یا د ناڤبەرا
واندا هەی [یان زیرەکی و دژوارییا وان بۆ ئێك و دویە] یا ژ تەڤە هەمی ئێکن، بەس دلێت وان نەدگەلێکن،
ئەڤە چونکی ئەو ملەتەکێ نەفام و تێنەگەهشتینە. ﴿١٥﴾ ئەو ژی وەکی ئەوێت بەری خۆنە [جوهییێت قەینوقاع
بەری وان، نێزیك نەدویر، پێغەمبەری دەرئێخستبوون] ئەوێت تامکرینە جزایێ کارێ خۆ، و ئیزایەکا دژوار
ژی بۆ وان یا هەی. ﴿١٦﴾ مەتەلا وان [دوڕوییان و سەردابرنا وان بۆ جوهییان] وەکی مەتەلا شەیتانییە،
وەختێ دبێژتە مرۆڤی ببە گاور و گاڤا گاور بوو دێ بێژیتێ: ئەز ژ تە بەریمە [و من شۆلە ب تە نینە]، ب
ڕاستی ئەز [ژ ئیزایا] خودانێ هەمی جیهانان دترسم.

فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِي ٱلنَّارِ خَٰلِدَيۡنِ فِيهَاۚ
وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ
ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٨ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ
نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ١٩
لَا يَسۡتَوِيٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۚ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡجَنَّةِ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ٢٠ لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ
عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۚ
وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ٢١
هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۖ
هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ٢٢ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ
ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ
ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٢٣ هُوَ ٱللَّهُ
ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ
لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٢٤





«١٧» ڤێجا دویماهیــیا هــەردووكان ئەڤەیــە: هەردو هەتا هەتــا دێ د ئاگریــدا بــن، و ئەڤەیە جزایــێ ستەمكاران. «١٨» گــەلی خــودان بــاوەران ژ خــودێ بترســن، و هــەر ئێـك بلا بەرێ خـۆ بدەتێ كا چ كار و كریار بۆ سـوبەهی كرینە، و چ ل پێشیــیا خۆ هنارتیــیە، و ژ خودێ بترسن، ب ڕاستی هــەر تشتەكێ هوین دكـەن خـودێ ژێ ب ئاگەهــە. «١٩» و هویـن وەكـی وان نەبـن ئەوێت خودێ (ئەمـرێ خـودێ) ژ بیركرین، و ترسـا وی نەكرینە د دلێ خـۆدا [یـان خـودێ و زكـرێ وی ژ بیركریـن]، ڤێجـا خـودێ وەل وان كـر خـۆ ژ بـیر بكـەن [ئـەو نەكـرن یـا فایدەیــێ وان بكەت، هەچكو خـۆ ژ بیركرین]، و ئەڤەنە ژ ڕێـكا ڕاسـت دەركەڤتـی. «٢٠» بەحەشـتی و دۆژەهی وەكـی ئێـك نابـن، بەحەشـتینە سـەرفەراز. «٢١» ئەگـەر مـە ئـەڤ قورئانە بـۆ چیایەكـی هنارتبایە، تـو دا [چیای] بینـی ژ ترسـێت خودێـدا ترسـگرتی و پـەق پەقـە، و ئەم ڤـان نموونەیـان بـۆ مرۆڤـان دیـار دكەیـن دا هـزرا خـۆ تێـدا بكـەن. «٢٢» ئـەو، ئـەو خودێیە یــێ چو پەرسـتی یــێت ڕاست و دورسـت ژ بلی وی نەی، و ئەوە زانایــێ نهێنـی و ئاشـكرایان، و ئـەوە خودان ڕەحمێ زێدە دلۆڤان. «٢٣» ئەو، ئەو خودێیە یــێ چو پەرستیــێت دورست ژ بـلی وی نـەی، خـودان و خوندكارێ هەمی چێكریانە، و یــێ پاقژە [ژ هەمی كێمـاسیــیان] و سـەرەكانیا تەنایی و سلامەتیــێیە، و دل تەناكـەرە [بـۆ بەندەیــێت خـۆ ژ ئیزایـا خـۆ] و پارێزەر و زێرەڤانە [ل سـەر هەمی تشـتان]، و سەردەسـت و دەسـت بلنـد و نەچاركـەرە، و خودان مەزناتیــیە، و خودێ ژ وان هەڤپشـكێت مـوشرك بۆ ددانن یــێ پاقـژە. «٢٤» ئـەوە خودایــێ چێكەر و پەیداكـەر و وێنە و ڕەنگ چێكەر، باشـناڤ هەمی یــێت وینە، هندی د ئـەرد و ئەسمــانانـدا هەیـن هەمـی وی ژ كێمـاسیــیان پاقژ دكـەن، و هەر ئەوە یــێ سەردەسـت و كاربنەجهـ.

سُورَةُ المُمۡتَحَنَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم
بِٱلۡمَوَدَّةِ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمۡ أَن
تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمۡ إِن كُنتُمۡ خَرَجۡتُمۡ جِهَٰدٗا فِي سَبِيلِي وَٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِيۚ
تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡۚ وَمَن
يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١ إِن يَثۡقَفُوكُمۡ يَكُونُواْ لَكُمۡ أَعۡدَآءٗ
وَيَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ وَأَلۡسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ ٢
لَن تَنفَعَكُمۡ أَرۡحَامُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡۚ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَفۡصِلُ بَيۡنَكُمۡۚ وَٱللَّهُ
بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ٣ قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ
مَعَهُۥٓ إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ
كَفَرۡنَا بِكُمۡ وَبَدَا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةُ وَٱلۡبَغۡضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤۡمِنُواْ
بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥٓ إِلَّا قَوۡلَ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسۡتَغۡفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمۡلِكُ لَكَ مِنَ
ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۖ رَّبَّنَا عَلَيۡكَ تَوَكَّلۡنَا وَإِلَيۡكَ أَنَبۡنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٤ رَبَّنَا
لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ وَٱغۡفِرۡ لَنَا رَبَّنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٥



## سۆرەتا مومتەحینە

**ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (١٣) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ گەلی خودان باوەران، نەیارێ من و نەیارێ خۆ نەکەنە دۆست و هەڤال، هوین لەزێ ل حەژێکرنا وان دکەن و ئەو ب خۆ باوەرییێ ب دینی و قورئانا بۆ هەوە هاتی نائینن، و پشتا خۆ ددەنێ چونکی هەوە باوەری ب خودایێ خۆ ئینابوو، هوین و پێغەمبەر [ژ مەکەهێ] دەرئێخستن، ژ بەر وێ باوەریا هەوە ب خودێ ئینایی خودایێ خۆ [ڤێجا چاوا هوین حەژ وان دکەن؟] و ئەگەر هوین بۆ جیهادێ و ڕازیبوونا من دەرکەڤتبن [دۆستینی و حەژێکرنا وان نەکەن] هوین ب دزیڤە ژ بەر وێ حەژێکرنێ، دەنگ و بەحسان دگەهیننە وان، و ئەز چێتر دزانم هوین چ ڤەدشێرن و چ ئاشکەرا دکەن، و هەر کەسێ ژ هەوە هەڤالینیا وان بکەت [نهینیێت موسلمانان بۆ وان ئاشکەرا بکەت]، ب سویند وی ڕێکا ڕاست بەرزەکر. ﴿٢﴾ ئەگەر هوین ب دەست وان بکەڤن و بشێنە هەوە دژمنیا خۆ دێ بۆ هەوە دیارکەن، و دەست و ئەزمانێت خۆ ب خرابی دێ ل هەوە درێژکەن، و حەز دکەن هوین ژی [وەکی وان] گاور ببن. ﴿٣﴾ د بنیڕا کەس و کار و زارۆکێت هەوە فایدەی هەوە ناکەن، خودێ ڕۆژا قیامەتێ دێ هەوە هەمییان ژێکڤەکەت، و تشتێ هوین دکەن خودێ ژێ ب ئاگەهە. ﴿٤﴾ ب سویند ئیبراهیم پێغەمبەر و ئەوێت باوەری پێ ئینایین، بۆ هەوە نموونەیەکا باش بوون وەختێ گۆتینە ملەتێ خۆ [ئەوێت گاور]، ب ڕاستی ئەم ژ هەوە و ژ وان ئەوێت هوین شوینا خودێ دپەرێسن پێت بەرینە، ئەم باوەرییێ ب دینێ هەوە نائینین، [هەوە گاور دبینین، و باوەرییێ ب کار و کریار و دینێ هەوە نائینین]، و ئەڤە نەڤیان و دژمنایی کەڤتە د ناڤبەرا مە و هەوەدا و نارابیت، هەتا هوین باوەرییێ ب خودێ ب تنێ نەئینن [و د هەمی تشتاندا چاڤ ل ئیبراهیمی بکەن ئاخڤتنا] د گەل بابێ خۆ گۆتی تێ نەبیت [دەمێ گۆتییێ]: ئەز دێ داخوازا گونەهـژێبرنێ بۆ تە کەم، و ئەز نەشێم تە ژ ئیزایا خودێ بپارێزم ژی، خودێوۆ، مە خۆ هێلا ب هیڤیا تەڤە و مە خۆ هەلپەسارتە تە، و ئەم ب بال تەڤە زڤرین، و زڤرین و دویماهیك هەر ب بال تەڤەیە. ﴿٥﴾ خودێوۆ، مە نەئێخە بەر ئیزایا گاوران و وان ل سەر مە سەردەست نەکە، کو مە ب ئیزایەکا ژ تاقەتا مە زێدە بجەربینی [و ئەو بێژن: ئەگەر ئەو پێت هەق بانە، ئەڤە ب سەرێ وان نەدهات] و گونەهێت مە ژێ ببە، خودێوۆ ب ڕاستی سەردەست و کاربنەجهـ هەر تویی.

لَقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِيهِمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَۚ
وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ٦ ۞عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجۡعَلَ بَيۡنَكُمۡ
ثلاثة أرباع الحزب ٥٥
وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ عَادَيۡتُم مِّنۡهُم مَّوَدَّةٗۚ وَٱللَّهُ قَدِيرٞۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٧
لَّا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَلَمۡ يُخۡرِجُوكُم
مِّن دِيَٰرِكُمۡ أَن تَبَرُّوهُمۡ وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ٨
إِنَّمَا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَأَخۡرَجُوكُم مِّن
دِيَٰرِكُمۡ وَظَٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخۡرَاجِكُمۡ أَن تَوَلَّوۡهُمۡۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٩ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ
فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ فَلَا
تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ وَءَاتُوهُم
مَّآ أَنفَقُواْۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّۚ
وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ وَلۡيَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْۚ
ذَٰلِكُمۡ حُكۡمُ ٱللَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡۖ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ١٠ وَإِن فَاتَكُمۡ
شَيۡءٞ مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ إِلَى ٱلۡكُفَّارِ فَعَاقَبۡتُمۡ فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتۡ
أَزۡوَٰجُهُم مِّثۡلَ مَآ أَنفَقُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ١١



﴿٦﴾ ب سویند ئەو [ئیبراهیم و ئەوێت د گەل] بۆ هەوە نموونە و چاڤلێكری یێت باشن، بۆ وی یێ داخوازا خەلاتێ خودێ بكەت و ژ ئیزایا ڕۆژا قیامەتێ دترسیت، و هەر كەسێ پشتا خۆ بدەتە باوەرییێ [و چاڤ ل پێغەمبەرێت وی نەكەت، ئەو بەس زیانێ ل خۆ دكەت]، ب ڕاستی هەر خودێیە یێ دەولەمەند و پاك و هێژایی شوكور و سوپاسییێ. ﴿٧﴾ [گەلی خودان باوەران دژمنایا گاوران نەهێلن] دبیت خودێ حەژێكرنێ و ڤیانێ بێخیتە د ناڤبەرا هەوە و هندەك ژ واندا، ئەوێت هوین نەیارەتیا وان دكەن،[ب ڕێكا موسلمانبوونا وان] و خودێ خودان شیان و گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٨﴾ خودێ هەوە ژ وان نادەتە پاش [و نەهیا هەوە ژ وان ناكەت] ئەوێت (ئەو گاورێت) شەڕێ هەوە ژ بەر دینێ هەوە نەكرین، و هوین ژ وەلاتێ هەوە دەرنەئێخستین كو هوین باشیێ و قەنجییێ و عەدالەتێ د گەل وان بكەن، ب ڕاستی خودێ حەژ عەدالەتكەران دكەت. ﴿٩﴾ بەلێ خودێ بەس نەهیا هەوە ژ وان دكەت ئەوێت شەڕ ژ بەر دینێ هەوە د گەل هەوە كرین، و هوین ژ وار و جهێت هەوە دەرئێخستین، و هاریكاری د دەرئێخستنا هەوەدا كرین كو هوین دۆستینیا وان بكەن، و هەر كەسێ دۆستینیا وان بكەت، ئێ ئەون یێت ستەمكار.

﴿١٠﴾ گەلی خودان باوەران، هەر وەختێ ژنێت خودان باوەر مشەخت بوون و هاتنە دەڤ هەوە، بجەڕبینن [كا وان ب دورستی باوەری ئینایییە یان نە]، و خودێ چێتر ئاگەهـ ژ باوەرییا وان هەیە، و ئەگەر هەوە زانی كو وان [ژنان] ب دورستی باوەری یا ئینایی وان ل گاوران نەزڤرینن، نە ئەو ژن بۆ وان گاوران دورستن و نە ئەو گاور بۆ وان دورستن، و [گەلی خودان باوەران] ئەو مەهرا زەلامێت وان ژنان [ئەوێت گاور] داییە وان ژنان ل زەلامێت وان بزڤرینن، و چو گونەهـ ل سەر هەوە نینە هوین وان ژنان مارە بكەن، ئەگەر هوین مارەیا وان بدەنێ، و ژنێت گاور ل سەر زیمەتا خۆ نەهێلن و ئەو مەهرا هەوە داییە وان [ژنێت گەهشتینە گاوران] ژ وان بستینن، و وان گاوران ژی كا چ مەهر داییە ژنێت خۆ [ئەوێت موسلمان بوویین و گەهشتینە هەوە و شوی ب هەوە كرین]، بلا ژ هەوە بخوازن ئەڤە بڕیار و فەرمانا خودێیە، خودێ ب ڤان بڕیاران حوكمی د ناڤبەرا هەوەدا دكەت، و خودێ یێ زانا و كاربنەجهە. ﴿١١﴾ [گەلی خودان باوەران] ئەگەر ژنەك ژ ژنێت هەوە بخرییێت و بگەهیتە گاوران، و هوین د شەڕێ خۆدا د گەل گاوران ب سەركەڤتن و دەستكەڤتی ب دەست هەوە كەڤتن، ڤێجا ئەوێت ژنێت وان چۆیین بووینە گاور كا چ مەهر زەلامێت وان داییە وان، تەمەتی وێ مەهرێ ژ غەنیمەی بدەنە وان، و ژ وی خودایی بترسن ئەوێ هەوە باوەری پێ هەی.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشۡرِكۡنَ بِٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡرِقۡنَ وَلَا يَزۡنِينَ وَلَا يَقۡتُلۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ فَبَايِعۡهُنَّ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٢ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَوَلَّوۡاْ قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ قَدۡ يَئِسُواْ مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلۡكُفَّارُ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡقُبُورِ ١٣

سُورَةُ الصَّفِّ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٣ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ ٤ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ لِمَ تُؤۡذُونَنِي وَقَد تَّعۡلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡۖ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٥



﴿١٢﴾ هەی پێغەمبەر، گاڤا ژنێت خودان باوەر هاتنە دەڤ تە دا پەیمانێ بدەنە تە کو ئەو چو هەڤپشکان بۆ خودێ چێ نەکەن، و دزیێ نەکەن و دەهمەن پیسیێ نەکەن و زارۆکێت خۆ نەکوژن، و چو زارۆکان ژ بێ بەختی ب دویڤ زەلامێت خۆڤە نەنن و ژ ئەمرێ تە دەرنەکەڤن، ڤێجا تو ژی پەیمانێ ژ وان وەربگرە و داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ وان ژ خودێ بکە، ب ڕاستی خودێ یێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿١٣﴾ گەلی خودان باوەران، دۆستینیا وان نەکەن ئەوێت خودێ غەزەب لێ کری، ب سویند ئەو ژ خەلاتێ ئاخرەتێ بێ هیڤینە کا چاوا گاور [ئەوێت باوەری ب ڕۆژا قیامەتێ نەی] ژ مریان بێ هیڤینە [جارەکا دی ساخ ببنەڤە].

## سۆرەتا صەف

### ل مەدینەیێ هاتیە خوارێ (١٤) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هندی د ئەرد و ئەسماناندا هەی تەسبیحا خودێ دکەن [ژ کێماسیان پاقژ دکەن]، و ئەوە یێ سەردەست و کاربنەجهـ. ﴿٢﴾ گەلی خودان باوەران بۆچی هوین دبێژن و ناکەن؟. ﴿٣﴾ ئاخڤتنا هوین دبێژن و نەکەن، کەربێ ل دەڤ خودێ پتر لێ دکەت. ﴿٤﴾ ب ڕاستی خودێ حەژ وان دکەت ئەوێت ئێك ڕێز شەڕی د ڕێکا خودێدا دکەن، دێ بێژی ئاڤاهیەکێ موکوم و پێکڤە گرێدایییە. ﴿٥﴾ و چیرۆکا مووسایی بۆ ملەتێ خۆ بێژە وەختێ گۆتییە ملەتێ خۆ: گەلی ملەتێ من بۆچی هوین من ئێزا ددەن و دئێشینن و هوین دزانن ئەز پێغەمبەرێ خودێمە بۆ هەوە، ڤێجا وەختێ وان هەقی هێلایی و بەرێ خۆ ژێ وەرگێڕایی، خودێ ژی دلێت وان ژێ دانە پاش و ژێ وەرگێڕان، و خودێ ملەتێ ژ ڕێکا ڕاست دەرکەڤتی ڕاستەڕێ ناکەت.

وَإِذۡ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُم مُّصَدِّقٗا لِّمَا
بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَمُبَشِّرَۢا بِرَسُولٖ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُۖ فَلَمَّا
جَآءَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٦﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى
ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُوَ يُدۡعَىٰٓ إِلَى ٱلۡإِسۡلَٰمِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧﴾
يُرِيدُونَ لِيُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ
ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ
عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ﴿٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ
تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿١٠﴾ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ
فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١١﴾
يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ وَيُدۡخِلۡكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ
طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٢﴾ وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَاۖ نَصۡرٞ
مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتۡحٞ قَرِيبٞۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ
أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ
قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ
وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ﴿١٤﴾



﴿٦﴾ و وەختـێ عیسایـێ کـوڕێ مەریەمـێ گۆتیـیە [ئسرائیلیـیـان]: گـەلی ئسرائیلیـیـان نـێ ئـەز پێغەمبەرێ خودێمـە بـۆ هـەوە، و ئـەز ڕاسـتـدەرئێخێ کتێبـا بـەری خۆمـە کـو تەوراتـە، و ئـەزێ هاتیـم مزگینیـیا پێغەمبەرەکـی بدەمە هەوە، پشـتی مـن دێ ئێت ناڤێ وی ئەحمەدە، و وەختێ عیسـا ب موعجیزەیـێت ئاشـکەراڤە بـۆ وان هاتـی، گۆتن: ئەڤـە سێربەندیـیەکا ئاشـکەرایە. ﴿٧﴾ و مـا کـی ژ وی سـتەمکارترە ئـەوێ درەوان ب ناڤێ خـودێ بکەت [پێغەمبـەرێ وی سـێربەند بدانیت، و موعجیزەیـێت وی سـێربەندی بدانیـت]، و داخـواز ژ وی ب خـۆ دئێتەکـرن [ب ڕێـکا پێغەمبەرێـت خـودێ] موسـلمان ببیـت، و خـودێ ملەتـێ سـتەمکار ڕاسـتەڕێ ناکـەت. ﴿٨﴾ وان [سـتەمکار و گـاوران] دڤێـت [ئانکو ل بـەر دگـەرن] ڕۆناهیـیا خـودێ [کـو قورئانـە] ب دەڤێـت خـۆ ڤەمرینـن، و خودێ ڕۆناهیـیا خـۆ هەر دێ تمـام کـەت، خـۆ ئەگەر گـاوران پـێ نەخـۆش ژی بیت. ﴿٩﴾ ئـەوە (خودێـیـە) پێغەمبەرێ خۆ ب ڕاستەرێییـێ [کـو قورئانـە] و دینـێ ڕاسـتڤە هنارتـی، دا ڤـی دینـی بکەتـە سەرپشـکا هەمـی دینـان و ب سـەر هەمـی دینـان بێخیـت، خـۆ هەڤپشـك چێکـەران پـێ نەخـۆش ژی بیـت. ﴿١٠﴾ گـەلی خـودان باوەران، ئەرێ ئەز بازرگانیـیەکێ نیشـا هـەوە بدەم، هـەوە ژ ئیزایـەکا دژوار و ب ژان ڕزگـار بکـەت. ﴿١١﴾ باوەرییـێ ب خـودێ و پێغەمبـەرێ وی بینـن، و جیهـادێ ب نەفسـا خـۆ و مالـێ خـۆ د ڕێـکا خودێـدا بکـەن، ئەڤـە [بـاوەری ئینـان و جیهـاد د ڕێـکا خودێـدا] بۆ هـەوە [ژ هـەوە و مالێ هـەوە] چێترە، ئەگـەر هویـن بزانـن. ﴿١٢﴾ [ئەگـەر هوین ڤـێ بکەن، باوەرییـێ ب خـودێ و پێغەمبـەرێ وی بینن، و ب نەفسـا خـۆ و مالـێ خـۆ جیهـادێ د ڕێـکا خودێـدا بکـەن]، خـودێ دێ گونەهێـت هـەوە ژێ بـەت، و دێ هـەوە بەتـە بەحەشـتێت ڕوبیـار د بنـڕا دچـن، و دێ هەوە کەتە د ئاڤاهیـیێت خۆشـدا د بەحەشـتێت ئاکنجیبوونێـدا، و ئەڤەیە سـەرفەرازیا مـەزن. ﴿١٣﴾ و نیعمەتـەکا دیـتر [یـان سەرفەرازیـیەکا دیـتر] هوین حـەژێ دکەن [خـودێ دێ دەتە هـەوە]، ئـەو ژی سـەرکەڤتن و ڤەکرنـەکا نێزیکـە ژ خـودێ [مەخسـەد پـێ ڤەکرنـا مەکەهێـیـە]، و مزگینیـێ بدە خـودان بـاوەران. ﴿١٤﴾ گـەلی خودان بـاوەران هاریکارێـت دینێ خـودێ بن [ئانکـو دینێ خودێ ب سـەربێخن و بلنـد بکـەن]، وەکـی عیسایـێ کـوڕێ مەریەمێ گۆتیـیە هەڤالێـت خۆ یـێـت بژارە: کـی دێ هاریکاریـیا من کـەت بـۆ سـەرفەرازکرنا دینـێ خودێ، هەڤالێت وی یـێت بـژارە گۆت: ئـەم هاریکارێـت دینێ خودێینـە، ڤێجا دەسـتەکەکێ ژ ئسرائیلیـیـان بـاوەری پـێ ئینا و دەسـتەکەکێ بـاوەری پـێ نەئینا، ڤێجا مـە ژی پشتەڤانیـیا ئەوێت بـاوەری ئینایـین ل سـەر نەیارێـت وان کـر، و ئـەو ب سـەرکەڤتن.

## سۆرەتا جومعه

### ل مەدینەییێ هاتیـیە خوارێ (١١) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ هنـدی د ئـەرد و ئەسمـــاناندا هەی خـودێ ژ هەمی کێماسیـیان پاقـژ دکـەن و تەسبیحا وی دکـەن، ئـەوە خودانـێ هەمـی تشـتان و ژ هەمـی کێماسیــیان پاقـژ، و سەردەسـت و کاربنەجهـ. ﴿٢﴾ ئـەوی پێغەمبـەرەك بـۆ عەرەبـان هـەر ژ نـاڤ وان ب خـۆ هنـارت، دا ئایەتێـت خـودێ کـو قورئانە بـۆ وان بخوینیـت، و دا وان [ژ قرێژا شرکێ و گاوریــیێ و گونەهـان] پاقـژ بکـەت و وان فـێری قورئانێ و سـونەتا پێغەمبەری بکـەت، هەرچەندە بـەری ڤـێ ئـەو د گومڕایــیەکا ئاشـکەرادا بـوون. ﴿٣﴾ و یــێ [هاتیــیە هنارتـن] بۆ هندەکێـت دی ژی کو هێـژ نەگەهشـتینە وان [ئانکو ئەو یــێ هاتیــیە هنارتن بۆ موسـلمانێت سـەردەمێ پێغەمبـەری و یــێت پشـتی وان دئێن هەتـا ڕۆژا قیامەتـێ، ژ عـەرەب و نەعەرەبـان]، و ئـەوە یــێ سەردەسـت و کاربنەجهـ. ﴿٤﴾ و ئەڤـە [ڕێـزداری و پێغەمبەراتـی] کەرەما خودێیە، خـودێ ددەتە وی یــێ بڤێـت، و خـودێ خودانێ کەرەما مەزنە. ﴿٥﴾ مەتەلا وان ئەوێت ل سـەر وان هاتیــیە دانـان کار ب تەوراتێ بکـەن، پاشـی کار پـێ نەکریـن و ژ فەرمانێـت وێ دەرکەڤتـین، وەکـی مەتەلا وی کەریــیە ئـەوێ بارەکـی کتێبان ل سـەر پشـتێ [و نوزانیت چیــیە ل سـەر پشـتێ، ئـەوان ژی تـەورات یا د نـاڤ دەسـتاندا بەلێ چـو ژێ نوزانن] مەتـەلا وی ملەتـێ نیشـان و ئایەتێـت خـودێ درەو دانایــین چەندا پیسـە، و خـودێ ملەتێ سـتەمکار ڕاسـتەڕێ ناکـەت. ﴿٦﴾ بێـژە: گـەلی جوهیــیان ئەگـەر ل دەڤ هـەوە وەسـایە کو هویـن ب تنـێ ژ هەمی مرۆڤان، دۆسـت و خۆشتڤیــێت خودێنـە، پـا کا داخوازا مرنـێ بکەن [دا بچنـە دەڤ وی و ژ ئێـش و ئازارێت دنیایــێ دەرکەڤن]، ئەگـەر هویـن ڕاسـت دبێـژن. ﴿٧﴾ و ژ بـەر وان کار و کریارێـت وان کریـن، چوجا ئـەو داخوازا مرنـێ ناکەن، و خـودێ ژ زۆرداران ب ئاگەهـە. ﴿٨﴾ [هـەی موحەمـەد] بێـژە: ب ڕاسـتی ئـەو مرنا هویـن ژێ درەڤـن، هەر دێ گەهیتـە هـەوە، پاشـی هویـن دێ ب بال زانایــێ نهینی و ئاشـکەرایانڤە زڤڕن، و هنـدی هەوە کـری دێ هەوە پێ ئاگەهدارکـەت [ئانکـو دێ هـەوە ل دویـڤ کار و کریارێـت هـەوە ئیزادەت].



سُورَةُ الجُمُعَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحِزْبُ ٥٦

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡمَلِكِ ٱلۡقُدُّوسِ ٱلۡعَزِيزِ
ٱلۡحَكِيمِ ١ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ
ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ
مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٢ وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ لَمَّا يَلۡحَقُواْ بِهِمۡۚ
وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٣ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ
ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٤ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ
يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢاۚ بِئۡسَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ
ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥
قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ إِن زَعَمۡتُمۡ أَنَّكُمۡ أَوۡلِيَآءُ لِلَّهِ مِن
دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٦ وَلَا يَتَمَنَّوۡنَهُۥٓ
أَبَدَۢا بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ٧ قُلۡ
إِنَّ ٱلۡمَوۡتَ ٱلَّذِي تَفِرُّونَ مِنۡهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمۡۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ
إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٨

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ
إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٩
فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ
مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٠
وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗاۚ قُلۡ مَا عِندَ
ٱللَّهِ خَيۡرٞ مِّنَ ٱللَّهۡوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِۚ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ١١

## سُورَةُ المُنَافِقُونَ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ
لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ١ ٱتَّخَذُوٓاْ
أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ
يَعۡمَلُونَ ٢ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ
الحزب ٥٦ لَا يَفۡقَهُونَ ٣ ۞وَإِذَا رَأَيۡتَهُمۡ تُعۡجِبُكَ أَجۡسَامُهُمۡۖ وَإِن يَقُولُواْ
تَسۡمَعۡ لِقَوۡلِهِمۡۖ كَأَنَّهُمۡ خُشُبٞ مُّسَنَّدَةٞۖ يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ
عَلَيۡهِمۡۚ هُمُ ٱلۡعَدُوُّ فَٱحۡذَرۡهُمۡۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ٤





﴿٩﴾ گەلی خودان باوەران گاڤا ڕۆژا ئەینییێ بانگێ نڤێژێ هاتەدان هوین بۆ بیرئینانا خودێ [و گوهدانا وەعزی و نڤێژا ئەینییێ] هەڕن، و کڕین و فرۆتنێ بهێلن، ئەڤە [هێلانا کڕین و فرۆتنێ و گرتنا ڕێکا ڕازیبوونا خودێ] بۆ هەوە چێترە ئەگەر هوین بزانن. ﴿١٠﴾ و ئەگەر نڤێژ هاتەکرن، [ڕابن] و د ئەردیدا بەلاڤ ببن و ژ ڕزقێ خودێ [ب کارێ خۆ] بخوازن، و گەلەك خودێ بیننە بیرا خۆ و زکرێ وی بکەن [هەمی وەختان نە بەس وەختێ نڤێژان ب تنێ]، دا هوین سەرفەراز ببن. ﴿١١﴾ و گاڤا وان بازرگانییەك یان کەیف و شاهییەك دیت، ب بەرڤە دچن و تە دهێلنە ژپێڤە [ل سەر مینبەرێ]، بێژە: تشتێ ل دەڤ خودێ بۆ هەوە چێترە ژ کەیف و شاهی و کڕین و فرۆتنێ، و خودێ باشترین ڕزقدەهە.

## سۆرەتا مونافیقوون

### ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (١١) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ گاڤا دوڕوی دئێنە دەڤ تە دبێژن ئەم شادەیییێ ددەین کو ب ڕاستی تو پێغەمبەرێ خودێیی، و خودێ دزانیت تو پێغەمبەرێ وی [چونکی وی تو یێ فڕێکری و تو نەهەوجەی شادەیییا دوڕوییانی]، و خودێ شادەیییێ ددەت کو دوڕوی درەوان دکەن [دەمێ دبێژن ئەم شادەیییێ ددەین تو پێغەمبەری، چونکی یا د دلێ واندا نەئەڤەیە، و یێ دل و دەڤێ وی نە ئێك بن، درەوینە]. ﴿٢﴾ سویندێت خۆ [یێت درەو] بۆ خۆ یێت کرینە مەتال، و ڕێکا خودێ ل خەلکی دگرن، ب ڕاستی پیسەکارە ئەو دکەن. ﴿٣﴾ ئەڤە چونکی وان [ب سەرڤە سەرڤە] باوەری ئینا، و پاشی [د دلدا] گاوربوون، و ژ بەر هندێ خودێ دلێ وان مۆرکر، و ئەو [ڕاستیا ئیمانێ و خێر و باشیا خۆ] نوزانن. ﴿٤﴾ و ئەگەر تە ئەو [دوڕوی] دیتن، دێ مینییە عەجێبگرتی ژ بەژن و بالا وان، و ئەگەر باخڤن دێ گوهێ تە مینیتە ل ئاخڤتنا وان، دێ بێژی دارن پالداینە دیواری [چو خێر د واندا نینە]، هزر دکەن هەر گازییەکا هەبیت ژ وان دگریت [هندی هند د ترسنۆکن]، ئەون دژمن هشیاری وان بن [خۆ ژ وان بپارێزن]، خودێ وان بکوژیت [لەعنەتان ل وان بکەت، و ژ دلۆڤانییا خۆ، وان دویر بێخیت]، چاوا ئەو بەرێ خۆ ژ هەقییێ وەردگێڕن؟!

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْا۟
رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ٥
سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن
يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ٦
هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا۟ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ
حَتَّىٰ يَنفَضُّوا۟ ۗ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِنَّ
ٱلْمُنَـٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ٧ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى
ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ
وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَـٰكِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ٨
يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُمْ
عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ
ٱلْخَـٰسِرُونَ ٩ وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَـٰكُم مِّن قَبْلِ أَن
يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ
قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ١٠ وَلَن يُؤَخِّرَ
ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ١١



﴿٥﴾ و هەر وەختێ بۆ وان هاتە گۆتن: وەرن دا پێغەمبەرێ خودێ داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ هەوە بکەت، دێ سەرێت خۆ بادەن و دێ بینی ژ مەزناتی رویێ خۆ وەردگێڕن. ﴿٦﴾ بۆ وان هەر ئێکە، چ تو داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ وان بکەی یان نەکەی، خودێ هەر گونەهێت وان ژێ نابەت، و ب ڕاستی خودێ، ئەوێت ژ ڕێکا ڕاست دەرکەڤتین، ڕاستەڕێ ناکەت. ﴿٧﴾ ئەو ئەون ئەوێت دبێژن: چو نەدەنە وان ئەوێت ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ، دا ڤەرەڤن و ل دۆر خڕنەبن، و خزینەیێت ئەرد و ئەسمانان یێت خودێنە، بەلێ دوڕوی تێناگەهن [و ڤێ نوزانن]. ﴿٨﴾ [دوڕوی] دبێژن: ئەگەر ئەم زڤڕینەڤە مەدینەیێ و ئەوێت خودان قەدر و ماقویل و دەستهەلاتدار [مەخسەدا وان ئەو ب خۆنە]، دێ بێ قەدر و بێ دەستهەلاتان [مەخسەدا وان پێغەمبەر و مشەختن] دەرئێخن، و قەدر و هێز و دەستهەلات و سەرکەڤتن بۆ خودێ و بۆ پێغەمبەرێ وی و بۆ موسلمانانە، بەلێ دوڕوی نوزانن [و ژ ڤێ بێ ئاگەهن]. ﴿٩﴾ گەلی خودان باوەران بلا مال و زاڕۆکێت هەوە، هەوە مژویل نەکەن و بیرئینان و پەرستنا خودێ ژ بیرا هەوە نەبەن، و هەر کەسێ ڤێ بکەت ئەو یێ خوسارەتە. ﴿١٠﴾ و ژ ڕزقێ مە دایییە هەوە بمەزیێخن و بدەن، بەری مرنا ئێك ژ هەوە بێت و بێژیت: خودێوۆ بلا تە مرنا من پیچەکێ ب پاش ئێخستبایە، دا من خێر کربانە و ئەز ژ قەنجیکاران بامە. ﴿١١﴾ و چوجا خودێ مرنا کەسێ گیرۆ ناکەت و ب پاش نائێخیت، ئەگەر وەختێ مرنا وی هات، و چ یا هوین بکەن خودێ پێ ئاگەهە.

## سُورَةُ التَّغَابُنِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۖ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ ۖ وَهُوَ
عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ۚ
وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ
فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ۖ وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ ﴿٣﴾ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ
وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ۚ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٤﴾
أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَبْلُ فَذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ
أَلِيمٌ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالُوا أَبَشَرٌ
يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا وَتَوَلَّوا ۚ وَّاسْتَغْنَى اللَّهُ ۚ وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٦﴾ زَعَمَ الَّذِينَ
كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ۚ
وَذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧﴾ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالنُّورِ الَّذِي أَنزَلْنَا ۚ
وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ ۗ
وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ وَيَعْمَلْ صَالِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ
تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٩﴾





## سۆرەتا تەغابون

**ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (١٨) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ هندی د ئەرد و ئەسماناندا هەی خودێ ژ
کێماسییان پاقژ دکەن و تەسبیحا وی دکەن، مالداری
و فەرمانداری و پەسن هەمی یێت وینە، و ئەو ل سەر
هەمی تشتان یێ دەستهەلاتدارە. ﴿٢﴾ وی هوین یێت
دایین، ڤێجا هندەکان ژ هەوە باوەری پێ نەئینا و
هندەکان باوەری پێ ئینا، و چ یا هوین دکەن خودێ
پێ ئاگەهە و دبینیت. ﴿٣﴾ ئەرد و ئەسمان بۆ هەقییێ
یێت دایین، و وێنە و شکل دا هەوە، و سەر و شکلێ
هەوە جوان کر و باش چێکر، و زڤرین و دوماهیکا
هەوە هەر ب بال ویڤەیە. ﴿٤﴾ هەچییا د ئەرد و
ئەسماناندا هەی دزانیت، و هەر تشتەکی هوین دکەن
چ ب نهێنی و چ ب ئاشکەرایی دزانیت، و دزانیت کا چ
د دلاندا هەیە. ﴿٥﴾ ئەرێ ما بەحسێ ئەوێت بەری ڤان
گاوربوویین نەگەهشتییە هەوە، وان تامکرە جزایێ کارێ خۆ، و وان ئیزایەکا ب ژان و دژوار یا هەی [رۆژا
قیامەتێ]. ﴿٦﴾ ئەڤە [ئیزایا وان دیتی] یا هندێ بوو، پێغەمبەرێت وان ب بەلگە و موعجزەیێت ئاشکەراڤە
بۆ وان دهاتن [و ئەوان باوەری ب وان نەدئینا]، و دگۆتن: ئەرێ چاوا مرۆڤەک دێ بیتە پێغەمبەر و دێ مە
راستەرێ کەت؟ گاوربوون و روییێ خۆ [ژ باوەری ئینانێ] وەرگێڕان، و خودێ پاکی ب [باوەری ئینانا]
وان نەبوو، و خودێ یێ زەنگین و هێژایی پەسن و سوپاسییێیە. ﴿٧﴾ گاوران [مەخسەد خەلکێ مەکەهێ]
هزرکرن ئەو [پشتی مرنێ] ناڕابنەڤە، بێژە: نەخێر، وەسا نینە وەکی هوین هزر دکەن، ئەز ب خودایێ خۆ
کەم هوین [پشتی مرنێ] دێ ڕابنەڤە، پاشی هوین دێ ب کار و کریارێت خۆ ئێنە ئاگەهدارکرن، و ئەڤە ل بەر
خودێ یا ب ساناهییە. ﴿٨﴾ ڤێجا باوەرییێ ب خودێ و پێغەمبەرێ وی و وێ رۆناهییا مە ئینایییە خوارێ
[کو قورئانە] بینن، و هەر کارێ هوین دکەن خودێ پێ ئاگەهە. ﴿٩﴾ رۆژا خودێ هەوە بۆ رۆژا کۆمبوونێ
کۆم دکەت، ئەو رۆژ ئەوە یا خوسارەتیا هەر کەسەکی دیار دبیت، و هەر کەسێ باوەرییێ ب خودێ بینیت
و کار و کریارێت راست و دورست بکەت، خودێ دێ گونەهێت وی ژێ بەت و دێ بەتە بەحەشتێت رویبار
دبنرا دچن، و هەروهەر دێ تێدا بن و ئەڤەیە سەرفەرازیا مەزن.

وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ
أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ١٠
مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ
يَهۡدِ قَلۡبَهُۥۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ١١ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ
وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ
ٱلۡمُبِينُ ١٢ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ
ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١٣ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ
وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ وَإِن تَعۡفُواْ
وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٤ إِنَّمَآ
أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ
عَظِيمٞ ١٥ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ
وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ
فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٦ إِن تُقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا
حَسَنٗا يُضَٰعِفۡهُ لَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ شَكُورٌ
حَلِيمٌ ١٧ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١٨





﴿١٠﴾ و ئەوێت گاوربوویین و نیشان و بەلگەیێت مە
درەو دانایین، ب ڕاستی ئەڤە دۆژەهینە و هەروهەر دێ
د دۆژەهێدا بن، و چ پیسە دویماهیکە ئەو. ﴿١١﴾ چو
نەخۆشی ب سەرێ کەسێ نائێت ئەگەر ب قەدەر و
دەستویریا خودێ نەبیت، و هەر کەسێ باوەرییێ ب
خودێ بینیت [و بزانیت هەر تشتەکێ ب سەری دئێت
قەدەرا خودێیە]، خودێ دێ دلێ وی ڕاستەڕێ کەت
[ئەو دێ ڕەفتارا دورست د گەل نەخۆشییێ کەت و
خەلەت نابیت]، و هەر تشتێ هەبیت خودێ ژێ ب
ئاگەهە. ﴿١٢﴾ [گەلی مرۆڤان] گوهدارییا خودێ بکەن
و گوهدارییا پێغەمبەری بکەن، ئەگەر هوین ڕوییێ
خۆ [ژ گوهدارییا خودێ و پێغەمبەری] وەرگێڕن،
[بزانن] ژ گەهاندنا ئاشکەرا پێڤەتر ل سەر پێغەمبەرێ
مە نینە. ﴿١٣﴾ خودێ ئەوە یێ چو پەرستی یێت
ڕاست و دورست ژ وی پێڤەتر نەی، و بلا خودان
باوەر پشتا خۆ ب خودێ گەرم بکەن. ﴿١٤﴾ گەلی
خودان باوەران، ب ڕاستی هندەك ژ ژن و زارۆکێت
هەوە دژمنێت هەوەنە، ڤێجا هشیاری وان بن [ئەو
کارلێکرنێ ل هەوە نەکەن هوین گونەهێ بکەن یان د ڕێکا خودێدا سست ببن]، و ئەگەر هوین ل وان
نەگرن و ل وان ببۆرن و لۆمەی وان نەکەن [و کێماسییێت وان ئاشکەرا نەکەن و نەدەنە ڕوییێ وان]، ب ڕاستی
خودێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿١٥﴾ هندی مال و زارۆکێت هەوەنە بۆ هەوە جەڕباندنن [دبیت بەرێ هەوە
بدەنە حەرامییێ، ڤێجا هشیار بن]، و خەلاتەکێ مەزن یێ ل دەڤ خودێ هەی [ڤێجا بلا مال و زارۆکێت
هەوە، هەوە ژ ڤی خەلاتی نەکەن]. ﴿١٦﴾ و هندی هوین بشێن ژ خودێ بترسن، و گوهدارییێ [یا وان
شیرەتان ئەوێت ل هەوە دئێنەکرن] بکەن، و گوهدارییا فەرمانێت ل هەوە دئێنەکرن بکەن، و مالی [د ڕێکا
خودێدا] بدەن و بمەزێخن، بۆ هەوە باشییە، و هەر کەسێ [خودێ] وی ژ قەلساتیا نەفسا وی بپارێزیت،
ب ڕاستی ئەو یێ سەرفەرازە. ﴿١٧﴾ و ئەگەر هوین ژ دل [و بێ بەرانبەر] مالێ خۆ د ڕێکا خودێدا بدەن
و بمەزێخن، خودێ دێ خێرا هەوە چەند قاتەکان زێدەکەت و گونەهێت هەوە دێ ژێ بەت، و ب ڕاستی
خودێ شوکورداره [ئانکو بەرانبەری تشتێ کێم، گەلەکێ ددەت و خەلاتدەهە]، و حەلیمە [لەزێ ل جزادانێ
ناکەت]. ﴿١٨﴾ زانایێ نهێنی و ئاشکەرایانە، و یێ سەردەست و کاربنەجهە.

سُورَةُ الطَّلَاقِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نصف الحزب ٥٦

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ
وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن
يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ
فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا ١
فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖ
وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ يُوعَظُ بِهِۦ
مَن كَانَ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ٢
وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ
إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦۚ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا ٣ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ
مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ
وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ
وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ٤ ذَٰلِكَ أَمۡرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ
إِلَيۡكُمۡۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعۡظِمۡ لَهُۥٓ أَجۡرًا ٥





## سۆرەتا طه لاق

### ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (١٢) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هەی پێغەمبەر گاڤا هەوە ڤیا ژنان بەردەن، وان د پاقژییا واندا بەردەن [پاقژیا ژ ژڤانا خۆ دەرکەڤتی، و چۆنا نڤینێ د گەل چێنەبوویی] و [پاشی پشتی بەردانێ] ژڤانێت وێ زەبت کەن و بهەژمێرن، و ژ خودێ بترسن [ژڤانێت وان نە کێم کەن و نە زێدەکەن] و وان [ژنێت بەردایی] ژ مالێت وان دەرنەئێخن [هندی ئەو د ژڤانێت خۆدا بن]، و بلا ئەو ژی [ژ خانییێت خۆ] دەرنەکەڤن، ئەڤە ژ بلی هندێ ئەو خرابییەکا ئاشکەرا بکەن (گەلەك دبێژن دەهمەن پیسییە)، و ئەڤە بریار و ئەحکامێت خودێنە [بۆ هەوە دانایین بۆ بەردانا ژنان]، و هەر کەسێ بدەتە سەر بریار و ئەحکامێت خودێ، ب سویند وی ستەم ل خۆ کر، تو نوزانی تێ هەیە خودێ پشتی بەردانا وان ژنان [دەمێ دمینن د مالێت خۆدا و دەرنەکەڤن]، خودێ ناڤبەرا وان خۆش بکەت و پێك بهێن [و جارەکا دی بزڤرنەڤە ئێك]. ﴿٢﴾ و ئەگەر نێزیکی دوماهییا ژڤانی [ئانکو عیددەیێ] بوون، ڤێجا ب خۆشی [نە ب ئێیەتا زیان پێ گەهاندنێ] بگرن و بزڤرینن، یان ژی ب خۆشی [بێ ژ مافێت مارە و کەل و پەلێت بەردانێ بێتە بێ بارکرن] بهێلن، [هەتا ژڤانێت وێ ب دورستی دبۆرن، و ئەمرێ وێ دکەڤیتە د دەستێ ویدا و ئازاد دبیت]، و دو کەسێت عادل ژ خۆ [بۆ زڤراندنا وان یان بەردانا وان یا دوماهییێ] بکەنە شاهد، [دا رێك ل نەخۆشییێ بێتە گرتن] و بۆ خودێ [ئانکو ب دورستی] شادەیییێ بدەن، ئەوێ باوەری ب خودێ و رۆژا قیامەتێ هەی، ئەڤ بریارە شیرەتن بۆ وی، و هەر کەسێ ژ خودێ بترسیت [و بریار و ئەحکامێت وی بپارێزیت]، خودێ دێ رێکەکێ بۆ ڤەکەت. ﴿٣﴾ و رزقێ وی دێ ب رەنگەکێ وەسا دەت نە د هزرا ویدا، و هەر کەسێ پشتا خۆ ب خودێ گرێ بدەت خودێ بەسی وییە، ب راستی خودێ فەرمانا خۆ هەر دێ ب جهـ ئینیت، و ب سویند خودێ بۆ هەر کارەکی و هەر تشتەکی وەختەکێ دەستنیشانکری یێ دانایی. ﴿٤﴾ و ژنێت هەوە ئەوێت ژ عوزران خلاس بوویین [ئەوێت دانعەمر]، ئەگەر هوین ل ژڤانێ وان ب شك کەڤتن [یان هەوە نەزانی]، و [بزانن] ژڤانێ وان سێ هەیڤن، و ئەوێت نەکەڤتینە د بێ نڤێژیاندا [ئانکو ئەوێت بچویك و هێژ خوین نەدیتین] ژڤانێ وان ژی سێ هەیڤن، و ژنێت ب حال ژڤانێ (عیددەیا) وان ئەوە بچویك ببن، و هەر کەسێ تەقوا خودێ بکەت و ژێ بترسیت، خودێ کارێ وی دێ بۆ ب ساناهی ئێخیت. ﴿٥﴾ ئەڤە بریار و فەرمانێت خودێنە بۆ هەوە هنارتین، و هەر کەسێ ژ خودێ بترسیت [و ژ ئەمرێ وی دەرنەکەڤیت]، خودێ گونەهێت وی دێ ژێ بەت و دێ خەلاتێ وی مەزن کەت.

أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا۟
عَلَيْهِنَّ ۚ وَإِن كُنَّ أُو۟لَـٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا۟ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ فَإِنْ
أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۖ وَأْتَمِرُوا۟ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ۖ وَإِن
تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴿٦﴾ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ۖ وَمَن
قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا
مَآ ءَاتَىٰهَا ۚ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴿٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ
عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَـٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَـٰهَا عَذَابًا
نُّكْرًا ﴿٨﴾ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَـٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴿٩﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ
لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ قَدْ أَنزَلَ
ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾ رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَـٰتٍ لِّيُخْرِجَ
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَمَن يُؤْمِنۢ
بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَـٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ
فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ﴿١١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَـٰوَٰتٍ
وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ
كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾



﴿٦﴾ [گەلی مرۆڤان] هوین، ئەوان [ژنێت هەوە
بەردایین ل دەمێ ژڤانان] د وان خانیانڤە بهێلن
ئەوێت هوین تێدا دژین [ئەڤە د ڕاستا وێ بەردانێدا یا
زڤڕاندن تێدا]، و زیانێ نەگەهیننە وان دا وان تەنگاڤ
بکەن [کو ئەو ب خۆ جهێ خۆ بهێلن]، و ئەگەر
ئەو یێت گرانە و ب حال بن وان خوەدان بکەن هەتا
بارێ خۆ ددانن، و ئەگەر [پشتی هنگی] وان شیر دا
[بچویکێت هەوە] هەقێ وان بدەنێ، و د ناڤ خۆدا ب
خۆشی تفاقەکێ بکەن [د ڕاستا دەستویردانا بچویکی
بۆ سەرەدانا دەیکێ و دیارکرنا هەقێ شیری]، و ئەگەر
هوین پێك نەهاتن [دەیکێ شیر نەدا بچویکێ خۆ،
یان بابێ هەقێ دەیکێ نەدایێ]، هنگی بلا ئێکا دی
شیری بدەتە بچویکی. ﴿٧﴾ یێ زەنگین بلا ل دویڤ
زەنگینیا خۆ بمەزێخیت، و یێ دەست تەنگ بلا ئەو
ژێ ژ وێ ڕزقێ خودێ داییێ بمەزێخیت، و خودێ
ژ وی پێڤەتر ژ مرۆڤی ناخوازیت یێ داییە مرۆڤی،
و پشتی تەنگاڤییێ خودێ دێ بەرفرەهییێ دەت.
﴿٨﴾ و گەلەك ژ خەلکێت گوندان ژ ئەمرێ خودایێ
خۆ و پێغەمبەرێت وی دەرکەڤتبوون، ڤێجا مە ژێ حسابەکا دژوار د گەل وان کر و مە، ب ئیزادانەکا کەسێ
نەدیتی، ئیزادان. ﴿٩﴾ و وان تامکرە جزایێ کارێ خۆ، و دویماهیکا وان بوو زیان و خوسارەتی. ﴿١٠﴾ خودێ
ئیزایەکا دژوار بۆ وان یا بەرهەڤکری، ڤێجا گەلی ئاقلدارێت هەوە باوەری ئینایین ژ خودێ بترسن [و هشیاری
ئیزایا وی بن]، نێ خودێ قورئان یا بۆ هەوە هنارتی [هەوە چو عوزر نینن]. ﴿١١﴾ و خودێ پێغەمبەرەك ژی
بۆ هەوە [د گەل ڤێ قورئانێ] یێ هنارتی، ئایەتێت قورئانێ یێت [حەلال و حەرام] ئاشکەراکەر بۆ هەوە
دخوینیت، دا ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت ڕاست و دورست کرین، ژ تاریستانێ [یا نەزانین و
گاورییێ] دەربێخیت و ببەتە ڕۆناهییێ [یا باوەری و زانینێ]، و هەر کەسێ باوەرییێ ب خودێ بینیت و
کارەکێ باش بکەت، خودێ دێ وی بەتە بەحەشتێت ڕوبار د بنڕا دچن، و ئەو هەروهەر دێ تێدا بیت، و
ب سویند خودێ ڕزقەکێ باش یێ داییێ. ﴿١٢﴾ خودێیە حەفت ئەسمان داین و ژ ئەردی ژی تەمەتی وان
داین، و ئەمرێ وی د ناڤبەرا واندا دئێت و دچیت، دا هوین بزانن خودێ ل سەر هەمی تشتان یێ خودان
شیانە، [و دا هوین بزانن] زانینا خودێ هەمی تشتان دگریت.

سُورَةُ التَّحْرِيمِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ثلاثة أرباع الحزب ٥٦ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ
غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ
ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٢ وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا فَلَمَّا
نَبَّأَتۡ بِهِۦ وَأَظۡهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖۖ فَلَمَّا
نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتۡ مَنۡ أَنۢبَأَكَ هَٰذَاۖ قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ٣ إِن
تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ
هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ
ظَهِيرٌ ٤ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرٗا مِّنكُنَّ
مُسۡلِمَٰتٖ مُّؤۡمِنَٰتٖ قَٰنِتَٰتٖ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٖ سَٰٓئِحَٰتٖ ثَيِّبَٰتٖ
وَأَبۡكَارٗا ٥ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا
وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ
لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ لَا تَعۡتَذِرُواْ ٱلۡيَوۡمَۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٧



## سۆرەتا تەحریم

### ل مەدینەیێ هاتیيە خوارێ (١٢) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ هەی پێغەمبەر، بۆچی تشتێ خودێ بۆ تە دورستکری، ژ بەر رازیکرنا ژنێت خۆ ل سەر خۆ حەرام و نەدورست دکەی؟ [دگەل ڤێ ژی] خودێ یێ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. ﴿٢﴾ ب سویند خودێ بۆ هەوە دورست کر [ب کەفارەتێ] ژ سویندا خۆ دەرکەڤن، و خودێ سەمیان و هاریکارێ هەوەیە، و ئەوە یێ زانا و کاربنەجهـ. ﴿٣﴾ وەختێ پێغەمبەری ئاخڤتنەکا نەپەنی د گەل ئێك ژ ژنێت خۆ کری [کو حەفصە بوو]، ڤێجا وەختێ وێ ئەو ئاخڤتن [بۆ عائیشایێ] ئاشکەراکری، و خودێ [پێغەمبەرێ خۆ] پێ حەساندی و پێغەمبەری هندەك [ژ وێ ئاخڤتنا نەپەنی ئەوا حەفصایێ بۆ عائیشایێ ئاشکەراکری] دیارکر و هندەك هێلا، و وەختێ پێغەمبەری ئەو ئاخڤتنا وێ (حەفصایێ) ئاشکەراکری پێ حەساندی، وێ گۆت: ئەڤە کێ تو پێ حەساندی؟ پێغەمبەری گۆت: خودایێ زانا و ئاگەهدار و شارەزا بۆ من گۆت. ﴿٤﴾ [ڤێجا] ئەگەر هوین هەردو [مەخسەد عائیشا و حەفصایە] تۆبە بکەن [بۆ هەوە چێترە]، ئەڤە دلێ هەوە د گەل پێغەمبەری ڕاست بوو، و ئەگەر هوین هەردو ببنە پشتەڤان و هاریکارێت ئێك ل سەر پێغەمبەری، [بزانن] خودێ و جبریل و باشێت خودان باوەر پشتەڤان و هاریکارێت پێغەمبەرینە، و پشتی ڤێ، ملیاکەت هەمی ژی پشتەڤانێت وینە. ﴿٥﴾ ئەگەر پێغەمبەر هەوە بەردەت، خودایێ وی هندەك ژنێت ژ هەوە چێتر و باشتر دێ دەتێ، شوینا هەوە، ئەو ژن یێت موسلمان بن و خودان باوەر بن و بەرئەمری خودێ بن و تۆبەدار بن و ژ دل عیبادەتکەر بن و ڕۆژیگر بن و گەریدە بن [د ڕێکا خودێدا] ژ بیژن و کچان. ﴿٦﴾ گەلی خودان باوەران خۆ و مالێت خۆ ژ ئاگرەکی بپارێزن، داردوویێ وی مرۆڤ و بەرن، هندەك ملیاکەتێت دلڕەق و دژوار و ب هێز یێت ل سەر، و ئەو [ملیاکەت] بێ ئەمری و نەگوهداریێا خودێ ناکەن ل سەر وی تشتێ ئەمرێ وان پێ هاتییە کرن، و وێ دکەن یا فەرمانا وان پێ دئێتەکرن. ﴿٧﴾ گەلی بێ باوەران و گاوران، ئەڤرۆ [کو ڕۆژا قیامەتییە] لێبۆرینێ نەخوازن [چونکی هەوە چو عوزر نینن، و چو عوزر ئەڤرۆ ژ هەوە نائێنە وەرگرتن]، ب ڕاستی هوین بەس ب وان کار و کریاران دێ ئێنە جزاکرن ئەوێت هەوە دکرن.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ يَوۡمَ لَا يُخۡزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥۖ نُورُهُمۡ يَسۡعَىٰ بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا وَٱغۡفِرۡ لَنَآۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٩﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمۡرَأَتَ نُوحٖ وَٱمۡرَأَتَ لُوطٖۖ كَانَتَا تَحۡتَ عَبۡدَيۡنِ مِنۡ عِبَادِنَا صَٰلِحَيۡنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمۡ يُغۡنِيَا عَنۡهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَقِيلَ ٱدۡخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمۡرَأَتَ فِرۡعَوۡنَ إِذۡ قَالَتۡ رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرۡعَوۡنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾ وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ عِمۡرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتۡ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتۡ مِنَ ٱلۡقَٰنِتِينَ ﴿١٢﴾



﴿٨﴾ گەلی خودان باوەران ب بال خودێڤە بزڤرن، و تۆبەیەکا ژ دل و ڕاست و دورست تۆبە بکەن [ئەگەر هوین د تۆبەیا خۆدا ڕاست و دورست بن]، خودایێ هەوە دێ گونەهێت هەوە ژێ بەت و دێ هەوە بەتە بەحەشتێت ڕویبار د بنڕا دچن، ڕۆژا خودێ پێغەمبەرێ خۆ و ئەوێت باوەری د گەل ئینایین نەشکێنیت و نەدەتە شەرمێ، ڕۆناهیا وان ل پێشیا وان و ل ملێ وان یێ ڕاستێ دچیت، و دبێژن [وەختێ دیتین ڕۆناهیا دوڕویان ڤەمری و ل وان بوو تاری]: خودێوۆ ڕۆناهیا مە بۆ مە تمام بکە و گونەهێت مە ژێ ببە، ب ڕاستی تو ل سەر هەمی تشتان خودان شیانی. ﴿٩﴾ هەی پێغەمبەر جیهادێ [ب چەکی و ب ئەزمانی] د گەل گاور و دوڕویان بکە، و ل سەر وان یێ دژواربە، جهێ وان دۆژەهە و چ پیسە جهە. ﴿١٠﴾ خودێ بۆ گاوران ژنا نووحی و ژنا (لووط)ی یێت کرینە نموونە، هەردو ژنێت دو بەندەیێت مە یێت باش بوون، [وان هەردو ژنان] خیانەت ل وان کرن [نە خیانەتا نامویسێ، ژنا نووحی دگۆت نووح یێ دینە، و ژنا (لووط)ی مێڤانێت وی ئاشکەرا دکرن]، ڤێجا [هەر چەندە هەردو پێغەمبەر ژی بوون] نەشیان چو ئیزایا خودێ ژ وان بدەنە پاش، و ژ هەردووکانڕا (ژنا نووحی و ژنا (لووط)ی) هاتە گۆتن: هوین ژی هەرنە د ئاگریدا د گەل وان ئەوێت دچنە تێدا. ﴿١١﴾ و خودێ بۆ خودان باوەران، ژنا فیرعەونی نموونە دئینیت، وەختێ گۆتی: خودێوۆ ل دەڤ خۆ بۆ من خانیەکی د بەحەشتێدا ئاڤا بکە، و تو من ژ فیرعەونی و کار و کریارێت وی قورتال بکە، و من ژ ملەتێ ستەمکار قورتال بکە. ﴿١٢﴾ [و خودێ بۆ خودان باوەران] مەریەما کچا عیمرانی دکەتە نموونە، ئەوا دەمەنا خۆ پاراستی، ڤێجا جبریلی، قاسدێ مە، ب ئەمرێ مە پفکرە بەر حەفکا وێ و وێ باوەری ب شەریعەتێت خودایێ خۆ [ئەوێت بۆ بەندەیێت خۆ هنارتین] و کتێبێت وی ئینا، و ئەو ژ وان بوو ئەوێت بەر ئەمری خودێ.

## سُورَةُ المُلْكِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الجزء ٢٩ الحزب ٥٧

تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ١ ٱلَّذِي خَلَقَ
ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ٢
ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن
تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ ٣ ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ
يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ ٤ وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ
ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابَ
ٱلسَّعِيرِ ٥ وَلِلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ٦
إِذَآ أُلۡقُواْ فِيهَا سَمِعُواْ لَهَا شَهِيقٗا وَهِيَ تَفُورُ ٧ تَكَادُ تَمَيَّزُ
مِنَ ٱلۡغَيۡظِۖ كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ ٨
قَالُواْ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَنَا نَذِيرٞ فَكَذَّبۡنَا وَقُلۡنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ
إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ كَبِيرٖ ٩ وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ
ٱلسَّعِيرِ ١٠ فَٱعۡتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمۡ فَسُحۡقٗا لِّأَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ١١ إِنَّ
ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ١٢



## سۆرەتا مولك

**ل مەكەهێ هاتیيە خوارێ (٣٠) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ پاكی و بلندی بۆ خودایێ خودان دەستهەلات و فەرمانداری، ئەو ل سەر هەر تشتەكی دەستهەلاتدارە. ﴿٢﴾ ئەوێ مرن و ژین دایی، دا هەوە تێدا بجەربینیت كا كی ژ هەوە دێ كار و كریارێت باش كەت، و ئەوە سەردەست و گونەهـ ژێبەر. ﴿٣﴾ ئەوە یێ حەفت ئەسمان ل سەرێك دانایین و رانایین، و دانان و رانان و چێكرنا خودێ یا وەسایە تو چو ڤێكنەكەفتنێ تێدا نابینی، چاڤێت خۆ بگێرە تو چو تیك و دەرزان ل ئەسمانان نابینی. ﴿٤﴾ پاشی جارەكا دی چاڤێت خۆ ل ئەسمانان بگێرە، دێ چاڤێت تە شەپرزە و وەستیایی ڤەگەرن. ﴿٥﴾ و ب سویند مە ئەسمانێ دنیایێ ب ستێران یێ خەملاندی، و مە ئەو ستێر یێت كرینە تیۆر بۆ رەجماندنا شەیتانان، و مە بۆ وان ئیزا و نەخۆشیا دۆژەها شارییایی یا بەرهەڤكری. ﴿٦﴾ ئیزا و نەخۆشیا دۆژەهێ بۆ وان ئەوێت باوەری ب خودایێ خۆ نەئینایین، و دۆژەهـ چ پیسە دویماهیكە. ﴿٧﴾ دەمێ ڤان گاوران دئاڤێژنە د دۆژەهێدا، دەنگەكێ كرێت ژێ دئێت وەكی زرزرێ و دغەونیت. ﴿٨﴾ نێزیكە ئەو ئاگرە خۆ بخۆت و بپەقیت هندی ژ گاوران یا كەربگرتییە، هەر گاڤا ملیاكەتان پێلەك ژ گاوران ئاڤێتنە تێدا، زێرەڤانێت دۆژەهێ ژێ دپرسن: ما چو پێغەمبەر بۆ هەوە نەهاتبوون، هەوە ژ ڤێ رۆژێ بترسینن؟ ﴿٩﴾ گۆتن: بەلێ پێغەمبەر بۆ مە هات [مە بترسینیت]، مە ئەو درەوین دانا و باوەری پێ نەئینا و مە گۆت: خودێ چو نەهنارتییە، و هوین یێت د گومراییێیەكا گەلە مەزندا. ﴿١٠﴾ و گۆتن ئەگەر مە فام هەبایە و ئەم یێت كەر (بێ گوهـ) نەباینە، نوكە ئەم نەدبووینە دۆژەهی. ﴿١١﴾ و گونەهـ ل سەر خۆ ئاشكەراكرن، دۆژەهی نەمینن و دویر بن ژ دلۆڤانییا خودێ. ﴿١٢﴾ ئەو كەسێت، بێی خودایێ خۆ ببینن، [یان ژی دەمێ ئەو ب تنێ و بەرێ كەسێ ل وان نە] ژێ بترسن، گونەهـ ژێبرن و خەلاتەكی مەزن بارا وانە.

وَأَسِرُّوا۟ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُوا۟ بِهِۦٓ ۖ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا
يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ
ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾
ءَأَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا هِىَ تَمُورُ ﴿١٦﴾
أَمْ أَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ۖ فَسَتَعْلَمُونَ
كَيْفَ نَذِيرِ ﴿١٧﴾ وَلَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿١٨﴾
أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَٰٓفَّٰتٍ وَيَقْبِضْنَ ۚ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا
ٱلرَّحْمَٰنُ ۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍۭ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ جُندٌ لَّكُمْ
يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ۚ إِنِ ٱلْكَٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ ﴿٢٠﴾ أَمَّنْ هَٰذَا
ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ ۚ بَل لَّجُّوا۟ فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾ أَفَمَن
يَمْشِى مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِى سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ
مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٢﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ
وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۖ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى
ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٦﴾



﴿١٣﴾ هویـن چ ئاخفتنا خـۆ ڤەشـێرن چ ژی دەرەهـی (ئاشـكەرا) بكـەن، خـودێ هـەر ژێ ب ئاگەهـە، هـەر تشـتێ د دلـێ مرۆڤيـدا خـودێ ژێ ب ئاگەهـە. ﴿١٤﴾ مـا ئـەوێ مـرۆڤ چێكـری پـێ نوزانيـت؟ نـێ هويربـين و شـارەزا هـەر ئـەوە. ﴿١٥﴾ ئـەوە يـێ ئـەرد بـۆ هـەوە بەردەسـت و سـاناهی كـری، د ناڤـدا بگـەڕن و ژ ڕزقـێ وی دايـيـيە هـەوە بخـۆن، و زڤڕينا هـەوە يـا دویماهيـيێ هـەر ب بـال ويڤەيـە. ﴿١٦﴾ ئەرێ مـا هوين پشـت ڕاست بووينە ژ وی ئەوێ ل ئەسمـانی [مەخسەد خودێيـە] كو هـەوە د ئەرديـدا نەبەتە خـوارێ، هەروەكی ب سـەرێ قاروونـی ئينايـی و ئەرد بلەرزيـت. ﴿١٧﴾ ئان هويـن پشـت ڕاسـت بووينـە ژ وی ئـەوێ ل ئەسمـانی [كـو خودێيـە] كـو بەرەبارانەكـێ ب سـەر هـەوەدا نەڕێژيـت [هەروەكـی ب سـەرێ ئەبرەهـەی ئينايـی]، و هويـن دێ زانـن كا گەفـا مـن يـا چاوايە دەمـێ هوين ب چاڤێ خۆ دبينن. ﴿١٨﴾ و ب سويند يـێت بەری وان ژی بـاوەری ب ڤێ چەنـدێ نەئينان، و من ژی چـاوا خەلەتيا وان دا بـەر ڕويـيێ وان [ب داڕێتنـا ئيزا و نەخۆشيـێ].
﴿١٩﴾ ئـەرێ مـا وان تەيـر و تـەوال، چەنگ ڤەكـری و چەنگ گرتی و ل هەوا، و د سـەر خـۆڕا نەدديتن كەس وان ل هـەوا ڕاناگريـت ژ خـودێ پێڤە، ئـەوە ژ هەر تشـتەكی ب ئاگەهـ. ﴿٢٠﴾ ئەرێ غەيری خودێ كيـيە لەشـكەر و هاريكاربيـت بـۆ هـەوە و هەوە ب سـەربێخيت؟ ب ڕاستی گاور يـێ د سـەرداچۆنەكا ئاشـكەرادا. ﴿٢١﴾ ئەرێ ئەڤـە كيـيە ڕزقـی بدەتە هەوە ئەگـەر خودێ ژ هـەوە ڤەگريـت [ب ڤەگرتنا ئەگەرێـت دەرامەتـی، ژ بارانێ و بای و نەهێلانـا ئاڤـا كانـی و دەريايـان، ئانكـو هەوە كەس نينە پشـتا خۆ پـێ گەرم بكـەن و بۆ خۆ بكەنە پشـت]، بەلـێ د سـەر ڤـێ ژيـڕا هـەر مانـە د ڕكا خۆدا و دويـر مان ژ هەقيـيێ. ﴿٢٢﴾ ئـەرێ ما هويـن نابينێ كا كيژ دورسـترە، ئـەوێ هـەر ل دويفسـەرێ خۆ دچيت و سـەرچەمیايی، يان يـێ ڕاسـت و سـەربلند ڕێكا خۆ دبينيـت و دچيت.
﴿٢٣﴾ بێژە خـودێ هويـن يـێت دايـين و گوهــ و چـاڤ و عەقل يـێت دايـينە هەوە، بەلـێ [هوين ڤـان كەرەم و نيعمەتـان كێـم ب كار دئينـن د باشـی و تاعەتانـدا] هويـن كێـم شـوكور و سوپاسيـيا خـودێ ل سـەر دكـەن.
﴿٢٤﴾ بێـژە: هـەر خودێيـە هويـن د ئەرديـدا دايـين و زێدەكرين، و هـەر دێ ب بال ويڤـە زڤـڕن. ﴿٢٥﴾ و دبێژن: كەنگـی ئـەو ڕۆژ دێ ئێـت [ئـەوا تـو مـە پـێ دترسينی]، ئەگـەر ڕاسـتە وەكـی هويـن دبێـژن؟!. ﴿٢٦﴾ بێژە: ب ڕاسـتی.. بـەس خـودێ وەختـێ هاتنـا ڕۆژا قيامەتـێ دزانيـت، و ئـەز بـەس هەوە پـێ ئاگەهـدار دكەم.

فَلَمَّا رَأَوۡهُ زُلۡفَةٗ سِيٓـَٔتۡ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم
بِهِۦ تَدَّعُونَ ٢٧ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَهۡلَكَنِيَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِيَ أَوۡ رَحِمَنَا
فَمَن يُجِيرُ ٱلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ٢٨ قُلۡ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ
ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيۡهِ تَوَكَّلۡنَاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ هُوَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٢٩
قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَصۡبَحَ مَآؤُكُمۡ غَوۡرٗا فَمَن يَأۡتِيكُم بِمَآءٖ مَّعِينِۭ ٣٠

## سُورَةُ القَلَمِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ١ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ٢ وَإِنَّ
الحزب ٥٧ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ٣ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ٤ فَسَتُبۡصِرُ
وَيُبۡصِرُونَ ٥ بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ ٦ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ
عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ٧ فَلَا تُطِعِ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٨
وَدُّواْ لَوۡ تُدۡهِنُ فَيُدۡهِنُونَ ٩ وَلَا تُطِعۡ كُلَّ حَلَّافٖ مَّهِينٍ ١٠
هَمَّازٖ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ ١١ مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ١٢
عُتُلِّۭ بَعۡدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ١٣ أَن كَانَ ذَا مَالٖ وَبَنِينَ ١٤ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ
ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ١٥ سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلۡخُرۡطُومِ ١٦



﴿٢٧﴾ و وەختێ ئیزا و نەخۆشییێ نێزیکی خۆ دبینن، سەر و چاڤێت گاور و بێ باوەران تێك دچن و تۆزكی دبن، هنگی ملیاكەت دێ بێژنە وان: ئەهـا ئەڤە ئەو رۆژە ئەوا هەوە لەز لێ دكر. ﴿٢٨﴾ بێژنە من ئەگەر خودێ ل دویڤداخوازا هەوە، من و ئەڤێت د گەل من نەهێلیت و بمرینیت یان رەحمێ ب مە ببەت و ژییێ مە درێژ بكەت، ما ئەڤە دێ چ گەهینیتە هەوە، و چ دێ گاوران ژ ئیزا و نەخۆشییا دژوار قورتالكەت. ﴿٢٩﴾ بێژە: بەس خودایێ دلۆڤانە مرۆڤی ژ ئیزا و نەخۆشییا دژوار قورتال دكەت، مە باوەری پێ ئینا و مە پشتا خۆ پێ گرێدا، و نێزیك هوین دێ زانن كی ژ مە د گومراییێكا ئاشكەرادایە، ئەم یان هوین؟! ﴿٣٠﴾ بێژە [وان]: ئەرێ بێژنە من ئەگەر ئاڤا هەوە د ئەردیدا بەرزەبوو، كی دێ بۆ هەوە ب سەر ئەردی ئێخیت ؟

## سۆرەتا قەلەم

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٥٢) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هۆسا دئێتە خواندن (نوون)، [ل دۆر راڤەكرنا ڤان رەنگە تیپان بزڤرە دەستپێكا سۆرەتا (بەقەرە)]، و سویند ب قەلەمی و سویند ب نڤێسینا پێ دئێتە نڤێسین. ﴿٢﴾ تو نەیێ دینی وەكی هزر دكەن و نابیت تو یێ دین بی، و خودێ ئەڤ خێر و نیعمەتە د گەل تە كری و داییە تە. ﴿٣﴾ و خودێ خێرەكا بەردەواما بێ ڤەبرین دێ دەتە تە [ژ بەر وێ بێنفرەهییا تو ل سەر ڤان نەخۆشییان دكێشی]. ﴿٤﴾ و بێ گومان تو خودانێ رەوشتەكی زێدە پاك و بلندی. ﴿٥﴾ نێزیك تو دێ بینی و ئەو ژی دێ بینن. ﴿٦﴾ كا كی ژ هەوە یێ دینە و یێ دین بوو. ﴿٧﴾ بێ گومان خودایێ تە چێتر دزانیت كا كی یێ خەلەتە و رێكا خودێ بەرزەكریە، و ئەو چێتر دزانیت راستەرێ كینە. ﴿٨﴾ ڤێجا گوهدارییا وان نەكە، ئەوێت ژ تە بێ باوەر، و تە درەوین ددانن. ﴿٩﴾ ئەو حەز دكەن تو سستییێ بكەی و ل دویڤ وان بەردەی [و هندەك فەرمانێت خودایێ خۆ بهێلی]، دا ئەو ژی پیچەكێ نەرم ببن و ل دویڤ تە بێن. ﴿١٠﴾ و گوهێ خۆ نەدە وی یێ گەلە سویندخۆر و پیس. ﴿١١﴾ یێ تانئاڤێژ و عەیب دەرئێخ و ئەوێ كارێ وی ئاختڤن گوهێزی [بۆ هلئێخستنا فتنە و نەخۆشییان]. ﴿١٢﴾ ئەوێ قەلس و خێرنەخواز و تەعداكەر و گونەهكار. ﴿١٣﴾ ئەوێ زڤر و ئەزمان رەق، پشتی ڤێ ژی بیژی [نە كورێ بابێ خۆ]، و ناڤدێر ب خراپییێ. ﴿١٤﴾ چونكی خودان مال و عەیال بوو، لەوا یێ هۆسا بوو. ﴿١٥﴾ وەختێ ئایەتێت مە بۆ دهاتنە خواندن و دبهیستن، دگۆت: ئەڤە چیرۆك و چیڤانۆكێت بەرێنە. ﴿١٦﴾ ئەم دێ دفنا وی دروی كەین، [دا بۆ هەمییان ئاشكەرا ببیت و بنیاسن].

إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا
يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ
كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾ فَتَنَادَوْا۟ مُصْبِحِينَ ﴿٢١﴾ أَنِ ٱغْدُوا۟ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ
صَٰرِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَٱنطَلَقُوا۟ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم
مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْا۟ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ ﴿٢٥﴾ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓا۟ إِنَّا
لَضَآلُّونَ ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا
تُسَبِّحُونَ ﴿٢٨﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ
بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ ﴿٣٠﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ﴿٣١﴾ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا
خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ
أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٣٤﴾
أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ
كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَكُمْ أَيْمَٰنٌ عَلَيْنَا
بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۙ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴿٣٩﴾ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ
زَعِيمٌ ﴿٤٠﴾ أَمْ لَهُمْ شُرَكَآءُ فَلْيَأْتُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٤١﴾ يَوْمَ
يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾





﴿١٧﴾ ب ڕاستی مە خەلکێ مەکەهێ جەڕباندن
هەروەکی مە خودانێت جنیکێ جەڕباندین، دەمێ سویند
خوارین سپێدەیێ زوی ڤێقییێ خۆ بچنن، و چو بۆ فەقیر و
ژاران پێڤە نەهێلن. ﴿١٨﴾ و نە گۆتن (ئەگەر خودێ حەز
بکەت) کو چو بۆ هەژاران نادانن. ﴿١٩﴾ هێژ ئەو د خەو
و ب شەڤ، ئاگرەك کەڤتە جنیکا وان. ﴿٢٠﴾ و جنیکا
وان سۆت و وەکی شەڤا تاری لێ کر. ﴿٢١﴾ سپێدەیێ زوی
گازی ئێك و دو کرن دا بچنە ناڤ جنیکا خۆ وەکی وان
ل بەر. ﴿٢٢﴾ [و گۆتن] زوی هەڕنە د ناڤ جنیکا خۆدا،
ئەگەر هەوە چنین ل بەرە. ﴿٢٣﴾ ئەو بەر ب جنیکێڤە چۆن
و بەرزەییڤە و نەپەنی. ﴿٢٤﴾ ب دەنگێ نزم د ناڤخۆدا
گۆتن: بلا چو فەقیر و ژار ب هەوە نەحەسن، و نەئێنە
ناڤ جنیکا هەوە. ﴿٢٥﴾ بۆ ب جهکرنا مەرەما خۆ، زوی
دەرکەڤتن، یا ژ وانڤە دێ شێن ڤێقییێ خۆ چنن، و دێ شێن
فەقیر و ژاران ژێ بێ بارکەن. ﴿٢٦﴾ وەختێ دیتین جنیکا
وان یا سۆتی و شەوتی، باوەرنەکرن جنیك جنیکا وانە،
و گۆتن: مە ڕێکا خۆ یا بەرزەکری و ئەڤە نە جنیکا مەیە.
﴿٢٧﴾ پشتی هشێت وان هاتینە سەرێ وان، ژ نوی زانین
یێت هاتینە جزادان ل سەر ئنیەتا خۆ د دەرهەقێ فەقیر و ژاراندا و گۆتن: د دەست مە ژیدا نەما، چونکی مە دڤیا چو
نەدەینە فەقیر و ژاران. ﴿٢٨﴾ یێ ژ هەمییان تێگەهشتیتر ژ وان گۆت: ما من نەگۆتە هەوە ئەگەر هوین ناڤێ خودایێ
خۆ نەئینن، و ژ کارێ خۆ یێ نەڕەوا لێڤە نەبن، ئەها ئەڤە دێ ئێتە سەرێ هەوە. ﴿٢٩﴾ پشتی ئەڤا ب سەرێ وان
هاتی، و پشتی زانین خەلەتی خەلەتیا وانە، ئینا گۆتن: خودێوۆ تو یێ پاقژی ژ هەمی کێماسییان، ب ڕاستی ئەم
یێت سەرداچۆیی بوویین. ﴿٣٠﴾ بەرێ خۆ دانە ئێك و دو و لۆمەی ئێك و دو کرن، و هەر ئێکی کرە سویچێ یێ
دی، کو ئەو بوو خودانێ ڤێ شیرەتێ هەتا ئەڤە هاتییە سەرێ وان. ﴿٣١﴾ گۆتن: وەی نەخۆشی و نەمان بۆ مە بیت،
چونکی ب ڕاستی و بێ گۆمان ئەم د خەلەت بوویین د کارێ خۆدا، مە دڤیا مافێ فەقیر و ژاران نەدەینە وان و پشك
و بارا وان ژ وان ڤەگرین. ﴿٣٢﴾ ئەم هیڤی دکەین خودایێ مە گونەهێت مە ژێ ببەت و ل مە نەگریت و بۆ مە چێتر
بەدەل ڤەکەت، مرادا مە لێنەگرتنا خودایێ مەیە. ﴿٣٣﴾ وەکی ڤێ ئێزایا مە داییە بەر خودانێت جنیکێ، دێ دەینە
بەر قورەیشییان، و ئەو ئێزا و نەخۆشییا قیامەتێ دگەهیتە وان گەلەك دژوارترە، ئەگەر بزانن و تێ بگەهن. ﴿٣٤﴾ بێ
گۆمان پارێزکار و خودێ ترسان، خەلاتێ بەحەشتێ ل دەڤ خودایێ خۆ هەیە. ﴿٣٥﴾ ئەرێ ما ئەم دێ موسلمانان
[ڕۆژا قیامەتێ] وەکی گونەهکاران دانین، بێ گۆمان هەردو جوین وەکی ئێك نابن. ﴿٣٦﴾ هەوە خێرە، هوین چاوا
وەکی ئێك ددانن؟! ﴿٣٧﴾ یان کتێبەك د ناڤ دەستێت هەوەدا هەیە، هوین لێ دخوینن؟! ﴿٣٨﴾ ئەو تشتێ هەوە
دڤێت یێ تێدا. ﴿٣٩﴾ یان [خودێ] سۆز و پەیمان داییە هەوە، هەتا ڕۆژا قیامەتێ ژی، دێ هەر ئەو بیت یا هوین بۆ
خۆ ددانن و دبێژن. ﴿٤٠﴾ کا ژ وان بپرسە، کی ژ وان کەفالەتێ دکەت، کو ئەو و موسلمان دێ وەکی ئێك بن، و چو
جوداهی د ناڤبەرا واندا نابیت. ﴿٤١﴾ یان وان هندەك هەڤال هەنە د ڤێ بیر و بۆچۆنێدا، بلا هەڤالێت خۆ بینن ئەگەر
ڕاست دبێژن. ﴿٤٢﴾ ڕۆژا ل وان دبیتە تەنگاڤی و ئێزا کو ڕۆژا قیامەتییە، و داخواز ژ وان دئێتەکرن بچنە سوجدەیێ،
بەلێ نەشێن [چونکی د دنیاییێدا ئەو نەدچۆنە سوجدەیێ].

خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ وَقَدۡ كَانُواْ يُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ
سَٰلِمُونَ ٤٣ فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِۖ سَنَسۡتَدۡرِجُهُم
مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ ٤٤ وَأُمۡلِي لَهُمۡۚ إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ ٤٥ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ
أَجۡرٗا فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ ٤٦ أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ ٤٧
فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ
وَهُوَ مَكۡظُومٞ ٤٨ لَّوۡلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعۡمَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلۡعَرَآءِ
وَهُوَ مَذۡمُومٞ ٤٩ فَٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ٥٠
وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزۡلِقُونَكَ بِأَبۡصَٰرِهِمۡ لَمَّا سَمِعُواْ
ٱلذِّكۡرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجۡنُونٞ ٥١ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٥٢

## سُورَةُ الحَاقَّةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نصف الحزب ٥٧
ٱلۡحَآقَّةُ ١ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ٢ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ٣ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ وَعَادُۢ
بِٱلۡقَارِعَةِ ٤ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهۡلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ ٥ وَأَمَّا عَادٞ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ
صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ ٦ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ فَتَرَى
ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ ٧ فَهَلۡ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٖ ٨



﴿٤٣﴾ وی رۆژێ سەروچاڤێت وان د شۆڕن و ڕەزیل و ڕسوانە، چونكی د دنیایێدا داخواز ژ وان دهاتەكرن بچنە سوجدەیێ، و ئەو ل سەرخۆ و ساخلەم، و نەدچۆن. ﴿٤٤﴾ ئەو كەسێت باوەرییێ ب قورئانێ نەئینن و تە درەوین ددانن، تو وان بهێلە ب هێڤیا منڤە ئەز دێ تۆلان ل وان ڤەكەم، و دێ وان پێنگاڤ پێنگاڤ ڕاكێشمە د دۆژەهێدا و بێی ب خۆ بحەسن. ﴿٤٥﴾ و ئەز وان گیرۆ دكەم و دەرفەتێ ددەمە وان، بەلێ تۆلڤەكرن و ئیزایا من یا دژوارە. ﴿٤٦﴾ یان تو مالەكی ژ وان دخوازی و ل وان گرانە، لەو باوەرییێ نائینن. ﴿٤٧﴾ یان دەپێ پاراستی ل دەڤ وانە، بۆ خۆ وان نیشان و بەلگەیان ژێ ڤەدگوهێزن، ئەوێت پشتەڤانیا هندێ دكەن كو ئەو د سەر گونەهكارییا خۆرا ژ موسلمانان چێترن، ژ بەر هندێ ئەو ل سەر ڕكا خۆنە. ﴿٤٨﴾ ڤێجا بێنا خۆ ل سەر ئەزیەتا وان فرەه بكە، و وەكی یوونس پێغەمبەری نەبە [بێنا خۆ چێك بكەی و لەزێ بكەی]، دەمێ د زكێ نەهنگیدا، و ئەو یێ خەمگین گازی خودایێ خۆ كری [دا قورتال بكەت]. ﴿٤٩﴾ ئەگەر دلۆڤانیا خودێ پێڕا نەگەهشتبایە، دا مینیتە ل چۆلی و یێ سویچەلۆ و لۆمەكری و لەكەداركری. ﴿٥٠﴾ بەلێ خودێ ب بەر دلۆڤانیا خۆ ئێخست، و ئەو هەلبژارت و ژ قەنجیكاران دانا. ﴿٥١﴾ وەختە گاور ب كەرب و كین و زكرەشیا خۆ تە چاڤین بكەن و تە بێخن، دەمێ گول تە دبن تو قورئانێ دخوینی، و ژ كەربانـدا دبێژن [موحەمەد] یێ دینە. ﴿٥٢﴾ و [ڤێ ئاخفتنێ د دەرهەقێ قورئانێدا دبێژن] قورئان ب خۆ، ڕێك و ڕێباز و بەرنامەیە بۆ هەمی مرۆڤان.

## سۆرەتا ئەلحاقە

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٥٢) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ (الحاقە) ناڤە بۆ ڕۆژا قیامەتێ، هاتییە ناڤكرن ب ئەلحاقە چونكی حەقە و ڕاستییە، و هەر دێ ئێت. ﴿٢﴾ ئەلحاقە چییە؟ [ئەڤە تەئكیدە ل سەر هاتنا ڕۆژا قیامەتێ]. ﴿٣﴾ ما تو چ دزانی هەی موحەمەد كا ڕۆژا قیامەتێ، ئەلحاقە یا چاوایە؟ [تو چو ژێ نوزانی] چونكی تە نەدیتییە كا ئەو ڕۆژە چەند ب سەهمە. ﴿٤﴾ (سەموود) (ملەتێ صالح پێغەمبەر) و عاد (ملەتێ هوود پێغەمبەر) باوەری ب ڕۆژا قیامەتێ نەئینان، و گۆتن: درەوە چو ڕۆژ نینن دلقوتك تێدا بێتە دلان. ﴿٥﴾ هندی (سەموود) بوو (ملەتێ صالح پێغەمبەر) ب هشكەقێرییەكا ب هێز و دژوار د هیلاك چۆن. ﴿٦﴾ و هندی عاد بوو (ملەتێ هوود پێغەمبەر)، ب ڕەشەبایەكێ ب سڕوسەقەم و ب ڤزەڤز و زێدە سار د هیلاك چۆن. ﴿٧﴾ حەفت شەڤ و هەشت ڕۆژان ل سەرێك ب سەر واندا هنارت، و ئەو د مالێت خۆدا مری و بێ بزاڤ مان، وەكی قورمێت دارقەسپێت خلۆلە لێ هاتن. ﴿٨﴾ ما تو دبینی شوینماییەكا وان مابیت، [بچویك و مەزن كەس ژ وان نەمان، هەمی قڕبوون].

وَجَآءَ فِرۡعَوۡنُ وَمَن قَبۡلَهُۥ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتُ بِٱلۡخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوۡاْ رَسُولَ
رَبِّهِمۡ فَأَخَذَهُمۡ أَخۡذَةٗ رَّابِيَةً ﴿١٠﴾ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلۡمَآءُ حَمَلۡنَٰكُمۡ فِي
ٱلۡجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجۡعَلَهَا لَكُمۡ تَذۡكِرَةٗ وَتَعِيَهَآ أُذُنٞ وَٰعِيَةٞ ﴿١٢﴾ فَإِذَا نُفِخَ
فِي ٱلصُّورِ نَفۡخَةٞ وَٰحِدَةٞ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةٗ
وَٰحِدَةٗ ﴿١٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ
وَاهِيَةٞ ﴿١٦﴾ وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ
ثَمَٰنِيَةٞ ﴿١٧﴾ يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ ﴿١٨﴾ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ
كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ﴿١٩﴾ إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ
حِسَابِيَهۡ ﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ ﴿٢١﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ ﴿٢٢﴾ قُطُوفُهَا
دَانِيَةٞ ﴿٢٣﴾ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾
وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ كِتَٰبِيَهۡ ﴿٢٥﴾ وَلَمۡ أَدۡرِ
مَا حِسَابِيَهۡ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ
عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلۡجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلۡسِلَةٖ
ذَرۡعُهَا سَبۡعُونَ ذِرَاعٗا فَٱسۡلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٣٣﴾
وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴿٣٤﴾ فَلَيۡسَ لَهُ ٱلۡيَوۡمَ هَٰهُنَا حَمِيمٞ ﴿٣٥﴾

سكتة لطيفة على هاء ماليه



﴿٩﴾ و فیرعەون و یێت بەری وی و گوندێت سەرێك و بنێك كرین دەست ب گونەهان كرن. ﴿١٠﴾ گوهداریا پێغەمبەرێ خودێ نەكرن، ئینا خودێ ئەو ئێزادانەكا دژوار ئێزادان. ﴿١١﴾ بێ گومان وەختێ ئاڤ ڕابووی و هەمی تشت بنئاڤ بووین، مە هوین ل سەر پشتا گەمیێ قورتالكرن. ﴿١٢﴾ دا ئەم [قورتالكرنا خودان باوەران و د هیلاكبرنا گاوران] بكەینە چامە و عیبرەت، و دا هەر بمینیتە د گوهێت ڤەكریدا. ﴿١٣﴾ وەختێ پفەك ل بوقێ دئێتە دان [پفا وێرانكرنا دنیایێ]. ﴿١٤﴾ و دەمێ ئەرد و چیا ژ ڕەهان دئێنە هلكێشان، و ڤێك دكەڤن و هویر و هەرا دبن. ﴿١٥﴾ ئەها هنگی بزانە قیامەت ڕابوو. ﴿١٦﴾ و ئەسمان كەلشت، و وێ ڕۆژێ ئەسمان یێ سست و خاڤە. ﴿١٧﴾ و ملیاكەت ل ڕەخ و دۆرانن (چونكی ئەسمان ئێورگەها ملیاكەتانە)، وێ ڕۆژێ هەشت ملیاكەت عەرشێ خودێ ڕادكەن. ﴿١٨﴾ وێ ڕۆژێ هوین دێ پێشبەری خودایێ خۆ بن، كەس ژ هەوە نائێتە ڤەشارتن. ﴿١٩﴾ هندی ئەوە ئەوێ كتێبا كار و كریارێت خۆ ب دەستێ ڕاستێ وەردگریت، ب كەیف دێ بێژیت: كەرەمكەن كتێبا من بخوینن. ﴿٢٠﴾ ئەز یێ پشت ڕاست بووم حسابا ڕۆژا قیامەتێ یا ل دویفمن، و خودایێ من دێ حسابەكا سڤك د گەل من كەت. ﴿٢١﴾ و ئەو یێ د ژین و ژیارەكا خۆشدا. ﴿٢٢﴾ د بەحەشتەكا خودان ڕێز و قەدردا. ﴿٢٣﴾ فێقیێ وێ [بەحەشتێ] نزم و بەردەستە. ﴿٢٤﴾ بخۆن و ڤەخۆن، هەوە نۆشی جان بیت ژ بەر وان كار و كریارێت باش ئەوێت هەوە د دنیایێدا كرین. ﴿٢٥﴾ و هندی ئەوە ئەوێ كتێبا خۆ ب دەستێ چەپێ وەردگریت ب كول و خەمڤە دێ بێژیت: خۆزی ژ خێرا خودێرا من ئەڤ كتێبە وەرنەگرتبایە. ﴿٢٦﴾ و من چو ژ هەق و حسێبا خۆ نەزانیبایە. ﴿٢٧﴾ خۆزی ژ خێرا خودێرا مرنا من، مرنا ئێكجاری بایە [و ئەز پشتی مرنێ ساخ نەبىامەڤە]. ﴿٢٨﴾ مال و ملكێ من ل سەر دنیایێ كۆمكری، نە مفا گەهاندە من، و نە ئێزا ژ من دا پاش. ﴿٢٩﴾ دەستهەلاتا من (پشت و پشتەڤانی و ناڤ و دەنگ) هەمی ژ دەست من چۆ. ﴿٣٠﴾ [خودایێ مەزن دێ بێژیتە ملیاكەتان: ڤی گونەهكارێ تێر گونەهـ] ببەن و دەست و پێیان لێ قەید و زنجیر بكەن. ﴿٣١﴾ و باڤێژنە د ناڤ دۆژەها سنجریدا. ﴿٣٢﴾ پاشی ب زنجیرەكا حەفتێ گەز زنجیرپێچ بكەن. ﴿٣٣﴾ ئەوی باوەری ب خودایێ مەزن نەدئینا. ﴿٣٤﴾ و نە خۆ و نە یێ وێڤەتر د بەر هندێرا نەدكر، برسا فەقیر و ژاران بشكێنیت. ﴿٣٥﴾ ئەوی ئەڤرۆ چو هەڤال و هۆگرێت خۆ ل ڤێرێ نینن.

وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴿٣٦﴾ لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ ﴿٣٧﴾ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا
تُبْصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿٤٠﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ
شَاعِرٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾
تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٣﴾ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾
لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم
مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ وَإِنَّا
لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾
وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٥١﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٥٢﴾

سُورَةُ المَعَارِجِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَأَلَ سَآئِلٌۢ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ ﴿١﴾ لِّلْكَٰفِرِينَ لَيْسَ لَهُۥ دَافِعٌ ﴿٢﴾
مِّنَ ٱللَّهِ ذِى ٱلْمَعَارِجِ ﴿٣﴾ تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى
يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾ فَٱصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا ﴿٥﴾
إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُۥ بَعِيدًا ﴿٦﴾ وَنَرَىٰهُ قَرِيبًا ﴿٧﴾ يَوْمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ
كَٱلْمُهْلِ ﴿٨﴾ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ﴿٩﴾ وَلَا يَسْـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا ﴿١٠﴾



﴿٣٦﴾ و چو خوارن ژ وی نینە، کێم و عەداڤا برینێت دۆژەهییان نەبیت. ﴿٣٧﴾ کەس ڤێ خوارنێ ناخۆت، گونەهکار نەبن. ﴿٣٨﴾ سویند ب یێ بەرچاڤ (یێ هوین دبینن). ﴿٣٩﴾ سویند ب یێ نەبەرچاڤ، (یێ هوین نەبینن). ﴿٤٠﴾ بێ گۆمان ئەڤ قورئانا هەنێ ئاخڤتنا خودایێ دلۆڤانە، بۆ پێغەمبەری یا هنارتی.

﴿٤١﴾ و [ئەڤ قورئانە] نەئاخڤتنا هۆزانڤانانە، هوین ژێ بێ باوەر. ﴿٤٢﴾ و [ئەڤ قورئانە] نەئاخڤتنا خێڤزانکانە، پیچەکێ ژێ، هوین خۆ تێ ناگەهینن!. ﴿٤٣﴾ ئەڤ قورئانە ژ نك خودایێ هەمی جیهانان یا هاتی. ﴿٤٤﴾ و هەکە وی [مەخسەد موحەمەد پێغەمبەر] هندە ئاخڤتن ژ کیسێ مە چێکربانە. ﴿٤٥﴾ ئەم دا ب هێز و شیانا خۆ زوی تۆلێ لێ ڤەکەین. ﴿٤٦﴾ پاشی ئەم، دا رها ب دلێ ویڤە گرێدایی، برین و قەتینین. ﴿٤٧﴾ هنگی ئێك ژ هەوە نەدشیا بەرەڤانییێ ژێ بکەت، دا نەکەڤیتە بەر جزایێ خۆ. ﴿٤٨﴾ و ب راستی ئەڤ قورئانە بیرئینانە بۆ خودان باوەرێت ژ خودێ ترس. ﴿٤٩﴾ و مە ئاگەهـ ژێ هەیە، هندەك ژ هەوە قورئانێ درەو ددانن. ﴿٥٠﴾ و ئەڤە رۆژا قیامەتێ بۆ گاوران دێ بیتە هزرەت و پەشێمانی. ﴿٥١﴾ و ئەڤ قورئانە راستییەکا راستە، چو گۆمان ناچنێ. ﴿٥٢﴾ ڤێجا تو پاقژییێ بدە بال ناڤێ خودایێ خۆ یێ مەزن، و خودایێ خۆ ژ هەمی کێماسییان پاقژ بکە.

## سۆرەتا مەعارج

### ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٤٤) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ ئێك ژ گاورێت مەکەهێ گۆت: کا بلا قیامەت بێت. ﴿٢﴾ گاوران وێ رۆژێ چو مەفەر نینن، و چو جهـ نینن پێڤە برەڤن. ﴿٣﴾ ئەو قیامەتا ئەو دخوازن، ب فەرمانا خودێ دێ ب سەر واندا ئێت، ئەو خودایێ خودان پێك و پەیسك، ملیاکەتێت وی پێ دچنە ئەسمانان. ﴿٤﴾ ملیاکەت و جبریل د رۆژەکێدا ژێلەل بەر ب خودێ دچن، درێژاییا وێ پێنجی هزار سالن. ﴿٥﴾ تو بێنا خۆ ل سەر نەخۆشییێت وان فرەهـ بکە، بێنفرەهکرنەکا بێ ترس و بێ خەم. ﴿٦﴾ ئەو دبینن ئەو رۆژ کو رۆژا قیامەتییە، یا دویرە و چوجا نائێت. ﴿٧﴾ و ئەم دبینین یا نێزیکە و دێ هەر ئێت. ﴿٨﴾ رۆژا ئەسمان وەکی رساسێ حەلیایی لێ دئێت. ﴿٩﴾ و رۆژا چیا وەکی هرییا بەرەبا لێ دئێت. ﴿١٠﴾ و وێ رۆژێ خۆشڤی پسیارا خۆشڤییێ خۆ ناکەت و لێ ناپرسیت.

يُبَصَّرُونَهُمْۚ يَوَدُّ ٱلْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذِۭ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾
وَصَٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِي تُـٔۡوِيهِ ﴿١٣﴾ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا
ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّآۖ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾ تَدْعُواْ مَنْ أَدْبَرَ
وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾ وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰٓ ﴿١٨﴾ ۞ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ
جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ
عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱلَّذِينَ فِيٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ ﴿٢٤﴾ لِّلسَّآئِلِ
وَٱلْمَحْرُومِ ﴿٢٥﴾ وَٱلَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٢٦﴾ وَٱلَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ
رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٢٧﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ ﴿٢٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ
لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ﴿٢٩﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ
غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٣٠﴾ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴿٣١﴾ وَٱلَّذِينَ
هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِشَهَٰدَٰتِهِمْ قَآئِمُونَ ﴿٣٣﴾
وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٣٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ فِي جَنَّٰتٍ مُّكْرَمُونَ ﴿٣٥﴾
فَمَالِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ ﴿٣٦﴾ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ
عِزِينَ ﴿٣٧﴾ أَيَطْمَعُ كُلُّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٖ ﴿٣٨﴾ كَلَّآۖ إِنَّا خَلَقْنَٰهُم
مِّمَّا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٥٧



﴿١١﴾ ئێك و دو دبينن و ئێك و دو دنياسن، مرۆڤێ
گونەهكار وێ ڕۆژێ حەز دكەت، كوڕ و كچێت خۆ
هەميان گۆری خۆ بكەت. ﴿١٢﴾ و ژنا خۆ و برايێت
خۆ هەميان گۆری خۆ بكەت. ﴿١٣﴾ و ئێل و ئويجاخا
خۆ، هەميان گۆری خۆ بكەت. ﴿١٤﴾ و پێ خۆشە
هندی ل سەر ڕوييێ ئەردی گۆری خۆ بكەت، بەس
قورتال ببيت. ﴿١٥﴾ نەخێر چو وان قورتال ناكەن و
بلا ل خودێ بزڤڕن، ئاگر و گوڕی يێ ل پێشيا وان.
﴿١٦﴾ [ئەو ئاگرە] پيستێ سەری و لەشی ڕادكەت
و دڕەڤيت. ﴿١٧﴾ گازی وان دكەت ئەوێت پشت
داينە هەقييێ، و خۆ ژێ داينە پاش. ﴿١٨﴾ گازی
وان دكەت ئەوێت مال كۆمكرين و داناينە سەرێك
و ڤەشارتين. ﴿١٩﴾ مرۆڤ چاڤترسيايی و بێتەنگ
يێ هاتييە چێكرن. ﴿٢٠﴾ ئەگەر نەخۆشی گەهشتێ
(چ نەساخی و چ هەژاری و هەر نەخۆشييەكا دی) يێ
خەمگين و بێ هيڤی و ب ئاخ و ئۆفە. ﴿٢١﴾ و ئەگەر
خودێ قەنجی د گەل كر و دەستێ وی فرەهكر، چو
ژ دەستان دەرناكەڤيت. ﴿٢٢﴾ نڤێژكەرێت تێ نەبن.
﴿٢٣﴾ ئەوێت ل سەر كرنا نڤێژان بەردەوام. ﴿٢٤﴾ و ئەو تێ نەبن ئەوێت بارا خودێ دێخنە د ناڤ مالێ
خۆدا. ﴿٢٥﴾ بۆ فەقير و ژار و خوازخوازۆكان. ﴿٢٦﴾ و ئەو تێ نەبن ئەوێت باوەرييێ ب ڕۆژا جزادانێ
دئينن. ﴿٢٧﴾ و ئەو تێ نەبن ئەوێت دلێ وان يێ ب ترس ژ ئيزادانا خودێ. ﴿٢٨﴾ ب ڕاستی عەزابا خودايێ
وان نەيا هندێيە ژێ پشت ڕاست ببن. ﴿٢٩﴾ و ئەو تێ نەبن ئەوێت داڤ و دەهمەن پاقژ و شەرمگەها خۆ
دپارێزن، ژ هەر كەسەكی. ﴿٣٠﴾ ژ بلی ژن و جێرييێت خۆ، و ئەو بۆ ڤێ نە د لۆمەدارن، و گازندە ژ وان
نائێتەكرن. ﴿٣١﴾ و هەر كەسێ ب ڕێكەكا دی شەهوەتا خۆ بشكێنيت ئەو يێ گونەهكارە. ﴿٣٢﴾ و ئەو تێ
نەبن ئەوێت سۆز و پەيمان و ئەمانەتێت خۆ دپارێزن. ﴿٣٣﴾ و ئەو تێ نەبن ئەوێت شادەييا خۆ بۆ دوير
و نێزيكان نەڤەشێرن. ﴿٣٤﴾ و ئەو تێ نەبن ئەوێت ب دورستی و بەردەوام نڤێژێت خۆ دكەن. ﴿٣٥﴾ ئەها
ئەڤەنە د بەحەشتاندا، خودان قەدر. ﴿٣٦﴾ ئەڤان گاوران خێرە هۆسا ب لەز ژ تە دڕەڤن، و تە درەوين ددانن
و باوەرييێ ب تە نائينن؟!!. ﴿٣٧﴾ دەستەك دەستەك ل ڕەخێ تە يێ ڕاستێ و چەپێ، د ڕوينشتی و بەلاڤ
و گوهشينە. ﴿٣٨﴾ ئەرێ هەر ئێك ژ وان ل هيڤييا هندێيە بچيتە بەحەشتا تێر خێر و بێر؟. ﴿٣٩﴾ نەخێر نە ب
كەيفا وانە، مە ئەو يێ ژ وی تشتی چێكرين يێ ئەو دزانن [ژ چپكەكێ، پاشی ژ پرتەكا خوينێ، پاشی ژ
پارچەيەكا گۆشتی]. ﴿٤٠﴾ سويند ب خودايێ ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤايان، ئەم دشێين.

عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَمَا نَحۡنُ بِمَسۡبُوقِينَ ﴿٤١﴾ فَذَرۡهُمۡ
يَخُوضُواْ وَيَلۡعَبُواْ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ﴿٤٢﴾ يَوۡمَ
يَخۡرُجُونَ مِنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ سِرَاعٗا كَأَنَّهُمۡ إِلَىٰ نُصُبٖ يُوفِضُونَ ﴿٤٣﴾
خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۚ ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمُ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٤٤﴾

## سُورَةُ نُوحٍ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَهُمۡ
عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ أَنِ ٱعۡبُدُواْ
ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرۡكُمۡ
إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُۚ لَوۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٤﴾
قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوۡتُ قَوۡمِي لَيۡلٗا وَنَهَارٗا ﴿٥﴾ فَلَمۡ يَزِدۡهُمۡ دُعَآءِيٓ إِلَّا
فِرَارٗا ﴿٦﴾ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوۡتُهُمۡ لِتَغۡفِرَ لَهُمۡ جَعَلُوٓاْ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ
ءَاذَانِهِمۡ وَٱسۡتَغۡشَوۡاْ ثِيَابَهُمۡ وَأَصَرُّواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ ٱسۡتِكۡبَارٗا ﴿٧﴾
ثُمَّ إِنِّي دَعَوۡتُهُمۡ جِهَارٗا ﴿٨﴾ ثُمَّ إِنِّيٓ أَعۡلَنتُ لَهُمۡ وَأَسۡرَرۡتُ
لَهُمۡ إِسۡرَارٗا ﴿٩﴾ فَقُلۡتُ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارٗا ﴿١٠﴾



﴿٤١﴾ وان ب هندەکێت ژ وان چێتر بگوهۆڕین، و ئەڤە ل بەر مە نەیا ب زەحمەتە و کەس نەشێت ڕێکێ ل مە بگریت. ﴿٤٢﴾ (هەی موحەمەد) ژ وان بگەڕە، بلا بمیننە ب پویچاتیێت خۆڤە، و بلا د دنیایا خۆدا بلەزن، هەتا وێ ڕۆژا ب ترس و سەهم یا تۆبە و پەشێمانی تێدا بێ مفا، دبینن. ﴿٤٣﴾ ڕۆژا ب لەز ژ گۆڕستانان دەردکەڤن، و بەر ب جهێ کۆمبوونێڤە دچن، دێ بێژی یێ قەستا بوتێت خۆ دکەن، ئەوێت وان ب دەستێت خۆ چێکرین. ﴿٤٤﴾ وێ ڕۆژێ، ئەو چاڤ شۆڕ و ڕەزیل و ڕسوانە، ئەها ئەڤەیە ئەو ڕۆژا ئەو ل سەر دنیایێ پێ دهاتنە ترساندن [و وان یاری پێ دکرن و باوەری پێ نەدئینان، ئەڤرۆ دێ جزایێ وێ بێ باوەرییێ ب چاڤێ سەرێ خۆ بینن].

## سۆرەتا نووح

**ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٢٨) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ مە نووح بۆ ملەتێ وی هنارت، و مە گۆتێ ملەتێ خۆ بترسینە ژ ئیزا و عەزابا خودێ، بەری ئەو بەرهنگاری تۆفانێ ببن و د تۆفانێدا بخەندقن. ﴿٢﴾ گۆت: هەی ملەتێ من، ئەز هەوە ب ئاشکەرایی ژ ئیزا و عەزابا خودێ دترسینم. ﴿٣﴾ ئەز فەرمانا هەوە دکەم هوین پەرستن و عەبدینیا خودایێ خۆ ب تنێ بکەن، و پارێزکاریا وی بکەن، و گوهدارییا من بکەن. ﴿٤﴾ دێ گونەهێت هەوە پویچ کەت، و ژییێ هەوە دێ درێژ کەت هەتا وەختەکێ دەستنیشانکری، ئەگەر ئەو وەختێ خودێ دەستنیشانکری هات، نە هوین پێش دکەڤن و نە پاش دکەڤن، ئەگەر هوین بزانن. ﴿٥﴾ گۆت: خودێوۆ من ب شەڤ و ڕۆژ (ئانکو هەمی وەختان) گازی ملەتێ خۆ دکر بۆ ڕێکا تە. ﴿٦﴾ بەلێ من چەند گازی وان دکر ئەو پتر ژ ڕێکا تە دویر دکەڤتن. ﴿٧﴾ و هەر جارا من داخواز ژ وان کربایە باوەرییێ ب تە بینن، دا گونەهێت وان نەهێلی، تلێت خۆ دکرنە د گوهێت خۆڕا، و جلکێت خۆ ب سەرێ خۆدا دئینان، دا من نەبینن و دا گول من نەبن، و هەر مانە ل سەر ئێك و دویا خۆ، و ژ مەزناتی و دفنبلندی پشتا خۆ دانە باوەرییێ. ﴿٨﴾ پاشی من ب ئاشکەرایی و بێ ترس، گازی وان کر. ﴿٩﴾ پاشی من ب ئاشکەرایی و نەپەنی، گازی وان کر. ﴿١٠﴾ من گۆتە وان ل خودایێ خۆ بزڤڕن و ژێ بخوازن گونەهێت هەوە نەهێلیت، ب ڕاستی هەر ئەوە تۆبەیێ وەردگریت و گونەهان ژێ دبەت.

يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا ﴿١١﴾ وَيُمۡدِدۡكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ وَيَجۡعَل
لَّكُمۡ جَنَّٰتٖ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ أَنۡهَٰرٗا ﴿١٢﴾ مَّا لَكُمۡ لَا تَرۡجُونَ لِلَّهِ وَقَارٗا ﴿١٣﴾
وَقَدۡ خَلَقَكُمۡ أَطۡوَارًا ﴿١٤﴾ أَلَمۡ تَرَوۡاْ كَيۡفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ
طِبَاقٗا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلۡقَمَرَ فِيهِنَّ نُورٗا وَجَعَلَ ٱلشَّمۡسَ سِرَاجٗا ﴿١٦﴾
وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ نَبَاتٗا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمۡ فِيهَا وَيُخۡرِجُكُمۡ
إِخۡرَاجٗا ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ بِسَاطٗا ﴿١٩﴾ لِّتَسۡلُكُواْ مِنۡهَا
سُبُلٗا فِجَاجٗا ﴿٢٠﴾ قَالَ نُوحٞ رَّبِّ إِنَّهُمۡ عَصَوۡنِي وَٱتَّبَعُواْ مَن لَّمۡ يَزِدۡهُ
مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارٗا ﴿٢١﴾ وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا كُبَّارٗا ﴿٢٢﴾ وَقَالُواْ
لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمۡ وَلَا تَذَرُنَّ وَدّٗا وَلَا سُوَاعٗا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ
وَنَسۡرٗا ﴿٢٣﴾ وَقَدۡ أَضَلُّواْ كَثِيرٗاۖ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَٰلٗا ﴿٢٤﴾
مِّمَّا خَطِيٓـَٰٔتِهِمۡ أُغۡرِقُواْ فَأُدۡخِلُواْ نَارٗا فَلَمۡ يَجِدُواْ لَهُم مِّن دُونِ
ٱللَّهِ أَنصَارٗا ﴿٢٥﴾ وَقَالَ نُوحٞ رَّبِّ لَا تَذَرۡ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ
دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرۡهُمۡ يُضِلُّواْ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓاْ إِلَّا فَاجِرٗا
كَفَّارٗا ﴿٢٧﴾ رَّبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيۡتِيَ مُؤۡمِنٗا
وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۖ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارَۢا ﴿٢٨﴾



﴿١١﴾ دێ بارانێ ل هەوە زێدەکەت، و دێ بارانێت
بۆش و ل دویفئێك بۆ هەوە بارینیت. ﴿١٢﴾ و دێ
مال و زارۆکان ل هەوە زێدە کەت، و دێ هەوە ب
چەم و باغ ئێخیت، و دێ ڕویبارێت ئاڤێ دەتە هەوە.
﴿١٣﴾ هەوە خێرە هوین ب دورستی ژ خودایێ خۆ
ناترسن، و قەدر و مەزناتیا هێژاییی وی بۆ نادانن؟!.
﴿١٤﴾ و وی هوین د چەند قویناخاندا یێت داین
(چپکەکا ئاڤێ، پاشی پرتەکا خوینێ، پاشی پارچەیەکا
گۆشتی و هۆسا...). ﴿١٥﴾ ما هوین دەستهەلاتداریا
خودایێ خۆ د چێکرنا ئەسماناندا نابینن، کا چاوا
حەفت قاتێت ئەسمانان ل سەرێك نژناندینە.
﴿١٦﴾ و کا چاوا هەیڤ د ئەسمانێ دنیایێدا کریە ڕۆناهی
بۆ ئەردی، و کا چاوا ڕۆژ بۆ هەوە کریە چرایەکێ
گەش. ﴿١٧﴾ و خودێ بابێ هەوە ئادەم ژ ئاخێ چێکر،
و هوین ب دویفئێخستن د ئەردیدا. ﴿١٨﴾ و جارەکا
دی دێ هەوە زڤرینیتەڤە ئەردی، و بێ گۆمان جارەکا
دی دێ هەوە ژ ئەردی دەرئێخیتەڤە بۆ مەحشەرێ.
﴿١٩﴾ و خودێیە بۆ هەوە ئەرد دەشتکری و ڕانایی بۆ
ژینێ. ﴿٢٠﴾ دا هوین بشێن بۆ خۆ ڕێکێت بەرفرەهـ بۆ هاتن و چۆنێ و کاروانێت خۆ، د ئەردیدا ببینن.
﴿٢١﴾ نووحی گۆت: خودێوۆ وان گوهداریا من نەکر و ب دویفزەنگین و گرەگر و کەنکەنەیێت خۆ کەڤتن،
ئەوێت مال و زارۆکێت وان ژ سەردابرن و خوسارەتییێ پێڤەتر ل وان زێدە نەکری. ﴿٢٢﴾ و پیلان و ئۆیینێت
مەزن گێڕان. ﴿٢٣﴾ و گۆتنە دویکەڤتییێت خۆ: پەرستییێت خۆ نەهێلن، و وەدد و سوواع و (یەغووسی) و
یەعووق و نەسری نەهێلن (ئەڤە بوتێت وان بوون). ﴿٢٤﴾ و ڤان کەنکەنە و گرەگران گەلەك مرۆڤ یێت د
سەردابرین، ژ بەر ڤێ چەندێ [خودێوۆ] تو ژ خوسارەتی و گومڕاییێ پێڤەتر ل وان زێدە نەکە. ﴿٢٥﴾ ژ بەر
خرابکاری و گونەهکاریا وان، مە ئەو د تۆفانێدا خەندقاندن - پاشی دێ وان کەینە د ئاگریدا - و وان ژ بلی
خودێ کەس نەدیت وان ژ تۆفانێ قورتال بکەت. ﴿٢٦﴾ نووحی گۆت: خودێوۆ کەتێ ژ گاوران نەهێلە، ل
سەر ڕوییێ ئەردی. ﴿٢٧﴾ ئەگەر تو وان بهێلی دێ بەندەیێت تە د سەردابەن، و یێ ژ وان ژی ببیت دێ هەر
یێ خرابکار و گاور بیت. ﴿٢٨﴾ خودێوۆ تو گونەهێت من ژێ ببە، و یێت دەیبابێت من و هەر کەسێ بێتە د
مالا مندا ژی ژ خودان باوەران، چ ژن چ مێر.. و ژ زیانێ و هیلاکێ پێڤەتر نەدە بەر زۆردار و گاوران.

## سُورَةُ الجِنِّ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحزب ٥٨

قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسۡتَمَعَ نَفَرٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا
عَجَبٗا ١ يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلرُّشۡدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦۖ وَلَن نُّشۡرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدٗا ٢
وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةٗ وَلَا وَلَدٗا ٣ وَأَنَّهُۥ كَانَ
يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطٗا ٤ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلۡإِنسُ
وَٱلۡجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ٥ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٞ مِّنَ ٱلۡإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٖ
مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَزَادُوهُمۡ رَهَقٗا ٦ وَأَنَّهُمۡ ظَنُّواْ كَمَا ظَنَنتُمۡ أَن لَّن يَبۡعَثَ
ٱللَّهُ أَحَدٗا ٧ وَأَنَّا لَمَسۡنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدۡنَٰهَا مُلِئَتۡ حَرَسٗا
شَدِيدٗا وَشُهُبٗا ٨ وَأَنَّا كُنَّا نَقۡعُدُ مِنۡهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمۡعِۖ فَمَن
يَسۡتَمِعِ ٱلۡأٓنَ يَجِدۡ لَهُۥ شِهَابٗا رَّصَدٗا ٩ وَأَنَّا لَا نَدۡرِيٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ
بِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ أَرَادَ بِهِمۡ رَبُّهُمۡ رَشَدٗا ١٠ وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ
وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَۖ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدٗا ١١ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعۡجِزَ
ٱللَّهَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَن نُّعۡجِزَهُۥ هَرَبٗا ١٢ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعۡنَا ٱلۡهُدَىٰٓ
ءَامَنَّا بِهِۦۖ فَمَن يُؤۡمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخۡسٗا وَلَا رَهَقٗا ١٣



## سۆرەتا جن

### ل مەكەهێ هاتیە خوارێ (٢٨) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ بێژە ملەتێ خۆ خودێ تەعالا وەحی بۆ من هنارت كو كۆمەكا ئەجنەیان گوهداریا قورئانێ كرن و باوەری پێ ئینان و موسلمان بوون، و پشتی زڤرینە ناڤ ملەتێ خۆ گۆتنە وان: مە گول قورئانەكا نەدیتی [ئانكو وەكی وێ نەهاتیە گولێ بوون و نەهاتیە دیتن] و كارلێكەر بوو. ﴿٢﴾ بەرێ مرۆڤی ددەتە ڕاستیێ و ڕۆناهیێ، مە باوەری پێ ئینا كو كتێبا خودێیە، و ئەم ژ ئەڤرۆ پێڤە چو هەڤپشكان بۆ خودێ چێ ناكەین. ﴿٣﴾ بێ گۆمان خودێ یێ پاك و بلند و مەزنە، و چو ژن و زارۆك بۆ خۆ نەگرتینە. ﴿٤﴾ بێ فامێ مە (كو شەیتانە) تشتێ نەلائیق و نەهەژی [و دویری ڕاستیێ] د دەرهەقێ خودێدا دگۆت. ﴿٥﴾ و مە هزر دكر ئەجنە و مرۆڤ چو درەوان د ڕاستا خودێدا ناكەن. ﴿٦﴾ و هندەك مرۆڤ هەبوون، پارستن ژ ئەجنەیان دخواستن، و ئەجنەیان ئەو پتر سەردابرن و پتر وەستاندن. ﴿٧﴾ و وان مرۆڤان ژی وەكی هەوە ئەو هزرە دكر، خودێ كەسێ پشتی مرنێ ساخ ناكەت. ﴿٨﴾ ئەم چۆین دا بگەهینە ئەسمانی و گوهێ خۆ بدەینە ملیاكەتان، مە دیت ئەسمان یێ تژی زێرەڤان و نۆبەدارە [ژ ملیاكەتان]، و تژی ستێرە [ملیاكەت د وان وەردكەن یێ گوهداریا وان بكەت]. ﴿٩﴾ بەری نوكە مە ل ئەسمانان جهـ هەبوون بۆ گوهداریێ، و هەر ئێكێ ڤێ گاڤێ گوهداریێ بكەت، دێ بینیت ستێرێت د ڕێكێدا و ل بەر د ڕاوەستاینە. ﴿١٠﴾ و ئەم ئەجنە نوزانین كا بۆچی خودێ هندە زێرەڤان و نۆبەدار داناینە د ئەسماناندا، ئەرێ خودێ دڤێت خەلكێ ئەردی بئێشینیت یان بۆ خێرا وانە. ﴿١١﴾ و ژ مە یێت هەین موسلمان و نەموسلمان، و ئەم گەلەك ڕێك و ڕێبازین. ﴿١٢﴾ و مە دزانی خودایێ مە ل سەر مە یێ دەستهەلاتدارە، هەر جهێ ئەم لێ بین ئەم نەشێین ژ ئێزایا وی قورتال ببین. ﴿١٣﴾ وەختێ مە قورئان گولێ بوویی ئێكسەر مە باوەری پێ ئینا و ئەم موسلمان بوویین، و هەر كەسێ باوەریێ بینیت بلا پشت ڕاست ببیت، نە خێرێت وی كێم دبن و نە گونەهێت وی پتر لێ دئێن.

وَأَنَّا مِنَّا ٱلۡمُسۡلِمُونَ وَمِنَّا ٱلۡقَٰسِطُونَۖ فَمَنۡ أَسۡلَمَ فَأُوْلَٰٓئِكَ
تَحَرَّوۡاْ رَشَدٗا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا ٱلۡقَٰسِطُونَ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبٗا ﴿١٥﴾
وَأَلَّوِ ٱسۡتَقَٰمُواْ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسۡقَيۡنَٰهُم مَّآءً غَدَقٗا ﴿١٦﴾ لِّنَفۡتِنَهُمۡ
فِيهِۚ وَمَن يُعۡرِضۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِۦ يَسۡلُكۡهُ عَذَابٗا صَعَدٗا ﴿١٧﴾ وَأَنَّ
ٱلۡمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا ﴿١٨﴾ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ
يَدۡعُوهُ كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيۡهِ لِبَدٗا ﴿١٩﴾ قُلۡ إِنَّمَآ أَدۡعُواْ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ
بِهِۦٓ أَحَدٗا ﴿٢٠﴾ قُلۡ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا رَشَدٗا ﴿٢١﴾ قُلۡ إِنِّي
لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٞ وَلَنۡ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَٰغٗا
مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦۚ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ
خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٢٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوۡاْ مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعۡلَمُونَ
مَنۡ أَضۡعَفُ نَاصِرٗا وَأَقَلُّ عَدَدٗا ﴿٢٤﴾ قُلۡ إِنۡ أَدۡرِيٓ أَقَرِيبٞ مَّا تُوعَدُونَ
أَمۡ يَجۡعَلُ لَهُۥ رَبِّيٓ أَمَدًا ﴿٢٥﴾ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ
أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ
يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا ﴿٢٧﴾ لِّيَعۡلَمَ أَن قَدۡ أَبۡلَغُواْ رِسَٰلَٰتِ
رَبِّهِمۡ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيۡهِمۡ وَأَحۡصَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ عَدَدَۢا ﴿٢٨﴾





﴿١٤﴾ پشتی مە قورئان گولیێ بوویی هندەك ژ مە
موسلمان بوون و باوەری ب پێغەمبەری ئینان، و
هندەك ڤەدەربوون و باوەری نەئینان، و ئەوێت
باوەری ئینایین ئەو ب سەر ڕێکا ڕاست هەلبوون.
﴿١٥﴾ و ئەوێت باوەری نەئینایین دێ بنە داردوویێ
دۆژەهێ. ﴿١٦﴾ و ئەگەر ئەوێت گاوربوویین ڕێکا
حەقییێ گرتبانە و موسلمان بووبانە، ئەم دا ڕزقێ وان
بەرفرەهـ کەین. ﴿١٧﴾ دا وان پێ بجەڕبینن و هەچیێ
گوهداریا خودایێ خۆ نەکەت، خودێ دێ وی
ئێخیتە د ئیزایەکا بێ ڤەبڕین و بێ ڤەهەسیاندا. ﴿١٨﴾ و
بێ گۆمان مزگەفت بەس جهێ هندێنە خودایێ مەزن
ب تنێ تێدا بێتە پەرستن و کەسێ دی تێدا نەپەرێسن.
﴿١٩﴾ وەختێ بەندەیێ خودێ (موحەمەد) ڕابوویی و
بانگ بۆ پەیاما خودێ هلدێرایی، ئەجنە لێ کۆمبوون
و نێزیك بوو بچنە سەر ملێت ئێك، هندی هند لێ
کۆم بوون، دا گوهێ خۆ بدەنە قورئانێ. ﴿٢٠﴾ [هەی
موحەمەد] بێژە [وان گاورێت ژ تە دخوازن تو دینێ
خۆ بهێلی، یان دبێژن ئەڤە موحەمەد چ دکەت]: ئەز
بەس خودایێ خۆ دپەرێسم و ئەز چو هەڤپشکان بۆ خودایێ خۆ چێ ناکەم. ﴿٢١﴾ بێژە: [بەس من خێرا
هەوە دڤیا بەلێ هوین نوزانن] ڤێجا ئەو خێرا من بۆ هەوە دڤێت ئەز نەشێم بگەهینمە هەوە، و ئیزایا هوین
هەژی ئەز نەشێم بینمە سەرێ هەوە. ﴿٢٢﴾ بێژە: ژ بلی خودێ من چو مەفەر نینن، و من چو کەس نینە ژ بلی
خودێ ئەز هەوارا خۆ بگەهینمێ و من بحەوینیت [ئەگەر ئەز پەیاما خودێ نەگەهینم یان نەگوهداریا وی
بکەم]. ﴿٢٣﴾ چو جهـ من ناحەوینن ئەگەر ئەز پەیاما خودێ ب دورستی و بێ کێماسی نەگەهینمە هەوە،
و هەر کەسێ نەگوهداریا خودێ و پێغەمبەرێ وی بکەت جزایێ وی ئاگرێ دۆژەهێیە، دێ هەروهەر
تێدا بیت. ﴿٢٤﴾ ڤێجا گاڤا ڕۆژا پێ دئێنە ترساندن دبینن کو ڕۆژا قیامەتییە، ئەها هنگی دێ زانن کا کی
ژ وان کێم پشت و کێم هەژمارە [ئەو یان موسلمان]. ﴿٢٥﴾ بێژە: ئەز نوزانم کا ڕۆژا قیامەتێ، ئەوا هوین
پێ دئێنە ترساندن یا نێزیکە یان نە [بەلێ دێ هەر ئێت]. ﴿٢٦﴾ خودێیە زانایێ تشتێ نەبەرچاڤ، و غەیبا
خۆ بۆ کەسێ ئاشکەرا ناکەت. ﴿٢٧﴾ بۆ وی نەبیت یێ ئەو بۆ پەیاما پێغەمبەراتییێ هەلبژێریت، خودێ
ملیاکەتان دهنێریت، دا ملیاکەت زێرەڤانییێ ل بەر سینگێ وی و ل پشت وی بکەن، و ژ ئەجنەیان بپارێزن.
﴿٢٨﴾ [خودێ تەعالا پێغەمبەرێت خۆ، ب ملیاکەتێت خۆ، ژ ئەجنەیان دپارێزیت] دا بشێن پەیاما خودایێ
خۆ بگەهینن، و خودێ دزانیت کا چ ل نك وان هەیە، و ئاگەهـ ژ هویر و گران هەیە، و چو ل بەر بەرزە
نابیت.

سُورَةُ المُزَّمِّلِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ١ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ٢ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ٣
أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ٤ إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلٗا
ثَقِيلًا ٥ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا ٦ إِنَّ لَكَ فِي
ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا ٧ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا ٨
رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا ٩ وَٱصۡبِرۡ
عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهۡجُرۡهُمۡ هَجۡرٗا جَمِيلٗا ١٠ وَذَرۡنِي وَٱلۡمُكَذِّبِينَ
أُوْلِي ٱلنَّعۡمَةِ وَمَهِّلۡهُمۡ قَلِيلًا ١١ إِنَّ لَدَيۡنَآ أَنكَالٗا وَجَحِيمٗا ١٢
وَطَعَامٗا ذَا غُصَّةٖ وَعَذَابًا أَلِيمٗا ١٣ يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ
وَكَانَتِ ٱلۡجِبَالُ كَثِيبٗا مَّهِيلًا ١٤ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ رَسُولٗا شَٰهِدًا
عَلَيۡكُمۡ كَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ رَسُولٗا ١٥ فَعَصَىٰ فِرۡعَوۡنُ ٱلرَّسُولَ
فَأَخَذۡنَٰهُ أَخۡذٗا وَبِيلٗا ١٦ فَكَيۡفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرۡتُمۡ يَوۡمٗا
يَجۡعَلُ ٱلۡوِلۡدَٰنَ شِيبًا ١٧ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرُۢ بِهِۦۚ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَفۡعُولًا ١٨
إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ١٩



## سۆرەتا موزەمیل

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٢٠) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ هەی ئەو كەسێ جلكێت خۆ د خۆ وەركرین.
﴿٢﴾ شەڤێ هەمییێ رابە نڤێژان بكە، كێمەك تێ
نەبیت. ﴿٣﴾ نیڤەكا شەڤێ یان كێمتر ژێ. ﴿٤﴾ یان ژ
نیڤێ زێدەتر، و قورئانێ هێدی (ل سەر خۆ) بخوینە.
﴿٥﴾ ئەم دێ ئاخڤتنەكا گران ب سەر تەدا ئینین و
دارێژین. ﴿٦﴾ رابوونا شەڤێ چێتر دل و دەڤان دكەتە
ئێك، و گۆتنێ سەرراست و دورستتر لێ دكەت.
﴿٧﴾ و د رۆژێدا تە دەلیڤەیەكا درێژ یا هەی بۆ
ب جهئینانا كاروباران. ﴿٨﴾ ب شەڤ و رۆژ ناڤێ
خودایێ خۆ بینە، و خۆ بۆ پەرستنا وی ڤالا بكە.
﴿٩﴾ خودایێ رۆژهەلات و رۆژئاڤایێ، چو پەرستی
ییێت راست و دورست ژ وی پێڤەتر نینن، ئەوی بۆ
خۆ بكە پشت. ﴿١٠﴾ بێنا خۆ فرەهـ بكە ل سەر وی
تشتێ دبێژن، و ب جوامێری پشتا خۆ بدە وان. ﴿١١﴾ تو ڤان بێ باوەریێت قیامەتێ درەو ددانن و حالخۆش
بهێلە ب هیڤیا منڤە، ئەز دێ جزایێ وان دەمێ، پیچەكێ بێنا خۆ ل وان فرەهـ بكە. ﴿١٢﴾ مە قەید و زنجیر
و دۆژهەكا سنجری یا هەی. ﴿١٣﴾ و مە خوارنەك یا هەی، د گەوریا كەسێدا ناچیت، و مە ئیزایەكا ب
ژان و دژوار یا هەی. ﴿١٤﴾ رۆژا ئەرد و چیا دلەرزن، و چیا دبنە گركێت خیزی. ﴿١٥﴾ مە پێغەمبەرەك یێ بۆ
هەوە هنارتی كو رۆژا قیامەتێ شادەییێ ل سەر هەوە بدەت، هەروەكی مە پێغەمبەرەك بۆ فیرعەونی ژی
هنارتی. ﴿١٦﴾ و فیرعەونی گوهداریا پێغەمبەری نەكر، و باوەری پێ نەئینا، مە هنگاڤت، هنگاڤتنەكا دژوار.
﴿١٧﴾ ئەگەر هوین باوەرییێ نەئینن، دێ چاوا خۆ ژ ئیزا و نەخۆشیا رۆژەكێ پارێزن، بچویكان پیر دكەت.
﴿١٨﴾ ژ سەهما وێ رۆژێ، تیك و دەرز دكەڤنە ئەسمانی، و ژڤانێ خودێ ب هاتنا وێ رۆژێ هەر دێ ئێت.
﴿١٩﴾ ئەڤە هەمی بیرئینانەكە، یێ بڤێت ژ بێ ئاگەهـ و نەگوهداران ل خۆ بزڤریت، بلا رێكەكێ ببینیت خۆ
پێ بگەهینتە خودێ (ئەو ژی رێكا باوەرییێیە).

۞إِنَّ رَبَّكَ يَعۡلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٞ
مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحۡصُوهُ فَتَابَ
عَلَيۡكُمۡۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرۡضَىٰ
وَءَاخَرُونَ يَضۡرِبُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَءَاخَرُونَ
يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُۚ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ
ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗاۚ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٖ تَجِدُوهُ
عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٗا وَأَعۡظَمَ أَجۡرٗاۚ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمُۢ ﴿٢٠﴾

سُورَةُ المُدَّثِّرِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمۡ فَأَنذِرۡ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ﴿٤﴾
وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ ﴿٥﴾ وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ ﴿٧﴾ فَإِذَا نُقِرَ
فِي ٱلنَّاقُورِ ﴿٨﴾ فَذَٰلِكَ يَوۡمَئِذٖ يَوۡمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ غَيۡرُ يَسِيرٖ ﴿١٠﴾
ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا ﴿١١﴾ وَجَعَلۡتُ لَهُۥ مَالٗا مَّمۡدُودٗا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ
شُهُودٗا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمۡهِيدٗا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطۡمَعُ أَنۡ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآۖ إِنَّهُۥ
كَانَ لِأٓيَٰتِنَا عَنِيدٗا ﴿١٦﴾ سَأُرۡهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾ إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾





﴿٢٠﴾ خودایێ تە ئاگەهدارە كو تو و هندەك ژ وان
كەسان، ئەوێت د گەل تە [ژ خودان باوەران]
نێزیكی دوسێكێت شەڤێ و جارنا نیڤەكا شەڤێ، و
هندە جاران سێكەكا شەڤێ بۆ شەڤنڤێژان رادبن، و
خودێ درێژاهیا شەڤ و رۆژان ددانیت و دزانیت،
دزانیت هوین نەشێن هەمی وەختێت شەڤێ رابن،
ژ بەر هندێ ل هەوە ناگریت، و هەر وەختێ
هوین رابوون كا هوین چەند دشێن هند بخوینن
(هند نڤێژان بكەن)، دزانیت هندەك ژ هەوە دێ
نەساخ بن، و هندەك ژ هەوە دێ وەغەران كەن ژ
بۆ رزقێ خۆ پەیدا بكەن، و هندەك ژ هەوە د رێكا
خودێدا دێ جیهادێ كەن، و قورئانێ هند بخوینن
[د نڤێژێدا] هندی هەوە پێ چێ ببیت، و نڤێژێت
خۆ بكەن و بارا خودێ ژ مالێ خۆ بدەن، و خێرێ
د رێكا خودێدا بكەن، هەر خێرەكا هوین بۆ خۆ
بكەن هوین دێ ل دەڤ خودایێ خۆ چێتر و ب
خێرتر بینن، ژ خودێ بخوازن ل گونەهێت هەوە
ببۆریت، بێ گۆمان هەر خودێیە گونەهـ ژێبەر و
دلۆڤان.

## سۆرەتا مودەثر

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٥٦) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ هەی كەسێ تە جلكێت خۆ ب سەر خۆ دادایین. ﴿٢﴾ رابە و كارێ خۆ بكە و خۆ بەرهەڤ بكە،
و خەلكی ئاگەهدار بكە. ﴿٣﴾ و خودایێ خۆ ب تنێ، مەزن بكە [مەزناتییێ ب بال كەسێ دیڤە لێ
نەدە، بەس خودێ یێ مەزنە]. ﴿٤﴾ و جلكێت خۆ بژوین بكە ژ پیساتییێ (ئانكو دلێ خۆ پاقژ بكە).
﴿٥﴾ و خۆ ژ بوت پەرێسییێ دویر بێخە. ﴿٦﴾ و قەنجییێ نەكە منەت ل سەر كەسێ، و قەنجییێ ب ئنیەتا
هندێ نەكە زێدەتر بۆ تە بێتە شوینێ. ﴿٧﴾ ژبۆ خودایێ خۆ، بێنا خۆ ل سەر ئیزا و نەخۆشییێ فرەهـ بكە.
﴿٨﴾ و رۆژا پف ل بۆقێ دئێتە دان. ﴿٩﴾ هنگی رۆژەكا گران و نەخۆشە. ﴿١٠﴾ ل سەر گاوران نەیا ب
ساناهییە. ﴿١١﴾ ژ من و وی ڤەبە، (وەلیدێ كورێ موغیرەیی) یێ من ئەو دایی و ئەو ب تنێ. ﴿١٢﴾ و پاشی
من كرییە خودان ملك و مالەكێ بەرفرەهـ. ﴿١٣﴾ و من هند كور دایینێ، ل دۆر خڕ ببن و هەردەم د گەل
بن. ﴿١٤﴾ و من دنیاداری بۆ سڤك و خۆش كری. ﴿١٥﴾ پشتی ڤێ هەمییێ، چاڤێ وی لێیە ئەز هەر بۆ زێدە
بكەم. ﴿١٦﴾ نەخێر ئەز چویێ دی نادەمێ، نەخێر ئەو بۆ ڤێ قورئانێ گەلەكێ مەژی هشك و سەرڕەق بوو.
﴿١٧﴾ ئەز دێ چاما رەش ئینمە سەرێ وی. ﴿١٨﴾ وی هزرەك بر، ئێك ئینا، ڤیا تشتەكی د دەرهەقێ قورئانێدا
بێژیت.

فَقُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ١٩ ثُمَّ قُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ٢٠ ثُمَّ نَظَرَ ٢١ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ٢٢
ثُمَّ أَدۡبَرَ وَٱسۡتَكۡبَرَ ٢٣ فَقَالَ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ يُؤۡثَرُ ٢٤ إِنۡ هَٰذَآ
إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ ٢٥ سَأُصۡلِيهِ سَقَرَ ٢٦ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ ٢٧
لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ ٢٨ لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ ٢٩ عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ ٣٠ وَمَا جَعَلۡنَآ
أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةٗۙ وَمَا جَعَلۡنَا عِدَّتَهُمۡ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ
لِيَسۡتَيۡقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَيَزۡدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنٗا وَلَا يَرۡتَابَ
ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ
وَٱلۡكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ
وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَمَا يَعۡلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَۚ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ
لِلۡبَشَرِ ٣١ كَلَّا وَٱلۡقَمَرِ ٣٢ وَٱلَّيۡلِ إِذۡ أَدۡبَرَ ٣٣ وَٱلصُّبۡحِ إِذَآ أَسۡفَرَ ٣٤ إِنَّهَا
لَإِحۡدَى ٱلۡكُبَرِ ٣٥ نَذِيرٗا لِّلۡبَشَرِ ٣٦ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَتَقَدَّمَ أَوۡ يَتَأَخَّرَ ٣٧
كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ رَهِينَةٌ ٣٨ إِلَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡيَمِينِ ٣٩ فِي جَنَّٰتٖ
يَتَسَآءَلُونَ ٤٠ عَنِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ٤١ مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ٤٢ قَالُواْ لَمۡ نَكُ
مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ ٤٣ وَلَمۡ نَكُ نُطۡعِمُ ٱلۡمِسۡكِينَ ٤٤ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ
ٱلۡخَآئِضِينَ ٤٥ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤٦ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ ٤٧



﴿١٩﴾ خودێ کوشتی چ گۆت؟. ﴿٢٠﴾ جارەکا دی
خودێ کوشتی چ گۆت، و چاوا گۆت؟ ﴿٢١﴾ جارەکا
دی دا هزرا خۆ. ﴿٢٢﴾ پاشی ناڤچاڤێت خۆ کرنە
گرێ، و خۆ گەلەك تەحل و ترش کر. ﴿٢٣﴾ پاشی
پشت دا باوەرییێ، و خۆ ژ هەقییێ و ڕاستییێ
مەزنتر دیت. ﴿٢٤﴾ گۆت: هەبیت نەبیت ئەڤە
سێرەیەکە ژ بەرێ وەرە، دەست بۆ دەست دئێتە
ڤەگوهاستن. ﴿٢٥﴾ هەبیت نەبیت ئەڤە گۆتنا مرۆڤانە
[نەگۆتنا خودێیە]. ﴿٢٦﴾ دێ وی ئاڤێژنە د ئاگرەکێ
سنجریدا. ﴿٢٧﴾ تو دزانی ئەو ئاگرێ سنجری چییە؟
﴿٢٨﴾ ئاڤاهی د چو ناهێلیت. ﴿٢٩﴾ ژ دویر یا دیارە
بۆ مرۆڤان. ﴿٣٠﴾ نۆزدە زێرەڤان ل سەر د ڕاوەستاینە.
﴿٣١﴾ و مە زێرەڤانێت ئاگرێ دۆژەهێ ژ ملیاکەتان
پێڤەتر چێ نەکرینە، و مە هەژمارا وان ژ بەر هندێ یا
کرییە هندە دا بێ باوەران بجەڕبینین، و دا خودان کتێب
(جوهی و فەلە) پشت ڕاست ببن کو ئەڤ قورئانە یا
ژ نك خودێ هاتی، و دا باوەرییا خودان باوەران پتر
لێ بێت، و دا خودان کتێب و خودان باوەر ب گۆمان
نەکەڤن (ل هەژمارا وان)، و دا ئەوێت دلێ وان گۆمان و دوروییاتی تێدا و گاور بێژن: خودێ چ مەخسەد
ب دیارکرنا ڤێ هەژمارێ هەیە، هۆسا یێ خودێ بڤێت گومڕا دکەت و یێ بڤێت ڕاستەڕێ دکەت، و
کەس نوزانیت کا خودایێ تە چەند لەشکەر هەیە و کا چنە، و ئەڤ ئاگرە (دۆژەهە) ژ دەرس و چامەیان
پێڤەتر نینە بۆ مرۆڤان. ﴿٣٢﴾ نە بلا ل خۆ بزڤرن، سویند ب هەیڤێ. ﴿٣٣﴾ و سویند ب شەڤێ دەمێ ب
تارییا خۆڤە دچیت. ﴿٣٤﴾ و سویند ب سپێدەیێ دەمێ ب ڕۆناهییا خۆڤە دئێت. ﴿٣٥﴾ بێ گۆمان ئەڤ
دۆژەهە ئێزا و ئاتافەکا مەزنە، چاوا ژێ ناترسن و ترانەیان پێ دکەن. ﴿٣٦﴾ ئەڤ ئاگرە ئاگەهدارکرنە بۆ
مرۆڤان، دا گوهدارییا فەرمانێت خودێ بکەن. ﴿٣٧﴾ بۆ یێ بڤێت بێتە پێش ب کرنا خێرێ و باشییێ، یان
ڤەمینیت ب کرنا گونەهان. ﴿٣٨﴾ هەر کەسەك د گەرەوا کارێ خۆدایە و پێڤە گرێدایییە [ژێ دەرناکەڤیت
هەتا مافێت ل سەر، ژێ نەئێنە ستاندن]. ﴿٣٩﴾ ئەو تێ نەبن ئەوێت کتێبا خۆ ب دەستێ ڕاستێ وەردگرن.
﴿٤٠﴾ د بەحەشتاندا پسیارا ئێك و دو دکەن. ﴿٤١﴾ ژ حالێ گونەهکاران. ﴿٤٢﴾ [دبێژنە گونەهکاران]: چ
هوین کرنە د [ڤێ] دۆژەهێدا. ﴿٤٣﴾ [گونەهکار] دێ بێژن: د دنیایێدا مە نڤێژ بۆ خودایێ خۆ نەدکرن.
﴿٤٤﴾ و مە نان نەددا فەقیر و ژاران. ﴿٤٥﴾ مە ژی وەکی خەلکی خۆ دهاڤێتە هەمی کاران، چ باش چ خراب.
﴿٤٦﴾ و مە د دنیایێدا باوەری ب ڕۆژا جزادانێ نەدئینا. ﴿٤٧﴾ ئەم د هۆسا بووییین، هەتا مرن ب سەر مەدا
هاتی.

﴿٤٨﴾ مەهـدەرا مەهدەرچیـیان، چـو مفایـی ناگەهینیتە
وان. ﴿٤٩﴾ بۆچـی پشـتا خـۆ ددەنـە قورئانـێ و گوهـێ
خـۆ نادەنـێ. ﴿٥٠﴾ دێ بێـژی كەرێـت ڕاتەقیایـینە.
﴿٥١﴾ ژ شـێرەكی یـێت ڕەڤـین. ﴿٥٢﴾ بەلـێ هـەر ئێكـی
ژ وان، دڤیـا بـۆ وی ژی كتێبـەك هاتبایـە، هەروەكـی بـۆ
پێغەمبـەری هاتی. ﴿٥٣﴾ نەخێر بلا ل وێ هیڤیـیێ نەبن،
بەلـێ ب ڕاسـتی وان بـاوەری ب ڕۆژا قیامەتـێ نینـە و
ژێ ناترسـن. ﴿٥٤﴾ نەخـێر وەنینـە وەكـی ئـەو د ڕاسـتا
قورئانێـدا دبێـژن، قورئـان ئاخفتنـا خودێیـە، و بیرئینان و
شـیرەتە. ﴿٥٥﴾ و یـێ بڤێت دێ باوەرییێ پێ ئینیت، و
بۆ خـۆ شـیرەتان ژێ وەرگریـت. ﴿٥٦﴾ و بـەس ئەو دێ
بـۆ خۆ شـیرەتان ژێ وەرگریت یـێ خودێ بـۆ ڤیایی، و
هـەر خودێیە خودانێ پارێزكارییێ و خودانێ گونەهـ
ژێبرنێ.



فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾ فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ
مُعْرِضِينَ ﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴿٥٠﴾ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍۭ ﴿٥١﴾
بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ﴿٥٢﴾ كَلَّا ۖ بَل
لَّا يَخَافُونَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴿٥٣﴾ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ ﴿٥٤﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿٥٥﴾ وَمَا
يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾

سُورَةُ القِيَامَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحِزْبُ ٥٨
لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ أَيَحْسَبُ
ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴿٣﴾ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ﴿٤﴾ بَلْ
يُرِيدُ ٱلْإِنسَٰنُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ ﴿٥﴾ يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿٦﴾ فَإِذَا بَرِقَ
ٱلْبَصَرُ ﴿٧﴾ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ﴿٨﴾ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴿٩﴾ يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ
يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ﴿١٠﴾ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ ﴿١٢﴾ يُنَبَّؤُا۟
ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴿١٣﴾ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾
وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴿١٥﴾ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا
جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾



## سۆرەتا ئەلقیامە

**ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٤٠) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ سـویندێ ب ڕۆژا ڕابوونـێ و دوییاهیـیێ دخۆم. ﴿٢﴾ و سـویند ب نەفسـا خێرخواز و زێـدە لۆمەكاری خۆ
[لۆمـەی خـۆ دكەت ل سـەر خەلەتیـێ، كا بۆچی كر، و ل سـەر باشـییێ كا بۆچـی نەكر]. ﴿٣﴾ ئـەرێ ما مرۆڤ
هـزر دكـەت ئەم نەشـێین جـارەكا دی هەسـتیكێت وی لێـك بدەیـن. ﴿٤﴾ بەلێ.. ئەم دشـێین سـەرتلێت وی ژی
وەكـی بـەرێ چـێ بكەیـن. ﴿٥﴾ مرۆڤـی دڤێت ب ڤـێ ئینكاركرنێ چو د دلـێ خـۆدا نەهێلیت، و ڕێكا خرابیـیێ
ل بـەر هـەر یـا ڤەكـری بیت. ﴿٦﴾ دبێژیـت كا كەنگـی ڕۆژا قیامەتـێ دێ ئێـت. ﴿٧﴾ وەختێ چاڤ زیـق دبن، ژ
ترسـاندا نـە بێن نـە بچـن. ﴿٨﴾ و وەختـێ هەیڤ نەما، غەیـری و تـاری بـوو. ﴿٩﴾ و وەختـێ ڕۆژ و هەیڤ ڤێك
دكەڤـن و دگەهنـە ئێـك. ﴿١٠﴾ ئەهـا هنگـی مـرۆڤ دێ بێژیـت كیڤـە بڕەڤـم. ﴿١١﴾ نەخـێر وی چـو ڕێـك نینـن.
﴿١٢﴾ وێ ڕۆژێ زڤڕیـن بـۆ نـك خودێیـە، وێ ڕۆژێ هەمـی ل دەڤ خـودێ دێ ئێـورن. ﴿١٣﴾ وێ ڕۆژێ كار و
كریارێـت مرۆڤـی هەمـی، هویـر و گـر، دێ بۆ مرۆڤـی ئێنە گۆتـن، و مـرۆڤ دێ بینیت. ﴿١٤﴾ مـرۆڤ ب خۆ ل
سـەر خـۆ دێ بیتـە شـاهد. ﴿١٥﴾ ڤێجا چەنـد هەجەتـان ژی بگریت فایـدێ وی ناكـەن. ﴿١٦﴾ [هـەی پێغەمبەر]
ئەزمانـێ خـۆ ب لـەز ل قورئانـێ نەگەڕینـە ژ ترسـا ژ بیركرنێ. ﴿١٧﴾ ب ڕاسـتی ل سـەر مەیـە ئەم ڤـێ قورئانێ د
سـینگێ تـەدا كـۆم بكەین، و بێخینە سـەر ئەزمانێ تـە كو تو بخوینـی. ﴿١٨﴾ ڤێجا ئەگـەر مە بۆ تـە خواند، گوهێ
خـۆ بـدە خواندنـێ [و ژ بـەر خواندنـا وێ ئەزمانێ خـۆ نەلڤلڤینە و بـێ دەنگ بە، پشـتی ئەم بۆ تە دخوینین پاشـی
بخوینـە، هەروەكـی بۆ تە هاتیـیە خواندن ئەم دێ ل سـەر تە سـاناهی و سـڤك كەین]. ﴿١٩﴾ پاشـی ل سـەر مەیە
ئـەم بۆ تە ئاشـكەرا بكەیـن، و ڕۆنكرنا وێ نیشـا تـە بدەین.

كَلَّا بَلۡ تُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ ٱلۡأٓخِرَةَ ﴿٢١﴾ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ
نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ ﴿٢٣﴾ وَوُجُوهٞ يَوۡمَئِذِۭ بَاسِرَةٞ ﴿٢٤﴾ تَظُنُّ أَن يُفۡعَلَ
بِهَا فَاقِرَةٞ ﴿٢٥﴾ كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ﴿٢٦﴾ وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ ﴿٢٧﴾ وَظَنَّ أَنَّهُ
ٱلۡفِرَاقُ ﴿٢٨﴾ وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ﴿٢٩﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمَسَاقُ ﴿٣٠﴾
فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ
يَتَمَطَّىٰٓ ﴿٣٣﴾ أَوۡلَىٰ لَكَ فَأَوۡلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوۡلَىٰ لَكَ فَأَوۡلَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَيَحۡسَبُ
ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ أَلَمۡ يَكُ نُطۡفَةٗ مِّن مَّنِيّٖ يُمۡنَىٰ ﴿٣٧﴾
ثُمَّ كَانَ عَلَقَةٗ فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنۡهُ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ
وَٱلۡأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ أَلَيۡسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰ ﴿٤٠﴾

سكتة لطيفة على النون

## سُورَةُ الإِنسَانِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقۡنَا
ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٍ أَمۡشَاجٖ نَّبۡتَلِيهِ فَجَعَلۡنَٰهُ سَمِيعَۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا
هَدَيۡنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ
وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا ﴿٤﴾ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ يَشۡرَبُونَ مِن كَأۡسٖ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾





﴿٢٠﴾ نەخێر نەكو هوین ل هاتنا رۆژا قیامەتێ ب شكن، بەلێ هوین ل دنیایێ ب لەزن [هوین گەلەك حەژێ دكەن]. ﴿٢١﴾ وهوین و پشتا خۆ ددەنە ئاخرەتێ. ﴿٢٢﴾ وێ رۆژێ هندەك سەروچاف د گەش و خۆشن. ﴿٢٣﴾ بەرێ وان یێ ل خودایێ وان و خودایێ خۆ دبینن. ﴿٢٤﴾ و هندەك سەروچاف وێ رۆژێ د تەحل و ترشن. ﴿٢٥﴾ دزانن كو ئاتافەكا مەزن دێ ب سەر واندا ئێت، و پشتێ ل وان شكێنیت. ﴿٢٦﴾ نەخێر وەنەكەن و ل خۆ بزڤرن، چ گاڤا رۆح گەهشتە قولقولكا ستوی، و مرۆڤ كەڤتە د سەكەراتێدا. ﴿٢٧﴾ و خەلكێ مالا وی گۆت: كا كی هەیە دەرمانەكی یان چارەیەكێ بۆ ببینیت. ﴿٢٨﴾ و پشت راست بوو كو مرنە، و دێ كەس و كارێت خۆ هێلیت. ﴿٢٩﴾ و پیێت وی تێك ئالیان. ﴿٣٠﴾ ئەها هنگی بەر ب خودێڤە دێ ئێنە ئاژۆتن. ﴿٣١﴾ نە [وی] باوەری ب قورئانێ ئینا، و نە [وی] نڤێژ كرن. ﴿٣٢﴾ بەلێ درەو دانان، و پشت دا وان. ﴿٣٣﴾ و [نە بەس ئەڤە وی كر] پاشی قەبە چۆ مالا خۆ. ﴿٣٤﴾ ئیزا ل سەر ئیزایێ بۆ تە بیت [هەی بێ باوەر]. ﴿٣٥﴾ پاشی ل سەر ئیزایێ بۆ تە بیت [هەی بێ باوەر]. ﴿٣٦﴾ ئەرێ مرۆڤ هزر دكەت، هەما دێ هۆسا مینیت، بێ حساب د گەل بێتەكرن. ﴿٣٧﴾ ما نە چپكەكا ئاڤێ بوو، كەڤتییە د مالبچویكیدا؟. ﴿٣٨﴾ پاشی بوو خوینپارە، پاشی خودێ چێكر و دورستكر، دەست و پێ و چاڤ و گوهـ دانێ. ﴿٣٩﴾ و ژن و مێر هەر ژ وی چێكرن [ئانكو كچ و كورِ ب دویڤ ئێخستن].
﴿٤٠﴾ ئەرێ ما ئەوێ هوین هۆسا داین، نەشێت مریان ساخ بكەتەڤە؟.

## سۆرەتا ئینسان

**ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٣١) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ ب راستی و بێ گۆمان دەمەكێ درێژ یێ ب سەر مرۆڤیدا بۆری، و ئەو نەبوو، و یێ نەنیاس بوو. ﴿٢﴾ ب راستی مە مرۆڤ ژ چپكەكا ئاڤا ژن و مێران یا تێكەل یێ چێكری، دا بجەرببینین كا پاشی دێ چ كار و كریاران كەت، و مە ب گوهـ و چاڤ ئێخست. ﴿٣﴾ بێ گۆمان مە رێك یا بۆ رۆنكری، ڤێجا یان دێ یێ شوكوردار بیت و نیعمەت و كەرەمێت خودێ د گەل كرین ژ بیر ناكەت، یان دێ ژ رێ دەركەڤیت و دێ یێ بێ نان و خوێ بیت، و رێكا خرابییێ دێ گریت. ﴿٤﴾ مە بۆ گاور و بێ باوەران زنجیر و قەید و ئاگرێ سنجری یێ بەرهەڤكری. ﴿٥﴾ بێ گۆمان مرۆڤێت قەنج و خودان باوەر، دێ ژ پەرداغەكا تێكەلی كافورێ ڤەخۆن.

عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفۡجِيرٗا ﴿٦﴾ يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ وَيَخَافُونَ
يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا ﴿٧﴾ وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا
وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ
وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوۡمًا عَبُوسٗا قَمۡطَرِيرٗا ﴿١٠﴾ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ
ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمِ وَلَقَّىٰهُمۡ نَضۡرَةٗ وَسُرُورٗا ﴿١١﴾ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُواْ جَنَّةٗ
وَحَرِيرٗا ﴿١٢﴾ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۖ لَا يَرَوۡنَ فِيهَا شَمۡسٗا
وَلَا زَمۡهَرِيرٗا ﴿١٣﴾ وَدَانِيَةً عَلَيۡهِمۡ ظِلَٰلُهَا وَذُلِّلَتۡ قُطُوفُهَا تَذۡلِيلٗا ﴿١٤﴾
وَيُطَافُ عَلَيۡهِم بِـَٔانِيَةٖ مِّن فِضَّةٖ وَأَكۡوَابٖ كَانَتۡ قَوَارِيرَا۠ ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٖ
قَدَّرُوهَا تَقۡدِيرٗا ﴿١٦﴾ وَيُسۡقَوۡنَ فِيهَا كَأۡسٗا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيۡنٗا فِيهَا
ثلاثة أرباع الحزب ٥٨
تُسَمَّىٰ سَلۡسَبِيلٗا ﴿١٨﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيۡتَهُمۡ حَسِبۡتَهُمۡ
لُؤۡلُؤٗا مَّنثُورٗا ﴿١٩﴾ وَإِذَا رَأَيۡتَ ثَمَّ رَأَيۡتَ نَعِيمٗا وَمُلۡكٗا كَبِيرًا ﴿٢٠﴾ عَٰلِيَهُمۡ ثِيَابُ
سُندُسٍ خُضۡرٞ وَإِسۡتَبۡرَقٞۖ وَحُلُّوٓاْ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٖ وَسَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ
شَرَابٗا طَهُورًا ﴿٢١﴾ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمۡ جَزَآءٗ وَكَانَ سَعۡيُكُم مَّشۡكُورًا ﴿٢٢﴾
إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ تَنزِيلٗا ﴿٢٣﴾ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعۡ
مِنۡهُمۡ ءَاثِمًا أَوۡ كَفُورٗا ﴿٢٤﴾ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ﴿٢٥﴾



﴿٦﴾ ئەڤ ئاڤە کانییەکە خودێناس ژێ ڤەدخۆن،
مرۆڤ د دویڤ خۆڕا ڕادکێشیت کیڤە بچیت دێ
د دویڤڕا ئێت، و چاوا بڤێت دێ وەسا دەربیت.
﴿٧﴾ ئەڤ خودێناسە ئەون ئەوێت تشتێ ئێخستینە
سەر خۆ ب جهـ دکەن، و ژ ڕۆژەکێ دترسن تەنگاڤی
و نەخۆشیا وێ یا تەڤاییە، کەس ژێ ڤەدەر نینە.
﴿٨﴾ و ئەو خوارنا ئەو حەژێ دکەن و هەوجە،
ددەنە هەژار و سێوی و دیلان. ﴿٩﴾ دبێژنە وان: ئەم
ڤێ خوارنێ د ڕێیا خودێدا ددەینە هەوە، مە چو
بەرانبەر ژ هەوە نەڤێت، نە خەلات و نە شوکورداری.
﴿١٠﴾ ئەم ڤێ چەندێ دکەین چونکی ئەم ژ خودایێ
خۆ دترسین، دا مە ژ ڕۆژەکا ترش و تەحل و
گران بپارێزیت. ﴿١١﴾ ژ بەر باشیا وان، خودێ
ئەو ژ نەخۆشیا وێ ڕۆژێ پاراستن، و ڕۆناهی و
گەشاتی ئێخستە د سەر و چاڤێت واندا. ﴿١٢﴾ و ژ
بەر بێنفرەهیا وان، ب بەحەشتێ و ئارمویشی
خەلاتکرن. ﴿١٣﴾ سەر تەختێت نەرم و خۆش و
چارچەڤکری د بەحەشتێدا پالداینە، نە گەرمێ دبینن
نە سەرماییێ. ﴿١٤﴾ و سیبەرا داروبارێ بەحەشتێ نێزیکی وانە، و فێقی و بەرێ وان داروباران ییێ بەردەستە.
﴿١٥﴾ و خزمەتکار، ئامانێت زیڤی و پەرداغێت تەنك و زەلال، ل بەر وان دگێڕن. ﴿١٦﴾ ئامان ژ زیڤینە و
بەس تێرا وان یا تێ هەی نە کێم نە زێدە. ﴿١٧﴾ و ئەڤ خودان باوەرە د بەحەشتێدا ژ پەرداغەکێ ڤەدخۆن،
تێکەلی زنجەبیلێیە. ﴿١٨﴾ ژ کانییەکێ ڤەدخۆن دبێژنێ سەلسەبیل [ئانکو خۆش و نەرم و شرین و سڤك].
﴿١٩﴾ و هندەك خزمەتکارێت بچویك ل بەر خزمەتا وان دگەڕن، هەروهەر تێدانە، و هەروەکی خۆ دمینن،
ئەگەر تو ببینی دێ بێژێ لۆلۆ و مراری ییێت بەلاڤن. ﴿٢٠﴾ و ئەگەر تو خۆشییێت بەحەشتێ ببینی، دێ بینی
ملکەکێ بەرفرەهە، و بێ حسێب خۆشینە. ﴿٢١﴾ و جلکێت ب خەمل و کەسك ل بەر وانە، ژ ئارمویشێ
تەنك و ستویر، و بازنێت زیڤی دکەنە دەستێت خۆ، و خودایێ وان ڤەخوارنەکا زەلال و پاقژ دێ دەتە وان.
﴿٢٢﴾ [خودایێ مەزن دێ بێژتە وان]: ئەها ئەڤە خەلاتێ بزاڤا هەوەیە، مە بزاڤا هەوە قەبویل کر و مە خەلات
کر. ﴿٢٣﴾ مە قورئان پیچ پیچە بۆ تە یا هنارتی. ﴿٢٤﴾ ڤێجا بێنا خۆ ل سەر گەهاندنا حوکمێ خودێ فرەه
بکە، و گوهداریا چو گونەهکار و بێ باوەران ژ وان نەکە. ﴿٢٥﴾ و بەردەوام ناڤێ خودێ بینە، سپێدە و
ئێڤاران.

وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَٱسۡجُدۡ لَهُۥ وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمۡ يَوۡمٗا ثَقِيلٗا ﴿٢٧﴾ نَّحۡنُ خَلَقۡنَٰهُمۡ وَشَدَدۡنَآ أَسۡرَهُمۡۖ وَإِذَا شِئۡنَا بَدَّلۡنَآ أَمۡثَٰلَهُمۡ تَبۡدِيلًا ﴿٢٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ﴿٢٩﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿٣٠﴾ يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمَۢا ﴿٣١﴾

سُورَةُ المُرْسَلَاتِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡمُرۡسَلَٰتِ عُرۡفٗا ﴿١﴾ فَٱلۡعَٰصِفَٰتِ عَصۡفٗا ﴿٢﴾ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشۡرٗا ﴿٣﴾ فَٱلۡفَٰرِقَٰتِ فَرۡقٗا ﴿٤﴾ فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴿٥﴾ عُذۡرًا أَوۡ نُذۡرًا ﴿٦﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٞ ﴿٧﴾ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ ﴿٨﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ نُسِفَتۡ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتۡ ﴿١١﴾ لِأَيِّ يَوۡمٍ أُجِّلَتۡ ﴿١٢﴾ لِيَوۡمِ ٱلۡفَصۡلِ ﴿١٣﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ﴿١٤﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾ أَلَمۡ نُهۡلِكِ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ نُتۡبِعُهُمُ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٧﴾ كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٨﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٩﴾



﴿٢٦﴾ و ب شەڤ نڤێژان بکە و شەڤا خۆ ب نڤێژان ساخ بکە. ﴿٢٧﴾ ئەڤ گاور و موشرکە گەلەك حەژ دنیایێ دکەن، و پشتا خۆ ددەنە ڕۆژەکا گران [کو ئاخرەتە]. ﴿٢٨﴾ مە ئەو یێت [ژ چونەییێ] چێکرین، و مە ئەندامێت وان یێت موکومکرین، و ئەگەر مە بڤێت دێ وان ب هندەکێت ژ وان چێتر گوهۆڕین. ﴿٢٩﴾ ئەڤە شیرەت و بیرئینانە، و یێ باشیا خۆ بڤێت، بلا ڕێکا خودایێ خۆ بگریت. ﴿٣٠﴾ و هوین نەشێن چو بکەن ئەگەر خودێ حەز نەکەت، ب ڕاستی خودێ یێ زانا و کاربنەجهە. ﴿٣١﴾ یێ وی بڤێت دێ ب بەر دلۆڤانییا خۆ ئێخیت، و بۆ گونەهکاران ئیزا و نەخۆشییەکا دژوار یا بەرهەڤکری.

## سۆرەتا مورسەلات

### ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٥٠) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ سویند ب بایێ ل دویڤ ئێك دئێت.
﴿٢﴾ و سویند ب هورەبایێ هور. ﴿٣﴾ و سویند ب وان ملیاکەتێت عەوران بەلاڤ دکەن. ﴿٤﴾ و سویند ب وان ملیاکەتێت فەرمانێت خودێ دئینن، دا ڕاستی و نەڕاستی ژێك بێنە ڤاڤارتن. ﴿٥﴾ و سویند ب وان ملیاکەتێت وەحیا خودێ بۆ پێغەمبەران دئینن. ﴿٦﴾ دا خەلکی هەجەتبڕ بکەن، یان دا خەلکی بترسینن.
﴿٧﴾ ئەو تشتێ سۆز و پەیمان بۆ هەوە پێ دئێتە دان دێ هەر ئێت. ﴿٨﴾ گاڤا ستێر ڕژیان و ڕۆناهیا وان نەما.
﴿٩﴾ و گاڤا ئەسمان کەلشت و دەرزی. ﴿١٠﴾ و گاڤا چیا ژ بن دچن و هویرهویر دبن. ﴿١١﴾ و گاڤا وەخت بۆ پێغەمبەران هاتە دەستنیشانکرن بۆ حوکمکرنێ. ﴿١٢﴾ بۆ کیژ ڕۆژێ هاتییە پاشئێخستن؟. ﴿١٣﴾ بۆ وێ ڕۆژێ ئەوا حساب تێدا د ناڤبەرا خەلکیدا دئێتەکرن کو ڕۆژا قیامەتێیە. ﴿١٤﴾ ما تو چ دزانی، ئەو چ ڕۆژە. ﴿١٥﴾ وێ ڕۆژێ نەخۆشی و ئیزا بۆ بێ باوەرانە. ﴿١٦﴾ ما مە پێشییێت وان یێت گونەهکار د هیلاك نەبرن. ﴿١٧﴾ پاشی ما مە گونەهکارێت پشتی وان ژی، نەدانە دویڤ. ﴿١٨﴾ ئەها ئەم ڤێ ب سەرێ خرابکاران دئینین. ﴿١٩﴾ وێ ڕۆژێ نەخۆشی و ئیزا بۆ بێ باوەران بیت.

أَلَمۡ نَخۡلُقكُّم مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ ٢٠ فَجَعَلۡنَٰهُ فِي قَرَارٖ مَّكِينٍ ٢١ إِلَىٰ قَدَرٖ
مَّعۡلُومٖ ٢٢ فَقَدَرۡنَا فَنِعۡمَ ٱلۡقَٰدِرُونَ ٢٣ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٢٤
أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ كِفَاتًا ٢٥ أَحۡيَآءٗ وَأَمۡوَٰتٗا ٢٦ وَجَعَلۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ
شَٰمِخَٰتٖ وَأَسۡقَيۡنَٰكُم مَّآءٗ فُرَاتٗا ٢٧ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٢٨
ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ٢٩ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلّٖ ذِي ثَلَٰثِ
شُعَبٖ ٣٠ لَّا ظَلِيلٖ وَلَا يُغۡنِي مِنَ ٱللَّهَبِ ٣١ إِنَّهَا تَرۡمِي بِشَرَرٖ
كَٱلۡقَصۡرِ ٣٢ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٞ صُفۡرٞ ٣٣ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٣٤
هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ ٣٥ وَلَا يُؤۡذَنُ لَهُمۡ فَيَعۡتَذِرُونَ ٣٦ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ
لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٣٧ هَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِۖ جَمَعۡنَٰكُمۡ وَٱلۡأَوَّلِينَ ٣٨ فَإِن كَانَ
لَكُمۡ كَيۡدٞ فَكِيدُونِ ٣٩ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٤٠ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ
فِي ظِلَٰلٖ وَعُيُونٖ ٤١ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشۡتَهُونَ ٤٢ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا
بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٤٣ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٤٤ وَيۡلٞ
يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٤٥ كُلُواْ وَتَمَتَّعُواْ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجۡرِمُونَ ٤٦ وَيۡلٞ
يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٤٧ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرۡكَعُواْ لَا يَرۡكَعُونَ ٤٨
وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٤٩ فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعۡدَهُۥ يُؤۡمِنُونَ ٥٠



﴿٢٠﴾ ما مە هوین ژ ئاڤەکا بێ بها چێ نەکرینە؟.
﴿٢١﴾ و مە ئەڤ ئاڤە کرە د جهەکێ موکومدا
[کو مالبچویکە]. ﴿٢٢﴾ هەتا وەختەکێ دیارکری.
﴿٢٣﴾ و مە شیا وی چێ کەین، و ئەم چ خۆش خودان
شیانین. ﴿٢٤﴾ وێ ڕۆژێ نەخۆشی و ئیزا بۆ بێ باوەران
بیت. ﴿٢٥﴾ ما مە ئەرد بۆ هەوە نەکریە مرۆڤ هلگر.
﴿٢٦﴾ ساخان ل سەر ڕوییێ خۆ ڕادکەت، و مریان
د زکێ خۆدا ڤەدشێریت. ﴿٢٧﴾ و مە چیایێت بلند
تێدا یێت چێکرین، و مە ئاڤەکا شرین و خۆش یا
دایییە هەوە. ﴿٢٨﴾ وێ ڕۆژێ نەخۆشی و ئیزا بۆ بێ
باوەران بیت. ﴿٢٩﴾ دێ بەر ب وێڤە هەڕن، یا هەوە
باوەری پێ نەدئینا و درەو ددانا. ﴿٣٠﴾ دێ هەڕنە
بەر سیبەرا دویکێلا سێ چەق. ﴿٣١﴾ ئەو سیبەرا نە
هەوە ژ گەرمێ دپارێزیت، و نە ژ گوریا ئاگرێ
دۆژەهێ. ﴿٣٢﴾ وی ئاگری هندە چریسك ژێ دچن،
تەمەتی ئاڤاهییێت مەزنن. ﴿٣٣﴾ ئەو چریسك دبنە
دویڤەڕێزك، دێ بێژی حێشترێت سۆرن کەڤتینە پشت
ئێك. ﴿٣٤﴾ وێ ڕۆژێ نەخۆشی و ئیزا بۆ بێ باوەران
بیت. ﴿٣٥﴾ ئەڤە ڕۆژەکە کەسێ چو ئاخڤتن نینە. ﴿٣٦﴾ و دەستویری ژی بۆ وان نائێتە دان هەجەتان بگرن.
﴿٣٧﴾ وێ ڕۆژێ نەخۆشی و ئیزا بۆ بێ باوەران بیت. ﴿٣٨﴾ ئەڤە ڕۆژا ژێکڤەکرنێیە، مە هوین د گەل یێت
بەری هەوە، یێت کۆمکرین. ﴿٣٩﴾ هەکە هەوە فند و فێلەك هەبیت بکەن. ﴿٤٠﴾ وێ ڕۆژێ نەخۆشی و
ئیزا بۆ بێ باوەران بیت. ﴿٤١﴾ هندی خودێترسن یێت د بن سها باغ و بیستانان، و یێت د ناڤ کانیاندا.
﴿٤٢﴾ و یێت د ناڤ وی فێقیدا ئەوێ ل دویڤ دلێ وان. ﴿٤٣﴾ بخۆن و ڤەخۆن، هەوە نۆشی جان بیت، ژ
بەر وان کار و کریارێت هەوە کرین. ﴿٤٤﴾ ئەها هۆسا، ئەم قەنجیخواز و قەنجیکەر و خۆشمرۆڤان خەلات
دکەین. ﴿٤٥﴾ وێ ڕۆژێ نەخۆشی و ئیزا بۆ بێ باوەران بیت. ﴿٤٦﴾ د دنیاییدا بخۆن و پیچەکێ کەیفێ بکەن،
هوین خرابکار و گونەهکارن. ﴿٤٧﴾ وێ ڕۆژێ نەخۆشی و ئیزا بۆ بێ باوەران بیت. ﴿٤٨﴾ و ئەگەر گۆتە
وان نڤێژان بکەن، نڤێژان ناکەن. ﴿٤٩﴾ وێ ڕۆژێ نەخۆشی و ئیزا بۆ بێ باوەران بیت. ﴿٥٠﴾ ئەرێ ئەو پشتی
قورئانێ، دێ باوەر ژ چ گۆتنێ کەن؟!.

## سُورَةُ النَّبَإِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ١ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ ٢ ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ مُخۡتَلِفُونَ ٣
كَلَّا سَيَعۡلَمُونَ ٤ ثُمَّ كَلَّا سَيَعۡلَمُونَ ٥ أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ مِهَٰدٗا ٦
وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا ٧ وَخَلَقۡنَٰكُمۡ أَزۡوَٰجٗا ٨ وَجَعَلۡنَا نَوۡمَكُمۡ سُبَاتٗا ٩
وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ لِبَاسٗا ١٠ وَجَعَلۡنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشٗا ١١ وَبَنَيۡنَا
فَوۡقَكُمۡ سَبۡعٗا شِدَادٗا ١٢ وَجَعَلۡنَا سِرَاجٗا وَهَّاجٗا ١٣ وَأَنزَلۡنَا مِنَ
ٱلۡمُعۡصِرَٰتِ مَآءٗ ثَجَّاجٗا ١٤ لِّنُخۡرِجَ بِهِۦ حَبّٗا وَنَبَاتٗا ١٥ وَجَنَّٰتٍ
أَلۡفَافًا ١٦ إِنَّ يَوۡمَ ٱلۡفَصۡلِ كَانَ مِيقَٰتٗا ١٧ يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ
فَتَأۡتُونَ أَفۡوَاجٗا ١٨ وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ أَبۡوَٰبٗا ١٩ وَسُيِّرَتِ
ٱلۡجِبَالُ فَكَانَتۡ سَرَابًا ٢٠ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتۡ مِرۡصَادٗا ٢١ لِّلطَّٰغِينَ
مَـَٔابٗا ٢٢ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحۡقَابٗا ٢٣ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرۡدٗا وَلَا
شَرَابًا ٢٤ إِلَّا حَمِيمٗا وَغَسَّاقٗا ٢٥ جَزَآءٗ وِفَاقًا ٢٦ إِنَّهُمۡ كَانُواْ
لَا يَرۡجُونَ حِسَابٗا ٢٧ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابٗا ٢٨ وَكُلَّ شَيۡءٍ
أَحۡصَيۡنَٰهُ كِتَٰبٗا ٢٩ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمۡ إِلَّا عَذَابًا ٣٠

الجزء ٣٠ الحزب ٥٩





## سۆرەتا نەبەء

### ل مەكەهێ هاتیيە خوارێ (٤٠) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ خەلكێ مەكەهێ پسیارا چ ژ ئێك و دو دكەن؟ [پاشی هەر سۆرەتێ بەرسڤ داڤە، چونكی پسیار نەبۆ هندێیە دا ئەو بەرسڤێ بدەن، بەلكی بۆ دیاركرنا حێبەتیبوونا حالێ وان بوو، و ئەو كراسێ وان خۆ كریيە تێدا]. ﴿٢﴾ پسیارا بەحس و خەبەر و سالۆخێ مەزن كو رۆژا قیامەتێیە ژ ئێك و دو دكەن. ﴿٣﴾ ئەو رۆژا ئەو تێدا دودل. ﴿٤﴾ نەخێر دێ زانن، بلا دودل نەبن. ﴿٥﴾ دیسا نەخێر دێ زانن، دەمێ ب چاڤێ سەرێ خۆ وێ راستیا ئەو تێدا دودل، دبینن. ﴿٦﴾ [چاوا هوین باوەریێ نائینن كو دێ جارەكا دی ساخ بن و ژ گۆڕان رابنەڤە، و رەخ و رویێت هەوە هەمی نیشان و بەلگەنە] ما مە ئەرد بۆ هەوە و ژینا هەوە و جانەوەرێت هەوە، خۆش نەكریيە و رانەئێخستیيە و بەرهەڤ نەكریيە. ﴿٧﴾ و ما مە چیا نەكرینە سنگ [بۆ راگرتنا ئەردی، دا نەهێت و بچیت، دا نەلەلقیت، و دا ب چو رەخان نەكەڤیت، و هەكە ئەڤ چیایە نەبانە ئەرد نەدراوەستیا، و دا هەر یێ هەژهەژۆك بیت]. ﴿٨﴾ و ما مە هوین نەكرینە ژن و مێر. ﴿٩﴾ و ما مە خەو (نڤستن) بۆ هەوە نەكریيە ڤەهەسیان [بۆ نەهێلانا وێ وەستیانا هوین د بزاڤا خۆ یا رۆژانەدا دبینن، و جارەكا دی دزڤرنەڤە سەر بزاڤا خۆ]. ﴿١٠﴾ و ما مە شەڤ بۆ هەوە نەكریيە پەردە و كراس. ﴿١١﴾ و ما مە رۆژ بۆ هەوە نەكریيە دەمێ بزاڤا ژینێ. ﴿١٢﴾ و ما مە حەفت ئەسمانێت ب هێز د سەر هەوەدا ئاڤانەكرینە. ﴿١٣﴾ و ما مە چرایەكێ گەش بۆ هەوە چێ نەكریيە. ﴿١٤﴾ و ما مە بۆ هەوە ئاڤ و بارانەكا بۆش ژ عەوران دانەرێتییە [و پاشی خودێ تەعالا سوود و مفایێت بارانێ ئاشكەرا كرن و گۆت:] ﴿١٥﴾ دا ئەم دان و دەرامەت و شینكاتی پێ بدەین. ﴿١٦﴾ و دا باخچەیێت تژی داروبار، پێ بدەین. ﴿١٧﴾ بێ گۆمان ئەو رۆژا ئەو تێدا دودل كو رۆژا جوداكرنا قەنجی و خرابییێیە، رۆژا كۆمبوون و ژێك ڤاڤارتنێ، یا د رێ و پێشیيا هەمی چێكریانـدا و هەر دێ ئێت. ﴿١٨﴾ رۆژا پف ل شاخكی دئێتە دان، ڤێجا هوین پێل پێل دئێن. ﴿١٩﴾ و ئەسمان وێ رۆژێ ڤەبوون و بوونە دەرگەهـ. ﴿٢٠﴾ و چیا هەژیان و بوونە لەیلان. ﴿٢١﴾ ب راستی [وێ رۆژێ] دۆژەهـ ل هیڤیيا بێ باوەرانە. ﴿٢٢﴾ جهـ و دویماهیكە بۆ زێدە خرابكاران. ﴿٢٣﴾ كو هەروهەر دێ تێدا مینن. ﴿٢٤﴾ تێدا تام ناكەنە هینكاتیێ و ڤەخوارنا تەزی. ﴿٢٥﴾ ئاڤا شارياى و كێم و زۆخ تێ نەبیت. ﴿٢٦﴾ ئەڤ جزایە ل دویڤ كریارێت وایە. ﴿٢٧﴾ د دنیایێدا وان چو بۆ حسابا ئاخرەتێ نەددانا. ﴿٢٨﴾ و باوەری ب ئایەتێت مە نەدئینان و دگۆتن درەون. ﴿٢٩﴾ هەمی تشت مە ب نڤێسین و هەژمار، سەركاغەز كریيە و نڤێسییە. ﴿٣٠﴾ دێ بخۆن ژ ئێزایێ پێڤەتر ئەم نادەینە بەر هەوە [و ژ ئێزایێ پێڤەتر ل هەوە زێدەنابیت].

إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا
دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً
حِسَابًا ﴿٣٦﴾ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلرَّحْمَٰنِ لَا يَمْلِكُونَ
مِنْهُ خِطَابًا ﴿٣٧﴾ يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا لَّا يَتَكَلَّمُونَ
إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ فَمَن
شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾ إِنَّآ أَنذَرْنَٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ
ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا ﴿٤٠﴾

## سُورَةُ النَّازِعَاتِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرْقًا ﴿١﴾ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشْطًا ﴿٢﴾ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبْحًا ﴿٣﴾
فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا ﴿٥﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾
تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ﴿٨﴾ أَبْصَٰرُهَا خَٰشِعَةٌ ﴿٩﴾
يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِى ٱلْحَافِرَةِ ﴿١٠﴾ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا نَّخِرَةً ﴿١١﴾ قَالُوا۟
تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ ﴿١٤﴾
هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٦﴾



﴿٣١﴾ بێ گۆمان جهێ سەرفەرازییێ بۆ پارێزكار و
خودێترسانە. ﴿٣٢﴾ ژباغ و هەمی ڕەنگێت تری. ﴿٣٣﴾ و پەریێت
مەمكهلداى و سینگهلدایی و هەڤژی و یەكدەست.
﴿٣٤﴾ و پەرداغێت تژی مەی [كو سەرێ وان پێ نەئێشیت].
﴿٣٥﴾ خەلكێ بەحەشتێ د بەحەشتێدا، ئاخفتنێت پویچ و
پەلاچ نابهیسن. ﴿٣٦﴾ [ئەڤە] دان و خەلاتەكێ دورست
و د جهێ خۆدایە، ژ خودایێ تە. ﴿٣٧﴾ خودانێ ئەرد و
ئەسمانان و هندی د ناڤبەرا واندا، خودایێ دلۆڤانە كەس
نەشێت د بەرڕا باخڤیت. ﴿٣٨﴾ ڕۆژا كو جبریل و ملیاكەت
ب ڕێز ڕادوەستن، و كەس نائاخڤیت مەگەر ئەو نەبیت یێ
خودێ ڕێ بدەتێ، و ئاخڤتنا دورست و د جهێ خۆدا
بكەت. ﴿٣٩﴾ ئەو ڕۆژە یا ڕاست و دورستە، ڤێجا یێ ڤیا
بلا ڕێكا ڤەگەڕیانێ ب بال خودایێ خۆڤە خۆش بكەت.
﴿٤٠﴾ ب ڕاستی مە هوین ژ ئیزایەكا نێزیك ترساندن ڕۆژا
مرۆڤ كریارێت خۆ دبینیت، و گاور دبێژیت: خۆزی ئەز
هەر ئاخ بامە و ساخ نەبووبامەڤە.

## سۆرەتا نازیعات

### ل مەكەهێ هاتیـە خوارێ (٤٦) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ سویند ب وان ملیاكەتێت ب دژواری جانێ گاوران دكێشن. [هەر ل دەستپێكا كێشانا ڕوحێ دێ كەڤنە بەر
ئیزا و نەخۆشییان، و ب توند و دژواری و بێ ڕەحم ملیاكەت جانێ وی دكێشن، دا هەمی گەهـ و بارێت وی بەر
ئیزا ببن]. ﴿٢﴾ و سویند ب وان ملیاكەتێت ب ڕەحەتی و نەرمی جانێ خودان باوەران دكێشن [دەمێ مرۆڤێ چاك
و باوەریدار دكەڤتە د سەكەراتێدا، ملیاكەت ڕەحمێ پێ دبەن و نەرم و ڕەحەت جانێ وی دكێشن، دا نەئێشیت، و دا
بزانیت كو ئەو یێ ل سەر وەغەرەكا خۆش، و دێ بەر ب ژینەكا خۆشتر چیت]. ﴿٣﴾ و سویند ب وان ملیاكەتێت
فەرمانێت خودێ ب لەز دئینە خوارێ. ﴿٤﴾ و سویند ب وان ملیاكەتێت بەرەبەزینكێ ب جانان دكەن، بۆ جهێ وان
یێ دویڤهاتییێ. ﴿٥﴾ و سویند ب وان ملیاكەتێت كاروبارێ بوونێ ئانكو وجوودێ، ب فەرمانا خودێ ب سەروبەر
دكەن. ﴿٦﴾ [سویند ب ڤان هەمییان] ڕۆژا ئەرد ب بارێ خۆڤە دهەژیێت [هەر دێ ئێت، دەمێ پفا ئێكێ ل شاخكی
دئێـتە دان هەمی تشتێ خودان ڕوح پێ دمرن]. ﴿٧﴾ د پشـتڕا پفا دی ژی دئـێت [كو سەرێ ڕابوونا مرۆڤـانە].
﴿٨﴾ وێ ڕۆژێ هندەك دل د پەریشان و ب ترسن. ﴿٩﴾ د چاڤ شۆڕ و ب ترسن. ﴿١٠﴾ دبێژن ئەرێ پشتی مرنێ ئەم
دێ ساخ بینەڤە، و دێ زڤڕینە سەر حالێ خۆ یێ ئێكێ، پشتی مرنێ. ﴿١١﴾ ئەرێ پشتی ئەم دبینە كۆمەكا هەستیكێت
هەلوەریای. ﴿١٢﴾ [ب ترانەڤە و ژ نەباوەری] دبێژن: ئەگەر وەبیت و ڕاست بیت [كو ئەم جارەكا دی دێ ساخ
بینەڤە، پشتی ئەم دمرین] ئەڤە زڤڕینەكا خوسارەتە. ﴿١٣﴾ دویرنەئێخن ب پفا دوویێ هوین دێ ڕابنەڤە [و دێ ل
مەیدانا حەشرێ حازربن]. ﴿١٤﴾ پشتی وێ پفێ، جهێ زكێ ئاخێ هوین دێ سەر ئاخ بن. ﴿١٥﴾ ما تە های ژ
سوحبەتا مووسایی نەبوویـیە؟. ﴿١٦﴾ دەمێ خودێ ل نهالا پیرۆز (طوى) ل چیایێ (سینا) گازی كریێ.

ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿١٧﴾ فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾
وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَرَىٰهُ ٱلْـَٔايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٢٠﴾
فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾
فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ ﴿٢٥﴾
إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ ﴿٢٦﴾ ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ
بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ
ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾ وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا
وَمَرْعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴿٣٣﴾
فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾
وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴿٣٦﴾ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ
ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ
رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾
يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن
ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ﴿٤٥﴾
كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ﴿٤٦﴾



﴿١٧﴾ گۆتییێ: هەرە دەڤ فیرعەونی، گەلەك یێ د
سەر پێ خودا چۆی و د ستەمێدا زێدە یێ خراب
بووی. ﴿١٨﴾ بێژێ: تە دل تێ هەیە ل خۆ بزڤری، و
خۆ ژ گونەهان بشۆی. ﴿١٩﴾ [بێژێ:] و ئەز دێ بەرێ
تە دەمە خودایێ تە، دا تو بترسی. ﴿٢٠﴾ و مووسایی
نەدیتییا (موعجیزەیا) مەزن نیشا دا، کو دار دبوو
مار. ﴿٢١﴾ فیرعەونی باوەر ژێ نەکر، و گوهداریا
خودێ نەکر. ﴿٢٢﴾ پاشی پشت دا باوەرییێ
(ئیمانێ)، و لەز ل خرابیا مووسایی و خودان باوەران
کر. ﴿٢٣﴾ خەلك ل خۆ کۆمکر و بانگ هلدێرا.
﴿٢٤﴾ گۆت: ئەز خودێ و خودانێ هەوە یێ مەزنم،
و هەوە ژ من پێڤەتر چو خودێ نینن. ﴿٢٥﴾ ئینا
خودێ ل سەر دنیایێ خەندقاند، و ل ئاخرەتێ دۆژەهـ
کرە بارا وی [و خودێ ئیزایا دنیایێ و ئاخرەتێ دا
بەر]. ﴿٢٦﴾ ب راستی چیرۆکا فیرعەونی چامە و
عیبرەتە، بۆ وی یێ ژ خودێ بترسیت. ﴿٢٧﴾ ئەرێ
ساخکرنا هەوە پشتی مرنێ ب زەحمەتترە یان
چێکرنا ئەسمانی؟. ﴿٢٨﴾ بانێ وی بلند کر و بێ
کێماسی دورست کر. ﴿٢٩﴾ شەڤا وی تاریکر و ڕۆژا وی ب ڕۆناهی ئێخست. ﴿٣٠﴾ و ئەرد پشتی هنگی
ل سەر ئاوایێ هێکێ ڕاست و خۆشکر بۆ ژیانێ. ﴿٣١﴾ و ئاڤ و چەرە ژێ دەرئێخست. ﴿٣٢﴾ و چیا
بۆ کرنە سنگ، دا نەهەژییێت. ﴿٣٣﴾ دا هوین هەمی پێکڤە ب جانەوەرێت خۆڤە مفای ژێ وەرگرن.
﴿٣٤﴾ ئەگەر ئەو ڕۆژا ب ترس و سەهم هات [ڕۆژا ژ ترسا وێ، سەرێ بچویکان سپی دبیت]. ﴿٣٥﴾ ڕۆژا
کار و کریارێت مرۆڤی دئێنە بیرا مرۆڤی. ﴿٣٦﴾ و ڕۆژا دۆژەهـ ل خودان چاڤان دیار دبیت. ﴿٣٧﴾ ڤێجا ئەو
کەسێ گەلەك ستەم و زۆری کرین، د دەرهەقا خودێدا. ﴿٣٨﴾ و ژیانا سەر دنیایێ چێتر ڤیای ژ ژیانا ئاخرەتێ
[و ژیانا دنیایێ ب سەر یا ئاخرەتێ ئێخستی]. ﴿٣٩﴾ ئەها دۆژەهـ جهێ وییە. ﴿٤٠﴾ بەلێ ئەو کەسێ ترسا
ڕاوەستیانا بەرانبەری خودێ د دلیدا، و بەرێ خۆ ژ دلخواستنێ وەرگێڕای. ﴿٤١﴾ بەهەشت دێ بیتە جهێ
وی. ﴿٤٢﴾ پسیارا قیامەتێ ژ تە دکەن [هەی موحەمەد] کا کەنگی دێ ڕابیت؟!. ﴿٤٣﴾ ما تو چ ژێ دزانی
هەتا پرسا وێ ژ تە بکەن (ئانکو تو ژی نوزانی کەنگی دێ ڕابیت). ﴿٤٤﴾ بێ گۆمان دویماهییا دنیایێ و هاتنا
قیامەتێ، بەس خودایێ تە دزانیت. ﴿٤٥﴾ کارێ تە بەس ترساندن و ئاگەهکرنا وی کەسییە یێ ژێ بترسیت.
﴿٤٦﴾ دەمێ ئەو دبینن، دێ هزرکەن مرنا وان ژ بێنەکا سپێدەیێ یان ئێڤاری پێڤەتر نەکێشایە.

سُورَةُ عَبَسَ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ربع الحزب ٥٩

عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوۡ يَذَّكَّرُ
فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسۡتَغۡنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيۡكَ
أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسۡعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخۡشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنۡهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾
كَلَّآ إِنَّهَا تَذۡكِرَةٞ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِي صُحُفٖ مُّكَرَّمَةٖ ﴿١٣﴾ مَّرۡفُوعَةٖ
مُّطَهَّرَةِۭ ﴿١٤﴾ بِأَيۡدِي سَفَرَةٖ ﴿١٥﴾ كِرَامِۭ بَرَرَةٖ ﴿١٦﴾ قُتِلَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَآ أَكۡفَرَهُۥ ﴿١٧﴾ مِنۡ
أَيِّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ ﴿١٨﴾ مِن نُّطۡفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴿١٩﴾ ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴿٢٠﴾
ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقۡبَرَهُۥ ﴿٢١﴾ ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ﴿٢٢﴾ كَلَّا لَمَّا يَقۡضِ مَآ أَمَرَهُۥ ﴿٢٣﴾
فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبۡنَا ٱلۡمَآءَ صَبّٗا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقۡنَا
ٱلۡأَرۡضَ شَقّٗا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ﴿٢٨﴾ وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا ﴿٢٩﴾
وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ﴿٣٢﴾ فَإِذَا جَآءَتِ
ٱلصَّآخَّةُ ﴿٣٣﴾ يَوۡمَ يَفِرُّ ٱلۡمَرۡءُ مِنۡ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ
وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ يُغۡنِيهِ ﴿٣٧﴾ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ
مُّسۡفِرَةٞ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٞ مُّسۡتَبۡشِرَةٞ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ عَلَيۡهَا غَبَرَةٞ ﴿٤٠﴾





## سۆرەتا عەبەسە

### ل مەکەهێ هاتیـیە خوارێ (٤٢) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

﴿١﴾ مڕویتا وی [پێغەمبەری] نەخۆشبوو و بەرێ خۆ ژێ وەرگێڕا
[مەخسەد پێغەمبەرە، دەمێ (عبدالله)یێ کوڕێ (أم مکتوم) هاتییە
دەڤ و ئەو یێ مژویل بوو ب ڕوی سپییێت قورەیشییانڤە، و دل
تێ هەبوو باوەرییێ بینن، و دەعوەیا وان دکر و ژ ئاگرێ جەهنەمێ
دترساندن، و د وی وەختیدا و ئەو یێ ب ڤان گرەگرانڤە مژویل،
(عبدالله) هاتە دەڤ و گۆتێ: ئەو تشتێ خودێ نیشا تە دایی بۆ
من ژی بێژە و نیشا من بدە، پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر
بن) نەدڤیا ئاخڤتنا وی د گەل ڤان گرەگران بێتە ڤەبڕین، ژ بەر
هندێ مڕویتا وی نەخۆش بوو]. ﴿٢﴾ دەمێ کۆرە (ابن أم مکتوم)
هاتییە دەڤ. ﴿٣﴾ ما تو چ دزانی بەلکوو هاتبیت، خۆ ژ گونەهان
بشۆت. ﴿٤﴾ یان پێڤەبچیت و مفای ژ شیرەتێت تە وەربگریت.
﴿٥﴾ و هەچییێ پشت دا باوەرییێ، و خۆ بێ منەت کر و پشتا خۆ ب
مالێ خۆ گەرم کر. ﴿٦﴾ تو پێڤە دمینی و بەرنادەی. ﴿٧﴾ خۆ پێڤە
نەئێشینە ئەگەر باوەرییێ ب تە نەئینیت، یا تە ژی بەس ڕاگەهاندنە.
﴿٨﴾ و هەچییێ ژ ڤیان و ژ دل، هاتە دەڤ تە. ﴿٩﴾ و دلێ وی ژ خودێ ب ترس. ﴿١٠﴾ تو وی ژ بیر دکەی، و دمینییە ب ئێکێ دیڤە.
﴿١١﴾ نەخێر وەنەکە، ئەڤ قەومینە و ئایەتێت د دەرهەقدا هاتین، بۆ بیرهاتن و پێڤەچۆنێنە. ﴿١٢﴾ هەچییێ بڤێت دێ مفای ژێ وەرگریت
و ل سەر ڕێڤەچیت. ﴿١٣﴾ و ئەڤ بیرهاتن و پێڤەچۆنە، د هندەك کتێباندانە د پیرۆزن. ﴿١٤﴾ [ئەو کتێب یێت] بلند و خودان ڕێز و
ڕویمەت و پاقژن. ﴿١٥﴾ د دەستێ هندەك ملیاکەتاندانە، ئێلچینە د ناڤبەرا پێغەمبەراندا. ﴿١٦﴾ ئەو ملیاکەت یێت خودان ڕێز و ڕویمەتن،
و بێ فەرمانییا (بێ ئەمرییا) خودێ ناکەن. ﴿١٧﴾ وەی بۆ مرۆڤی، چەندێ بێ نان و خوێیە و چەند یێ ژ ڕێ دەرکەڤتییە. ﴿١٨﴾ خودێ ژ
چ چێکرییە [بیرا وی دئینیتە بنەتارێ وی، دا خۆ مەزن نەکەت و ب خۆ نەخرێیت، و خۆ ل سەر سەرێ بەنیێت خودێ مەزن نەکەت].
﴿١٩﴾ ژ چیکەکێ، بێ کێماسی و ئەو یێ تەکووز چێکری. ﴿٢٠﴾ پاشی ڕێکا بوونێ بۆ ب ساناهی ئێخستی [و ژیان بۆ ساناهی کر
و هەردو ڕێك بۆ ئاشکەراکرن، ڕێکا باشییێ و باوەرییێ و ڕێکا خرابیـیێ و گاورییێ، کا وی کیژ بڤێت بلا بۆ خۆ وێ بگریت].
﴿٢١﴾ پاشی مراند و بن ئاخ کر، [دا بێنا وی ب سەر ساخاندا نەئێت، و دەهبە (وحش) نەخۆن بۆ هندێ بێ بها نەبیت]. ﴿٢٢﴾ پاشی
دەمێ خودێ ڤیا، دێ زیندی کەتەڤە. ﴿٢٣﴾ نەخێر د سەر ڤێ هەمیێڕا، تشتێ خودێ ژێ ڤیایی نەکر. ﴿٢٤﴾ بلا مرۆڤ بەرێ خۆ بدەتە
خوارن و ڤەخوارنا خۆ [و هویرك هزرا خۆ تێدا بکەت، کا چاوا دبیتە خوارن و دئێتە بەر دەستێ وی]. ﴿٢٥﴾ مە ئاڤ ژ عەوران دارێت.
﴿٢٦﴾ و مە ئەرد ب گل و گیا و شینکاتیڤە کەلاشت. ﴿٢٧﴾ مە دان و دەرامەت ژێ دەرئێخست [وەکی دەخلی و جەهی و برنجی، کو
خوارنا سەرەکینە بۆ مرۆڤی]. ﴿٢٨﴾ هەروەسا تری و زەرزەوات ژی. ﴿٢٩﴾ و زەیتوون و دارقەسپ ژی. ﴿٣٠﴾ و جنیك و بیستانێت
تێکڕا ژی. ﴿٣١﴾ و فێقی و چەرە ژی. ﴿٣٢﴾ سوود و مفا بۆ هەوە و تەرش و دەوارێت هەوە. ﴿٣٣﴾ ڤێجا ئەگەر ڕۆژا مرۆڤی ژ گوهان
دکەت (کو ڕۆژا قیامەتێیە) هات. ﴿٣٤﴾ ڕۆژا مرۆڤ ژ برایێ خۆ دڕەڤیت [و براتیا خۆ یا دەیبابی ژ بیر دکەت، و ژ ترساندا پشتا خۆ
ددەتێ]. ﴿٣٥﴾ ڕۆژا مرۆڤ ژ دەیبابێت خۆ دڕەڤیت، و کەس خۆ ل کەسێ نەکەتە خودان. ﴿٣٦﴾ ڕۆژا مرۆڤ ژ ژن و زارۆکێت
خۆ دڕەڤیت [ئەو ژن و عەیالێ د دنیایێدا هند حەژێ دکر، و سەرخاترا وان، سینگێ خۆ دئێخستە هەمی نەخۆشییان، ئەڤرۆ دێ ژێ
ڕەڤیت]. ﴿٣٧﴾ هەر ئێك وێ ڕۆژێ ب خۆڤە یێ مژویلە، و حالێ وی بەسی وییە. ﴿٣٨﴾ وێ ڕۆژێ هندەك سەروچاڤ د گەشن.
﴿٣٩﴾ دەڤ ب کەنی و بەختەوەر و دلخۆشن. ﴿٤٠﴾ و هندەك سەروچاڤ وێ ڕۆژێ د شۆڕ و تۆزەوینە.

تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَفَرَةُ ٱلْفَجَرَةُ ﴿٤٢﴾

## سُورَةُ التَّكْوِيرِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ
سُيِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلْعِشَارُ عُطِّلَتْ ﴿٤﴾ وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ﴿٥﴾
وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ﴿٦﴾ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ ﴿٧﴾ وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ
سُئِلَتْ ﴿٨﴾ بِأَيِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتْ ﴿١٠﴾
وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتْ ﴿١١﴾ وَإِذَا ٱلْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ٱلْجَنَّةُ
أُزْلِفَتْ ﴿١٣﴾ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّآ أَحْضَرَتْ ﴿١٤﴾ فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلْخُنَّسِ ﴿١٥﴾
ٱلْجَوَارِ ٱلْكُنَّسِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ﴿١٧﴾ وَٱلصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾
إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿١٩﴾ ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٍ ثَمَّ
أَمِينٍ ﴿٢١﴾ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢٣﴾
وَمَا هُوَ عَلَى ٱلْغَيْبِ بِضَنِينٍ ﴿٢٤﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿٢٥﴾
فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ ﴿٢٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن
يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾





﴿٤١﴾ رەشاتییێ هلچنینە. ﴿٤٢﴾ ئەها ئەڤەنە، گاورێت ژ
رێ دەركەڤتییێت گونەهكار.

## سۆرەتا تەكویر

**ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٢٩) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ دەمێ رۆژ دئێتە وەرپێچان و تاری دبیت، و
رۆناهییا وێ نەمینیت [كو ئەڤە دەستپێكا خرابكرنا
دنیایێیە]. ﴿٢﴾ و دەمێ ستێر هلدوەریێن و پارچە
پارچە دبن، و گەشاتیا وان دچیت. ﴿٣﴾ و دەمێ چیا
بەربا دبن، و ژ جهێ خۆ دەردكەڤن و پرت پرت
دبن. ﴿٤﴾ و دەمێ حێشترێت ئاڤس، ژ ترسێت ڤێ
رۆژێدا، بێ خودان دمینن [بەس ئەڤە نموونەیە بۆ
رۆنكرن و دیاركرنا رەوشا ڤێ رۆژێ، چونكی رۆژا
قیامەتێ چو حێشتر نینن، بەلێ ژ ترسێت ڤێ رۆژێدا
مالێ ژ هەمییان عەزیزتر ل دەڤ عەرەبان، دێ هێلن و
پاتكا خۆ دەنێ، هەلبەت ژ ترس و لەرزا ڤێ رۆژێ].
﴿٥﴾ و دەمێ جانەوەرێت كویڤی و دورندە دئێنە
كۆمكرن، ژ ترساندا كۆم دبنە سەریێك. ﴿٦﴾ و دەمێ كناریێت دەریایان دپەقن، و دەریا خۆ لێك ددەن.
﴿٧﴾ و دەمێ روح جارەكا دی دزڤریتە سەر لەشان. ﴿٨﴾ و دەمێ كچا ب ساخی هاتییە بن ئاخكرن،
دپرسیت. ﴿٩﴾ ب كیژ گونەهێ هاتییە بن ئاخكرن و هاتە كوشتن. ﴿١٠﴾ و دەمێ كاغەزێت كار و كریاران
دئێنە بەلاڤكرن. ﴿١١﴾ و دەمێ ئەسمان ژ جهـ دچیت و پرت و پەرتە دبیت. ﴿١٢﴾ و دەمێ دۆژەهـ دشارییێت
و دسنجریت. ﴿١٣﴾ و دەمێ بەحەشت بەرهەڤ دبیت بۆ خودێناسان. ﴿١٤﴾ هنگی هەر ئێك دێ زانیت، كا چ
بۆ خۆ بەرهەڤكرییە. ﴿١٥﴾ ئەز سویند دخۆم، ب هەمی ستێرێت رۆژێ بەرزە و شەڤێ دیار. ﴿١٦﴾ ئەوێت د
چەرخێت خۆدا دزڤرن، و ب شەڤ دچرسن. ﴿١٧﴾ ئەز سویند دخۆم، ب شەڤ دەمێ رۆناهییێ هلدچنیت.
﴿١٨﴾ ئەز سویند دخۆم ب بەرسپێدێ، دەمێ ب رۆناهییا خۆڤە دئێت. ﴿١٩﴾ ب راستی ئەڤ قورئانە ژ ئینانا
جبریلێ خودان رێز و رویمەتە. ﴿٢٠﴾ یێ خودان هێزە، و ل دەڤ خودانێ عەرشی [كو خودێیە] جهێ خۆ
هەیە. ﴿٢١﴾ ملیاكەت ژێرا گوهدارن، و ل دەڤ خودێ یێ دەستپاكە [ل سەر گەهاندنا پەیاما خودێ].
﴿٢٢﴾ [گەلی خەلكێ مەكەهێ]، هەڤالێ هەوە [ئەوێ هەوە بەری نوكە هەڤالینی د گەل كری، و باش نیاسی
كو موحەمەدە] نە یێ دینە. ﴿٢٣﴾ پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر بن)، جبریل ل سەر رەنگێ وی یێ
دورست و ب ئاشكەرایی ل پەرێ ئەسمانی دیت. ﴿٢٤﴾ و [موحەمەد] یێ بێ كێماسییە (بێ تەخسیرییە)
د گەهاندنا بانگ و پەیاما خودێدا. ﴿٢٥﴾ و قورئان نە ئاخڤتنا شەیتانەكێ رەجماندییە. ﴿٢٦﴾ هوین دێ كیڤە
چن، و چ رێكا ژ ڤێ رێكێ باشتر دێ گرن؟!. ﴿٢٧﴾ قورئان شیرەت و رۆناهییە ژ بۆ هەمی خەلكی.
﴿٢٨﴾ بۆ هەر كەسێ بڤێت سەرراست و راستەرێ ببیت. ﴿٢٩﴾ هوین نەشێن وێ رێكا راست ژێ بگرن،
ب هاریكارییا خودێ خودایێ هەمی جیهانان نەبیت، (ئانكو ئەگەر خودێ حەز نەكەت هوین نەشێن رێكا
راست بگرن).

سُورَةُ الانفِطَارِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلْكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ
فُجِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ﴿٤﴾ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ
وَأَخَّرَتْ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِى
خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِىٓ أَىِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾
كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ ﴿٩﴾ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا
كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ
ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ﴿١٤﴾ يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿١٥﴾ وَمَا هُمْ عَنْهَا
بِغَآئِبِينَ ﴿١٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿١٧﴾ ثُمَّ مَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ
ٱلدِّينِ ﴿١٨﴾ يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْـًٔا ۖ وَٱلْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ ﴿١٩﴾

نصف الحزب ٥٩

سُورَةُ المُطَفِّفِينَ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكْتَالُوا۟ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ﴿٢﴾
وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ﴿٣﴾ أَلَا يَظُنُّ أُو۟لَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ﴿٤﴾



## سۆرەتا ئینفیطار

**ل مەکەهێ هاتیە خوارێ (١٩) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ دەمێ ئەسمان دکەلشیت و دکەڤیت. ﴿٢﴾ و دەمێ
ستێر دکەڤن و دپرتکن. ﴿٣﴾ و دەمێ دەریا هەمی
دپەڤن، و هەمی دبنە ئێك دەریا. ﴿٤﴾ و دەمێ گۆڕ
سەرێك و بنێك دبن، و مرۆڤ ب سەردکەڤن و
ژێ دەردکەڤن. ﴿٥﴾ هنگی هەر ئێك دێ زانیت
کا چ ل پێشیا خۆ کرییە، و چ ڕێکا باش یان یا
خراب ب پاش خۆڤە هێلایە. ﴿٦﴾ هەی مرۆڤۆ چ
تو د سەردابری، تو ڕێکا خودێ نەگری. ﴿٧﴾ ئەو
خودایێ بێ کێماسی و ڕاست و دورست تو چێکری.
﴿٨﴾ ئەو خودایێ تو د وێنەیەکێ لێکدایدا کو وی
ڤیایی، تو چێکری. ﴿٩﴾ نەخێر... هوین پشتا خۆ
ددەنە ڕۆژا جزادانێ، و باوەریێ پێ نائینن و هوین
درەو ددانن. ﴿١٠﴾ و ب ڕاستی هندەك ملیاکەت
د زێرەڤانن ل سەر نڤێسینا کار و کریارێت هەوە. ﴿١١﴾ ئەو هندە ملیاکەتێت خودان ڕێز و ڕویمەتن، هەر
تشتەکێ هوین بکەن دنڤێسن. ﴿١٢﴾ دزانن و دنڤێسن، یا هوین دکەن. ﴿١٣﴾ هندی چاك و خودێناسن،
دێ د خۆشیان و د بەهەشتێدا بن. ﴿١٤﴾ و هندی گونەهکار و خرابیخوازن، دێ د ئاگرێ دۆژەهێدا بن.
﴿١٥﴾ ڕۆژا جزادانێ دێ چنە تێدا. ﴿١٦﴾ ب چ ڕێکان ژێ ڕزگار نابن و نەشێن ژێ بڕەڤن، و هەروهەر
دێ تێدا بن. ﴿١٧﴾ تو چ دزانی ڕۆژا جزادانێ یا چاوایە؟. ﴿١٨﴾ دیسا تو چ دزانی ئەو چ ڕۆژە؟.
﴿١٩﴾ ئەو ڕۆژەکە کەس مفای ناگەهینیتە کەسێ، و نەشێت بەڕەڤانیێ ژێ بکەت، و وێ ڕۆژێ فەرمان
فەرمانا خودێیە و بەس.

## سۆرەتا موطەففین

**ل مەکەهێ هاتیە خوارێ (٣٦) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ وەی ئێزا و نەخۆشی، بۆ ترازی دز و پیڤان دزان. ﴿٢﴾ ئەوێت دەمێ ب پیڤان و کێشان ژ خەلکی دکڕن،
ب دورستی هەقێ خۆ دخوازن. ﴿٣﴾ بەلێ ئەگەر ب کێشان و پیڤان فرۆتن، ترازیێ ددزن و ب دورستی نا
کێشن. ﴿٤﴾ ما ئەڤێت هەنێ هزرا ڕابوونا پشتی مرنێ ناکەن؟.

لِيَوۡمٍ عَظِيمٖ ٥ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ
ٱلۡفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٖ ٧ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سِجِّينٞ ٨ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ٩
وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ١٠ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ١١ وَمَا يُكَذِّبُ
بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ١٢ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ١٣
كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٤ كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ
يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ١٥ ثُمَّ إِنَّهُمۡ لَصَالُواْ ٱلۡجَحِيمِ ١٦ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا
ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ١٧ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ ١٨
وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ١٩ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ٢٠ يَشۡهَدُهُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ٢١
إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ٢٢ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ٢٣ تَعۡرِفُ فِي
وُجُوهِهِمۡ نَضۡرَةَ ٱلنَّعِيمِ ٢٤ يُسۡقَوۡنَ مِن رَّحِيقٖ مَّخۡتُومٍ ٢٥ خِتَٰمُهُۥ
مِسۡكٞۚ وَفِي ذَٰلِكَ فَلۡيَتَنَافَسِ ٱلۡمُتَنَٰفِسُونَ ٢٦ وَمِزَاجُهُۥ مِن
تَسۡنِيمٍ ٢٧ عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا ٱلۡمُقَرَّبُونَ ٢٨ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ كَانُواْ
مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ ٢٩ وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ يَتَغَامَزُونَ ٣٠
وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ ٣١ وَإِذَا رَأَوۡهُمۡ قَالُوٓاْ
إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ٣٢ وَمَآ أُرۡسِلُواْ عَلَيۡهِمۡ حَٰفِظِينَ ٣٣

سكتة لطيفة على اللام





﴿٥﴾ بۆ رۆژەکا ب ترس و سەهم [کو رۆژا دویماهیێیە]. ﴿٦﴾ رۆژا هەمی مرۆڤ ل بەر خودێ و ل بەر فەرمانا وی رادوەستن. ﴿٧﴾ نەخێر وەنەکەن، هندی دەفتەرا بەدکارانە (گونەهکارانە) د تۆمارا دۆژەهیاندایە. ﴿٨﴾ تو چ دزانی ئەو تۆمارە چییە؟. ﴿٩﴾ دەفتەرەکا ب ناڤ و نیشانە. ﴿١٠﴾ وەی ئیزا و نەخۆشیا وێ رۆژێ بۆ بێ باوەر و خودێ نەناس و گونەهکاران بیت. ﴿١١﴾ ئەوێت بێ باوەر ژ هاتنا رۆژا جزادانێ، و درەو ددانن. ﴿١٢﴾ ئەو ب تنێ یێ ژێ بێ باوەرە و درەو ددانیت، ئەوێ ستەمکار و گونەهکار بیت. ﴿١٣﴾ دەمێ قورئان بۆ دئێتە خواندن، دبێژیت: ئەڤە گۆتگۆتك و ئەفسانەیێت پێشیانن. ﴿١٤﴾ نەخێر وەنینە... بەلکوو گونەهێت وان دلێ وان گرتییە و کۆرە کرییە. ﴿١٥﴾ نەخێر... ئەو وێ رۆژێ [رۆژا دویماهییێ] ژ دیتنا خودێ بێ بارن. ﴿١٦﴾ پاشی ئەو دێ چنە د دۆژەهێدا و دێ ئیزای بینن. ﴿١٧﴾ پاشی ملیاکەتێت دەرگەهڤان دێ بێژنە وان: ئەها ئەڤە ئەوە یا هەوە باوەری پێ نەی و درەو ددانا. ﴿١٨﴾ ب راستی دەفتەرا خۆش مرۆڤ و خودێناسان د جهەکێ بەحەشتێ یێ بلند دایە. ﴿١٩﴾ تو چ دزانی، ئەو جهێ بلند یێ چاوایە. ﴿٢٠﴾ دەفتەرەکا ب ناڤ و نیشانە. ﴿٢١﴾ ملیاکەتێت خودان رێز و رویمەت ل دەڤ خودێ، دێ ڤێ دەفتەرێ ئامادەکەن و رۆژا دویماهییێ شادەییێ بۆ دەن. ﴿٢٢﴾ هندی خۆش مرۆڤ و خودێناسن، دێ د بەحەشتێدا بن. ﴿٢٣﴾ دێ ل سەر تەختێت چارچەفکری، بەرێ خۆ دەنە وێ خێرا خودێ بۆ وان بەرهەڤکری. ﴿٢٤﴾ دێ نیشانێت خۆشییێ د ناڤ چاڤێت وانرا بینی. ﴿٢٥﴾ دێ ژ مەیەکا سەرمۆر ڤەخۆن. ﴿٢٦﴾ دویماهییا وێ ڤەخوارنێ تاما مسکێ ددەت، بلا هەڤرکییێ ئەها بۆ ڤێ بکەن. ﴿٢٧﴾ تێکەلێ وێ ژ کانییەکا زێدە ب قەدرە د بەحەشتێدا. ﴿٢٨﴾ کانییەکە خودێناس و خۆش مرۆڤ ژێ ڤەدخۆن. ﴿٢٩﴾ ئەوێت ژ رێ دەرکەڤتین د دنیایێدا، بۆ خۆ ب خودان باوەران دکەنین. ﴿٣٠﴾ دەمێ د بەر وانرا دبۆرین، چاڤێت خۆ ل هەڤدوو دنقاندن. ﴿٣١﴾ دەمێ دزڤرینە مال بۆ خۆ دکرنە پێ ترانك، و خۆشی ژێ ددیتن د سوحبەتێت خۆدا. ﴿٣٢﴾ و ئەگەر ددیتن دگۆتن: ئەڤەنە یێت گومرا و رێبەرزە. ﴿٣٣﴾ و ئەو رێدەرکەڤتی نەهاتینە هنارتن کو زێرەڤانییێ ل وان بکەن.

﴿٣٤﴾ ئەڤـا ئەڤـرۆ (ڕۆژا قیامەتـێ) خودان بـاوەر دێ ب
بـێ باوەران کەنن. ﴿٣٥﴾ ل سـەر تەختێت چارچەفکری
دێ تەماشـە کەنـە وان. ﴿٣٦﴾ دا بزانـن کا گـاور ل سـەر
گونەهێـت خـۆ هاتنە جـزادان و یا دنیایــێ بـۆ وان ما!.

## سۆرەتا ئینشیقاق

### ل مەکەهێ هاتیـە خوارێ (٢٥) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ دەمێ ئـەسمـان پرت پرت دبیت. ﴿٢﴾ و [ئەسمـانی]
گوهداریـیا خودایــێ خـۆ کـر، و گوهداریـیا فەرمانا
خـودێ ل سـەر پێدڤـی بـوو. ﴿٣﴾ و دەمـێ ئەرد ڕاست
دبیـت، و چو کەند و کۆر و چیا تێـدا نەمینن. ﴿٤﴾ و ناڤ
زکێ خۆ ژ مریـییێت تێدا و هەر تشـتەکێ دی، سـەر ئەرد
کـر و چـو د نـاڤ خـۆدا نەهێـلا. ﴿٥﴾ و گوهداریـیا
خودایــێ خـۆ کـر، و گوهداریـیا فەرمانا خـودێ ل
سـەر پێدڤـی بـوو. ﴿٦﴾ هـەی مرۆڤۆ، هـەر تشـتەکێ تو
خـۆ پێڤـە دوەسـتینی، و تـو د گـەل کارێ خۆ دێ چیـیە
بەرانبـەری خودایــێ خـۆ. ﴿٧﴾ ڤێجـا هـەر کەسـێ دەفتـەرا خۆ ب دەسـتێ ڕاسـتێ وەرگریـت [ملیاکەتا دایــێ
و ب دەسـتێ ڕاسـتێ وەرگـرت]. ﴿٨﴾ دێ حسـێبەکا سـڤك د گـەل ئێتەکـرن. ﴿٩﴾ و دێ ب دلخۆشـی ب سـەر
کـەس و کارێـت خـۆدا زڤڕیـت. ﴿١٠﴾ و ئەو کەسـێ ستۆیــێ وی هاتـە ڕاندن، و دەفتـەرکا کار و کریارێت خۆ
ژ پشـتڤە وەرگـرت [وەختێ ملیاکـەت دەفتەران دئینـن مرۆڤێ چاك یــێ ژ خۆ پشتڕاسـتە و کتێبا خۆ ب دەسـتێ
ڕاسـتێ وەردگریت، بەلێ گونەهکار خۆ دنیاسیت دێ ڤەدەمێت وی شـکێن و پێسـترکێ گریت، و یەلڵا دشـێت
ب دەسـتێ چەپـێ وەرگریـت]. ﴿١١﴾ هنگـی دێ مرنـا خـۆ خوازیـت و نفرینـان ل خـۆ کـەت. ﴿١٢﴾ و دێ چیتە
د دۆژەهێـدا و ئیزایــێ بینیـت. ﴿١٣﴾ ئـەو د نـاڤ کـەس و کارێـت خـۆدا ل سـەر دنیایــێ یــێ دلخـۆش و شـاد
بـوو. ﴿١٤﴾ ئـەوی هـزر دکر ناچیتـە بەر دەسـتێ خودێ، و جـارەکا دی سـاخ نابیتەڤە پشـتی مرنـێ. ﴿١٥﴾ نەخێر
وەنینـە چونکـی خـودێ ئاگەهـداری هەمـی کار و کریارێت وی بـوو. ﴿١٦﴾ سـویند ب سـۆراتیا ڕۆژئاڤابوونێ.
﴿١٧﴾ سـویند ب شـەڤێ، و ب هـەر تشـتەکێ کـۆم دکـەت و دجڤینیـت. ﴿١٨﴾ سـویند ب هەیڤا چاردە شـەڤی.
﴿١٩﴾ هویـن دێ ژ ڕەوش و پەرگالەکـێ چنـە د ڕەوش و پەرگالـەکا دیـدا. ﴿٢٠﴾ ڤێجـا وان خـێرە بۆچـی ئـەو
باوەریـیێ نائینـن؟. ﴿٢١﴾ دەمـێ قورئـان بـۆ وان دئێتـە خوانـدن ئـەو گوهداریـیا وێ ناکـەن، و سوجدەیــێ بۆ
نابـەن. ﴿٢٢﴾ نەبـەس سوجدەیــێ بـۆ نابـەن بەلکـی ئەڤێـت بـێ بـاوەر، قورئانـێ و ڕۆژا قیامەتـێ دەرەو ددانـن.
﴿٢٣﴾ و خـودێ دزانیـت کا ئـەو چ د دلـێ خۆدا ڤەدشـێرن (و کا چ د دلـێ واندایـە)؟ ﴿٢٤﴾ ڤێجا مزگینیـیا ئیزا و
نەخۆشـیـیەکا دژوار بدە وان..



فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ﴿٣٤﴾ عَلَى
ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٦﴾

سُورَةُ الانشِقَاق

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ثلاثة أرباع الحزب ٥٩
إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ﴿١﴾ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ﴿٣﴾
وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ ﴿٤﴾ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ﴿٦﴾ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ
كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوۡفَ يُحَاسَبُ حِسَابٗا يَسِيرٗا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ
إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورٗا ﴿٩﴾ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوۡفَ
يَدۡعُواْ ثُبُورٗا ﴿١١﴾ وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا ﴿١٣﴾
إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾ بَلَىٰٓۚ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا ﴿١٥﴾ فَلَآ أُقۡسِمُ
بِٱلشَّفَقِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ ﴿١٧﴾ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴿١٨﴾
لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٖ ﴿١٩﴾ فَمَا لَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قُرِئَ
سجدة عَلَيۡهِمُ ٱلۡقُرۡءَانُ لَا يَسۡجُدُونَ۩ ﴿٢١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُكَذِّبُونَ ﴿٢٢﴾
وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴿٢٣﴾ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٤﴾

إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونِۭ ٢٥

## سُورَةُ البُرُوجِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡبُرُوجِ ١ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡمَوۡعُودِ ٢ وَشَاهِدٖ وَمَشۡهُودٖ ٣
قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ ٤ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ ٥ إِذۡ هُمۡ عَلَيۡهَا
قُعُودٞ ٦ وَهُمۡ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ شُهُودٞ ٧ وَمَا نَقَمُواْ
مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ٨ ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ٩ إِنَّ ٱلَّذِينَ
فَتَنُواْ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَتُوبُواْ فَلَهُمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمۡ
عَذَابُ ٱلۡحَرِيقِ ١٠ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ
جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡكَبِيرُ ١١ إِنَّ بَطۡشَ
رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ١٢ إِنَّهُۥ هُوَ يُبۡدِئُ وَيُعِيدُ ١٣ وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلۡوَدُودُ ١٤
ذُو ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡمَجِيدُ ١٥ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ١٦ هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ
ٱلۡجُنُودِ ١٧ فِرۡعَوۡنَ وَثَمُودَ ١٨ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي تَكۡذِيبٖ ١٩ وَٱللَّهُ
مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطُۢ ٢٠ بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ٢١ فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ٢٢



﴿٢٥﴾ ژ بلی وان ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت قەنج کرین، خەلاتەکێ بێ ڤەبڕین بۆ وان هەیە.

## سۆرەتا برووج

### ل مەکەهێ هاتیە خوارێ (٢٢) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ سویند ب وی ئەسمانی، یێ ستێر لێ خودان جهـ و قویناخ. ﴿٢﴾ و سویند ب وێ ڕۆژا ژڤان پێ هاتیە دان (کو ڕۆژا قیامەتێیە). ﴿٣﴾ و سویند ب وان یێت شادەیییێ ددەن، و ب وان یێت شادەیی بۆ وان دئێتە دان. ﴿٤﴾ خودانێت خەندەکێ ژ ڕەحم و دلۆڤانییا خودێ هاتنە دویرئێخستن. ﴿٥﴾ خودانێت ئاگرێ ب داردوی. ﴿٦﴾ دەمێ ئەو ل دۆر ئاگری د ڕوینشتی. ﴿٧﴾ و وان نێزیک سەرپەرشتیا ڤێ نەخۆشییێ دکر، و ددیتن کا چ ب سەرێ وان باوەرداران دهات و بەرێ خۆ ددانێ. ﴿٨﴾ ئەوان ئەڤ ئێزایە دا بەر وان ب تنێ، ژ بەر هندێ بوو چونکی وان باوەری ب خودایێ دەستهەلاتدار و هێژای سوپاسییێ ئینابوو. ﴿٩﴾ ئەو خودایێ ملك و پاشاتیا ئەرد و ئەسمانان د دەستدا، و ئاگەهدار ب هەر تشتەکی. ﴿١٠﴾ بێ گۆمان ئەو کەسێت خودان باوەر، چ ژن چ مێر، ئێزادایین و سۆتین، و ل خۆ نەزڤرین، ئێزایا دۆژەهێ و ئێزایا سۆتنێ بارا وانە. ﴿١١﴾ و ئەو کەسێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت قەنج کرین بەحەشتا گەلەك جۆ و ئاڤ د بنرا دچن، دێ بیتە بارا وان، و ئەها ئەڤەیە سەرکەڤتنا مەزن. ﴿١٢﴾ ب ڕاستی ئێزادانا خودایێ تە یا دژوارە. ﴿١٣﴾ ئەها ئەوە یێ مرۆڤی ژ چونەیێ چێدکەت، و ساخ دکەتەڤە [پشتی دمریت]. ﴿١٤﴾ و ئەوە یێ گونەهان ژێ دبەت و دنخێڤیت، و ئەوە یێ بەندەدۆست. ﴿١٥﴾ خودانێ عەرشی، خودایێ پایە بلند. ﴿١٦﴾ تشتێ بڤێت، دکەت. ﴿١٧﴾ ئەرێ سوحبەت و دابێشا (بەحسێ) لەشکەری گەهشتییە تە. ﴿١٨﴾ فیرعەون و (سەموود). ﴿١٩﴾ بەلێ ئەوێت باوەری نەئینایین ژ قورەیشییان، تە درەوین ددانن. ﴿٢٠﴾ و خودێ ئاگەهـ ژ وان هەیە، و دێ وان ژی وەکی لەشکەرێ فیرعەونی و (سەموود)ی تێ بەت. ﴿٢١﴾ نێ ئەڤە قورئانەکا مەزن و پیرۆز و پایە بلندە. ﴿٢٢﴾ ئەڤ قورئانە د دەپەکێ پاراستیدا نڤێسییە.

سُورَةُ الطَّارِقِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ١ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ ٢ ٱلنَّجْمُ ٱلثَّاقِبُ ٣
إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ ٤ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ٥
خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ٦ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ٧ إِنَّهُۥ
عَلَىٰ رَجْعِهِۦ لَقَادِرٌ ٨ يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ ٩ فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٍ وَلَا
نَاصِرٍ ١٠ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجْعِ ١١ وَٱلْأَرْضِ ذَاتِ ٱلصَّدْعِ ١٢
إِنَّهُۥ لَقَوْلٌ فَصْلٌ ١٣ وَمَا هُوَ بِٱلْهَزْلِ ١٤ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ١٥
وَأَكِيدُ كَيْدًا ١٦ فَمَهِّلِ ٱلْكَٰفِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًۢا ١٧

سُورَةُ الأَعْلَىٰ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحِزْبُ ٦٠ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ١ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ٢ وَٱلَّذِى قَدَّرَ
فَهَدَىٰ ٣ وَٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلْمَرْعَىٰ ٤ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحْوَىٰ ٥
سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ٦ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ ٧
وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ٨ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ٩ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ١٠



## سۆرەتا طارق

**ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (١٧) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ سویند ب ئەسمانی، و وان ستێرێت ب شەڤ
دەردكەڤن. ﴿٢﴾ تو چ دزانی ئەو ستێرێت ب شەڤ
دەردكەڤن چنە؟. ﴿٣﴾ ئەو ستێرە یا تارییێ دسومیت
و هلدچنیت. ﴿٤﴾ هەر كەسەكی ملیاكەتەك دگەلە، و
كار و كریارێت وی دنڤیسیت. ﴿٥﴾ بلا هەر كەسەك
برێنتێ، كا ژ چ هاتییە چێكرن. ﴿٦﴾ نێ یێ ژ ئاڤەكا
هلپەرژی (بلقە) چێبووی. ﴿٧﴾ ئەڤ ئاڤە ژ مۆركێت
پشتا مێران، و ژ هەستیێ سینگێ ژنان دزێت.
﴿٨﴾ و خودایێ مەزن ل سەر ساخكرنا وی، پشتی
مراندنێ، خودان شیانە. ﴿٩﴾ رۆژا هەمی نهێنی
ئاشكەرا دبن. ﴿١٠﴾ وێ رۆژێ وی مرۆڤی چو هێز و
پشتەڤان نینن. ﴿١١﴾ سویند ب وی ئەسمانێ خودان
باران، و باران دارێژ. ﴿١٢﴾ و ب وی ئەردێ خودان
كەلش [گل و گیا و شینكاتی دكەلێشن]. ﴿١٣﴾ ئەها ئەڤ قورئانە گۆتنەكا ڤەبرە و جوداكەرە [حەقی و
نەحەقییێ ژێك جودا دكەت]. ﴿١٤﴾ و ئەڤ قورئانە راستییە، یاری تێدا نینە. ﴿١٥﴾ ب راستی ئەوێت بێ
باوەر بوویین، و باوەری ب ڤێ قورئانێ نەئینایین، فندوفێلان دگێرن. ﴿١٦﴾ و من ئاگەهـ ژ وان هەیە و ئەز
ژی ئویینان بۆ وان ددانم و دێ فندوفێلێت وان ب سەرێ واندا دشكێنم. ﴿١٧﴾ ڤێجا بێهنا خۆ ل گاوران
فرەهـ بكە، و پیچەكا مۆلەتێ بدە وان، دێ بینی كا دێ چ ئێنمە سەرێ وان.

## سۆرەتا ئەعلا

**ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (١٩) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ ب پاك و پاقژی ناڤێ خودایێ خۆ یێ بلند بینە. ﴿٢﴾ ئەو خودایێ هەر تشتەك چێكری، و بێ كێماسی
لێكدایی و ب سەروبەر كری. ﴿٣﴾ و ئەوێ هەر تشتەك ب كێش و پیڤان كری، و رێ نیشادایی. ﴿٤﴾ و ئەوێ
چەرە دایی و شینكری. ﴿٥﴾ پاشی سەواند (هشكر)، و كرە پویشەكێ هشك و رەش. ﴿٦﴾ ئەم دێ تە كەینە
قورئانخوین، و تو چو ژێ ژ بیر ناكەی. ﴿٧﴾ ئەو تێ نە، یا خودێ ڤیایی، خودێ تشتێ ئاشكەرا و نەپەنی
دزانیت، و ئاگەهـ ژێ هەیە. ﴿٨﴾ و ئەم دێ تە ب سەر رێكا سانەهی ئێخین [كو ئیسلامە]. ﴿٩﴾ خەلكی ب
قورئانێ شیرەت بكە، ئەگەر بۆ خۆ مفایەكی ژ شیرەتێ وەربگرن. ﴿١٠﴾ و ئەو دێ مفایی ژێ وەرگریت، یێ
ژ خودێ بترسیت.

وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلۡأَشۡقَى ﴿١١﴾ ٱلَّذِي يَصۡلَى ٱلنَّارَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴿١٢﴾ ثُمَّ لَا يَمُوتُ
فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ ﴿١٣﴾ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾
بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ﴿١٦﴾ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ﴿١٧﴾ إِنَّ
هَٰذَا لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾

## سُورَةُ الغَاشِيَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ ﴿١﴾ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٞ
نَّاصِبَةٞ ﴿٣﴾ تَصۡلَىٰ نَارًا حَامِيَةٗ ﴿٤﴾ تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٖ ﴿٥﴾ لَّيۡسَ
لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٖ ﴿٦﴾ لَّا يُسۡمِنُ وَلَا يُغۡنِي مِن جُوعٖ ﴿٧﴾ وُجُوهٞ
يَوۡمَئِذٖ نَّاعِمَةٞ ﴿٨﴾ لِّسَعۡيِهَا رَاضِيَةٞ ﴿٩﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ ﴿١٠﴾ لَّا تَسۡمَعُ
فِيهَا لَٰغِيَةٗ ﴿١١﴾ فِيهَا عَيۡنٞ جَارِيَةٞ ﴿١٢﴾ فِيهَا سُرُرٞ مَّرۡفُوعَةٞ ﴿١٣﴾ وَأَكۡوَابٞ
مَّوۡضُوعَةٞ ﴿١٤﴾ وَنَمَارِقُ مَصۡفُوفَةٞ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِيُّ مَبۡثُوثَةٌ ﴿١٦﴾ أَفَلَا يَنظُرُونَ
إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ رُفِعَتۡ ﴿١٨﴾ وَإِلَى
ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ ﴿٢٠﴾
فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ ﴿٢١﴾ لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ ﴿٢٢﴾





﴿١١﴾ و ئەو دێ پشتا خۆ دەتێ و گوهدارییێ لێ
ناكەت، یێ ژ دل ل سەر گاورییێ. ﴿١٢﴾ ئەو كەس
ژدل گاور دێ چیتە د ناڤ ئاگرێ مەزندا. ﴿١٣﴾ پاشی
نە تێدا دمریت، دا ژێ ڕزگار ببیت، و نە ژی خۆشییێ
تێدا دبەت. ﴿١٤﴾ ب ڕاستی ئەو كەسێ سەرفەرازە یێ
خۆ ژ گونەهان پاقژ بكەت . ﴿١٥﴾ و ناڤێ خودایێ
خۆ ژ دل بینیت و نڤێژان بكەت. ﴿١٦﴾ بەلێ هوین
خۆشییێت دنیایێ، ب سەر ئاخرەتێ دئێخن و چێتر
دبینن. ﴿١٧﴾ و ئاخرەت چێترە و خودان مانە و ب
دۆمە. ﴿١٨﴾ بێ گۆمان ئەڤا بۆری، د كتێبێت بەرێدا
یا هاتی، و یا هەی. ﴿١٩﴾ د كتێبێت ئیبراهیم پێغەمبەر
و مووسا پێغەمبەردا.

## سۆرەتا غاشییە

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٢٦) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ ئەرێ سالۆخێ ڕۆژا قیامەتێ بۆ تە هات؟ [ئانكو
ئەو سالۆخ بۆ تە هاتییە، كو دبێژنە ڕۆژا قیامەتێ (غاشیە) چونكی ترس و لەرزا وێ هەر گیاندارەكی
دگریت]. ﴿٢﴾ وێ ڕۆژێ هندەك سەروچاڤ د ڕەزیل و ڕسوانە. ﴿٣﴾ د دنیاییدا كار و كریارێت وەسا كرینە،
كو ڕۆژا قیامەتێ بۆ وان ببنە ئێزا و نەخۆشی. ﴿٤﴾ وێ ڕۆژێ ئەو دێ چنە د ئاگرەكێ شارییایدا. ﴿٥﴾ دێ
ئاڤێ ژ كانییەكا كەل و گەرم، دەنە وان. ﴿٦﴾ وان چو خوارن نینە ژ بلی سترییەكێ گەنی و تەحل نەبیت.
﴿٧﴾ نە مرۆڤی قەلەو دكەت، و نە برسێ دشكێنیت. ﴿٨﴾ وێ ڕۆژێ هندەك سەروچاڤ د گەش و دلخۆشن.
﴿٩﴾ ژ كار و كریار و خەباتا خۆ، پڕ قایلن. ﴿١٠﴾ د بەحەشتەكا بلند دانە. ﴿١١﴾ تو تێدا ئاخڤتنا پویچ و بێ
مفا نابهیسی. ﴿١٢﴾ كانییێت ئاڤ ژ بەر دچیت تێدانە. ﴿١٣﴾ تەختێت بلند و بەركەڤتی تێدانە. ﴿١٤﴾ هەروەسا
پەرداغێت دانایی و ڕێزكری. ﴿١٥﴾ و بالگەهێت ڕێزكری. ﴿١٦﴾ و بەڕكێت (مەحفویرێت) ڕائێخستی تێدانە.
﴿١٧﴾ ما نارێننە حێشترێ، كا چاوا هاتییە چێكرن؟!. ﴿١٨﴾ و ما نارێننە ئەسمانی، كا چاوا بێ ستوین هاتییە
بلندكرن؟!. ﴿١٩﴾ و ما نارێننە چیایان، كا چاوا د ئەردیدا هاتینە چكلاندن؟!. ﴿٢٠﴾ و ما نارێننە ئەردی، كا
چاوا هاتییە ڕاستكرن؟!. ﴿٢١﴾ بینە بیرا وان، بەس شیرەت و بیرئینان ل سەر تەیە. ﴿٢٢﴾ دەستێ تە نە ل سەر
سەرێ وانە، و تو ل سەر وان نەیێ سەردەست و زالی.

إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴿٢٤﴾
إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾

## سُورَةُ الفَجْرِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ﴿٣﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴿٤﴾
هَلْ فِى ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِى حِجْرٍ ﴿٥﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾
إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ ﴿٧﴾ ٱلَّتِى لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿٨﴾ وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ
جَابُوا۟ ٱلصَّخْرَ بِٱلْوَادِ ﴿٩﴾ وَفِرْعَوْنَ ذِى ٱلْأَوْتَادِ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ طَغَوْا۟ فِى
ٱلْبِلَٰدِ ﴿١١﴾ فَأَكْثَرُوا۟ فِيهَا ٱلْفَسَادَ ﴿١٢﴾ فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ
عَذَابٍ ﴿١٣﴾ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ
رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ
فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا تُكْرِمُونَ
ٱلْيَتِيمَ ﴿١٧﴾ وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿١٨﴾ وَتَأْكُلُونَ
ٱلتُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا ﴿١٩﴾ وَتُحِبُّونَ ٱلْمَالَ حُبًّا جَمًّا ﴿٢٠﴾ كَلَّآ ۖ إِذَا
دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ﴿٢١﴾ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾





﴿٢٣﴾ ئەو تێ نەبیت یێ پشت ددەتە باوەرییێ، و
گاور دبیت. ﴿٢٤﴾ ڤێجا خودێ دێ ئیزا و نەخۆشیا
دۆژەهێ (جەهنەمێ) یا مەزن دەتە بەر وی. ﴿٢٥﴾ بێ
گۆمان زڤرینا وان، هەر ب بال مەڤەیە. ﴿٢٦﴾ پاشی
جزادانا وان ژی، هەر ل سەر مەیە.

## سۆرەتا فەجر

### ل مەکەهێ هاتیە خوارێ (٣٠) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ سویند ب سپێدەیێ. ﴿٢﴾ و سویند ب دەهکێت جەژنا
حاجیان (دەهکێت سەرێ ژی الحجە). ﴿٣﴾ و سویند ب
کت و جۆتێ هەر تشتەکی. ﴿٤﴾ و سویند ب شەڤێ
دەمێ دچیت. ﴿٥﴾ ئەرێ ئەڤ تشتێت سویند پێ
هاتیە خوارن، نە هێژا و لائقی سویند خوارنێنە؟.
﴿٦﴾ تە نەزانی کا خودایێ تە چ ب سەرێ ملەتێ
هوود پێغەمبەری ئینا؟. ﴿٧﴾ ئیرەما [ئیرەم ناڤەکە
بۆ عاد] خودان ستوین و پایە یان خودان هێز و
بەژنوبال. ﴿٨﴾ ئەو ملەتێ وەکی وان، ب قەلافەت و خودان گەود و هێز، دەردیدا نەهاتینە چێکرن.
﴿٩﴾ و تە نەزانی کا چ ب سەرێ ملەتێ [(صالح) پێغەمبەر] (سەموود) ئینا، ئەوێت بەر ل (وادی القری)
دبرین، [جهەکە دکەڤیتە د ناڤبەرا شام و حیجازێدا]؟ ﴿١٠﴾ و کا چ ب سەرێ فیرعەونێ خودان لەشکەر، ئەو
لەشکەرێ ب زەند و باسك و هێز، ئینا؟ ﴿١١﴾ ئەوێت گەلەك دەستدرێژی و زێدەگاڤی د گونەهێدا کرین.
﴿١٢﴾ و گەلەك بێخێری و بێ شەرمی تێدا کرین. ﴿١٣﴾ ڤێجا خودایێ تە ئیزا و نەخۆشییەکا دژوار، ب سەرێ
واندا دارێت. ﴿١٤﴾ خودایێ تە ل بەر وان یێ راوەستیایە، و هەمی کار و کریارێت وان ل بەر د ئاشکەرانە
[و هەر ئێکی جزایێ وی دێ دەتێ]. ﴿١٥﴾ ڤێجا دەمێ خودێ مرۆڤی ب خێر و کەرەما خۆ دجەرببینیت،
دبێژیت: [ئانکو مرۆڤ دبێژیت] خودێ دا من، و ئەڤە قەدرە بۆ من، و ئەڤ خێر و کەرەمە نائێنە بەرچاڤان
و نوزانیت جەرباندنە. ﴿١٦﴾ و ئەگەر خودێ جەرباند، رێکا ژینێ لێ بەرتەنگ کر، دێ بێژیت: خودێ ئەز
رەزیل و رسوا کرم. ﴿١٧﴾ نەخێر وەنینە [دان و نەدان، ب قەدری و نەقدریڤە، نە یا گرێدایییە]، نێ هوین ب
راستی قەنجی و مەردینییێ د راستا سێویدا ناکەن. ﴿١٨﴾ هوین ئێك و دو د بەر هاریکارییا بەلنگازیرا ناکەن.
﴿١٩﴾ و هوین میراتێ حەلال و حەرام پێکڤە دخۆن [و حەقێ میراتخۆران ب دورستی نادەنێ، نەخاسمە یێ
کچان]. ﴿٢٠﴾ و هوین گەلەك حەژ مالدارییێ ژی دکەن. ﴿٢١﴾ هۆ نەکەن، دەمێ ئەرد دهەژییێت و راست
دبیت، و چو ل سەر نەمینیت. ﴿٢٢﴾ و خودێ هات بۆ جوداکرنا هەقییێ ژ نەهەقییێ، و ملیاکەت رێز رێز
هاتن.

وَجِاْيٓءَ يَوْمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَۚ يَوْمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ
لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿٢٣﴾ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي ﴿٢٤﴾ فَيَوْمَئِذٖ
لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيَّتُهَا
ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرْضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾
فَٱدْخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾

## سُورَةُ البَلَدِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿١﴾ وَأَنتَ حِلُّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿٢﴾ وَوَالِدٖ وَمَا وَلَدَ ﴿٣﴾
لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ ﴿٤﴾ أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ
أَحَدٞ ﴿٥﴾ يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالٗا لُّبَدًا ﴿٦﴾ أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٧﴾
أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانٗا وَشَفَتَيْنِ ﴿٩﴾ وَهَدَيْنَٰهُ
ٱلنَّجْدَيْنِ ﴿١٠﴾ فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾
فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوْ إِطْعَٰمٞ فِي يَوْمٖ ذِي مَسْغَبَةٖ ﴿١٤﴾ يَتِيمٗا ذَا مَقْرَبَةٍ ﴿١٥﴾
أَوْ مِسْكِينٗا ذَا مَتْرَبَةٖ ﴿١٦﴾ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَوَاصَوْاْ
بِٱلصَّبْرِ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلْمَرْحَمَةِ ﴿١٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿١٨﴾



﴿٢٣﴾ وێ ڕۆژێ دۆژەهـ هاتـە بەرهەڤكرن، ئەو ڕۆژا مرۆڤ هەمی كار و كریارێت خۆ ل پێش چاڤێت خۆ دبینیت و دئینیتە بیرا خۆ، بەلێ چو مفای ژێ نابینیت. ﴿٢٤﴾ دبێژیت خۆزی من تشتەك بۆ ژینا خۆ كربایە [و ژ نوی دزانیت ژیانا دورست ژیانا ئاخرەتییە، نەیا دنیایێ ئەوا كورت]. ﴿٢٥﴾ وێ ڕۆژێ كەس وەكی خودێ ئیزا و نەخۆشییێ نادەتە بەر. ﴿٢٦﴾ و كەس وەكی خودێ وی نائێخیتە قەید و زنجیران. ﴿٢٧﴾ (د وێ ڕۆژێدا دێ ئێتە گۆتن:) هەی نەفسا ب باوەری و ئێمن و ڕەحەت و پشت ڕاست. ﴿٢٨﴾ ب بال خودایێ خۆڤە بزڤڕە، قایل و ڕازی ب بارا خۆ، سەرباری ڕازیبوونا خودێ ژ تە. ﴿٢٩﴾ ڤێجا خۆ بدە د گەل بەندەیێت من. ﴿٣٠﴾ و هەرە د بەحەشتا مندا.

## سۆرەتا بەلەد

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٢٠) ئایەتە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ سویند ب ڤی باژێری [كو مەكەهە]. ﴿٢﴾ و تو یێ د ڤی باژێریدا. ﴿٣﴾ و دیسا سویند ب باب و زارۆكێت وی. [ئانكو ب ئادەمی و دویندەها وی] ﴿٤﴾ ب ڕاستی مە مرۆڤێ چێكری ژ كەڤت و ڕەفت و نەخۆشییێ، [و د دنیایێدا باش و خراب د هەڤپشكن، د دیتنا نەخۆشی و وەستیانێدا ب كارێ تەنگاڤی و خەمخوارنێ]. ﴿٥﴾ ئەرێ مرۆڤ هزر دكەت كو كەس نەشێتێ. ﴿٦﴾ ب شانازیڤە دبێژیت: من گەلەك مال یێ مەزاختی [و من گەلەك مال یێ هەی]. ﴿٧﴾ ما هزر دكەت كەس وی نابینیت، ئانكو یا ژ ویڤە، خودێ وی نابینیت و پسیاری ژێ ناكەت [كا ئەو مال ژ كیڤە ئینایە، و د چ دا مەزاختییە؟!]. ﴿٨﴾ ما مە ڕوی و چاڤ نەدایینێ. ﴿٩﴾ و ما مە ئەزمانەك و دو لێڤ نەدایینێ. ﴿١٠﴾ و ما مە هەردو ڕێك [یا قەنج و یا خراب] بۆ ئاشكەرا نەكرینە و نیشا نەداینە. ﴿١١﴾ بلا ژ ئاستەنگێ ببۆریت [و گەلەك مرۆڤ ژ ئاستەنگان نەبۆرین ـ ئەو ئاستەنگێت ڕێكا وان ژ سەرفەرازییێ ددا پاش ـ و ڕێكا سەرفەرازییێ نەگرتن]. ﴿١٢﴾ و ما تو چ دزانی كا ئەو ئاستەنگ چییە؟ ﴿١٣﴾ گەردەن ئازادكرنە. ﴿١٤﴾ و ناندانە د ڕۆژا برسێدا. ﴿١٥﴾ بۆ سێویێ ژ خزم و خوینا مرۆڤی. ﴿١٦﴾ یان بۆ بەلنگازەكێ دەست تەنگ. ﴿١٧﴾ پاشی ژ وان بیت ئەوێت باوەری ئینایین، و هەڤدوو ب بێنفرەهی و دلۆڤانییێ شیرەت دكەن. ﴿١٨﴾ ئەها ئەڤەنە دلخۆش و بەختەوەر [كتێبا خۆ ب دەستێ ڕاستێ وەردگرن].

﴿١٩﴾ و ئەوێت باوەری ب قورئانێ نەئینایین، ئەون
بەخت ڕەش و دل نەخۆش [کتێبا خۆ ب دەستێ
چەپێ وەردگرن]. ﴿٢٠﴾ د ناڤ ئاگرەکێ دادایی دانە،
و هەمی ڕەخێت ئاگری ل وان یێت دائێخستینە [و ب
چو ڕەنگان هیڤی نینە ژێ دەرکەڤن].

## سۆرەتا شەمس

### ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (١٥) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ سویند ب ڕۆژێ و ڕۆناهییا وێ. ﴿٢﴾ و سویند ب هەیڤێ
دەمێ دکەڤتە دویڤ (ژ بۆ ڕۆنکرنێ). ﴿٣﴾ و سویند ب ڕۆژێ
دەمێ ب ڕۆناهییا ڕۆژێ ڕۆن دبیت. ﴿٤﴾ و سویند ب شەڤێ
دەمێ ڕۆناهییێ هلدچنیت. ﴿٥﴾ و سویند ب ئەسمانی، و
سویند ب یێ ئەسمان دانای و ڕانای. ﴿٦﴾ و سویند ب ئەردی،
و یێ ئەرد بەرهەڤکری و دەشتکری بۆ ژینێ. ﴿٧﴾ و سویند
ب نەفسێ، و یێ نەفس بێ کێم و کاسی چێکری و دای.
﴿٨﴾ و پاشی قەنجی و خرابی نیشا دای. ﴿٩﴾ [سویند ب
ڤان هەمییان] ب ڕاستی هەر کەسێ ئەو نەفس ژ گونەهان پاقژ کر سەرفەرازە [ڕۆژا ئاخرەتێ]. ﴿١٠﴾ و دیسا ب ڕاستی
هەر کەسێ نەفسا خۆ ب گونەهان کێمکر و شکاند، زیانکارە [ڕۆژا ئاخرەتێ]. ﴿١١﴾ (سەموود) پێغەمبەرێ خۆ درەوین
دانا، ژ بەر دەستدرێژی و زێدەگاڤییا خۆ د گونەهاندا. ﴿١٢﴾ دەمێ یێ ژ هەمییان پیستر [و خرابتر]، ڕابوویییە سەر
خۆ. ﴿١٣﴾ و پاشی پێغەمبەرێ خودێ گۆتە وان: ژ حێشترا خودێ بگەڕن و مایێ خۆ د ئاڤ و ڤەخوارنا وێدا نەکەن.
﴿١٤﴾ باوەری پێ نەئینان و درەوین دانا و حێشتر کوشتن، ڤێجا خودایێ وان ئیزا و نەخۆشی ب سەر واندا داڕێت، ژ بەر
گونەها وان و هەمی دانە بەر [چونکی هەمی د هەڤپشك و هاریکاربوون د گونەهێدا]. ﴿١٥﴾ خودێ ئەڤە ب سەرێ وان
ئینا، و ژ دویماهیکا ڤێ ئیزادانێ ژی نا ترسیت. [ئانکو چو ترسێ ژ پاشەڕۆژا ڤێ ئیزادانێ ژی ڕاناکەت].

## سۆرەتا لەیل

### ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٢١) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ سویند ب شەڤێ دەمێ تاریاتیا خۆ ب سەر ئەردی داددەت. ﴿٢﴾ و سویند ب ڕۆژێ دەمێ ڕۆن دبیت. ﴿٣﴾ و سویند
ب وی، یێ نێر و مێ چێکرین. ﴿٤﴾ [سویند ب ڤان هەمییان] ب ڕاستی بزاڤ و خەباتا هەوە ژێك جودایە، هندەك
بەر ب خرابییێیە، و هندەك بەر ب قەنجییێیە. ﴿٥﴾ ڤێجا هەر کەسێ مالێ خۆ د ڕێکا خودێدا مەزاخت، و پاشی خۆ
پاراست و فەرمانا خودێ ب جهـئینا. ﴿٦﴾ و باوەری ب بەحەشتێ ئینا، و کار بۆ کر. ﴿٧﴾ ئەم دێ ڕێکا وی بۆ کار و
کریارا باش خۆش کەین [ئەو ڕێکا بەرێ وی بدەتە سەرفەرازیێ]. ﴿٨﴾ و ئەڤە و هەر کەسێ قەلسی و چڕویکاتییێ
بکەت، و پاکی ب خێر و خەلاتێ خودێ نەبیت. ﴿٩﴾ و باوەری ب بەحەشتێ نەئینا، و کار بۆ نەکر و درەو دانا.



وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا هُمْ أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ ﴿١٩﴾ عَلَيْهِمْ نَارٌ مُؤْصَدَةٌ ﴿٢٠﴾

سُورَةُ الشَّمْسِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ﴿١﴾ وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا ﴿٢﴾ وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا ﴿٣﴾
وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا ﴿٤﴾ وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا ﴿٥﴾ وَالْأَرْضِ
وَمَا طَحَاهَا ﴿٦﴾ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا
وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا ﴿١٠﴾
كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَاهَا ﴿١١﴾ إِذِ انْبَعَثَ أَشْقَاهَا ﴿١٢﴾ فَقَالَ لَهُمْ
رَسُولُ اللَّهِ نَاقَةَ اللَّهِ وَسُقْيَاهَا ﴿١٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ
عَلَيْهِمْ رَبُّهُمْ بِذَنْبِهِمْ فَسَوَّاهَا ﴿١٤﴾ وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَا ﴿١٥﴾

سُورَةُ اللَّيْلِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ﴿١﴾ وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ﴿٢﴾ وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَىٰ ﴿٣﴾
إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ﴿٤﴾ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾
فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾

فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ١٠ وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ١١ إِنَّ عَلَيْنَا
لَلْهُدَىٰ ١٢ وَإِنَّ لَنَا لَلْـَٔاخِرَةَ وَٱلْأُولَىٰ ١٣ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ١٤
لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى ١٥ ٱلَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ١٦ وَسَيُجَنَّبُهَا
ٱلْأَتْقَى ١٧ ٱلَّذِي يُؤْتِي مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ١٨ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ
تُجْزَىٰٓ ١٩ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ ٢٠ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ٢١

## سُورَةُ الضُّحَىٰ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلضُّحَىٰ ١ وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ٢ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ٣
وَلَلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ ٤ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ
فَتَرْضَىٰٓ ٥ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ٦ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ٧
وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ٨ فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ٩
وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ ١٠ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ١١

## سُورَةُ الشَّرْحِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ١ وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ٢ نصف الحزب ٦٠





﴿١٠﴾ ڤێجا ئەم دێ ڕێكا وی بۆ كار و كریارا نەباش خۆش كەین [ئەو ڕێكا بەرێ وی بدەتە زیانێ].
﴿١١﴾ پاشی مالێ وی بەرەڤانییێ ژێ ناكەت و چو پاكییێ لێ ناكەت، دەمێ دمریت. ﴿١٢﴾ ل سەر مەیە ئەم ڕێ نیشا هەوە بدەین (ڕێیا باش دا هوین بگرن، و ڕێیا خراب دا خۆ ژێ بدەنە پاش). ﴿١٣﴾ و هەر تشتەكێ د دنیایێ و ئاخرەتێدا، د بن دەستێ مەڤەیە و یێ مەیە. ﴿١٤﴾ ڤێجا مە هوین ژ ئاگرەكێ شاریای ترساندن. ﴿١٥﴾ ئاگرەكە ژ سەرگوم و ڕێبەرزە و گاوران پێڤەتر كەس ناچیتە تێدا. ﴿١٦﴾ ئەو كەسێ باوەری ب هەقییێ نەئینایی، و درەو دانای و پشت دایییە باوەرییێ.
﴿١٧﴾ و هەر كەسێ خۆ دویری سەرگومی و ڕێبەرزەیی و گاورییێ بگریت، دێ دویری ڤی ئاگری بیت.
﴿١٨﴾ ئەو كەسێ مالێ خۆ د ڕێكا خودێدا دمەزێخیت، و دڤێت ژ گونەهان پاقژ ببیت. ﴿١٩﴾ و كەسێ ژێ چو منەت ل سەر نینن، دا بۆ ب بەر بێخیت. ﴿٢٠﴾ ژ بۆ ڤیان و ڕازیبوونا خودێ نەبیت، وەناكەت. ﴿٢١﴾ پاشی ئەو مرۆڤ دێ قایل و دلخۆش بیت، ب خەلاتێ خودێ.

## سۆرەتا ضوحا

**ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (١١) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ سویند ب تێشتەگەهێ. ﴿٢﴾ و سویند ب شەڤێ، دەمێ هەمی گیاندار تێدا ڤەدهەسن، و بێنا خۆ ڤەدكەن. ﴿٣﴾ خودێ پشتا خۆ نەدایییە تە، و كەرب ژ تە ڕانەكرییە. ﴿٤﴾ دویماهی بۆ تە ژ پێشییێ چێترە [ئەڤە مزگینییە بۆ بەردەوامیا پێغەمبەرینییێ]. ﴿٥﴾ ڤێجا خودێ دێ هندێ دەتە تە، هەتا تو پێ قایل دبی. ﴿٦﴾ ما تو سێوی نەدیتی، و تو ڤەحەواندی. ﴿٧﴾ و ما تو شەپرزە نەدیتی، و ڕێ نیشا تە دا. ﴿٨﴾ و ما تو دەستكورت نەدیتی، و تو بێ منەت كری. ﴿٩﴾ ڤێجا تو ژی، سێوی ڕسوا نەكە و نەئێشینە. ﴿١٠﴾ و خواستەكی (و خوازخازوكی) پاشڤە نەبە. ﴿١١﴾ و تو هەر بەحس و دابێشا خێر و كەرەما خودایێ خۆ بكە، و پێ باخڤە و د جهێ وێ یێ پێدڤیدا ب كاربینە.

## سۆرەتا شەرح

**ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٨) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ ما مە سینگێ تە فرەهـ نەكرییە. ﴿٢﴾ و ما مە بارێ تە سڤك نەكرییە.

ٱلَّذِيٓ أَنقَضَ ظَهۡرَكَ ﴿٣﴾ وَرَفَعۡنَا لَكَ ذِكۡرَكَ ﴿٤﴾ فَإِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا ﴿٥﴾
إِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرٗا ﴿٦﴾ فَإِذَا فَرَغۡتَ فَٱنصَبۡ ﴿٧﴾ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرۡغَب ﴿٨﴾

## سُورَةُ التِّينِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ﴿١﴾ وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾ وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ ﴿٣﴾
لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدۡنَٰهُ أَسۡفَلَ سَٰفِلِينَ ﴿٥﴾
إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ ﴿٦﴾
فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعۡدُ بِٱلدِّينِ ﴿٧﴾ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴿٨﴾

## سُورَةُ العَلَقِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقۡرَأۡ
وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ
مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ﴿٥﴾ كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ﴿٧﴾
إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ ﴿٨﴾ أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يَنۡهَىٰ ﴿٩﴾ عَبۡدًا
إِذَا صَلَّىٰٓ ﴿١٠﴾ أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ ﴿١١﴾ أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ ﴿١٢﴾



﴿٣﴾ ئەو بارێ پشتا تە ئێخستییە بەر تە. ﴿٤﴾ و ما مە
ناڤ و دەنگێ تە بلند نەکرییە. ﴿٥﴾ ب ڕاستی هەر
تەنگاڤییەکێ بەرفرەهییەك ل دویڤە. ﴿٦﴾ جارەکا دی، ب
ڕاستی هەر تەنگاڤییەکێ بەرفرەهییەك ل دویڤە. ﴿٧﴾ ڤێجا
هەر دەمێ تو ژ کارەکی ڤەبووی، ژ دل دەست ب کارەکێ
دی بکە. ﴿٨﴾ و بلا هەر خودێ داخوازا تە بیت.

## سۆرەتا تین

### ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٨) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ سویند ب وی جهێ تێر هەژیر، و ب وی جهێ
تێر زەیتوون [دو جە بوون ئێك ل شامێ بوو، و ئێك ل
قودسێ]. ﴿٢﴾ و سویند ب چیایێ (طوور)ی سینا، ئەوێ
خودێ ل سەر، د گەل مووسایی ئاخفتی. ﴿٣﴾ و سویند
ب ڤی باژێرێ ئێمن و تەنا، کو مەکەهە. ﴿٤﴾ [سویند ب
ڤان هەمییان] ب ڕاستی مە مرۆڤ ل سەر باشترین ڕەنگ
و وێنە دورستکرینە و چێکرینە. ﴿٥﴾ پشتی هنگی مە
ئێخستە د پەییسکا ژ هەمییان نزمتردا [نزمترین جهـ]. ﴿٦﴾ ئەو تێ نەبن (ژ بلی وان) یێت باوەری ئینایین و کار و
کریارێت باش کرین، ئەوان خەلاتەکێ بێ ڤەبرین یێ هەی. ﴿٧﴾ ڤێجا [هەی مرۆڤ] ئەو چییە تە ژ ڕۆژا جزادانێ
بێ باوەر دکەت، و وەل تە دکەت تو درەو بدانی. ﴿٨﴾ باشە ما خودێ، نە موکومترینێ فەرمانڕەوا و خوندکارە.

## سۆرەتا عەلەق

### ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (١٩) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ بخوینە ب ناڤێ خودایێ خۆ، یێ هەر تشتەك چێکری. ﴿٢﴾ ئەو خودایێ مرۆڤ ژ خوینپارەیی چێکری. ﴿٣﴾ بخوینە
خودایێ تە، ژ هەر کەسەکێ بەخشندەتر و کەرەمدارترە. ﴿٤﴾ ئەو خودایێ مرۆڤ ب ڕێکا قەلەمی ( خامە و پێنووسی)
فێری نڤێسین و زانستێ کری. ﴿٥﴾ مرۆڤ فێری وی تشتی کرییە، یێ مرۆڤ ژێ بێ ئاگەهـ. ﴿٦﴾ نەخێر بلا کەرەمێت
خودێ ژ بیر نەکەن، ب ڕاستی مرۆڤ د سەردا دچیت و ژ ڕێ دەردکەڤیت. ﴿٧﴾ دەمێ خۆ دەولەمەند و بێ منەت دبینیت.
﴿٨﴾ بێ گۆمان زڤرین هەر بۆ نك خودایێ تەیە. ﴿٩﴾ ئەرێ تە دیت ئەو کەسێ ڤیایی ڕێکێ بگریت ﴿١٠﴾ ژ بەندەیەکێ
هەکە ببینیت نڤێژێ دکەت. [ئەڤ ئایەتە دراستا ئەبی جەهلدا هات، دەمێ سۆز دایە هەڤالێت خۆ هەکە ئەو پێغەمبەری
(سلاڤێت خودێ ل سەر بن) ل کەعبێ ل سەر نڤێژێ ببینیت دێ پاشڤە بەت و پێ خۆ دانیتە سەر ستۆیێ وی و پشتی هاتی
نێزیکی پێغەمبەری بووی(سلاڤێت خودێ ل سەر بن) زوی ترساندا پشت و پشت ڤەگەریا گۆتنێ: ها تە چو گوتبوو و
تە چو کر گۆت: ب خودێ خەندەکەکا ئاگری کەڤتە دناڤبەرا من و ویدا ئەز ترسیام و پاشڤەزڤریم] ﴿١١﴾ بێژە من، ئەگەر
ئەو کەسە ل سەر ڕێکا ڕاست بایە. ﴿١٢﴾ یان ژی داخوازا خودێترسی و پارێزکارییێ کربایە [ما ئەڤە بۆ وی چێتر نەبوو].

أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١٣﴾ أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ كَلَّا لَئِن لَّمۡ يَنتَهِ
لَنَسۡفَعَۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٖ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٖ ﴿١٦﴾ فَلۡيَدۡعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾
سَنَدۡعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡ وَٱقۡتَرِب۩ ﴿١٩﴾ سَجۡدَة

## سُورَةُ القَدۡرِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ﴿٢﴾
لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ﴿٣﴾ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا
بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ﴿٤﴾ سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ﴿٥﴾

## سُورَةُ البَيِّنَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَمۡ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ
تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡبَيِّنَةُ ﴿١﴾ رَسُولٞ مِّنَ ٱللَّهِ يَتۡلُواْ صُحُفٗا مُّطَهَّرَةٗ ﴿٢﴾ فِيهَا كُتُبٞ
قَيِّمَةٞ ﴿٣﴾ وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ
ٱلۡبَيِّنَةُ ﴿٤﴾ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ
حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴿٥﴾





﴿١٣﴾ بێژە من كەسێ د رێكا كرنا نڤێژێدا ڕاوەستیایی، و باوەری نەئینایی و پشتا خۆ داییە باوەرییێ، ما ژ خۆ ناترسن خودایێ مەزن ئیزایەكێ ب سەر واندا داڕێژیت؟. ﴿١٤﴾ ئەرێ ما ئەو نوزانیت و نەزانییە، خودێ وی دبینیت؟. ﴿١٥﴾ نەخێر بلا وەنەكەت، سویند ئەگەر ژ خۆڤە نەبیت [و دەست ژ دژمنكارییا دینی بەرنەدەت]، ئەم دێ وی د پۆرچكا ویرا گرین، و بەر ب دۆژەهێ ڕاكێشین. ﴿١٦﴾ پۆرچكا درەوینا گونەهكار. ﴿١٧﴾ و پاشی بلا گازی دەستەك و جڤاتا خۆ بكەت. ﴿١٨﴾ ئەم ژی دێ گازی زێرەڤانێت دۆژەهێ كەین. ﴿١٩﴾ نەخێر، گوهێ خۆ نەدێ و نڤێژێت خۆ بكە، و خۆ بۆ خودایێ خۆ داچەمینە، و ب گوهدارییێ خۆ نێزیكی وی بكە.

## سۆرەتا قەدر

### ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٥) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ مە قورئان د شەڤەكا ب ڕێز و ڕویمەتدا ئینا خوارێ. ﴿٢﴾ تو چ دزانی ئەو شەڤا ب ڕێز و ڕویمەت چ شەڤە؟. ﴿٣﴾ ساخكرنا وێ شەڤێ (ئەو شەڤا ب ڕێز و ڕویمەت) ب ڕێكا پەرستنا خودێ، چێترە ژ هزار هەیڤان. ﴿٤﴾ د وێ شەڤێدا ملیاكەت و جبریل ژی، ب هەمی فەرمانێت خودێڤە دێینە خوارێ. ﴿٥﴾ ئەڤ شەڤە [شەڤا ب ڕێز و ڕویمەت] شەڤا ئاشتی و تەناهییێ هەتا بەرسپێدەیێ [ئانكو خودێ بەس تێدا تەقدیرا ئاشتی و تەناهییێ دكەت].

## سۆرەتا بەیینە

### ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٨) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ ئەوێت كو بێ باوەر، ژ خودان كتێبان (جوهی و فەلە) و بوتپەرێسان، دەستا ژ بێ باوەرییا خۆ بەرنادەن، هەتا بەلگە و نیشانەكا ئاشكەرا بۆ نەئێت. ﴿٢﴾ ئەو ژی پێغەمبەرەكە ژ نك خودێ، كتێبەكا پیرۆز ل سەر وان دخوینیت، (كو قورئانە). ﴿٣﴾ كو چەند فەرمانێت ڕاستگۆ و دورستانە تێدانە. ﴿٤﴾ ل سەر پێغەمبەرینیا موحەمەدی (سلاڤێت خودێ ل سەر بن)، ئەڤێت خودان كتێب ژێك جودا نەبوون، هەتا پشتی پێغەمبەر ب خۆ بۆ وان هاتی. ﴿٥﴾ د گەل ڤێ ژی فەرمانا وان نەهاتییە كرن، ئەگەر ب پەرستنا خودێ نەبیت، ژ دل و دلبێشی و دلسۆژ بن د دینێ خودا، و ڕوییێ خۆ ژ هەر بیروباوەرەكا لەنگ و لۆر و خوار و ڤیچ وەرگێڕن، و بەرێ خۆ بدەنە ڕێكا خودێ و بەردەوام و ب ڕەنگێ پێدڤی نڤێژان بكەن و زەكاتێ ژ مالێ خۆ بدەن، ئەها ئەڤەیە دینێ ڕاست و دورست.

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ
خَٰلِدِينَ فِيهَآ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٧﴾ جَزَآؤُهُمْ
عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ
فِيهَآ أَبَدًاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾

## سُورَةُ الزَّلْزَلَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ
ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾
يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْاْ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَن يَعْمَلْ
مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾

## سُورَةُ العَادِيَاتِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ضَبْحًا ﴿١﴾ فَٱلْمُورِيَٰتِ قَدْحًا ﴿٢﴾ فَٱلْمُغِيرَٰتِ
صُبْحًا ﴿٣﴾ فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا ﴿٤﴾ فَوَسَطْنَ بِهِۦ جَمْعًا ﴿٥﴾



﴿٦﴾ بێ گۆمان ئەڤێت بێ باوەر ژ خودان کتێب و
بوتپەرێسان دێ چنە د ئاگرێ دۆژەهێدا، و هەروهەر
دێ تێدا مینن، و ئەها ئەڤەنە خرابترین چێکری و
دورستکرییێت خودێ. ﴿٧﴾ بەلێ ئەڤێت باوەری
ئینایین و کار و کریارێت قەنج کرین، ئەها ئەون
باشترین چێکرییێت خودێ. ﴿٨﴾ خەلاتێ وان ل دەڤ
خودایێ وان چەند بەحەشتەکن، کو جهێ ئێورین و
روینشتنێنە، و رویبار د بنرا دئێن و دچن، و هەروهەر
دێ د ڤان بەحەشتاندا مینن، خودێ ژ وان قایل بوو و
خەلاتکرن، و ئەو ژی قایلبوون ب خەلاتێ خۆ، ئەڤە
خەلاتە بۆ هەر کەسەکێیە ژ خودێ بترسیت.

## سۆرەتا زەلزەلە

### ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٨) ئایەتە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ دەمێ ئەرد ب بیڤەلەرزا خۆ ڤەدلەرزیت.
﴿٢﴾ و دەمێ ئەرد هەر تشتێ د زکێ خودا، ب سەر
ئەردی دئێخیت. ﴿٣﴾ و مرۆڤ وێ رۆژێ دبێژیت: ئەڤە ئەردی چییە و بۆچ هۆ لێ هات. ﴿٤﴾ وێ رۆژێ
ئەرد بەحس و دابێشا خۆ دکەت، و کا چ ل سەر چێ بوویە ڤەدگێریت. ﴿٥﴾ کو خودایێ تە، هۆسا فەرمان
یا دایێ. ﴿٦﴾ وێ رۆژێ مرۆڤ دێ ب تەرابەرایی و شەپرزەیی ژ گۆران رابن، دا کار و کریارێت خۆ ببینن.
﴿٧﴾ ڤێجا هەر کەسێ تەمەت گرانییا پرتا ژ هەمییان بچویکتر قەنجییێ بکەت، دێ خەلاتێ وێ قەنجییێ
بینیت. ﴿٨﴾ و هەر کەسێ تەمەت گرانییا پرتا ژ هەمییان بچویکتر خرابییێ ژی بکەت، دێ جزایێ وێ
خرابییێ بینیت.

## سۆرەتا عادییات

### ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (١١) ئایەتە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ سویند ب هەسپێت بەزا، دەمێ حلکەحلك دئێتێ. ﴿٢﴾ سویند ب سومێت، ئاگر ژ نالان دچیت.
﴿٣﴾ سویند ب هەسپێت سپێدەییان، هەوان ددەنە سەر دژمنێت خودێ. ﴿٤﴾ کو ب هندێ تۆزێ رادکەن.
﴿٥﴾ و ب وێ تۆزێڤە خۆ دگەهینتە مەیدانا شەرگەها دژمنان.



﴿٦﴾ [سویند ب ڤان هەمییان] ب ڕاستی مرۆڤ نەیێ شوکورداره بۆ خودایێ خۆ. ﴿٧﴾ و ئەو ب خۆ ژی باشترین بەلگەیە ل سەر ڤێ نەشوکورداریێ، چونکی کریارێت وی ییێت نەباش د ڕاستا خودێدا، ڤێ نەشوکورداریێ ئاشکەرا دکەن. ﴿٨﴾ و ئەو ل سەر ڤیانا مالی گەلەکێ ڕژده. ﴿٩﴾ ڤێجا ما نوزانیت دەمێ مرییێت ناڤ گۆڕان ڕادبن و ساخ دبنەڤە. ﴿١٠﴾ و هنگی هەر تشتەکێ د سینگاندا ڤەشارتی، ئاشکەرا دبیت. ﴿١١﴾ بێ گۆمان ئەها وێ ڕۆژێ، خودایێ وان ئاگەهداری هەر کار و کریارەکا وانە.

## سۆرەتا قاریعە

### ل مەکەهێ هاتیيە خوارێ (١١) ئایەتە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ (ڕۆژا قیامەتێ) ژ گوهـ کرنە، چونکی ب ترس و نەخۆشییێت خۆ، مرۆڤی ژ گوهان دکەت. ﴿٢﴾ ئەو ڕۆژ چییه؟. ﴿٣﴾ تو چ دزانی ئەو چ ڕۆژه؟. ﴿٤﴾ ئەو ڕۆژا مرۆڤ تێدا، وەکی بەلاتینکێت شەپرزە و بەلاڤە. ﴿٥﴾ و چیا وەکی هریا ژەنی لێ دئێن. ﴿٦﴾ ڤێجا ئەو کەسێ ترازیا وی ب کار و کریارێت قەنج گران بوو. ﴿٧﴾ ئەو دێ د ژیانەکا خۆشدا بیت. ﴿٨﴾ و ئەڤە و ئەوێ بارێ ترازیا وی ب کار و کریارێت قەنج سڤك بیت. ﴿٩﴾ جهێ وی دۆژەهە و ئاگره. ﴿١٠﴾ تو چ دزانی ئەو ئاگر چییه؟ ﴿١١﴾ ئاگرەکێ شاریایە.

## سۆرەتا تەکاثور

### ل مەکەهێ هاتیيە خوارێ (٨) ئایەتە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿١﴾ مال کۆمکرن و مالداریا دنیایێ، هوین ژ بیرڤەکرن و بێ ئاگەهکرن. ﴿٢﴾ هەتا مرن ب سەر هەوەدا دئێت، هوین دێ د ڤێ ڕەوشێدا بن. ﴿٣﴾ نە.. وەنەکەن ژ نوکە و پێڤە هوین دێ زانن [سەرەنجاما ڤێ ژ بیرڤەکرن و بێ ئاگەهیێ، دێ بیتە نەخۆشی]. ﴿٤﴾ جارەکا دی ژ نوکە و پێڤە هوین دێ زانن سەرەنجاما ڤێ ژ بیرڤەکرن و بێ ئاگەهیێ، دێ بیتە نەخۆشی. ﴿٥﴾ نە.. وەنینە وەکی هوین هزر دکەن، ئەگەر هەوە ب دورستی زانیبایە سەرەنجاما هەوە هەر نەخۆشییە، هەوە وەنەدکر. ﴿٦﴾ بێ گۆمان هوین دێ دۆژەهێ ب چاڤێ سەرێ خۆ بینن. ﴿٧﴾ جارەکا دی هوین دێ ب چاڤێ ڕاست و دورست بینن. ﴿٨﴾ پاشێ وێ ڕۆژێ، پسیارا هەر خێر و خۆشییەکێ دێ ژ هەوە ئێتەکرن.

سُورَةُ العَصۡرِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ٣

سُورَةُ الهُمَزَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ١ ٱلَّذِي جَمَعَ مَالٗا وَعَدَّدَهُۥ ٢
يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ ٣ كَلَّاۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلۡحُطَمَةِ ٤
وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحُطَمَةُ ٥ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ٦ ٱلَّتِي تَطَّلِعُ
عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ ٧ إِنَّهَا عَلَيۡهِم مُّؤۡصَدَةٞ ٨ فِي عَمَدٖ مُّمَدَّدَةِۭ ٩

سُورَةُ الفِيلِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصۡحَٰبِ ٱلۡفِيلِ ١ أَلَمۡ يَجۡعَلۡ
كَيۡدَهُمۡ فِي تَضۡلِيلٖ ٢ وَأَرۡسَلَ عَلَيۡهِمۡ طَيۡرًا أَبَابِيلَ ٣
تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٖ مِّن سِجِّيلٖ ٤ فَجَعَلَهُمۡ كَعَصۡفٖ مَّأۡكُولِۭ ٥



## سۆرەتا عەصر

**ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٣) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ سویند ب دەمی. ﴿٢﴾ ب ڕاستی مرۆڤ هەمی د
خوسارەتن (بەر خوسارەتن). ﴿٣﴾ ئەو نەبن ئەوێت
باوەری ئینایین، و کار و کریارێت قەنج کرین، و
هەڤدوو ل سەر حەقییێ شیرەت کرین، و هەڤدوو ب
بێنفرەهییێ شیرەت کرین.

## سۆرەتا هومەزە

**ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٩) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ نەخۆشی و ئیزا بۆ هەر کەسێ عەیبدەرئێخ و
تانەاڤێژ. ﴿٢﴾ ئەوێ هەر مال کۆمکرنێ دکەت، و
هەر دهەژمێریت. ﴿٣﴾ هزر دکەت مالێ وی، دێ
هەر وی هێلیتە ساخ. ﴿٤﴾ نە.. بلا وێ هزرێ نەکەت، بێ گۆمان ملیاکەت دێ وی هاڤێژنە د دۆژەهێدا،
ئەو دۆژەها هەر تشتەکی پرت و پەڕاتە دکەت. ﴿٥﴾ تو چ دزانی ئەو دۆژەهە چییە؟ ﴿٦﴾ ئاگرێ خودێ
یێ شارییایە. ﴿٧﴾ ئەو ئاگرێ سەر و دلان دگریت. ﴿٨﴾ بێ گۆمان ئەڤ ئاگرە ل سەر وان یێ گرتی و
دادایییە [رزگاربوون ژێ نینە]. ﴿٩﴾ ب ستوینێت ڕائێخستی و درێژکریڤە د گرێداینە.

## سۆرەتا فیل

**ل مەکەهێ هاتییە خوارێ (٥) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ [هەی موحەمەد] ما تە نەزانی کا خودایێ تە چ ب سەرێ خودانێت فیلان (لەشکەرێ ئەبرەهەیێ
حەبەشی) ئینا. ﴿٢﴾ ما مە دژمنکاری و فند و فێلێت وان، پویچ و بەربا نەکرن. ﴿٣﴾ و مە ڕەڤێت پەڕندەیان
دەستەسەری وان کرن، و ب سەر واندا هنارتن. ﴿٤﴾ وان پەڕندەیان بەرێت ئاخا سۆتی تێوەردکرن. ﴿٥﴾ وەکی
کایا خواری، یا کەتییە بن پێیان لێ کرن.

سُورَةُ قُرَيْشٍ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ ﴿١﴾ إِلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ ﴿٢﴾
فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَٰذَا الْبَيْتِ ﴿٣﴾ الَّذِي أَطْعَمَهُم
مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ ﴿٤﴾

سُورَةُ المَاعُونِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ الَّذِي يَدُعُّ
الْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيْلٌ
لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾
الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ ﴿٧﴾

سُورَةُ الكَوْثَرِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ ﴿١﴾ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ ﴿٢﴾
إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ ﴿٣﴾



## سۆرەتا قورەیش

**ل مەکەهێ هاتیـیە خوارێ (٤) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ ژ بەر وێ گورا قورەیشیـیان دایییە کاروانکاریـیێ.
﴿٢﴾ ژ بـەر گـورا وەغـەرا زڤستانێ (بـۆ یەمەنـێ)، و
یـا هاڤینێ (بـۆ شـامێ)، دبـرن. ﴿٣﴾ بـلا خودانـێ ڤـێ
مالـێ (کـو کەعبەیە) بپەرێسـن، و ببنـە بەندەیـێت وی.
﴿٤﴾ ئەو خودایـێ ژ برسـێ تێرکرین، و ژ ترسێ ئێمن و
پشت ڕاسـت کرین.

## سۆرەتا ماعوون

**ل مەکەهێ هاتیـیە خوارێ (٧) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ بێـژە من، ئـەرێ تە ئەو مرۆڤـێ باوەریـیێ ب ڕۆژا
جزادانـێ (کـو قیامەتـە) نەئینیـت دیـت. ﴿٢﴾ ئها ئـەوە
یـێ پشـتا خـۆ ددەتە سـێوی. ﴿٣﴾ و کەسـێ د بـەر نانـدان و تێرکرنـا بەلنگازیـا ناکـەت. ﴿٤﴾ ئیزا و نەخۆشـی
بـۆ وان نڤێژکـەران. ﴿٥﴾ ئەویـت ژ نڤێـژا خـۆ د بـێ ئاگەهـ [یـان ژی نەکـەن بۆ ڕویمەتـی نەبیـت]. ﴿٦﴾ ئەوێت
ڕویمەتکاریـیێ دکارێ خـۆدا دکـەن. ﴿٧﴾ و ڕێـکا هەوجەییـیێت مالـێ ژ خەلکی دگرن [یـان زەکاتێ نەدەن و
ڕێکـێ لـێ دگرن].

## سۆرەتا کەوثەر

**ل مەکەهێ هاتیـیە خوارێ (٣) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

﴿١﴾ [هـەی موحەمـەد] مـە گەلـەك کـەرەم و خـێر و خێرات یـێت دایـینە تـە، ژ وان ڕوبیـارێ (کەوسـەر)ێ..
د بەحەشـتێدا. ﴿٢﴾ ڤێجـا نڤێـژان بـۆ خودایـێ خـۆ بکـە، و قوربانـان بـۆ ڤەکـوژە. ﴿٣﴾ بـێ گۆمان یـێ کەربێ
دهاڤێتـە تـە و حـەژ تـە نەکـەت، ئـەوە یـێ وارکـۆرە و ژ خـێرێ دادۆتـی و بـێ سەروشـین [و مال مـیرات].

## سُورَةُ الكَافِرُونَ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾
وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾
وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾

## سُورَةُ النَّصْرِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ﴿١﴾ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ
يَدْخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ
وَٱسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًا ﴿٣﴾

## سُورَةُ المَسَدِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾
سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴿٤﴾
فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ ﴿٥﴾



## سۆرەتا كافیروون

**ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٦) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ [هەی موحەمەد] بێژە شاندێ (وفد)ێ
قورەیشییان هەی بێ باوەر و گاورینۆ. ﴿٢﴾ ئەز وی
ناپەرێسم یێ هوین دپەرێسن. ﴿٣﴾ و هوین ژی وی
ناپەرێسن یێ ئەز دپەرێسم. ﴿٤﴾ من ژی پەرستنا
هەوە كری، نەكرییە و نە ئەز دكەم. ﴿٥﴾ و هوین ژی
وێ پەرستنێ ناكەن یا ئەز دكەم. ﴿٦﴾ دینێ هەوە (كو
شرك)ە بۆ هەوە، و دینێ من (كو نیاسینا خودایەكێ
ب تنێیە) بۆ من.

## سۆرەتا نەصر

**ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ (٣) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ ئەگەر سەركەفتنا خودێ و ڤەكرنا مەكەهێ بۆ تە هات، و ب دەست تەڤە هات [ئەڤ سۆرەتە نیشانا
نێزیكبوونا وەغەركرنا پێغەمبەرییە (سلاڤێت خودێ ل سەربن)]. ﴿٢﴾ و تە خەلك دیت، یێ كۆم كۆم دئێنە
د دینێ خودێدا. ﴿٣﴾ ڤێجا هنگی خودێ ژ هەمی كێماسییان بشۆ، و سوپاسی و شوكورا خۆ بۆ دیاركە، و
داخوازا لێبۆرینێ ژێ بكە، چونكی بێ گۆمان ئەوە یێ هەر تۆبەوەرگر.

## سۆرەتا مەسەد

**ل مەكەهێ هاتییە خوارێ (٥) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ بەرزیان و بەرئاتاف ببن دەست و لەپێت (أبو لهب)، ـ مەخسەد پێ ئەو ب خۆیە ـ و بەرزیان ژی بوون.
﴿٢﴾ مالێ وی و قازانجێ ژێ گەهشتیێ، مفایێ وی نەدا. ﴿٣﴾ دێ چیتە د ئاگرەكێ ب گوریدا. ﴿٤﴾ د گەل
ژنا خۆ كو پشتیهەلگرا دار و ستریان بوو (بۆ هلئێخستنا فتنەیێ). ﴿٥﴾ وەریسەكێ هلچنی د ستۆیێ ویدایە.




## سۆرەتا ئیخلاص

**ل مەکەهێ هاتیـیە خوارێ (٤) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ [هـەی موحەمـەد بێـژە گـاوران ئەویـت دڤێن تـۆ خودایـێ خـۆ بـۆ وان بدەیـە نیاسـین] بێـژە خـودێ ئێکە و تـاك و تەنیایـە. ﴿٢﴾ ئـەو خودایـە یــێ هەمـی پێدڤـی هەوجـەی وی، و وەجـا هەمیـیان دقەتینیـت، و ئـەو پێدڤـی هەوجەیی کەسـێ نینە. ﴿٣﴾ کـەس ژێ نەبوویە، و [ئـەو] ژ کەسـێ نەبوویـە. ﴿٤﴾ و چـو هەڤکویـف ژێ بـۆ نینن.

## سۆرەتا فەلەق

**ل مەکەهێ هاتیـیە خوارێ (٥) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ بێـژە ئـەز خـۆ ب خودانـێ سپێدەیــێ دپارێـزم. ﴿٢﴾ ژ زیـان و خرابیـا هـەر چێکریــیەکی [ئانکـو ژ خرابیـا هەمی تشـتان]. ﴿٣﴾ و ژ زیـان و خرابیا شـەڤێ دەمێ دئینیـت [و دنیـا تـاری دبیـت، و تێـدا خرابـی دئێتەکـرن]. ﴿٤﴾ و ژ زیـان و خرابیـا سـێربەندان ئەوێـت پفـان ل گرێیـان ددەن [و ل بـەر دگـەرن ناڤبەرا مرۆڤـان نەخۆش بکەن، ب سێربەندیــێ و ب پفکرنـا گرێیان]. ﴿٥﴾ و ژ زیـان و خرابیـا هەر زکرەشـەکێ زکرەشیــێ بکەت [ئانکـو وەختێ زکرەشیــێ و حەسویدیــێ دکەت].

## سۆرەتا ناس

**ل مەکەهێ هاتیـیە خوارێ (٦) ئایەتە**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

﴿١﴾ بێـژە ئـەز خـۆ ب خودایــێ مرۆڤـان دپارێـزم. ﴿٢﴾ سـەروەر و خودانێ هەمـی مرۆڤان. ﴿٣﴾ و پەرسـتی و خودایــێ هەمـی مرۆڤـان. ﴿٤﴾ ژ زیانا شـەیتانێ خـۆ نەپەنی دکـەت، دەمێ ناڤێ خـودێ دئێتە ئینـان. ﴿٥﴾ ئەوێ د گوهـێ خەلکیـدا دخوینیـت، و دەنگێ خۆ دگەهینیتە سـەر دلێ وان، و خرابیــێ ل بەر دلـێ وان شرین دکەت، و وەسواسـێ دئێخیتـە د دلێـت واندا. ﴿٦﴾ ژ شـەیتانێت ئەجنە و شـەیتانێت مرۆڤان.

# فهرس بأسماء السور وبيان المكي والمدني منها

## ناڤەرۆك بناڤێ دیارکرنا سورەتـێت مەکەهیێ و مەدینیێ

| السورة | مەكییە یان مەدەنی | بەرپەر | سۆرەت | ژمارا وێ |
|---|---|---|---|---|
| سورة الطارق | مەكییە | ٥٩١ | سۆرەتا طارق | ٨٦ |
| سورة الأعلى | مەكییە | ٥٩١ | سۆرەتا ئەعلا | ٨٧ |
| سورة الغاشية | مەكییە | ٥٩٢ | سۆرەتا غاشییە | ٨٨ |
| سورة الفجر | مەكییە | ٥٩٣ | سۆرەتا فەجر | ٨٩ |
| سورة البلد | مەكییە | ٥٩٤ | سۆرەتا بەلەد | ٩٠ |
| سورة الشمس | مەكییە | ٥٩٥ | سۆرەتا شەمس | ٩١ |
| سورة الليل | مەكییە | ٥٩٥ | سۆرەتا لەیل | ٩٢ |
| سورة الضحى | مەكییە | ٥٩٦ | سۆرەتا ضوحا | ٩٣ |
| سورة الشرح | مەكییە | ٥٩٦ | سۆرەتا شەرح | ٩٤ |
| سورة التين | مەكییە | ٥٩٧ | سۆرەتا تین | ٩٥ |
| سورة العلق | مەكییە | ٥٩٧ | سۆرەتا عەلەق | ٩٦ |
| سورة القدر | مەكییە | ٥٩٨ | سۆرەتا قەدر | ٩٧ |
| سورة البينة | مەدەنییە | ٥٩٨ | سۆرەتا بەیینە | ٩٨ |
| سورة الزلزلة | مەدەنییە | ٥٩٩ | سۆرەتا زەلزەلە | ٩٩ |
| سورة العاديات | مەكییە | ٥٩٩ | سۆرەتا عادییات | ١٠٠ |
| سورة القارعة | مەكییە | ٦٠٠ | سۆرەتا قاریعە | ١٠١ |
| سورة التكاثر | مەكییە | ٦٠٠ | سۆرەتا تەكاثور | ١٠٢ |
| سورة العصر | مەكییە | ٦٠١ | سۆرەتا عەصر | ١٠٣ |
| سورة الهمزة | مەكییە | ٦٠١ | سۆرەتا هومەزە | ١٠٤ |
| سورة الفيل | مەكییە | ٦٠١ | سۆرەتا فیل | ١٠٥ |
| سورة قريش | مەكییە | ٦٠٢ | سۆرەتا قورەیش | ١٠٦ |
| سورة الماعون | مەكییە | ٦٠٢ | سۆرەتا ماعوون | ١٠٧ |
| سورة الكوثر | مەكییە | ٦٠٢ | سۆرەتا كەوثەر | ١٠٨ |
| سورة الكافرون | مەكییە | ٦٠٣ | سۆرەتا كافیروون | ١٠٩ |
| سورة النصر | مەدەنییە | ٦٠٣ | سۆرەتا نەصر | ١١٠ |
| سورة المسد | مەكییە | ٦٠٣ | سۆرەتا مەسەد | ١١١ |
| سورة الإخلاص | مەكییە | ٦٠٤ | سۆرەتا ئیخلاص | ١١٢ |
| سورة الفلق | مەكییە | ٦٠٤ | سۆرەتا فەلەق | ١١٣ |
| سورة الناس | مەكییە | ٦٠٤ | سۆرەتا ناس | ١١٤ |

إنّ وزارة الشؤون الإسلامية والدعوة والإرشاد

في المملكة العربية السعودية

المشرفة على

مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف

في المدينة المنورة

إذ يسرُّها أن يُصدر المجمع هذه الطبعة من

ترجمة معاني القرآن الكريم

إلى اللغة الكردية

(اللهجة الكرمانجية)

تسأل الله أن ينفع بها الناس

وأن يجزي

خادم الحرمين الشريفين الملك سلمان بن عبدالعزيز آل سعود

أحسن الجزاء على جهوده العظيمة في نشر كتاب الله الكريم

والله وليُّ التوفيق

**وەزارەتا كاروبارێت ئیسلامی و بانگەوازی و ڕابەرییا**

ل شاهنشینا عەرەبستانا سعوودی

یا سەرپەرشتیار ل سەر كومەلگەها مەلك فەهەد

یا چاپكرنا قورئانا پیروز ل مەدینەیا مونەووەر

كۆمەلگەهێ پێ خوشە ڤێ چاپا قورئانا پیروز دگەل راڤەكرنا وێ ب

زمانێ كوردی دەربێخیت

داخوازێ ژ خودێ دكەین خەلك مفایی ژێ وەرگرن

**و خەلاتێ خێرێ بدەتە (خادم الحرمین الشریفین)**

**شاه سەلمان كورێ عەبدول عەزیز ئال سعوود**

ل سەر زەحمەت و رەنجا مەزن یا ئەو ل سەر بەلاڤكرنا قورئانێ دبەت

و خودێ خودانێ هاریكارییـێیە






---

ص. پ ٦٢٦٢ ل مەدینەیا مونەووەر
www.qurancomplex.gov.sa
contact@qurancomplex.gov.sa

ⓒ **مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف، ١٤٤٢هـ**

فهرسة مكتبة الملك فهد الوطنية أثناء النشر

**مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف**

ترجمة معاني القرآن الكريم إلى اللغة الكردية (اللهجة الكرمانجية) / مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف - المدينة المنورة، ١٤٤٢هـ

٦٤٠ ص؛ ١٩,٥ × ٢٨ سم

ردمك: ٠-٢٤-٨٣١١-٦٠٣-٩٧٨

١- القرآن - ترجمة - اللغة الكردية (اللهجة الكرمانجية) أ. العنوان

ديوي ٢٢١,٤ ١٤٤٢/٢٨١٩

رقم الإيداع: ١٤٤٢/٢٨١٩

ردمك: ٠-٢٤-٨٣١١-٦٠٣-٩٧٨





تصفح الترجمة

تەماشەی وەرگێرانێ بکە




(٤٠٠٠/د ٤٩-٢) (٠٣) (٠١) ردمك: ٠-٢٤-٨٣١١-٦٠٣-٩٧٨